

# فەرهەنگی ناهید

## کوردی ـ کوردی ـ فارسی

محەمەد ناهید

هەولێر ٢٠١١




* ناوی کتێب: فەرهەنگی ناهید

* نووسەر: محەمەد ناهید

* بەرگ و سەرپەرشتیاری هونەری: عوسمان پیردلود .

* وێنەی بەرگ: نامۆ

* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە(١٢٢).

* چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر.

* تیراژ: ٧٥٠ دانە.

* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(٨٩٦ )ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە.

نووسینی ئەم بەرهەمە پێشکەش‌دەکەم بە ڕۆحی ئوستادی بێ‌وەکی نیگارگەری و مۆسیقای کوردی (فەیزوڵا خانی ناهید) باوکی‌دڵسۆز و ماموستا و ئاریکارم لە بوارەکانی سەغڵەتی تەنیایی و ژیانمدا.

# بەناوی خودای دلوڤان

## (ژیانم بەکورتی)

ساڵی ١٩٣٩ز(١٣١٨هە )هاتمەدونیا و ناویاننام موحەممەد، لە عەشیرەی فـەیزوڵڵابـەگـیم سەر بە شاری سەقز، نگارکێشان‌و تارژەندن هەر لە سـەرەتـای منداڵیمـەوە لـە خزمـەت فـە-یزوڵاخانی ناهید (باوکم) کە نیگارکێش و مۆسیقارێکی بەناوبانگ و بەتوانا بوو فێربووم.

ساڵی ١٩٦١(ز) زانستگای نیزامیم لە تاران تەواوکرد و هاتمە ڕیزی ئەرتـەش و لـەتـاران مامەوە و بەهۆی‌خزمایەتی و دۆستایەتی لەگەڵ دوکتۆر هاشمی‌شیرازیدا، هاتوچۆی ماڵیانم دە-کرد و هەرلەوێ زۆرجار بەخزمەت ژێنراڵ‌ئێحسان نووری‌پاشا(هەڵۆی‌ئارارات) دەگـەیشـتم کـە بەزانایی و ڕاوێژی شیرینی، درگای دونیایێکی نوێی بۆ ئاواڵەکردم، هەتا ڕۆژێـک فسۆسـێکی-کوردی‌هاوشاریم بەم چاوپێکەوتنانەی زانی و بووبە هۆی هەڵداشتنم لە تارانەوە بۆ شاری‌خـۆی و پاش‌پێنج ساڵ گەڕامەوە بۆ تاران.

خزمایەتیێکی‌دوورم لەگەڵ‌مامۆستا موحەممەدی‌قازی نووسەر و وەرگێڕی بەناوبانگ هـە-بوو، پاش دیدارێک بە هۆی زانینی گۆرانی و تارژەندن ئەو هەلەم بۆ ڕەخسا کە زۆر بەساناهی ڕێگەم بکەوێتە کۆڕ و مەجلیسی شەوانەی ئەدیب و شاعیر و نووسەر و هونەروەرانی بە توانای ئەو سەردەمە کە لەگەڵ مامۆستا قازی و دوکتۆرشیرازی دەورە میوانییان هەبوو، سێ‌سال لـە-کۆڕی شەوانەیاندا بەشداریم‌کرد کە باندۆرێکی گرینگی لە سەر ژیانم دانا، ئەوەیش منـەتبـاری مۆسیقام دەنا ئەفسەرێکی‌لاو لەکوێ و کۆڕی وها لەکوێ؟

جارێک مامۆستا مەزهەری‌خالقی ڕێگای کەوتە ئـەو کـۆڕە و لـەوکاتـەدا لـەڕادیـۆئێران ئیشی‌دەکرد پاش ئاشنا بوون بڕیارماندا کە چەند ئاوازێک لە ڕادیۆ(بەشی)کوردیی تـاران تۆمـار بکەم؛ کە بوو بەهۆی بەردەوامیم لەکاری مۆسیقا و لەپاش بیست‌ساڵ‌چەند بەرهەمـی‌مۆسـیقام تۆمارکرد.

بەڵام ئسترانبێژێکی پرۆفیشیناڵ نەبوومە و هەرگیز بۆ هیچ پێشنیار و موناسەبەیێـک، یـان لە هیچ کۆڕێکی غەیری خۆماڵیانەدا بەشداریم نەکردووە و کاری مۆسیقاییم لەرادیـۆ و تـەلـە-فزیۆن‌و پڕکردنەوەی شریت تێپەرنەبووە. بۆجاری دووەم (بەڕاپۆرتی‌هەر ئەو سیخوڕە)سەبارە-ت بە کۆڕی شەوانەمان، هەمدیسان هەڵوەدا بووم و هەڵیانداشتمەوە بۆ شاری خۆی و لە تاران دووریان خستمەوە، کە تا دوو ساڵ پاش سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانـی ئێـران لـە پارێزگـای ئازربایجان مامەوە ، بەراوەژووی چاوەڕوانی ئەوانەی پێیان وابوو لە شاری خۆی زوو جاڕز دەبم و واز لە کاری عەسکەری دێنم، (بەهۆی ئیشەکەمەوە) بە سانایی توانیم لەگەڵ زۆربـەی جـە-

ماوەری ئەو شارە دۆستایەتییێکی وەها پێک‌بێنم کە لەسەرەتای شۆڕش و دواتریش جەماوەری شاری خۆی و هاوکارەکانم، ڕێکخراوەی بەرپرسایەتی منیان بێمزەڕەت پاراست کە ئیستاش لەبەرچاومە و منەتباریانم.

ساڵی٧٩ ز.پلەی سەرگوردیم وەرگرت و بوومە بەرپرسی تەداروکاتی مەراغە و مهاباد و ساڵی٨١ ز. کارکەنار بووم و هاتمەوە سەقز و لە پاڵ کاری فەرهەنگی و ئەدەبیدا وانەی تەڕاحی و تار و نیگار کێشی و فێرکاریی دروستکردنی‌کەرەستەی‌مۆسیقایشم دانا کە ئەمڕۆ شاگردەکانم زۆربەیان مامۆستان و خاوەنی وانەی فێرکارین و زۆر جێی شانازیمن، دڵشادم کە نەیانهێشت ڕەنج‌بەخساربم.

پاش‌کارکەناریم لەگەڵ ماموستایان عەزیز شاڕوخ، حەمەجەزا، ڕەشید فەیزنیژاد، مامڵێ، ئەحمەدی قازی و نووسەرانی‌گۆواری سروە و هەژار ، هێمن ، ئەحمەدهەردی و سووتاو و زۆربەی مامۆستایانی ئەدیب و هونەروەر پێوەندیم هەبوو،کە هەموویان هەقی ئوستادیان بەسەرمەوە هەیە و بیرەوری شیرینی‌کات وساتێک کە لە خزمەتیاندا بووم لە لاپەڕەیێکدا ناگونجێ، ئەگەر عومر مەودا بدا بە تێروتەسەلی لەو باسە دەدوێم و پێشکەشی دەکەم. ئێستەش بەر دەوامم لە سەرنووسینی وشەدانی (ناتەواویەکانی هەنبانەبۆرینە) دیارە کە وشەدان لەگەڵ‌فەرهەنگدا تەوفیری‌هەیە بەڵام‌چبکەم مامۆستا هەژار ناوی فەرهەنگی لێناوە، ئەم وشەدانەش ناتەواویی هەنبانەبۆرینەیە، منیش هەر بەو شێوە ناوی فەرهەنگ لە سەر ڕووپەڕەکەی دادە نێم.

٢٠١٠.ز نووسەر.

## چۆنیەتی دەستپێکی ئەم وشەدانە:

ساڵی ۱۹۷۲ ز. پێش ئەوەی ئەلفوبێی کوردی بزانم، دەستم کرد بە کۆکردنەوەی وشە، سەرەتا بەڕێنووسی فارسی دەمنووسی، بەڵام دوای ناسینی الفوبێی کوردی هەموویانم گۆڕی و پاش ئەوەی کە هەنبانە بۆرینەم وەدەست کەوت، بۆ دووپات نەکردنەوە و ڕاگرتنی ڕێزی هەنبانە بۆرینە و پێشگری لە زیادە سەرفی پارەی کڕیاران، وشەکانی هەنبانە بۆرینەم لێ دەرهاویشت،کەهیوادارم لەپاڵ هە نبانە بۆرینەدا بتوانێت بەرەو تەواوترکردنی فەرهەنگی زمانی کوردیهەنگاوێک هەڵبێنێت پاش ئەوەش فەرهەنگی مامۆستا(گیو. مو کریانی)م گەیشتە دەست و زۆرم کەڵک لێوەرگرت. بەڵام زۆر وشەم بۆ ڕوون نەکرایەوە و نەمتوانی بەگشتی واتاکانیان لە ناوچەکاندا لە جەماوەر بپرسم، بریا زووتر بەدەستم گەیبا، چوونکا زۆربەی وشەکانی ئەم وشەدانە لە زمانی خەڵکی ناوچەکان وەرگیراون کە دەبووا سێ کەس لەسەری داکۆکی بکەن.

وشەی بیانی کە لە ئاخافتن‌دا زۆر لە سەر زاری جەماوەرن، یان ناون یان کۆژی پیشەیی و فە نین (دەستەواژە) ئامێتەی ئەم وشەدانەن، بەڵام هەندێ وشەی بیانی کە زیاتر لەبڵاقۆک وگۆوارەکاندا بەر چاو دەکەون ئەگەرچی کوردی نین بەڵام بە پێویستم زانی بە جودا لەژێر وشەکانی هەر پیتێکدا وشە بیانییەکانیش بنووسم.

زانستگای کوردستان لە ساڵی ۲۰۰۴ و۲۰۰۵ ز. دا لێبڕا بۆ دانانی فەرهەنگێکی سێ جڵدی (هاوتای وشەیفارسی بەکوردی) و منیش بەشێوەی کاتی و بێ موقابیلە ماوەی شەش مانگێک بەشداریم‌کردن و بووبەهۆی ئەوە کە هەست بە پێویستییێکی زیاتری ئەم وشەدانە بکەم. ئیشکردنم لە بوارەکانی جۆربەجۆری وەک: تەڕڕاحی ، مۆسیقا و ئاواز ، نگارکێشان ، وێنەگەری ، وچێکردنی تار و سێتار و (نەجاڕی و موعەڕەق و ناسککاری)و ئەکتەری سینما و دەوام‌کردن لە ئەرتەشدا، هۆکارێک بوون کە ئەو وشە و کۆژانە کە پێوەندیان بەو ئیشانەوە هەیە، بە تێڕادیوی شرۆڤە یان بکەم وحەوجەم بە پرسین نەبێت.

کەندوکۆسپی ژیان و تەنیاباڵی و بێهاواڵی لەم بوارە دژوارەدا نەبوونە لەمپەر و دڵساردیم بەڵام ئەرخایەنم ناوبەناو هەڵە و گرفتوگیرییان پێکهێناوە بەتایبەت لەباری ڕێنووسەوە، هیوادارم بە دڵفراوانیەوە بیپەژرێنن وهەڵەکانی سەرڕاست بکەنەوە و ئاریکار بن بۆ پێشکەوتی زمانە شیرینەکەمان (کە ناسنامەی هەرمیلەتێک زمانەکەیەتی و هونەرەکەی).

سەرکەوتووبن

# (فەرهەنگ و نووسراوەی مامۆستایانێک
# کە لەم وشەدانەدا کەڵکیان لێوەرگیراوە)

هەژار ...... هەنبانە بۆرینە

گیو موکریانی ............. فەرهەنگی کوردستان.

شێخ موحه ممەدیخاڵ......... فەرهەنگیخاڵ.

ئیبراهیم ئەحمەد .....................کویرەوەری.

هێمن ............. تاریک و ڕوون، ناڵەی جودایی

ڕەحمان زە بێحی ......... قامووسی کوردی.

فەتاح ئەمیری ............ هاوارەبەرە، میرزا

ئەحمەد بەحری .................. فەرهەنگی باڵندە.

حەمەی حەمەباقی ......... گوڵەکانی دۆزەخ، ئەفسانەی ئەدونیس،کێشەی کورد

حەسەن سەلاح سۆران ...... شیعر ، پەخشان، نوسراوە(سایتی ئینتێرنێت).

هێدی .................. ئاوێنەی خەیاڵ، ئاوێنەی شکاو

عەبدوڵا پەشێو ........بتی شکاو، شەونییە خەوتان پێوە نەبینم، پشت لە نەوا و ڕوو لە کرێوە

مارف عومەرگوڵ ........................ .خۆری زیندان.

ڕەحیم لوقمانی ........................ زامستان (شێعر).

مەلا خەلیلمشەختی ........................ فەرهەنگا مەرگ و ژی

ئەمیر ئەمینی ........................ فەرهەنگیگیا.

ئیبراهیم ئەحمەدی ........................ فەرهەنگی کینایە.

عەلی سەدری ................ ........... فەرهەنگی تەوفیق (فەڕانسە، کوردی).

عەبدوڵا حەسەنزادە ............... گوڵ چنینەوە

نووری کاراکۆیون........................ فەرهەنگی تەگوچی (کوردی، تورکی)

مەولەوی تاوەگۆزی........................ دیوانی مەولەوی.

حمەئەمین ئەحمەد ........................ فەرهەنگی یاد (ئینگلیسی،ئارەوی،کوردی).

فایەق بێکەس ........................دیوانی شێعر.

شێرکۆ بیکەس ........................ کاوەی ئاسنگەر، تەون،کۆچ (شیعر، پرۆزە)

ئەمیر ئەمینی ........................ فەرهەنگی ئارام(ئینگلیزی، کوردی، فارسی).

سوارەی ئێلخانیزادە ........................ خەوەبەردینە.

نادر نیرومەند(بۆران) ........................ جەغەتووی فرمێسک.

ئەحمەدی خانی ..................... مەم وزین.
عەبدوللا سەمەدی ..................... دەفتەری دەسنووس.
عەلی سەلیمی .........................داوەتی‌گول، شێعر.
سەجاد جەهانفەرد ......................ناونامەی کوردی
ئەمین گردیگلانی .......................دەفتەری دەسنووس
مەجید قوردویی‌میلان ...................فەرهەنگی کوردی، فارسی.
دوکتۆر جەمشید درەخشان و ئیبراهیم ئۆلغون ......... فەرهەنگی تورکی، فارسی
فەرهەنگۆکی پتر لە٢٠٠ ژمارە گۆڤاری سروە. زیاتر لە ١٢٠ژمارە گۆڤاری مهاباد.
ژمارەیێکی زۆرکتێبی کوردی و پۆلیکۆپی زانستگاکان.

جگە لەوانەش گەڕان، پشکنین و پرسین لە جەماوەری شار و گوندی کوردەواری لە-کرماشانەوە هەتا هەورامان و ماکۆ و ئەرزڕووم و هەولێر و سلێمانی کە زۆربەی وشەکانی-گرتووەتە بەر.

تێبینی : ئەگەر وشەیێک جگەلە واتای نووسراو لەهەنبانە بۆرینەدا، واتاییێکی دیکەی هە-بێت نیشانەی (+) م بۆ داناوە و حەولم داوە لە نووسینەوەی واتاکانی هەنبانە بۆرینە خۆ بپارێزم.

## (کورتکراوەی هەندێ وشە)

هەندێ وشەی زمانەکانی ئارەوی، فارسی، ئینگلیزی، فەرەنسی، ئیتالیـایی، تـورکی، هـەر بەو فونێتیک و ماناوە لە کوردیشدا هەیە، لە بەر ئەوە پـەیـداکردنی ڕەچـەڵـەکـی ئـەو وشـانە کارێکی جیاوازە ، بێ ئە وەی لەسەر ڕەگەز و بنەمای وشەکان بدوێم یان بڵێم تایبەت بـە کـام زمانە ، ئاماژەم پێکردووە کە لەو زمانانەشدا دەڵێن وەک :

فد؛ کورتکراوەی" فارسیش دەڵێ

تد؛ کورتکراوەی " تورکیش دەڵێ.

فرد؛ کورتکراوەی" فەڕانسەیش دەڵێ

ئیتا د؛ کورتکراوەی ئیتالیاییش دەڵێ

اند؛ کورتکراوەی" ئینگلیزیش دەڵێ

روس د؛ کورتکراوەی ڕووسیش دەڵێ.

کورتکراوەی ناوی هەندێ لە فەرهەنگەکان و حاڵەتی وشە لەبواری دەستووری زمانەوانییەوە و نیشانی پێویستی تر.

(ب)............. برێتی لە

ف.هن.... فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە.

ف.مشە.... فەرهەنگا مەرگ و ژی، مشەختی.

ف.گیا..... فەرهەنگی گیاشناسی.

ف.ب...... فەرهەنگی باڵندە.

ف.مان........... فەرهەنگی مان

[ناو،ت].....ناوی تێکەڵاو.

[ناو،بک]....ناوی بکەر.

[ ناو،بەر].....ناوی بەرکار.

[چاوگە،ت].....چاوگەی تێکەڵاو.

> ............... بڕوانە بۆ

\+ .............. جگە لە واتای هەنبانەبۆرینە

# ڕێز و سوپاس

ئەگەرچی لەسەرەتای نووسیندا تەنیابالْ و بێهاوالْ بووم، بەڵام لە بواری کاردا ئەم مامۆستایانە هاندەرم بوون و دڵگەرمیان‌کردم و بە پێداچوونەو ڕاستکردنەوەی چەوتیەکانی زۆر خۆیان ماندووکرد، بە پێویستی دەزانم ڕێز و سپاسی خۆم آراستەی ئەو عەزیزانە بکەم.

١. کاک حەسەن سەلاحسۆران، بەداخەوە پێش چاپ بوونی ئەم کتێبە چووە بەر ڕەحمە-تی خودا . ٢. کاک فەتاح ئەمیری .٣. کاک مستەفا ئیلخانیزادە .٤.کاک ڕەحیم لوقمانی.٥. کاک جهانگیر هاشمی.٦ کاک ئێرج ناهید . ٧. ئەندازیار کاک لوقمان فەیزوڵابەگی.٨ کاک کەیوان مەنسووری کە (ئەرکیسەرپەرشتی کاری کامپیوتەری) وەئەستۆ گرت.

سوپاس بۆ هاوکارانی بەشیکامپیوتەرکە ئەرکی پیت چنینیان وەئەستۆ گرت.
(١)یای فرووغ ناهید(پیتی ئا)و ویراستاری (٢). یای، زێنەب عەبدوڵلایی: (بەشێک لە پیتی ب) . (٣). یای، ئارەزوو مەنسووری خوێندکاری زمانی ئینگلیزی لە زانستگای سنە کە لەبواری پیتچنی و ویراستارییەوە ئاریکارییێکی زۆری کردم.(٤). یای، هانا موحەممەدیقەسریان کە بە دڵسۆزیەوە ئەرکی پیت چنینی١٢ پیتی گرتە ئەستۆ. (٥)نیما پەروێزی (بەشی بەجێماوی پیتی (ب) و ویراستاری (٥).یای،گەشین زەکەریاییبەشێک لە پیتی(پ )

پێویستە لە بەڕێزان (١) یای فەریبا ناهید دوکتۆری (کاردۆژ) (٢)مامۆستا نامۆ (ئوستادی زانستگا) ویای حەمیدە یۆسفی (دیزاینێر) وهونەرمەند. (٤)یای ستارە زوهرە (سیت) (٥)یای کولسووم عوسمانپوور (شاعیر). کە بەدڵسۆزیەوە بەتەنگیئەم کارەوە بوون یان بە تەلەفۆن یان ناردنی کتێب و فەرهەنگ، ئاریکاریان کردووم سپاسبکەم.

## (شێوەی دانانی ڕیزی پیتەکان )

ئەمڕۆ شێوەی ڕیزبەندی پیت لە نووسینی فەرهەنگدا گۆڕاوە کە بۆی هەیە ڕاستیش بێت، بەڵام ئەم وشەدانە ناتەواوی هەنبانەبۆرینەیە و هەر لە سەر ئەوشێوازە نووسیومە لەبەر ئەوەی-کەسانێ کە هەنبانەبۆرینەیان هەیە، هەر لەوجێگادا وشەی پێویستیان بدۆزنەوە. ئەم وشەدانە بەپێی ٢٨پیتی ژێرەوە نووسراوە نەک بە پێی دەنگ.

أ. ا. ب. پ. ت. ج. چ. ح. خ. د. (ر.ڕ) ز. ژ. س. ش. ع. غ. ف. ڤ. ق. ک. گ. (ل.ڵ)م. ن. (و.ۆ.وو) (ە.هێ) (ی.ێ)

هەمزە تەغەر بە سەر چوار پیتی(ا، و، ە، ی) وە دەنیشێ.

لە(ئا)وە هەتا (ی) بەشێوەی ژێرەوە نووسراون،

١. ئا..ئو.ئە.ئی.ئیی..............دەبێتە پیتی(ب)

٢ پیتی(ب. با.بب.بپ.بت_.......بە.بی.بیی...دەبێتە پ).

٣. پا.پب.پپ-..... پو.پە.پی. پیی ..دەبێتە پیتی(ت )

٤. تا.تب.تت.-......تە.تی. ..تیی...... دەبێتە پیتی(ج).

٥.جا.جب.جپ.جت.جج.جچ.جح.......جە.جی .جیی... دەبێتە پیتی(چ)

٦.چا.چب.چت.چچ.چح.چخ...چە.چی..چیی..دەبێتە پیتی (خ)..

٧. هەروا بەو ڕەوتە تادەگاتە نون... ح. خ. د. (ر.ڕ). ز. ژ. س. ش. ع. غ. ف. ڤ. ق. ک. گ. (ل.ڵ). م....... دەبیتە (ن) .نا.نب.نپ.نت......نل.نن. نو.نووو.نە.نی،دەبێتە پیتی (و،ۆ)

٨. وا.وب.وپ.وت............ ول...... ون.وو. وە. وهە. وەی،وی .ویی.. دەبێتە پیتی ( هێ)

٩.ها.هب.هپ.........................هل.هم.هن.هو..هوا...هون.هوو . هە.هی.- دەبێتە پیتی(ی.ێ).

١٠.یا.یب.یپ.یت....ین.یو.یون.یوو.یە. یی. و یێ. و یێ و.....ییا.... ییە... ییی. ییە.. ییی.

بۆ نموونە وشەی (بووهیشک) لەپێش وشەی(بوهارتن) دایە. پیتی(ر_ ڕ) ، (ل_ ڵ)، (و_ وو_ۆ)هەرسێکیان یەکن، بەڵام بەدوای یەکدا بێن، وەک پیتی سەربەخۆ بەکار دەبرێن.

پیتی(ی- ێ)وەک واو هەرچەند جار بەدوای یەکدا بێن هەموو جار سەربەخۆن . بڕوانە-بەندی ١٠.پیتی(ی) وەک دوو پیتی سەربەخۆ وایە کە بە دوای یەکدا هاتبێت. (پێویستە بیدرکێنم کەکامپیوتەریش هەربەو ڕەوتە پیتەکان دەچنێت

تێبینی: لە تەشدیددا هەردوو پیت دەبنە پیتێک وەک: شەققە ئەڕڕا، بەڵام لەوشەی وەک: ببە ، پیتی (ب) دوو جار دە وترێت، هەڵبەت تەشدید ئەگەر وەک دوو پیتی سەربەخۆش بنووسرێن هەردەبێ،(وەک چنینی کامپیوتەر) کە بە بڕوای‌من دروستترە و ئەوە لەگرفتوگیریە سەرەکییەکان نین ،هەرچەند چاوەڕوانی چارەسەرکردنیشی هەین.

## (سەبارەت بە نیشانە و ڕێنووس)

ئەگەر سیٚ دڵم هەبا هەرکام دارماڵٚ تەژی لە زاراوەییێک لە سیٚ زاراوەکانی کوردی، هەر سێکم دەکردنە یەک با لێک هەڵنەبڕێن (١)

لەم سیٚ زاراوە جوانە، لەم سیٚگوڵە بۆنخۆشە،گوڵاوێک بگیریتٚ داخۆم چ بۆن و بەرامەییێکی دەبێت؟

بۆ هەموو میللەتی دونیا لە باری فەن و هونەر و پێشکەوتەوە، لەیەک گەیشتن بە یەک-گەیشتنە.

ڕێنووسی کوردی لە زۆربەی ڕێنووسەکانی دونیا لەپێشترە هۆکارەکەشیئەوەیە کەپاشئە-وان دەستمان پێکردووە و لە هەڵەکانی ئەوان خۆمان پاراستووە، بەڵام چەند خاڵٚ لە ڕێنووسماندا هەیە ئەگەر چارەسەربکرێن تەنانەت بۆ زمانەکانی دیکەش کە بەئەم ئەلف و بێیە دەنووسرێن، جێیگەی ئەلفوبێی (فۆنێتیک)دەگرێتەوە، خاڵەکانیش ئەمانەن.

١.بەپێی دەستووری پەژرێندراوی هەر زمانێک دەبیٚ ساکارترین یاسا بۆ زبان هەڵبژێردرێت، بەڵام ئاڵۆزی دەبینرێت، بۆ نموونە دەنووسن (پیاوێک، دانەییێک) ئەگەر پیتی(ک) جیابکەینەوە دەبێتە،

(پیاویٚدانەییٚ) بەهۆی پیتی پێش (ک)کە دەنگدارە یان بێدەنگە بۆچی بیکەینە بانێک و دووهەوا؟ بۆچی بنووسین (پیاوێک ، دانەیەک )

بۆ پاراستنی ساکاری زمان چاک وایە هەردووکیان وەکوو یەک بنووسرێن و یەکلایی بێتەوە(وەک زاراوەی کورمانجی)مەبەست ئەوەیە هەموویان(ییێک یان یەک)بن

دیسان، (دەرەجەییێک) واتا یەک دەرەجە،(سوٚباکە دەرە جەییٚ+ک= دەرەجەییێک زیاد کە)یان(دەرەجەیێکیان دا بە ئەفسەرێک) بەڵام (دەرەجەیەک پیاوە، یا هەنارەکەم دەرەجە یە-کە) ڕوونە چەند جیاوازن. هەر لەو بنزاراوەدا، بە دانەدەمیەک دەڵێن دانەدەمییێک.

٢. وشەی وەک: بوون (چاوگە)، بوون (ڕابووروو)، بوون (ڕابووردوویدوور،(بووگن).بوون، واتا، بین، (کاری ئەمری) بیٚنیشانەیە.

٣.شنگ، دنگ،منگ،سنگ ،مانگا، ئەو (ن گ)یٚ کەمینگەیین و لە ناو کەپۆدا دەوترێن بیٚ-نیشانەیە.

۴. (ت و دالی) سوواو،وەک: بم؟ەریٚ، واتا بمدەریٚ. دە؟کوژم واتا دەتکوژم، بیٚنیشانەیە.
دوو نوون کە حاڵەتی تەشدیدی ئارەویی هەیە وەک :بازننە واتا دوٚڕاو، بەننە واتا بەنی، کە لە-هەندیٚ زاراوەدا هەردوو(نون) مینگەیین، بیٚنیشانەیە. ئەم شێوە ئاخافتنەلە فارسی سەنگلەجی دەچێت کە جیاوازە لەفارسی دەری ،دیارە ئەم جۆرە وێژە لە هەر زمانێکدا گەنجینەییێکی پڕبە-هایە.

(١) لە شێعرێکی ماموٚستا شێرکوٚ بێکەس

## سوپاس وپێزانین

دۆستی زۆر خۆشەویست و لەمێژینەم پرۆفسۆر د. مارف عومەر گول لەزانستگای سلێمانی، پاش دیتنی بەرهەمەکە، پێخۆش بوونی خۆی دەربڕی و دوای ڕێنموونی پێویست ئەرکەکەی بە مامۆستا عەبدوڵا زەنگەنە سپارد لەهەولێر و ئەویش بەڕۆحسووکی و دڵسۆزییێکی زیاتر لە-چاوەڕوانیەوە بەتەنگی کارەکەوە بوو، تەنانەت خۆی هات و بە ئاکادێمیای زمانی کوردی ناساندم. بەپێویستی دەزانم سوپاسی بێبڕانەوەی خۆم پێشکەشی ئەوبەڕێزانە بکەم.

## ئاکادێمیای زمانیکوردی ڕووگەی ئەویندارانی زمانەوانی

کارێکی هەرە پڕبایەخ کە لە دوورگەی هێمنی هەرێمی کوردستاندا کراوە دامەزرانی ئاکادێمیای زمانی کوردیە لە هەولێر، کە لە داهاتوودا گرینگی خۆی زیاتر دەنوێنێت.

لە پەنای پارکێکی بەدیمەندا کۆشکێکی جوان و ڕازاوە، لەناو حەسارێکی تەژی لەگول و ڕووەکدا، بە وێنەی بەهەشتێکی خەیاڵاوی،دەرکەی لەسەرپشتە و بووەتە ڕووگەی ئەویندارانی زمانەوانی و فەرهەنگ و ئەدەبی کوردەواری.

بەرپرسە کانی هەرکام سەمبول وتاپۆی خزمەت گوزارین بە زمان و کەلتوورەکەمان. کاتێک چووم بۆ چاپی کتێبەکەم، لە هەڵسوکەوتیانگەشامەوە و تەنانەت لادێک هەستم بە نامۆیی نەکرد و خۆم بە میوان نەزانی.

لەسەر ویستی خۆیان لەدرکاندنی ناوی ئازیزانی بەرپرس خۆم پاراست، دەیشزانم کەنە بە-گۆیە و نەبەقەڵەم ناتوانم ئەوجۆرە کەدڵخوازمە حەقی پێویستی ئەو مەبەستە بەیان بکەم. تەنیا دەڵێم، هیوادارم لەم بوارە پیرۆزەدا، سەرکەوتووبن و سوپاس و پێزانینمیان ئاراستە دەکەم.
نووسەر.

# ئـ

هەمزە، لە ئەلف و بێی کوردیدا فۆنیمێکی سەربەخۆنییە وفۆنیمێکی یاریدەدەرە زیاتر بە سەر چوارپیتی(ئەلف؛ واو؛ هێ،یێ) وە یان بە دەگمەن بەپیتی دیکەوە دەلکێ و دەنگێ پێکدێنی کەهاوتای(ئەلف مەددی یان ئەلفە) لە ڕێنووسی فارسیدا، بە بڕوای هێندێ لە توێژەرانی زمانی کوردی هەمزە کوردی نییە و جێگەی(ە)ی گرتووەتەوە، وەک: ئاتر و ئاماڵ و ئاوشان کە لە پێشدا: هاتر و هاوماڵ و هاوشان بوون، هەروها لە بەینی وشەی لێکدراودا زۆرجار هەمزە نامێنێ وەک: ماڵ-ئاوایی؛ ناوئاخن؛ بارئاش؛ کەبوونەتە: ماڵاوایی و ناواخن و باراش و زۆروشەی تر. (همزە)

+ئا بەهۆی شەش بەڵگەی ژێرەوە بۆی - هەیە واتای گەورە؛ گرینگ؛بەڕێز؛ بەرز؛ بەڕوومەت؛ بەنرخ؛ بدات. (بەڵگەی_١) ئاهورئا کە لە ئاوێستاوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی پالەوی. (ئا- هور- ئا) واتا (گەورە خۆری بڵیند) یا (بەرزە نووری بەڕێز) کە نوورێکی بەرز و جێگەی ڕێز و حورمەت بووە؛ (ب) خودا لە ئایینی زەردەشتدا. (بەڵگە-ی٢) موور واتا کۆتەداری کەرتکراو؛ دارەکە موور مووربکە: دارەکە لەت لەت بکە؛ ببڕەوە؛ لە وشەکانی وەک ئەلموورونیر و ئارەقونێڵ و ئاقیلە و ماقیلەدا کە هەرسێکیان بەواتای ئاراڤن، ئاموور و ئارەق و ئاقیلە هەمان باسکێشی سەر نیرن کە دارە درێژە گەورەکەی کەرەستەی شێوبڕینن؛ واتا: مووری درێژ وبڵیند

(بەڵگەی٣) لە بنزاراوەی ئەردەڵانیدا بۆ ڕێزنان لە برا و خوشکی گەورە دەڵێن ئابرا یا ئاباجی، دیارە ئا کورتکراوەی ئاغایش هەیە بەڵام بۆ وشەی ئاباجی بە کار ناهێنرێت و ئاشکرایە بەواتای: (گەورە باجی؛ براگەورە و کاکە)یە.

(بەڵگەی٤) وشەکانی ئارێز بەواتای: تەپۆڵکی بەرز و ئاراوەند بەواتای: بڵیندە بەرز، و ئاری بەواتای: بەرز، بڵیند؛ لە زمانی کوردیدا هەیە کە باندۆری(ئا) بە واتای گەورە بەرز، بڵیند، لە سەریان دیارە. (بەڵگەی ٥) ئابا: جەدد و ئابا: گەورە باوکان.

(بەڵگەی٦) ئادا: خوشکی گەورە؛ دادەی گەورە. (بزرگ، محترم، بلند)

+ئا: (١) کورتکراوەی ئاغا؛ ئا ڕەحیم: ئاغا ڕەحیم. (مخفف آقا) (٢) پێشگر: بۆ دنەدان و هاندان؛ ئادەی: دادەی؛ ئابڕۆ: دابڕۆ؛ (تحریک برای انجام کاری) (٣) پێشگر: بەواتای: مەکە؛ ئادەنگ: دادەنگ؛ دەنگ مەکە؛ بێدەنگبە؛ قوڕوقەپ. (به معنای نفی کاری) (٤) پێشگر: بۆ پرسکردن، ئاخۆ و ئاخۆم؛ ئایا؛ تۆبڵێی. (گویی) (٥) نیشانەی کۆمکردن لە زاراوەی کورمانجیدا: مروڤا؛ سوارا؛ واتا:

پیاوەکان؛ سوارەکان. (علامت جمع)
+ئا: پاشگرێکە دەچەسپێ بە پاش ڕیشەی کار(فێعل)ە وە و دەیکا بە(سیفەتی فاعیلی) وەک : خۆرا؛ زانا؛ بینا. (پسوند)
ئائلی: [ناو] زۆرداری؛ ملهوڕی. (زور گویی)
ئائۆش: (ف.مشە) هێشتا؛ هێژ.(تاکنون)
ئائەمەسە: ئائەمەیە؛ خۆیەتی؛بە تیز وتانەیشەوە دەوترێت. (این است)
ئائیت: [بەند]لەئاوێستایشدا ئائیتهاتووە،واتا: ئێستا؛ ئەلعان؛ نهۆ.(الان)
ئائیش: [ناو]کار؛ شوڵ؛ کەسب؛ ئیش؛ تێکۆشان؛ خەبات. (کار؛شغل)
ئائیل: [ناو] منداڵ؛ زارۆ.(بچە)
ئابا: گەورە باوکانی پێشو؛ جەددی گەورە. (اعلی جد)
ئاباجی: [ناو،ت] تد: خوشکی گەورە؛ باجییگەورە؛ پوور. (خواهر بزرگ، عمە)
ئاباد: [ئاوەڵناو]ئاوا؛ ئاوەدان؛ پاشگر، بە واتای (ناوی‌بک)ئاوەدان‌کەرەوە (آباد)
ئابادی: فد: [ناو] (١) نامەی چەپەرخانە. (نامە پستی) (٢) ئاوەدانی. (آبادی)
ئابان: [ناو] فد: ناوی مانگی دووهەمی پائیزی ساڵی هەتاوی. (آبان)
ئابڕو بردنە سەر لقی دار: (ب) ڕیسواکردن و لە قاودانی نەهێنی کەسێک. (رسوا کردن)
ئابڕوو بەکەسێکەوە نەهێشتن: ئابڕووبردن؛ ڕیسواکردن،بوون بە هۆی ئابڕووچوونی کەسێک.(آبرو بردن،رسواکردن)
ئابڕوودار: فد: [ئاوەڵناو] بەشەرەف؛ ئابڕوومەند. (باشرف؛ آبرومند)
ئابڕووکڕینەوە: [چاوگە،ت]کارێک کە لە ڕیسوابوونی کەسێک بەرگری‌بکا.(آبروی-کسی‌راخریدن)
ئابڕوو مەندانە: فد: شەرافەتمەندانە؛ بە-شێوازی ئابڕومەند. (شرافتمندانە؛ آبرومندانە)
ئابساڵ: فد: تەڕەساڵ. (سال پر بارش)
+ ئابشار: فد: [ناوی تێکەڵاو] زیاتر سێهەمین زەربەی تۆپی والیباڵە کە بە نهێم دەدرێت بەزەمینی حەریفدا.
(آبشار؛ اسپک)
ئابشۆڕ: [ناو،ت] دێکۆرێک کە ئاوی پێدا بێتە خوار زیاتردەستکردە لە بینادا. (دکور منزل کە ازآن آب سرازیر شود)
ئابلە: [ ناو،ت] (ف.مشە) هاوڵە؛ ئاوڵە؛ خوریک.(آبلە)
ئابلەکوت: [ناو،بک] (ف.مشە) هاوڵەکوت؛ خوریک‌قوت.(آبلەکوب)
ئابنووس: [ناو،ت] فد؛ فرد؛ اند: سەختەدارێکی ڕەنگ قاوەییتۆخە. (آبنوس)
ئابنووسیڕەنگ: فد: ڕەنگی قاوەییتۆخ. (آبنوسی رنگ)
ئابوورینااس: [ناو،بک] پسپۆڕی زانستی ئابووری، ئێکۆنۆمیست. (اقتصاددان)
ئابەوەت: [ناو] ئەم وشەیە هەورامییە و لە-ئاوێستایشداهاتووە: ئاوات؛ ئارەزوو.(آرزو)
ئابیدە: [ناو] (١) بینای گەورە؛ کۆشک. (قصر) (٢) تاپۆ؛ کۆتەڵ. (مجسمە)
ئاپا: [ناو] خۆشکی ئاپۆ؛ پوور. (عمە)
ئاپارتی: [ئاوەڵناو] تد؛ فد: ئاپاردی بیحەیا؛ هەڵگیراو؛ ڕەدووکەوتوو؛ (بەتورکی ئاپاردی-

واتا: بردی،هەڵیگرت؛ لەچاوگـەی ئاپارمـاخ).
(آپارتی)
ئاپاندیسیت: [ناو]فد؛ فرد؛ اند.: ئازاری
پـەنمـین و چڵـک‌کردنــی ڕیخۆڵـەکـوێرە.
(آپاندیسیت)
ئاپتەڕ: [ناو،ئاوەڵناو] شێت؛ دێوانە. (دیوانه)
ئاپتـەڕی: [ناو،بـەرهـەمـی چاوگـە] شـێتی؛
شەیدایی. (دیوانگی)
ئاپڕژێن: ئاو پرژێن. (آب پاشیدن)
+ ئاپۆرە: (١) [ئاوەڵناو،ناو،ت ] مرۆڤی سووک
و بێ‌بایەخ، بۆرەپیاو. (انسان بـی ارزش) (٢)
دەربەدەر؛ مشەخت؛ شتی بێ‌بایەخ وچرووک.
(دربدر)
ئاپۆژن: [ناو،ت] ماموژن. (زن عمو)
ئاپێ: [ناو] برای‌باب؛ئاپۆ؛ مامە؛ مام. (عمو)
ئاپێمووس: [ناو،ت] یارییێکە. (اسم یک
بازی است)
ئـاپیس: [نـاو] هێنـد؛ فـد: (١) نـاوی گـای
موبارەکی هێندیەکان کە دەیانپەرست؛ نـاوی
گاییێک کە بۆ جەمـاوەرێـک لـە هێندوسـتان
موبارەکە.(٢) مەیمونێ کـە شـێوەی ئینسـان
دەدا. (آپیس)
ئاتاشە: [ناو،ت] فد؛ فرد: ئەندامی باڵوێزخانە.
(عضو سفارت)
ئاتر: [ناو] ئاور؛ ئاگر؛ لە پێشینەدا هاتر بـووە .
(آتش)
ئاترەش: [ناو] ئاگادار و زێڕەوانی ئاور لە
ئایینی زەڕدەشتدا. (نگهبان آتش درآئین
زردشت)
ئاتڵ: ناڕەوا. (ناروا)

ئاتڵای: [ناو] موڵەت. (مهلت)
ئاتڵ و باتڵ: [بەند] عاتڵ وباتڵ؛ بێکار؛ ماتڵ؛
فیڕۆ؛ بێ‌سوود. (عاطل وباطل)
ئاتۆلیـە: [نـاو] فـرد؛ فـد؛ انـد: (١) کارگـای
هونەری.(٢)کارگـا و نومایشـگای هونـەری؛
ئاتلیە. (آتلیه)
ئاتۆ بەدەستدان: بەڵگە یان بـێ هێـزی لـە
بـەرانبـەر حـەریفـدا نیشـاندان و هـەسـتی
سەرکەوتوویی بە حەریفدان بۆبیانوو گـرتن.
(آتو به دست کسی دادن)
ئاتۆم:ئەتـۆم. [نـاو] انـد؛ فـد؛ فـرد: ئـەتـۆم،
بچووکترین بەشی هەرماکێک،گەردیلە. (اتم)
+ ئاتوون: قات و قڕی. (قحطی)
ئاتەشمار: [ناو،ت] مارێک کە ڕەنگی سووری
ئاتەشییە. (مار آتشی رنگ)
ئاتەشە: [ناو]فد: ئاتەشەک: (١) ئاورە؛
زەردەبـــرین. (زرده زخـــم) (٢) ســـووزاک.
(سوزاک)
ئاتــەشــەک: [نـاو] نــەخۆشــینی ســووزاک.
(سوزاک)
+ ئاتەگ: [ناو] (١) ئاتەکی‌زین؛ ئەو تـەختـە
چەرمە کە دەکەوێتە ژێر ڕانی
سوار. (چرم زیر ران سوارکار) (٢)
گۆشتی‌لاتەڕافەی حەیوانی سەر بڕاو.
(گوشت دنده)(٣) داوێنی‌کەوا؛ شاقەل.
(دامن.؛تریج‌قبا)
ئاتێل: [ناو] تەوقەیێکە دەیکەنە مل‌بۆ کەمتـر
جوڵانــەوەی گــەردن لــەکاتێکـدا ئــازارێکی
پێگەیشتبێت. (لەپزیشکیدا) (آتل)
ئـاتیوان: [چاوگـە،ت]تاواندنـەوە؛ ئاتیوانـدن.

(ذوب کردن)
ئاج: [ناو] فد: (۱) ئاژ؛ ددانە؛ قورنج قورنج؛ زبری بەردەئاش، زبری و ددانەی بڕبەند. (۲) ددانەی ژێر لاستیکی سەیارە. (دندانه)
ئاجکاری: فد: [بەرهەمی‌چاوگە] دروست-کردنی ددانە بە بەرد یا ئاسن، بیرازکردن؛ قورنج قورنج کردن؛ گرنج‌گرنج‌کردن. (دندانه دندانه کردن)
ئاجۆ[ئاوەڵناو] ڕەق؛ سەخت و سفت.(سفت)
ئاجۆر: [ناو] واتا خشت و کەرپووچی-سوورەوەبوو. تێبینی: خشتی ئاجۆر لە خاکی تایبەت کە هەمان خاکی چێکردنی جەڕەیە، دروست دەکرێت (خاکی ڕۆس) گڵەسوورەی تایبەتە، بە قاڵب لێدانەکەی دەڵێن خشت پێژی یاخشت بڕین و بە سوور کردنەوە کەی دەڵێن ئاجۆرپەزی؛ وەک: (ئاشپەزی وچاپەزی)، و بە کوورەکەی دەڵێن کوورەی ئاجۆرپەزی؛ وەک: کوورەی قسڵ و گەچ پەزی. (آجر)
ئاجۆرپەز: [ناوی‌تێکەڵاوی بک] فد: کەسێک‌کە خشت سوور دەکاتەوە و دەیکاتە ئاجۆر. (آجر پز)
ئاجۆرپەزی: [بەرهەمی‌چاوگە] فد: (۱) کاری‌کەسێک کە خشت سووردەکاتەوە و دەیکاتە ئاجۆر.(۲.ب) کوورەی سوورەوەکردنی ئاجۆر.(آجرپزی)
ئاجۆرپێژ: [ناو،ب] خشت‌بڕ بۆ ئاجۆر. (خشت زن)
ئاجۆرپێژی:[بەرهەمی‌چاوگە]کاری خشت پێژان بۆئاجۆر. (خشت آجر زنی)
ئاجۆرچن: [ناو،ب] (۱) کەسێک کە دیوار بە ئاجۆر هەڵدەستێنی و دروستیدەکا. (۲) کەسێک کە خشتی ئاجۆر لە ناو کوورەدا بە شێوەی تایبەت دەچنێ بۆ سوورەوەکردن. (آجرچین)
ئاجۆرفەرش: [ناو،ت] فد: جێگایێک کە بە ئاجۆر داپۆشرابێت،وەک: شەقامی بە ئاجۆر ڕووکێش‌کراو. (آجرفرش)
ئاجۆرکار: [ناو،بک] فد: کەسێک‌کە بە ئاجۆر بەننایی دەکا. (آجرکار)
ئاجۆرکاری: فد: (۱)[بەرهەمی‌چاوگە] بینایێک‌کە بە ئاجۆر دروستکراوە؛ دیواری ئاجۆرکاری. (۲) [بەرهەمی‌چاوگە] کاری بەننایێک کە بە ئاجۆر دیوار دروست دەکات؛ بەننایی بە ئاجۆر.(آجر کاری)
ئاجۆری: [ئاوەڵناو] فد: (۱) لە ئاجۆر دروستکراو. (۲)[ناو] ڕەنگی خشت یا هیرباری سوورەوەکراو. (آجری)
ئاجۆری ئەسفەنجی: [ناوی‌تێکەڵاو] فد: ئاجۆری کونکون و سووک؛ ئاجۆری کفەڵ. (آجر اسفنجی)
ئاجۆری‌پاشکار: [ناو،ت] ئاجۆری لای ژوورەوە. (ناوەوە)لە دیواردا. (آجرتوکار)
ئاجۆری‌پێشکار: [ناو،ت] ئاجۆری لای دەرەوە (ڕووی دەرەوە)لە دیواردا (آجرروکار)
ئاجۆری‌خە تایی: [ناوی‌تێکەڵاو] فد: ئاجۆری تەواو ۲۰ ×۲۰ سانتیم بۆ ئاجۆرفەرشی خیابان لە قەدیمدا. (آجر ختایی)
ئاجۆری‌فشاری: [ناو،ت] فد: ئاجۆری نە زۆر باش بۆ دانانی سفت کاری. (آجر فشاری)

ئاجۆری کاشی: [ناو،ت] فـد: ئاجۆرێـک کـه یەک ڕووی کاشیبێ. (آجر کاشی)
ئاجۆرینوما: [ناوت] فد: ئاجۆرێکی لووسـی جوان یا نەخشەدار بۆ داپۆشینی نومـای بینـا. که٣ یا ٥ سانیم بارسـتای هـەیـه و بـه قـەد نیـوەئـاجۆر یاکـەمتـر پانـایی هـەیـه و بـه درێژایەتی ئاجۆری ئاساییه. (آجرنما)
ئاجۆرینەسووج: فد، [ناو،ت] ئاجورێ که لـه خاکی نەسووج چێبووبێ. (آجرنسوز)
ئاجەک: [ئـاوەڵنـاو] ڕژد؛ چکـووس، دەسـت قووچـاو؛ بـەئێـرەیـی؛ بـەرچاوتـەنگ،قـە- ڵس.(خسیس)
ئـاجی کـەبـاب: [نـاو،ت] تـد؛ فـد: نـاوی لوولەکەبابێکه که لەبەر ئیسـیوەت و بیبـاری زۆر تامی تاڵه، زیاتر بۆ گۆڕینی تامی شیرینی گۆشتی وشتره و جۆرێک خاپانـدنی موشـته- ریيه، له هەندێ کەبابخانەکاندا.(آجی کباب)
ئاجیلخۆری: فـد: (١)[نـاو] دەفـری ئاجیـل- تێکـردن. (ظـرف آجیـل خـوری)٢. کـاری خواردنی ئاجیل.(چەرەز). (خوردن آجیل)
ئاجیل فرۆش: [ناو،ت]چەرەز فرۆش. (آجیـل فروش)
ئاجیه: [ناو] دەوری کڵاش وگیوه. (گیوه)
ئاچار: [ناو] کلیل، کلێل. (سوئیچ.
کلید)(٢) کەرەستەی توند و شلکردنی
پێچ ومۆره و جەڕ. (آچار)
ئاچارئاڵین: [ناو،ت] فـد: ئاچـارێکی شـەش گۆشەیه بۆ توند و شلکردنەوەی جەڕی ئاڵین که سەری جەڕەکە چاڵێکی شەش گۆشەیه و ئاچار دەچێ

بەسەری جەڕەکەدا. (آچار آلن)
ئاچاربۆکس: [ناو،ت] فد: چەند ئەندازه سـەره ئاچاری ڕینگه که تەنیا دەسکێکیان هـەیـه و به سەره ئاچارەکان دەخوا. (آچاربوکس)
ئاچارتەخت: [ناو،ت] فـد: ئاسـنێکی لاپانـه هەر سەرێکی به ژمارەیێـک پـێچ دەخـوا و شەش گۆشەیه و سەری شەش گۆشی پـێچ دەچێته نێویەوە. (آچار تخت)
ئاچارشێلاقی: فد: [ناو،ت] جۆرێک لووله گـر که دەمەکەی میزان دەکرێ و به هێزێ کـه بەسەریدا دێت چاکتر لووله دەگرێت؛ زیاتر بۆ لوولەی قەوی بەتایبەت بۆ کردنه و بەستنە- وەی فیلتێری ڕۆنی سەیاره. (آچار شلاقی)
ئاچارڕینگ: [ناو،ت] فد: ئاچارێکی ناوچـاڵی شەشگۆشەیه کـه پـێچ دەکـەوێتـه نێـوی. تایبەت بـۆ جـەڕی سـەر ڕینگـی تـەگـەری سەیاره. (آچار رینگ)
ئاچارفـەڕانسـه: [نـاو،ت] فـد: ئاچـاری جەڕکردنەوە و جەڕتوندکردن که دەمەکـەی (زۆر تا کەم) میزاندەکرێت؛ (ب) کـەسـێک که هەموو کارێک بزانێت و ئەنجامی بدا و دا نەمێنێت له کردنی هیچ کارێکدا؛ (کـابرا لـەو ڕێکخراوەدا ئاچار فەرانسەیه) (آچارفرانسه)
ئاچارقوفڵی: [ناویتێکەڵـاو] فـد: ئاچارێکـه ئەندازەکەی میزان دەکرێـت و دوای گرتنـی پێچ قوفڵ دەبێت. (آچار قفلی)
ئاچارکێشـی: فـد: [بـەرهـەمـیچاوگـه] توندکردنەوەی بەینا بەینی جەڕگەلی سەیاره و هەر کەرەستەی جەڕدار بۆ ئەرخەیان بوون لەوەی که شل نەبوونەتـەوە. (سـفت کـردن

پیچهای ماشین. آچار کشی)
ئاچمەز: [ئاوەڵناو] تد؛ فد:ئەم وشەیە لەتور کیەوەهاتووە واتا: نەکراوە ؛ بەستراو.(١) هەر گرێی، کە نەکرێتەوە.(٢) هەر ڕێگاییێک بەسترابێ و نەکرێتەوە. (٣)حاڵەتێ لە شەترەنجدا کە مۆرەییێک(داشێک) نەتوانێت بگوێزرێتەوە لە بەر ئەوە لە ڕاستی شادایە و بەری شای گرتووە. (آچمز)
ئاچی: [بەند] پەری چی؛ بۆچی؛ ئە ڕاچی.(برای چە)
ئاحیل: [ ناو] تەمەنی بەینی جەحێلی و پیری (میانسال)
ئاحێلی: [ناو] ژیانی نێوەڕاستی(بەینی) جەحێلی و پیری. (میان سالی)
ئاخاڵ: [ناو] ئاخاڵ؛ ئاشغاڵ،کلێشی و پیسی.(آشغال)
ئاخاندن: [چاوگە،ت] ئاخنینەوە پەستاوتن و پڕکردن. (پرکردن)
ئاخاوتن: [چاوگە،]ئاخافتن؛ قسەکردن. (حرف زدن)
+ ئاخایۆک: [ناو] جۆرێک سەقر.(نوعی باز)
ئاخایەتی: ئاغایەتی. (آقایی)
ئاخپوڵ: [ناو،ت] (١) قوڕشێلان بۆ هەوڕ. (گل را آماده کردن برای سفالگری و بنایی) (٢) خوڵەپۆتێ؛ یاری بەخوڵ. (خاک بازی)(٣) قوڕەبان.(گل اندودکردن پشت بام)
ئاختفی: [ئاوەڵناو] تەواو کەچەڵ. (بە کلی کچل)
ئاختە: [ئاوەڵناو] (١)ئەختە؛ یەختە؛ گون- دەرهێنراو؛ خەساو. (اختە)

ئاخچەواش: [ناو]گیاییێکی خواردەمەنییە. (آخچە واش)
ئاخرجار: دوایین جار. (آخرین مرتبە)
ئاخرچۆڕ: دوادڵۆپ. (آخرین قطرە)
+ ئاخرخێر: [ئاوەڵناو،ت]عاقیبەتبەخێر؛ هەرکارێک دەرئەنجامی بەخێر و خۆشی بگات. (عاقبت بەخیر)
ئاخردەست: [بەند] (١) دەستی ئاخر؛ دوایین کایە لە قوماردا. (آخرین دست)
(٢ب)[ناو] ئاخر و عاقیبەت؛سەرئەنجام. (آخر دست)
+ ئاخرزەمان: [ناو،ت] فد: (ب) دونیا ئاخربوون. (آخر زمان)
+ ئاخرشەڕ: [ئاوەڵناو،ت] (١) کەسێک کە لە ڕۆژانی دوایی ژیاندا خێر نەدیو بێت.(آخر شر) (٢) [بەند] ئاخر شەڕ، دۆاهەمین کێشە. (آخرین جنگ)
ئاخروئاقیبەت: سەرئەنجام، ئاکام؛ ئاخروعاقیبەتت خێر بێ. (آخر و عاقبت)
ئاخرهەناسە: دووا هەناسە. (ب) مردن. (آخر نفس)
ئاخری:(ب) هەر؛ ئاخری ڕاستت پێ نەوتین؛ هەرچی پێم گوتی ئاخری بەقسەت نەکردم؛ [ئاوەڵناو]دووا هەمین؛ لە ئاکامدا. (سرانجام)
ئاخریکار: بڕانەوە؛ تەواوبوون؛ عاقیبەت؛ تەواوبوونی کار. (آخرکار؛ عاقبت)
ئاخرین: [ئاوەڵناو] فد: دواهەمین (آخرین)
ئاخرینجار: جاری ئاخر؛ دواهەمین کەڕەت. (آخرین بار)
ئاخرین قیمەت: [ناو،ت]لەو قیمەتە کەمتر

نایفرۆشم؛ لەو قیمەتە زیاتر نایکرم، ئاخرین قسەی موعامەڵە. (آخرین قیمت)

ئاخفت:[ڕابووردووی‌ئاخافتن]قسەی کرد، گوتی. (حرف زد)

+ئاخفتن: [چاوگە](١) ئاخەفتن، قسەکردن. (حرف زدن) (٢) کرانەوەی برین؛ دەمدانەوەی برین؛ دەمکردنەوەی برین. (بازشدن‌زخم)

ئاخفین: [چاوگە](١) دەمکردنەوەی خونچەی گوڵ. (باز شدن غنچە) (٢) قسەکردن. (حرف زدن)

ئاخ‌کۆلان: [چاوگە،ت]عەرزهەڵکۆڵین . (کندن زمین)

ئاخگە: [ناو،ت] ئاویلکە؛ قەیران؛ گیانەڵا؛ تەنگانە. (دم مرگ؛ تنگنا)

ئاخڵ: [ناو] فد؛ تد: ئاخڵە، (١) خەرمانەی مانگ. (هالە ماە) (٢) جێی داکردنی مەڕ و ماڵات، جۆرێک تەویلەی مەڕ و ماڵات، هۆڵ. (آغل)

+ ئاخڵە: [ناو] (١) قەڵاغە تەپاڵە؛ کۆشکەڵانی تەپاڵە. (دیوار تاپالە)(٢) قەیران. (قیران) (٣) خەرمانە. (هالە) (٤) پاپۆکە. (چنبرە)

ئاخڵەدان: [چاوگە،ت](١) پاپۆکەخواردن. (چنبرە) (٢) کۆزبەستن بەدەوردا و کۆبوونەوە لە دەوری شتێک. (حلقە زدن دور چیزی)

ئاخلەوەڕ: [ناو] ئاخسبات؛ کاتی سەردە-رهێنانی گیا و لەوەڕ لە ژێر خاک؛ نیوەی ئاخری ڕەشەمە(نیمەآخراسفند)

ئاخڵەوی: [ناو] تد: یاغڵەوی، قابلەمەی سەربازکە لە تاوە دەچێ. (یاغلە وی)

ئاخلیڤینک: [ناو] تاوە؛ یاغڵاوی. (تابە؛یاغلە-وی)

+ ئاخن:(١)[پاشگر] واتاکەسێک کە دە ئاخنێتەوە. (تپانندە)(٢) ئاە و هەناسە هەڵکێش. (کسی کە آە می کشد) (٣) پاشگر: دەرپۆش و سەرپۆش؛ گونجەئاخن؛ رۆچن ئاخن. (درپوش. پوشانندە)

ئاخنەبا: ئاخنەبات:>ئاخلەوەڕ.

ئاخوئۆخ:(١) [دەنگەناو] دەربڕینی بێزاری.(٢) ناز و قەمزە. (آخ و اوخ)

ئاخوئۆخ لێبڕین: [چاوگە،ت] (ب) لە زمان خستن بە لێدان و دارکاری. (از نالە انداختن)

ئاخوئۆف : [دەنگەناو] دەنگێکە بۆ دە ربڕینی ئێش وئازار و هەروەها کەیف‌خۆشی. (آخ، آخیش)

ئاخوتف: بەدەنگ و سەداوە تف و بەڵغەم فڕێدان. (اخ و تف)

ئاخۆتن: [چاوگە،]ئاخاوتن؛ دووان؛ قسەکردن. (حرف زدن)

ئاخوڕاو: [ناو] گۆلاو؛ ئاخوڕی ئاو تێدا خواردنەوەی ئاژڵ. (آبشخور)

ئاخوڕبەرز: [ئاوەڵناو] (ب) بەفیز؛ لووتبەرز و زیادەخواز. (زیادە طلب)

ئاخوڕچەور: [ئاوەڵناو] (ب) ساماندار و خۆش‌بژیوو؛ تێروتەسەل. (کنایە از پولدار)

ئاخوڕچی: [ناو] مەیتەر؛ ئاگاداری‌کاری تەویلە و ئاخوڕ.(مهتر)

ئاخۆرە: [ناو] ئاخرگە؛ مێشولەکوێرە. (پشە ریز)

ئاخۆم: [ئامراز،ت] ئاخۆ؛ داخۆ؛ ئایا؛ تۆبێژی. (توگویی؛ آیا)
ئاخووەند: [ئاوەڵناو+ناو] هونەرمەند؛ زانا لە- هونەردا. (هنرمند)
ئاخوین: [چاوگە] چاکبوونەوەی برین؛ گۆشتەزوون هێنانەوەی برین. (التیام زخم)
ئاخە: [ناو] ئاغا. (آقا)
ئاخەڕەش: [ناو،ت] خۆڵی ڕەش؛ بووڵ؛ خۆڵەمێش (خاکستر)
ئاخەفتەر: [ناو،بک] وێژەر؛قسەکەر. (گوینده)
ئاخەفتیار: [ناو،]وێژەر؛کەسێک کە لە کۆڕ و مەجلیسدا قسە دەکات یان لە لایەن کۆڕێکە وەقسە دەکات. (سخن گو)
ئاخەلێوکۆتایی: [ناو،ت] ئاخر و ئۆخری کار. (آخرهای کار)
ئاخیرەت: [ناو] (ب) قیامەت. (قیامت)
ئاخێزا: [ڕابوردوو] ئاخیزی کرد؛ هەڵسا؛ ڕابوو.(بلندشد)
ئاخێزگە: [ناو]جێی ڕاپەڕین و سەرهەڵدانی کەسێک یان بیر و باوەڕێکی نوێ. (مکان پیدایش. خاستگاه)
ئاخێفتن: [چاوگە] ڕواندن. (رویاندن)
ئاخیڤێنی: کولانەوەی برین. (به درد آوردن و دستکاری زخم)
ئاخێوتن:[چاوگە،] گێڕانی ئەسب بۆ وشک بوونەوەی عارەقی لەشی؛ تەڕاتین. (گرداندن اسب)
ئاخێوەر: [ناو،بک] بێژەر. (گوینده)
+ ئادا: (١)[ناو] لە زبانەکانی پرۆگرام نووسینی کامپیوتەر. (زبان برنامە نویسی کامپیوتر). (٢)خوشکی گەورە. (خواهر بزرگ)
ئادابتۆر: [ناو] اند؛ فد: لەکوردیدا ئەم وشەیە نییە، کەرەستەی گۆڕینی کارەبای دوو تەرەفە بە یەک تەرەفە بە وڵتاژێکی کەمترەوە. (آدابتور)
ئادابوڕسووم: [ناو،ت]کۆی داب و دەستوور؛ دابونەریت. (آداب و رسوم)
+ ئادار: [ناو] شوێنەوار. (جای بودن؛نشانه)
ئادار بەسەر پادارەوە نەمان: (ب) وێران بوون، ژێروژوور بوون؛ خاپوور بوون. (ویران شدن)
+ ئاداروک: [ناو] جەژنی ساڵی نوێی مانگی خاکەلێوە؛ نەورۆزی دابی کۆن. (عید نوروز قدیمی)
ئاداش: [ناو] ئابرا؛ برای گەورە؛ ئاواڵ؛ دۆست؛ هاواڵیهاومەرامی ڕامیاری وحیزبی؛ڕەنگە لە ئارکاداش ویۆڵداشی تورکیەوە هاتبێت کە هەر بەو مانایەیە (آقاداداش،رفیق)
ئاداک : ئادا؛ دوورگە؛ پەڵەیێک وشکی لە ناو زەریادا؛ (جزیره)
ئادامس: [ناو] فد: بنێشتی فەڕەنگی. (آدامس؛ سقز فرنگی)
ئادانی: بەموفابوون؛ بەکەڵکبوون؛ بە سوود بوون. (پرسودی)
ئادرێس: [ناو] اند؛ فد: شوێن، نیشانی؛ دیاری کردنی جێگایێک بە وتە یان نووسین. (آدرس)
ئادگار: [ناو] ڕوخسار؛ پۆتەراک؛ قەڵافەت؛ سیما؛ بەژن و باڵا. (شمایل)

ئادۆ: [ناو] خۆشی؛ کەیف؛ شادی.(شادی)
+ئادۆدە: [ناو] (۱) بژارچن؛ بیڵەکـان. (بیلچـه وجین) نێرەژەن؛ داری بەینی دوو لوولـەپ لـە مەشکەدا. (چوب بین دو دسته مشک)
+ ئادە: [ناو] تـد (۱) دوورگـە، بـە شـێ لـە وشکایی نە زۆر گەورە کە دەوراندەورە کـەی ئاوە. (جزیره)(۲) جێناو بۆ مێیینە. (ضمیربرای ماده) (۳)بژار. (وجین) (۴) تەڵە(تله)
ئادەر: [ناو] ئازەر، ئاگر، ئاور، ئاهیر(آذر،آتش)
ئادەربەرزین: [ناو،ت] ئازەربەرزین، ناوی پە-رەسـتگەییکـی زەردەشـتیانە . (نـام پرستشگاهی‌است در دین زردشت.
ئادەنگ: بێدەنگبە، دادەنـگ، قـوڕ و قـەپ. (ساکت شو)
ئادەی: دادەی، وشەی هاندان .(ها،زودباش)
+ ئادی: [بەند]ئەی، ئەدی، بەڵێ،
ئەری. (بله)
ئادینده: [ناو] کولکەزێرینە، کەسـکە سـوور، کۆلکەڕەنگینە، پەلکەڕەنگینە، ئەستوونە زێر-ینە، کەسکوسوور(قوس‌وقزح،رنگین کمان)
+ ئار: [ناو](۱) یەکـەی ئـەنـدازە بـۆ پێـوانی زەوی و پانایی بەرانبەر بە۱۰۰ میکـاب. (آر. برابـر ۱۰۰ متـر مربـع) (۲) پاشـگر: دیـدار، کڕیار، گرفتار، کردار، جووتیار. (پسوند)
+ ئارا: فدە تد: [پاشگر] ڕازێنەر، چەمەن‌ئـارا، مەجلیس‌ئارائد: بەین (پسوند:آرا ،میانه)
ئاڕاد: حاڵەتی‌تامەزرۆیی و خولیای‌جنسـی لـە هەندێ‌جەحێڵاندا(میل‌جنسـی‌شدیددربعضـی جوانان)
ئارارات : ئاگر هات؛ ئاگر وەشان؛ گـڕ کـان؛ ناوی کێوی ئاگریداغ یان ئوغریداغ (آرارات)
ئاراس : (۱)ئەسر؛ فرمێسک(اشک) (۲)نـاوی چۆمێکە لە سنووری ئێران و دەوڵەتـی ئـازە-ربایجاندا(رود ارس)
ئاراستن: (۱) خستنەپشت‌گوێ. (پشت گـوش انداختن) (۲)[چاوگە] خەملاندن. (آراستن)
+ ئاراستە: فد: (۱)[ئاوەڵناو+ ناو،بەر] ڕازاوە؛ دەق‌دراو، پۆشتە، ئاڕایش‌کـراو، ڕازاوە، تەڕپۆش. (آراسته) (۲) بەرەوڕوو ناردن؛ تێگرتن. (روبه‌کسی پرتکردن)
+ ئاراف: [ناو] نیـر و ئـاموور، ئـارەق و نێـل، ئاقیلـەو ماقیلـە، ئاکیلـە و ماکیلـە، ئێـرەق و نێل(خیش)
ئاراک: [ناو] ئاورگە، ئاتەشگا(آتشکده)
+ ئارام: [ئاوەڵناو] و [ناو][بەند] فد:
(۱)لە چاوگەی(رەم)ی ئاوێسـتاییەوە هـاتووە بـە واتـای پشـوودەرکـردن و حـەسانەوە و بێهن‌وەدان(۲) کڕ؛ ئەسپایی؛ هێدی؛ هـێمن؛ هێواش؛ ژیـر؛ ئـۆقرە؛ بـێجوولـە؛ ئاسـوودە؛ لەسەرخۆ؛ بێدەنگ؛ ستار؛ شێنەیی؛ ئەسپەکـە ئارامە :شەڕوور نییە. (آرام)(۳) نـاوی دەریـای بەرینی ئارام، لە باکوورەوە تا باشووری گۆی زەوی(دریای آرام)(۴) نـاوەبـۆ پیـاوان. (نـام مردانه)
ئارام‌بـوون: [چاوگـە،ت]هێـواش‌بـوون؛ بـێ-جوولـەبـوون؛ هێـدی‌بـوون؛ ئـۆقرەگـرتن؛ کڕبـوون؛ لـەسـەر خۆبـوون؛ دامرکـان؛ داسەکنین؛ هێوربوون. (آرام شدن)
ئارام بوونەوە: [چاوگـە،ت]داسـەکنـین دوای تـوڕەیـی. هێمنایـەتـی دوای نائـارامی؛ ژیـر

بوونەوەی منداڵ لـە گریـان؛ هـەدادان. (آرام گرفتن)
ئارامگرتن: [چاوگە،ت]ئوقرەگرتن، داسەکنین؛ هێور بوون؛ هەدادان، ژێربوونەوە؛ سرەوتن؛ دامرکان. (آرام گرفتن)
ئارام لێهەڵگرتن:[چاوگە،ت]زۆر بـۆ هێنـان ؛ هەراسانکردن؛ بێئوقرەکردن؛ تەنـگ پـێ-هەڵچنین. (بی قرار کردن)
ئارامەند: (١) ئەرامەنە؛ فەقیر؛ بێئەنوا. (نیازمند) (٢) [ئاوەڵناو]ئارا تورکی واتا بـەیـن؛ مەند واتا ماو؛ ئارامەند واتا تیامـاو؛ کـەسێک کە لە کارێکا دابمێنێ؛ دەسەوسان. (وامانـده؛ درمانده)
ئـارامی: [نـاو](١) ئـەسـپایی. (٢) حاڵـەتـی هێمنــی؛ هێواشــی؛ هێــوری؛ بێــدەنگــی؛ لەسەرخۆیی. (٣) نێوی قـەومێکـی مێژوویـی. (٤) لقێ لە زبانگەلی سامی لـە ڕۆژ هـەڵـاتی ناوەڕاست.(آرامی)
+ ئاران: (١) هان، (تحریـک)(٢) وردکـردن؛ هاڕین. (خورد کردن؛ سودن) (٣) [ئـاوەڵنـاو] تووڕە. (عصبانی)(٤) [ناو] گەرمەسێر؛ ئـالان. (گرمسیر)
ئارانجا: [ناو] شوێنی گەرمێن؛ ناوی پێشوی کەرکووک. (نام قبلی کرکوک)
ئاراندن: [چاوگە،ت] (١) هـاڕین؛ وردکـردن. (خرد کردن. پودرکردن) (٢) کولاندنەوە. (بـە درد آوردن و دسـتکاری زخـم) (٣) هانـدان. (تحریک کردن)
ئـارا و قـارا: [نـاو،ت] ئـارام و قـەرار؛ ئـوقرە؛ حەجمان. (آرام و قرار)

ئاربابا: [ناو] کێوێکە لە باشووری شاری بانە. (کوه آربابا؛
ئاربەشک: [ناو،ت] چەخماخ؛ گیڵەنگێدەن کە بە هاتن و چوونێـک فیشـەک دەخاتـە بـەر خانی تفەنگ. (چقماق)
ئارتاخ: ئەو کەسەیە بە نەهێنی شتێ لە جێگاییێک دەربێنێ. (کسی که یواشکی چیزی را از جایی درآورد)
ئارترۆز: [ناو] فد؛ فرد؛ اند: نەخۆشینی بەینی جومگەو ئێسکەکانی بڕبڕەی پشت و سووانی کرکراکەی بەینی دوو ئێسک. (آرتروز)
ئارتزیەن: [ناو] اند؛ فد؛ فرد: بەرانبەری ئـەم وشەیە لەکوردیدا نییە. بیری زۆر قووڵ؛ بیری ئارتزیەن؛ بیری قووڵ تا مابەینـی دوو تـوێ سەختی زەوی کە ئاوەکەی هـەڵـدەقـوڵێ و نیازی بە مۆتۆڕپۆمپ نییە. (آرتزین)
ئارتوون: [ناو،ت] ئاتەشخان؛ دۆژە.(آتش خانه؛ جهنم)
ئارج: [ناو] جۆرێک قامیشی گەرمەسێر. حەیزەران.(خیزران)
ئارچەن: [ناو] چەناکە.(چانه)
ئارختە: [ناو] سەنگ سواربوون لەخەودا؛ مۆتـەکـە؛ ئارختـک؛ مۆتـە؛ بـەختـەک. (بختک؛کابوس)
ئارخچن: [ناوی تێکەڵاو] ئارەقچن؛کڵاوی ژێـر مێزەر. (عرق چین)
ئارداف: [ئاوەڵناو] فێڵەبـاز؛ گزیکـار؛ گـزەون؛ داوباز. (حیلەگر)
ئاردبێژ: [ناو](١) هێڵـەک. (الـک) (٢) [نـاوی بکەر]کەسێککە ئارد لـە هێڵـەک دەدا. (آرد

الک کن)
ئارد تەقاندنەوە: [چاوگە،ت] ئـارد بێـژتن.(آرد الک کردن)
ئاردن: [چاوگە]هێنان؛ هاوردن؛ ئینان؛ هانین. (آوردن)
ئاردە ماڵ: [نـاوی‌تێکـەڵـاو] بێڵـی ئاردمـاڵین لەئاشدا.(آردروب)
ئاردوو: [ناو،ت] (١) ئاوردوو. (گیاه نـرم بـرای شـعله ورکــردن و گیرانــدن آتــش) (٢) سووتەمەنی وەک دار و چیلکـە وچـەویـل و تەپاڵە. (سوخت)
+ ئاردەبا: [ناو،ت] ئاردەوا، تراوی ئاردی جۆ و ئاو بۆ دەباغی. (آرد جو آبکی برای دباغی)
ئاردەبارە: [ناو،ت] مزی یاریدەدان لە بارکردنی بارە ئاشدا کە ئاشـەوان لـە ئـاش- هێری دەستێنێ. (مزد بار کردن بار آرد)
ئاردەبرنج: [ناو،ت] هاڕاوەی برنج. (آرد برنج)
ئاردەتـوو: [نـاو،ت] تووشـیرینی کـوتراو. (آرد توت، توت کوبیده)
ئاردەساوار:[ناو،ت]پیرخەنیلە؛وردەساوار. (بلغور آسیاب شده)
ئاردەشان: ئارداوێژ. (آردی که از کناره سنگ آسیاب می ریزد)
ئاردەشێلە: [ناو،ت] تراوی ئارد و ئاو. (مخلوط آرد و آب آبکی)
+ ئاردەڵ: [ناو] (١) سەربازێ کە ئەسب دەبـا بۆ باڵادەستی. (٢) پاسەوان؛ یاساوڵ. (آردل)
ئاردەلووکە: [ناو،ت] ئاردی زۆر ورد کە لە ناو قووڵکەی ئاشدا دەمێنێتەوە. (گرد آردمانده در گودال آسیاب)
ئاردەڵێن: [نـاوی‌تێکـەڵـاو]ئـاردبێژ؛ هێڵـە ک. (الک)
ئاردەنۆک:[ناو،ت]هاڕاوەی نۆک. (آردنخود)
ئاردی‌تە قیاوە: [ناو،بەر] ئاردی بێژراوە؛ ئاردی هێڵەک کراو.(آرد الک شده)
ئاردی هەشتەرخان: [ناوی‌تێکەڵاو] ئــاردی تایبــەت بۆدروســتکردنی‌تۆشــە و شــیرینیات کــە سپۆســەکــەی تــەواو گیرابێ.(آردبی‌سبوس)
ئــارزان: [نــاو] ئــاردە بــرویش؛ ئــاردی- ساوار.(آردبلغور)
ئارزە: ئازە؛ ئەو؛ جێناوی سێهەم کەسی مـێ. (او،برای ماده)
ئارزەن: [ناو] ئارگوشک؛ چەنە؛ چەناکە؛ چەناوە؛ ئەرزین؛ چەناگە؛ ئارزینگ. (آرواره)
ئارزی: [ناو] سەرمایەی تایبەت. (سرمایه)
ئارزێ: [جێناو]ئازێ؛ ئـەوان؛ بـۆ نێـر و مـێ. (آنهابرای نرماده.)
ئارزینچ: [ناو] ئارووک؛ ئاریک؛ میچ. (سقف)
ئارژین: ئاژین؛ ئاو بەردانەوە سـەر مـەزرا یـا زەوی بەشێنەیی و سەلیقە. (هـدایت آب بـه مزرعه)
ئارشام: ناوی باوەگـەورەی داریووشـی هـە- خامــەنشــی.(اسـم پـدربزرگ داریــوش هخامنشی)
ئارشــتی: [نــاو]تیــر؛ تیــری پــەیکانــدار. (تیرپیکاندار)
ئارشە: [ناو] فرد؛ فد؛ اند: کەمانی

وێڵوون و کەمانچە و وێڵوونسێل لێدان.
(آرشه)
+ ئارقان: [ناو] بارئاش.(بار برای آسیاب)
+ ئارگوون: [ناو]تەندور. (تنور)
ئارماز: [نـاو] (١) گزموولـه. (تیلـه خـاکی)(٢) جەنجەڕی ئاو هەڵکێشان له بیر؛ جەنجـەڕی کارێزهەڵکەن کە خوّلی بیری پـێ دەردێـنن. (چرخ چاه)
ئارمانج‌خواز: [ئاوەڵناو+ ناوبـک]هـوّگری بـه ئامانج گەیشتن. (آرمان گرا)
ئارمـانج‌خـوازی: [بـەرهـەمـی‌چاوگـه] تایبەتمەندیی ئارمانج‌خواز.(آرمان‌گرایی)
ئارمین : ئەهوەن؛ هێمن؛ ڕام کـراو؛ ڕام بـوو. (رام شده)
ئارن: [ناو] ئێسقانی شەویلکە. (آرواره)
ئاروار: [ناو] وشـتری یـەکساڵە. (شـتر یـک ساله)
ئاروان‌گرسکرن: [چاوگە،ت]بارئـاش‌لێکـردن؛ ئـاروان هـاڕین؛ دانـەوێڵـە هـووڕکردن (وردکردن) (آرد آسیاب کردن)
ئـاروانلوٚک: [نـاو،ت] لـوٚک؛ وشـتری نێـری چوارساڵە. (شترنر چهار ساله)
+ ئاروانە: [ناو]ئارد؛ ئار. (آرد)
+ ئاروانە: [ناو] وشتری مێوی چوارساڵە. (شتر ماده چهار ساله)
ئاروان هووڕکردن: [چاوگە،ت] بارئاش لێکردن. (بار گندم را آسیاب کردن)
ئارایی: [پاشگر] ڕازینەری؛ وەک: سفرەئارایی؛ سەفحەئـارایی؛ مـەجلیس‌ئـارایی. (پیـواژه : آرایی)

ئاروٚده: [ئاوەڵناو+ ] ژنی ماڵانگەڕ؛ تێوەتـلاو. (بدکاره)
ئاروٚک: [ناو]کفتـەی بـه بـرویٚش و گوٚشـت چێکراو. (کوفته با بلغور و گوشت)
ئـاڕوگوٚڕ: [نـاو،ت] ئـاڵوگـوٚڕ؛ گوٚڕینـەوه. (تعویض)
ئاروٚنه: لـه ئاوێسـتادا(ئـەواروٚنـه)هـەیـه بـه- واتای:لاڕێ؛ لەفارسـییدا(وارونـه)هـەیه‌بـه- واتای‌سەربەرەوخوار یا بەراوەژوو ؛ بوٚی‌هەیه- لەگەڵ ئاروٚنه؛ بەواتای لاڕێ وکەچ ڕەوی له ڕیشەیێک بن.(وارونه)
ئاروو: [ناو] (١) هارویٚ؛ خەیار. (خیار)
(٢) ئاسمانەی‌دەم؛ مەڵاشوو. (کام)
+ ئارووشـــک: [نـــاو] باوێشـــک؛ بایشـــک؛ باووشک، دەم‌کردنەوە خوٚ نـەخـواز لـەکـاتی بێتاقەتی و خەواڵوویيدا. (خمیازه)
ئارووشه: [ئاوەڵناو] (١) بزوٚز: سەربزێو؛ نائارام؛ بیٚئوٚقره. (نا آرام)(٢) [ناو] ئاروٚشه؛ شەویلکـه؛ لاجانگ. (آرواره)
ئارووک:[ناو] ئاریک؛(١) میچ. (سقف)(٢) [ناو]کفتەی بڕوێش و گوٚشت. (شامی کباب)
ئارویس: [ناو] وریس؛گوریس.(طناب ضخیم از مو)
ئـاروین: [نـاو] تاقیکردنـەوه؛ ئـەزمـوون؛ ئیمتیحان. (آزمون)
ئاره: [ناو] ئارد. (آرد)
ئارهایی: [ناو] (١) ژانێکی هـەمیشـەیـی لـه لەشدا. (آزار) (٢) تووشی دەردیسەری هاتن. (دچار دردسر شدن)
ئارەبانه: [ناو] ئەڕابە؛گاری. (ارابه)

+ ئارەزوو: [ناو] تاسە؛ بیر؛ دڵبۆچوون؛ ڤـین؛ ڤیان؛ حەز. (آرزو)
ئارەزوو بەدڵ مان: (ب)نامورادی. (ناکامی)
ئارەزوو بەگۆڕبردن: بەنامورادی مـردن. (آرزو به گور بردن)
ئارەزووکردن:[چاوگەی تێکەڵاو] ئیشـتیاکردن؛ ئارەزووی گـەیشـتن بـە دڵخـواز؛ مـەیـل و تامەزرۆیی کردن. (آرزو کردن)
ئارەزوو هاتنەدی: بەراوەردە بوونی ئـارە زوو؛ بە ئارەزوو گەیشتن. (اجابتآرزو)
ئارەزووی‌خاو:خەیاڵی‌خاو؛ ئارەزووی بێهـوودە. (آرزوی محال)
ئارەزووی دوورودرێژ: ئارەزووی درێژ خایـەن و دژوار. (آرزوی دور و دراز)
ئارەسە: ئافەرین. (آفرین)
ئارەش: [ناو] ئارەقە. (عرق تن)
+ ئارەق: [ناو] ئاموور؛ ئاقیلە؛ باسکێش؛ ئێرەقە؛ ئامبوور؛ ئێلەقە؛ ئەمبوور؛ ئاکیلە. (قطعه دراز خیش)
ئارەق پێکردن: [چاوگـە ،ت](۱ب) هـیلاک- کردن؛(۲) خەجاڵەت‌کردن. (کنایه از خسته یا شرمنده کردن)
ئارەق‌جۆش: [ناو،ت] ئارەق‌سـووت؛ زیپکـەی ورد بە هۆی تاولێدان و ئارەق‌کردنی پێسـتی لەشەوە. (عرق سوز؛ جوش زدن بعلت عـرق سوزشدن)
ئـارەقچـن: [نـاو،ت] (۱) بـەڕوولـە دارێکـە دەیکەن بەنێو کونی لووتی کەڵ یان وشـتردا بۆ ئارام‌کردنـەوە و ڕاکێشـانی. (مهارشـتر)(۲) کڵاوی ژێرمەندیل. (شب کلاه)
ئارەق‌چنیاو: [ناو،بەر] [ئاوەڵناو] (۱) کە سێک ئارەقی وشک بووبێتەوە. (خشک شدن عرق) (۲) (ب) لە کاردەرهاتوو. (کار آزموده)
ئارەق‌خۆر: [ئاوەڵناو،بک]کەسێک کـە ئـارەق دەخواتەوە؛ مەی‌خۆر. (عرق خور)
ئارەق‌خۆری:[ناو]کـاری ئـارەق‌خـۆر؛ مـەی- نۆشی. (عرق خوری)
+ ئارەق‌دەردان: [چاوگە،ت]ئارەق‌کردن؛ (۱) لەگەرمادا یا بە هیلاک‌بوون.(۲) لە شەرم و خەجاڵەت‌دا عارەقی شەرم دەردان. (عرق کردن)
ئارەق‌ڕژاندن: [چاوگە،ت](۱ب) زەحمەتی زۆر لە پێناوی کارێکا کێشان.(۲) ئارەق‌ڕشتن بـە هۆی هیلاکییەوە. (عرق ریختن)
ئـارەق‌سـووت: [نـاو،ت] ئـارەق‌سـووز؛ سووتانەوەی پێسـت بـە هـۆی ئـارەقـی زۆر کردن بە تایبەت لە ژێر باغەڵ و بەینـی ڕان، لە ئینسانی قەڵەودا ؛ یاسووتانی بەینـی پـای منداڵ لە بێشـکەدا بـە هـۆی میزکـردن بـە خۆیدا:. (عرق سوز)
ئارەق‌سـەگـی: [نـاو،ت] فـد: (ب)ئـارەقـی- کشمیش یا ئارە قی‌دەسـت‌سـازی هـەرزان- بایی.(عرق سگی)
ئارەق‌فـرۆش: [نـاو،ت] مـەی‌فـرۆش. (مـی فروش)
ئارەق‌کێشـان: [چاوگـە،ت]ئـارەق گـرتن لـە هەڵمی، کوڵاندنی هەندێ گیا یـا لـە میوەی گەڕاوە یا نیشاستەیێک کە بووە بەگۆڵۆکۆز و پاشان بە ئەڵکوڵ. (عرق گیری)
ئارەق‌کێشی: [بەرهەمی‌چاوگە] کاری

ئارەق دەرهێنان و ئارەق‌گرتن. (عرق کشی)
ئارەق‌گرتن: [چاوگە،ت] ئارەق‌کێشان. (عرق گرفتن)
+ ئارەقگیر: [ناو،ت] (١) ژێرکراس. (زیر پیراهن) (٢) جلی ژێر زین. (نمد زین) (٣) کاری کەسێک کە ئارەق دروست دەکا. (کسی کە عرق درست می کند)
ئارەقی‌جاترە: [ناو،ت] ئارەقیٚ‌کە لە نەعنای کێوی دەگیرێت و بۆ زگ‌ئێشە باشە.(عرق نعنا)
ئارەقی دار: [ناو،ت] ئارەقی‌چێو؛ ئارەقیٚ کە ئەسیدئەستیک و ئەلکۆلٚ‌میتیلیکی تێدایە و ژهراوییە و کەمیٚ پارافین و نەفتالین و فینۆلی تێدایە؛ خواردنی دەبێتە هۆی مەرگ یان کوێری. (الکل چوب)
ئارەقی ڕەش‌وشین دەردان: [چاوگە،ت] (ب) زۆر هیلاک بوون. (کنایە ازخستگی بسیار)
ئارەقی ڕەش‌وشین ڕشتن: [چاوگە،ت] ئارەقی‌ڕەش‌وشین‌کردن؛ یا دەردان (ب) زۆر هیلاک بوون. (کنایە از خستگی بسیار)
ئارەقی‌شاتەڕە: [ناو،ت] ئارەقیٚ‌کە لە شاتەڕە دەگیری و دەوای هەندیٚ نەخۆشینە(عرق‌شاترە)
ئارەگۆز: [ناو،ت] ئاڕوگۆڕ؛ ئالٚوگۆڕ. (تعویض)
ئارەمووک: [ناو] گامێشی نەنێر نەمێو. (گاومیش نەنر و نە مادە)
ئارەمەت: [ناو] داڕێژەر. (ریختە گر)
ئارمو: [ناو]عەرەب. (عرب)
ئارەوی: عەرەبی. (عربی)
+ ئاری: [ئاوەڵناو] گەورە؛ بەختیار؛ مەزن. (بزرگ)
+ئاریا: [ناو](١) بەشی سەرەکیی مێلۆدییێکی ئۆپێرایە. (قسمت آهنگین اپرا)(٢) دەنگی تاکە کەسی ئاواز لە ئۆپێرا دا. (آواز تک نفرە اپرا)(٣) مەڵبەندی ئاگر (جایگاە آتش) (٤)نە-تەوەی نیشتەجیٚ بووی کۆچەری سپی پێستەکانی هێند و ئوروپایی لە پەنای کێوی ئارارات(ئاگریداغ) و باکووری ئێراندا.(نژاد آریا)
ئاریایی: [ئاوەڵناو+ ناو] ئەو تیرەکە پەیوەندیان بە نیژادی ئاریاوە هەیە. (آریایی)
+ ئاریٚخ: [ناو] دارتار؛ دارێکی درێژە لە ئەرابە دا. (چوب بلند ارابە)
+ ئاریٚز: [ناو](١) تەپ؛ تەپۆلکی بەرز. (تپە)(٢) بەرێز؛ گەورە؛ مەزن.(بلند مرتبە)
ئاریش: [ناو]هۆش. (هوش)
ئاریشەن: (١)[ناو] لە ئاوێستادا هاتووە،ئاری: ئاگر+ شەن: ژیان]ئاوری ژیان (آتش و گرمی زندگی) (٢)[ئاوەڵناو] بەهۆش؛ بەورە. (باهوش)
ئاریک:ئارووک؛ میچ. (سقف)
ئاریکاریکردن:[چاوگە،ت]کۆمەک کردن.(کمک‌کردن)
ئاریکاری‌ویستن: [چاوگە،ت]کۆمەک خواستن.(کمک خواستن)
ئاڕین: هاڕین. (خرد کردن)
ئاڕین‌دار: [ناو،ت] ئالٚوودار؛ دەستەکی خانوو. (تیر چوبی سقف)
ئارینگ: [ناو]مەلٚاشو؛ مەلٚازە؛ ئاسمانەی دەم.

(سقف دهان)
ئارینەک: [ناو]ئاگاداری. (آگاهی)
+ ئاز: [ئـاوەڵنـاو+ نـاو](١) هێـز؛ وزە؛ سـاغ؛ قەوەت.(قدرت) (٢) ڕاست و دروست؛ سـادە؛ گورج و گۆڵ. (درستکار)(٣) [ئـاوەڵنـاو]دژوار؛ چەتوون؛ سەخت. (سخت؛ دشوار)
ئاز: [ناو]ف.مشە: (١)تەماح (٢)زیپکەی دەموچـاو؛ جوانـەزمـە.(١.آز.٢جـوش جـوانی-سروصورت)
+ ئازا: [ئـاوەڵنـاو]دلێـر؛ گـەڕنـاس؛ خـورت؛ بـەجورئـەت؛ شـێردڵ؛ خۆشـمێر؛ گوسـتاخ؛ بـەجـەرگ؛ چـاف سـوور؛ سـەلـەحشـوور؛ جەنگاوەر؛ بێباک؛ بەزات؛ ئەگیـد؛ مێرخـاس؛ ڕەند؛ بەجوربـوزە؛ مـەرد؛ دڵقـایم؛ لێهـاتوو؛ خێرا؛ ژێهاتی؛ زرینگ؛ گورجوگۆڵ لـەکـاردا؛ شـوجاع. (نتـرس. شـجاع.جنگاور؛سلحشـور؛ بیباک.)(٢)[ناو] لە(ئەعزای) ئارەویەوە هاتوە-تە نێو زمانی کوردی واتا: ئەندام؛ هەندێجار -واتای گشت، هەموو، دەدا وەک: ئـازای ئـە-ندامم دێشێ: هەموو ئەندامم دێشـێ.(اعضـا؛ همه) (٣) ساغ؛ بێعەیب؛ دژی پووچ: گوێزی ئازا. (سالم؛ بیعیب)
+ ئازاجەوت: [ناو.ت]توێخلی ژێرەوەی بەڕوو. (پوسته داخلی بلوط)
+ ئازاد: [نـاو، ئـاوەڵنـاو] فـد: (١) سـیفەتـی سـەوڵ: (سـەوڵـی ئـازاد) فـەزای ئـازادی ڕامیـاری؛ سـنوری ئـازاد، دووکـاژێر وەخـتم ئازادە؛ لە غەم ئازادم، شوغلی ئـازاد؛ هـەوای-ئازاد؛ سەری تەنافەکە ئازادە؛ چوونە نـاو ئـەو هۆڵە بۆ هەمووکەس ئازادە؛ لە زینـدان ئـازاد کرا؛ گەردنم ئازادکە؛ نێوی پیاوانە؛ ئـازادەرێ. (آزاد)(٢) ڕەها؛ وێڵ؛ بەرەڵا؛ سەربـە خـۆ.(ب) ئافرەتێ کە خۆی دانە پۆشێ
وشەرم نەکات لە ڕوو داپۆشین .(آزاد)
–ئازادبیری: [ناو] شێوەی بیرکردنەوە دوور لە باوەڕی سوننەتی یـان بـەرچاوتـەنگـی.(آزاد فکری؛ آزاد اندیشی)
–ئازادفکر: فد: [ئاوەڵناو]ئازادبیر. (آزاد اندیش)
ئازاد فکری: [ناو] ئازادبیری. (آزاد اندیشی)
ئازادە: فد: (١)[ئاوەڵناو] دوور لە هەر پەیوەندی و سەرشۆڕییەک لە بەرانبـەر هـەر جۆر ملهوڕێکـدا.(٢) دوور لـە تـەسـکبینـی؛ خاوەن ڕەوشتێکی جوامێرانە. (آزادە) (٣) سە-ربەستە. (آزاداست)
ئازادیخوازی: [بەرهەمی چاوگە] (١) ویسـتی کەسانێک کەئاواتەخوازن ژێر چەپۆکەی هیچ ملهوڕێـک نـەبـن.(٢)ویسـتی ئـازادی-خواز.(آزادیخواهی)
ئازادیکاتی: لە زیندان بەردانـی بـەنـدی بـۆ ماوەییەکی دیاریکراو. (آزادی موقت)
ئـازادیی مـاڵ و مـەسـکەن: فـد: مـافی هەڵبژاردنی مـاڵ وخـانوو، هـەروەهـا مـافی بەرگری لە وەژوور کەوتنی کەسـانی دیکـە. (حق انتخاب خانه ومسکن داشتن)
+ ئازار: فد: [ناو](١) ئەشـکەنجـە؛ دەرد؛ ژان؛ ئێش؛ ڕەنج؛ تاڵـاو؛ کـوێرەوەری؛ عـەزیـەت. (آزار) (٢) نەخۆشی. (مرض)
ئازاردەر:[ئاوەڵناو+ ناو.بک] فد: (١) داوخوازی ئازار پێگەیاندن؛ سادیست.

(آزارگر؛ سادیست) (۲) ئەشکەنجەگەر.
(شکنجه گر)
ئازارەباریکە: [ناو]سیل. (سل)
ئـازارەمریشــک: [نـاو،ت] دەردەمریشــک.
(مرض مرغ مانند نیو کاسل)
ئازاسـەر: [ئـاوەڵنـاو] سـەربـەسـت و ئـازاد؛
هەرزان. (آزاد؛ ارزان)
+ ئازایەتی: [ناو،بەرهەمی چاوگە]یە جـەرگـی؛
خورتی؛ بـێترسـی؛ جـوامێری؛ چاڤسـووری؛
پرکێشـی؛ زاتـداری؛ خێرایـی؛ گـورج‌وگـۆڵی
لەکاردا؛ لێهاتوویی. (دلیری؛ شجاعت)
ئازتەک: زبان و ئەندامگەلی قەومی
سوور پێستانی میکزیکی. (زبـان و اعضـای
قوم سرخ پوست مکزیکی)
ئازرگان: شاری ئەرزنجان. (ارزنجان)
ئـازرەنـگ: [نـاو] (۱) چـەخماخـە؛ بـەرقـی
هەورە تریشقە. (آذرخش)(۲) رەگـی ئـاورین؛
شوڵەی درێژی ئاور. (رگەآتش)
ئازمەند: [ئاوەڵناو] فد: ف.مشە: تـەمـەعکـار؛
تەماحکار (آزمند)
ئازنج: [ناو] خانووی بەردی یەکقاتی.
(خانه یک طبقه سنگی)
+ ئازوبەزە: [ناو،ت] دەین؛ ئازوبەزەت وەئـە-
ستۆم: دەینت وەئەستۆم. (دین.گناه)
ئازوگوێز: [ناو،ت]ئاڕوگۆڕ؛ گۆڕینەوە؛
گوازتنەوە لە جێگایێـک بـۆ جێگـایێکی تـر.
(نقل مکان.)
ئـازوەر: [ئـاوەڵنـاو]تـەماحکـار؛ زگبرســی؛
چاوبرسی؛ موحتاج. (آزمند)
ئازە: [جێناو] ئەو بۆ مێ. (او برای جنس ماده)

ئازەر: فد: [ناو](۱) ئاور ئاگر. (آتش)(۲)
ناوی سێهەم مانگی پاییزی ساڵی
هەتاوی. (آذر ماه)(۳) نـاوە بـۆ ژنـان. (نـامی
زنانه)
ئازەربایجان: فد؛ تد: [ناو] دوو هەرێمی
ڕۆژ ئاوای باکوور لە ئێران کە کورد و
تورک نشینە. (آذربایجان)
ئازەرمە: [ئاوەڵناو] لاو؛ جەحێڵ؛ گەنج؛ عازە-
و.(جوان)
ئازەرهۆشەنگ: لەقەمی ئەوەڵین پێغەمبـەری
پارسیەکانە کەناوی(مەهاباد،مـەئابـاد) بـووە.
(لقب‌اولین‌پیغمبرپارسیان‌است بنام مهاباد)
ئازەری: فد، تد: (۱)[ئاوەڵناو+ناو]
پێوەندیدار بە ئازەربایجانەوە. (آذر
بایجانی) (۳) ئازەربایجانی؛ جەماوەرێکی کە-
ونارا بوون کە لە ناوچەی ئازربایجان نیشـتە-
جێ بوون و زمانیان ئازەری بـوو لـە زەمـانی
مەغوولدا زمانیان تێکەڵ زمانی ئۆراڵ‌ئاڵتـایی
بووە و زمانی تورکیی لێ
پەیدابووە .(آذربایجانی)
ئازەریـن: فـد: (۱) لـە سـەخلـەتـابوون؛ لـە
ئازاردابوون، (۲)[ئاوەڵناو] ئاورین. (آذرین)
ئازەو: [ئـاوەڵنـاو]عـازەو؛ عـازەب؛ جـەحێـڵ.
(جوان)
ئازین: [ناو] دەستوور؛ شێوە. (متد؛ شیوه)
+ ئاژاڵ: [ناو](۱) ئاشغاڵ. (آشـغال)(۲) شـتی
بەکەڵک نـەهـاتوو و جـێگـر. (اسـباب بـی
ارزش)
ئاژک: [ناو] ئاژنگ؛ بادامەکێویلە. (بادام
کوهی)

ئاژکردن:>ئاژنکردن.
ئاژنکردن:[چاوگـه،ت](۱)ئـاژین کـردن. (آب بستن به مزرعه)(۲)بیرازکردنی بەرد یان هەر شت. (آجکاری)
ئاژنـگ: [نـاو] ئـاژک؛ بـادامی کێـوی.(بـادام کوهی)
ئاژنـە: [نـاو](۱) بنچکێکـی پڕسـاقەتـە بـۆ ئاخنینی سەر ڕۆچن.(بتەپرشـاخ و بـرگ) (۲) چیلکەپێکەبێخی ددانی پێ پاک دەکـەنـەوە. (خلال‌دندان)
(۳) توێزی پەڕۆ یا خـوری کـە زسـتانان لـە سەرکـونی ڕۆچـن دایـدەنـێن. (گلولـە ای از پارچە برای سرپوش درب روزنە پشت بام)
+ ئـاژنین:> ئـاژن‌کـردن؛ ئـاژن چاوگـەی کورتکراوەی (ئاژنین)ە. (خلاندن؛ خلالکردن)
ئـاژوان: [ناو؛بـک](۱)لێخـوڕێن.(رانـدن)(۲) لێخوڕ.(راننده)
ئاژۆتن: [چاوگە](۱) ڕادان؛ بڵاو بوونـەوەی ئـاژەڵ بـە دەشـت و سـەحـرادا. (پخش کردن)(۲)ئاژووتن؛ لێخوڕین؛ ژەنـدن. (راندن و تکان دادن)
ئاژۆتی: زەویی کێڵراو؛ شێوکراو. (زمین شخم زده)
ئاژۆدان: (۱)هەڵکوتانە سـەر. (حملـە بـردن) (۲)شەو لەوەڕی ئاژەڵ لە کێو(درشب چراندن گلە درصحرا)
ئـاژەڵـدار: [ئـاوەڵنـاو،+نـاو]خـاوەن ئاژەڵ؛حەیواندار.(گلە دار)
ئـاژیر: فـد: (۱)[نـاو] هۆشـیارکەر؛ دەنگـی خەبەردارکردنەوەی جەمـاوەر وەک: ئـاژیری (خەتەر؛ ئامبولانس؛ ئاورکوژ) (صـدای آژیـر) (۲)[ناو] ناوی کـەرەسـتەی هۆشـیار کـەر و ئاگادەر لە مەترسی. (آژیر) (۳) [ئاوەڵناو] ژیر؛ زیرەک؛ تێگەیشتوو؛ عەقڵدار.(عاقل.فهیم)
+ ئاژین: بەشـێنەیـی ئـاو کردنـە نـاو زەوی. (آبیاری کردن)
+ ئاسا: (۱) ئەو وەختـە؛ ئـەوکاتـە، ئـەوسـا. (آنوقت) (۲) ئاش. (آسـیاب)(۳)پاشـگر:وەک: مینا.(مانند)
+ ئاسار: [ناو] ئەم وشەیـە کـۆی(ئـەسـەر)ی فارسییە بە واتای باندۆر بەڵام وەکوو(مـوفرە-د)لە کوردیدا کەمتر بەکاردێـت و بـە شـێوە-ی(کۆ)لە ئارەوی وفارسییەوە وەرگیـراوە بـە واتای شوێنەوار و جێ‌پەنجە؛ کارگەلی هونە-ری کە دەخولقێت یان لە پاش کەسێک بـە-جێ دەمێنێ؛ ئاسەوار. (آثار)
ئاسارە: [ناو] ئەستێرە. (ستارە)
ئاسارەزلـە:[نـاو،ت] ئـەسـتێرەی ڕۆژ.(سـتارە صبحگاهی)
ئاسامی: فد: [ناو+ ئاوەڵناو](۱) خەڵکی ئاسام لە هێند. (اهل آسام) (۲) لقێ لە زبانی هێند و ئوروپایی. (زبان هند و اروپایی)
ئاسان‌بوون: [چاوگە،ت] ئاسانی؛ سـاکاربوون؛ هێسان بوون؛ ساناهی. (آسان‌بودن)
ئاسان‌بژیو: [ئاوەڵنـاو+ناوبـک]خـاوەن ژیـانی ساکار و سادە. (دارای زندگی سادە)
ئاسـانتی: زبـان و ئـەنـدامانی قـەومێکـی ئەفریقـایی ڕەش‌پۆسـتاڵ. (زبـان و اعضـای جماعتی‌ازنژاد سیاه پوستان آفریقایی)
ئاسانسۆر: فد؛ فرد: [ناو]ئامێری کارەبایی بـۆ

ئاو تاڵ: (ب) عارەق و شەڕاب. (آب تلخ)
ئاو تاڵ و سوێر: [ناو،ت] ئاوی تاڵ و سوێری خواردوتەوە: (ب) ڕەنج و عەزابی ڕۆژگاری- چەشتوە؛ بە مرۆڤی ئەزموون وەرگرتوو دەڵێن. (سرد و گرم چشیده)
ئاوتراش کردن: [چاوگە،ت]کڕاندنی هەندێ میوە بۆ هاتنە دەرەوەی ئاو؛ وەک کڕاندنی ناو لەتی شووتی. (آب تراشی)
ئاوترسی: [ناو]حاڵەتی،لە ئاو ترسان بەهۆی کێشانی بەنگ یا هاریەوە.آبترسی)
ئاو تەڵا: [ناو]ئاوی زێڕ. (آب طلا)
ئاوتێکردن: [چاوگە،ت] (١) پڕکردنی دەفر لە ئاو. (پرکردن ظرف ازآب) (٢) ئاو ڕژاندنی کاتی جووت بوون.(آب منی ریختن در جماع)
ئاو تێکەڕیای: [ئاوەڵناو] (١) ئاو تێکەڕاو؛ ئاو گرتنی دڵی لاوی تازە باڵق؛ ئاو گرتنی میوە، ئاڵوبوڵبوونی میوە. (آبدار شدن)
ئاو تێوەردان: [چاوگە،ت] ئاو پیادان؛ دوا ئاوکێشان پاش شتن. (آب کشیدن)
ئاوجۆسازی: [ناو،ت](١)کاری دروست کردنی ئاوجۆ. (کار درست کردن آبجو) (٢) کارگای دروستکردنی ئاوجۆ(بیرە). (کارخانە آبجوسازی)
ئاوجە: [ناو] هێوەرژن؛ ئاوجا. (جاری)
ئاوجەڕ: [ناو،ت] نشوستکردنی ئاوی زەریا بە هۆی گەڕانی زەوی بەرانبەر بە مانگ؛ نیشتاو؛ دژی بەرزاو. (جذر)
+ ئاوچاوسەندن: [چاوگە،ت]ئاوی چاو سەندن ڕام کردن بە هۆی ترساندنەوە؛ بۆ ڕام کردنی ورچ بە پێدانی خواردنی سوێر و ئاو پێنەدان لاواز و ڕامیان دەکرد.(آب چشم گرفتن)
+ ئاو چنین: (١) ئاوەچۆڕکردن. (آب گرفتن) (٢) ئاوی پۆڵا گرتن بە گەرمای زۆر بۆ نەرم بوونەوە. (آب کشیدن) (٣) ئاوی میوە گرتن. (آب میوە گرفتن)
ئاوچوون: [ناو](١) چوونە ئاو؛ قوماشێ کە بە شۆردن کورت بێتەوە. (آب رفتن) (٢) (ب) لەڕ و لاواز بوون. (لاغر شدن)
ئاوچوونە ژێرپێست: (ب) قەڵەو بوون. جوان بوون. (کنایە از چاق شدن)
ئاوخاکی: [ناو] اند، فد: پاپۆڕێک کە لەوشکی و بەحردا کەڵکی لێ وەر دەگیرێت؛ هاوێرکرافت. (هاورکرافت؛ آب خاکی)
+ ئاوخانە: [ناو،ت]کاسەی چکۆلەی ژێر لانکەی منداڵ. (آبریز گاه گهوارە)
ئاوخواردن: (١)[چاوگە،ت] کاری ئاو خواردنەوە. (آب خوردن) (٢) خەرج زۆر هەڵگرتنی کارێک؛ بۆ من زۆر ئاوی خواردەوە: خەرجی زۆر بوو. (گران تمام شد) (٣) زۆر ئاسان ئاسانە وەک ئاوی خواردن وایە. (مانند آب خوردن) (٤) ئاوی تایبەت بۆ خواردنەوە؛ شەربەیێک ئاوخواردنم بەپێ. (آب نوشیدنی)
+ ئاوخواردنەوە: (١)[چاوگە،ت] خواردنەوەی ئاو. (٢) واتای قوول بۆ قسەی ڕەق؛ ئەم قسە زۆر ئاو دەخواتەوە: زۆر بەری درێژە. (٣) ئاسانیی کار (وەک ئاو خواردنەوە ئاسانە). (٤) خەرجی زۆر هەڵگرتن. (آب خوردن)
ئاوخواز: [ئاوەڵناو] (١) ئاوکێش. (ب)

خواردەمەنی سوێر. (خـوردنی آب کـش) (٢) شت یا کەسێک، کە پێویستی بە ئاو هـەیـە؛ توونی؛ تینوو. (تشنه)
ئاوخۆرگە: [ناو،ت] جێگای ئاو خواردنی ئاژاڵ. (آبشخور)
+ ئاوخۆرە: [ناو]ئاسنێکی باریکە لە لـەغـاودا کە دەچێتە نێـو زاری ئـەسـب؛ دەمـاری دار. (آبخوره؛ آوند)
ئاوخۆرەی ئاوکێش:[ناو،ت] دەماری دار و گیا کە شیلەی پەروەردە لە گـەڵـاوە دەبـات بـۆ ساقەت و ئەندامی دار.(آوند آبی)
ئاوخۆرەی چێوی: [ناو،ت]دەمـاری دار و گیـا کە لە ڕیشەوە ئاو و ماکی پێویست دەگەیە-نێ بە گەڵای دار و گیا. (آوند چوبی)
ئاوخوێ:[ناو] تاواوەیخوێ لە ئاودا.(آبنمک)
+ ئاودار: [ئاوەڵناو+ ناو](١) تەڕ و پڕ لە ئاو(٢) (ب)جـەواهێـر و تێخــی جــەوهــەرداری خۆشڕەنگ و بە بریقە. (آبدار)
ئاو داخستن: [چاوگـە،ت](١) لـە شـێلەگـەوە بەری ئاو بەردان. (٢) ئـاو بـەردانـەوە سـەر مەزرا. (هدایت آب به مزرعه)
+ ئاو دادان: ئاو هاتنە دەر لەژێرگۆزە و دەفر؛ ئاو لێتکان؛ ئاو دەڵاندن؛ عەرزی بـۆش کـە زوو ئاو هەڵدەمژێت.(نشت آب)
ئاودارخانە: [ناو] قاوەخانـەیتایبـەتـی؛ چـای خانەیتایبەتی. (آبدارخانه)
ئـاودارچی:[نـاو]بـەڕێـوەبـەری ئاودارخانـە. قاوەچی. (آبدارچی)
ئاوداری:[ناو] ئاڤداری؛ حاڵەتی شـتی ئـاودار. (آبداری)

ئاوداگرتن: [چاوگە،ت]بوون بە ژێر ئاوەوە؛ ئاو بـە سـەردا کشـان؛ ئـاوی لافـاو هـەمـوو مەزراکەی داگرتووە. (آب همه جا را گرفتن)
+ ئاودان:[چاوگە،ت]بە کەرەستەی کارەبـایی و تیژاو زێڕ یا زێو یا هەرچی بە سەرکانزاییک داکێشان. (آبکاری)
+ ئاودانەوە: [چاوگە،ت](١) تێخـی سـوورەوە بوو خستنە ناو ئاو یاڕۆن بـۆ ڕەق بـوون.(٢) ڕوکێش‌کردنی کـانزا بـە زێـڕ یـا زێـو. (آب دادن)
+ئاودانەوە: [چاوگە،ت](١) وەک: ئاو دەردانی ماست؛[٢] رەحەتبوون. (آب دادن)
ئاوددان: [ئاوەڵناو] ئاودنان؛ هاوتەمەن. (هـم- سن‌وسال)
ئـاودل: [نـاو] ئـەول؛ کـورتکراوەی نـاوی عەبدوڵا؛ عەودل. (عبدل)
+ ئاوەردان: [چاوگە،ت](١) عارەقـە کـردن. (عرق کردن) (٢) ئاو هاتنەدەر لە هـەر شـت بە هۆی گوشین یـا گـەرم‌کـردن. (آب پـس دادن)(٣) ئـاوی چـاڵ یـا حـەوز خـاڵی- کردن.(تخلیه آب چاه یا حوض)
ئاودەرمـانی: [نـاو] عیلاجـی نـەخۆشـی بـە خواردنەوەی ئاوی زۆر. (آب درمانی)
ئاودەستخانە: [ناو]مستەراح. (مستراح)
ئاودەڵێن: [ئاوەڵناو،ناو] (١) هەر شت کە ئاوی لێ بتکێتـە دەرەوە. (هـر چیـزی کـە آب آن نشـت کنــد) (٢) درزی دەفــر. (شــکاف ظـرف)(٣) کـونی زۆر وردی دەفـر. (سـوراخ بسیار کوچک)
ئاودەم: [ناو](١) هاونشین؛ هـاودەم؛ دۆسـت؛

هـاواڵ. (همنشـین و همـدم)(٢) لیـک. (آب دهان)
ئاو دەماندن: ئاو لە زەویە کـە ئـاژین کـە بـا تەواو بیدەمێنیێ؛ ئاو مژینی زەوی؛ ئاوچەشتن. (آبیاری کامل.جذب آب)
ئـاودەنگـی: [نـاو]هـاودەنگـی؛ هـاوبیری؛ دۆستایەتی؛ نزیکی و هاودەمی؛ هاواڵی؛ هـاو قسەیی. (هم دلی. هم آوایی)
ئاو دیان: [ئاوەڵناو] هاوتەمەن. (همسال)
ئاودیدە:(١ب) بار هـاتوو؛ وەک پوڵـا ئاودیـدە بوون. (بـار آمـده)(٢).ئـاو دیـدە: تـەڕبـووگ. (خیس شده)(٣) ئاو لێکەوتوو.
(آب پاشیده شده) (۴)[ناو] ئاو چاو؛ ئاوی چاو؛ فرمێسک؛ ئەسرین. (آب دیده)
ئاوڕ: [ناو] ڕوخسار؛ ڕوو. (رخسار)
ئاوڕدانـــەوە: [چاوگـــە،ت]ڕوو تێکـــردن؛ لا لێکردنەوە. (برگشتن و نظاره کـردن) ئـاوڕا: [ناو]هاوڕیێ؛ هاوباوەڕ؛ هاوعـەقیـدە؛ هـاوبیر؛ هاومەرام. (همراه؛ همفکر)
ئاوڕایی: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە]هاوڕایی؛ هاوڕێیی؛ هابیری؛ هاو ئەندێشی. (همراهی و همفکری)
ئاورباران: [ناو،ت](ب) تیر ئەندازی زۆر تونـد. (ب) گەرمای زۆری ڕۆژ. (آتش باران)
ئاورباز: ئاگرباز؛ کەسێک کە بـە ئـاور یـاری دەکا. (آتش باز)
ئاوربڕکردن: [چاوگە،ت]کوژانـەوەی ئـاور بـە تەواوی. (بکلی خاموش کردن آتش)
ئاور بە پشت دەستەوەنان: (ب)تۆبە کردن لە دووپاتکردنەوەی‌کارێک؛ دەست داخکردن بۆ نەکردنی کارێک. (پشت دست داغ کردن)
ئاور بەردانـەوە: [چاوگـە،ت] ئاگربـەردانـەوە؛ کردنـەوەی ئـاور و ئـاگر تێبـەردان. (روشـن کردن آتش.)
ئاورتێبەربوون: [چاوگە،ت](١) گڕگرتن. (آتش گرفتن) (٢) (ب) ئوقرە لیێبڕان. (بی قراری)
ئاورتێبەردان: [چاوگە،ت] گڕتێخستن و ئـاور دان. (آتش زدن)
ئاورچەرخان: [ناو] تاوڵەمە.(آتش‌گردان)
ئاورخان: [ناو]ئاگرخان؛ ئارتوون. (آتشخان)
ئـاوردن: [کـار]هـاوردن؛ هێنـان؛ هـانین. (آوردن)
ئاوردەمێن: [ناو+ ناوی‌بـک] (١) مـەشـکەی مسگەری. (دمـه مسـگری)(٢) ئـاور دەمـێن کەسێک کە بەو مـەشـکە ئـاور دە دەمێنـیێ. (کسی کە مشک را بکار مـی بـرد) (٣) ئـاور گەشێن. (کسی کە آتش را گیرا می کند)
ئاوردەیویاگی: بەجیێهێنانەوە؛ بەجیێ هاوردن؛ بەجیێ هانین. (به جا آوردن)
ئاو ڕژان: (١)ڕژانی‌ئاو. (٢ب)توو تکـان. (آب- ریختن)
ئاو ڕژاندن: [چاوگە،ت](١) بەردانـەوەی ئـاو؛ ئاو فڕێدانی یەکسمی میێ. (آب ریخـتن) (٢) (ب) باو کردنی کارێک: گەورە ئاو دەرێژیێ و چکۆلە پای لێدەخات. (مدکردن)
ئاور ژێرکا: [ناو،ت](ب) نەرمەبڕە؛ کـەسـێک کە بە نەهێنی کاری خۆی دەکات. (آب زیـر کاه؛ حیله باز)
ئـاوڕژێن: [ناو،بـک] ئـەوەی کـەئـاو دە-

ڕێژی.(آبریز)
ئاوڕشـانن: [چاوگـە،ت]ئـاو ڕژانـدن. (آب ریختن)
ئاوکردنەوە: [چاوگە،ت](١) ئاور هـەڵکـردن؛ چێکردن و تەیار کردنی ئاور؛ ئاور ڤێخستن. (آتـش افـروزی)(٢) (ب) فیتنـە و شـەڕ هەڵایسان.(فتنه و آشوب بر پا کردن)
ئاورکەوتنەجەستە: [چاوگە،ت] بێئارام و بێئۆقرەبوون؛ حەجمان لێبـڕان؛ بـێهـەدا بوون؛ بێقەراربوون؛ نیگەرانبوون. (آتـش بـه جان افتادن)
ئاورکەوتنەگیان: [چاوگە،ت](ب) حـەجمـان لێبڕان؛ سرەوت نەمان. (آرام و قرار نداشتن)
ئاورگە: [ناو] جێگای ئاور. (جای آتش)
ئاورگەردان: [ناو] تاوڵەمە؛ تـۆڕێکی لـە سـیم چنراوی ناوچاڵە، دەسکێکی زنجیری هەیە بۆ زوخاڵ گەشاندنەوە. (آتش چرخان)
ئاورگەرم: [ئـاوەڵنـاو] (١) ڕژدبـوون لـەسـەر کارێـک. (مصـر و مصـمم)(٢) مرۆڤـی زۆر بەهەوەس. (آتشی مزاج)
ئاورلـەچاوبـارین: [چاوگـە،ت](ب) زۆر تووڕەبوون. (غضبناک شدن)
ئاورلەکایکـۆن بـەربـوون: (ب) مرۆڤـی بـە ساڵاچوو کە خەریکی دڵداری بێت. (کنایـه از عشق پیری)
ئاورۆچکە: [ناو] ئاگرۆچکـە؛ ئـاوری منـداڵان. (آتش بچه ها)
ئاورۆکە: ئاوری چکۆلە. (آتش کوچک)
ئـاوڕووبردن: [چاوگـە،ت]ئـابڕووبردن؛ ڕیسواکردن؛ ناو بە خراپە زڕاندن؛ سووکایەتی بە سەر هێنـان شـەقڵـی کچێنـی بـە نـاڕەوا شکاندن. (آبرو بردن)
ئاوڕوو چووانـدن: [چاوگـە،ت]ئـابڕوو بـردن. (آبرو بردن)
ئـاوڕووچووگ: [ئـاوەڵنـاو]ڕیسـوا؛ بـەدنـاو؛ ئـابڕووچوو؛ نـاو زڕاو؛ ئـابڕوو تکـاو؛ ئـابڕوو نەماگ؛ لەبواری دەستووری زمانەوە [نـاوی- بەرکارە] بەڵام بە واتا ئاوەڵناوە. (آبرو رفته)
ئاوڕوودار: [ئاوەڵنـاو] ئابڕوومـەنـد؛ بـەئـابڕوو؛ بەحەیا؛ (آبرومند)
ئاوڕووداری: [ناو](١) ئابڕووداری؛ بە ئابڕوویی؛ ژیانی شەرافەتمەندانە و بەسەربـەرزی. (٢) (ب) بـەرگـری لـە ئـابڕوو چـوون؛ قسـە خواردنەوە و لای بێگانە نەدرکاندنی هەنـدێ نهێنی کە بۆی هەیە ببێتە هۆی سەرشۆڕی؛ (ب) بەزڵە ڕوومـەت سـوور ڕاگـرتن. (آبـرو داری)
+ ئـاورە: [نـاو] (١) ئافـەتـی هـەوربردنـی زەرحاتی نۆک. (آفت نخود) (٢) زەردەزەخـم؛ زەردە برین. (زرد زخم)
ئاوڕەنگ: [ناو] جۆرێک ڕەنگی وێنەگەری کە بە ئاو دەگیرێتەوە. (آبرنگ)
ئاوڕێژ: [ناو](١)تاڤگە. (آبشار)(٢)[ناو،بک ]ئـاو ڕێژ، کەسێک کە ئاو دەڕێژێ. (آبریز)
ئاوری ژێرکا: [ناو،ت] (ب) نەرمەبڕە؛ حیڵەباز؛ ئەو کەسە بە نەهێنـی کـاری خـۆی دەکـا. (آتش زیر کاه؛ آب زیر کاه)
ئاوڕێژگە: [ناو] تاڤگە. (آبشار)
ئاوڕیشبوون: (١) دەستەویەخەبـوون؛ بـەگـژ یەکتردا چوون؛ تێکگیران. (دعوا و مرافعـە-

کردن)(٢) هاوتەمەن بوون (هم سن)

ئاورێشم‌باف: [ناو،بک] کەسێک کە کاری چنینی قوماشی ئاورێشمە. (ابریشم باف)

ئاورێشم‌بافی: [چاوگە،ت](١) کاری ئاورێشم باف. (٢)[ناو] کارگای چنینی قوماشی ئاورێشمی. (ابریشم بافی)

ئاورێشم‌چن: [ناو،بک]گوڵدۆزی بە ئاورێشم دەکا؛ کاری چنین بە ئاورێشم. (ابریشم دوز)

ئاورێشم چنین: [چاوگە،ت]گوڵدۆزی بە ئاورێشم. (ابریشم دوزی)

ئاورێشمی: [ئاوەڵناو] هەورێشمین؛ لە جنسی ئاورێشم. (ابریشمی)

ئاوریل: [ناو] ئاپریل؛ مانگی چوارەمی ساڵی زایینی. (آوریل)

ئاورێیی: [ناو،بەرهەمی چاوگە] هاورێیی؛برایەتی؛کۆمەک و یاری؛ ئاریکاری؛ یارمەتی. هاومەڕامی. (همراهی)

ئاوزا: (١)هاواڵ؛ هاوتەمەن؛(٢) ئاوزاچاوم: چاوم پڕبوو لە ئاو؛ زا: ڕابووردووی (زایین)ە بە هەموو مانایێکەوە.) زۆنگ‌بوو؛ ئاوی تێزا. (همسن؛ پراشک‌شدن چشم)

ئاوزاینەچاو: چاو لە ئەسرین پڕبوون ؛ ئاو لە چاوا قەتیس بوون.(جمع‌شدن اشک‌درچشم)

ئاوزاینەدەم: بە هۆی دیتنی خۆراکێکی خۆشەوە؛ ئاو لەزارگەڕان؛ (ب) تامەزرۆ بوون. (دهان‌آب‌افتادن)

ئاوزەنگی‌تەقێن: [بەند،ت](ب) بەخێرایی؛ لە تاودانی وڵاخ و چارەوا؛ چوارناڵ؛ تاودانی ئەسپ؛ ڕکێف کوت. (اشاره بە چهار نعل تاختن)

ئاوزەنگی‌دار: [ئاوەڵناو] بەپێی ئەو کەسانەدەڵێن‌کە ژێر پایان چاڵە.(کف‌پای- کسانیکه‌گودباشد)

ئاوزەنگی‌کوت: [بەند،ت] ڕکێف‌کوت؛ (ب) چوارناڵ و بەغار لێخوڕینی ئەسب. (چهار نعل)

ئاوزەنگی‌لێدان: [چاوگە،ت] لێخوڕینی وڵاغی بە زین و بەرگ بە ڕکێف تێکوتان. (رکاب زدن)

+ ئاوزیاگ: [ئاوەڵناو] تێگەیشتوو؛ عاقڵ؛ بەئاوەز؛ ژیر. (عاقل)

ئاوزینە: [ناو] ئافزوونە؛ ئاڵقەزوونە. (سگک)

ئاوزینی: [ناو] هاوشانی؛ هاواڵی؛ هاوتەمەنی؛ هاوسەنگی. (هم شان)

+ ئاوس:[ئاوەڵناو]هاوس؛ دووگیان؛ زگپڕ؛ تلدار؛ تۆڵدار؛ بەزگ؛ زگدار؛ بەتێشت. (آبستن)

ئاوساندن: [چاوگە،ت]هەڵمساندن؛ پەنماندن؛ ئەستوور کردن؛ماساندن؛ وەرماندن. (پربادکردن)

ئاوساڵ: تەڕەساڵ. (آبسال)

ئاوسانە: (١)[ناو]ئەوسانە؛ ئەفسانە؛ چیرۆک؛ حەکایەت. (افسانە. قصە)(٢) وەک ئاوس؛ ئاوس ئاسا؛ (بسان آبستن)

ئاو سەرکەفتن: [چاوگە،ت]سەرکەوتنی ئاو؛ ئاو بە سەردا گەڕان و داگرتنی زەوی یا جێگایێک؛ ئاو بە سەر جێگایێکدا کشان.(بالاآمدن‌آب)

ئاوسەرکەم: [ئاوەڵناو] هەژار؛ دەستکورت؛ فەقیر؛ بێ ئەنوا؛ هەژێر. هاوسەرکەم؛ کەمدەست؛ ژار؛ ئاتاج؛ موحتاج؛ کەمتر لە

ماڵەجیران و دراوسێ. (محتاج)
ئاوسێ: [ئاوەڵناو+ ناو]جیران؛ جینار؛ دراوسێ. (همسایه)
ئاوشار: [ناو] تاڤگە. (آبشار)
ئاوشانی: [ناو] هاوکووفی؛ ئاوکووفی؛ هاوشانی؛ هاوسەنگی؛ بەرانبەری. (هم شانی)
ئاوشۆر: [ناو] ئاو شوران؛ ناوی چۆمێ لە کرماشان. (رودخانه آبشوران)
ئاوشە: [ناو] شەونم؛ ئاونگ؛ خوو؛ خوناوە؛ (شبنم)
ئاوفڕێدان:[چاوگە،ت]ئاوفڕێدانی مایین لە وەختی جووت خوازیدا. (ب) وەک جوین بە ئافرەتی سووک دەوترا. (آب ریختن مادیان در حال فحل)
+ ئاوقا: [ناو، ] (١) تووش؛ دووچار؛ ئەم نەخۆشینەم ئاوقا بووە. (دامنگیر)(٢) هێرش؛(ڕۆژ باشم ئەکرد لەکولم و لێوی، ئاوقایی دەمم بوو سەبرێ گەستم) «تووری» (حمله)
ئاوقاکردن: [چاوگە،ت](١) ئاراستەکردن؛ بۆخستن؛ بەرد و گوللە و دار تێگرتن. (چیزی را رو بە کسی انداختن)(٢) تووشکردن؛ هەڵامەتی گرت، ئاوقای (تووشی) منیشی کرد. (مبتلا کردن)(٣) هاندان بۆ شەڕ یان هێرش پێبردن؛ سەگەکەی ئاوقا کرد. (وادار به حمله)
ئاوقۆرەگرتن: [چاوگە،ت](١) ئاو لە قۆرەگرتن بە گۆشین(گوشین) یا بە ئاو میوەگیری.(آبغوره گرفتن) (٢ب) فرمێسک وەراندن. (اشک ریختن)
ئاوقەد: [ئاوەڵناو] هاوقەد؛ بەقەد؛ هاوئەندازە. (هم قد)
ئاوقەرا: [ئاوەڵناو] بەقەد یەک؛ هاوتا؛ هاوپایە؛ هاوسەنگ؛ هاوشان. (همتا)
+ ئاوکردن: [چاوگە،ت](١) تاواندنەوە؛ قاڵ-کردن؛ ئاتیواندن. (ذوب کردن)(٢) (ب) فرۆشی ماڵی خراپ و لە سەردەست ماو؛ فرۆشتن؛ لەبازاڕ شتەکانم ئاوکرد. (فروختن)
ئاوکردنەژێر: (ب) جێگای کەسێک لێژکردن و بەرە بەرە دەرکردنی لە شوێنێک. (کنایه از بیرون کردن)
ئاوکوڵاتگ: [ناو،ت] ئاوی کوڵاتوو؛ ئاویداخ؛ ئاوێ کە داخ کرابێ. (آب داغ)
ئاوکووف: [ئاوەڵناو] هاوشان؛ هاوتەراز.(هم-شان)
ئاوکە: [ناو]جۆرێک ترێ. (نوعی انگور)
ئاوکێشان: [چاوگە،ت](١) ئاو هەڵگرتن و بردن بۆ شوێنێکیتر. (آب از جایی به جایی بردن) (٢) ئاو دزینی برین. (آب آوردن زخم) (٣) ئاوی جێگایێک یا حەوزێک دەردان. (آب حوض یا چاه کشیدن)(٤) ئاو تێوەردان پاش شتن. (آب کشیدن) بەجۆگە یان بۆڕی ئاوکێشان بۆ شوێنێک.(بەوسیلەجوی یا لوله آبکشیدن)
+ ئاوکێشی: [ناو،بەرهەمی چاوگە] ئاو تێوە-ردانی پاش شتن. (آبکشی)
ئاوگر: [ناو] (١) جێگەی چاڵ. (جای پست) (٢) زەوینی بەر سێڵاو.(زمین در مسیرسیل) > ئاوگیر
+ ئاوگرتن: [چاوگە،ت](١) کاری ئاوکێشان

له میوه به گوشین یان ئاو میوه‌گیری. (آب میوه گرفتن)(۲) ئاڵ‌وبۆڵ بوونی میوه. (میوه نزدیک به رسیدن و آب گرفتن میوه) (۳) (ب) ئەوەڵی لاویەتی و دڵ ئاوگرتن. (کنایه از اوایل جوانی) (۴) گونجەی ئەستێر بەستن له لایەن کەسێکەوه که نۆره ئاویەتی. (بستن آب استخر)(۵) لە قەدیمدا پاشەکەوت-کردنی‌ئاو؛ عەمباراو پڕکردن له ئاو. (پرکردن آب انبار)

ئاوگەرم: (۱) گڕاو؛ کانیاوی‌گەرم.(چشمه آب گرم) (۲)ئاوی داخ و کوڵاتوو.(آب داغ)

ئاوگەرمکەر: [ناو،بک] ئەوەی ئاوگەرم دەکا؛ کەرەستەی گەرم کردنی ئاو؛ دێئـوتێرم. (آب گرمکن)

ئاوگەز: [ناو،ت] چرزانی تەڕەکاڵ لە باردا. (زده دار و خراب شدن میوه)

ئاوگەڵە: ئاژاڵێ که بچێته ناو هەر مێگەلێک، هەست به نامۆیی نەکات. (بزوگوسفندیکه داخل هرگله ای بشود ئاوگەڵی ئازاد: [ناو] ئەو بەحرانه که له ژێر باندۆری دەسەڵاتی دەوڵەتگەلێکی تایبەتدان. (آبهای آزاد)

ئاولک:[ناو] تۆقڵەی ناو دەست و پێ به هۆی کاری زۆرپێکردن. (تاول)

ئاو لووت: [ناو،ت]ئاوی‌کەپۆ؛ئاوی لووت. (آبدماغ)

ئاو لەئاشی‌دوژمن‌کردن:(ب) بە سوودی دوژمن کارکردن.(به سود دشمن‌کارکردن)

ئاو لەئاشی‌کەسێک‌کردن: (ب) کۆمەک پێکردن؛ کردنی‌کارێک که بەرژەوەندیی کە-سێکی‌تری تێدابێ.آب‌بەآسیاب‌کسی‌ریختن)

ئاو له ئاونداکوتان:(ب)کاری بێ‌سوودکردن؛ (آب درهاون کوبیدن)

ئاو لەئاوەڕۆ دەرکردن: (۱) (ب) زۆر بێ حەیایی‌کردن. (بی حیایی)(۲) له حەد بەدەر؛ له سنووری شەرم و حەیا دەرچوون. (از حد گذشتن)

ئاو له بەر ڕۆیشتن: (۱) ئاو لێچوون؛ ئاو دە-ڵاندن. (نشت) (۲) سەرڕێژی‌ئەستێری لیپاولیپ پڕ له ئاو. (سر ریز)

ئاو لەجێ‌ماڵ‌دەرهێنان: (ب) ماڵی کەسێ خاپوورکردن؛ بەڵای زۆر بەسەر هێنان؛ نابووت‌کردن (ئاو لە جێ‌ماڵ نان). (خانه کسی را ویران کردن)

ئاو له چاوانه لێل‌بوون: ئاو له سەر چاوەلێل-بوون؛ (۱) (ب) ناڵەباری کارێک له بنەڕەتدا. (۲) (ب) سەرچاوه و ئەساسی کارێک لە لایەن گەورەترین مەقامەوه گەندەڵ-بوون.(آب از چشمه گل آلود بودن)

ئاو له دەس نەتکان: (ب) کاری مرۆڤی ڕژد و خەسیس. (خسیس)

ئاوڵەڕوو: [ئاوەڵناو] گڕوێ؛ کەسێک کە دەموچاوی چاڵ‌وچۆڵی هاوڵەی پێوه دیاره. (آبله رو)

ئاوڵەفەڕەنگی: [ناو]دوا پلەی نەخۆشینی هاڵه، سفلیس. (سفلیس)

ئاوڵەمورغان: [ناو] نەخۆشینی دەرکردنی زیپکەی سوور سوور؛ وشەیێکی فارسییه و هەر بەو ناوەیش لە کوردی دا دەوترێت. (آبله مرغان)

ئاوڵەکوتان: [چاوگە،ت]سێرۆمی هاوڵه له

سەرپێست دانان و دەرزی ئاژن کردن وکراندنی بە نەشتەر بۆ بەرگری لە هاوڵە.(آبلەکوبی)

ئاو لەکونەمێرولەکردن: (ب) هەژاندنی جەماوەر و پشێوە دروست‌کردن؛ وەک چیلکە لە کونی هەنگەژاڵە ڕۆکردن.(شوراندن مردم)

ئاوڵەگایانە: [ناو] خورۆکەی گا؛ هاوڵەیێک کە لە سەرگوانی مانگا پەیدا دەبێ.(آبلە گاوی)

ئاو لەگیلفان (گیرفان) وەردان:(ب) گیلفان خاڵیکردن و پارە تیا نەهێشتن.(کنایە از جیب خالی کردن)

ئاو لەلچ هاتنەخوار: (١) لیک‌چاندن. (٢) (ب) زۆر بەتامەزرۆ و بەهەوەس کەوتن بۆ خواردەمەنییێک. (آب از لب سرازیر شدن)

ئاو لەمشتنەتکان: (ب) ڕژدی؛ چکووسی؛ خەسیسی؛ دەست‌قووچاوی؛ چاوچنۆکی.(کنایە از خسیس)

ئاولێل‌کردن: [چاوگە،ت](ب) ئاژاوە دروستکردن.(آب را گل آلود کردن)

ئاولێل‌نەکردن: [چاوگە،ت] (ب) ئەرخەیان بوون و جێی‌باوەڕ؛ بەیەقین؛ ئەوندە پیاوی چاکە ئاولێل‌ناکات.(کنایە از جای اعتماد واطمینان)

ئاولیمۆ: [ناو] ئاوی لیمۆ؛ (ب) ئاوی لیمۆترش.(آبلیمو)

ئاومژین: [چاوگە،ت]ئاو هەڵمژین؛ کوتاڵ ئاو هەڵدەمژێ؛ زەوی ئاوی هەڵمژی؛ ئاوی ئەو هەنارە بمژە.(جذب آب؛ پارچە یازمین کە آب جذب کند)

+ ئاومل: [ئاوەڵناو] هاوجووت؛ لفی‌گاجووت؛ هاونیر؛ وەک دوو ئەسپی دروشکە(جفت حیوان برای کشیدن ارابە و درشکە)

ئاومیوە:> ئاوی میوە.

ئاومیوەگر: [ناوبک و ناو] (١) کاری کەسێک کەئاوی میوە دەگرێت.(٢)[ناو] کەرەستەی ئاوی میوە گرتن(آب میوە گیر)

ئاونگ و دەستە: [ناو] ئاوان و دەستە؛کەرەستەی کوتان و وردکردن.(هاون و دستە)

ئاونگە: [ناو] (١) ئاونگ؛ شەونم.(شبنم) (٢) ئاونگی ژێر دەستە بۆ کوتانی شتی ئاشپەزخانە(مدبەق).(هاون)

ئاونگی: [ناو] (١) ئاونگ؛ تریێ‌تۆپیگ؛ مێلاق.(انگورآویزان‌شدەباطناب) (٢) شەونم.(شبنم)

ئاونوما: [ناو،ت] (١) تاقگەی دەستکرد.(آب نما) (٢) چاوانەی کارێز.(دهانە کاریز)

ئاونەبات: [ناو،] شەکروکە؛ جۆرێک‌نوقوڵ.(آبنبات)

ئاونەبات‌چێوی: [ناو،ت] ئاونەباتێ کە کلکێکی چووکەی چێوی پێوەیە و منداڵ دەی مژن. مژمژۆکە.(آب نبات چوبی)

ئاونەباتی ترش‌وشیرین: [ناو،ت] ئاونەباتی مەیخۆش؛ ئاونەباتی‌کەهەندێ ماکی ترشی لێدراوە(آب نبات میخوش)

ئاو نەباتی‌کێشدار: [ناو،ت] ئاونەباتێک کە بەددان دا دەچەسپێ و کێشی‌دێ.(آب نبات کشی)

ئاو نەچوونەناوجۆگەیێک: (ب) ناسازگاری؛ پێک نەهاتن.(آب توی یک جوی نرفتن. کنایە از عدم توافق)

ئاونەدیدە: [ناو] شتیٚ کەئاوی لیٚنەکەوتبیٚت؛ ئاهەکی‌ئاو نەدیدە؛ قوماشی‌ئاونـە دیـدە؛ ئـاو نەدیتوو؛ ئاو لیٚنەکەوتوو. (آب ندیده)
ئاو وئاڵف: [ناو،ت] (١) (ب) ڕۆزی و نیعمەت؛ ماڵ و دارایـی. (روزی)(٢) ئـاو و گیـا. (آب و گیاه)
ئاو وخاک: [ناو،ت] سەرزەمین؛ (ب) وەتـەن؛ نیشتمان. (آب و خاک)
ئاووڕەنگ: [ناو،ت] (ب) دیمەنی جوانی تەڕ و تازەی ڕوخسار. (آب و رنگ)
ئاووش: [ناو] باوەش؛ ئامیٚز. (آغوش)
+ ئاووگڵ: [ناو،ت] (١)حەری و قـوڕ. (گـل و شـل) (٢) (ب) کـوڕەکـان لـە ئـاو وگـڵ دەرهاتوون و گەورەبوون(بووگن) و لـە خـەم ڕەخسیون. (بزرگ شدن بچـه)(٣) نـەسـەق، من لەم شارە حەقی ئاو وگڵم هەیە. (حق آب و گل داشتن) (۴) جیٚگەی مردن و ناشـتن و خاک بەقسمەت‌بوون، ئاو و گل هەڵـی‌گـرتم هیٚنامی بۆ ئیٚرە. (خاک‌قسمت شدن)
ئاوهاویٚژ: [ناو،بک] فوارە؛ ئاوهۆڕشان. (فواره)
ئاوەچۆڕ: [ناو،ت](١) چۆڕاندنی ئـاو لـە شـتی تەڕ تا دوا دڵـۆپ. (٢) تکـان و تـەواو بـوونی ئاوی شتی تەڕ(آب چلاندن)
ئاوەچۆڕبوون:[چاوگە،ت] چـۆڕایی هـاتن؛ دوا دڵۆپ تکانی ئاوی شتی تەڕ. (ریختن آخرین- قطره آب از چیز تر)
ئاوەچۆڕکردن: [چاوگە،ت]ئاو چنین وچـۆڕایی پیٚ هیٚنانی ئاو لە شتی تەڕ بە هەڵواسـین یـا گووشین. (آب گرفتن)
ئاوەچەما: [ناو] ئاوی چاو؛ فرمیٚسک؛ ڕوندک؛ ئە سرین. (آب چشم)
+ ئاوەخانە: [ناو] ئاوخانە؛ دەفریٚکـی بچـوک بە بن بیٚشکەی منداڵەوە بۆ تیٚچـونی میـزی منداڵ. (جای پیش آب بچه در گهواره)
ئاوەدانکەر: [ناو،بـک] ئاڤاکـەر؛ کـەسـیٚ کـە کاری ئاوەدان‌کردنە. (آبادگر)
ئاوەر: (١) هاوەر؛ [پاشگر] ناوئاوەر: دارای ناو؛ جەنگاوەر: شەڕانـی؛ دڵـاوەر: پـڕدڵ؛ (پسـوند آور)(٢) کەسیٚک کە دەهیٚنیٚ؛(نان ئاوەر: نان- هاوەر؛نان‌هیٚنەر) (آورنده)
+ ئاوەڕۆ: [ناو،ت] بەرزترین جیٚگـەی کیٚـو و تەپۆلک کە ئاوی باران نیوەی بەو لاو نیوەی بەم لادا بیٚتەخوار؛ سەرووی دیـرەگ. (خـط الراس)(٢) لیٚژایی سەربان ڕوو بە پلووسـک. (آبریز)(٣) جیٚگـای دامـەزرانـدنی پلووسـک. (آبریز) (۴) گونجەی ڕیٚگای ئاو پیـا ڕۆیشـتن لە حەوز یا ئەستیٚردا. (آبراهه)
ئاوەڕۆگە: [ناو] ئاوەڕۆ. (آبراهه)
ئاوەژووکردنەوە: [چاوگـە،ت] هـەڵگیٚڕانـەوە. سەرەو نخوون کردنەوە(برگرداندن و پشت‌و روکردن
ئاوەژی: [ئاوەڵناو] گیانداری ئاوی. (آبزی)
ئـاوەسـتیٚ: [نـاو] مـووچیٚچی قـۆڵی کـراس؛ جۆریٚک سۆرانی؛ مەچـەکپـیٚچ؛ ئـەنگوچـک؛ فەقیٚیانە. (دنباله آستین)
+ ئاوە سـوو: [ئـاوەڵناو،بـەر] (١) ئـاوەسـوود؛ جلکیٚ کە لە ئاودا سووابیٚ واتـا زۆرمابیٚتــەوە؛ چڵک مەردە(مردە). (چرکی که جـذب شـده) (٢) (ب) ڕوو داماڵاو. (بی حیا)
+ ئاوەشکیٚنە: [ناو] شیٚلەگە(جای‌تغییر مسـیر

آب)
+ ئاوەشی: [ناو] بارێزە؛ میوەی لە دار کەوتوو (وەریو). (میوه نارس از درخت افتاده)
+ ئاوەکولْ: [ناو] (ب) ناخۆشی؛ بێدرەتانی؛ لێقەوماوی؛ ڕۆژەڕەشی.(سیه روزی)
ئاوەکی‌بوون: > ئاوەکی‌کەوتن
ئاوەکی‌کەوتن: [چاوگە،ت]ئاوارە و سەرگەردان‌بوون لە غوربەت. (آواره در غربت)
ئاوەگل: [ناو] گڵاو؛ پیس؛ سپلۆت. (نجس)
ئاوەگل‌کردن: [چاوگە،ت]حەوت ئاو(حەوتاو) کردنی شتی گڵاو بە گڵەسوورە و ئاو؛ حەوت ئاوکردن. (نجسی درکردن)
ئاوەگی: [ناو] ئاوایی؛ دێ؛ گوند. (آبادی. قریه)
+ ئاوەل: [ناو]ئەو گیایە پێش بەهار لە دەم جۆگەدەڕوێ. (اولین رویش گیاه لب جوی آب در بهار)
ئاوەڵچنە: [ناوبک] ئاو هەڵچنە؛ کاغەزی جەوهەرکێش.(جوهر خشک کن)
ئاوەڵدووانە: [ئاوەڵناو] لفەدووانە. (دوقلو)
ئاوەڵکار: بەند، (لەزانستی دەستووری زباندا).(قید)
ئاوەڵمندالْ: [ناو] پەڕەولْ؛ پزدان. (پرده پوششی جنین هنگام تولد؛ جفت)
ئاوەند: [ناو](١)ئاوەنگ؛ ئاونگ؛ بەند و ڕێسمانی مێلاق.(آونگ)(٢)بەڵگە و بورهان؛ حەجەت. (دلیل؛برهان) (٣) دوو جۆر ڕەگە لە ساقەتی ڕووەکدا.(آوند)
ئاوەندی‌ئاوکێش: [ناو،ت] ئاوخورەی ئاوکێش، لوولەیێکی باریکەلەئەندامی‌گیا و داردا کەشیرەی‌پەروەردە لە گەڵاوە دەبا بۆ ئەندامگەلی ڕووەک.(آوندآبکش)
ئاوەندی‌چێوی:[ناو،ت] ناونێرک، لوولەی باریکی‌ناو ئەندامی ڕووەک کە ماکگەلی پێویستی ژیان لە ڕیشەوە دەگەیێنێتە گە-ڵای‌ڕووەک. (آوندچوبی)
ئاوەن و دەستە: [ناو]کەرەستەی کوتانی شتی پێویستی ئاشپەزخانە. (هاون و دسته)
ئاوەن و ڕەوەن: [ناو،ت] هاتوچۆی زۆر؛ (ب) ماڵێ کە میوانی زۆری بۆ بێ. (آمد و رفت زیاد)
ئاوەنووس: [ناو] داری ئابنووس. (آبنوس)
ئاوەنە: [ناو] ئاوێنە؛ قودیک. (آئینه؛جام)
+ ئاوەنیا: [ناو]کوڕی هاوسەر لە مێردی پێشووی. (پسرهمسر از شوهر قبلی)
ئاو هۆرشان: [ناو] ئاو هاوێژ؛ فووارە. (فواره)
ئاو هەڵچن: [ناوبک] ئاو چن؛ وشک‌کەرەوە؛ ئاو هەڵمژ. (خشک کن)
ئاو هەڵگوێزان: [چاوگە،ت](١) ئاو لە حەوز یان بیر دەرهێنان. (٢) ئاولە دەفریا هەر شت هەڵینجان. (آب کشیدن)
ئاویاری بارانی: [ناو] ئاوداشتن بە لوولە (بۆڕی) و پرشاندنی بە تەوژم بە سەر مەزرا دا بە شێوەی باران. (آبیاری بارانی)
ئاویاری دڵۆپەیی: [ناو،ت] ئاوکردنە بن هەر دار و بنچکێک بە بۆڕی‌و لوولە بە شێوەی دڵۆپە. (آبیاری قطره ای)
ئاوی‌باتری: [ناو،ت]تراوی تیزاوی سولفوریک. ئیلیکترۆلیتی باتری تەڕ. (آب

باطری)
ئاوی بیٚ‌لەغاو خواردنەوە: (ب) بار هـاتن بـە مەیلی خوٚ؛ کەسێک کە سەرگری و بەرگری لێنەکرابێت.(کنایە،زندگی‌بدون سختگیری)
ئاوی‌پاک: [ناو،ت] ئاوێک کـە شـتی پیسـی تیدا نەبێت؛ ئاوی‌پاکی بە دەسـتداکردن: (ب) هومێد لەکەسێک بڕین. (آب پاک)
ئاوی‌پاکی: (١) دوا هەمین ئاوی ئاو تێوەردان و ئاوکێشانی شـتی شـوٚراو. (٢) ئـاوی پـاکی کردبـە دەسـتیدا (ب) ئـەرخـەیـانی‌کـرد و یەکجاری ناهومێدی کرد؛ (آب پاکی)
ئـاوی پـڕژ: [نـاو]تاڤگـە؛ سـوولاڤ؛(سـوو) تورکییە واتا: ئاو. (آبشار)
ئاویی پیروٚزەیی: [ناو،ت] لـە تێکـەل‌کردنـی ڕەنگی شینی زوٚر ئـاخج و سـەوزی ئـاخج و سپی، یان لە سـپی و شـین و زەرد پێکـدێ. (آبی فیروزه ای)
ئاوی‌تاچنوٚ: ئاو دەدەلێنی.(آب‌نشت میکند)
ئاوی‌تـالٚ: [نـاو،ت] ئـاویٚ‌کـە تـال‌بـیٚ؛ (ب) شەڕاب و عارەق. (آب تلخ)
ئاوی تـالٚ‌و سـوێر خواردنـەوە: (ب) ڕەنـج و عـەزاب کێشـان؛ تـالٚی و سـوێری ژیـان چەشتن.(رنج وعذاب کشیدن)
ئـاوێتن‌سـەر: [چاوگـە،ت] بـەسـەرهێنـان؛ بەسەردا سەپاندن؛ بـەسـەردا سـاخ‌کردنـەوە. (بسر آوردن)
ئاوی‌توٚبە: [ناو،ت]ئاویٚ کە بەنیەتی توٚبـە بـە سەردا دەکرێت؛ بوٚ ژنی خراپەکار کە توٚبە بکا دەگوترێت(لە هەندیٚ مەزهەبدا). (آب توبه)
+ ئاویتـە: (١) ئاوێتـە؛ ئامێتـە؛ تێکـەلٚـاو. (آمیخته) (٢)نـالٚین؛ فـەغـان؛ کـالین؛(نالـه و فغان)(٣)مەساسەی پاش‌نەقیزەی شـێف بـرٚ ین. بیلچەکوچک‌انتهای‌چوبدست‌شخم‌زنی)
ئاوی‌تەبەڕوک: [ناو،ت]ئاویٚ کە لە سەر پیـر و چاکەوە هاتبێت. (آب تبرک)
ئـاوی‌تـەلٚـا: [نـاو،ت]ئـاوی‌زێڕ؛داپوٚشـینی کانزاییێک بە تەلٚا، بە تووەوەی تەلٚا لە تیـژاودا و کەلٚک وەرگرتن لە کارەبا. (آب طلا)
ئاوی‌چاوگرتن: [چاوگە،ت](١) (ب) ترساندن. (زهـر چشـم یـا نسـق گـرفتن)(٢) ورچ بـە منداڵی(پاکوٚلی) بـەپێـدانی خـوٚراکی سـویر و ئـاوکێش و تـونی ڕاکرتنـی، ئـاوی چـاوی دەچنرا و ڕام دەبوو. (آب چشم گرفتن)
ئاوی‌چلٚاو: [ناو،ت]ئـاوی وشـکەپلٚـاو؛ ئـاوی- برنجی نیوەکول‌کە بە سەلەدا دەکریٚ بوٚ چلٚاو یا پلٚاو. (آب چلو)
ئاوی‌چێشت: [ناو،ت]بەشـی تـراوی چێشـت؛ ئاوی خوٚرشت. (آب آبگوشت و خورش)
ئـاوی چێشـت زیـادکردن: (ب)تـەعـارفی (خولٚکی)خوٚماڵیانە؛ نەهار وەرە بوٚ مالٚی ئێمـە ئـاوی ئاوگوٚشـتەکـە زیـاد دەکـەیـن. (آب آبگوشت را زیاد کردن)
ئاوی‌حەوزکێشی: (١) کاری‌کەسێک‌کە ئاوی حـەوز دەر دەدا.(٢) کـاری دەردانـی ئـاوی حەوز.(آبحوضی؛ آب حوض کشی)
ئاوی‌حەیات: [ناو،ت]ئاوی ژیان؛ (ئەفسـانەی ژیانی ئەبەدی) (ب) عـارەق و شـەڕاب. (آب حیات)
ئاوی خالیس: [ناو،ت](١) هەلٚماو؛ ئـاویٚ کـە لـە هـەلٚمـی ئـاو بـە دلٚـوٚپ گیرابـیٚ؛ ئـاوی

هەڵمەتکێن. (آب مقطر)(٢) ئـاوی بـاران و بەفر، ئاویٚ کە هیچ شتێکی تێدا نەتوابێتـەوە. (آب برف تمیز)
ئاویخواردن:ئاوی‌تایبەت بۆ خواردنـەوە؛ (ب) ئاسانی کار. (آب خوردن)
ئاوی‌خۆش‌لەگەرونەچوونـەخـوار:(ب) دائیمـە لەڕەنج و عەزابدابوون؛ ئاسایش و ئاسوودەیی بە خـۆوە نـەدیـن.(آب‌خـوش از گلـو پـائین نرفتن)
ئـاوی دەریـا بـەخشـین: (ب) تـەعـاروف (خوڵک) بە سـەر ئـاوی حـەمامـەوەکـردن؛ شتیٚ‌کە ماڵی غەیر بێت و ببـەخشـرێت. (آب دریا بخشیدن)
ئاویر: [ناو] ئاور؛ ئاگر؛ ئاهیر. (آتش)
ئاویرگا: [ناو] جێی ئاگر؛ ئاتەشگا. (جای آتش؛ آتشگاه)
ئاوی‌ڕەوان: [ناو،ت]ئاویٚ کە لە ڕۆیشـتندابیٚ وەک ئاوی‌چۆم یا جۆگە؛ (ب) بی‌گریٚ‌وگـۆلٚ (دەرسەکەم وەک ئاوی ڕەوان لـە بـەرە)(آب جاری؛درس‌را روان‌بودن)
ئاوی زار: [ناو،ت] ئاقدم؛ ڕینگاوی دەم؛ لیک؛ ئاقدەلیک. (آب دهن)
ئـاوێزان‌بـوون: [چاوگـە،ت](١)شـۆڕبوون؛ حاڵەتی شۆڕ بوونەوە؛ هەڵواسران؛ دارداکـری. (آویزان بودن) (٢) ڕووبەڕوو ڕاوەستان و لە - ئامێز گرتن (وەرگەڕیٚ ئاوێزانت‌بم)«فوڵکلۆڕ» (مقابل‌شدن ودرآغوش گرفتن)
ئاوێژتن: [چاوگە]هاوێژتن؛ هاڤێتن؛ تێگـرتن؛ خستن؛ فڕێدان؛ پەرت‌کردن. (انداختن)
+ ئاوێژە: [ناو]ئاڤێژە؛ دەنگدانەوەو گەڕانەوەی دەنگ؛ گەڕانەوەی تیشک. (انعکاس)
+ ئاوێژە: [نـاو](١) جۆرێـک تـرۆزی (نـوعی خیار چنبر) (٢) ئاوەنیا .بـەراو.ڕەپسـتە.(زمـین آبی)
ئاوێژیار: [ناو،بک]هاوێژ؛ هاوێژەر؛ ئەو کەسە- یە کە فڕێدەدا و تیٚ‌هەڵدەکا. (کسی کە مـی اندازد)
ئاوی ژێرزەمینی: ئـاویٚ‌کـە لـە ژێـر تـوێژی زەویدا قەتیس مابیٚ. (آب زیر زمینی)
ئاوی سارد بەسەرداکردن: (ب) واق وڕمـان؛ داچڵەکان. لەو خەبەرە وەک ئاوی ساردم بە- سەردا بکەن وام لێهات. (آب سـرد روی سـر کسی ریختن)
ئاوی‌سپی: [ناو] ئـاوی‌مـرواری؛ ماشـاو. (آب مروارید)
ئاوی‌سووک: [ناو]ئاوی خۆش‌نۆش، ئاوێک کـە خـویٚ و مـاکی کـانزایی کـەم- تێدابێت. (آب سبک)
ئاوی‌سوێر: [ناو]ئاوی خویٚ تێکراو. (آب شور)
ئاوی‌سەنگین: [ناو](١) ئاوی خەنی‌کراو (پیتێندراو) بە دۆتریۆم بۆ بەکارهێنان لەڕێئاکتۆری ئەتۆمیـدا.(٢)ئـاویٚ‌کـە خـوێی- کانزایی زۆربیٚ. (آب سنگین)
ئاوی‌سیا: [ناو] ئاوی‌ڕەش؛ نەخۆشینی سـفت بوونی ئاوی ناو گـۆی‌چاو کە هاوڕێیە لەگەڵ ئێشی زۆردا. (آب سیاه)
ئاویش: [ناو] دەرمان؛ دەوا. (دوا)
ئاوی‌شیرین: (١) شەکراو؛ شەربـەت.(٢) (ب) ئاویٚ کە وەک ئاوی‌دەریا سوێر نـەبێـت. (٣) ئاوی سووک بۆ خواردنەوە. (آب شیرین)

ئـاوی‌عیماڵـە: [نـاو،ت] ئـاوی سـابوون یـان تراوی دەرمانیٚ‌کە دەکرێتە ناو عیمالەوە؛ (ب) ڕانـەوەسـتان و هـاتن و چـوونی زۆر؛ وەک ئاوی عیمالە هەر دێت و دەچیٚ. (آب عماله)
ئاوی‌کۆڕ: [ناو،ت]ئاوی شەرعی لە ئیسلامدا میکائێک پان و میترێک بەرزایی ببێت؛ یەک ملیۆن سی سی. (آب کر)
ئاوی کوڵاتوو: [نـاو،ت]ئاوێـک کـە دەکـوڵیٚ؛ کوڵـاتوو؛ ئـاوی‌داخ. ئـاوی ١٠٠دەرەجـەی سانتیگراد گەرم. (آب جوش)
ئاوی کەللەتەزێن: [ناو] (ب) ئاوی زۆر سـارد؛ سەهۆڵاو. (کنایه از آب خیلی سرد)
ئـاوی‌گـەرم: [نـاو،ت](١) ئـاوی بـەتـین.(٢) چاوانەی ئاوێک کە نزیکە لەکانگای گـۆگرد کە بە گەرمی‌لە عەرز هـەڵـدەقـوڵیٚ؛ ئـاوی-گەرمی کانزایی؛ گڕاو. (آب گرم)
ئاوی‌گوێ‌دادان: ئامۆژگاری‌کردن؛ مۆجیـاری کردن. (نصیحت کردن)
ئاوی‌لوولەکێشی: ئاویٚ کە بە بۆڕی بۆ ماڵـان دەچیٚ. (آب لوله کشی)
ئاوی‌موزاف: [ناو،لەدینی ئیسلامدا]ئاوێک‌کـە پاکە بەڵام بۆ شت پێشتن بەکـەڵـک نایێـت وەک ئاوی میوە یا گوڵاو. (آب مضاف)
ئاوی‌میوە: [ناو،ت]ئاوێک کـە لـە میـوە دە-گیرێت و بە ناوی میوەکەیـەوە دەناسـرێت؛ وەک ئاوی(هەنـار؛ شـووتی؛ گرکـە؛ گێـزەر؛ سێو؛ پرتەقاڵ؛ نارنج؛ لیمۆ و...) (آب میوه)
ئاوێنە: [ناو] ئامرازێکە لە مەکینەی درومانـدا. (قطعه ای در چرخ خیاطی)
+ ئاوێنەدار: [ناو] (١) کەسـێک‌کـە ئاوێنـەی هەیە؛ (٢) کەسـێک‌کـە ئاوێنـە ڕووبـەڕووی بووک یا کەسێک ڕادەگرێت.(آینه دار)
ئاوێنـەکـاری: [ناو،بـەرهـەمـی چاوگــە ]ڕازاندنەوەی دیوار یا قوماش بە کوتە ئاوێنە. (آینه کاری)
ئاوێنەی‌باڵاڕوان: [ناو،ت] ئاوێنـەی باڵـانوێن؛ ئاوێنەی بەقەد باڵای ئینسان کـە تـەواوقـەد بنوێنیٚ. (آینه قدی)
ئاوێنەی‌قـەددی: [نـاو،ت]ئاوێنـەی‌باڵـاڕوان. (آینەقدی)
ئاوێنەی‌کووڕ: [ناو،ت] ئاوێنەیێـک کـە هـەر شت گەورە نیشـاندەدا؛ دژی ئاوێنـەی چـاڵ. (آینه محدب)
ئاوێنــەی‌ناوچــاڵ: [نــاو،ت] موقــەعــەر؛ ئاوێنەیێک‌کە وێنە چکۆلەتر نیشاندەدا. (آینـه مقعر)
+ ئاویە: (١)[ئاوەڵـناو] زەوینـی‌بـەراو. (زمـین آبـی) (٢)[نــاو] ســواخ. (گچکــاری؛ گــل-اندود)(٣)[ناو] هاویە؛ کـەرەسـتەی لـەحـیم-کردن؛ چەکوشێکە دەم باریک کە بە ئاور یـا کارەبا گـەرمـی دەکـەن بـۆ لـەحیمکـاری. (هویه)
ئاویەدان: [چاوگە،ت]سواخدان. (گچ یـا گـل اندود)
ئاویەو: [ناو] بیرە؛ ئاوجۆ؛ ئاوی جێە. (آبجو)
ئـاویی‌پـرووس: فـدن [نـاو] (دەسـتەواژەی وێنەکێشیە) ڕەنگی ئاویی بێڕلین؛ شینی تۆخ. (آبی پروس)
+ ئاویی‌ژەنگـاری: [نـاو] لـەتێکـەڵـاوکردنی ڕەنگی شینی تۆخ و قاوەیی تۆخ و (سەوزی

تـوٚخ) یـا زەردی کـەم پێـک دێـت. (آبـی زنگاری)
ئاه: ئان؛ دەمێکی‌کورت؛ هـەناسـە؛ ئـاهێکی مابوو بمرێت:کەمێکی‌مابوو بمرێت.(لحظه)
+ ئاها: [بەند]بەڵێ؛ وایە. (ها؛ بله)
ئاهار: [ناو] فد؛ تد: جۆرێک کوڵ؛ تراوێکە لـە نیشاستە و کەتیرە و جیوەی گوڵـەهێـرۆ کـە پێش لە ئوتـوو کـردن لـە پارچـە و ملیـوانی کراسی دەدەن بۆ شەق و ڕەق بوون. (آهار)
ئاهاردار: [ئاوەڵناو] فد: ئاهار لێدراو. (آهار دار)
ئاهار لێدان: [چاوگە،ت]لێدان یا ساوینی ئاهار بە سەر شتێک یان کوتاڵێکدا. (آهار زدن)
ئاهای: فد: ئەهای؛ وشەی بانگکردن؛ هـۆی؛ هێی؛ ئاهای لەگەڵ‌تۆمە. (آی؛ هان)
ئاه تێدا نەمان: [چاوگـە،ت](١) لـە کـەڵـک-کەوتن؛ بەرگە نەگرتوویی؛ پڕتووکیاگ؛ ئاهی تێدا نەماوە بـەکارنایێـت. (رمـق نمانـدن)(٢) بێ‌هێز بوون. (ناتوان شدن)
ئاهرمەلووچ: [ناو،ت] ئاینەمـەل؛ عایلـەمـەن؛ خەزایی. (نوعی پرنده)
ئاه کێشای: [چاوگـە،ت] ئـاهەڵکێشـان. (آه کشیدن)
ئاهکێشـتەی: [چاوگـە،ت]ئـاهەڵکێشـان. (آه کشیدن)
ئـاه لـەبیسـاتانەمـان. (ب) مروٚڤـی فـەقیـر کەوتوو. (آه در بساط نماندن)
ئاهن: [ناو]ئاهەن؛ ئاسن. (آهن)
+ ئاهۆ: (١) هە یهۆ. (اوهوی)(٢) ئێش. ئـازار؛ نەخۆشینی گیروٚدار.(درد) (٣) ئاهوو؛ عەیب و نەنگ؛ خراپ؛ ناپەسند. (عیب)

ئاهۆن: [ئاوەڵناو،بەند] ئەهوەن؛ ئارام؛ هێـدی. (آرام)
ئاهونزا: [ناوی‌چاوگە]دوٚعا لێکردن بە کـڕوزان و پاڕانەوە؛ ئاهونزولە. (نفرین کردن)
ئـاهوو: (١) هـاهوو: زۆردوورە؛ زۆر لـە مێـژە؛ (خیلی وقت است) (٢)[ناو] عەیب. (عیب)
ئـاهوورا مـەزدا: [نـاو،ت]لـە ئاوێسـتاوە وەر گێڕدراوەتە سەر پەهلەوی، واتا بەرزە نـووری گەورە؛ [ئا: بـەرز، گـەورە، بـەڕێـز، + هـوور: خـوٚر.(ب)خـودا لـە ئـایینی زەڕدەشـتدا.] (اهورامزدا)
ئاهوهـەناسـە: [نـاوی،ت](ب) ئـاهونزولـە، (ئاهوهەناسەم داوێنت بگرێ). (آه ونفرین)
ئاهووی‌خوتەن: [نـاو،ت] ئاسـکی چووکـەی کێوەکانی خوتەن؛ ئاهووی موشک: ئـاهوی-ناوچـەکـانی (سـیبریا و هیمالیـا و کـورە و ساخالین) کە لە ناوکیان عەترێک دەگیرێـت بە ناوی موشک. (آهوی ختن)
ئاهـەکـی: [ئـاوەڵنـاو] فـد: (١) لـە ئاهـەک هـەڵکێشـراو؛ ئاهـەکـاوی؛ یـا هـەر شـتێ پێوەندیدار بە ئاهـەکـەوە. (٢) زەوییێـک کـە ئاهەکی زۆر بێ.(٣) ئاوی‌کارێز و کـانی کـە دارای ئاهەک بێت؛ ئاوی سەنگین بـۆ خـوار دنەوە. (آهکی)
ئاهەکی زیندو: [ناو،ت] ئاهەکی ئاو نەدیتـوو؛ ئاهەکی نەپشکووتوو. (آهک زنده)
ئاهەکی مردوو: [ناو،ت] ئاهەکی پشـکووتوو. ئاهەکی ئاو لێکـەوتـوو کـە زۆر بمێنێتـەوە و تاماوەییێک بیشێوێنن. (آهک مرده)
ئاهەنگ‌دار: [ئاوەڵناو] دارای ئاهەنگ؛ دەنگی

مۆسیقایی؛ خاوەنی ڕیتم و مێلۆدی مۆسیقایی. (آهنگ دار)
ئاهەنگسازی: [ناوبەرهەمی چاوگە] دروستکردنی مێلۆدی وئاهەنگی تازە. (آهنگسازی)
ئاهەنگ گرتن: [چاوگە،ت]بەزم سازکردن و کۆکردنەوەی خەڵک بۆ شایی و هەڵپەڕکێ وکۆڕ و مەجلیسی بەزم وشادی. (جشن گرفتن)
ئاهەنگگێڕ: [ناو،بک]کەسێک کە بەزم خۆش دەکات و گەرمی دەدا بە شایی؛ (ب) گۆرانی بێژی هەڵپەرکێ. (مطرب)
ئاهەنگی شاد: [ناو،ت] ئاهەنگی هەڵپەڕین و دارای ڕیتم (زەرب ئاهەنگی) تونـد؛ (ب) بـن بزێوکە. (آهنگ شاد)
ئاهەنگیعازیەتی: [ناو،ت] ئاهەنگی ماتەم؛ دارای ڕیتمی هێدی و خەم هێنەر؛ وەک چەمەری و کوتەڵ گێڕان. (آهنگ عزا)
ئاهەنگیمۆسیقا:[ناو،ت] نەزمیمۆسیقا؛ مێلۆدی و ئاهەنگ بە شێوەیمۆسیقایی . (آهنگ موسیقی)
ئاهەڵکێشان: [چاوگە،ت]ئاخ هەڵکێشان؛ ئاهی حەسرەت و کەسەر و خەم هەڵکێشان. (آه کشیدن)
ئاهیتە: [ئاوەڵناو،بەند]خراپ؛کرێت؛بەد. (بد)
ئاهیسارد: [ناوی چاوگە]هەناسەی سارد؛ ئاهیخەمباری؛ئاهی ناهومێدی و ڕۆژە ڕەشی.(آه سرد)
ئاهین: (۱)ئاهکێشان؛ نالین. (آه کشیدن) (۲) ئاسن. (آهن)

+ ئای: [دەنگەناو](۱) هەی؛ ئای باڵت نەگەڕێت، ئای بمریت. (ای)(۲) تماشاکە؛ بۆ سەرسووڕمان؛ ئای لەو دونیا بێوەفایە. (آی)(۳) کەسەر؛ ئایحەیف بۆ ئەو کوڕە. (آخ) (۴) هاوار؛ ئای دەستم شکا مەیگووشە. (آخ و درد) (۵) بۆ گەورە یا عەجایبـبوون؛ ئای لەو لووتە چەن زلە، ئای لەو درۆ. (وای)
+ ئای ئای: [،دەنگەناو](۱)ناوی جۆرێک گۆرانییە. (اسم آهنگی است)(۲) وشەی بەرەنگاری؛ وا مەکە ئای ئای. (دیهە) (۳)[بەند] پیشاندانی سەرسووڕمان، تماشاکە: ئای ئای لەو کابرا ئەوە شێت بوویی؛ ئای ئای خۆ هێشتا وەڕێ نەکەوتووە (تماشاکن)
ئایڕۆ: [ئامراز]ئەیڕۆ؛ ئەیەڕۆ؛ ژنان بۆ دەربڕینی هاوار لە تەنگانە دا دەیڵێن. (ای وای)
ئایرەقوڵە: [ناو،ت] ئاوروچکەی منداڵان. (آتش اندک)
ئای. سی: [ناو]کۆمێکی بچووک لە ئەندامانی ئێلیکترۆنیکی کە لە سەر تێغەیێکی بچووکی نیوەهادی(نیوە گە یێن، نیوەڕەسانا) ی کارەبایی دابەسترابێت لە نێو کەرەستەی کارەباییدا وەک ڕادیۆ و تەلەفزیۆن. (آی سی)
ئایسین: [چاوگە]ئایسان؛ گڕان؛ بە شوڵەوە سووتان؛ پیبوون. (سوختن با شعله)
+ ئای. سی. یو:[ناو] فرد؛ فد؛ اند: بەشێکی خەستەخانە بۆ ئاگالێبوونی تایبەتی نەخۆش و ئیجازەی نزیک بوونەوە یا دیداری کەسو-کارنەدان بۆ چوونە ژوورەوە. (آی. سی. یو)

ئایشۆکیٚ: [ناو] چەشنەگۆرانییٚکە. (اسم-آهنگیست)
ئایشەوان: [ناو،ت] ئاشەوان. (آسیابان)
ئایفت: [ناو] وشەییٚکی ئاویٚستاییە: هومیٚد؛ هیوا؛ قازانج. (امید؛ سود؛ منفعت)
ئایلەمەل: [ناو] خەزایی؛ ئایلەمەن. (پرنده ملخ خوار)
+ ئایلەمەن: [ئاوەڵناو] (۱) عایلەمەند؛ عەیاڵوار؛ دارای ژن و منالی زۆر. (عایله مند) (۲)[ناو] خەزایی. (پرنده ای است)
ئایننە: [ناو](۱) داهاتوو؛ ئایەندە؛ ئاتی. (آینده)
ئایننە گەل: [جیٚناو]کەسانیٚ کە لە داهاتوو دا دیٚن؛ داهاتووگەل. (آیندگان)
ئاینوو: [ناو](۱) ناوی قەومیٚکی سپی پیٚست کە لە باکووری ژاپۆن دەژین. (قومی در ژاپن)(۲) هەریەک لە ئەندامانی ئەو قەومە. (اعضای آن قوم) (۳) زبانیان. (زبان آن قوم)
ئای وای: فد؛ تنذ[دەنگەناو]هەی هەوار؛ ئەی هاوار؛ ئەی داد. (ای داد)
+ ئایە: [ناو](۱) ڕستەییٚکی تەواوی قورعانی؛ کورتکراوەی ئایەت. (آیه) (۲) پوور. (عمه)(۳) سوود؛ قازانج؛ لەگەڵ مایە بەکار دەبریٚت؛ ئایەومایە. (سود و منفعت)
ئایەتەل کورسی: [ناو] چەند ئایەتیٚک کە لە سوورەی ئەلبەقەرەدایە. (آیت الکرسی)
ئایەختە: [ئاوەڵناو] ڕووت و بیٚبەرگ؛ زیاتر بۆ دەرکیٚشانی شیر و خنجیٚر لە کالان دەوتریٚت. (آخته)
ئایەرگا: [ناو] ئاورگە؛ ئاورگا. (آتشگاه)
ئایەرە: [ناو] پیٚوانەی دیاریکراو؛ ئەندازە؛ عەیارە. (پیمانه)
ئایەخ: (۱) [ناو] ڕەهەندی ئاودەس. (فاضلاب)(۲) [ئاوەڵناو] بیٚبایەخ. (بی ارزش)(۳) جیا کردنەوەی خراپ لە چاک. (جداکردن وکنار گذاشتن‌بدازخوب)
ئایەندوڕەوەند: [ناو،ت]هاموو شۆ؛ هاتوچۆ؛ هەڵس وکەوتی زۆر. (آمد و رفت زیاد)
ئایهۆ: [ئامراز]هەی‌هۆ؛ ئەی‌هۆ؛ لە کاتی تووڕە بووندا دەگوتریٚت؛ دەنگدانی ئەسپ لە سەر ئاخوڕ؛ یانی تەنیشت؛ یان ئارام‌بە. (زکیسە. برو کنار)
ئایهۆ ئایهۆ: [ئامراز]حەیەحەی. (به به همراه نیشخند)
ئاییٚ: [جیٚناو]ئەوان؛ (ئاییٚ واتا: ئەوان وتیان.) (آنها)
ئایی: [پاشگر] بەدوای ناو و ئاوەڵناوەوە دە-لکیٚت و ناویٚکی دیکە(بەرهەمی‌چاوگە)ی لیٚدروستدەبیٚ وەک: بەرد (بەردایی) پان(پانایی)(پیواژە)
ئاییسە: [ئاوەڵناو](۱) یائیسە؛ نەزۆک؛ ئەستیٚور؛ (یائسە) (۲) [بەند] ئەلعان؛ ئیٚستا. (اینک)
+ ئایین: [ناو](۱) دەستووری دین و مەزهەب؛ (۲) یاسا؛ ڕەسم؛ ئایینی بە ڕیٚوە بردنی جەژن و زەماوەند. (آئین)
ئایین و ڕەوەن: [ناو،ت]ئایەن‌و ڕەوەن؛ (ب) میوانی زۆر هاتن؛ هاتوچۆی زۆر. (رفت وآمد زیاد)
ئایینە: [ناو]ئاویٚنە؛ ویٚدەچیٚ(ئاو ویٚنە) بوو بیٚت. (آینە)

ئایینەبەنی: [ناو]ئاوێنەبەندی. (آینه بندی)
ئایینەداری لە شاری کوێران: (ب) هونەر نواندن بەکەسانێ کە لێی حاڵی نابن. (آینە داری درشهر کوران)
ئای. یو. دی: [ناو]کەرەستەیێکی چکۆلە کە لە نێو لەشی ژناندا دادەنرێت بۆ ئەوەی ئاوس‌نەبن. (آی. یو. دی)
ئح: [ئامرازی‌دەنگ]وشەی دەنگدان. (از ادات صدا)
ئزمڕی: [ناو] ئەزمەڕی؛ جۆرێک ترێ. (نوعی انگور)
ئستڕانە: [ناو] جۆرێک لاوک؛ جۆرێک-ئستڕانی دڵداری. (نوعی آواز)
ئشک:[ناو] پەی؛ دووسەری ماسوولکەی بەلەک کە بە پاژنەوە چەسپاوە لە کرۆژ کرۆژە نەرمترە و ڕەنگی سپیە لە چەق دەکا لە پشت پاژنەدایە. (پی پشت پاشنه)
ئەشکێل: [ناو]دەسەڵات ؛ هێز؛ توانایی. (توانایی)
ئلۆل: [ناو] هەڵۆڵ؛ بۆش؛ ناوخاڵی. (توخالی)
ئله: [ناو] هەڵۆ. (عقاب)
ئلهۆ [نا] هەڵۆ. (عقاب)
ئلەهە: دەبا؛با؛بێسە؛جا؛لیگەڕێ.(بگذار)
ئلێمی: [ناو] شاڵی ملپێچ. (شال گردن)
ئۆب: (١) > هۆبە؛ چەند ڕەشماڵ لە پەنای یەکدا. (جمع چند چادر)(٢) هۆب (هوپ) فەرمانی ڕاوەستاندنی ماشێن (سەیارە) کە شاگرد بە شۆفێری دەڵێ، لە ئیستۆپی ئینگلیزیەوە هاتووە. (هپ)
ئۆبژنک: [ناو]بێژنگ. (غربال)
ئۆبلیسک:[ناو] فرد؛ فد: مایل؛ بەرانبەر بە ١٦٠٩میتر. (مایل)
ئۆبنە: [ناو] گرێی‌دار؛ قووندەر. (گره چوب؛ اوبنه)
ئۆبوا:[ناو] فرد؛ فد؛ اند: کەرەستەیێکی مۆسیقایی ئوروپیە لە زوڕنا دەکا. (ابوا)
ئۆبەر: [ناو] بەرگە لێفە؛ ڕووی لێفە. (رویە-بالای‌لحاف)
ئۆبەری: [ناو] لێفەی چکۆلە. (لحاف‌کوچک)
ئۆپاڵ: [ناو]عاقێقی مەشهوور بە عاقێقی سلێمانی. (عقیق سلیمانی)
ئۆپێرا: [ناو](١) جۆرێک شانۆگەری هاوڕێ لەگەڵ مۆسیقا دا.(٢) هۆڵی بەجێ‌هێنانی ئەو کارە. (اپرا)
ئۆتۆمبیل: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]ماشێن؛ سەیارە؛(باری، سواری، شکاری) (اتومبیل)
ئوتوو: [ناو]تد؛ فد: کەرەستەی سافکردنی قوماش و لیباس؛ ئوتووی: {بەرقی، زووخاڵی، بوخار ("هەڵم")} (اتو)
ئوتووچی: [ناو] تد؛ فد: ئوتووکێش. (اتو کش)
ئوتووکراو: [ناو،بەر]لیباس و قوماشی ساف‌و سوف کراو؛ ئوتووکێشراو. (اتو شده)
ئوتووکردن: [چاوگە،ت]کاری ئوتوو لێدان؛ ئوتوو کێشان. (اتو کردن)
ئوتووکێش: [ناو،بک]کەسێک کە پیشەی ئوتووکردن و ئوتوو لێدانە. (اتو کش)
ئوتووکێشی: فد: [ناو،بەرهەمی چاوگە]ڕموتی ئوتووکێشان.(١) کاری ئوتووکردنی لیباس.(٢) دووکان یا جێگای ئوتووکردن.(اتو کشی)

ئوتی: تد: [ناو] ئوتوو. (اتو)
ئوجاخ:[ناو] تد؛ فد:کوانوو؛ وەجاخ. (اجاق)
ئوجاخکوێر: [ئاوەڵناو] (ب) کە سێک کە منداڵی نێرینەی نییە؛ وەجاخکوێر. (اجاق کور)
+ ئۆخ: [ئامراز](١) ئاخ؛ ئۆف. (آخ برای درد و ناخوشی) (٢) ئۆخەی؛ ئۆخەیش. (آخیش برای خوشی)
ئۆختاپووس:[ناو] یۆنان د؛ اند؛ فرد؛ فد: هەشت پای دەریایی. (اختاپوس)
ئۆخچی: [ناو،بک](١) تیرهاوێژ. (تیر انداز) (٢) تفەنگچی. (تفنگچی)
ئۆخرا: [ناو](١) خاکێکەئۆکسیدی ئاسنی هەیە. (٢) ڕەنگی قاوەیی زۆر ئاچخ (ئاجۆری یا زەردی مەیلەو سوور؛ ڕەنگی ئۆخرا.) (اخری)
ئۆخژن‌هاتن: کوڵ‌وکۆی دڵ دامرکان؛ ئوقرەگرتن. (دل آرام گرفتن)
ئۆخین: [چاوگە]خەم خۆری.(غم‌خوری)
ئۆدۆکلۆن: [ناو]فرد؛ اند؛ فد: تراوی عەتر گەلی جۆرا و جۆر کە ئالکۆل دارە. (ادکلن)
ئورارتۆریو: [ناو]ئاوازێکی چەند بەشی لە مۆسیقای ڕۆژ ئاواییدا کە بێژەرەکان بێ شانۆ گەری دەیلێن. (اورارتوریو)
ئۆرارتۆیی: [ئاوەڵناو+ناو] (١) خەڵکی مەملەکەتی لە مێژینەی ئۆرارتۆ، لە داوێنی کێوی ئاراراتەوە تا زەریای وان. (٢) زمانی ئەو قەومە. (٣) پێوەندیدار بە ئۆرارتۆوە. (اورارتویی)
ئۆراڵ‌ئاڵتائی: [ناو] زمانگەلی کەونارای تورکی و مەغوولی. (زبانهای ترکی و مغولی)

ئۆرانیۆم:[ناو] فرد؛ فد؛ اند؛ تد: کانزایی کە دارای ڕادیۆ ئەکتیوە؛ بۆمبی ئاتۆم ئەنجامی شکاندنی ئاتۆمی ئۆرانیۆمە. (اورانیوم)
ئۆرانووس:[ناو] فرد؛ فد: حەوتەمین ئەستێرەی نزیک بە گۆی‌زەوی. (اورانوس)
ئۆرتزە: (١) هەڵپەڕە. (برقص) (٢) [ناو] قنچکەسڵاو؛ سیتکەسەلام.(سندەسلام؛گلمژە)
ئۆرتزیان: [چاوگە،ت]هەڵپەڕین؛ هەڵپەڕکێ. (رقصیدن)
ئۆرتۆپێد: [ناو] فرد؛ فد؛ اند:دوکتۆری نەشتەرکاری ئیسک‌بەندی و شکستە بەندی. (ارتوپد)
ئۆرتۆدۆکس:[ناو] فرد؛ فد؛ اند: (١) لقێ لە دینی مەسیحیەت. (٢) کەسێک‌کە شوێنگری کلیسای ئۆرتۆدۆکس و ئایینی کۆنی مەسیحیەتە. (ارتدوکس)
ئۆرتۆدۆنسی: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] کاری-ڕێکوپێک کردنی ددانی خوار و خێچ یان ڕیچ و نالەبار. (ارتدنسی)
+ ئۆردوو: [ناو] تد؛ فد: (١) سپا؛ هۆردوو.(٢) زمانی هێند و ئێرانی کە لە هێندوستان و پاکستان وئەفغانستان قسەی پێدەکەن. (٣) تاقمێک خەڵک کە بۆ ماوەیێک لە جێگاییێکدا کۆ ببنەوە و بمێننەوە. (١و٢و٣ اردو)
ئۆردوکێشی: [ناو] لە شکەرکێشی. (لشکر کشی)
ئۆردوگا: [ناو] فد: ئۆردووبەز؛جێگای مانەوەی ئۆردوو؛ ئۆردووگای: (١) فێرکاری (٢)وەرزشی(٣)کاری‌ئیجباری(۴) ئاوارەگەل (۵) پەنابەران(۶) پێشاهەنگی(٧) خوێندکاران(٨)

دیل‌گەل (٩) هاوینی (١٠) نیزامی (١١) جەنگی(١٢) ئۆردووگای خووگرتووان بە تریاک و هێرۆیین بۆ تەرک‌کردن و مالیجەبوون. (اردوگاه)
ئۆردەک:[ناو] فد؛ تد: پەلەوەرێکی ئاویە، چکۆلە تر لە قاز. (اردک)
ئوردیبەهیشت: فد: [ناو]دووەمین مانگ لە ساڵی هەتاوی. (اردیبهشت)
ئورز: [کاری ئەمری]هەڵسە؛ هەستە. (پاشو)
ئورشیان: [لەچاوگەی ئورشین]دڵ‌تێکچوون؛ ئۆرتێکچوون؛ دڵ‌بەیەکداهاتن؛ ڕشانەوە؛ ڤە-ڕشیان. (دل‌آشوب‌شدن)
ئورفە: شارێکی کوردنشین، نزیک بە دیار بەکر. (شهر اورفه)
ئورکێستر:[ناو] فرد؛ فد؛ اند: گرووپێکی مۆسیقا زان کە پێکەوە ئاهەنگی لێبدەن. (ارکستر)
ئورکێستراسیون: فرد؛ فد؛ (١) سازبەندی و تەنزیمی یەک ئاهەنگ بۆ چەند کەرەستەی جۆراو جۆر.(٢) هونەری دروستکردنی ئاهەنگ بۆ ئۆر کێستر (ارکستراسیون)
ئۆرکێسترسەمفۆنیک: فرد؛ فد:[ناو،ت]
گرووپێکی زۆری سازژەن کە لە لێدانی هەر ئاهەنگێدا چەند نەفەر بۆ ژەندنی یەک جۆر ساز تەرخان بکرێن. (ارکستر سمفونیک)
ئۆرکێستری فیلارمۆنیک: فرد؛ فد:
ئۆرکێسترێک کە ئەندامی ئەنجومەنی فیلارمۆنیک (کۆڕی مۆسیقازانان و شوێگرانی مۆسیقا) بێ. (ارکستر فیلارمونیک)
ئۆرکێستری مەجلیسی: فد:[ناو،ت]گرو پی بچووکی چەندکەسی ساز ژەن.(ارکستر مجلسی)
ئۆرگ:[ناو] فرد؛ فد: کەرەستە یێکی موسیقاییە. (ارگ)
ئورگێلان: [چاوگە،]وەرگەڕان؛ ڤەگەڕیان؛ گەڕانەوە؛ وەرچەرخان؛ زڤڕیان. (برگشتن؛بازگشتن)
ئورمێ: ورمێ؛ شارێکە لە ئازەربایجانی ڕۆژ ئاوا کە کورد و تورک نشینە. (ارومیه)
ئۆرناگ: [ناو]نموونە. سەنبول. (نمونه، الگو)
ئۆرنج : هاوسەری زەڕدەشت پێغەمبەر (همسر زرتشت پیغمبر)
ئۆرووسی:[ناو] روس‌د؛ ف: عورووسی؛ جۆرێک پەنجێرەی قەدیمی بە چاوانە و شووشەی چکۆلە و ڕەنگینەوە کە بە شێوەی کەشەوی هەڵدەدرایەوە یان دادەدرایەوە. (اروسی)
ئۆزالید:[ناو] فد: جۆرێک کۆپیەگرتن لە وێنە و خەریتە لە سەر کاغەزی هەستۆک (بە هۆی هەڵمی ئامۆنیاکەوە.) (ازالید)
ئۆزنگ: [ناو] زرانی؛ ئەژنۆ؛ ژنۆ. (زانو)
ئۆزۆر: [ناو] ئازار. (آزار)
ئۆزۆن:[ناو] فرد؛فد: گازێکە لە قاتی سەرەوەی هەوای دەوری گۆی زەویدا. (ازن)
ئوزەر: (ف.یاد) [ئاوەڵناو]بەناوبانگ؛ مەزن؛ شکۆدار؛ دەمڕاست.(شکوهمند)
ئۆزیزە: دوێنێ. (دیروز)
+ ئۆستاد:[ناو+ ئاوەڵناو] فد: (١) مامۆستا؛ ناوی باڵاترین مەقامی مودەڕیسی زانستگا. (٢) سەر کارگەری کارئامەد و کارزان؛ ئوستاد کار؛(٣) سوا؛ سواکار؛ وەستا؛ کارزان؛ کارامە.

(استاد)
ئوستاندار:[ناو] فد: پارێزگار. والی؛ بەر پرس وسەرکردەی هەرێم. (استاندار)
ئوستانداری: فد: [ناو](١) بینایێک کە ئوستاندار ئیشی تێدا دەکا. (٢)شوێنی ئوستاندار. (استانداری)
ئوستڕالیایی: [ئاوەڵناو+ ناو](١) خەڵکی ئوستڕالیا.(٢) گرێدراو بەئوستڕالیاوە. (استرالیایی)
ئوسقوف: [ناو]مەقامیکێلەکلیسادا باتتر لە کەشیش. (اسقف)
ئوسلوواک: [ئاوەڵناو+ ناو]خەڵکی ئوسلوواکی؛ قەومی ئوسلوواکی و زبانیان. (اسلواکی)
ئوش: تد: [ئامراز، دەنگەناو]هۆش و هێش؛ کە کورتکراوەی هێشەک یا ئیشەکە بە تورکی یانی کەر، دەنگێ بۆ ڕاوەستانی کەر. (صدایی برای ایستادن الاغ)
ئوشت: [دەنگەناو]ئوش؛ هۆش؛ هۆئش. (هش)
ئووشن: دەبێژن؛ ئێژن؛ دەڵێن. (میگویند)
ئوغربێ: تد: لە زمانی تورکییەوەهاتووە (١)بۆکوێ دەچی؛سەفەر بەخێر. (کجا میروی) (٢ب) سەر خێر چی؛ خێر لە ڕێتا بێت. (سفر بخیر)
ئوغڵانەکەم لەبێلەبێ: >بابی‌بابی ٢
ئوغلبەگ: گوندێکە لە ئازەربایجانی ئێران کە زیاتر لە قەدیما زوڕناژەن و دەهۆڵکوت-بوون و مەیموون و ورچیان ڕادەگرت و بە دێهاتی کوردستاندا دەگەڕان و بەزمیان دەگێڕا. (قریه ای است)

ئوفتالمی:[ناو] فرد؛ فد: ناوی نەخۆشینی پەنمینی گۆی چاو. (افتالمی)
ئوفسێت: فرد؛ فد: (١) چاپی ئوفسێت؛ (٢) جۆرێک مەکینەی‌چاپ کە لە زینگ و کاغەز کەڵک وەردەگرێت. (افست)
ئوفلاز: [ئاوەڵناو]لەبەردڵان؛ خۆشەویست(عزیز)
ئوکالیپتۆل: [ناو]عەترێکە لە داری ئو کا لیپتووس دەگیرێ. (عطر درخت اکالیپتوس)
ئوکالیپتووس: [ناو]دارێکی جەنگەڵییە، بەتایبەت لە ئوستڕالیا زۆرە. (اکالیپتوس)
+ ئوگر: [ئاوەڵناو](١) هۆگر؛ لایەنگر. (هوادار) (٢) دەستەمۆ؛ ئارامگرتوو؛ گیرۆدەبوو؛ تۆتکە؛ ئۆقرەگرتوو. (رام شده)
ئوڵ: [ناو]بۆی‌هەیە لەیوڵی تورکییەوە هاتبێ واتا ڕێ، ڕێبازگە، ڕێگا، بواری دینی‌ئایین. (راه)
ئوڵەمپیاد:[ناو] قد؛ فرد؛ اند:(١) وەرزشگەلی جیهانی کە هەر چوار ساڵ جارێک لە مەملەکەتێکدا بەڕێوە دەچێت. (٢) هەر جۆرە کێبەرکێی جیهانی لە بواری زانستی و لێهاتوویی و وەرزشییەوە. (المپیاد)
ئوڵەمپیک:[ناو] گرێدراو بەئوڵەمپیادەوە. (المپیک)
ئولی: [بەند]ژوور؛ ناوەوەی وەتاغ. (داخل اتاق)
ئومەوی: عد؛ فد: پێوەندیدار بە ئومەویانەوە کە دوو زنجیرە لە فەرمانڕەوایانی مەملەکەتەکانی ئیسلامی بوون لە شام و ئەندلوس. (اموی)

ئومێدەوار: [ئاوەڵناو] فـد؛ بـەهیـوا؛ هیڤیـدار؛ بـەئـاوات؛ هیـوادار؛ بـەهومێـد؛ هومێـدەوار؛ بەهیڤی. (امیدوار)
ئونجە: [ناو]وێنجە؛ یۆنجە. (یونجه)
ئوندا: [ئاوەڵناو] پێوار؛ گوم؛ بەرپێوار؛ بزر؛ وندا. (گم)
ئۆنس: [ناو] فرد؛ فد؛ اند: سەنگی کێشانە یێکە بەرانبەر بە ٢٨ گرەم. (اونس)
ئوو: [پیتی پێوەندی] وە؛ و؛ پیتـی پێـوەنـدی دوو ڕستە. (و)
ئووچک: [ناو]تل؛ قامک. (انگشت)
ئوود: [ناو]ڕێز؛ قەدر. (احترام)
ئوودە: [ئاوەڵناو] بەڕێز؛ بەقـەدر. (محتـرم؛ بـا احترام)
ئوور: [ناو]سک؛ زک؛ ورگ. (شکم)
ئووربەلیشک: [نـاو]دووچـەرخـەی موتـۆڕی؛ موتۆڕ سیکلێت؛ کەرماشێنی ماتۆڕی. (موتـور سیکلت)
ئوورت: [ناو]نیشتمان؛ مەزرای نزیکی گونـد. (میهن؛ مزرعه نزدیک)
ئوورگ: [ناو]ورگ؛ گەدە. (شکمبه)
ئوورین: [چاوگە]لووراندن. (زوزه)
ئووزوونبروون: [ناو](١) لە تورکی وەرگیـراوە. (ئوزوون برنی) واتا لووت درێژ. (دماغ دراز) (٢) جۆرێک ماسی کە خاویـاری لێ بە دەست دێ. (ازون برون)
ئووزەر: [ناو]جێ؛ جێگا. (جا)
ئووسرە: [ناو]کەندووی ئارد. (کندوی آرد)
ئووشی: (١) هێشوو؛ بۆڵ. (خوشه) (٢) ئێژی؛ دەڵێی؛ دەبێژی(گویی)

ئـۆوول: [نـاو] فـرد؛ فـد؛ئۆڤـول توخمـەک؛ جێگەیێک کە ئیسپێرم لە ناوێدا دەگـوروێ و دەبێتە ئاوەلمە. (اوول)
ئوولا: ئەولا. (أنطرف)
ئوولی: [ناو]نهۆمیدووهە مـی خـانوو(طبقـه-٢خانه)
ئوویفت: باری کەڵلا؛ ئافەرین. (آفرین)
ئۆوێرکۆت: [ناو] اند؛ فد: قوڵەباڵتە؛ زیـاتر لـە قوماشی ئاو نەدەڵـێن چـیدەبـێ و بـەسـەر لیباسدا دەیکەنەبەر. (اورکت)
ئوویـەردە: بووردنـەوە؛ دڵسسـتبـوون و بێحاڵبوون. (بیحال شدن)
ئۆڕویت: [ناو،ت] ئاوڕووت. (پر کندن با آب گرم)
ئوهنای: ئۆخەی؛ ئۆخەیش. (آخیش)
ئوێژنگ: [ناو]بێژنگ. (غربال)
ئویژە: [ناو]گاینجە؛ قایشیجووت. (چرم رابط بین یوغ و خیش)
+ ئـوین: [نـاو]تـد: عوین؛کایـە؛ گاڵتـە؛ یاری.نیوەی ماڕسێک لەنەردێندا (بازی)
ئوینبـاز: تـد: [ئـاوەڵنـاو،](ب١) عـوینبـاز؛ گاڵتەچی؛ شـۆخیبـاز؛(شـوخ) (٢)کایـەکـەر؛ یاریکەر (بـازیگر) (٣ب)[ئـاوەڵنـاو] فێڵـەبـاز؛ مەکرباز. (حیله گر)
+ ئە: (١) ئامرازی هێما بۆ جێناو؛ ئـەو، ئـەم، ئەمن، ئەتۆ، ئەمانە، ئێمە. (حـرف اشـاره) (٢) ئامرازی هێما بۆ نزیک و دوور؛ ئەمە، ئەوانـە، ئەوئەسپە. (اشاره به نزدیـک و دور) (٣) بـە-جێی ئا بە کاردەبری؛ ئەئێرە:ئائێرە (به جای آ) (٤) لە جێی دە بە کاردەبرێت؛ ئەچم: دەچـم؛

ئەتوانم : دەتوانم. (بە جای می در علامت مضارع)
ئەئاوا: ئاوا؛ بەوشێوە؛ بەوجۆرە؛ بوی‌ئاواهی. (اینطوری)
ئەبابۆز: [ناو]جەردە؛ ڕێگر؛ تەریدە. (راهزن)
ئەبابۆزی: [ناو]جەردەیی؛ دزی؛ ڕێگری. (دزدی؛ راهزنی)
ئەباڵ: وشەیێکە بۆ وەپاڵدانی قسەی خراپ؛ ئەو خراپیەی ئەباڵ مەدە؛ چەسپاندن؛ وەپاڵدان. (نسبت دادن و چسپاندن)
ئەبجەد: ناوی چوار پیتی ئەلف و بێی عەرەبییە؛ (ئەلف، ب ، ج، د) (ب) هەر پیتی ئەبجەد لە ئەلفو بێدا ژمارەیێکی دیاری کراوی هەیە.(ابجد)
ئەبداڵ: [ناو،ئاوەڵناو] عد؛ فد: (١) سەوداسەر؛ دەروێش؛ (٢) ئەوداڵ؛ عەوداڵ. (درویش)
ئەبداڵان: [ناو] ڕیوایەتە حەوت سوارەی عەوداڵان کە بی‌موقابیلە یاریدەری هەژارانی سەر گۆی‌زەوی بوون. (ابدالان)
ئەبرۆپەیوەس: [ئاوەڵناو]دوو برۆ کە لە یەک جیا نە بوونەتەوە و پێکەوەلکابن. (ابرو پیوست)
ئەبرۆقەیتانی: [ئاوەڵناو](ب) ئەبرۆی باریک. (ابروی باریک)
ئەبرۆکەوانی: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە]ئەبرۆی- چەماوە.(ابروکمانی)
ئەبرۆناسک کردن: [چاوگە،ت] (ب) نازکردن.(نازکردن)
ئەبرۆ هەڵتەکاندن: [چاوگە،ت]وەڵامی سەلبی دانەوە بە هێمای‌برۆ. (ابرو بالا انداختن)
ئەبرۆ هەڵگرتن: [چاوگە،ت] (ب) ئارایشی ئەبرۆ بە هەڵکەندن و لا بردی مووی زیادیی سەر و ژێری ئەبرۆ. (آرایش ابرو)
+ ئەبرەش: [ئاوەڵناو] هەبرەش؛ زۆرتینوو. (تشنه)
+ ئەبرەش: [ناو]فد: (١) ئەسپی‌شین‌بۆرەی گوڵ گوڵ. (ابرش)(٢) مێیینەیێک کە لە پاش زاینی ژەکی نەبێت بۆ بێچوەکەی؛ بێژەک. (زائوی بی شیر)
ئەبڵۆقە: > ئابڵۆقە. (محاصره)
ئەبڵەڕەنج: کەسێک کە لە بەر بی‌عەقڵی ڕەنج بەخەسارە. (رنج به بادرفته)
ئەبلەمەزێج: زیادە ڕەوی.>ئەبڵەڕەنج. ئە بووا: مەشیا؛ ئەشیا؛ دەبوو؛ دەبووایێت. (میبایست)
ئەبووتەیارە: [ناو]ماشێنی سی‌چەرخە؛ (ب) سەیارەی زۆر شڕ و شەوێق و کۆن. (ابو طیاره)
ئەبوو عەتا:[ناو] عد؛ فد: (١) ناوی گۆشەیێک (کۆپلەیێک)کی مۆسیقا کە لە دەزگای شووردایە. (٢) باوکی عەتا. (ابو عطا)
ئەبوولهەول: ناوی پەیکەرەیێک لە میسر؛ (ب) ترس هێنەر. (ابوالهول)
ئەبووێد: [ناو]مۆریانە؛ ئەسپێ. (شپش)
ئەبەنووس: [ناو]داری ئابنووس؛ دارێکی زۆر بە ناویە و جوان بۆ دار تاشی و نەجاڕی کە ڕەنگی قاوەیی زۆر تۆخە. (آبنوس)
ئەبێ: دەبێ؛ ئەبێ بڕۆی: دەبێ بڕۆی؛ ئاخر وائەبێ: ئاخر وادەبێ. (باید؛ میشود)
ئەبیاڵ: [ناو]جاش؛ جاجم؛ پەتوو. (رختخواب-

پیچ؛ پتو)
ئەبێد: جۆرە گەنمێکە. (نوعی گندم)
ئەپراخ:[ناو] یونان‌د؛تد: یاپراخ؛ دۆڵمە .(دلمە)
ئەپلۆک: گیای هەپەلۆک. (گیاهی است)
ئەپەرتەر: [ئاوەڵناو،بەند] زیاتر؛ تەغەر. (بیشتر)
ئەپیۆن: [ناو] بووەتە ئەفیونی ئارەوی و گۆڕدراوە. ڕێنووسی ئارەوی(پ)ی‌نییە (افیون)
ئەت: (١) [پێشگر] نیشانەی داهاتوو، بە جێگای(دەت)؛ ئەتکوژم: دەتکوژم. (علامت مضارع) (٢) ئات؛ خۆشکی‌گەورە؛ دادە. (خواهر بزرگ)
ئەتابەک: فد؛ تد: [ناو](١) لە ئاتا بیوکی تورکییەوە هاتووە؛ واتا: باوەگەورە؛(ب) ناوی چەند تیرەی فەرمانڕەوا بوون وەک: ئەتابەکانی موسڵ، ئەتابەکانی فارس. (سلسله ای از فرمانروایان)(٢) لەقەبی وەزیر لە مێژینەدا؛ ئەتابەکی ئەعزەم: سەرۆک وەزیر. (لقب وزیر؛ اتابک)
ئەتانێ: (١)[جێناو] ئەوەتانێ. (اینست)(٢) ئەتوانێ؛ لە چاوگەی‌تانین(توانین)(میتواند)
+ئەترەش: [ناو](١) زەندەق؛ زراو؛ زاور. (کیسەصفرا)(٢) جورئەت؛ زات.(جرئت) (٣)فریشتەی‌ئاگاداری ئاو لە ئایینی زەڕدە- شتدا. (فرشتەنگهبان‌آب)
ئەتکڵێردن: [چاوگە،ت] ئابڕووبردن؛ ئەتک‌کردن؛ سووک‌کردن.(آبروبردن)
ئەتفک: [ناو]هێشووی چکۆلە؛ بۆڵی چکۆلە. (خوشە کوچک)
+ ئەتڵەس:[ناو] فد: (١) کتێبی خەریتە ی جۆغرافیا. (٢) جۆرێک ماشێنی خاک هەڵکەن. (٣) ناوی زەریاییکی بەرینە، ئۆقیانووسی(بەحری) ئەتڵەس (٤) جۆرێک قوماش. (اطلس)
+ ئەتڵەسی: فد: (١) [ناو]گوڵێکی کەم باڵایە؛ (٢) [ئاوەڵناو]بەڕەنگی گوڵی ئەتڵەس.(٣)[ناو] جۆرێک قوماشی ساف و بریقەدار. (اطلسی)
ئەتۆران: (١)زیزدەبوون؛ دەتۆران.(قهر میکردند) (٢)زەڕدەشتی.(زردوشتی)
ئەتۆم: [ناو]فد؛ فرد؛ اند: چووکترین بەشی هەر شت کە لە ئلێکتڕۆن و نۆترۆن پێک هاتووە. (اتم)
ئەتۆمی:[ئاوەڵناو] پێوەندیدار بە ئەتۆمەوە؛ بۆمی ئەتۆمی؛ نیروگای ئەتۆمی. (اتمی)
ئەتوون: [ناو]ئارتوون؛ دۆژە. (جهنم)
ئەتەر: [ناو](١) نیشانە؛ جێ‌شوێن؛ ئاسەوار؛ هەتەر. (نشانە)(٢) هەتەر: هێزی‌دیتن؛ هەتا چاو هەتەر دەکا دەشتە.(کارایی‌دید)
+ ئەتەک: [ناو]پاڵوێنە؛ پاڵێو. (صافی)
+ ئەتەم: تەنین؛ تەونچنین.(بافتن)
ئەتێ: [ئامراز] بانگ‌کردنی باجی، خوشکی گەورە؛ (صداکردن‌خواهربزرگ)
ئەجباندن:[چاوگە،ت]عەجباندن‌پەسەند کردن؛ بەرگەم‌کردن. (پسند کردن)
ئەجکاندن: [چاوگە،ت](١) پرووکاندن؛ نابووت‌کردن؛ لە نێوبردن؛ چوواندن. (از بین بردن) (٢) قڕ تێخستن. (کشتارجمعی) (٣) تەفروتوونا کردن. (تارومارکردن)

ئەجووڕیٚ: (١)[لەچاوگەی(جووڕان)] قسەی لە دەمدا تێکدەچیٚ، زمانی بە هەڵە دەچیٚ. (تپق می زند) (٢) دەدۆڕێت بە (سووکایەتیە-وە.) (می بازد)

ئەجووری: [ناو]جۆرێک خەیار؛هارویٚ. (نوعی‌خیار)

+ ئەجەل: عد؛ فد: [ناو]وەختی مەرگ(اجل)

ئەجەل‌هاتن: وەختی مەرگ هاتن؛ بزن ئەجەلی‌بێت نانی شوان دەخوات(پەند).(اجل رسیدن)

ئەجێلۆک: بەرگ گۆڕین.(تعویض‌لباس)

ئەحمەدومەحموودکردن: بەقەرزوقۆڵە ژیان؛ ژیانی‌دەساودەس (دەستاودەست)؛ لە کەسێک قەرز وەرگرتن و بە کەسێکی تر دانەوە؛ (ب) دەست و گوێڕی.(احمد و محمودکردن؛کنایە، با نسیە زندگیکردن)

ئەحمەقانە:[بەند]فد: لە ڕووی بیٚعەقڵیەوە؛ [ئاوەڵناو]وەک ئەحمەق.(احمقانە)

ئەحمەقی: فد:[ناو،بەرهەمی‌چاوگە] گەوجی؛ نەفامی؛ بیٚعەقڵی؛ گەمژەیی.(احمقی)

+ ئەحواڵپرسی: [ناو،بەرهەمی چاوگە] (١) پرس و جۆ لە حاڵی کەسێک‌کردن. (٢) ڕە-وتی سەردان لە نەخۆش و لێپرسین. (٣) (ب) چاک‌وخۆشی‌کردن. (احوالپرسی)

ئەحیا: عد؛ فد: (١) بوژاندنەوە؛ زیندو کردنەوە.(زندە کردن) (٢) شەو بێداری؛ شەو نخوونی؛ (ب) شەوگەلی ١٩ تا ٢١ ی مانگی ڕەمەزان، بەتایبەت لە مەزهەبی شێعەدا. (شب بیداری)

ئەخ: (١) وشەی دەنگە.(کلمە صداست)

(٢)پیس بە زبانی منداڵانە(پلشت‌بچگانە)

ئەخباری: عد؛ فد: [ناو] مەکتەبێکی فیقهی شێعەیە کە بۆ حەدیس و خەبەر زیاتر لە دەلیلی کردەوەیی ڕێز دادەنیٚ؛ دژی ئوسووڵی.(اخباری)

ئەخت و چار: [ناو،ت]هەوڵو تەقەلای زۆر. (تقلای زیاد)

+ ئەختە: (١)[ئاوەڵناو] یەختە؛ گون دەرهاتوو؛ خەساو. (٢) (ب) پیاوی خوێڕی و بیٚ جەرگ. (٣) [ناو]یەختە؛ دەسەکی داربی کە لە کەنار ئاودا دەیچەقێنن بۆ شین‌بوون. (اختە)

ئەختەر:[ناو]فد: (١) هەسارە.(ستارە. اختر) (٢) ناوی گوڵێکە.(نام گلی است) (٣ (ناوە بۆ ژنان.(نامی زنانە)

ئەختەرژمار: [ناو]هەسارەناس؛ هەسارەژمار؛ ئەستێرەژمار.(منجم)

ئەختەرسوٚتی: [ئاوەڵناو] ئەستێرە سوٚتی؛(ب)بەدبەخت؛ بیٚئیقباڵ؛ ڕۆژڕە ش ؛ بیٚشانس(بی‌اقبال.)

ئەخرەب: [ناو]ئەقرەب؛ دووپشک؛ دومارە-کوٚڵ(عقرب)

+ ئەخشاڵ: [ناو]ئەشغاڵ؛ ئاشغاڵ؛ زبڵ(آشغال)

ئەخلەخ: [ناو]ند؛ فد: سوخمە؛ سیخمە؛ کولۆنجەی بێقوٚڵ‌کە قوٚشە و گۆ یا زیوەری پێوە لکێندرابێت. (دوورابێت).(اخلخ)

ئەخم‌کردن: فد؛[چاوگە،ت] ڕوو ترش-کردن(اخم‌کردن)

ئەخموتەخم: فد؛ [ناو،ت]ڕووگرژی لەگەل قسەی توند و تیژدا.(اخم و تخم)

ئەنگ‌لێدان: [چاوگە،ت](١) مۆر و نیشان دانان لە سەر بەستە و جەعبە و تەلیسی پڕ لە کاڵا. (٢) تۆمەت‌لێدان؛ ناوخستنە سەر کەسێک. (انگ زدن)
ئەنگوتکە: [ناو](١) جۆرێک تریێ. (نوعی انگور) (٢) گونگ؛ ئەنگوتک. (چونە)
ئەنگوڕ: [ناو]تام؛ چێژە. (طعم)
ئەنگووس‌پیانان: [چاوگە،ت] قامک پێدانان؛ لە جیاتی واژۆ بە سەری قامک مۆر بە بەڵگەدانان. پەنجە مۆر کردن. (انگشت زدن)(ب)پەژراندن.
ئەنگوست تێخستن: [چاوگە،ت] (ب) شێواندن و ئاژاوە نانەوە؛ خۆتێهەڵقورتاندن؛ (ب) دەست لەکاریێ وەردان.(آشوب بپا کردن)
ئەنگوستە گەورە: [ناو]کەڵە ئەمووست؛ تبلا مەزن؛ تلیا مەزن؛ قامکە گەورە؛ بەرانیێ؛ قامکی‌هەرە قەویی دەست وپا. (انگشت شصت)
ئەنگوستیلەی بێکاسە: ئاڵقەی پەنجە؛ ئەنگوستیلەی بێ‌نقیم.(انگشتر بی‌نگین)
ئەنگوستیلەی درومانیێ: ئەنگوسانە؛ قووچکە؛ کلکەوانەی درومانیێ؛ سەرتلیک؛ هنگوستۆک. (انگشتانە)
ئەنگوشت:[ناو] فد: قامک؛ ئەنگووس؛ تل؛ تبل؛ کلک. (انگشت)
ئە نگوشت نیشان: [ئاوەڵناو] ئەنگوشت‌نوما. (انگشت‌نما)
ئەنگوشتەری: فد: [ناو]ئەنگوستیلە؛ کلکە-وانە؛ (انگشتر)
ئەنگووس‌گەزین: (ب)پەژیوان‌بوونەوە؛ لە حەسرەتدا قامک بردن بە دەما و گازلێگرتن.(انگشت‌گزیدن)
ئەنگووس لە سەردانان: (١) دەست لە سەر شتێک دانان و دیاریکردنی شتی دڵخواز.(٢) هێما بەکاریا باسێک‌کردن و دیاریکردنی خاڵێک لەباسێکدا.(انگشت روی چیزی گذاشتن)
ئەنگووس‌نیگاری: [چاوگە،ت](١) وێنە هەڵگرتن لە هێڵی سەر قامک بۆ دۆزینەوەی خاوەنەکەی. (٢) وێنە هەڵگرتن لە جیێ شوێنی سەرپەنجە بۆ دۆزینەوەی دز و خراپە کار. (انگشت نگاری)
ئەنگووسەبراتووتەلە: تبلی پەنای قامکە تووتەلە. (انگشت چهارم)
ئەنگووسە ناوگین: [ناو]تبلی ناوەڕاست؛ زەڕنەقووتە؛ بەرزەملیێ؛ تلیا ناوین. (انگشت وسط)
ئەنگووسیێ: قامکێک.(ب)کەمێک.(یک انگشت)
ئەنگووسی ئیشارە: ئەنگووسی شادە؛ دۆشاو مژە. (انگشت سبابە)
ئەنگەبین:[ناو] فد: (١) هەنگوین. (عسل) (٢)شیرەی گەزئە نگەبین. (گزانگبین)
ئەنگەچەری: بێحەیا؛بیێ‌شەرم. (بیشرم)
ئەنگیر: [ناو]تریێ. هەنگور. (انگور)
ئەنۆش: نۆش؛ (ب) نۆشی گیانت‌بیێ:بەگیانت-خۆش و گەوارابیێ. (نوش)
ئەنووختە: [ناو]پاشەکەوت. (اندوختە)
ئەنووختەکار: [ناو،بک]پاشەکەوت‌کار.

(اندوخته گر)
ئـــــەنووختـــــەکـــــردن: [چاوگـــــە،ت] پاشەکەوتکردن.(اندوخته کردن)
ئـــەنێشـــە: [نـــاو](١) بیـــر؛ هـــۆش؛ فکـــر؛ خەیاڵ.(اندیشه)(٢) ترس؛ خۆف. (ترس)
ئەنی‌گەش: [ئاوەڵناو] (١)ڕووخۆش، (٢) جـوان؛ قـەشـەنـگ؛ خۆشـکۆک؛ نێوچـاو کراوە.(بشاش؛ زیبا)
+ ئەنیماتۆڕ: فد: [ناو،بک]کەسێک‌کە فیلمـی کـارتۆن (ئـەنیمـەیشـێن) دروسـت دەکـات. (انیماتور)
+ ئەنیمەیشێن:[ناو] اند؛ فد: فیلمێـک‌کـە بـە وێنە گرتنی پەیتاپەیتا و لە سەریەک لە شتی بێگیـــان وەک بووکـــە چینـــی و وێنـــەی نیگارکێشی چێدەبێ. (کارتون)
ئەنین: داد و هاوار و ڕۆڕۆ. (داد و هوار)
ئەوارە: [ئاوەڵناو] ئاوارە؛ ئەراکێـل؛ دەربـەدەر؛ ســەرگــەردان؛ بێئــەنــوا؛ دەروەدەر؛ تــەرە؛ هەڵوەدا؛ پەڕەوازە. (آوارە)
ئەوارەیـی: [بـەرهـەمـی چاوگـە]ئـاوارەیـی؛ دەربەدەری؛ بێ ئەنوایی؛ بێجێگە و ڕێگەیـی. (آوارە ای)
ئەوازین: [ناو]وازن؛ زریان.(بادیکـە ازشـمال-میوزد)
ئەوباش:[ناو] عد؛ فد: ئەڵوات؛ هەتیومـەتیـو؛ بەرەڵا؛ ئەلۆجەلۆ؛ لات و لـووت ؛ بێســەروپـا؛ وێڵگەرد؛ رووتەوپووتە؛ هەرزە؛ گـەدەوگـودە؛ سووکـوچرووک؛ شەڕلاتان و شـەڕ فـرۆش. (اوباش)
ئەوباشی: فد: [بەرهـەمـی چاوگـە]ڕەوشـتی ئـەوبـاش؛ کـاری ئـەوبـاش؛ شــەڵــاتی؛ شەڕفرۆشی؛ شەڕلاتانی. (اوباشی)
ئەوباشیگەری: [ناو،بەرهەمی چاوگـە] لاتـی؛ ئەڵواتی؛ ئەلواتی؛ وێڵگەردی. (اوباشگری)
ئـەبـەری: [نـاو]لێفـەی بچـووک. (لحـاف کوچک)
ئەوپەڕ: [نـاو]ئـەوسـەر؛ ئـەوبـەر؛ نیهایـەت. (نهایت)
+ ئەوت:[ناو] اند؛ فرد؛ فـد: (١) ئـاوت؛ تـۆپ چوونـەدەر لـە سـنووری کایـەی ولیبـاڵ و فووتباڵ وباسکیتبالدا.(٢) وەدەرنان؛ چوونەدەر یان لەکایە یان لە کێبەرکێ قرت(قت) بوون. (اوت)
ئەوتا: [ئاوەڵناو] هاوتا؛ هاوئەندازە. (همتا)
ئـــەوتـــۆ:[بـــەنـــد،ت] وا؛ وەهـــا؛ شـــیاوی باس؛کارێکی‌ئەوتۆی‌نەکرد:کارێکی‌گرینـگ و شیاو و بەرچاوی نەکرد؛ بەچـەشـنێک؛ بـە-جۆرێک. (مهم؛شایان گفتن؛ بەنوعی)
ئەوتەئەوت: وەڕەوەڕ. (عوعو)
ئەوتین: [چاوگە]وەڕین. (عوعو کردن)
ئەوجاریش: ئەمجاریش؛ هەمیسانەکـە؛ هـە-مدیسان. (دوبارە)
ئەوجن: [ناو]جۆرێـک سـەختـەدارە. (نـوعی درخت)
ئەو دونیا: دونیای پاشـمەرگ؛ ئـاخیرەت؛ (آن جهان)(٢) دونیایێک‌کە تێیـداین؛ ئـەو دونیـا چەند بێوە فایە: ئەم دونیا چەندبێوەفایە.(این-جهان)
ئەو دەم: [بەنـد،ت]ئـەو وەخـت؛ ئـەو کـات. (آنوقت)

ئەوراف: [ناو]هەورێک کە بارانێکی کەمی پێوەبێ. (ابر کم باران)

ئەوراقچی: [ناو]کەسێک کە کەرەستەی کۆن و ئەوراقی دەفرۆشێت. (اوراقچی)

ئەوراقی: [ئاوەڵناو] (۱) (ب) شەق-وشڕ.(۲)لێک هەڵوەشاوە؛ لە بەریەک دەرهاتوو. (۳) شیاوی لێک هەڵوەشاندن. (۴)[ناو] دووکانی فرۆشتنی کەرەستەگەلی هەڵوەشاو. اوراقی)

ئەورام:[ناو] ڕوایی؛ سازگاری؛ دروستی. (سازش)

ئەورترشکی: [ناو]هەورەتریشقە. (رعد وبرق؛ آسمان قرمبه)

ئەورۆکە: [بەند]ئەمڕۆکە؛ ئیمڕۆ؛ ئەم ڕۆژگارە؛(امروزه)

ئەوروو: [ناو]مەڵاشو. (سق)

ئەوره مەزدا: > ئاهورا مەزدا. (اهورا مزدا)

ئەوڕەنگ: [ناو](۱) تەختی شایەتی؛ شکۆ. (اورنگ) (۲)[ناو] تێگەیشتن؛ فامین. (فهمیدن)

ئەورێشم: [ناو]ئاڕمووش؛ هەورێشم. (ابریشم)

ئەوزەڵ : لە ئاوەز بەواتای عەقڵەوە وەرگیراوە. فرەزان؛ زانا؛ (پەیوەندی بە ئەفزەڵی ئارەویەوە نییە) (دانا)

ئەوشان: [ئاوەڵناو]هاوشان. (هم شان)

ئەوشین:>ئەڤشین.

ئەوشۆ: ئیشەڤ؛ ئەمشەو؛ شەوێک کە تێیداین. (امشب)

ئەوقاس: [بەند]ئەوەندە؛ هێندە؛ ئەو ئەندازە. (آنقدر)

ئەوقە: [ناو،ت]ئاوقە؛ شاڵاو؛ هێرش؛ تووشبوون. (حمله؛ برخورد)

ئەوقەدبوون: ئاوقەدبوون؛ هاو ئەندازە؛ هاوشان. (هم قد)

+ ئەوک: کابرا؛ هین؛ وانێک؛ یارۆ.(یارو؛ چیز)

ئەوکات: ئەوسا؛ ئەو وەخت. (آنوقت)

ئەوکردنەوە: [چاوگە،ت]کردنەوە؛ ئاوەڵاکردن؛ درانە ئەو کە واتا دەرگاکە بکەوە. (باز کردن)

ئەوکێ: [جێناو+ناو]ئەوک؛ کابرا؛ یارۆ؛ وانێک؛ هین. (یارو؛ چیز)

ئەوگار: [ئاوەڵناو] پەرێشان؛پەشێو؛دڵ بەخەم؛ زگار؛ کز.(مغموم)

ئەولاد:[ناو] عد؛ فد: زارۆک؛ منداڵ؛ فرزەندی کوڕ وکچ؛ عەولاد. (اولاد)

ئەولاولا: [جێناو] ئەملاوئەولا؛ ئەیلاوئوولا. (اینطرف وآنطرف)

ئەولەو: [ناو]لافاو؛ سێڵاو؛ لەهی. (سیلاب)

ئەولەیی: [ناو]خاترجەمی؛ ئەرخایەنی دڵنیایی؛بڕوایی؛ متمانە؛ جێی ئیحتیبار. (اطمینان)

ئەونە: (۱) ڤیقاس؛ هێندە؛ ئەوەندە؛ (اینقدر) (۲) ئەوکەسە نە. (او نه)

ئەو وەختە: [بەند،ت]ئەوکاتە؛ ئەو زەمانە؛ ئەو دەمە. (آنوقت)

+ ئەوە: [ناو]شەونم؛ خوناوە. (شبنم)

ئەوەئامای: [چاوگە،ت]هاتنەوە؛ گەڕانەوە. (برگشتن)

ئەوەئێس: دۆزەرەوە. (پیداکننده)

ئەوەئێستەی: ئێستەیوە؛ دۆزینەوە. (پیدا کردن)

ئەوپڕای: [چاوگە،ت]لـە بورادان؛پـەڕینـەوە. (گذشتن)
+ ئەوەتا: [جێناو] ئێهیٚ؛ ئەڤەڤە؛ ڤا؛ڤایە ؛ هـا؛ هـانیٚ؛ ئـەمـەسـا؛ ئـەمـەتـا؛ ئـەتـا؛ ئاتـانیٚ؛ ئینە؛ئەوەتانیٚ؛ خۆیەتی. (اینهاش؛ خودشه)
ئـەوەتـاوای: [چاوگـە،ت]قـاڵبوون؛ تاوانـەوە؛ ئاتیوان؛ توانەوە.(ذوب شدن)
ئەوەتانیٚ: ئەوەتا؛ ئەوەتێهیٚ؛ ڤەیە؛ ئەیـەسـە؛ یەسە؛ ئەوەسە؛ خۆیەتـی؛ خۆیـەسـی. (ایـن است)
ئەوەتاهیٚ: خۆیەسی؛ ئەوەتێهـیٚ؛ خۆیـەتـی. (خودش است)
ئەوەتی: ئەوەتی تۆم دیوە هیچ کەسم وەبیر نایە؛ لەوکاتەوە. لەوەتی. (از آنوقت)
ئەوەتێهیٚ: ئەوەتانیٚ؛ خۆیەسی. (اینست)
ئەوەسیای: (۱) حەسانەوە. (استراحت)
(۲) حەپەسان. (زبان بند آمدن)
ئەوەکان:هینەکان؛ ئەوانی‌دی؛شتەکـانی‌تـر . (دیگران؛ چیزها)
ئەوەگۆڕی‌بیٚ: (ب) ئـەوە دەردی‌بـیٚ؛ دەبـڕو دەی حەقی خۆیەتی؛ مافی خۆیەتی. (حقـش همین بود)
ئەوەندە: ئەو هێندە؛ ئەونە. (آنقدر)
ئەوەندەی: [بەند]هێندەی؛ ئەونەی؛ بـە قـەد. (آن قدر؛ هر چقدر)
ئـەوەهـا: (۱) ئـاوا؛ وا. (اینطـور)(۲)[جێنـاو] ئەوەها؛ ئەوەتا؛ ئەوەهای؛ ئەوەتانیٚ. (اینست)
ئەوەیە: ئەوەسە؛ خۆیەتی. (خودش است)
+ ئەویٚ: [جێناوی‌تاکی میٚ]ئەویٚ گوتە مـن؛ ئەو ژنە بە منی گوت. (او برای زن)

ئـەوێسـتایی: (۱) زبـانیٚ‌کـە ئاوێسـتای پێنووسراوە. (۲) پێوەندیدار بەئاوێستا کتێبـی دینی زەردەشتەوە. (اوستایی)
ئەوێستیٚ: [بەند]ئێستا؛ ئێستە؛ ئێسە. (حالا)
ئەوێستێکە: [بەند]ئێستاکە؛ ئێستە کە. (حـالا؛ حالاکە)
ئەویسک: ناوی باڵندەیێکە.(نام‌پرندەایست)
ئەویشان: [جێناو]ئەوان. (ایشان)
ئەوی‌کە: (۱)ئەوی‌دیکە؛ ئەوی‌دی؛ ئەوی‌تـر. (آن یکی) (۲) ئـەوکـەسـە. هـەرکـەسێک؛ ئەوی‌کە نەیێت بەشی دەخورێت. (هرکسی)
ئەوێندەر: [بەند]ئەڤێندەر؛ ئـەویٚ؛ ئـەوجێگـا. (آنجا)
ئـەوێنـدەریٚ: [بـەنـد]ئـەویٚ؛ ئـەڤێنـدەریٚ؛ ئەوجێگایە. (آنجا)
ئەوێها: هوٚ ئەوە. (آنست)
ئەهالی:[نـاو] فـد: جـەمـاوەری دانیشـتووی جێگایێک؛ ((ئەو شاهی ماهی میسرە ئەهالی لە ڕێی سجوود)) « نالی»(اهالی)
ئەهرامی میسر:[ناو] فد: سـیٚ هیـرەمـی بـە ناوبانگی میسر. (اهرام مصر)
+ ئەهل: [ئاوەڵنـاو] منالـە کـەی زۆر ژیـر و ئەهلە؛ ئارام؛ ژیر. (آرام)
ئەهل و عـەیـاڵ:[نـاو]فـد:(ب)ژن و منـداڵ؛ خاوخێزان؛ عال و عەیاڵ. (اهل وعیال)
ئەهلی: [ئاوەڵناو] فد: ڕام؛ دەستەمۆ؛ کـەوی. (اهلی)
ئەهلی بەقیە: [نـاو،ت](ئـەهلـی بـاقیـە.(ب) خەیات. (اهل بخیه)
ئەهلی‌تەسەنـون: فـد: [نـاو،ت]](ب) سـوننی

مەزهەب. (اهل تسنن)
ئەهلیتەشەیوٓع: فد: [ناو،ت]((ب) شیٓعە مەزهەب. (اهل تشیع)
ئەهلیتەقوا: فد: [ناو،ت](ب) ئەوەی لە کاری دژیدین خوٓی دەپاریٓزیٓت. (اهل تقوی)
ئەهلیحالٓ: فد: [ناو،ت](۱) ئەهلیزکر و عیرفان و سوٓفیگەری. (۲) (ب) باحالٓ؛ خوٓش گوزەران؛ خوٓش ڕابویٓر(اهلحال)
ئەهلیحەق: فد: [ناو،ت](۱) لایەنگری عەدالٓەت و حەق و ڕاستی. (۲) پەیڕەوی دینی حەق. (اهل حق)
ئەهلیدلٓ: فد: [ناو،ت](ب) خوٓشبار لە هەلٓسوکەوتدا؛ کەسیٓککە بە دلٓی خوٓی دەژی؛ زیاتر بوٓ خوٓش ڕابواردن و دلٓداری بە هەموو ماناییٓکەوە؛ خاوەن دلٓ؛ ئەهلی کەیف. (اهل دل)
ئەهلی عیبادەت:فد:[ناو،ت](ب) کەسیٓک کە ئەرکیدینی خوٓی بەڕیٓوە دەبات. (اهل عبادت)
ئەهلی قەلٓەم: فد: [ناو،ت] (ب) نووسەر؛ ئەدیب؛ قەلٓەم بە دەست. (اهل قلم)
ئەهلیقەناعەت: فد: [ناو،ت] (بوٓ ئەهلی قەناعەت لە پلٓاو خوٓشترە داندوٓک) "شیٓخ ڕەزا". ڕازی و دەست پیٓوەگر. (اهل قناعت)
ئەهلیکتیٓب: فد: [ناو،ت] (۱) (ب) پەیڕە وانی پەڕتووکی ئاسمانی. (۲)هوٓگری موتالٓا وکتیٓب خویٓندنەوە. (اهل کتاب)
ئەهلیمەنقەلٓ: فد: [ناو،ت]((ب) تلیاکی؛ تریاکی؛ ئەهلیبافوور؛ ئەسرارکیٓش؛ بافووری؛ وافووری.(اهلمنقل)
ئەهلینەزەر: [ناو،ت](خاوەن ڕا. (ب) پسپوٓڕ لە کاریٓکدا. (اهل نظر)
ئەهلیوەفا: (ب) وەفادار؛ ئەمەکدار؛ باوەفا. (اهل وفا)
ئەهوورە: ئاهورا. (اهورا)
ئەهوورە مەزد: [ناو](۱) ئاهورامەزدا.(۲) ڕووناکی بەرزی گەورە؛ خودا لە ئایینی زەڕەدەشتدا.(اهورا مزدا)
ئەهوەن: [ئاوەلٓناو] ئارام؛ لە سەرخوٓ؛ ژیر؛ هیٓور (آرام)
ئەهەک: [ناو] ئاهەک؛ قسلٓ؛ ئەهاک. (آهک)
ئەی ئەی: ئای ئای؛ وشەی سەرسووڕمانە؛ ئائای ئەوە شیٓت بووگی. (آی آی)
ئەیا: [ناو] ئایە؛ دایە؛ دایک. (مادر)
ئەیتە: هەیتە: [ناو] پوٓلیس؛ ژاندارمە. (ژاندارم.پولیس)
ئەیچە: ئەیچی؛ ئەدیچی. (پس چی)
ئەیچی: ئەدیچی؛ ئەیچە. (پس چە)
ئەیدز: اند؛ فد؛ فرد: [ناو] نەخوٓشینی لە کار کەوتنی هیٓزی بەرگری و چارەسەری لە لەشدا کە دەبیٓتە هوٓی چاک نەبوونەوەی برین و نەخوٓشینگەلیتر، لە کاری سەر جیٓیی لەگەلٓ نەخوٓشینداری ئەیدزیدا تووشی مروٓڤ دەبیٓت یان لە ڕیٓگای خویٓنی ئەیدزیەوە تووشی مروٓڤ دەبیٓت. (ایدز)
ئەیدزی: [ئاوەلٓناو] دووچاری ئەیدز هاتوو. (ایدزی)
ئەیدمر: [بەند] ئیٓرە؛ ئیٓستا. (اینجا؛ حالا)
ئەیدی: [ئامراز] ئەدی؛ ئەیتر؛ ئەتر؛ ئیدی؛

ئەیدی بەسمە: ئیتر بەسمە. (دیگر)
ئەیرە: [بەند]ئێرە؛ ئەگرە؛ ڤێرێ. (اینجا)
ئەیڕۆ: > ئەیەڕۆ. (ای داد)
ئەیزەد: [ناو] خودا؛ یەزدان؛ پەروەردگار. (ایزد)
ئەیزەدی: [ناو] ئیزەدی؛ خودایی؛ خودا پەرەست. (ایزدی)
ئەیزەن:[بەند] فد: لە (ئەیزەن)ی فارسی وەرگیراوە، دیسان؛ دووبارە؛ هەمدیسان؛ هەمیسان. (ایضاً؛ دوباره)
ئەیژی: دەبێژی؛ دەڵێی؛ چما؛ وابزانم. (ب) وادەزانی؛ وابزانم.(می گویی؛ گوئی)
ئەی سووتام برژام: ناوی گەمەیێکی منداڵانە. (نام بازی است)
ئەیڤەز: [ئاوەڵناو]ئامادە. (آماده)
ئەیڤەزاندن: [چاوگە،ت] ئامادەکردن؛ تەیارکردن. (آماده کردن)
ئەیڤەزین: [ناو]ئامادەیی؛ تەیاری ؛حازری. (آمادگی)
ئەیلا: ئەملا؛ ئیلا؛ لای نزیکتر؛ دژی ئەوولا و ئەولا. (اینطرف)
ئەیلۆ: بۆبانگ کردنی کۆمەڵێ پیاو؛گەلۆ. (برای صداکردن جمعی مرد)
ئەیلێ: بۆبانگ کردنی کۆمەڵێک ژن.(برای- صداکردن جمعی زن)
ئەین: [ناو]هەین؛ هەینی؛ جوعمە. (جمعه)
ئەینا: [بەند]ئەگینا؛ ئەگەرنا؛ دەنا. (اگرنه)
ئەینوو: هەینی.> ئەین. (جمعه)
+ ئەیە: [بەند](۱) ئایا؛ داخۆ؛ داخۆم؛ داخوا. (آیا) (۲) ئەمە؛ یە؛ ئەڤە. (این)

ئەیینی: [ناو]ئەوینی؛ ئەڤینی؛ حەزلێکەری؛ خۆشەویستی؛ مێهرەبانی. (عشق)
ئیبلیس:[ناو] یونان‌د؛ عد؛ فد: وشەی یۆنانی دیابۆلۆس؛ واتا دووزمان؛ درۆزن؛ شەیتان؛ (ب) شەیتان. (شیطان)
ئیتالیائی: (۱) پێوەندیدار بە ئیتالیاوە. (۲)خەڵکی ئیتالیا و زمانیان. (ایتالیایی)
ئێتانۆل:[ناو] فرد؛ فد؛ اند: جەوهەری شەڕاب؛ ئەلکۆلی خۆراکی؛ لە هەڵمەتکێن کردنی (تەقتیر)ی شەڕاب بە دەستدێت. (اتانول)
ئیتراک: [ناو]ئەترەش؛ زراو؛ زمندەق؛ زراور.(کیسەصفرا؛ زهره)
ئیتقات: [ناو]ئیتقاد؛ لە ئعتقادی ئارەویەوە هاتووە ؛ باوەڕ؛ عەقیدە؛ ئیمان؛ بڕوا. (اعتقاد)
ئیتوان: [ناو]هیتوان؛ جووتیار. (شخم زن)
+ ئێتۆد: اند؛ فرد؛ فد: [ناو]دەستەواژەی نیگارگەرییە، موتاڵای سەرەتایی؛ گەڵاڵەی تەڕاحی سەرەتایی؛ مەشق لە بابەت نیگارکێشیەوە. (اتود)
ئیتۆن: [ناو]کوێر. (کور)
ئێتوون: [ناو]دوژە؛ جەهەنم. (جهنم)
ئێتێر: [ناو]تراوێکی بێرەنگە و هەڵچوک؛ بۆن پێوەکردن و هەڵمژینی دەبێتە هۆی لە سەر خۆ چوون و بێهۆشی. (اتر)
ئیجارەدار:[ناو] فد: کەسێک کە شتێک بۆ ماوەیێک بە ئیجارە دەگرێت.(اجاره دار)
ئیجارەداری:[ناو] فد: بارو دۆخ و کاری ئیجارە دار. (اجاره داری)
ئیجارەنامە:[ناو] فد:نووسراوەی شەرت و شرووتی هەر شتی ئیجارەیی.(اجارەنامە)

ئیجارەنشین:[ناو] فد: دانیشتوو لە ماڵی بەکرێگیراودا؛ تێبینی: ئیجارە و کرێ پڕ بە پڕ یەکنین باغوبێستان زیاتر بە ئیجارە دەگیرێت نە بەکرێ، پیاو بەکرێ دەگیرێت نە بە ئیجارە. (اجاره نشین)
ئیجارەیی: [ئاوەڵناو] فد: (١) دانراو بۆ ئیجارە.(٢) ئیجارەکراو (اجاره ای)
+ ئیجازە:[ناو] فد: لێگەڕان؛ بوار؛ئیزن؛ (وەک: ئیجازەی مەرەخەسی، ئیجازەی ڕۆیشتن، ئیجازەی دانیشتن). (اجازه)
ئیجازەنامە:[ناو] فد: نووسراوەی ئیزن‌پێدان؛ پەروانە؛ جەواز؛ ڕەوادید؛ ویزا. (اجازه نامه)
ئیجباری: [ئاوەڵناو+ناو] فد:ئەم وشەیە ئارەوییە: لە ڕووی ناچاریەوە؛ لە ڕووی ناعیلاجیەوە؛ (ب) دوو ساڵ ئیجباری (سەربازی) خزمەتی وەزیفەی عەسکەری. (اجباری)
ئیجیارەوەری: [ناو]تیشکی خۆرەتاو؛ تیرێژ؛ (اشعه خورشید)
ئێچک: [ناو]دارێکی سەر بە قولاپە لە سەر گوریسی دەبەستن.(حلقه چوبی که به سر طناب می بندند)
ئیچ قەلا: [ناو]ئوچ قەڵا؛ لە توورکییەوە هاتووە، ناوی سێ قەڵا بەدەم یەکەوە کە میری ڕەواندوز درووستیکردوە. (سه قلعه)
ئیحتیاجی: دەستکورتی؛ پێویستی؛ ئاتاجی؛ ناتەواوی؛ حەوجەیی. (محتاجی)
ئیحتیبار:[ناو] عد؛ فد: (١) جێی باوەڕ. قسەکەت جێی ئیحتیبارە. (٢)کەسایەتی ماڵی؛ بە ئیحتیباری تۆ بانگ قەرزی پێدام. (٣) پارەی تەرخان کراو لە دەوڵەتدا؛ ئیحتیباری دەزگای کارەبا چەندەیە؟ (٤) ڕەواج؛ برِ؛ ماوە؛ ئیحتیباری پاسپۆرتەکەم سبەینێ تەواو دەبێت. (٥) بەڕێزی و کەسایەتی؛ پیاوێکی بە ئیحتیبارە.(اعتبار)
ئیحتیباردار: فد: (١) بەڵگەیێک کە ماوەی بەسەرنەچووبێت. (٢)[ئاوەڵناو] جێی باوەڕ. (٣) موحتەبەر و دارای کەسایەتی و ڕێز. (اعتباردار
ئیحتیباری‌بانکی: بەپێی فورمگەلی بانکی و شێوەی موعامەلەی موشتەری، بانک ڕادەی باوەڕ پێکراوی بەکەس یان شەریکەیێک دیاری دەکا. (اعتبار بانکی)
ئیحتیرام:[ناو] عد: فد: ڕێز؛ حورمەت. (احترام)
ئیحتینا: [ناو]حاڵەتی بەحیسابهێنان؛ لا لێکردنەوە؛ بەراخوەدان؛ ئاوڕ لێدانەوە. (اعتنا)
ئێحسان:[ناو] عد؛ فد: (١) ناوە بۆ پیاوان. (نام مردانه) (٢)ئێسحان؛ خێر و چاکە. (احسان)
ئێحیاکردنەوە: وشە ئارەوییە و زۆر جار لە-دیوانی مەولەویدا هاتووە: ئەحیاکردنەوە: بوژاندنەوە؛ زیندوو کردنەوە؛ هێنانەوەحاڵ؛ (احیا کردن)
+ ئیختیار:[ناو] عد؛ فد؛ تد: (١) دەسەڵات؛سەرپشکبوون.(٢)هۆش؛ بێ-ئیختیارکەوتن: بێهۆش‌کەوتن. (اختیار)
ئیختیاردار: [ئاوەڵناو] خاوەن؛ بە دەستبوون؛ دەسەڵاتدار؛ باوکم ئیختیاردارمە هەرچی بڵێ وا دەکەم. (اختیاردار)

ئێخدان: [ناو](١)یەغدان؛ جێگای لیباس و شتوو مەک.(صندوق)(٢)جێگای سەهۆڵ.(یخدان).
ئیخدان: [چاوگەت]چۆک پێدادان و خەواندنی وشتر؛ لە تورکیڕا هاتووە؛ یخدان. (خواباندن شتر)
ئێخسیری: [ناو]دیلی؛ کۆیلەتی؛زیندانی؛ بەندی. (اسارت)
ئیخە: [ئامرازیدەنگ]بۆ دەنگ دانی مەڕ و بزن. (صدایی برای دور کردن بز و گوسفند)
ئێخە: [ناو]یەخە؛ یێخە؛ بەرۆک. (یقه)
ئێخە و بەرک: [ناوت]یەخە و بەرۆک؛ سینگوبەرۆک. (یقه و سرسینه لباس)
ئێخەوبەرۆک: [ناوت]یەخە و بەرسینگ؛ سینگ و بەرۆک.(یقه و سینه)
ئیدارەجاتی: [ناو]کەسێک کە لە ئیدارەدا ئیش دەکات. (اداره ای)
ئیداری: [ئاوەڵناو] فد: (١) کاری ئیداری، سەیارەی ئیداری؛ کەسێک کە لە ئیدارە دا دەوام دەکات؛ (٢) پەیوەندیدار بە ئیدارەوە. (اداری)
ئیدز: [ناو]نەخۆشینی لەکارکەوتنی هێزی بەرگری لە ویرووس و هوورک کە دەبێتە هۆیچاکنەبوونەوەی زام لە لەشدا.(ایدز)
ئیدزی: [ئاوەڵناو]کەسێککە نەخۆشینی ئیدزی هەیە.(ایدزی)
ئیدوون: [بەند+ناو]هەنووکە؛ ئەلعان؛ ئێستە؛نهۆ. (حالا)
ئێدەک:[ناو]یەدەک؛ئامرازی ڕەچاوگیراو بۆ جێگۆڕکێ لەگەڵ ئامرازی یەک کەوتوودا. (یدک)
ئێدەک: [ناو]یەدەک؛ چارەوێی زیادی بەدوای سوارەوە بۆ جێگۆڕکێ و هیلاک نەبوونی ئەسپی ژێر ڕکێف. (یدک)
ئێدەن: ئەمەسە؛ ئەمەیە. (این است)
+ ئیرادە: [ناو]هێزی زاڵ بەسەر دەروونـدا. (اراده)
ئیرادەکردن: [چاوگەت]هیمەت کردن و لە خۆبڕیان؛ عەزم جەزمکردن بۆکردنی کارێک. (اراده کردن)
ئێرانی: [ناو + ئاوەڵناو] خەڵکی ئێران؛ پەیوەندیدار بە ئێرانەوە. (ایرانی)
ئێرج : بە هادار؛ بەنرخ؛ (باارزش)
ئێردانە: [بەند]ئێرانە. (اینجا)
ئێردەک: [ناو]ئێدەک؛ یەدەک. (یدک)
ئێرش: [ناو]هێرش؛ پەلامار. (حمله)
ئێرشت: [ناو]هێرش؛ هەڵمەت. (یورش)
ئێرگا: [ناو]ئاگرگا؛ هێرگا. (آتشگاه)
ئیرلەندی: [ناو+ئاوەڵناو] (١) زبانی سەڵتی.(٢) خەڵکی ئیرلەند؛پەیوەندیدار بە ئیرلەندەوە. (ایرلندی)
ئێرنگە: [بەند]ئەلعان؛ ئێستا. (حالا)
ئێروکووشن: [ناوبک] ئاور کووژێن. (آتش خاموش کن)
ئێرەتی: [ئاوەڵناو] بێتین؛ بێهێز؛خۆنەگر. (بی استحکام)
ئێرەڵ: [ناو](ئێرەڵماسی)؛ لە توورکییەوە هاتووە، (یێر: زەوی + ئاڵما: سێو) یارەڵماسی؛ سێوک؛ یرەڵماسی؛ کارتۆڵ؛ کارتۆپی؛ پەتاتە؛ سێف زەمینی؛ سێب زەمینی؛ کارتینە؛

هێرەڵماسی؛ کرتۆپڵ؛ پۆتیتە؛ کارتینک؛ کرتۆفڵ؛ پەتیتە. (سیب زمینی)
ئێرەوان: ناوی پێتەختی ئەرمەنستان. (شهر ایروان)
+ئێرەیی: (۱) خەڵکی ئێرە.(اهل اینجا) (۲)[ناو،بەرهەمی‌چاوگە] بەخێڵی؛ بەغیلی؛ بەخیلی. (حسادت)
ئێرێس:[ناو] سەرۆکی فەلەکان.(رهبر عیسویها)
ئیز:[ناو] تد؛ فد: شوێن؛ جێیا. (رد)
ئیز: [جێناو]ئەمە. (این)
ئیزافە: [ناو] فد: ئەم وشە یە فارسییە بەڵام زۆر باوە، زیادکردن؛ زۆرکردن؛ زۆرتر لە پێویست؛ لیباسی ئیزافی، نانی ئیزافی، عەلاوە ؛ زیادی؛ ئیزافە لە حەقەکەی خۆی دە تمەنم پێدا؛ زیاتر لە ئەندازەی دیاری کراو: ئیزافەبار؛ دوو بە ئیزافەی سێ دەکاتە پێنج. (اضافه)
ئیزافەکار: [ناو]کاری زیاتر لە ماوەی دیاری کراو.(لە ئیدارات باوە). (اضافه کار)
ئیزافەکاری: [ناو](۱) کارکردنی زیاتر لە ڕادەی دیاری کراو. (۲) پارەیێک کە بابەتی ئیزافە کار وەردەگیرێت. (اضافه کاری)
ئیزافەکردن: [چاوگە،ت]خستنەسەر؛ زیادکردنەسەر؛ لە ماتماتیکدا دوو ڕەقەم یا زیاتر کۆم کردنە سەریەک؛ عەلاوەکردن. (اضافه کردن)
ئێزدان: یەزدان. (یزدان)
ئێزدی: [ئاوەڵناو]پەیڕەوی دینی‌ئیزدی؛ ئیزەدی؛ یەزیدی بەهەڵە وتراوە. (ایزدی)

ئێزدین‌سەری: [ناو]جۆرێک بووزوو. (نوعی بافته از پشم بز مرغز)
ئیزگومکردن: [چاوگە،ت] شوێن گومکردن. (رد گم کردن)
ئێزگە: [ناو]شوێنی وێستان؛ ئیزگە؛ ئیستگا؛ وێستگە. (ایستگاه)
ئیزمک: [ناو]بیرۆ؛ نەخۆشینێکی‌پێستییە. (اگزما)
ئیزن‌خواستن: داوای‌ئیجازەکردن؛ داوای ئیجازەی ڕۆیشتن و خودا حافیزی‌کردن لەکاتی دەرکەوتن لە کۆڕێکدا. (اجازه گرفتن)
ئیزن‌دان: [چاوگە،ت]ئیجازە دان؛ (ب) مەرەخەس کردن؛ ئیختیار پێدان. (اجازه دادن)
ئێزەد: [ناو]ئیزەد؛ خودا. (خدا)
ئیزەدی[ئاوەڵناو]: (۱) خودایی. (۲) سەر بە دینی ئیزەدی کە بەهەڵە بەیەزیدی بەناوبانگن؛ چوونکا زۆر لە پێش یەزید دا ئەو ئائینە هەبووە. (ایزدی)
ئیزەن: [جێناو]ئەمەسە. (اینست)
ئیزیرە: [ناو+ بەند]دوێنێ. (دیروز)
ئێزینگ وان: [ناو]ئێزینگ ڤان؛ داربڕ و دار کۆکەرەوە. (هیمه چوب جمع کن)
ئێژەن: [ناو]جاچکە؛ بنێشت؛ بەنووشت؛ بهنیشت. (سقز)
ئێساکوونێ: [بەند]ئێستاکوونێ؛ ئە وێستاکە. (الان)
ئیساولا: [بەند]لە ئێستا بەولاوە؛ لەمەودووا. (منبعد)
ئیسپات‌کردن:[چاوگە،ت] عد؛ فد: دەرخستن

و سەڵماندنی ڕاستی و دروستی مەبەستیٚ بە سەنەد و بەڵگەوە؛ چەسپاندن؛ سەڵماندن؛ (بادلیل قبولاندن)
ئیسپاگێتی:[ناو] ایتالیایی‌د؛ فرد؛ اند؛ فد: خۆراکیٚ‌که له هەرشته فەڕەنگی‌دروست دەبیٚ. (اسپاگتی)
ئیسپانیائی: [ئاوەڵناو+ناو] (١) پێوەندیدار بە ئیسپانیاوە. (٢) خەڵکی ئیسپانیا و زمانیان.(اسپانیایی)
ئیسپانیۆلی: [ئاوەڵناو+ناو] ئیسپانیایی؛ خەڵک و زبانی دانیشتوانی ئیسپانیا. (اسپانیایی)
ئێسپڕانتۆ: [ناو]زمانێکی ساکار کە ساڵی ١٩١٧(ز) له لایەن (دوکتور زامینهوف) ی لەهیستانییەوە دروست‌کرا،کە لە ساکارترین وشەی زمانگەلی دونیا پێک‌هاتووە. (اسپرانتو)
ئێسپێرم:[ناو] فرد؛ فد: تۆوی نێرینەکە لەگەڵ ئـوول‌دا دەگوریٚ و لە منداڵدانـدا منداڵ (ئاوەلمە) دروست‌دەکات. (اسپرم)
ئێسپێرماتۆزۆئید:[ناو] فرد؛ فد: تۆوی نێرینە؛ ئێسپێرم. (اسپرماتوزوئید)
ئیست:[ناو] فد: (١) فەرمان بۆ وێستان؛ ڕاوەستە. (ایست) (٢) له کارکەوتن؛ وێستان؛ ئیستی‌قەلبی: ڕاوێستانی دڵ. (ایستادن؛ از کار افتادن)
ئێستادیۆم:[ناو] اند؛ فد: سالۆن (هۆڵی) وەرزشی. (استادیوم)
ئیستارت:[ناو] اند؛ فرد؛ فد؛ تد: (١) (ب) دەست پێک. (٢) سلف(کلیل)ی هەڵکردنی هەر جۆر مەکینە یان مۆتۆڕ و سەیارە؛ سوییچ لێدان. (٣) کەرەستەیێک لە سەیارەدا. (٤) هێندلی (قەدیمی). (استارت)
ئیستالاکتیت:[ناو] فرد؛ فد: ئەستوونی ئاوێزان له میچی ئەشکەوتدا لە بەردی نەرمی ئاهەکی کە بە هۆی دڵۆپەکردن پێکدیٚ.(استالاکتیت)
ئیستالاگمیت:[ناو] فرد؛ فد: ئەستوونی بەردی ئاهەکی (لەقسڵ) که له دڵۆپەی ئاو له تەختی عەرزی ئەشکەوت دا چێدەبیٚ. (استالاگمیت)
ئیستامبوولی: [ناو+ئاوەڵناو] (١) خەڵکی ئیستانبوولی تورکیا. (٢)دەفری قوڕکێشان لە بەننایيدا. (٣) پێوەندیدار به ئیستانبولەوە. (٤) جۆرێک هێرەڵماسی چکۆلە و درێژ و مەیلەو سپی ڕەنگ. (استانبولی)
ئیستانبولی‌پڵاو: [ناو]خۆراکێکٚ که به برنج و تەماتە و قیمەی گۆشت وهێرەڵماسی چیٚ-دەبێت. (استانبولی پلو)
ئیستاندارد:[ناو] اند؛ فد: (١) دیاریکردنی نموونەی (سەنعات و هەرجۆر بەرهەم) کە لە دونیا یان لە کیشوەرێکدا بەدی دیٚ بۆ پەژراندنی گشتی. (٢) مەتاعێک‌که لەگەڵ‌ئەو نموونەدا یەک بگرێتەوە. (٣) سازمان یان مەرزینگەی بەر پرسی ئەو کارە. (استاندارد)
ئێستردار: [ناو]هێسرەوان؛ خاوەن هێستر. (چاروادار)
ئێسترەگاییلە: [ناو]ئێستری بابئەسپ (باڵانی). (استری که مادرش الاغ باشد)
ئیستگا: [ناو]فد: (١) ئیزگە ؛وێستگە.(٢) جێی تایبەتی وێستانی سەیارە و قەتار. (٣) ساختومانی فەنی بۆ گەیاندنی هەندیٚ

خزمەت. ئیستگای رادیۆ؛ ئیستگای کارەبا. (۴) جێی ڕاوەستانی سپاردە بۆ کاری تایبەت.ئیستگای بازڕەسی. (ایستگاه)
ئیستۆپ : فد؛ اند.لەکوردستانی باشوور بە تورمزی سەیارە دەڵێن(استوپ؛ ترمز)
ئیستۆپا: ناوی زیارەتگای بووداییەکانە کە زیاتر لە بیچمی نیوەگۆ چێدەبێ. (استوپا)
ئیستەپڵ:[ناو] فد: تەویلەی ئەسپ و هێستر. (اصطبل)
ئیستەنسیل:[ناو] اند؛ فد: جۆرێک کاغەز. (استنسیل)
ئیستەیو: دۆزینەوە. (پیدا کردن)
ئیستەیو نەوەشی: [چاوگە،ت] پەیداکردنی چەشنی نەخۆشی؛ شناسینی نەخۆشی؛ ناسینی چلۆنایەتی نەخۆشی. (تشخیص بیماری)
ئێستەیەوە: [ناو،بک]پەیداکەر؛ دۆزەرەوە. (پیداکننده)
ئیستیبداد: [ناو] ئۆتۆکراسی؛ حکومەتی ملهوڕانە و ڕەچاو نەگرتنی ویستی خەڵک و جەماوەر؛ دژی دێمۆکرات. (استبداد)
ئیستیعارە:[ناو] عد؛ فد: دەستە واژەی شێعرییە؛ حاڵەتی دانانی وشەیێک لە ڕەستەیێکدا کە واتا و بۆ چوونێکی دیکە دە داتە دەست؛ ئیستیعارەی نزیک وەک: کەوان و ئەبرۆ یان باڵا و سەول؛ ئیستیعارەی دوور وەک: کچی بەیانی و ڕۆژ؛ چاوم لە دیمەنی کچی بەیانیە، « سوارەئیلخانی زادە». (استعاره)
ئیستیقەلبی: [ناو]ڕاوەستانی دڵ.(ایست قلبی)
ئیستیلاح:[ناو] عد؛ فد: کۆژ؛ دەستەواژە؛ (۱) وشەیێک یا ڕەستەیێکەکەلەناو هەر گروپ یا سینفێکی تایبەتدا واتایێکی تایبەتی هەیە؛ وەک ئیستیلاحی بازاڕی، ئیستیلاحی پزیشکی، (اصطلاح) (۲) بەئیستیلاح تۆبەی-کردوە. (به اصطلاح)
ئیستیوار: [ناو]فد:دەرەجەی نیزامی ئێران؛ باڵاتر لەگرووهبان. (استوار)
ئیستیوایی: [ئاوەڵناو] فد: ئەو سەرزەوینانەی کە نزیکی هێڵی ئیستیوان. (استوایی)
ئیسحاڵی خوێنی:[ناو،ت]زەحیری بەخوێن و لیمان و زگ ئێشەوە؛زەحیری باسیلی. (اسهال خونی)
ئیسڕاحەت: پشوودان؛ ئیسڕاحەت؛ بێهن وەدان؛ ئاسوودەیی. (استراحت)
ئیسراییلی: [ناو+ئاوەڵناو] خەڵکی ئیسراییل؛ پێوەندیدار بە ئیسراییلەوە. (اسرائیلی)
ئیسفاڵت: [ناو](۱) قیرتاو؛ بە تێکەڵاوەی قیر و زیخیداخ، پۆشاندنی شەقام یان سەربان. (۲) جادەیێک کە قیرتاو کرابێ. (آسفالت)
ئیسفاڵتی داخ: ئیسفاڵتیێکە تا۱۶۰دەرەجەی سانتیگراد گەرم دەکرێت. (آسفالت داغ)
ئیسفاڵتی سارد: ئیسفاڵتیێکە بە گەرمای کەم و زیخی گەورەتر چێدەکرێت.(آسفالتسرد)
ئیسفاڵتی گەرم: ئیسفاڵتێک کە تا ۱۰۰دەرەجەی سانتیگراد گەرم دەکرێت. (آسفالت گرم)
ئیسفەند: [ناو]مانگی ئاخری ساڵی هەتاوی.

(اسفند ماه)
ئیسفەنج: [ناو]گیانلەبەرێکی گیا ئاسایە؛ بێ بزوە و جوڵەیە لە ژێر ئاوی دەریادا دەژی و لاشەی دەبێتە کۆگایێکی گەورە لە جنسی وەک بەردی نەرم کە جۆراوجۆرە و ئاهەکی و سیلیسی و شاخیی هەیە و لە بەردەپاشۆرە دەکا. (اسفنج)
ئیسفەهان: (١) شارێکی ئێران. (شهر اصفهان) (٢)ئیسفەهان یا بەیاتیئیسفەهان؛ مەقامێکی مۆسیقایە کە هەندی لە پسپۆڕانی مۆسیقا دە ڵێن لە مەقامی شووردایە و هەندێکیش پێیان وایە سەربەخۆیە. (مقام اصفهان)
ئیسقانی: [ئاوەڵناو] (١)پێوەندیدار بە ئێسقانەوە؛ وەک: ئازارە باریکەی ئێسقانی.(٢) لە جنسی ئێسقان. (استخوانی)
ئێسقانیکەشکەک: [ناو،ت] ئێسقانی کاسەی ئەژنۆ؛ئێسقانی سەرزرانی؛ کەشک ئەژنۆ؛ (کشکک زانو)
ئیسقایی: [ئاوەڵناو] کەسێک کە نەخۆشینی ئیسقای هەبێ. (استسقایی)
ئیسکاتیف: [ناو]جۆرێک ڕۆنی گیاییە لە- گەڵ ڕۆنی بەزرەکدا تێکەڵاوی دەکەن بۆ زووتر وشک بوونەوەی ڕەنگی نیگارکێشی. (اسکاتیف)
ئیسکاچ: [ئاوەڵناو+ناو](١) پێوەندیدار بە ئیسکاتلەندەوە؛ (٢) جۆرێک چەسپ.(٣) جۆرێک قاپ و قاچاخ شۆر.(اسکاچ)
ئیسکاندیناوی: [ناو]بریتیە لە وڵاتەکانی سوئێد و نۆروێژ و دانیمارک و ئیسلەند و زبانیان. (اسکاندیناوی)
ئیسکلە: [ناو](١) سەکۆ و شەپۆلشکێن و بار ئەنداز لە پەڕاوی دەریادا. (٢) لەنگەرگای پاپۆڕ. (اسکله)
ئیسکۆتک: [ناو]هەنیسک.(حالت شبیه سکسکه بعد ازگریه)
ئیسکۆدۆ:[ناو]یەکەی پارەیمەملەکەتی پورتەقاڵ. (واحد پول پرتغال)
ئێسکووک: [ناو]کەوچکی داری کلکدرێژ. (قاشق چوبی دراز)
ئیسکەیت: فد؛ اند: [ناو]کەوشێکی چەرخدار یا ساف بۆ ڕۆیشتن یان خلیسکان بە سەر ئیسفاڵت یا سەر سەهۆڵیان بەسەر زەوی سافدا. (اسکیت)
ئیسکەیتیسەرسەهۆڵ: پاتیناژ؛ خلیسکێن لە سەرسەهۆڵ بە لەپێکردنیکەوشی تایبەت. (پاتیناژ)
ئیسکی: [ناو](١) وەرزشی خلیسکێن و ڕۆیشتن بە سەر بەفردا بەکەوشی تایبەت، کە لە تەختەی درێژ و باریک چێدەبێت.(٢) ناوی ئەو کایە وەرزشیە.(اسکی)
ئیسکیباز: [ناو]کەسێک کە ئیسکی- دەکات.(اسکیباز)
ئیسکییسەرئاو: جۆرێک ئیسکی، بە دەست گرتن بە تەنافی دوای قایقەوە و بە کەوشی پانی تایبەتەوە بە سەر ئاودا خلیسکان . (اسکی روی آب)
ئیسکیمۆ:[ناو] فد: (١) قەومێکی دانیشتووی باکوری کانادا و ئالاسکا و گروئینلەند و خۆر هەڵاتی سیبری. (٢) هەریەک لەئەندامانی

ئەو قەومە؛ (٣)چەشنیٚ بەستەنی. (اسکیمو)
ئیسڵاح: [ناو]لە ئارەویەوە هاتووە و لە کوردیشدا جیٚکەوتووە: (١) بەرھەمی ڕاست کردنەوەی چەوتی یا هەڵە؛ وەک : ئیسڵاحی نووسراو. (٢) کاریٚک کەدەبیٚتەچاک تر بوونی حاڵەتی هەر شت وەک ئیسلاحی نیژادی حەیوانات. (٣) کاری سەر و ڕیش ڕیٚکوپیٚک کردن یا تاشین یا کورت کردنەوەی سەر. (اصلاح)
ئیسڵاحی سەر: قرتاندن و ڕیٚکوپیٚک‌کردنی قژەسەر. (اصلاح سر)
ئیسڵاو: [ناو]چەند دەستە لە زبانگەلی هیٚند و ئوروپایی وەک زبانی ئۆکراینی، رووسی، سیٚرب، کۆرِوات، ئۆسڵەواکی، چیٚک، ئۆسلونی، لەهیستانی و نیژادی جەماوەری ئەو وڵاتانە و بۆلغارستان و موڵداوی. (اسلاو)
ئیسلاید: [ناو]ویٚنە لە سەرفیلم بۆ نیشاندان بە پرِیٚژیٚکتوِر. (اسلاید)
ئیسماعیلییە: [ناو]تیرەییٚک لە مەزهەبی شیٚعە، کە ئیسماعیلی‌کوڕی‌ئیمام‌جەعفەر بە ئیمامی ئاخر دەزانن. (اسماعیلیه)
ئیسم لەسەرکەسیٚ دانان: لەقەب لە سەرکەسیٚک دانان وەک: فاتیٚگاخوٚر و مەجید سەرەگا.(اسم روی کسی‌گذاشتن)
ئیسم و ڕەسم:[ناو،ت] فد: ناوبانگ؛ شوٚرەت؛ ناوداری. (اسم و رسم)
ئیسم و ڕەسمدار: [ئاوەڵناو] بەناوبانگ؛ مەشهوور؛ ناو دەرکردوو؛ بەناو و دەنگ. (اسم ورسم دار)
ئیسمەن: [بەند](١) لەڕووی ناوەوە؛ ئیسمەن دەیناسم خوٚیم نەدیوە. (٢) بەقسە؛ لە ڕواڵەتدا؛ ئیسمەن نوٚکەریەتی: بەزاهیر، لە ڕواڵەتدا نوٚکەریەتی. (اسماً)
ئیسمی‌شەو: [ناو]درکاندنی ڕەمزی شەو بوٚ هاتوچوٚ و عەلامەتی خوٚیی‌بوون؛ بە تایبەت لە عەسکەریدا. (اسم شب) ئیسمی‌فامیل:فد: شوٚرەت؛ ناوی‌گەورە (شهرت)
ئیسنوٚمبیل: اند؛ فد: [ناو]ماشینی بەفرماڵینی جادە و شەقام؛ سەیارەی سەر بەفر؛ (اسنومبیل)
ئیسوٚتی: [ناو]ئیسیوەت؛ ئاڵەت.(فلفل سیاه)
ئیٚسوٚ: بانەگر؛ پەنابا. (پناهگاهی که از باد در امان باشد)
ئیسە: [بەند]ئیٚستە؛ ئیٚستا. (حالا)
ئیسەرەم: [بەند]تد:ئیستەرەم: دەمەویٚت؛ دەبیٚ؛ وشەی پیٚداگرتن؛ حەتمەن و پیٚویست؛ لە ئیستەرەمی تورکییەوە هاتووە بەواتای:دەخوازم. (باید)
ئیسەنی: [بەند]ئیٚستاکە. (هم اکنون)
ئیشارە:[ناو] فد: هیٚما و ئاشیرەتکردن بە دەس و چاو یا هەر شتی‌تر؛ بە نووسین یا قسەی ناڕاستەوخوٚ، سووکە ئاماژە پیٚکردن. (اشاره)
ئیشارەت: [ناو]هیٚما؛ ئاماژە؛ ئاشیرەت؛ (دەمیٚ توٚ نەینیٚی شەو لە نیٚوی دەم ، خودا بیبرِیٚت ئیشارەت بەچم) (اشارت)
ئیشارەت‌کردن:[چاوگە،ت]بەهیٚما و ئاماژە تیٚگەیاندن؛ بەقامک نیشاندان و ئاماژە کردن؛ سووکە ناوبردنیٚ لە قسە یا نامەدا. (اشاره کردن)

ئێشازراف: [ناو]ئازارەباریکە؛ سیل.(سل)
+ ئێشان: (۱) جێنـاو] ئـەوان. (آنهـا)(۲) ژان؛ گل؛ ژان کردن. (دردکشیدن)
ئێشاندن: [چاوگە،ت]وەئێش هێنـان؛ وەژان- هێنان. (به درد آوردن)
ئێش بەدەست: [ئاوەڵناو]کاربەدەست؛ کەسێک کە لە سەرکارێکە. (کار به دست)
ئێشپیل: فرد؛ فد: [ناو]خشپیل؛ تـەلێکـی دوو توێکراو کـە دووای بـەستنی پـێچ و مـۆرەی (تایبەتی کوندار) لـەو کونـەی ڕۆدەکـەن بـۆ ئەوەی شل نەبێتەوە پەرچـی دەدەنـەوە؛ لـە کوردەواریدا بووە بە خشپیل. (اشپیل)
ئێشپیل: فـد: [نـاو]گـەرای ناوسـکی ماسـی. (اشپل)
ئێشتیاکردن: [چاوگە،ت]ئـارەزووکـردن؛ دڵ- پیوەبوون. (اشتها کردن)
ئێشـــتیاکوێربوونەوە: لـــە ئێشـــتیاکەوتـــن؛ بەسەرچوونی مـەیلـی خـواردن.(اشـتها کـور شدن)
ئێشتیالێبوون: [چاوگە،ت]دڵبە خۆراک یـان شتێکەوەبوون؛ تامەزرۆیـی؛ مـەیـل لێبـوون. (اشتهاداشتن)
ئێشتیانەبردن: [چاوگە،ت](ب) تێر خـواردن و دڵنـەبـردن؛ ئـارەزووی خواردنێـک چوونـە بـەس؛ حـەز بـە خواردنێـکنـەکـردن. (میل نداشتن)
ئێشتیاهەڵسـان: [چاوگـە،ت] پـەیـدا بـوونی مەیل و هەوەس بۆ خواردنی خۆراکێک یـان کردنی کارێک. (هوس کردن)
ئێشتیها: [ناو]ئێشتیا. (اشتها)

ئێشدار: [ئاوەڵناو] ژاندار؛ ساحیب ئێش. (درد دار)
ئێشدار: [ئاوەڵناو]کەسێککـە دارای کارێکـە؛ شوڵدار. (دارای کار)
ئێشکاوهاتن: بڕانەوەی ئاو. (ب) هەر شت کـە دووایی بێ. (قطع شدن)
+ ئێشک کردن: [چاوگە،ت](۱) وشک کـردن؛ ئاو لێچنین.(۲) ڕێگای ئاو بڕین. (۳) کانییەکە ئێشکی کردووە: ئاوی لێنایێت؛ تـەواو بـوونی ئاوی کانی.(خشک کردن)
ئێشک‌وبرینگ: [ئاوەڵناو] وشک‌وبرینگ؛ هیچ تەڕایی تیادا نەبوون.(خشک‌خشک)
ئێشکەبەند: وشکە سەرمـا. (سـرمای سـخت بدون برف و باران)
ئێشـکەپـەڕ: [نـاو،ت]ڕەحـەت بـوونی بـێ- نزیکایەتی ژن و مێردی؛زیاتر بۆ حـەیوانـات بەکاردەبرێت. (انزال بی جماع)
ئێشکەجاو: [ناو،ت]ئێشکەجوو؛ نـانی وشـکی خواردن؛ نانی بێپێخۆر خـواردن. (نـان خـالی خوردن)
ئێشکەچن: [ناو]دیواری بەردی بێمـەلات و قوڕ؛دیواری بە بەردهە ڵچنراو. (دیوار سـنگی بدون ملات)
ئێشـــکەشـــیو: [نـــاو]ئێشـــکەشـــۆر؛(ب) هەڵگەڕاندووەی لیباس بە دیوی تـازەتریـدا. (برگرداندن لباس بر رویه تازه تر)
ئێشکەمەلە:[ناو](ب) حەمام چوونی بە لـەش پاکی. (حمام بدون جماع)
+ ئێشک‌هەڵاتن:[چاوگە،ت]ڕەق‌بوونەوە و لە سەرما وشک‌هەڵاتن. (از سرما یخ بستن)

+ ئیشـکیل: [نـاو](١) دەسـەڵـات؛ حـوکم؛ فەرمان. (حکم) (٢) بە دەستوپا بەستنەوەی وڵاخی بەرزە و هەر چوارپێی دیکە.(دستو پا بستن‌اسب و استر)
ئیشـکیل‌کـردن: [چاوگـە،ت]دەسـتبەنـد و پابەندکردنی وڵاخی بەرزە (پابندو دستبندزدن چهارپایان)
ئیش‌لێهاتن:کار لە دەس‌هاتن. (توانائی‌کار)
ئیش‌لێهاتوو: [ئاوەڵناو]کارلێهـاتوو؛ کـەسێک کە توانایی کردنی کاری هەیە؛ (ب) کـارزان؛ پسپۆڕ؛ کارئازموودە؛ سەردەرچوو. (کارآمد)
ئیشن: دەڵێن؛ ئووشن؛ دەبێژن؛ ئێـژن. (مـی گویند)
ئێشوو: [ناو]هێشو؛ بۆڵ. (خوشه)
ئیشەڤ: [ناو+بەند]ئەوشۆ؛ ئەمشەو؛ ئـەمشـۆ؛ ئیمشەو. (امشب)
ئیشی: ئووشی؛ دەڵێی؛ ئێژی. (میگویی)
ئیعتیادییە: لـەکوردسـتانی باشـوور بـەواتـای (ئاساییە) بەکار دەبرێت.(عادی)
ئیعدامی: فد: (١) [ئاوەڵناو] ئیعدام کـراو. (٢) مەحکووم بووە بە ئیعـدام و چـاوەڕێـی بـە-ڕێوەچوونی حوکمە. (٣) (ب) زۆر بۆی‌هـەیـە مەحکووم بە ئیعدام بکرێت. (اعدامی)
ئێف ئێف: [ناو]کەرەستەی دەرکە کـەرەوەی کارەبایی. (آیفون)
ئیفادە فرۆشتن: بەخۆنازین و دەعیـە و دەمـار بە خەڵک نیشاندان؛ لووت بـەرزی نووانـدن. (افاده فروختن)
ئیفاقـە: [نـاو]فایـدە؛ موفـا؛ حاڵـەتـی چـاکتر کردنـەوە؛ دەرمانـەکـە ئیفاقـەی‌نییـە؛ واتـا کەڵکی‌نییە. (افاقه)
ئیفاقەکردن: [چاوگە،ت]بـە لـەشـت و موفـا بوون؛ بەکەڵـک بـوون؛ بـەهـرەدان. (افاقـە کردن)
ئیفت: [ناو](١)زایەبووگ؛ ئیفت لێدەر کـردن: دەرهاوێشتنی خەوش وخاڵ؛(٢) کەمکردنی-کێشی دانەوێڵە لە هەماردا بـە هـۆی وشـک بوونـەوە؛(٣) خـەوش و ناڕاسـتی و درۆ لـە گێڕانەوەی باسێکدا، قسەکانی گشـتی وانییـە ئیفتی زۆرە. (٣) سووکی و کەسری‌شان؛ (ئەو کارە بۆ تۆ ئیفتی‌هەیە) (افت)
+ ئیفتیخار: لەقەمـی عـەبـدولاخانی ناهیـد، نووسەر و ئوستادی‌تار و نیگارکێشی کورد کە بۆ ئەوەڵین جار لە ساڵی ١٢٩٢ هـە) تـاری-شیرازی هێنایە کوردسـتان (گونـدی‌سـلێمان کەندی لەناوچەی سەقز).(لقب‌استاد عبدالـه ناهید)
ئیفدار: دوژمندار؛ غەنیمدار.(دشمن‌دار)
ئێڤنۆتە: [ئاوەڵناو] ساغ و سەلیم؛ لەش‌سـاغ. (تندرست)
ئێڤەر: [ناو]وانێک؛ هین؛ شت. (چیز)
ئیقدانـەوە: (١) سـەر ڕێـژی ئـەسـتێر؛ حێـق کردنـــەوە. (ســـرریز اســـتخر)(٢) (ب) جـەمـاوەرێکـی زۆر کـە لـە جێگایێکـەوە دەرکەون.(یکباره جمعیت زیـاد بـراەافتـادن) (٣) هەڵهێنانەوەی خۆراک. (استفراغ)
ئێک‌بیر: [ئاوەڵناو] هاوبیر؛ یەک هـەڵویسـت. (همفکر)
ئێکران: فد: (١)<یەکران.(٢)[نـاو] پـەردە ی سپیی سینەماکـان کـە وێنـەی‌فیلمیـان دە

کەوێتە سەر؛ (ب) نیشاندانی فیلم لە سینە ماکان؛ هێشتافیلمەکەمان ئێکران نەبووە. (اکران)

ئیکس: [ناو](۱) ناوی پیتێکی ئەلفو بێی فەڕانسە و ئینگلیزی. (ایکس) (۲) (ب) ئەو پیتە دروشمی بەرپێوار و نادیارە؛ تیشکی ئیکس: تیشکی نادیار. (مجهول)

ئێکۆ: فرد؛ فد؛ [ناو](۱)ئاوێژە و زایەڵەی دە نگ (۲)> ئەوتۆ؛ شایانیباس. (اکو؛ قابل؛ مهم)

ئێکی: [ناو]یەکییەتی؛ یەکێتی. (اتحاد)

+ ئێگرە: [بەند]ئەگرە؛ ئێرە. (اینجا)

ئێگزۆز: اند؛ فرد؛ فد؛ تد: [ناو]بۆڕیی جێی دەرچوونی دووکەڵی سەیارە؛ جێی دەرچوونی دووکەڵی مۆتۆڕ. (اگزوز)

ئیگلوو: [ناو]سیپە یا ماڵی لە بەفر چێکراوی ئیسکیمۆکانی ئالاسکا. (ایگلو)

ئێگۆ: فد؛ فرد: [ناو](۱) کانگای نەوتی ژێر زەوی. (۲) ڕەهەندی ئاوە ڕۆی پیساوی شار. (اگو)

ئیگە: (۱) ئەمدانە؛ ئیگلە. (این یکی)(۲) ئیستا. (حالا)

ئیلا: ئەملا. (این طرف)

ئیلاغا: [ناو]ناوی لەوەڕگەییێکە لە ماردین. (نام علفچریست در ماردین)

ئیلامی: [ئاوەڵناو+ناو] (۱) پەیوەندیدار بە ئیلامەوە. (۲) خەڵکیئیلام (شارێکەلەئێران). (۳) خەت و زمانی قەومی کەونارای ئیلام. (ایلامی)

ئیلاوئەولا: [جێناو]ئەملاوئەولا(اینطرف و آنطرف)

ئیلاهە: ناوی یەکێ لە خوداکانی مێوینە لە ئائینەکەونارا کاندا. (الاهە)

ئیلاهی: عد؛ فد: خودایمن؛ خودایا؛ یاخودا؛ (الاهی)

ئێلچی: تد؛ فد: [ناو] (۱) سەفیر؛ باڵوێز. (۲) دەستەی خوازبێنیکەر.(ایلچی)

ئێلخان: تد؛ فد: (۱) سەرۆکعێل.(۲) لە تایفە و هۆزی ئێلخانانی مەغوول. (۳) خاتوونی عیل؛ خانمیعیل.(ایلخان)

ئێلخی: [ناو](۱) ڕەوەئەسپ. (۲) جێگای ڕاگرتنی ئەسپ. (۳) (ب) بێسەروبەر و بێ ئەدەب لە هەڵسوکەوتدا. (ایلخی)

ئیلدرم بیلدرم: تد؛ فد: [ناو]بەهەڕەشە و گوڕەشەوە قسەکردن؛ هارت و پورت. (الدرم بلدرم)

ئێلغار: تد؛ فد: [ناو]ڕۆیشتن بە ڕکێفکوت ڕوو بە دوژمن لە شەڕدا و کوشتن و بڕین و تاڵان و بڕۆ. (ایلغار)

ئێلم: [ناو](۱) هیلم؛ چەسپی دارتاشی. (سریشم) (۲) چیاییێکە کە بۆ کوردان ڕێز دارە لە جزیر و بۆتان. (کوهی است کە برای کردها مقدس است)

ئیلمە: [ناو]هیلمە؛ گرێی فەڕش. (گره فرش)

ئێڵنج: [ناو] هێڵنج؛ دڵبەیەکاهاتن؛ حاڵەتی ڕشانەوە. (دل آشوب شدن)

ئیلۆک: [ناو]هەڵۆ. (عقاب)

ئێلەقە: [ناو]ئاموور؛ ئارەق؛ ئاقیلە؛ باسکێش؛ ئێرە قە. (چوب دراز خیش)

ئێلیان: [ناو]هێلانە. (آشیانە)

چەند وشەی بیانی‌کە لە گۆوار و بڵاڤۆکەکاندا بەرچاو دەکەون یان لەپەیڤیندا بەکاردەبرێن، ئەگەرچی کوردی نین، بەڵام بەپێویستم زانی چەند لاپەڕەیان بۆتەرخان‌بکەم

ئابار: [ناو]تیزاوی سولفیتی قورقوشم؛تاواوەی تیزاوی‌سولفوریک و قورقوشم. (سولفیت سرب)

ئاباژوور: فد؛ فرد؛ اند: [ناو]سەرپۆشیٚ بۆ کەم (مولایم)کردنی نووری‌چرا؛ بەتایبەت شەوقی گولۆپی‌کارەبا. (آباژور)

ئاب نەبات :ئاو نەبات: [ناو،ت] فد: جۆرێک - شیرینی. (آب نبات)

ئاب‌وتاب: [ناو،ت] فد: ڕازاندنەوە لە قسەگێرانەوە دا، لق و پۆپ زیادکردن لەگێرانەوەی قسەیێکدا. (آب و تاب)

ئابی: [ناو] فد:(ف. گیو) :(١) ڕەنگی ئاسمانی. (آبی آسمانی) (٢) [ئاوەڵناو] ئاوی؛ هەر شتیٚ‌کە پەیوەندی بە ئاوەوە ببیٚ؛ حەیوانی- ئاوی؛ زەوی‌ئاوی؛ ئاوەژی. (آبی)

ئابیابی: [ناو،ت] فد: (١) کاری دۆزینەوەی ئاو لە ژێر عەرز. (ردیابی آب زیر زمینی) (٢) کاری قوماربازێک کە بانکی پڕبووە و هەر کایە بەردەوام دەکا. (کارقمار بازیکه بانکش پر شده وادامه می دهد. آبیابی)

ئاپارات: روس‌د؛ فد؛ تد: [ناو](١) ئامرازی نیشاندانی فیلمی سینەمایی. (٢) ئامرازی گەرم‌کردن و پەنچەرگرتنی تیوپی تەگەری سەیارە. (آپارات)

ئاپاراتچی: تد؛ فد: [ناو]کەسێکە لە سەر ئامێری ئاپارات کاردەکا. (آپاراتچی)

ئاپارتمان: فد؛ فرد؛ اند؛ تد: شوقە؛ بینای چەند قاتی بیٚ‌حەسار زیاتر هەرقات ملکی کەسێک بێت؛ یا سەربەخۆبێت. (ساختمان چند طبقه مستقل)

ئاپارتمانسازی: [ناو]کار و ڕەوتی دروست- کردنی ئاپارتمان. (آپارتمان سازی)

ئاپارتمان نشینی: فد: [ناو]نیشتەجیٚ‌بوون و ژیان لە ئاپارتماندا. (آپارتمان نشینی)

ئاپارتاید: فد؛ فرد؛ اند: [ناو]جیاوازیی‌نیژادی؛ ڕەگەز پەرەستی. (آپارتاید)

ئاتۆ: [ناو] فرد؛ فد؛ اند:(١) بەڵگی سەرکەوتوو لە قوماردا.(٢ب) هۆی پەڵپو بەهانە.(آتو)

ئاتەش: [ناو]فد: ئاور؛ ئاگر. (آتش)

ئاتەشبار: [ناو،ت] فد: (١) گورهانی‌تۆپخانە کە سیٚ دەستەی ٢٧کەسییە لە ئەرتەش (سوپا)دا. (واحدتوپخانه) (٢) یەکەی تۆپی شەڕ؛ مەترەلۆس. (توپ)

+ ئاتە شپارە: [ناو،ت] و [ئاوەڵناو،ت] فد: ئاورپارە؛ سکڵی‌ئاور (ب) زبر و زرینگ؛ زیت و وریا؛ هاروهاج؛ نەسرەوت؛ کار لەدەس‌هاتوو. (آتش پاره)

ئاتەشپەرەست: [ناو،بک] فد:ئاورپەرست؛ (ب) گاور، زەردەشتی. (آتش پرست)

ئاتەش‌چەرخان: [ناو،ت] ئاتەشگەردان، تاولەمە. (آتش گردان)
ئاتەشدان: [ناو،ت] فد: جێی‌ئاور؛ کوچک‌ئاور؛ کوانوو؛ مەنقەڵ؛ ئاوردان؛ کوانگ؛ کوورە؛ کووری؛ مەنقەل؛ وەجاخ؛ ئوجاق. (آتشدان؛ آتش‌زدن)
ئاتەشکێش: [ناو،ت] خاک‌ئەنداز؛ خاکەندازی بچووک کە دەمەکەی کەمێ نوشتاوەتەوە بۆ نزیک کردنەوەی سکڵ لە کوورەدا؛ خاکەناز. (آتش کش)
ئاتەشگەردان: [ناو،ت] فد: تاولەمە. (آتش گردان)
ئاتەشگیر: فد: (ئاوەڵناو،ت]۱) شتێک کە زوو ئاور بگرێت. (مواد محترقه) (۲) [ناوی‌تێکەڵاو] مقاش. (منقاش)
ئاتەشی مەزاج: [ئاوەڵناو،ت] فد: (ب) حاڵەتی کەسێک‌کە زوو تورە دەبێت. (آتشی مزاج)
ئاداب: [ناو] عد، فد: (۱) زووخاو؛ کێم. (خونابە)(۲) کۆی ئەدەب؛ ئاداو؛ ڕەسمگەل؛ داب و نەریت؛ کۆی یاسا و ڕێ و ڕەسم و نەریت؛ داب. (آداب)
ئادابزانین: [چاوگە،ت] ئاگابوون لە چۆنیەتی ڕەسم و یاسا و داب و نەریت. (آداب دانی)
ئادابی موعاشیرەت: عد؛ فد: ڕەسمگەلی هەڵس‌وکەوت، داب و نەریت و یاساگەلی باو لە کۆمەڵدا. (آداب معاشرت)
ئادمیراڵ: فد؛ عد:[ناو]دەرەجەی‌ژێنراڵی هێزی دەریایی.(درجه نظامی نیروی دریایی)
ئادەم‌کوژ: [ئاوەڵناو] (ف مشە) مروڤ‌کوژ، قاتڵ.(قاتل)
ئادینە: عد، فد: [ناو]هەینی؛ جومعە. (جمعه)
ئارامبەخش: [ئاوەڵناو] فد: (۱) داسراکێن؛ هێدیکەر؛ سوکناییدەر؛ دامرکێن؛ هێورکەر؛ سرەوینەر.(۲ب) [ناوی‌تێکەلاو]دەرمانی ئێش‌بەر. (آرام بخش)
ئارامپەز: [ناو،ت] فد: مەنجەڵی (کارەبایی) کەزۆر بەشێنەیی (بە تینی کەم) چێشت دەکولێنێ. (آرام پز)
ئارامش: [ناو] فد:(۱) هێمنایەتی و نەبوونی زەنازەنا و شەڕ و شۆڕ.(۲) سوکنایی؛ هێمنی. (آرامش)
ئارامگا: [ناو،ت] فد: (۱) گومەز و بارەگای سەرگۆڕ. (گنبد) (۲) گڵکۆ، قەبر؛ گۆڕ؛ مەزار. (قبر) (۳) جێی حەسانەوە. (جای آرام گرفتن)
ئارامگای سەربازی ون: فد: ئارامگای سەربازی نەناسراو؛ مەزارێک کە بۆ ڕێز گرتن و بە یادی تەواوی شەهیدانی شەڕێک دروست دەکرێت؛ گۆڕی سەربازی ون. (آرامگاه سرباز گمنام)
ئاڕایشگەر: [ناو،بک] فد: شانەکار؛ خەملێن؛ جوانکەر. (آرایشگر)
ئارایشگەری: فد:[بەرهەمی چاوگە] کاری ئارایشگەر؛ شانەکاری. (آرایشگری)
ئارایشی جەنگی: فد: دابەشکردن و جێگیرکردن و چنینی هێزەکان لە مەیدانی شەڕدا. (آرایش جنگی)
ئارایی: [پاشگر] ڕازینەری؛ وەک: سفرەئارایی؛ سەفحەئارایی؛ مەجلیس ئارایی. (پیواژە ؛ آرایی)
ئارتیست: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]شانۆکار؛

کایەکەری سینەما و شانۆ؛ ئەکتەر. (آرتیست)
ئارتیستبازی: فد؛ اند؛ فرد: [ناو]کاری سەیروسەمەرە کردن بۆ خۆنواندن. (آرتیست بازی)
ئارشیتێکت:فد؛ اند: [ناو] ئەندازیاری پلان-کێشی (نەخشە کێشی)بیناسازی (آرشیتکت)
ئارشیو: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] کۆ بەڵگە؛ جێگای ڕاگرتن و ئاگاداریکردن لە بەڵگە و نوسراوە و گۆڤار. (آرشیو. بایگانی)
ئارەق‌گیری: [بەرهەمی‌چاوگە] ئارەق‌کێشی. (عرق گیری)
ئازارگەری: فد:[ناو]کاری ئازارگەر؛ سادیسم، ئەشکەنجەگەری. (آزار گری. سادیسم)
ئازمایش:فد: [ناو]ئاروین؛ ئەزموون؛ تاقیکاری؛جەڕباندن؛ لە (ف.مشە) یشدا هاتووە. (آزمایش)
ئازمایشگا:[ناو] فد: تاقیگە؛ ئەزموونگا. (آزمایشگاه)
ئازمایشگەر:[ناوی‌بک] فد: تاقیکار؛ ئەزموونکار؛ (امتحان کننده. آزمایش‌کننده)
ئازمایشی: فد: بۆتاقیکاری؛ بۆ ئازمایش؛ ئەوەڵ فڕینی فڕۆکە ئازما یشییە.(آزمایشی)
ئازموون: فد: [ناو]ئەزموون؛ ئاروین؛ تاقیکاری؛ تە جروبە؛ لەوکارە ئەزموونم وەرگرت. (تجربه)
ئاسایشگا: [ناو] فد: جێگای ئاسودەیی و خەوتن و ئیسراحەت؛ وەک ئاسایشگای (بەساڵا چووان؛ قوتابیان؛ ئیفلیجەکان؛ موعتادەکان؛ نەخۆشەکان لە (ف.مشە)یشدا هاتووە (آسایشگاه)

ئاسیستان: فرد؛ فد؛ اند: [ناو](١) دووای تەواو کردنی زانستگای پزیشکی کارکردن و فێر بوون بە کردەوە لە بەردەستی ئوستاد دا.(٢) وەردەست؛ بەردەست؛ کومەک؛ یاریدەدەرر. (آسیستان)
ئاشام: فد: پاشگر: هەڵلووش؛ وەک خوێن ئاشام. (پیواژە: مانند خون آشام)
ئاشپەزباشی: تد؛ فد: [ناو،ت]سەرئاشپەز؛ سەرکردەی ئاشپەزگەل؛ باش لە تورکییەوە هاتووە بەواتای سەر؛ باشی: سەرکردە. (سر آشپز. آشپز باشی)
ئاشپەزخانەی ئۆپێن: اند؛ فد: [ناو] ئاشپەزخانەی ئاواڵەی مۆدی تازە کە لە لایێکەوە دیواری نییە و زۆرتر ڕوو بە ساڵۆنی مێهمانی ئاواڵەیە. (آشپزخانه اپن)
ئاشووب:[ناو] فد: ئاژاوە؛ شەڕ و کێشە؛ ئاڵۆزی؛ پشێوە. (آشوب)
ئاشووب‌گێڕ: [ناوبک+ئاوەڵناو] ئاشووبگەر؛ کەسێک‌کە ئاشووب بەرپا دەکا؛ خومشێوێن؛ ئاژاوەچی؛ پشێوەچی؛ شەڕهەڵخڕێن. (آشوبگر)
ئاشووبگەر: [ئاوەڵناو،ت] فد: ئاژاوە چی؛ پشێوێن؛ گێرەشێوێن؛ تێکدەر؛ شەڕهەڵخڕێن؛ خوم شێوێن.(آشوبگر)
ئاشووبگەری: فد: [ناو،بەرهەمی چاوگە]کاری ئاشووب نانەوە؛ پشێوە و ئاژاوەدروستکردن؛ شەڕ دروست کردن.(آشوبگری)
ئاشووب‌گێڕان: [چاوگە،ت]کێشەنانەوە و شەڕهەڵایسان؛ ئاژاوە دروستکردن؛ شەڕهەڵخڕاندن. (آشوب بپا کردن)

ئاشووبنانەوە:[چاگ،ت]کێشە هەڵایساندن،شەڕ دروستکردن، ئاژاوە بەرپاکردن.آشوب‌بپاکردن)
ئاشوفتە: [ئاوەڵناو] (وشە فارسییە بەڵام زۆر لەسەر زمانانە) ئاشفتە؛ شێواو؛ شڵەژاو؛ تێک-چوو؛ ئاڵۆز؛ شێویاگ؛ هەڵشیواو. (آشفتە)
ئاشوفتەبازار:[ناو]کەس‌لەکەس؛ شێواو؛ شلۆق و پلۆق. (آشفتەبازار)
ئاشوفتەحاڵ: [ئاوەڵناو] فد: حاڵ‌شێواو؛ شپرزە و شڵەژاو؛ پەشێوحاڵ. (آشفتە حال)
ئاشوفتەخەیاڵ: [ئاوەڵناو] فد: فکرشڵەژاو؛ فکرپەرێشان؛ خەیاڵ‌بڵاو. (آشفتە خیال)
ئاشوفتەدڵ: [ئاوەڵناو] فد: دڵ‌نیگەران؛ دڵ-پەشێو؛ دڵ‌پەرێشان. (آشفتە دل)
ئاشوفتەیی: [ناو]شپرزەیی؛ بێ‌سەر و بەری؛ شێواوی؛ پەرێشانی. (آشفتگی)
ئاشیان:[ناو] فد: لە مەموزیندا هاتووە: ئاشیانە؛ هێلانە؛ هێلوون.(آشیانە)
ئاشی‌ڕشتە: [ناو،ت]ئاشی‌هەرشتە؛ ئاشێک کە بە دانەوێڵە و سەوزی و هەرشتەفەڕەنگی چێ‌دەبێت و کەشکی ساوراو لەگەڵ نەعنا داخی بەسەردا دەکەن. (آش رشتە)
ئاشی شولە قەڵەمکار: [ناو](١) ئاشی شلەقەڵەمکار. (٢) (ب) شوبهاندن بە کاری ئاڵۆز و تێکەڵ‌پێکەڵ؛ هەر شتی دەرهەم و بەرهەم. (کارشلوغ پلوغ)
(٣) ناوی چێشتێکی تراوە بە هەرشتە فەڕەنگی و دانەوێڵە و سەوزی چێ‌دەبێت. (آش شلە قلم کار)
ئافتابڕوو: فد: [ئاوەڵناو] وەتاغی ڕوو بە ڕۆژ؛ جێگایێک کە تاو بیگرێت. (آفتابگیر)
+ ئافتامات: روس د. فد. [ناو](١) جۆرێک موسەلسەلی خودکار. (ئە سڵە حە ی خودکار)
(٢) ناوی کەرەستەی خودکارکردنی کارەبای سەیارە.(وسیلە
خودکار کردن برق ماشین.آفتامات)
ئافتاو: [ناو]خۆر؛ ڕۆژ؛ هەتاف؛ هەتاو ناوە بۆزنان؛ لە (ئافتاب)ی فارسی وەرگیراوە. (آفتاب)
ئافتاو پەڕ: [ناو،ت]ڕۆژپەڕ؛ (غروب)
ئافتاوی: [ئاوەڵناو] (١) ڕۆژی‌بێ‌هەور؛ خۆرە-تاو. (آفتابی) (٢) ئاشکرا؛ ئافتاوی بوون: خۆ دەرخستن؛ دەرکەوتن. (واضح)
ئافەت: فد، عد: [ناو] (١) بەڵا؛ وەی؛ نەخۆشی. (٢) مێمل. (آفت)
ئافەتی ئاسمانی: فد: بەڵای ئاسمانی؛ وەک : بوومەلەرزە؛ قڕکەوتنە نێو ماڵات وشکەساڵی.(آفت آسمانی)
ئافەتی ڕۆح: فد: مێملی ڕۆح، بەڵای گیان. (آفت روح)
ئافەتی‌عەنبار: ئەو جانەوەرانەن کە شتی عەنبارکراو لەبەین دەبەن وەک: مشک؛ کرم؛ سپی؛ مۆریانە. (آفت انبار)
ئافەتی‌گەنم: وەک: هەوربردن؛ سن؛ ژەنگ؛ بێبارانی بۆ دێم؛ سپێی‌گەنم،کوللە؛ ئەو شتانەکە گەنم لەبەین دەبەن.(آفت گندم)
ئافەتی‌گیایی: فد مێملی گیایی؛ بەڵای لە بەین‌بردنی باغ و زەرحات وەک: سن؛ کوللە؛ ژەنگ؛ کرم؛ بژار. (آفت گیاهی)
ئافیش: فرد؛ فد: [ناو]ئێتیلاعیە بۆ هەڵواسین

و ئاگاداری؛ زیاتر بە وێنەوە؛ دەستەواژەی سینەمایی(ئەکتەری حازر بەکار و ئامادە بۆ فیلم بەرداری. (آفیش)
ئاکاردئۆنی: [ئاوەڵناو] فد: حاڵەتی شتێ کە وەک گەڕەمەشکە درێژ و کورت ببێتەوە. (آکاردئونی)
ئاکادیمی:[ناو] فرد؛ فد: جێگای فێربوونی فەن یا زانستێ بەکردەوە و خوێندن، لە ناوی باخێ وەرگیراوە لە یۆنان کە ئەفلاتوون دەرسی(وانە)ی فەلسەفەی تێدا گوتووەتەوە؛ کۆڕی زانیاری؛ ئەنجومەنی عیلمی. (آکادمی)
ئاکادیمیک: [ئاوەڵناو] فرد؛ فد؛ اند: زانستگایی؛ (ب) خوێندنی زانستگایی. (تحصیل دانشگاهی)
+ ئاکتۆر: فرد؛ اند؛ فد: [ناو]کایەکەری پیاو لە شانۆ و فیلمی سینەماییدا.آکتور)
ئاکتۆرێس: [ناو]ژنی شانۆگەر؛ ئەکتەری ژن.(زن بازیگر)
ئاکتیف: اند؛ فد: پڕکار؛ لەکارا؛ بەکار؛ کارا؛ لەحەرەکەتدا. (فعال)
ئاکسان: فد؛ اند؛ فر: لێدانی نۆتێکی تایبەت لە ناکاو و پێداگری لەسەر ئەو نۆتە لە ئۆرکێستردا. (آکسان)
ئاکواریۆم: فرد؛ فد؛ اند: دەفری شووشە بۆ ڕاگرتنی جانەوەری ئاوە ژی. (آکواریوم)
ئاکۆرد: اند؛ فرد؛ فد[ناو]چەند نۆتی مۆسیقایی هاو فرێکانس کە پێکەوە لێبدرێن. (آکورد)
ئاکۆلاد: فرد؛فد: [ناو]وەک دوو ئەبرۆی پەیوەسی بەرانبەر بەیەک کە چەند پەرانتیز دەگرێتە بەر و جیایان دەکاتەوە؛ بۆ جیا کردنەوەی وشەگەل و ڕستەگەل بە کار دێت،وەک: {}(آکولاد.
ئاگراندیسمان: فد؛ فرد؛ اند: [ناو](١) گەورە کردنەوەی وێنە. (٢) کاری گەورە کردنەوەی وێنە. (٣) (ب) گەورە نیشان دانی ڕووداوێک لە گێڕاندنەوەدا. (٤) کەرەستەی گەورە کردنەوەی وێنە. (آگراندیسمان)
ئاگنۆستیسیسم: فد؛ اند: [ناو]مەکتەبی نەزانین گەری. (اگنوستیسیزم)
+ ئاڵایش: فد: [ناو]ئالایش؛ ئالوودەیی؛ خوو وخدەی ناپەسەند؛ خەوش؛ تێکەڵاوی. (آلایش)
ئاڵترناتیف: [ئاوەڵناو] اند، فرد؛ فد: جێنشین؛ عەوەز؛ یاگەگر؛ جێگر؛ پەسندکراو و بەرگەم کراو بۆ دانانەجێ. (آلترناتیو)
ئاڵتۆ: فرد؛ اند؛ فد: [ناو]دەنگی زیلی ژنانە لە ئاوازی کۆڕدا. (صدای زیر زنانه در کر)
ئالۆمینیۆم: [ناو] فافۆن. (آلومینیوم)
ئالۆمینیومی: [ئاوەڵناو] هەرچی لە فافۆن چێکرابێ؛ وەک:دەفری ئالۆمینیۆمی. (آلومنیومی)
+ ئالوودە: [ئاوەڵناو] فد: شتتێوەچوو؛ تێکەڵاو بەشتیپیس بوو؛ گیرۆدەبوو؛ تووشبوو بە-خراپە؛ خوو پێگرتوو. (آلوده)
ئالوودەیی: [ناو،بەرهەمی چاوگە] (١) گیرۆدەبوویی؛ حاڵەتی تێوە تلیاوی. (٢) شتی پیس تێچوویی؛ پیسبوویی. (آلودگی)
ئالێرژی: فد؛ اند: [ناو](١) هەستەمەنی؛ هەستۆکی؛ حەساسیەت؛ خورووی لەش بە

هۆی بۆن پیوەکردن یا خواردنی شتێکەوە؛ (٢) بزوتنی هەستی خۆشەویستی یارق لێبوون بەدیتنی کەسێک یا ناو بردنی یان بە بیستنی بابەتێک یاقسەیێکی بەدڵ یا نابەدڵ. (آلرژی)

ئاماتۆر: [ئاوەڵناو] اند؛ فرد؛ فد: کارێک بۆ سەرگەرمی وسەرقاڵی. کارێکی هونەری یا وەرزشی یا هەرچی کە بۆ بژیو نەبێ و نەبێتە پیشە و شوڵی سەرەکی.دژی پرۆفیشینال. (آماتور)

ئامادەکراو: [ڕابوردووی ئامادە کردن ]سازکراو؛ تەیارکراو؛ حازرکراو. (آماده شده)

ئامادەکردن: [چاوگە،ت]سازکردن؛ حازر کردن. (آماده کردن)

ئامادەکریاگ: ئامادەکراو؛ سازکراو؛ تەیار وحازرکراو. (آماده شده)

ئامادەکەر: [ناو،بک]ئەوکەسەیە کەکار یاشتێک سازدە کات و تەداروکی‌کارێک دەبینێ.(امادەمیکند)

ئامادەیی:[ناو]تەیاری؛ ڕێک‌وپێکی؛ سازی. (آمادگی)

ئامار: [ناو]سەرژمێری لە هەر شت؛ بژاردنی جەماوەر؛ ئاماری نەخۆشی؛ ئاماری ماڵو مەسکەن. (آمار)

ئامارگر: فد[ناو،بک]کەسێ کە کاری ئامارگرتن دەکا؛ کەسێک کە کاری سەر حیساب کردنە؛ سەرژمێر. (آمار گیر)

ئامارگرتن: [چاوگە،ت] ئامارگری؛ کاری ئامارگرتن. (آمارگیری)

ئاما و ڕەفت: [ناو،ت]ئامەدوڕەفت؛ هاتوچۆ. (ب) هەڵس‌وکەوت و نزیکایەتی. (آمد و رفت)

ئامبۆلانس: فد؛ اند؛ فرد؛[ناو]سەیارەی تایبەتی ڕاگوێزانی نەخۆش و برینداو و مەیت. (آمبولانس)

ئامبوولی: فد؛ فرد؛ اند: [ناو]ڕێی‌خوێن لەناو دەمارا گیران، کە بەهۆی دەڵەمە بوونی خوێن بە (هەوا یا گازی نێو دەمار) پێکدێ. (آمبولی)

ئامفی تێاتر: اند؛ فرد؛ فد: [ناو]هۆڵی شانۆگەری. (آمفی تئاتر)

ئاناتۆمی: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]زانستی لەش-ناسی؛ زانستی شروڤە کردنی لەشی گیاندارانی موغرەدار بە تایبەت ئێسکی لەشی ئینسان(دەستەواژەی پزشکی و تە ڕاحیە لە نیگارکێشیدا. (آناتومی)

ئانارشیسم: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]ئانارش؛ مەکتەبی پشێوەخوازی. (هرج و مرج طلبی)

ئانارشیست: [ئاوەڵناو] پشێوەخواز. (انارشیست)

+ ئانالیز: فرد؛ فد: [ناو]شیکاری؛ جەڕباندن و کەند و کاو؛ پشکنین و بە دوادا گەڕان و لێکدانەوەی پاژگەلی هەر شت؛ بەشێ لە زانستی ماتماتیک و کیمیا. (آنالیز)

ئانتراکت: فد؛ فرد؛ اند: [ناو]زەمانی پشوودان لە بەینی دوو پەردەی شانۆگەری یا سینەمادا؛ یا لە بەینی دوو پڕۆگرامی ئۆرکێستری موسیقادا. (آنتراکت؛ فاصله بین دو پرده نمایش یا دو برنامه موسیقی)

ئانتی‌بیۆتیک: فرد؛ اند؛ فد: [ناو]دەرمانی

نەخۆشین گەلی چلکی؛ دژی هوورک. (آنتی بیوتیک)
ئانتیم: [ئاوەڵناو] فرد؛ فد: ئەنتیم؛ گیانی گیانی؛ هاوڕێ و هاواڵی نزیک و گەرموگوڕ. (انتیم)
ئاندانتە: فرد؛ فد: [ناو]زەرب و ڕیتمی هێواش لە مۆسیقادا لە بەینی ئالێگرتۆ و ئاداجیۆدا. (آندانتە)
ئاندۆسکۆپ: فرد؛ فد: [ناو]کەرەستەی پشکنینی چاڵ‌وچۆڵی دەروونی لەش کە بە گلۆپی تایبەت ناوزک وناخی لەش ڕۆشن دەکات و دەیخاتە پێش چاو بە کەڵک وەرگرتن لە دووربین.(جورێک کامێرا). (آندوسکوپ)
ئاندۆسکۆپی: فرد؛ فد:[ناو]کاری موعاینە بە دەزگای ئاندۆسکۆپ. (آندوسکوپی)
ئانژیوگرافی: [ناو]بە کەرەستەی ئانژیۆگراف ڕەگ و دەمار پشکنین، بۆ دەرخستنی گیروگرفت لە ناو دەماردا. (آنژیو گرافی)
ئانۆڕماڵ: فرد، فد، اند: [ئاوەڵناو]غەیری نۆڕماڵ؛ خیلافی قاعیدە؛ خیلافی یاسا. (آنرمال)
ئانەمی: فرد؛ فد؛ اند: ناوی نەخۆشینی کەم خوێنی. (آنمی)
+ ئانی: (۱)[ئاوەڵناو] فەوری؛ لە ئانێکدا؛ بێ-ماتڵی؛ زۆر زوو. (آنی) (۲)[ناو] ئەنییە؛ هەنییە؛ نێوچاوان. (پیشانی)(۳) ئیدی؛ دەنا؛ ئەدی؛ ئەینا. (اگر نە) (۴) ئەمە؛ بۆ کەسێکی مێوینە و نزیک. (این) (۵) ئەمانە. (اینها)
+ ئاوانس: فرد، فد، اند: [ناو] قان؛ کۆمەک؛ چاو پۆشی لە هەڵە؛ ئیمتیاز پێدان. (آوانس)
+ ئاوبردە: [ناو،بەر]ئاوبردوو؛ شتێ کە ئاو ڕای ماڵیبێ و بردبێتی. (آب بردە)
ئاوری هیجران: ئاوری دووری.آتش‌هجران)
+ ئاوگیر: [ناو،ت](۱) گۆل و ئەستێری گەورە؛ هەرێمێ کە چاڵ و نەوی بێ. (۲) هەر شوێنێ ئاوی تێدا کۆ ببێتەوە. (۳) کاری کەسێک کە لە شتێک ئاوبگرێت. (۴) کەسێک کە ئەستێر بۆ نۆبە ئاوی ئاو داشتن دەگرێتەوە. (آبگیر)
ئاوگیری: [ناو،بەرهەمی چاوگە]کاری ئاوی میوەگرتن؛ کاری ئاو گرتن؛ سەندنی(چنینی) ئاوی پۆڵا بۆ نەرم بوونەوە؛ پڕکردنی (خە-زێنە)ی ئاوی حەمام و عەنباراو. (آبگیری)
ئاهەکپەزی: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە] فد: (۱) کاری دروست کردنی ئاهەک. (آهک پزی) (۲)[ناو] کوورەی ئاهەکپەزی، (کوورەی قسڵپەزی) (کورە آهک پزی)
ئای. سی. یو: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]بەشێکی خەستەخانە بۆ ئاگالێبوونی تایبەتی نەخۆش و ئیجازەی نزیک بوونەوە یان دیداری کەسو-کارنەدان بۆ چوونە ژوورەوە. (آی. سی. یو)
ئای. کی. یو: اند؛ فد: [ناو]ڕادە بەهرەوەری هۆشی؛ (ئای. کی. یو)ی لە سەرە وەیە: بە هۆشە. (آی. کی. یو)
ئۆپێڕاتۆر:[ناو،بک] فرد؛ فد: کەسێک کە بە کەرەستەی وەک مەکینەی حیساب یا چاپ یا هەرکەرەستەی ماشێنی کاردەکا. (اپراتور)
ئۆتۆبانـد: [ناو] المان د؛ فد؛ اند؛ فرد.: ئووتوبان؛ دوو جادەی پان ویەک لایەنە لە پاڵ یەکدا. (اتوبان)

ئۆتـۆكرات: [ئـاوەڵنـاو+نـاو] دیكتـاتۆر؛ خـود رایی.(استبداد.)
ئۆتۆكراسی: فرد؛ فد؛ انـد: [نـاو](١) جۆرێـک ئیســـتیبداد دژی دێموکڕاســـی.(٢) کـــاری کەسێک کە هەر جۆر پێیخۆش‌بێ بژی؛ (اتو کراسی)
ئۆتۆمـــات: [ئـــاوەڵنـــاو](کـــورتکراوەی ئۆتۆماتیک)هەر دەستگایێک کە خۆ بـە خـۆ کاردەکا؛ خودکاری؛ وەک ئافتامات کـە چـە-شنێ موسەلسەلی خۆکارە. (اتوماتیک)
ئۆتۆماتیک:روس د؛ فرد؛ فد؛ انـد:[ئـاوەلنـاو] دەزگای خۆکار؛ خۆبزوین. (اتوماتیک)
ئۆتۆسرویس: فد: [ناو] جێگای ڕاگەیشتن بە کاری سەیـارە وەک: شـۆردن یـان گـۆڕینی ڕۆنـی مۆتـۆر و ئاچارکێشـی سـەیـارە. (اتـو سرویس)
ماشـێن شـۆری. (٢) هـەڵـەی بـاوە، بـە ئوتووشۆیی: [ناو،ت] فد: (١) کارگەی لیبـاس شـۆردن و ئوتوکێشـان و شـوێنی شـۆردن و ئوتووی لیباس دەڵێن ئوتووشۆیی، لە جیـاتی ئوتو بوخار یان ئوتوکێشی. (اتو شویی)
ئـۆرژانس: فـرد؛ فـد: [نـاو]بـەشـێک لـە نەخۆشـخانەکـان کـە بـێ مـاتڵی دەرمـانی نەخۆشگەلی جێی مەترسی وەک تەسادوفی و برینداری جێی مەترسی دەکا. (اورژانس)
ئوستادی ڕانوما: مامۆستای ڕێنوێن؛ مامۆستای زانسـتگا کـە یاریـدە دەری ئـەو کـەسـانەن کـە پایـان نامـە(تێـز) ی دوای تەواوکردنی زانستگا دەنووسن. (استادراهنما)
ئوسلووب: فد؛ فرد؛ اند: [ناو]ئوسلووب؛ شێوە-ی کار؛ تەریقە؛ ڕەوشتی‌کار. (اسلوب)
ئوسووڵی‌دین:عد؛ فد:[ناو،ت] قاعیدە وڕەسمی پەژراوی دین؛ لە سونیی دا: تەوحید، نبووەت، مەعاد و لە شێعەدا عەدڵ و ئیمامەتی لێ زیاد بووە. (اصول دین)
ئۆکازیۆن: فرد؛ فد: [نـاو]هـەل و فورسـەت بـۆ کردنـی کـارێکی بـەموفـا و پڕسـوود یـا کارێکی زۆر بەدڵ.(اکازیون)
ئۆکتێت: فرد؛ فد: [ناو]بەشێ لە مۆسـیقا کـە بە هەشت دەنگ یـا هـەشـت کـەرەسـتەی جۆراو جۆری مۆسیقایی لێدەدرێت. (اکتت)
ئۆلتیماتۆم: فرد؛ فد: [نـاو]دوا قسـە؛ ئـاخرین بڕیار پێوتن؛ دوایین هەڕەشە. (اولتیماتوم)
ئۆلگوو: فد: [ناو]نموونە؛ ئۆرناک؛ سە رمە شق؛ کرداری کەسێک کردنە وێنە و سەرمـەشـق. شکڵ و وێنەیێک کە لـە ڕوویـەوە دروسـت بکەن یان بکێشنەوە. (الگو)
ئۆملێـت:[نـاو] فـرد؛ فـد: هێلکـەوڕۆن کـە تەماتەی تێکرابێ. (املت)
ئومەرا: عد؛ فد: [کۆی ئەمیر]وشە ئـارەویـە و لـــە کوردییشــــداباوە؛ ئامرگــــەل؛ ئـەمیران؛کـەسـانێک کـە فـەرمـان دەدەن؛ سەرۆک گەل. (امرا)
ئۆنیفۆڕم: فرد؛ فد؛ اند: [ناو](١) لیباسی یەک ڕەنـگ و یـەکسـان بـۆ گرووپێـک؛ وەک ئۆنیفۆڕمی عەسکەری.(٢) لیباسی تایبەت بۆ ناساندنی شۆڵی کەسێک وەک ئۆنیفـۆڕمی خزمەتکاری هۆتێل و کابارە و هتد.(یونیفورم)
ئۆوێرتۆر: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]ئاهەنگـی پـێش دەست پێکردنی ئۆپێرا؛ یان ئاهەنگـی پـێش

دەست پێکردنی ئاهەنگی عەسلی. (اورتور)

ئەحەد: عد؛ فد: (١) [ئاوەڵناو]تەنیا؛ یەکدانـە. (یکه و تنها) (٢) ناوە بۆ پیاو. (نام مردانه)

ئەختەرناسی: [ناو،بەرهەمی چاوگـە] زانسـتی نوجوم؛ ئەستێرە ناسی. (ستاره شناسی)

ئەدەبپـەروەر: فـد: [ئـاوەڵنـاو]لایـەنگـری ئەدەب؛ خزمەتکاری ئەدەبیات. (ادب پرور)

ئەدیب:[ناو] عد؛ فد: (١) شارەزای ئەدەبیات. (ادیب) (٢) شاعیر؛ نوسەر. (شـاعر. نویسـنده) (٣) وێژەوان. (سخنور)

ئەدیبانە: [ئاوەڵناو]ئەدیب ئاسا؛ وەک ئەدیـب؛ شاعیرانە. (ادیبانه)

ئەرج: ف.مشە) فد: مەزناتی؛ حورمـەت؛ ڕێـز؛ گەورەیی؛بلێندپایەیی.(ارج)

ئەرجمەند: (ف.مشە) فد: [ئاوەڵناو]بەحورمەت؛ ڕێزدار(ارجمند)

ئـەساسـنامە: فـد: [نـاو]کـۆیقـانون و دەستوورێک‌کە بۆ بەڕێوەچوونی شەریکە یان حێزبێک دیاریدەکرێت. (اساسنامه)

ئەساڵەت: عد؛ فد: [ناو](ئەم وشەیە ئارەویـە) حاڵەتی عەسـڵ بـوون. (٢) (ب) نـەجابـەت؛ ئـەسـاڵەتـی عـەشـیرەتـی: ئـەسـاڵەتـی خانەوادەیی.(اصالت)

ئەسڵونەسەب: عد؛ فد: [ناو]ئێڵوتەبـار؛ بـاو باپیر؛ خانەوادە و عەشـیرە و تایفـە؛ بنـەچـە؛ ڕەچەڵەک؛ نیژاد؛ ڕەگەز؛ ئاباوئەجداد؛ جـەد و ئابا. (اصل و نسب)

ئەسلەحە:[ناو] فد: لـە(سـلاح)ی ئـارەویـەوە هاتووە، چەک؛ ئامرازی ڕاو و شەڕ؛ لە زمـانی کوردیدا جێکەوتووە. (اسلحه)

ئەسڵەحەخانە:[نـاو] فـد: جبـەخانـە؛ جێگـای ڕاگرتنی ئەسلەحـە بـە تایبـەت لـە پادگـانی نیزامیدا. (اسلحه خانه)

ئـەسـلـەحـەدار:[نـاو] فـد: (١) بـەرپرسـی ئەسڵەحەخانە. (٢) چەکدار. (اسلحه دار)

ئەسڵەحە دانانە عەرز: چەک دانانە عەرز؛ (ب) دەس لـە شـەڕ هـەڵگـرتن. (اسـلحه زمـین گذاشتن)

ئـەسـڵەحـەسازی: فـد: [نـاو](١) کـاری- دروستکردنی چەک. (٢) فابریکای ئەسلەحـە چێکردن. (اسلحه سازی)

ئـەسـڵەحـەکێشـان: [چاوگـە،ت] (١) لـە جێکاییێکەوەچـەک بـردن بۆجێگـاییێکیتـر. (جابجـایی اسـلحه) (٢) خنجێـر و شـێر و دەمانچە دەرکێشان یان هەڵکێشان لەکـالان و بەرگ؛ ئایەختەکردنی ئەسلەحە بۆ هەڕەشە یا کوشتن. (اسلحه کشیدن)

ئەسڵەحـە هـەڵگـرتن: [چاوگـە،ت] (١) (ب) تەیاربوون بۆ شەڕ؛ خۆئامادەکردن بـۆ شـەڕ . (٢) (ب) یـاخیبوون و چـەک هـەڵگـرتن بـۆ بەرەنگاری. (اسلحه برداشتن)

ئەسـڵەحـەیخۆکـار: [نـاو،ت]موسـەلسـەل؛ چەکێ کە بەتیرئەندازی دووبارە ئامادەیتیـر ئەنـدازی دەبێتـەوە؛ وەک تـەمـاتیر(اسـلحه خودکار)

ئەسڵەحەیڕاو: چەکی ڕاو؛ (ب)زیاتر تفەنگـی دوولوولی ساچمەهاوێژ؛ چـەکـی ڕاونێچیـر. (اسلحه شکاری)

ئەسڵەحەیسارد:[ناو،ت]چەکیکە تەقەمەنـی تێدا بەکار نـەبـرێ وەک شمشـێر و کـارد و

خنجێر. (اسلحه سرد)

ئەسڵەحەی سەنگین: فد: [ناو،ت] چەکی‌کە تەقەمەنی زۆری تێدا بەکار دەبرێت؛ گوللەی گەورەیە و خۆیشی زۆر قورسە؛ وەک: تۆپ، مەترەلۆس، یا موسەلسەلی سەنگین. (اسلحه سنگین)

ئەسڵەحەی کەمەری: [ناو،ت] دەمانچە. (اسلحه کمری)

ئەسڵەحەی گەرم: فد: [ناو]چەکی گەرم.چە-کێک کە تەقەمەنی تێدا بەکاربرێت. (اسلحه گرم)

ئەسیرگرتن: [چاوگە،ت]دیل گرتن؛ یەخسیرگرتن. (اسیر گرفتن)>ئەسیر جەنگی

ئەسیری جەنگی: فد: دیلی‌کە لە سەنگەر یا لە شەڕدا بگیرێت؛ کە بە پێی یاسای ژێنێڤ دەبێ ڕەفتارێکی تایبەتی لەگەڵدا بکرێت. (اسیر جنگی)

ئەشکەم دوریدە: [ئاوەڵناو] سکدڕاو؛ زک‌دڕاو؛ گەدەدڕاو. (ب) زۆر خۆر. (شکم دریده)

ئەشکی تیمساح: [ناو،ت] فرمێسکی بەدرۆ؛ گریانی بەڕیایی؛ وەک: کوشتنی کەسێک و گریان و شیوەنکردن بۆی. (اشک تمساح)

ئەشکی حەسرەت: فرمێسکی‌کە بەهۆی ناکامی و پەشیمانییەوەبێت؛گریان بۆ خۆشەویستی لەدەس‌چوو.(اشک‌حسرت)

ئەشکی شەم: فد: (ب) تکەی مۆم کە وەختی سووتان لێی دەتکێت.(اشک شمع)

ئەفسووس: فد: [ناو+ئامراز]داخ؛ مەخابەن؛ دریغا؛ حەیف ؛ئاخ و داخ بۆ لەدەس‌چوو. (افسوس)

ئەفسوونگەری:[ناو،بەرهەمی‌چاوگە،ناو] فد؛سێحربازی؛ چاوبەستی جادووگەری؛ (ب) عیشوەگەری. (افسونگری)

ئەقسات: فد: لەئارەوییەوەهاتووە، کۆی- قیست؛ دابەشکردنی قەرز (مانگانە یان ساڵانە) بە چەندکەرت. (اقساط)

ئەکسیر: [ناو](١) ئیکسیر؛ نایاب.(٢) ماکێکی ئەفسانەیی کە پێیان وابوو بنەمای هەر شتێک دەگۆڕێت وەک: ماکی‌کیمیایی کە مس بکات بە زێڕ. (اکسیر)

ئەکشێن: [ئاوەڵناو+ناو] اند؛ فد: پڕشەڕ و شۆڕ؛ پڕلە جۆش و خورۆش؛ پڕجم و جۆڵ؛ زیاتر بۆ فیلمی سینەمایی پڕلە کێشە و هەڵلا بە کاردێنرێت. (اکشن)

ئەلباقی: عد؛ فد: [ناو]باقی؛ ئەوەی ماوەتەوە؛ لە دەتمەن چوارتمەنم خەرجکرد، شەش تمەن ئەلباقیەکەی ماوە. (الباقی)

ئەلکوڵیزم: فد؛ اند؛ فرد: [ناو] ئەلکوڵیسم؛ ڕەوت و کاری عادەتگرتن بە خواردنەوەی ئەلکوڵ. (الکلیسم)

ئەمپێرسیۆنیست: فرد؛ فد: [ئاوەڵناو] شوێنگری ئەمپێرسیۆنیسم؛ سەر بە ئەمپێرسیونیسم. (امپرسیونیست)

ئەمپێرسیۆنیسم: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] ڕێبازێکی هونەری و ئەدەبیە کە شوێنگرانی (هەوادارانی) ویستیان دەربڕین و نیشاندانی بە تەواوی و گشتی هونەرەکەیە بێ‌ئەوە سەرنج بدەنە وردەکاری و پەڕاوێزی هونەرەکە. (امپرسیونیسم)

ئەمپێریالیست: [ئاوەڵناو] خاوەنی دەم ودەزگا

و ڕەوشتی ئەمپێڕیا لیسم. (امپریالیست)
ئەمپێڕیالیستی: [ئاوەڵناو] فرد؛ فد: ڕەوت و شێوەی کاری ئەمپێریالیست؛ گرێدراو بە ئەمپێریالیستیەوە. (امپریالیستی)
ئەمپێڕیالیسم: [ناو]دوایین قۆناغی پێشڕەوتی نیزامی سەرمایەداری بە شێوەی پەیدا بوونی تەک قۆرغگەلی مەزن و دەسەڵاتدارانی ماڵی و ناردنی سەرمایە بۆ وڵاتانی ژێر فەرمان و چەوساندنەوە و گیروگرفتی دروستکردن بۆ زاڵبوون بە سەریاندا. (امپریالیسم)
ئەمریە:[ناو] فد: (١)دەستوور و فەرمانیباڵادەست بە نووسراوە بۆ ڕێخراوی ژێر دەست. (٢) نووسراوەی دەستووری گشتی.(امریە)
ئەنتێڕن: اند؛ فد؛ فرد: [ناو]تەلەبەیێک کە کاری خوێندنیڕشتەی پزیشکییە و پاش تەواو کردنی زانستگا لە خەستەخانەکان بۆ ماوەیێک لە بەر دەستی پزیشکی ئوستاددا کار دەکات. (انترن)
ئەنتێڕناسیۆناڵ: فرد؛ فد: [ناو]جیهانی؛ ڕێکخراوەی حیزبیٚ یاشوٚلیٚ لە سەرانسەری دونیادا؛ وەک ئەنتێڕناسیۆناڵی کرێکاران: ئەنتێڕناسیۆناڵ سوسیالیسم. (انترناسیونال)
ئەنتێڕناسیۆنالیست: [ئاوەڵناو] فرد؛ فدد: هەوادار و هۆگری ئەنتێڕناسیۆناڵیسم. (انترناسیونالیست)
ئەنتێڕناسیۆنالیسم: فرد؛ فد:[ناو]بڕوا بە یەکییەتی و بەرژەوەندی گشتی لە ناو تەواوی میلەتگەلی دونیادا بۆ گرووپێک یا چینێک یا سینفێک لە جیهاندا؛ وەک ئەنتێڕ ناسیۆنالیسمی کرێکاران. (انترناسونالیسم)
ئەندیکاتۆر: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]دەفتەری سەبتی نامەی (ئیداری یا ڕێکخراوەیێک) کە بۆ ئەو ئیدارە دێت یا بەڕیٚ دەکرێت بۆ جێگاییێکی تر و لێدانی ژمارە و کات و نووسینی کورتەی نامەکە لە دەفتەرەکەدا. (اندیکاتور)
ئەنیماتۆڕ: فد: [ناو]کەسیکٚ کە فیلمی کارتۆن (ئەنیمەیشێن) دروست دەکات. (انیماتور)
ئەنیمەیشێن: اند؛ فد: [ناو]فیلمێک کە بە وێنەگرتنی پەیتاپەیتا و لە سەریەک لە شتی بێگیان وەک بووکە چینی و وێنەی نیگارکێشی چێدەبیٚ. (کارتون)
ئەوراق: [ناو]عد؛ فد: (١) کۆی وەرەق و پەڕە. (اوراق) (٢) (ب) هەڵوەشاوە؛ لە بەریەک دەرهاتووی کەرەستەگەلی وەک سەیارە و مۆتۆڕ و هتد. (ورقه ورقه)
ئیٚئۆسین: [ناو]دووهەمین خول لە خولی سێهەمی زەوی شناسی. (ائوسین)
ئێپسیلۆن: فرد؛ اند؛ فد: [ناو](١) پێنجەمین پیتی ئەلفوبێی یۆنانی. (حرف پنجم الفبای یونانی)(٢) نزیکبەهیچ. (ب) هیچ. (اپسیلون؛یک سرسوزن)
ئێپۆل: [ناو]باڵشتەکێکی بچووک کەدە-خرێتەژێرشانی کۆت.(اپل)
ئێپیکورئایینی: [ناو]ڕێبازێکی فەلسەفی یۆنانی کە ئامانجی ژیان لە خۆشی و ئارامشی رۆحیدا دەزانیٚ. (اپیکور آئینی
ئێپیکوری: [ئاوەڵناو] فد؛ اند؛ مەکتەبی ئایینی عەیش خوازی. (مکتب وآئین عشرت

طلبی)

ئیپیکوریسم: فد؛ اند: [ناو]هەوا داری مەکتەبی ئیپیکور ئایینی. (اپیکوریسم)

ئێتۆد: اند؛ فرد؛ فد: [ناو]موتاڵای سەرەتایی؛ گەڵاڵە؛ تەڕاحی سەرەتایی؛ مەشق لە بابەت نیگارکێشیەوە. (اتود)

ئێتیکێت: فرد؛ فد؛ اند: [ناو](۱) بەڵگی چووکی قیمەت نووسین و بەسەرکەل-ویەلەوە چەسپاندن لە فرۆشگا و بازاڕدا. (۲) کارتی نووسراوەی ناوی هەرکەس کە لەسەرسینگی درابێت. (۳) (اتیکت)(۴) کە-سایەتی؛ (شخصیت)

ئیختیارکردن: [چاوگەت]هەڵبژاردن و بە ساحیب بوون. (اختیار کردن)

. ئیختیاری:[بەند] فد: بەمەیلی‌خۆ؛ بە ئیرادەی‌خۆ؛ (اختیاری)

ئیرادەت: فد:[ناو]بۆ تەعاروف بەگەورەتر دە-وترێت، سەرسپێری و دۆستی و ئیمان و باوەڕ بەکەسێک هەبوون. (ارادت)

ئیستریبتیز: اند؛ فد: [ناو]جۆرێک ڕەخسی ڕۆژ ئاوایی‌کە ڕەقس‌کەری ژن لەکاتی-ڕەخسیندا تیکە تیکە لیباسەکانی دادەکەنێ تا تەواو ڕووت دەبێتەوە. (استرپتیز)

ئێستریس: اند؛ فد: [ناو]زەبری ڕۆحی؛ تەوژمیرۆحی. (استرس)

ئیستریل: [ئاوەڵناو] فرد؛ فد: (۱) حاڵەتی بێ‌میکرۆبی. (۲) نەزوک. (استریل)

ئیستیبداد: [ناو] زۆرەملی؛ ئۆتۆکراسی؛ حکومەتی خود سەرانە و ڕەچاو نەگرتنی ویستی خەڵک و جەماوەر؛ دژی دێموکرات. (استبداد)

ئیستیبدادی: [ئاوەڵناو] زۆرەملانە؛ ملهوڕانە؛()استبدادی

ئیستێرلیزە: فرد؛ فد: [ئاوەڵناو]ئیستریل کراو؛ میکروب کوژراو؛ پاقژکراو. (استرلیزه)

ئێستێریۆفۆنیک: اند؛ فد: [ناو] [ئاوە-ڵناو]کەرەستەی تۆمار کردن و بڵاوکردنی دەنگ بەشێوەیێک کە دەنگە جیاوازەکان هەرکام لە بڵیند گۆیێکەوە بڵاوبینەوە؛ ڕەوتی تۆمارکردن بە شێوەی ئیستێریۆفۆنیک. (استریو فو نیک)

ئیستیسمار: عد؛ فد: [ناو]قازانج وەرگرتن لە زەحمەتی دیتران؛ بەهرەوەرگرتن لە بەرهەمی کاری دیتران. (استثمار)

ئیستیعمار: عد؛ فد: [ناو]داگیرکردنی سەرزەمینێک لەلایەن هێزی بیانییەوە بۆ بەهرە و قازانج وەرگرتنی ئابووری و کەلەپووری و هێزی ئینسانی بەناوی لایەنگری و پشتیوانییەوە. (استعمار)

ئیسکادران: ئیتاد؛ اند؛ فرد؛ فد: [ناو]هێزی هەوایی و دەریایی وعەرزی بەرانبەر بە ۳ تا ۶ پاپۆری جەنگی. ۳ تا ۶ فڕۆکەی جەنگی. ۳ تا ۶ دەبابە. (اسکادران)

ئیسکلێت: فرد؛ فد: [ناو](۱) ئێسقان بەندی لەش. (۲) ڕێژەک؛ چووارچێوە؛ قاپووڕ و گەڵاڵە. (اسکلت)

ئیسکۆرت: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] (۱) بەدرەقە (ڕەوانەکردن) و ئاگاداری و بەرێکردن؛ چەند فڕۆکەئیسکۆرتی ئەو پاپۆڕەن؛ (۲) موراقەبەی چەند یایەک کەس لە کەسێکی

تر. (۳) ناوی ئەو چەند کەسە(اسکورت)
ئیشارپ: فرد؛ فد: [ناو]قوماشێکی سێگۆشە-یە کە وەک کۆلوانە ژنان دەیدەن بە شانیاندا بەتایبەت لە ئوروپا. (اشارپ)
ئێشانتیۆن: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]نموونەی مەتاع یا دەرمانێک کە بە خۆڕایی دەدرێت بە موشتەری یا خەڵک بۆ ناساندنی زیاتر و کڕینی ئەو شتە. (اشانتیون)
ئێشێل: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]ڕادە و میزان؛ پلە و پایەی مووچە وحقووقی ئیداری. (اشل)
ئیعتیاد: عد؛ فد: [ناو](۱)عادەتگرتوو.(۲) خووگرتن و گیرۆدەبوون بەکردنی کارێک. (۳) بە هۆی کردن یا خواردن یان هەڵمژین دووچار و گیرۆدەبوون کە تەرک کردنی دژواربێت وەک ئیعتیاد بە ئالکۆل و سیغار و تریاک و.... (اعتیاد)
ئیفتیخارکردن: [چاوگە،ت]نازین؛ شانازی-کردن. (افتخارکردن)
ئیفتیخاری: [ناو+ئاوەڵناو] (۱)بەڵگە یان بڕوانامەی پێشکەشی بۆ شانازی، بە بێ تێپەڕکردنی بواری پێویست وەک: دیپلۆمی-ئیفتیخاری. (۲)بە شداری کردن لە کارێکدا بە بێ موقابیلە یان بەشداربوون لە کۆڕێکدا بەبێ موقابیلە: ئەندامی ئیفتیخاری. ۳.کۆمەک-کردن و بە شداری کردن بۆ بەڕێوەبردنی کارێک بە بێ موقابیلە: ئەکتەری ئیفتیخاری؛ کاری هونەری وخزمەتی بەلاشکردن. (افتخاری)
+ ئیفلیج: [ئاوەڵناو] حاڵەتی گۆجی؛ گۆجبوون یا دەستوپێ کارنەکردن و بێجوولە بوونی هێندێ ئەندامی لەش. (افلیج)
ئیفلیجی: [ناو]حاڵەتی ئیفلیج بوون؛ جاری وایش هەیە زگماکیە. (افلیجی)
ئێکسپێڕسیۆنیست: [ئاوەڵناو] هەواداری ئێکسپێڕسیۆنیسم. (ا کسپر سیو نیست)
ئێکسپێڕسیۆنیسم: [ناو]شێوازێکە لە هونەردا کە زیاتر گرینگی بە حاڵەتگەلی هەستی و رۆحی دەدا. (اکسپرسیونیسم)
ئێکسیر: یونان‌د؛ عد؛ فد: [ناو]ماک یان گەوهەرێک کە پێیان وابوو چۆنییەت و ماکی هەر شت دەگۆڕێت یان تەواوتریان دەکات؛ وەک ئێکسیری جەوانی کە پیری بکاتەوە لاو یا مس بکاتە ئاڵتوون؛ (ب) شوبهاندن بە هەر شت کە بە دژواری وەدەست بکەوێت. (اکسیر)
ئێکۆسیستم: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]ژیان و جێی ژیانی هەموو گیاندارێک. (اکوسیستم)
ئێکۆلۆژی: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]زانستی ناسینی زەوی و جێی ژیانی گیانلەبەران. (اکولوژی)
ئێکۆلۆژیست: فرد؛فد؛ اند: [ناو]کەسێک کە کاری ئێکۆلۆژیە. (اکولوژیست)
ئێکۆلۆژیکی: [ئاوەڵناو] فرد؛ فد؛ اند: تیکە-یشتوویی لە جێواری ژیان. (زیست محیطی؛ اکولوژی)
ئێکۆنۆمی: فرد؛ اند؛ فد: [ناو]ئابوور. (اکونومی؛ اقتصاد)
ئێکۆنۆمیک: [ئاوەڵناو] فرد؛ فد؛ اند:ئابووری. (اکونومیک؛ اقتصادی)
ئێکۆنۆمیست: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]ئابوور زان؛ ئابووریناس. (اکونومیست؛ اقتصاددان)

ئیگزیستانسیالیست: [ئاوەڵناو] هۆگری ئیگزیستانسیالیسم. (اگزیستانسیالیست)
ئیگزیستانسیالیسم:فرد؛اند؛ فد: [ئاوەڵناو]مەکتەبیکی چەرخی بیستەمە لە ئوروپا سەری هەڵدا، کە بڕوای وایە ئینسان لە هەڵس و کەوت و نزیکایەتی و مەرگدا حاڵەتێکی سەربەستی هەیە و خۆی ژیانی خۆی دیاریدەکات.(اگزیستانسالیزم)
ئێگۆ: فد؛ فرد: [ناو](۱) کانگای نەوتی ژێر زەوی. (۲) ڕەهەندی ئاوە ڕۆی پیساوی شار. (اگو)
ئێلوتەبار: فد: [ناو،ت]تایفە بەگشتی. (ایل و تبار)
ئێلێکتریک: فرد؛ فد: [ناو]ئەلەتریک؛ ئەلەم تریک؛ کارەبا. (الکتریک)
ئێلێکتریکی: فرد؛ فد:(۱)دووکانی فرۆشتنی کەرەستەی کارەبایی. (مغازە الکتریکی) (۲) کەسێک کە پیشەی دروستکردنەوەی کەرەستەی کارەباییە. (برق کار)(۳) کەرەستەگەلێ کە بە کارەبا ئیش دەکەن وەک سەماوەر ، ڕادیو، ئۆتووی کارەبایی. (الکتریکی)
ئیمپراتریس: فرد؛ اند؛ فد: [ناو](۱) ژنێ کە فەرمانڕەوای ئیمپراتورێکە.(۲) ژن و هاوسەری ئیمپڕاتۆر.(امپراتریس)
ئیمپڕاتۆر: فرد؛ فد؛ اند: شای چەند مەملەکەت. (امپراطور)
ئیمپڕاتۆری: (۱) مەقامی ئیمپڕاتۆر.(۲) چەند مەملەکەت کە لە ژێر حوکماتی یەک ئیمپڕاتۆردابێت.(امپراطوری)

ئیمپێرسیۆنیست: [ئاوەڵناو] پەیوەندیدار بە ئیمپێرسیونیستەوە.(امپرسیونیست)
ئیمپێرسیۆنیسم: [ناو]ئەمپێرسیۆنیسم؛ ڕێبازێکی هونەریە کە شوێگرانی بڕوایان بەنیشاندانی ناوەرۆکی هونەرەکەیە و بایەخ بە وردەکاری و پەڕاوێز نادەن. (امپرسیونیسم)
ئیمپێریاڵ: [ناو]قۆشە(سکە) ی کۆنینەی پارەی ڕووسیا. (امپریال)
ئیمپێریالیست:[ئاوەڵناو] پەیوەندیدار و خاوەنی دەزگای ئیمپێریالیسم (امپریالیست)
ئیمتیاز: فد.(۱) سەربوون؛ پێشتربوونی ژمارەی سەرکەوتن لە هەر سرویسی والبیالێدا. (۳) ئیجازەی دامەزرانی بنکە یا ڕێکخراوێک لەلایەن دەوڵەتەوە؛ خاونی - ئیمتیازی ڕۆژنامە ؛ قان پێدان؛ مافی تایبەت. (امتیاز)

# ب

(ب)واتا بە؛ بچاوان: بـەچـاوان؛ بجـارەکـی: بەجارێکی؛ بتەنێ: بەتەنێ. (ب)
+ بـا: [نـاو](۱) هـەوا؛ دەمـار؛ فیـز؛ خـۆ هەڵمساندن؛ لووت بەرزی؛ خۆ بـەزل زانـین؛ بای کەڵلە؛ بای کـەپـۆ. (بـاد) (۲) دەسـپێک و ئەوەڵ؛ لەبای‌بەیانییەوە هاتووم: لـەئـەوەڵـی بەیانییەوە هاتووم؛ لەگەڵ؛ بە؛ بـاوجودی؛ بـا ئەم حاڵە؛ (با این حال)
+ بـا: [پێشـگر] خـاوەن؛ بـا ئـەدەب؛ بـا فەرهەنگ. (پیشوند؛ دارای)
بائاورد: [ناو]یا ئاوەر؛ باهـاورد؛ ڕیوایـەتـە کـە قەیسەر هەشت کووپە خەزێنـە بـاری پـاپۆڕ دەکـات کـە لـە شـەڕێکـدا کـە لـەگـەڵ خەسرەوپەرویز بوویەتی دووری بخاتەوە لـە-مـەیـدانی شـەڕ،بـەڵـام بـا دەیڕفێنـێ بەرەولەشکری خەسرەو، وشـەی بـاد ئـاورد، یاباهاورد یا بائاورد لە ویڕا بـووەتـە بـاو.(بـاد آورده)
بائـاوردە: داهـاتی بـێ ڕەنـج و هـەوڵـدان. (بادآورده)
بائەم: بائەمە؛ بەئەم؛ بـەم؛ بائـەم حاڵـە: بـەم حاڵەوە. (با این)
بائەمە: [بەند] ئەگەرچی؛ لەگەڵ‌ئەمـەدا؛ بائـە مە کە نەخۆشـبووم هـاتم: ئـەگـەرچـی کـە نەخۆش بووم هاتم. (با وجود)
+ باب: [ناو]باب؛ باو؛ ڕەواج؛ مۆد؛ بابی ئەمڕۆیە: بابەتی‌ئەمڕۆیە؛ مۆدە. (پدر؛ مد،باب)
بابا پیارە: [ناو]باوە پیارە. (پدر خواندە)
بابادەم: [ناو]حەزرەتی ئادەم. (آدم؛ شوهرحوا)
باباگورگوڕ: [ناو]باوەگوڕگوڕ مەزاری چاکێکـە؛ ناوی ناوچەیێکە لـە هـەرێمـی‌کوردسـتانی-عیـراق.(لـەسـەرسـینگە نـەوتاییـەکـەی باوەگوڕگـوڕ، نزیـک تاڤگـەی بـەرەوژووری زێڕینی‌گڕ(پەشـێو) (اسـم پیـر و نـام منطقـە ایست)
بابان: [ناو](۱)میرسلێمان کەمیرنشینیی بابانی لەسلێمانی‌دامەزراند، لەگەڵ تایفەی فـەیـزو لابەگی(بەگزادە)دا کە لە بەینی دیوانـدەرە و سابڵاغدا دەژین لە نەتەوەی فقێ ئەحمـەدی دارەشـمانەن؛ «مێـژووی ئـەدەبـی کـورد، نووسینی عـەلادیـن سـەججـادی،ل۲۲۸» و گـەشـتی ڕیـچ بۆکوردسـتان ل۲۹۷وە-رگێڕ«محەمەدحەمەباقی»و شەجەرەنامـەی-ئێلی فەیزوڵابەگی،نووسینی «حەسەن سەلاح سۆران» (بابان) (۲) باوان. (خانـە پـدری) (۳) بنەماڵـەیێکـی دەسـەڵاتـداربوون لـە سـنە و سلێمانی ئیمارەتی بابانیان لـەو ناوچـە دامـە زراند.«مێژووی ئەدەبی‌کورد». (بابان)
بابان ئاوا: ماڵەباب ئاوەدان (ب) ئافرەتـێ کـە خاوەندی کەسوکارە؛ ماڵبات‌ئـاوەدان: بابانـت ئاوەدان‌بێ. (کسی کەخانەپدری دارد)
بابانوێڵ: [ناو]پیرەپیاوێک بەکڵاوی گوڵینگدار

و چەکمە و جلو بەرگی نا ئاساییەوە کە هەمـ-
موو ساڵێک لە شەوی لەدایکبوونی عیسا
مەسیحدا دیاری بۆ منداڵان دەبا. (بابا نوئل)
بابان‌وێران: [ئاوەڵناو،بەر] بابانکۆر؛ ماڵی‌دایک و باب وێران؛ برێتی لە ژنی بێ‌کەس‌وکار و تەنیا کەوتوو. (کنایەاز بی کس و کار شدن)
بابانە: [ئاوەڵناو](١) وەک باب. (مانند پدر) (٢) باوێنی. (پدری)
بابانی: جۆرێک قوماشی بە نرخە بە ناوی عەشیرەی بابانەوە ناوی لێنراوە؛ هەر شت پێوەندیی بە بابانەوە ببێ. (نوعی پارچە)
باب برا: [ناو]زڕبرا؛ هاوباب. (برادر ناتنی)
باب‌دەست: [ئاوەڵناو] وەرشکست؛ بەرشکست، نابووت؛ موفلیس؛ مافینگی. (ورشکستە)
بابردوو: [ئاوەڵناو،بەر] (١) هەر شتی سووک کە با ڕفاند بێتی. (اشیاء سبک باد بردە) (٢) (ب) هەر شتی سووکی بوودەڵە. (اشیاء سبک) (٣) (ب) لە ناو چوو؛ لەدەست چوو، مەچۆ بە دوای کڵاوی بابردوودا.«فۆلکلۆڕ» (از بین رفتە)
بابری: > بابردوو.
بابزەن: [ناو]باوێشک. (خمیازە)
بابک: [ناو]ڕەچەڵەک؛ بەرەباب. (ریشە؛ نژاد)
باب کوشتی: [ناو،بک]باب کوشتوو. (پدرکشتە؛ قاتل‌پدر)
بابلمعدە: عد؛ فد: [ناو]درگای گەدە؛ جێگایێک کە ڕیخۆڵە بەگەدەوە لکاوە. (باب-المعدە)
بابلوسک: [ناو](ف.گیو) دەوران؛ سەردەم؛ سەدە. (دوران؛ عصر. سدە)
بابلەکانێ: [ناو]جۆرێ سەما و هەڵپەڕکێی کوردی. (نوعی رقص کردی)
بابلیسۆک: [ناو]لووتی فیل؛ گێژەڵووکە. (خرطوم. گردباد)
+ بابۆ: بۆن‌هەڵگرتن؛ بۆن‌گێڕان؛ سەگ و تانجی کە بە بابۆ نێچیر دەدۆزنەوە. (پیدا کردن بەوسیلەبو کشیدن)
بابۆر: [ناو] دەرەلینگی‌هەڵپێچراو (ورمالیدن پاچە)
بابۆرە: [ناو]تیکەی‌درێژی پێچراو؛ بابۆڵە. (لقمەبزرگ ودراز؛ ساندویچ)
بابۆنک: [ناو]بابوونە؛ گوڵی بەیبوون. (بابونە)
بابوون: [ناو]جۆرێک عەنتەرە. (بابون)
بابوهێر: بابوێر؛ درزوکەلێنی دیوار؛ بادرۆخ. (منفذ باد)
بابەلباب: (ب) جەدئەندەرجەد؛ زۆر لە مێژینە؛ چەندین‌پشت.(پدر درپدر)
بابەڕاخ: ناوی شۆڕشگێڕ و شاعیری کورد لە ئێلی داسنی کە بە فەرمانی خەلیفە مەنسوری عەبباسی کوژرا. (بابرا.)
بابەڕۆ: باوکەڕۆ؛ لەوەختی مردنی باب‌دا یان لەوەختی کارەساتی دڵتەزێن‌دا دەیلێن. (بابام وای)
بابەژنی: [ناو]زڕدایک. (زن پدر)
بابەقوورەت: [ئاوەڵناو]چلەنۆک؛ مرۆڤی بستەباڵای تەمەن زۆر. (کوتولە)
بابەک: ناوی‌باوەگەورەی ئەردەشێری بابەکان‌بووە . (پدر بزرگ اردشیر بابکان)
بابەکی‌خوڕەمدین: ناوی شوڕشگێڕی دەورانی

خەڵیفەی‌عەبباسی (موعتەسەم) بووە، کە سەرکردەی خورەم دینان و خەڵکی مەحاڵی خەڵخاڵی ئازەربایجان‌بووە، کە دەرئەنجام خەڵیفەی‌عەبباسی کوشتی.(بابک‌خرم‌دین)

+ بابەلیٚ: [ناو،ت]باوەلیٚ؛ پیاوی پیری ئایینی وەک بابە وەلی؛ پیاوی‌خوا. (بابا ولی)

بابەلیچ: [ناو]قامکی ئەنگوستیلە؛براتووتەلە. (انگشت چهارم دست)

بابەلیچک: [ناو]بەسەرهاتی ساڵانە. (وقایع سالانە؛ سالنامە)

بابەلیسک: [ناو]بابلیسک؛ گیٚژەلۆکە؛ باگەڕ؛ گەردەلول؛ شایی‌جندوکان. (گردباد)

بابەلیشک: [ناو]بۆڕی‌گەلوو؛ لوولەی‌گەروو؛ قورقوڕاچکە. (مری)

با بهیٚر: با بویٚر.>بابوهیٚر. (منفذ باد)

بابی: [ناو]پەیڕەوانی ئایینی میرزا عەلی شیرازی، مەعروف بە باب. (بابی)

بابیٚ: (١) بڵابیٚ؛ بیٚڵا بابیٚ. (بگذار بیاید) (٢) باوکە. (بابا)

بابی بابی: [ناو](١) باوەگەورەی ئەو. (پدر بزرگ او) (٢) گەمەی‌منداڵانە؛ ئوغلانەکەم لەبیٚ لەبیٚ سەرسووری من لەماڵی کیٚ. واتە: کوڕەکەم لەویٚ لەویٚ سەر سوڕی من (سەر سوڕ: شاراوە) لە ماڵی کیٚ؟. هیٚما بەکام ماڵ دەکەم ؟ ئوٚغڵان: منداڵ، وشەییٚکی تورکییە. (بازی کودکان)

بابیت: [ناو]تیٚکەڵاوی قورقوشم و قاڵایی کە زۆر ڕەقە و ناسویٚ یاتاغانی موٚتوٚڕی لیٚ چیٚ دەکەن. (بابیت)

بابیٚتی: ١.باوکی؛٢.>بابییەت. (پدری)

بابی‌چاویش: [ناو]پیری خیٚڤزان و غەیبزان. (پیر غیب گو)

بابی‌خیٚڤزان: [ناو](١) پیری غەیبزان؛ ناوی پیریٚ بووە لە ئایینی ئیزەدیاندا.(٢) پلەییٚکی- باڵا لە ئایینی زەردەشتدا. (پیرغیبگو)

بابیزوٚک: [ناو]لافاو؛ سیٚڵاو؛ لەهی. (سیلاب)

بابیستانە: [ناو]حەقلی مەقوٚ. (الاکلنگ)

بابی‌کوٚچەک: [ناو]پلەییٚکی خوارتر لەبابیٚ خیٚڤزان لەلای ئیزەدیان. (یک درجە کمتر از پیر غیب گو)

بابیەت:(١) بابییە؛ ڕیٚبازگەی بەهاییەکان (بابی) (٢) باوکیٚتی. (پدری)

باپالیٚو: فد: [ناو](ب) جلی ناسک و کون- کون؛ فیلتیٚری‌هەوای‌سەیارە. (لباس نازک. فیلتر)

باپزوو: [ناو]ئەو بەفرەکە با بیماڵیٚ و لەلاپاڵان سووانەی پیٚکا؛ کلیلە بەفر؛ ڕنوو.(بهمن)

باپشکیٚو: [ناو]قنچکە سڵاو.> بویتان (گل مژە. سندەسلام)

باپووسکە: [ناو]بابووسکە؛ خوٚڵەمیٚش؛ سووتکی‌کاغەز و خوٚڵی جگەرە و پەڕوٚ. (خاکستر کاغذ و پارچە)

باپووشکە: [ناو] چیلکە وکای‌نەرم کە با هەڵیدەگریٚت؛ بابردەڵە. (خردەخاشاک)

باپەڕ: [ناو]ڕەونج؛ دوای هیلاکبوون- وعارەقکردن لە بەربا دانیشتن و تووشی باپەڕ (ڕەونج) بووون. (سرماخوردگی از جلو باد نشستن بعد از عرق کردن)

باپیٚچک: [ناو]سووڕ هەڵدانی با؛ بوٚران؛

بادەڤ؛ بابلیسوٚک؛ گێژەڵووکە. (طوفان)
باپێچەک: (١) شەتەکدان. (محکم طناب پیچ کردن) (٢) ژان و پێچێ کە بە هوٚی- باکردنەوە، لە ناو زگدا هەست دەکرێت. (نفخ)(٣) با پێچەکی نانَ؛ تیروٚک. (وردنه)
باپیران: باوک و باپیرگەل. (پدران)
باپیرە گەورە: [ناو،ت]باوکی باپیر. (پدر پدر بزرگ)
باپشتیوان:پشتیواندار؛پاڵپشتدار.(باپشتیان
باپێشی: [ناو]پزیشکی چاو. (دکتر چشم)
باپێکردن: [چاوگە،ت] مووش پێکردن؛ سکماساندن و سکپەنماندن.
(حرص کسی رادر آوردن. باد کردن بەچیزی)
باپێلیک: [ناو]گەردەلوول؛ باگەڕ؛ گێژەبا؛ با گێژە؛ شایی‌جندوکان؛ گەرەپێچ؛ گێژەڵووکە؛ باگروٚکە؛ باگەڕوٚک؛ باگەڕوٚکە. (گردباد)
با پێو: [ناو]کەرەستەی ئەندازە گرتنی توندیی و تەوژمی با. (بادسنج)
باپیوان: [ئاوەڵناو]باپیڤان؛ هەتیوچە؛ هەتیم- چەرەک؛ هەتیم.(یتیمچه.)
بات: بری؛ لەباتی. (بجای)
باتانی: [ناو]جاش؛ جاجم؛ بەتانی؛پەتوو. (جاجیم)
باتریی‌تەڕ: [ناو،ت]عەمباری کارەبا کە لە دەفرێکی (ئێلکترۆلیز) و دوو ئێلیکترۆد پێکدێ. (باطری تر)
باتریساز:[ناو،بک]کاری‌دروستکردن یان شارژ کردن یاچاک‌کردنەوەی باتریە.(باطریساز)

باتریسازی: [ناو](١) کاری کەسێک کە ئاوی باتری سەیارە دەگوٚڕێت یان شارژ(پڕ)ی دەکاتەوە یان لە کاروباری کەرەستەی کارەبایی سەیارەدا ئیش دەکا. (٢) شوێنی کردنی ئەوکارە. (باتریسازی)
باتری وشک: [ناو]قووە؛ قەوە؛ قووەی چراقووە . (باطری خشک)
باتری‌هەتاوی: [ناو]قووە (پیلی) هەتاوی کە بە خوٚر شارژ دەبیتەوە.(باطری خورشیدی)
باتسی: [ناو]جەژنێکی لە بیرچووی ئیزەدیانە نزیک بەکاتی جەژنی‌کریسمەس بەڕێوە دەچوو. (باتسی)
باتک: [ناو]ئاوگەردان؛کەوچکی گەورەی ئاوهەڵگوێزتن.(آبگردان)
باتڵاغی: [ئاوەڵناو] حاڵەتی زەوینێکە باتڵاغبیٚ؛ حاڵەتی زەوینێک کەقوڕاوبێت و مروٚڤ تی هەڵچەقێت. (باتلا قی)
باتمان: [ناو]قورسایی ٢٦ کیلۆ. (باتمان)
+ باتوو: [ناو]عەشیرەتێکە لە بووتاندا. (عشیرەباتو)
با تووبەند: [ناو،ت]ئامرازی بەستنی باتوو بەتایبەت بوٚ کەسێک کە قوٚڕبێت. (خایەبند)
باتوودان: [ناو]هەویج؛ پێستی گون. (پوستەخایە)
باتوون: فرد؛ فد: [ناو](١) شوشکە؛ شیری کورت. (٢) باتوٚم؛ قوڵەدار یان لاستیکی دەستی پاسەبان و پوٚلیسی قەدیم.(باتوون)
باتوونی‌کارەبایی: [ناو] میلەی‌کارەبایی بوٚ ئەشکەنجەی بەندی. (باتون برقی)
باتە: پاڵ‌توٚ؛ جەمتە؛کن‌توٚ؛لای‌توٚ؛باڵتە.

(نزدتو)
باتەربیەت: [ئاوەڵناو] باتەدەب؛ خاوەن نزاکەت؛ خاوەن تەربییەت. (باتربیت)
باتەگبیر: [ئاوەڵناو] بەتگبیر؛کارزان؛ بەمشوور. (باتدبیر)
+ باتێدان: [چاوگە،ت] باتێکردن بە ناسووس یان بە قەلەمە فووکردنە ناولاشەی ئاژەڵ بۆ جیا بوونە وەی پێست لە گۆشت و باشتر کەولبوون. (باد کردن)
باتیسک: [ناو] خوشکیشوو؛ دش.باڵدز. (خواهرشوهر)
باتێکردن: [چاوگە،ت] (١) فوتێکردن؛ پڕکردن لە با. (٢) (ب) دنەدان؛ شووتی وەبن هەنگڵنان؛ هان دان (باد کردن و هندوانەزیر بغل گذاشتن، ترغیب)
باج خوازی:<باج؛ بەزۆرەملی پارە یان شتێک ویستن. (باج خواهی)
+ باجگر: [[ئاوەڵناو+ناو،بک]لە ڕابووردوودا پیاوی لات و زۆردار بەزۆر باجیان لە خەڵک- دەستاند. (باجگیر)
باجلێگرتن: (ب) ناخوونەک لە ئەمانەت یان لە شتی کەسێکدان. (کنایە ناخونک زدن)
باجووا: [ناو] باجیبەباجی؛ ژنیکە ژنبەژنی پێکرابێت. (زن گرفتن تواتری)
باجووج: [ئاوەڵناو] شۆخیباز؛ گاڵتەچی. (شوخ)
باجە: [ناو] بۆتکە؛ گیشە؛ دەککە؛ وەتاغەک؛ وەتاغێکی بچووک بۆ فرۆشی بلیتی(پسوولە)ی سینەما یان فرۆشی وردەواڵە. (باجە. گیشە)

باجەلان: ناوی خێڵ و مەڵبەندێکە لە نزیک خانەقین. (سرزمین باجلان)
باجەلانی:خەڵکی باجەلان.(اهل با جلان)
باجەیبانگ: شوێنی پارە سپاردن و پارە وە- رگرتن لەبانگ. (باجەبانک)
باجەیبلیت: وەتاغی چکۆلەی فرۆشتنی بلیت(پسوولە). (باجەبلیت)
باجەیتەلەفۆن: [ناو،ت]کیۆسکی تەلەفۆن لە تەلەفونخانە یان سەرشەقام. (باجەتلفن)
باجەیپۆست: [ناو،ت] شوێنی نامە پۆستکردن لە ئیدارەی پۆست. (باجەپست)
+ باجی: [ناو] پلەی حەو نۆتەی مۆسیقا. (اندازەگام موسیقی)
+ باجی : [ناو]زڕدایک لە هەندێ بن زاراوە- دا.(نامادری)
باجیڕێ:[ناو،ت]کرێیدەربازبوون لەڕێگا یان ئوتوبان. (عوارض)
باجیسمێڵ: [ناو،ت]باجی ملهوڕی و لاتیگەری و سمێڵ قەویەتی کە لە قەدیمدا لە خەڵکی بێنەوا دەستێنرا. (باجسبیل)
باجیسەربار: [ناو] پیتاکی سەربارانە.(باج سربار)
باچوو: [وتە(حەرف)کاریئەمری]بڵێ؛ باچە؛ بێژە؛ بووشە (بگو)
باچە: [کاریئەمر]باچوو؛ بێژە؛ بڵێ. (بگو)
باچک: [ناو](دێمیلە) دانەوێڵەییێکە لە هەرزن گەورەتر، ساقەتەکەی دەکەن بەگسک. (دانەایست ازارزن بزرگتر)
باحاڵ: فد. [ئاوەڵناو](١) سەر زیندوو. (زبر و زرنگ)(٢) خاوەن ئاکاری لەبەردڵان.

(باحال)(٣) له سه‌رحاڵ؛ به‌که‌یف. (سرزنده. سرحال)

باخبڕ: [ئاوه‌ڵناو] [ناوی‌بک]هه‌رەس‌کار؛ ته‌کمیشی باغ ده‌کات یان داری باخ ده‌بڕێته‌وه. (هرس کننده‌باغ)

باخ‌بڕین: [چاوگه،ت] (١) ته‌کمیشی باغ.
(٢) بڕینی باغ؛ هه‌رسی باغ. (بریدن باغ)

باخت: فد: [چاوگه‌ی‌کورتکراو] له کوردیدا ئه‌م وشه‌یه به‌ده‌گمه‌ن به‌ته‌نیا ده‌وترێت و له‌گه‌ڵ کار(فێعل)ی کردندا ده‌وترێت: ڕه‌وتی دانان؛ دوڕان؛ باختکردن؛ به‌ختکردن؛ له‌ده‌ستدان؛ دۆڕاندن؛ (مصدر مرخم باختن)

باخته‌ر: له‌ئاوێستادا به مانای(باکوور) هاتووه. فد: [ناو](ف.مشه).ڕۆژ ئاوا؛ خۆرنشین؛ (باختر)

باخچه‌وان: [ناو] ئاگاداری باغچه‌یه. (باغچه‌بان)

باخچه‌ی منداڵان: [ناو] جێگه‌ی ئاگاڵێبوونی منداڵان، پێش‌له ته‌مه‌نی چوونه مه‌دره‌سه؛ پارکی منداڵان. (کودکستان؛ پارک کودک)

باخدار: [ئاوه‌ڵناو] پیشه‌ی باخدارییه؛ خاوه‌ن‌باخ؛ باخی هه‌یه.(باغدار)

باخستن: باکه‌وتن؛ باکه‌ی خست. (بادخوابیدن)

باخڵه: [ناو]عه‌ماره‌شه‌تڵ؛ دوو کانه‌شه‌تڵ؛ که‌رته‌زه‌وییێک که تووی پێداده‌چێنن بۆ شه‌تڵ؛ خه‌زانه. (انبار نشاء)

باخوا: [ئاوه‌ڵناو]() دیندار؛ خواناس؛ پیاوخاس. (باخدا)

+ باخواردن: (١)هه‌ڵخستنی جلی شۆردراو بۆ وشک‌بوونه‌وه. (بادخوردن)(٢) پێچ‌خواردن؛ خول‌خواردن. (پیچ خوردن)

+ باخۆش: [ئاوه‌ڵناو]له‌بار؛ باوخۆش. (خوشدست)

باخۆشه: [ناو]که‌وچک یا دارێکی پان بۆ شێواندنی دۆکولێو. (قاشق بهم زدن آش)

باخوه: [کاری‌ئه‌مری] باخڤه؛ قسه بکه؛ (حرف بزن)

+ باخه: [ناو]باغه؛ ته‌زبێحی باغه؛ جنسی جۆرێک مووروو. (باغه)

باخه‌خواز: [ناو]سواڵکه‌ری باخه‌گه‌نم و جۆ. (سائل باقه غلات)

باخه‌فتن: [چاوگه،ت]با که‌وتن؛ وێستانه‌وه‌ی با؛ (ب) له به‌ین چوونی لووت‌به‌رزی؛ له فیز و ئیفاده و ته‌که‌بورکه‌وتن؛ باکه‌ت خه‌فت؟: ئارام بوویه‌وه؟. (باد خوابیدن)

باخه‌ڵبڕ: [ناو، بک] باغه‌ڵبڕ؛ گیرفان بڕ. (جیب بر)

باخه‌ڵه: [ناو]باغه‌ڵ؛ بن‌باغه‌ڵ؛ گیرفان.(بغل؛ جیب)

باخه‌وان: [ناو،ت]ئاگاداری باخ؛ ئه‌وی‌که‌کاری په‌روه‌رده‌کردنی گیاوگوڵ و داره له باخدا. (باغبان)

باخه‌وانی: (١) زانستی کاری باخه‌وانی. (علم باغبانی) (٢) ڕه‌وتی چاندن و په‌روه‌رده‌کردنی گوڵو دار و گیا له باخدا. (باغبانی)(٣)کاری باخه‌وان. (کارباغبان)

باخی‌وه‌حش: [ناو]جێگای ڕاگرتنی حه‌یوان‌گه‌ل بۆ پیشاندان به‌خه‌ڵک. (باغ وحش)

باخێ: [ناو]گه‌وره‌ی فه‌له. (بزرگ عیسوی ها)

باخیر: [ناو،بک]خه‌به‌رهێن؛ به‌رسه‌ف-

هێن.(خبررسان)
باخیره: [ناو]باکرِوقه؛ بوّران؛ با و کرِێوه پێکەوە؛ بادەڤ. (بوران)
باخی‌گولاّن: [ناو]گولزار؛ گوڵستان؛ باخی پر لەگول. (گلستان)
+ باد: [ناو]با؛ هەوا؛ (بەوەی بادیهەوایە دەڵێن کورتە باڵایە). (ب) تەکەبور؛ فیز؛ لووت بەرزی. (باد)
+ باد: ببێ؛ زیندەباد: بژی. (باد)
بادئاوردە: (١) > بائاوردە؛ شتێک کە با لەگەڵ خوّی بیهێنێت. (٢) [ئاوەڵناو] (ب) ماڵی بێ تێکوشان هاتنە دەست.>بائاوەرد (باد آوردە)
بادابادا: [ناو]گوّرانییێکە لەئێران بوّ زاوا و بووکی دەڵێن. (بادابادا مبارک بادا)
باداروّک: [ناو]دەسریلەی سەری منداڵی‌ساوا؛ گوڵەسەر. (دستمال کوچک نوزاد؛ گل سر)
باداری: واداری؛ تووشی نەخوّشینی پەنمانی چوّک و جوّمگە(جومگە)ی‌لەش هاتوو .(رماتیسم)
باداریّتی: [بەرهەمی چاوگە] دووچاری پەنمانی لەش‌بوون. (دچار اماس بودن)
بادام زمینی: [ناو]بەری دارێکە توّخلێکی قەوی وکفەڵی هەیە و لە ناوکی فەندوق دەکا و کەمێک درێژترە و دەخورێت. (بادام زمینی)
بادام هێندی: [ناو]بەری دارێکە کە لە هێند دەروێت؛ دەخورێت و تێکەلاّوی ئاجیل(چەرەز)ی دەکەن. (بادام هندی)
بادامی: [ئاوەڵناو] (ب) لەوێنەی بادام؛ وەک:چاوبادامی؛ هەر شت بە بادامەوە پێوەندی هەبێ. (بادامی)
بادامی‌تاڵ: [ناو،ت]بادامێک‌کە تامی‌تاڵەو روّن بادامی لێدەگرن. (بادام تلخ)
بادامی‌کاغەزی: پستە بەهیف؛ بادامی توخل ناسک. (بادام کاغذی)
بادامی‌کێوی:بادامەکێویلە.(بادام‌وحشی)
بادایی: [رِابووردووی‌بادان]هەستوو؛ گرژبوو؛ بادراو. (ریسیدە)
بادەبان: [ناو]جوّری‌پەردە لە قوماشێکی قایم کە بە دەکەڵی پاپوّرەوە قایم‌دەکرێت و بە هێزی با پاپوّر دەخاتەرِێ. (بادبان)
بادرموش: [ناو]کون‌وکە لێنی‌خانو؛ بادرز؛ بابوێر؛ (درز در و دیوار خانە)
بادروّخ: [ناو]بادرز؛ بادەڵێن؛ بادرەوش؛ بابوێر. (منفذ باد)
بادرِەنگبوو: [ناو]بادرەشکبوّ؛ بادرِەنجبوّ؛ بادرِەنگبوّ؛ گیاییێکە عارەقێکی بوّنخوّشی لێدەگیرێت. (بادرنج بو.)
بادرِێزە: [ناو]بارِێزە. (میوەباد انداختە)
بادرِێسە: [ناو](١) سەڵکەتەشی.سەرە دووخ. (سردوک) (٢) فرفروّکە؛ فرفرەی منداڵان. (فرفره) (٣) دەوار. (چادر)(۴) کوّمانج؛ هەورەبان. (کماج)
بادک: عەشیرەتێکە لە وڵاتی بوّتان. (عشیرەایست)
بادکێش: [ناو] باکەش؛ کەڵەشاخ. (بادکش)
+بادە: (١) مەی؛(می)(٢)بای‌بدە، کرژی بکە. (بریس. بپیچان)
(٣) گشتە،کرژە.(ریسیدەشدە)۴.هەوایە(باد

هواست):(وەرە ساقی بەکولْ بێنە دڵی کەیلم بە هۆیبادە، بە جامیْ مەی خەڵاتم کە و سەری تونگەم لە بۆ بادە، شەرابی ئاڵی یاقووتی بدە دەستم فەلک بادە،تەپ و تۆزی خەیاڵات وخەفەتباریم وەبەر بادە.)«حەسەن سەلاح سۆران» (می؛بپیچ؛ریس زیاد؛باد؛ بادهواست.)

بادەچی: [ئاوەڵناو] مەیفرۆش؛ مەیخانەدار. (میفروش)

بادەر: [ناو](١) شتێک کە بای لێدەرچێ. (دارای منفذ باد) (٢) کرژدەکا و بایدەدا. (ریسنده)(٣) جەڕەبادەر. (پیچ کوشتی)

+ بادەرچوون: [چاوگە،ت]پەنچەری؛ تەگەر یان تۆپ کونبوون؛ (ب) با نیشتنەوە و لە لووت بەرزی کەوتن؛ (ب) لە فیز و تەکەبور کەوتن. (پنچر)

بادەڤ: [ناو]بادەوە؛ بۆران؛ با و بەفربارین پێکەوە؛ بایتوندکە بەفر ڕامالێ.(طوفان)

بادەک: [ناو]ئاچار؛ پێچ کوشتی؛ جەڕەبادەر. (پیچ کوشتی)

بادەمەک:[ناو] لووی ژێرپێست؛گرۆڤەر. (غده)

بادەنۆشی: [ناو]مەیخواردنەوە. (بادەنوشی)

بادیان: [ناو]بادیانە؛ ڕازیانە. (رازیانه)

بادیلە: [ناو]جامیبچووک؛ دەفریچکۆلە. (ظرف کوچک)

بادین: [ناو](١) گۆلێکی گەورەیە لەبەینی موسڵ و هەولێردا. (دریاچەای نزدیک هولیر)

بادیناوا: ناوی گوندێکە لە نزیکی کێوی قەندیل. (اسم دهی است)

بادینی: [ئاوەڵناو+ ناو] زبان و خەڵکی بادینان. پێوەندیداربەبادنینەوە . (زبان و اهل بادینان)

بادیهەڤا: [ئاوەڵناو]لەخۆدەرچوو. (متکبر)

+ بار: [پاشگر] بۆیهەیە لە وشەی جۆبار و ڕۆباردا واتای (بوار) بدا و لە پێشدا جۆبوار و ڕۆبوار بووبێتن. (پسوند، بار)

+ بار: [ناو](١) ئیزنی چوونە بارەگای سوڵتان و گەوران. (٢) باری کارەبایی. (٣) پێشخوانی مەیفرۆشی. (۴) گەنجەی تایبەت بۆ دانانی مەی. (۵) کەڕەت.(دەبار، سەدبار). دەفعە،پات.(۶) ڕەستۆرانی تایبەت بۆ پیاڵەفرۆشی و خواردنەوە؛ جێگای دانانی خواردنەوەی جۆراوجۆر. (بار)

بارئاسیاو: [ناو]بارەئاش. (بار آسیاب)

بارەئاشلێکردن: [چاوگە،ت]بار بۆ ئاشبردن و بە ئاردکردن (بردن بار بەآسیاب وآسیاب کردن). (ب) چەنەدرێژی. (کنایه(وراجی)

بارئەناز: [ناو](١) بارەناز؛ جێگای بارداگرتن. (٢) شوێنی بار لێدان و بارداگرتن لە ئێسکلەی بەندەر. (بارانداز)

باراخودیْ: (ف.مشە).(ب) بەش یان پشکاخودیْ؛ زەکات. (زکات)

باراڤ: عەشیرەتێکی کورد لە دیاربکر. (اسم عشیرەایست)

بارام: (١)بەهرام ناوی پیاوان. (نام مردانه) (٢) ناوی ئەستێرەی مێریخ. (سیارەمریخ)

+ باران: [پاشگر] بە ناوەوە دەلکێ واتای ڕژاندنەخوار دەدا وەک، توپباران، بەرد باران، گوڵباران. (پیواژە: باریدن)

بارانبارین: [چاوگە،ت]هاتنە خوارەوەی

باران. (باران باریدن)
باران‌پێوی: [ناو] لقی‌ له‌زانستی بووم‌ناسی که‌ له‌ چلۆنایه‌تی و ڕاده‌ی باران له‌ شوێنگه‌ل و وه‌رزگه‌لی جۆراوجۆر ده‌دوێت. (باران سنجی)
+ باران‌دادان: [چاوگه‌،ت]هه‌ر شت یان میچ یان ڕه‌شماڵێ که‌ ئاوی‌باران دابدا.(نشت- باران‌بداخل‌چادر)
+بارانـدن:[چاوگـه‌،ت]کاتێـک مریشـکێکی جووجکه‌ له‌به‌ر جووجه‌ڵه‌کانی له‌ خـۆی دوور ده‌کاته‌وه‌ به‌ هۆی‌گه‌وره‌بوونیانه‌وه‌.(وقتی‌مرغ جوجه‌هایشرا ازخود دورمیکند)
باران‌دیده : >باڵان‌دیده‌
باران‌کوت: [ناو]سفت‌بوون وکوترانی جێگاییک به‌باران. (باران کوب)
بارانگر: [ناو]هه‌رشوێنێک‌که‌ باران بیگرێته‌وه‌. (باران گیر)
باران‌لێدان: [چاوگـه‌،ت] (۱) لـه‌بـه‌ربارانـدا مانه‌وه‌ و ته‌ڕبوون. (۲) باران له‌ هه‌ر شتێک بکه‌وێ. (باران خوردن)
بارانـه‌: (۱) کرێـی‌بـار. (کرایـه‌بـار)(۲) هـه‌وا وگورانییێکه‌. (اسم ترانه‌ایست)
بارانه‌ی‌سه‌ربه‌قه‌پوچکه‌:کڵاو بـه‌سـه‌ر؛ بـارانی به‌خوڕڕه‌م و ده‌نک گه‌وره‌.(باران تند)
بارانـــه‌ی‌ســـه‌ربـــه‌کڵـــاوه‌: ڕێژنـــه‌بـــارانی توند؛کڵاوبه‌سه‌ر؛ شه‌سـته‌بـارانی بـه‌ تـه‌وژم. (باران تند)
بارانه‌ی‌ورد: نه‌رمه‌باران. (باران نم نم)
بارانه‌ی‌وه‌شت: ڕهێڵه‌باران؛بارانی‌به‌ خوڕڕه‌م و ده‌نک گه‌وره‌. (باران بشدت)
+ بارانی: (۱) [ئاوه‌ڵناو] هه‌ر شت پێوندی بـه‌ بارانه‌وه‌ ببێ؛ هه‌وری‌بارانی؛ هـه‌وای‌بـارانی. (۲)[نـاو] جـۆری باڵتـه‌ی ناسـک کـه‌ بـاران ناده‌ڵێنێ (دای‌نادا) (بارانی)
بارانی‌په‌ڵه‌: به‌بارانێ ده‌ڵێن که‌ به‌ ئـه‌نـدازه‌ی پێویست بۆ شین‌بوونی ده‌غڵ ببارێت. (بـاران کافی برای روئیدن غلات)
بارانی توند: شه‌سته‌باران. (باران تند)
بارانی ده‌ستگرد: بارانێ که‌ به‌گـوڕانی ڕه‌وتـی هه‌ور ده‌یبارێنن. (باران مصنوعی)
بارانی‌ناوه‌خـت: بـارانی بێـواده‌ کـه‌ زه‌ره‌ر لـه‌ کشت و کاڵ ده‌دا. (باران بیموقع)
بارباج: [ناو]بـاجی‌کـه‌ لـه‌ هـه‌رکـوڵ و هـه‌ر بارێک ده‌ستێنرێت. (بارانه)
بارابارانێ: [نـاو]بـاره‌خوێیـانێ؛ کـوڵ‌کـوڵێنی. (بازی نوجوانان)
باربارکێ: [ناو]کوڵ‌کوڵێنێ. (بازی نوجوانان)
باربه‌ر: [نـاو](۱)بـاره‌بـه‌ر؛ بـارگینی بـاری.(۲) کـــوڵ‌بـــه‌ر؛ بـــاره‌بـــه‌ر. (بـــاربر)
باربـه‌ری: [نـاو](۱) کوڵکێشـی. (۲) بنکـه‌ی ڕاگـوێزانی بـاری خـه‌ڵـک بـه‌مـز؛ بونگـای (نووسینگه‌)ی باربه‌ری. (باربری)
باربـه‌ژن: [نـــاو]تـــه‌لیســـمی هـــه‌ڵواســـراو (ئاوێزانکرا)و به‌ له‌ش‌دا. (طلسم آویـزان بـر بدن)
+ باربـه‌سـتن: [چاوگـه‌،ت] (۱) پێچانـه‌وه‌ و به‌ستنی بار. (بستن بـار)(۲) (ب) بـه‌پـوول و پاره‌گه‌یین و جێی‌خۆ قـایم‌کـردن لـه‌ژیانـدا. (به‌آلاف و ئولوف رسیدن)
+ باربه‌ند:[ناو](۱) هه‌ر شـت کـه‌ بـاری پـێ ببه‌ستن. (۲) ته‌رک یا شوێنی بار له‌سه‌ردانان

لە سەرسەیارەی‌سواری. (۳) کەسێک کـەبـار دەبستێ. (باربند)
باربەنیش‌کـەردەن: بـاری پێچـاوەتـەوە؛ بـار بەندیی‌کردوە. (بار بندی کرده)
باربەها: [ناو]بنپشک؛ ئەوکچـە کـە براکـەی داناوە ژن‌بەژنی پی‌بکات؛ ڕەسمێکی کۆن و کرێت بوو لەقەدیمدا (خـواهری کـەبـرادرش برای عوض کردن با دختری دیگر و عروسی در نظر میگرفته)
بارپێچ: [ناو، بک و بەر ](۱) کەسێک‌کـە بـار دەپێچێتـەوە. (۲) شـتێک‌کـە لـە باریـەوە دەپێچن. (بار پیچ)
بارچەوتـی: [ناوبـەرهـەمـی‌چاوگـە]بارکـە- چـی(لاری)؛(ب) ناڕاسـتی و نـەگونجـاوی. (بارکجی)
+ بارخانە: [ناو](ب) سمت‌وسـاتان؛ سـمت و بارخانە. (کنایەاز باسن بزرگ)
باردا: [ناو]چۆمێکە لە سوریا. (رود باردا)
+ باردار: [ئاوەڵناو] (۱) ئاوس. (۲)[ناو] زمـانی باردار و تەم گرتوو یان (بەڵغ‌گرتوو). (باردار)
باردان: [چاوگە،ت]گرژکردن؛ بـادان؛ ڕسـتن. (پیچ دادن)
بارزانی: لەقەمی حەزرەتی مارشـاڵ‌مسـتەفـا بارزانی‌خـەبـاتگێری نـەمری کـورد. (لقـب حضرت ژنرال‌مصطفی بارزانی).
بارزە: [ناو]جیوەی‌دار.(صمغ درخت)
باری‌ژیان: (۱)قورسایی‌و بارگرانی ژیـان. (۲) چۆنیەتی ژیـان؛ ڕەوتـی ژیـان(طـرزو شـیوه زندگی)
بارسا: [ناو]بارست؛ بارستا؛ قیللەت. (ضخامت)
بارسـڤک: [ئـاوەڵنـاو] کـەمبـار؛ بارسـووک؛ (ب)بێخەم؛ بی‌پەرۆش.(سبک بار؛بی‌غم)
بارسووکی:[ناو،ت]کەم بوونی کەلوپەلی ماڵ؛ (ب) بی‌ئەرکی. (سبک بار)
بارڤە: [ناو] بۆران؛ ڕەشەبا. (بوران)
باروفت: [نـاو] زەوییێـک کـە بـا خۆڵـەکـەی بردبێ؛با و بۆران؛بارەش.(بارفت؛ بوران)
بارفیکس: فرد؛ فـد؛ انـد:[نـاو]کـەرەسـتەی- وەرزشی ژیمناستیک. (بارفیکس)
بـارقورس: [ئـاوەڵنـاو] بـارگران؛ (ب) وەژێـر مەینەت کەوتوو. (بارسنگین)
بارقووڵ: [ئاوەڵناو] خـۆڕاگر؛ بـەپشـوو بـێهن درێژ. (مقاوم)
+ بـــارکردن: [چاوگـــە،ت](۱) بارلێـــدان. (بارزدن)(۲) (ب) ماڵ ڕۆیشتن لەجێگاییێکەوە بـــۆ جێگـــاییێکی‌تـــر؛ مـــەڕۆ بارمـــە- کـە.(کـوچکردن)(۳) (ب) قسـەی نـاخۆش خستنەسەر. (۳.بارکردن)
بارکۆڵە: [ناو]باری چکۆلە. (بار کوچک)
بارکێشـــی: [ناوبـــەرهـــەمـــی چاوگـــە] (۱)بارکێشـــان؛ حـــەمـــاڵی. (حمـــالی) (۲) بارهـەڵسـەنگانـدن و بـەقـەپـان یـان بـە ترازوکێشان. (توزین کـردن بـار) (۳) کـاری کەسێک‌کە ئەو ئیشەدەکا. (بار کشی)
بارگر: [ناو]حەماڵە بۆ نەڕووخانی دیوار. (چوب حماله دیوار)
+ بارگەچی: [نـاو](۱) کـاروانچی. (کـاروانی) (۲) ژنی کارەکەر کە لەگەڵ بووک دەچێ بـۆ ماڵی زاوا و بۆ ماوەییێک دەمێنیتەوە. (کلفـت کەبا عروس میرود و ميماند)

بارلێدان: [چاوگە،ت]بارباركردن؛ بار خستنه سەر بارەبەر. (بار زدن)
بارڕنج: ڕەنج بەبا. (رنج بەباد)
+ بارنەبردن: [چاوگە،ت] (ب) یاخیبوون؛ سەرکێشی؛ کەلەوەکیشی؛ نافەرمانی؛ ژێربارنەچوون. (بار نبردن. زیر بار نرفتن)
بارنەوەری: [ناو](ب) بارنەبردن و کوڵنەدان. (نافرمانی)
بارووسەرزمانی: [ناو]باری سەرزبان. (بار زبان)
باروٚک: [ناو]شێوازێکی موٚسیقای ئورووپییە. (باروک)
باروبنە: [ناو]ماڵەکوٚچ؛ بارگەوبنە. (باروبنە)
باروزگا: [ناو]بارئەنداز؛ بارەناز. (بارانداز)
باروٚشەی کارەبایی: پەنکە؛ باوەشێنی کارەبایی. (پنکە)
باروٚم: بمهێنی. (بیاوردم)
باروٚن: [ناو]لەقەمی پیاوی گەورە لە ئورووپا؛ عینوانی پیاوی گەورەی ئەر مەنی. (بارون)
باروو: [ناو](١) بورج و باروو؛ دیواری بەرز. (برج و بارو) (٢) بارووت. بارووت. (باروت) (٣) باربوو؛ یارمەتی زەرەر لێکەوتوو. (کمک بەخسارت دیدە)
بارووت پێژ: [ناوبک]بارووت چێکەر. (باروت ساز)
بارووتخانە: [ناو](١) جێگای دروستکردنی بارووت. (کارخانەباروت) (٢) عەمباری بارووت. (انبار باروت)
بارووتساز: [ناو]بارووت چێکەر. (باروت ساز)
بارووتکەر: [ناو]بارووتچێکەر.(باروتساز)

بارووتە: [ئاوەڵناو]خوێڕی؛ لەش گران؛ تەمبەڵ. (تنبل)
بارووتی: بارووتی.[ناو+ ئاوەڵناو] (١) ناوی جوٚرێک چای وشک و وردە. (چای باروتی) (٢) هەر شت پێوندی بە بارووتەوە هەبێت. (باروتی)
بارووتی بێدوکەڵ: [ناو،ت]جوٚرێک بارووت کەلەکاتی سوتاندندا دووکەلێ نییە.(باروتبی-دود)
بارووتی ڕەش: قەرەبارووت؛ بارووتی ئاسایی. (باروت سیاه)
بارووتیلوٚکە: [ناو] بارووتیپەموو؛ ماکێکی لوٚکە ئاسایە کە زوو ئاوردەگرێت(باروتپنبه)
بارووود: تد: [ناو]بارووت. (باروت)
بارووف: [ناو]گژەبا. (باد تند)
بارەوون: [ناو]لەقەمی پیاوی مووسایی. (بارون)
بارە: [ناو]وارە؛ بابەت؛ لە بارەی کێوە قسە دەکەن. (بارە)
بارهاوردن: [چاوگە،ت] (١) بار ئانین؛ هاوردنی بار. (آوردن بار) (٢)بارهاوردن؛ هاوردن وەر؛ ڕەعەمەل هێنان. (بار آوردن)
بارەبی: (١) [ناو،ت]کوٚلێک داربی؛ بارێک داربی. (یک بار چوب بید) (٢) باربوو؛ بارەبوو؛ کوٚمەکی ماڵی (کمک مالی)
بارەبی کردن: [چاوگە،ت]باربووکردن؛ کوٚکردنەوەی کوٚمەکی ماڵی بوٚ کەسێک. (جمع کردن کمک مالی برای کسی)
بارەخوێ: (١) بارەخوێی بارکراو.(٢) جە واڵی پڕ لەخوێ. (بار نمک) (٣) گەمە ییکە؛ بار

بارانێ. (اسم بازی)
بـــاره دار: (١) [نـــاو،ت]داری لـــه بـــار بەستراو؛کۆڵێک دار. (بار هیزم) (٢)[ئاوەڵنـاو] ئاوس؛ تولدار؛ زکپڕ. (آبستن،حامله)(٣) بـاره-دار؛ بەردار؛ بەهرەدار. (بهره دار)
بارەسیاو: [ناو]بارەئاش. (بار آسیاب)
بارەسیاوهاڕ: [ناوی،بک]باراش لێکەر. (کسـی کەبار را آسیاب میکند)
باڕەکە: [ناو] مریشکی‌باڕ؛ باڕۆکە. (جوجه مرغ یکساله)
بارهەڵگرتن: [چاوگە،ت] (١)کۆڵ هەڵگـرتن. (بار بردن) (٢) (ب) ژێرباری ژیـان چـوون و ڕەنج و زەحمەت کێشان. (زحمت‌کشیدن)(٣) ژێر بار چوون. (زیر بار رفتن)
بارهەنگ: [ناو]تووی گیای‌ڕکێشه بۆ قۆخـه باشه. (بارهنگ)
بارهێنان: [چاوگـە،ت] (١) پـەروەردە کـردن. (بارآوردن) (٢) بار هێنـان.(وەک) لـه بانـەوە، بارێکی هێنا بۆ سەقز. (حمل بار)
+ باری: (١) هەر شت تایبەت بە بار کێشـی-بێـت وەک ئـەسـپی‌بـاری. (بـاری) (٢) هاتنەخوارەوەی لەسەریـەک لـه ڕابـووردودا؛ وەک: باران باری. (بارید؛)(٣) یەکەی گوشـار بەرانبەر بـه١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ پاسـکاڵ لـه فیزیـک دا. (بـاری)(٤) کـورتکراوەی بـاری تعالا؛ (تا کەس نەڵێ بـه کـوردی نـەکـراوە مەدحی باری) «حەقیقی». (باری)
بـاریێ: (١)دەسـتاوەدەسـتکردن؛ بـاریێ بـه هەرحاڵ، هـەر چۆنێـکبێـت. (٢)یـەک بـار؛ یەک کـۆڵ(٣) یـەک جـار؛ یـەک کـەڕەت.
(باری)
باریتۆن: [ناو]دەنگێ (پیاوانه) له بەینی بـاس و تێنۆردا له مۆسیقادا. (باریتن)
باری تەعالا: خوای گەورە. (باریتعالی)
باریدۆخ: [ناو]بارودۆخ. (وضع؛موقعیت)
باڕێزان: گەڵاڕێزان؛ برێتی له پاییزی درەنگ. (برگریزان)
بارێســـەدوخ: [نـــاو]ســـەلکـــەتـــەشـــی؛ سەرەتەشی.(سردوک)
باری‌سەرزمان: [ناو]بەڵگی سەرزمان. باروسە-رزمانێ. (بار زبان)
باری‌سەربار: [ناو]ناوبار. (ب) مـوزاحیم؛ بـاریێ کە لەسەر کۆڵ وباری سـەرشـان دادەنرێـت (بار سربار)
باری سەرشان: [ناو](١) وەزیفه؛ ئەرکی سـه-رشان. (وظیفه) (٢) سەربـاربوون؛ زحمـەت و دەردیسەر. (سربار شدن)
باری‌عام: [ناو]ئیزنی‌بە عام چوونـه بـارەگـای گەوران. (بار عام)
باری‌کارەبایی: [ناو]ڕادە و ئـەنـدازەی هێـزی کـارەبـا کـه لـەخـەزینـه یـا (ژنراتـۆر) وەردەگیرێت.(بار برقی)
باریکایی: [ناو،ت]شوێنی هـەرەبـاریکی هـەر شت. (جای باریک هر چیز)
باریک‌بیر: [ئاوەڵناو] ورد بین؛ بیرتیژ. (باریـک بین)
باریــک‌بیــری: [نـــاو] چۆنیــەتــی بــەوردی تێفکرین؛ بیرتیژی. (باریک بینی)
باریک‌بین: [ئاوەڵناو] وردبین؛ زۆرسه رنج دەر. (باریک‌بین)

باریک‌بینی: [ناو] وردبینی؛ چۆنیه‌تی وردبین بوون. (باریک بینی)
باریکه‌ڕا: [ناو] تووله‌ڕێ؛ ڕێگای‌ته‌نگه‌به‌ر؛ ڕێگای‌ته‌سک. (راه‌باریکه)
باری‌لێو: [ناو]به‌ڵغی سه‌رلێو؛ لێوی بارگرتوو (لێو به‌بار و تازیه بارم) (قشر روی لب)
بارین: پاشگر: هاتنه‌خوار. خۆڵبارین: گوللە-بارین، باران‌بارین. (باریدن)
باڕین: [چاوگه] باڕه؛ باڕاندنی ئاژاڵ. (بع بع کردن)
باریه: [ناو]بۆریا؛ حه‌سیر؛ ڕایه‌خی له جه‌گه‌ن چێبوو. (بوریا)
+ باز: (١) ئه‌سپی نێوچاوان‌سپی. (اسب پیشانی سفید) (٢) باز. (ف گیو) دیسان؛ هه‌م؛ دووباره؛ ژی. (باز)
+ بازاڕ: ڕوژێ، یاکاتێکی دیاریکراو له مانک یا حه‌وتوودا بۆکڕین و فرۆشتنی ماڵات و ئاژاڵ له‌شوێنێکی دیاریکراودا؛ وه‌ک بازاڕی قه‌باخکه‌ندی. (بازار)
بازاڕپه‌سند: [ئاوه‌ڵناو+ناو]قابیلی فرۆش؛ موشته‌ری په‌سند. (بازار پسند)
بازاڕچه: [ناو] گوزه‌ر و شوێنێک که چه‌ند دووکانی تێدابێت. (بازارچه)+ بازاڕگه‌رمی: [به‌رهه‌می‌چاوگه]تاریفی زۆر و به‌درۆ بۆ فرۆشتنی شتێک یان خۆشیرین‌کردن. (بازار گرمی)
بازاڕی: [ئاوه‌ڵناو] (١) کاری‌بازاڕی: کاری‌هو-نه‌ری‌بۆ فروش و ڕه‌چاو نه‌کردنی ورده‌کاری له هونه‌ره‌که‌دا. (٢)[ناو] ئه‌وه‌ی له‌بازاردا موعامه‌له ده‌کا یا دووکانی‌هه‌یه. (٣)(ب) کار یا شتی بێبایه‌خ و سه‌رسه‌ری . (بازاری)
بازاڕی ئازاد:کڕین و فرۆشتنی بێ‌گرفتوگیری و به‌بێ‌کۆپۆن؛ بازاڕێک که زیادی و که‌می قیمه‌ت به هۆی زۆر و که‌می کاڵا یان زۆر و که‌می پێداویستی موشته‌ری ده‌گۆڕدرێت.(بازار آزاد)
بازاڕی بوورس: شوێنی سه‌ودا و موعامه‌له‌ی وه‌ک جه‌واهێرات و نه‌وت؛ هتد. (بورس)
بازاڕی جیهانی: بازاڕێک که جنسگه‌لی له لایه‌ن ده‌وڵه‌تگه‌لی جۆراوجۆر بۆکڕین و فرۆشتن دابین‌بکرێت.(بازار جهانی)
بازاڕی ڕۆژ: ڕۆژگه‌لی دیاریکراو بۆکڕین و فروشتن له شوێنێکی تایبه‌تدا. (بازار روز)
بازاڕی زێڕینگه‌ران: شوێنێک یا ڕاسته بازاڕێک که زۆربه‌ی دووکانه‌کان زێڕینگه‌ر بن؛ هه‌روه‌ها بازاڕی ئاسنگه‌ران و مسگه‌ران و قوماشفرۆشان و ته‌نه‌که‌سازان. (بازار زرگران)
بازاڕی سیا: [ناو.ت] ڕه‌شه‌بازاڕ؛ موعامه‌له‌ی پێدا ویستی به‌گرانتر له‌نرخ و به دزیی یاساوه. (بازار سیاه)
بازاڕی شام: (ب) جێگای زۆرشلۆق و تێکه‌ڵ و پێکه‌ڵی پێده‌شوبهێنن. (بازار شام)
بازاڕشکێنی:کاری فرۆشتنی کاڵایێک زۆر به هه‌رزان یابه نرخی‌که‌م بۆ زه‌ره‌ر لێدان له‌و که‌سانه که مله(ڕه‌قابه‌ت) ده‌که‌ن و له مه‌یدان ده‌رکردنیان. (بازار شکنی)
بازاڕی عومده‌فرۆشی: شوێنێ که ورده فرۆشه‌کان سه‌رجه‌م شتی لێده‌کڕن و به ورده‌فرۆشی به‌گرانتر ده‌یفرۆشنه‌وه. (بازار

عمدەفروشی)
بازاڕی کار: ڕاکێشانی هێزی کاری ئینسان لەلایەن داخوازانی ئەو هێزەوە لە کۆمەڵدا؛ هەموو ڕۆژ ژمارەیێک خەڵک دەچنە نێوبازاڕی کارەوە، شوڵ پەیدا دەکەن. (بازار کار)
بازاڕی گەرم: (ب) بەبرەو. (بازار گرم)
بازاڕی مانگانە: بازاڕێک کە مانگی جارێک لە ڕۆژێکی دیاریکراودا پێکدێ؛ هەروەها بازاڕی ساڵانەو حەفتەیی. (بازار ماهانە)
بازاڕی ناوخۆ: بازاڕی پیشاندان و موعامەلەی کاڵا لە ناوخۆی ولاتدا. (بازار داخلی)
بازاڕنەبوون: بێبازاڕی؛ بازاڕکەسادی؛ بازاڕی چۆڵوهۆڵ و بێموشتەری؛ دژی بازاڕتیژی و بازاڕگەرمی. (بازار کساد)
بازبردن: [چاوگە،ت]پەڕین؛ بە سەر شتێکدا بازدان. (پریدن)
بازبەر: (١.ف.مەر). جێی دەربازبوون؛ شوێنی دەربازبوون.(٢)بازدەر.(راه گریز٢.پرش کنندە)
بازبەند: [ناو] بازووبەند؛ قۆڵبەند؛ بازیبەند.(بازوبند)
بازد: [ناو] باز. (پرش)
بازدایی: [ناو،بک] دەرچوو؛ هەڵاتوو. (فرار کردە)
بازدبازوکێ: [ناو،ت] بازبازێن؛کایەی بازدان.(پرش)
بازد دان: [چاوگە،ت]باز دان. (پرش کردن)
+ بازدی: [ناو] بازدید؛ دیدەنیدانەوە. (بازدید)
بازراقە: [ناو] بازرقە؛ بازراقە دان: لەپڕ دەرپەڕین.(جهش)
بازقەبان: [ناو]باشقەپان؛ تیژمار. (نوعی مار)
+ بازگ: [ناو]بازوو؛ باڵ. (بازو)
بازگۆ: دووبارە وتنەوەی قسەیێک؛ گێڕانەوە-ی قسەیێک. دووپاتکردن. (باز گو)
بازمەلە: [ناو]باسکەمەلە. (شنای کرال)
بازنگ: [ناو]بازند؛خڕخاڵ؛ بازنە. (النگو)
بازنگە: [ئاوەڵناو] (پیتیگ منگە) بازننە؛ دۆڕاو. (بازندە)
بازننە: [ناو،بەر] بازندە؛ دۆڕاو لە قوماردا؛ بۆڕدراو لەزۆرانبازی و وەرزشدا. (بازندە)
بازنۆکە: [ناو] بەربازن بۆ دانەکەوتنی بازنە؛ بازنەی چووک. (النگوی کوچک)
بازنەگاسن: [ناو،ت] ئاڵقەیئاسن کە دەخرێتە سەرگاسنی درزدار. (حلقەگاو آهن)
بازۆ: ناوی سترانێکی کوردییە.(نامترانەایست)
بازوپاز: [ناو]جۆرێک زکر لە ئاینی زەڕدە-شتدا. (نوعی ستایش درئایین زردشت)
+ بازۆر: [ناو] ڕەشەبا؛ بای زۆرتوند. (باد شدید)
بازۆڵە: [ناو]باسک؛ (زیاتر بۆ باسک و قۆڵی قەوی) دەوترێت، ئەگەرچی (لە)نیشانەی چووککردنەوەیە. (بازو)
+ بازوو: [ناو] ئەو چارەوێی کەئالقەیێکی باریکیسپیلەخوارچۆکەکانییەوەبێت؛ ئەگەر هەر لە دەست یاپاییێکیدابێت،(چە پە). <ئە-سپیچەپ.> ئەسپیڕاست.(اسبی کە در پایین بخلق حلقەهاییسفیدرنگ دارد)
+ بازووبەند: فد: [ناو](١) ئالقەی بۆ جوانی لەقۆڵبەستن. (٢) نوشتە لەقۆڵکردن وەک گوللە بەند و تێغ بەند.(٣) بازووبەندی

پاڵەوانی.(٤) بازووبەندی ڕەش لەعەزادا.(٥) بازوو بەندی کاپیتانی والیبالۆ یافووتبالۆ. (٦) بازووبەندی بەرپرسی، وەک بازوبەندی دیژبان.٧) بازووبەندی هیلالی ئەحمەر.(بازوبند)
بازووکا: فد: [ناو]چەکی شەڕ دژی تانگ و زرێپۆش کە لوولەکەی زیاتر لە میترێک درێژی هەیە و بەشان هەڵدەگیرێت. (بازوکا)
بازووی بارهەڵگری نوێل: لە خاڵی پاڵگەی نوێلەوەیە تا ئەو جێگا کە هێزی بارەکە دەکەوێتە سەر نوێل، کە هەمیشە کەمترە لەبازووی زۆرپێدەر. (بازوی اهرم)
بازووی زۆرپێدەر: ماوەی خاڵی زۆر هێنەر تا پاڵگەی نوێلۆ، کە هەمیشە زۆرترە لە بازووی بارهەڵگر؛ (لە فیزیکدا). (بازوی محرک)
بازوەن: [ناو]بازووبەند؛ قۆڵبەند. (بازوبند)
بازوی: > بازوو: ئەسپیۆکە چەند ئاڵقەی سپی لەلاقەکانیدابێت؛ (اسبی کەدر پایین بخلق پاهاحلقەی سفیدرنگ دارد)
بازووی درگا:[ناو،ت]لاشیان. (چوبهای دو طرف چهار چوب در)
+ بازە: [ناو](١) مەیت؛ جەنازە. (جنازە)(٢) ئەسپی نێوچاوسپی. (اسب پیشانی سفید)
+ بازە: بەڵەک؛ ناوە بۆ سەگی بەڵەگ؛ (بۆرە نەبیۆ بازەبیۆ، دانەیک تەڕ و تازەبیۆ) (فۆلکلۆر). (سگ‌دورنگ)
بازەم: (١) بمهێڵە؛ لێمگەڕیۆ. (بگذار) (٢) دیسان؛ دووبارە. (بازهم)
بازەند: [ناو]مەچەکبەند؛ خڕخاڵۆبازنە. (النگو)
بازەوان: [ناو]کەسێک کە خزمەتی باز دەکا و لە ڕاودا باز بەردەداتە نێچیر. (بازبان)
بازەی: (١)[ئاوەڵناو+ بەند] برێوە؛ هەندیۆ؛ بازیۆبەعزیۆ؛ برێک؛ (بعضی) (٢) دیسان. (بازهم)(٣)لێیگەڕیۆ.(ولش کن)
بازی: فد: [ناو](١) کایە؛ گاڵتە؛ یاری؛ قومار؛ پاشگر: کایەکەری؛ تەختەبازی، قومار بازی، تورنا بازی، سیا بازی؛ کەلەشێربازی، کۆتربازی. (بازی)(٢) وەردێنەی گونگ پان-کردنەوە؛ تیرۆک.(غلطک‌پهن کردن‌خمیر)
بازی‌سپی: [ناو،ت] شاباز. (شهباز)
بازیگەر: فد: [ناوی‌بک]کایەکەر؛ ئەکتەری شانۆ؛ ئاکتۆری سینەما و شانۆ. (بازیگر)
بازیلیک: [ناو]جۆرێک مارمێلک کە بە پا لە سەر ئاو هەڵدێت. (بازیلیک)
بازی هەوایی: [ناو] بەرزەحواییلە؛ بەرزە حەوایی. کۆلارە. (بادبادک)
باژ: ف.مشە. باز؛ واتا: دیسان. (باز)
باژارسازی: باژێرسازی. (شهر سازی)
باژارگیڕی: لە کوردستانی خورهەلات : شارەداری؛ لە کوردستانی ئەودیو: شارەوانی. (شهرداری)
باژاڕۆک: [ناو]شارۆچکە. (شهرک)
+ باژەڵە: [ناو]مووروویێک کە دەیساونەوە بۆ دەرمانی نەخۆشینی باژەڵە. (نوعی خرزە)
باژەن:[ناو](١) باوەشێن. (بادبزن) (٢) نێریە کێوی. (بز کوهی)
باژنە: [ناو]پاژنە؛ پانی؛ پاشنە؛ باژنۆ. (پاشنه)
باژێرگێڕ: [ناو،بک]شارەدار: لە ئێران؛ شارەوان: لە کوردوستانی عێراق (شهر داری. شهربانی)

+ باس: فرد؛ فد؛ اند: [ناو](١) دەنگی گڕ لە سازی ئۆرکێستر و ئۆپێرادا؛ دەنگی گڕ (بەم) لەکوپلە موزیکێدا، دەنگی نێر و پیاوانە. (باس) (٢) خەبەر؛ بەحس (ب) نزیک کەوتن؛ کارم بەسەریەوە نییە باسی ناکەم: لێینادەم توخنی ناکەوم. نایدوێنم. (کاریش ندارم)
باسارک: [ناو]کوٚلێر؛ کوٚلێڕی ئاوی و گازی. (کولر آبی و گازی)
باسبێژ: [ناو]حەکایەتبێژ؛ چیروٚکبێژ. (داستان گو)
باس‌پرس: فد: [ناوی‌بک]باس کوٚڵ؛ تویژەر لە باس؛ باسوخواسکەر. (باز پرس)
باسترغە: [ناو]ئاودانی چەڵتووک بوٚ چەکەرە-کردن. (آب دادن چلتوک)
باستووق: [ناو]باسڵخ؛ باسووق. (باسلق)
باسخوون: [ناو]پەلاماری لەپڕ و بێ‌خەبەر لە شەڕدا بەشەو. (شبیخون)
باسرێژ: [ناو] پڕوپاگەندەچی؛ ڕێکلامچی؛ باڵگاشەچی. (تبلیغات چی)
باس‌زان: [ناو] مێژووزان. (تاریخ دان)
باسقول: [ناو] لەپڕ ئابلوٚقەدان. (محاصره ناگهانی)
+ باسک: تیرەیێکن کە دانیشتووی باسکن لە باکووری ئیسپانیا؛ هەرکام لە کەسانی ئەو عەشیرەتە و زمانیان. (باسک)
باسکانە: دووبەرەکی؛ دوو قوٚڵی‌بوون؛ بەبەرەکانیی دوو فیرقەیی. (انشقاق و مخالفت ؛دودسته ای)
باسک‌بەند: [ناو]قوٚڵبەند؛ بازووبەند. (بازوبند)
باسکراو: [جێناو] نێو براو؛ باس لێکراو؛ لێدواو. (نامبرده)
+ باسکڵاو: [ناو]ناوی مەلێکە.(اسم پرندەایست)
باسکوٚ: [ناو]قرتاندنی باڵی باڵندە. (قیچی کردن بال پرنده)
باسکوٚ باسکوٚ: باڵ لێدانی فڕندە؛ باڵە پڕژێ؛باڵەفڕی. (بال زدن پرنده)
باسکوٚڵ: [ناو](١) قەپانی هەرەگەورە بوٚ کێشانی باری قورس. (باسکول)(٢) باس کوٚڵ؛ قەکوٚڵەر لە باس؛ تویژەر لە باس. (بازپرس)
باسکە باسکانی: دوو بەرەکی؛ دەستە بەندی؛ دوو قوٚڵی؛ دوو دەستەیی .(دستەبندی)
باسکە دار: [ناو]دەستەک؛ داری دارەڕا.(تیرک)
باسکەمژانە: [ناو]باسکێش.(بازوی دراز خیش)
باسکەو باسک: [ناو،ت] ئەم یاڵ و ئەو یاڵ. (از این تپەبەآن تپە)
باسکیتباڵ: اند؛ فد؛ فرد.: [ناو]وەرزشێکە لە بەینی دوو دەستەی پەنج نەفەریدا کە تێدەکوٚشن توٚپێک بخەنە نێو توٚڕێکی هەڵواسراوەوە. (بسکتبال)
باسکی‌سیغار: [ناو]موٚدنە؛ دەمنە. (چوب سیگار)
باسلوق: [ناو]جوٚرێک شیرینی نەرم و کێش-دارە. (باسلق)
+ باس نەکردن: [چاوگە،ت]کار بەسەرەوە نەبوون. وەرە من باست ناکەم: کارم بەسەرتەوە نییە. (کار بەکسی نداشتن)

+ باس‌وخواس: [ناو،ت] لێپرسینه‌وه‌؛ حیساب و کیتاب لیٚ‌کێشانه‌وه‌ و پرسینه‌وه‌ له‌ خه‌رج کردن یا له‌ چۆنیه‌تی کارێک. (پرسیدن از خرج و دخل. حسابرسی؛ باز خواست)
باسوون: [ناو]سازێکی نیزامییه‌ که‌ به‌فوو لێده‌درێت وه‌کوو کلارینێت وایه‌. (باسون)
باسه‌ری: [ناو]بای که‌لله‌؛ به‌هه‌وایی؛ لووت به‌رزی. (مغرور)
باسه‌واد: [ئاوه‌ڵناو](١) سه‌واددار؛ خوێنده‌وار؛ خوێنه‌وار؛ خوێنده‌ ڤان؛ خاوه‌نی توانایی خوێندنه‌وه‌. (باسواد)(٢) (ب) زانا. (دانا)
باسی: [ناو]لاسایی؛ ده‌مه‌لاسکیٚ.(تقلید؛ ادا)
باسی‌کرن: [چاوگه،ت]ده‌مه‌ لاسکیٚ‌کردن؛ لاسایی‌کردن . (تقلید کردن؛ادا درآوردن)
+ باش: تد:[پێشگر و پاشگر] وه‌ک:باش مه‌للا و به‌نناباشی؛ سه‌رۆک؛ سه‌رده‌سته‌؛ نه‌فه‌ری-سه‌روو؛ که‌سی‌یه‌که‌م له‌یاریدا؛ باش‌مه‌للا؛ سه‌روه‌ستا؛ (دژی قڕه‌). (سر)٠
باشتی: (ف.مشه) میرات.(ماترک متوفی)
باش‌ڕۆژ: ڕۆژ باش؛ ڕۆژ به‌خێر.(روزبخیر)
باشقه‌: [ئاوه‌ڵناو] سه‌روو؛ ژوور؛ سه‌رباشقه‌: هه‌ڵبژارده‌؛ له‌ هه‌موو چاکتر؛ سه‌رتۆپ؛ هه‌ڵکه‌وته‌؛ له‌(باشقا)ی‌تورکییه‌وه‌ هاتووه‌ واتا بان‌سه‌ر. (لایق؛ تک؛ بالا؛ برگزیده)
باشقیر: خێڵێکی تورکن که‌ له‌ ئاسیای نێوه‌ ڕاست نیشته‌جێن؛ هه‌ر کام له‌ ئه‌ندامانی ئه‌و خێڵه‌. (باشقیر)
باشکۆ: فد: (ف.مشه) شکۆدار؛ ڕێزدار؛ گه‌وره‌. (باشکوه)
باشکێن: [ناو،ک]ریزێک دار که‌ به‌ر با بگرێت؛ هۆ یان ده‌رمانی‌لابردنی بای سک. (بادشکن)
باشگا: فد: [ناو]یانه‌. نادی؛ کلووب؛ ناوی جێگایێکه‌ که‌ چه‌ند که‌سی هاو بیروڕا یا هاو شۆڵ لێی کۆ ده‌بنه‌وه‌ بۆ ڕابواردن و سه‌رگرمی؛ وه‌ک باشگای ورزه‌شی، باشگای ئه‌فسران،باشگای مامۆستایان. (باشگاه)
باشمه‌: [ناو]باسمه‌؛ شه‌قڵی‌خه‌رمان؛ مۆری قوماش‌ڕه‌نگاندن. (باسمه)
باش‌مه‌للا: [ناو]باش (تورکییه‌: سه‌ر). که‌سی ئه‌وه‌ڵ‌له‌یاریدا؛ سه‌روه‌ستا. (نفر اول بازی)
+ باش‌وبۆش: [ئاوه‌ڵناو] چاک و پۆشته‌؛ پۆشته‌ و په‌رداخ؛ خۆش‌گوزه‌ران.(خوش گذران)
باشوو: [ناو]باڵنده‌یێکه‌ له‌ واشه‌ گه‌وره‌تره‌ و زوو که‌وی‌ده‌بێت. (نوعی شاهین)
باش‌وه‌ستا: [ناو]سه‌روه‌ستا. (استاد کار)
باشه‌باش: چاکه‌ چاک؛(ب) هه‌مووی‌دروسته‌. (درسته)
باشه‌ڤار: ئێڤارباش؛ ئێواره‌باش. (ئیواره‌به‌خێر)
باشی:(١)چاکی(خوبی)(٢)پاشگر: سه‌رده‌سته‌؛ لۆتی‌باشی، به‌نناباشی، چاپه‌زباشی، (باشی)
باشیق: [ناو]باشوو؛ باڵنده‌یێکه‌ له‌ سه‌قر گه‌-وره‌تره‌ و زوو که‌وی ده‌بیٚ. (نوعی شاهین)
باشیلا: [ئاوه‌ڵناو]باش (تورکییه‌ :سه‌ر). سه‌رگه‌ردان. (سرگردان)
باشیله‌: [ناو]باش: تورکی، له‌: نیشانه‌ی بچووک کردنه‌وه‌؛ ده‌ستماڵی‌بچووکی‌سه‌ر؛ سه‌رپۆشی چکۆله‌؛ به‌رهه‌ڵبێنه‌ و کوڵوانه‌ی چووک. (روسری کوچک. پیشبند؛ رودوشی)

باشیم: [ناو]باشتی؛ میرات. (ماترک)
باشیمگیر: [ناو]باشتی‌گر؛ کـوتگر؛ بـەش‌بـەر؛ (سهیم در ماترک)
باعاندن: [چاوگە،ت]بالاتـدن؛ باڕانـدن. (نالـە گوسفند و بز)
باعەباع : [دەنگەناو] باعەی لەسەریەکی کـار وئاژەڵ. (بعبع)
+ باعیس: فد: [ناو]بـایس؛ بوونـە عیلـەتـی-کارێک؛ هۆ. (ب) بوونە هۆ؛ خودا بـاعیس و بانیەکەی ماڵویرانکات. (سبب؛ علت)
باغار: [ناو] بەپڕتاو. (چهار نعل)
باغبێن: [ناو] گیای درێژی باخە بەستن. (گیاەبلند مخصوص بستن باقه)
باغچـەی‌سـاوایان: (ب) شـوینێک بـۆ ئاگـا-لێبوونی منداڵان لە تەمەنی کەمتر لـە حـوت ساڵیدا. (کودکستان)
باغدار: فـد: [ئـاوەڵنـاو+ نـاو]خـاوەنـی بـاغ ؛ دارای‌باغ. (باغدار)
باغداری: فد: [ناو]کاری باغدار؛ کاری تـوانین و زانینی بە ڕێوە بردنی باغ. (باغداری)
باغربودن: [چاوگە،ت] گـەورەبـوون گـەورە-بوون؛ لە خۆگۆڕان؛ لەخـۆدەرچـوون؛ غـورور پەیداکردن. (مغرور شدن)
باغستان: فد: [ناو]دارسـتان؛ زیـاتر بـۆ داری بەر. (باغستان)
باغەوانی: [بەرهەمی چاوگە] باخەوانی؛ کاری سەرپەر شتی‌کردنی باغ. (باغبانی)
باغەوبەس: [ناو]باغبێن. (گیاەدراز مخصـوص بستن یکدستەگیاە)

باغی‌میللی: [ناو،ت]پارکی میللـی؛ بـاغی کـە دەوڵەت سەرپەرشتی دەکات بۆ گەشت و لە-ناودا گەڕانی خەڵک.(باغ ملی)
باغی‌میللت: [ناو،ت] باغی‌میللی؛ پارکی‌میللی. (باغ‌ملت)
باغی‌وەحش: [ناو]جێگای ڕاگرتنی حـەیـوانی جۆربەجۆر بۆ نیشاندان بە خەڵک.(باغ‌وحش)
باف: چن؛ [پێشگر] وەک: قاڵیباف، جاجم‌باف، بەرماڵباف. (باف)
بافالۆ: اند [ناو] بووفالۆ؛ گامێشی وەحشی. (بو فالو)
بافڕوک: [ناو]فڕندە. (پرنده)
+ بافره: [ئاوەڵناو] بادیهەوا. (مغرور)
بافڵ: [ناو]تافگ؛ تاف. (آبشار)
بافوور: فد: [ناو]وافوو؛ حۆققە و دەسـتەکـەی بۆ تریاک‌کێشان. (وافور)
بـافووری: [ئـاوەڵنـاو] فـد: (وافـووری؛ (ب) تریاکی؛ ئە سرارکێش. (تریاکی)
بافەدەنگ: [ئاوەڵنـاو] بـافیش کـەر؛ خۆهـە-ڵکێش. (خود پسند)
بافەدەنگی: [ناو]خۆهەڵکێشی؛ تاریف‌کردن لە خۆ.. (خود پسندی)
بافی:فد:[پاشگر]چنین؛قاڵیبافی،جـاجم بـافی؛ بەرماڵبافی. (بافی)
بـافین: [چاوگـە]چنـین؛ گـۆرەوی‌بـافین: گۆرەوی‌چینـین؛ کـاموابـافین: کـاموا چنـین؛ (بافتن)
باڤماری: [ناو] زڕباب. (ناپدری)
باڤێ: [کاری‌ئەمری] بهـاوێ؛ بهـاڤێ؛ بخـە؛ باوێ. (بیانداز)

باڤێژه: [کاری ئەمری] بهاوێژه؛ فڕیده؛ فڕێیده. (بنداز)
+ باڤینی: باڤیتی؛ باوکێتی. (پدری)
باق: [ناو](۱) مووچ؛ قولاپه؛ گرێی دەست و پا. (مچ)(۲)سەلکه سیر و پیاز. (غدەسیروپیاز)
باقباق: [دەنگەناو]باقەباق؛ دەنگی ڕێوی و چەقەڵ. (واق واق)
باقر: (۱) دەفری مسینه که قاڵاییەکەی سێورابێب و سوورایی مسەکه دەرکەوتبێت. (ظرف مسی قلع رفته)
(۲) ڕوو داماڵاو. (بی آزرم) (۳)[ناو] ژەنگی- مس. (زنگ مس)
باقسمات: [ناو]بیسکویت. (بیسکویت)
+ باقل: چما؛ له ڕووی عەقڵەوه؛ ڕەنگە؛ وادیاره؛ باقڵ نەیزانیبێت: ڕەنگە نەیزانیبێت؛ باقڵ تۆ نازانی من خەڵکی سابڵاغم؛ چمابە ئە قل. (عقلاً؛ شاید)
باقلا قاتق: [ناو]خواردنێکی زۆرمه شهوری باکووری ئێرانه.(با قلا قا تق)
باقلاوا: [ناو](۱) تێکو شینی ڕۆن و دۆشاو. (نوعی غذا است) (۲) جۆرێک شیرینیات. (نوعی شیرینی)(۳)ناوی گوندێکه له باکووری شاری سنه ڕەنگە باقرئاوا بووبێت. (نام دهی- است.)
باقلک: [ناو] باقله؛ پاقله. (باقلا)
باقلەپڵاو: [ناو،ت] پڵاو به باقله و گۆشتەوه. (باقلاپلو)
باقلەکێوی: [ناو] بۆقلی؛ جۆرێک باقلەی ورد. (باقلای وحشی)
باقلەوا: باقلاوا؛ جۆرێک شیرینیاته چوارگۆشه دەبڕن و بادام و پستەی تێدەخەن.(باقلوا)
باقۆته: [ناو]سەلکی پیازچه؛ نێرتکی پیاز و سیر. (غدەریشەپیاز و سیر)
باقۆشه: [ناو]میوەی نەگەییو؛ باڕێزه؛ باکۆڤه؛ (میومنارس؛ زیردرختی)
باقۆڵه: [ناو]باقۆره؛ کودەڵەی بەراز؛ بەچکەی بەراز. (بچەی گراز)
باقوور: [ناو]کەته مەڕ و ڕان. (رمه گوسفند)
باقوەس: [ناوی بک]باقوەز؛ باقەوەس؛(۱) کەسێک که باخه دەبەستێت. (کسی کەدستەگیارا می بندد)(۲)[ناو] باقبین؛باغە- بێن؛ (گیاەدراز مخصوص بستن؛ باقه)
باقۆیی: [ناو]بەلەباقه؛ دەردێکی ئاژاڵه. (ناخوشی بزو گوسفند)
باقەباق: [دەنگەناو]دەنگی ڕێوی و بزن وکار. (واق واق)
باقەبزه: [ناو]بەلەباقه؛ نەخۆشینی کوتوپڕی ئاژاڵ. (مرض گوسفند و بز)
+ باک: اند؛ فد؛ فرد: [ناو]عەمباری بێنزین له سەیارەدا. (باک بنزین)
+ باکردن: [چاوگە،ت](۱) پەنمان. (۲) سک- ماسین؛ تووڕه و قەلس بوون.(۳) فیزکردن. (بادکردن).(۴)[کنایی]شتی فرۆشی به سەر دەستەوه مان و نەفرۆشران.(بادکردن)
باکرن: <باکردن. (باد کردن)
باکردنه قولاپه: بێجێ تاریف کردن و هاندان و دنه دان بۆ ئەنجامی کارێک؛ شوتی وەبن هه نگل دان (تعریف و تحریک بەانجام کاری)
باکردگ: [ناو،بەر] باکردوو؛ پەنماو. (باد کرده)

> باکردوو
باکردوو: (۱) [ناوبەر] پـەنمـاو. (۲)[نـاو] (ب) شتی فرۆشی کە بەسەردەستی فرۆشیارەوە مابێتەوە و نە فروشرێت. (باد کرده)
باکروڤە: [ناو] بۆران؛ بەفربارین‌بەباوە. (بوران)
باکوت: [ناو]جێگایی‌کە بای زۆر تێدە کەوێت. (جایی کەباد زیاد بەآن میوزد)
باکووزک: [ناو]باکووسک؛ کـزەبـا. (بـادخیلی سرد)
+ باکـــەش: [نـــاو] لوولـــەی ســـۆبە (بوغاری،کوورە).(لولەبخاری)
+ باکەش‌گرتن: [چاوگە،ت] کەڵەشاخ‌گـرتن بێ‌نەشتەر لێدان. (بادکش گرفتن)
باکـەڵە: [ئـاوەڵنـاو] (۱) کـەڵەدار.((۲) (ب) عەقڵ‌دار؛ هزردار. (باکله)
باکیرە: [ئاوەڵناو]کچێ‌کەبنی هەیە. (باکره)
+ باگا: [ئاوەڵناو] ئاگادار؛ بەخەبەر؛ نەنووستوو؛ هۆشیار.(آگاه)
باگـــار: [نـــاو]باغـــار؛ غـــاردانی‌ئـــەســـپ بەپڕتاو.چهارنعل)
باگر: جێگاییێک‌کە زۆر بای‌تێ‌بکـەوێـت. (در مسیر باد)
باگرتن: (۱)بای ناو بۆڕی پڕ لە تراو گرتن لـە بەر نە تەقـین.(۲) سـەیـارەیێـک بـەتونـدی بەلاما هات لێینەدام ، بەڵام باکـەی گرتمـی وەری چەرخاندم، سـورڕاندمیەوە.(بالێـدان، بـا گرتن). (باد گرفتن)
باگردان‌گێڕ:[ناوی‌بک]کەسێک‌کـە بـانگردێن دەگێڕێت لە سەربان. (بام غلطان کار)
باگۆ: [ناو] وەڵام. (جواب)
باگوڕ: [ناو](۱)باگوڕک؛ ئاریکاری؛ زبارە؛ هـە- رەوز. (همیاری)(۲) ئابوونە؛ بەشـداری کـردن؛ ئەندام بوون. (آبونە)
باگۆرە: [ناو]مشار. (اره)
باگەڕێن: [ناو]بانگردێن. (بام غلطان)
باگەف: (ف گیو) خشتێک کە تەواو سوور نـە بووبێتەوە. (خشت نیمپز)
باگیر: >باگر؛ شوێنێک کە با دەیگرێت؛ سەر داپۆشی‌کون‌کونی‌سە ر قلیانـاوی. (جـای بـاد گیر؛ در پوش قلیان)
باگیٚـادیٚ: (ف.مشـە) مـانگی یـادی خـودا. (ب)مانگی ڕەمەزان (ماه رمضان)
بـال: [نـاو](۱) سـەرنـج؛ بـالکێش: سـەرنـج ڕاکـێش؛ (توجـە) (۲) ڕەنگـی‌خـۆڵ. (رنـگ خاک) (۳)باڵ، لە(تورکییەوە هاتووەواتـا هـە- نگوین) (عسل)
+ باڵا: [ئاوەڵناو+ نـاو] بـەرز؛ سـەرەوە؛ ژوور؛ قیمەتی‌ئاڵتوون باڵایە: زۆر زیادە. (بالا)
باڵا بڵند: [ئاوەڵناو] بەژن بەرز. (قد بلند)
باڵا بڵیندی: [ناو] باڵا بەرزی. (بالا بلندی)
باڵـا بـەر: [نـاوی] مـەکینـەی بـاری‌قـورس هەڵێنان. (بالابر)
باڵابەر: [نـاو]کـەرەسـتەی بردنـە سـەرەوەی باری زۆر قورس؛ ئاسانسۆر. (بالابر؛ آسانسور)
+ باڵا بەژن: [ئاوەڵناو]بەژن‌بڵیند؛ باڵابەرز. (قـد بلند)
+ باڵاپۆش: [ناو،ت]هەر شت تـەواوی لـەش داپۆشـی؛«سـفیدەی‌کفـن باڵاپۆشـم‌بـی»(فۆلکلۆر) (بالاپوش)
باڵاتە: [ناو]گیاییێک کە بەرەکەی لەنـاو گوڵـە

کەیدا دیاربێت؛ وەکوو تووی گوڵەبەڕۆژە. (گلی کەتخمەدر داخل گلبرگش پیدا باشد)
بالاخوەدان: [چاوگە،ت]سەرنج‌دان. (توجه‌کردن)
باڵا دار: [ناو]داری سەرەوەی‌دارتەون. (چوب بالا در قالی بافی)
باڵاسەر: بانی‌سەر؛ (۱ب) زوور ئاسمان؛ (۲)سەرپەرشت؛ چاودێر؛ "ژنێکی تەلاق دراوی بی‌باڵا سەر: ژنێکی تەڵاق دراوی بی‌سەرپەرشت. (بالا سر)
باڵاشیرین: [ئاوەڵناو] (ب)بە ژن‌جوان.(خوش قد و بالا)
باڵاعەرعەڕ: [ئاوەڵناو] (ب) قەو بلێند؛ باڵابەرز؛ قەدبلێند. (قد بلند)
باڵافروان: [ناو]باڵفروان؛ فڕۆکەوان. (خلبان)
بالافس: [ئاوەڵناو]کورتەباڵا. (کوتاەقد)
بالاڤخۆش: سیحەتی ئاوی‌گەرم؛ حەمام کردنت خۆش.(صحت حمام)
بالاڤگە: [ناو]سەرەشۆرگە؛ گەرماو؛ گەرماڤ.حمام)
بالاڤیک: [ناو]وردەبڕویش؛ ساواری‌ورد؛ ساڤاری هوور؛ سماییلۆک. (ریزەبلغور)
باڵاکورت: [ئاوەڵناو]کورتەبالا؛ کۆتابالا؛قوڵەبنە. (کوتاەقد)
بالالایکا: فد؛ اند: ناوی کەرەستە ییکی مۆسیقایە. (بالالایکا)
+ بالان: [ناو] باڵان. (۱) تەڵەگورگ. (تلەی گرگ) (۲) داڵانی هەوایی؛ شوێنی دیاری-کراوی هات‌وچۆی فڕۆکە. (دالان هوایی) (۳) ڕاڕەوی نێو بینا. (دهلیز؛ راهرو)

باڵاندن: [چاوگە،ت]باڕاندن. (صدای بز)
باڵاندیدە : [ناو،ت] تەڵە دیتوو؛ وەک: داودۆز (ب)بەئەزموون؛ (کنایی، باتجربە)
باڵانەوی: [ئاوەڵناو] کورتەباڵا؛ کوڵەبنە. (کوتاەقد)
باڵا و داوێن: [ناو،ت]سەر و خواری کراسی-ژنانە. (بالاودامن)
باڵباز: (۱) باڵ‌نەبەستراو. (باز وآزاد) (۲) باڵوێز. (سفیر)
بالبالی: [ناو]هومایی؛ مەڕمەڕشا. (چلوار)
بالبالووکە: [ناو]تاژیلکە؛ تانجی‌کێویلە؛ تانجی‌قولانج؛ حوشترخوا.(آخوندک)
+ باڵبەستە: [ناو،بەر] کەسێک‌کەدەستی بەستراوە؛ (ب) کەسێک کە هیچ کارێکی پی‌نەکرێت. (دست بسته)
باڵ بەسەرداکێشان: [چاوگە،ت] (۱) خستنەژێر باندۆر؛ داگیرکردن. (غصبکردن)(۲)باڵ بە سە راگرتن؛ مێهرەبانی و ئاگاداری و بە خێو کردن؛ هەروەها خستنەژێر باڵ؛ چاوەدێری و دەست‌دانەباڵ. (مهربانی ونگهداری)
باڵ بەسەراگرتن: [چاوگە،ت] (۱) چاوەدێری و بەخێو کردن و ئاگا لێبون.(۲) دەست بە سەردا گرتن.(غصب‌کردن)
باڵ‌پۆش: [ناو]قاوخی سەربالی قالۆنچە و خالخالۆکە و شتی‌تر. (بال پوش)
بالتان: [ئاوەڵناو] (ف.مشە) ئارام؛ هێدی؛ ژیر. (آرام)
باڵتۆ: [ناو]پاڵتۆ؛ پاڵتاو؛ باڵتە. (پالتو)
باڵتوز: تد: [ناو]باڵدز؛ دش؛ خۆشکی مێرد.

(خواهر شوهر)
+ باڵته: [ناو](۱) باڵتـه؛ باڵـاپۆش. (پـالتو) (۲) تەور؛ بێور. (تبر) (۳) بـاڵ تـه؛ لای تـۆ؛ کـن تـۆ.(نـزد تـو) (۴)جـەنجـەڕی گێـرەکـردن. (خرمنکوب)
+ باڵدار: [ناو،ت] باڵنده؛ هەرمەلێک کە بـاڵی هەبێـت (بفڕێـت یـا نـەفڕێـت) (ب) باڵنـده. (بالدار)
باڵداسووکه: [ناو] تەیرەکوێره. (پرندەایست)
بالدرێژ: [ئاوەڵناو] (ب) بە پشوو؛ پشـوو درێـژ؛ بەتاقەت؛ بەسەبر. (صبور)
باڵدوز: تذ: [ناو]بـاڵتوز؛ خوشـک(خۆشـک)ی مێرد؛ دش؛ بالدز. (خواهر شوهر)
باڵ دەرهێنان: [چاوگە،ت] (۱) بـەچکـە مـەلْ کە خـەرێکـە پـەلـیبـاڵ دەربێنـێ. (۲) لـه خۆشیان لەوانە بوو باڵ دەربێنم. (۳) قۆڵ لە بندا دەرهێنان. (بال در آوردن)
باڵڕاکێش: [ئاوەڵناو] زەین ڕاکێش؛ سـەرنـج ڕاکێش؛ بالکێش. (موردتوجه؛ جذاب)
باڵڕاکێش: [ناو]قۆڵڕاکـێش؛ (ب)چاوسـاغی مرۆڤی کوێر.(راهبرانسان نابینا)
باڵش: [ناو]سەرینی چکۆله. (بالش)
باڵشتەک: [ناو](۱) باڵشی چووک.(۲) جێگای ساچمەی بۆڵبرینگ.(بالشتک)
بـاڵشـکان: [چاوگـە،ت](۱)ئیسـقانی بـاڵ و قۆڵشکان (۲) (ب) بـێهێزبـوون؛ بـێیـاوەر بوون.(بال‌شکسن)
باڵفڕ: [ناو]فڕۆکه. (هواپیما)
باڵفڕشـــکێن: [ناو،بـــک]فڕۆکـــە شـــکێن. (هواپیمای جنگی)

باڵ فشکردنەوه: [چاوگە،ت] باڵ فشەوکردن. (۱) با کردنەخۆ و خۆ بە پاڵـەوان زانـین. (۲) باڵـه شـۆڕی؛ شـۆڕبونەوەی بـاڵی مریشـکی نەخۆش. (بال آویزان کردن)
باڵقەدان: باڵ لێدان. (بال زدن)
باڵقرتاندن: [چاوگە،ت] (۱) قۆڵبڕین. (قطـع کردن) (۲) باڵکردن؛ باسـکۆکردن. (قیچـی کردن)
باڵکردن: [چاوگە،ت]باسـکۆ کـردن؛ شـاپەر قرتاندن بۆ هەڵنەفڕین. (بال قیچی‌کردن)
باڵکۆ: [ناو](۱)تارمەی بـەر پـەنجـەره.(۲) > بالکۆن. (بالکن)
باڵکۆک: [ناو]بەڵگه؛ قەباڵه؛ ئێور. (سند)
بالکێش نامه: [ناو]نامەی دادگـا بـۆ ئاگـاهی. (اخطاریه)
بالگاش: [نـاو]شـاتـو شـوت؛ ڕێکـلام. پـڕو پاگاند. (تبلیغات)
بالگاشه: [ناو]بالگاش؛ باڵگاشه؛ ڕێکـلام؛ پـڕو پاگاند. (تبلیغات)
بالگی: [نـاو]باڵگـه؛ بـالین؛ بـاڵین؛ سـەریـن؛ بالیف؛ بالیفک؛ بالیک؛ بالینگ؛ باڵنج. (بالش)
بالگیف: [ناو] باڵش. (بالشت)
باڵمۆم: [ناو] باڵمەمی؛ باڵمۆمی؛ لە تورکیـەوه هاتووه واتا مومیهەنگوین؛ هێژای وتنـە کـه مۆم واتا شەم و مۆم(مێو) بە ڵام شەم واتـای مێوی هـەنگـوین نـادا و مـاکێکیپاتڕۆڵیـه. (موم)
باڵندەی‌کەوی: باڵندەی دەسەمۆ. (پرنده رام)
بالنگی: [ناو]سەرینی ژێرپێ. (بالش زیر پا)
باڵوپاڵ: ڕەواجی؛ فەراوانی. (فراوانی)

بالوپەڕ: [ناو،ت](۱)باڵوپەڕ؛ پەڕوباڵ. (بال و پر) (۲) (ب) قودرەت؛ دەست ڕۆیشتن: لەباڵ و پەرکەوتن: لەدەسەڵات کەوتن (قدرت)
باڵۆر: [ناو]باڵویز. (سفیر)
+ بالۆرە: [ناو] دەنگ هەڵێنان و ئا هەنگێکی ڕیتیمیک(چەلەپایی)گوتن و بەسەرپەنجە لە گەروو دان. (نوعی ترانه)
بالوفک: [ناو]باڵنجی چووک. (بالشتک)
باڵۆل: [ناو] بۆڕی؛ لوولە. (لوله)
+ بالۆن: [ناو]تونگی ئازمایشگای کیمی. (بالن)
باڵۆن: [ناو](۱)گیانلەبەرێکی زۆر گەورەی دەریایی (کە شیر بە بەچکەی دەدا) لەڕۆن و گۆشتی کەڵک وەردەگیرێت؛ نەهنگ؛ (بالن. نهنگ)تورەکەی زۆرگەورەی پر لە گازی سووک یا گەرما کە دەکەوێتە حەوا(بالن)
باڵووری: [ناو] مەڕمەڕشا؛ هومایی؛ بالبالی. (چلوار)
باڵووک: [ناو]بالووکە. (زگیل)
باڵووکرەش: [ناو]خاڵ. (خال روی پوست)
باڵووکێ: [ناو]بالووکە. (زگیل)
+ باڵە: [ئاوەڵناو] گەوج؛ حۆل. (گیج)
باڵە: [ناو]باڵی ماسی. (باڵەی پشت، باڵەی سک، باڵەی کلک، باڵەی سینگ). (بالەماهی)
+ بالە: [ناو]جۆرێک ڕەقس و هەڵپەڕینە لەئوروپا و ئەمریکا. (رقص باله)
باڵهاوردەنەوە: شاپەڕ دەرهێنانەوە. (بال در آوردن دوباره)
بالەبال: [دەنگەناو] باڕەباڕ. (صدای احشام)
+ باڵەبان: [ناو]باڵابان؛ شەیپووری زۆرگەورە؛کەڕەنا، دارای کونی جێگە قامکە و بەپیک کۆک دەکرێت (وەک زوڕنا). (بالبان)
باڵەخانەی تاوسانی:کۆشکی هاوینی. (ویلا)
باڵەشنە: [ناو]باڵشت. (بالش)
باڵەفرکە: [ناو،ت]باڵەفڕێ؛ باسکۆ باسکۆ. (پر زدن پرنده وقت اسارت)
باڵەفرتێ: [ناو،ت]باڵەفرتێی پەلەوەر لە کاتی سەر بڕیندا. (بال زدن پرندەوقت سر بریدن)
باڵەکرە: [ناو،ت]بێڵەکڕێ. (بیل رابەزمین کشیدن برای جمع اشغال)
باڵەوان: [ناو]باڵەبان. (بالبان)
+ باڵەوباڵ: گوللە باڵەوباڵ سمیویەتی؛ (ئەمدیو ئەو دیوکردنی گوللە) (سوراخ شدن بدن با گلوله)
باڵەی سەرسەهۆڵ: [ناو] ڕەقسی باڵە کە لە سەر سەهۆڵ دەکرێت. (بالەروی یخ)
باڵێت: [ناو]ڕەقسی باڵە. (بالت)
باڵێدان: (۱) حاڵەتێک کە با لەشتێ بدا؛ بارەوشەکردن. (۲) با کردنە ناو تەگەر یا تۆپ یا تیوپ یا شتی تر . (باد زدن)
بالیف:[ناو]کیسەیێک کە پڕی دەکەن لە پەل یا شتی نەرم و بەرگی دەگرن بۆ لە ژێر سەر نان؛ سەرین. (متکا)
بالیفک: [ناو]سەرینی گچکە. (بالشتک)
بالیک: [ناو]بالووکە. (زگیل)
بالینە: [ناو]باڵینە؛ جەغزێکی بچوکی لە قوماش (عەگال ئاسا)یە لە کاتێکا مەنجەڵ یان تەبەق لە سەرسەر دادەنرێت لە بەینی سەر و بارەکەدا دای دەنێن. (بالشتک زیر باری کەروی سەر حمل شود)

+ باڵینە: [ناو](١) ژێر نیر. (بالشتک گردن گاو در موقع شخم)(٢) کورتانی حەماڵی. (پالان حمالی)
باڵینەک: [ناو]باڵۆن؛ کیسەی زەلامی پڕ لە گاز یا گەرما کە بە حوادا دەچێ. (بالون)
بام: [ئاوەڵناو] ڕەشتاڵە؛ ئەسمەر؛ سەوزەڕوو. (اسمر)
+بام: بێم؛ ببم؛ منبام بۆلای‌تۆ فیدات‌بام؟: من بێم بۆلای‌تۆ فیدات بم؟.(بیایم، بشوم)
بامال: جێگای بەرزایی کە با بەفرەکەی یان خۆڵەکەی بماڵی. (برف‌روبی شدەبا باد)
بامبو: فد: [ناو]قامیشی هێندی. (بامبو)
بامجانا ڕەش: [ناو]بادەمجان. (بادمجان)
بامجانا سوور: [ناو]تەماتە. (گوجەفرنگی)
بامخەڵتان: [ناو](ف.مشە) بانغەڵتان؛ بانگلێن؛ باگردێن؛ بانگووش؛ بانگۆش؛ باگوردێن؛ بانگلان؛ مەندەڕوونە؛ تپانە؛ لۆغ؛ گردەل؛ باگوردان؛ بانگلێر.بانتلێر.. (بام غلطان)
با مرنێ: [ناو]بای مردنێ(ب)تاعوون. (تاعون)
با مرە: [ناو]بنەبان؛ قوونەبان. (کنج بام)
بامشت: [ناو]باگر. (بادگیر)
بامەن: بێمەن؛ کورتکراوەی ناوی بەهمەن. (خلاصەشدەاسم بهمن)
+ بامیە: [ناو](١) شیرینیاتی تایبەتی مانگی ڕەمەزان؛ زولبیا و بامیە. (بامیە) (٢) داهاتێکی بێستانییە و لەشاری بامیانی ئەفغانستانەوە هاتووە. (بامیە)
بان: وان: [پاشگر] بەواتای چاودێر؛ نگهبان: زیرەوان؛ باغەبان: باغەوان. (پیواژە، بان)
+ بان: کورتکراوەی باند. (. باند)

بان: [ناو]جۆرێک دارە لە هێند کە لە بەرەکەی ڕۆنیکی بۆن خوش دەگرن (بان)
+ بان: بووایێن؛ ببونایە. (می بودند)
بانا: [ناو]بانوما. (بادنما)
بانبز: [ناو](ف .گیو) بزنەکێوی. (بز کوهی)
+ بان‌پوشین: [چاوگە،ت] (١) سەرنانەوە و شاردنەوەی مەبەستێک؛ دیزەبەدەرخۆنە. (٢) سەری بەتالی دەفر نانەوە؛ سەرپۆش بە سەر هەر شتێکدا دان. (سر پوشیدن)
بان‌تلێر: [ناو]باگردێن. (بام غلطان)
بانتوو: [ناو](١) جەماوەرێکی زۆر لە خەڵکی ڕەش پۆستاڵی ئەفریقای ناوەڕاست و باشووری ئەفریقا. (٢) زبانیان. (بانتو)
بانجۆ:بانژۆ:[ناو]کەرەستەیێکی موسیقایە لە گیتار بچووکترە.(بانجو)
+بانجێڵە: [ناو](١) تارمە؛ باڵکۆنی بەرپە-نجێرە؛ تەختەبەندی بەرپەنجێرە. (بالکن جلوپنجرە)(٢) کۆمانج؛ بانیجە. (کماج)
بان‌چاو: (ب)بەسەرچاو؛ بەلێباش.روی‌چشم).
بان‌چەوک: (ف.گیو) سەرلانکە.(روی‌گهوارە)
بانخانی:[ناو]سەربان؛بانخانوو.(پشت‌بام)
باندان: [چاوگە،ت]شاردنەوە؛ بان‌پۆشین؛ بان نانەوە؛ سەرنانە وە. (پوشش. قایم کردن)
باندپێچی: [ناو]پێچانی‌برین یا جێگای کوتراو یان هەر شت بەتەنزیف. (بانداژ)
باندڕۆل:[ناو]کاغەزی چەسب‌داری وەک تە-مر بۆ لکاندن‌بەسەر شوشە (بتری)تالکۆل یاهەر بەرهەمێکی‌دەوڵەتی‌دا؛ یاباندی(شریتی‌پان) دریژ بۆسەر بەستە بە-ندی لەفابریکادا. (باندرول)

باندڕۆڵدار: [ناو+ئاوەڵناو] (۱) دارای‌باندڕۆڵ. (۲) برێتی لە نەکراوە؛ تازە و کارنەکردوو؛ ئاکبەند. (آکبند؛ باندرول دار)
بانـدۆر: [نـاو](۱)هـەرێمـی دەسـەڵاتـدارای. (قلمرو) (۲) ئەسەر دانان؛ کاردانەوە؛ شوێن- دانان. (نقش و ایز بجاگذاشتن؛ عملکرد.)
باندوور: [ناو] نیر؛ نیلە؛ نیرێـک‌کـە ئـامووری پێوە دە بەسترێت. (دنباله یوغ)
باندەر: [ناو]باندەڤ؛ بادەوە؛ بادەڤ. (طوفان)
باندەو: [ناو] بادەوە؛ بۆران. (بوران)
بانژو: [ناو] بانجو؛کەرەستەیێکـی‌مۆسـیقایە. (بانجو)
+ بانسەر: سەرسـەر؛ تـەوقـی سـەر (ب) لـە جیاتی بان‌چاو؛ بەڵێ. (بالای سر، روی سر)
بانکداری: (۱) [بـەرهـەمـی چاوگـە]ڕەوتـی بەڕێوەبردنی بانک؛ (۲) خاوەنی بانک بوون. (۳) شوڵی ئیدارەکردنی(بەرێوەبردنـی) بانـک. (بانکداری)
بانکوت: (۱)شیلان و کوتانەوەی‌بـان بـۆ بـەر گری لـە دلۆپـە.(۲)>بـانگلێر. (پشـت بـامرا سفتکردن وکوبیدن)
بان کوتانەوە: [چاوگـە،ت] >بـانکوت‌کـردن. (کوبیدن‌پشت‌بام)
بانکە:[ناو]بۆشکەی‌چکۆلە.(بشکە کوچک)
بانگ بە گویداخوێندن: (ب)ناونان؛ نـاو لـە - سەر دانانی منالی موسوڵمان. (اسم گذاری)
بانـگ‌دان: [چاوگــە،ت]بانـگ گــوتن. (اذان گفتن)
بانگ‌دەر: [ناوی‌بک]کەسێک‌کـە بانـگ‌دەدا؛ بانگ‌ویژ؛ (اذان گو)

بانگژابوون:گرژبوون؛ ئانگژابوون؛ هێرش‌بردن بۆ یەک. (عصبانی شدن)
+ بانـگ کـردن:[چاوگـە،ت](۱) لێگێرانـەوە؛ بانگهێشـتن؛ دەعـوتکردن. (دعـوتکردن) (۲) قوماری بانگ کردن. (بـازیکردن قماربانـک) (۳) قاوکردن؛ هەرا لێکردن.(صدازدن)
بانگ‌کـەر: [نـاوی‌بـک]جـاڕچی؛ هاوارکـەر؛ کەسێک‌کە بانگ دەکا. (بە هەموو مانایێکـە- وە) (چارچی)
بانگلۆر: [ناو]بانگردێن. (بام غلطان)
بانگ‌لێکردن: [چاوگە،ت]هەرا لێکـردن؛ قـاو لێکردن. (صدا زدن؛ فرا خواندن)
بانگ مەل: ئاوازی باڵندە. (آواز پرنده)
بانگۆلە: [ناو]مێتولکە. (نوزاد شپش)
بانگووير: [ناو]شانە و شەنەی کۆ کردنـەوەی کلۆ و بەردی نێو شیناوەرد. (شن کش)
بانگە: [ناو](۱) منارەی جێی‌بانگ‌وتن. (منارە) (۲) سپێی تازە لە ڕشک دەرهاتوو؛ مێتوولکە. (نوزاد شپش)
بانگەڕا: [ناو]بانگلێن. (بام غلطان)
بانگەبانگ: [ناو،ت]هاوارهاوار. (هوار هوار)
+ بانگـەشــە: [نــاو] ڕێکــلام؛ بانگــاش؛ پڕووپاگاند؛ (تبلیغات) (ئەم وشەیە بە جـاڕدان و بانگـە واز نزیکتـرە، بالگـەشـە وبالگاشـە کوردیتر ونزیکترە بە(ڕێکلام) چـوونکی بـاڵ، واتا: سەرنج یاسرنج. (تبلیغات)
+ بانگـەواز: [نـاو،ت]برێتـی‌لـە ڕاگـەیانـدنی خەبەرێک؛یان بۆ ڕاگەیاندنی شتی گـوم بـوو بە خەڵک؛ جاڕدان. (جارزدن)
بانگی‌شێوان: [ناو](۱) بانگی‌مەغرێـب. (اذان-

مغـرب) (۲ب) وەختـی خـۆراوای درەنـگ؛ ئێوارەی درەنگ. (وقت غروب)
بانمەک: [ئـاوەڵنـاو] خـوین‌شـیرین؛ ئێسـک سووک؛ قسەخۆش؛ بامەزە. (بانمک)
بانناو: [ناو]بانەناو؛ قوڕەبان.(گل انـدود کـردن بام)
بانوانک: [ناو] بانبانک؛ ڕزق؛ جۆرێک مشکی گەورە. (نوعی موش)
بانوانە: [بەند] خاتوونانە؛ خانمانە. (خانمانە)
+بانۆک: [ناوی بک] لـە چاوگـەی(بانانـدن): قبوولٚکردن؛ بە بزن و مـەڕێـک دەڵـێن کـە شیر بە بێچوو دەدەن، و دەبـانێنن. (حیـوانی کە بە نوزاد شیر می دهد)
بانوما: [ناو،ت]کەرەستەی پیشاندەری شوێنی هاتن و تەوژمی‌با. (بادنما)
بانوو: [ناو](۱)خـانمی‌مـاڵ؛ خـاتوون.۲. سـەر دیرەگی‌بەرز. (بانو. تپە)
بـانووان: [نـاو]بـەردفـەڕش؛ سـەنگفـەڕش. (سنگفرش)
بانووچکە: [ناو]بانیژە؛ بـانی‌چووکـە؛ کۆمـانج؛ هەورەبان. (کماج)
بانهـاڕ: [نـاو]سـەرەوەی ژێرهـاڕ؛ لـەئـاش ودەستاڕدا. (سنگ روی آسیاب)
بانـەسـەرە: [نـاو،ت]زنجیـری بـەنـدکردنی لارەپێچ بە سەرەوە. (زنجیرمحکم‌کردن دستار زنانە)
بانەک: [ناو]خوو؛ خدە؛ ڕەوشت؛ ڕەفتار. (خـو؛ عادت)
+ بانەوبان: [ناو]جەحێڵێ کـەزۆر بـەبانانـەوە بگەڕێت؛ کاتێ بەفر زۆربێ‌وکوڵان پڕبێت لـە بەفر بەسەر بەفردا لەو بان بۆ ئەو بان چوون. (جوانی کەزیاد پشت بـام هـا را گـز کنـد؛ از روی بامی بەروی بام دیگر رفتن)
بان‌هەڵبان: [نـاو]باڵـەخانـەی چـەنـد قـاتی. (ساختمان بلند)
بانیجە: [ناو]کۆمانج؛ بانیژە. (کماج)
+ بـانیژە:[نـاو]کۆمـانج؛ بانیجـە؛ شـوێنی بـە پلیکان ڕۆیشتن بۆ سەربان. (کماج)
با نیشـتنەوە: (۱) نیشـتنەوەی‌ئامـاس؛ تـەواو بـوونی پـەنمـین؛ (ازبـین‌رفـتن آمـاس) (۲) وێستانی با؛ (قطع‌شدن‌باد) لە فیـز و لـووت-بەرزی کەوتن. (نخوت و باد خوابیدن)
با نێک و دوو هەوا: (ب) قسـە یـا کـاری دژ بەیەک لە یەک کاتدا. (یک بام و دوهوا)
+ بانین: [چاوگە]ناوجێیی؛ بوونەهۆی ئاشـت بوونەوە؛ بوونە هۆی ڕێککەوتن و یەکتـرین پەژراندن.(میانجی؛ آشتی‌دادن)
بانیۆ: [ناو]گەرماو؛ حەمام؛ شۆرگە. (حمام)
+ باو: (۱)لەگەڵ بـەنـد دا دێـت: بـەنـدوباو؛ ئستران. (آواز) (۲) مۆد؛ تازە ئەو لیباسە باوی نەماوە. (مد)
باوانـــە: [نـــاو] نێـــرەچۆلـــەکـــە؛ نێرەپاساری.گنجشک‌نر)
باوباران: [ناو،ت]بۆران. (بوران)
باوبرا: [ناو] باوک‌برا؛ زڕ برای باوکی. (برادر نا تنی)
باوخۆش: [ئـاوەڵنـاو]خۆشـباو؛ هـەل‌خـۆش. (خوش دست)
باورە: [کاری ئەمری]بێنە؛ بیهێنە.(بیاور)
+ باوسـەنـدن: [چاوگـە،ت] بوونـە مـۆد

لەجەماوەردا؛ پەرەسەندن. (مد شدن)
باوشکاندن: [چاوگە،ت]باوێشکەهاتن. (حالت دهن دره)
باوشکین: [چاوگە]باوێشکەهاتن. (دهن‌دره-کردن)
باوکبرا: [ناو] زڕبرا؛ باببرا. (برادر ناتنی)
باوگوڕی: [ناو] ڕاوێژکاری ؛ڕاوێشکاری. (مشاوره)
باوگەره: (ف. گیو) بابەگەوره. (پدربزرگ)
باولی: [ناو] سندوقی دەستەداری کەل‌وپەل؛ یەغدان. (صندوق دسته‌دار)
باو و نەریت: [ناو،ت]داب و دەستوور؛ داب و نەریت؛ ڕێ‌وشوێن. (رسم و رسوم)
باوویان: [ناو](ف.مشه) ئارەزوو؛ هومێد (امید)
باوه: (۱) باوکە؛ بابە. (پدر)(۲) موژده؛ بابەتە. (مد) (۳) کەردوو؛ دێراو. (کرت)
باوەجوا: بائەمە؛ بائەمحالە؛ جودالەوە. (بااین وجود)
باوەخولە: [ناو،ت]باوەخولی. (بازی نوجوانان.چرخیدن)
باوەخوون: [ناو]بۆهەوەڵجار کە بووک دە-چێتەوە ماڵی‌بابی؛ باوەخۆن. (اولین مهمانی رفتن عروس به خانه‌پدری)
باوەڕپێکردن: [چاوگە،ت]کار یا قسەی کەسێ بە ڕاست زانین و بڕوا پێکردن. (باور کردن)
باوەڕپێهێنان: [چاوگە،ت]باوەڕپێکردن. (۱) باوەڕ بەکەسێک‌کردن. (۲) کاری‌کەسێک‌کە باوەڕ بە قسەیێک بکا.(باور کردن)
باوەڕدار: [ئاوەڵناو] بەباوەڕ؛ باوەڕمەند. (دارای باور)
باوەڕدەرمانی: [ناو،ت] مالیجە بە هۆی زیاد کردنی باوەڕ و ئیمان و عەقیدەوە. (باور درمانی)
باوەڕگران: [ئاوەڵناو] دێرباوەڕ؛ گران باوەڕ؛ سەختباوەڕ. (دیر باور)
باوەڕگرانی: دێرباوەڕی؛ گران‌باوەڕی (دیر باوری)
باوەڕگومان: [ناو،ت]دوودڵ؛ دووشک. (دو دل)
باوەڕمەند: [ئاوەڵناو]باوەڕکری؛ بەباوەڕ. (باورمند)
باوەڕۆ: [کاری‌ئەمری]بیهێنە؛ باوەرە. (بیاور)
باوەڕۆک: [ناو]بڕوانامە. (ویزا)
باوەرەک: (ف.گیو) بای سەخت. (بادسخت)
باوەزیرک: [ناو](ف. گیو) چزووی دووپشک و هەنگەژاڵە و ئیتر. (نیش عقرب و سایر گزندگان)
باوەژۆ: [ئاوەڵناو] ئاوارە؛ سەرگەردان. (آواره)
باوەسیر: [ناو] بێو سیری. (بواسیر)
باوەش‌پێداکردن: [چاوگە،ت]لەباخەل گرتن؛ لە ئامێزگرتن؛ لەزۆرانبازیدا مەچەک لە کە-مەر قایمکردن. (بغل کردن)
باوەشان:[چاوگە،ت]باوەشێن کەر. باوەشێن-کردن با لێدان. (بادزدن)
باوەشی: [ناو]هەڵۆ. (عقاب)
باوەشین: [ناو] باوەشێن. (باد بزن)
باوەکو: [بەند] ئەگەرچی؛ هەرچەند. (اگر چه)
باوەلە: [ناو]باوەلی؛ چەمەدان؛ یەغدان.(صندوق)

باوموه: [ناو]بایەوە؛ بادەوە. (بوران)
بــاوی: [ئــاوەڵنــاو]ڕۆمــاتیزمی؛ بــاداری. (روماتیزمی)
باویزە: [ناو] با و پێچی نـاوزگ؛ باپێچـەک. (نفخ)
باویژدان: [ئاوەڵناو]دارای ویژدان. (با وجدان)
باوێژە: [کاری ئەمری] بیخە؛ بیهاوێژە. (بینداز)
باویشــە: [نــاو](١) بــاڕێزە. (میــوەی بــاد ریختــە)(٢) کــاتی لارەســێبەری ئێــواران. (هنگام عصر دیر وقت)
باوین: بەرهەڵست دروستکردن بەگڵ. (با گل جلو گرفتن جائی)
باوی نوێ: مۆدی تازە؛ ئەمڕۆیی. (مد نو)
باوێنی: باوکێنی؛ شتی ماڵەباب؛ شتی بـاوک. (پدری)
باهاوردن: [چاوگە،ت](١) باهێنـان؛ بـاکردن؛ پەنمین؛ ماسین. (آماس کردن) (٢) حاڵـەتـی شتێک کە با بیهێنێ. (چیزی کەبـاد بـا خـود بیاورد)
باهر: [ناو]بایر؛ بایەر؛ چۆڵ. (بایر)
+باهۆ: [ناو] موور و ئەڵوار بۆ کاری نەجاڕی؛ تـەختـەی قـەوی و درێـژ؛ دار و کاریتــەی قەوی. (چوب الوار)
باهۆبەند:[ناو]قۆڵبەند؛بازوبەند.(بازو بند)
باهۆس: [ناو]باهۆز؛ ڕەشەبای سەخت؛ تۆفان. (طوفان)
باهۆش: [ئاوەڵناو] وریا؛ زیرەک. (باهوش)
بــاهۆل: [نــاو]بــاهۆس؛ بــاهۆز؛ بــای-سەخت.(بادسخت)
باهۆل: [ناو](ف.مشە)چانتە؛ تۆربـە؛ جانتـک. (ساک)
باهینک: [نـاو](ف.مشـە)ڕوماتیسـم؛ هینـک، دروستترە.>باداری. (رماتیسم)
بایا: ببوایێت؛ خۆزگەدونیا بەدڵیمن بایا. (مـی بود)
بــایبــەهــاری: [نــاو،ت] بــای دەمــە و نەوروز.بادبهاری)
بای بەیانی: [نـاو،ت] بـای سـەرسبح. (بـاد صبح)
بایت: [ناو]چکۆلەترین گروپی بیـرەوەری لـە کامپیوتێردا. (بایت)
بایجومگە: [ناو،ت]ڕۆماتیزم. (روما تیزم)
بایدارئاوس: بایوادە کە لەو کاتەدا دار چـڕۆ دەکا. (باد وقت بهار)
+ بایدە: (١)[کار ئـەمـری] کرژیکـە؛ گـرژی بکە؛ بایبدە. (بپیچ و بریس) (٢)[نـاو] بابیـە؛ چەرخی؛ دەفری چووکەی کانزا. (کاسەفلزی)
بای ڕۆژئاوا: [ناو،ت] بای بێرین. (باد عصر)
بای زریان: [ناو،ت] بایێکی سـاردی پاییزانـە لە لای بـاکوورەوە دێـت. (بـاد سـرد موسـم پاییز)
بــایزەمــەن: [نــاو،ت] بــایتونــد.بــا سەخت.(بادسخت)
بایسەبا: [ناو،ت] شنەبای سەحەر. (باد صبا)
بایسەبوون: [ناو،ت] بای زۆر گەرم کە باغ و بێستان وشک دەکا ودەیپرووکێنی. (بادسام)
بایسەحەر: [ناو،ت] شنەبـای بـەیـانی. (بـاد سحر)
بایسـەرسـەر: [نـاو،ت] بـای زۆرتونـد. (بـاد سرسر)

بای سەوا: [ناو،ت] بای سەبا. (باد صبا)
بای شەماڵ: [ناو،ت] بای باکوور (باد شمال)
بایق: [ناو]بەقا. (باور)
بای کەپۆ: [ناو،ت](ب) فیز و غورور؛ لووت بەرزی (باددماغ؛بادغبغب)
بای کەڵە: [ناو،ت](ب) غورور؛ خەیالاتی- سیاسی (ڕامیاری). (کنایە. غرور)
بای گەڵوو: [ناو]قرقێنە. (اروغ)
بایلۆز: باڵوێز؛ باڵیۆز (سفیر)
باینجان سیاوە: [ناو]بادەمجانی- ڕەش.(بادمجان)
باینە: [ناو]بایەقووش؛ کوندەبوو. (بوف)
بای نەرم: نەرمەبا؛ شنە؛ سروە. (نسیم)
بایوادە: [ناو] بایبەهاری؛ (بەفری بەفرانبارە بێ بای وادە قەت ناچێتەوە). «فۆلکلۆر» (بادبهاری)
بای وشک: [ناو] وشکەبایساردبادبیباران- وسرد)
بایەخدار: [ئاوەڵناو] بەڕێز؛ بەنرخ، بەقیمەت. (باارزش)
بایەدەس: [ئاوەڵناو] هەڵەخەرج؛ دەسبڵاو. (ولخرج)
بایەر: [ناو]بەیار؛ بایر.بووره؛ بەتاڵ؛ خاڵی. (بایر)
بایەڤ: [ناو]دەوەنێکە بۆ سوتاندن.(بتەایست برای بر افروختن)
بایە کۆش: [ئاوەڵناو] وەجاخ کوێر؛ دۆعاکردن لە ژن کە وەجاخ کوێربیێت؛ واتە منال سەرکۆشت نەچێت. (اجاق کور؛ بچەدار نشدن)
بایەوان: [ناو]بادەبان؛ بادەوان لە پاپۆڕی بایی‌دا (بادبان)
بایی‌بێرین: [ناور،ت] زریان ؛بای ڕۆژانە؛بای ئێواران.(بادروزانە)
بایی‌تووری: (ب) بێبایەخبوون؛ نرخی بەقەد نرخی تووڕێکە.(کنایەاز بی ارزشی)
بایید: [ناو]لەگەن؛ تەشت. (لگن)
بایی‌زەر: [ناو]زەردوویی. (یرقان)
باییس: (۱)[بەند] گەرەکە؛ دەبێ‌وابێت. (بایستی) (۲)[ناو]هۆ؛باعیس.(سبب.علت)
بایی‌کوور: [ناو،ت] بای‌شەماڵ(بادشمال)
بایی‌گوڕ: [ناو،ت] بای توند. (باد سخت)
باییهەوا: [ئاوەڵناو] بادیهەوا؛ بەفیز؛ لووتبەرز (متکبر)
باییهەوایی:[نا و،بەرهەمی چاوگە]ڕەوتی باییهەوابوون. (حالت متکبرشدن)
بدەبستێن: [ناو،ت]ئاڵش وێرش؛گۆڕینە وە لە موعامەلەدا.(بده بستان) .لە(ف.مشە)یش‌دا بە واتای گوفت‌وگۆ؛ هاتووە
بدەرەم: بمدەری؛ پێم‌بدە. (بدەبمن)
بدێکار:>بدیکار
بدیکار: (ف.مشە) دەیندار؛ قەرزدار. (بدهکار)
بران: (۱)لە دایک‌وبابێکن. (برادرند) (۲)هەر دوو بە سەربازی بران؛ بریان. (بردندشان)
بڕان: (۱)[ڕابوردووی چاوگەی بڕین بۆ کە- سی سێهەمی کۆ] قرتیان؛ بڕدران؛ لە- تیانکردن.(بریدندشان)(۲) لەیەک بڕیان: دابڕان و جیاوەبوونەوە. (جداشدند)(۳) [پاشگر] باران‌بڕان.(پسوند)
براندۆک: [ناو]براندۆخ؛ درۆینەوان. (دروگر)

برایی‌کانوونی: >پاییزەبرا.
بردنەسەر: (١)داسەپاندن و جی‌کەوتنی قسە و مەبەست: ئاخری قسەی خۆی بردەسەر. (سخن بکرسی نشاندن)(٢) حەوانەوە و ژیان و تەواوکردن:چۆن لەگەڵ ئەو بی‌ئەمەکە دەتووانی ڕۆژگار ببەیتەسەر؛ وادەی زیندانەکەی بردەسەر.(بسربردن) (٣) کەسایەتی پێدان:ئەوەندەی تاریف‌کرد و بردیە سەر گەیاندیە عاسمان.(شخصیت بالابردن)(٤) بارەکە زۆرسووک بوو بەئاسانی بردیە سەر سەیارەکە.(بالابردن)
برسیاتی: [ناوبەرهەمی‌چاوگە]برسییێتی؛ برسی‌بوون.(گرسنگی)
برکدان: خستن؛ فرێدان؛ هاویشتن (انداختن)
برمە:[ناو]دیزەی چێشت تیدا کوڵاندن. (دیزی)
بروا: (١)بچێت؛ (٢)بڕوانە؛ تماشاکە. سەیرکە. (٣) باوەر.(برود؛تماشاکن؛ باور)
بڕوانە: تماشاکە.>بڕوا. (نگاەکن)
برووکیای: [چاوگە،ت] برووسکیان برووسکیان؛ ترووسکانەوە؛ درەوشانەوە. (درخشیدن) (٢)وەک: چاوداگرتن؛ چاوقرتاندن. (چشمک‌زدن)
بریان: (١)[ئاوەڵناو] برژیاو؛ برژاو. (بریان)(٢)بران، ڕابووردووی (بردن) بۆ کەسی سێهەمی کۆ. (بردنشان)
بڕیتک: [ناو](١) شەقەمشار؛ مشاری دوو دەستک. (ارە دونفرە)(٢)برینگ.(دوکارد)
بڕێن: گوڕڕەی‌با؛ خوڕڕەی‌ئاو؛ قوڕەی زک. (صدای آب و باد و نفخ)
بڕینە: [ناو]ژانی منداڵ‌بوون. (دردزایمان)
+ بژ: [ناو]داسوو؛ پرژی سەری‌گوڵە گەنم و جۆ؛ کاکوڵی گەنمەشامی (کاکل ذرت. کاکل گندم)
بژاربڕ: [ناو+ناوی‌بک]بژارچن؛ ئالاچن؛ بژار لێبڕین؛ بژاربڕم‌کرد: بژارم‌لێبڕی. (بیلچەوجین؛اتمام وجین‌کردن)
بژارتوو: [ناو،بەر] ژماردە؛ بژاردە؛ ژمارەکراو؛ بژێردراو؛ هەڵبژێردراو.(شمارەشدە.پاکشدە. برگزیدە)
بژارتی [ناو،بەر](١ب)برژاو؛ برژیاگ. (٢)بژێردراو.دانەوێڵەی پاک‌کراو.(٣)ژمارەکراو. هەڵبژێردراو. (بریان‌شدە؛ پاکشدە؛ شمارە شدە. انتخاب شدە)
+ بژارە: [ناو] پەڕوباڵ ڕێک‌وپێک‌کردنی فڕندە بەدەندوکی‌خۆی. (مرتب کردن پرها با نوک)
+ بژانک: [ناو]کەرەستەی ئارایشی ژنان. (وسیلەآرایش زنان)
بژاندن: ئیشتیا و هەوەسکردن.دڵ‌پێوەبوون. (هوس کردن)
بژن: ژن‌دار. (زندار. متاهل)
بژنین: [چاوگە]هەڵبژاردن؛ بەرگەم کردن. (انتخاب)
بژون: (١) جوان‌خاس. (جوان) (٢) ورە؛ توانا. (توانایی)
بژوولک: [ناو] برژۆڵ؛ مژۆڵ. (مژە)
بژوون: (١) پۆشتەوپەرداخ؛ تەڕپۆش. (شیک پوش) (٢) ئازا؛ جوامێر؛ گورجوگۆڵ. (جسور)
+ بژوێن: [ئاوەڵناو] خاوێن؛ تەمیس. (تمیز)

بژە: [ناو](١) هەنگوینێک کە پاش بڕینـەوەی کەندوو بۆ ژیواری هەنگ دەمێنێتەوە. (عسـل جاماندەدر کندو) (٢) زۆرزان و عەیار. (عیار)
+ بژی: (١) ئێشکایی؛ بەڕی. (بر) (٢) ڕەشی. (سیاهی) (٣) زیندوو بـە؛ بژیـت:زینـدووبیت؛ زیندووبێت.(زنده باش؛ زندمباشی؛ زندمباشد)
+ بژیان: ئارەزووکردن. ئیشتیاکردن. (آرزو)
بژیـر: (١)[نـاو] بـژار. (علـف هـرز) (٢) بـژار کردن.(وجین)(٣)[ئـاوەڵنـاو] زیـرەک؛ وریـا . (زیرک.هوشیار)
بژێردراو: [ڕابوردووی چاوگـەی بـژاردن، نـاو، بەر](١)ژمارەکراو.(٢)[ناو،بەر] بژێـراو؛ دەغڵـی پاک کراو. (شمارەشده؛ غلەپاکشده)
بژیڕەش: [ناو،ت]داسوو؛ گوڵی گەنـم و جـۆ. (سنبلەگندموجو)
بژێلک: [ناو]برژۆڵ. (مژه)
بـژی و مـەمـرە: (ب) ژیـانی زۆر سـاکار و فەقیرانە؛ خۆراکی کەم. (بخور نمیر)
بسات: فد: [ناو]بیسات؛ شتومەکی پێویست بۆ ڕێخستنی کاری میوانی یان زەماوەنـد؛ دام و دەزگا؛ (ڕەببی بیساتتشێوێ) شتومەکی سەر عارەبانەی چەرچی. (بساط)
بساز: (١) چێکەر؛ دروست دەکا. (ساز نـده) (٢) دژی ناسـازگار؛ کـەسـێک کـە دەحاوێتەوە و دەسازێت. (سازشکار)
بسـام: (١)[ئـاوەڵنـاو] بـەسـام؛ سـامدار؛ بەهەیبەت. (باهیبت)(٢)[ناو] جاڕی گـەنـم و جۆ. (جای گندم درو شده)
بسانیمەوە: بمسێنەرەوە. (پسم بگیر)
بستام: فد: مەرجان. (مرجان)
+ بستۆکە: [ناو]مەسیٚ؛ ئـەسـتێولک؛ پارچـە ئاسنی سەرتەنوور. (آهن روی تنور)
+ بستە: [ئاوەڵناو] بەفیز؛ بەهەوا؛لـووتبـەرز. (متکبر)
بستە: [ئاوەڵناو] بڕۆ لەلایەن منەوە بستەبـە: چیت پێ خۆشەبیکە؛ ئازاد؛ سەربەست. (آزاد)
بستێن: [نـاوی بـک] بسـتێنەر. وەردەگـریٚ؛ وەرگر. (بستان)٢.کڕیار. (خریدار)
+ بسک: [ناو]کولانەی مریشـک؛ باڵـەخانـە؛ کوشک. (لانەمرغ. کاخ)
بسکۆ: [ناو] مافوورە. (فرش)
بسکۆکە: [ناو] لەرزانە؛ بسکۆڵە. (زیور زنانه)
بسکەبسک: مشقەمشق.(١ب) بـە خۆشـیەوە هـاتن و چـوونی تـازەلاو بـەدەورو بـەری کیژاندا.(٢)نێری بەدەور بزندا مرقاندن کاتی بـە تەگەبوون. (گشتن شاک بدور بز)
بسکەگیا: [ناو] قولیٚ گیا. (یک دستەگیاه)
بسمارک: [ناو] بزمارەی دستوپـا؛ مێخـەکـە. (میخچه)
+ بسە: پستە. (پسته)
بسەرخوە: (ف. گیو) [ئاوەڵناو]ئازا؛ جـەسـوور؛ سەربەست. (جسور؛ مستقل و آزاد)
بسەرکەتن: (١) سەرکەوتن؛ پیرۆزبوون. (پیروزی)(٢) کەوتنـە سـەر؛ وەک: کـەوتنـە سەرئاو. (بالا مانـدن) (٣) وەک: لـە پلیکـان سەرکەوتن. (بالا رفتن)
بســەروەهــاتی: [نــاو] ســەربهــوری؛ بەسەرهات؛سەرگورەشتە. (سرگذشت)
بسێلاک: [نـاو]بسـیلاک؛ لمدار؛زیخـەڵـان؛ زەوینێک کە لم و زیخی زۆربێت. (شنزار)

بشرین: [ناو]بزه؛ لێوکەن. (لبخند)
+ بشکانن: [چاوگە،ت]پشکنین؛ پشکاندن. (جستجو)
+ بشکڤاندن: [چاوگە،ت]تروکاندن؛ لەیەک-کردنەوە؛ کاردۆژەی گوێز. (شکستن یا در آوردن مغز گردو یا تخمه)
بشکڤین: [چاوگە]سەرسوورِمان. (تعجب)
بشکۆفت: [ناو]بشکۆژ؛قوبچە؛ دووگمە. (دگمه)
بشکۆل: برژۆڵ. (مژه)
+ بشێونە: (١)[ناو،بک] بشێوێن؛ کەسێک کە دەشێوێنێت. (بەهەم زن) (٢) فەرمانی شێوانن. ئەو دۆخوا بشێونە(بیشێوێنە) با نە بڕووسقێت. (مخلوط کن)
+ بغور: [ئاوەڵناو] زۆر خۆر. (شکمو)
بڤ: [ئاوەڵناو] ترکزە. تۆکز. خەتەر؛ مەترسی. (وەک) تابلۆی ئاگاداری لە مەترسی لە-سەرشەقام: نیشانەی بڤە)(خطر)
بڤار: [ناو]بوار. (گدار)
بڤۆک: [ناو]جەغزێکی تورِداری چووک بۆ ماسی گرتن.(انبرک و تورکوچک دسته دار ماهی گرفتن)
بڤە: (١)[ئاوەڵناو]خەتەر؛ (٢)جێی مەترسی؛ وەک: تابلۆی عەلامەتی خەتەر لەسەر جادە. ترکزە. تۆکز.(خطر؛ علامت‌خطر)
بڤلیقۆک: [ناو]بڵقی‌ئاو. (حباب آب)
بقە: (ف. گیو) پڵتە. (قرزدن)
بقەبق: فلتەفلت؛ پلتەپلت، بلمەبلم. (یاوەگوئی؛ قرقر)
بکار: فـد: [ناو](بێکار) دەنگی‌نۆتێک لە حاڵەتی سروشتیدا؛ دەنگی ئەسڵیی نۆت کە بێمول یان سوری یان کورِۆن یان دێز نەبێت لە مۆسیقادا. (بکار)
بکارئانین: [چاوگە،ت]بەکارهێنان. (بە کار بردن)
بکڕ: [ئاوەڵناو+ ناو،بک]کرِیار؛ بسێن. (خریدار)
بکۆ: [ناو]بسکۆ؛ مافوورە. (فرش)
بکوژبکوژ:[ناو،ت]کوشتوکوشتاری‌زۆر. (بکش‌بکش)
بکوژوببڕ:[ناو،ت]کوشتار و سەربڕین. (ب زەبر و زەنگ خستنەسەر. (بکش و ببر)
بکەر: (١)کارکەر.(٢) بیکە.(٣) (ئەوەی کارێکی لێ ڕوودەدا). ئەوەی کارێک دەکا؛ (فاعیل) (١.کننده .٢. بکن.٣. فاعل.)
بکێشۆ: بکێشێ؛ بە هەمووماناوە.(بکشد)
بکیقۆک: [ناو]بڵقی‌ئاو. (حباب آب)
بکێڵگە: [ناو] زەوی کێڵراو؛ کێڵگە. زمین- شخمزده)
بگاردان: بواردان؛ ڕێگادان؛ بڤاردان. (گدار داشتن؛ با گدار)
بگرای‌بگر: [ناو،ت]گرتنی‌لە سەریەک. (بگیر بگیر)
بگربگر: [ناو،ت] هەراوهوریا؛ قاڵمەقاڵم؛>بگرای‌بگر. (دادو هوار.بگیربگیر)
+ بگردن: [چاوگە]بووردن؛ ڕابووردن؛ دابگردن؛ بگردن لەم کووجیەباریکەو سەختە. (گذر کردن)
بگەڕ: [ئاوەڵناو+ ناو] ئەوەی دەگەڕێ؛ خول-خۆر. (چرخان؛ سیاح؛ دوار)

بگێڕ: [ئاوەڵناو+ ناوی‌بکـ] (١) کارگێڕ. (مدیر)(٢) کەسێک‌کە شتێک دەگێڕێت یا خولی پێدەدا. (گرداننده)
+ بڵ: ناوی تاڤگەی بڵ لە نزیکی هەورامان؛ گوندی بڵ لە نزیکی هەورامان؛ میوەی - نەرم‌بووی زۆر گەیشتوو؛ وەک:کاڵەکی‌بڵ. (آبشار بل. دەبل. میوەنرم شده)
بلاجووهەور: [ناو] هەورەتریشقە. (تندر)
بلاچە: [ناو] برووسکە؛ تریشقە؛ هەورە-ترشکێ؛ بلێسە؛ گڕ؛ شوڵە. (درخشنده. شعله)
بلاڤ: [ئاوەڵناو] دژی‌چڕ؛ بلاو؛پەڕش وبلاو. (پخش)
بلاڤۆک: [ناو] هەر شت‌کە بلاو ببێتەوە(ب) گۆڤار و ڕۆژنامە. (نشریە)
بڵاڵووکەکێویلە:[ناو]دارێکی‌کورتەبنەیە کە بە-رێکی سووری‌تۆخی هەیە.(آلبالوی‌کوهی)
بڵام: [وتە] بەڵام؛ بەڵان. (اما؛ ولی)
بلامکەر: [ئاوەڵناو] زۆرخۆر؛ بغور. (پرخور)
بڵان: [وتە]بەڵام. (اما)
بڵانە: [ئامرازی‌ئەمری]لێگەڕێ؛ بێڵانە؛ بی-هێڵە؛ بێڵە.(بگذار)
بلاو: [ناو] ددانە لەغاو. (دهنە افسار)
بلاو: [ئاوەڵناو‌بکـ] لاوێنەر ؛ ئەوکەسەیە کە چەمەری دەگێڕێت و مردوو دەلاوێنێتەوە (خوانندە عزا)
بلاوێن: [ئاوەڵناوی‌بکـ] کەسێک‌کە دە لاوێنێتەوە و دڵداری‌دەداتەوە؛ ناز و نەوازش-کەر ؛لاوێنەر. (تسلی دهندە)
بڵاوی: [بەرهەمی چاوگە] پەرت‌وبڵاوی؛ پەخشانی؛ پژیاگی. (پراکندگی)

بلباس: [ناو](١) ناوی ئێلێکی‌کوردە. (نام عشیرەای کرد) (٢) ئەلماس. (الماس)
بلبال: [ناو]سەوزەواتی‌خواردن. (سبزی خوردن)
بلبسێن: [ئاوەڵناو] سەرگەردان؛ حەیران. (حیران. سرگردان)
بلبلە: [ئاوەڵناو] (١) زۆر بڵێ. (حراف) (٢) [ناو]پلپلە؛ پرپرە؛ پرپرەی‌گوارە. (آویزەگوشوارە)
بڵبوون: [چاوگە،ت]زۆرگەیین؛ کاڵەکی‌بڵ؛ گرکەی بڵ؛ شل‌ونەرم بوونی میوە وەک کاڵەک و شووتی و گرکە بە هۆی مانەوەی زۆرەوە. (نرم شدن میوە. زیاد رسیدە)
بڵحات: [ناو]بیلعەت؛ خراپە. (بلعت)
بڵحانە: [ئاوەڵناو+بەند] وەک بڵح: بەشێوەی بڵح و ئاریلە. (بد اطوار اسا)
بڵحەروو: [ئاوەڵناو] ژنی‌حیز و ئاکارخراپ؛ هەرزە و دەم‌بەپێکەنین لەگەل هەمواندا. (زن هرزە)
+ بلسک: [ناو] قولانج. (پاژ)
بڵسک: [ناو] پلوسک. (ناودان)
بڵقاس: [ئاوەڵناو] خۆ بەزل زان. (متکبر)
بڵقن: [ئاوەڵناو] چلمن؛ بڵقەی دێ: وەک: بڵقەی لووتی دێت. (چلمن)
بڵقە: [ناو+ئامرازی‌دەنگ]دەنگی هاتنە دەرەوەی با لە ژێر تراوەوە. (صدای‌حباب‌از زیر آب بیرون‌آید)
بڵماندن: [چاوگە،ت]بڵمەبڵم‌کردن. (غرو لند زیر لبی)
بڵمن: [ئاوەڵناو] زۆر دەبڵمێنێ و بوڵە و بڵمەی

دیْ. (غرغرو)
بڵن: [ئاوەڵناو] بڵیند؛ بەرز (بلند)
بڵنایی: [ناو]بڵیندایی؛ بەرزی. (بلندا)
بلنداهی: [ناو]بڵێندی؛ بەرزی. (بلندی)
بلندبوون: [چاوگە،ت](١) وەحەوا کەوتن؛ بەرزبوون؛ پەنگزین. (بلند شدن).(٢)[ناو] بڵند بوون؛ بەرز بوون؛ بەرزی.(مرتفع بودن)
بڵندێتی: [ناو،بەرهەمی چاوگە]حاڵەتی بڵیند بوون. (حالت بلندبودن)
بڵندین: [ناو]سەردەرانە؛ ئاسانە. (آستانە)
بڵنگۆ: [ناو]بڵێندگۆ.بەرزەواچ. (بلند گو)
بلۆ: [کاری ئەمری لەچاوگەی لوین:ڕۆیشتن] برۆ؛ بچۆ؛ هەڕە. (برو)
بلوار: فرد؛ فد: [ناو] شەقامی‌بەرین و پان‌کە بووبێتە دوو کەرتی یەک لایەنە بۆ هاتن و چوونی سەیارە. (بلوار)
بلۆدان:زۆرکوڵان و بڵق هەڵدانی‌تراوێک لە سەر ئاور و هەڵچوونی. (سر رفتن مایع در حال جوش)
بلۆر: [ناو]بللوور؛ مینا؛ پیپۆک؛ هەر شت کە لە بلوور چێبووبێت. (بلور)
بلوور: [ناو](١) بلوول؛ بلوێر. (سازیست) (٢) لولەی‌نێولانکی منداڵان.
(لولەای در داخل گهوارە)(٣) شوشە؛ کریستاڵ؛ پیپۆک. (بلور؛ کریستال)
بلوورسازی: [ناو](١) کارخانەی بلورچێکردن؛(٢) کاری بلورچێکردن.(٣) کاری‌بلورساز. (بلور سازی)
بلوورڤان: [ناو] بلوێرژەن. (نی زەن)
+ بلووری: (١)[ناو] هومایی؛بالبالی؛ شاخ‌بزی؛ مەڕمەڕشا. (چلوار) (٢) [ئاوەڵناو] بلوورین؛ هەر شتی چێ‌کراو لەبلوور. (بلوورین)
بڵووک: [ناو] مێگەل. (رمەگوسفند)
بلووک: [ناو](١) چەند ماڵ لە بینایێکدا، لەناو (شۆقە یان آپارتمانێکدا) چێبووبێت. (بلوک) (٢) ئاجۆری لە چیمەنتو چێبوو. (بلوک- مصالح ساختمانی)
بلووک: [ناو](١) کۆی چەند مەملەکەتی یەک گرتوو دارای ڕێوڕەوشتێکی نزیک بەیەک؛ وەک (بلوکی غەرب)(بلوک) (٢) جوری خشتی گەورەیە لە چیمەنتۆ چێ‌کراو. (بلوک ساختمان)
بڵووکە: [ناو] فش؛ بۆش؛ وەک بەفرەبڵوکە. (نرم و متخلخل)
بلوولژەن: [ناو] بلوێرچی؛ بلوێرژەن(نی زن)
بلوێرپێچ: [ناو]بلوولک‌پێچ؛ پارچە پەڕوێکە لە بلوول دەپێچرێت.(پارچە ای کەدور لولەداخل گهوارەمی پیچند)
بڵە: (١)[وتە،کاری ئەمری] واچە؛ببێ؛ ببێژە؛ بوویش؛ بووشە؛ بڵێ.بێژە؛ (بگو)(٢)[ناو] شل و نەرمە؛ ئەو شووتیە بڵە. (میوەی زیادرسیدە)
بلەخش: [ناو] جەواهێر. (جواهر)
بلەزەندەر: [ئاوەڵناو] پیاوی زل و لەندەهوور. (لندهور)
بلەگاز: [ئاوەڵناو+ناو] (ف. گیو) بەلەنگاز؛ بێچارە؛ داماو.(بیچارە)
بلەوحەز: [ئاوەڵناو]بلەزەندەر؛ لەندەهوور. (لندهور)
بلەوەز: [ئاوەڵناو] زاڵم؛ ملهوڕ. (مستبد)

بلەوەس: [ئاوەڵناو] هەوەسباز؛ هەوەس‌دار؛ بەهەوەس؛ کەڵکەڵەباز. (بلهوس)
بلی:[بەند]جگە؛ بێجگە؛جیا لەوە.(غیراز)
بڵی: [بەرهەمی‌چاوگە]حاڵەتی‌زۆرگەیشتن و نەرم‌بوونی میوە.(حالت زیاد رسیدن ونرم شدن میوه)
بڵێ: [وتەی ئەمری]بێژە؛ واچە؛ بووشە؛ ببێژە؛ بڵە. (بگو)
بلیارد: [ناو]بیلیارد؛ یاری دووکەسیی سەرمێزە کە بە چێو بیلیارد لەچەند گۆ دەدەن و دەیخەنە نێو کونێکی دیاریکراو. (بیلیارد)
بلیاق: [ناو]گلێنەی چاو. (مردمک)
بلیان: [چاوگە] پێگەیین؛ زانین؛ پێگەیین. (دانستن)
بلیتچی: [ناو]بلیت‌فرۆش؛چەموەز. (بلیط فروش. گیرندەبلیط)
بڵێسکە: [ناو] بڵێسە؛ وەک فیچقەی‌خوین و بڵیسەی ئاور. (فوران. شراره)
بڵێسە بلێس: [ناوەت] نێڵەنێڵ: کلپەکلپ. گرپەگرپ. (زبانەآتش پشت سر هم)
بڵێسەدار: [ئاوەڵناو]گڕدار.(آتش‌زبانەدار)
بڵێک:[ناو]کرێوە. (بارش برف)
بلیمانە: [ناو] لیمان؛ خەستێکی‌کێش‌دارە لەگەڵ منداڵ بووندا لە زێی‌مێوینە دێت. (مایع غلیظ کەهمراەبچەاز رحم زائو بیرون می‌آید)
بلیمەتیەتی: [ناوبەرهەمی‌چاوگە] ڕەوتی بلیمەتی و زۆرزانی و زۆرزیرەکی؛ هەڵکەوتوویی و پسپۆڕی. (نابغه)
بڵێن: [وتەی ئەمری]ئێوە بڵێن: بێژن؛ ئەوان بڵێن: بووشن. (شماها بگویید، آنها بگویند)

بڵیندایی: [ناو]بەرزایی؛ ترۆپک. (هەرکەسێک بەرز ئەفڕێ زوو ئەمرێ، بای‌بڵیندایی سەر و دڵ دەگرێ «ماموستا هەژار». (بلندا)
بڵیند پایە: [ئاوەڵناو] بڵند پایە؛ پایەبەرز. (بلند پایە)
بڵینەبێژ:[ناو]بڵیندگو؛ بڵیندبێژ.بەرزەواچ. (بلندگو)
بلیوار: [ناو]یەکەی پارەی وینێز وئێلا. (بلیوار)
بڵێین: [وتە،]ئێمەبێژین، بوشین. (بگوییم)
بن‌بەست: [ناو]کۆڵانێک کە سەرێکی گیرابێ.(بن بست)
بن‌بیڤ: [ناو] خانووی ژێرعەرز. (خانەزیر زمین)
بنپاڵ: [بەند]تەنیشت؛ لا؛ کن؛ نک؛ پەنادەست.(کنار؛جنب)
بنپزوو: [ناو] قوشقون؛ پاڵوێنی‌بن‌کلکی وڵاخی سواری. (پاردم)
بنتان: [ناو]ئێلەک؛ سوخمە؛ سیخمە. (یلک)
بنک: گەڵای‌خوارەوەی ساقەتی‌تووتن. (برگهای پایین ساقەتوتون)
بن‌کەن: (١) بن‌کەند؛ لە ڕیشەوە هەڵکێشان؛ لە بێخ دەرهێنان. (از بیخ در آوردن) (٢) (ب) بنەبڕ؛ دواهاتوو. (بەخاو و خێزانەوە لە و شارە بن‌کەن بوون و هیچ کەسیان نەما). (بەیکبارەرفتن از جایی)
بن‌دڕیایی: (١)قەرزداری؛ موفلیسی (ورشکستگی) (٢) هەر دەفر و هەنبانەیێک کە بنەکەی دڕیابێت. (تەپارە) (٣) (ب) کچی بن‌پژاو. (بی بکارتی)
بندیان: [ناو](١) ڕەچەڵەک فەلە؛ بنە فەلە.

(عیسوی) (٢) ژێردان. (زیر دندان)

بنێشه: [ناو] بنەڕەت؛ بناغه. (اساس)

بواچه: [وتەی ئەمری(حرف)]بێژه؛ بڵێ؛ بووشه؛ واچه. (بگو)

بۆتانی: [ئاوەڵناو=ناو] پێوەندیدار بە وڵات و زمانی بۆتانه وه. (بوتانی)

بۆجه: [ناو] پارەی تەرخان‌کراو بۆ مەبەستێک.(ف.مشه)بۆدجه؛مەسرەف.(بودجه)

بۆخاو: [ناو] بۆنی‌ناخۆشی وەک بۆنی ماسی یاگۆشتی‌کاڵ(بوی بد گوشت و ماهی خام)

بۆخه: [ئاوەڵناو] گای دەبه؛ بۆغه؛ مل‌قەوی. (گاوگردن کلفت)

بۆدەله: [ئاوەڵناو] نەزان؛ گەوج؛ حۆل؛ گێژ. (گیج؛ نفهم)

بۆره: بوەره؛ بخۆ. (بخور)

بۆره: [ناو]ڕەنگی ئەسپی ڕەنگ بۆر(اسب نیله)

بۆڕەبۆڕ : [دەنگەناو] دەنگی کەڕەنای لەسەریەک؛ گریان و گابۆڕ؛ (صدای کرنا؛ صدای گریه باصدای‌بلند)

بۆره خزم: [ناو]خزمی دوور؛ خزمایەتی بەبۆنەی ژن و ژن خواستنەوە.(خزمی دووری ژن‌یامێرد) (اقوام دور. اقوام‌سببی‌دور از طرف زن‌یاشوهر)

بۆرەژان: [ناو]بەرەژان؛ دەستپێکی ژانی منداڵبوون؛ ژانەدرۆزنە(دردکاذب قبل‌از زایمان)

بۆره مرۆڤ:> بۆره پیاو

بۆڕی‌لاستیکی : لوولەی لاستیکی ؛ شیلەنگ. (شیلنگ)

بۆرێوه: [کاری ئەمری بۆ دووهەم کەسی تاک] بۆرەوه؛ وەرەوە. (برگرد)

بۆریزان: [ناو]بۆریزان؛ کەڕەنا‌ژەن؛ شەیپوورژەن. (شیپورچی)

بوزه: [ناو]بزن. (بز)

بۆسۆلی‌هەڵنەسان: (ب) ڕووتوقووت؛ بیخەیتە تەنوور بۆسۆی‌لێ‌نایێت.(کنایی ملخت وعور)

بولبوله: [ناو] لوولەی‌تەنگی تۆنگی تراو تێکردن. (لوله‌تنگ تُنگ)

بۆنچی: [ناو]تاجی؛ تاژی؛ تانجی(سگ تازی)

بۆنسۆ: [ناو] بۆسۆ(بوی‌سوختن پارچه)

بوو: (١)بۆن. بۆ. (بو) (٢) ڕابوردوی بوون، کێ لەوێ‌بوو؛ (بود)

بوواچ: [وته][کاری ئەمری بو چاوگەی وتن]بێژه؛ بڵێ؛ بووشە؛باچه؛ نیشانەی دەرخستنی کارێکه، بوواچ بزانم بۆ نەهاتی؟ (بگو)

بوواچۆ: دەڵێم؛ ئێژم؛ ئووشم. (میگویم)

+ بووان: بخوێنه. (بخوان)

بووبایه: (١)بووایه؛ ببا؛ ببواییێت؛(٢)کەره کە بووبایە: بۆبایە، بۆنیگرتووه. (می شد؛ بوگرفته)

بووبایێ: ببوایێ؛ ببایێت. (می شد)

بووبووچک: [ناو]پۆپەی فڕنده. (تاج پرندگان)

بۆوبەرامه: [ناو‌ت]بۆنی‌ڕەوان و خۆش؛بۆن خۆشی. (خوشبویی)

بووبیش: [ناو]شوێنی زەبەندی دێم؛ گیا جاری دێم. (گیامزار دیم)

بووجاڕ: [ناوی‌بک]کەسێک‌کە کاری بوو جاڕیه. (بوجار)

بوو جاڕی: [ناو](١) کاری پاک‌کردنەوەی دانەوێڵە بە بێژنگی گەورە، بەباکردنی یان بەدەست یان بە کەرەستەی موتوڕی و مەکینە. (٢) ناوی ئەو مەکینە.(بوجاری)
بووچکەوبوون:چکۆلەبونەوە؛(ب) لە دەستدانی‌حورمەت؛ (پێ‌پەستبوون). (کوچک شدن)
بووخاک: (ف. گیو) فووکردن و دەماندن (فوت کردن)
بووخێر: [ناو]هێشوی چووکەی ترێی نەگەییو (قۆرە) (خوشەنرسیدەانگور)
بوودایی: [ئاوەڵناو+ ناو]پەیرەوی دینی بوودا. (بودایی)
بوودابیەت: [ناو]بوودائیسم؛ دینێکە کە بوودا لە هێند دایمەرزاند؛ (دایمە زراند). (بودائیت)
بوودەڵە: [ئاوەڵناو] پیاوی چکۆلە و نابووتە. (انسان خیلی کوتاەقد) گێژوحوڵ. (گیج و منگ)
بوور: [ناو] بوار. (گدار)
+ بوور: (ف. گیو)(١) جۆرە عەرەبانە یێکە. (نوعی ارابە) (٢) بیور. (تبر)
بوورا: (١) تێپەڕی؛بوورد؛ڕابورد؛ ڕابرد.) (گذشت)(٢) برای ژن. (برادرزن)
بووراندن: (١)کاری بەخشین وچاولێ پۆشین (لە چاوگەی بووردن).(بخشیدن) گوزەراندن؛ بهوراندن؛ڕەت (ڕەد)کردن (گذراندن)
بووراهی: (١)[بەرهەمی چاوگە] بۆرایی؛ حاڵەتی بۆربوون(٢)[ناو]شتی‌بۆر کە لە دوورەوە جوان دیاری نەکا؛ تارمایی. (کبودی)
بووردن: [چاوگە](١) ڕەت‌بوون؛ ڕابگردن؛ بهووردن؛ ڕابووردن. (٢) لە گوناح خۆشبون؛بووردن. (گذشت کردن)
بوورژان: [چاوگە،ت] ومنەوز؛ خەوەنووچکە؛ پینکی(چرت
بوورژانەوە: [چاوگە،ت] چاو چوونە خەو؛ لە وەنەوزەوە چوون. (چرت زدن)
بووروو: [ناو]سووتەکی ئاور کە لەگەڵ گڕو دووکەڵدا بەحەوادا دەچێ. (اشیاء سوختەسبک کەهمراەدود بەهوا می رود)
بوورەدێر: [ناو،ت] زەویی بوورە کە ئاو بدرێ بۆ نەرم بوونەوە و کێڵان.(آب دادن‌زمین بایر)
بووری: وەرە؛ بێرۆ؛ بێ. (بیا)
بووریان: حاڵەتی‌بووردن.[لەچاوگەی بووردن](١) ئەوان ڕەت بوون و ڕۆیشتن، بووریان؛ دەربازبوون؛ گوزەریان؛ ڕەتبوون. (رد شدند)(٢) لە گوناح خۆش بوون؛ بووردن. (گذشت کردن)
بوورین: [چاوگە](١) تێپەڕین؛ بهوڕتن؛ ڕابووردن؛ لێوە بووردن.. (گذشتن(٢) بەخشین؛ لێبووردن.. (گذشتن)
بووزۆ: دابخات؛ ڕابخات؛ فەڕش‌بووزۆ: فەڕش ڕابخات. (بگسترد)
بووزوو چریشکردن: (ب) کاری سەرسەری و ناپوختە،کردن؛ سەرهەم‌بەندی. (کار سرسری کردن)
بووزە: بهاوێ؛ بخە.باوێژە.(بینداز)
بووزەڵە: [ناو] پارچە قوماشێک‌کە لە کاتی مەشکە ژەندندا سنگو باسکی کابان دادەپۆشێت. (نوعی پیشبند)
بووزی: [ناو]بووزو. (شال دستباف)

بووژان: (۱) گیای بێژان(۲) ڤەژیـان؛ ژیانـە-
وە.۳خـــەوەنووچکــــە؛ وەنـــــەوز.
(بومادران؛احیا.چرت‌زدن)
بووژاندنەوە: [چاوگە،ت]ژیاندنەوە؛ ڤەژیانـدن؛
زیندو کردنەوە. (احیا کردن)
بووس: [ناو] هەڵـم و بـۆق؛ هاڵـاوی‌گـەرمـا؛
تینی گەرما.(هورم‌گرما وبخار)
بووسـان: [چاوگـە]خـەوتـن؛ نووسـتن؛ڕازان.
(خوابیدن)
بووک‌وزاوا: [ناو،ت]گوڵاڵە؛ گوڵە مێلاقە.(گـل
لاله)
بووکێنی: [ئاوەڵناو+ ناو] بووکی؛ پێوەنـد یـدار
بە بووکەوە: جلو بەرگـی بووکێنی؛کـەو شـی
بووکێنی. (عروسی)
بووڵدان:[ناو]خۆڵەمێشدان(جای‌خاکستر)
بوومرێـج: ئوسـتڕالیاد،فد: [نـاو]تـەختـە یـان
کانزایێکی پانە کـە دەهاوێژرێـت ، دەورێـک
دەداتەوە و بـە خـول‌خـواردن دەگـە ڕێتـەوە
بۆلای هاوێژەرەکەی (بومریچ)
بوونتاف: [ناو]هەورەتریشقەیێک کە لە عـە-
رزدەدا.(برق رعدکەبزمین برخوردکند)
بـووەرە: (۱)[کـاری ئـەمـری، لـە چاوگـەی
واردن] بخۆ. (بخور)(۲)[کاری ئەمـری] وەرە؛
بێ. (بیا)
بووهیشک: [ناو]گوێژ؛ بلچ. (زالزالک)
بوهارتن: [لـەچاوگـەی بهـورین] بهـوردن؛
تێپەرین؛ ڕەت‌بوون؛ڕابگردن.(گذشتن)
بوهتوم: [ناو] بوختان؛ تۆمەت. (تهمت)
بوەرەی: [کـاری ئـەمـری]بـاوەرەی؛ بێنیـە؛
بیهێنە. (بیاورش)

بوەرێ: [کاری ئەمری] بیخۆ. (بخور)
بۆهەڕنەمووت: بۆ مچەو. (بوگند)
بوی‌ئاواهی: بەوشکڵە؛ بەوجۆرە؛ بەو چەشـنە.
(اینطور)
بۆیاخکـار: [ناو،بـک]بۆیـاخچی. ڕەنـگ کـار.
(واکسی. رنگ کار)
بویتان: [ناو]بویتک؛ قنجکـەسـەلام؛ سـیتکە
سەلام؛باپشکێو. (گل مژه.سنده سلام)
بۆی دێ: (۱) چاکی بۆدێ شانسی هەیە (لـە
قوماردا). (برایش می آید)(۲) سفارشی‌کـردوە
،منـــیش دامنــــاوە خـــۆی بـــۆی دێ-
دەبیا.(میآیدبرایش) (۳) بۆنی لـێ‌دێ؛ بۆگـە-
نە.(بویش‌میآید)واهـەسـت دەکـەم؛ بـۆی‌دێ
بقەومێت: وادیارە بقەومێت. (حس میکنم)
بوێری: [ناو،بەرهەمی چاوگە]بەجەرگی؛ نـە-
ترسی؛ جەسارەت.(جسارت)
بـوێژە: [کـاری ئـەمـری](۱)ببێـژە؛ بێـژە؛
بڵێ؛بواچە. (بگو)
بۆیکردگـە: (۱) بـۆیکردوە؛ بـۆنی‌کردگـە.
(گندیـدەاسـت) (۲) هـەسـتی‌کـردوە.بـوبردە
است(۳)(من بۆم ئە نجام نە داوە ئـەو بـۆی-
کردوە: ئەو بۆی‌کردگە(برایش‌انجام‌دادە)
بوینووت: بدبینم؛ بتبینم. (ببینمت)
بۆیە : لەکوردستانی باشووربە ڕەنـگ دەڵـێن
(رنگ)
بۆیە مـە:[نـاو] مێـزە ری‌گوڵینـگ‌دار. (دسـتار
منگولەدار)
بـۆی‌هـەنگـەل: بـۆی ژێرباخـەڵ؛بۆکڵیشـە.
(بوی‌زیربغل)
بۆیەی نینۆک : ڕەنگی نانووخ ڕەنگ کـردن؛

ڕەنگی نینۆک؛ (لاک ناخن)
بۆیێ: بەو هۆیە؛ لەبەر ئەوە؛ پۆکی ؛ ئەڕا. (باین‌علت)
بەئابڕو: [ئاوەڵناو]ئابڕودار؛ بەڕوومەت. (با آبرو)
بە ئاخری خەت گەیشتن:(١) تا دوایی کارێک‌چوون. (٢) هیوا لێبڕان و نزیک بەمردن. (بەآخر خط رسیدن)
بەئارمانج: [ئاوەڵناو] خاوەن مەڕام؛ بەهیوای- گەیشتن‌بە مەڕام؛ (هدفمند)
بەئارەزوو: (١) [ئاوەڵناو] بەهیوا؛ ئاواتخواز؛ بەهیڤی؛ بەهەویا؛ ئارەزوومەند؛ تامەزرۆ؛ ئومێدەوار؛ (٢ب) بەئیشتیا؛ بەتەواوی؛ تیروتەسەل؛ بە ئارەزووی دڵ‌تەماشام‌کرد. (با آرزو)
بەئارەزووی‌دڵ: بەئیشتیای‌دڵ؛ تا ڕادەی پێخۆش‌بوون؛ بەئارەزووی‌دڵ سەیرم‌کرد. (تا دل بخواهد)
بەئازموون: [ئاوەڵناو] فد: بەتەجروبە؛ ئەزموون وەرگرتوو. (ب) مرۆڤی‌دونیادیدە. (دنیا دید)
بەئازین: بەدەستوور.(٢) (ب) خاوەنی ڕێ و شوێنی تایبەت بۆ ئەنجامی‌کارێک.(دارای- سبک)
بەئاستەم و دووبەڵا: [بەند،ت] ئەندازەیێکی زۆرکەم؛ بەحاڵ‌ودووبەلا؛بەعاستەم‌ودووبەلا (خیلی‌کم)
بەئاکار: [ئاوەڵناو] (١) بەکردار؛ ڕەفتارچاک.(٢) (ب). ماقووڵ؛ ساحێبی- کەسایەتی و مەزنی. (نیک کردار)
بەئاگاهێنان: [چاوگە،ت]وشیارکردن؛ بێدارەو کردن؛ لەخەوهەڵساندن؛ لە خەو خەبەرکردنەوە. (آگاه‌کردن.بیدارکردن)
بەئاڵشت: [ئاوەڵناو] خوروو دار؛ ئالۆشاوی. (ب) زۆر نێرخواز یا مێوخواز؛ بەخوروو. (حشری)
بەئالیڤەدان: [چاوگە،ت]نرخاندن؛ هەڵسەنگاندن. (براورد کردن)
بەئامانەت: بەئەمانەت؛ سپاردن بۆ چەند وەخت. (ب) بۆ ئاگالێبوون و چاوەدێری- لێکردن؛ ئەوتفەنگە بە ئامانەت لای‌تۆ دادەنیم بۆم ڕاگرە؛ (ب)بۆکاتێکی دیاریکراو، بۆ ماوەیێک بە ئەمانەت لێرە ماومەتەوە چەند ڕۆژی‌تر دەڕوم. (بطور امانت؛ موقتی)
بەئاواچوون: [چاوگە،ت] (١) نوقوم‌بوون‌لە ئاودا. (بەآب رفتن)(٢) (ب) لەدەست دان و گوم‌بوون؛ سەرتێداچوون. (از دست دادن)
بەئاو و ئاورا دان: ڕیسک؛ حەولدانی بێ مەترسی؛ بی‌ترس خۆخستنەخەتەر. (بەآب وآتش زدن)
بە ئاوەدانی نەزانین: (ب) بە چ حیساب نەکردن؛ پویتە پێنەدان؛ بەهیچ نەگرتن. (بحساب نیاوردن)
بەئاهەنگ: [ئاوەڵناو](١)خاوەنی ئاهەنگ و ئاواز؛ ئاهەنگ‌دار. (٢) بە پێی زەرب، یان (ڕیتم)ی ئاهەنگی، جووڵانەوە؛ (بەهەوای ڕیتمی خاوی و کرژی). (آهنگین؛ باضرب)
بەئجاندن: [چاوگە،ت]هاندان. (تیر کردن)
بەئجین:[چاوگە،]تووڕەیی دامرکان. (آرام- کردن)
بەئوک: [ئاوەڵناو] ناشیرین.(زشت)

بەئەدەب: [ئاوەڵناو] بەنزاکەت؛ بەعەدەب؛ بەعەوەب؛ ژیر.(باادب)
بەئەرک: (١) بارقورس؛ بەزحمەت. (بار سنگین) (٢)بە ئەرکی خۆزانین: بە وەزیفەی- خۆ زانین.(بوظیفه) (٣)کەسێک کە زەحمەتی- زۆربێ بۆکەسێکی تر.(زحمت‌دار)
بەئەژمارە: بەبژاردە؛ بەدەسەندە. (باحساب و شماره)
بەئەم: بەم؛ بەئیمە. (به این ؛بما) بەئەمانە: بەمانە؛ بەم شتانە؛ من بەئەمانەڕازی نابم.(بااین‌چیزها) (٢)له دەست ئەوان‌دا نییە بە ئەمانە (پیش‌اینهاست)
بەئەمەدا: بەمەدا؛ بەئەمەدا دیارە، لە ڕووی ئەمەوە.(ازروی‌این؛ازاین)(٢) بە ئەمەدا مەڕۆ: بەم جێگادا مەڕۆ. (از اینجا)
بەئەو: بەو؛ بەئەو نییە: لە دەسەڵاتی ئەودا نییە؛ بەئەونەبێ‌ناکرێت.(پیش‌او؛ دردست‌او) (٢)بەئەوە: لای ئەوە، لای من نییە. (پیش‌او) (٣) بەئەوە چت لێ نایێت: بەئەوشتە. بەوشتە. (باآن)
بەئەوانە: (١)بەوانە؛ بەوانە‌بە ئێمە نییە:لای ئێمە نییە. (پیش‌آنهاست)(٢) بە ئەوانە ئەسپەکە ناگیردرێت: بەوکەسانە) (بااین افراد)(٣)بەوشتانە؛ بەوانە ناکەوێت، بەوانە نامرێت. (بەآن چیزها)
بەئەوجۆرە: بەوی‌ئاواهی؛ بەوی‌ڕەنگی: بوی- ڕەنگی؛ بەوجۆرە.(اینطور)
بە ئیسراحەت: (١)بە ئیستراحەت و خەوتن لە جێدا چاک دەبێتەوە. (٢ب) بە شێنەیی؛ بە کاوەخۆ؛ بە ئیستراحەت کارەکە دەوام بدە زۆر پەلە مەکە. (بااستراحت؛ بەکندی)
بەئیشتیا: (١) دارای مەیلی خواردن . (با اشتها)(٢) (ب) تەواو؛ بەئەندازەی پێویست؛ بیلا مەزرا کە بە ئیشتیا بخووسێت.(باندازه کافی) (٣)بە ئیشتیای تۆ‌نییە: بەمەیلی تۆ نییە. (بەدلخواه)
بەئیمان: [ئاوەڵناو] (١) خاوەنی باوەڕ و ئیتقاد. (٢) (ب). مرۆڤی ڕاست و دروست. (با ایمان)
بەبادان: [چاوگە،ت]لەدەس دان؛ بەفیڕۆ چوون. لە ناو بردن (ب) خەرمان بەدەم‌باوە دان؛ (بەباد دادن)
بەبا دریاگ: [ناو،بەر] (١)بەبا دراو؛ ئەو شتەی دراوە بە دەم باوە؛ (بەبادداده‌شده) (٢) بە- فیڕۆلەدەس‌چوو. (بباد رفته)
بەبارە: (١) بارکراوە، لە ژێر باردایە؛ (بارگیری شده) (٢) بە سەمەر؛ بە بەهرە (٣) بەسەمەرە؛ بە بەهرەیە (بهرەدار؛بابهرەاست)
بەبارێکداخستن: [چاوگە،ت] بەلایێکدا خستن؛ (ب) کاربڕانەوە؛ بیخە بە بارێکدا یا چاک یا خراپ؛ یەک‌لایی‌کردنەوەی کاری. (کنایی. تکلیف روشن کردن)
بەباسک و باهۆ: [ئاوەڵناو] بەهێز؛ زەلام و شان و قۆڵ قەوی. (گردن کلفت)
بەباف: بادراو؛ کرژ. (رسییده‌شده)
بەباکردن: [چاوگە،ت] شت بەدەم باوە دان بۆ پاک بوونەوە؛ (ب) شەن‌کردن ولاتیل و خەرمان بەباکردن. (با باد تمیز کردن بنشن از کاه)
بەباڵابڕان: [چاوگە،ت](١) لێ‌کاڵینەوە؛ بە- نسیب بوون؛ ئەو کارە بابەتی تۆیە؛بە باڵای

تۆ بڕاوە. (شایان)(٢) بە ئەندازە بوون؛ ئەو کەوا هەر دەڵێی بە باڵای تۆ بڕاوە. (بەاندازە بودن)
بە باڵا دا هەڵگوتن: [چاوکەت]تاریف لە کەسێک کردن؛ بە شان و باڵدا هەڵگوتن؛ پەسن کردن. (از کسی تعریف کردن)
بەبایباڵ: بەباوی باڵ؛ لەسەرەخۆ کارکردن؛ بەکاوەخۆ؛ بەهەوایشان. (بدون عجلەوبآرامی کارکردن)
بە بای فەنا چوون: (ب) نابووت بوون؛ فەوتان؛ (ب) تەفرو توونا بوون. (بەباد فنا رفتن)
بەبر: فد: [ناو]بەور؛ دڕندەیێکەخەت خەت.(ببر)
بەبڕ: (١) [ئاوەڵناو] بە زاکۆن؛ بەبڕشت. (کاربر)(٣) بیٚ پێوانە و دیاریکردن؛ دروێنە بە بڕ هەڵگرتن. (کنترات تخمینی)
بەبلیبەبان: بەبلەبەبان؛ (ب) منداڵی ساوا. (نوزاد)
بە بۆق و کەڕەنا: بە هەرا و هوریا. (ب)
بە باڵگاشە؛ بەڕێکلام و بانگەشەی زۆر. (بوق و کرنا)
بەبۆن: (١) بۆندار؛ (هەروەک ڕێحانە بە بۆنی) (بودار) (٢) بە هۆی بۆنەوە: بەبۆنکردن؛ تانجی بەبۆن کەروێشکەکەی دۆزیەوە. (بودار)
بەبە: [ناو](١) بیبیلەی چاو؛ بیلبیلە؛ ڕەشکێنەی چاو. (مردمک چشم) (٢) منداڵی ساوا. (نوزاد)
بەبەران: [ئاوەڵناو]مەڕی بەرانخواز.(گوسفند جفتخواه)
بە بەرەوەبوون: [چاوکەت] (١) ژنیٚ کەمناڵی ساوای بە بەرەوەیە، بەباوشییەوەیە. (٢) هەبوونی کات و زەمان و شتیتر (شەو زۆری بە بەرەوەیە). (کارەکە زۆری بە بەرەوەیە)؛ یان زۆری بە دەمەوەیە؛ زۆری ماوە تەواوبێت. (٣) دەوام؛ بەڕەکە زۆری بە بەرەوە نەماوە، کۆنە.(مهلت داشتن؛ جاداشتن؛ ماندن؛ دوام.)
بەبەز: [ئاوەڵناو]بەنەفەس؛ بێهن درێژ؛ بەزدار؛ (ب) قەڵەو. (پرنفس.چاق)
بەبەغە: [ناو]بەرخەبەبە؛ چەرمی شۆڕ بووی ژێرملیگا یا هەرگیانلەبەرێک. (غبغب)
بەبەلە: [ناو](١) بەبەلە؛ منداڵیساوا.(٢) کناچەیچاو؛ کناچەیچەمی؛ بیبۆک. کەچکا چاقیٚ؛ بیبیلەیچاو؛ (مردمک چشم)
بەبیرئانین: [چاوگەت] بیرهێنانەوە؛ یاد کردن؛ تاسە کردن.. (یادآوری. بیاد آوردن)
بەپا: (١)[ئاوەڵناو] ئازا و گورج و گۆڵ
لە ڕێگا ڕۆیشتندا؛ بەلەپا؛ خیرا و خۆش ڕەوت. (سریع) (٢)[ناو] بەسەر دێم نەک بەپا؛ شەق بەپا دەوەشیندرێت. (با پا)
+ بەپشت:[ئاوەڵناو] دەغل و دانی پڕ و بیٚ خالیایەتی. (پر پشت)
بەپێچ و قەمچ: (١) بە خۆبادان و خۆ هەڵسووڕان. (باقرواطوار) (٢) چۆ مەکە بە پێچ و قەمچەوە لە شیوە کاندا دەڕوات. (پیچ و تاب)(٣) (ب) ناز و غەمزە؛ فێل و تەڵەکە. (ادا ؛ حیلە)
بەت: [ئاوەڵناو]بیٚئەزموون؛ بیٚتەجروبە.(بی-

تجربه)
بەتات: [ناو]درۆ؛ ڕیا. (ریا)
بەتار: (ف. گیو)(١) بەدبەخت؛ شووم. (بد بخت) ٢) چەتال؛ بینایی‌چاو. (دید چشم)
بەتاراڤک: [چاوکە،ت] نقوم بوونی پاپۆر و گەمی لە ئاودا؛ بە ژێر ئاوەوە بوون. (غرق شدن)
+ بەتارە: [ناو] گولەنگ؛ مەنگۆڵە. (منگوله)
بەتاک: (١) [ئاوەڵناو] بەتاڵ؛ ئاواڵە. (تهی؛ باز) (٢) بەتاق؛ دژی بەجووت. (مفرد)
بەتاڵپا: [ئاوەڵناو] وێڵگەرد؛ بێکار. (ولگرد)
بە تاڵ کردن: [چاوکە،ت] (١) خاڵیکردن. (خالی‌کردن) (٢) باتڵ کردن؛ پووچ کردن. (فسخ؛ باطل کردن)
بەتاڵووکە: بەپەلە؛ بەلەز. (با عجله)
بەتاڵ و هەتاڵ: [ئاوەڵناو]خاڵی‌وخوت؛ بێکار و بێ بار. (کاملاً خالی. بی کاره)
بەتالیۆن: [ناو]یەک تیپ سەربازی هەزار کەسی لە ئەرتەشی تورکیادا.(یک‌تیپ سرباز درترکیه)
بەتان: [ناو]ئاستەڕ. (آستر)
بەتانە: [ناو]تێکەڵاوی مێل و ڕۆنی بەزرەک بۆ شوشە پەنجێرە دابەستن و پڕکردنەوەی درز و قلیشی تەختەی دار. (بتونه)
بەتانەکاری:[ناو]کاری تێهەڵساوینی بەتانە بە سەر درز و برینی تەختە و شتی دیکەدا. (بتونه‌کاری)
بەتاو: بەپڕتاو. (١) بەتاڵووکە؛ بەپەلە؛ بەلەز. (با عجله)(٢) بەخوڕ. (باتابش‌آفتاب)
بەتاوار: [ناو]عاقیبەت و دەرئەنجام. (عاقبت)

بەتخوو: [ئاوەڵناو]بەد ڕەوشت. (بد خو)
بەترپێر: [ناو] بەسر پێر. (پس پریروز)
بەترپێرار: [ناو] بەسر پێرار. (پس پیرار)
بەترمە: (ف.مشە)بەترۆمە؛ پەترۆمە؛ پەیوەند لێدانی دار. (پیوندزدن درخت)
بەترمەیی: [ئاوەڵناو]پەترۆمە؛ بەترۆمە؛ تێکەڵ لە چەند وشە یا چەند شت؛ دژی ساکار. (مرکب)
بەتری: [ناو] چاو ئیشە. (چشم درد)
بەتفەڕ: [ئاوەڵناو] بەدفەڕ. (زشت)
بەتکەبەش: [ناو] قوڕەبەشە؛ چاڵەکە. (گورکن)
بەتڵاندن: [چاوگە،ت]ماندووکردن؛ هیلاک-کردن؛ لە بەین بردن. (خستەکردن؛ازبین بردن)
بەتڵە: [ناو]تەپکە؛ داوووسک؛ تەڵە. (دام
بەتڵی‌ڕۆژ: چەندکاتێ لە ڕۆژ.قسمتی‌از روز)
+بەتلین: [چاوگە](١) تیاچوون؛ بەتڵین؛ بەتڵان؛ (از بین رفتن) (٢) هیلاکبوون؛ شەکەت بوون. (خستەشدن)
بەتۆرە: [ئاوەڵناو] (١) بەشێواز. (بە راه. بطریق) (٢) خاوەنی‌تێگەیشتن؛ زانا؛ بەئەدەب. (دانش. با ادب)
بەتۆم: [ناو](١) جۆرێک سابوونە لە ڕۆنی فستق دەگیرێ. (نوعی صابون) (٢) [ئاوە-ڵناو]خاوەنی‌توو؛ بەناوک. (دارای تخم)
بەتوون: (١ب) بەجەهەندەم. (بەجهنم) (٢) [ئاوەڵناو] خوێڕی؛ مرۆڤی بێ‌عار؛ مرۆڤی بێ‌ئەمەک و خوێڕی و پەست. (انسان لاابالی)

بەتوونە: [ناو](١) بەتانـە. (بتونـە) (٢) جـۆری گول؛ باتوونە. (گل بابونە)
بەتەربیەت: [ئاوەڵناو] (١) بەئەدەب؛ ژیـر. (بـا ادب) (٢) تەربیەت کراو؛ ڕەعەمەل هـاتوو. (بـا تربیت)
بەتەک: [ناو]کورِکورِ. کەڕەواڵە؛ بەدبـەدە. (بـا قرقرە؛باغرقرە)
بەتەگە:[ئاوەڵنـاو] بـەتـەگ؛ بزنـی نێرخـواز. (حالت جفت خواهی نر)
بەتەما: [ئاوەڵناو] چاوەڕوان؛ بەهیوا. (منتظر)
بـەتێشـت: [ئـاوەڵنـاو] ئاوس؛تۆلـدار؛ زگپـڕ. (آبستن)
بـەجـا: (ا)بـەجـێ؛ بـەوەخـت؛ بـە جـا: (٢)[ناو]لەجیاتی؛ دووبارەکردنەوە؛ حاڵەتێ لـە پینگ پۆنگدا ئەگەر تۆپ لە تورِ بکـەوێـت و نەچێتە دەرەوە، دووبارە سرویس لێدە درێتـە-وە(بجا)
بەجا: [ناو]حاڵەتی مانەوە؛ مانەوە لـە جێگـای خوێ؛ بەرەنـدە بـەجـا: (ب) لـە یاریـدا دۆڕاو لادەچێ و یاری کەرێکی‌تر لەگەڵ بەرەندەدا یاری دەکا. (بجا)
بـەجـەئـانین: [چاوگـە،ت]بـەجـێهێنـان؛ ئەداوەکردن. (بجاآوردن)
بەجەم: [ئاوەڵناو+بەند] پتەو؛ تونـد؛ خـۆڕاگر. (محکم)
بەجێگە: (١) لەجیاتی؛ لـەبـاتی. (بجـای) (٢) بەوەخت؛ پەسەند. (بجا)
بەجێماو: [ناو،بـەر](١) کـەلـەپـوور؛ میـرات. (ماترک) (٢) دواکەوتوو؛ وەپاش کـەوتـوو.(٣) (ڕۆیشتن و ماڵەکەیان لێ بـەجێمـاوە). (بجـا ماندە)
بە جێهاوردن: [چاوگە،ت](١) بەجـێهێنـان؛ جێبەجێ‌کـردن؛ ئـەداکـردن.(٢) ناسـینەوە؛ (بمبوورە بەجێم نەهێنایت): نەمناسیت (بجـا آوردن)
بەچاودا دانەوە: [چاوگە،ت] چاکی لـەگـەڵ-کەسێک‌کردن و باس‌کردنـی لـەلای‌خـۆی؛ کۆڵینەوە (ب) بەڕوودا دانەوە. (بـروی کسـی آوردن)
بـەچـاووەکـردن: [چاوگـە،ت]چـاو پێـدا هەڵهێنان؛ بەچاو پێکان؛ بەچاوی‌پیس‌پێکـان. (چشم زخم)
بەچکوو: [بەند]بەشکەم؛ بەشـکوو؛ بـەڵکـوو؛ بەڵکەم؛ بەڵکی؛ بەڵکین.(شاید)
بەچکەدانان: ترەکین؛ زایینـی گیانلـە بـەری وەک سەگ و پشیلە و جرِ و جووڵەوەر. (بچە گذاشتن)
بەچکە دەوڵەمەند: [ئاوەڵناو+ ناو]منـاڵی ماڵـە دەوڵەمەند؛ منداڵی‌ماڵی‌ساماندار. (ب) دەست-بڵاو؛ بەهیممەت؛ دڵئاوا.(بچە دارا)
بەچکەسواڵکەر: [ناو]مناڵەفـەقیـر و سـواڵکەر (ب)[ئاوەڵناو] چاوچنۆک. (بچەگدا)
بەچۆکداهاتن: [چاوگە،ت] کۆڵدان؛ بـەزیـن؛ خـۆ ڕانـەگـرتن؛ چـۆکدانانـە سـەرعـەرز. (شکست خوردن؛ زانو زمین گذاشتن)
بەچەخستن: [چاوگە،ت] بەرفرِێـدانی ئـاژەڵ. (بچەانداختن)
بەچەخۆر: ئەو گیانلەبەرە وا بەچکـەی خـۆی دەخوا.(جانوریکە بچەخودرا میخورد)
بەچـەسـرکە: [نـاو]جۆرێـک کـەڕووی سـەر

خواردەمەنی؛ مێشوولەییێک کە سرکە هەڵیدێنی؛ مێشوولەییێک کە میوەی کۆن وگەنیو هەڵیدێنێت.(قارچ روی خوراک.پشە سرکە.)
بەحاڵ ودووبەڵا: [ئاوەڵناو] بەئاستەم؛ زۆرکەم؛ بەحاستە م و دووبەڵا.(خیلی کم)
بەحت: [ئاوەڵناو]گێژ؛ ور؛ گێج. (گیج)
بەحری: [ئاوەڵناو] (١) پێوندیدار بە بەحرەوە. (بحری)(٢) زەریایی؛دەریایی. (دریایی)
بەحسی‌سەر: باسی‌سەر؛ قسەیاکاری پڕ-مەترسی‌کە سەر بەبا دەدا؛ تۆکز؛ بڤە. (خطرناک)
بەحشینک: [ناو](١) هەناری‌نەگەیشتوو. (آنار نارس) (٢) (ب) بەحەوت ئاو شۆریاگەسەو: بێشەرموحەیا؛ حەیا تکاو؛ بێئابروو؛ حەیا نەماو. (کنایەاز بی حیایی)
بەحەق: (١) بەمز(٢) لەحەقیقەتدا؛ بەڕاستی؛ بەحەق پیاوی چاکە. (درمقابل مزد؛ بەحق)
بەخ: فیز؛ ئیفادە؛ فیزکردن بە سەرکە سێکدا. (بەخ مەکەیەخ دەکەی). «فۆلکلۆر» (فخر؛ افادە)
بەخاوکەوتن: [چاوگە،ت] بەجەمام کەوتن بە هۆی شەکەت بوونی زۆرەوە لە ناو (ماسولە)و خۆندا ژەحرێک پەیدادەبێ کە ماسوولکەڕەق‌دەکا و دێشێت، بەوحاڵەتە دە-ڵێن بەخاو کەوتن. (کوفتگی‌بعلت خستگی)
بەخپوور: [ناو]بەغپوور؛ لەدوو وشەپێک هاتووە، بەخ: خودا؛ پوور: کوڕ؛ واتا کوڕی خودا؛ بە فەخفوری پادشای چین وتراوە. (بەعقیدەچینی ها پسر خدا) +بەخت: [ناو](١)ئەوکچەچووە ماڵی‌بەخت؛ بەختی-کرایەوە شووی کرد.(ب) شووکردن؛ (بخت)(٢) لەحەرام گێڕان و دۆڕاندنی ماڵ و پارەیە؛ لە ئاوێستادا بەختە بەواتای شانس هاتووە؛ لە فارسی و کوردیشدا هەر بەومانا بەکار دەبرێت، لەپێشدا باختی (فارسی) بووە کە چاوگەی کورتکراوی(باختن)ە بە واتای دۆڕاندن.(شانس؛دور ریختن‌مال)
بەختان: هات؛ ئامەو؛ ئامەد. (آمد)بەتیز و تانەوە دژواتایە (نەهاتی)
بەخت بلێند: [ئاوەڵناو] بەختەوەر. (بخت بلند)
بەخت تاقیکردنەوە: تاڵا گرتنەوە. (دەچمە سەری سوڵتانی شەو دادی نا ییمەوە، بەختی خۆم و لێو ئاڵی بە تاقی دە کەمەوە. (ب) بەرد بە کیلی قەبری زیارەتگاوە چەسپاندن بۆتاقیکردنەوەی بەخت و شانس. (بخت آزمایش کردن)
بەخت چوونەبەس: بەخت بەستران؛ دژی بەخت کرانەو؛ بەدبەختی و نەهامەتی. (بخت بستە)
بەخت خەوتوو: [ئاوەڵناو] بەدتاڵا؛ بەدشانس؛ بەدبەخت؛ بێئیقبال. (بخت خفتە)
بەخت‌کرانەوە: [چاوگە،ت] بەخت ڕوو تێکردن؛ (ب)، شووکردن.(بخت باز شدن)
بەخت‌کەنۆک: [ئاوەڵناو] بەختەوەر؛ خۆشبەخت؛ (ب) لێوکەن لێدانی شانس بە ڕووی کەسێکدا؛ بزە هاتنە سەر لێوی بەخت. (خوشبخت)
بەخت‌کەنۆکی: بەختەوەری؛ ئەوەی‌شانس و ئیقباڵی بزەی لە سەر لێوە.(خوشبختی)
بەخت لە درگادان: ڕوو هێنانی ئیقبال؛ شانس

ڕوو تێکردن؛ خوشبەختی بەرەو ڕووهاتن. (بخت در کسی را کوبیدن)
بەخت و نێوچاو: [ناو،ت]شانس و بەخت و ئیقبال.(لەنێوچاوی ئەو خانەدانە لەهی چۆنە پیتی بڕاوە)«سوارەئێلخانیزادە». (شانس)
بەختوەرگەڕاو: [ئاوەڵناو] بەخت وەرسووڕاو؛ بەخت هەڵگەڕاو. (ب) نەهاتی و نەدامەت ڕوو تێکردن. (بخت برگشته)
بەختوەکری: [ئاوەڵناو] شانس‌دار؛ بەخت-کراوە؛ بەختەوەر. (شانس دار)
بەخت نەمەنە: [ئاوەڵناو] بەخت نەمەندە؛ بێ-بەخت؛ بەدبەخت؛ شانس نەماو. (بد بخت)
بەختەباران: [ناو،ت]مانگی دووهەمی بەهار؛ بەختەواران؛ بارانی کاتی بەهاران کە لە جێگایێک دەباری و لە جێگایێک ناباری. (باران بهاری شانسی در منطقەمحدود)
بەختەبەران: [ناو،ت]بەرخی دووساڵە کە دایدەنین بۆ داشت تا ببێتە بەران. (نگهداری برەدو سالەبرای قوچ شدن)
بەختەک: [ناو] مۆتەکە؛ کابووس؛ سەنگ-سواربوون؛ بەهۆی تەزینی لەش لە خەودا؛ هەستی‌خنکان لە خەودا؛ (بختک)
بەختەواران: [ناو،ت]بەختەباران. (بخت باران)
بەخت یاری‌کردن:[چاوگە،ت] باش‌هاتن؛ بەخت بەپیریەوە هاتن؛ بەخت لەگەڵ بوون؛ شانس ڕووتێکردن. (بخت یاری کردن)
بەختی‌بەستراو: بەختی‌نووستوو؛ شانسی گرێدراو؛ بەکچی‌دەڵێن خوازبێنی‌کەری نەبێت. (بخت بسته)
بەختی‌نووستووە:ئەوەی دایمە تێدەشکێ و سەر ناکەوێ و هەر خراپە دێتە ڕێگای؛بە-دبەخت.بەدئیقبال. (بخت خوابیده)
بەختەوەری: [بەرهەمی‌چاوگە] بەختیاری؛کامەرانی(بختیاری)
بەخچە: [ناو]باخچە. (باغچە)
بەخشاندن: [چاوگە،ت](١) بەخشین. (٢) عەتاکردن. (٣) بەشکردن . (بخشیدن)
بەخشراو: [ناو،بەر](١) لێبووردرا؛ عافووکراو. (عفو شده) (٢) شتێ کە درابێت بەکەسێک یان بەخشرابێ. (چیزی کەبخشیدەشدە)
بەخۆدا شکانەوە: [چاوگە،ت]خەجاڵەت‌بوون؛ شەرمەزاربوون؛ تەریق‌بوونەوە. (شرمندەشدن)
بەخودان‌کردن: [چاوگە،ت]بارهێنان؛ پەروەردە کردن؛ خۆبەساحێب‌کردن. (پرورده‌کردن)
بەخۆڕاگەیشتن: [چاوگە،ت]خەریکی خۆ بوون؛ خۆ جوان‌کردن. (ب) چاک ژیان؛ خزمەتی خۆکردن. (بخود رسیدن)
بەخوڕڕەم: بەتەوژم هاتنە خوارەوی چۆم و سێڵاو؛ بارانی توند و بەخوڕ. (سرعت آب سیلاب ورودخانەدر حال پائین آمدن)
بەخۆوەبوون: قەڵەو بوون؛ زەلام و زەبەلاح-بوون (چاقبودن؛ تنومندبودن)
بەخۆیەوە: (١) لەخۆیەوە؛ لەخۆڕا. (خود بخود) (٢) لەگەڵ خۆیدا؛ (بەخۆیەوە شەش نەفەرن). (با خودش)
بەخەبەر: [ئاوەڵناو] ئاگادار؛ خەبەردار؛ نەخەوتوو؛ هۆشیار. (باخبر)
بەخێرچی: سەر خێراچی؛ (ب) بڕو بە

سڵامەت.(ب)خودات لەگەڵ. (خیر پیش)
بەخێرهاتی: (١)وەڵامی بەخێرهاتنی کەسێک کە دێتە ناوکۆڕ یان سڵاو دەکا. (٢) خۆش هاتی: لەکاتی خوداحافیزیدا. (خوش آمدی)
بەخێریەت: خێری لەگەڵ بێ؛ بەخێرەوە. (خیر باشد)
بەخیلی: [ناو،بەرهەمی چاوگە]چکووسی؛ بەغیلی؛ وەرچەم تەنگی؛ بەرچاوتەنگی؛ ڕژدی؛ چرووکی؛ چاوچنۆکی؛ ئێرەیی. (حسودی)
بەخێو: [ناو] دژی بێخێو؛ خاوەن‌دار(٢) بەخێوکردن:بەخاوەن کردن؛ پەروەردەکردن. (صاحبدار؛ سرپرستی کردن)
بەخێوبوون: [چاوگە،ت] بەڕێچوون؛ گوزەران کردن. (ادارەشدن؛پرورش‌شدن) بەخێوکار: [ناو،بک] بەخێوکەر؛ بەرێبەر؛ پەروەردەکەر؛کەسێک کە بەخێو دەکات. (سرپرست؛ پرورش دهنده)
بەدئادگار: [ئاوەڵناو] ناشیرین؛ ناحەز؛ دزێو؛ خوێن‌تاڵ؛ بەدفەڕ. (زشت)
بەدئاکار: [ئاوەڵناو]کردارخراپ؛ کارخراپ؛ کەسێک کەکردەوەی خراپە؛ ئاکارخراپ. (بد عمل)
بەدئاهەنگ: [ئاوەڵناو] (١) دەنگ‌ناخۆش؛ ئاهەنگ ناخۆش.(٢) ڕیتم و زەربی ناپەسەند لە مۆسیقادا. (بد آهنگ)
بەدئوتوو: [ئاوەڵناو]کووتاڵو جل و بەرگێ‌کە ئوتوو(ئۆتوو)هەڵنەگرێ.(بداتو)
بەدئوغر: [ئاوەڵناو] بەدیومن.شووم؛ ناموبارەک.(شوم)
بەدئەحواڵ: [ئاوەڵناو] فد: (١) حاڵ‌خراپ.(٢) ناساغ و دەستکورت؛ ژیان‌تاڵ؛ ژیوارناخۆش. (بداحوال)
بەدئەسڵ: [ئاوەڵناو] فد: ناڕەسەن؛ خراپە(بد اصل)
بەدئەنجام: [ئاوەڵناو] فد: عاقیبەت خراپ؛ دواڕۆژ ڕەش؛ عاقیبەت‌شەڕ. (بد انجام)
بەدئیخلاق: [ئاوەڵناو] بەدخوو؛ بەدفەڕ؛ بەدکردار؛ ڕەفتارخراپ. (بد اخلاق)
بەدئیقباڵ: [ئاوەڵناو] بەخت‌ڕەش؛ بەدشانس؛ بێبەخت. (بد اقبال)
بەدارڤەکرن: [چاوگە،ت] (١) دارداکری، هەڵواسین؛ ئاوێزان کردن بەدیوار یاندارەدا. (آویزان کردن) (٢) لەسێدارەدان. (دار زدن)
بەداری‌نەحلەتاچوون: ڕازی‌نەبوون بە هیچ کلۆجێ؛ پاچەقاندن لە مەبەستێ. (بەهیچوجەراضی نشدن. لج کردن)
بەدانستە: (١) لەڕوی‌ئەقڵەوە. (٢) بە ئاگادارییەوە.(٣)بەئانقەس؛دەس‌ئەنقەس. (از روی عقل؛ باآگاهی؛عمدی)
بەد بدێ: [ئاوەڵناو] (١) کەسێک کە خراپ دەدا یان دەداتەوە. (٢) (ب) قەرزکوێر. (بد بده)
بەدبسێن: [ئاوەڵناو] زۆر ڕژد لەسەر سەندنەوەی قەرز. (بدبستان)
بەدبۆ: [ئاوەڵناو] بۆگەن؛ بۆدڕن. (بد بو)
بەدبەختانە: فد:لەبەختی خراپەوە (ب) بەداخەوە؛ مەخابەن؛ لەشانسی‌خراپەوە. (متأسفانه)

بەدبەختی: [ناو،بەرهەمی چاوگە] (ب)چارەڕەشی؛ خاکبەسەری؛ قوڕ بەسەری؛ کوڵۆڵی؛ بەلەنگازی؛ ڕۆژە ڕەشی؛ نەهامەتی؛ نەدامەتی؛ داماوی؛ هەژاری؛ بەدچارەیی؛ سیابەختی.(بدبختی)
بەدبێژ: [ئاوەڵناو]خراپەوێژ؛قسەناخۆش؛ زبان ناخۆش؛ قسەتاڵ. (بدگو)
بەدپەسەن: [ئاوەڵناو] بێسەلیقە لە بەرگەم-کردندا؛ گەن پەسەند؛ شتیخراپ پەسەنەکەر. (بد پسند)
بەدپۆز: [ئاوەڵناو] خۆبەزلزان؛ پۆزو فیزی-بێجێ. (متکبر)
بەدتوخم: [ئاوەڵناو] (١) ناڕەسەن. (٢) نێرەی گیانداریێک‌کە بەچکە یا منداڵی چاکی لێ-نەکەوێتەوە. (بد تخم)
بەدچاپ: فد: نووسراوەییێک کە چاپەکەی باش نەبێت؛ کەرەستەی چاپ‌کە باش چاپ نەکات. (بد چاپ)
بەدچاو: [ئاوەڵناو] چاوپیس. (چشم شور)
بە دحاڵ: فد: [ئاوەڵناو] (١) بەد ژیوار.(٢) حاڵنەدار، نەخۆش. (بدحال)
بەدحیساب: فد: [ئاوەڵناو] خووگرتوو بە بەدحیسابی؛ حیساب‌کوێر؛ قەرزکوێر؛ (ب) ماڵیخەڵک‌خۆر (بدحساب)
بەدخواز: [ئاوەڵناو] خراپە ئارەزوو دەکابۆخەڵکیتر. (ب) دوژمن. (بدخواه)
بەدخۆراک: [ئاوەڵناو] (١) خووگرتن بە خواردەمەنیخراپ. (٢)هەموو خۆراکێ نەخواردن و قیزوبیزکردن. (بدخوراک)
بەدخووکردن: [چاوگە،ت] ئاژەڵ یا مرۆڤ فێری خوو و خدەیخراپ‌کردن؛ ڕەوشتی-خراپ فێر کردن. (بد خوکردن) بەدخوویی: [ناو،بەرهەمی چاوگە]کاری‌بەدخوو؛ بەدڕەفتاری؛ بەدڕەوشتی؛ پڵمەروویی؛ لاساری؛ نەگونجاوی؛ ناوچاوگرژی. (بدخویی)
بەدخەت: خەت‌ناخۆش؛ خەت‌ناشیرین؛ دژی خۆش‌خەت. (بد خط)
بەدخەو: [ئاوەڵناو] (١) کەسێک کە درەنگ-خەوی لێدەکەوێ؛ (٢) کەسێک‌کە لە خەو ڕاچەنێ ئیترخەوی لێنەکەوێتەوە و بەدخەوبێ؛ خەو زڕاو. (بدخواب)
بەدخەیاڵ: [ئاوەڵناو] خەیاڵ‌خراپ. (ب) دڵ-پیس؛ بەدگومان. (بدخیال)
بەددەست : [ئاوەڵناو] (١) دەشت خراپ؛ (دە-شت، هەوەڵین پارەیێکە کە دووکاندار لە موشتەری وەریدەگرێ) هەرگا لەدەستی کەسێک وەریبگرێت‌کە ودمیخراپبێت - دەڵێن بەد دەستە یان بەد دەشتە.(٢) دەست-قورس بۆ لێدان یا قەرز لێوەرگرتن . (بددست)
بەددیمەن: [ئاوەڵناو] ڕواڵەت ناشیرین.(بدمنظر)
بەدر: فد: [ناو]دیاربوونی بازنەی‌تەواوی مانگ لە شەوی چواردەهەمدا. (بدر)
بەدڕا: [ئاوەڵناو] (١) خاوەنیبیروباوەڕی خراپ. (٢) کەسێک‌کە ڕێگای خراپی-گرتبێتەبەر. (٣) لاڕێ: ڕێگای خراپ (۴) جێگاییێک‌کە ڕێگا کەی سەخڵەتە. (بد راه)
بەدڕایی: [ناو،بەرهەمیچاوگە] (١) بەڕێگەی-

خراپدا ڕۆیشتن؛ (۲) خاوەنی بیر و ڕای خراپ. (۳) لاڕێیی کردن. (بدراهی)
بەدرِک: [ئاوەڵناو] ڕق‌هەستوو؛ کەللە ڕەق؛ سەر سەخت؛ کینەیی. (کینەیی. سر سخت)
بە درۆخستنەوە: [چاوگە،ت] درۆ بە ڕوودا دانەوە؛ دەرخستنی درۆ؛ ڕاستی وتنی قسەی درۆزن. (نمایاندن دروغ)
بەدرِۆژ: [ئاوەڵناو]کەسێک کە بەڕۆژ خراپ و تووڕەیەو بەشەو چاکترە. (بد روز)
بەدرِەفتاری: [ناوبەرهەمی‌چاوگە] نیشاندانی کردەوەی دزیو؛ کردەوە خراپی و ئاکارخراپی لەگەڵ خەڵک. (بدرفتاری)
بەدرِەگ: [ئاوەڵناو] لەشی‌کەسێک دەماری دیارنەبێت و بەزحمەت دەماری بۆ دەرزی وەشاندن پەیدابێت(بدۆزریتە وە). (بدرگ)
بەدرِەنگ: [ئاوەڵناو] ڕەنگ‌ناشیرین؛ ناحەز.(بد رنگ)
بە درەنگ‌خستن: [چاوگە،ت] وە درەنگ- خستن؛ کار ڕاگرتن بۆ ماوەیێک؛ خستنە دوواوەی ئەنجامی‌کارێک. (بەتأ خیر انداختن)
بەدرِەوشت: [ئاوەڵناو] بەدکردار؛ بەدرەفتار؛ بەدخوو. (بد روش)
بەدرِەوشتی: [بەرهەمی‌چاوگە]کار و ڕەوتی بەدرەوشت؛ بەد خوویی؛ ئاکارخراپی؛ بەدرەفتاری. (بد روشی)
بەدرِێبوون: [چاوگە،ت] لاڕێبوون؛ ڕەوشت‌خراپ‌بوون. (بدراەشدن)
بەدزمان: [ئاوەڵناو] جنێوفرۆش؛ زمان‌پیس، بەدبێژ؛ زمان‌شڕ؛ دەم‌شڕ. (بد زبان)
بەدسروشت: [ئاوەڵناو] بەدزات؛ بەدئەسڵ؛ بەدخوو.(بدسرشت)
بەدشانس: فد: [ئاوەڵناو] بەدئیقباڵ؛ بخت‌ڕەش.بدبخت)
بەدشەو: [ئاوەڵناو]کەسێک‌کە بەشەوا ڕەفتاری خراپ بێت و بەڕۆژ چاکتربێت (کسی کەشب ها بد اخلاق باشد)
بەدشێوە: [ئاوەڵناو] ناشیرین؛ بەدقیافە؛ ئێسک‌گران؛ دزێو. (بد قیافه)
بەدفەڕ: [ئاوەڵناو] شووم؛ بێ‌ودم ناشیرین؛ ناحەز؛ ئێسک‌گران. (بد یمن)
بەدفەرجام: فد: (ف.مشە)پاشەڕۆژخراپ؛ ئاخرشەڕ.(بدفرجام)
بەدقومار: [ئاوەڵناو] لە قوماردا- گزەون؛کایەشێوێن؛ (بد قمار)
بەدقەدەم: [ئاوەڵناو] قەدەم‌شەڕ؛ کەسێک کە نەها مەتی ببێت، بچێتە هەرجێ دەبێتە هۆی شەڕ و ناخۆشی؛ قەدەم‌ڕەش. (بد قدم)
بەدقەوارە: [ئاوەڵناو] قەڵافەت‌ناشیرین؛ قەدوباڵا ناشیرین.(۲) زەوییێک‌کە نارێک و نالەبار و ناڕێژە بێ بۆ دروست‌کردنی خانوو. (بد قواره)
بەدکارە: فد: [ناو] ژنی‌خراپەکار؛ ژنی‌کردەوە خراپ. (بدکارە؛ فاحشه)
بەدکردار: فد: [ئاوەڵناو]کردەوەناشیرین؛ کارناشیرین؛ بەدرەوشت. (بد کردار)
بەدگڵ: [ئاوەڵناو] بەدگڵ؛ (ف.مشە)بەدخاک؛ ناشیرین و کرێت و نا ڕێک(بدگل)
بەدگۆشت: [ئاوەڵناو] (۱) خوێنتاڵ؛ ناشیرین.(۲)کەسێک کە برینی درەنگ ساڕێژ دەبێت.(بدگوشت)

بەدگومـان: [ئـاوەڵنـاو] بـەدبـین؛ دڵ پـیس؛ دووشک؛ دڵ چەپەڵ. (بد گمان)
بەدگووز: [ئاوەڵناو] ڕەوشت خـراپ و تـووڕە؛ بیانوو گر. (بد ادا)
بەدگۆیی: [ناو،بەرهەمـی‌چاوگـە] بـەدبێـژی؛ بـەدزبـانی؛ خراپـەبێژی؛خراپـەی کـەسـیک گۆتن. (بد گویی)
بەدڵ: [بەند](١)پەسەند(بەدڵمـە).(پسـند) (٢) [ئاوەڵنـاو] بـەجـەرگ؛ (بـەجورئـەت)؛ بـوێر. (باجرئت)
بەدڵوداو: [بەند،ت]بەداوخوازێکی لە دڵـەوە؛ (ب)داخوازێک لەکانگای‌دڵەوە؛ بـەئیشـتیای- دڵ. (از تەدل)
بەدڵوگیان: [بەنـد]بـەدڵوداو؛ بـەگیـان‌ودڵ داوخوازکردن: داوخوازکردن لە نـاخی‌دڵـەوە. (از جان ودل)
بەدلەغاوی: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە] سەربـادانی ئەسپلە کاتی لەغاوکردندا؛ کـەڵـەوەکێشـی؛ سەرپێچی؛ نا فەرمانی (نافرمانی)
بەدڵـەوەگـرتن: [چاوگـە،ت] لـە دڵـدا مـانی باندۆری کردەوە یان قسەی ناخۆش و لەبیر نەبردنەوەی.(بدل گرفتن)
بەدڵەوە نووسـان: (١) گوشـین بـەسینگەوە؛ پێخۆش‌بوونی خۆراک و خواردنـەوە، نۆشـی گیـان‌کـردن؛ (نـەت هێشـت نانـەکـەم بەدڵەوەبنووسێ، لێت کردم بـەژەهـری مـار) (بەسینە چسپاندن؛ نوش‌جان کردن)
بەدموعامەلە: [ئاوەڵناو] لە موعامەلەدا جیڕ و بیانووگر؛ سەرسەخت لە مامەڵە کردنـدا. (بـد معامله)
بەدمەزە:بەدمـەززە. [ئـاوەڵنـاو] تـام‌نـاخۆش؛ مەزەخراپ؛ تام ناخۆش. (بد مزه)
بەد مەزهەب:بەدمەسسەو: خاوەنـی دیـن و ئایین و مەزهـەبـی ناشایسـت و دژی دینـی جەماوەر؛ زیاتر بۆ جوێنە(ب) بێ دیـن؛ بـێ- ئوول. (بد مذهب)
بەدمەست: [ئـاوەڵنـاو] ئاکـارخراپ لـەکـاتی مەستیدا؛ ئاگا لەخۆبڕان لەکاتی مەستی‌دا.(بـد مست)
بـەدمـەسـەب: بـەدمـەزهـەب؛ بۆجوێنـە. (بدمذهب)
بەدمەوەدان: [چاوگە،ت] (١) ڕوو پێـدان؛ بـە دەمەوە دان.(٢) شل‌کردن؛ گوریسەکـە شـۆڕ کەرە وە وکەم‌کەم بیدە بەدەمیەوە. (٣) مـاوە پێـدان بـۆکردنی‌کـارێ. (٤) شـتێ خسـتنە سەرشتیکی‌تر لەجنسی‌خۆی؛ باغچـەکـە دە دەمـــە دەم حـــەســـارەکـــە. (رودادن؛ بەسرانداختن؛ میدان‌دادن. شل‌کردن)
بەدمینگتۆن: فد: [ناو]وەرزشێکەکە بەڕاکێـت و تۆپی پەڕدار دەکرێت. (بد مینتون)
بەدناوکردن: [چاوگە،ت] ناو بەخراپە زڕاندن؛ ناوی‌یەکێ بەخراپە خستنە سەرزمانـان. (بـد نام کردن)
بەدنوما: [ئاوەڵناو] ڕواڵەت ناشیرین. (بدنما)
بەد نیژاد: [ئاوەڵناو] بەد ڕەسەن؛ بەدئـەسـڵ؛ بەد توخم؛ بەد ڕەگەز. (بد نژاد)
بەدنییـەت: [ئـاوەڵنـاو] ئـارەزوی خراپـە دە- کا؛بەدخواز؛بەدنیهاد؛ نییـەت‌خـراپ؛ دەروون- خراپ. (بدنیت)
بـــەدوادا چـــوون: [چاوگـــە،ت] (١) چـــوون

بەشوێندا بۆ بانگکردن. (رفتن بەدنبال کسی) (٢) لە پشتسەرەوە ڕۆیشتن. (پشت سر رفتن) (٣) ڕێگا و ئاکاری کەسێک هە ڵگرتن؛ (دنبالەرو) (٤) وە شوێن کارێک کەوتن. (پیگیر بودن)

بەدوادااناردن: [چاوگە،ت] (١) بەدوادا هەناردن؛ ناردنی کەسێک بۆ بانگ کردنی کەسێکی تر. (دنبال فرستادن) (٢) دوابەدوای کەسێک، ڕەوانەکردنی کەسێکیتر. (پشت سر کسی روانەکردن)

بەدواداهاتن: [چاوگە،ت] (١) بەربوونەوە یا شل بوونەوەی بار لە سەرپشتی بارەبەر بۆ پشتەوە. (افتادن بار از عقب ستور) (٢) کەسێک کە هاتوەبەشوێن کەسێکداکەبیباتەوە. (دنبال آمدن) (٣) لە پشتسەر کەسێکەوە ڕۆیشتن. (پشت سر آمدن) (٤) چەمینەوە یان کەوتنبەپشتا. (ب) نوشوست هێنان . (بەپشت افتادن؛ تنزل)

بەدوور زانین: کارێ کە دوور لە چاوەڕوانی بێت؛ دوور لە خەیاڵ؛ دوور لە چاوەڕوانی؛ دوور لە باوەڕ؛ (دور از انتظار)

بەدەرەتان: (١) بەموڵەت؛ فورسەت پێدەر. (دارای مهلت) (٢) [ئاوەڵناو] بەرئاواڵە؛ بەرنە-گیراو؛ پان و بەرین. (جلوباز؛ وسیع؛ گسترده)

بەدەرەک: (ب)بەتوون؛ بەجەحەندەم. (بەجهنم)

بەدەستوبرد: [ئاوەڵناو] (ب)لەکاردا خێرا؛ کارامە؛ دەستسڤک؛ زیرەک.(سریع درکار)

بەدەستەوام: بەهەرەوەز؛ بەگەل کردن و بە دەستەواو؛ بەکۆمەکێ کە قەرەبوو بکرێتەوە هەربەو جۆرەکۆمەکە؛ قەرزی کۆمەک بە-کۆمەک. (کمک متقابل)

بەدەستەوەبوون: [چاوگە،ت] (١) شتێ کە لە ناو دەست دایە. (٢) نزیکی تەواوبوونی-کارێک؛ بە دەستەوەیە تەواوبێت، خەرێکە تەواو دەبێت. (٣) کەرەستەیێک کەدایم لەبەر دەستدا ئامادەبێت. (٤) کەسێک کە دایم بۆ ئەنجام دانی کار و بار لە بەردەستدابێت. (٥) خەریکبوون بە دەسپێکی کارێک؛ کارێکم بە دەستەوەیە. (در دست بودن)

بەدەم ئاوەوە دان: [چاوگە،ت] (١) شتێک خستنە ناو ئاوێک کە دەڕوا. (بەآب جاری انداختن) (٢) (ب) بەفیڕو لە دەستدان. (از دست دادن)

بەدەمباوەدان: [چاوگە،ت] (١) سپاردن بەبا؛ بەبادان؛ توزەکەیدابەدەم باوە. (٢) بەوێلخەرجی سامانەکەیخۆیدا بەدەم باوە: (ب) لە ناوبردن. (بەدست باد سپردن)

بە دەم دادان: [چاوگە،ت] (١) قسەلێبڕینەوە و بێدەنگ کردن؛ لەدەم ڕاکێشان و لێدان. (ساکت کردن) (٢) وەڵامی ڕەق دانەوە. (تودهن زدن)

بەدەمدا دانەوە: [چاوگە،ت] بەرپەرچدانەوەی قسە. (حرف کسی را قطع کردن)

بەدەمدانان: [چاوگە،ت] (١)بەدەمدا چەسپاندن؛ ئاورەکەی بەدەمدا نا، چزاندنی بە دەمیا؛ (٢) رشانەوە.(٣) (ب) شێوەدان؛ ئە و منداڵە چەند لە بابی دەچی دەڵێی بەدەم داینـاوە.(گذاشتن روی دهان؛ با دهان گذاشتن)

بەدەمداهاتنەوە: [چاوگە،ت] جوابەجەنگی؛ شەڕەدەندووکێ. (جوابگویی)
بەدەم ڕێگاوە: لەحاڵ و لەکاتی ڕێگە ڕۆیشتندا؛ بەدەم ڕێگاوە گۆرانی دەڵێ. (ضمن راه)
بەدەمکەسێکەوە چوون: [چاوگە،ت] (١ب) بەفریای کەسێک کەوتن؛ چوون بۆ ئاریکاری کەسێک؛ (ب) بەدەنگ وهاواری کەسێکەوە چوون؛ (٢)پێشوازی کردن. (بەکمک کسی شتافتن؛ بەپیشواز رفتن)
بەدەمەوەبوون: [چاوگە،ت] (١) شتێک کە بەدەمەوەیە؛ سێوەکەی بەدەمەوەیە. (دردهان بودن) (٢) بوونی کات و مۆڵەت؛ زۆرم بە دەمەوەنییە پیربوومە. (مهلت) (٣) بە بەرەوە بوون؛ بەرین بوون. (وسعت)(۴) لە بەردەستدابوون و بە دەور و پشتدا هاتن وخزمەتکردن. (خدمت کردن) (۵) ئەو بەرە زۆری بەدەمەوە نەماوە دەدرێت؛ واتا بەرگەی نەماوە. (استحکام
بەدەمەوەدان: [چاوگە،ت] (١) بەدەمەوە کردنی خۆراک. (دهن گذاشتن)(٢) ڕوو پێدان و ڕوودارکردن. (رو دادن) (٣) وردە وردە شل کردنی تەناف. (شل کردن طناب) (۴) ئەو قوماشەکورتە بدە بەدەم لەتێکی ترەوە. (اضافەکردن)
بەدەمەوە ڕۆیین: [چاوگە،ت] (١) هەڵکەوتن و بەسەرەوە ڕۆیین؛ سەرەنگردان. (سکندری خوردن) (٢) ئەو دیوارە بڕوخێنی زیاتری بەدەمەوە ئەڕوات و ئەیداتەدەمی. (بیشتر شدن؛ اضافەشدن)
بەدەمەوەهاتن: [چاوگە،ت] (١) لایێک لە دیوارەکە دەڕوخێنی ئەولاکەی تریشی بەدەمەوە دێت. (اضافەشدن وهمراه) (٢) بەفریای کەسێکەوە هاتن. (٣)پێشوازی-لێکردن. (بەکمک آمدن؛ بەپیشواز رفتن)
بەدەم یەکەوەبوون: [چاوگە،ت] (١) بەهاواری یەک گەیشتن. (بەداد هم رسیدن) (٢) پێکەوە چەسپاو؛ یەکپارچە. (یکپارچە)
بەدەورا هاتن: [چاوگە،ت] (١) خولانەوەوگەڕان بە دەوری شتێکدا. (دور چیزی گشتن) (٢) لەدەورگەڕان و خۆ بە قوربان کردن؛ (قربان صدقەرفتن) (٣) (ب) خزمەت کردن و ئاگالێبون و خەمڵاندن و جوان بەخێوکردن. (خدمت کردن)
بەدەهەن: [ئاوەڵناو] دڵاوا؛ دەسبڵاو؛ دەهەندە و بەهیمەت. (بخشندە)
بەدیارەوەبوون: [چاوگە،ت] (١) بەدیارۆ بوون؛ شتێ کەدیاربێت؛ لە بەرچاو؛ دیاربوون؛ خویابوون؛ (مرئی؛ پیدا بودن) (٢) بەلاوەدانیشتن؛ ئاگا لێبوون. (نگهداری)
بەدیارەوە دانیشتن: (١[چاوگە،ت]) (ب) چاوەڕوانی بۆ پێ‌گەیشتن و هاوسەری،ئاگە-ڕانەوە و یەک دیتن؛ وەک، چاوەڕوانیی-کچێک و شوو نەکردنیتا گەڕانەوەی دە-زگیرانەکەی لە دوور وڵاتان . (در انتظار نشستن) (٢) ئاگا لێوونی نەخۆش. (پرستاری)
+ بەر: (١) ببە؛ دڵشادبەر: دڵشادبە؛ (٢)لەپ؛ بەری‌دەست: لەپی‌دەست. (باش؛کف دست)
+ بەر: [ناو]دەرەوە؛ بەرکەردەی: دەرکردنە-

دەرەوە؛ ئامای بەر:هاتەدەرەوە؛ (بیرون).
+ بەر: [ناو](١)ئەو پانایيە کە پاڵە لە دروێنەدا دیارییدەکا بۆ دوورینەوە >پاڵە. (انتخاب عرض درو)(٢) دوورینەوەی یەک کەرت و بیٚ وچان گرتن (درو یک عرض معین در یک بار)(مەودا؛ ماوە؛ بەری تەنگانە کورتە. (چشم انداز؛ مدت)
بەر: [ناو]قەراغ؛ کەنار؛ لێو؛ لێوار. (کنار)
بەرئاڤ:[چاوگە،ت]پەڕاو؛ قەراغ زەریا . (کناردریا،ساحل)
بەرئاڤێتن: [چاوگە،ت] بەرخستن؛ بەر فرێدان؛ منداڵ لەبارچوون. (سقط شدن بچە)
بەرئاگر: [چاوگە،ت] (١) کوڵەوەژ. (چوب آتش بهم زن) (٢) بەر ئاگر؛ پیشەوە و ڕوو بە ئاور. (روبەروی اتش) بەرئانین:[چاوگە،ت](١) پێشکەش کردن.(پیشکشی) (٢) بەرهێنان؛ سەمەرهێنان. (بهرەدادن)
بەرئاو: گیای قناولیٚ؛ بۆ چڵکی سی باشە. (مندآب)
بەرئاوەڵە: [ئاوەڵناو] پێش‌بەتاڵ؛ بەرنەگیراو؛ بەر فراوان. (وسیع)
بەرئەندام: [ناو] خۆ دیاریکردن بۆ دەنگ - دان و بەرگەم بوون. (کاندیدا)
بەرئەندامی:کاری خۆ دیاریکردن بۆ هەڵبژاردن و دەنگدان و بەرگەم بوون. (کاندیدایی)
بەرا: [ناو]بڵا؛ با. (بگذار)
بەرابەرێتی: [ناو،بەرهەمی چاوگە] بەرامبەری؛ ڕووبەڕوو وێستان؛ رەوتی ملانیٚ و بەرەنگاری و هاوهێزی. (حالت برابری‌و رقابت)
+ بەرات:(١)تاجریٚ‌نامەییٚکی‌دەنووسی بۆ تاجرێکی‌دی‌کە پارەی دیاریکراو لە نامەکەدا بدا بەساحیبی‌نامەکە (لە قەدیم دا) ئەمڕۆ بانگ هەر بەو شێوە ئیش دەکا و بەو نامەی بانکییە دەڵین (بەرات) (٢) جەژنی بەرات. (٣) مووچە(مۆچە)ی کرێکار و نوکەر و ڕەنجبەر. (برات)
بەرات: (ف.مشە) بەڵگە؛ ئاوەند؛ دەلیل؛ رەزا-یەتنا مەی گەوران.(رضایتنامە بزرگان)
+ بەرات: [ناو] بەڵگەییٚکە کە لە سۆنگەیەوە کەسێک لە کەسێکی‌تری دەوێتکە لە کاتێکی دیاریکراودا پارەییٚک بدا بە کەسێک یان شوێنێک. (برات)
بەراتکێش: [ناوی‌بک]بەرات نووس؛کەسێک‌کە دەروەستە پارەی بەرات لەکاتی دیاریکراودا بدا بە بەرات گر. (براتکش)
بەراتگر: [ناوی‌بک](١)کەسێک‌کە پارەی-بەراتەکە لە وادەی دیاریکراودا لە براتکێش وەردەگریٚ. (برات گیر)
بەرارۆ: دەربێنێت؛ دەرکێشێت. (دربیاورد)
بەراڕەوی: [بەند]بەڕاگوزەری؛ بەهەڵکەوت؛لەناکاو. (اتفاقی)
+ بەرازە: [ناو](١)تەختەداری کورت و قەوی لە بەینی کوڵەکە و کاریتەدا؛ سەرکوڵەکە؛ تانج‌کوڵەکە.(٢) ئاغزوونە؛ ئافزوونە. (١.سر ستون،٢.سگک)
بەرازی میٚ: ماڵوس. (خوک مادە)
بەرازی نێر: یەکانە. (گراز)

بەراژۆ: [ئاوەڵناو]بەرەوژوور؛ سەرەوژوور. (سر بالا)
بەراژۆیی: [ناو] سەرەوژووری. (سربالایی)
بەڕاست: (١) بەلای ڕاستدا. (بطرف راست)
(٢) بەڕاستی و بێدرۆ. (براستی) بەڕاش: [ناو]جۆرێک چێشکەیە. (نوعی گنجشک)
بەراشۆ: [ناو] بەرشیو؛ جل و بەرگێککە بۆ شووشتن دادەنرێت. (رخت برای شستن. رخت چرک)
بەراشە: [ناو]جۆرێک باڵندەیە. (نوعی پرندە)
بەراڤ: پەڕاو؛ قەراغ زەریا. (کناردریا،ساحل)
بەراڤیتن: [چاوگە،ت] بەرهاوێژتن؛ بەرخستن؛ بەر فڕێدان. (انداختن جنین)
بەراڤێژک: [ناو] بەرهاڤێژک؛ زێڕەوشان. (زرافشان)
بەڕاکردن: بەغار؛ بەهەڵاتن. (با دویدن)
بەراگر: (١) بەرئاگر. (٢) کۆڵەوەژ.
(١)جلوآتش.(٢)چوب بهمزدن آتش‌تنور)
بەرامبەری‌کردن: (١)وەک یەک‌هاتنەوە و یەکسانی. (یکسان بودن)(٢) بەربەرەکانی کردن؛ و نەبەزین. (رقابت)
بەرامپێل: [ناو،ت](١) بەرانپیل؛ بەرهەڵبێنە. (پیشبند) (٢)[چاوگە،ت] بەرانبەری کردن؛ بەرامبەرەکی.(٣) بەرانبر. (برابری ورقابت؛ پیش افتادن و دور زدن)
بەران‌بازی: [ناو] شەڕە بەران. (جنگ قوچ)
بەرانبەربوون: (١) ڕوو بە ڕووی یەک بوون. (٢) هاوتابوون؛ هاوکێش بوون؛ هاو ئەندازە- بوون؛ هاو قەدبوون. (٣) (بەران بەر بوون)(ب)کاتی بەران بەردان بۆ نێو مێگەل. (روبەروی هم بودن؛ برابر بودن؛رهاکردن قوچ بەمیان‌گلە)
بەران بەردان: (١) بەران کردنەنێو مێگەل. (تگەرا با گلەهمراەکردن)
(٢) بەرانبەر دان. حاڵەتی بە یەکگرتن؛ هەڵسەنگاندن؛ پێکگرتن؛ ڕووبەڕوو دانان (مقابلە)
بەرانبەری‌نەکردن: بەرگەی شتێک نەگرتن؛ نەواندن؛ کۆڵدان؛ بەزین؛ هێز پێنەشکان؛ هاوسەنگ نەبوون؛ هاوشان نەبوون. (مقاومت نکردن. برابری نکردن)
بەران‌پۆز: پۆزبەران؛ لووتبەران؛ کەپوی کووڕی دەرپەڕیو. (دماغ عقابی) بەرانکێ: [ناو]بەرانەک؛ تلیامەزن؛ قامکە گەورە. (انگشت شست)
بەرانە جەنگی: (١) بەرانی تایبەت بۆ شەڕ.(قوچ جنگی)(٢) شەڕە بەران. (جنگ قوچ)
بەرانەک: [ناو] قامکە گەورەی دەست؛ تلیا مەزن. (انگشت شست)
+ بەرانی: بەسەر لە یەک دانی‌کەڵ و حەیواناتی دیکە؛ کشانەوە دواوە بۆ خۆ بە یەکدادان.(هاڕەی گۆ و دوو قرانی، لێک دەکشانۆ بەرانی)(فۆلکلۆر). (شاخ بەشاخ)
بەڕانی‌خۆدادان: (ب) پەشیمان بوون و داخ و حەسرەت دەربڕین بۆ لەدەس چوو بە دەست بەسەر ڕاندا دان. (کنایەی اظهار تأسف و بادست بەزانو کوبیدن)
بەراوان: [ناوی‌بک]پارێزەر؛ چاودێر. (محافظ)
بەڕاوەبەر: [ناوی‌بک] ڕێبەر؛ بەرێوەبەر.

(مدیر)
بەراوەرد: (١) هەڵسەنگاندن لەگۆتره. (برآورد) (٢) هاتنەدی؛ ئاواتەکەم بەراوەرد بوو. (رسیدن به آرزو) (٣) بەراوەردن؛ دەرهێنان؛ ڕیشەش بەراورد؛ ڕیشەی دەرهێنا.(درآوردن)
بەراوێژ: [ناوی‌بک]بەرهاوێژ؛ بەرفڕێدەر؛ ئاژەڵی‌که بەردەخا. (بچەانداز)
بەڕاوێژ: [ئاوەڵناو] خاوەن ڕاوێژ؛ بەتەگبیر. (با تدبیر)
بەراوێژتن: [چاوگە،ت] بەرخستن؛ لەبارچوون؛ بەر هاوێژتن. (بچەانداختن و سقط شدن)
بەراوێژتوو: لە بارچوو؛ بەرهاوێژتوو؛ بەرخستوو. (بچەانداخته)
بەراویلکە: [ناو]بەرگاییلکە؛ بەرگاییلە؛ جۆرێک چۆلەکەیە کەکاتی‌شێو بڕینی زەوی لە نزیکی‌جوتیار کرم لە زەوینی‌تازە شێو بڕاو هەڵدەگری و دەی چنێتەوە. (اسم پرندەایست)
بەراهک: بەراهی؛ بەرایی. (دیدگاه)
بەرایی: (١) پەژراندن و فتوا دان؛ دڵم-قەبوول‌ناکا: دڵم‌بەرایی‌نادا. (قلباً قبول کردن) (٢) سەردەلیل؛ سەرکاروان؛ پێشەنگی‌کاروان؛ پیشەوەی ڕانە مەڕ؛ بەرفراوانی. (پیشرو کاروان؛ وسعت)(٣) قۆچەقانی؛ بەردهاوێژک؛ بەرەقانی؛ بەرەقان.(فلاخن)
بەراییل:<بەرایی. ١.و٢.
بەربات: [ئاوەڵناو]بەرباد. (برباد)
بەرباد بوون: [چاوگە،ت]تەفر و توونا بوون؛ لەناو چوون؛ بەفیڕۆچوون (بربادرفتن)
بەربچاڤ: لەبەرچاو؛دیار؛بەرچاو؛ خویا.(جلوچشم)
+ بە ربار: (١)بەرپرس. (مسئول)(٢)گوێ‌لە-مست.(گوش‌بفرمان) بەرباران: (١) لە ژێرباراندا. (زیر باران) (٢) چەتر؛ سەیوان. (چتر)
بە رباری: [(١) بەرپرسی. (مسئول) (٢) گوێ-ڕایەڵی؛ گوێ‌لەمستی. (شنوا)
بەربای گوێ کەوتن: [چاوگە،ت] سووسەکردنی دەنگوباسێ؛هەست-کردن.(حس‌کردن؛ باد بەگوش رساندن)
بەربایی: ئاشکرابوون؛ خەبەری‌ڕوداوێک کە بڵاو ببێتەوە. (برملا)
بەربچاڤ: [ناو]سەرکار؛ (ئەمیندار)(١) ئەو کەسە ڕادەی مافی ئاغا، یا دەوڵەت لە ماڵی کاسب و ڕەنجبەران دیاری دەکا. (ممیز)(٢) دیار؛ خویا. (پیدا)(٣)گرینگ؛ لە بەرچاو. (چشمگیر)
بەربچان: ئەوەی‌کەڕەفتار و ئاکاری لە خەڵک نەچی.(آنورمال؛دارای‌رفتار غیرعادی)
بەربخوار:(١)سەرەو ژێر؛ ڕوو بەخوارەوە. (سراشیب؛ روبه پایین)
+ بەربڕ: [ئاوەڵناو+ناو] (١) بەربەند؛ بەرلی-بڕینەوە. (سد؛ مانع)(٢) بەرانبڕ دانەوە، پێشکەوتن و دەور دانەوە لە ڕێگادا. (دورزدن)(٣) کەسێک‌کە بەرانبڕ دەداتەوە یا پێش بە کاریان کەسێک دەگرێ. (حالت پیشی گرفتن) (۴)
هەر شت کە بەرد دەبڕێت؛ کەسێک‌کە بەرد دەبڕێتەوە . (سنگ بر)

بەربڕینەوە: [چاوگەت] پێش پێگرتن؛ نەهێشتن و ئیجازە نەدان؛ بەرهەڵستدانان لە بەر ڕێدا. (جلوگیری)
بەربژوور: سەرەوژوور. (سربالا)
بەربژێر: (١) بەردهەڵبژاردن لە دانەوێڵە و زەوی؛ نیسکەکە بەربژێر بکە. (سنگ-جداکردن) (٢)[ناوت] بەربژێر؛ بەرەوخوار؛ سەرەوخوار. (سراشیب) (٣) بەرد هەڵبژێر. (کسی کەسنگ جدا می کند)
بەربسک: [ناو] ئەگریجە؛ قژی لاسەر. (گیس طرفین صورت)
بەربڵاو: [ئاوەڵناو]پێش ئاواڵە؛ پان وبەرین؛ بەرنەگیراو. (وسیع)
بەربۆر:کەسێک کە تووشی گێچەڵێ بووە و لێی ڕزگارنابێت. (گرفتار مخمصەلا علاج)
بەربوار: [ناوت](١) بەربوارد؛ ساڵێ قسربوونی ئاژڵ. (یکسال نازایی)(٢)بەر بوار؛ لەسەرڕێ؛ لەسەربوار و بەرەگە.(گذرگاه)
بەربووز: [ناو]چۆغە؛ چۆخە؛لەبووزووچێکراو. (لباسی از شال دستباف محلی)
بەربووق: [ئاوەڵناو] ژنی بەدکار و خۆفرۆش؛ جننە؛ جوننە. (جندە)
بەربووکانە: خەڵاتی زاوا بۆ شاییگێڕ لەکاتی گەیشتنی بووکدا.(خلعت داماد بە مطرب)
بەربوونەوە: [چاوگەت](١) دیسان بەربوون؛ (دوبارەرها شدن) (٢) کەوتنە خوار؛ خلار بوونەوە لە سەرەوە. (افتادن)(٣)ئاوربەربوونەوە. (سرایت)
بەربەت: [ناو]ئامرازێکی مۆسیقایە؛ عوود. (بربط؛عود)

+ بەربەڕ: [ناو]قەومێکی دوا کەوتوو لە شارسانییەت لەباکووری ئەفریقا. (ب) وەحشی و بێفەرهەنگ. (بربر)
بەربەرۆژگ: [ناوت]بەربەرۆچکە؛ شوێنی-بەرهەتاو؛ خۆرگر. (روبەآفتاب)
بەر بەروو: [ناو]بەر بەرۆک. (یقە)
بەربەرەڵا: [ئاوەڵناو]پێش نەگیراو؛ بەرئاواڵە. (ب) بێخاوەن. (آزاد. بیمانع)
بەربەری: [ناو] (١) دوژمنایەتی. (دشمنی(٢) چاولێکەری. (هم چشمی)
بەڕبەڕی: [ناو]جۆرێ کولێرەی درێژ و قەوی. (نان بربری)
بەربەزە: تاڵان کردنی ماڵێ دوژمنان. (غارت مال دشمنان)
بەربەسەر: بەربەژوورقە؛ بەرەوبان؛ سەرەو ژوور. (روبەبالا)
بەربەسکردن: [چاوگەت](١) پێشگرتن؛ بەربەست کردن. (مانع شدن) (٢) هەڵکێشانی بەن لە زاخاودا بۆ مانەوە و بەردەوامی ڕەنگ. (نخ را در مواد فرو کردن برای دوام رنگ)
بەربەگوار: [ناو]ئاژەڵێک کە گوشتێکی زیادیی وەک گوڵنیگ لە بەر ملیدایە. (گوسفندی کەگردنش گوشتی گوشوارەمانند دارد)
بەربەڵاکردن: [چاوگەت]بەلاگێڕکردن؛ بە قوربان کردن. (قربان و صدقەرفتن)
بەربەند: [ناوت](١) سەد؛ بەنداو؛ لەمپەر؛ ئاوبەند؛ (سد) (٢)ژێرچەنە؛ خشڵی ژێر چەناکەی ژنان. (زیور زنانە)
بە ڕبە نەپێوان: پۆیتەپێنەدان؛ بایەخ پێنەدان؛

به چ نه‌گرتن. (اهمیت ندادن)
به‌ربه‌هه‌ڤ: [به‌ند+ ئاوه‌ڵناو]به‌رانبه‌ر؛ رووبه‌ڕوو. (روبرو)
به‌ربه‌یار: [ناو] بووره؛ وه‌ک چاندنی گه‌نم له‌ زه‌ویی نه‌کێڵراودا.(زمین‌شخم نشده)
به‌ربێر: [ناو]شوان. (چوپان)
به‌ربێژ: (۱)[ناو] پێش وتار و سه‌ره‌کی؛ (دیباچه) (۲) [ئاوه‌ڵناو] زۆربلێ؛ فره‌وێژ؛ چه‌نه‌ درێژ؛ درێژ دادڕ؛ پڕبێژ. (پر حرف)(۳) [ناوی- بک] مزگینی‌ده‌ر؛ موژده‌هێنه‌ر.(مژده‌آور.)
به‌ربیست: سه‌ره‌تای‌لاوی؛ ته‌مه‌ن له‌ بیست ساڵ که‌متر. له‌ هاوتای(تین ئیجێر)ی ئینگلیزی وه‌رگیراوه. (کمتر از بیست سالگی)
به‌ربێنده: [ناو]به‌ربێن؛ به‌ن‌که‌ڵه‌وه.(نخ چنبر گاو)
به‌رپابوون: [چاوگه،ت]ڕوو دان؛ قه‌ومان؛ دروست بوون؛ ساز بوون. (شه‌ڕ به‌رپابوو؛ شه‌ڕ هه‌ڵسا؛ شه‌ڕهه‌لایسا. (برپا شدن)
به‌رپاڵ:[ناو]قه‌دپاڵ؛داوێنی‌کێو.(دامنه‌ی کوه)
به‌رپان: [ئاوه‌ڵناو] به‌رین؛ دووبه‌ر؛ قوماشی‌که‌ به‌ری زۆر پان بێت. (برپهن)
به‌رپشت: [ناو]کورتانی سه‌ر پشتی کۆڵ هه‌ڵگر. (پالان حمالی)
به‌رپرسییه‌تی:حاڵه‌تی‌ده‌روه‌ست‌بوون. (ب) ڕموتی سه‌رۆکایه‌تی. (حالت مسئولیت)
به‌رپشین: [چاوگه،ت]به‌رپشێن؛ تووچاندن؛ توو وه‌شاندن. تۆڤ‌هاوێتنا په‌رێزی. (تخم پاشی)
به‌رپۆز: به‌رلووت؛ به‌رانبه‌ر؛ به‌رده‌م. (در برابر؛ جلو دماغ)

به‌رپه‌رچ‌دانه‌وه: [چاوگه،ت](۱) قسه لێبڕین و جواب دانه‌وه.(صحبت‌قطع کردن)(۲) به‌رانبڕدانه‌وه.(راه‌سدکردن)
به‌رپێش کرن:[چاوگه،ت]پێشکه شکردن. (پیشکش کردن)
به‌رپێن: [ناو]پاشقول؛ پێ وه‌به‌ر پێ‌دان. (لنگ)
به‌رپێوار: [ئاوه‌ڵناو] گوم؛ نادیار؛ بزر. (گم)
به‌رتا:به‌ره‌تا: [ناو،ت]گه‌نه تا؛ سووکه ته‌ب و له‌رزی پێش نۆبه‌تێ. (پیش تب)
به‌رتاسه: [ئاوه‌ڵناو] به‌تاسه؛ ئاره‌زوودار. (آرزومند)
به‌رتاشت: [ناو،ت]به‌رچاشت؛ به‌رتێشت؛ به‌رچا؛ به‌رقه‌نده؛ نانی به‌یانی؛ به‌رقلیان؛ ناشتایی. (صبحانه)
به‌رتر: [به‌ند]پێشتر؛ له‌مه‌وبه‌ر؛ به‌ر له‌ ئیستا. (قبلا؛پیشتر)
به‌رتل: [ناو]مته؛میته؛ میچکه؛ هه‌ر شت که‌ له‌ هه‌ڵماتێندا داده‌کرێ بۆ یاریی مێشێن. (نشانه‌برای تیله‌بازی)
به‌رته‌ر: [به‌ند]به‌رتر؛ پێشتر؛ له‌مه‌وبه‌ر. (قبلاً)
به‌رته‌سک: [ئاوه‌ڵناو] که‌م پانایی؛ به‌رته‌نگ- ؛کۆلانی به‌رته‌سک: باریک؛ قوماشی به‌رته‌سک: که‌م به‌ر. (کم عرض)
به‌رته‌ق: بارته‌قا؛ به‌قه‌د؛ هێنده‌ی؛ ئه‌ونده‌ی. (اینقدر)
به‌رته‌لان: (۱)(به‌ر تاشه به‌ردان،(ته‌ل: به‌رزایی). به‌ر واتا: (سا، ژێر، بن، پاڵ؛ په‌نا). په‌نای به‌رد. (سایه؛ پناه سنگ) (۲) به‌ر ڕه‌وه‌زی به‌رز؛ به‌ر به‌ردی قیت و قووچی

سەرکێوان. (پای‌دیوارەی سنگی)
بەرتەنگ: [ئاوەڵناو]١) تەسک؛ بەرتەسک؛ کۆڵانی بەرتەنگ: کۆڵانی باریک. (تنگ)
(٢)[ناو] بەر تەنگە؛ قایشی ژێرسینگی ولاخ کاتێک کە زین دەکرێت. (تنگەزین)
بەرتەونانە: [ناو]گۆرانی تایبەت لە کاتی تەون کردندا. (آواز مخصوص فرش بافتن)
بەرتیل‌خواردن: [چاوگە،ت]ڕێشوەت وەرگرتن. (رشوەگرفتن)
بەرتیلخۆر: [ناو،بک] وەلیقەتخۆر؛ ڕیشوەتخۆر. (مرتشی)
بەرتیل‌کردن: [چاوگە،ت](ب) پارە و ماڵ لێ‌کێشانەوە؛ موفتەخۆری و لەسەرسکی کەسێک لەوەڕان. (سر کیسەکردن)
بەرجا: [بەند]بێجگەلە؛ جگە؛ جگەلە؛ با بمێنێ. (بجز؛ بماند)
+ بەرجل: [ئاوەڵناو] بەرچاوتەنگ. (تنگ‌نظر)
بەرجڵانەکێ: [ناو]جوڵانێ؛ هەلۆرتک. (تاببازی)
بەرجلیێتی: بەرچاوتەنگی؛ ڕژدی؛ چکووسی. (تنگ نظری)
بەرجەستە: [ئاوەڵناو] (١) هەڵکەوتە؛ مومتاز. (٢) قوت؛ بەرز؛ زۆپ. (برجستە)
بەرجەوەنگ: [ناو]بەرجەوەن؛ ڕوانگە؛ دیمەن؛ بەرچاو. (منظرە)
بەرجێ: [بەند]بەرجێ؛ بەرجا؛ بێجگەلە؛ جگەلە؛ بابوەستێ. (بماند؛ بجز)
بەرجیس: [ناو]ناوی ئەستێرەی موشتەری. (ستارەمشتری)
بەرجینک: [ناو]بەرچیغ؛ ئەستوندەکی چیغی - مەڕو ماڵات. (دیرک چادر)
بەرچاو تاریک‌بوون: [چاوگە،ت](١) (ب) زۆر تووڕە بوون و ئاگا لە خۆ بڕان لە تووڕەییدا. (خیلی عصبانی شدن)(٢) هیچ نەدیتن لە بەر بیستنی خەبەری ناخۆش و دڵتەزێن. (جلو چشم تاریک شدن)
بەرچاوتێر: [ئاوەڵناو] دڵ‌ئاوا؛ دەستو دڵباز؛ دژی چکووس. (مستغنی)
بە رچاوتێری: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە]دڵ‌فراوانی؛ دڵ‌ئاوایی. (استغنا)
بەر چاو و دەم کەوتن: (ب) بەچاوی پیسەوە-بوون؛ پێکران بەچاوی پیس. (چشم زخم خوردن)
بەرچچاک: [ناو]تریان؛ بەرچنۆک؛ بەرچن؛ بەرچنە؛ قەرتاڵەی میوەچنین. (سبد میوەچیدن)
بەرچۆ:کارێکی دژوار کە هەموو کەس بۆی نەکرێ. (کارسختی کەاز همەبرنیاید)
بەرچوکنان: [چاوگە،ت] ژێرچۆکنان؛ زەوت‌کردن؛ داگیرکردن. (غضب کردن)
بەرچوڵەمە: [ناو]بەر چێڵە؛ پێستی‌شۆڕەوە بووی ژێر ملی گا. (پوست زیر گردن گاو)
+ بەرچەپ: [ئاوەڵناو+ناو،ت] مێملێ؛ دژ. (آفت)
+ بەرچەق: [ناو]دەستە خنجێر و شمشێر؛مشتووک.(دستەخنجر و شمشیر)
بەرچەنگ: بەردەست. (جلو دست)
بەرچیت:>پەردە؛ پەردەی جیا کردنەوەی خانوو یان ڕەشماڵ‌کە پیاوان لەژنان

جیادەکاتەوە. (حائل؛ پردەمیان چادر)
بەرچیچک: [ناو]نزگەرە. (سکسکە)
بەرحوزور: [بەند] لەبەرانبەر و لە خزمەتا؛ لەخزمەت دا؛ لە حوزووردا؛ لە ڕووبەڕوودا. (درحضور)
بەرحەق: [ئاوەڵناو] حەقبەدەست؛ حەقدار؛ لە سەرحەق؛ حەق؛ ڕاست. (برحق)
بەرحەلینگ: [ناو]بۆتە؛ بۆتەی بەردین؛ دەفری تاوندنەوەی کانزا. (بوتە)
بەرخ ئاهو: [ناو]کار مامز. (برەآهو)
بەرخدان: [ناو]پزدان.منداڵدانی مەڕ.(رحم-گوسفند)
بەرخستن: [چاوگە،ت] (۱) وە پێش خستن بۆ ڕێز لێگرتن. (جلو انداختن)(۲) نان خستنە بەر سەگ. (نان پرت کردن جلو سگ) (۳) بەر هاویشتنی تۆڵدار. (بچەانداختن)
بەرخستن: [ناو] نەخۆشینی بەرخستن، تایبەتی ئاژاڵە کە بۆ ئینسانیش گیرۆی هەیە بە ناوی (یاوی ماڵت)؛ ناوی عیلمیەکەی(برو سلۆز)ە. (تب مالت)
بەرخ خنکێنە: [ناو]گیایێکی (نووسەک و چەسپانە) لە مێرگدا دەڕوێ. (نوعی گیاەچسپناک)
بەرخوار: [ئاوەڵناو] پێش چەوت؛ زەوی-لارەولار و ناڕێک؛ قوماشێ کە لار ببڕ درێ. (کج)
بەرخواردن: (۱) تووشبوون؛ گەیشتنە یەک. (بهم رسیدن) (۲) گران هاتن؛ پێم بەری خوارد(برخوردن) (۳) بەرخواردن: لە سەمەر و (بەر) خواردن. (از بهره خوردن)
بەرخسوەدان: سەرنجدان؛ تماشاکردن؛ ڕوو تێکردن؛ بەراخوەدان. (نظر کردن)
بەرخوەر: بەرخۆر؛ (۱) کەڵک؛ سوود؛ مفا. (مفید) (۲) لە سەمەرخۆر؛ بەرهەم خۆر. داهاتخۆر. (از بهره خور) (۳)گرانهاتن؛ قسە یا هەر شت کە دەبێتە هۆی سوکایەتی و تەوهین (برخواردن). (برخوردن)(۴) بەر ڕۆژ. (رو بەآفتاب)
بەرخە بەران:[ناو،ت]کاوڕبەران؛ کاوڕی نێر. (برەنر)
بەرخەفج: مۆتەکە؛ بەرخەفچ؛ سەنگ سوار بوون لە خەودا. (کابووس)
بەرخەکەم: (۱) بەرخەکەی من.(۲) شو بهاندنی منداڵ یا کیژۆڵە بە بەرخ.(هەی لاوە لاوە بەرخەکەم لاوە). فۆلکلۆڕ. (برەکوچک)
بەرخەلەوان: [ناو،ت]شوانیبەرخەل. (چوپان-برە)
بەرخەمێ: [ناو،ت]وەرەما؛ بەرخی مێ. (برەمادە)
بەرخەنێر: [ناو،ت]وەرەنێر؛ بەرخەبەران. (برەنر)
بەرخەساوا: [ناو،ت] ئەملک؛ بەرخی تازە زاو. (برەنوزاد)
بەرداسی: [ناو] دەغلێککاتی دروێنەی هاتبێت. (مزرعەغلات رسیدەبرای درو)
بەر داسنەکەوتن: دەغڵی کەم باڵا کە بە داس نەدروێتەوە. (دم داس نیافتادن)
+ بەردان: (۱) وەختی دەست لێک بەردان و جیا بوونەوە. (جدا شدن)(۲) ئازاد کردن. (رها کردن)(۳)بەر دان: سەمەر و فایدە دان. (بهره

دادن)(۴) وەبــەر دان؛ دارەکــەی بــەردە: وەبەردە با نەکەوێت. (حایل کـردن) (۵) وە- بەردان:کردن بەژێرسـەیـارەوە. (زیرگـرفتن)
بەردانک: بەردامـێن؛ دانـگ: دانـک: دامـین، خواروو؛ دانگی چیا: داوێنی چیا. (دامنە)
+ بەردانەوە: [چاوگە،ت](۱) با لـە کونێکـەوە بەتاڵ کردن؛ بای تـەگـەری سـەیارەکـەی بەرداوە. (خالی کردن)(۲) خلارکردنەوەی لـە سەر بۆ خـوار؛ تۆپـەکـەی بـەرداوە: خـلاری کردەوە؛ کەوتنەخوار؛ بەربوونەوە؛ ئاولە شێلە- گــە داخســتن وبــەردانــەوە. (پــائین انـداختن)(۳)بـۆن‌بـەردانـەوە: بڵاوکردنـەوە . (پخشکردن)
بەرداوەتی: [ناو]گۆرانی داوەت. (آواز عروسی)
بــەردایــی: [نــاو] (۱) بــەردەڵــان؛ پڕلەبەرد.(سنگلاخ) (۲) بـەربـووگ؛ ڕهـابوو؛ بەرەڵابووگ؛ بەرداو؛ وێڵ‌کراو. (رهاشدە)
بەرد بـاران: [نـاو]بـەرد بـە سـەردا بارانـدن؛ سـەنگـەسـار؛چەشـنـێ سـزای شـەرعییـە. (سنگسار)
+ بەردبڕ: [ئاوەڵناو+ناو] (۱)هەر شت توانـای بڕینـی‌بـەردی هـەبێـت. (۲) کـەرەسـتەی بەردبڕین.(۳)کەسێک کەکـاری بـەرد بڕینـە. (سنگ بر)
بەردبڕی: (۱)[ناو] کاری بەرد بڕین و بەردبڕ. (۲) توانــایی بڕینــی بــەرد. (۳) کارخانــەی بڕینی بەرد(۴) مەتە و کەرەستەی بەردبـڕی؛ مەتەی بەرد بڕین.(سنگ بری)
بـەرد بژێـر: (۱) ئـەونیسـکە بـەرد بژێرکـە؛ بەردەکەی جیا کەوە. (جدا کردن سنگ)
(۲) زەویـەکـەی بـەردبژێـر کـردوە و پـاکی کردوە تەوە لەبەرد. (چیدن سنگ زمـین) (۳) کاری بەرد بژێرکردن. (کارجداکردن‌سنگ)
بەرد بەردانێ: [ناو](۱) قـەمچـێن؛ بـازەڵـێن. (بازی‌با سنگ؛یک قول‌دو قول)
(۲) بەرد بەسەر بەردەوە بەند نەبوون: هیچ بەسەر هیچەوە نەمان. (ب) وێرانبـوون؛ کاول بوون.(سنگ‌روی‌سنگ بند نبودن)
بەردتاواندنەوە: (ب) کەسێک توانای خواردنی هەموو خۆراکێکی ببێت و گرفتی پـێ‌نـەکـا. (سنگ هضم کردن)
بەردخستنە بەرپا: چـەت خسـتنە کاریٚ؛بـە- رگری لـە ئـەنجـامی کـاریٚ؛ بـەرهـەڵسـت دروستکردن بۆ ئەنجـامی کارێـک. (سـنگ جلو پا انداختن)
بەر دڕ: [ناو] جل و بەرگێک کە بۆ پێشگیری لە دڕانی لێباسی‌چاک لە بەردەکرێت؛ جـل و بەرگی‌کار.(لباس‌کار)
بەرد ڕێژ: [ناو]سەنگ‌فەڕش؛ داپۆشینی زەوی یا شەقام بە بەرد؛ بانوان. (سنگ فرش)
بەردڕێژکردن: [جاوگە،ت]جێگاییێک بە بـەرد داپۆشین وەک سەنگ‌فەرش . (سنگ فـرش کردن)
بەردشکێن: [ئاوەڵناو+ ناوی‌بک](۱) پیـک یـا هەر شت کە بەرد بشکێنی. (۲) کەسێک کە بەرد دەشـکێنی. (۳) (ب)کـەسـێک‌کـەبـەرد ڕێک دەکـات بـۆ کـاری سـاختومان‌سـازی. (سنگ شکن)
بەردکردنە ئاو: (ب) ڕوحم و بەزەیی ڕاکێشان بەلای خۆدا. (کنایی، رحم وشـفقت کسـی را

برانگیختن)
بەردکوڵاندن: [چاوگە،ت](ب) کاری بیٚ سوود و موفا کردن.(کنایی،کار بیهوده)
+ بەردڵ: تیکەییٚکم لە و بیسکویتە خوارد بەردڵیٚ گرتم؛ لە ئیشتیا کەوتم. (رفع گرسنگی)
بەردلک: [ئاوەڵناو] ئۆفلاز؛ نازەنین؛ خۆشەویست. (محبوب)
بەرد لە ئەژنۆ دان: [چاوگە،ت] (ب) پەشیمانی لە کار و کردموە.(سنگ‌بەزانو زدن)
بەرد لەسەردانان: [چاوگە،ت](ب) دیزەبەدەرخۆنە؛ شاردنەوە و لە بیر بردنەوە و باس نە کردنی مەبەستیٚک. (سرپوش گذاشتن)
بەرد لێبارین: [چاوگە،ت] (ب) تووشی بەڵا و موسیبەت بوون؛ بەردباران بوون؛ (کی تەفرەی داوی بەردی لێباریٚ) (فۆلکلۆڕ). (دچار مصیبت شدن سنگسار شدن)
بەردۆش: (١) تەکان‌دان. هەژاندن. (تکان دادن) (٢) بەرهەڵبێنە. (پیشبند)
بەردوولاقیٚ: [ناو]هەواو بەستەییٚکە، ژنان لە بەر خۆیانەوە، لەکاتی خوری‌ڕستن و ڕایەخ چێکردندا دەیڵێن؛ بە شێوەی بەرتەونانە. (آهنگی است)
+ بەردۆڵیان: [ناو]بەرئاویٚ کە لە دۆڵیانی ئاشەوە دیٚت و لە ژیٚر پەرەی ئاشەوە دەرژیٚتەدەرەوە. (آبیکەاز آسیاب بیرون میر یزد)
بەردوئەسی: [ناو،ت]ئەستیٚوبەرد بەردوچەخماخ. (قطعەآهن و سنگ آتش زنە)
بەردوو: [ناو،ت] بەر دووگ؛ شوێنی بیٚ مووی ژیٚر دووگ. (زیر دنبە)
بەردووگ: [ناو،ت] ئەو جیٚگا لە دووگ کە بە ڕانی مەڕەوە دەنووسیٚت و مووی نییە. (جای بی موی دنبە)
بەردە: (١) ئەو تاپۆ بەردە، ئاسن نییە؛ (سنگ است) (٢) شو بهاندن بە بەرد؛ ڕەقە دەڵیٚی بەردە. (مانندسنگ‌است) (٣) ڕهای کە؛ بەریدە. (دەبڕو بەرۆکم بەردە). (رها کردن) (۴) بیدە دەمی؛ وەبەریدە: جارەکە شیٚو کە بوورەیشی بەردە واتا وەبەریدە. (اضافەکن) (۵) دارە کە بەری زۆرە کۆڵەکەی بەردە، کۆڵەکەی وەبەردە؛ (حایل کردن) (۶) کویلە؛ خوڵام. (بردە)
بەردەئاش: [ناو،ت]بەرد ئاسیاو؛ بەردیٚکی سەخت و ڕەقە و (سیلیسیە) دەی‌تاشن و دەیکەن بە هارە بۆ هاڕینی دانەوێڵە؛ هارەی ئاش. (سنگ آسیاب)
بەردەبیٚل: [ناو]مەڕی سیٚساڵە.(گوسفندسەسالە)
بەردە خویٚ: [ناو](١) بەردیٚکە پان کە خویٚ دەکەن بەسەریدا بۆ ئاژاڵ. (سنگ نمک پاشیدن برای حیوانات) (٢) بەردی خوێڵێن؛ بەردی خویٚ کە لە (سۆدیۆم و کولۆڕ) چیٚ بووە؛ خوێی مەعدەن(کانگا) کە وەک بەرد وایە. (سنگ نمک)
بەردەخوین: بەردی‌خوێن: [ناو]جۆریٚک بەردە.(حجرالدم.سنگ خون)
بەردەرکانە: [ناو]پارەییٚک کە لە زاوا وەردەگیریٚ تا درگای ماڵی بووکی لیٚبکەنەوە.(پول‌گرفتن ازداماد جلو خانەعروس).

بەردەزوورک: [ناو]بەردەزووره؛ بەردەزبره؛ بەردێکە لە هەسان زبرترە بۆ تیژکردنی دەمەتیخ. (سنگ خارا)
بەردەسپیلە: [ناو]بەردەچەرمەڵە. (سنگ سفید)
بەردەستک: [ناو]دستە کەوشە؛دەستەندوو؛ دەستەمشتە؛ جێگای دەست پێوەگرتن لە سەرباسکێش لە شێو برین‌دا. (جای دست گرفتن در خیش)
بەردەسماتە: [ناو]بەردەماتە؛ بەردی جەهەندم؛ هەسان؛ بەردی تێخ تیژکردن. (فسان)
بەردەسمبادە: [ناو] بەردەچخماخ کە بە قاڵب و چەسب دەبێتە تەختە بەردێکی ناسک و بە جەغر دەیبڕنەوە بۆ سەر مەکینەی سومبادە بۆ ساوینی کانزا و شتی دی. (سنگ سمبادە)
بەردەسووری: تیرەیێکی کوردن لە ئێران، لە مەحاڵی بەردەسوور. (اسم طایفەایست)
بەردەسەبر: [ناو]بەردێکی ئەفسانەیی کەقسەی بۆ دەگێڕنەوە هەتا دە-قەڵشێ.(سنگ‌صبور)
بەردەفڕکێ: [ناو](۱)بەردخستن بۆنیشانە یان بویەکترین؛ بەرد هاویشتنی زۆر. (بهم سنگ اندازی کردن) (۲) بەرد فڕێدانی لەسەریەک. (سنگ اندازی پیاپی)
بە ردە فرۆشی: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە]کاری فرۆشتنی کۆیلە. (بردەفروشی)
بەردەڤ: [ناو] دەمڕاست؛ نوێنەر؛ قسەزان. (سخنگو؛ نماینده)
+بەردەڤک: (۱)هاودەم؛ هاوڕاز. (همدم) (۲) موننە؛ مودنە؛ دەمنە.(چوب سیگار)(۳)لەلایە-ن کەسێکی‌ترەوە ئاخافتن و دووان.(سخنگو بجای‌کسی)(۴)سەربار؛ موزاحیم. (مزاحم)
بەردەڤکر: [ناو] قلیاندار. (قلياندار)
بەردەقسلێ: [ناو،ت]بەردێک‌کە لە ناو ئاوری بەتین‌دا دەبێتە قسلێ؛ بەردەئاهەک. (سنگ آهک)
بەردەکۆڵەکە: [ناو،ت]بەردی پانی ژێر کۆڵەکە؛ بەردی ژێر وێستوون. (سنگ زیر ستون)
بەردەگونجە: [ناو،ت]بەردێکی‌کونە دەیکەنە گونجەی حەوز و ئەستێر. (سنگ آبرفت)
بەردەگێچ: [ناو،ت]بەردێ کە بە گەرما پێدان لە کوورە دا دبێتە گەچ (گێچ). (سنگ گچ)
بەردەمانگ: [ناو]جۆرێک بەردی‌بە-نرخە.(سنگ‌قمر،حجرالقمر)
بەردەمۆرە: [ناو]خشتێکی چکۆلانەیە کە لە مەزهەبی شیعەدا وا ڕەسمە بۆ موبارەکی لە سوجدەی نوێژدا نێوچاوان دەنێنە سەری. (مهر نماز)
بەردەمووکە: [ناو]دەمامک؛ نیقاب؛ دەمۆکانە؛ دەمکانە؛ دەم و لووت پێچ. (صورتک،نقاب)
بەردەمەڕمەڕ: [ناو](۱) بەردێکی جوان و ڕەنگاوڕەنگ بۆ نومای‌بینا بەکەڵکدێ. (۲) بەردێ کە هەڵماتی لێ‌چێ‌دەکەن. (سنگ مرمر)
بەردەنسگ: [ناوی بەر]بیسەر؛گوێگر. (مخاطب)
بەردەنما: [ناو]بەردەنوێژ. (سنگ نماز)

بەردەنووس: [ناو](۱) لەوحی بەردین. (۲)نوسراوەی سەربەرد. (سنگ نوشته)
بەردەوام: [بەند] بێبڕانەوە؛ هەمیشە؛ دایم؛ بێبڕانەوە. (مدام)
بەردهەڵکەن: [ناوی‌بک]کەسێک‌که لەکان (مه عده ن) بەرد هەڵدەکەنی؛ بەردهەلقەن. (کسی کەکارش در آوردن سنگ از کان است)
بەردەیی: [بەرهەمی چاوگە]حاڵەتی بەردەبوون؛ کۆیلەتی؛ خولامی. (بردگی)
بەردی‌پا: [ناو]سەنگی‌پا؛ بەردێکی (سیلیسیه)ڕەش و ناو کفەڵە بۆ شۆردنی‌ژێر پێ بەکاری دێنن لە گەرماودا. (سنگپا)
بەردی‌ترازو: [ناو]سەنگی‌ترازو؛ بەردی ئایەرە بۆ کێشان. (سنگ ترازو)
بەردی‌چەخماخ: [ناو]بەردێکی ڕەقە لە جنسی سیلیس که لە یەک بدرێن ئاوریان لێدەبێتەوە و بۆ چێکردنی کاغەزپەرداخ کەڵکی‌لی‌وەردەگرن؛ بەردەسی. (سنگ چخماخ)
بەردی سارد و گەرم وەبەر ڕێ‌هاتن: (ب) تووشی بەڵا و موسیبەت هاتن؛ (کنایی ،دچار مصیبت و بلا شدن)
بەردی سەرمەڵۆ:کاتی‌گیا و دڕک و داڵ دووروا دەیکەنە مەڵۆ و بەردیکی لە سەر دادەنین که با نەیبا؛(ب) ئاماژەیە بو بەڵێنی سەرزارەکی؛ بەو قەرارە دەڵێن کە خوازبینیێکی سەرزارەکی لەکچی‌بکری وجوابی ئەرێنیێکی سەرزارەکی وەرگیرابێت. (پیمان معاملەنامحکم و آبکی)

بەردی قەبر: [ناو](۱) بەردێک‌کە لە سەر گوریچەی قەبر دادەنرێت؛ بەردی- ئەلحەد.(سنگ‌الحد)(۲)کێل.(سنگ- گور)بەردی کفتە: [ناو] لەڕا بووردوودا بەردێ بوو کەگۆشتیان لە سەر دەکوتا بۆ کەبابی لوول و کفتە. (سنگ گوشت کوب)
بەردی کومرێ: [ناو]بەردی ڕەژی؛ سەنگەزوخاڵ؛(کومور):تورکییە. (ذغال سنگ)
بەردی گورچیلە: [ناو]بەردێ کە لە ناو گورچیلەدا چێدەبێت و ئیمڕۆژە بە تیشکی لەیزیڕ چارەسەری دەکەن. (سنگ کلیه)
بەردی‌گێچ: [ناو]بەردەگەچ؛ بەردێک کە لە ناو کوورەی گەرمدا دا دەبێتە گەچ. (سنگ گچ)
بەردێلک: [ئاوەڵناو]هاونرخ؛ هاوتا؛ هاوشان. (هم‌شأن)
بەردێلی: [ناو](۱) ژن بە ژن. (زن درمقابل زن) (۲) گۆڕینەوەی شت بە شت. (معاملەی تهاتری)
بەردی مەحەک: [ناو]بەردێکی ڕەق و ڕەشە که لە تیژاودا ناتوویتەوە و بۆ دیاری کردنی ڕادەی زێڕی خالێس لە لیرە یا شتی زێڕین‌دا بەکاردێ. (سنگ محک)
بەردی مەسانە: [ناو]بەردێک کە لە بەر میزەڵدان‌دا دروست‌دەبێت و زۆر بە ئێش و ئازارە، جارجار دەخزێ و لەگەڵ میزدا دێتەدەر و جاریش هەیە کە بە دەرمان یا نەشتەرکاری یا تیشکی لەیزێڕ مالێجەدەبێت. (سنگ مثانه)
بەر ڕادان: (۱)[چاوگە،ت] بەر پێش ماڵین یا

پاک کردنەوە بە گسک یا بە بێل ڕادان. (جلو جاروب کردن)(٢) کایە و یاری. (بازی کردن) (٣) دۆڕاندن لەکایەدا. (باختن)
بەرڕەتخستن: وەگیرخستن. (گیرآوردن)
+ بەرزاخوڕ: [ئاوەڵناو] ولاغێ کە بە ئالفی خۆش فێر بووبێت و ئالفی ناخۆش نەخوات. (ب)ئینسانی بەفیز. (اسب و استری کەعادت بەعلف خوش خوراک گرفته؛ متکبر)
+ بەرزان: (١)بەرزەکان؛ (بلندیها) (٢)بارزان؛ مەڵبەندێکە لە بەین زێبار و ڕەواندزدا کە عەشیرەی بارزان لە و مەڵبەندەدان (سرزمین وعشیره بارزان)
بەرزاو: [ناو]بەراو؛ زەناو. (زمین آبی)
بەرزاو: [ناو]هاتنە سەرەوەی ئاوی زەریا بە هۆی بارودۆخی مانگەوە؛ دژی (نیشتاو یا ئاوجەڕ). (مد)
بەرزپەڕین: [چاوگە،ت](١) هەڵخستنەوە؛ زۆر خۆ حەوادان.(پریدن بلند)(ب٢)حاڵەتی لووت-بەرزی و بە هیوای گەیشتن بە پلەوپایەی بەرز. (بلند پروازی) (٣) هەڵفڕینی مەل بە ئاسمان‌دا و زۆر بلیند بوونەوەی. (پرواز بلند)
بەرزگ: [ناو،ت](١) خوارووی زگ. (پائین شکم) (٢) پێستی ژێر زگی حەیوان. (پوسته-زیرشکم حیوانات)
بەرزواج: [ناو]بەرزوێژ؛ بڵیندگۆ؛توندبێژ. (بلندگو)
بەرزۆخە: [ناو]بەرزۆڵە؛ منارە. (مناره)
بەرزۆڵە: [ناو]بەرزوخە؛ منارە. (مناره)
بەرزە بڵێسە: [ناو](١) ئاورێک کە بڵێسەی زۆر بە حەوادا بچێ. (آتش شعلەبلند) (٢) [ئاوەڵناو]چەنەباز؛ زۆربڵێ؛ هەڵەوەڕ (حراف)
بەرزەبوون: [چاوگە،ت]گومبوون؛ بزڕبوون؛ زایەبوون.(گم شدن)
بەرزەپێ: تەواو ڕاستبوونەوە و لە بەر هەڵسان. (تمام‌قد جلو پای‌کسی بلند شدن)
+ بەرزەحەیوان: [ناو،ت]ولاغی‌بەرزە؛ یەک-سم؛ ئەسب، ئێستر، و کەر.(مال سواری و باری)
بەرزەخ: [ناو](١) بەرزەق؛ ماوەی سنووری جەهەندم تا بە بەهەشت گەیشتن. (برزخ) (٢) [ئاوەڵناو] تووڕە. (عصبانی)
بەرزەفت‌کردن: [چاوگە،ت]سەرڕێگا لێگرتن؛ پێش پێ‌گرتن. (جلوگیری کردن)
بەرزەفڕ: [ئاوەڵناو] (١ب) بیر لە کاری‌گەورە دەکاتەوە و هیوای‌کردنی‌کاری گەورەی لە دڵدایە. (بلند پرواز)(٢)فڕندەیێک‌کە زۆر بڵیند هەڵدەفڕێت.(بلندپرواز)
بەرزەقانی [ناو]قۆچەقانی؛ قەڵماسک. (فلاخن)
بەرزەکرن: [چاوگە،ت] بەرزەکردن؛ بزرکردن؛ گومکردن؛ دۆڕاندن؛ زایەکردن. (گم کردن)
بەرزەکۆڵ: پڕکردنی دەفر لە شتی وەک دانەوێڵە ،زیاتر لە دارماڵ بە شێوەیێک‌کە لە سەرەوە قیت ببێتەوە. (زیادپرکردن غلەدر ظرف)
بەرزەکەوە: [ناو،ت] لقی داری بە لق و پۆپ بۆ چێکردنی پەرژین؛ لقی بەرزی سەوز. (چوپ با شاخەو برگ)
بەرزەلنگ: [ناو،ت]زەنگوڵەگیا؛ گیایێکە دژی کرمی ڕیخۆڵە و تەوژمی‌خوێنە. (یوشن؛

ورک؛ درمنه)
بەرزەوکردن: [چاوگە،ت]هەڵگرتن و لە عەرز بڕین؛ بەرزکردنەوە. (ب) ژن و کچ هەڵگرتن(سازکردن). (بلند کردن)
بەرزەیی: [بەند] بەدزیەوە؛ شاراوە؛ نادیاری؛ پەنامەکی. (پنهانی)
بەرزیلە: [ناو] ئاتەک؛ شاقەل.(تریچ؛ تریز.)
بەرزیکان : ناوی دەسەڵاتداری کوردی شارەزوور کە ناوەندەکەی دینەوەر بوو (نام امارت شهر زور با مرکزیت دینور)
بەرزین: [ناو](١) قەڵتاخ؛ قاڵتاخ؛ قەرپوز؛ قەڵپۆز. (قالتاغ)(٢) جوانووی ئامادەی گرتن کە وختی زین‌کردنی هاتبێت. (اسب سەساله)
(٣) نەرمەزین؛ خلۆرتە. (نمد زین)
بەرژوور: [ناو،ت]سەرەوژوور؛ بەرەو ژوور؛ سەرەو ژووری. (سربالایی)
بەرژەند: [ناو]بەرژەوەند؛ ڕەچاوگرتن و بەراوەردی چەخش و بەهرە و داهات و سوود و قازانج و دەرفەتی بە موفا. (صلاح ومصلحت)
بەرژەوەند: [ناو]بەرژەند؛ ڕەچاو گرتنی (چەخش و بەهرە و قازانج و دەرفەت و موفا و هەل و ڕێکەوتی‌خێر). (براورد مصلحت و منفعت)
بەرژەوەندی: چەخشی؛ بەرژەندی؛ موفایی-خۆدیتن؛ ڕەچاوکردنی قازانج. (درراستای-مصلحت بودن)
بەرژەوەندی پەرست: سوود پەرەست؛ قازانج پەرەست. (مصلحت پرست)
بەرژێر: [ناو،ت]سەرەوخوار؛ بەرەو ژێر.
(سراشیب)
بەرستک: [ناو]بەرستۆ؛ بەرێخە؛ بەریەخە؛ (جلویقه)
بەرستۆک: [ناو]بەرسکوور؛ بەرۆک. (جلوسینه)
بەرسفکە: [ناو]هەیوان. (ایوان)
بەرسکوور: [ناو]بەرمل. (یقه)
بەرسم: [ناو]گەڵای دار؛ لە ئاویستایش‌دا هە-ربەو مانایە هاتووە.(برگ درخت)
بەرسمێڵ کردن: [چاوگە،ت]سمێڵ-کورتکردنەوە.(ب) ڕووکەم‌کردنەوە؛ ئازار و زەرەر پێگەیاندن. (کنایی؛ ضرر زدن؛روکم-کردن)
بەرسووچ: [ناو،بەر] بەرتاوان؛ تۆمەت لێدراو؛ تاوانبار. (متهم)
بەرسوورکە: [ناو]قالۆنچە؛ سوورکە؛ (سوسک قرمز)
بەرسیچکە: [ناو]نزگەرە. (سکسکه)
بەرسیسانی: [ناو]ئامرازی مشتومال‌کردن. (وسائل مشت و مال)
بەرسێلک: [ناو]تەندوور؛ تەندووری بەرد.(تندرسنگی)
بەرش: [ناو]بەنگ. (بنگ)
بەرشکستە: [ئاوەڵناو] نابووت؛ وەرشکستە؛ مافینگ. (ورشکسته)
بەرشۆ: دەرچێت. (فرارکند؛ بیرون شود)
بەرشۆ: [ناو]بەرشۆر؛ جلێ‌کە لەکاتی شیو وکوڵ‌دا دەیکەنە بەر. (لباس تعویضی برای کارشستشو)
بەرشە: [کاری ئەمری بو دووهەم کەسی

تاک]دەرچوٚ؛ دەرکەوە. (دررو)
بەرشەنوٚم: [ناو](دەرهاویشتن)جیاکردنەوە و جیاڕاگرتنیگیانداری نەخوٚش دوور و جیاواز لەساخ (لە بەر ئەوەی گیروٚدەی نەخوٚشی- نەبن). (قرنطینه)
بەرشیا: [بهووری لەچاوگەیبەرشین] دەرهات؛ دەکەوت.(بیرون آمد)
بەرشیان: [چاوگە]دەرهاتن؛ دەرکەوتن.(بیرون آمدن)
بەرشێڤ: [ناو]عەسروٚژە. (عصرانه)
بەرشین: [چاوگە]چوونەدەر؛ دەرچوون؛ جەحەد بەرشیەن: لەحەد دەرچووە. (بیرون شدن)
بەرغەبەبە: [ناو،ت](ف. گیو) بەرخەبەبە. (غبغب)
بەرغەموٚت: [ناو،ت]جوٚرێک میوەیە. (میوه ایست)
بەرفرمان: فرمانبەر؛ ئامادە بوٚ بەجێهێنانی فرمان.(حاضربه فرمان)
بەرفرە: [ئاوەڵناو] زوٚر؛ گەلێک؛ زەحف؛ بەرمشە؛ بەرفراوان؛ بەرپان. (زیاد؛ وسیع)
بەرفماڵ: [ناو] بەفرماڵ؛ وەورماڵ؛ وەروەرە؛ بەفرەلوٚ. (پاروی برف روبی)
+ بەرفەک: [ناو](١) ئەو بارستا سەهوٚڵە کە دیوارەی یەخچاڵ(سەلاجە) لە ناوەوە دەیگرێ. (٢) مەغشوش بوون و خەتخەت بوونی شاشەی تەلەویزیوٚن لەکاتی روٚشن بووندا.(٣) پەڵەی سپیایی(خوێ) دەردانیدیوار بە هوٚی تەڕەشوٚوە. (برفک)
بەرفەندە: [ناو]هەرەسی بەفر؛ شکانی کلیلە بەفر. (بهمن)
بەرفیماڵک: [ناو]بێڵی بەفرماڵین؛ وەروەرە. (پاروی برف روبی)
بەرڤان: شوان. (چوپان)
بەرڤانەک: [ناو]بەرهەڵبێنە؛ بەروانکەی منداڵ؛ بەرڤانک. (پیش بند)
بەرڤە: (١) قەد؛ دووتوٚ نووشتانەوە. (تا؛ لایە) (٢) بەربە؛ ڕووبە. (روبە)(٣) بەرەوە؛ پێش؛ پێشەوە. (روبەجلو)
بەرڤەکری: [ئاوەڵناو]گوشاد؛ بەرئاواڵە؛ بەرکراوە. (گشاد)
+ بەرق: فد: [ناو](١)کارەبا؛ (سێفاز، دوو فاز، یەک تەرەفە، دوو تەرەفە، ساکین) (٢) درەوشانەوە؛ بریقە؛ شەوق.(برق)
بەرقتین: [چاوگە،ت]قەڵشین؛ لەتبوون. (قطع شدن)
بەرقخستن: [چاوگە،ت](١) بریقەدان؛ بەرقخستنی هەور؛ هەورەتریشقەلێدان. (برق رعدوبرق) (٢) ساوینولووس کردن و بریقەدارکردن. (ب) زوٚر خاوین کردنەوەی سامانی ماڵ. (برق انداختن)
بەرقگر: فد: [ناویبک]تریشقەگر؛ برووسکەگر؛ میلەیێکلەکانزا لە سەرخانوو دەچەقێت و بە سیمێک بەعەرزەوە دەی- لکێنن کە باری کارەبایی بوٚ عەرز ڕابگوێزێت، هەروەها زنجیرێکە لە لوری و ترێلیی نەوت کێشدا لە پاشەوە لە عەرز دەخشی بوٚ ڕاگوێزانی باریکارەبایی بوٚ عەرز. (برق گیر)
بەرقگرتن: [چاوگە،ت]کارەبا کە کیانلە بە-

رێک دەگرێت بە هۆی هەورە تریشقە یان کەوتن لە سیمگەلی کارەبا. (برق گرفتن)

بەرق لێدان: (١) درەو شانەوە؛ بریقە خستن؛ بریقە دان. (٢) بە بەرق سەری کەچەڵ مالیجەکردن (کارەبا)(٣) بەر بروسکەی هەورەتریشقە کەوتن. (۴) بروسکە دانی هەورەتریشقە. (برق زدن)

بەرقەپ: [ئاوەڵناو]بەرقپ؛ داری پوواو؛ پڕتووکیاگ و نزیک بە قرپ بوون. (پوسیده)

بەرقەد: [ناو](١) ناوقەد؛ (کمر) (٢) قەدپاڵ. (کمر کش کوه)

بەرقەدێر: [ناوی،بک]پارێزەر. (محافظ)

بەرقەم: [ناو]جۆرێک ڕەنگی‌سوور.(رنگیست-سرخ)

بەرِک: [ناو]بەڕەی بچووک. (گلیم کوچک)

+ بەرکار: (١) ئەوەی کارێک بە سەریدا دێت (دژی کریار و بکەر) (مفعول) (٢) دانیشتن لە پای کارێک وەک جوڵایی و قاڵی چنین. (پای کار) (٣) بەردەست. (وردست)

بەرکردن: [چاوگە،ت](١) جل پۆشین؛ لەبەرکردن. (پوشیدن)(٢) بە مێشک سپاردنی نوو سراوە؛ ئەزبەرکردن: لەبەرکردن. (حفظ کردن)

بەرکردەی: [چاوگە]دەرکردن. (بیرون کردن)

بەرکزە: [ناو،]هاوردە؛ دژی دەرکزە. کاڵای توجاری کە دێتە ناو وڵاتێک. (واردات)

+ بەرکوت: [ناو،ت]لە ڕوی نیازەوە بەشێکی- کەم کلۆش گێرە دەکرێت بۆ ئەوەی گەنمەکەی زوو بگەیێنن‌بەئاش یا زوو بیفرۆشن. (قسمت کم. غلەکوبیدن)

بەرکوڕ: [ناو]جیقەڵدان؛ قیسک.کوڵ (چینە- دان)

بەرکۆز: [ناو،ت]جێگای تفاق پێدانی ئاژەڵ لە زستان‌دا.(جای علف دادن بەگوسفندان)

+ بەرکوزە: [ناو،ت]قەیتانێ بۆ داخستنی یەخەی‌کراس بەگرێدان؛ بەن‌یەخە. (بند یقە)

بەرکۆستە: [ناو]بەرکۆسەر؛ بن‌دیوار؛ پای- دیوار؛ سای‌دیوار. (پای دیوار)

بەرکۆسەچ: [ناو] پیاوی بێ‌ڕیش؛ پیاوی کۆسە؛ پیاوی‌ڕیش‌تەنک یا بێ‌ڕیش.(کوسە)

بەرکۆشک: [ناو،ت]بەربالەخانە؛ بەرهەیوانی باڵەخانە. (بالکن)

بەرکۆڤ: [ناو،ت]پنا بەرد؛ پاڵ بەردێ کە پەنا و پەسیوبێت. (درپناەسنگ)

بەرکۆڵ: [ناو]شتی نەرم بۆ سەرپشت کە بار ئازاری نەدا. (روپشتی زیر بار)

+ بەرکوڵ‌کردن: [چاوگە،ت](ب) خواردنی کەمێک خۆراک پێش نەهار و شام؛ زۆر برسیم نییە بەرکولێکم کردوە. (چند لقمەخوردن قبل از حاضر شدن غذا)

بەرکە: (١)[ناو] چوار بەرکەی قورسی؛ چوار لاشانی قورسی کە زستانان دایان دەنا. (بغل کرسی؛ اطراف کرسی) (٢) لابکەوە. (تو گیانی کاکەت بەرکە بەم لاوە). «فۆلکلۆڕ» (برگرد ونگاەکن)

بەرکەردەی: [چاوگە]دەرکردن. (بیرون کردن)

بەرکەشۆک: [ناو]کەشەفی چکۆلانە. (سینی- کوچک)

بەرکەفتن: [چاوگە،ت](١) بەرکەوتن؛

بەرخستنی ئاژەل. (بچەانداختن، افتادن)
(٢)بەرکەوتن: لە پێش کەسێکەوە ڕۆیشتن. (جلو افتادن) (٣) بەش پێبڕان لە بەش-کردن‌دا. (قسمت شدن) (٤) پێکران: ئەنگێوران؛ وە بەر گوللەکەفتن. (اصابت کردن) (٥) دابڕان: حەوشەکەمان بەرخیابان کەوت.(جزوشدن)

بەرکەف: هەل؛ دەرفەت: (فرصت)

بەرکەنار: (١) قەرەنەکەوتوو؛ لە کەنارەوە؛ لە ڕەخەوە؛ (برکنار) (٢) جیا؛ بیجگە؛ بەرجیا؛ بەرجێ؛ (بجز) (٣) دەرکراو لەکار؛ لابراو؛ وەلانراو. (رانده‌شده)(٤) خانەنشین؛ کارکەنار. (باز نشسته)

بەرکەناری:(١) دوورکەوتویی؛ (فاصله‌گرفتن) (٢) حاڵەتی وەلا نراوی و لا براوی و دەرکراوی. (رانده‌شده)(٣) تێکەڵی جەماوەر نەبوون و لە پەراوێزدابوون. (گوشەگیری و برکناری)

بەرکەواندن: پێکان؛ لە نیشانە دان. (زدن بەهدف)

+ بەرکەوتن: [چاوگە،ت](١) بەردا خستن؛ لە بار چوونی منداڵ. (جنین انداختن)(٢) ماڵەکەم وەبەر خیابان کەوت. (جزو شدن) (٣) بەش پێ گەیشتن. (قسمت) [٤]وەپێش کەوتن.(جلوانداختن)

بەرکێش: [ناو،بک+ناو]بەردکێش.(١)کەسێک کە بەرد دەکێشی.(سنگ‌کش) (٢) خەرەکی. (وسیله حمل سنگ.

بەرکێشک:[ناو،ت] کەشەوی مێز؛ چەکمەجە. (کشوی میز)

+ بەرگ: [ناو] بەڵگ؛ وەرەق؛ لاپەڕە. (برگ)

+ بەرگ: [ناو]ڕووکێش؛ وەک بەرگی دۆشەک و لێفە و دمانچە و کتێب و سەرین و باڵش و پشتی و زین و نووشتە و کێلانی خنجێر..... (روکش؛ برگ)

بەرگ پێداگرتن: [چاوگە،ت]بەرگی لێفە و دۆشەک و کتێب دوورین... پێداگرتن؛ بەرگ‌گرتن؛ (برگ گرفتن)

بە رگ: پێش(گ)کورتەبزوێنە:[ئاوەڵناوی‌بەر] بەرگین؛ پێشوو؛ لەمەوپێش. پێوەندیدار بە ڕابوردووەوە.(قبلاً)

+ بەرگاز: [ناو]خلێف و قوونووی مێش هەنگوین. (کندوی عسل)

بەرگر: [ناو،بک+ ناو](١)نەهێل؛ بەربەند؛ پێش‌پێگر؛ بەر بەست؛کۆسپ. (مانع) (٢)بە-دەوام؛ بەرگەگر. (مقاوم)) (٣) داری ناوتەون بۆ ڕاست ڕاوەستان؛ بەرگرد. (چوب دستگاەقالیبافی)

بەرگ‌تێگر: [ناوی‌بک](١) کەسێک‌کە بەرگ دەگرێ بەڕووی شتێکدا.(برگگیر)

بەرگ‌ساز: [ناوی‌بک] خەیات؛ ڕوکێش ساز. کەسێک‌کە بەرگ دروست‌دەکا.(خیاط؛ جلد دوز)

بەرگ‌گر:[ناوی‌بک]بەرگ‌پێاگر.(برگگیر)

بەرگوارە:[ناو]زنگەتەترێ.(خوشەانگور)

بەرگووز: [ناو]بەربووز؛ چۆخە؛ چۆغە. (لباسی کەدستباف و از پشم ریسیده درست شده)

بەرگۆهەک: [ناو،ت](١) گۆشیی تەلەفۆن؛ بیستۆک. (گوشی)(٢) گوێپۆش. (گوش پوش)

بەرگوێکەوتن: [چاوگە،ت](ب) بیستن، بە- سووسە بیستن. (شنیدن)
+ بەرگە: [ناو](١) بەڵگە؛ سەنەد. (سند) (٢) وەرەقە. (ورقه)(٣) تا بشت و توانا و قایمی و خۆ ڕاگری؛ لە توانادابوون و پێوەستان؛ (توان) (٤) زمانە چکۆلە؛ (زبان کوچک) (٥) ئاسۆ؛ دیمەن؛ بەرەگە. (منظره)
بەرگەشت: [ناوی‌چاوگە](١) زڤرین؛ گەڕانەوە؛ (برگشت) (٢) پەشیمان بوونەوە. (پشیمان) (٣)[ناو] لە مۆسیقا دا دوو هێڵی ئەستوونییە بە دوو خاڵەوە لە سەر پنج هێڵی نۆت بە واتای ئەوەیە تا ئەوجێگایە،نۆتەکان دووپات ببنەوە. (دوخط برگشت)
بەرگەگرتن: [چاوگە،ت](١) وەرەقە گرتن؛ بەرگە وەرگرتن؛ زیاتر بۆئیجازەنامەی هات- وچۆ یا ئیزنی مەرەخەسی لە سەربازخانە. (برگەگرفتن) (٢) خۆ ڕاگری لە کارێکدا؛ دەوام هێنان. (دوام آوردن)
بەرگەگر: [ئاوەڵناو](١) بەدەوام؛ خۆڕاگر. (بادوام. مقاوم) (٢)[ناوی‌بک] کەسێک کە بەرگە(بەڵگە) وەردەگرێ. (کسی کەورقە(برگە) بگیرد)
بەرگەگری: بەدەوامی؛ خۆڕاگری؛ ڕاوەستاوی. (دوام آوردن)
بەرگێ: (١) بنا گوێ. (بنا گوش) (٢) یەک بەرگ. (یک برگ)
+ بەرگیر: (١) بەرهەڵست؛ کۆسپ؛ پێش پێگر؛ بەرگر؛ ڕێبەست؛ نەهێڵ. (مانع) (٢) بەرگەگر؛ خۆڕاگر. (مقاوم) (٣)حاڵەتی وەدەستخستن؛ بەرچەنگ؛ وەگیرهێنان؛ هیچم بەرگیر نەکەوت . (گیر انداختن؛بچنگ‌آوردن)
بەرگین: (١) [ناو]برگ‌دار. (جلد دار)(٢) [بەند] پێشوو. (قبلی)
بەرگێو: ناو،بک] بەرهەڵست؛کۆسپ؛ لەمپەر؛ بەرگر؛گلدەرەوە؛ (مانع)
بەرلۆغە: [ناو،ت]بەرچێڵە؛ بەرخەبەبە. (غبغب)
بەرلیکە: [ناو،ت]بەرسینگەی منداڵان. (پیش بند بچەها)
بەرماڵ بەسەر ئاواگەڕان:(ب)پیاو چاکی و دینداری. (تعریف برای خوبی و دینداری)
بەرماڵان: [ناو] پێش ماڵان؛ خوار مالان زیاتر لە دێهاتدا دەوتری. (جلو روستا یا شهر)
بەرماڵک: [ناو](١) بەورماڵک؛ وەور ماڵک. بەفرماڵ؛ وەروەرە. (بیل برف روب) (٢) بەرهەڵبێنە. (پیش بند) (٣) جاجم و جاش و مەوجی چکۆلە. (رختخواب پیچ)
بەرمالووسکە: [ناو،ت]خەوشوخاڵ و کۆتەڵی خوار مالوسکە لە خەرمانی‌دەغڵدا. (خاشاک پائین ماسولەخرمن)
بەرماما: (١) هەڵسا؛ بەرزبووەوە. (بلند شد؛ ایستاد) (٢) [ناو]یاریدەدەر و بەردەستی مامان؛ ژنێک‌کە کۆمەکی دوکتۆری ژنان دەکات لە منداڵ بوونی ئاوسدا.(وردست ماما)
بەرماوەخۆر: [ناو،بک] پاشخوان‌خۆر؛ (ب) نۆکەر.(پسمانده خور)
بەرماوەخۆری: [ناو] پاشخوان‌خۆری. (ب) نوکەری و چڵکاوخۆری. (خوردن ماندەاز خوراک سفره)
بەرمل: [ناو] یەخە؛ ئەو خوریە کە بۆ جوانی

لە بـەرملـی مـەڕدا دەمێنێتـەوە و نایبڕنـەوە. (یقە؛ موی یقەگوسفند)
بەرمووره: بەرموور؛[نـاو،ت](١) ملوانکـە. (٢) موروو یا قاشی گەورەی خوار ملوانکـە؛ پـای ملوانکە. (پائین گردنبند)
بەرمیت: [ناو] مێو؛ مۆم. (موم)
بەرمیز:[ناو]کەمێڵە. (گال)
بەرمێشک:[ناو،ت] جۆرێک قەزوان؛ جۆرێـک وەنەتەق. (چاتلانقوش)
بەرمیلە: [ناو]بەرمیل؛ بۆشکە. (بشکە)
بەڕمێن: شـتیٚخواهـانی زۆربێـت؛ بـەبـرەو؛ بەبازاڕ؛ بەڕەواج. (خواهان و رواج داشتن)
بەرناخ: [ئاوەڵنـاو] فێڵبـاز؛ زرینـگ؛ بـاهۆش؛ شەیتان و سەربزێو؛ مەردوڕەند؛کـەڵـەکبـاز. (حقەباز؛ زرنگ)
+ بەرناف: [ناو]هـەوەڵـی شـیو و دەرە. (اول درە)
بەرناڤدان: [چاوگە،ت]ئامێتەکـردن؛ تێکـەڵـاو کردن. (مخلوط کردن)
بەرنامە نووسـین: [چاوگـە،ت] (١) داڕشـتنی بـەرنامـە و جیـا کردنـەوەی کـاتی دەرسـی هـەریـەک لـە وانـەکـانی مـەدرەسـە و دیـاریکردنی مامۆسـتای هـەر سـاتیٚ، کـە مودیری مەدرەسە دەی‌نووسێت. (٢) نوسینی پرۆگرام بۆ ئەنجامی‌کـاریٚ کـە پلـە بـە پلـە دیاری‌دەکرێت. (برنامەنوشتن)
بەرنانەوە: بنی بێسـتان و دار بـۆش‌کـردن و خۆڵ ٚدانە پاڵی. (خاک زیر بتەریختن)
بەرناو: ناوی‌گەورە؛ لەقەم؛ لەقەب؛ بـەرنـاف؛ شۆرەت؛ (شهرت)

بەرندێر: [ناو]مەڕی سـیٚسـاڵە.(گوسفندسـە-ساله)
بەرنە: (١)[ئاوەڵناو]بـەرنـدە؛ سـەرکـەوتـوو. سـەرکـە وتـووو لـە قومـار و یـاریدا. (٢) کەسێک‌کە جایزە(خەڵات) بە ناویەوە دەردیٚ. (٣) سەرکەوتوو لە کێبەرکێدا.(٤) کەسێک‌کە شتێک دەباتەوە.(برندە)
بەرنووت: [ناو] وشـەیێکـی تورکییـە؛ (بڕنـو، برنی :لووت) ئەنفییە، کەبەلـووت هـەڵـیدە-مژن؛تۆزی‌تووتن کەپشمەدێنیٚ. (گرد توتون)
بەرنەگر: (١) دارێک کە بەر نـەهێنـیٚ. (بـی بر)(٢) کەسێک کە بەر هەڵستی لـە کارێـک نەکات و بەرەنگـاری نـەبێـت. (حالـت مـانع نشدن)
بەرنیا: [ناو] بەرنیـان؛ دەمـەزەردە؛ زیـاتر بـۆ گاسنە. (تعمیرگاوآهن و داس)
بەرنیر: [ناو،ت](١) گایێک‌کە نیـری لـەسـەر ملە. (گاو شـخم زن) (٢) جوانـەگایێـک کـە وەختی جووت‌کردنـی هاتبێـت.(گـاوآمـادەی شخمزنی)
+ بـەرِوٚ: (١) بـــەرەوە؛ پێشـــەوە. (جلـــو)(٢) دە رە وە. (بیرون)(٣)بیات. (ببرد) (٤) لەبەرۆیە: لەبەرەوەیە. (جلواست)
بەرۆێنک: [ناو] هـەنیـە هـەڵگـرتن؛ مـووی زیادیی ئەبرۆ و ناوچـاوان دەرکێشـان. (ابـرو برداشتن)
+ بەرِوار: (١) مێژوی مانگ و سـالٚ؛ تـاریخ. (تـاریخ)(٢) ڕێکـەوتـی‌کـات. (مصـادف) (٣) ئەندازەی پانایی زەوی. (مساحت)
بەروارک: [ناو] قەرتاڵە؛ قەرتاڵەی میوەچنین؛

تریان؛ بەرچن. (سبدکوچک)
بەرواژی: [ئاوەڵناو] (١) ئاوەژوو؛ پێچەوانە. (برعکس) (٢) بەرواژی وی‌یەکی: بەو باری-ئەوەدا؛ بەوباری‌دیکەدا. (برعکس این)
بەروباو: (١) بەرەجووت؛ داهاتی‌جووت وگا. (حاصل کشت و زرع)(٢) کارەسات؛ گێچەڵ. (آشفتگی)
بەروخوار: [ئاوەڵناو]بەرەوخوار؛ سەرەوخوار؛ سەرەولێژ؛ (سراشیب)
بەروڕوو: (١) ڕواڵەت؛ سەر و سیما؛ خۆش بەروڕوو: ڕواڵەت جوان؛ پشت و ڕوو. (سرو سیما؛ پشت ورو)(٢) بەرە و ڕوو؛ حاڵەتی ڕووبەڕوو بوون. (رودر رو)
بەڕۆژ: (١) ڕۆژانە؛ حیساب بە ڕۆژانە (روزانە ٢) ڕوبەڕۆژ؛ بەربەرۆچکە. (روبەخورشید) (٣) ناوی قەدیمی بانە؛ (اسم قدیم شهر بانه) (۴) لەکاتی ڕۆژدا. (در روز)
بەڕۆژە: (١)بەپێی ڕۆژە، ڕۆژانە بارودۆخ دە-گۆڕدرێ؛ وەک، قیمەتی ئاڵتوون بەڕۆژە؛ دە-ستەواژەی بازاڕییە. (روزانە) (٢)بەڕۆژایە، بە-شەوانییە.(در روزاست)
بەروک بەردان: [چاوگە،ت]واز لە کەسێک هێنان؛ لێ گەڕان. (دست از کسی برداشتن)
بەرۆک‌گرتن: [چاوگە،ت]یەخەی کەسی گرتن و شەڕپێفرۆشتن. (یقەکسی را گرفتن)
+ بەروو: [ئاوەڵناوی بەر] (١) رابووردوو؛ بهوری؛ پێشوو؛ بەرگین.(گذشته)(٢) [ناو] سینە و بەرۆک. (سینەو پستان)
بەڕوودا کەوتن: [چاوگە،ت](١)بەڕوودا کە-وتن؛ بەسەرا کەوتن. (سرزده دیدن مسئله یا کاری) (٢) شەرم لە ڕووی کەسێکداکردن. (شرم کردن)(٣) لەسەر سک پاڵکەوتن. (روی شکم افتادن) (۴)سەرەنگری‌بوون و بەدەمەوەکەوتن. (روبەجلو افتادن)
بەڕوولەخۆر: [ناو،ت] بەڕوولەخۆرە؛ هەر شت کەپێویستبێ بەڕولەی تێوەبچێ؛ جێگای بەڕوولە؛ وەک:کونی شیلەپە کە بەڕوولەی تێدەخرێ بۆ توندکردنی باسکێش. (سوراخی-در وسایل وماشین آلات که لازم باشد پیم یا میله کوچکی درآن فرو کنند،)
بەروون: ببەم؛ بیوەم؛ بوەم؛ بەرم. (ببرم)
بەروونکار: [ناوی‌چاوگە]بەرەنگار؛ ئاست؛ هەمبەر. (مقابله و سد راه)
بەڕووەکووپە: [ناو،ت]جۆرێ بەڕوو کە لە کووپەڵە دەکا. (نوعی دانەبلوط)
بەروە: دەرەوە؛ ڕوو بە: بەر بە؛ بەروە با: ڕوو بە با: بەرانبەر بە با. (بیرون،روبرو)
بەروەبەر:کەم‌کەم؛ نەختە نەختە؛ بەرە بەرە. (کم کم)
بەروەدان: [چاوگە،ت]بەرڤەدان؛ بەردان؛ ڕەهاکردن؛ بەرەڵا کردن؛ بەرەودان؛ ئاوبەروە-دان: ئاوبەردانە وە. (آزاد کردن)
بەروەدە: [ئاوەڵناو]بەرئاوەڵە؛ بەربڵاو. (وسیع)
بەروەست: بەرگە؛ تابشت؛ دەوام؛ تاقەت.(دوام)
بەروەستن: [چاوگە،ت] بەرگەگرتن؛ دەوام-هێنان؛ لەباراندا بوون. (با دوام)
بەروەسێڵ: [ناو،ت](١) ئاووردان؛ ئاگردان؛ کووانوو. (آتشدان) (٢) بەربەسێڵ؛ خواردنێکی کوردەوارییە زیاتر بە گۆشتی گیسک و

ماست چیٚ‌دەبیٚت. (نوعی غذا)
بەروەشێن: [ناو،ت]ئـەو تـووەیـە کـە پـێش کێڵان دەوەشـێت بـەعـەرزدا. (تخـم قبـل از شخم)
بـەروەنــن: بـەرخســتن؛ لـەبـارچوون؛ بەرهاوێشتن. (سقط شدن)
بەروەنە: [ناو،ک] بەرها وێژتوو؛ بـەرخسـتوو. (بچەسقط کردە)
بەروێ: [ناو] بەرۆک. (سرسینە)
+ بەرە: (۱) ئاستەر؛ وەک، بەرەلێفـە؛ (آسـتر) (۲) فەرمان بۆ بردن؛ ئەم پارە بەرە بۆ بانـک. (ببر) (۳) دژی هۆرتە لـە جـووت کـردن‌دا. (ندا بەگاوی کەشخم می کند)
+ بەرە: [ناو،ت]دەستە؛ دوبەرەکی‌لە جەبهەی شەڕدا. (دو دستەیی)
بەرە: [ناو،ت] قایشی بەرسینگەی زین و بە-رگ؛ (تسمەزین در جلوسینە)
بەرهاوێشتە‌کردن: [چاوگە،ت] (۱) زووتـر لـە مۆڵەت. (قبل‌ازموعد)(۲)پـێش خسـتن. (جلـو انداختن)
بەرەباب: [ناو،ت]نەتەوەی باب؛ تایفەی باب؛ ڕەچەڵەک. (طایفەپدری)
بـەرەپـۆ: [نـاو،ت]بـەڕە؛ گڵـێم؛ مـافوورەی بێتووک؛ بەڕ؛ لەی. (گلیم)
بـەرەپـاش: بـەرەوپـاش؛ ڕوو بـە دواوە؛ بـۆ دواوە(روبەعقب)
بەرە پێش: (۱) بەرەوپێش؛ بۆبەرەوە.(۲) بیبـە پێشەوە.(روبەجلو؛ببرجلو)
بەرەجۆ: [ناو،ت](۱) بەرەجووتی جۆ. (حاصـل جـو) (۲) چـەنـد کـەرت زەوی کـە لـە بـەر جۆگەلەبێکدابن و لەو جۆگـەیـە ئـاو بـدرێن. (چند قطعەزمین کەاز یک‌جوب‌آبیاری شوند)
بەرە دار: (۱)بـەرە دار؛ مـەودای بـەینـی دوو کارێتە لـە خـانوو دا. (فاصـلەبـین دو بـالار) (۲)بەرە دار؛ سەمەری دار. (بـر درخـت) (۳) بەهرەدار. (بهرە دار)
بەرەدووڤ: [ناو،ت]بـەردووگ؛ پێسـتی بنـی دووگی مەڕ. (پوست بیخ دنبە گوسفند)
بەرەدێ: [ناو،ت](۱) زەویی خـوارووی دێ و نزیک بەدێ. (زمین پـائین دەو نزدیـک) (۲) (ب)دێ‌بەر؛ خوارەوەی گوند. (جلو دە)
بـەرەڕەت: [نـاو،ت]بـەرەگـە؛ سـەر ڕێگـە و شوێنی ڕابووردن؛ بەرەگـەی ڕێـوی لـە ڕاودا دیرەگاو دیرەگە. (مسیر راە)
بەڕەز: [ناو]بەڕەزا؛ ئەو گیایـە کـە بـە زوڵفـی جوانــان دەی‌شــوبهێنن. (اســم گیــاە پــر سیاوشان)
بەرەزڤر: [ناو،ت] بەردەزوورە؛ بەردەزبرە؛ بـە-ردی تیژکردنی دەمـەتـێخ؛ جۆرێـک بـەردە-پاشۆر. (نوعی سنگ خارا)
بەرەزوونە: [ناو،ت]ئاغزونە. (سگک)
بەرەزیڤ: <بەرەزڤر.
بەرەستە: [ناو،ت]بەردەئەسـتێ؛ بـەردەسـتێ. (سنگ آتش زنە)
بەرەشکۆن: بۆی‌هەیـە بـەرئـەشـکەوت‌بـێ؛ بەردی گەورەی سێبەردار بۆ دانیشتن. (سنگ بزرگ سایەدار)
بەرەشۆر: [ناو] بەردەشۆر؛ نیسکەشـۆر. (جـدا کردن شن و ماسەاز حبوبات باآب)
بەرەشۆڕکە: جووڵـەوەرێکـە وەک قۆلانچـە.

(سوسک)
بەرەڤی: [ناو] مەجلیس؛ کۆڕ. (مجلس)
+ بەرەک: [ناو](۱) بەرۆک. (سرو سینه) (۲) ئەستێرەی سیوەیل .(ستارەسهیل)
بەرەکونار: [ناو] بەری کونار؛ بەری شیلان. (میوه نسترن کوهی)
بەرەکە: [ناو] نۆ بەرە. (نوبر)
بەرەکە بەرەک: وتوویژ؛ گوفتوگۆ. (گفتکو)
بەرەکەت: [ناو](۱) موبارەکی؛ پیت. (برکت) ((۲) (ب) دۆشینی مەڕ و مالات؛ بەرەکەتت کردن؟ واتا دۆشیتن؟دەستەواژە بۆ ڕێزگرتن لەمەڕو ماڵات. (برکت؛دوشیدن حیوان)
بەرەڵابوون: [چاوگە،ت](۱) ڕەهابوون؛ وێڵ-بوون. (آزاد شده) (۲) باغێ یان زەوییێک کە قەدەغە نەکرابێت یان بێخاوەن بێت. (باغ یا زمینی کەصاحب نداشتەباشد)
بەرەڵا کریاگ:[ئاوەڵناوی،بەر+ ناو،بەر] بەرەڵا بوو؛ بەرەڵاکراو. (آزاد شده)
بەرەڵایی: [ناو،ناوبەرهەمی چاوگە](۱) ئازادی؛ سەربەستی؛ رەهایی؛ ڕەهایی؛ وێڵی. (آزادی) (۲)بێعاری؛ بێکار سووڕانەوە. (ولگردی)
بەرەم: [ناو] عەمبار؛ عەمباری تفەنگ. (انبار)
بەرەمەشکانە: [ناو](۱) بەخشینی کەرەی ئەوەڵین مەشکەی ساڵ.(بخشیدن اولین کرەی مشک)(۲) داهات و بەرهەمی کەرەی یەک جاری مەشکە ژەندن. (فراوردەیکبار مشک)
بەرەنان: [ناو،ت]بەنان کردنی یەک کەوڵی پڕلەگونک.(پختن یکسری چونەحاضرشده)
بەڕەنگ: (۱) خاوەن ڕەنگ. (رنگدار) (۲) بە ربرینگ.(آمادگی گوسفند برای پشم چینی) (۳)وەک: بەڕەنگی سوور داپۆشە.(بوسیلە رنگ)
بەرەنیا: [ناو]بیراز. (آجدارکردن سنگ آسیاب)
بەرەو: (۱) پێش؛ پێشەوە؛ بێبەرەو: وەرە پێشەوە. (جلو) (۲) ڕووبە؛ بەرەو خۆشی چوون: ڕوو بە خۆشی چوون؛ بەر بە خۆشی چوون. (روبە)
بەرەوان: [ناو]بەڕەڤان؛ نێوبژیکار؛ناوجێبیکەر . (میانجیگر) بەرەوان: [ئاوەڵناو]لایەنگر؛ هەوادار.
(مدافع)
بەرەوانی: [بەرهەمی چاوگە] ڕەوتی لایەنگری؛ پاراستن؛ بەڕەڤانی(دفاع)
بەرەوبڕدانەوە: [چاوگە،ت] بەرانبڕدانەوە. (درحالت دویدن پیچیدن جلوی کسی)
بەرەوبوونەوە: [چاوگە،ت] (۱) بەربوونەوە؛ تێبەربوون؛ ئاورتێبەر بوون. (افتادن؛ گرفتن)(۲) ڕژاندنی ئاوەکی؛ ئاوەکە بەرەو بوو: قڵم بووەوە(ریختن)(۳)بەردانەوە و کەوتنەخوار؛ خلاربوونەوە لە لێژی؛کەوتنە خوارەوە (قل خوردن؛افتادن)
بەرەوپێش: بەربەپێش؛ بۆپێشەوە؛ ڕوو بەپێشەوە. (روبەجلو)
بەرەوپێشەوە چوون: (۱) پێش چوونی کار. (پیشرفت)(۲)بۆپێشەوە ڕێ پێوان.جلورفتن)
بەرەوپیل: [ناو،ت] بەرەوپیر؛ پێشواز.(پیشواز)
بەرەودان: بەردانەوە؛ بەروەدان. (۱) بۆن بڵاوکردنەوە: بۆن بەرەودان. (پخش کردن)

(۲) ئاوی ئەستێر بەرەودان؛ بەردانەوە؛ قڵم-کردنەوە.(آب استخر را باز کردن)
بەرەودووایی: ڕو ولە تەواوبوون؛ ڕوو لە تەواوی؛ نزیک بە دوایی هاتن. (روبەاتمام)
بەرهەڤکار:[ناو،بک]کۆوەکەر؛ خڕکەرەوە. ئامادەکار. (جمع کننده)
بەرهەوا: [ئاوەڵناو] بێکەڵک؛ فیڕۆ؛ بێفایدە؛ بێ سوود؛ بەرباد؛ بەربات. (برهوا)
بەرهەوا: [ئاوەڵناو] بێموفا؛ بێمانا؛ بێواتا. (بی معنی)
بەرەهووت: [ئاوەڵناو] فد: بیابانی چۆڵ و قاقر و چۆڵوهۆڵ. (برهوت)
بەرهەڵدا: [ئاوەڵناو] (۱) ئازاد ؛ بەرەڵا. (آزاد) (۲)(ب) خوێڕی و بێکارە. (بیکاره)
بەرەیخۆ نەخستنەژێرکەس: ئیجازە بە کەسێک نەدان بۆ خاپاندن و ماڵ خواردن؛ خۆ نەخستنە ژێر باری منەتی کەسێک. (اجازەسوء استفادەکردن بکسی ندادن)
بەرەیکار: [ناو] بەرهەمیکار؛ سەمەریکار. (بهرەکار)
بەری: (۱) وەلانراو. (بری) (۲) بێبەری: بێوەری: بێبەش.ئافە رۆز.(محروم؛ بی قسمت)(۳)بەروو؛ بەرگ؛ پێشوو؛ لە پێش. (قبلاً)
+ بەرێ: [ناو](۱) پێشێ؛ پێشەوە؛ وەرە بەرێ: واتا وەرە پێشەوە. (جلو)
بە ڕێخستن: بەڕێکردن[چاوگە،ت](۱) (ب) کاری کەسێک جێبەجێکردن. (۲) پارە بە-کارگەر دان پاش تەواو بوونی کار و بەڕێ خستنیان؛ (۳) بەرپاکردن؛ میوانداریی بێکەم وکوڕی سازدان؛ بەڕێوەبردن.(۴) ناردنی-کەسێک بۆ جێگایێک؛ بەڕێکردن (راەانداختن) بەرێخوەدان: [چاوگە،ت] ڕوو تێکردن؛ سەرەنجدان؛ تەماشا کردن؛ زەین پێدان. (نگاەکردن)
بەریدەست: [ناو،ت]لەپیدەست؛ ناو لەپی دەس؛(کف دست)
بەڕێز: [ئاوەڵناو] بەڕوومەت؛ بەقەدر؛ بەحورمەت؛ ماقوڵ؛ سەنگین و گران. (محترم)
بەریش: [ناو]نەخۆشینیئاژەڵە.(مرض-بزوگوسفند)
بەریشەوەبەستن: [چاوگە،ت]خستنەمل؛ بەسەردا سەپاندن. (بەریش بستن)
بەریگ: [ناو]تیر؛ گوللە. (تیر؛ گلولە)
بەریما: بنچینەیی؛ ڕەچەڵەکی؛ نیژادی، (نژادی)
بەرینە: (۱) پێشینە؛ مێژینە. (قدیمی) (۲) پانە؛ مەودای زۆرە. (پهن است)
بەرینی:(۱)پانایی.(عرض)(۲) پێشویی (قبلی)
بەریوارە: [ناو،ت]بەرئێوارە، دوای نیوەڕۆ؛ کاتی لارە سێبەر؛ زەردەی خوراوا. (عصر)
بەڕێوەبەر: [ناویبک](۱) بەرپرس. (۲) مودیر؛ ڕابەر. (مسئول) (ادارەکنندە)
+ بەڕێوەچوون: [ناو،ت](۱)بەخێوبوون؛ بەڕێچوون. (ادارەشدن)(۲)بەڕێگادا ڕویشتن. (راەرفتن)
بەریەمێ: [ناو]گیایکووزەڵە؛ ڤیتامین(ئا و ئی)زۆرو، خواردنی بۆ ژنی تۆڵدار باش نییە

جارنا منداڵ لەباردەبا.(بولاغ اوتی؛ شاهی آبی؛ علف چشمه)
+ بەزا: (۱) [ڕابووردووی‌بەزین] بەزی؛ شکستی خوارد.(شکست خورد)(۲) [ئاوەڵناو] ئەو شتە یا ئەو کەسە کە زۆر شکست دەخوا. (شکست خور)(۳) [ئاوەڵناو]خۆشبەز؛ ئەسپی بەنەفەس.(راهوار)
بەزابتە: [ئاوەڵناو] بەهەیبەت؛ بەسام؛ بەتوانا؛ (باقدرت)
+ بەزاخ: [ئاوەڵناو] بەکار؛ ئازا؛ بەدەست‌وبرد؛ خۆشمێر؛ جوامێر. (کاری. کارا)
بەزافتە: [ئاوەڵناو] بەزابتە؛ بەهەیبەت؛ بەسام؛ (باهیبت)
بەزاقیت: [ئاوەڵناو+ناو،بک] ئیرادگر؛ڕەخنەگر؛ عەتەبگر. (عیب جو)
بەزاندن: (۱)[چاوگە،ت] بڕدان؛ شکست دان. (شکست دادن) (۲) [پاشگر]لەگەڵ (هەڵ) و(دا دا دێ، هەڵبەزاندن، دابزاندن، (جهاندن، پیادەکردن) (۳) غاریێ‌کردن. (دواندن)
بەزاوا بوون: [چاوگە،ت](۱) ژن هێنان. (۲) چوونە پەردە لەگەڵ تازەبووک بۆ ئەوەڵجار و دەست تێکەڵاوکردن. (داماد شدن)
بەزداخ: [ناو،ت]بەپیوداخکردن؛ داخکردنی قڵیشی دەست و پا بە دووگ بۆ نەرم بوون و چا کەوە بوون. (پیەداغ)
بەزدار: [ئاوەڵناو] (ب) قەڵەو. (کنایە. چاق)
بەزدۆک: [ناو]جێگای‌بازدان؛ پلیکانی تایبەت لەتەختە جێگای خۆ هاویشتنە ناو ئەستێر بۆ مەلە و کێبەرکێ. (جای پریدن. پلەپرش)

بەزرەک: [ناو]گیایێکە ڕۆنەکەی دەگرن و لە نەقاشی (وێنەکێشی) ڕەنگ و ڕەوغەندا کەڵکی هەیە. (بزرک)
بەزک: (۱)[ناو] قومارێکە بە پەڕە دەکرێ. (نوعی قمار) (۲) [ئاوەڵناو] ئاوس. (آبستن)
بەزکە: [ناو]بەزەک؛ ڕازاندنەوە؛ ئارایشت؛ جوان کردن و خەمڵاندن. (بزک؛ آرایش)
بەزکەکەر: [ناوی‌بک]خەملێن؛ ڕازێن؛ جوانکەر؛ شانەکار. (آرایشگر)
بەزل: بەرانبەر؛ هەڤبەر. (برابر)
بەزمان: (۱)[ئاوەڵناو] بەقسە؛ قسەزان؛ بەدەموپل؛(۲) بەزبان؛ هەر بەزمان ڕازییان- دەکا. (سروزبان دار؛ بازبان)
بەزم پێگرتن: [چاوگە،ت]تووڕەبوون و شڵتاخ کردن بە سەرکەسێکدا؛ (ب)سەر خستنەسە- رکەسێک و گاڵتە پێکردن. (از کسی عصبانی شدن و دری وری گفتن؛ سربسرگذاشتن)
بەزمیگ: [ناو](۱) بزنمژە؛ جۆرێک مارمێلک. (بزمجه) (۲) مچ؛ گەنە. (کنه)
بەزمشک: [ئاوەڵناو]بەدەموپل؛ <بەزبان. (حراف)
بەزمگە: [ناو،ت]بەزمگا؛ جێگای بەزموڕەزم. (بزمگاه)
بەزمگێڕان: (۱ب)کێشەسازکردن. (ئاشوب درست کردن) (۲) شایی و زەماوەند بەڕێوە- بردن. (بزم درستکردن)
بەزموڕەزم: [ناو،ت](۱) شادی و زەماوەند. (۲) (ب) شادی و شادمانی‌کردن بە هەراوهور یاوە . (بزن بکوب)
بەزۆک: (۱) [ئاوەڵناو]خۆشبەز.(اسب راهوار)

[ناو]سەیارە. (ماشین)
بەزۆکەوان: [ناو]شوفێر؛ ئاژوان. (راننده)
بەزەک: [ناو]بایی زەر؛ زەردوویی(مرض یرقان) <بەزکە
بەزەوزۆ: زۆر سک و زا کەر؛بەزاوزوو؛ حاڵەتی منداڵ بوونی زۆر. (مادەای کەزیاد بزاید)
بەزەویاچوون: [چاوگە،ت](١)ڕۆچوون بەزەویدا(٢) (ب) خەجاڵەت بوونی زۆر. (بزمین فرورفتن)
بەزەوی پیاهاتن:(بەزەیی) [چاوگە،ت] ڕەحم و دڵسوو تاندن بۆ هەر شت؛ بەزەیی پیاهاتن(دلسوزی
بەزەویدا دان: [چاوگە،ت]بەعەرزدا دان؛ (ب) شکست دان؛ نکووڵ پێ هێنان. (بزمین زدن)
بەزەویدا کوتان: [چاوگە،ت]بەعەرزدا دان؛ بەزەوی‌دا دان. (ب) شکست پێ دان. (بزمین زدن)
بەزەیی‌دار: [ئاوەڵناو] بەڕەحم؛ مێهرەبان؛ دڵسۆز. (دارای رحم؛دلسوز)
بەزیادکردن: [چاوگە،ت](١) (ب) کۆ کردنەوەی سفرە وخوان پاش نان‌خواردن. (٢) (ب) شکورکردن؛ سپاسکردن.(جمع- کردن سفره)
بەزیاگ: [ناوی‌بەر]بەزیو؛ شکست خواردوو؛ بۆڕ خواردوو؛بەزاو. (شکست خورده)
بەزیان: [لەچاوگەی بەزین] بەزین؛ بۆڕخواردن.(شکست‌خوردن)
بەزیبک و زاکون: [ئاوەڵناو]مێرخاس و کارامە؛ بەدیسیپلین و نەزمونیزام؛ ڕێکوپێکی و لێهاتوویی لەکاردا؛ بەزابتە؛ بەسام. (بانظم و کارآمد)
بەزی‌چاو: [ناو،ت]چەوری و گۆشتی زیادی لە سەرسپینەی‌چاو؛ وەردێنە؛ ناخوونەک. (ناخنک)
بەزیو: [ناوبەر]بۆڕخواردوو؛ شکاو لە زۆراندا؛ تێشکاو لە شەڕ و کێبەرکێدا. (مغلوب)
بەژاقی: [ناو،ت]وشکاوی؛زیندەوەرێ کە لە وشکایی و ئاودا دەژی.(ذوحیاتین)
بەژاف: [ناو]زەوینی دێمی و بێ‌ئاو. (زمین دیم)
بەژاقیت: [ئاوەڵناو+ ناو] بەزاقیت؛ ڕەخنەگر؛ عەتەب‌گر؛ بەبیانوو؛ بەپەلپ. (بهانەگیر؛ رخنەگیر)
بەژانەوەبوون: [چاوگە،ت](ب) ژنێک کە لە حاڵی منداڵ بوونایە و ژان و ئێشی هەیە؛ بە ئێش و ئازارەوەبوون. (در حال درد زایمان بودن)
بەژگی: ناکۆکی؛ ناتەبایی؛ ئاژاوە. (نابسامانی)
بەژمنێر: [ئاوەڵناو] خاوەن شکۆ. (باشکوه)
بەژمێر: ژمێراو؛ بەژمارده؛ بەحیساب هێنراو؛ شیاو؛ شایان. (بەحساب آوردن)
بەژن‌شووش: [ئاوەڵناو] ناتلەنگ‌زراو؛ قەدباریک؛ بەلەباریکە؛ (باریک اندام؛ کمر باریک)
بەژن‌کورت: [ئاوەڵناو]کورتەبنە؛ کورتەباڵا؛ کوڵەبنە. (کوتاەقد)
بەژن‌وباڵ: [ناو،ت]بەژن وباڵا. (قد وبالا)
بەژنە دار: [ناو]تەنەی دار؛ کۆتەرە؛ ساقەتە - هەرە قەویەکەی دار. (تنەدرخت)

بەژنهورت: [ئاوەڵناو] بەژن‌کورت؛ کورتەباڵا؛ کوڵەبنە. (کوتاەقد)
بەژۆک: [ئاوەڵناو] زۆربلێ؛ پڕبێژ. (پرچانە)
بەژەک‌کەوتن: [ناو،ت]نەخۆشی منداڵی ساوا بەهۆی زۆر خواردنی ژەکەوە. (مریضی بچەبعلت آغوز زیاد خوردن)
بەژەوەند: [ئاوەڵناو+ناو] پەسەند؛ بەرگەم؛ هەڵبژاردە. (پسند؛ ممتاز)
بەژی: (۱) دێمی. (دیمی) (۲) ئێش و ئازارێک‌کە بە لەشدا بڵاو دەبێتەوە. (درد پخش شدەدر بدن)
بەژێرادان: (۱) بەرز کردنەوە. (بلند کردن) (۲ب) حاشا لێکردن. (حاشا کردن)
بەژێر لچەوەکردن: <بە ژێر لێوەوە کردن: (ب) نەدرکاندنی نەهێنی کەسێ؛ چاوپۆشی- کردن و شاردنەوەی هەڵە؛ دیزە بەدەرخۆنە کردن. (کنایە؛ چشم پوشی کردن)
+ بەس: (۱)[پاشگر] کەسێک‌کە دەبەستێ؛ چاوبەس؛ باغەبەس. (اسم فاعل بستن) (۲) کیفایەت؛ تەواو؛ بەسمە ئیدی نامەوێ. (کافی) (۳) (تەنیا؛ قوتار) بەس‌من‌دەچم؛ تۆیت و بەس. (فقط) (۴) بەست؛ قفڵ و بەس. (بست)
بەساڵاچوو: [ئاوەڵناو] پیر؛ بەتەمەن؛ زۆرهان. (پیر)
بەساڵدا چوون: [چاوگە،ت] پیر بوون؛ گەیشتنە سنوری پیری؛ تەمەن زۆربوون. (پیر شدن)
بەس‌بێژ: [ئاوەڵناو] زۆربلێ؛ چەنەباز. (حراف)
+ بەست: [ناو+ناوی‌بک](۱) جێگای داخستنی درگا بە ئالقەرێزودوولایی. (جای قفل (۲) هەرچیێ کە دوو شت پێکەوە بەند بکا. (بست)(۳) بەشی جارێک کێشانی تریاک کە بە سەر وافوریەوە دەچەسپێنن. (چسپ)
بەست: [ناو] وەحی؛ سەروا؛ ئیلهام؛ گەیشتن بەمەبەستیێ لە خەیاڵدا؛ خەیاڵی. (الهام)
بەست: [پاشگر] دربەست؛ ماڵی‌دەربەست؛ سەیارەی‌دەربەست؛ چێوبەست؛ داربەست؛ (بست)
بەست: ڕابووردووی بەستن؛ دەرکەکەی بە- ست. (ماضی‌بستن)
+ بەست: [ناو](۱) دەشت. (دشت) (۲) بەستێن. (مرز دو مزرعە)
بەستام: [ناو](۱)شاری بەستام لە ئێران. (شهر بسطام) (۲)ناوی خاڵی‌ئەردەشێری بابەکان. (دائی اردشیر بابکان)
بەست دانیشتن:کاری دانیشتن و پەنا بردنی گوناحباران بە مەرقەد یان جێگاییێکی موبارک بۆ خۆ پاراستن لە سزادان، ڕیوایەتە کە دەست و پایان‌بەمەزارەکەوە بەستوەتەوە (بست نشستن)
بەست لیێڕابوون: گەیشتن بە هەستێکی دەرونی‌لە بەرپێوارەوە؛ لە نادیارەوە بە دڵدا هاتن؛ سەروا هاتن. (الهام. سروش)
+ بەستن: [چاوگە]گرێدان؛ دانانی قەرار و پەیمان و شەرت؛ شەرت‌بستن: پەیمان- بەستن (بستن)
بەستن: [چاوگە]بهیستن؛ بیستن؛ شنەفتن. (شنیدن)

بەستن‌بەڕیشەوە: [چاوگە،ت]شتێ داسەپانـدن بە سەر دا؛ بەکـوڵدا دانـی تۆمـەت. (بـریش بەستن)
بەسـتوو: [ئـاوەڵنـاو] (١) بـەسـتراو؛ مـەییـو. (بەسـتەشـدە) (٢) تـەزیـو؛ ڕچیـاو؛ ڕچیـاگ؛ سرپووگ؛ چـوو؛ دەسـتم لـە سـەرمـادا بـە-ستوویەتی. (چائیدە)
بەستوورک: [نـاو] بـەرسـتوورک؛ ملیـوان و یەخەی کراس. (یقەپیرهن)
+ بەستە: گۆرانی و ئاهەنگ کە خاوەنـی زە-رب و ڕیتمە(جیاوازە لە مەقام) بـەسـتە(تـە-ڕانە)ی فارسییە گۆرانییێکـە کـە جـاران لـە بەینـی مـەقامێکـدا ئیجـرا دەکـرا و ئـەمڕۆ لەکوردوستاندا پێش یا دوای مەقام (بەسـتە) دەوترێت خۆی مەقام نییە، بەڵام هەر لەسـەر ڕەوتـی موسـیقایی ئـەو مـەقامـە دا دەوترێت،(پەردە) و حاڵەتی نۆتەکانیشیان یە-کێکە. (ترانە)
+ بـەسـتە: بـێ‌تـرس؛ بـێ‌بـاک؛ ئـازاد؛ بستە؛(بیباک)
+ بەستە : هێڵی بـەینـی دوو مـەزرا؛ هێڵـی دیاری کردنی سنوور.>بەسە. (مرز)
بەستەبەند: [نـاوی‌بـک]بـەسـتەپـێچ؛ کـاری بەستەپێچی دەکا. (بستەبند)
بەستەبەندی: ڕەوتی دەستەکردن و پێچانەوە و بەستن؛ بەستە بـەسـتەکـردن؛ پرێسـکە و پیازکە دروستکردن؛ شت خستنە ناو قوتـوو و سەرچەسپاندن و پێچانەوەی. (بستەبندی)
بەستەکـار: [ناو،بـک]بـەسـتە دانـەر؛ بـەنـد ڕێکخەر؛ هەوادانەر؛ ئاهەنگ‌ساز. (ترانەساز)
بەستەکاری:بەستە دانان؛ بـەنـد ڕێکخسـتن؛ ڕەوتی هەوادانان؛ ئاهەنـگ‌سـازی. (سـاختن ترانە)
بەستەڵە:[ناو،ت]بەستەڵۆک؛ بەستەڵەک . (یخ بستە)
بـەسـتەم: [نـاو] ئـەسـتێ و بـەرد. (سـنگ چخماخ)
بەستەوانی: میزگیران. (بستەشدن میزراە)
+ بـەسـتی: (١) [نـاو]چـاوتێری؛ بـەقنیـات. (قانعی) (٢) [ناو]باڕەکـەوێـک کـە فێـری‌ڕاو دەکرێت. (کبک تعلیمی‌برای‌شکار)
+ بـەسـتی: (١) چـاوتێری. (قـانعی) (٢) کوولـەکـە. (کـدو) (٣) تـەرم .(جنـازە)(۴) [ڕابـوردووی بـەسـتن] دای‌خسـت؛ ژەنـدی گرێیدا. (بست)
بەستیار:بیستیار:[ناو،بـک]گـوێڕادەر؛ بیسـەر؛ بهیستیار. (شنوندە)ناو،ت
+ بـەسـتێن: [نـاو](١) زەمینـە؛ بـواری هونەری.(زمینە) (٢) حودوود؛ مەرز. سنووری بەینی دوو مەزرا. (مرز)
بەس‌ڕووین: >بـەسـت‌چـوون، پـەنـابردن؛ بەست دانیشتن، هانابردن. (بست نشستن)
بەسکیتباڵ: [ناو]یـاریی دوو دەسـتەی پێـنج نەفەری لە زەویی تایبەتدا. (بسکتبال)
بە سکیتبالیست: [ئاوەڵناو+نـاو]کـە سێک‌کـە کایەی بەسکیتباڵ دەکا. (بسکتبالیست)
بەسڵامەت: بێ‌مـزەڕەت؛بـێ‌وەی؛ بـەسـاغی؛ جوابی خوداحافیزی؛ بەدوعا. (بسلامت)
بەسڵامەتـی: بـەلـەش‌سـاغی؛ بـەخێریـەت؛ توسڵامەتبیت؛تەعاروفی پێش خواردنـەوی-

مەی. (بسلامتی)
بەسڵک: [ناو+ ئاوەڵناو] (١) سەهۆڵ. (یخ) (٢) بەستەنی؛ دۆندرمە. (بستنی) (٣) سەهوڵبەندان. (یخبندان)
بەسڵکە: بەسڵک: بەستەڵەک.(یخزده)
بەسلەمە: (مەلە(ماخ)ی تورکییەوە هاتووە. دابەستراو؛دابەستە؛تەغەر بۆ دابەستنی ئاژاڵە کە بۆ قەڵەو بوون دابەستە دەکرێ.(بستەشدە؛ پروار)
بەسمین: [ناو،ت] لێوکەن؛ بزە؛ کەنین. (لبخند)
بەسە: [ناو](١) بەستە. (بستە) (٢) حودوودی بەینی دوو مەزرا؛ بەستێن. (مرز) (٣) قەراری تایبەتی لە قوماردا هەرکەس ئەو دەستەی(عوین) بردەوە ئەو پارە هی خۆیەتی. (بستەدر قمار)
+ بەسە: (١) کیفایەتە؛ ئەیترنا؛ ئەوەم بەسە. (کافی است) (٢) بەستە؛ بەسراو؛ داخراو. (بستە)
بەسەختی: [بەند] بەدژواری؛ بەچەتوونی؛ بەسەخڵەت. (بسختی)
بەسەر: (١)[ئاوەڵناو] حازر؛ ئامادە؛ خەرمانەکەم بەسەرە. (آمادە) (٢) بەفری بەستوو؛ بەفرەبەسەرە ناچەقم. (یخ بستە)
بەسەراچوون: [چاوگە،ت]چوون بە سەر کەسێکدا لەکاتی کردنی کارێکدا. (مچ گرفتن)
بەسەراکەوتن: [چاوگە،ت] (١) دۆزینە وە. (پیداکردن)(٢)کەوتن بە سەرشتێکدا.(افتادن روی چیزی) (٣) بەسەرمیراتداکەوتن؛ بەدەستهێنانی ماڵی موفت. (مالی بدست افتادن)
+ بەسەراهاتن: [چاوگە،ت]ڕووداوییێک بە سەردا قەومان؛ ئاخ چیم بە سەرهات. (بەسر آمدن)
بەسەربردن: [چاوگە،ت]ڕابواردن؛ ژیان؛ زینگانی کردن؛ تەواوکردن. (بسر بردن)
بەسەرپاییێکەوە: سووکە سەردان؛ چوون بۆ ماوەییێکی کوورت. (کنایە. یک لحظەرفتن و سرزدن)
بەسەرپەڕین: [چاوگە،ت] (١) ئەسب سواری مایین بوون. (جفتگیری‌اسب) (٢)پیاوێ کە بە سەر ژنەوە بگیرێ.(کسی‌کەبازنی گرفتە شود)
بەسەرچوو: (١) (ب) ڕۆیشت و لێبووەوە؛ لە سەرلاچوو؛ تەواوبوو. (گذشت) (٢)بەسەرچوو؛ فریوی‌خوارد؛ بەسەهوچوو؛ بەهەڵەچوو. (فریب خوردن)
بەسەرخولانەوە: ئەوەندەسەرم دێشێ بە سەر دەخولێمەوە. (باسر چرخیدن)
بەسەردابڕین: [چاوگە،ت]داسەپاندن بە زۆر؛ کچێ خۆی بەسەرشوۆڕشدا بڕی: خۆی بڕی بە ملیا (تحمیل کردن)
بەسەردادان: [چاوگە،ت](١)لە سەری کەسێک ڕاکێشان و لێدان. (توی سرزدن) (٢)خۆ داسەپاندن و بە میوان بوون بە ناوەخت و لە ناکاو. آوار کسی شدن) (٣) مەدە بەسەر ماڵەکەیدا قەڵب و چرووکی مەکە.(توی سرمال زدن) (٤) هێرش‌بۆبردن؛ هەڵکوتانە- سەر. (حملە کردن)

بەسەردا دانەوە: [چاوگە،ت]شتی وەرگێڕاو یا کڕدراو کەبەدڵیان نەبێ و بیبەنەوە بۆ ساحێبی پێشووی(پس‌دادن)

بەسەردا قیژاندن: [چاوگە،ت]هەڕەشە و تووڕەبوون و سەرکۆنە بە دەنگی‌بەرز؛ بە سەرداگوڕاندن؛ نەڕاندن بە سەردا. (هوار کشیدن برسر کسی)

بەسەرداکردن: [چاوگە،ت](١)شتی لە بە-رکردن بە سەر جلوبەرگێکی‌تردا؛ شتی‌کردن بەسەر شتێکی تردا؛(بەتن‌کردن‌لباس برروی-لباس‌دیگر) (٢)بە سەردا ڕژاندن. (ریختن بروی)

بەسەرداهاتن: [چاوگە،ت]لەپڕ؛ ناکاو؛ نشکێڤە؛ بەسەرداکەوتن؛کارێک بەسەردا قە-ومان. (ناگهانی)

بەسەرداهاتن: [چاوگە،ت] (١)سەرکۆنەکردن سرزنش‌کردن(٢) بیرۆکە یان هەوەسی کارێک کەوتنە مێشک. [بە مغز خطورکردن]

بەسەرزگەوەچوون: مردنی ژن بەدەم منداڵ بوونەوە. (سرزا رفتن)

بەسەرکردن: [چاوگە،ت]ڕەوان‌کردنی پێچ و مۆرە. (روان کردن پیچ و مهره)

بەسەرکردن: [چاوگە،ت]بەرز ڕۆیشتنی گوللە؛ (سرکردن گلوله)

بەسەرکردن: [چاوگە،ت]ژماردن؛ سەرحیساب بوون. (حساب کردن). (٢) سەرلێدان؛ هەواڵ پرسین؛ ئەحواڵ پرسین. (ملاقات رفتن)

بەسەرکردنەوە: [چاوگە،ت]سەرلێدان؛ لێپرسین؛ لێ توێژینەوە. (بازدید. پرسیدن احوال)

بەسەرگێڕان: سەرلێ‌شێواندن و ڕاگرتنی کاری کەسێ. (دست بسر)

بەسەروبەر: [ئاوەڵناو] ڕێک و پوخت و پاڕاو؛ماڵێکی بەسەروبەر و مورەتەبە؛ بەنەزم و نیزام. (منظم)

بەسەروبەرەوە: (١ب)بەیەکجاری. (یکجا؛باسروبر)(٢)بە خۆیەوە و بەسەمەرەکە-یەوە.(باسروبر)

بەسەروبەرەوە تیاچوون: (ب) دوایی هاتنی بنەماڵە؛ قڕتی‌کەوتنی بنەماڵەیێک؛ لەبەین-چوونی گیان و ماڵ‌بەیەکجاری. (ازبین‌رفتن جان و مال)

بەسەر و زمان: [ئاوەڵناو] زیرەک و وریا و قسەزان و خۆڕێک‌خەر.(زیرک‌وزبانباز)

بەسەرهاتن: [چاوگە،ت](١) وەختی شتێ تەواو بوون؛وەک > بەسەرچوونی ماوە. (بەاتمام رسیدن) (٢)(بە سەر هاتن) تۆ ئیشارە بکە بە سەر دێم نەک بە پا. (باکلەآمدن) (٣) قەومان؛ نازانی چەم بەسەرهات. (پیش-آمد؛ بسرآمدن)

بەسەرەو ڕۆیین:[چاوگە،ت]سەرەنگری‌بوون. (باسر بجلو رفتن؛ سکندری)

بەسەرهەڤ: [ناو](١) سەلەم. (پیش خرید) (٢)بەسەریەکەوە؛سەرجەم.(کلی؛ سرجمع)

بەسەزمانی: [ناو](ب) لێقەوماوی؛ هەژاری؛ بەستەزمانی؛ بێ‌سەروزمانی. (حالت زبان بستەبودن)

بەسی: [ناو]گۆزە؛ جەڕە. (کوزە)کەسێک‌کە لە بەستدابێت؛ پەنا بردوو؛ بەستنشین؛ هانا بردوو؛ لەبەستدا دانیشتوو. (بەستی)

بەسیٚ: ناوی ئافرەتانە. (اسم زنانه)
+ بەسیان: (۱) بەسیٚدانە؛ بەسیٚ کەس؛ شەڕەکە یەک بە سیان بوو. (سەتایی) (۲)[چاوگە،ت] بەستن؛ بەسران؛ داخران. (بستن) (۳) بەسیان کرد: تەواویان کرد. (تمام کردند) (۴)[ڕابوردووی بەستن] دووکانەکان بەسیان؛ داخریان؛ دایان خست.(بسته شدند) [چاوگە،ت] بەسران؛ داخران؛ بەستن. (بستن)
بەسی کە: بی بڕەوە؛ تەواوی کە. (بس کن)
بەش بڕاو: [ناوی بەر]بیٚبەش؛ بیٚوەری؛ ئافەروٚز. (بی بهره؛ عاق)
بەشبەش کردن:[چاوگە،ت]پشک پشک کردن؛ پاژ پاژکردن؛ پارپار کردن.(قسمت قسمت کردن)
بەشت: [ناو]کاریٚتەی خانوو. (بالار)
بەش چوونەوە سەر بەشان: نزاو دوعای مەرگ بوٚ کەسیٚ خواستن کە پیٚش ئەوە بەشت پیٚببڕیٚت و میرات وەربگری، خوٚت بمری و بەشە کەت میراتبەرەکانی تر ببیەن؛ یا ئەوەی هەتەمیراتبەر بییا. (آرزوی مرگ خواستن برای کسی)
بەش خواردن: [چاوگە،ت] (۱) خواردنی ماڵیٚکە بەرکەسیٚک کەوتووە. (۲) بەناحەق ماڵ یا حەقی کەسیٚک داگیر کردن. (سهم خوردن)
بەش خوران: [چاوگە،ت]بیٚبەهرەبوون؛ ئەوەی درەنگ بچیٚ بەشی دەخوریٚ؛ ماف خوران. (سهم خوردن)
بەش خوراو: [ناوی بەر] کەسیٚک ماڵی خورابیٚت یان لی داگیرکرابیٚت؛ (زوڵم لیٚکراو، ماف خوراو). (بی بهرەشدن.؛ مظلوم واقع- شدن و خوردەشدن سهم)
بەش خوراوی: [ناو] بیٚبەشی؛ قسمەت خوراوی؛ (ب) زوڵم لیٚکراوی. (بی بهرەای)
بەشدارەکی: ئەندام بوون؛ بەشداری؛ شەریکی؛ هەڤپایی (عضوشدن)
بەشداری: [ناو] هاوکاری؛ بەشدارەکی؛ شەریکی؛ هەڤپایی. (عضویت؛ همکاری)
بەشداری کردن: [چاوگە،ت]شەریک- بوون؛هاوکاری کردن؛ئەندامبوون.هکاری کردن)
بەششاندن: [چاوگە،ت]دابین کردن؛ قایل- کردن؛ ڕازیکردن. (رازی کردن)
بەشقم: [بەند،ت]بەشقەم؛ بەشکوو؛ بەڵکوو؛ تەقاو؛ هاتوو؛ بەشکم؛ ویٚدەچی؛ بوٚی هەیە؛ دوورنییە؛ شایەد. (بلکه)
بەش کریاو: [ناوی بەر]بەشکریاگ؛ بەش- کراو.(قسمت شده)
+ بەشکوٚ: (۱) [ئاوەڵناو]) خاوەن شکوٚ؛ بەژمنیٚر؛ گەورە. (شکوهمند)(۲)بە شکوٚ: بە شکەوە لەگەڵ دوو دڵیدا. (باتردید)(۳) [ناو]بەشکوٚ. شەریکە؛ شیرکەت. (شرکت)
بەشگە: [بەند]بەشکە؛ بەشکوو؛ شایەد؛ بەشکەم؛ بوٚی هەیە؛ بەڵکوو. (شاید)
بەشلانە: [ناو]فەقیٚی فەلەیان. (فقیەعیسوی)
بەشوٚ: [ئاوەڵناو] شیٚدار؛ شوٚدار. (نمدار؛ دارای ترشح)
بە شوٚنا ڕویین: [چاوگە،ت]بە دوادا ڕوٚیشتن؛ بە شویٚنا چوون؛ کەوتنەدوا. (دنبال کردن)
بە شەرتی چەقوٚ: فروٚشتنی میوەی وەک

شووتی بەو مەرجە لەتی بکا ئەگەر چاک نەبوو نەیکڕێت. (بەشرط چاقو)
بەشەردۆست: [ئاوەڵناو] مرۆڤدۆست؛ ئینساندۆست. (انساندوست)
بەشەردۆستانە:بە شێوەی بەشەر دۆستی؛ کۆمەکی بەشەردۆستانەی گروپی مۆسیقا بۆ نەخۆشخانەی بەساڵاچووان. (بشر دوستانه)
بەشەردۆستی: [بەرهەمی چاوگە]حاڵەتی خۆشویستنی مروف و دلسۆزی و هاودەردەی بۆ خەڵک. (بشردوستی)
بەشەروەکری: [ئاوەڵناو] ڕووخۆش. (خوش رو)
بەشەری: [ئاوەڵناو] (١) گرێدراو بە ئینسانەوە. (٢) ئینسانی.(بشری‌انسانی)
بەشەن: [ناو]قەڵافەت؛ هەیکەڵ؛لەش؛ ئەندام؛ دیمەن. (جسم، هیکل)
بەشەنخۆش: [ئاوەڵناو] دلگر؛ دیمەن جوان؛ دلڕفێن. (دلگیر)
بەشەنی: بەدەنی؛ لەشی؛ پەیکەری. (بدنی)
بەشەوکردن: [چاوگە،ت] (١) بەش‌کردنەوە؛ دابەش کردن. قسمت کردن)(٢) بە شەو کارکردن سەختە؛ بەشەو کاریٚ کردن سەختە. (شب کارکردن) (٣) (ب) خەوتن؛ درەنگ وەختە با بیکەین بە شەو : واتا بخەوین. (کنایی خوابیدن)
بەشێنەیی:[بەند،ت]بەئارامی؛لەسەرە خۆیی؛ بیٚ لەزو بەز. (آرام)
بەشینی خواردن: [چاوگە،ت] (ب) فرۆشتنی حاسڵات پێش ئەوەی بگا؛ پێش فرۆشی حاساڵات لە بەر دەس‌تەنگی. (فروختن حاصل کشاورزی قبل از رسیدن)
بەعاستەم و دووبەڵا: [بەند،ت]بەئاستەم؛ زۆرکەم؛ بە هێواشی. (خیلی کم)
بەعام: [بەند،ت]گشت؛ گشت پێکەوە؛ بەکۆمەڵ؛ هەموو. (همگی)
بەعجی: [ئاوەڵناو]ترسەنۆک. (ترسو)
بەعەج: [ناو]ترس؛ خۆف. (ترس و بیم)
بەعەرز نەکەوتن: [چاوگە،ت] (ب) کالاییٚک‌کە بە سەردەستەوە بیکڕن و لە عەرزدا نەمێنێتەوە؛ پێویستی هەمووان. (کنایی‌کالایی کەروی دست ببرندش)
بەعیجین: تووڕەبوون؛ ڕەق هەڵسان. تۆقین لە ترسێکی زۆر. (عصبانی شدن.ترسیدن)
بەعیف‌تەڕ: [ناو]بادامی‌تەڕ؛ چوڵەبادام؛ (چقالەبادام)
بەغدا: [ناو] بەغداد؛ لە وشەی ئاوێستایی (بەغوداتە) واتا (خودای زانا) وە هاتووە. (بغداد)
بەغیلی پیٚبردن: [چاوگە،ت]ئێرەیی پیٚ-کردن؛ حەسوودی‌پیٚکردن . (حسودی کردن)
بەفتاچوون: [چاوگە،ت]تووڕەبوون و شەڕ پیٚفرۆشتن؛ بەگژداچوون. (گلاویز شدن)
بەفراو: [ناو،ت]بەفراف؛ (١) ئاوی بەفری تواوە. (برف آب شده). (٢) (ب) ئاوی سارد؛ سەهۆڵاو؛ ئاوی فرە چاییگ. (کنایەآب یخ)
+ بەفرماڵ: [ناوبک] ئەو کەسە بەفر دەماڵیٚ. (کسی کەبرفروبی می کند)
بەفر نیشتن: بەفر کەوتنەزەوی؛ داپۆشرانی زەوی بە بەفر بارین. (برف نشستن)

بەفروپشۆ: [ناو،ت] شلێوە. (برف و باران باهم)
بەفرو دۆشاو: [ناو،ت]زیاتر بەفری دانار دانار لەگەڵ دۆشاودا تێکەڵی دەکەن بۆ خواردن. (برف و شیره)
بەفرەبەسەر: [ناو،ت]بەفری کە بەستوویەتی و پای تیٚناچەقی.(برف یخزده کە پادرآن فرو نرود)
بەفرەخۆرە: [ناو،ت]بەفری بلۆکە و کەم کە بە سەر بەفردا بباری زووتر دەیتووێنێتەوە(برف برف خورک)
بەفرەشینە:[ناو]کاسەڵەکەشینە؛ کاسەڵەشینکە. (مرغ زنبور خوار)
بەفرەمبار: [ناو]بەفرانبار. (دی ماه)
بەفری پیری: [ناو،ت](ب) سپی بوونی موی سەر. (برف پیری)
بەفریک: [ناو]سەهۆڵدان؛ بەفردان؛ جیٚگای بەفرو سەهۆڵ.بەفر ماڵ . (یخدان.پاروی برف روبیدن)
بەفرینە: (١)[ناو] بەستەنی؛ دۆندرمە. (بستنی) (٢) [ئاوەڵناو] هەر شت گرێدراو بە بەفرەوە. (هرچیزی وابستەبەبرف)
+ بەفشک: [ناو]باریکایی دەست و لاق. خوارەوەی لوولاکی پێ و مەچک؛ مووچی دەست و پێ. (مچ دست و پا)
بەقر: [ناو](١) تەور؛ بێور؛ بێقر؛ بیقر. (تبر)(٢) بەور؛ بەبر. (ببر)
بەقڕ: [ئاوەڵناو] درۆزن؛ ئاوانتەچی. (دروغ گو)
بەقڕا: [بەند]بەهەقڕا؛ پێکەوە. (باهم)
+ بەقل: هاوپایە؛ هاوشان. (هم شأن)

+ بەقا:[ناو] فد: (١) دەوام؛ باقی بوون؛ حاڵەتی ماندنەوە؛سەرت سلامەت، بەقای عومری تۆ بێت. (باقی)(٢) بڕوا؛ بەقات پێناکەم: باوەڕت- پێناکەم. (باور)
بەقاڵی: [ناو]دوکانی ئازۆخە فرۆشی؛ کاری- ئازۆخە فرۆشی. (بقالی)
بەقانامە: [ناو،ت]باوەڕنامە؛ بڕوانامە. (اعتبار نامە)
بەقبەقی: [ناو]گۆزەڵەی دەم چکۆلە،کاتێ کە ئاوەکەی برژێ دەنگی بلقەبلقی لێوە دێ. (کوزەدهان تنگ)
بەقم: (١) ڕەنگ‌هەڵگەڕاو؛ ڕەنگ بڕووسقاو. (رنگ باختن)(٢) بە قوڕ کون‌وکەلینی دیوار سوواخدان؛ دەرگا سوواخدان؛ بەقوڕگرتن: وێران کردن. (ویران کردن)
بەقەستی: لەقەستی؛ بە شۆخی وگاڵتە.(ازسرشوخی)٢.بە قەستی؛ بە —دانستە؛ دەس‌ئەنقەس؛ ڤیانی؛ خوازەکی؛ لەڕووی ویستەوە. (ازقصد)
بەقەو: بەقەد؛ بەقەی. (باندازە)
+ بەقەم: [ناو]گەنم و جۆی گەیشتوو بۆ دروێنە. (گندم و جو رسیدە)
بەک: اند؛ فد: [ناو]یاریکەری دواوە لە فوتباڵ دا لە(تۆپی پا) دا. (بک)
+ بەکار: (١)[ئاوەڵناو] بەکەڵک. (بدرد خور)(٢) حازر بەکار؛ لەکارا بوون؛ بە کاردێ: بە کەڵک دێ. (آمادەکار)(٣) [ئاوەڵناو] ئازا؛ خێرا. (کاری)
بەکارئانین: [چاوگ،ت]بەکارهێنان.(بکار گرفتن)

بەکاری: [ناو] خێرایی؛ ئازایی؛ زۆرکارکەر. (کاری)
بەکاسە هاوسیێ ژیان: (ب) بە سووالٚ و سەدەقە و لە سایەی کۆمەکی خەڵکەوە ژیان. (کنایی باگدایی زندگی کردن) بە-
کتاش: (ف.مشە)(۱)نازناوی خزمەتکاری میران.(۲)ناوی عارفێکە.(۱نام خدمتکارامیران؛ ۲ نامعارفی است)
بەکڕ: [ئاوەڵناو]کاتی لە سەر هێلکە کڕ کەوتنی باڵندە. (کرچبودن)
بەکرێگرتن: [چاوگە،ت]وەرگرتنی هەر شت بۆ ڕاپەراندنی ئیش و کار لە بە رانبەر پارەدا بۆ ماوەی دیاریکراو. (کرایەگرفتن)
بەکرێگیراو: [ناوی‌بەر](۱) هەر شت بۆ ماوەیێک لە بەرانبەر پارەدا بەکرێگیرابێت. (کرایە) (۲) ئەوەی کە بە پارە خزمەتی کەسێک یا ڕێکخراوێ یا کۆمەڵێک‌بکا. (اجیر)(۳) (ب) جاسووس و نیشتمان فرۆش. (کنایەجاسوس)
بەکلک‌گوێزشکاندن:(ب) زۆربەکەیف و خۆشحالٚ. (بادم گردوشکستن)
بەکۆ: [بەند] بەکۆمەڵ؛ بەعام؛تێکڕایی. (دستجمعی)
بەکۆمەڵ: [بەند] بەکۆ؛ بەعام؛ بەتێکڕایی؛ بەگەل. (دستجمعی)
بەکوناکردن: [چاوگە،ت] (۱) (ب) بەزاندن.(۲)بەکوناکردنی نێچیر لە کاتی ڕاودا. (کنایی شکست دادن؛توی سوراخ راندن شکار)
بەکێودا دان: [چاوگە،ت] (۱) (ب) یاخی‌بوون. (یاغی شدن) (۲) (ب) شێت بوون. (دیوانەشدن)
بە کێوداکردن: [چاوگە،ت] (ب) بەشێت‌زانین؛ لەوانەبوو بیکەن بەکێودا؛ چەپڵە لێکوتان و ڕیسواکردن. (دیوانەپنداشتن)
+ بەگ: ناوی خودای هەخامەنشیان. (خدا در زمان هخامنشیان)
+ بەگا: [ئاوەڵناو] بەجێ؛ بەجا؛ ڕەوا. (بجا)
بەگانە: [ئاوەڵناو] ئاغایانە؛ وەکوو بەگ. (بیگ آسا)
بەگرتن‌دان: [چاوگە،ت]بوونە هۆی‌گرتن. (سبب بازداشت‌کسی شدن)
بەگزادە: [ناو،ت]دوو هۆزی گەورەی کوردن.(۱) تایفەی فەیزولابەگی کە لە گەورە هۆزەکانی کوردستانی ئێرانن و لە بەینی (دیواندەرە هەتا بۆکان) نیشتەجێن.(۲) عەشیرەی ناوداری بەگزادە لە ناوچەی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕن. (دو طایفەبزرگ کرد)
بەگشتی: [بەند] (۱) بەبادراوی؛ بەگرژی. (باریس زیاد) (۲) بەگشتی؛ بەهەمووان.تێکڕا؛بەتەواوی؛تەفرا(همگی؛ بتمامی)
بەگلک: لە(بەگلخ‌بەگلیک)ی تورکییەوە هاتووە، بەگییەتی و بەگێتی. (حالت‌بیگ-بوودن)
بەگوڕ: [ئاوەڵناو](۱) بەهێز؛ بەتین. (زوردار)
بەگوڕەگوڕ: بەگوڕاندن و هەراو هوریای زۆر. (نعره زن زیاد)
بەگۆشت: [ئاوەڵناو] (۱) قەڵەو. (چاق)(۲)

زەوینی نەرمانی بیٚبەرد؛ گۆشتەزەوی. (زمین نرم و بدون سنگ)
بەگۆشەیچاو ڕوانین: (۱)(ب) نازکردن؛ بەنازەوە ڕوانین. (۲) بەتووڕەییەوە ڕوانین. (باگوشەچشم نگاەکردن)
+ بەگون: [ئاوەڵناو]۱) (ب) پیاوی جەسوور و بە جەرگ. (۲) نەخەساو؛ زیاتر بۆ ماڵات دەوترێت. (خایەدار)
بەگوێ: گوێڕایەڵ؛ قسە وەرگر؛ دژی بێ-گوێ. (حرف شنو)
بەگوێچکەداهاوردن:> بەگوێدا هاوردن.
بەگوێداهاوردن: [چاوگە،ت] تێگەیاندن و بەگوێدا دان و ئیشارەپیٚکردن؛ بەگوێچکەدا خوێندن. (نصیحت کردن. حالی کردن)
بەگوێرە: لەوشەی(گوێرماخ)ی تورکییەوە هاتووە:(واتا:دیتن) لەبوار؛ بەهەڵسەنگاندن؛ بە بەراوەرد؛ بەدیتن؛ لەڕێک؛ بەپێی.(برطبق؛ بنابەنظر)
بەگەرووی شێرداچوون: (ب) بوێر و ئازا بوون. (تو دهن شیر رفتن)
بەگەم: بەکەڵک؛ بەدەردخۆر؛ بەکارهاتوو؛ گرینگ. (بدردبخور)
بەگیان گەییشتن: لە دەست ناڕەحەتی تەواو عاسیبوون؛ ئیتر بەگیانم گەییوە ناتوانم قەبووڵی کەم؛ تاقەت تەواو بوون. (بجان رسیدن)
بەگیێتی: حاڵەتی بەگبوون. (بیگی)
بەل: (۱) ماسین؛ ئاووسان؛ هەڵمسان؛ پەنمان؛ (باد کردن) (۲) بزنی گوێ لول. (بز گوش لولەای)
بەلادا: (۱)بەتەرەفێکدا(یەکیٚلە چووار تەرف).(۲) کراسەکەی کرد بەلادا کراس-کردنی(ژنان) بە بەر پشتوێندا.(یک طرف)
بەلاشە: (۱)[ناو] جۆرێک قوماشیهەرزان و خراپە.(۲) بەخوڕاییە.(نوعیپارچە؛ مفتاست)
بەلاڤکەر: [ناویبک]پەخشکەر؛ بڵاوکەر. (ناشر)
بەلاڤی: (۱) بڵاوی؛ پڕشوبڵاوی (پراکندگی). (۲) هەراشی؛ شاشی؛ وەک: قوماشی هەراش و زبر چندراو، یان مەزرای داچێندراوی کەم توو. (فاصلەداری؛ کمپشتی)
بەڵاکێش: [ناوبک] دەردکێش؛ زەجرکێش؛مەینەتکێش. (بلاکش)
بەڵاڵووێ: [ناو]بڵاڵوک. (آلبالو)
+ بەڵام: (۱) بەڵاییێک کە دێتە خوار بۆ من)؛ بەڵام لێتدا: قەزاوبەڵای من لە تۆ کەوێ(۲)وەلیٚ؛ ئەمما؛ بەڵان؛ لیٚ. (بلایم؛ ولی؛ اما)
+ بەلان: [ئاوەڵناو] وەک: پیاوی توند و تۆڵ و ئازا و چەلەنگ. (چابک)
بەڵاو: (۱) [ئاوەڵناو] بڵاو؛ پڕژاو؛ بەلاڤ؛ بڵاو؛ پڕاگەندە. (۲) بەڵات: بەڵای تۆ(بەڵاو لە من). (۱پراکندە؛ بلایت)
بەڵاوکردن: [چاوگە،ت]بڵاوکردن؛ پەخش-کردن. (پخش کردن)
بەلاوە: (۱)[بەند] لە پێشدا. من بەلاوە گەیشتم: من لە پێشدا گێەشتم. (قبلاً) (۲) تۆم بە لاوەیە: تۆ نزیکی منی، ئاگاداری منی.(پیش نزد.کنار)
بە لایخۆداتاشین: [چاوگە،ت] (ب) قازانج و

بەرژەوەندیی خۆ ڕەچاوگرتن.(نفع خـود را در نظر گرفتن)
بەلبەلاسینگ: [ناو]پەڕپەڕۆک. (پروانه)
بەلبەلەشوانی: [ناو]جۆرێک گیـای خۆراکیـە. (نوعی گیاەخوردنی)
بەلبەلیتانگ: [ناو]پەپوولە. (پروانه)
بەلبەنی: [ناو]پەلپینە؛ دۆراخ. (نوعی گیاه)
بەلچەم: [ناو] گەڵا؛ بەرگ؛وەڵگی دار. (بـرگ درخت)
بەلخ‌کوچک: [ناو] خەنەگورگە؛ گڵەوەز؛ خەنە تیلکە؛ قریژەبەرد؛ کریژەبەرد؛ گەنمەبەردیلـە؛ بیرۆبەرتک؛ خەنەبەردیلە. (گل سنگ)
بەلشـاندن: [چاوگـە،ت]هانـدان بـۆ دەسـتەو یەخەبوون و پێکدا هەڵپڕژانـدن؛ ئاوقـاکردن. (تیر کردن)
بەڵغوبۆ: [ناو،ت] پیس و بۆگەن؛ چڵکن و بۆن ناخۆش.(چرکین‌وبوگندو)
بەڵغە: [ناو] بەڵغ؛ بەڵخ؛ دووکـەڵ و ڕەشـایی کە لە سەر شووشەی چرا نـەوتـی دەنیشـێ؛ بەڵغی حەوز؛ قورم. (بلغ؛ دوده)
بەڵغی: [ناو] سەرەتای چنینی بەڕە و مافوورە. (ابتدای بافتن قالی)
بەلفاندن: [چاوگە،ت]خڵافاندن؛ فێڵوتەڵەکـە لێکردن؛ خاپاندن. (گول زدن)
بەلاف: [ناوی‌بک]خڵافێنەر؛ خاپێنەر. (گـول-زن)
بـەلقانـدن : [چاوگـە،ت] بڵقانـدن؛ دەنگـی-هەڵقوڵینی ئاو؛ بڵق‌دان؛ بڵقەی ئاوێ کـە لـە زەوی هەڵدەقولێ. (صدای آب که از چشـمه جوشد)

بەلقاندن: [چاوگە،ت]قەڵەشاندن؛ قەڵاشـتن. (شکافتن)
بەلقەتین: [چاوگە]قەڵـەشـان؛ قـەڵـەشـیان. (شکافتن)
+ بەڵگ: [ناو]بەرگ؛ گەڵا؛ وەڵگ. (برگ)
بەڵگ‌چاو: [ناو] پێلووی چاو. (پلک چشم)
+ بەڵگە: [ناو] وەرەقە؛ پەڕە. (ورقه)
بەڵگی‌لووت: [ناو،ت]پەڕەی‌لووت. (پرەدماغ)
بەڵمەڕیشە: [ئاوەڵناو] (ب) ڕیشی پانی تێک-ئالاو. (ریش پهن آشفته)
بەلوتنەک: [نـاو] پیـک؛ پیـق؛ پیکـی زوڕنـا؛ فیقەنە. (زبانەسر سرنا)
بەلۆق: تروسکەدار؛ بەبریقە. (درخشنده)
بەلوو: [ناو](١) بەڕوو.(٢) دارگەزۆ. (درخت گز علفی؛ بلوط)
بەلووچ: [ناو]خەڵکی بەلووچستان. (بلوچ).
بـەلووچکـە: [نـاو](١) بـەلووچـە؛ بـەڕوولـە؛ خڕەداری چکۆلە و کورت کە دەچـێ بـەنێـو دوو داری کونکراودا بۆ تونـدکردن وەک بـە ڕوولەی بەینی دەند و پاشـبارە لـە ئـامووردا، هەروا لە کانزایش چێ دەبێت.(٢)بەڕوولەی-بێستان. (پیم؛ میله مخروطی)
بەلووچی: [ئاوەڵناو+ نـاو] زمـان و خـەڵکـی بەلووچستان؛ گرێدراو بە قەومی بەلووچـەوە. (بلوچی)
بەلووەر:[]گۆزە. (کوزە)
بەلوەشین: [ناو]نەخۆشینی گولی. (جذام)
بەلـە: [نـاو]مـەڕی گوێچکـە درێـژ و لـوول. (گوسفند گوش دراز و پیچیده)
بەلەبۆر: [ناو] مەڕی ڕەنگ‌بۆری گوێ (ڕاست

و درێژ) (گوسفند رنگ کبود)
بەلەبۆز: [ناو](ب) گورگ. (کنایەاز گرگ)
بەلەبەش: [ناو]بزنی ڕەشی نێوچاوان سپی. (بز سیاەپیشانی سفید)
بەلەپا: [ئاوەڵناو]گورجوگۆڵ و ئازا لە ڕۆیشتندا. (سریع در راەرفتن)
بەلەتوورکە: [ناو] نەخۆشینی بەلەفیرە. (ناخوشی حیوانات)
بەڵەدێ: [ناو،بەرهەمی چاوگە]شارەزایی. (بلدی)
بەلەزوواد: [ناو]ئاڤزونە؛ ئاغزوونە. (سگک)
بەلەسوور:[ناو]کەڵەکێوی ئامالْسوور. (بز کوهی رنگ مایل بەقرمز)
+ بەلەسە: [ناو،بەر] گوێلکی بەلەسە بووە: تاراوە، بەڵام بۆ ئینسان هەر (بەلەزە) بە کاردە برێ. (فراری؛ باعجلە)
+ بەلەشین: [ناو] بزنەکێوی ئامالْشین (بزکوهی رنگ مایل بەکبود)
+ بەلەک: [ناو]گیای بەلەک.(گیاەمجو؛ شیرین بیان)
بەڵەک: [ئاوەڵناو] لە حەیوانگەلدا دوورەنگ؛ گوڵگوڵی؛ پڵینگ پڵینگ. پڵنگ و(خالْ خاڵی گەورە). (خال خال)
بەڵەکچاو: [ئاوەڵناو] خاوەنیچاوی پان کە ڕەشکێنەکەی زۆر ڕەش و سپێنەکەی زۆر سپیبێت. (چشم قرنیەسیاەو سفیدەچشم خیلی سفید باشد)
بەلەکناچی: [ئاوەڵناو] بلەژنانێ؛ ئارێلە؛ پیاوی ژنانیلە. (مرد با اخلاق زنانە).
بەڵەکی: (١)[ناو] خالْخالْبوونی بەفری کێوان؛ کاژو واژ (خال خال شدن برف کوهستان) (٢)[ناو]نەخۆشینیدوو ڕەنگ-بوونی پێست. (مرض‌برص)
بەلەگ: (١)[ناو] سەرمایە. (سرمایە)(٣) شێوەی بەرگ پۆشین. (شیوەپوشیدن لباس)
بەلەگەور: [ئاوەڵناو] (ب) بەدبەخت؛ (بەختی بەلەگەورە، بە شەو سایەقەیە و بە ڕۆژ هەورە). (بدبختی)
بەلەمرک:[ناو] ئانیسک؛ ئانیشک.(آرنج)
بەلەمکێش: [ناوی‌بک]پاپۆڕی موتۆڕی بۆ کێشانی پاپۆڕی بێمۆتۆڕ. (یدک کش)
بەلەمیسکە: [ناو]شوڕاوەی کەمی تراو. (ریزش کم مایعات)
بەلەندیربڕ:[ناو،ت]کاتی بڕینەوەی خوری لە کاوڕە مێی دوو ساڵە(برەدو سالە کە وقت پشم چیدنش رسیدە باشد)
بەلەنگازی: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە] هەژاری؛ نەداری؛ لێقەوماوی؛ بێنەوایی؛ دەسەوسانی. (بیچارگی)
بەلەوا: [بەند] لە پێشدا. (قبلاً)
بەڵەوبوون: [چاوگە،ت]بەلەدبوون؛ زانین؛ شارەزایی. (بلد بودن)
بەلی: [ئاوەڵناو]ئاشکرا؛ لەبەرچاو؛دیار؛ خویا. (آشکار)
بە لیبۆر: ئارامی؛ حاڵەتیهێدیبوون؛ هێمنی. (آرامی)
بەلیتانک: [ناو] پەپوولە. (پروانە)
بەلیتە: [ناو]ناویگۆرانییێکە.(اسم‌آهنگی است)
بەلینا: ماسیی گەورە. (ماهی بزرگ)
بەڵێنی: [ناو،ت]قەوڵی ئەرێنی؛ پەیمان؛ سۆز؛

نەهاتی گەرچی پێتدابووم بەڵێنی.« هێمن»
(پیمان؛ قول)
بەمانە: <به ئەمانە. (باینها)
بەمبا: [ناو]بۆمبا؛ بۆمب؛ بۆم. (بمب)
بەمبوو: [ناو] جۆرێک قامیشی‌هێندی. (بامبو.)
بەمجۆره: ئاوا. بەم چەشنه. (اینطور)
به مز: بەکرێ؛ به پاره. (بەکرایه)
بەمزدەر: [ناو،بک] بەکرێدەر. (کرایەدهند)
بەمزدان: [چاوگە،ت]بەموزد دان؛ بەکرێ دان. (کرایەدادن)
بەمووی‌مابوو: بەموو بەندبوو؛ کەمێکی مابوو؛ بەمووی‌مابوو بکەوێ. (نزدیک بود)
بەمینەوه: بەگریان و فینگەفینگەوه؛ بە مینگەمینگەوه. (همراەباصدای گریه)
بەن: [< بەند ١و٢](١) بەند؛ پێوەندەی؛ بەستراو؛ (سیامەند به دارەبەنێکەوه بەن-بوو)؛ (٢) گل: دوو رۆژه منت بەن کردووه بۆ ناهێڵی بڕۆم.(مانع؛ معطل) (ب) ماتڵ کردن. (٣) ڕێسمان؛ ریسراوی خوری و موو، (ریسمان) (۴) وەن؛ دارەوەن؛ دارەبەن. (درخت ون) بەناحەق: فد: دوورلەحەق و ماف؛ دوور له حەقیقەت؛ دوور لەڕاستی ودروستی. (بناحق)
بەناڕومی:[ناو] گیای تاوڵێ؛گژنیژ. (گشنیز)
بەناشرمە: [ناو] ملوانکەی‌پیاوانه.(گردنبند مردانه)
+ بەناف: (١)[ناو] بناو؛ بناوچ؛ دارێکی قورسه لەناو ئاودا دەکەویته بن‌ئاو. (درختزبان گنجشک) (٢) [ئاوەڵناو]بەناو و دەنگ؛ ناو دار. (نامدار)

بەناغ:[ناو]بناغە؛بنچینە؛ئەساس.(اساس)
+ بەنان: [ئاوەڵناو] (ب) بەخشندە؛ دڵفراوان؛دەس بڵاو؛ نان بدێ.(بخشنده)
بەنان هات و بەئاو چوو: (ب) بێسەر و شوێن بوون؛ گوم بوون. (کنایەگم شدن)
بەناوبانگ: [ئاوەڵناو] بەنێوبانگ؛ ناودار؛ بەناوودەنگ. (مشهور)
بەناوکردن: ناوی‌کەسێک لەسەر شتێ دانان؛ ماڵەکەم به ناو کوڕەکەمەوەکرد: به ناویەوه تاپۆم‌کرد. (بنام کردن)
بەن‌پرچ: [ناو،ت] بەنی زولف پێ‌بەستن. بەن جەله.بەن‌پەلکه. (بند گیس)
بەن‌پێڵاو: بەن‌کەوش. (بند کفش)
بەن‌تفەنگ: قایشی تفەنگ. (بند تفنگ)
بەن‌تەرک: بەن‌ساموۆرته. (بند ترک؛ فتراک)
بەن‌تەزبێح: بەنێک که تەزبێحی پێ دەهوننەوه. (بند تسبیح)
بەنجەله: [ناو](١) بەنی جەله پێوەکردن و هۆنینەوه. (بند ردیف کردن و نخ کردن چیزی) (٢) بەنی زولف بەستن؛ (بند زلف)
+ بەند: [ناو](١)بەن؛ تەناف؛ هەودا؛ پەت؛ (طناب) (٢) بەندی سەعات؛ بەندی کەوش؛ [پاشگر وپێشگر:بەندکەڵەوه، گەردن-بەند،رووبەند؛ (٣) پابەند؛ گیرخواردوو؛ (سەبارەت بەتوو لەم شارەبەندم)] (پایبند)(۴) [ناو]بەینی دوو ئاجۆر لەبینا سازیدا؛ بە ندکێشی: بەنکێشی: سواخ دانی بەینی دوو ڕیزه ئاجۆرلەدیواردا. (بند) (۵) جومگە. (بند) (۶)[ناو] بەربەست؛ بەند؛ بەنداو. (سد) (٧) زیندان. (زندان)(٨) گرێی ساقەتی گەنم و

قامیش. (بند) (۹) تەنافی هەڵواسراوی ئاسۆیی بۆ بەندبازی و تەنافبازی. (۱۰)سەد؛ ئاوبەند. (۱۱) وێستانەوە؛ خوێن بەند هاتن(بند)(۱۲)بەند لە ڕوانگەی دەستووری زمانەوانییەوە، قەید.(قید)

+ بەند: ماتڵ؛ گرفتار؛ کەسێک کە لە زیندان(لەبەندداببێ) وەک بەندکراو.(گرفتار؛ تاخیر؛)

بەند: [ناو] بەشێکی تایبەت لە زیندان وەک: بەندیچوار؛ (بند)

+ بەندان: (۱)[پاشگر] بەستران ،ڕێگابەندان، ڕێبەندان، پێوەبەستن، وەک خەنەبەندان، جەمدین: سەهۆڵبەندان. (بستن)(۲)کۆیبە-ند؛ گۆرانی و ستران.(بەندان دەڵێم بە زاری) (فولکلۆر). (ترانە)

بەندار: [ئاوەڵناو] بۆندار؛ خاوەنیبەن. (بودار؛بنددار)

بەنداو: [ناو]گۆل؛ ئەستیر؛ سەد. (استخر)

بەندباز: [ناویبک]تەنافبازیسیرک؛ ئەوەی لە سەر تەنافی هەڵبەستراو یاریدەکا. (بندباز)

بەندبڕ: بەنبڕ؛(ب) تێغ؛ تیغە؛ چەقۆ. (تیغە)

بەندبێژ: [ناویبک]گۆرانیبێژ؛ ئسترانبێژ. (آواز خوان)

بەندبێژی: [ناو] شایەری؛گۆرانیبێژی.(آواز خوانی)

بەندپساندن: > پەت برین > پەت بڕ.

بەندخستن: بەنخستن؛ ڕوومەت هەڵگرتن. (بند انداختن)

بهندخوە دان: [چاوگە،ت]بۆن لەخودان؛ گوڵاو لە خۆ دان؛ عەتر لەخۆ دان.(بخود عطر زدن)

بەندکران: زیندانیکران؛ گیران؛ گیریان (۲)(زندانی شدن)(۲) ماتڵ کران. (معطل شدن)

بەندکردن: [چاوگە،ت] (۱) ماتڵکردن؛ گل-دانەوە؛ بەرگری لە ڕۆیشتن.(معطل کردن) (۲) زیندانیکردن؛ گرتن. (زندانی کردن)

بەندکیدوو هەمبانی: بەندی دوو هەمانە؛ (ب)مرۆڤی بەکارنەهاتوو.(بی‌کفایت)

بەندگێڕانەوە:گۆرانیسەندنەوە.(تکرار کردن آواز خواننده دیگردرمراسم)

بەندگیس: [ناو](ف. گیو) بەنپرچ. (بند زلف)

بەندوبەس: [ناو،ت]زیاتر بۆ پەیمانی نهێنی و بەدزی بەکاردێ. (ب) ساختوپاخت. (بند و بست)

بەندوبەستچی: [ئاوەڵناو+ ناو،بک] کاری-کەسێک کە بەند و بەست دەکا. (ب) دەستوگوێبڕ. (بند و بستچی)

بەندوشک: [ناو]بەنیەخە. (بند یقە)

بەندە: (۱) بەنی؛ کۆیلە؛ واتا: من، بە تەوازوعەوە؛ (۲) گیرە؛گیراوە؛ ؛ دەستم بەندە. (غلام؛ بندە؛ بند است)

بەندەری: [ئاوەڵناو] فد: هەر شت پێوەندی بە بەندەرەوە ببێ؛ گورانیی بەندەری؛ ڕەقسی بەندەری. (بندری)

بەندەڤان: [ناو]بەندوان؛ زیندانەوان؛زێرەوان (زندانبان)

بەندەک: [ناو]لنگەبار. (یک لنگەبار)

بەندەک: [ناو] بەز و چەورایی سەر لاتە-

ڕافەی ئاژاڵ.(چربی‌روی دنده وشکم‌حیوان.
بەندەمان: [ئاوەڵناو]مەحتەل‌مان و لە سەر وێستان؛ چاووڕێ. (منتظر)
بەندەمانی: [ناو]چاوەڕوانی.چاوەنواری.(انتظار)
بەن‌دەمبێن: [ناو]بەنی بەستنی دەمبێنیی گاگێرە. (نخ بستن دهان بندگاو)
+ بەندەوار: [ئاوەڵناو] (١) چاوەڕێ؛ بە هیوای کە سێک بوون. (منتظر)(٢) زیندانی؛ دیلی؛ بەندی.(زندانی)(٣) وەک کۆیلە.(غلام‌آسا)
بەندهەڵگرتن: [چاوگە،ت](١) جۆگە کێشان لەلای ژوورەوەی چۆم یان لە چاوانەوە بۆ سەر مەز را.(جوی آب کشیدن) (٢) ڕوومەت هەڵگرتن بە بەن. (بند انداختن)
بەندەهۆن: [ناو،ت]بەنەخوێن، هۆجەنە؛ دۆخین؛ بەن‌شەرواڵ. (بند شلوار)
بەندەیی: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە] بەندەگی؛ خوڵامی؛ حاڵەتی بەندەبوون. (بندگی)
+ بەندی: [پاشگر] (١)ڕاگیراو؛ زاوابەندی؛ (٢) دەستەکردن، بەش‌کردن، جیرەبەندی؛ دەستەبەندی؛(٣) جیٚ‌کەوتن؛ ئاوبەندی مۆتۆڕ.(٤) کون‌گرتن؛ ئاوبەندی.(بندی)
بەندیخانەوان: [ناو،ت] زیندانەوان؛ پاسەوانی بەندیخانە. (زندانبان)
بەندی‌دڵ‌پچڕان: [چاوگە،ت]بەندی‌دڵ‌بڕیان. (ب) دڵ داکەوتن لە خەبەرێکی جەرگبڕ یان داچڵەکانی زۆر.(بند دل پارەشدن)
بەندیرە: > بەندێر.
بەندی‌گوارە: [ناو] زریزەیان قەیتانی‌کە گوارەی قورسی پێدا هەڵدەواسرێت‌کە گوێ ئازار نەدا. (بند گوشوارە)

بەندیل: (١) پیاسکە؛ بوخچەی چکۆلە. (بقچەکوچک) (٢) لەگەڵ (بار) دا دێ.
باروبەندیل: کەل‌وپەلی‌کە پێچراوەتەوە بۆ بارکردن. (بار و بندیل)
بەندی‌مارکرنیٚ: پەیمانی ژن‌مارەکردن. (عقدنکاح)
بەندی‌ناوک: [ناو]ئەو لوولەکە بژیو دەگەیێنێتە ئاوەلمە کاتیٚ لە منداڵدانداییە. (بند ناف)
بەندیوار: پەیوەند؛ بەندیواری: پێوەندی، نزیکی. (بستگی)
بەنزوئەن: [ناو] ناوی عیلمی ڕۆن‌بادامی تاڵ. (بنزوئن)
بەنزین: [ناو] بێنزین؛ تراوێکی ئاوربەرە کە لە زۆربەی سەیارەومەکینەدابەکاری دێنن بۆ سووتاندن لە مۆتۆڕیاندا (بنزین)
بهنژین: [ناو]باویشک. (خمیازە)
بەن‌ساماتە: [ناو] بەن‌سامۆرتە؛ بەن‌تەرک. (فتراک)
بەن‌سەعات: [ناو،ت] بەندی‌کاتژمێر؛ قایش یا زنجیر یا دەسبەندی کاتژمێر. (بند ساعت)
بەنشتۆک: [ناو] بنێشتۆک؛ دارەبەن؛ دار قەزوان؛ داربنێشت. (درخت ون)
بەن‌شەواڵ: [ناو،ت] بەن‌شەرواڵ؛ دۆخین؛ هۆجەنە. (بند شلوار)
بەن‌قادە: [ناو،ت] بەن‌کەڵەوە. (بند چنبرە)
بەن‌کاڵە: [ناو،ت] بەنێک‌کە کاڵەی لە پادا پیٚ توند دەکەن. (بندگالە)
بەن‌کڵاوە: [ناو،ت] بەن‌کەڵەوە. (بند چنبرەگاو)

بەن کەڵـەمـە: [نـاو،ت] بـەن کـەڵـەوە. (بنـد چنبرەگاو)
بەن کەوش: [ناو،ت] قەیتانی قۆندەرە؛ بـەنـی کەوش. (بند کفش)
بەنکـەی شـاخ: [نـاو] گرێـی شـاخی ئـاژەڵ (گرەشاخ)
بەنکـی خسـتۆک: [نـاو،ت]گـریێ پووچکـە. (گرەکور)
بەنگـاڵی: [ئـاوەڵنـاو+نـاو] زبـان و خـەڵکـی بەنگاڵ. (بەنگالی)
بەنگـبوون: [چاوگە،ت](١) بـەنـدبوون. (بنـد شـدن) (٢) بێهـۆش‌بـوون و مـەنـگ‌بـوون. (معطل شدن. بیهوش شدن)
بەنگ کێش:[ئاوەڵناو+ ناو،بک] خووگرتوو بـە کێشانی بەنگ، فێـری کێشـانی بـەنگـە یـا بەنگ دەکێشی. (بەنگی)
بەنگۆڵە: [ناو] مێتولکە. (نوزاد پشی)
بـەنگـەژ: [نـاو] ڕوخسـار؛ دیـم؛ دەم و چـاو. (صورت)
بەنگەی‌شاخ: [ناو] بەنکەی‌شاخ؛ گرێی‌شاخی ئاژەڵ. (گرەشاخ حیوانات)
بەنگەی‌ناخوون: [نـاو] جومگـەی‌قامک؛یـە- کەمین گرێی‌سەر قامک(بند سر ا نگشت)
+ بـەنگـین: (١) هـاوارکردن؛ گـازی کـردن؛ بانگکردن. (هوار) (٢)ناوی هاوڵی مـەم، لـە- کتێبی مەم وزیندا. (دوست مم)
+ بەنگین: [ئاوەڵناو] عاشق. (عاشق)
بەن‌مووتاوین: [ناو] مـووی‌بـادراو؛ بـەنـدروو. (بند دوختن جوال)
بەننە: [ناو]کۆیلە؛ بەنی؛ بەنـدە؛[جێنـاو] بـە- ڕێزەوە لە جیاتی من دەگوتریٚ. (بندە؛غلام)
بەنۆش: [ناو] گیای وەنـەوشـە؛ (دژی یـاوە). (بنفشە)
بهنـۆک: [نـاو] گوڵـاو؛ خـاوەن‌بـۆن؛ بۆنـدار. (گلاب؛ بودار)
بەنۆکە: [ناو] دارەبەن؛ داربەنۆک؛ بەنیشتۆک؛ دارقەزوان. (درخت ون)
بهنۆڵێدان: عەتر لێدان. (عطر زدن)
بەنووشت: [ناو] بنێشت؛ جاچکە. (سقز)
بەنووکە: [ناو] بەنۆکە؛ دارەبەن. (درخت ون)
بەن‌هاتن: [چاوگە،ت] وێستانەوە وێسـتانەوە؛ دووایی‌هاتن؛ خوێنی لوتم بەر ببوو بەن‌هات، یا بەند بوو. بڕایەوە. (بندآمدن).
بەنەفش: [ناو]بەنەوش. (بنفش)
بەنەک: [بەند]پشووێیک؛ دەمێک؛بە ینێک؛ هەناسەێیک. (نفسی؛ دمی)
بەنەوش: [نـاو]بـەنـەفـش؛ ڕەنگـی(سـوور و شین)ی تێکەڵاو. (بنفش)
بەن‌هەڵکردن: [چاوگە،ت] بەن‌کۆوەکـردن و بە گوڵۆلە کردن. (کلاف کردن ریسمان)
بەن‌هەڵگرتن: [چاوگە،ت](١) جۆگـە کێشـان بۆ ئاو پێـدا چـوون. (جـوی آب کشـیدن)(٢) مـووی دەموچـاو بـەڕێسـمان هـەڵکێشـان. (بنداناختن)
بەنی‌زاوا: [ناو] زاوا ڕێوی؛ زاوابەندی. (دامـاد سر خانە)
بەنێو: [ئاوەڵناو] بـەنـاو؛ بـەناوبانـگ؛ نێـودار. (مشهور)
بـەنیـوان: [نـاو] زیندانـەوان؛ بـەنـدەڤـان.

(زندانبان)
بەنێوبانگ: [ئاوەڵناو] ناسراو؛ نێودار. (مشهور)
بەن‌یەخە: [ناو] بەرکۆزە. (بندیقه)
بەو: (۱) [ئاوەڵناو]بەد؛ خراپ. (بد) ۲) بەئەو. (باو)(۳) وەرە(بیا)
بەوا: [ناو] بووا؛ بابە؛ باب؛ باوە؛ باوک؛ باوکە. (بابا)
بەوا: (۱)[ئاوەڵناو] بەبا؛ (دێل)ماسەگی نێرخواز. (وقت جفت گیری سگ ماده) (۲) بەوا؛ بە ئەوا؛ بەئەودا؛بەوا بۆم بنێرە. (وسیله‌او)
بەوار: [ناو] چەوتی؛ چەفتی؛ خواری. (کجی)
بەواسی: [ناو] بێوەسیری. (بواسیر)
بەوپێودانە: (ب) بەو ڕەوشتە؛ بەو پێوانە؛ بەو پێوەرە؛ بەو ڕەوتە. (از روی این معیار)
بەوجۆرە: بەو جوورە؛ بەو چەشنە؛ بەوی ئاواهی. (آنطور)
+ بەور: [ناو] بوار؛ گوزەر. (گذار)
بەور: (۱) [ئاوەڵناو] بهوج؛ گەوج؛گێل. (احمق)(۲) [ناو] بەبر. (ببر)
بەوروو: [ناو] بووروو کە لەگەڵ شوڵەی ئاوردا سەردەکەوێت؛ سووکەبووڵ. (خاکستر کەبەهوا بلند شود)
بەورەوە: [کاری‌ئەمری] بگەڕێوە؛ وەرەوە. (باز گرد)
بەورین: [چاوگە] ڕابووردن. (گذشتن)
بەوز: [ناو] بەڤز؛ زڤیرک؛ جۆرێ زەرگەتە و زەردەواڵە. (نوعی زنبور)
بهوست: [ناو] بست؛ بنگووست. (وجب)
بهوشت: [ناو] بەهەشت. (بهشت)

بەوش‌مل: پشتمل. (پشت گردن)
بەوناوی: [ناو،بەرهەمی چاوگە]بەدناوی. (بد نامی)
بەوون نیشتەیەرە: زەحیری خوێنی. (اسهال خونی)
بەوە: (۱) لای ئەوە بە من نییە. (پیش اوست) (۲) خراوە؛ بەدە؛ خراپە. (بد است) (۳) بەئەوە؛ بەو شتە؛ بەوە بادی هەوایە دەڵێن کورتەباڵایە. (با این)
بەوەی‌کەم: (ب) سوێند بەو کەسە. (قسم بەاو)
بەوی‌ئاواهی: بەوتەرزە؛ بەوشێوە؛ ئاوا؛ بەو جۆرە. (با آن شکل)
بەوی‌ڕەنگی: بەوڕەنگە؛(ب) بەو تەرزە؛ بەو جۆرە. (آنطور)
بەهادار:[ئاوەڵناو] فد: نرخدار؛ بەنرخ؛ بەقیمەت. (بهادار)
+ بەهاران: فد:(۱) هەموو بەهارێک.(۲) وەرزی بەهار.(بهاران خۆشە زمزیران). (۳)ناوی شارۆچکەیێکە لەشاری‌سنە. (بهاران)
بەهاربەن: [ناو] بەهاربەند؛ تەویلەی سەربەتاڵ بۆبە ستنەوەی چارەوی‌لە هەواخۆشیدا. (طویله‌سر گشاد)
بەهارخەو: [ناو] وەتاغی(ژووری) لە قاتی سەرەوەی باڵە خانەدا کە دەوری نەگیرابێ یا لایێکی نەگیرابێ. (بهار خواب)
بەهارخێر: سەرەتای شینایی گیای بەهار. (اولین سبزەبهاری)
بەهارنارنج: فد: [ناو]پەڕەی گوڵی‌نارنج؛

غونچەی گوڵی‌نارنج کـە لـە عـەترسازی و مورەبا چێکردندا بەکەڵکە. (بهار نارنج)
+ بەهـارە: [نـاو](١) نـاوی سـترانێکە. (اسـم آهنگی است)(٢) گەنمی بـەهـارە،بـەهـاروو؛ بەهارە کێڵ. (گندم بهارە)
بەهارەکانی: [ناو]کانیە درۆزنە؛ کوێرەکانی کە هاوینان وشک دەکا. (چشمەای کەفقط بهـار آب دارد)
بەهاری‌ئـازادی: فـد: نـاوی سـکەی زێـڕی ئێران. (بهار آزادی)
بەهاز: :[ئاوەڵناو، بەهێز؛ زۆردار. (باقدرت)
بەهایی: فد:[ناو]پـەیـڕەوی دینـی بـەهـایی. (بەهایی)
بەهایی‌گەری: فد: بەهاییەت. (بهائیگری)
بـەهاییـەت: فـد: [نـاو] دینـیٚ کـە ساڵی(١١٩٦کۆچی) حوسەینعەلی نووری واتە بەهائوڵا هێنای وئیدیعای وابوو کە هـەر ئـەو کەسەیە کە عەلی موحەممەدی‌باب موژدەی هاتنی داوە. (بهائیت)
بەهاندن: [چاوگـە،ت]ترسـاندن؛ گێژکـردن؛ وڕکردن. (ترساندن)
+ بـەهتـین: [چاوگـە]ترسـان؛ واق وڕمـان. (بوهت)
بهجین: [چاوگە] بێهجین. (١) تووڕەبوون.(٢) تـۆران؛ وەڕەزبـوون؛ هـیلاکبـوون. (قهـر کردن؛ خستەکردن)
+ بەهرە: تد: فد: [ناو] سووت؛ سوود؛ نزوول؛ ڕیبا؛ (١) سوودی بانگی.(٢) بەهرە و سوودی پوولی بە ڕیبا و نزوول دراو. (بهرە)
بەهرەچە: [ناو] سەمەرە؛ داهات. (درآمد)
بەهرەک: [ناو]بەش؛ پشک. (سهم)
+ بـەهـرەمـە: [نـاو](١) دڕێـڵ؛ برغـوو.(٢) سەری‌دڕێڵ، مەتە؛ بەهـرەمـەی‌تایبـەت بـە دیوار و ئاسن و چێو. (دریل. متە)
بەهرەوەر: فد: :[ئاوەڵناو]بەهرەمەنـد؛ بـەهـرە بردوو؛ بەهرە وەرگرتوو . (بهرەور)
بەهرەوەری: [ناو]حاڵەتی بەهرە وەرگرتوویی؛ بەهرەمەندی. (بهرەوری)
بەهمەن: [ناو](١) ناوی مانگی یازدەهـەمـی ساڵی هـەتـاوی. (٢) وەهمـەن؛ یـەکـیٚ لـە ئەمشاسپەندان.(٣) کلیلـەبـەفـر؛ ڕەنیابـەفـر؛ ڕنوو.(۴) ناوی پیاوانە. (بهمن) (۵) بیر و خە-یاڵ چاک؛ ()نیک اندیش
بەهناف: ناوچاک؛ ناوە بۆ پیاوان. (بهنام)
بەهۆرە: :[ئاوەڵناو]خاوەن ئیرادە؛ بـەورە. (با ارادە)
بـەهـۆش‌هاتنـەوە: [چاوگـە،ت]هـۆش‌بـە بەرداهاتنەوە؛ دژی‌بێهۆشی؛ وشـیار بوونـەوە؛ ئاگادار بوونە. (بهوش آمدن)
بەهۆک: [ناو]بەهیٚ؛ بیٚ؛ بەی. (بە)
بەهووردە :[ئاوەڵناو] بلیمەت؛ بەسەلیقـە. (با سلیقە)
بەهەست‌وپێستەوە خواردن: خواردن بە ناوک و پێستەوە؛ خواردن (بەهەسـتە و پێسـتەوە)؛ (ب) خواردن بە یەکجاری. (یکجا بلعیدن)
+ بەهەشت: فد: [ناو]لە ئاوێستادا وەهەشـت هاتووە واتا جەننەت؛ (ب) گـوڵزار و جێگـای خۆش و بەدیمەنی پیٚدەشوبهێنن. (بهشت)
بهەڤ: [بەند] پێکەوە. (با هم)
بهەڤ شابوون: [چاوگە،ت]بەیەک گەیشـتنی

دوو خۆشەویست و دڵدار؛ بەدیتنی یەک شاد بوون. (بدیدار هم شاد شدن)
بەهەڵم: (١) بەهەڵم و بۆغ. (دارای بخار) (٢) [ئاوەڵناو] بەهەڵمەت؛ خێرا. (تیز چنگ)
بەهی: [ناو](١) ماتەم؛ ئازیەتی؛ ڕەشپۆشی؛ پرسە. (عزا؛ تعزیە)(٢) ژاکاو؛ چرمسی. (پژمردە).
بەهیپۆش: :[ئاوەڵناو] ڕەشپۆش؛ عازیەتبار. (سیاەپوش)
بەهێسانی: بەئاسانی. (بەآسانی)
بەهیڤتەڕ: [ناو] چوولەبادام؛ تەڕەبادام. (چاقالەبادام).
بەهین: (١) هەڵبەز و دابەز. (جست وخیز) (٢)بە هین: بە وانێک؛ بە شت. (بە چیز) چرمسین؛ سیس‌بوون؛ ژاکان .(پژمردن)
بەهێندگرتن: گرینگی‌پێدان؛ بەگرینگ‌زانین؛ پۆیتەپێدان. (اهمیت‌دادن)
بەی: بەیی (١) بەدی؛ بەڵێ؛ با. (آری) (٢)بێی؛ (بەقوربان کەردەی ناڵەی ڕەنگ نەی، چێش مەبۆ ئەربەی وەی پەی من ئەر نەی). «مەولەوی» (بیایی)
بەی: (١) بە؛ بەو؛(بەی جیلوەی جەلالیتەوە): بەو جیلوەی جەلالیتەوە. (٢) بدەی؛ ئەتوانی کتێبێ بەی بەمن؟ (بدهی) (٣) وەرە؛ بێ (بیا) (۴) بەهی. (بە)
بەیا: [ئاوەڵناو] بێفایدە. (بیفایدە)
+ بەیات:[ئاوەڵناو] (١)کۆن؛ ماوە؛وەک : نانی بەیات. (بیات) (٢)[ناو] ناوی چەند مەقام (دەستگاە) ی ئێرانی لە مۆسیقادا وەک بەیاتی‌زەند (تورک)، بەیاتی‌ئیسفەهان، بەیاتی‌کورد، (کورد بەیات). (نام چنددستگاەموسیقی ایرانی)
بەیاتی‌کورد: [ناو]ناوی مەقامێکە لە مۆسیقای ئێراندا. (کورد بەیات) (دستگاەبیات کرد)
بەیاربڕ: [ناوی‌بک]بوورەکێل. (کسی کەزمین بایر را شخم می کند.)
بەیاز: [ناو](١)دەفتەری شیعر. (دفترشعر) (٢)داشی دۆمینەی سپی (بێ خاڵ). (طرف سفید مهرەدو مینە)
بەیان بەربوون: [چاوگە،ت]ڕۆژ بوونەوە.(آمدن سحر؛ صبح‌شدن)
بە یانیان: [ناو،ت](١) سبە ینان. (٢) [بەند]هەموو بەیانییێک. (صبحها. هر روزصبح)
بەیانی‌باش: بەیانی بە خێر. (صبح بخیر)
بەیانی‌دا: ڕۆژ بووەوە؛ بەیان بەربوو (لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان، بەیانی-دا سپیدەی باغی سێوان) «نالی» (سحر شد)
بەیایی‌کردن: [چاوگە،ت]یادکردن. (یاد کردن)
بەیتار:[ناو]بەیتاڵ؛دوکتۆری‌ئاژەڵ.(دامپزشک)
بەیتاک: [ناو] چۆلەکە. (گنجشک)
بەیتاڵ: [ناو] بەیتار. (دامپزشک)
بەیتک: (١)چۆلەکە. (گنجشک)(٢)شتی بێ-سود و بێ‌کەڵک. (اشیاء بی فایدە)
بەیت‌وباو: [ناو،ت] (ب)دەنگۆ داخستن؛ قسە هەڵبەستن؛ تۆمەت و درۆ و دەلەسە؛ بەیت‌و بالۆرە؛(برای کسی‌حرف درستکردن)
+ بەیتەشە: (١)[ئاوەڵناو] سەرکێش؛ وەک:ئەسپی سەرکێش؛ قاتریێ کە بۆ سواری و بارلێنان ڕانەوەستێ. (اسب و قاطر سرکش)

(۲) دەمهەراش و بێحەیا. (زن زبان دراز و بد دهن)(۳) بیٚ چاو و ڕوو. (ناسپاس و بی چشم و رو)
بەیتیبلە: (ب) درێژە پێدان؛ نەبڕانەوەی ڕووداو یان قسە. (کنایەمانند خون‌سیاوش)
بەیتی بەشکردنیئاو: لە هەورامانی کۆندا بەوتنی بەیت ئاویان بەش‌دەکرد؛ ڕەنگە لە جیاتی کاتژمێر بووبێت. (آهنگ سهمیەبندی آب)
بەیدانە: [ناو]ناوکیبەهیٚ بە برژاوەکەی دەڵێن: ئەنجووجەک یان بەیجووجەک. (دانەبە)
بەیداماڵی: [ناو] دارهەنجیرێک کە بەری ئەوەڵی بوەریٚ و چەند دەنکی پێوە بمێنیٚ. (درخت انجیرکە میوە اش ریختە باشد)
بەیر: [ناو] بەهرە؛ سەمەر. (بهرە)
بەیستار: [ناوبک] بیسەر؛ شنەوا؛ گوێدەر. (شنوا)
بەیستۆک: [ناو] بهیستوک؛ کەرەستەی بیستنی دەنگ وەک گۆشیی تەلەفۆن. (اسباب صوتی و گوشی تلفن)
بەلیسە: [ناو]سەهۆل؛ یەخ؛ چلوورە. (یخ؛ دنگالە)
بهێڤرا؛بهەڤرا: [بەند] بەیەکەوە؛ پێکەوە. (با هم)
بە یەکرِێیان: [بەند] بەیەک‌جێیان؛ بەیەکجاری؛ تێکرِا؛ پێکرِا؛ بەیەکرِا؛ بەیەکەوە: پێکەوە. (با هم)
بەیەکرا: [بەند]بەجاریٚ؛ تێکرا؛ بەیەکەوە. پێکەوە؛ بەیەکجار. (با هم)
بەیگەیشتن: (۱) پیٚگەیشتن. (باورسیدن)(۲) بەهیٚگەیین.(رسیدن‌بە)
بهێنە: [کاریئەمری لە چاوگەی هاوردن] بێنە؛ باوەرۆ؛ بێرا؛ (بیار)
+ بەین: [ناو] پەیمان؛ (مـن دوور و تـۆ دوور بەینیٚبەستین) (فولکلۆر) بەینەت. (پیمان) لەهەندیٚ جیٚ بە(دوور) مانا کراوە بەڵام لەم شێعرەدا واتای عەهد و پەیمان دەدا.
بەینەشە:> بەیتەشە؛ بیٚچاو و ڕوو. (بی چشم و رو)
بەینیٚ: بەینێک؛ ماوەیێک؛ مەودایێک؛ پەیمانیٚ. (مدتی؛ عهدی؛ پیمانی)
بەیۆ: بێت. (بیاید)
بەیواستن: پێویستی؛ زەروری؛ خوازە. (ضروری)
بەیەخەداکێشان:کردنە هیخۆ؛ وەک: منداڵی بیانی کردنە منداڵی خۆ.(مال خود کردن)
+ بەیەکەو دان: (۱) پێکەوەنان؛ دانە دەم یەک؛(بهم چسباندن) (۲) داخستن؛ پێوەدان و جووت‌کردنی دەرکە. (بستن)
بەی هەڵگەڕیان: [چاوگە،ت]پیا هەڵگەڕان؛ پیا هەڵچوون. (بالا رفتن از)
بەیی: [ناو] (۱)بەدی؛ بەڵیٚ (بلی) (۲) خرابی؛ خراپی؛بەدی؛ بەوی. (بدی)
بەییجە: [ناو] پەیژە؛ نێردیوان؛ پەینجە. (نردبان)
بەیین: ژاکاندن؛ وشک‌کردن. (خشک کردن)
+ بی: ببی؛ بووی. (باش؛ باشی)
بیٚئابڕوویی: [ناو] بیٚئاورووییی؛ چرووکی؛ ئابڕوو نەمان؛ ئابڕووتکاوی؛ ڕوو سیایی؛ بەد

ناوی؛ ناو بە خراپە زڕاوی؛ ڕیسوایی. (بی آبرویی)
بێئار: [ئاوەڵناو] (١) بێعەیب؛> بێعار. (بی عیب)(٢) کەسێک کەعەیبەی لانییە(ب)
بێشەرم؛ کەسێک کە ئەزموونی لە عەیبە وەر نەگرتووە و تەممی‌نەبووە و عەیبەی پێ-عەیب نییە.> بێعار(بیعار)
بێئازار: [ئاوەڵناو] (١) بێدرد و ڕەنج؛ساغ(سلامت) (٢) ئەوەی‌کە عەزیەت و ئازاری بە کەس ناگا. (بی آزار)
بێئاف: [ئاوەڵناو] بێئاو؛ وشک؛ هەر شت کە ئاوی نەبێت. (بی آب).
بێئامان: [ئاوەڵناو] بێدەرفەت، بێمۆڵەت. (بی امان)
بێئاوی: [ناو] باغەکە لە بەر بێئاوی و شک بووە؛ (ب) وشکەسالی؛ کەم‌ئاوی. (بی آبی)
بێئایین: [ئاوەڵناو] بێدین؛ خودانەناس. (بی آئین)
بێئەدەب: [ئاوەڵناو] فد: فێری نزاکەت نەکراو؛ بی‌نزاکەت؛ بێئاکار. (بی ادب)
بێئەدەبانە: بەشێوەی دوور لە نەریت و نزاکەت. (بی ادبانە)
بێئەدەبی: [ناو] بێعەدەبی؛ بێنزاکەتی؛ کاری نەگونجاوکردن؛ (ب) بێئیحتیڕامی-کردن. (بی ادبی)
بێئەندازە: [ئاوەڵناو+ ناو] بێحەد؛ لە ئەندازەبەدەر؛ بێ ئەژمار؛ لە حەدبەدەر؛ بێشوو. (بی اندازە)
بێئیحتیبار: [ئاوەڵناو] (١) جێی‌باوەڕنەبوون؛ بێڕێز.(٢) بێبرەو؛ لە ڕەواج‌کەوتوو؛ بی‌کەڵک کەوتن و کات بەسەرچوون؛ بلیتەکەم دوێنی ئیحتیباری تەواو بوو. (بی اعتبار)
بێئێساف: [ئاوەڵناو] دوور لە ڕاستی و دروستی؛ کەسێک‌کە خاوەنی کردەوەی ڕەوا نییە؛ لە عەسڵدا وشە ئارەویە و لە سەر زبانی خەڵکیش وەک کوردیی لێهاتووە. (بی انصاف)
بێئیسافی: [ناو،ت]ناحەقی؛ حەق‌کوژی؛ بێ-عەداڵەتی؛ بی‌مروەتی؛ کردەوەی ناڕەوا. (بی انصافی)
بێئیشتیا: [ئاوەڵناو] بێمەیل؛ بێمەگێز؛ حاڵەتی دڵ نەبردن. (بی اشتها)
بی‌ئیشتیایی: [ناو]بێمەیلی؛ دڵ پێوەنەبوون؛ حاڵەتی دڵ‌نەبردن و حەز لە خۆراک نەکردن. (بی اشتهایی)
بێئیمان: [ئاوەڵناو] بێباوەڕ؛ کافر؛ بێدین؛ بێعاقیدە و بڕوا. (بی‌ایمان)
بیابان‌گەرد: [ئاوەڵناو] فد: بیاوان‌گەرد؛ چۆڵ-گەرد. حاڵەتی کۆچەری‌بوون لە دەشت و بیاباندا. (بیابانگرد)
بیابان‌گێل: [ئاوەڵناو] بیابان‌گەرد؛ چۆڵگە-رد.(صحراگرد)
بیابان‌نشینی: [ناو]چۆڵ‌نشینی؛ سەحرانشینی؛ ژیان لە چۆڵ و سەحرادا. (بیابان نشین)
بیانگە: بیانگ؛ بینک؛ پەڵپ؛بەهانە (بهانە)
بیانی: [ناو] (١) بێگانە. (بیگانە) (٢) بیانوو؛ بیانک. (بهانە) (٣) بەیانی؛ سبح؛ سبحا؛ سبەینی؛ شەوەکی. (صبح. فردا)
بیاوانی: [ئاوەڵناو] سەحرایی؛ پێوەندیدار بە بیاوانەوە؛ (غووڵی‌بیاوانی). (ب) دوور لە

شارسـانییەت؛ وەحشـی و ئـاداب نـەزان. (بیابانی)
بیاوە: [کاری ئەمری]بگە؛ وەرەوە. (برس).
بیاوەشەرە: [کاری ئـەمـری] ڕایخـە؛ بـەڕە و ڕایەخ ڕابخە. (پهن کن؛ بگستران)
بیاوەم: [کاری ئەمری] بمگـەرێ، بمگـەیـە؛ پێم بگە.(بەمن برس)
بیایی: [ناو](ف. گیو) سەهۆل بـەسـتنی ئـاو؛ سەهۆڵ بەستن. (یخ بستن)
+ بیبـا: (١) بیبوایـە. (میداشـت)(٢) جێگـەی بیێ؛ گلێنەی خۆم دە هێنمە خزمـەتـت بـۆم تێکە تا بیبا. «(ماموستا هـێمن» (جـا داشـتە باشد)(٣) لێگەڕێ لەگەڵ خۆی بیبـا. (ببـرد؛ ببردش)
+ بێبار: (١)[ناو،ت] کەسێک کـەبـاری نییـە. (بدون بار) (٢ ب). [ئاوەڵناو] نالەبار؛ بەدئـەدا. (ناراست) (٣) بێسەمەر؛ بێبەر. (بی بهره)
بـێبـارانی: [نـاو] بـاران نـەبـارین؛ (ب) وشکەسالی. (بی بارانی)
بێباکی: [ناو] پاوێری؛ ئازایی؛ بوێری؛ دلێری (بیباکی)
بێبال: (ف.گیو) بێدەسـت؛ دسـتکورت؛ بـێ هـاواڵ؛ بێکـەس؛ فڕنـدەی بـاڵ قرتـاو. (بیکس،بیدست،بیبال)
بێباوک: [ئاوەڵناو] (١) هـە تیو؛سێوی؛ بـاب مردوو. (یتیم)(٢) (ب) بیژوو؛ زۆڵ؛ حـەرام زا؛ حەرام زادە. (حرامزاده)
بێباوەڕ: [ئاوەڵناو] بێئیتقـات؛ بـێعـەقیـدە؛ ڕەش بین؛ ئەوەی باوەڕی بـە کـەس یـا بـە شتێ نەبێ. (بی باور)
بێبڕانەوە: [بەند] بێپسانەوە؛ لە سەریەک و بێبەین کەوتن. (لاینقطع)
بێبڕشـت: [ئـاوەڵنـاو] (١) کـول. (کنـد) (٢) زەوی یا هەر شتێکەحاسلێ چاکی نـەبێت. (بی حاصل) (٣) نەبوونی توانـایی و زافتـە و بڕڕایی لە کار و فەرماندا. (بی قاطعیت)
بێبڕوا: > بێباوەڕ. (بی باور)
بیبکە: (ف. گیو) بیبیلەی چاو.(قرنیەچشم)
بێبنیات: > بێبونیاد.
بێبنگە: [ئاوەڵنـاو]بـێڕیشـە؛ بـێعـەسـڵ و نەسەب؛ بێڕەچەڵەک. (بی ریشه)
بێبۆ: [ئاوەڵناو]بێبۆن؛ بێبوو؛ بێبێن؛ بـێ-بێهن. (بی بو)
بیبۆک: (ف. گیو) بیبیلە. (مردمک)
بێبوار لە ئاودان:(ب)بێتاقیکردنەوەی ڕێگای چارەسەری، کارێک کردن. (بی گـدار بـەآب زدن)
بێبوونیات: [ئاوەڵناو] بێئـەسـاس؛ بـێپایـە؛ بێڕیشە؛ (ب) درۆئین. (بیاساس)
بێبەرقی: (١) بـێبریقـە و تریفـە. (٢) بـێ-کارەبایی. (بی درخشندگی؛ بی برقی)
بێبەندوبار: [ئـاوەڵنـاو] بـێڕێوشـوێن؛ بـێ-دەرووەستی؛ قەفان؛ بەڕەڵا؛ بێعار.(بیبند و بار)
+ بیبی: []ناو(١) خانم؛ خاتوون. (بیبی) (٢) پوور. (عمه)
بیبیجانخانم: [ناو] هاواڵی پاڵەوانکەچەڵ لە بەزمی چادر هەڵـدانی دەسـتەی لۆتیـان لـە ڕابـووردوودا.(عروسـک لوتیهـای عروسـک گردان)
بیبیچەو: [نـاو] بیبیلـەیچـاو؛ گلێنـەیچـاو.

(قرینەچشم)
بی‌بی‌مەتۆ: [ناو] تووتی. (طوطی)
بیبێن: [ناو] بیبین؛ پشتوێن. (شال کمر)
بیٚبین: [ئاوەڵناو] (١)بیٚبیٚهن؛ بیٚسەبر؛ بیٚ-پشوو؛ بیٚن تەنگ؛ بیٚبۆن.(بی بو؛ بی صبر)
بیٚپار: [ئاوەڵناو]بیٚبەش؛ بیٚپشک؛ بیٚوەری؛ بیٚنسیب؛ ئافەرۆز. (بی سهم)
بیٚپاڵ: [ئاوەڵناو] تەنیاباڵ؛ بیٚپەنا؛ بیٚیاوەر؛ بیٚپاڵپشت. (بی پناه)
بیٚپاڵپشت: [ئاوەڵناو]بیٚلایەنگر؛ بیٚپناه؛-لانەواز و بیٚکەس. (بدون حامی)
بیٚپشتوپەنا: [ئاوەڵناو]لانەواز؛ بیٚپاڵپشت؛ بیٚکەس. (بی پشت و پناه)
بیٚپەڕبوون: [چاوگە،ت](١) هەر شت کە پەڕی وەری بیٚت. (بی‌پر)(٢) (ب) پەڕوەرین و فیز نیشتنەوە. (از آفاده‌افتادن)
بیٚپەرداخی: بیٚزەوقی؛ شیٚواوی؛ (دڵ نە گەردە لوول بیٚپەرداخیەن) (مەولەوی). (بی نشاطی)
بیٚپەردە: (١) [ئاوەڵناو] قسەی ڕاست و ڕەوان و بە ئاشکرا؛ ڕیٚک و ڕەوان. (بی پرده) (٢) هەر شت پەردەی نەبیٚ .(٣ب)بن پژاو. (بی پرده)
بیٚپەرگ: (ف. گیو) بەتاڵووکە؛ بەلەز؛ بە پەلە. (با عجله)
بیٚپەروا: [ئاوەڵناو] فد: (ف. گیو) بیٚترس؛ بیٚباک؛ جەسوور. (بی پروا)
بیٚپەروایی: فد: [ناو] پاویٚری؛ گوستاخی؛ ڕیلاسی؛ بویٚری؛ بەجەرگی؛ نەترسی. (بی پروایی)
بیٚپەڕوباڵ: [ناو] بیٚپەلوپۆ؛ (ب)[ئاوەڵناو] بیٚنەوا؛ هەژار و بیٚ قودرەت؛ (ب) بیٚ-یاریدەدەر و تەنیا باڵ. (بینوا)
بیٚپەڕە:(١) بیٚوەرەق؛ بی‌بەرگ؛ بیٚلاپەرە. (بی برگ)(٢) (ف.گیو) بەفیڕۆ؛ بە خۆڕایی؛ موفتە. (مفت)
بیٚپەنا: [ئاوەڵناو] بیٚکەس؛ بیٚپاڵپشت؛ بیٚ-یاریدەدەر. (بی پناه)
بیٚپیر: (١) جۆری جویٚن. (٢) بیٚگەورە و پیری دەستگیر. (بی پیر)
بیٚپیژەن: بیٚدەست و پا وەشاندن؛ ئارام؛ لە سەرەخۆ؛ هیٚدی. (آرام)
بیٚپیٚشگر: بیٚبەرهەڵست؛ بیٚکۆسپ؛ ئازاد؛ سەربەست. (آزاد؛ بدون مانع)
بی‌پیٚش‌ودووا: [ئاوەڵناو] بیٚسەروبن؛ بیٚ-بەرودووا. (بی سروته)
بیٚپیشە: (١)[ئاوەڵناو] بیٚشۆل؛ بیٚئیش؛ بیٚکار. (بیکار) (٢)[ناو] پەڵپینە(گیاەخرفه)
بیٚپیٚشە: [ناو،ت](ب) گوشتەنەرمەی بیٚ-ئیٚسقان. (بدون استخوان)
بیٚپیٚلەکەرە:بیپیلەکەرە: (ف. گیو) مارمیٚلک. مارمیٚلکە. (مارمولک)
+ بیٚپیٚوان: (١) بەبیٚپیٚوانە؛ لە گۆترە؛ لەبڕ. (با تخمین) (٢) بە بیٚئەندازەگرتن. (بی اندازەگرفتن)
بیٚتا: (١)[ناو] خەومنووچکە؛ چۆرت؛ چۆرتم. نقروسک؛ پۆنژین؛ بهیٚنژین.(چرت)(٢)[ئاوەڵناو]بیٚوەک؛بیٚلنگە؛ بیٚهاوتا. (بی‌همتا)
بیٚتاقەت: [ئاوەڵناو] بیٚتاب؛ بیٚتوانا و تابشت؛ بیٚتاو؛ بیٚحەوسەڵە. (بیطاقت)

بێتان: [ئاوەڵناو] ئاشکرا. (آشکار)
بێتانوپۆ: [ئاوەڵناو] (ب) بێعەسڵ ونەسەب؛ بێ ڕایەڵ و پۆ. (بی اصل و نسب ؛ بی‌تاروپود)
+ بێتاو: (١) [ئاوەڵناو] بێتین و گەرما.(بی حرارت)(٢)یەکسمی تەپ،کە نەتوانی بە توندی غار بکات. (اسب کندرو) (٣) بێ-خۆرەتاو: ڕۆژیبێخۆر. (ابری)(٤) [ئاوەڵناو] بێ ئۆقرە؛ بێئارام؛ بێتاب. (نا آرام بیتاب)
بێتاوی: [ناو] بێتابی؛ بێتاقەتی؛ بێئارامی؛ بێئۆقرەیی؛ نیگەرانی.(بی‌آرامی)
بێترس: [ئاوەڵناو] بێواهیمە؛ بێباک؛ بێ-پەروا. (بیباک)
بێتک: [ناو] چۆلەکە. (گنجشک)
بێتلشا: (ف. گیو) وڵاخ. (الاغ)
بێتن: [چاوگە](١) بێژتن؛بێژان؛دابێژان. (غربال کردن)(٢)گوتن؛ وتن.(گفتن)
+ بێتۆ: (١) بێتە؛ دونیام ناوێ بە بێتۆ (فۆلکلۆر) (بی‌تو) (٢) بێتۆ؛ بێتەوە؛ بگەڕێتەوە؛ ئەگەرکاکەمبیتۆ: ئەگەرکاکەمبگەڕێتەوە. (بیاید؛برگردد)
بێتوافەت: [ئاوەڵناو] بێتەفاوەت؛ بێجیاواز؛ بێتەوفیر؛ وەکوویەک. (بی تفاوت)
بێتوافەتی: [ناو](١) حاڵەتی یەکسان بوون؛ بێفەرق و جودایی.(٢) پۆیتە پێنەدان؛ لەلا گرینگ نەبوون؛ بێ مشووری؛ کەمتەرخەمی. (بی تفاوتی)
بێتۆر: [ئاوەڵناو] (ف. گیو) بێکار؛ دەستەوسان. (بیکار)
بێتۆرە:[ئاوەڵناو] بێئەدەب؛بێڕێوشوێن. (بی ادب)
بێتۆک: [ئاوەڵناو] (١)بێتۆخڵ.(بی‌پوسته) نە-رمونیان.(کنائی:نرم ونازک)
بێتۆن: فد: [ناو] تێکەڵاوی زیخ و چیمەنتۆ وئاو؛ سمینت . (بتون)
بێتوونئارمە: فد؛ اند: [ناو] میلەی ئاسن (ئارماتۆڕ) لە ناو چیمەنتۆدا بۆ موحکەمی کە لە بیناسازیدا بەکاردێ. (بتن آرمە)
بێتۆنڕێژی: پڕکردنەوەی بنچینەی دیوار بە بیتۆن؛ داکردن و فەرش‌کردنی شەقام و سەربان بە بێتۆن (بتن ریزی)
بێتۆنکاری: [ناو] سواخدان بەبێتۆنیان بێتۆنڕێژی؛ کاری بیناسازی بە بێتۆن. (بتن کاری)
بێتونەبێت: بێونەبێ؛ هەر؛ ئیسەرەم؛ بێونەبێلەلای‌ئەوە: حەتمەن‌لەلای‌ئەوە. (باشد و نباشد)
بێتۆنی: [ئاوەڵناو] هەر شت لە بێتۆن چێ-کرابێت (بتنی)
+ بێتوو: (١) بێ تۆو؛ تووی نییە؛ ئەمساڵ ڕەحیم نان و تووی نییە. (بی تخم؛ بی بذر) (٢)[بەند] هاتوو بێ؛ ئەگەر بە ڕاست بگەڕێ؛ ئەگەر بێتوو خودا بیکا... (اگر بشود)
+ بێتووک: (١) [ئاوەڵناو] لە ڕوڵاواز. (لاغر) (٢) بێگلەیی؛ بێدوعاونزا. (بدون گلە) (٣) [ئاوەڵناو] ڕووت‌و ڕەجاڵ. (ندار) (٤) [ئاوەڵناو] مرۆڤ یان هەر شت کە مووی پێوەنەبێ. (بیمو)
بێتەجروبە: [ئاوەڵناو] (١) بێئەزموون؛ کەسێک‌کە تەجروبەی کەم بێ.(٢)بێ-

جرباندن وتاقی کاری (٣) (ب) بێ‌ئاوەز و دونیا نەدیتوو.(بی تجربە)
بێ‌تەربیەت: [ئاوەڵناو] فێری تەربیەت نەکراو؛ (ب) دوور لە زانستی ئەدەب و ڕەسمی کۆمەڵا یەتی؛ بارنەهاتوو؛ بێ‌ئەدەب. (بی تربیت)
بێ‌تەرش: [ئاوەڵناو] (ف. گیو) بەدخوو؛ بەدڕەفتار؛ کەمتەرخەم. (بد اخلاق)
بێتەڤزوتیز: بێتەوس‌وتیز؛ بێتوانج. (بی کنایەو طعنە)
بێتین: ([ئاوەڵناو] ١)سارد؛ بێ‌گەرما .(بیحرارت)(٢) بێ‌هێز؛ بێ‌توانا؛ بێ‌تابشت؛ چلەکی؛ ئێرەتی. (ناتوان)
+ بێج: [ناو] ڕەنگی بێژ: ڕەنگی چێرەیی مەیلەوکەوە. (بژ)
+ بێجا: (١)[ناو] بێجێ‌وڕێ. (٢) (ب) غەڵەت؛ بێجای‌کرد: غەڵەتی‌کرد. (٣) نابەجێ؛ بێ‌جێگا؛ نە لە جێگەی خۆیدا. (بیجا)
بیجادە: [ناو] یاقوتی‌سوور. (بیجادە)
بێجاکردن: [چاوگە،ت] غەڵەتکردن؛ شەکەرخواردن؛ (بیجا کردن)
بیجامە: [ناو] بیژامە؛ بیژامە؛ بێجامە. (لیباسی تەنیایی و خەوتن)
بیجبیجانخانم:[ناو] جۆرێک شانۆگەری‌بوو لە ناو چادرێکی چکۆلەدا. (نوعی‌خیمەشب بازی)
بێ‌جقە: [ئاوەڵناو] بێ‌نیشان و نەخش؛ ساکار،سادە. (سادە)
بیجەک: [ناو]کاغەزی فاکتۆر؛ سیاهە و لیستەی کڕینی کەل‌وپەل و ئەشیا کە فرۆشیار دەیدا بە مشتەری. (فاکتور خرید)

بێجێ: > بێ جێگە.
بێ‌جیازی: (١) بێ‌جیایی؛ بێ‌جیاوازی.(بی جدا یی)(٢) بووکێ‌کە جیازیی نەبێت. (بی جهاز)
بێ‌جێگە: (١) بێ‌جێ‌وڕێ؛ بێ‌شوێنی مانەوە. (بی مکان) (٢) قەرزێ کەبۆدانەوەی سامانێ لە جێگایدا نەبێ؛ (بیجا) (٣) کەم(کەسر)هێنانی‌پارە لە لایەن سندووقدار یا حیسابدارەوە؛سندووقدارەکە هەزارتمەن‌بێ‌جێیە. (کم آوردن)(٤) (ب) جێگەی تەنگ و کەم. (جاتنگی)
بیچارەیی: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە] (١) بێ دەرەتانی. (٢)ب) چارەڕەشی؛ بەدبەختی؛ نەداری؛ فەقیری؛ هەژاری؛ دستکورتی. (بیچارگی)
بێ‌چاڵ‌وچۆڵ: ساف و بێ‌گرێ؛ (ب) بێ‌دەست ئەنداز. (صاف؛ بی دست انداز)
بێ‌چاوسوور: [ئاوەڵناو] بێ‌داشدار؛ بێ‌سەرپەرشت؛ بێ‌چاودێر. (بی سرپرست)
بێ‌چاوەڕوان: (١) لە ئینتیزاردانەبوون. (٢) کەسێک‌کە بە هیوای وەرگرتنی حەق یا پارە یا پاداش نییە؛ دوور لە چاوەڕوانی و ئینتزار و هیوا. (بی انتظار؛ بی‌توقع)
بێ‌چاوەڕوانی: (١) بێ‌هیوای پاداش و حەق و مز. (بی توقع)(٢) بە هیوای هاتنی کەسێک نەبوون. (نا منتظر) (٣) بێ ئینتیزاری. (بی چشم انتظاری)
بێ‌چرتە: [ئاوەڵناو] بێ‌چرپە؛ بێ‌چرکە؛ بێ‌ترپە؛ بێ‌دەنگ؛ بێ‌خوست. (بی صدا)
بێ‌چرکە: [ئاوەڵناو] (١) بێ‌حەرەکەت؛ بێ‌جووڵە؛ بێ‌جووڵە. (بی حرکت)(٢) بێ‌دەنگ و

ئارام و بیٚخوست. (بی صدا)
بیٚچروچاو: [ئاوەڵناو] (۱) چاو مژومۆر؛ چـاوکز. (دید ضعیف) (۲) بیٚئەمەک؛ نمەکـنـەنـاس. (ناسپاس)
بیچک: [ئاوەڵناو] بووچک؛ چکۆلە. (کوچک)
بیٚچنە: بیٚبەڵگە؛ بیٚدەلیل؛ بیٚهۆ؛ لـەخـۆڕا؛ بیٚسەبەب و عیلەت. (بی دلیل)
+ بیٚچوون: (۱)[ئاوەڵناو] بیٚوەک؛ بیٚوێنـە. (بیچون) (۲)بیٚ چوون: بەبیٚ ڕۆیشن. (بـدون رفتن)
بیٚچـووە مـامز:[نـاو،ت]کارمـامز؛ کارژیلـە؛ کاژیلەی ئاهوو. (آهو بره)
بیٚچووەوان: [ناو] شوانیبەرغەل؛ بەرخـەوان؛ کارەوان؛ بیٚچڤان. (نگهدار برەها)
بیٚچەنوچوون: بیٚچەندوچوون؛ بیٚ لە سـەر ڕۆیشتن و چەنەلیٚدان؛ بیٚشـەرتوشـرووت و بەهانە هیٚنانەوە. (بی چند و چون)
بیچیک: [ئاوەڵناو] حوٚل ؛ گیٚژ. (گیج)
بیٚح: [ناو] مامەڵە؛ بیٚع: موعامەلە. (ب) پـارەی پیٚشەکی لە موعامەلەدا؛ چەشنیٚک بارمتە لـە سات وسەودا دا (بیع)
بیٚحالٚ: [ئاوەڵناو] (۱) لەهۆشچوو. (۲) شـە-کەت؛ماندو؛ هیلاک. (۳) تەنبـەڵ و بیٚکـارە؛ سست و خاو.(۴) بـیٚحـالٚو حـەوسـەڵـە.(۵) حالٚنەدار؛ نەخۆش. (بیحال)
بـیٚحـالٚبـوون: [چاوگـە،ت] دڵبووردنـەوە؛ لەهۆشچوون؛ لە حاڵینەخۆشی و هیلاکەتدا بوون. (بیحال شدن)
بیٚحـودوود: [بـەنـد] [ئـاوەڵنـاو] بـیٚمـەرز؛ بیٚسنوور؛ (ب) لە ئەندازە بـەدەر. (بـی مـرز؛ بیحد)
بیٚحورمەت: [ئاوەڵناو] بیٚڕیٚز؛سووکوچروک. (بیحرمت)
بیٚحەلاب: لەکایەی میٚشیٚن یان یـاری تـردا وشەییٚکە واتا ،حیسابنییە؛ هەڵەیە، قەبووڵ-نییە. (قبول نیست)
بیٚحەمدی: [ناو] غەیـری ئیـرادی؛ بـیٚئاگـا لیٚبون؛ نە لە ڕووی قەستەوە؛ ویٚدەچیلەوشە-ی(عەمد)ی ئارەوی یافارسییەوە هاتبیٚ. (غیر عمد)
بیٚحەو: [ئاوەڵناو]بـیٚحـەد؛ بـیٚئـەنـدازە؛ لـە ئەندازە بەدەر؛ بیٚحودود. (بیحد)
بیٚحەوسەڵە: [ئاوەڵناو] بیٚتابشت؛ بیٚتاقـەت. جاڕز. (بی حوصله)
بیٚحەیا: [ئاوەڵناو] بیٚئاوڕوو؛ حـەیاتکـاو؛ ڕوو داماڵـــاو؛ بـــیٚشـــەرم.(ب)شـــەڕانـــی و شەڕفرۆش.(بیحیا)
بیٚحیساب: [ئاوەڵناو] (۱) لە ژمارەبـەدەر؛ بـیٚ هەژمار؛ (ب)لە ئـەنـدازەبـەدەر.(بیشـمار) (۲) پاک لە پاک. (بی حساب)
بیٚحیسابی: [ناو،ت](۱) (ب) غەدر؛ زوڵـم؛ نـا حیسابی. (ظلم) (۲) حاڵەتی لە بەین چوون یا پاککردنی حەسابوکیتاب؛ حاڵەتی نەمـانی قەرز و قوٚڵە. (بی حسابی)
بیٚحیٚل: [ئاوەڵنـاو] (۱) خـەسـتە؛ بـیٚحـالٚ ؛ نەخۆش. (۲) ناتەوان؛ بیٚهیٚز. (بیحال)
+ بیٚخ: [ناو](۱) بیٚخدیوار: بندیوار.(۲) کونجی لایخواروو: لە بیٚخ ماڵەکەدا دانیشـتوە.(بـیخ) (۳) بن: بیٚخ حەوزەکە پڕە لە قوڕ؛ چیٚشتەکـە بیٚخی گرتووە.(بیخ) (۴) ڕیشـە، گیٚـژەڵووکـە

گیاکەی لە بێخەوە دەرکیشا. (ریشه)
بیٚخالٚ: (١) [ئاوەڵناو]بیٚنیشانه ؛ بیٚنوختە؛ سادە و ساکار .(٢) بیٚخاڵۆ. (بیخال؛ بی نقطه؛ بدون دائی)
بیٚخاوخیٚزان: [ئاوەڵناو] بیٚ ژن و منداڵ؛ سەڵت. (بی زن و بچه)
بیٚخاوەن: [ئاوەڵناو] بیٚساحیٚب؛ (ب) بەرەڵلا؛ وەک باغی بەرەڵلا. (بی صاحب. ول)
بیٚخ بەستن: (١) ڕیشه داکوتان. (محکم شدن ریشه) (٢) بیٚخ گرتنی چێشت، لەتاوە و تیانەدا. (بیخ گرفتن)
بیٚخپەیداکردن: بەدریٚژەکیٚشانی کاریٚ؛ لق و پۆپ لیٚبوونەوە و دژواربوونی کاریٚ؛ کارەکە بیٚخی پەیداکردووە بەم زووانە تەواونابیٚ. (بیخ پیدا کردن)
بیٚخدیان: بندیان؛ پووک؛ ڕیشەی ددان. (بیخ دندان)
بیخدیوار: فد: پای دیوار؛ بندیوار.(بیخ دیوار)
بیخڕیش: فد: (١) بنڕیش. (٢) ماڵی قەڵب بیٚخی ڕیشی ساحیبی؛ داسەپاو؛ مانەوە بەڕیشەوە؛ بەڕیشەوەبوو. (ب) بەسەر دەستەوە مان. (بیخ ریش)
بیٚخگرتن: [چاوگە،ت](١) سووتان یا لکانی چیٚشت بەبنی تیانە و تاوەدا. (٢) نیشتنی خڵتەی تراو. (بیخ گرفتن)
بیٚخڵتە: ساف؛تراوی ڕۆشن؛ بیٚلیتە؛ تراوی ڕوون. (ساف)
بیٚخ مل: [ناو،ت] بنامل؛ ژیٚرمل؛ بینەقاقا. (بیخ گلو)

بیٚخ ناخوون: [ناو،ت]ژیٚرناخوون؛ بنی ناخوون. (بیخ ناخن)
بیٚخۆ: (١) [ئاوەڵناو] نابەجیٚ؛ بیٚخود؛ بیٚخۆی کرد: غەڵەتی کرد، بیٚجای کرد.(غلط)(٢)[بەند] بیٚهۆ؛ بیٚجیهەت؛ لە خۆڕایی؛ قسەی موفت؛ بیٚدەلیل. (بیخود)(٣)(ب) [ئاوەڵناو] بیٚهۆش؛ بیحالٚ؛ لە حالٚ چوون؛ دڵبووردنەوە. (بیحال)
بیٚخوبن: [ناو،ت] بنجوبناوان؛ بنەڕەت؛ ڕیشە و دەمار؛ بنچینە. (بیخ و بن)
بیٚخوبناوان: [ناو،ت] ڕیشەوڕەگەز؛ بنەما؛ بنچینە؛ وەک: سەرەتا و چاوگەی خەبەریٚک.(بیخوبن)
بیٚخوبنج: [ناو،ت] بنجوبناوان؛ ڕەگ و ڕیشە.(بیخ و بن)
بیٚخودان: (١) [ئاوەڵناو] بیٚساحیب؛ بیٚخیٚو. (٢)بیٚخوان: خودایان نییە. (بیصاحب؛ بیخدایند).
+ بیٚخوڵک: [ئاوەڵناو] (ب)ساردوسڕ؛ بیٚتەعاروف. (ئیٚوارە دیتم بە جەلالەوە خوڵکی نەکردم. بیٚمە ماڵەوە). (فۆلکلۆڕ) (بی تعارف)
بیٚخەو: [ئاوەڵناو] (١) حاڵەتی کە سیٚک کە خەوی زڕاوە و خەوی لیٚناکەویٚ؛ خەو لیٚنەکەوتن. (٢) کەسیٚک کە مەرکەز (ناوەندی) خەوی شیٚواوە و قەت خەوی لیٚناکەوی. (هۆکەیشی زەربە لە سەرکەوتنە). (بیخواب)
بیٚخەوش: [ئاوەڵناو] خالیس؛ بیٚتیٚکەڵاوی؛ بیٚگەرد؛ پاک؛ بیٚعەیب. (بیغش. ناب)
بیٚخەوی: [ناو](١) کەسیٚک کە خەوی زڕاوە

و خـــەوی لێناکـــەوی.(بیخـــوابی) (٢) شەونوخوونی. (٣) (ب) کەم خـەوی. (کـم- خوابی)

بیٚخەیاڵ: [ئاوەڵناو] (١) کەسێک کـە فکـر و خەیاڵی نییـە؛ ئاسـودەخـەیـاڵ. ٢) سسـت و مشوور نەخۆر و لاقەید و کەمتەرخـەم. (بـی خیال)

بیٚخەیاڵی: [ناو](١) بیٚخەم و خـەیـاڵ بـوون. (٢) کەمتـەرخـەمـی؛هیچ شـت بـە گرینـگ نەگرتن. (٣) بیٚمشووری. (بی خیالی)

بیٚخێر: [ئاوەڵناو] بیٚسوود؛ بێکـەڵـک؛ بـیٚ- قازانج؛ بیٚموفا. (ب) بیٚبۆ و بیٚخاسیەت. (بی خیر)

بیٚخێروبـەرەکـەت: [ئـاوەڵنـاو] بـیسـوود و قازانج؛ بیٚکەڵک. (ب) بیٚبەرگەگری و بـیٚ- دەوامی و بیٚبەرەکەتی مـاڵ و سـامان. (ب) خێر نەدانەوە. (بی خیر و برکت)

بیٚخێو: <بیٚخودان

+ بێدا: [ناو] بێداد؛زوڵم؛دوورلەدادگەری؛ دوور لە عەداڵەت. (بیداد)

بێداخ: (١)[ناو] بەیداخ؛ ئاڵا؛ پەرچەم؛ بەیرەق؛ بەنـدێر. (پـرچم) (٢) [ئـاوەڵنـاو] بـیٚدەرد و کەسەر؛ بیٚداخ و دەرد. (بیغم)

+ بیداد: [ناو](١)بێدا؛ زوڵم؛ ناعەداڵەتـی؛ بـیٚ عەداڵەت. (ب) بـیٚعـەداڵـەتـی. (بیـداد) (٢) گۆشەیێکە لە(دەستگا) مـەقـامی هومایونـدا. (گوشەای در دستگاه همایون)

+ بێداد: [ئاوەڵناو] (ب)بـیٚحـەد؛ بـیسـنوور؛ بیٚژمـــار؛ جـــەمـــاوەرێکـــی بێـــداد ڕاوە- ستابوون.(بیحد)

+ بێدار: (١)بیٚ دار؛شوێنیکە داری لیٚنەبـیٚ و ڕووتەن بیٚ. (بی درخت) ٢) [ئاوەڵناو]بەخەبەر؛ هۆشیار. (بیدار)

بێدارخــەو: (١) ســووکەخــەو؛ وەنــەوز. (٢) حاڵەتی بەینی بە خەبەری و نووستوویی. (٣) حاڵەتی کەسانیٚ کە لە خەودا هـەڵـدەسـتن و دەڕۆن بەڕێدا. (بیدار خواب)

بیٚداروەرەخت: زەوییێک کەڕووەکی تێدانەبـیٚ. ڕووتەن. (بی دار و درخت) بیٚداروماڵ: [ئاوە- ڵناو] بـیٚسـەروسـامان؛ هـەژار؛ بـیٚ مـاڵ و دارایی. (بی سرو سامان؛ بینوا)

بیٚداڵدە: (١)[ئاوەڵناو]بیٚپشتیوان؛ بیٚ پەنا. (٢ب) بیٚبناوان. (بی پناه؛ بیخانە دار).

بیٚدانە: (١) [ئاوەڵناو] بـیٚنـاوک؛ بـیٚدەنـک؛ بیٚتۆم. (بی هسـتە) (٢)[نـاو] جۆرێـک ترێیـە کەدەنکی نییە. (انگور بیدانە)(٣)[نـاو] نـاوکی بیٚ؛ دەنکی بەهی. (دانەبە)

بیٚداوی: [ئاوەڵناو] لەبڕان نە هاتوو. بیٚ دوایی. بیٚتەواو بوون. (بیپایان)

بێدایی: [ناو] بێدادی؛ هاوار لـە زوڵـم و بـیٚ- ئینسافی و بیٚعەداڵەتی و بێدایی. (بیدادی)

بیٚددان: [ئاوەڵناو] کەل؛ تەواو دیان کەوتـوو؛ بوونەوەری بیٚدیان یا بیٚ مینای دیـان وەک ئارمادیلۆ یان مێلوورەخۆرە. (بی دندان)

بیٚدڵ: [ئاوەڵناو] (١) بیٚجەرگ؛ ترسـەنـۆک. (تر سو) (٢ب) : دڵمردوو؛ بیٚهەوەس وئارە- زووی دڵـداری؛ بـیٚدڵودەمـاخ و خـەمبـار. (دلمردە)

بێدلخە: نـاوی هـەفتـەی دووهـەمـی ئـاخر مانگی زسـتان. (نـام هفتـەدوم اسـفند مـاە)

بیدمشک: [ناو] جۆری ڕووەکی بۆن خۆشە کە لە شیرینیسازیدا کەڵکی هەیە، عارەقەکەیشی دەگرن. (بید مشک)
بێدوا: بێپاش؛ بێداوی؛ بێئەنجام؛ دوا بڕاو. (بیانجام)
بیدۆر: (ف. گیو)[ئاوەڵناو] (١) بەهێز؛ بەقووەت. (زورمند) (٢) بەڕێز؛ ڕێزدار. (محترم)
بێدۆژمندن: (١) هەڵپەرین بێدۆت. (رقصیدن بدون دختر) (٢) (ب) بە هە موو شت و هەموو بارودۆخێ ڕازیبوون. (کنایەبهر چیز راضی بودن)
بێدوندان: [ئاوەڵناو] (ف. گیو) (ب) وجاخ- کوێر؛ نەزۆک؛ شوینبڕاو. (ابتر. اجاق کور)
بێدونده: (ف. گیو) منداڵ لە دووا بەجێ نەماو. (بی فرزند)
بێدوو: [ئاوەڵناو] (١) بێدووکەڵ؛ (٢) (ب) بێکەڵک بێخاسیەت؛ بێخێر.(بیدود؛ بی- خاصیت)
بیده: فد: (١)[ناو]فووارەی ئاودەس فەرەنگی.(٢)[کاری ئەمری] بیده بە ئە- و:بیدەری. (١و٢بیده؛بده)
بێدەراف: بێدەراف؛ بێدەرفەت؛بێمۆڵەت. (بیفرصت)
بێدەرد: [ئاوەڵناو] (١) بێغەم؛ بێڕەنج؛ بێ ئازار.(بیدرد).(٢ب) سست و بێخەیاڵ و بێ- مشوور؛ کەمتەرخەم. (بی درد)
بێدەردی: [ناو] بێژانی؛ حاڵەتی بێڕەنج- بوون؛ بێپەرۆشی؛ بێهەستی لە ئاستی ڕووداوی دڵ تەزێندا؛ (ب) بێڕەگی؛ بێ- دەماری؛ بێخەیاڵی. (بیدردی)
بێدەردیسەر: [ئاوەڵناو] بێگرفتاری؛ بێ- ئەرک؛بێکێشە؛ بێگرفتوگیری؛ بیسەرئێشە. (بیدرد سر)
بێدەرمان: [ئاوەڵناو] (١) بێعیلاج؛ لەعیلاج نەهاتوو؛ لە چارنەهاتوو. (٢.ب)دەردێ کە چارە ودەرمانی نییە. (بیدرمان)
+ بێدەس: (١ب) [ئاوەڵناو] بێدەسەڵات. (بی قدرت) (٢) دستی نییە. (بیدست)
بیدەستەر: ف اند: ناوی سەگیئاوی. (بیدستر؛ سگ آبی)
بێدەسنوێژ: کەسێک کەدەسنوێژیشکابێ یان دەستنوێژی نەبێت. (بی وضو)
بێدەسوپا: [ئاوەڵناو] بێدەستوپا؛(ب) سڕوسەپۆل؛ دەسەوسان؛ بێدەسەڵات؛ کارلێنەهاتوو . (بی دست و پا)
بێدەسەڵات: .[ئاوەڵناو] حاڵەتی دەست نەڕۆیشتن و کارلێنەهاتوویی؛ بێقودرەتی. (بی تسلط)
+ بێدەم: (١)خاوەخاو دەکا لە خواردنا؛ (٢) [ئاوەڵناو]تانجییێک کە لە وەختی ڕاودا درەنگ نچیر هەڵدەگرێ و دەمساردە. (کەم و یواش خوردن؛ تازی کەدرگرفتن شکارفرزنباشد.)
بێدەموزمان: [ئاوەڵناو] سڕوسەپۆل و قسەنەزان؛ کەمقسە. (بی سرو زبان)
بێدەمی: [ناو](١) حاڵەتی حەیوانێ کە خاوەخاو دەخوا یا کەم دەخوا؛ دەمساردی. (حالەت حیوانی کەکم غذاست یا یواش غذا می خورد)(٢) قسەنەزانی؛ بێدەموپلی. (کەم حرفی. نافصیح)

بێدەنگ کردن: [چاوگە،ت] ڕازیکردن بۆ نەدرکاندنی نهێنی و قسە نەگێڕانەوە؛ خامۆشکردن وەک:ڕادیۆکە بێدەنگ کە؛ بەستنی دەم و دەنگ لێبڕین؛ دەمکوتکردن.(ساکت کردن)
بێدەنگی: [ناو](١)حاڵەتی دەنگ لێوە نەهاتن پەنەمووسی. (بی صدایی)(٢) ماتی و پیش خواردنەوە؛ ئارامی. (خاموشی و افسردگی)(٣) باسی نهێنی نەکردن؛ بێدەنگی لێهێنان. (خاموشی)
بێ'دەوام: (١) [ئاوەڵناو] شتێ'کە قایم نەبێ'؛ بەرگە نەگر. (دژی پتەو) (٢) [ئاوەڵناو] بێ'-داوی؛ بێ'دوایی؛ ناپایەدار.(زوڵمی زاڵم بێ'-دەوامە). (بیدوام)
+ بێر: [ناو] زەوی وشک و بایێر.(زمین-خشک‌وبایر)
+ بیرا: [کاری ئەمری] بێرا؛ بێرانە؛ بیهێنە؛ باوەڕە. (بیاور)
بێ'ڕا: [ئاوەڵناو] بێ'ئایین؛ بێ'عەقیدە؛ بێ'-ڕەوشت؛ بێ'نەزەر؛بێ'ڕێگە.(بی‌عقیده؛ بیراه)
بێراخ: [ناو] پرچم؛ ئاڵا؛ بەیداخ؛ بەندێر؛ بەیرەق (پرچم)
+ بیرازتن: ڕەهەندلێدان بۆ لە بەین چوونی تەرەشۆیی و زۆنگی لەزەو یدا. (زەکشی)
بێراقک: [ناو] سەوڵ؛بێڵی بەلەم؛ بێڵاوک. (پارو)
بێراق: [ناو] بەیرەق؛ ئاڵا؛ <بەندێر. (پرچم)
بیراهی: لەفکردا؛ لە بیرکردنەوەدا؛ لەئەندێشەدا.(دراندیشه‌بودن)
بێڕایی: [ناو]لاڕێیی؛کەچڕەوی. (گمراهی)
بیربڕ:[ئاوەڵناو] (ف.گیو)زیرەک؛ وشیار. (هوشیار)
بێربێرۆک:[ناو]کرمێکی فوسفوڕیە بەشەو دەدرەوشێ'؛ گوڵ'ئەستێرە. (کرم شب تاب)
بیرتەسکی: [ناو] مێشک وشکی؛ مژی هشکی؛(ب)نەزانی.(تنگ‌نظری.نادانی)
بیرتیژ: [ئاوەڵناو] بیرقووڵ'؛ زانا؛ زیرەک؛ وشیار. (اندیشمند)
بێردۆش: [ناو] بێرەدوش؛ سەتڵی دۆشینی ماڵات؛ بێری.(سطل‌شیر دوشی؛ شیردوش)
بیرقووڵ': [ئاوەڵناو]تێگەیشتوو؛ عقڵدار؛ بەفکر. (اندیشمند)
بیرکردن: [چاوگە،ت](١) فکرکردن لەکارێ'. (تفکر)(٢) تاسەکردن؛ تامەزرۆی دیتن؛ (مشتاق دیدار)(٣) هەروەها لە بیرکردن: فە-رامۆشکردن. (فراموش کردن)
بیرکردنەوە: [چاوگە،ت] فکرکردنەوە؛ بەدڵ' ورد بوونەوە لە مەبەستێ'. (اندیشیدن. تفکر)
بیرکووڕ: [ئاوەڵناو] بیرقووڵ'؛ بیرتیژ؛ بەئاوەز. (با هوش اندیشمند)
بێرکۆت: زێدی شاعیری ڕۆشنبیر عەبدولا پەشێو. (اسم دهی دست)
بیرکەر: [ناو،بک](١) فکردەکاتەوە. (فکور) (٢) بیرهەڵکەن. چاەکن)
بیرکەفتن: [چاوگە،ت](١) بیرکەوتن؛ بیرکەوتنەوە؛ هاتنەوە یاد. (یاد آمدن) (٢) کەوتنەوەیاد. وەبیر خۆ هێنان. (بیاد آوردن)
بیرکەوتنەوە: هاتنەوە یاد. (یاد آمدن)
بێرگ: شوێنی بێری‌کردن؛ بێرگە. (جای جمع شدن گلەبرای دوشیدن)

بیرگە: [ناو](ب) مێشک. (نفر)
بیرگەش: [ئاوەڵناو]ڕۆشنبیر؛تێگەیشتوو؛ پێشکەوتووی هزری؛ دژیدواکەوتە. (روشنفکر)
بێرم: (١)[لەچاوگەی هێنان] بێنم؛ بهێنم (بیاورم) (٢)[ناو] بەنداف؛ بەنداو. (سد)بیرمشک: [ناو] بیدمشک؛ دارێکە لە بی دەچی؛ عارەقی بیدمشکی لێدەگیری. (بیدمشک)
بیرمۆک: [ناو] داری قەزوانیکە بەرەکەی وردە؛ بەنەوشۆک. (درخت ون ریزدانه)
بیرنامە: [ناو] یادنامە. (یادنامه)
بیرۆبەرتک: [ناو] خەنەگورگە؛ خەنەتیلکە؛ قرێژەبەرد؛ گەنمەبەردیلە؛ بەڵخ کوچک؛ گلەوەزە؛ خەنەبەردیلە؛ بەڵغەکوچک؛ کرێژەبەرد. (گل سنگ)
بێرۆ: [کاری ئەمری](١) وەرە؛ بێ. (بیا) (٢) وەرەوە؛ بێرەوە. (برگرد)
بیروڕا: [ناو،ت](١) پرسومەسڵەحەت(٢) ئاقیدە و بۆچوون؛ ئەندێشە و ڕا. (اندیشه ونظر)
بیرورد: [ئاوەڵناو] بیرهووڕ؛ وردبین؛ زۆر سەرنج دەر. (اندیشمند)
بێڕۆزی: [ئاوەڵناو] (ب)کەمڕزق؛ کەم-دەرامەد؛ چۆلەکەڕۆزی. (بی روزی)
+ بیرۆڤ: [ناو] تووکی بەرزگ.(موی زهار)
بیرۆکە: خەیاڵی بە مێشکداهاتن؛ گەڵاڵەی ئە-ندێشەیی وفکری.(خیال)
بێرووت: بەیرووت؛ پێتەختی لوبنان. (پایتخت لبنان)
بێرووک: [ناو] بەرک؛ گیرفان. (جیب)
بێڕوومەت: [ئاوەڵناو] بێئابڕوو؛ بێ بایەخ؛ بێڕێز. (بی آبرو)
بێرە: (١)بیهێنە.(بیاور)(٢)ڕە وتیبێری کردن؛ ڕانەبێرە. (کارشیردوشیدرجایمخصوص )
بیرهاتن: وەبیرهاتنەوە. (یاد افتادن)
بێرەبا: [ناو،ت]بەبێڵشەنکردن و خەرمان بەباکردن؛ بێڵەبا. (بابیل خرمن راباد دادن)
تێبینی:(ل) هەندێجار دەبێتە(ر) وەک بێل: بێر ، مال: مار
بیرەبیرە: [ناو،ت] وازوازی؛ ڕاڕایی. (وەک مەڕەکێوی بیرەبیرە خۆم). (فۆلکلۆڕ) (فرار کردن و واپس نگریستن آهو؛حالت تردید)
بێڕەحم:[ئاوەڵناو]دڵڕەق؛بێبەزە(بیرحم)
بێرەدا: بەئیرەدا؛ وێڤە؛ ڤێرەڕا؛ ڤێڕیدا. (ازاینجا)
بێڕەزا: [ئاوەڵناو] (١) ڕەزاگران؛ ناشیرین. (زشت) (ب٢) :دڕندە و بێئەمان؛ ئەو سەگە زۆر بێڕەزایە ئاوقەی هەموو کەس دەبێ. (درندەخو)
بێرەو: [<بێرۆ](١) وەرە؛ بێ. (بیا) (٢) وەرەوە؛ بگەڕێوە. (برگرد وبیا)
بێڕەواج: فد: [ئاوەڵناو] بێبرەو؛ قەڵب. (بیرواج)
بێرەواجی: [ناو،بەرهەمی چاوگە]کەسادی؛ بێبرەوی. (بیرواجی) بیرەوخەر: [ناو،بک] ئەوکەسە وەبیر دەخاتەوە؛ بە یادهێنەر؛ بیرخەرەوە. (بیاد آورنده)
بیرەوکردن: [چاوگە،ت] بیرکردنەوە؛ فکر کردنەوە؛ چوونە نێو فکرەوە (فکر کردن)

بێرەونەق: [ئاوەڵناو] (١) بێڕەواج. (٢) بێ-شەوق. (٣) سیس؛ ژاکاو. (بی رونق) بیرەوەر: [ئاوەڵناو] خاوەنی بیر و هۆش. (هوشمند)

+ بیرەوەری: [ناو] لە بیرماو؛ بەیاد ماو؛ سەرگورەشتە و ڕووداوی قەدیم؛ خاترە. (خاطره)

بیرهەڵقەندن: [چاوگە،ت] بیر هەڵکەندن؛ چاڵاوچێکردن. (چاەکنی)

بێڕیا: [ئاوەڵناو] بێگزی؛ ڕاست؛ موخلیس؛ بێ گری؛ بێدرۆ؛ بێفێڵ سەمیمی؛ دۆستی بیرپا: دۆستیگیانی. (بیریا)

بێریبێری: فد؛ اند؛ فرد: ناوی نەخۆشینێکی ماسوولکە و پووکە بەهۆیکەم بوونی ویتامین بێوە تووشی ئینسان دەبێ. (بری بری)

بێڕێزی: [ناو،بەرهەمیچاوگە] ڕیسوایی؛ بێ-حورمەتی.بیحرمتی)

بێریش: (١) [ئاوەڵناو] کۆسە؛ لووسکە؛ بێ-تووک. (کوسه) (٢) ڕیش تاشراو. (بی ریش)

بێریکرن: (١)ئاژاڵدۆشین لەبێرگە.(٢) مەڕهێنانەوە بۆ بێری. (گوسفندان را در جای مخصوص دوشیدن بردن)

بێریک: [ناو] بەرک؛ گیرفان. (جیب)

بێز: [ناو] ئیشتیا؛ (١)ئەگەر بێز لە بێزاریەوە هاتبێ واتای ئیشتیا نادا. (٢) ئەگەر وها نە-بێتوو واتای ئیشتیا بدا دەبی قیزیش بە واتای ئیشتیابێ دەنا (قیزوبیز) دەبێتە دوو وشەی دژ مانای لێکدراو، یاخۆ (قیز)یش دەبێ واتای ئیشتیا بدا،کە ڕەنگە ئەمە لە ڕاستییەوە نزیکتربێ چوونکی دەڵێین: قیزم دەبا: بێزم دەبا، بەڵام لێرەدا جێگای(قیزو بیز) بڕێک لێژ دەبێ. بڕوانینە قیزوبیز لە فەرهەنگەکانی دیکەدا، کە واتای دڵ هەڵشێوان دەدا.

بێزاری:[ناو](١) هەراسانی؛جاڕزی؛ وەڕە زی.(٢) بێزاری ؛ بێدەمی. (بیزاری؛ بیدهانی)

بێزاڵە: [ئاوەڵناو] (ف.گیو) ترسەنۆک؛ بێزراو؛ بێزاور. (ترسو)

بێزراف: [ئاوەڵناو] بێزاور؛ ترسەنۆک؛ بێ-زاڵە؛ دژی دڵ قاییم. (ترسو)

+ بێزراو: [ناوبەک و بەر](١) لە بەرچاوکەوتوویی؛ لە خواردنی قیز هە-ڵشێوانەوە (زدەشدە) (٢) مەلی تۆراو لەهێلانە؛ لەهێلانە بێزراو. (پرندەاز آشیان فراری) (٣) [ئاوەڵناو] بی زراو؛ ترسەنۆک؛ بێزاڵە. (ترسو)

بێزمان: (١) زمانینییە؛ (٢) [ئاوەڵناو] لاڵ؛ (ب)خامۆش؛ بێقسە. (ب) بێدەموپل. (بی زبان)

بێزوبۆکردن: [چاوگە،ت] قیزو بیزکردن. (احساس‌اشمئزاز بکسی‌دست دادن)

بیزۆک: [ناو] بیزبۆ؛ ئەو ژنە کە حەیزدەبێت؛ (ژنەک کۆ مەهان دەبەت). (زنی کەحیض می شود)

بێزۆک: ژن لەکاتی ئاوس‌بووندا تا منداڵ بوونی. (زن آبستن تاروز وضع حمل)

+ بێزە: [ناو](١) بێزگ؛ بێزوو؛مەگیرانی. (ویار) (٢) جۆرێکدراویبێنرخە. (نوعی پول بی ارزش)

بیزە: [ناو] سیراج؛ سیرێژ؛ ژاژی. (کتخ. شیراز)

بێزهاتن: [چاوگە،ت] قیزهاتن؛ دڵ‌هەڵگرتن؛ چـوّن بێـزت هــات ئــەو شــتە بخــوّی؛ (مشمئزنشدن از دیدن یا خوردن چیزی)
بێ‌زەحمەت: (١) بــێ‌ئــەرک و دەردیســەری؛ (٢)وشەیێکە بوّ ئیجازەگـرتن یـا ڕێگـە دان؛ (ب) زەحمەت نەبێ. (بی زحمت)
بیزەر: [ناو] جوّری داربی؛ بیزەرد. (نوعی بید)
بێ‌زەوق: [ئاوەڵناو] (١)بێ‌شەوق؛ سیس؛ ژاکـاو؛ بێکـەیـف.(٢) بــێ‌ســەلیقــە؛کـەچ سەلیقە.(بیذوق)
بێــــزەوەر: (ف. گیــــو) ڕزیـــو؛ پـــیس؛ قیزهەڵشێوێن؛ چڵکـن؛ چـەپـەڵ؛ بێزهێنـەر. (فاسد؛ چرکین)
بێزیان: (١) <بێزران. (٢)بی زیان؛ بێ زەرەر. ٢(بی زیان)
بیژاما: پیژامە؛ لیباسی ناسکی تایبەت بـوّ نـاو ماڵ و خەوتن. (بیژامە)
بێژان: (١) گیای شابەنگ؛ بووژان؛ (بومادران) (٢) دابێژان؛ گوللە بـارانی بـەتونـدی و کـون کــون کردنــی ئامــانج؛ (تیربارانــدن) (٣) تەقاندنەوە بـە هێڵـەک؛ بێژانـەوە و دابێـژان. (الک کردن)
بێژاندن: [چاوگە،ت](١) دابێژاندن؛ وەبەرگوللە دان بە موسەلسەل یـا بـە تیرئـەندازیی لـە سەریەک. (گلولەباران) (٢)بە هێڵەکدا کردن. (الک کردن)
بێژانەسیاوە: [ناو]گیای بووژانەسـیاوە؛ ڕەشـە شابەنگ؛ بووژانەی کێوی. (برنجاسف)
+ بێــژین: [لــەچاوگــەی بێــژتن](١)بلێــین؛ بووشین؛ ببێژین؛ .لە(بێژە و بیـژتن: گـوتن و وتن). (•بگوئیم .گفتن)
بێژگە: [وتە]جگە؛ جیا لەوە؛ بێجگە؛ بەجگـە؛ ژبلی؛ بلی (بجز)
بیژلک: [ناو] بێژلک؛ بیژوو؛ ویدەچـی (لـک) لە(لخ)ە وە هاتبێ و تورکی‌بێت. (حرامزادە)
بیژموّتە: [ناو] بیژک؛ بیـژوو؛ بیژلـک؛ بیـژی؛ زوّل؛ حەرامزا؛ حەرامزاو؛ حەرامزاد. (حرامزادە)
+ بێژن: .(١)[ئاوەڵناو] بێوەژن. (زن بیـوە) (٢) .[ئـاوەڵنـاو] بــێ‌ژن؛ پیـاوێ کـەژنـی نییـە. (سەڵت). (بـی زن) (٣)[وتـە] بڵـێن؛ ببێـژن؛ بووشن. (بگویند)
بێژندە: [ناو،بک]بێژەر؛قسەکەر.(گوینده)
بێ‌ژنی: [ناو] ڕەبەنی؛ سەڵتی؛ حاڵەتی پیاوی بێ‌هاوسەر. (مجردی. بی زنی)
بێژوّ: .[ئاوەڵناو] زوّربڵێ؛ پڕبێژ. (وراج)
بێژوّک: [ناو](ف. گیو)(١) جێگای کوّ بوونەوە بوّئاخافتن. (جای‌تجمـع‌بـرای‌حـرف زدن)(٢) [ئاوەڵناو] بێژوّک چەنەباز؛ زوّرویـژ؛ فـرەویـژ. (حراف)
بیژوّکە: [ناو](١) زوّڵەک؛ دەنکەگەرمـەشـانی نەتوّقیو لـە برژاندنـدا. (دانـەذرت نشـکفتەدر چسفیل).(٢ب) بە منداڵی نەسـرەوت و شـە- یتـان و هاروهـاج؛ دەڵـێن.(بچــەنـاآرام) (٣) دانەوێڵەی نەکوڵ. (دانەبنشن دیر پخت) (٤)دەنکە دانەوێڵەی نەکوڵیو لـە نـاو گـرار و چێشتدا. (دانەبنشن نە پختە)(٥)دەنکە میوەی نەگەیشتوی ناو کوّگای میوەی گەییو. (دانـە میوە نرسیدە در انبوەمیوە).
+ بێژە: (١)[کار، ئەمری] بلێ؛ ببێژە؛ بووشـە. (بگو)(٢) وتە؛ قسە. (سخن)

بێژەر:[ناو،بک]ویژەر؛قسەکەر.(سخنگو)
بیژی: [ناو]بیژوو؛ غەیریعەسڵ؛ شاخەولقی زیادیی دار؛ زۆڵەکی برێشکە. (حرامزادە)
بێژیار: [ناو،بک] وێژەر. (گوینده)
بێژێتی: [ناو،بەرهەمیچاوگە] زوڵی؛حەرام-زایی؛ بەفێڵی. (حرامزادگی)
بیسات: [ناو] بسات؛ ئەسپابی سەر سفرەی زماوەند و میوانی؛ بیساتی سەماوەر: وەک ئیسکان و نالبەکی و قوری و کەشەف... سفره یا گاریەی ورده والە فرۆشی کەنار شەقام. (بسات)
بیسات شێواندن: [چاوگە،ت](ب) کاری کەسێک تێکدان؛ بیساتتێکدان؛ (ب) مەجلیس شێواندن. (بساط بهم زدن)
بیسار: فد: فیسار؛ جێناوی کەسی گوم (نادیار)؛ لەگەڵ فڵاندا دێ؛ فڵانوبیسار؛ فڵان-وفیسار. (بسیار)
بێسام: .[ئاوەڵناو] بێترس؛ بێواهیمە؛ ترسهێنەرنییە؛ بێزافتە. (بدون واهمه؛ بی-ابهت)
بێسامانی: [ناو] بێسامانبوون؛ فەقیری و هەژاری و بێئەنوایی.(بیسامانی)
بێسانچی: [ئاوەڵناو+ناو] بێستانەوان؛ بێستان دەچێنی وئاگای لە بێستانە. (بوستانچی)
بێستانچایی:ند. [ناو] چای بە تورکی: چۆم، بێستانی بەرچۆم؛ بێستانیئاوی؛ بێستانی بەراو کە لە چۆم ئاوبدرێ.(بوستانلبرودخانه)
بیسترۆ: اند؛ فد:[ناو]جێگای خۆراکو نۆشابە فرۆشتنی هەرزان بایی کە لە هێندی کیشوەر(ولات)دا تایبەت بە چینی هەژارانە.
(بیسترو)
بیستۆک: [ناو]کەرەستەی یاریدەدەری گوێیگرانە بۆ باشتربیستن.(سمعک)
بیستۆک: ئامێری دەنگ هێەر و دەنگ بەر لە تەلەیفووندا.(گوشی)
بێستوون : (۱)بەغستوون؛ بەغستان، وڵاتی خودایان و گەوران؛ (سرزمین خدایان) بی کۆڵەکە؛ (بدون ستون) (۳) کێوێکە لە کرماشان. (کوهیست در کرمانشاه)
بێستە: [کاری ئەمری لەچاوگەی وێستان]بێسە؛ بویستە؛ ڕاوەستە. (بایست)
بیستیار: (۱) بیسەر؛گوێگر؛ گوێداتەپێن؛ گوێهدار. (شنونده) (۲) (ب) سیخوڕ؛ فسوس. (جاسوس)
بیستیک: [ناو] ئەستێولک؛ ئاسنی سەر تەنوور. (تکەآهنی رویتنورکەدیگرانگە میدارد)
بیستەمین: [ئاوەڵناو] لە پلە و پایەی بیستەمدا؛ لە ژمارەی بیستەمدا. (بیستمین)
بیسک: [ناو] ئان؛ دەمێکیکورت. (آن)
بیسکادن: ئانێکیتر؛ تاوێکیتر.(لحظه دیگر)
بیسکار: [ئاوەڵناو] (ف. گیو) جنێوفرۆش؛ ئازاردەر. (بد دهن؛ آزارنده)
بیسکاری:[ناو](ف.گیو)بیسکانی؛ جنێوفرۆشی؛ ئازاردەری. (نا سزا)
بیسکانی: <بیسکاری.
بیسکویت: فد: [ناو] جۆری تۆشە لە ئارد و شەکر. (بیسکویت)
بێسمەت: [ئاوەڵناو] بێسەمەت؛ بێترس؛ بێئیحتیات. (بیاحتیاط)

بیٚسوو: نەمانی هێزی دیتن؛کەمسوو. (کم سو و بیفروغ)
بێسووا: (۱) [ناو] بێسۆ؛ بۆسە؛ ڕەبەت؛ کولـە. (کمین) (۲)[بەند] بیٚسووا؛ بـیٚگومـان؛ بـیٚ-شک. (بی گمان)
بیٚسوود: [ئاوەڵناو+ناو]بیٚموفا؛ بیٚقازانج؛ بیٚ-سوود؛ بیقازانج؛ بیٚڕیبا؛ بێبەهرە. (بیسود)
بیسە: [کاری ئەمری لـە چاوگـەی ویسـتان] بێسە؛ بوەستە؛ ڕاوەستە. (بایست)
بیٚسەبر: [ئاوەڵناو] بیٚمۆڵەت؛ نائارام؛ بـەلـەز؛ بیٚتاقەت. (بی صبر)
+ بیٚسەر: [ئاوەڵنـاو]هـەر شـت کـە سـەری نەبیٚ؛ بیٚ کەڵک؛ بزر؛ بیٚشوێن. (بی سر.گم)
+ بیٚسەروبن: [ئاوەڵناو] (۱) زۆر دوور و درێژ؛ بیٚ ئەول و ئاخر. (بی سـروته) (۲ب) تێکـەڵ پێکەڵ. (بی سرو تەو آشفته)
+ بێسەر و زمان: [ئاوەڵناو] (۱) نەخۆشـیٚکـە لە زمـان کـەوتبـیٚ. (مـریض از حـرف زدن عاجز. (۲) بیٚ دەموپل وقسەنەزان. (بی سـرو زبان)
بێسەروسامان: فد: (۱[ئاوەڵناو]) بێسەروبەرە و شێواو؛ ئاڵۆز. (۲) بێدار و ماڵ و بیٚئـەنـوا؛بیٚ-ماڵوهاوسەر. (بیسروسامان)
+ بێسە روسە دا: (۱)[ئاوەڵناو]بیٚدەنـگ ؛بـیٚ-هەراو هوریا .(بیسرصـدا)[بـەنـد](۲) جێگـای خەڵوەت و بیٚدەنگ؛ ئـەم وەتاغـە زۆر بـیٚ-سـەروسـەدایـە. (دنـج)(۳ب) کردنـی کـاریٚ بەپەنامەکی و بە هێواشی و بیٚدەنگـی. (بـی سر و صدا)
بـیٚسـەرە: .[ئـاوەڵنـاو] بـیٚخـاوەن؛ ئـاڵۆز. (بیصاحب.بینظم)
بیٚسەرەتا: .[ئاوەڵناو] ئەزەڵی؛ بیٚچاوگە؛ بـیٚ-چاوانە و بیٚسەرچاوە. (بی‌ابتدا)
بیٚسەلیقە: .[ئاوەڵناو] (۱) بیٚزەوق. (بـی‌ذوق) (۲ب) تێنەگەییو و بیٚعەقڵ. (بیشعور)
بیٚسەمەر: .[ئاوەڵناو]بیٚموفا؛بیٚبـەهـرە؛ بـیٚ-سوود؛ بیٚبەر. (بی بهره)
بیٚسەواد: .[ئاوەڵناو] نەخوێنـدەوار؛کـەسـێک نـەتوانێـت بنووسـێت و بخوێنێتـەوە. (ب) کەسێککە لـە بـاری زانسـتییەوە زۆر پڕبـار نەبیٚ. (بیسواد)
بیٚسـەوادی: [نـاو] نـەوانـایی؛ بـیٚسـیواتی؛ نەخوێنـدەواری؛ (ب) کـەم ئاگـایی لـەبـاری زانستەوە. (بیسوادی)
بێسیرەت: [ئاوەڵناو] (۱) بـیٚئـەخـلاق؛ بـیٚ-ئاکار.(بی‌اخلاق)(۲)ئابڕووچوو؛بیٚبن کراو بە-ناڕەوا؛ بن پڕاو. (بی سیرت)
بیسیک: [ناو] لەزمانگەلی پرۆگرام نووسـینی کـامپیوتێر. (از زبـان هـای برنامـەنویسـی کامپیوتر)
بێسیمچـی: [نـاو] لـەسـەربێسـیم (بێتـە ل کاردەکا؛ بێسیم هەڵگر لە ئەرتەشدا. (بیسـیم چی)
+ بێش: .[ئاوەڵناو+ بەند] زیـاد؛ کـەموبـێش: کەم تا بێش: کەم تا زۆر. (بیش)
بیٚشاتوشووت: بیٚهەراو هوریاوشـیتەشـیت؛ (ب)[ناو،ت] بیٚڕێکلام؛ بـیٚتـەبلیغـات؛ بـیٚ-بانگەشـە؛ بـیٚبالگاشـە؛ بـیٚپڕوپاگانـد. (بـی تبلیغات)
بیٚشاخ: کۆڵ؛ هەر حەیوانی شاخدارێک (وە-

ک بزن)که شاخی نەبێت. (بی شاخ)
بیشتر: فد: [ئاوەڵناو+ بەند] بیشتەر؛ زیاتر؛ فیشتەر. (بیشتر)
بێشک: (١)[ناو] لانکە؛ بێشکە (گهواره) (٢)[بەند] بیٚشک؛ بیٚگومان. (بی شک)
بیٚشکست: [ئاوەڵناو] (١)کوڵنەدە؛ بیٚ نکوول.(٢)ساغ؛ نە شکاو. (بی شکست)
بیٚشۆخی: ڕاستەقینە ؛بیٚگاڵتە؛ (ب) بۆ پرسکردنە، بەڕاستە؟ شۆخی ناکەی. (جدی؟)
بیٚشوو: [ئاوەڵناو] (١) بێشۆ؛ بێژمار؛ بێداد؛ بیٚحەد؛ (بیشمار) (٢) [ناو] بیٚمێرد؛ (بێوەژن). (بی شوهر)
بیٚشەرت:بیٚمەرج؛ بیٚدانانیمەرج؛هیچ شەرتیٚ لە بەین دانە بیٚ. (ب) [ئاوەڵناو] شەرت شکێن و بێوەفا. (بی شرط؛ بی وفا)
بیٚشەرتوشۆ: [ئاوەڵناو] بیشەرتوشوێن؛ بیٚوەفا؛ بیٚقەول؛ بیٚقەولوقەرار؛ بیٚبەڵێن. (بیوفا)
بیٚ شەرتوو شوێن: >بیشەرتوشۆ.
بیٚشەرتی: [ناو] شەرت نەبردنەسەر؛ شەرت بەجیٚنەهێنان؛ بێوفایی بە قەرار و پەیمان. (بی شرطی)
بیٚشەرعی:کاری دوور لە ئایین وشەرع ؛ کاری خیلاف؛ کاری خراپ وغەیری شەرعی . (بی شرعی)
بیٚشەریک: [ئاوەڵناو] بیٚهاوبەش؛ (ب) :تە نیا؛ ب.(خوای بیٚشەریک)(بی شریک)
بێشەنگ: (١)[ئاوەڵناو]گرینۆک؛ کەسێک کە زۆر بگری یا زوو دەستبکا بەگریان؛(٢)بیٚ-شەنگ شۆڕەبی
(همیشەگریان؛ بیدمجنون)
بیٚشەهامەت: [ئاوەڵناو] بیٚجەرگ؛ بیٚ جگەر؛ قزە؛ ترسەنۆک؛ بیٚغیرەت؛ بیٚزاڵە (بی‌شهامت)
بێشی: بێشە؛ مێشە. (بیشه)
بیٚشێل: [ئاوەڵناو] (ف. گیو) ناشیرین؛ ناپوخت. (زشت)
بیٚشیلەوپیلە: [ئاوەڵناو]بیٚدەغەڵی و فێڵبازی؛ پاک و سادە.«گۆڤاری‌مهاباد١١٢» (بی‌شیلە-پیلە)
+ بێعار: فد: بۆیهەیە لەوشەی (بیعار)ی فارسییەوە هاتبیٚ) عار واتا عەیب و نەنگ لەفارسییشدا ئەم دژواتایە هەیە.(بیعار)
بیٚعارەق دەرچوون: [چاوگە،ت] (ب) بیٚ-دیتنی ئازار و عەزیەت دەربازبوون؛ (ب) لە سزای تاوان دەربازبوون. (معادل مفت در رفتن)
بیٚعورزە: [ئاوەڵناو] بیٚلیاقەت؛ سووک و چروک؛ نالایق؛ (ب) کار لێنەهاتوو. (بیعرضه)
بیٚعوزروبەهانە: بیٚلاموجوومی؛ بیٚپرووبیانوو . بی عذر و بهانه)
بیعەجمان: [ئاوەڵناو] بیٚحەجمان؛ نەسرەت؛ بیٚئۆقرە؛ بیٚئارام و قەرار. (ناآرام)
بیٚعەجەلە: بەکاوەخۆ؛ بەئارامی؛ بیٚلەزوبەز. (بی عجله)
بیٚعەمەل: [ئاوەڵناو] بیٚحەمەل.(١) بیٚ کردەوە. (٢) (ب) کابرا پیاوێکی بیٚعەمەلە؛ هیچ کارێکی خراپ ناکا. (بی عمل)
بیٚعەیب: [ئاوەڵناو] ساغ؛ دروست؛ بیٚئیراد؛ بیٚئاهوو؛ (بی عیب)

بیٚغـەرەز: [ئـاوەڵنـاو] بـیٚکینـە؛ بـیٚبوغز؛ ڕاستوڕەوان؛ (ب) بیٚلایەنگرییان دوژمنی؛ بیٚنەزەر لە قەزاوتکردندا. (بیغرض)
بیٚغەم: [ئاوەڵناو] غەمینییە؛ کـەمتـەرخـەم. (ب) ئەرخایەنبە، بیٚغەم بە: خەمت نـەبـیٚ؛ نیگەران مەبە. (بی غم)
بیٚغیرەت: [ئاوەڵنـاو] نـامووسفـرۆش؛(ب) نیشتمان فرۆش؛ ناپیـاو؛ خـویٚڕی؛ بـیٚڕەگ. (ب) ترسەنۆک؛ قـزە؛ بـیٚشـەهامـەت. (بـی غیرت)
بیٚفرمان: [ئاوەڵناو]بیٚکار؛ ئیش و فرمان پیٚ-نەسپیردراو؛[ناو]بیٚفەرمان؛ سەیارەییٚـک کـە رۆڵی نەبیٚیان ؛ ڕۆڵەکەی خەلاسیی(بۆشـی) ببیٚ یان خراپ بیٚ. (بیکار؛بیفرمان)
بیٚفەڕ: [ئـاوەڵنـاو] بـەدفـەر؛ ناشـیرین؛ ودم خراپ؛ شووم. (شوم و بدیمن)
بیٚفەرهەنگ: [ئـاوەڵنـاو] بـیٚکـەلتـوور؛ بـیٚ ئەدەب.(ب) دوا کەوتوو؛ ئادابنەزان؛ دوور لە شارستانییەت. (بی فرهنگ)
بیٚفەهیٚت: [ئاوەڵناو] بیٚشەرم؛ بیٚئابڕوو؛ بیٚ-حەیا. (بی آبرو)
بیٚڤان: (١) هین؛ وانیٚک؛ ئەوکیٚ. (چیز)
بیٚڤل: [ناو] بیڤل؛ کەپو؛ لووت. (بینی)
بیٚقابیلەت: [ئـاوەڵنـاو] سـووک و چـروک؛ نالایەق؛ ناقابیل؛ بیٚڕیٚز. (بیقابلیت. نالایق)
بیٚقاچ: (١) دوور لە پەژراندنیعەقـڵغـەیـری مەنتیقی؛ دوور لە پەسەنـدی عـەقـڵ. (غیـر منتقی) (٢) کەسیٚککەپاینییە؛ بیٚپا. (بیپا)
بیٚقاعیـدە: (١)دوور لــە ڕەســم و ڕسـووم؛ (٢)بیٚســەروبــەرە.(٣ب) عــەیــب.ئیــراد؛ بیٚقاعیدە نییە من بچم بۆلای ئەو دۆستەت؟: واتا عەیب نییـە؟ (بـی قاعـدە دوراز رسـم و رسوم)
+ بیقام: [ناو] حەوز یا گۆلی بەقەد باڵا پیـاویٚ قووڵبیٚ؛ حەوزیا گومیٚ پەینەدا. (حوض یـا استخر،درحدود دومترگود)
بیٚقانوونی: (١)[ناو]کەسلەکەسی، بیٚسـەرەو بەرەیی. (٢ب) زوڵم؛ غەدر؛ نا حـەقـی؛ دوور لە یاسا. (بیقانونی؛ ظلم)
بیٚقولاخ: [کنایی] بیٚسەروشوین؛ لە تورکییـەوە هاتووە قولاخ واتـاگوێ؛ وا بـاو بـوو ئـەگـەر مـەڕیٚـک گـورگ زگـی دڕیبـا، شـوان گوێچکەکانیدەهیٚناوە بۆ نیشانەی ئـەوە کـە گوم نەبووە؛ بیٚسۆراخ؛ ونـدا؛ بـزر. (کنایـەگـم شدن)
بیٚقەدر: [ئاوەڵناو] سووکوچـروک؛ بـیٚڕیٚـز؛ بیٚحورمەت. (بی ارزش)
بیٚقەراری: [ناو](١) نائارامی؛ بیٚئۆقرەیـی.(٢) زەوتنەبوون و بەندنـەبـوون لـە جیٚگاییٚـک. (٣) نیگەرانی. (بیقراری)
بیٚقـەوارە: [ئـاوەڵنـاو] نـاقۆلا؛ ناشـیرین؛ لـە ئەندازە و قەوارەدا نەبوون؛ زەوی یـان شـتی پان کە دارای کەچ و کووڕیبـیٚ یـان چـوار گۆشە نەبیٚ و لار و خیٚچ بیٚت. (بیقوارە)
بیٚقیمـەت: [دژ واتـا](١) بـیٚبـەها؛هـەرزان؛ چروک؛ بیئەرزش؛ناقابیل.(٢) بەخۆڕایی: بـیٚ قیمەت بۆ تۆ.(٣ب)(دژواتا) زۆر بـە قیمـەت و لە قیمەت نەهاتوو.(بیقیمت)
+ بیٚکاری: [ناو،بەرهەمیچاوگـە] (١) ڕەوتـی نەبوونی کار. (٢) بەتاڵی و کـاتی پشـوودان و

سەر پەرژین؛ (٣) لەسەرکار دەرکران و بێکـار مانەوە. (بیکاری)
بێکاریی وەرزی:کەسانێ کە شوڵەکەیان وایـە کە چەند مانگ لە ساڵدا کاریان نەبـێ؛ وەک: فـەلاو دروێنـەوان کـە زسـتانان بێکـارن. (بیکاری فصلی)
بێ کنج: ڕووت و بێ لیباس؛ بێ جل و بـەرگ. (بی لباس)
+ بیکوانە: [نـاو] بنێشـت؛ جاچکـە؛ شـیلەی قەزوان. (سقز)
بێکول: > بیکوڵ.
بێ کوڵ: [ئاوەڵناو] بێ کەسەر؛ بێ دەرد؛ بێ ئازار؛ ئاسودە. (آسودە)
بـی کـوڵ:[نـاو] کوڵـەبـی؛ بـی زەر؛ بـی زەرد؛ بنجەبی کە لە مێشەدا سەوز دەبێ. (بتـەبیـد کوتاه)
بێکەس وکار: [ئاوەڵناو] بێ فەکوفامیـل؛ بـێ-قەوم و خێش. (بیکس و کار)
بێکـەسـی: [نـاو] (١)بـێ خـزم وکـەسـی؛ تـەنیابـاڵی.(٢) بـێ هـاودەمـی؛ بـێ هـاواڵی؛ تەنیایی. (بیکسی)
بێ کەلک: [ئاوەڵناو] بێکەڵک؛ بێ سوود؛ بەکار نەهاتوو. (بدردنخور).
بێ کەللە: [ئاوەڵناو] (ب) بێ ئیحتیات و سـەرە رۆ؛ کەللەڕەق؛(ب)بێ مەغز؛ بێ عەقـڵ. (بـی کلە)
بێ کەموزیاد: (١) بە اندازە؛ نە کەم نـە زیـاد. (٢)(ب) تەواو وکەماڵ. (بی کم و زیاد)
بێ کەم وکەسر: [ئاوەڵناو] تەواوکـەمـاڵ؛ بـێ کەمایەسی؛ بێ کەموکووڕی.(بی کم وکسر)

بێ کەیف: بێ حاڵ؛ بێ شەوق؛ پەشێو؛ خەمبار؛ نەخۆش. (غمگین)
بـێ کێـر: [ئـاوەڵنـاو] (ک)بڵـاودە وتـرێ: بەکارنەهاتوو؛ بێکەڵک. (بدردنخور)
+ بێـگ: [نـاو] پیـادەی شـەتـرەنـج. (پیادەشطرنج)
بێگا: [ناو+ بەند] بێگاف؛ ناوخت.درەنـگ وە-خت.(بیگاه)
+ بێگاڤی: [ناو](١) ناوەختی؛ درەنگ وەختی. (ناوختی) (٢) زۆرەملی. (زور گویی)
بێگانـەخـوازی: [ناو،بـەرهـەمـی چاوگـە] (ب)نیشـتمان فروشـی؛ فسۆسـی بـۆ بێگانەکردن؛ کـاری بێشـەرەفـی و دوور لـە نیشـتمان پـەروەری کـردن بۆبێگانـە. (بیگانەخواهی)
بێگانەیی: [ناو](١)حاڵەتـی خـزم نـەبـوون و دوور لەخزمایەتی.(٢)نەناسراوی و غـەریبـی؛ نامۆیی؛ غەوارەیی؛ ناس نەکری. (بیگانگی)
بێ گرێ: [ئاوەڵنـاو] ڕاسـتوڕەوان؛ (ب) بـێ قۆرت و خواری؛ سەولێ بـێ گـرێ: سـەولـێ ڕاست و بێ کەچ وکووڕی؛(ب) بـێ فیـڵ (بـی گرە)
بێگلەیی: لەوەختی بەڕێ کردنی میواندا دەڵێن واتا: هیوا دارم میواندارییمان جێـی گلـەیـی و گازندە نەبووبێ. (بی گلایە) بێگۆ: [ناو] بـۆژۆ. (علف بو گرفتە)
بێگومان: [بەند] بێ شک؛ ئـەرخـەیـان. (بـی گمان)
بێ گوناح: [ئاوەڵناو] بێسووچ؛ بێتاوان. (بیگناه)
بێگەف: [ئاوەڵناو] گەوج؛ سەرسەری. (احمق)

بیل: [ناو] ئاخ؛ خۆڵ؛ خاک. (خاک).
بێڵا: (١) دوو نهۆم. (دوطبقه)(٢)باران‌نەگر؛ پەسیو. (جائیکەباران نخورد) (٣) لێ گەڕێ؛ لێی‌گەڕێ. (بگذار)
بیلاتەشبی: (ب) دوور لە ڕووت؛ تەشبیهاتی نەبێ؛ دوور لەشوبهاندن.(بلا تشبیه)
بێڵاسن:[ناو] بێڵی‌ئاسنی؛پێمەڕە. (بیل آهن)
بێڵاسنی ئەسپەرەدار: [ناو،ت]پێمەڕەیێک کە ئەسپەرەی خراوەتە سەر بۆ جێگای پا. (بیل آهن ئەسپەردار)
بیلامانێ: (١) دوور لە مانای شاراوە. (بدون معنی‌دیگر) (٢) بیلامانیع؛ بێ‌بەرگری و عیب و عار. (بلامانع) (٣) (ب) دوور لە ڕووت؛ بیلاتەشبی. (دورازحضور)
بێڵانە: [کاری ئەمری]لیگەڕێ؛ بڵا. (بگذار)
بیلانیسبەت: [بەند] بەڵا نیسبەت؛ (ب) دوور بێ لە نیسبەت بە تۆ؛ بێ‌پێوەندی لەگەڵ تۆدا. (بلانسبت)
بێلایەن: [ئاوەڵناو] حاڵەتی بێ هۆگری. (بی طرف)
بێلایەنی: [ناو] حاڵەتی کەسێک‌کە لە حوکم کردندا لایەنی هیچکەس نەگرێ. (بی طرفی)
بێڵتەکرن: [چاوگە،ت] تەکمیش؛ بۆش‌کردن و شی کردنەوەی بنی دار. (بیل زدن و نرم کردن زیردرختان)
بێلشا: (ف. گیو) لاوی گێژ و حوڵ و بێ مێشک و گەوج. (خول)
بێلکاری:[ناو](١)بەبێل‌کارکردن(٢)زەوی شێوکردن بە بێل.(٣) پێمەڕەکاری. (بیل کاری)
بێڵۆتە: [ناو] داوەتی بێ دۆ(دۆت)؛ (داوەتی فەقێیان) (جشن و سماع فقەها)
بێلوژە: جۆرێک هەرمێ. (نوعی گلابی)
بێ‌لۆک: ڕۆیشتنی ئارام و بێ‌لۆقەکردن. (راەرفتن آرام)
بێ‌لووت: (١) بێ‌دەماخ؛ سەیارەیێک کە مۆتۆڕەکەی لە پاشەوەبێ و پێشەکەی ساف‌بێ. (٢) نۆکە بێلووتە: نۆکە سپیلکە (بیدماغ)
بێلە: [ناو] جوری پیڵاوی ژنان بوو لە قەدیم‌دا. (نوعی کفش قدیمی)
بێڵەبا: [ناو] شەن‌کردنی جەغزی دانەوێڵە بە بێل. (باد دادن گندم و خرمن با بیل)
بیلەکۆ: [ناو،ت] بوول؛ خۆڵەمێش. (خاکستر)
بێ‌لەنجی: [ناو]خوێن‌گەرمی؛ بێ مان‌گرتن؛ تەبا. (خون گرم)
بیلەوار: [ناو] مەحاڵێکە لە ئازربایجانی ڕۆژ هەڵاتدا لە ئێران. (بیلەوار)
بیلیارد: اند؛ فد: [ناو](١) جۆرێک یاریە بە چەند گۆی دارین و دارە دەستێ دەکرێ(٢) کورسی(مێزی)ئەویاریە. (بیلیارد)
+ بێ‌لیتە: [ئاوەڵناو] ساف؛ بێ‌قوڕ و لیتە؛ تراوی بێ‌خەوش‌وخاڵ؛ تراوی بن نەگرتوو. (ساف و بی تەنشین)
بێڵی میکانیکی: [ناو،ت] جۆرێک مەکینە بۆ هەڵکەندنی زەوی کە بێڵێکی گەورەی بە سەرەوەیە. (بیل مکانیکی)
بیلیۆن: فد؛اند؛فرد: [ناو] لە ئامریکاهەزار ملیۆن و لە ئینگلیس‌یەک‌ملیۆن-ملیۆن.(بلیون)

بیٚماتلّی: [بەند] فەورەن؛ بیٚمەحتەلی؛ بیٚ ڕاوستان. (بی معطلی)
بیمار: [ئاوەڵناو] نەخۆش؛ ناساز؛ نەساخ؛ خەستە؛ (بیمار)
بیٚماریفەت: [ئاوەڵناو] لە فارسییەوە هاتووە بەڵام واتاکەی گۆڕدراوە بیٚمەعریفەت. (ب) ئەمەک نەناس؛ بیٚپیاوەتی؛ بیٚجوامیٚری؛ (بیمعرفت)
بیٚماف: [ئاوەڵناو] بیٚبەهرە؛ بیٚبەش؛ بیٚ حەق. (بیبهره)
بیٚماک: (١) نیٚریٚ کەهیٚلکەگونی نەبیٚ. (نربی خایە) (٢) کار و بەرخی بیٚدایک. (بزغالەو برەبی مادر)
بیٚمالٚ: [ئاوەڵناو] (١)بیٚخانەولانە؛ کەسیٚک ماڵی نەبیٚ.(٢ب)فەقیروبیٚئەنوا. (١بی خانە. ٢ فقیروبی چیز)
بیٚمانا: [ئاوەڵناو] بیٚمەعنا؛ بیٚواتا؛ قسەی پڕ و پووچ و بیٚمانا. (بیمعنی)
بیٚمایە: [ئاوەڵناو] (١) بیٚپووڵوپارە. (٢) زۆرشل و تراو. (٣) (ب) بیٚسەواد؛ بیٚزانست. (بیمایە)
بیٚمحەلی: [ناو] بیٚتەوەجوهی؛ بەچ نەزانین؛ ڕیٚز لیٚنەگرتن؛ بە چ نەگرتن؛ خۆ تیٚنەگەیاندن؛پویتەپیٚنەدان.(بیمحلی)
بیٚمرۆس: [ئاوەڵناو] (ف. گیو) غەمگین؛ ڕوو تالٚ؛ مرو مووچ؛ مرو مۆچ. (غمگین؛ روترش)
+ بیٚمریٚس: [ئاوەڵناو] (ف.گیو) بیٚ ئیشتیا. (بی اشتها)
بیٚمزەڕەت: [ئاوەڵناو]ساغ وسلامەت؛ بیٚوەی .(بیضرر)
بیٚمشوار: [ئاوەڵناو] (١) بیٚودم؛ بیٚ- فریشک.(بدیمن)(٢) نا پایە دار. (ناپایدار)
بیٚمشوور: [ئاوەڵناو] بیٚتەگبیر و بیٚ سەلیقە لە بەڕیوەبردنی کاریٚکدا. (بی تدبیر)
بیٚمشووری: [ناو،ت] بیٚتەکبیری بەتەنگی کاریٚکەوە نەبوون؛ حاڵەتی لیٚنەهاتوویی لە سەرپەرەشتی کردنی کار یان ڕیٚخراویٚکدا. (بی تدبیری)
بیٚمۆخ: [ئاوەڵناو] بیٚکەللە؛ بیٚمیٚشک. (ب) ئەوەی کردەوەی لە ڕووی عەقڵەوە نییە (بیمخ)
بیٚمۆڵ: [ناو] نشانەییٚکە لە نۆت نووسیدا کە دەنگی نۆتی ئەسڵی نیو پەردە دەهیٚنیتە خوارەوە. (بمل)
بیٚموو: (١) [ئاوەڵناو] هەویز؛ سەرتاس؛ بیٚ- تووک؛ (٢) هەر شت کە مووی نەبیٚ. (٣) لووسکە و موو دەرنەهاتوو. (٤) موو تاشراو. (بیمو)
بیمە: فد: [ناو] مەختە؛ بەڵام لە سەر زمانی خەڵک هەر بیمە دەوتریٚ و لە کەسم نە بیستووەکە بلّیٚت مەختە ئەگەر چی وشە کوردیەکەی مەختەیە. (بیمە)
بیٚمەزە: [ئاوەڵناو]بیٚتام؛ بیٚچیٚژ؛ هەروها. قسەی بیٚمەزە؛ شۆخیی بیمەزە و بیٚنمەک و بیٚتام. (بیمزە)
بیٚمەزەیی: [ناو] بیٚتامی؛ کار و قسەی بیٚ نمەک و بیٚتام کردن. (بیمزگی)
بیٚمە غز: [ئاوەڵناو] (١) بیٚمیٚشک. (٢) بیٚ- ناوەڕۆک. (٣) پووک؛ پووچەڵ. (٤) (ب) بیٚ- ئاوەز. (بی مغز)

بێمەیلی: [ناو] پێخۆش نەبوون؛ بێ-عەلاقەیی؛ سارد و سڕی؛ بێئیشتیایی. (بی میلی).
بێمێر: [ناو] بێشوو؛ بێمێرد. (بی شوهر).
بی‌مێزی: (ف. گیو) گەورەیی؛ پانی. (بزرگی؛ وسعت).
بێمێهری: [ناو] بێموحیبەتی؛نەبوونی مێهرەبانی و خۆشەویستی؛ بێمەیلی. (بی مهری)
+ بین: [ناو] بین‌خواردنەوەی زوڕناژن و شمشال‌ژەن. (عمل دم و بازدم در حین زدن نی)(۲) پیران کردن و توند خولانەوەی مەزرەق و شێلاق. (بسیار بسرعت چرخیدن)(۳) [پاشگر]واتا بینا(ناوی کرداری-دەبەخشی) ئەوەی‌کە دەبینێ وەک دوور بین، نزیک بین، هووڕبین. (بین) (۴) بینە قاقا. قوڕگ. قوڕوو. (خرخره)
+ بینا: (۱)[ناو] ساختومان.(۲) [ناو] قەرار؛ بەنا. مەگەر بینا لە سەر ئەوە نەبوو تۆ بچی. (بنا) (۳) [ئاوەڵناو]کەسێ‌کە دەبینێ. (بینا)
بینافسۆک: [ئاوەڵناو] (ف. گیو) غەمگین؛ خەمناک؛ بەپەرۆش. (غمگین)
بێناڤ: [ئاوەڵناو]بێناو؛ ناونادیار؛بێناوک؛ بێ-ناوکە. (بی نام؛ بی‌هسته)
بێناموس: [ئاوەڵناو] ناپیاو؛ بێغیرەت؛ > بێشەرەف. (بیشرف)
بیناندن: [چاوگە،ت] بار بارکردن و بەستن. (بستن)
بیناندنەوە: [چاوگە،ت](۱) دۆزینەوە؛ دیتنەوە. (۲) بەستنەوە. (پیدا کردن. بستن)
بینانەوە: بەستنەوە. (بستن)
بێناوکە: [ئاوەڵناو] بێناوک؛ بێناوەڕۆک؛ بۆش؛ بادامی‌بێناوکە: بادامی‌بێمەغز. (بی مغز و تهی)
بینای: بەستن؛ بەسەهۆڵبوون؛ یەخ بەستنی ئاو. (یخ بستن)
بێن‌بێن: [بەند] بەین بەین؛ بەینابەین؛ ناوبەناو؛ جارجار. (هرازگاهی؛ گاه‌گاه)
بێن‌تەنگ: [ئاوەڵناو] بێهن‌تەنگ؛ پشووسوار؛ بێتاقەت. (بی صبر)
بین‌خواردنەوە: [ناو،ت] شمشاڵ‌یا زوڕنا ژەندن بەیەک‌نەفەس و بێبڕانەوە و بێپشوودان. (یک‌نفس‌در نی‌دمیدن)
بێن‌درێژ: [ئاوەڵناو] پشوو درێژ؛بەتاقەت؛ خۆڕاگر؛ بێهن درێژ. (صبور)
بێندن: <بەستن. (بستن)
بێنژین: [چاوگە] پشیمین. (عطسه‌کردن)
+ بێنشک: (۱) باوێشک. (۲) وەنەوز؛ پۆنژین؛ خەوە نووچکە. (خواب آلودگی زیاد)
بێن‌فەرە: [ئاوەڵناو] بەتاڵشت؛ بەتاقەت؛ بەسەبر. بێن‌درێژ؛ بێهن‌دریژ؛ بێهن‌فەرە؛بە-پشوو. (صبور)
بێن‌ڤەدان: بێهن‌ڤەدان؛وچان‌گرتن؛ هیلاکی دەرکردن؛حەسانەوە.(خستگی درکردن)
+ بینگ: [ناو](۱) بەرقوڕوو؛ بەربین. (جلوگلو) (۲) هەناسە؛ بێن؛ بێهن. (نفس)
بین‌گرتن: [چاوگە،ت](۱) پیران گرتن و توند سووڕانەوە. (سریع چرخیدن) (۲) بین خواردنەوەی زوڕناژەن. (یک نفس سرنا زدن) (۳) بەر بینە قاقای‌کەسێک گرتن.

(یقه‌کسی را گرفتن)
بێنه: [کاری ئه‌مری] باره؛ باوه‌ڕۆ؛ بێره؛ باوره؛ بێرا؛ بێرانه؛ بیهێنه. (بیار)
بینه‌ر: [ناوبک](١) تماشاچی. (٢) ئه‌وه‌ی که ده‌بینێ. (بیننده)
بێ‌نه‌سیو:[ئاوه‌ڵناو] بێ‌پار؛به‌ش‌بڕاو؛بێ‌به‌ش؛ ئافه‌رۆز. (بی نصیب)
+ بینی: [پاشگر] حاڵه‌تی دیتن؛ جیهان بینی، تاڵا بینی، خۆشبینی، به‌دبینی. (پیواژه. بینی)
+ بێ‌نیازی: [ناو](ب) تێروته‌سه‌لی؛ ده‌وڵه‌مه‌ند؛ هیچ نه‌خوازی؛بێ‌حه‌وجه‌یی. (بی نیازی
بێ‌نیشان: [ئاوه‌ڵناو](١) یه‌کده‌ست و بێ خاڵ. (٢) بێ‌شوێن. (٣) بێ‌میداڵ. (۴) گوم‌بوو؛ سه‌رهه‌ڵگرتوو؛ بێسه‌روشوێن. (بی نشان)
بینین: چاوپێکه‌وتن؛ دیتن؛ به‌ستن؛ جه مدین؛ به‌سه‌هۆڵ‌بوون.(دیدن؛ بستن)
بینینه‌وه: [چاوگه،ت] دۆزینه‌وه؛ دیتنه‌وه. (پیدا کردن)
بێ‌نێوبڕ: [به‌ند] په‌یتا په‌یتا؛ له‌سه‌ریه‌ک؛ بێ-پسانه‌وه. (بدون وقفه)
بێنیه: [کاری‌ئه‌مری له چاوگه‌ی هێنان] بیهێنه؛ ئه‌و شته بێنه؛ باوه‌ره‌ی؛ بێرانییه. بێرای. (بیاورش)
بیو: [ناو] بیڤ؛ فورسه‌ت؛ ده‌رفه‌ت؛ بیف. (فرست)
بێواده:[به‌ند] بێگاف؛بێ‌وه‌خت؛ ناوه‌خت؛ (ب) درنگ وه‌خت. (بیموقع)
+ بێ‌وار: [ئاوه‌ڵناو] (١) بێ‌شوێن. (بینشان)(٢) وه‌جاخ کوێر. (اجاق کور)
بێ‌واری: [ناو] بێ‌شوێنی؛ وه‌جاخ‌کوێری. (بی نشانی. اجاق کوری)
بێ‌واز: [ئاوه‌ڵناو] بێ‌حه‌وسه‌ڵه؛ حاڵ‌نه‌دار؛ بێ-تاقه‌ت؛ بێ‌حاڵ؛ جارس؛ جاڕز؛ بێزار. (بیحال)بیمال وسامان؛ هه‌ژار؛ ژیان-ناخۆش.(بیوضع)
بێ‌واسیته: [ئاوه‌ڵناو+ به‌ند] بێ‌پێوه‌نده‌ر؛ بێ-ده‌ڵاڵ؛ بێ‌نێوجێیی‌که‌ر؛ بێ‌نێوبژ؛ ڕاسته‌وخۆ. (بیواسطه)
بێ‌وجوو: [ئاوه‌ڵناو]بێ‌وجوود؛ شتێک که بوونی‌نییه. (ب) بێ‌که‌سایه‌تی؛ بێ‌قه‌در؛ بێ-بایه‌خ. (بیوجود)
بێ‌وچان: [به‌ند] بێ‌حه‌سانه‌وه؛ بێ‌ڕاوه‌ستان؛ له‌سه‌ریه‌ک و په‌یتاپه‌یتا.(بی وقفه)
بێوکه: [ناو](١) موریانه‌ی خوری و به‌ن. (٢) مۆرکه. (موریانه‌پشم)
بێوڵه‌ت: [ئاوه‌ڵناو] نه‌گبه‌ت؛ نه‌هامه‌ت؛ ندامه‌ت؛ جۆری جوێن؛ شووم. (بی یمن)
بیوم: بووم؛ بووگم. (بودهام)
بێ‌ونه‌بێ: ببێ‌ونه‌بێ؛ بێت‌ونه‌بێت؛ له هه‌ر حاڵدا. (باشد و نباشد)
+ بێ‌وه‌خت: تد؛ فد: [به‌ند] ناوه‌خت؛ زیاتر بۆ دره‌نگ وه‌خت؛به‌م‌ئێواره‌بێوه‌خته هاتی؟ (بیوقت)
بێوه‌سیری: مایه‌سیری؛ باواسیر؛ واسی. (بواسیر)
بێ‌وه‌فا: [ئاوه‌ڵناو] بێ‌به‌قا؛ بێ‌قه‌ول‌وقه‌رار؛ بێ شه‌رت‌وشۆ. (بیوفا)
بێ‌وه‌ک: [ئاوه‌ڵناو] بێ‌هاوتا؛ دایکا بێ‌وه‌کا من: دایکی بێ‌وێنه‌ی من. (بی همتا)
بێ‌وێری: [ناو](١) بیڤێری؛ بێ‌ده‌رفه‌تی. (بی مجالی)(٢) نه‌خۆش که‌وتووی بێ‌عیلاج و چاره. (مریض لاعلاج)
بێ‌ویژدان: [ئاوه‌ڵناو] ویژدان خه‌وتوو؛ که‌سێک‌که ویژدانی‌نییه. (بی وجدان)
بێ‌هایی: [ناو] بێ‌ئاگایی؛ ئاگا له خۆ نه‌بوون.

(نا آگاهی)
بێهش: [ئاوەڵناو]بێهۆش. (بیهوش)
بێهن: [ناو](١) نەفەس؛ هەناسە. (نفس) (٢) بۆن. (بو)
بیەن: (١)بوون؛ بووە؛ بووگە.(٢)بووگن؛ (بوده؛ بودەاند)
بێهناخوەبەردان: حەسانەوە؛ پشوودان. (تنفس استراحت)
بێهنام: ناوە بۆ پیاوان؛ ناوچاک؛ خۆشناو. (بهنام)
بێهن پێکەتن: [چاوگە،ت] بۆنگرتن؛ بۆگەن-بوون. (بوگرفتن)
بێهندار: [ئاوەڵناو] بۆندار. (بودار)
+ بێهن‌دان: [چاوگە،ت](١) پشوودان؛ حەسانەوە. (استراحت) (٢) بۆن‌دان؛ حاڵەتی هەر شت کە بۆنی‌لێ‌دێ. (بو دادن)
بێهنژین: [چاوگە] پشمین.(عطسه‌کردن.)
بێهنشک: [ناو] پشمە. (عطسه)
بێهن ڤەدان: [چاوگە،ت] پشوودان. (استراحت)
بێهن لێ‌چکاندن: [چاوگە،ت] نەفەس لێ-بڕین. (نفس قطع کردن)
بێهن‌لێ‌چکین: نەفەس تەنگ بوون. (نفس تەنگ شدن)
بێهوودە: فد: [ئاوەڵناو] (ف.مشە) بێ‌سوود؛ بەفیڕۆ؛بێ موفا. (بیهوده)
بێهوڕک: [ناو] بەهی؛ بێ؛ بەی. (به)
بێهۆشکردن: [چاوگە،ت] لەسەرهۆش بردن؛ لە هۆشبردن؛ زیاتر بۆ نەشتەر کاری. (بیهوشکردن)
بێهۆشکەوتن: [چاوگە،ت]بێ‌هوشبوون؛ لە-سەرخۆ چوون. (بیهوش شدن)
بێهۆشی:[ناو](١)حاڵەتی لەسەرخۆچوون و هۆش لە دەستدان. (٢) بێ‌هۆشی؛ کەم بیر و هۆشی؛ فەراموش کاری؛ گێژی. (بیهوش)
بێ‌هونەر: [ئاوەڵناو] ئەوەی هیچ هونەرێکی نییە؛ (ب) بۆرە پیاگ و بێ جەوهەر. (بی هنر)
بیەوی و نەیەوی: بڤێ و نەڤێ. (ب) مەجبورە؛ ناچارە. (خواهی نخواهی)
بێ‌هەتک: [ئاوەڵناو]بێشەرم؛ بێحەیا؛ ڕوودار.(بیحیا)
بێ‌هەست: [ئاوەڵناو] بێ‌خوست؛ بێ‌خشە؛ بێ‌دەنگ و ئارام؛ بێ‌حیس. (یواش؛ بیحس)
بێ‌هەڤبەر: [ئاوەڵناو] بێ‌هەمتا؛ بێ-هاوشان.(بی همتا)
بێ‌هەمبەر: [ئاوەڵناو] بێ‌بەرابەر؛ بێ هاوتا؛ بێ‌هەڤبەر؛ بێ‌ڕەقیب؛ بێ‌هاو تەراز. (بی همتا)
بێ‌هەمپائی: [ناو] بێ‌هاوشانی؛ بێ‌هەڤبەری؛ بێ‌بەانبەری. (بی همتایی)
بێ‌هەمدی: [ناو] بێ‌حەمدی؛ غە یری‌ئیرادی؛ بەدەستخۆنەبوون؛ بێ‌ئاگایی.(غیر عمدی)
بێهەناقی: [ناو] ترسە نۆکی؛بێ‌جە رگی؛ بێزراقی. (ترسویی)
بێ‌هێڤی: [ناو] ناهومێدی؛ ناهومێد؛ ناهمێ؛ بێ هیوا؛ بێ‌هیوایی. (نا امید. نا امیدی)
بێ‌یارویاور: [ئاوەڵناو] بێ‌دۆست و رفێق؛ بێ-پشت گر و یاریدە دەر. (بی یار و یاور)
بێ‌یاوەر: [ئاوەڵناو]بێ‌یاریدەدەر؛ بێ‌ئاریکار؛ بێ‌هاواڵ و پاڵپشت. (بی‌یاور)
بێیی‌کو: بێ‌ئەوەی. (بدون اینکه)
بێ‌یومن: [ئاوەڵناو] بێ‌ودم؛ بەد قەدەم؛ بێ-یۆم؛ ناموبارەک. (بی یمن)

بادی‌گارد: انـد: [نـاو] پـارێزەری گیـانی کـە سێک لەبەرانبەر کوشتن یا هەر چەشنە هـە-ڵمەتیکدا.(بادیگارد)

باتـەجروبـە: [ئـاوەڵنـاو] بـەئـەزمـوون. (ب) دونیادیدە. (باتجربە)

باربکیو: اند؛ فرد؛ فد: [ناو] کەبـاب‌برژێنێکـی مۆدی‌ڕۆژە. (باربکیو)

بـــاردارکردن: [چاوگـــە،ت] ئاوســـکردنی گیانلەبەر؛ ڕەوتی بـەرهـەمـدارکردنی ڕووک. (باردار کردن)

بارداری: [نـاو] تـۆڵپڕی؛ تۆڵـداری؛ زگپـڕی؛ ئاوسی؛ دووگیانی. (بارداری)

باجە: [ناو] بۆتکە؛ گیشە؛ دەککە؛ وەتاغـەک؛ وەتاغێکی بچووک بۆ فرۆشی بلیتی سینەمـا یا فرۆشی وردەواڵە. (باجە. گیشە)

باداباد: هەرچی دەبێ باببێ. (باداباد)

بادگیر: [ناو](١) هـەورەبـان ئاسا لـە سـەر سەربان چێدەکرێ و بـۆ نـاو مـاڵ هـەوای سارد دێنێ لە هاوینان‌دا.(٢) کراسـی ناسـکی با نەبوێر کە بەسەر لیباسدا لە بـەر دەکـرێ. (بادگیر)

بازپرس: [ناو] دادڕەسێک‌کەکاری لێپرسین لە تۆمەت لێدراو و شاهیدانە بۆ ڕوون کردنەوی چۆنیەتی گوناح و حوکم دەر کردن لەو بارەوە. (بازپرس)

بازپەروەر: فد: [ناو،بک](١)بەخێـوکـەری بـاز. (٢) کاری‌کەسێک‌کە بەندی و تریاکی و بەنگی پەروەردە دەکا بۆ ئـەوەی بـەژیـری و سلامەتی بگەڕێنەوە ناو جـەمـاوەر و ژیـانی ئاسایی؛ دیسان پەروەردەکردن. (بازپرور)

بازپەروری:فد:[ناو]کار و ڕەوتی‌گەڕاندنـەوەی ژیری یان لەش سـاغی و ڕاهێنـانی(گیـرۆدە بووان‌بەماکگـەلـی‌سـڕکەر) بـەرەو ژیـانیکی ئاسایی. (بازپروری)

بازجۆ: [ناو،بک]باسوخواسکەر؛ کـەسـێک-کەکاری لێپرسینەوەی سەرەتاییـە لـەلایـەن ڕێکخراوی ئینزیبـات (شـارەبـانی) یـەوە بـۆ دروستکردن و تەکمیلی پەروەندەی تۆمـەت لێـدراو؛ پرسـکەری دادگـا و بـەرپرسـی حکوومەت . (بازجو)

بازخڕید: فد:[ناو]کەسێک‌کە چەند سـاڵ لـە-ڕێکخراوێکدا شوڵ دەکا و لەسـەر ئـەو کـارە بێکاری دەکەن و یەکجێ بابەتی ئەو سـالانە کە خزمەتی‌کردوە پـارەیێکـی دەدەنـێ. (باز خرید)

بازداشـت: فـد: [نـاو]زینـدانی‌کردنـی کـاتی (مـوەقـەت)ی تۆمـەت لێـدراو هـەتـا ڕوون بوونەوەی تۆمـەتـەکـە لـە لایـەن دادگـاوە. (بازداشت)

بازداشـــتی: [ناو،بـــەر]ئـــەوەی‌بازداشـــت-کراوە.بازداشتی)

بازدید: [ناو] دیدەنی دانەوە؛کاری بازڕەسی لە ڕێکخـراوێ بـۆ ئاگـاداری لـە چلۆنایـەتـی کاروباری ئەو ڕێکخراوە. (بازدید)

بازڕەس: فد: [ناوی‌بک]پشکێنەر؛ ئەوەی بازڕەسی دەکا. (بازرس)
بازڕەسی: فد: [ناو](١) پشکنین؛ سەنگ- وسوژن کردن. (٢) لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی‌کاروباری ڕێکخراوێ. (٣) توێژینەوە لە چلونایەتی ڕوداوێک؛ سەرلێدان و سەرنجدان لە کاری ڕێخراو یا کارێکی دی. (بازرسی)
بازسازی: فد؛ [ناو](١) دروستکردنەوەی شتی تێکدراو. (٢) تێکدان و لە سەرەنوێ دروستکردنەوە.(باز سازی)
+ بازگەشت: فد؛ [ناو]گەڕانەوە لە سەفەر؛ زفریان. (بازگشت)
بازگەشتی: فد: [ ناو] (١)کەسێک‌کە بازگەشت بووە و پەشیمان بووەتەوە.(٢) کاڵاێک کە بازرگان بەدڵی‌نییە و دەینێرێتەوە بۆ فابریکا (کارخانە).کاڵای بازگەشتی:کاڵای بەرگەشتی. (بازگشتی؛ برگشتی)
بازنشوست: [ناو] کارکەنار؛ خانە نشین. (بازنشست)
بازنشوستەیی: [ناو](١) کارکەناری.(٢) مووچەی‌ئەوکارە؛مووچەی بازنشوستەیی (بازنشستگی)
باستان: فد: [ئاوەڵناو] لەمێژینە؛ کەونارا. (باستان)
باستان‌ناس: [ناو]کۆنینەناس. (باستان شناس)
باستان‌ناسی: فد: [ناو]کاری‌کونینەناس؛ کۆنینەناسی. (باستانشناسی)
باستانی: فد: [ئاوەڵناو]هەر شتی زۆرکۆن؛ هەر شت پێوەندی ببێ بەباستانەوە. (باستانی)
باستانی‌کار: فد: [ناو،ت] وەرزشکاری زۆرخانە. (باستانی کار)
باسمەیی: [ناو،بەر] شەقڵ‌کراو؛ مۆرکراو؛ قوماشی مۆرلێدراو. (ب) کاری سەرسەری وبی‌سەرنجدان.(باسمەای)
باسەن: فد: کەفەڵ؛ بەرزاییی‌کەمەر لە پشتەوە؛ سمت؛ ئەندازەی دەوری ئەندام لە خوارکەمەرەوە، (دەستەواژە زیاتر لە جل- درووندا). (باسن)
+ بافت: فد: چن؛ چنراو؛کاری‌چنین؛ بافتی شارەکەکۆنەیە؛ ئەو بەردە بەردی مسە، بافتەکەی ڕەگ‌ڕەگاویە؛ کومێک یاختەی یەکسان بۆ ئەنجامی کاری ژیان لە لەش‌دا؛ بافتی کروژ کروژە. (بافت)
+ بافتە: فد: [ناو،بەر]چنراو. (بافتە)
بافتەنی: فد: [ناو]هەر شت بە شیش یا قولاپ یا مەکینە لە بەن یا کاموا بچنرێ. (بافتنی)
باڵانس: فد؛ فرد؛ اند: [ناو](١) میزان‌بوون؛ لە وەرزشی ژیمناستیکدا لە سەردەست ڕاوێستان و یا سەرمەو قولانج لێدانی‌لاتیل. (بالانس)(٢) تراز؛ میزان سووڕانی تەگەر؛ هاوسەنگ بوون؛ تەرازبوون؛ (بالانس)
باڵانس‌کردن: هاوسەنگ‌کردن؛ تەگەرێ کە واڵە دەکا باڵانس نییە. (بالانس)
بالرین: اند؛ فرد؛ فد: [ناو] پیاو لەڕەقسی باڵەدا. (مرد رقصندەبالە)
بالرینا: اند؛ فرد؛ فد: [ناو] ژن لە ڕەقسی باڵەدا. (زن رقصندەبالە)

باڵشویست: فد؛ روس‌د: ڕەوتی باڵشویک بوون. (بالشویست)
باڵشویسم: فد؛ روس‌د: [ناو] بۆڵشویسم؛ مەرامی بۆڵشویکی هەوا داری حوکومەتی میللی. (بالشویسم)
باڵشویک: فد. روس‌د: [ئاوەڵناو]بۆڵشویک؛ فراکسیۆنی حیزبی سوسیال دیموکراتی شوڕەوی قەدیم. (بالشویک).
باڵکۆن: فد: [ناو] (١) قاتی سەرەوەی سالۆنی سینەما. (٢) هەیوانی بەر پەنجێرە؛ تارمە. (بالکن)
باڵیستیک: فد؛ اند: دارای سیفەتی باڵستیکی. (بالستیک)
باڵیستیکی: فد؛اند: [ناو] مووشەکی‌باڵستیک دارای تایبەتمندی ئاراستەکردن بۆمەودا یێکی دوور. (بالستیکی)
بامەزە: [ئاوەڵناو] (١) شتی تام دار و خۆش.(٢) (ب) ئینسانی قسەخۆش و مەجلیس ئارا و بانمەک. (بامزه)
باند: [ناو] (١) پارچە قوماشی باریک و درێژ؛ تەنزیف؛ باندی برین پێچان؛ باندی قژ بەستن؛ ڕوبانی قژ پێچان؛ (٢) دەستە و گروپ وەک: باندی تروریستی. (٣) جادەی- پان؛ ئۆتۆ باند؛ باندی فرودگا. (باند پارچە. دستە؛ باند فرودگاه)
باند: [ناو] شەپۆل (فرێکانس)؛ (ب) شەپۆل لە کەرەستەی وەک ڕادیۆ و بێتەل‌دا شەپۆلی کورت و بڵیند و ناوەندی؛ ڕادیۆ کەم دوو باندە. (باند)
بانداژ: [ناو] پێچانی‌برین بە باند؛ باندپێچی. (باند پیچی)
باندبازی: [بەرهەمی چاوگە] ڕەوتی دەستە وگروپ سازکردن بۆ ئە نجامی‌کاری؛ دەستە و گروپ بازی. (باندبازی)
بایگان: [ناوی‌بک](ف.مشە) ئەوکەسەی کاری بایگانی دەکا. (بایگان)
بایەگان: [ناوبک]کەسێک کە نامە یا بەڵگەگەل دەستەبەندی دەکاو ڕایدەگرێ. (بایگان)
بایەگانی: [ناو]ئەوجێیە بایەگان کاری هەڵگرتن و دەستەبەندیی بەڵگە و نامەی لێ‌دەکا. کاری بایەگان.ئارشیو. (بایگانی)
بلوف: اند؛ فد؛ تد: [ناو] تۆپوتەشەری بێ ناوەرۆک؛ تۆپوتەشەری بەدرۆ؛ تۆپ لێدانی خاپێنەر لە قوماردا. (بلوف)
بلۆندۆر: اند؛ فرد؛ فد: [ناو،بک] تراوێکە لە موو دەدرێ بۆ ئەوە ڕەنگی موو بلۆند بکا (کالی بکاتەوە) (بلوندور)
بلووز: فد؛ فرد: [ناو] جوری‌کراس؛ کراسی ئەستوور؛ بۆلیز؛ (بلوز) (بلوز)
بلووکە: اند؛ فد: داگیرکردن و دەس‌بەسەر پارەی دەوڵەتێکدا گرتن لە لایەن دوڵەتێکی‌دیکەوە. (بلوکه)
بۆرژوا: [ناو] ئەندام یان هەواداری بۆرژوازی.(بورژوا)
بۆرژوازی: [ناو] بورژوازی:شارستانیگەلێ کە سەرمایە و ئامێرگەلی بەرهەم هێنانیان بەدە- ستەوەیە(لە وڵاتگەلی سەرمایە- داریدا.(بورژوازی)
بۆرس: فرد؛ فد: [ناو] شوینی یەکتر دیتنی

بازرگانان بۆ موعامەلەی کاڵاییێک.(بورس)
بۆرسی خویندکاری: [ناو،ت] فەرحانە یێک یان پارە یێک کە بۆ خوێندن بە خوێندکارێک دەدرێ (زیاترلە لایەن دەوڵە-تەوە).
بوروکرات: فرد؛ فد: [ئاوەڵناو]هۆگری دامودە-زگای مەرزینگەیی؛ مەرزینگە-وان.(بوروکرات)
بورۆکراسی: فرد؛ فد: [ناو] یاسای مەرزینگەیی؛ (ب)نامەبازی؛کاغەزبازی. (بوروکراسی)
بەئیجرا دانان: [چاوگە،ت] (۱) بردنی چەک بۆ بانک و لە بانگەوە بۆ دادگا بۆ ئیجرا. (بەاجرا گذاشتن)(۲) بەڕێوەبردن. (اجرا کردن)
بەتاڵەت: فد؛ عد: [ناو] وەخت بە فیڕۆ دان؛ بێ کار سووڕانەوە. (بطالت)
بەتەرتیب: فد: (۱) ڕیزکردن و ریزبەندی؛ لە چووکەوە بۆ گەورە یا بەو باردا. (۲) [ئاوەڵناو] بەنەزم؛ مورەتب. (بەترتیب؛ منظم)
بەخش: فد: (۱)پەخش؛ بڵاو.(۲)پاشگر: بە-خشندە؛ وەک: ئارامبەخش، رەهاییبەخش. (بخش)
بەخش: فد: [ناو](۱) شاری گەورە کە بە چەند بەشی دیاریکراو دابەش کراوە و هەر بەشە بەخشدارێکی هەیە و بەخشدارەکان ژیر دەستی فەرماندارێکن. (۲) چەند گوند لە ناوچەییێکدا کە گوندێک دەبێتە ناوەندی بەخش و بەخشدار و بەخشداریی تێدایە. (بخش)
بەخش: فد: [ناو](۱) بەش.؛ (۲) بەشی لە ڕێکخراوێ؛ { بەخشی تایبەت، بەخشی دەوڵەتی، بەخشی کاردۆژەی نەخوشخانە(جەراحی)}(۳) چەندگوند کە بەخشدارێکی هەیە. (۴) کاری دابەشکردن لە ماتماتیکدا.(۵) بەخشی کرێکارنشینی شار.(۶) بەخشی حیسابداریی ئیدارەی کارەبا. (بخش)
بەخشدار: مقامی هەرەگەورە لە بەخشدا؛ بەرپرس و بەڕێوەبەری شارۆچکە یا بەشێکی دیاریکراو لە شاردا بەناوی بەخش. (بخشدار)
بەخشداری: [ناو](۱) کاری بەخشدار.(۲) هەریمێ کە لە ژیر باندۆری بەخشدار دایە. (۳) شارۆچکەداری.(۴) جێگای کار تێدا کردنی بەخشدار. (بخشداری)
بەخشکردن:[چاوگە،ت]پاژکردن(بخش کردن)
بەخشنامە: فد: [ناو] ناردنی دەستووراتی گشتی بۆ ئیدارات و ڕێکخراوەکانی ژێردەست بە نووسین (بخشنامە)
بەدئەختەر: فد: [ئاوەڵناو] بەدئیقبال؛ بەدشانس؛ ناوچاوڕەش. (بد اختر)
بەدئەخم: فد: [ئاوەڵناو] خوێنتاڵ؛ ڕووترش؛ ڕەزاگران؛ ناوچاوتاڵ؛ ئێسکگران؛ مرو مۆچ؛ ناوچاوگرژ؛ گرژومۆن. (بداخم)
بەدئەندام: [ئاوەڵناو] فد: قیافەناشیرین؛ لەشخێچ و خوار. (بد اندام).
بەدئەندێش: [ئاوەڵناو] نییەتخراپ؛ بیرچەپەڵ؛ فکر چەوت؛ بیرچەوت؛ گومان-ڕەش؛ دڵپیس؛ (بد اندیش)

بەدئەنێشی: [ناو،بەرهەمی چاوگە]بەدئەندێشی؛ فکرچەوتی؛ کاری بەدئەندێش؛ دڵپیسی؛ کاری کەسێکەفکری خراپ لەسەری دایە. (بد اندیشی)
بەدجنس: [ئاوەڵناو] فد: نارەسەن؛ جنس- خراپ؛ بەدزات. (بدجنس)
بەدجنسی: [ناو،بەرهەمی چاوگە] فد: نارەسەنی؛ بەدرەسەنی؛ بەدزاتی؛ خراپی. (بد جنسی)
بەرخورد: (١) لێککەوتن؛ لەیەک کەوتنی دوو شت. (٢) چۆنیەتی هەڵسوکەوت.(٣) تووش بوون؛ بەیەک گەیشتنی دوو نەفەر لەپڕ .(۴) بەر هەڵست و دژ ڕاوستان؛ بەر خوردی پۆلیس لەگەل خراپەکاردا.(نوع بەرخورد. برخورد)
بەرقەرار: فد: [ئاوەڵناو] ڕاوەستاو؛ پابەرجا؛ ماندگار؛ دامەزراو؛ بەردەوام. (برقرار)
بەرقراری: فد: [ناو]جێگرتوویی؛ ڕاوەستاوی؛ بەردەوامی؛ دامەزراوی. (برقراری)
بەرگوزیدە: فد: [ئاوەڵناو] هەڵبژێردراو؛ بەرگەم کراو؛ پەسەن کراو؛ مومتاز. (برگزیدە)
+ بەرگەشتە: فد: [ئاوەڵناو] سەرنخوون؛ سەروبن بوو.؛ سەرنگوون هەڵگەڕاوە؛ هەڵە- وگەڕیاگ؛ وەرگەڕاو؛ بەراوەژوو؛ (برگشتە)
+ بەرگەشتی: فد: (١) کەسیٚ کە بەرگەشت بووە. (٢) [ئاوەڵناو] کالاییێک کە تاجری کڕیار بەدڵی نییەو دەینێرێتەوە بۆ کۆمپانیاییێک کە لێی کڕیوە. (اجناس برگشتی)
بەرنامەڕێژی:[ناو] داڕشتنی ڕێوشوێنی ئەنجامی کارێک؛ بەرنامەچنین. (برنامە ریزی).
بەشارەت: فدد؛عد: [ناو] موژدە؛ مزگانی؛ (مژدگانی)
بەفرخۆر: فد: [ناو،ت]جۆرێ کەرەستەی بەفر ماڵی شەقام و جادەیە. (ماشین برف روب)
بەکالۆریوس: فرد؛ [ناو] لیسانس.(لیسانس)
بەکهەند: اند؛ فد: [ناو] زەربە بە پشت ڕاکێت لێدان لە یاری پینگ پۆنگدا.(بکهند)
بەڵادیدە: [ئاوەڵناو+ ناو،بەر] بەڵادیە؛ موسیبەت دیدە ؛ بەڵا بەسەر هاتوو. (بلا دیدە)
بەڵغەمی مەزاج: [ئاوەڵناو] مرۆڤی بەشێنەیی و ناوچاو تاڵ و گرژو مۆن. (بلغمی مزاج)
بەندەرگاه: [ناو]ئەسکەلە؛ جێگای بار گیری و بار خاڵی کردنی پاپۆڕ. (اسکلە)
بەندەگەری: [ناو] نۆکەری؛ کۆیلەتی. (بندگی)
بەندەگی:[ناو]کۆیلەتی.(ب)حاڵەتی چووکایە- تی. (بندگی)
بەندەنەوازی: [ناو](ب) ژێردەست نەوازی؛ مێهرەبانی لەگەڵ ژێردەست. (بندەنوازی)
بەهرەبەرداری: فد: [ناو] ڕەوتی بە دەست هێنانی حاسڵ ومەنفەعەت؛ کەڵک وەرگرتن لە داهات. (بهرەبرداری)
بەیانگەر: فد: [ناو،بک] ڕۆشن کەرەوەی مەبەستێ؛ وادەردەکەوێ؛ وادیارە: قسەکانی بابم بەیانگەری ئەوەبوو کە کەوشم بۆ ناکڕێت. (بیانگر)
بەیانییە: فد: [ناو] بەیاننامە؛ ڕاگەیاندن بە

نووسراوه. (بیانیه)
بەین شەکەراوبوون: (ب) بەین تێکچوون؛ لەیەک زیزبوون یا توران. (میانەشکر آب)
بیٚئەسل‌ونەسەب: فد: [ئاوەڵناو]بیٚخانەوادە و بیٚئیل وتەبار؛ بیٚبنەچەک و ڕەچەڵەک؛ بیٚ بنە چەکە؛ (ب) نارەسەن. (بی اصل و نصب)
بیٚبوخار: (لە فارسییەوە هاتووە) (١) بیٚ هەڵم. (بی بخار) (٢) [ئاوەڵناو] (ب) بیٚزابتە و زاکون؛ خوێڕی و بیٚخاسیەت. (بی بخار)
بیٚتەرتیب:([ئاوەڵناو] نارێک شێواو؛ بیٚ-سەروبەر؛ بێنەزمونیزام. (بی ترتیب)
بێداری: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە] بەخەبەری؛ ئاگاداری. (ب)هۆشیاری. (بیداری)
+ بێدەماخ: [ئاوەڵناو] (١) بیٚکەیف.(بیحال) (٢)بیٚلووت؛ وەک سەیارەی بیٚدەماخ کە موتورەکەی لە دواوەیە.(بیدماغ)
بێڕاهە: [ناو،ت] بێڕێگە؛ کویرەڕێ؛ لاڕێی سەخڵەت؛ (بیراهە)
بیٚشعوور: فد؛ ند: [ئاوەڵناو] بیٚئاوەز؛ بیٚ-عەقل؛ نەفام. بیٚهەست ؛گەوج؛ تێنەگە-یشتوو. (بی شعور)
بیفتەک: فد: [ناو]تیکەگوشتی سورەوەکراو لە گوشتی چەرخ نەکراو. (بیفتک)
بیٚگوش: [ئاوەڵناو] بیٚگویٚ؛قسەنەبیس. (حرف نشنو)
بیلان: فرد؛ اند: فد: [ناو](١) تەراز نامە؛ بەراوەرد و سیایی گرتن لە کاری یەک یان چەند ڕێکخراویٚ. (٢) حیسابی کارکردی موعامەلە و خەرج و درامەت و قازانج و زەرە لە کاتێکی دیاریکراوی ڕێکخراوێکدا. (بیلان)
بیٚموبالات: [ئاوەڵناو] بیٚبەندوبار؛ بیٚ-تەوەجوە؛ بیٚ قەید. کەم تەرخەم. (بی مبالات)
بیٚمولاحە زە: [ئاوەڵناو+ بەند]بێمەلاعەزە؛ ڕەچاو نەکردنی داب و دەستووری سەلمێندراو لە کومەڵدا؛ بیٚ سرنج؛ بیٚ-ئاوڕدانەوە و تماشاکردن؛ بیٚموبالات؛ بیٚ-ڕوودەربایستی؛ بەبیٚ شەرمی حوزوور. (بی ملاحظه)
بیمەکراو: (١) مەختەکراو؛ مەختەبوونی گیان یا ماڵ لە لای بیمەگەر.(٢) هەر شت کە بیمەکراوە؛ وەک ماڵ و سەیارە...و. (بیمەگزار)
بیمەگەر: فد: [ناو،ک]کەس یا ڕێخکراوێکە کە بیمە دەکا لە بەرانبەر وەرگرتنی پارەی دیاریکراودا، کە لە بیمەکراوی دەسێنی. (بیمەگر)
بیمەنامە: [ناو] مەختەنامە؛ قەراردادێکی نوسراوە لە بەینی بیمەگەر و بیمەکراودا کە شەرت و شروتی هەردوولایەنی تێدا نوسرابیٚ. (بیمەنامە)
بیمەی ئیجباری: مەختەی ئیجباری جورێک بیمە کە بو گروپێک لە شوڵگەل پێویستە وەک بیمەی کەسی دووهەم بو خاوەن سەیارە یا بیمەی موسافیر. (بیمەاجباری)
بیمەی باربەری: بو ئەرخایەن بوون لە زەرەری زور نەکردن ، کاڵای توجاڕی یا هەر بارێکی تر، بە پێی قیمەت بیمە دەکریٚ. (بیمەباربری)

بیمەی (مەختـەی) بێکـاری: بیمـەیێـک بـۆ قـەرەبـووی ڕۆژەکـانی بێکـاری؛ هـەروەهـا بیمـەی کارگـەری و کارمـەنـدی و دزی و سوتمان و بیمەی سەیارە و بیمـەی عـومر و بیمەی دەوا و دەرمان. (بیمەبیکاری)

بیٚنەزم: فد: [ئاوەڵناو] بیٚنیزام؛ بـیٚتـەرتیـب (بی نظم)

بیۆگرافی: فرد؛ فد: [ناو] نوسینی بەسەرهات و ئەحوالات. (بیو گرافی)

بیوٚلۆژی: فـرد؛ انـد: فـد: [نـاو] ژیـانناسـی. (بیولوژی)

بیوٚلۆژیست: اند؛ فرد؛ فد: [ناو] ژینەور نـاس؛ زیندەوەرناس. (بیولوژیست)

بێهداری: فد: [نـاو] ڕێکخراوێکـی پزشـکییە دەروەستی سـاغی و سـڵامەتـی جـەمـاوەرە. (بهداری)

بێهداشت: فد: [ناو] بـاش ڕاگـرتن؛ ریٚ ورە-وشت و کارگەلیٚ کە بۆ پاراستنی سڵامەتـی و ساغی جەماوەر پێویستە. (بهداشت)

بێهداشـتی ڕۆحـی: فـد: [نـاو،ت] بێهداشـتی ڕەوانـی؛ پێشـگرتن و پاراسـتن و ماڵیجـەی نەخۆشینگەلی ڕۆحی. (بهداشت روانی)




پا: [ناو] یەکەی ئەندازە گرتنی درێژایی،پێوەرێکی ئورووپییە بەرانبەبە ۰۴۸/ ۳۰ سانتیمیتر.(فوت)

پا ئەوشار: [ناو] تەختەی ژێرپێی جۆلا. (تختەزیرپای جولا)

پابازی: فد: [ناو] گەمەکردن بەپا (ب) گەمەکردنی دوو دڵدار بە پا، وەک دەسبازی. (پابازی)

پابڕین: [چاوگە،ت] (۱) پاقرتاندن یا برینداركردن و بڕینی‌پا. (پابریدن)(ب) دووریکردن و نەچوون بۆ شوێنێ؛ سەر لێنەدان؛ تۆ خوا پام لێ‌مەبڕە زیاتر سەرم بدە؛ پات لێرە ببڕە قەت مەیێ. (پابریدن)

پابلقە: [ناو] قادرمە؛ نێردیوان؛ پێپلیکان نەردیوان؛پەیژە؛ پەینجە.پاپلیکان؛ (نردبان)

پابۆچ: [ئاوەڵناو+ ناو] پێبەند؛ پابەند. (پایبند)

پا بۆس: [ناو،بک] پا ماچ‌کەر. (پابوس)

پابۆسی: [ناو] پا ماچ‌کردن (ب) بۆخزمەت پیاوی زۆر گەورە چوون. (پابوسی)

پا بە پا: بەیەک ڕەوت لەگەڵ کەسێکا ڕۆیشتن، شان بە شان. (قدم بەقدم؛ پا بەپای کسی رفتن؛ شانەبەشانە)

پا بە پا: [ناو]پا و پا؛ پاوەپا؛ لنگەبەلنگە کەوش کردنە پا. (لنگەبەلنگە)

پابەپەردە: [ئاوەڵناو] پەنجەیێک‌کە بەینی قامکەکان، بە پەردە پێکەوەلکابن وەک پەردەی پای مراوی و قاز. (پای پردەدار)

پابەرجا: [ئاوەڵناو] پاوەرجا؛ پابەرجێ. (پابرجا)

پابەرجێ: [ئاوەڵناو] پابەرجا؛ پاوەرجێ؛ ڕاوەستاو؛ بەرقەرار لەسەر شوێنی‌خۆ؛ خۆڕاگر؛ جێگر؛ دەوامدار. (پا برجا)

پابەرێ: [ناو] شەروال؛شواڵ؛ دەرپێ. (شلوار زیر)

پابەس: >پا بەست.

پابەستە: (۱)[ناو،بەر] پێ‌بەستراو. (پابستە) (۲) [ئاوەڵناو] گیرۆدە؛ گیرخواردوو؛ پابەستەی ئەو دووکانەم ناتوانم بۆ شوێنێ بچم. (پایبند)

پابەستی: [ناو] ڕەوتی پابەستبوون؛ گرفتاری؛ گیرۆدەیی؛ گیرخواردوویی بەدەست ئیشێکەوە. (پایبندی)

پا بە عەرزا کوتان: (۱) لەقە بەعەرزدا دان (زمین لگد زدن)(۲) (ب) قین‌گرتن و تووڕە-بوون (عصبانی شدن)

پا بەعەرز نەکەوتن: (ب) لە خۆشی و بە دەماخیدا پا بەزەوی نەکەوتن؛ زیاتر بە گەیشتنی خەبەری خۆش. (روی پا بند نبودن)

پابەمانگ: [ئاوەڵناو] ژنی تۆڵدار لە مانگی ئاخری دووگیانیدا؛ (ب) لەو مانگەدا دەزێ.(پابەماه)

پابەند: [ئاوەڵناو] (۱) دەروەست؛ دەروەس. (متعهد) (۲) گیرۆدە؛ دەستەبەر

(پایبند)(۳)[ناو]هەر شت کە پای پێ‌بەبە-ستن(وسیله پابستن) (۴)[ناو] پاوەند؛ بە-ستنەوە بە پا(باپابستن)
پابەنی: [ناو] پابەندی؛ بارودۆخی پابەندبوون. (پایبندی)
پابەوی: [ناو] جیازی وەوی؛ جیازی بووک(جهاز)
پا بەیەکاهاتن: (۱) لاق تێکهالاًن. (پا بهم پیچیدن)(۲) حاڵەتی وره بەردان لە ڕۆیشتندا. (پا بهم پیچیدن)
پابێڵ: [ناو] پێمەڕە؛ بێڵاسن؛ مەڕبیل. (بیل آهن)
پاپ: [ناو](۱) پیاوی گەورەی ئایینی مەسیحی گەورەتر لە کەشیش. (پاپ) (۲) ناوی جۆرێک مۆسیقای ڕۆژ ئاوایی و ئوورووپییە (موسیقی پاپ)
پاپرەگ: [ناو]پەپرەگ؛ گیای‌کولێرە مارانە؛ سەوکا ماری. (اسم گیاهی)
پا پۆرەنیای: (۱) پا پێدانان؛ ژێرپاخستن؛ پاشێل‌کردن؛ تلیقاندنەوە بەپا؛ پا لەسەر دانان. (زیر پا انداختن) (۲ب) ماف پێ‌نەدان؛ حاشاکردن و پێشێلکردنی ماف. (زیر پاگذاشتن)
پاپۆش: [ناو] (۱) هەر شت کە لای خوارووی لەش دادەپۆشێ؛ کەوش، پاتۆڵ، دەرپێ، گۆرەوی، بە تایبەت بە قۆندەرە دەڵێن (پاپوش. کفش)(۲) پیلان؛ داو؛ (ب)لە مەخمەسە خستنن (پاپوش)
پاپۆش دروستکردن: [چاوگە،ت](۱) پا پۆش چنین؛ کەوش دوورین. (کفش دوختن) (۲) گێچەڵ سازکردن؛ بەناڕەوا تووشی مەخمەسە کردن؛ پیلان نانەوە و لە دەردیسەرخستن. (پاپوش دوختن)
پاپۆکە: [ناو] ئاڵقەدان؛ چەمەرە؛ خۆ کۆکردنەوە و قەف خواردنی مار. (چمبرەزدن)
پاپەجانی: [ناو] پیلاوی چووکەی منداڵان. (کفش کودکان)
پاپەجینە: [ناو] پەیژە؛ پاپەینجە؛ پێپەلیسک؛ نێردیوان. (نردبان)
پاپەڕ: [ئاوەڵناو] فڕندەیێک‌کە تا سەرپەنجەی پەلی لێ‌ڕوابێ؛ وەک کۆتری پاپەر. (پاپر)
پاپەست: [ئاوەڵناو] پێخوست؛ پێ پەستکراو: لە ژێر پێ نراو؛ پاپەست بوو: بەرپێ‌خراو. (لگد کوب ؛ پایمال)
پاپەستی: [ناو] حاڵەتی ژێرپا خراوی و پێخوست بوون. (پایمالی)
پاپەل: (۱)[ناو] لقەکانی خوارووی دار و گیا. (برگ ساقه پائین گیاه) (۲) [ئاوەڵناو]پاپەڕ؛ فڕندەی پا بە پەڕ. (پرندەپر پا)
پاپەنج: [ناو] سیخوڕ؛ جۆرێ ژووژووی تیر هاوێژ. (نوعی خارپشت)
پاپەی: (۱) بەدوای مەبەستێکدا ڕۆیشتن؛ پاداگرتن و سووربوون لەسەر داوخوازێ. (۲) سۆراخ‌گرتن و حەول و تەقەلا بۆ دۆزینەوەی کەسێک یان شتێک. (پیگیر)
پاپیادە: [ناو،ت] پیادە؛ سوارنییە؛ (ب) بە پیادە ڕۆیشتن. (پیادە)
پاپێچ: [ناو،ت] موزپێچ؛ بەلەک‌پێچ؛ هەر شت کە بە دەوری پا دا پێچ بخوا. (پا پیچ)
پاپێچ‌بوون: بەپای‌کەسێکا پێچان و پیلان

گێڕان و بەهانە پێگرتن؛ بەدوای چزە لێدان و ئازاری کەسێکەوە بوون؛ بەپادا ئالأن. (پا پیچ شدن)
پـاپیرووس: نـاوی گیاییێـکـەکـە یـەکـەمجـار کاغەزیان لیٚ دروست کردووه. (پاپیروس)
پا پێز: [ناوبەر] دەوەی بە پا پێژراو؛ گـەمـڕه. (سرگین پا خوردەوسفت شده)
پاپیلکە: [ناو] قادرمـە؛ نێردیـوان؛ پێپلیکـان نـەردیوان؛پـەیـژە؛ پـەینجـە. : پاپلیکـان؛ (نردبان)
پاپێو: [ناو] ئەندازەگرتن بـە هـەنگـاو؛ بـەپـا پێوان. (با پا متر کردن)
پاپیۆن: [ناو] جۆرێک قـەرەوێتـە لـە شـکڵی پەپووله، بەلاٚم وەک بۆین باخ شۆڕ نابێتـەوه. (پاپیون)
پات: (١) حاڵەتێکە لە شەترەنجـدا، بـەرابـەر بوونی بـیٚ (بردنـەوه و دۆڕانـدن). (پـات)(٢) پــات؛ جــار؛ دووپــات: دووبــاره؛ تیکــرار. (مرتبه)(٣) هەویر. (خمیر)
پاتار: [ناو] (١) لە هەندی شـوێن (ل) دەبـیٚ بە(ر) یا بە(غ) پاتال؛ ئاژەڵی وەک مەڕ و بـزن و گا؛ پاتاغ؛ پاتالٚ؛ پرِو پاتالٚ. (حیوانات اهلـی) (٢) لە کارکەوتوو؛ پیروپاتالٚ (پیرو پاتال).
پاتاغ:>پاتالٚ.
پاتاک:>پاتالٚ.
پاتان: [نـاو] جـەمـاوەریکـی سـپی پێسـتی نیشتەجێی ئەفغانستان و پاکستان. (پاتان)
پاتاوه: [ناو] (١) پووزپێچ؛ مووزپێچ؛ مووچپێچ. (موچ پیچ (٢) کاڵه. (پاتاوه)
پاترۆتــــک: (١) [ئــــاوەڵنــــاو] ڕزیــــو.
(پوســیده)(٢)[نــاو] پــڕزۆلٚ؛ تیتــۆل؛ بزگــوڕ. (رشتەباریک پارچەکهنه)
پاتڵاخ: [ناو] باتڵاغ؛ زەوینی زۆنگ و شلەقـوڕ؛ زەلکاو؛ زۆنگاو. (باتلاق)
پاتن: پات: هەویر: هەویرپاتن: هەویر پێـژان: هــەویرپانکردنــەوه و لــە بیچمــی نــان دروستکردن؛ (ب) نان کـردن. نـان پێـژان. (خمیر را بشکل چونه درآوردن)
پاتۆڕپاتۆر: [ئاوەڵناو] (١) پتڕۆ پتـڕۆ؛ ڕیشـالٚ-ڕیشالٚ؛ پڕزۆلٚ پڕزۆلٚ. (تکـەتکـه)(٢) شـڕ و کون کون و لە کارکەوتووو. (سوراخ سوراخ)
پاتۆره: [ناو] دەنکی بـەفـر؛ کولـووی بـەفـر؛ (دانەبرف)
پاتۆره : دیاری؛ خەڵات؛ (سوقات؛ خلعت)
پـاتۆس: [نــاو] پـاتۆز؛ کۆمبـاین؛ مـەکینـەی دروێنه. (کمباین)
پاتۆق: [ناو] جێگای ڕابواردنی کاتی پشوودان و بێکاری؛ پاتۆقی من مەیدانی هەڵویـە هـەر وەخت پێت خۆش بوو لەویٚ دەمبینی؛مەکـۆ (پاتوق)
پاتۆڵی: [ناو] پاتۆلٚ؛ دەمەقۆپان. (تنبان)
پـاتووک: [ئــاوەڵنــاو] پتروکــاو؛ پڕتووکــاو؛ شڕوکۆنه. (پوسیده
پاتەرۆ خ:>پاتالٚ.
پاتەرۆک: پاتال.
پاتی: (١) چێشتی لە ناو پاتیلدا کوڵاو؛ کولـاو؛ نیوه سووت. (آمادەشدەدر پاتیل)(٢) لـەگـەلٚ قاتیدا دیٚ، قاتیپاتی: تێکەلٚ پێکـەلٚ. (قـاتی پاتی)
پاتیل: (١) [ناو] مەنجـەڵـی گچکـه؛ تیانـەی

چکۆله(دیگ کوچک)(۲) [ناو] سوێنه‌ی دار؛ جێگای پات شێلان؛ جێگای هه‌ویر شێلان. (پاتیل خمیر)(۳) [ئاوه‌ڵناو] زۆر مه‌ست؛ ڕه‌شه‌مه‌ست؛ قه‌ره‌مه‌ست. (سیاه‌مست)

پاتیل‌بوون: سیامه‌ست‌بوون؛ زۆر سه‌ر خۆش‌بوون؛ قه‌ره‌مه‌ست‌بوون و ئاگا له خۆنه‌مان. (پاتیل بودن)

پاتیلۆک: [ناو] گۆشتی پاتی؛ که‌بابی پل. (کباب)

پاتێنان: که‌وتنه ناوکاریٚ؛ تێوه‌تلیان له کاریٚ؛ زیاتر بۆکاری‌خراپ ده‌وتریٚ. تێکه‌وتووه: پای‌تێناوه.(افتادن توی کاری)

پاجا: یه‌کسه‌ر؛ یه‌کجاری؛تێکڕا؛به‌جاریٚ. (یکجا)

پاجۆربوون: [چاوگه‌،ت] له‌ڕاده‌ی پێویستدا حه‌ریفی یاری هه‌بوون. (پا جور بودن)

پاجۆرکردن: [چاوگه‌،ت]په‌یدا کردنی حه‌ریفی یاری له ڕاده‌ی پێویستدا. (پا جور کردن)

پاجووت‌کردن: [چاوگه‌،ت] پا چه‌سپاندن (چه‌سپ لێدان)ی پله‌ی خوارتر بۆ پله‌ی بانتر له سه‌ربازی (عه‌سکه‌ری)دا؛ (ب)مردن. (پاچسباندن؛ کنایه ازمردن)

پاجه: [ناو] (۱) باجه؛ په‌نجێره؛ په‌نجه‌ره. (پنجره)(۲) ده‌ربیجه‌ی چکۆله‌ی پسووله فرۆشتن له سینه‌ما.(۳) دوکانچه؛ بۆتکه. (باجه)

پاجه‌چی: په‌نجێره‌ساز. (پنجره‌ساز)

پاجی: [ناو] جیٚ‌پا؛ پاجیٚ؛ شوێن پیٚ؛ ڕچه. (جای پا)

پاچرا: (۱) [ئاوه‌ڵناو] (ب) مرۆڤی زۆر کورته‌باڵا. چڵه نۆک؛ باوه‌عه‌مره؛ باوه‌قووره‌ت. (کوتوله)(۲) [ناو] پاره‌یێک‌که قومارباز به ساحێبی قومار خانه‌ی ده‌دا. (شتیل)

پاچڤه‌زان: پاچڤان؛ وه‌رگێڕ. (مترجم)

پاچک: [ناو] (۱) پیٚ؛ پا؛قاچ؛ قول؛لینگ. (پا،لنگ) (۲) په‌ڕۆی له‌ت و شڕ؛ په‌ڕۆی ده‌ستگره؛ ده‌ستگره‌ی‌ئاشپه‌زخانه. (دستگیره‌آشپزخانه) (۳)پاچکه؛ پایه‌ی چرپا و کورسی. (پایه)

پاچکه: (۱)له‌بن ڕانه‌وه هه‌تاپه‌نجه‌ی-پیٚ.(ازبیخ‌ران‌تاپنجه‌ی‌پا)(۲)پایه‌ی‌کورسی و چرپا و قه‌ره‌وێڵه. (پایه‌میز) (۳) ده‌ره‌لینگ. (پاچه)

پاچکه به‌ده‌مابردن: وه‌ک قولاپه بردن به‌ده-ما؛ لیٚ‌تووڕه‌بوون به‌شیته‌شیت و شاتوشووته-وه، شوبهاندن به سه‌گ .(پاچه کسی راگازگرفتن)

پاچکه‌هه‌ڵمالیاگ: [ئاوه‌ڵناو] ده‌ره‌لینگ هه-ڵماڵراو؛ (ب) بیٚ‌حه‌یا و ڕوو داماڵراو.(پاچه ورمالیده)

پاچه‌به‌ند: [ناو] (۱) ده‌ره‌لینگ‌به‌ند؛ پاچکه-به‌ند؛ (۲) به‌نی ده‌ره‌لینگ پێبه‌ستن. (پاچه‌بند)

پاچه‌سپاندن: [چاوگه‌،ت] چه‌سپ لێدان و سڵاوی سه‌رباز و عه‌سکه‌ر بۆ باڵا ده‌ست. (پاچسپاندن)

پاچین: (۱) [پاشگر] قرتاندن؛ هه‌ڵپاچین، داپاچین. (پسوند چیدن)(۲) [ناو] ئه‌وه‌ڵین چینی خواره‌وه‌ی دیوار. (پاچین دیوار)(۳)[ناو] لێوار و دامێنی خواره‌وه‌ی کراسی ژنانه.

(پاچین)
پاچینەوە: (هەڵ پاچین و بڕینەوەی خوری لە ئاژەڵ)؛ بڕینەوە. (پشم چینی)
پاخ: [ناو] ترس؛ سام؛ باک؛ هەراس.(ترس؛ بیم)
پاخاف: [ئاوەڵناو] گوێقوڵاخ و ترساو؛ لە سەرهەست؛ بەترسەوە. (گوش بزنگ و بیمناک)
پاخاوکردنەوە: [چاوگە،ت] ڕەوتی ڕۆیشتن هێواش کردنەوە. (آرامتر راەرفتن)
پاخستن: [چاوگە،ت] لەپاکەوتن؛ هێزی ڕۆیشتن لێبڕان بەهۆی ئازار و هیلاکی زۆرە- وە؛ (ب)حاڵەتی نەخۆشی کە نەتووانی هەڵسێتەسەرپا. (ازپاافتادن)
پاخلیسکان: [چاوگە،ت](١) پاخزان. (لغزیدن)(٢) (ب) تووشی هەڵە و لاڕێبوون. (اشتباه کردن)
پاخواردن: [چاوگە،ت](ب) کارکردنی ژێرڕاخەر، وەک مافوورە، زیاتر بۆ کۆنبوون و هەناردە، (دەرکزە) کردن واتا ناردن بۆ وڵاتی دەرەوە بۆ فرۆش (هەڵبەت لە بەر ئەوە ماڵیاتی شتی کارکردە کەمترە). (پا خوردن)
پاخوڕ: [ناو] پاشاخوڕ (پاش ئاخوڕ).چیلکە و چەوێڵی بەرماوەی لەوەڕ لە ئاخوڕدا. (پسماندەآخور)
پاخەند: [ناو] یاکەند؛ یاقووت. (یاقوت)
پاداشت خراوی: [ناو](١) سزا؛ قەرەبووی ئاکاری خراپەکردنەوە؛ خراو هاتنەڕێ.(٢) هەروا پاداش خاسی: چاکە هاتنەڕێ و قەرەبووی چاکی کردنەوە.(پاداش بدی و خوبی)
پاداف: [ناو] (١) پاداو؛ تەپکە؛ داو مووسک. (دام)(٢) کەوی بنە(کبک داخل کمینگاەشکار)
پادان: [چاوگە،ت] پاکەوتن؛ هەڵڕەخسین؛ لوان؛ ئەگەر پابدا بۆم بەهاردێم؛ واتا ئەگەر بۆم بلوێ بەهاردێم. (پا افتادن)
پادای: [چاوگە،ت] پالێدان؛ پا لەڕکێفی کەرماشێن (بایسیکل) وەردان؛ ڕکێف لێدان لەسواری اسبدا؛ پا جووڵانەوە لە مەلەدا. (پا زدن)
پادزە: [بەند] پێدزە؛ بێدەنگ هەنگاو هەڵگرتن؛ بێچرپە ڕۆیشتن. (پاورچین)
پادگان: فد: [ناو] یاگەی سپا؛ سەربازخانە؛ شوێنی فیربوونی کاری عەسکەری؛ جێگای ژیانی سەربازگەل. (پادگان)
پادەرهەوا: [ئاوەڵناو] (ب) کاری کە دەرئەنجامی دیارنییە دروستبێ یاخەێر، موعامەلە کەمان بۆی هەیە پێکنەیێت هێشتا پا دەرهەوایە: تەقولەقە.(پادرهوا)
پادەری: فد: [ناو] ڕایەخێکە لە بەر درگای ژووری ڕادەخرێ. (پا دری)
پادەم: [ناو] دەمەی ئاسنگەری. (دمەآهنگری)
پاڕابلۆم:[ناو]جۆرێک دەمانچەیە(پارابلوم)
پارازۆ: پارێزەر و ئێشکچی؛ چاوەدێر. (نگهبان)
پاراستن: [چاوگە] چاوەدێری؛ مەلاحەزەکردن و بەزەیی پیاهاتن لە لێداندا، دەست پاراستن واتا ڕەچاوگرتنی دەست و پێ شکان یا

کوێربـوون لـه کـاتی دارکـاری و کوتـهک لێداندا. (در نظر گرفتن و پر هیز کردن)
پاڕاف: فرد؛ فد: [ناو] پێش واژوو؛ پێش ئیمزا؛ ئیمزای پێش نووس . (پاراف)
پاڕافین: [ناو] جۆریک ڕۆن که له نـهوت بـه دهستدێ له قهدیما دهیاندا له سـهر و قـژ بـۆ جوانی؛ دوو جۆره(تراو و ڕهق) (پارافین)
پاڕاگراف: فرد؛ قد: [ناو] بهشێ لـه نووسـراوه کـه لـه بابـهتـێ دهدوێ و بـه دهسـتپیکی دیڕیکی تر بابهت دهگۆڕی و له بهشی پێشوو دادهبڕێت. (پاراگراف)
پاڕالێـل: [نـاو]کـهرهسـتهییکـی وهرزشـی ژیمناستیکه که له دوو میله پێکهاتووه که له ڕاستی یهکدان و ههرکام به دوو پایه له سهر عهرز دابهستراون (پارالل)
پاڕاندن: >دهڵاندن. (نشت)
پاراوی: [ناو،بهرهـهمـیچاوگـه] (۱)حاڵـهتـی پاراوبوون؛ تێرئاوی؛ ڕوهکـی ئـاودار و تـهڕ و تازه و به نهشه. (سیراب و شـاداب) (۲) بـێ-نیـازی و ژیـان خـۆشڕابـوێری؛ (ئـهوانـهی که(پاراو)ی ئاون بژارن). «سوارهی ئێلخـانی زاده». (متنعم بودن)
پـارچ: [نـاو] سـوراحی؛ تـۆنگی ئـاو؛ تۆنگـه. (پارچ)
پارچمک: [ناو]کهوشیدهمپـایی؛ سـهرپـایی؛ مداس. (دمپایی)
پارچه: فد: [ناو] (۱) قوماش.(۲) لـهت؛کـوت. (۳) یهکهی قهواره بۆ ژماردنی مڵک و زهوی؛ سێ پارچه ئاوایی؛ دوو پارچه زهوی.(پارچه)
پارچهپارچه: فد:[ئاوهڵناو]کهرتکـهرت؛ لـهت لهت؛ پاژ پاژ؛ پل پل. (پارچهپارچه)
پارچهپارچهکردن: [چاوگه،ت] پلپـلکردنـی گۆشـت یـا هـهر شـت تیکـه تیکـهکـردن؛ بـــهلقـــهتـــین؛ بـــهلقـــهتانـــدنی زۆر. (پارچهپارچهکردن)
پارچهچی: (۱ب) [ئاوهڵناو] ئاوانتهچی؛ درۆزن؛ لافلێـــــدهر؛ خۆهـــــهڵکـــــیش. (لاف زن)(۲)[ناو،ت]بـهزاز؛پارچـهفرۆش؛کووتـاڵ و قوماش فرۆش.بزاز)
پارچهفرۆش: فد:[ناو،ت]کووتـاڵ و قومـاش-فرۆش؛ بهزاز. (بزاز)
پارچهفرۆشـی: فـد: [ناو،بـهرهـهمـیچاوگـه] جێگای‌فرۆشتنی‌قومـاش؛ دووکـانی قومـاش فرۆشتن. (پارچهفروشی)
پارخان: [ناو] پهراسوو. (دنده)
پارخووان: [ناو] سمت؛ کهفهڵ. (کپل)
پارزنین: [چاوگه] پالاوتن؛ پالافتن. (پالایش)
پارزونـک: [نـاو]کۆڵوانـه؛ چارۆکـهی ژنـان. (رودوشی زنانه)
پارس: [ناو] (۱) هۆزێکی کهونـارای ئاریـایی که لهههریمـی فـارس (باشـووری ئێـران) دا دهژین؛ (۲) حهپـه؛ وهڕه؛ دهنگـی سـهگ.(۳) سـهرزهوینـی هـۆزی پـارس.(۴) هـهژار و گهدا.(پارس)
پارستن: [چاوگـه]بـهشـکردن؛ جیاکردنـهوه؛ جیاوه کردنـی بـهش؛ پارڤـهکـرن. (قسـمت کردن)
پارسکرن: [چاوگه،ت] سواڵکردن؛ گـهدایـی-کـردن؛ وهڕینـی سـهگ.(گـدایی) پارسـکهر: [ناو،بک] سواڵکهر؛ گهدا. (گدا)

پارسۆن: [ناو] پارزون؛ پاڵۆینە؛ پاڵیو.(پالا؛ صافی پالونه)
پارسەنگ خستنەپاڵ: [چاوگەت] (ب)ناونیتکە و قسەی سووک بۆ کەسێک دروستکردن و دانە پاڵ؛ ناو زڕاندن لە خۆرایی لەقەمی کرێت خستنەپاڵ. (بکسی-نسبتبددادن)
پارسەنگ‌گرتنەوە: [چاوگەت] قورسایی دەفری خاڵی دیاریکردن بۆکێشانی هەر شت کە بکریتە ناو دەفر و بکێشری؛ سەر ڕاستکردنی دوو تای ترازوو. (تعیین وزن-ظرف محتوی شیئ‌توزینی؛پارسنگ)
پارسی: فد: [ئاوەڵناو+ ناو] (۱)خەڵکی وڵاتی پارس؛ زمانی پارسی یا فورسی.(۲) ئەندامانی هۆزی پارس.(۳) زەردەشتیەگانی دانیشتووی هێند. (پارسی)
پارڤەکرن: [چاوگەت] بەشکردن؛ قیسمەت-کردن؛ دابەشکردن. (قسمت کردن)
پارک: فرد؛ فد: [ناو] (۱) سەیرانگای خاوەن دار و درەخت و گوڵ و زیاتر جێگای یاری کردنی منداڵان بە کەرەستەگەلێ کە لە سەیرانگاکەدا دامەزراوە.(۲) شوێنی ڕاگرتنی تایبەت بە سەیارە لە شەقامدا؛ (ب) گاراجی سەیارە زیاتر لە قاتی یەکەم یا ژێر زویدا؛ بەدەگمەن لە بینای گەورەدا لە قاتی دووهەم و یا زیاتر چێدەکرێ. (پارک)
پارکار: اند؛ فد: [ناو] ناوی جۆرێک باڵتەی کڵاو داری قەوی و درێژە؛ زیاتر تایبەت بەئە-ندامە کانی عەسکەرییە. (پارکا)
پارک‌کردن: [چاوگەت](۱) فەننی فێر بوونی ڕاگرتنی سەیارە لە شوفێریدا.(۲)ڕاگرتنی سەیارە لە شوێنی دیاریکراودا.(پارک کردن)
پارکێت: فرد؛ فد: [ناو]چێوفەڕشی تایبەت بۆ ناو ماڵ‌کە لە تەختە و چێوی ناسک چێکراوە. (پارکیت)
پارکی‌جەنگەڵی: [ناوت](۱) لێرەواری تایبەتی سەیرانگا. (۲) لێرەواری پاوان کراو، (قۆرخ) بۆ ژیانی گیان‌لەبەرانی وەحشی و کێوی. (پارکی جنگلی)
پارکی‌شار: [ناوت] پارکی‌گشتی سەیرانگای-گشتی زیاتر لە ناو شارەکاندا. (پارک شهر)
پارکی‌گشتی:>پارکی‌شار. (پارک شهر)
پارکی‌مۆتۆڕی: [ناوت] شوێنێ لە پادگاندا کە کەرەستەگەلێ وەک سەیارە و دەبابەی لێ پارک دەکەن. (پارک موتوری)
پارکی‌میللی: [ناوت] (۱) شوێنێ بۆ پاراستنی گیان لەبەرانی نایاب. (پارک‌ملی)(۲) (ب) پارکی‌شار. (پارک شهر)
پارگین: [ئاوەڵناو] پێوندیدار بە پارەکەوە. (پارینه)
پاڕلمان: فد؛فرد؛اند: [ناو] پەڕلەمان شوێنی کۆ بوونەوەی نوێنەران بۆ کاری تایبەت و دەستووردانان. (پارلمان)
پاڕلمانی: [ئاوەڵناو] پەڕلەمانی؛ گرێدراو بە پەڕلەمانەوە. (پارلمانی)
پاروا: بێستانێ کە درەنگ دەگا. (بوستان دیر رس)
پاروینکە: [ناو] جۆگەلەی دەوری‌چیغ و چادر و خێوەت بۆ بەرگری لە ئاوی‌باران.(جوی-دورچادر)

پاڕوو: [ناو] (١) بێڵ؛ بێڵی داری؛ وەروەرە؛ بەفرماڵ. (پارو) (٢) سەوڵ؛ چێوی گەمی بە-ڕیوەبردن؛ بێڵی گەمی ئاژووتن. (پارو)

پاڕووکێشان:>پاڕوولێدان.

پاروگرتن: [چاوگە،ت] تیکە گرتن بۆ خواردن. (لقمەگرفتن)

پاڕوولیدان: [چاوگە،ت] (١) بێڵ لێدان؛بەبێڵ پاک کردنەوەی شوێنێ؛ بێڵ ماڵ. (بیل زدن) (٢) بە پاڕوو بەفری سەربان خستنەخوارەوە و سەربان ماڵین بە وەروەرە. (برف روبی)(٣) گەمی ئاژووتن بە سەوڵ؛ سەوڵ لێدان. (پارو زدن)

پاڕووی: [ناو] سەوڵ؛ پاڕووی گەمی. (پارو)

پارەخشت: [ناو] لەتەخشت؛ تیکەیێک خشت؛ خشتی شکاو؛دەستە واژەی بە نابییە، واتا:نیوەخشت. (پارەخشت)

پارەخۆر: [ئاوەڵناو] بەرتیل خۆر؛ لە ئاوێستادا هەر بەو واتا هاتووە؛ (رشوەخور)

پاڕەس: [ناو] (١) بوار. (گدار) (٢) جێگای پێ لە قەراخ بیردا، وەک پلیکانی چووک بۆ پا دانان لە سەر و خوارکردن لە بیردا.(پلەهای دیوار چاە)

پارەکردن: [چاوگە،ت] دڕاندن؛ هەڵدڕین؛ دادڕین؛ کوتکردن؛ لەتکردن؛ بچڕاندن؛ بچکڕاندن؛ (میروەحت زولفە وکەبابیش جە-رگی پارەی نالییە) «نالی»(پارەکردن)

پارەکە: (١) [ناو] ساڵی ڕابووردوو؛ لە ئاوێستادا هەر (پارەکە)هاتووە. (پارسال)(٢)[کاری ئەمری] بدڕێنە؛ بدڕە؛(جەرگم بە خنجێر پارەکە) (پارەکن)(٣) [ناوی ناسکری]دڕاوەکە: دڕیاوەکە. (آن پارە معلوم)(٤)[ناوی‌ناسکری] دراوە کە: پووڵەکە. (آن پول ، اسم معرفە)

پارەنگا: [ناو] پێ‌مێو؛ ئەو دارە کە دەیدەنە بەر تەرزی مێو. (ستون نگاهدارندەتاک)

پاڕەو: [ناو] پیادەڕەو؛ کەناری شەقام تایبەت بۆ پیاسە. (پیادەرو)

پاریا: [ئاوەڵناو] خراپ؛ کەنەفت؛ کرێت. (بد)

پارێزتن: [چاوگە] پاراستن؛ چاوەدێری؛ پارازتن. (نگهداری)

پارێزکەر: [ناوبک] ئەوەی کە پارێز دەکا و خۆ دوور ڕادەگرێ لە هەر شت کە بە خراپی بزانێ؛ خۆ بوێر. (پرهیز کنندە)

پارێزکەردەی: [چاوگە،ت] پارێزکردن؛ پارێزگاری. (حفاظت)

پاری زل: [ئاوەڵناو] (١) (ب) بەرتیل خۆری تەماحکار؛ زاڵم. (رشوەخور ظالم)(٢)پارو زل؛ تیکەقەوی(ب) زۆرخۆر. (لقمەبزرگ؛ شکمو)

پارێڤ: [ناو]گۆشتی برژاو. (گوشت برشتە)

پاریک:>پاڕوو.

پارین: [ئاوەڵناو] پارگین؛ پێوەندیدار بە پارەکەوە. (پارینە)

پارینە: [ناو] پارۆنە؛ مریشکی‌دووساڵە.(مرغ-دوسالە)

+ پاز: [ئاوەڵناو] (ف. مشە) ناسک؛ نەرم و نیان. (نازک)

پازاچ: [ناو] (ف. مشە) داپیرک؛ ماما. (ماما)

پازار: [ناو] پاژار؛ دژی ژار؛ دژی‌ژەحر. (پادزهر)

پازەن: [ناو] نێریەکێوی. (بز کوهی نر)

پاژمله: پاش مله؛ پشتسەر. (پشت سر)
پاژنە: [ناو](۱) بەشی دوواوەی پا لە ژێر قولاپەدا.(۲) ناڵچە؛ وەک ناڵچەی کەوش.(۳) ڕێسمە؛ گرێژەنە؛ پاژنەی درگا.(۴) تەختەی ژێرەوەی قۆناخی تفەنگ. (پاشنەقنداق)
پاژنەبەرز: [ناو،ت]کەوشی ناڵچەبەرز. (پاشنەبلند)
پاژنەتێگرتنەوە: [چاوگە،ت]گۆڕینی پاژنەی کەوش. (تعویض پاشنە)
پاژنە مێشوولە:[ناو،ت]کەوشی ناڵچە بووچک کە تایبەت بەژنانە. (کفش پاشنەکوچک)
+پاژنەهەڵکێشان: [چاوگە،ت] (ب)قۆڵ هەڵماڵین و خۆ تەیارکردن و ئامادە بوون.(پاشنە ورمالیدن)
پاژنەیدرگا هەڵکێشان: [چاوگە،ت] درگا لە ڕێسمە بردن. (ب) هاتنی پەیتاپەیتای کەسێک. (پاشنە دراز جا در آوردن)
پاژە: [ناو] سەروپێک. سەروپێ. (کلەپاچە)
پاژەر: [ناو]کۆڵەکە؛ ئەستۆن؛ وێستۆن؛ ڕاگر. (ستون)
پاژەڕەش:[ناو]گەڵای تازە دەرهاتووی دارگویز. (اولین برگ ازتژەی درخت گردو درآمدە)
پاس: [ناو](۱) خستنی تۆپ بۆ هاواڵ لە یاری تۆپی پا و باسکێت باڵ و والیباڵ و هەند باڵدا. (۲) ئێشک؛ کێشک.(۳)ڕەتکردن وتەواوکردن و دەرچوون لە ئەزموونی دەرسی؛ ئەدەبییاتم پاسکرد. (۴) هێشتا چەکەکەم پاس نەکردوە واتا پارەکەیم نەخستوەتە بانک. (۵) ئاگادارکردن و وەڕینی سەگ. (پاس)

+ پاسادان: [چاوگە،ت] عافووکردن؛ بەخشین؛ لێبووردن؛ گوزەشتکردن؛ چاوپۆشیکردن؛ داپۆشینی هەڵە و عەیب. (گذشت وچشم پوشی)
+ پاسار: [ناو]کەسەر؛ خەم؛ خەفەت؛ کوڵوکۆ. (غم واندوە)
پاسردان:کوڵیدڵ دەرکردن؛ غەشی دڵ دەرکردن؛ غەشی دڵ ڕشتن. (دق دل خالی کردن)
پاساودان: پێشگری لە بەدناوی بە پاکانە؛ حەولدان بۆ شاردنەوەی تاوانی کەسێک. (جلوگیری از بدنامی کسی)
پاسدان: [چاوگە،ت] (۱) کێشک دان. (پاسداری) (۲) خستنی تۆپ لە یاری توپێندا بۆ هاواڵ. (پاس دادن) (۳) شت یا کەسێک لە سەر خۆ داماڵین و حەواڵەی کەسێکی ترکردن. (پاس دادن)
پاستۆڕ: [ناو] لوویی پاستۆڕ زانای فەرەنسی کە میکروبی پاوێر کرد و کاری میکروب کوژی (پاستوریزەکردن) بە ناوی ئەوە وەیە. (پاستور)
پاستۆڕیزە: فد؛ فرد؛ اند: [ئاوەڵناو] هەرماکێ کە میکروب (هوورک) و باکتێریەکانی بە شێوەی پاستۆڕیزاسیۆن لە بەین چووبێ؛ وەک شیری پاستۆڕیزە. (پاستوریزە)
پاستۆڕیزاسیون: فد؛ اند؛ فرد: [ناو]کاری لە بەین بردنی (هوورک و باکتێری) لەخواردەمەنیەکاندا بەشێوەی گەرما پێدان بۆ ماوەی دیاریکراو و تێکنیکی تایبەت. (پاستوریزاسیون)

پاستێل: فرد؛ فد: [ناو] جۆرێک تەباشیر بە ڕەنگ‌گەلی جۆراو جۆر کە لە وێنەکێشیدا کەڵکی لێ وەردەگرن. (پاستیل)
پاسست بوون: [چاوگە،ت] ئەو قسەم بیست هەردوو پام سست بوو، ئەژنۆم شکا؛ هێزی پانەمان.. (پا سست شدن).
پاسکاری: [ناو] لە سەریەک و پەیتا پەیتا پاس بە یەکدان لە یاری تۆپی پادا. (پاسکاری) (ب) ئازاردانی کەسێک لە ئیدارەیێکی حکومەتیدا و جێبەجێ نەکردنی کارەکەی و ناردنی بۆلای ئەم و ئەو. (پاسکاری)
پاسکاڵ: (١) ناوی زانای ئینگلیسی کە دانەری یاسای پاسکاڵە.(٢) یەکەی پێوەرەی تەوژم، بەرانبەر بە یەک نیوتۆن لە سەر میکایێک (٣) یەکێ لە زمان گەلی پرۆگرام نووسینی کامپیوتێر. (پاسکال)
پاس کردن: [چاوگە،ت] (١)حاڵەتی سەگێ کە دەوەڕی. (پارس کردن) (٢) تۆپ خستن بۆ هاواڵیاری یا پاسکردنی تۆپ بۆ سەر تۆڕی والیبال بۆ ئیسپەک لێدان. (پاس دادن) (٣) پارەی چەک لە بانگ هاوێشتن بۆ بەرگری لە گەڕانەوەی چەک. (پاس کردن) (٤) لە سەر خۆداماڵین و بەکەسێکی دیکە حەواڵە دان وەک پاسکردن لەم ئیدارەوە بۆ ئەو ئیدارە. (پاس کردن) (٥) وەڕینی سەگ لە بێگانە. (پارس کردن)
پاسوور: [ناو] جۆرێک یاری بە پەڕەی پەڕانتۆ. (پاسور)
پاسووکبوون: [چاوگە،ت]دەڵێن لە دەستپێکی کارێکدا ئەگەر کەسێک پای سووک بێت و ڕابوورێ بە سەرکارەکەدا زوو تەواو دەبێ، لە دەستپێکی تەون‌کردندا منداڵێکی خوێن شیرین بانگ دەکەن کەبێ بە سەر کارەکەدا. (پاسبک بودن)
پاسە زانای: [چاوگە،ت] پێ‌وابوون؛ وا لێ-حاڵی‌بوون؛ وا زانین. (پنداشتن)
پاسەن: بەوجۆرەسە؛ واسە؛ وایە.(اینطوراست)
پاسەنگ: [ناو]پارسەنگ. (پارسنگ)
پاسەمەبۆ: واناب؛ وانییە بەوجۆرەنابێ. (اینطوری نمی شود)
پاسەوانە: [ناو]خەرجی ئێشکچێ؛ پارەیێک‌کە بە جەزایەرچی دەدرێ. (هزینەپاسداری)
پاسە یچە: وایچە؛ وایشە؛ ئاوایشە؛ (پاسەیچە نییە تۆ وینیت وە چەم): وایش نییە تو بە چاو دیت. (اینطور هم)
پاسیاوان: [ناو] پاسەوان؛ زێڕەوان؛ زێرەوان. (پاسبان)
پاسین: [چاوگە] پەسندکردن؛ تاریفکردن؛ پیا هەڵخوێندن. (تعریف و تمجید کردن)
پاشار: باشار؛ دەرەقەت؛ مشوور. (مقابلە؛ بفکر بودن)
پاشا فر: >پاشا خوڕ.
پاشام: (١) پادشای من. (شاەمن)(٢) [ناو] پارشێو. (سحری)
پاشاو: [ناو] (١) پایناو؛ ئاوێک‌کە لە کاتی ئاو داشتنی زەوی دا بە فیڕۆ دەچێ و لە خوار زەویەکەوە دەردەچێ؛ (قووناو) (پساب آبیاری) (٢) پاشماوەی ئاوی خوراوە لە

شەربەدا. (پس ماندەآب در لیوان)
پاشای: (١)[چاوگە] شانای؛ پاشین؛ پڕژانـدن. (پاشیدن) (٢)[ڕابوردووی پاشـین] پڕژانـدی؛ پاشاندی. (پاشید)
پاشایەتی: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە]حاڵەتـی پاشا بوون؛ شایەتی؛ میرایەتی. (پادشاهی)
پاشایی: (١)[ناو] جۆرێک تریێ. (نوعی انگور) (٢) [بەرهـەمـی‌چاوگـە]سـوڵتانی؛ پادشـایی؛ شایی. (پادشاهی)
پاشـــایی‌کـــــردن: [چاوگـــــە،ت] (١) خوونکـاریکردن؛ کـار و ڕەوتـی سـوڵتانی. (پادشاهی‌کردن)
پاشبارە: دارێکە لە باسکێش (ئاموور) چەقیـوە و دەسـتەکـەوشـەی لـە سـەرە. (پایـەی دستگیرەخیش)
پاشبەر: >پاشەبەر.
پاشبین:>پاشەڕۆژ بین.
پاشـپاریز: [ناو،بـک]پاسـاوڵێ‌کـە ئاگـای لـە دواوەی لەشکرە؛ پاشـدار؛ دواپـارێز(نگهبـان. عقبەلشکر)
پاشتر: دوواتر. (عقب‌تر، بعدا)
پاشتن: [چاوگە] لوولدان و گرێدان و هەڵبـە-سـتنی ڕیشـوەی شـەدە و مێـزەر. (آویـز عمامەبستن)
پاشخسـتن: [چاوگـە،ت] (١) دوواخسـتن؛ وەپاش‌خستن؛ (عقـب انـداختن)(٢) سـپلۆت ڕاکشاندن بـە عـەرزدا. (بـەزمـین خواباندن سگ)
پاشخوڕ[ناو] پاشاخوڕ. (علف ماندەدر آخور)
پاشدڕ: (١) سەگێ‌کە بێدەنـگ لـە دواوە گـاز دەگرێ.(سگی‌کە پنهانی‌حملە‌میکند) (٢) (ب) مرۆڤـێ کـە بـە نـەهێنـی زەرەر و زیـان دەگەیێنێت.(کسی‌کەدر خفا ضرر میزند)
پاشدوو: [ناو،بک] لە پاشملە غەیبەت دەکـا . (پشت سر غیبت میکند)
پاشـڕۆژ: [نـاو] دواڕۆژ؛ داهـاتوو؛ پاشـەڕۆژ. (آینده)
پاشڕۆیی: [ناو] زڤڕین و گـەڕانـەوە؛ بـەدوادا گەڕانەوە؛ بەپاشـداگەڕانـەوە؛ پاشـڤە چـوون. (برگشتن)
پاشـڤەدان: (١) خـۆ خسـتنە دواوە. (خـود را عقب انداختن)(٢) کشانەوە؛ گەڕانەوە. (عقـب کشیدن)
پاشڤەلێـدان: [چاوگـە،ت] هـەڵچـەرخانـدن؛ ڤەزڤڕاندن. (برگرداندن)
پاشقاوەتوون: [ناو] نان‌خواردنی بەینی (نـانی بەیانی و نیمەڕۆ)قاوەتوون و فراوێن. (غـذای بین صبحانەو نهار)
+ پاشقول: [ناو] ئاخرین فروش یا قەرەپـوولْ یا میتە یان دراوێ کە بە قوماربازدەمێنیـت؛ و بـە قـەولـی قومـار بـازان لـە قولیـدا دایشـاردووە؛کە قـانی‌پاشـقول یـان قـانی دواقولی پێدەڵێن. (آخرین دینار قمار)
پاشکرێ: [ناو] دواکرێ؛ پاشماوەی‌کـرێ کـە دوای گەیشتنی بـار یـا موسـافیر دەدرێ بـە شوفێر. (پسکرایە)
پاشگر: [ناو] وردەوشە و واژۆکە کە بـە دوای وشەدا دێ و واتای وشەکـە دەگۆڕێـت وەک (پاشی) لە وشەگەلی ئاوپاشی، ژارپاشی، وتۆم پاشیدا. (پسوند)

پاشکەمە: [ناو] پاشکۆم؛ خوارەوەی قەفی گۆچان. (پایین خم عصا)

پاشکەوتن: [چاوگە،ت](١) بەجێمان لە ڕێگا ڕۆیشتندا؛ وەپاشکەوتن. (٢) دواکەوتن لە ژیان یا دەرس خویندندا. (عقب ماندن) (٣) پاشکەوتن؛ پاڵکەوتنی سەگ و تانجی. (خوابیدن سگ)

پاشکی: دەرئەنجام؛ لەپاشان؛ دووایی؛ ئەوجار؛ ئەوسا. (بعدا)

پاشگۆ: [ناو،بک] پاشدوو؛ قسەی پشتملە؛ قسەی پشتەسەر. (غیبت)

پاشگوتن: [چاوگە،ت] پاشگۆیی‌کردن؛ قسە لە پشتسەرکردن. دوا قسە، دوا گوتن. (غیبت کردن. آخرین حرف)

پاشماگ: [ناو] میرات؛ کەلەپوور؛ بەجێماو. (بجامانده)

پاشماگ‌گر: [ناو،ت] میراتبەر؛ میراس- گر.(سهم گیر ازمال بجا مانده مرده)

پاشماوەخۆر: [ناو،بک] بەرماوەخۆر. (ب) چڵکاوخۆر؛ نوکەر. (پس ماندەخور)

پاشمەڵلا: [ناو] دوای مەڵلا؛ دوای پاشمەڵلا؛کەسی دووهەم لە یاریدا. (نفر دوم در بازی)

پاشمێر:[ناو،بک] پشتگر لە شەڕدا؛یاریدە دەر لە شەڕوکێشەدا. (کسی کەدر جنگ بەکسی کمک می کند)

پاشمێر: [ناو،بک] بەرگری دواوە لە یاری تۆپی پادا. (دفاع عقب)

پاشنوێژ: (١) دوای نوێژ. (پس از نماز) (٢) (ب) دوای نیوەڕۆ. (بعد ازظهر) (٤) پاش- نیڤرو؛ پاش‌نیوەڕۆ؛ دوانیمەڕۆ. (بعد ازظهر)

پاش‌وپێش: بەرودوا؛ سەروبن؛ دووشت کە جێگای سەری‌یەکێکیان لە دواوە بێ و جێگای دواوەی لە پێشە وەبێ. (سروتە)

پاشۆر: [ناو] (١) پا دەشوا. (کسی کەپا شوید) (٢) هەر شت و هەرکەرەستە کە پای پێدەشۆن. (وسایل پا شستن) (٣) (ب) بەردێکی ڕەشی کفەڵە (بەردە پاشۆر) (سنگ پا) (٤) شوێنێکە لە قەراخ حەوز بۆ دسنوێژ گرتن و پا شۆردن. (پاشورە) (٥) پاشۆرەکردن بۆ فێنک بوونەوە یا بۆ مالیجەی نەخۆشی. (پاشویە)

پاشۆرەکردن: [چاوگە،ت] پا شتن؛ پێ شووشتن؛ پاشۆرە بە گەڵا بی یا دەرماناوی‌تر بۆ لەبەین بردنی یاو؛ پا شۆردن بۆ فێنک- کردنەوە. (پا شویە)

پاشەڕۆژبین: [ئاوەڵناو] دوورئەندێش ئایەندەبین. (آیندەنگر)

پاشەسەر: [ناو،ت] پشتەسەر؛ پشتە سەرە ،جۆرێ خشڵی ژنانە کە لە دواوەی لارەپیچی دەدەن. (نوعی زیور زنانە)

پاشەکشە: <پاشەکشێ. [ناو](١) گەڕانەوە بەدوادا؛ پاشەکشە. (عقب- نشینی)(٢)(ب)پەشیمانی؛ پاشگەزبوون. (پشیمان شدن)

پاشە لێپیس: [ئاوەڵناو](ب) ڕابووردووخراپ؛ ڕابوور دووی خراپ وگەندەڵ. (بد سابقە)

پاشەنگ: [ناو]پاشدار؛پاشمێر.(عقب دار)

پاشەوانە: [ناو]کەندووی زیادی کە دەنری بە پاش کەندووی سەرەکییەوە بۆ شانە بەستنی

هەنگ. (کندوی یدک.
کندوی دوم)
پاشەوپاش: پشتاوپشت؛ (ب) بێ ڕوو وەرگێڕان و سووڕان هەنگاونان بۆ دواوە. (عقب عقب)
پاشی: (١) لە دوایی؛ لە پاشان. (بعد)
پاشی: [پاشگر] واتا: پڕشان؛ وەشان؛ تووپاشی، ئاوپاشی، خوێپاشی. (پیواژە)
(٣)[رابوردووی پاشین] پاشاندی؛ بڵاوی کردەوە. (پاشید)
پاشێل: [ناو](١) پاشل؛ قافیەی شێعر. (قافیەشعر) (٢) پووز و پاژنەی پا.(ساق‌پا)
(٣) فلان کەس پاشێلکی تەڕە؛ واتە: ڕابوردووی خراپە.(سابقە)
پاشین: (١)لاق شین؛ پا بەڕەنگی شین. (پا آبی) (٢)[چاوگە] پڕژاندن؛ پڕژان. (پاشیدن)(٣) [ئاوەڵناو] دووا هەمین. ئاخرین. (واپسین)
پاشێنەر: [ناو،بک] هەر شت‌کە دە پڕژێنێ یا دەپاشێنێ؛ پڕژێنەر. (پاشندە)
پاقژی: [ناو] تەمیسی؛ تەمیزی و پاکی.(پاکی)
پاقلۆک: [ناو] ئێسکی قەڵەمە؛ ئێسقانی لوولاک؛ئێسکی‌درێژی‌دەست وپێ.(قلم دست وپا)
پاقلەی‌کێوی: [ناو]پۆڵکە؛ جۆرێک پاقلەی دەشت. (با قلای وحشی)
پاقلەمارانە: [ناو] پاقلەی‌کێوی؛ پۆڵکەمارانە. (با قلای کوهی)
پا قلێرە: [ناو]گوێزێ‌کە پێستە شینەکەی دانەماڵرابێ.(گردوباپوست سبز)
پاقڵیس: پاقژکردن؛ پاککردن؛ تەمیس کردن؛ دەفری خۆراک پاش تەواو کردنی‌خۆراک‌بە-نان‌لستنەوە.(پاک‌کردن)
پاقورس‌بوون: [چاوگە،ت] دژی پاسووک - بوّن. (پا سنگین بودن)
پاقوڵاخ:[ناو]سمکۆڵ.(سم‌برزمین‌کوبیدن)
پاکاسە: [ناو] لە یاری ڕامیدا کەسێک کەدەستی ئەوەڵی بردووەتەوە پای‌کاسەیە و ئەگەر دەستی دووەمیش بەرێتەوە کاسەیش دەبا تەوە. (پای کاسە)
پاکایی: [ناو، بەرهەمی چاوگە] (١)جێگاییێکی پاک لە چاو دەوراندەوری ؛(٢) ئەوەندە پیسە هەرچەند دەیشۆم پاکایی نایێت؛ واتا پاک بوونەوە؛ حاڵەتی بەپاکی-گەیشتن.(ئایی،پاشگرێکە وەک تە-ڕایی،وشکایی،ساردایی.) (حالت پاک شدن)
پاکتاوکردن: [چاوگە،ت](١) پاککردنەوە؛ بژارکردن؛ کار و ڕەوتی تەمیس‌کردنی شوێنێ لە گەمار و پیسی و خرایی؛ جەڕاندن و ئاڕوین کاری و ناسینی ئەندامانی ناپەسەند و وەدەرنانیان لە ڕێکخراوییێک. (٢) پاک-کردنەوە؛ لە بین بردنی بە ڵگەگەلی قاچاخ و کتێب و...کە دەبنە هوێ گرفتاری و گیرکەوتن؛ پاککردنەوە. (پاکسازی)
پاکدامان: فد: [ئاوەڵناو] پاکداوێن؛ دەهمەن پاک؛(ب)بێ‌گوناح.(پاک‌دامان)
پاکداو: [ئاوەڵناو] پاکدامێن؛ پارێزکار؛ داوێن-پاک. (پاک دامن)
پاکداوێن: [ئاوەڵناو] پاکدامێن؛ پاکداو. (پاک

دامن)

پاکدڵ: [ئاوەڵناو] بێفڕوفێڵ؛ ساکار؛ دڵپاک؛ بێغەرەز. (پاکدل)

پاکڕن: [ئاوەڵناو+ ناو،بک] (١) دروێنە وانێک کە لە بنەوە دەستی دەگرێ و بنبڕ دەیدوورێتەوە و گوڵ ناخا. (پاک درو کننده) (٢) (ب) بە سەر چاک و خراپ یا جوان و ناشیریندا نەچوون. (ب) یا لە خواردندا گوێ نەداتە خۆش و ناخۆش و هەموو شت بخوا و لە سەرسفرە هیچ بەجێ نەهێڵێ. (همەچیزپسند)

پاکڕەوشت: [ئاوەڵناو] خۆشخوو؛ پاکڕەفتار؛ پاککردار. (پاک روش)

پاکژ: [ئاوەڵناو] پاقژ؛ پاک. (پاک)

پاککردن: [چاوگە،ت](١) قەرز دانەوە و قەرز پاک کردن. (تسویەحساب) (٢) توێکل لێکردنەوەی میوە و دار و پێست داماڵینی لاشەی ئاژەڵ. (٣) ئاوە ڕووتکردن یا موو لە پێست کردنەوە. (پوست کندن)(٤) پاقژکردن؛ تەمیسکردن. (پاک کردن)

پاکنووسی: [ناو] نووسینی دووبارە لە ڕووی پێشنووسەوە؛ نووسین لەڕووی چڵکنووسەوە. (پاکنویسی)

پاکنیژاد: فد: [ئاوەڵناو] پاکنیژات؛ (ب)ئەسڵزادە. (پاکنژاد)

پاکنیهاد: [ئاوەڵناو] دڵ و دەروون پاک؛ پاکسروشت؛ (ب) ئەوەی بۆ هەمووان ئاواتە خوازی چاکە دەکا. (پاک نهاد)

پاکوپاراو: [ئاوەڵناو] پاکوپاریاو؛ تەڕوتازە؛ پاقژ؛ خاوێن. (تمیز و تر و تازە)

پاکوپاریاو: [ئاوەڵناو] پاکوپاراو؛ تەڕوتازە و ئاودار؛ (تمیز؛ تر وتازە)

پاکوتکی: (١) بە پا شێلان. (لگد کردن) (٢) پا بەعەرزدا کوتان و سمکوڵکردن. (سم بزمین سائیدن و کوبیدن)

پاکوڵ: [ناو](١) بەچکەی ورچ. (بچەخرس)(٢) سمکوڵ. (سم بزمین سائیدن)

پاکوڵ: (١)کورتتربوونی پا لە ژووورووی لەش. (پاکوتاه) (٢) پایەکورت؛ هەر شتی پایە داریکورت. (پایەکوتاه)

پاکە: (١)[کاری ئەمری] برنجەکەپاکە؛ پاکیپکە.(پاککن) (٢) تەمیزە؛ بێخەوشە. (پاک است)

پاکەتی: (١) لە بیچمی پاکەت. (٢) (ب) جوێنی پاکەتی جوێنی سەربەستە.(قسە پێ-وتن) لە توێی نزاکەتدا. (٣) لە ناو پاکەتدا؛ ماستی پاکەتی، شیری پاکەتی، (پاکتی)

پاکەتیپۆستی: [ناو،ت] (١) پاکەتیکە لە ئیدارەی پۆستەوە دێ.(٢) پاکەتیکە نامەی تێدەنێن. (پاکت پستی)

پاکەرەشێلە: [ناو]گیای (یاوز) بۆ درگاکردنی دومەڵ کەڵکی هەیە. (اسفرزە)

پاکەمتار: [ناو] پاکەمتیار؛ گیاخەروو. (گیاخورروو). بۆ نەخۆشینی گاڵ (گەڕۆڵی) کە زۆر دەخوری باشە. (خر نوب)

پاکەند: [ناو] پاخەند؛ یاکەند؛ یاقووت. (یاقوت)

پاکەوپاک: [ئاوەڵناو] پاکلەپاک؛ بێحیساب. (بێحساب)

پاکەوتن: [چاوگە،ت] هەڵڕەخسان پێکهاتنی دەرفەت و هەلومەرج؛ لوان؛ ڕێکەوتن. (پا افتادن)

پاکەوکردن: [چاوگە،ت] (١) پاک کردنەوە و دەستماڵ کێشان. (دستمال کشیدن) (٢) گسک دانی ماڵ و بەر دەرکە. (آب و جارو) (٣) دەردانی خەوش‌وخاڵ لە چاڵ یا حەوز. (پاک کردن) (۴) لە بژار پاک کردنەوەی دەوری دار و باخچە. (وجین کردن)(۵) هەژگەڵی دار قرتاندن. (هرس)(۶) شتن و تەمیس کردن و خاوێن کردن. (شستن و تمیز کردن)

پاکەوکریاگ: [ناو،بەر] دەستماڵ کێشراو و پا قژ کراو؛ تەمیس کراو. (پاک شده)

پاکی: (١)[ناو،بەرهەمی‌چاوگە]تەمیسی؛ پاکیێتی. (تمیزی) (٢) [بەند]سەرتاپای؛ گشتی؛ هەمووی؛ تەواوی. (پاکی با بیبا) واتا: هەمووی با بیبا. (همەاش)

پاکیێتی: [بەرهەمی‌چاوگە]ڕەوتی تەمیسی؛ خاوێنی. (پاکی)

پاکێشان: [چاوگە،ت] پای کەسێک کێشانە ناوکاری؛ (ب) لە کارێکەوە تلاندن و تووشی کێشە کردن. (پاکشیدن)

پاکێشانە دواوە: دەست هەڵگرتن لە کارێ؛ واز لە کارێ هێنان و خۆکێشانە دواوە لە کارێ. (پا بیرون کشید ن)

پاگر: (١) پاگیر؛ گرفتار؛ پابەند؛ دووچار؛ هۆی پێش‌نەچوونی کار؛ دەست‌وپێگر. (دست و پا گیر)

پاگران: [ئاوەڵناو](١ب) ئاوس؛(٢) پێقورس؛ دژی پاسووک. (پا سنگین)

پاگرتن: [چاوگە،ت] (١) منداڵێ کە فێری ڕێگاڕۆیشتن ببێ. (٢) کەوشێ کە لە شوێنێکدا ئازاری پا بدا لە بەر تەنگی؛ کەوشەکەم پام دەگرێ. (پا زدن) (٣) کاری-گرتنی‌پا لە زۆرانبازیدا. (زیر گرفتن)

پاگۆدا: ناوی پەرەستگەیێکی ڕۆژ هەڵاتی دوورە. (پاگودا)

پاگوشادانە: [ناو] پێشکەشێکە، بە میوانێ دەدرێ کە بۆ هەوەڵین‌جار بە میوانی هاتووە.>پاکردنەوە. (پیشکش مهمان)

پاگەرد: فد: [ناو] جێگاییێک بۆ دەوردانەوە یا وەرچەرخان لە ڕێگەی پلیکانی بێنای چەندقاتیدا. (پاگرد)

پاگیر: (١) هەر شت ببێتە لەمپەر و بەرگر؛ گیرۆدە. (٢) حاڵەتی دڵبەستن بە شتێ یان کەسێک کە بەرگری بکا لە ڕۆیشتن و بەجێ هێشتنی جێگاییێک.(٣) هۆی گرفتاری و دە-ردیسەری و ناڕەحەتی.(پاگیر)

پاگیربوون: [چاوگە،ت] (١) تێوەتلان بەتاوانی کەسێکی دیکەوە. (پاگیر) (٢) پابەند بوون؛ حاڵەتی دڵبەستن بەشتێکەوە؛ گیرۆدە بوون. (پاگیر شدن) (٣) حاڵەتی گیر خواردویی لە تەنگ و چەڵەمەیێکدا یا لە سووچێک (گوناحێک)دا. (پاگیرشدن؛گیر افتادن)

پاگێرە: [ناو] خەرمانێ کە بە پا ورد دەکرێ. (خرمن کوبی با پا)

+ پاڵ:(١) [ناو] سیستمێکی نیشاندانی ڕەنگ لە تەلەویزیۆنی ڕەنگیدا؛ هاوتای سێکام. (پال) (٢) (ب) حەمە خوشکی ئەحمەدی لە

پاڵ دایە واتا ژنییەتی. (کنایەهمسری) (٣) (ب) تەجاوەز؛ پیاویان کردە پاڵی واتا ئەتکیان کرد. (کنایەهم خوابگی)
پالاردانان: [چاوگە،ت] (١) (ب) هەڵەکردن؛ لارێکردن؛ کاری خراپ کردن؛ کاری نائاسایی کردن. (٢) (ب) لە ئەمری گەورەتر و باڵادەست دەرچوون. (پا کج گذاشتن)
پاڵادروو: [ئاوەڵناو+ ناو،بک] پێڵاودروو؛ کەوش دروو. (کفش دوز)
پاڵاندروو: [ئاوەڵناو+ناو،بک]کورتاندروو؛ کۆپاندروو. (پالاندوز)
پاڵاندن: [چاوگە،ت] پاڵاوتن؛ پاڵێوتن؛ پاڵافتن. (پالودن)
پاڵانقەجەری: [ناو] کورتانی قەجەری؛ جۆری کۆپان کە لە زەمانی قاجاڕدا دروست کراوە. (پالان قجری)
پالاوشک: [ناو] جێگەی پێڵاو؛ کەوشکەن.(کفش کن)
پاڵ بە پاڵ: [بەند] شان بە شانی یەکەوە بوون؛ لە تەنیشت یەکدا. (شانەبەشانە)
پاڵ پێوەنەر: [ناو،بک](١) پاڵنەر؛ ئەوەی کە پاڵ بە شتێکەوە دەنێ. (فشار دهندە)(٢) (ب) هاندەر. (محرک)
پاڵتاو: [ناو] باڵتە؛ باڵاپۆشی شۆڕ. (پالتو)
پاڵچم: [ناو] پەڵچم؛ گزرە لە گەڵای دار تایبەت بۆ خۆراکی بزن. (برگ درخت خشک خوراک بز)
پاڵ خریاگ: [ناو،بەر] پاڵ خراو؛ ڕاکێشراو. (خواباندەشدە)
+ پاڵ خستن: [چاوگە،ت] (ب) خەواندن و درێژکردن لە سەر عەرز. (خواباندن)
پاڵدانە پاڵ: شان بە شانی یەکەوەنان بۆ ئەنجامی کاری. (ب) کۆمەککردن؛ ئاریکاری؛ گەلەکۆمەکی. (کمک کردن)
پالدای: هەڵسپاردن؛ هەڵی سپارد. (تکیەدادن؛ تکیەداد)
پاڵدراو: [ڕابوردووی پاڵدان] هەڵسپاردە؛ هەڵسپاردراو؛ هەر شت کە پاڵی دابێتەوە. (تکیەدادە)
پاڵ دیوار: [ناو،ت] پای دیوار؛ پەنای دیوار. (جنب دیوار.)
پاڵس: [ناو]یەکەی دیاریکردنی خەرج و پارەی تەلەفۆن و مۆبایل. (پالس)
پاڵ سەنگ:[ناو] پارسەنگ کە بۆ قەرەبووی تای ترازوی سووک لە سەری دادەنرێ. (پار سنگ)
پاڵکورسی: [ناو،ت] پاڵقورسی؛ نزیکی قورسی؛ بەرکەی قورسی. (جنب کرسی)
پاڵکەفتگ: [ڕابوردووی پاڵکەوتن] پاڵکەوتوو؛ ڕاکشاو؛ درێژبوو. (درازشدە)
پاڵ کەوتن: [چاوگە،ت]درێژبوون؛ ڕاکشان. (دراز کشیدن)
پاڵگان: [ناو] پاڵگانە؛ باڵکۆن. (بالکن)
پاڵگە: [ناو] جێگای پاڵ پێوەدان؛ باڵنج؛ پشتی؛ پاڵپشت. (پشتی)
پاڵ لیدانەوە: [چاوگە،ت] پاڵ دانەوە و پشوودەرکردن؛ بێهن وەدان دوای ئەنجامی-کاری؛ (ب) ئاسوودە بوون؛ دڵنیا بوون؛ ئەر خایەن بوون. (تکیەدادن. آسودەشدن)
پاڵنگان: پلینگان؛ گوندێکی دیمەن جووانە لە

ڕۆژ ئاوای باشوری شاری سنه. (پالنگان)
پاڵنەگەڕان: [چاوگە،ت] باڵنەگەڕان؛ پاڵت نەگەڕێت؛ (ب) خودا دەوامت نەدا؛ جۆرێک تووک لێکردن؛ هیوای خراپ خواستن بۆ کەسێک(لە گەڕیکە ویت)(خواستاربدی برای کسی)
پاڵۆش: [ئاوەڵناو] پرش؛ تێکەڵ. (مخلوط)
پاڵۆنە: [ناو] پاڵۆنە؛ کەفگیر؛ کەوگیری کون کون. (کفگیر)
پالووتە: [ناو] (۱) گەل؛ گەلە دروێنە وگەلە جووت.(۲) بێگار بەگەل؛ کاری بێ‌مز بەگەل. (بیگار جمعی)
پاڵوو دان: [چاوگە،ت] (۱)بە تە نیشتە وە پاڵکەوتن؛ پاڵەو دان؛ پاڵ‌وەدان؛ پاڵڤەدان؛ پاڵدانەوە. (تکیەدادن)(۲) کەژووی ژێرسکی بارە بەر و تەنگەی زین بەستن. (تنگ زین بستن)
پالووڤ: [ناو](۱) لاتەرافە؛ تەنیشت. (پهلو (۲) تەنگە و پاڵووی ژێر سکی وڵاخ؛ پاڵوو. (تنگ زین)
پاڵە: [ناو] (۱) وشەیێکی ئاوێستاییە واتا شار، پاڵەوان: چاودێری شار. (۲) بە هەڵە باوە کە بە هەموو دروێنەوانێ دەڵێن پاڵە، بەڵام پاڵە ئەو دروێنەوانەیە کە لە هاواڵانی بەکارترە و خەتی دروێنە دیاری دەکا لە پاڵەوە، ودروێنەوانانی‌تر لە خوار دەستیەوە دروێنە دەکەن.(دروگر ممتاز)
پا لە بەرە درێژترکردن: [کنایی] پای‌زیادی داکێشان؛ (ب) ڕوو داری و زیادەڕەویی؛ لە ئەندازە بەدەر کردن؛ تەماح و ویستی زۆرتر لە ئەندازە؛ (ب) بە تەمای ئەنجامی‌کارێ کە لە وزە دا نەبێ. (پا را از گلیم دراز کردن)
پاڵەپەسێو: [ناو] (۱) گەمەی پاڵ لە یەکەوە-نان زیاتر لە پاڵ دیواردا؛ پاڵەپەستێ؛ شانە-چرکێ. (بازی هول دادن.بافشار) (۲) بە زۆر ئاخنینەوە؛ پاڵەپەستۆ. (بافشار آکندن)
پا لە پەی دان: [چاوگە،ت] پاقاویژ؛ لە-ڕۆیشتندا پانییە لە قولاپەی پاکەوتن. (پاشنەزدن به قوزک پا موقع را رفتن)
پا لەپەیین‌دان: [چاوگە،ت](ب)بێ‌کاری‌وبێ باری؛ گەڕان و سووڕانەوەی بێ موفا. (بیکار)
پا لە حەق‌خستن: [چاوگە،ت] پا لەسەرحەق-دانان؛ ماف و ڕاستی پامالکردن ؛ حەق وە شاردن؛ حەق کوژی. (حق را زیر پا گذاشتن)
پا لە ژێردەرچوون: [چاوگە،ت] (ب) هە-ڵخلیسکان؛ (پالغزیدن)
پا لە سەردانان: [چاوگە،ت] پا لێنیان؛ پا لێنان؛ بە ژێر پاوەکردن (ب)شاردنەوەی مە بەستێ. (لگد کردن)
پا لەسەرلێوی‌قەبربوون: (ب) سەر لە گوێی قەبر لەرزین؛ پیری زۆرهان؛ بەیەکی‌دەڵێن‌کە عومری‌کەم مابێ و زۆر پیر بووبێ. (پا لب-گوربودن)
پالەقۆچە: [ناو] سەرمەوقولات؛ سەرمەقولاتج. (محلق)
پالەقە: [ناو،ت](۱) لەقە لێدان؛ بە ژێر پێ بە سەرشتێکدا دان،ئەگەر بەسەرپەنجەی‌پابێ (شەق)ە. (۲) بۆ وڵاخ ئەگەر بە یەک پابێ لەقە و پاش لەقەیە و ئەگەر بە هەر دوو پا بێ جووتەیە. (لگد)

پاڵەکی: فد: [نـاو] دوو سـندوقی داریـن کـە بەینی تەختەکانیٚ هەراشە (بلاٚوە) و لە سـەر بارە بەر دایـدەبـەسـتن بـۆ کێشـانی بـەرد و خشت. سەرەکەیشی بەتاڵە. (پالکی)

پاڵەمێر: [ئاوەڵناو] ئاخووەونـد؛ هونـەرمـەنـد؛ زیرەک؛ وریا؛ زانا. (هنرمند. دانا)

پاڵەنگ‌بوون: [چاوگە،ت] (١) شەلبوون. (شل شدن) (٢)بارچەوت بوون. (بدبیاری) ٣. کـەم بوونی پای یاری.(پالنگ بودن دربازی)

+ پاڵەوان: (نـاو)(١) وشـەیێکـی ئاوێسـتاییە؛ شارەوان؛ چاودێری شار. (٢) ئەکتەری ئەوەڵ لە سینەمادا. (آرتیست)

پاڵەوان‌کەچەڵ: [ناو] ئاواڵی بیجبیجان خانم لە بەزمی لوٚتیاندا کە لە ناو چادرێکی چووکدا بەرِێوە دەچوو. (پهلوان کچل)

پاڵـەوانـە: [نـاو] پاڵوانـە؛ باڵداسـووکە؛ تەیرەکوێرە؛ تەیرە حەوابیلە. (پرستوی سیاه)

پالەوی: (ناو)(١) پێوەندیـدار بـە پالـەویـەوە، کڵـاوی پالـەوی، زمـانی‌کـۆنی پالـەوی، (٢) بنەماڵەی شای ئێران لە دەورانی قاجار هەتـا دامەزرانی کۆماری ئیسلامی. (پهلوی)

پـاڵی: زمـانی ئـەدەبـی و دینـی تـاقمیٚ لـە بوودابیەکانی هێند. (پالی)

پالیٚبـڕین: [چاوگـە،ت] هـاتوچۆ نـە کـردن؛ سەرلێ‌نەدان؛ ئەحوال نەپرسین. (پا از کسـی بریدن)

پالێدان: [چاوگە،ت] (١) بە پا لە شتێک دان. (٢) پا جوڵاندنەوە لە پا مـەلـەدا. (٣) ڕکێفـی دووچەرخە سووڕاندن بە پا. (۴) بە رکێف لـە تەنیشتی ئەسب کوتان. (۵) ناسووسـی پـایی لێدان و با کردنە ناو توٚپ و تیوپ. (پا زدن. بەتلمبەباد پازدن)

پالێنان: [چاوگە،ت] (١) پانیان بە سەرشتێکدا. (پـا گذاشـتن) (٢) ڕاسـتی وتـن؛ درکانـدنی نهێنـی و سـووچ و گونـاح ؛ دان پێـدانان. (اعتراف)

پاڵێو: [ناو،بک] ئەوەی‌کە دەپاڵێوی؛ ئـامرازی پاڵاوتن؛ (پالا)

پاڵێوگا: [نـاو] (١) (ب) پاڵایشـگاە؛ فابریکـای پاڵـاوتنی پـاترولٚ (نـەوت) و گـاز و.. (ب) فابریکای پاڵاوتن و جیاکردنەوەی ماکگـەلـیٚ کـە لـە نـەوت بـەدەسـتدیٚ. (پالایشگاەنفت)(٢)جێگەی پاڵـاوتن. (جـای- پالایش)

پامالٚ: [ئاوەڵناو] خسـتنە ژێـر پـیٚ؛ پێشـێل؛ پایەمـالٚ؛ لـە ژێـر پـیٚدا وردکـردن؛ پتیـوار. (پامال)

پامناچیٚ: (ب) قەت ناچم؛ هەرگیز ناچم؛ پای تیٚ نانێم. (پا نمی گذارم)

پامۆرە: [ناو] (١) پاماو؛ لووسکردنی گەچ لـە گەچکاریدا بە قوماش یالۆکەی‌تەڕ(صافکردن گچ با پنبەتر) (٢) پام0وورە؛ پێموورە؛ پاوانە لـە مووررووی هۆنراوە. (زینت‌مچ پا)

پاموزە: [ناو] پامز؛ حەقەپیلاو. (حق القدم)

پاموورە جوانیٚ: گورانییەکی‌کۆنە کـە بـەرێـز میسباح دیوان، (ئەدب) بەشێعری (نوسرەتیٚ- جوانیٚ) دای ناوە و بۆی هەیە کەسانێکی‌دی کە مەبەستیان نوسرەت نەبوە کردوویانـە بـە پاموورە جوانیٚ چونکا هەردوو یەک (مێلۆدی) و یەک (ئاهەنگ) و گۆرانین. (اسـم ترانـەای

است)
پامەس: [ناو] وتار؛ گوفتار؛ نوسراوەی وتار. (مقاله)
پا مەتبەری: [ناو](١) لاواندنەوەی مردوو لە بواری قسەی ئاخونددا لەلایەن دانیشتوانی دەوری مەنبەرەوە. (٢) (ب) وتەی کەسێک بە شێاو زانین و سەلماندنی بە خەڵکی تر بەوتنی بەڵی و ئەری یا قسە و کەلام هاویشتن لە بواری قسەکەدا. (پا منبری)
پامەنقەڵی: [ناو] جۆرێک ئاوازی ئێرانی لە ڕا بووردوودا تایبەت بوو بە ئەسرار کێشانی دەوری مەنقەڵ کە لەبواری هونەرییەوە بایەخێکی ئەو تۆی نەبوو، بەڵام بەشێعرەکانی زیاتر بایەخ دەدرا. (پامنقلی)
پاناڤ: [ئاوەڵناو] پانتاو؛ پاناو؛ زەوینی تەخت؛ دەشتایی. (میدان؛ پهنایی زمین)
پا نان بەجەرگدا: (ب)زات‌کردن؛ نەترسان؛ وێران؛ خۆ خستنە مەترسی و خەتەر. (پارویجگرگذاشتن)
پا نانە جێپا: (١) کەسێک‌کردن بە نموونە بۆ ژیان و حەول دان بۆ ئەوەی وەک ئەو ژیان بەرنە سەر و جێگای ئەو پڕ بکەنەوە. (پا جای پای کسی گذاشتن) (٢) لاسایی کردنەوە؛ دەمەلاسکی‌کردن و وەک کەسێک خۆنیشاندن. (تقلید در آوردن)
پا نانەناو: چوونەناو؛ چوونە تێوی؛ پامناوەتە حەفتا ساڵ. (پا گذاشتن)
پاناوک: [ناو] ئەو جێگا کە چۆم پان و تەنک دەبێتەوە؛ تەنکاو؛ زیاتر بۆ بواری‌چۆم دەوتری.(گدار)
پان‌بوونەوە: [چاوگە،ت] (١) خۆ پان‌کردنەوە و خەوتن لە عەرزدا. (٢) خۆشلکردنی مێوینە بۆ جووت‌بوون و خۆ پاڵ‌خستن.(پهن شدن)
پانتومیم: [ناو] لاڵبازی؛ نیشاندان و گێڕانەوەی مەبەستێ بە جووڵانەوی هەموو ئازای لەش جگە لە زبان جار و بار مۆسیقایشی لەگەڵدایە. (پانتومیم)
پانجاڕی: [ناو] پانجاڕچن؛ گیاچن؛ گیای خواردەمەنی هەڵکەن. (سبزی جمع کن)
پانچ: اند؛ فد: [ناو] ئامرازێ کە ئاگاداری دەدا بەکەرەستەگەلی کارەبایی و کامپیوتێری، بە کون‌کون‌کردنی شریتی کاغەزگەلێک.(پانچ)
پاندا: فرد؛ فد؛ اند: [ناو]گیانلەبەرێکی ورچ ئاسای چکۆلەیە زیاتر بە ڕەنگی بەڵەکی سپی و ڕەش، دەوری چاویشی ڕەشە. (پاندا)
پانک: [ناو] مەڵاشوو؛ مەڵاشک. (سقف دهان)
پانک: اند؛ فد: [ناو] تاقمی لە لاوەکانی ڕۆژ ئاوایی کە دژ بە بیر و باوەڕی کۆمەڵگایان. (پانک)
+ پانکە: [ناو] جووجە؛ غەریب سنجان؛ تەختە پیتی.>پەنکە. (ساس)
پانکی: [ناو] شوێگرانی پانک؛ کەسانێ‌کە وەک پانک لیباس لە بەر دەکەن و سەر و قژیان بە شێوەی ئەوان دە ڕازێننەوە. (پانکی)
پانگ: [ناو] قولانج؛ درێژایی بە ئاندازەی کردنەوەی قامکی گەورە و شادە. لە بست کەمتر. (باژ)
پانگولەن: [ناو] مروچە خۆر و میلوورە خۆر، گیانلەبەرێکە بەقەد ڕێوییێک دەبێ و لووتی وەک (بابلیسوک)خورتوومی فیل وایە.

(پانگولن)
پانگهە: [ناو] پشتێر؛ هـۆڵ؛ تـەویلـە؛ گـەوڕ؛ پشتیر؛ هەمـار؛ عـەنبـاری گـەنـم و خـەلـە. (طویلە؛ انبار)
پان‌وپۆڕ: [ئاوەڵناو](۱) مەکانی پان و بەریـن. (مکان وسـیع) (۲)مرۆڤـی تـەزەی ناوشـان پان؛ تێک سمڕاوی قەوی‌وقۆڵی ناوشان پان. (گردن کلفت؛ شانەپهن)
پانۆڕاما: اند؛ فد: [ناو] وشەی اینگلیـزی واتـا: دیمەن؛ جیهان‌نوما؛ بە سینەماییێک دەڵێن کە وەک (سینەڕاما) بـەچـەنـد پرۆژێکتـۆر فـیلم دەخاتە سەر پەردەی سینەما و وێنەکان پـان و بەرینن. (پانوراما)
پانۆڵـە: [ئـاوەڵنـاو] قـولۆپـان؛ تێکسـمڕاوی کولەبنە؛ قوڵە بنەی قەڵەو. (چاق و قد کوتاه)
پانومـا: [ئـاوەڵنـاو] گـۆرەوی ناسـک کـە پـا دەنوێنی وەک کایزە، لە تۆڕێکی ناسک چیێ-بوو. (پانما)
پانەستە: [ناو] پێست؛ پۆس. (پوست)
پا نیان‌بـەگیانـا: (ب) زات‌کـردن؛ جورئـەت-کردن؛ خۆخستنە خەتەر. (از جان گذشتن)
پا نیانە پێش: (ب) ئامادە بوون؛ حـازر بـوون؛ پێشقەدم بوون و داخوازی بۆ کردنـی‌کـاری. (داوطلب)
پا نیانە جێپا: بـە ڕچـەی کـەسێکا ڕۆیشـتن حەول دان بۆ گرتنەوەی جێگای‌کەسێک لـە جەماوەردا؛ (ب) لاسایی‌کردنەوە و کـەسـێک بە نموونە و ئورناک‌کـردن. (پـا جـای پـای کسی گذاشتن)
پانیە فەڕشی:[ناو] کەوشی سەرپایی ناومـاڵ؛ دەمپایی ناوماڵ. (دمپائی مخصوص منزل)
پانیەکێش: [ناو] پاژنەکێش؛ پاژنەهـەڵکـێش؛ کوتە کانزاییێکی بچووکە لە کەوچک دەکا بۆ هـەڵکێشـانی پشـت پاژنـەی‌کـەوش. (پاشنەکش)
پاوانـدار: (۱) ئێشـکچی‌و چـاودێری قـۆرغ و پاوان.(نگهبان‌محوطە حفاظت‌شـدە)(۲)هـە-رجێگاییێک‌کە ئێشکچی بـۆ دانرابـێ. (دارای نگهبان)
پا و پا: تابەتا کەوش‌کردنە پا. (لنگەبەلنگە)
پا و پاکردن: [چاوگە،ت] خۆ خافڵاندن؛ شک و گومان و دوودڵی‌کردن؛ ماتـڵ‌کردنـی‌کـار. (تردید و دو دلی)
پاوپووز: [ناو،ت] پێ و بەلەک؛ (پاوپووز دەڵێی زێڕە پێوەنەی تێکراوە) فۆلکلۆر.(ساق پا)
پـاودان: [نـاو،ت] بـارو دۆخ؛ دۆخ؛ حاڵـەت. (موقعیت)
پاوقەدەمڕەش: [ئاوەڵناو] بێ‌ودم؛ بـەدقـەدەم؛ بێ‌یومن؛ شووم؛ پـاش گوێزتنـەوەی بـووک ئـەگـەر ڕوو داوییێکـی خـراپ لـە مـاڵی زاوا بقەومێ دەڵێن بووک پاوقەدەمی ڕەشـە. (بـد قدم)
پاوند: اند؛ فد: [نـاو] (۱) یـەکـەی کێشـانەی ئەمریکایی و ئورووپی بەرانبـەربـە۴۵۴ گـرام. (۲) یەکەی پارەی باوی ئینگلیز. (پاوند)
پاوەپا: لنگەکەوشی پای ڕاست لە پـای چـپ کردن و لنگەکەوشی پای چپ لە پای ڕاست کردن. (لنگەبەلنگە)
پاوەڕا: پا بەڕێ؛ بـەڕێگـەوە؛ کـەسـێک کـە خەریکە بکەوێتە ڕێ بۆ سەفەر. (پا براه)

پا وەرمانگ: >پا بەمانگ؛
پاوەرە: [ناو] پا وەری؛ پیٚوەرە؛ دەرپیٚ؛ ئاوە لْکراس؛ پاتۆڵ؛ شەرواڵ؛ شواڵ.(زیر شلوار)
پاوەرجـایی:پـاورجێیی؛ بـەردەوامـی؛ڕاوەسـتاوی.(پابرجائی)
پاوەرجیٚ: [ئاوەڵناو] ڕاوەستاو؛ پابەرجیٚ؛ پتەو؛ قاییم؛ بەردەوام؛ پایـەدار؛ پـاوەجـیٚ.(پابرجـا)
پـاوەیـۆ: [نـاو] پێخـەسـوو؛ پـاوەوی؛ پاخـە سوو.(ینگە)
پاوێر: (١) [ئاوەڵنـاو] نـەتـرس؛ بـەجورئـەت. (نترس)(٢) [ناو] دۆزینـەوە و پـەیـداکردن و ناساندن بۆ هەوەڵین جار. (کشف کـردن)(٣) پاڵپشت؛ لایەنگر. (تکیەگاە)
پا هەڵکەوتن: [چاوگەت] (١) سەرەنگردان؛ شتیٚ وەبەر پا کەوتن؛ سەرسەمدانی ئەسب؛ سەرەنگریٚ. (سکندری)(٢) (ب) هەڵەکردن. (اشتباەکردن)
پای ئیمانت: تۆ ئیمانت؛ هەروەها: پـای شـەرا فەتت، پای پیاوەتیت، پای مەردانەگیت، پای دۆستیمان. (بەحساب ایمانت)
پایتوون: [ناو] فایتوون؛ دروشـکە؛ گالیسـکە. (درشکە)
پایزە: (١) ناوی بـەیتێکـی‌کوردیـە. (نـام آواز کردی) (٢) هەرمیوەیێک کـە درەنـگ بگـا. (میوەپاییزی) (٣)[ئاوەڵناو] پێوندیدار بەپاییزە- وە. (منصوب بەپاییز)
پایزەبـرا: [نـاو] سـەبـارەت‌بـە دەسـتکەوتـی حاسڵات لە کاتی پاییزدا سەرلێـدان و پـەیـدا بوون؛ (ب) دۆستی‌نانی؛ بەکەسێکیش دە ڵین کە درەنگ دە بینـدریٚ.(دوسـتی بـە خاطرنفع مادی؛ کنایە از دیر ملاقـات‌کـردن)
پای‌زیادی داکێشان: [چاوگەت] (١ب) زیـادەڕەوی؛ ڕووداری زیـادە لـەحـەد. (٢) ویستی زیادە لە ئەندازە.(٣) دەست‌دانەکارێک کە لە وزەدا نەبێت.(پا از گلیم دراز کردن)
پای سێدارە: [ناو] (١) لە بەرپەتـی سـێدارەدا ڕاگیراو بۆ لە سێدارە دان. (٢ب) بەندییێک‌کـە زۆر بـۆی هـەیـە لـەسـێدارەبـدریٚ. (٣) بەندییێک‌کە مەحکوم بـووە بـە مـەرگ و لـە زینداندا ماتڵی بەڕێوەبردنـی حوکمـە. (پـای اعدام).
پـای‌کـەسـێکنووسـین: [چاوگـەت] (ب) خەتابارکردن و تاوان خستنە سەرکـەسێک؛ گوناحەکەی پای‌من‌نییە پای‌خۆتە؛ خـودا بـە پای‌منی نەنووسیٚ. (پای کسی نوشتن)
پای من‌نییە: (١) لاقی من نییە. (٢)پای‌مـن- نییە (ب) پێوندیی بەمنەوە نییە؛ بـەحیسـابی من نییە.(پای من نیست)
پـای‌ویژدانـت: (ب) تـۆ و ویژدانـت؛ بێعـی - ویژدانت؛ تو بیت و ویژدانت؛ بێحی ویژدانت؛ بۆ سوێنددانە. (ترا وجدانت)
پایـە: [نـاو] (١) سـتوون؛ ویسـتوون؛ ڕاگـر؛ کۆڵەکە؛ (پایە))(٢) بنچینـە؛ بنـەڕەت؛ هـیم؛ بنـەمـا. (پایـە) (٣) پاچکـە؛ پایـەی- کورسی:پاچکەی کورسی. (پایە) (٤) دەرەجە؛ پلەوپایە. (پایە) (٥) پێیـە، دەسـت نییـە. (پـا است)(۶) ئەندامـە ؛ ئـەویـش پایـە؛ پـایێکی یاریە. (پاست)
پایەبڵیند: [ئاوەڵناو](١) پایـەبڵن؛پایـەبـەرز.(٢) هەر شتێک خاوەندی پاچکەی‌درێژ بێـت.(٣)

مەزن؛ ڕێزدار؛ خاوەن پلـە و پایـە.(پایـەبلنـد؛ بلندپایه)
پایــەبــەرزی: [نــاو] (ب) شــان‌وشــکۆداری؛ گەورەیی و مەزنی؛ پایەوەری. (پایەبلندی)
پایەدار: [ئاوەڵناو] (۱)بنەڕەتدار؛ هەر شتێ‌کـه پاچکەی ببێ؛ خاوەنی پله و پایه و دەرەجه و مەقام. (پایـەدار؛ مقـام دار) (۲ب) ڕاوەسـتاو؛ بــێ‌داوی؛ دەوامــدار؛ بــەرقــرار؛ جێگرتــوو؛ بەردەوام؛ بێ‌دوایی. (پایدار)
پایەڕێژی: [نـاو] (۱) بناغـه دانـان؛ بنـەڕەت دانـان. (پایـەریـزی) (۲) دارشــتنی پایــەی- دیوار(خەندەک‌دارِشتن).(پی‌ریزی.)
پای‌یاری: [ناو] هەریەک لە ئەنـدامانی‌یـاری؛ پای‌کایە؛ هاوکایە. (پای بازی)
پاییزی: [ئاوەڵناو] سەربە پاییز؛ پێوەندیدار به پاییزەوە؛سەرمای پاییزی، بـارانی پـاییزی. (پائیزی)
پت: [ناو] (۱) تبل؛ تلی؛ قامک، ئـەنگـووس؛ کلک؛ ئـەنگوسـت. (انگشـت) (۲)[ئـاوەڵنـاو] ژیکەڵە: خشـپیله و جـوان؛ نـازدار. (قشـنگ کوچولو)(۳) سووری‌تۆخ؛ پل؛ شوتیەکـه وەک پتی‌خوێن وایه واتا زۆر سوورە.(قرمز تیره)
+ پتپتۆک: [ئاوەڵناو] خاڵ خاڵ؛ نوخته نوخته؛ پنپنۆک. (نقطه‌نقطه)
پتدان: چل‌دان. (نبض زدن)
پترووکـاو: [ئـاوەڵنـاو] پتورکـاو؛ دارِزاو لـه بەرکۆنی؛ پوواو؛ پرتووکیاگ. (پوده)
پتری: (۱) زۆری؛ پرانی؛ زۆرتری؛ فیشــتەری. (بیشتر) (۲)بتری؛ خـراپ‌هێنـان لـه یـاری و قوماردا. (بطـر آوردن) پتـک: [نـاو] (۱)پـت؛ قامـک؛ تبـل؛ تـل؛ کلـک. (انگشـت) (۲) شەمچه؛ شقارته؛ گۆگرد. (کبریت)
پتکۆ: [ئاوەڵناو] خشپیلانه؛ جوان؛ ناتلـەنـگ- زراوی ژیکەڵە. (کمر باریک و قشنگ)
پتکه: [ناو] پرتکه؛ پترۆکه. (تکه)
پــت‌وپیــازگ: [نــاو،ت] بوخچــه؛ پیاسـکه؛ پرێسکه. (بقچه)
پتوورکاو: [ئاوەڵناو] پترووکـاو؛ پـوواو؛ دارِزاو؛ زۆرکۆن و دافەتراو. (پوده)
پتــوون: [ئــاوەڵنــاو] تــەواو؛ یــەک‌جــێ؛ «گۆڤاری‌مهاباد ژ۱۱۲» (یکلی)
پته: [ناو] (۱) پللــه؛ چـەقـەنـه. (بشـکن)(۲) پتەلێدان؛ چەقەنەلێدان. (بشکن زدن)(۳) پڵتۆک؛ پەلەپیتکه. (تلنگر)
پتیـــــوار:[ئـــــاوەڵنـــــاو]پامـــــاڵ؛ تەفروتووناکاول.(پایمال)
پچ: چک؛ تۆز؛کەمۆکه. (کمی.اندکی)
پچــپچ: (۱) هــەویــرەکــەم پچپچیــه واتــا هەویرەکەم ترشاوە و زۆر هەڵاتووە. (ور آمدن زیاد خمیر) (۲) سرتەسرت. پچ پچ. (پچ پچ)
پچرانه وە: (۱)دووبارەپچـران. (بازپـاره شـدن) (۲) پچران؛ تەزبێحەکـەمـت پچرانـەوە واتـا پچراندت. (قطع شدن)
پچڕاوە: (۱) [ڕابوردووی دووری پچران] لـە- مێژە پچڕاوەتەوە (قبلاً پارەشـده)(۲) پچریـاو؛ کــۆن بووگــــه و پچـــڕاوە: (پچـــڕاو، پچڕیـاگ)(۳)دیسـان پچڕایـەوە.(پـارەشـده است؛پارەشد؛ پارەشده)
+ پچڕپچـــڕ: (ب) لــەت‌کــردن وڕفانــدن هەرکەس بۆ خۆی؛ کەس‌لـەکـەس؛ بـڕفێن

برفێن. هەرکەس فریا کەوت بەشی خۆی پچڕی. (معادل بخور بخور)
+ پچڕینەوە: [چاوگە،ت](۱) پچڕانەوە. (پارەشدن)(۲)(ب)کێشانەوەی ماڵ و پارە لەکەسێک ؛وەک: ڕفاندنیان دەس کەوتنی شتێ. (کنایی، سرکیسە کردن)
پچۆز: (۱) خاترخازی؛ بەدۆعایی؛ خودا حافیزی. (خداحافظی) (۲) ژنی پەست و بێئابڕوو. (زن بی شرم)
پچووکاهی: [ناو،بەرهەمیچاوگە] چکۆلەیی؛ چووکی؛ منداڵی؛ بچووکی. (کوچکی)
+ پچووککردنەوە: [چاوگە،ت] (ب) سووک و چرووک کردنلەلایخەڵک بەڕوو شکێنییا بایەخ پێنەدان وپوێتەپینەدان؛ پێپەستکردن(چکۆلەکردنەوە) (کوچک کردن)
پچەڕان: پچکڕان؛ پچڕان. پسان. پڕچیان. (پارەشدن)
پچەڕاندن: [چاوگە،ت]پساندن؛ چڕاندن؛ پچڕاندن؛ پچکڕاندن.(پارەکردن)
پچەڕپچەڕ: (۱) پچڕ پچڕ؛ تیکەتیکە؛ کوت کوت. (پارەپارە)(۲) بڕفێن بڕفێن. (ب) کەسلەکەس؛ هەرکەس بۆ خۆ ڕفاندن. (معادل بخور بخور)
پچی: (۱) بڕوا؛ بچە. (برود) (۲) کەمی؛ چکی؛ تۆزێ. (کمی)
+ پچین:(۱)[داهاتی(چوون)بۆکۆ]؛بڕۆین. (برویم)(۲)[چاوگە،ت] تێهەڵدان؛شەق لێدان. (تیپا زدن)
پچێن: [ناو،بک]وەشێن؛ کەسێکە توو دەچێنێ؛توو وەشێن. (پاشندە)

پخپخ:(۱)[ناو]هەلگڵۆفین و ختیلکەدانی منداڵان.(غلغلک)(۲)بۆ دەنگدانی ئاژاڵ. (پخ پخ)(۳) هێما بۆ سەربڕین. (یخ یخ)پخوهۆڕ: [دەنگەناو]پرخەی زۆر بەهێز؛ پرخوهۆڕ. (خرناسەبلند و زیاد)
پخەپخ: [ناو،ت] پرخەپرخ. (خرناسەزیاد)
پخین: [چاوگە] پرخاندن. (خرناسەکشیدن)
پدی: [ناو]پدوو.پدۆ.پووک.گۆشتیبندان. (لثە)
+ پڕ: [ئاوەڵناو] دژی تەنک؛ تووی زۆر بەزەویداکردن؛ چڕ؛ چنارەکان زۆر پڕن: زۆر لەپاڵ یەکدان. (تنگ هم)
پڕئێش: زۆر بەئازار. (دردناک)
پراکریت: [ناو] هەموو زمانەکۆنەکانی هێند جگە لە سانسکریت. (پراکریت)
پرانی: گشتی؛ زۆری؛ بەپرانی: بەگشتی؛ بەتەواوی. (تمامی)
پڕاو: [ئاوەڵناو] (۱)پڕئاو؛ چۆمیکە ئاوی زۆر بێ. (پر آب) (۲) ئاودار. (آبدار)
پڕبوون: [چاوگە،ت](۱) لیپاولیپ بوون؛ تەژی بوون. (۲) بڵاو بوونەوەی قسە لە شاردا. داکەوتنیقسە پڕبەشار.(پر شدن)
+ پڕبوونەوە: [چاوگە،ت] وەک: تۆز و خۆڵ چوونەچاو؛ چاڵ پڕبوونەوە. (چیزیدرچشم-افتادن)پرشدن
+ پڕبەپڕ: [ئاوەڵناو+ بەند] بەاندازە بوون؛ بەقەد؛ نە زیاد نەکەم؛ ئەو پێچە پڕبەپڕی مۆرەکەیە: (تواو بەئەندازەیەتی) : تەواو فیتی خۆیەتی؛ (کیپ؛ فیت؛ بەاندازە بودن)
پڕبەپێست: بەئەندازە؛ تەواو پڕبەپڕ.(بەاندازە))

+ پڕپیاکردن: [چاوگه،ت] قەپ گرتنی سەگ؛ نچیرگرتنی سپلۆت. (گاز گرفتن سگ)
پڕپێچ: [ئاوەڵناو] جادەکە پڕپێچ و پلووچە؛ پڕپێچ و قەمچ. (ب) مرۆڤی فێڵبازی ناڕاست. (پرپیچ؛ کنایەاز آدم حیلەباز)
پڕتاندن: [چاوگە،ت] لە ژێر لێوەوە بۆڵاندن. (غرولند)
پڕتاندن: [چاوگە،ت]پەڕتاندن؛پەڕتاوتن؛ قرتاندن؛ دڕاندن.(قطع کردن ؛ پارەکردن)
پرتە : [ناو] (۱) پرتە و بۆڵە.(۲)پرتک؛ کوتی چکۆڵە؛ پرتک. (غرولند؛ تکە)
پڕتەم: تەمی زۆر؛ مژی چڕ. (مەغلیظ)
پرچەکوڵ: [ناو]گۆێژەکێوی؛ گوێژەکەژی؛ بلچەکێفی. (دژی شەکەرمز و بەردی گورچیلە)یە. (زالزالک کوهی)
پڕخۆر: [ئاوەڵناو] (ف.مشە)خۆرا؛زۆرخۆر. (پر خور)
پڕخۆری: [ناو،ت](۱) زۆرخۆری(۲) نەخۆشینی ئاژاڵ کەزاوریان دەماسێ؛ ئاوردەڵ؛ کولەش؛ زاڵە ماسە؛ ئاو دور دڵ؛ ماختە؛ (مرض کیسەصفرای حیوانات)
+ پڕخە: هێمایە بۆ خەو لێکەوتن وخەوی خۆش؛ (گیانە لە پرخەی‌خەوی‌خاومدا، (پێ- بنێ‌بەسەر هەردوو چاومدا) لەپرخەی خەودایە:لەخەونێکی‌گراندایە. (کنایەاز خواب رفتن)
پڕخەتەر: [ئاوەڵناو] پرمەترسی؛ بقە. (پر خطر)
+ پڕدان: (۱)پڕپێداکردن؛ لەپڕگرتن. (گرفتن) (۲) [ئاوەڵناو] گەنمە کە پڕدانە؛ دانی‌زۆرە. (پردانە)
پڕدڵ: [ئاوەڵناو] ئازا؛ مێرخاس؛ جوامێر؛ بەزات؛ نەترس؛ بەجورئەت. (پردل)
پردۆکە: [ناو] (۱) پردەڵە؛ پردی چکۆڵە. (پل کوچک) (۲) دوو تەختە دارە لە کەرەستەی جەنجەڕدا.(دو قطعەچوب خرمنکوب)
پردوو: [ناو] پەردوو؛ کورتەدارەکانی بەینی دەستەک و هەڵاش لە سەربانی خانوودا. (پردوو)
پردووخیاگ: [ئاوەڵناو] هەڵپرووزاو؛ هەڵپرووزیاگ؛ (پشم و موی سوختە)
پردووخیان: [چاوگە] هە ڵپرووزان .(سوختن- پشم و مو)
پردەباز: [ناو] پردی پیداڕۆیشتن؛ بەردەباز؛ چەند بەرد کە لەناو تەنکاوی ئاودا بەڕێز دادەنرێ بۆ پا نانەسەر و پەڕینەوە. (پل.از روی سنگ پریدن ورفتن بەطرف دیگر آب یارودخانە)
+پردەڵە:>پردۆکە.(پل‌کوچک)
پردی ئاسنی: [ناو،ت] پردی چێبوو لە ئاسن؛ هەر وەها پردی خشتی، پردی بەردین، پردی دارین. (پل آهنی)
پردی پیادەڕەو: پردی تایبەت بە پەڕینەوەی پیادە. (پل عابر پیادە)
پردی پشت‌سەر شکاندن: (ب) هومێدی گەڕانەوە بڕین. (ب) پێوەندی لەگەڵ ڕابووردوودا قرتاندن؛ ڕێگای گەڕانەوە تێکدان. (پل را پشت سر خراب کردن)
پردی تەنافی: [ناو] پردی هەڵواسراو؛ پردێ- کە بەتەناف یا بەکابل (چەند رشتەسیمی

بادراو) کێشرابێ و ناوەکەی تەختە پۆش کرابێ زیاتر بۆ سەرچۆمی بێبوار. (پل آویزان،طنابی)
پردی قەتار: [ناو،ت] پردی تایبەت‌بەقەتار کە هێلی ئاسنی بە سەردا کێشراوە بۆ ڕابووردنی قەتار.(پل قطار) پردی‌کەوانی: [ناو] پردێ‌کە هیلالی و کووڕ دروستکرابێ. (پل قوسی)
پردی هەوایی: [ناو] (١ب) هات‌وچۆی فڕۆکە لە بەین دوو شوێندا.(٢) پردی‌بەرز لە سەرجادە بۆ پەڕینەوە. (پل هوایی)
پڕڕوو: [ئاوەڵناو] ڕوودار؛ ڕووهەڵماڵراو؛ بێشەرم؛ ڕیلاس. (پررو)
پڕڕوویی: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە] ڕووداری؛ بێشەرمی؛ ساوازی؛ سەوازەکریاوەیی؛ بێ-حەیایی؛ ڕوو هەڵماڵراوی. (پررویی)
پڕڕەنگ: [ئاوەڵناو] ڕەنگی‌تۆخ؛ ڕەنگی‌خەس‌وخۆڵ وەک: چای پڕڕەنگ؛ (ب) ڕەنگی دژی ئاچخ. (پررنگ)
پرزۆلە: [ناو] پڕزۆڵە؛ پڕپۆڵە. (زواله)
پرزە: نەفەس؛ تاقەت؛ فورسەت؛ بڕست.هێز؛ تین؛ هەست؛ پرزەی‌بڕیم: لەهێزی خستم. (توان؛ فرصت)
پرزەبڕین: [چاوگە،ت] دەسەوسانکردن؛ بەیدەسکردن؛ هیچ بۆ نەهێشتنەوە؛ ماڵ-وێرانکردن؛ بڕستلێبڕین؛ لەتوانا خستن. (توان بریدن)
پرزەکورت: [ئاوەڵناو] بێهن‌تەنگ؛ بێ‌تاقەت و توانا. (ناشکیبا)
پڕژ: [ناو] پەڕ؛ لقی ورد و باریکی دار؛ پڕژوباڵ واتا پەڕوباڵ. (پر؛ ساقەنازک بالای درخت)
پڕژوبڵاو: [ئاوەڵناو] پرشوبڵاو؛ پەخش و بڵاو.(پخش‌وپلا)
پڕژە: [ناو] (١) پڕشە؛ پرشە؛ وردەی هەر شت کەبپڕشێ و بڵاو بێتەوە. (٢) پڕشکە؛ وەک پڕشکەی ئاو؛ پڕشکەی خومپارە؛ پڕشکەی ئاور. (پشنگ؛ ترکش)
پرسان پرسان: [بەند] بە پرس‌کردن لەم و لەو. (پرسان پرسان)
پرس‌پێکراو: پرس‌لێکراوە؛ پرس و ڕا لێ-خوازراو؛ (ب) ئیجازە لێوەرگیراو. (پرسش از او شده)
پرس پێکردن: [چاوگە،ت] بیرورا لێخواستن. (ب) ئیجازەخواستن؛ بێ‌پرسی باوکم شوو ناکەم. (عقیدەو اجازەخواستن ازکسی)
پرسکار: [ناو،بک] پرسکەر؛ پرسیار(پرسندە)
پرس‌کردن: [چاوگە،ت] پرسکرن؛پرسین. (پرسیدن)> پرسیار
پرسکەر: [ناو،بک] پرسکار؛ پرسیار؛ پرس-دەکا و دەپرسێ. (پرسندە)
پرسوجۆ: [ناو،ت] پرسین و گەڕان لە مەبەست؛پرسین و جۆیابوون.(پرس‌وجو)
پرس‌وڕا: [ناو،ت] پرسکردن و ڕا و بۆچوونی پرسلێکراو زانین؛ پرس و مەسڵەحەت؛ ئاقیدە و ڕا لە بارەی کارێکەوە پرسین؛ پرسین و ڕێی چارە ویستن لە کەسێ. (مشورت؛ عقیدە ورای خواستن)
پرسەخەسوو: [ناو] (ب) ئەحواڵپرسی نە بەڕاستی؛ لێپرسینی سەرزارەکی. (احوال پرسی سرسری)
پرسەدار: [ئاوەڵناو]عازیەتبار؛ مردوو لێ‌مردوو؛

عەزادار؛ سەرەخۆشیدار. (عزادار)
پرسەک: نیشانەی پرس لەپاش ڕستەدادادە-نرێت وەک(؟) (علامت سوال)
پرسەکەر:[ناو،بک]کەسانیٚکە دەچن بۆ سەرەخۆشی. (کسانیکەبەعزاداریمیروند)
پرسی: (١)[پاشگر] ڕەوتی پرسین؛ ئەحوالٚپرسی، جواوپرسی. (٢) پرسیکرد؛ [ڕابووردووی پرسین]. (پرسید)
+ پرسیار: [ناو،بک] پرسکار؛ پرسکەر. (سوال کننده) .(بەلاٚم بە هەلٚە بە پرس دەوترێ پرسیار، پرسیار واتا کەسێک کە پرس دەکات وەک جووتیار، کرێار .
پرسیارپێچ: کاریکەسێک کە بە پرس کردنی جۆراوجۆر بە تایبەت لە کاتی بازجۆیی پۆلیسدا سەرلە گومانلێکراو دەشێوێنێ؛ بە پرس لێکردنی زۆر، تەنگ پیٚهەلٚچنین و زۆر بۆ هێنان؛ حالٚەتی کەسێک کە کەوتووەتە بەر تەوژمی پرسلێکردنی پرسکەر. (سوال پیچ)
پرسیارۆکێ: بەپرس؛ زۆر پرسکەر؛ کەسیٚ کە زۆر پرس دەکا. (خیلی سوال کننده)
پرسیاری: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە]ڕستەی پرسینەوە لەلایەن پرسیارەوە؛ وەرەقەی پرسیاری: وەرەقەی ئەزموون وەرگرتن بەپرس کردن. (پرسشی)
پڕشان: [چاوگە] پڕژان. (پاشیدن)
پڕشاندن: [چاوگە،ت] پڕژاندن. (پاشیدن)
پڕشکە: < پڕژە؛ پڕشە؛ پرشە.
پڕشەپڕش: [ناو،ت] پڕشەی لە سەریەک. (پاشیدن پشت سرهم)

پڕشە لێکەوتن: [چاوگە،ت] (١) تراو بە کەسێکا پڕژان؛کەوتنە بەر پڕشکە. (با آب تر شدن) (٢) (ب) تاوان و خراپەی کەسیٚ داوێنگیر بوون؛ بەدناو بوون بە هۆی کەسێکی دیکەوە. (بدنام شدن)
پڕشەنگ: (١) زۆر شۆخ و شەنگ.(خیلی قشنگ) (٢) چریسکە؛ پزیسک؛ پڕشنگ؛ پزوسک؛ پزووسکە. پڕشە. (شرارە)(٣) پڕشنگ؛ تیرۆژ؛ تیشکی ڕۆژ. (تابش آفتاب)
پڕشێنەر: [ناو،بک] پڕژێنەر. (پاشندە)
پرق: تریقە؛ قاقا؛ پرقەی پێکەنین: تریقەی پێکەنین. (قهقهه)
پڕقوورەت: [ئاوەلٚناو] بەهێز؛ بەقووەت؛ زۆردار. (پرقدرت)
پرقین:(١) لە تریقە و قاقای پێکەنیندان. (قاەقاەخندیدن) (٢) قرقێنە. (آروغ)
پرک: (١) پردی چکۆلە؛ پردۆکە؛ پردەلٚە. (پل کوچک)(٢) خلٚتە؛ تلٚتە. (درد)
پرکاندن: [چاوگە،ت] تروکاندنی چاو. (پلک زدن)
+ پڕکردن: (١[چاوگە،ت]) لیپاو لیپ کردن؛ تەژی کردن. (٢) پڕکردنی ددانی هەلٚۆلٚ.(٣) قاوداخستن؛ قوو داخستن لە ناو شاردا، شارەکەی پڕکردووە لە باسی من و تۆ.(٤) بە قسە هەلٚفریواندن و قسە بۆکردن و هاندان بۆکاریٚ؛ پڕیان کردوەتەوە. (٥) نەوارێکی پڕکردەوە: شریتێکی پڕکردوەتەوە .(پرکردن)
پڕکردنەوە: [چاوگە،ت](١) داگرتنەوەی تفەنگی ڕەشۆکی. (پر کردن) (٢) پڕکردنەوەی چالٚ و چۆلٚ. (پر کردن)(٣)

دووبارەپڕکردنی دەفر و هەر شتی خاڵی. (دوباره پر کردن) (۴)لاپەڕەیێکی پڕ کردوەتەوە. (پرکردن) (۵) هەڵفریواندن و دنەدان و هاندان بەقسە و ئامۆژگاری بارودۆخ ڕەخساندن بۆ ئەنجامی کاریٚ.(تیرکردن) (۶) ددان پڕکردنەوە؛ (۷)شارژکردنی باتری؛(دندان- پرکردن.شارژکردن باطری)[۸] وەڵام نووسینەوەی پرسنامە. (پرکردن پسشنامه)
پرکە: [دەنگەناو] تریقە؛ پریقە؛ قاقا. (قهقهه)
پڕکەردەی: [چاوگە،ت] پەڕکەردەی؛ تەپنای؛ پڕکردن. (پرکردن)
پڕکێش: [ئاوەڵناو] زاتدار؛ ئازا؛ پڕڕوو. (پررو)
+ پڕکێشی: [بەرهەمی چاوگە] زاتکردن؛ لە ڕوو هەڵاتن؛ جورئەت کردن؛ جەسارەت کردن؛ پڕکێشیم نەکرد بێمە خزمەتت:جەسارەتم نەکرد بیمە خزمەتت. (جسارت)
پڕمانن:[چاوگە،ت]پڕماندن.(صدای بینی اسب)
پڕماندن: [چاوگە،ت] دەنگی لووتی چارەویٚ و یەکسمی تر. (صدای بینی اسب و استر)
پڕمایە: فد: [ئاوەڵناو] (۱) مایەدار؛ خەسوخۆڵ؛ چاییەکە مایەدارە واتا زۆر پڕ ڕەنگە؛ (مایەدار) (۲) (ب) بە کەسێکی زانا و ئاگا دەڵێن؛ مێشک پڕ؛ باسەواد و زانا. (پرمایە) (۳) (ب) دارا و پووڵدار. (پولدار)
پڕموهۆڕ: [ناو،ت] (۱) پڕمەپڕمی زۆری لووتی ئەسپ. (صدای بینی اسب). (۲) لە پڕمەی گریان دان و بە تەوژم گریان. (زیر گریەزدن)> پڕمەپڕم
+ پڕمە: [دەنگەناو] (۱) دەنگی بە تەوژمی گریان. (صدای گریەو شیون) (۲) دەنگی لووتی چارەوەی و هێستر. (صدای بینی اسب و استر) (۳) تریقە؛ پریقە. (قهقهه)
پڕمەپڕم: [دەنگەناو] پڕموهۆڕ؛ دەنگی پەیتا پەیتای پڕماندن. (صدای پیاپی بینی اسب)
پڕمەی‌گریان: [ناو] بەتەوژم و نەهێم گریان. (زیر گریەزدن)
پڕمین: [چاوگە دەنگەناو](۱) پڕمان؛ پڕماندن؛ دەنگی لووتی ئەسپ. (صدای بینی اسب) (۲) دەنگی گریانی بەرز و لە ناکاو. (زیرگریەزدن)
پڕنا: [ناو] قاش؛ بە قاش بڕراو. (قاچ)
پڕنۆ: [ناو] بەڵگە؛ دەلیل؛ سەنەد. (برهان)
پڕنە: [ئاوەڵناو] پڕپیاکەر؛ گورجوگۆڵ و ئازا. (چابک)
پڕۆ: فرد: فد: [ناو] پمنڕۆف؛ (پێکەوە چەسپاندنی‌قوماشی بڕاوی جلوبەرگ بەسنجاخ یا کۆک(تەقەڵی درشت) بوئەندازە گرتنی لیباس لەخەیاتیدا.(پرو)
+ پڕواندن: [چاوگە،ت] (ب)وردکردن؛بۆت هەڵسم دەت پڕوێنم. (خردکردن)
پڕوپاتاڵ: [ناو،ت](۱) کەرەستە و ئەسپابی بێ نرخ و بێ بایەخ. (آت و آشغال)
+ پڕوپووچ: [ناو،ت] بەهیچ کردن؛ پارە کەی- لە دووڕۆژدا پڕوپووچ کرد و تەواوی کرد.(برباد دادن و ازبین بردن دارایی)
پڕوپووش: [ناو،ت] پلووپووش؛ چیلکە و چەوێڵ؛ هەژگەل؛ پووشوپلاش. (ساقەهای قطع‌شده باریک و خشکیده درخت وگیاه)
پڕوپیتاڵ: [ناو،ت] شتومەکی ژنان؛ خرتە و

پرته؛ شڕوشیتاڵ؛ جل‌وبەرگی شڕ. (آت و آشغال؛ وسایل زنانەو لباس فرسوده)
پڕوتستان: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] مەزهەب و شوێگرانی مەزهەبی پڕوتستان، لقێ لە دینی مەسیحییەت. (پروتستان)
پڕۆتێز: [ناو] (کوژی پزشکییە)کاری دانانەجێی ئەندامگەلی لەش وەک دەستێ ددانی دەستکرد. (پروتز)
پڕۆزە: [ناو] پەخ شان(نش)
پڕۆستات: [ناو] لوو یا گروڤەرێکی کەلله قەندی ئاسای چکۆلەیە لە ژێر میزەڵدانی مرۆڤدا. (پروستات)
پڕۆفسۆر: فد؛فرد؛اند: [ناو] لێزان؛ مرۆڤی زانا و بلیمەت؛ باڵاتر لە دەرەجەی دوکتۆرا لە بواری زانستییەوە. (پروفسور)
پڕوڤانس: [ناو] زمانی تاقمێ لە خەڵکی فەڕانسە، نیشتەجێی پروڤانس. (پرووانس)
پڕۆڤە: [ناو] تەمرین؛ مەشق؛ ڕاهێنان. (تمرین).
پڕۆگرام: اند؛ فد: [ناو] بەرنامە؛ ڕێنامە؛ پێڕەو؛ ڕیچ؛ پێڕەو بۆ جێبەجێکردنی کارێ. (برنامه) لەزمانی کوردیدا جێ‌کەوتووە.
پڕۆم: [ناو] لووتکەی چیا؛ لووتکە. (قله)
پڕۆناڤ: [ناو] جێناو؛ پیتێ‌کە هێمایە بۆ ناو. (ضمیر دستوری)
پڕۆنێو: [ناو] جێناو؛ پڕۆناو؛ پڕۆناڤ؛ پیتێ کە هێمایە بۆ ناو؛(ضمیر دستوری) پڕووزکاندن: [چاوگە،ت] پڕووسکاندن؛ پڕووسقاندن؛ بچڕاندن؛ پچکڕاندن؛ قرتاندن؛ لەت‌کردن. (قطع کردن)

پڕووزە: [ناو] وردەسووتاوی کاغەز و موو. (خاکستر ریز کاغذ و مو)
پڕووزە بابردن: (ب) بوون بە قەقنەس؛ سووتان؛ ئاور تێبەربوون و بوون بە سووتوو. (آتش گرفتن و خاکستر به هواررفتن)
پڕووزیاگ: [ئاوەڵناو] هەڵپڕووزاو.(مانند موی سوخته شده)
+ پڕووسقان: [چاوگە] بڕووسقان بچڕان؛ قرتان؛ (گیاکە بەڕیشەوەدەر نەهات لە دەستم دا هەڵپڕووسقا: قرتا؛(قطع‌شدن) هەڵپڕووسقان: هەڵپچڕان؛ شیر و دۆکوڵیو بڕووسقان: بڕیان. (حالت بریدن شیر)
+ پڕووسقیان: [چاوگە](۱) بڕوسقان؛ بڕیانی شیر و دۆکوڵیو؛ خراپ‌بوونی شیر و دۆکوڵیو؛ (بریدن شیر) (۲) پچڕیان؛ قرتیان؛ قرتان؛ بڕیان؛ لەت‌بوون؛کەرت‌بوون.(قطع شدن) (۳) ڕەنگی ڕوخسار پەڕین. (رنگ باختن)
پڕووش: [ناو] پورز؛ زۆپی سەرتەختە وەک وردە تۆڵاش؛ پڕزۆڵ؛ کوڵک و مووی سەر قوماش؛ کەواکەم پڕوشی هەڵداوە. (پرز)
پڕووکان: [چاوگە](۱) پسانی گیانداران بە هۆی هیلاکی زۆرەوە. (مردن از خستگی) (۲) مردن بە هۆی گەرمای زۆرەوە. (هلاک-شدن از گرما)
پڕووکاندن: [چاوگە،ت] وەک تڕووکاندنی-چاو(پلکزدن)
پڕووکاندن:[چاوگە،ت]کوشتن بەماندوو کردنی زۆر یان گەرمای زۆر؛ پساندن؛(کشتن با خستگی و گرما)
پڕووکە: [ناو] تڕووکە؛ پڕووشە؛ بەفر بارین بە

دەنکی ورد وئارام.(بارش برف آرام و ریز)
پڕوەش: [ئاوەڵناو] زۆرخۆش؛ خۆشبەز؛ خۆشڕەو؛ بەڕەوت؛ ئەسپی پڕوەش:ئەسپی تالیم دراوی بەکار. (خوش.خوش قدم)
پڕەملە: [ناو] جۆرێک ملوانکەی تەنگ و پڕ بەمل و چەسپیمل. (نوعی گردنبند تنگ)
پڕهەنگ: [ناو] پەڕهەنگ؛ وشەدان. (لغتنامه)
پڕی: تەژێتی؛ حاڵەتی پڕبوون. (پری)
پڕیانکردگەسەو: (١)ئەوان ددانیان کولۆر بوو پڕیانکردووەتەوە؛ ئەوان چاڵە خاڵیە کەیان پڕکردگەسەو. (پر کردەاند) (٢) هانیان داوە؛ فێریان کردوە؛ بەڕاست یا درۆ مێشکیان پڕکردوەتەوە کە کارێ بکا؛ پڕیان کردوەتەوە. >پڕکردنەوە.(پرش کردەاند)
+ پڕێزە: (١) پەرێز؛ زەوییێککە دوروابێتەوە(دوورابێتەوە)و دەغل و گیای تێدا نەمابێ؛ جاڕەگەنم و جۆ. (مزرعەدرو شده)(٢) ڕەبەت؛ حەشارگە. (کمین) (٣) بەدزە چوون بۆ نچیر. (پاورچین نزدیک شدن بەشکار)
پڕێس: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] (١) مەنگەنە؛ ئامرازی گووشینە پاڵ یەک بەگوشاری زۆر. (پرس) (٢) جۆرێک هاڵتێر لێدان (بە-رزکردنەوە) بێ هەڵخستنەوە،لە ڕابووردوودا؛ یا پڕێسی سەرسینگ. (پرس)
پڕیسکە: [ناو] نەردیوان. (نردبان)
پڕیقوهۆڕ: [دەنگەناو،ت] پڕقوهۆڕ؛ تریقوهۆڕ؛ پڕیقوهووڕ؛ پڕیکەپڕیک؛ پڕیکوهۆڕ؛ پێکە-نین بە دەنگی بەرز و حیلکەحیلک؛ لەقاقای پێکەنین دان. (قاەقاەخندیدن)
پڕیمووس: [ناو] پەڕەمێز؛ جۆرێک چرای ئاشپەزیە. (پریموس)
پڕینت: اند؛ فد: [ناو] چاپ؛ لەچاپدراو. (ب)کاری چاپکردن بە ئامێری پڕینتێر. (پرینت)
پڕینتڕ:اند؛ فد: [ناوبک]چاپگەر؛ کەرەستەی چاپ. (چاپگر؛پرینتر) لە زمانی کوردیدا جێ-کەوتووە.
پرینگان: [چاوگە] سڵەمین؛ ترسان؛ پارێزکردن و نزیک نەکەوتن. (ترسیدن و دوری کردن)
پرینگاندنەوە: [چاوگە،ت] داچڵەکاندن؛ ترساندن؛ سڵەماندنەوە و ترساندن و ڕادانەدوواوە. (ترسانیدن)
پرینگانەوە: [چاوگە،ت] سڵەمینەوە؛ کۆکردن؛ مەترسیکردن؛ هەڵبەزینەوە لەترسان؛ داچڵەکان؛ سڵکردن. (ب) خۆ لە قەرەنەدان؛ دووری لێ کردن.(جاخوردن. ترسیدن و نزدیک نشدن)
(پ.ز):کورتکراوەی وشەی (پێش لە زایینی) حەزرەتی عیسا مەسیح. (قبل از میلاد. ق. م)
پز: (١) منداڵلەتوڵداندا؛ ئاولەمە؛ ئاوەلمە(جنین) (٢) بڵیند؛ گەورە؛ بەرز. (بلند) (٣) دومەڵ؛ برین (دمل؛ زخم) (٤)پس؛ کوڕ؛ پزمام :پسمام: کوڕمام.(پسر)
پزپزۆک: جگەرە؛ سیغار؛ سگار (سیگار)
پزدۆک: [ناو] گرۆڤەر یا گۆشتی زیادی یا زیپکەی گەورە بە سەر پێستی لەشەوە. (گوشت زیادی روی پوست بدن)
پزرووک: [ناو] بارانیبەخوڕەم؛ بارانی زۆر و توند. (بشدت باران باریدن)

پزگـورِ: [نـاو] ڕیشـاڵی جلکـی دڕاو؛ بزگـورِ. (بزگور)
پزماریْ: [ناو] بزماره؛ مێخه‌که(میخچه)
پزمام: پسمام؛ کوڕی مام (پسر عمو)
پـزوو: [نـاو] نـه‌خۆشـینی کلـاوڕه‌ش؛ مشـه؛ سیه‌ڕه‌شه؛ مێشه‌پزگ؛ سیه‌زینـه؛ سـی‌ده‌رده؛ هه‌نووه‌کوتـه؛ کـه تایبـه‌ت بـه ئاژاڵـه، نـاوه عیلمیه‌که‌ی (پنۆسۆنی) یه. (پنوسونی)
+ پـزوو: [نـاو] (۱) جێگـای تێهـه‌ڵکێشـانی دۆخین (نیفه) (۲) به‌فـره‌بلووکـه‌یـی کـه بـا ده‌یهێنـیْ و بـه‌رده‌رکـه ده‌گـریْ. (بـژ. بـرف بادآورده) (۳) جێگـه‌ی بـه‌ن تێهـه‌ڵکێشانی جـه‌مسـه‌ری سـه‌ریـن (نیفـه) (۴) جـۆریْ نه‌خۆشینی مه‌ڕ که چڵمن ده‌بێت و مووشه‌ی دیْ و نالـه‌وه‌ڕیْ. (مـرض گوسـفند) (۵) گیایێکه ده‌یکه‌ن به په‌تێکه‌وه ده‌یکه‌نه ملـی مه‌ڕ بۆ شیفای نـه‌خۆشـینی پـزوو. (گردنبنـد گوسفند برای بهبودی مرض)
پزیشکی قانوونی: [ناو،ت] پزیشکی به‌رگـه‌م کراوی دادگا که چۆنییه‌تی بریندار بـوون یـا کـوژرانی مـروڤ بـه دادگـا ڕاده‌گـه‌یێنێـت. (پزشکی قانونی)
پزیشکی ماڵات: [ناو،ت] پزیشکی تایبه‌ت بـۆ ئاژه‌ڵ. (دام پزشک)
پژا: [ڕابوردووی پژان](۱) کوڵـا؛ پیشـا؛ کوڵیـا (پخته‌شد)(۲) پرژا؛ بڵاو بووه‌وه؛ پرشـیا؛ پرشـا (پاشید)
پژقانــدن: [چاوگــه،ت] ڕژانــدن(بــۆ تــراو)؛ پرشاندن (پاشیدن)
پژڵْ: [ناو] (۱) هه‌ژگه‌ڵ؛ (خار و خاشـاک)(۲) پرژ و لکی باریکی سه‌ره‌وی دار. (شاخه‌نازک درخت)
پژمـان: [ئـاوه‌ڵنـاو] (۱)دڵسـارد؛ پشـمان؛ په‌شیمان؛ پاشگه‌ز .(پشیمان) (۲) [ناو]ناوه بۆ پیاو (اسم مردانه)
پژمانــدن: [چاوگــه،ت] پشــماندن؛ پنــژین؛ بێهنژین. (عطسه‌کردن)
پژمل: [ناو] پشت‌گه‌ردن. (پس گردن)
پژمل‌پان: (۱) پشتمل‌پان (پس گردن پهن) (۲) (ب)به‌تیـزه‌وه بـه مرۆڤـی تـه‌زه و خوێڕی ده‌وترێت. (کنایه‌تن لش)
پژمین: [چاوگـه] پشـمین؛ بێهنـژین؛ پژمـای (عطسه)
+ پژنچـــــــه:[نـــــــاو](۱)شـــــــانه‌ی جۆلایی(شـانه‌بافنـدگی) (۲) قاشـاو؛ ڕنـه‌ک (قشـــو) پژۆنـــی: [ئـــاوه‌ڵنـــاو] واتـــایی؛ مه‌عنه‌وی؛پێوه‌ندیدار به بیر و هه‌سته‌وه؛ دژی دونیایی و ماددی: دژی ئه‌نبۆژه‌نی. (معنوی)
پژی: > پژڵْ.
پژیاو: >پژیاگ؛ پرش و بلاو بوو. (پاشیده)
پژین: [چاوگه](۱) پیشان؛ کولاْن و برژان بـه گه‌رمای بیْ شوڵه. (پختن) (۲) پشان؛ پرژان؛ وه‌ک خوێنی لـووت بـه‌ربـوون؛ (ماننـدخون دماغ‌پاشیدن)
پژێن: [ناوبک] پرشێن؛ پرشێنه‌ر؛ ده‌پرشێنیْ. (پاشنده)
پسا: [ڕابوردووی چاوگه‌ی پسان](۱) پچکـڕا؛ قرتا؛ که‌رت‌بوو؛ پسیا؛ له‌ت‌بوو؛ پچڕا؛ قرمسـا؛ قورمسا؛برووسقا. (پاره‌شد) (۲) ئه‌سپه‌کـه لـه غاری زۆردا پسا؛ بڕیـا. (بریـدن‌اسـب‌بعلـت-

خستگی)

پسـات: [نـاو] (١)<بیسـات؛ دەمـودەزگـا. (بسات) ٢) کەلوپەلیٚ‌کـە لـەکـەنـار شـەقـام لەسەر سفرە یا تەختە، پـانی دەکـەنـەوە بـۆ فرۆش؛ (٣)بیساتی سەماوەر: کەلوپەلی سـە- ماوەر) (بسات)

پسپسەکەڵە: پەزپەزەکێفی؛ پەز پـەزەکێویلـە؛ جۆریٚ جاڵجاڵووکەی تووکن و بیٚ‌ئازار (نوعی عنکبوت)

پسپێری: پێشبینی. (پیشبینی)

پسـتانەک: فـد: [نـاو] (١) مـەمکـەمـژە؛ لـە فارسـییەوە هـاتووە و بـاوە.(پسـتانک)(٢) جەڕیکی‌کونە لەکەرەستەی گازیدا کە گازی- لێـــدەردەچێتـــە دەرەوە.(پســـتانک)(٣) سەرپێچێکی کونە لە چراتۆڕیدا کە نەوت لەو کونەوە دەپڕژێتە نـاو تـۆڕی چـرا. (پسـتانک چراغ توری)

پستەی زەمینی: بادامزەمینی(بادامزمینی)

پستەی‌شـامی: [نـاو] بـادام زەمینـی. (بـادام زمینی)

پستەی‌کێوی: [ناو] بەری دارەوەن؛ وەنەتەق؛ قەزکەوان؛ قەزوان؛ قەسـخەوان؛ قسـقەوان؛ قەزکەوان. (پستەکوهی. چاتلانقوش)

پستی:[ناو]بسە؛پستە؛لەسلێمانی‌بەپستە دەڵێن فسدق یا فستق (پستە)

پســـخاڵ: [نــاو]کــورەخـــاڵ؛ خـــاڵوزای- نێرینە(پسردایی)

پسدار: [ئاوەڵناو] پزدار؛ تۆلدار؛ ئـاوس؛ زگپـڕ. (آبستن)

پســدان:[نــاو](١) پزدان؛پزدانـک منداڵـدان. (زهدان) (٢) زەرف؛ دەفر. (ظرف)

پسلْ: [ناو] گیای چەمەمارە(ترتیزک وحشی)

پسڵی: [ناو]گیادۆخەوا؛ گیادۆخوا؛ دژی‌کرمـی ڕیخۆڵەیە. (گندنای کوهی)

پسمار: [ناو] بزمار؛ مێخ (میخ)

پسماری: [ناو] بزمارە؛ مێخەکە(میخچە)

پسوڵمان: مسوڵمان (مسلمان)

پسوولە: [ناو] بەرگـە؛ بـەڵگـەی ئیجـازەدان؛ پاسپۆرت؛ بەڵگەی هاتن و چون؛ بلیت؛وەرە- قە. (برگە.بلیط)

پسە: (١) وەک؛ وا. (اینطور)٢. پستە. (پستە)

پسەزانای: [چاوگە،ت]پاسـەزانـای؛ وازانـین؛ پیٚ‌وابوون؛ بەخـەیـاڵ؛ وادانـان؛ گومـانکردن (گمانکردن)

پسەژنی: [ئاوەڵناو] ئاریلـە؛ ژنـانیلیٚ؛ ژنـانیٚ. (زن آسا)

پسەیوی:[ئاوەڵناو] وەک خۆی؛عەینـی شـت. (شبیە)

پش: [ناو]نەخۆشینی گـەڵای دارمێـو و بـاخ. (آفت برگ درخت مو و درختان)

پشارۆش[ناو،ت]جەرگ؛جگەر(جگرسیاە)

پشاسپی:[ناو] سیپەلاک؛سی.(جگرسفید)

پشافتن: [چاوگە] پشاوتن؛ هەڵپشاوتن؛ هـە- ڵگلۆفین. (مچالەکردن)

پشبەن: [ناو] (١) پشتبەند؛ دوایی؛ دوومـاهی. (پشت بند) (٢) شەوژەن؛ پشت‌وەسی دەرکە؛ پشتبەس؛کوڵۆم.(٣) دوابەند؛ ڕسـتەی‌دوابـە- ندی گۆرانی.(پشت بند)

پشپشۆکە: [ناو]گیاکتک؛ گیابۆندار؛ ئەشەدبـۆ؛ ڕیخەداڕوو (علف گربە. سنبلەطیب)

پشپشیان: پشلیان؛ پچپچ بوون؛ هەڵاتن؛ هە-ڵماسین. (ورآمدن خمیر)
پشلیان: [چاوگە،ت] هەڵاتن و هەڵماسینی هەویر. ترشان؛ گەڵێک پچپچ بوون. (ورآمدن خمیر)
پشپۆ: [ناو] پشتپۆ؛ جیگای ئاوێزان کردنی بەن تەون لە فەرشچێکردندا (چوبی کەنخ فرشبافی را با آن می آویزند)
+ پشت: [ناو] پاش؛ پشتیسیڕۆژ: پاشی سیڕۆژ؛ هەندیجار،واتا(سەر،بان)وەک، پشتدەست :سەردەست؛ پشتزین:سەرزین. (بعد ، بالا)
پشت ئاواڵە: [ئاوەڵناو] [ناو،ت] هەر شت کە پشتی بەتاڵ بێت و نەگیرابێت وەک کراسی پشت ئاواڵە؛ پشت ماڵەکەمان سەحرایە: پشت ئاواڵەیە. (پشت باز)
پشت ئێشە: [ناو،ت] ئازار و ژانی پشت و کەمەر. (پشت درد)
پشتباقی: [ناو] هەتیوێ کە بابی مردبێت؛ هەتیوی باوکی. (پدر مرده)
پشتبەرگ: [ناو] بەرگی ئاخری جلدی کتێب؛ (پشتبەرگ دژی ڕووبەرگە) بەڵام بە هەڵە هەردوو وشە بۆ سەر جلدی کتێب بە-کاردێنن (پشت جلد)
پشتبەسێڵ: [ناو] جۆرێ کولێرەی سەرساج. (نوعی گردەکەروی ساج درست شدە)
پشت بەیەکۆ دان: [چاوگە،ت] پشت بە یەکەو دان؛ پشت بەیەکەوە دان؛ پشت بە پشتەوەنان؛ پشت دانەپاڵیەک؛ پاڵدانە پاڵ-یەک؛ (ب) پشتی یەکگرتن؛ هاوکاری-کردن؛کۆمەکییەکبوون(همپشتی)
پشتپەردە: (ب) شاراوە؛ نەهێنی. (پشت پردە)
پشتپێ: (١) شەق. (تیپا) (٢) پشت پێی تۆ ئەویش ڕۆیی واتا دوای ڕۆیشتنی تۆ ئەویش ڕۆیی. (بعد از رفتن) (٣) پاژنەی پا؛ پاشنەی پا. (پاشنە)
پشت چاڤ: [ناو] پێلوو؛بەلکیچاو.(پلک چشم)
پشت چەپەر: [ناو،ت] (١)پشت دەرکەیلە شووڵچێکراو؛(پشتدرطنیدەشدە از شاخە درخت)(٢) پشت سەنگەر؛ پشت بۆسە.<چە-پەر. (پشت سنگر)
پشت چەمانەوە: [چاوگە،ت](١) پشت چە-مینەوە (ب) کوڕنۆش بردن و دانەوین (خم شدن) (٢) لە بەر بار قورسی یا ژیانی سەخت و دژوار یا ڕووداوی دڵتەزێنکۆم بوونە-وە.(پشتخم کردن)(٣)کۆم بوون بە هۆی پشتشکان یاپیرییەوە(پشتخم شدن)
پشتچەمین: [چاوگە،ت](١) پشتکووڕبوون؛ پشت چەمینەوە لە بەر پیری. (٢) پشت کۆم بوون لەژێر باری قورس یا باری نالەباری ژیان یا پشت شکاندا.(پشت خم شدن)
پشت حۆچک: [ئاوەڵناو] پشتکووڕ؛ پشت-کۆم؛ پشت خوار؛ پشت چەماوە؛ پشتقوڤ. (کوژ پشت)
+ پشت دانەوە: [چاوگە،ت] پاڵدانەوە. (لم دادن)
پشتدەست: [ناو] ئەودیوی بەری دەست؛ بان دەست. (پشت دست)
پشتدەست داغکردن: [چاوگە،ت](١)

ئاورنان بەپشت دەستەوە. (آتش گذاشتن بەپشت دست) (۲) (ب) تۆبە لە دووبارەکردنەوەی کاریٚ. (پشت‌دست‌داغ-کردن)
پشت‌دەست گەزین: [چاوگە،ت] دەربڕینی پەشیمانی؛ وەک بە بەرد لە ئەژنۆ دان.(پشت دست گزیدن)
پشتڕاست: [ئاوەڵناو] پشتگەرم؛ پشتیواندار؛ بەپشتەڤان؛ دڵگەرم؛ ئەرخایەن؛ دڵنیا؛ خاترجەم. (دلگرم؛ مطمئن)
پشتڕاست بوون: [چاوگە،ت] دڵنیابوون؛ خاترجەم بوون؛ ئەرخەیان بوون؛ موتمانەکردن. (مطمئن بودن)
پشت ڕاست کردنەوە: [چاوگە،ت] (ب) دووای هاتنی بەڵاو نکوولی‌هێنان دوو بارە گەڕانەوە سەر دۆخی پێشوو؛ پار نابووت بوو (بەرشکست) ئەمساڵ پشتی ڕاست کردەوە. (بعد از ورشکستگی بحال اول بازگشتن)
پشتڕاستی: [ناوبەرهەمی‌چاوگە] خاترجەمی؛ دڵنیایی؛ ئەرخەیانی. (مطمئنی؛ اطمینان)
پشت‌زین: [ناو،ت] (۱) دواوەی زین؛ جێی تەرک (عقب زین) (۲ب) سەر زین؛ دانیشتە پشت زین و بەغار چوو. (روی زین)
پشت‌سارد: [ئاوەڵناو] مەیل بەکاریٚ نەمان؛ ناهومێد بوون لەکاریٚ؛ بیٚ‌هیوا؛ دڵسارد. (دلسرد)
پشت‌سەر: [ناو] (۱) دواوەی سەر؛ پشتمل. (عقب سر) (۲) پاشملە(در غیاب؛ پشت سر)
پشت‌سەریەک: (۱)[بەند] پەیتا پەیتا؛ بەدووای یەکدا. (پشت سر هم) (۲) لە پشت سەریەکەوە بەڕیز ڕاوەستان (پشت سر هم)
پشت شکاندن: [چاوگە،ت] (۱ب) بەڵای زۆرگەورە بە سەردا هێنان. (پشت شکستن) (۲) شکاندنی پشتی کەسیٚ (پشت شکستن)
پشت‌شکێن: [ناو،بک][ب) موسیبەتی گەورە؛کەس یان شتێک، کە پشت بشکێنێت. (پشت شکن)
پشت‌قایم: [ئاوەڵناو] (۱) دارای پشتیوانی بە قودرەت؛ (۲) ئەرخایان‌بوون‌لەلایەنگری و هۆگریی کەسیٚ؛ پشتڕاست؛ پشتگەرم؛ پشت-ئەستوور.(دارایٚ پشتیبان)
پشتکۆم: [ئاوەڵناو] پشتقۆڤ؛ پشتکووڕ؛ پشت خوار؛ پشت حۆچک (کوژ پشت)
پشتکوول: [ناو] پشکەڵ (پشکل)
پشتکووز:> پشتکۆم.
پشتگر:[ئاوەڵناو]لایەنگر؛هەوادار؛داشدار؛ یاریدەدەر؛ کۆمەک. (حامی)
+ پشتگرتن: [چاوگە،ت] (۱) کەوتنە دوای کاریٚ و دەست هەڵنەگرتن؛ پشتی کارەکەم گرت تا دروستم نەکرد لێی نەگەڕام (پشت گرفتن) (۲) پشتیوانی‌کردن (حمایت کردن)
پشتگری: [ناو] پشتەڤانی؛ هۆگری؛ یارمەتی؛ کۆمەک‌کردن؛ پشتیوانی؛ لایەنگری. (حمایت)
پشت‌گۆهاڤیتن: > پشتگویٚ‌خستن.
+ پشتگویٚ‌خستن: [چاوگە،ت] پویتە پێنەدان؛ لە بیر خۆ بردنەوە. (پشت گوش انداختن)
پشتگەرم: [ئاوەڵناو] (۱) دڵگەرم؛ بەهیوا؛ بە-دڵ‌وداو خەریکی‌کاریٚ‌بوون. (پشتگرم.جدی)

(٢) ئەرخایەن لەکۆمەکی پشتیوان.(پشت گرم)
پشتگەرمی: فد: [ناوبەرهەمی‌چاوگە]
(١)حاڵەتی‌دڵگەرم‌بوون لەکردنی کارێکدا؛ هیواداری بەکردنی کارێ. (پشتگرمی)(٢) بەهۆی هەواداری کە سێکەوە دڵ‌قایم بوون.(اتکابەپشتیبانی حامی)
پشتلەئەردی: ژنکا پشتلەئەردی: (ب) ژنی مارەکراو (عقد کرده)
پشتلەرزین: [چاوگە،ت] (ب)تۆقین و لە ترسا دڵ بە لاوە نەمان؛ (ب) هەست بە مەترسیی گەورە و ترسانی زۆرکردن. (پشت لرزیدن)
پشت لە عەرزدان: [چاوگە،ت] (١) لە زۆرانبازی دا لە عەرزدانی پشتی حەریف. (٢) (ب) شکست پێ‌هێنان لەهەربوارێکی دیکەوە. (پشت بەخاک مالیدن)
پشتماز: [ناو] پشتەمازە؛ پشتمازە؛ موغەرەی پشت؛ بڕبڕەی پشت. (پشت مازه)
پشتماکی: [ناو] هەتیوی دایک مردوو.(مادرمرده)
پشتماڵە: [ناو] پاشماڵە؛ ژێرماڵە(سرایدار)
پشت‌مێزنشین: [ئاوەڵناو] (ب) موچەخۆری دەوڵەت؛ یەخەسپی؛ کاربەدەستی ڕێکخراوی دەوڵەتی.(پشت میز نشین)
پشتۆ: [ناو] (١) دەمانچە(طپانچه)(٢) دواوە؛ پشتەوە. (عقب)
پشتوڕوو: [ئاوەڵناو]پێچەوانە؛بەروپشت؛ بەراوەژوو؛ بەرواژی؛ هەڵگەڕاوە؛ هەڵەوگەڕیاگ. (برعکس)

پشتوو: [ناو] زمانی پەشتوو؛ کە لە پاکستان و ئەفغانستان پێی دەدوێن. (زبان پشتو)
پشت وەرگێڕان: [چاوگە،ت] (١)لەشەڕدا هەڵاتن، و پشتکردنە دوژمن. (پشتکردن-بدشمن)(٢ب) ڕوو وەرگێڕان و بایەخ پێ نەدان؛ پشت تێکردن. (پشت کردن و اهمیت ندادن)
+ پشتە: [ناو] (١) پشتدێراو؛ پشتەی کەردوو؛ بڵیندایی بەینی دوو کەردوو. (پشته) (٢) دووایین بیرەکانی کارێز و هەوراز و بەرزاییەکانی پشتیەوەی. (زمین های مرتفع پشت چاههای کاریز)(٣) هەوراز؛ تەپ؛ تەپۆڵکە؛ زەوینی بەرز و قوت. (تپه)
+ پشتەسەر: [ناو] پاشەسەر؛ (١) خشڵێ‌کە لە پاش لارەپێچەوە قایم‌دەکرێ؛پشتەسەرە. (زیور پشت سر زنان) (٢) لە نەبوونی کەسێکدا باس کردنی؛ پاشملە. (غیبت)
پشتەڤان: [ناو] پشتیوان؛ پاڵپشت؛ هۆگر؛ هەوادار؛لایەنگر. (پشتیبان)
پشتەماڵ: [ناو] هەولە؛ خاولی (حوله)
پشتەملە: [ناو] پشتەسەر؛ پاژملە؛ پا شملە؛ وەک: قسەکردن لە بارەی کەسێکە وە کە خۆی لەوێ نەبێ. (پشت سر؛ در غیاب؛ غیبت)
پشتەوڕوو: [ناو](١) پشتەوقەپاڵ(تاق‌باز)
پشتەوسوور: [ئاوەڵناو] پشت‌ئەستوور؛ خاترجەم و دڵ‌قایم؛ ئەرخایەن.(مطمئن)
پشتهەڤ: بەیەکەوە؛ لەگەڵ‌یەکدا؛ تەڤی هەڤ؛ پشتبەپشت. (با هم)
پشتیکێش:کۆڵ‌هەڵگر؛کۆڵکێش؛ باربەر؛

حەماڵ. (باربر)

پشدان: [چاوگە،ت] بێهن‌وە دان؛ پشوودان؛ هەناسە کێشان؛ هیلاکی دەرکردن (نفس تازەکردن؛نفس کشیدن)

پشدەری: [ناو+ ئاوەڵناو] (١) خەڵکی پشدر (اهل پشدر)(٢) پێوندیدار بە پشدەرەوە (وابستەبەپشدر)(٣) [ناو] پارچە و قوماشێ کە لە سەر شوشەی پەنجێرە دادەبەسترێ لە بەینی پەردە و پەنجێرەدا. (پشت دری)

پشقەڵ: [ناو]قشپل؛کشپەڵ؛ پشقل؛ پشکەڵ؛ پشقل؛ بوشکوول؛ کوشپل؛ بشکوول (پشکل)

+ پشک: [ناو](١) دەو؛ پشکیل؛ قورعە. (پشک)(٢) بەش؛ سەهم؛ قیسمەت (سهم)(٣) گۆپکەی دار؛چرۆ.(تژەدرخت)

پشکاندن: [چاوگە،ت] (١) هەموو کونج و قوژبنێ گەڕان و پشکنین. (وارسی کردن)(٢) پشماندن؛ پژمین؛ پشمین؛ پنژین؛ پشکین. (عطسەکردن)

پشکاوتن: [چاوگە،ت] هەڵوەشاندنی چندراو یان تەقەڵی دووراو. (شکافتن)

پشکخستن: [چاوگە،ت]دەوکردن؛ قورعەکێشان. (پشک انداختن)

+ پشکۆ: [ناو] چرۆ و گۆپکەی دار. (تژەدرخت)

پشکۆدان: (١) [ناو،ت] ئاوردان؛ مەنقەڵ (آتشدان)(٢)[چاوگە،ت] پشکۆ دان؛ پشکۆ دەرکردنی دار؛ و خونچە و گوپکە دەرکردن؛ پشکۆدەردان. (درخت در حال غنچەدادن)

پشکۆژە: [ناو] پشکۆ؛ چرۆی دار (تژەدرخت)

پشکۆڤ: [ناو] خونچە؛ خونچە لەحاڵەتی دەمکردنەوەدا. (غنچەدر حال باز شدن)

+ پشکۆڵ: [ناو] (١) داری‌داخستنی‌پشت دەرکە بۆ خاتر جەمی؛ ئەشکیل‌ئەشکێل؛ پاڵپشتی دەرکە. (چوب پشت در برای اطمینان. کلون) ٢) > پشکەڵ.

+ پشکول: [ناو] (١) بشکول؛ قوڕ؛ قوڕاوی. (گل آلود) (٢) پاشەکشێ؛ خۆدزینەوە. (عقب نشستن؛ فلنگ بستن)

+ پشکووتن: [چاوگە](١)دەمکردنەوەی گۆپکە ی داروگوڵ.(٢)خیڤبوون؛ وردبوون، کرانەوەی بەردی قسڵ کە ئاوی لێبکەوێ. (٣) هەڵتۆقینی گەرمەشانی لە وەختی برژاندندا.(٤) (ب) کەیف خۆش بوون؛ ڕووگەش بوون؛ ڕوو گەشانەوە. (شکفتن)

پشکووژا مەمکا: [ناو،ت] دوگمەی مەمک؛ گۆی مەمک؛ گۆپکەی مەمک. (نک پستان)

پشکهاوێشتن: [چاوگە،ت] دەوکردن؛ قوڕعەخستن؛ قوڕعەکێشان. (قرعەکشی)

پشکەگوڵ: [ناو]گیاییکە(بلوێر) یشی پێ دەڵێن. (بادبیز)

+ پشکیلان: [ناو] (١) ڕۆیشتنی زاوا و برا زاوا بۆ ماڵی بووک لە شەوی شەوگەڕدا. (رفتن داماد و دوستانش بمنزل عروس در شب قبل از عروسی) (٢) گۆرەوی بازی.(جوراب بازی)

پشکین: [چاوگە] پشمین؛ پنژین؛ بێهنژین؛ دەڵێن یەک جار سەبرە، دوو جار جەختە و چاکی هێنا. (عطسەکردن) پشۆر: [ناو] نەحلەت. (لعنت)

پشۆرەیی: [ئاوەڵناو] نەحلەتی. (لعنتی)

پشوودار: > پشوودرێژ.

پشوودان: [چاوگە،ت] بێهن‌وەدان؛ هیلاکـی-دەرکردن؛ حەسانەوە؛ وچـانگرتن. (خسـتگی در کردن)
پشوودرێژ: [ئاوەڵنـاو] خـۆڕاگر؛ بـەنـەفـەس؛ بەرگەگر؛ پشوودار؛ بەتاقەت؛ بەسەبر؛ دلفـرە؛ مەند؛ لەسەرەخۆ. (صبور و مقاوم)
پشیلە خستنەدەرپـێ: جـۆرێ هـەڕەشـە بـۆ تەمبێکردن، لە ڕابووردوودا جۆرێ تـەمبـێ-کردن؛ زیاتر بـۆ ژنـان بـوو. (نـوعی تنبیـەدر گذشتەگربەتنبان انداختن)
پشێونی: > پشێوێنی.
+ پف: (۱)[ئاوەڵناو] کفەڵ؛ پفەڵ؛ فش؛ دژی پتـــەو؛ تـــووری‌کفـــەڵ واتـــا تـــووری قانگ.(متخلخل(۲) [ناو] سیپەلاک؛ پشاسپی؛ سی. (ریە)
+ پفدان: [چاوگـە،ت](ب) سـگ ماسـاندن و تووڕەکردن. (کنایەعصبانی کردن)
+ پف‌کـردن: [چاوگـە،ت](۱) فـووکردن لـە گڕی چرا بـۆ کوژاندنـەوەی.(۲) خۆشـکردنی ئاور؛ بە فوو تۆز لابردن لە سەرشـتێ. (فـوت کـردن)(۳) بـاکردن؛ پـەنمـین؛ هـەڵمسـان؛ ماسین. (باد کردن؛ پف کردن)
پفکــردن بــە ســەرەگــەورەکــەیــدا: (ب) ناشارەزایـی لـەکارێکـدا وەک فـووکردن بـە سەری گەورەی زوڕنادا. (کنایە. نا وارد بـودن در کار)
پفکە: [نـاو] پفلـەک؛ بلـۆق؛ تۆقلـە؛ ئـاورگ. (تاول)
پفڵە: [ناو] پفکە. بلۆق. پفلەک. تۆقلە. (تاول)
پفلە: (ب) کێشانی‌تریـاک؛ وافـوور؛ ئـەهلـی پفلەیە واتا تریاکییە. (اهل وافور)
پف لە خوڵەمێش‌کردن: پف لە خوڵەمڕکردن؛ (ب) کـاری بێسـوود و بێهـوودە. (کنایـەکـار بیهودەکردن)
پفڵەکە: > پفلە.
پفلیـان: [چاوگـە] پشـلیان؛ وەک هـەڵـاتنی هەویر؛ ماسین؛ باکردن؛ پەنمین. (بادکردن)
پفیان: [چاوگـە،ت](۱) تـووڕەبـوون؛ بایـان-کرد؛سـکیان ماسـی.(عصـبانی شـدند) (۲) باکردن؛ تووڕە بوون. (عصبا نیت)
پفەک: [نـاو] پوفـەک؛جۆرێـک خواردنـە بـۆ منداڵان لە هێرەڵماسی و هێلکە و خـۆی بـە شکڵی بەڕوولەی کفـەڵ دروسـت دەکرێـت (پفک)
پفیۆ: [ئاوەڵناو] پەست؛ بێ‌غیرەت؛ بۆی هەیە هەر (پفیوز)ی فارسی بێ بە واتای بێ‌غیرەت بەڵام لە ئەسڵ دا بەکسێ دەڵێن کە لەکـۆڕی مـەی خواردنـەوەدا تـەنیـا مـەزە و خـۆراک دەخوا. (پفیوز)
پفۆک: [ناو] (۱) باڵۆن؛ کیسـەی زۆر گـەورە کە بە گازێکی سووکتر لە هەوا، یان بەگەرما هەڵدەماسێ و بـە بـار و موسـافیرەوە دەچـێ بەحەوادا.(بالون؛ بالن)(۲)کیسەی پڕلە بـا لـە ناوزگی ماسیدا.(کیسەهوادر شکم ماهی)
پکەنە: (۱) پێپکەنە. (بخند) (۲) هەڵکەنە؛ ئەو جێگا پکەنە: چـاڵی کـە. (بکـن. گـودکن) (۳) لیباسەکانت پکەنە؛ دایکەنە. (بکن)
پکێـت: [ئـاوەڵنـاو] ڕاوەسـتاو؛ قـایم؛ پتـەو (محکم)
پکێش: [ناو،بک] ئەوەی‌کە دەکێشێ؛ بکێش

(بە هەمو مانایێکەوە) (بکش)
پکێشە: [کاری‌ئەمری] بکێشە؛ (١) هەناسە پکێشە؛ سیگار پکێشە. (بکش) (٢) وێنە پکێشە؛ ڕەسم بکێشە: عەکس و وێنە هەڵگرە: بگرە. (بگیر)(٣) نەقاشی پکێشە؛ هێلێ پکێشە. (بکش)(٤) لە دەس ڕوزگار تاڵی پکێشە. (از دست روزگار بکش)(٥) ئەو ئەڕابە پکێشە؛ ڕایکێشە. (بکش) (٦) بەترازوو برنجەکە پکێشە. (توزین کن)(٧) تەنافەکە پکێشە: تەنافەکە لەو بەرهەیوانە هەڵخە: بیگێڕە. (بکش)
پلاتین: [ناو] پلاتین؛ ئاڵتوونی‌سپی؛ زێڕی سپی. (پلاتین)
پلارەقسە: [ناو،ت] تانووت؛ قسەی‌ناخۆش، زیاتر لە توێی نزاکەتدا؛ توانج؛ تەشەر؛ تەوس؛ قسەی بەتێکول. (متلک)
پلاژ: فرد؛ فد: [ناو] لەکوردیشداباوە، چیغ و چادر یاماڵ و خانووی دروستکراو لە پەڕاوی دەریادا. (پلاژ)
پلاژداری: [ناو] (١) کەسێکە پلاژی هەیە.(٢) کاری بەڕێوەبردنی پلاژ.(پلاژ داری)
+ پلاس: [ناو]گاز ئەنبوڕ؛ جۆرێ گازی دەمپانە. (انبردست)
پلاس‌ئاخوڕ: [ئاوەڵناو] (ب) ژنێک کە شەرمی گەورەبێت (کنایەفرج گشاد)
پلاستێر: اند؛ فد:[ناو]چەسپی‌موشەمایی بۆ چارەسەرکردنی ئێش و ئازار. (پلاستر)
پلاستیک: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] یەکێ لە بەرهەمەکانی پۆلیمێری کە بەگەرما پێدان نەرم دەبێتەوە و بیچمی دڵخوازی پێدەدرێ. (پلاستیک)
پلاستیکی:[ناو،ئاوەڵناو]هەر شت لە پلاستیک بێ؛ پێوەندیداربەپلاستیکەوە. (پلا ستیکی)
پلاسما: [ناو] بەشی‌تراوی خوێن کە لە ئاو و ماکگەلی کانزایی و پرۆتۆیین پێکهاتووە. (پلاسما)
پلاڤ: [ناو] پلاف؛ پڵاو؛ چڵاوێکە ئاوکێش-دەکرێ و نانی لە ژێردا دادەنێن بۆ بنکڕ و پێش دەمکێشان ڕۆنی بەسەردا دەکرێ؛ هەروەها، هەرشتەپڵاو، لووبیاپڵاو، ئیستامبوولی‌پڵاو، بڵالووک‌پڵاو، شیرین‌پڵاو، پلاوبرویش، پڵاو بامیە، پاقلەپڵاو، سەوزی-پڵاو، زرشک‌پڵاو؛ پڵاو گۆشت، پڵاو و خۆرشت. (پلو)
پلاک: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] (١) قەوارەی جیا کراوی زەوی.(٢) قاشی ملوانکەی کانزایی کە ناو و ژمارەی لەسەر نووسراوە و سەربازان دەیکەنە مل لە بەر بێسەروشوێن نەبوونی تەرم لە شەڕدا.(٣)ڕەقەمی نوسراو لە سەر دەرکەی خانووبەرە.(٤) ژمارەیێک کەپاش لەدایکبوونی منداڵ لە نەخۆشخانە دەیکەنە دەستی بۆ نەگۆڕان. (پلاک)(٥) ڕێژەکی ڕەقەمی سەیارە. (شمارەماشین)
پلاکت: فرد؛ اند؛ فد: گردەی خوێن کە زە-ڕەگەلێکی لاپانی زۆر وردن، لە گرسانەوە و دەڵەمە بوون و مەیینی
خوێندا باندۆریان هەیە و بە هووڕبین دەبینرێن. (پلاکت)
پلان: اند؛ فد: [ناو] (١) گەڵاڵە؛ نەخشەی

خانوو؛ بەرنامە و پرۆگرامی بەڕێوەبردن. (پلان)(٢) پیلان؛ تەشقەڵەودوڵاب.(کلک) (٣) فیلم هەڵگرتن لەدیمەنێک بێ برانەوە لە کاری سینەمادا (پلان)

پلانگتۆن: [ناو] گیاندارانی وردیلەی ناو زەریا کە بەشێکی زۆر لە خۆراکی ئاوەژیان پێک- دێنن. (پلانکتون)

پلاوبرۆیش: [ناو،ت] پلاڤساوار؛ پلاوێ کە لە ساوار چێ دەبێ. (پلوبلغور)

پلاوپارزن: [ناو] پلاوپاڵێو؛ سەلەیا دەفری کون- کون بۆ دارشتنی پلاو (پاڵاوتنی پلاو) (آبکش‌پلو)

پلاوپارێن: > پلاوپارزن.

پلاوپەز: [ناو](١) پلاو لێنەر؛ دەفری پلاوتێدا چێکردن؛ (پلوپز) (٢) [ناو،بک] ئاشپەزی پلاو لێنەر؛ وەک چاپەز و ئاشپەز.(آشپز پلو)

پلاوپەزی کارەبایی: [ناو] دەفرێکە بە کارەبا گەرم دەبێ و برنج لێدەنێ بێ ئەوەی بیپاڵێون، (بێ‌دارشتن). (پلوپز برقی)

پلاوخۆری: (١) پێوەندیدار بە پلاو خواردنەوە؛ لیباسی پلاوخوری: لیباسی میوانی: لیباسی تازە و جوان. (لباس پلو خوری) (٢) [ناو] دەفری گەورەی پلاوتێکردن (دیس) (٣) (ب) میوانی و جەژن و بانگهێشتن بۆپلاو خواردن.(دعوت‌بەجشن)

پلاوماش: [ناو،ت] پلاوێ‌کە لە برنج و ماش دروست دەبێت. (پلو ماش)

پلپلێ: [ئاوەڵناو] زۆربلێ؛ چەنەدرێژ. (پر حرف)

پلتانگ: [ناو] پەرپەڕۆک؛ پەپوولە. (پروانە)

+ پڵتە: [ناو] تلتە. (١) خلتە و خۆڵ و لێڵایی نیشتوو لە ژێر(بن)تراودا. (درد)(٢) پاشماوەی چایی لە ناو قۆریدا؛ پڵتەچایی. (تفالەچای)

پڵتەپڵت: [ناو،ت](١) فلتەفلت؛ قسەی بێتام و بێ جێ فلتەفلت مەکە: واتا قسەی قۆڕمە کە.(حرف بی ربط)(٢)قسە کردنی بێ- ددان. (صحبت کردن آدم بی دندان)

پڵتەخۆری: [ناو، بەرهەمی‌چاوگە] پیس- خۆراکی؛ بەرماوەخۆری. (بد خوراکی،)

پل‌تەقێن: [ناو،بک] پللە لێدەر؛ چەقەنە لێدەر. (بشکن زن)

پلچاندنەوە: [چاوگە،ت] فلیقاندنەوە؛ پان و فلچ کردنەوە؛ تلیقاندنەوە. (لەکردن)

پلچی: (١) [ناو] بلچ؛ گوێژ؛ گێوژ. (زالزالک)(٢) پلیخاوی؛ پانوفلچی. (لەشدگی)

پلحەتکە: [ئاوەڵناو] دەستراست؛ پللەڕاست لە مەڕ مەڕێندا. (هەف زن در تیلەبازی)

پلخ: [ناو] فلق؛ پلق؛ پلخ دەرهینان:فلق دە- رهێنان؛ فلیقاندنەوە. (لە؛ پهن)

پل لێ‌تەقاندن: [چاوگە،ت] چەپلەلێ‌تەقاندن؛ (ب) ئاشکراکردنی نەهێنی و ڕیسوا کردن؛ لە قاودان. (کنایەانگشت نما کردن)

پلم: [ئاوەڵناو] پلم؛ گرژ؛ موون؛ مۆن؛ پلمە- ڕوو: ڕووناخۆش (تند خو. بد اخم)

پلماندن: [چاوگە،ت] بلماندن؛ لە بەرخۆوە بۆڵەبۆڵ‌کردن. (غرولند کردن)

پلمژیان:[چاوگە،ت] پلژیان؛سیس بوون. (پژمردە)

پلمەڕوو: [ئاوەڵناو] ڕووترش؛ ڕووناخۆش و ڕووگرژ؛ پەلپگر؛ ناوچاو گرژ؛ تووڕە(ترش رو؛

عصبانی؛ اخمو)
پلند: [ناو] جەمسەری بڕبڕەی پشت؛ بەندی خوارەوەی مۆغەرەی پشت. (آخرین مهرەپشت)
پڵنگ پڵنگ: [ئاوەڵناو] گول گول؛ پنۆک پنۆک؛ خاڵ خاڵ؛ پەڵە پەڵەی چووک. (گل گلی)
پڵنگی: [ئاوەڵناو] پلنگ ئاسا.(ب) ڕەنگی وەک پڵینگ؛ گول گول؛ پەڵە پەڵە. (پلنگی)
پلۆ: [ناو] پلە؛ پایە؛ ڕادە. (اندازە؛ مقام)
پڵۆخین: [چاوگە،ت](١) لەگەل (دا) دا دێ، داپلۆخین، داپڵۆسین،لێدان و داگرتن بە شەق و دار.(لەو لوردە کردن) (٢) زۆر کوڵان.(لەشدن‌ازپختن زیاد)(٣)پێست داماڵانی سوتاو (پوست انداختن از سوختن)
پلووپۆ: [ناو،ت] (١) (ب) کەوتنە سەر هەوای‌کردنی‌کارێ؛ گل‌وخول خواردن بە دوای‌کردنی‌کارێکا. (بهوای انجام کاری بودن) (٢) بۆنکردن و گەڕان بەدوای شتێکدا زیاتر بە سەگیش دەڵێن کە بە دوای نچیردا بابۆ دەکا و دەگەڕێت. (گشتن دنبال چیزی. بو کشیدن)(٣)پەڕوپۆ.(پرهای پرندە)
پلوورە: [ناو] (١)شۆڕاوەی ئاوی نەپساوە لە شێری سەماوەر یا پلووسک یا شێری دەستشۆری.(شرە)(٢)سەهۆڵی شۆڕەوە بوو لە پلووسک یائەشکەوت؛ کێرەکەڵ (دنگالە)
پلووکەبەرد: [ناو] بەردی ورد؛ بەردی چکۆلە؛ لەتی چکۆلەی بەرد. (پارەسنگ کوچک)
پل‌وەشاندن: [چاوگە،ت] (١) دەست وەشاندن؛پەل‌وەشاندن.(ضربەزدن بادست)(٢)پل‌تەقاندن. پللە وەشاندن؛ پللەلێدان. (بشکن زدن)
پلوێن: [ناو] (ف. گیا) گیاگۆچان؛ گیواوەگۆچانە؛ سێپەڕێ؛ سێپەڕ؛ بۆگەدە و میزەسووتە و سووزاک باشە. (ناخنک. اکلیل الملک)
+ پلە: [ناو] دەرەجە؛ پایە؛ ڕادە؛ پلەی سارد و گەرمی هەوا.(حد؛ میزان) (٢)یەکەی پێوانی-گۆشە(سووچ)لە هێندسەدا؛ وەک بڵێین پلەی گۆشەی وێستاو(٩٠) و جەغز(٣٦٠) پلە-یە.(درجە)
+ پلە ترازیان: [چاوگە،ت] لەپلەم ترازیا:(ب) لەدەستم دەرچوو؛ هەڵەی-خۆنەویست.(اشتباەغیر عمد)
پلەپلە: [بەند]کەمەکەمە؛ قۆناخ قۆناخ؛ پایە پایە؛ هەنگاو بە هەنگاو (ب) ئەنجامی کار بەتەرتیب و بەرە بەرە.(پلە پلە)
+ پلەگۆشت: [ناو] (١) تیکەگۆشت؛ جنچکەگۆشت (تکەگوشت) (٢) (ب) مرۆڤی قەڵەو و شل و نەرم. (انسان تپل و چاق)
پلەمەتێ: [ناو] مەتێ. (١) مەتەی دەستی؛ مەتەیێک کە بە کەوان دەخولێتەوە. (متە دستی) (٢)مەتەی دەستی ئامرازێک کەکەوانی نییە، بەڵام بە بادانی دەسکەکەی مەتە دەچەرخێت. (دەسووڕێت) . (متەدستی)
پلەوەر: [ناو] پایەوەر؛لە مەقامدا سەرکەوتوو ؛ دارای پلە و پایە. (پایور)
پل‌هەڵسان: [چاوگە،ت] (ب) لە پڕ هەست-کردن بە مەیل و ئیشتیا، بۆکردنی کارێ. (بەناگاەهوس انجام کاری کردن)

پلەی‌سەرما و گەرما:ڕادەی ساردی و گەرمی. (سطح. درجه‌حرارت)
پلی: [ناو] قاڵدرمە؛ قادرمە. پلیکان؛ نێردیوان، نەردیوان؛ دەرەج. (نردبان)
پلیان: [چاوگە،ت] کەوتن. (افتادن)
پلیت: بلیت؛ پسوولە؛ بڵیت. (بلیط)
+ پڵیتە: [ناو] فتێڵە. (١) فتێڵەی چرای نەوتی (فتیله) (٢) پەڕۆی بادراو (تەنزیف) بۆ ناو برینی قووڵ.(فتیله‌زخم)
پلیخـین: زۆرکـولاَن؛ پڵـۆخین؛ پڵـخ دەرهاتن،پلۆخین. (له‌شدن)
پلیسە: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] (١) جۆرێ دامێنـی لیباسی ژنانەکە چین لە سەر چین (لەدرێـژی دا) ڕادەوەسـتێ. (پلیسـه) (٢) پـەڕەسـریلکە؛ پلیسـرک؛ پلیسـگەرد؛ پلیزگـرد؛ پەڕەسلێرکە> پەڕەستوو. (پرستو)
پلیقان: [چاوگـە] فلیقـان؛ پلیشـان؛ پلۆخـان. (له‌شدن)
پلیکانێ: [ناو] هەلووکێن (الک دولک)
پلیکانی نەجات: [نـاو] پلیکـانی چێکـراو لـە دەرەوەی ڕووکاری خانووی چەنـد قـاتی بـۆ دەربازبوون لە کاتی تەنگانـە و سـووتمان دا. (پلکان اضطراری)
پناڵتی: اند؛ فد: [ناو] جۆرێ جەریمەی تـاوان لە یاری وەرزشـیدا؛ وەک باسـکیتباڵ، تـۆپی پێ، هەند باڵ، و فووتساڵ. (پنالتی)
پنپنی: [ئاوەڵناو] پنۆک پنۆک؛ پـەڵـە پـەڵـە؛ گوڵ گوڵ؛خاڵ خاڵ.(نقطه نقطه)
پنجک: [ناو] پنجی چکۆلە؛ بنەگیـای‌کـورت؛ دەوەن. (بته)
+ پنج و مۆر لە خۆ نان: خۆگرتن؛ لووت بـە-رزی و خۆ بەزل زانین. (تکبر نشان دادن)
پنـدر بوونـەوە: [چاوگـە،ت] وشـکبوونەوە؛ کزربوونەوە؛ تەواو بوونی زگچوون.خشکشدن؛ بندآمدن‌اسهال)
پندرپۆزە: [ناو] ڕووەکێکە لە قـەراخ جۆگـە و ڕۆبار دەڕووێ. (نام گیاهی است)
پندریسک: [ناو] باڵندەیێکـی چکۆلـەو هـار و هاج و نـەسـرەوتـە بـە ڕەنگـی بـۆر. (اسـم پرنده‌ایست)
پنـدەپیـر: [نـاو]داپیرۆشـک؛ جاڵجاڵووکـە .(عنکبوت)
پنر: [ناو]پندر؛حاڵەتی‌چرچ‌بوونی‌دەست‌و پێ‌کە زۆر لە ناوئاودابمێنێتەوە.(آبکیس)
پنس:[ناو]کەڕوو. (کپک)
پنک: [ناو]پەڵەی چووک؛ خاڵ؛ پنت؛ پەڵەی چکۆلە. (نقطه. لکه)
پنک پنک: [ئاوەڵناو] (١) پەڵە پەڵە؛ خاڵ‌خاڵ؛ پنۆک پنۆک. (لکه‌لکه. خال خـال)(٢) خـاڵ-خاڵ بوونی بەفری‌کوێستان؛ کاژو واژ. (خـال خال شدن برف)
پنکدار:خاڵدار؛دارای پەڵە و خاڵ.(خالدار)
پنکەهەور: [ناو] پەڵەهەوری گچکە.(پاره ابر)
پنگاف: > پونگاو؛ پەنگاو.
پنـگ خواردنـەوە: [چاوگـە،ت] (١) پونـگ خواردنـەوە> پۆنگـاو. (٢) (ب) بـە خـۆدا چـوون؛ پـیش خواردنـەوە؛ زوێـر دانیشتن.(غمگین نشستن)
پنگر بوونەوە: > پندر بوونەوە.
پنۆرە: [نـاو] داری سـەردوو فلیقانـە بـۆ کـۆ

کردنەوەی دڕک و گژاڵک. (چوب‌خارجمع کنی)
پنۆسۆنی: [ناو] ناوی نەخۆشینی مقاو لە ڕوانگەی پزیشکییەوە. (پنوسونی)
پنەدای: [چاوگە] پێدان (دادن)
پنەزانای: [چاوگە،] (١) پێزان، پێزانین؛ بە-سوپاس‌بوون؛ بەئەمەکبوون. (قدرشناسی)(٢)پێ‌وابوون؛ وا زانین(فکر کردن؛خیال‌کردن)
پنەشۆر: [ناو] هەرچی‌کە شتی پێدەشۆن؛ وەک سابوون؛ سپۆن. (چیزی کەبا آن میشویند)
پنەیاوان: [چاوگە،ت] پێگەیشتن؛ گەیین (رسیدن)
+ پنی: [ناو] (١) پینە؛ پنوو. (پینە) (٢) پەنامەکی؛ نهێنی؛ سوڕ؛ سڕ. (سر. راز)
پنیْ: [ناو] پنە؛ پنەکە. (تختەخمیر پهن کردن)
پنیا: (١) [ئاوەڵناو] پەنامەکی (نهانی) (٢) پینەکردن(پینەکردن)
پنی‌سیلین: فد؛ فرد؛ اند: [ناو] هەوەڵین دەرمانی میکرۆب‌کوژ کەکەمتر لە سەد ساڵە پاوێر بووە و بۆ چارەسەرکردنی نەخوشینگەلی چڵکی بەکار دەبرێ؛ کە لە چەشنێ کەڕوو بەدەست‌دێ؛ جۆرێک ئانتی-بایۆتیکە. (پنی سیلین)
+ پۆ: [ناو] (١)کوێرووی گەنم. (سیاهەک گندم) (٢) بەڕوو؛ نانی پۆ واتا نانی بەڕوو. (بلوط)
پۆێم سەمفۆنی: [ناو] پارچەمۆسیقاییێک کەبۆ ئورکێسترسەمفۆنی دروست‌دەکرێ و بە ڕواڵەت دەست‌وپێگریی کەمترە و لە سەر مەبەستێکی تایبەتی ئەدەبی چێ-دەکرێت.(پوئیم سمفونی)
+ پوان: [ناو] (١) شیلان؛ جلیق؛ ڕوەکێکی دڕکاویە. (نسترن کوهی) (٢) بەری ئەو دارە. (میوەنسترن کوهی)
پۆ بە دەمەوە نەبوون: (ب) دەم‌هەراشی؛ بێ-حەیایی (بی چاک دهن)
+ پۆپ: [ناو] (١) لق‌وپۆپ؛ لقی سەرووی دار. (بالاترین شاخەهای درخت.) (نووچکەی چیا و دوند. (قلە)
پۆپ‌چەرمگ:[ناو]سەرسپی؛پۆپ چەرموو. (موی سر سفید)
پۆپ‌چەرموو: [ناو](١) سەرسپی؛ مرۆڤی پیری سەرسپی؛ تەغەر بە پیرێژن دەوترێ و بەپیاو ڕیش‌چەرموو دەڵێن. (پیر گیس سفید)(٢) (ب) مرۆڤی بە ئەزموونو دونیادیدە. (گیس سفید)
پۆپلین: [ناو] جۆرێ قوماشی ناسک بۆکراسی پیاوان و مەلافە کەڵکی هەیە. (پوپلین)
پۆپەشینە: [ناو] پۆپەڕەشە؛ جۆرێ نەخۆشینی باڵندە. (نوعی بیماری ماکیان).
پۆتک: جل‌وبەرگی شڕوکۆن.(لباس‌مندرس)
+ پۆتە: [ئاوەڵناو] بەرکەتی؛ هەڵبژاردە؛ پێش کەوتوو. (موفق، جلو افتادە، ممتاز)
پۆتەکە: [ناو] لاتەڕاف؛ کەلەکە(پهلو)
پۆج: [ناو]کیمیا. (شیمی)
پۆج‌زان: [ناو]کیمیاگەر؛ کیمیازان. (کیمیاگر)
+ پوخت: [ئاوەڵناو] جێکەوتوو؛ ڕسکاو؛

بارهاتوو؛ کاری تەواو و تەمیس؛ خۆش کراو؛ بێ گرێوگۆڵ. (جا افتادن؛ مرتب)
+ پوختکردن: [چاوگە،ت] خۆش‌کردنی قوڕ و هەویر و ڕەنگی وێنەکێشی. شێلان و تێکەڵاو کردن و گرێ‌وگۆڵ لێبڕین؛ ڕاهێنان. (پخته کردن)
پوختوپاراو: [ئاوەڵناو] بێکەم و کەسری و بێ-گرێوگۆڵ؛ ڕسکاو؛ تەواو خۆش و ئامادە کراو؛ کاری بێ‌عەیب. (بی‌نقص و آماده)
پوختەیی: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە] (۱) خۆش-کراوی؛ ڕێک‌وپێکی؛ (ب) دونیا دیتوویی؛ لەکار دەرهاتوویی؛ کارزانی؛ پوختوپاراوی؛ لە کلّ دەرهاتوویی؛ بەئەزموونی؛ سارد و گە-رم چەشتوویی. (پختگی)
پوختی: [ئاوەڵناو] ڕێک‌وپێکی؛ بێخەوشی؛ تەمیزی؛ خاوێنی لەکاردا؛ بەئەزموونی؛ ڕەوتی پوختبوون. (تمیز. مرتب. باتجربه)
پۆخ‌دەرکەوتن: [چاوگە،ت] بۆی‌هەیەلە (پۆخ)ی تورکیەوە هاتبی، گەندی کاری دەرهاتن؛ گەندەلی لێ‌ئاشکرابوون. (گند درآمدن)
پۆخلکار: [ئاوەڵناو]کارپیس؛ ناپوختکار؛ کار ناشیرین؛ کارنەزان. (کارنامرتب؛ بی نظم)
پۆخەکە: [ناو] جۆری پووشووی نەباش. (برهو)
پۆخەڵە: [ناو] گیای کەرکۆڵ؛ درەدەوا. (باد آورد؛ خار مقدس)
پۆدر: فرد؛ فد: [ناو](۱) تۆز و خۆڵ ئاسا؛ هاڕاوەی ورد. (۲) پۆدر؛ جۆری دەرمانی هاڕاوە بۆ بەرگری لە عارەق سووت بوون.
(۳)هاواڵی ماتیک و سووراو؛ جۆری سپیاو.(پودر)
پۆدری‌بەرد: [ناو،ت] خاکەسەنگ؛ کەلەگەل چیمەنتۆی سپیدا تێکەڵ‌دەبێ لە بینا سازیدا کەڵکی هەیە. (پودر سنگ)
پۆدری‌تالک: [ناو،ت] پۆدری‌منداڵ؛ پۆدرێکەبە لەشی منداڵی ساوایدا دەساون بۆ ئەوی عارق سووت نەبێ. (پودر تالک)
پۆدری منداڵ:<پۆدری تالک. (پودر تالک)
پۆڕاندن: [چاوگە،ت] تێ‌ترنجاندن؛ بەزۆر پێاکردن؛تێ‌تەپاندن. (سپوختن؛ چپاندن)
پۆڕاو: [ئاوەڵناو] ئامادە؛ دروست بوو. (مهیا)
پۆڕاڕۆیین: (ف. گیو) بەپووڕا ڕۆیین؛ چاوەدێری؛ ئاگالێبوون؛ (مراقبت؛ زیر نظر داشتن)
پۆرت: (۱) پۆڕما؛ سەروقژ. (موی سر)(۲) تاریف کردن؛ گۆرانی پیاهەڵخۆیندنی شایەر؛ بەشاخ‌وباڵدا خوێندن. (تریف کردن)
پۆرتخ: [ناو] چڵکی‌برین؛ کیم(کێم)؛ زووخاو.(چرک‌زخم)
پۆڕترە: فرد؛ فد: [ناو] دەستەواژەی نیگارگە-رییە، وێنەی سیما و سەروچاو. (پرتره)
پورتەقاڵ: (۱) [ناو] دار و میوەی پورتەقاڵ. (۲) [ناو] مەملەکەتی پورتەقاڵ. (۱و۲پرتقال)
پورتەقاڵی: [ئاوەڵناو] (۱) پورتەغاڵی؛ خەڵک و زمانی مەمملەکەتی پورتەغاڵ. (پرتغالی) (۲) ڕەنگی پورتەقاڵی؛ زەردی مەیلە و نارنجی؛ لە تێکەڵکردنی ڕەنگی زەرد و سووری کەم پێکدێ. (رنگ پرتقالی)
پۆرتک: [ناو] مەندیل؛ سەروپۆتراک؛

مێزەر.عمامە

پورخ: [ناو] پلیش؛ پڵخ؛ جیق. (له)

پورخانــدن: [چاوگــە،ت] تلیقانــدن؛ جیــق دەرهێنان. پلیشاندن (لەکردن)

+ پۆرخز: [ئاوەڵنـاو] ناقوڵـا؛ زەلام؛ تـەوەزل؛ تەمبەڵ؛ تەواسا؛ زەمتە؛ زلحـۆرتی‌تـەمبـەڵ‌و سست؛ قرخە مەرەس. (شکم گندە؛ تنبل)

پۆرسان: [ناو]کاوێژ (نشخوار)

پۆرسپی: [ناو](١) پۆپسپی؛ پـۆپچـەرمـگ؛ سەرسپی. <پۆپچەرموو. (مـو سـفید) (ب٢) پێخەسوو؛ ژنی‌کە لەگەڵ بـووک دەچـێ بـۆ ماڵی زاوا بۆ ماوەیێک؛ پاخەسوو. (ینگە)

پۆرقوت: [ناو] (١) موو قرتێن؛ سەرتاش؛ سەر تراش. (سرتراش؛ آرایشگر) (٢) قژ هەڵچـوو. (موی سر بالا ایستادە)

پۆرگ: [ناو] (١) لوو؛ قـونێر؛ کـوان؛ دومـەڵ؛ کروڤەر. (دمل) (٢) بلۆق؛ تۆقلەی لەش کاتی سووتاندن. (تاول) (٣) پەنمـانی بـرین و بـن ددان؛ کـیس. (کـیس) (۴) تـوێژی بـرین؛ قرتماغە؛ پترۆک؛ قەتماغە.(پوستەنازک روی زخم) (۵) تۆخڵی پەڕشـە و بـرنج. (چلتـوک. شلتوک) (۶) پینەی دەست و پێ. (پینەدسـت و پا)

پۆرەکەردەی: [چاوگە،ت] پێوەکـردن؛ کـردن بە ناوا؛ هۆنینەوە. (فروکردن .رشتن)

پۆڕهەلەک: [ئاوەڵناو] قژ لوول؛ موو پێچ پێچ؛ مـوو فـڕ؛ مـو قـەف قـەف؛ (زیـاتری ڕەش پوستاڵ پۆڕ هەلەکن). (مجعد)

پۆڕین: (ف. گیو) پۆڕیان؛ خەم و خەفـەت و سکاڵاهەڵڕشتن؛ بەیـانی خـەم و کـەسـەر و

دەردی‌دڵ. (درد دل کردن)

+ پـۆز: [نـاو] فـرد؛ فـد:[نـاو] (١) دەعیـە؛ تـەکـەبـور؛ لـووتبـەرزی. (تکبـر) (٢) پـۆز؛ وشەیێکی فـەرەنسـیە واتـا ڕازاوەیـی‌جـل و بـەرگ، (خـۆ لـە دەق‌دان) وێـدەچـێ، ئـەو ڕازاوەییە بووبێ بەدەعیە و لووتبەرزی. (پز)

+ پۆز: [ناو] (١) قەپۆز؛ لووت. (پوزە)(٢) لووتـەی کێـو (قلـە) (٣) دەمـار؛ دەعیـە؛ خۆگرتن؛ لووتبەرزی. (تکبر)(۴) پوواز؛ هۆرە. (پغـاز) (۵)[ئـاوەڵنـاو] هـەراو؛ فـش؛ گوشـاد. (گشاد)

پۆزبەران: (١) [ناو] قەپۆزبەرانی؛ لـووت کـە- مـانی؛ لـووت کـەوانـی؛ نـاوەڕاستی لـووت دەرپەڕیـو. (دمـاغ عقـابی) (٢) (ب) کـەیـف خۆش؛ بـەدەعیـە. (سـرخوش)(٣)[ئـاوەڵنـاو] جوامێر؛ بەجەرگ. (دلیر)

پۆزەبەند: [ناو] دەمبێن؛ دەمبێنی ڕەشەولاغی گێرە. (دهان بند)

پۆزەوانە: [ناو] ئالقەیێک کە دەخرێتە لووت و لمۆزی گامێش و گا.(پوزەبند)

پۆژمین: [ناو] ئیسکی‌کەللەسەر؛کلـۆخی‌سـەر. (جمجمە)

پوژن: [ناو]خەم؛ پەرۆش (پژمردگی. غصە)

پۆژنای:[ناو] پۆشاندن؛ داپۆشین. (پوشاندن)

پۆژەنەی:[چاوگە،ت](ف.گیو)تی‌تەپاندن؛ تێ- ئاخنین؛ پیاکردن. (فرو کردن)

+ پۆس: [ناو] پۆست: پلەوپایە؛ بەرپرس‌بوون لە مەقامێکدا یان لـە ڕێکخراوێکـدا؛ پۆسـتی رەئیسی؛ پۆستی وەزارەت.(پست)

پۆس‌ئەڕەنیای:کەول‌کردن پێستڕینن؛ پێسـت

داماڵین. (پوست کندن)
پۆسان: [چاوگە] پرتووکان؛ ڕزین (پوسیدن)
پۆس بەپێشەوەلکیان: پێست بە ئیسقانەوە نووسان.(ب) زۆر لەڕ و لاواز بوون. (پوست بەاستخوان چسبیدن)
پۆس بەمەشکە دەرهێنان: (١) کەوڵکردن و گرتنەوەی پێستی لاشە بەشیوەیێک کە بە سەریدا داماڵرێت، بۆمەشکە. (پوست کندن برای مشک درست کردن) (٢) (ب) هەڕەشە کردن، کە پێستی لەشت بەسەرتدا دادەماڵم و بۆ مەشکە دەریدێنم.(پوست کسی را قلفتی کندن)
پۆسپارە: (١) پارچە پێست. (تکەپوست)(٢) پێست دڕاو. (پوست پارەشدە)
پۆسپەنیر: [ناو] (١) خیگە؛ خیگەی پەنیر؛ (خیک) (٢) پیاوی زەبەلاحی قەلەوی پێ دەشوبهێنن. (تشبیەآدم چاق و خیکی)
پۆس پیاگرتن: [چاوگە،ت] پیاگرتنی پۆسی دەهۆڵ و دومبەک و تار و کەمانچە و دایرە و دەف(پوستانداختن)
پۆستاڵ: [ناو] (١) پۆس؛ پۆست؛ پێست؛ کەوڵ؛ ئیبار. (پوست) (٢) لەکوردستانی باشوور بە پۆتینی سەربازی دەڵێن پۆستاڵ. (پوتین)
پۆستچی:فرد:تد:فد:[ناو]پۆسەچی؛ چەپەر؛ نامەگەیێن. (پستچی)
پوستیئێکسپرێس: فرد؛ تد؛ فد: [ناو] پۆستێ کە بەخێرایی کار ئەنجام دەدا؛ پۆستی فەوری. (پست اکسپرس)
پوستی ئێلێکترۆنیکی: ئیمەیل؛ فرد؛ تد؛ فد: [ناو] جۆرێک پەیامنێر بە نووسین لەکامپیوتێرێکەوە بۆ یەکێکی دی. (پست الکترونیکی)
پۆستی دەرەکی:کاری بردنی نامە و بەستەی پۆستی بۆ دەرەوەی وڵات. (پست خارجی)
پۆستێر: [ناو] (١) لاپەڕەی وێنەدار بۆ ڕێکلام و چەسپاندن بە دیواردا. (پوستر) (٢) وێنەی گیراو لەدیمەن یا لە نەقاشی. (پوستر)
پۆستیژ: فرد؛ایتالیاد فد: [ناو]کلاوقژ؛ قژی دەستکرد. (پوستیژ)
پۆستیکارەبا: [ناو،ت] بنکەو جێگەی دابەشکردنی هێزی کارەبا. (پست برق)
پۆستیهەوایی: [ناو،ت]کاری پۆست بە فڕوکەکردن؛ هەروها پۆستی زەوینی؛ (پست هوایی)
پۆسخستن: [چاوگە،ت] (١) کاژخستن؛ کراژ فڕێدانی مار؛ پۆسفڕێدان.(پوست انداختن) (٢) هاتنەدەرەوەی پەپوولە لە قاپووڕی گەرا.(پوست اندازی) (٣ب)گۆڕان؛ هاتنەسەربارودۆخیکیتر.(عوضشدن)
پۆسڕنیای: [چاوگە،ت] پێست کلاشای، خوراندن؛ پێستڕنین.(خاراندنو خراشیدن پوست)
پۆسفڕێدان: [چاوگە،ت] (١) پێست فڕێدانی مار؛ کراژفڕێدان. (٢) پێست فڕێدانی برین؛ پێست لێبوونەوەی برین. (پوست انداختن) (٣) (ب) گۆڕان؛ هاتنە سەر حاڵێکی دی؛ ڕواڵەت گۆڕین و ڕەنگ گۆڕین. (عوض شدن؛ پوست عوض شدن)
پۆسکردن: [چاوگە،ت] (١) پۆستکردن؛

نامە خستنە ناو سندووقی پۆست یا بە ئیدارەی پۆست تەحویلدان. (پست کردن) (٢) (ب) دەست بەسەرکردن و خافلاندن و فریودان و ناردن بۆ جێگایێک. (پست کردن)

پۆسکەنن: [چاوگە،ت] (١) پێست لێکردنەوە؛ پێست داماڵین. (٢) هەڕەشە بۆ کەوڵکردن؛ دەستم پێت بگا کەوڵت دەکەم: پۆستت ئەکەنم. (پوست کندن)

پۆسکەنە: [ئاوەڵناو+ بەند] (١) پۆست داماڵاو؛ پێست لێکراوە و پاک‌کراو. (پوست گرفتەشدە)(٢) (ب) ڕاست و پۆسکەنە: پێست و پەردە لە سەرلابراو. بێپەردە، بە ئاشکرا و بێ‌شاردنەوە. (پوست کندە)

+ پۆشان: (١)[ڕابوردووی پۆشین] کردیانەبەر؛ پۆشایان؛ پۆشییان؛ (٢) ئەوانەی کە لەبەر دەکەن؛ (گوڵ چوون ڕووی ئازیز نزاکەت پۆشان). (مەولەوی) (پوشیدە. پوشیدند.پوشان) (٢) لیباس پۆشان: لیباس پۆشین لە بەرکردن. (پوشیدن)(٣) کراسی منداڵەکەیان پۆشان واتا کردیانە بەری. (پوشاندند)

پۆشاندن: [چاوگە،ت] (١) کردنە بەر؛ کردنە بەرکەسێ. (پوشاندن) (٢) داپۆشینی سوڕ؛ سەری شتێ داپۆشین. (پوشش دادن)

پۆشتەیی: [ناو] سازی و بەکەیفی؛ خاوەن لیباسی تەڕوتازە؛ حاڵەتی پۆشتەبوون. (شیک و مرتب بودن)

پۆشراو: [ناوبەر] (١) سەرنراوە؛ سەربەستە؛ بەر پیوار؛ داپۆشیاگ؛ وەشارتوو؛ شاراوە؛ شاردراوە؛ سەرسوڕ؛ سوڕ؛ لە نەهێنیدا. (پوشیدە) (٢) لەبەرکراو. (پوشیدەشدە)

پوشکووتن: [چاوگە] دەم‌کردنەوەی گوڵ؛ بشکفتن؛ پشکووتن. (باز شدن شکوفە)

پۆشنای: [چاوگە] پۆژنای؛ پۆشین. (پوشاندن)

پۆشەر: (١)[ناو،بک]کەسێک کەدادەپۆشێ؛ داپۆش. (پوشندە) (٢) پێداپۆشەر؛ سەرپۆش؛ ڕووکێش. (پوشش) (٣) کەسێ‌کە لە بەردەکا. (پوشندە)

پۆشمەنی: [ناو] جل‌وبەرگ (لباس)

پۆشی: (١)[ڕابوردووی پۆشین] کردیەبەر. (پوشید) (٢) [پاشگر] پۆشاندن؛ پەردەپۆشی، چاوپۆشی، تاوانپۆشی. (پوشاندن)

پۆشیدە: [ئاوەڵناو] (ف. گیو)داپۆشراو؛ شاراوە(پوشیدە)

پۆشێن: [ناو،بک]داپۆشەر؛ ئەوەی جل دە-کاتە بەر کەسێک. (پوشانندە.

پۆقە: [دەنگەناو] (١) دەنگی تەقینەوە(صدای انفجار) (٢) لەگەڵ تەقەدا دێ، تەقەوپۆقە، دەنگ و سەدای بەرز. (صدای بلند انفجار)

پۆکێ: بۆیێ؛ ئەڕا؛ لە بەرئەوە؛ پۆکێ‌گریا: بۆیێ‌گریا. (برای این)

پۆکێر: [ناو] جۆرێک یارییە بەپەڕەی(پەڕانتۆ) (پوکر)

پۆل‌بوار: [ناو،ت] ڕاوی سەرلەسبەینانی کەو لە سەرڕێگای کانیاو؛ ڕاوی پۆلە باڵندەی کۆچەری لەبەرەگەی گەڕانەوەیاندا لە گە-رمێن. (شکارکبک و پرندگان درراەچشمە و گرمسیر)

پۆڵکە: [ناو] پاقلەی کێوی؛ سێ‌جۆرە پۆڵکە خاتوونە و پۆڵکە گایانە دەخورێن و پۆڵکە

مارانه ناخوریٚ. (باقلای کوهی)
پولوٚتقـه:[نـاو]کلکـەسـووتیٚ. (١) کلـک ڕاتەکاندنی سەگ بەنیشانەی ڕەزامەنـدی و خوٚشەویستی. (٢) (ب) زمان لووسی و ڕیایی. (تملق؛ ریا؛ چاپلوسی)
پولووس: فد.اند. [ناو] پولوٚوس؛ئامرازیبـەدە- وردا چەرخینی تەگەری سەیارە. (پولوس)
پوٚلیپ: فرد؛ تد؛ فد: [ناو]گروڤـەرێکـی پایـە دارەکە لە سەردیوارەی لووت یان گەدە یـان ڕیخوٚلە گەورەیـان منداڵـدان پـەیـدا دەبـیٚ. (پلیپ)
+ پوٚلیس: فرد؛ تـد؛ فـد: [نـاو]کـوٚی هێـزی بەرپرسی هێمنایەتی لە وڵاتێکدا. (پلیس)
پوٚلیش:[ناو]تـوٚزی سـماتە لـە نـاو جوٚرێـک ماسڵەدا؛ بوٚ بریقەدارکردنی ڕەنگی سەیـارە و شتیتر. (پولیش)
پوٚلیش‌لێدان: [چاوگـە،ت] ڕوٚنـی پـوٚلیش بـە پەڕوٚ بە سەر ڕەنگی ڕەوغەنی وشکەوەبـوودا ساوین بوٚ بریقەداربوون. (پولیش زدن)
پوٚلیکـا: [نـاو] نێـوی توجـاڕەتیـی لوولـەی پلاستیکی، تایبەت بەلوولەکێشی پلاسـتیکە. (پولیکا)
پوٚلیکـوٚپی: فـرد؛ فـد: (١) [نـاو] ئـامرازی کوٚپیـەگـرتن. (٢) بـەرهـەمـیکوٚپیـەیئـەو کەرەستەیە. (پلی کپی)
پوٚلین: [چاوگە] دەسـتە دەسـتەکـردن؛ پـوٚل پوٚل‌کردن؛کوٚگاکوٚگا کردن.(کپه کپه کردن)
پوٚمپ:فرد.فد:[نـاو](١)ئـامرازیهـەڵکێشـانی ئاوەکی و با؛ ترومپای‌کارەبایی. (پمپ)(٢) لـە سەیارەدا بوٚ پـومپیئـاو و پـومپی ڕوٚن زیـاتر وشەی (واتر پمپ و ئوییل پمپ) بەکار دێنن. (پمپ آب. پمپ روغن)
پومپی بـا: [نـاو،ت] ئـامرازی بـا کردنـە نـاو تەگەری سەیارە. (پمپ باد)
پوٚمپیبێنزین: [ناو] (١) ئامرازی بێنزین کردنە ناو باکی سەیارە.(٢) ناوی جێگای فروٚشـتنی بێنزین. (پمپ بنزین)
پومپی ڕەنگپاشی: [ناو]کـەرەسـتەیێـک کـە ڕەنگی ڕەوغەنی و با تێکەڵ دەکا و بەگوشـار دیپرژێنێت. (پمپ رنگ پاشی)
پوٚنگ: [ناو] پەنگ؛ کوٚبوونەوە و گەڕانـەوەی تراوی بەرگیراو و ڕاوەستاو. (جمع شـدن آب رابسته)
پوٚنگاو: [ناو] پەنگاو؛ ئاوی بـەرگیـراو کـەکـوٚ بووبێتەوە و پـوٚنگی خواردبێتـەوە. (آب جمـع شدەپشت سد یا دیوار)
پونگـەڕێـوی: [نـاو]پنگـەڕێـوی؛ گیـای پونگەڕواس؛جوٚرێک نەعنـا؛ دژی زەردوویيـە کە نەخوشینی پەنمانی زاورە. (نعناصحرایی)
پوٚنیس: [نـاو] بزمـارێکی کـورت و باریکـە و سەری زوٚر پانە کە بە پاڵ پێـوەنـان دەچێتـە نێو تەختـە و دیـواری گـەچـی بـوٚ ڕاگرتنـی عەکس و کاغەز. (پونز)
پـوو: [نـاو] (١) پـووک؛ گوشـتی بـن‌ددان. (لثـه)(٢) پەڕوٚ؛ پووشوو؛ دەستەچیلـە. (کهنـە. برهود)
پووار: [ناو] گیایێکەکورتەبالاٚ خوراکی ئاژاڵـە. (اسم گیاهی است)
پووتانـــەوە: [چاوگـــە،ت](١) ڕووتانـــەوە؛ چڕووسانەوە؛ (لخت کردن) (٢) چرمسانەوە؛

لەتبوون و پچڕاندنەوە. (پارەکردن)
+ پووتک:[ناو](١)گول:خۆرە(مرض خورە؛ جذام) (٢) دەستگیرەی مدبەق. (دستگیرەآشپزخانە)
پووتەل: [ئاوەڵناو] پووچ؛ پووک؛ ناوخاڵی؛ بێ ناوەرۆک؛ بێناوک؛ پوچەڵ. (پوچ)
پووچاڵ: [ناو] پووشاڵ؛ پووشوپڵاش. (پوشال)
پووچانەوە: [چاوگە،ت] (١)پووکانەوە؛ کاغەزەکەی لە دەستیدا پووچاندەوە؛ نایلۆن ئاور دەگرێ دەپووچێتەوە: دەپووکێتەوە؛ لەپاڵیەک چوون و چکۆلە بوون و چرچ بوون. (کوچک شدن و هم رفتن مچالەشدن) (٢) (ب) کردن بە هیچ؛ پووچ کردنەوە. (پوچ کردن)
پووچەوبوون: [چاوگە،ت] پووچبوونەوە؛ (ب) بە هیچبوون؛ جێنەگرتن؛ لەڕۆژێکدا پارەکەی پرپووچ کرد؛ پووچبووەوە: پووچەوبوو. (پوچ شدن)
پووچەوکردن: [چاوگە،ت] پووچکردنەوە؛ بە هیچ بوون. (ب) خەرج کردنی بێجێ. (کنایە برباد دادن)
پووچی: [ناو،بەرهەمی چاوگە]خاڵیایەتی؛ پووچبوون؛ پووچایەتی؛ پووچێتی؛ پووچەڵی. (پوچی)
پووچی: [ناو،بەرهەمیچاوگە] بێناوەرۆکی؛ ڕەوتی بێناوەرۆک بوون؛ بەتاڵەت. (پوچی)
پوودی: [ناو] پدی؛ پدۆ؛ گۆشتی بنددان؛ پووک. (گوشت بیخ دندان)
پوورئایشۆکە: [ناو] پوورایشێ؛ ڕووەکێکی دڕکاوی ڕەنگ کەوەیە دەیدوورنەوە بۆ تایە و دانگۆی بزن. (نوعی خار بیابانی)
+ پوورت: (١) پۆرت. (٢) لەگەڵ هارت دێت، هارتوپوورت: شاتوشووت؛ هارتوهورت؛ خۆهەڵکێشان. (لاف و گزاف)
+ پوورە: (١) کۆم؛ کۆ؛ پوورەیاندابوو واتا کۆ بوونەوە؛ تەموورە. (جمع شدن)(٢)فد؛ اند: ڕەندەکراو و وردکراو؛ پوورەی سێف زەمینی؛ وردکراویدانەوێڵەی نیوەکوڵ. (پورە سیب زمینی)(٣) شڵخە و بەچکەی مێشهەنگوین و کوللە. (جمع شدن نوزادان زنبور(٤) پووری؛ بانگ کردنی پوور وەک پوورە ئامین. (صدا کردن عمە)
پوورەگوڵ: [ناو]گیای یاسەکەوە؛ لە باکووری سەقز زۆرە، دەرمانی کۆخەیە. (یاس بنفش)
پوورەهەنگ: [ناو،ت]شڵخەهەنگ.(جمع شدن زنبورهای عسل)
پووری: (١) بانگکردنی پوور. (صدا کردن خالەوعمە)٢)بانگکردنیژنیگەڕاوە بۆ ڕێزلێنان و بە پوور بانگ لێکردن.(خطاب زنان بعنوانخالە و عمە)
پووزپێچ: [ناو] (١) گیای بناوەتوم؛ بۆ نەخۆشینی باداری جومگە (ڕوماتیزم) و شەکەرمز کەڵکی هەیە.(٢) > مووس پێچ.(ساق پیچ)
پۆزکە: [ناو] لووتی ماسی؛ بابلیسۆک، لووتی-فیل.(دماغماهی؛خرتومفیل)
پووزەر: [ئاوەڵناو] پۆڕزەرد؛ قژ زەرد؛ موو زەرد. (مو زرد)
پووزی: [ناو]هەراوی؛ گوشادی؛ فشی. (گشادی)

پووژنە: [ناو،بک+ناو] پۆژنە؛ پۆشەر؛ داپۆشەر؛ پاکەت. (پوشاننده؛ پاکت)
+ پووشاڵ: [ناو] (١) پرووپووشاڵ؛ پووش و پلاش. (٢) دەمەڕەندەی دارتاشی بۆ قەراخ کۆلێڕی ئاوی.(پوشال)
پووشاڵی: فد: [ئاوەڵناو] (ب) درۆیین؛ خۆنەگرتوو؛ نەمەییو؛ بنبۆش. (پوشالی)
پووشبرنج: [ناو] (١) پێستی چەڵتووک. (پوست چلتوک) (ب٢) کاتی بارانبڕان. (ایام قطع شدن بارش باران)
+ پووشپەڕ: [ناو] (١)کاتی پەڕینی گوڵی گیا و وشکبوونی. (ایام خشک شدن گیاه)(٢) یەکەمین مانگی‌هاوین.(تیرماه)
پووشخستن: > پووش فرێدان.
پووشخورما: [ناو] گەڵای دارخورما؛ بۆقەرتاڵەچێکردن بەکەڵکە.(پوش خرما)
پووشدیان: [ناو]ئاژنەی ددان؛ چیلکەی ددان ئاژن. (خلال دندان)
پووشفڕێدان: [چاوگە،ت] (ب) بێمەیلی- کردن؛ لە بیر بردنەوەی دۆستی. (بی محبت شدن)
پووشی: > پووشوو.
پووشێت: فرد؛ فد: [ناو] دەستماڵێ کە بۆ جوانی لەگیرفانی بەرسینگی چەپی کوتی دەنێن و گوشەیێکی بەدەرەوەیە (پوشت)
+ پووک: [ئاوەڵناو]کفەڵ؛ قانگ.(متخلخل.)
+ پووکە: [ناو] (١)کەڕەگۆشە.(لوئی)(٢) قاپووڕ؛ قاوخ؛ پووکەفیشەک:قاپوڕە فیشەک. (پوکە)(٣)جۆرێ بەردی‌کفەڵ و سووک بۆ بانەناوی خانووبەرە. (پوکە)
پووکی: [ناو] پفەڵی؛ دژی پتەوی؛ کفەڵی. (متخلخل بودن)
پووڵبەفیرۆدان: پارەخەرجکردنی بەفیرۆ (ب)شتی بێکەڵک‌کڕین. (پول بباد دادن)
پووڵپەرس: [ئاوەڵناو] پووڵ پەرەست؛ ماڵ خۆشەویست. (ب) سەقیل؛ ڕژد؛ چکووس. (پول پرست)
پووڵ پەیداکردن: [چاوگە،ت] (١) پووڵ دۆزینەوە.(٢) (ب) کاسپی‌کردن؛ پووڵوە- دەستخستن؛ خاوەنی دەرامەت بوون.(پول پیدا کردن)
پووڵ ڕژاندن: [چاوگە،ت] (ب)لەپای مەبەستیکدا پارەی زۆر خەرجکردن. (پول ریختن بپای خواستەای)
پووڵکۆکردنەوە: [چاوگە،ت] (١)کۆکردنەوەی پارەیێک کە بەسەر بووک و زاوا دا دەکرێ (پووڵی زێڕوەشان). (٢) (ب) پاشەکەوت کردنی پارە و نیانە سەریەکی پووڵ.(٣) پووڵ خڕکردنەوە لای‌ئەم و ئەو بۆ کۆمەک‌کردن بەکەسێکی دەستتەنگ؛ خەرمانکردن. (پول جمع کردن)
پووڵگۆڕینەوە: [چاوگە،ت](١) پووڵی درشتە دان و پووڵی وردە وەرگرتن یا بەراوەژووی ئەوە. (پول عوض کردن)(٢) پووڵی بیانی- کڕین بەپووڵی ناوخۆ؛ یا بەراوەژوویی ئەوە. (تبدیل پول)(٣) (ب)یەکێ جەژنانە دەدا بە منداڵی کەسێک ئەویش جەژنانە دەدا بە منداڵی ئەوی دی. (تعویض پول)
پووڵگێران: [چاوگە،ت] کاسپیکردن بە پووڵی کەسێکی دیکەوە کە لە قازانجەکەیدا

بەش دەبا بەپێی بڕیار. (پول بەجریان انداختن؛ با پول کسی معاملەکردن)

پووڵلەپادا دانان: [چاوگە،ت] بۆگەیشتن بەئامانج یان مەبەستێک پووڵ ژماردن و خەرجکردن؛ هەتا عیلاجی نەخۆشیەکەی-کرا پارەییێکی زۆرم لەپادا دانا؛ تاکردم بە دوکتۆر پووڵێکی زۆرم لەپادا دانا. (پول بالای چیزی دادن)

پووڵلەسەر دانان: [چاوگە،ت] (۱) پارە خەرجکردن لە ڕێی دروستبوونیکارێک یا مەبەستێکدا. (در راەچیزی پول خرج کردن)(۲) بۆکڕینی هەر شت پارەخەرج کردن.(پول‌خرجکردن)

پۆنی: ژن لەحاڵەتیحەیزدا؛ ژنەکۆ مەهان-دەبت.(قاعدگی)

پووڵ و خۆڵ بەیەکزانین: (ب) بایەخ بە ما-ڵی دونیا نەدان.(کنایە(اهمیت بەپول‌ندادن)

پووڵو دڵیگیفانیٚ:گیلفان‌پووڵی.(پول‌توجیبی)

پووڵەسپی: [ناو،ت] لەڕابووردوودا قەرەپووڵی ئێران، بە تایبەت ۲ قڕانی و ۵ قڕانی بەشێ زۆری لە زێو بوو، ناوی پووڵەسپی بوو. (پول خرد قدیم)

+ پووڵەکی: [ئاوەڵناو] پووڵدۆست؛ پارەپەرەست؛ بۆ ماڵیدونیا حازر بە ئەنجامی کاری ناشایست بوون. (ب) کار بەدەستی بەرتیلخۆر. (پولکی)

پووڵەوردە: [ناو،ت] قەرەپووڵ؛ پەرەهووڕ. (پول خرد)

پووڵی: [ئاوەڵناو] ئەنجامیکارێک یان پێدانی هەر شت بە پووڵ؛ بەخۆڕاییە یا پووڵییە؟ واتا بەپووڵە. (پولی)

پووڵی: اند؛ فد: [ناو] جەغرێکی خولخۆر لە مۆتۆڕدا کە هێزی مۆتۆڕ بەتەسمە یان زنجیر دەخاتە سەر بەشێکی تری مۆتۆڕ. (پولی)

پووڵی پێشەکی: [ناو] (۱)کرێیخانووەکەت دوسەد هەزار تمەنە و یەک ملێون پێشەکی. (پول پیش) (۲) بێعانەی موعامەلە؛ دەهەزار تمەن پێشەکی وەرگرە ئەو فەڕشە ڕاگرە، مەی فرۆشە سبەینیٚ دێم باقی پارەکە دێنم و فەڕشە کە دەبەم. (پیش پرداخت)(۳) ئەوڕادیۆ دەکرم، سیهەزار تمەن پێشەکی دەدەم باقیەکەی بە قیست، مانگی دوو هەزار تمەن دەدەم (پیش قسط)

پووڵی حەرام: [ناو،ت] دراویٚ کە لە ڕێگای ناڕەواوە بەدەستدیٚ؛ پووڵی ناڕەوا؛ وەک سوود؛ (سووت). (پول حرام)

پووڵی حەلاڵ: [ناو،ت] پارەییێک کە لە ڕێگای ڕەوا وکاسپی و ڕەنجی شانەوە پەیدا دەبێت. (پول حلال)

پووڵی خوێن: [ناو،ت] (۱) خوێن بایی؛ بەهای خوێن؛ پارەی تاوانی کوشتنی کەسێک بە میراتبەر دان. (خونبها) (۲) (ب) پووڵی خوێنی بابی دەویٚ، بە فرۆشیاری زۆرگران فرۆش دەڵێن.(پول‌خون پدرش رامیخواهد)

پووڵیخەوتوو: پارەییێک خرابێتە حیسابی بانگ؛ پارەکەم لە بانگ خەواندوە. (پول خواباندندربانک) (۲)(ب) پارە یێک کە نە-کەوتبێتەگەڕ؛ پارەی ڕاگیراوی بێموفا و بێسوود و قازانج. (پول راکد)

پوولی‌درشت: دژی قەرەپوول؛ پارەی زور بەها؛ دراوی پڕبایەخ و ڕەقەم زۆر. (پول درشت)
پوولی‌کاغەزی: [ناو] پارەی قاقەز؛ ئەسکەناس. (اسکناس)
پوولیکێش: [ناو]کەرەستەی تایبەت بۆ دەرکێشانی پوولی لە جێگەی خۆی لە مۆتۆڕدا. (پولیکش)
پوولی نەغد: [ناو] پوول و پارەیێک کە بە دەستەوە بێ؛ (بەقەرزی نادەم بەپوولی نەغدی دەفرۆشم. (پول نقد)
پووە: [ناو]کەڕەپوو؛ گیامەترەق؛ گیای قامیشی کەڕەگۆشە،کەبەرەکەی دەکرا ناو گەچ بۆ ئەوە دوای گەچکاری نەقەڵەشێ. (لوئی)
پووەدای: [چاوگە،ت](۱) پێوەدان؛ داخستن؛ دەرکە داخستن. (بستن) (۲) پێوەدانی هەنگ و مار. (نیش زدن مار)
پوەڵەکارگ: [ناو،ت] قارچکی دار؛ قارچکە جنۆکانە؛ قارچکە جنانە؛ پیفێ،کە وشکەوە دەکرێ بۆ پووشوو. (غاریقون؛ قارچ سمی)
پویتە: [ناو] گرنگی؛ بایەخ؛ پویتە پێدان: حورمەت گرتن. (اهمیت)
پوینەچەرمە: [ناو]گیای‌پوینەچەرموو؛ پونگەسپیە؛ بۆنەخۆشینی‌گەدە و ڕیخۆڵە-باشە(نعنافلفلی)
پەپتوول: [ناو] تڵف؛ تلپ. (تفاله)
پەپوو تیاخوێندن: [چاوگە،ت] (ب) جێگای چۆڵ‌وهۆل؛ وێرانە. (کنایەاز برهوت؛ ویرانه)
+پەپووسێمانە: [ناو] (ف. ب) بوبووکەرە، پاپی‌سلێمونی؛ پوپی؛ پەپووسڵەمانکە؛ پە-پووسولەیمانە؛ پەپووسلێمانی؛ پەپووک؛پە-پووکەرە؛ هەپووک؛ دوونکول؛ دوونکل؛ سولەیمانۆ؛ شانەبەسەر(شانەبسر؛هدهد)
+ پەپوولەکلک: پڕپوولە؛ پەپوولە؛ نەخوشینی جەرگی ئاژاڵ. (کلک)
پەپەرک: [ناو] بەردە تراویلکە؛ زیخە شینە کە دەبێتە هۆی خەیاڵی دیتنی ئاو لە سارای زیخەڵاندا. (شنی کەمعلول‌دیدن‌سراب‌است)
پەتبڕ : [ئاوەڵناو] (۱) شێت؛ سەرەڕۆ؛ شێت و وێت؛ کەم ئاوەز. (دیوانە؛ بی شعور) (۲) نافرمان؛ یاخی؛ سەرکێش. (نافرمان)
پەتپساندن:[چاوگە،ت](ب)سەرکێشی‌کردن؛ نافرمانی‌کردن؛ کەڵەوەکێشی‌کردن؛ سەرەڕۆیی‌کردن؛ پەتبڕین. (نافرمانی)
+ پەتپەتی پێکردن: [چاوگە،ت] بەڵا بەسەر هێنان و عەزیەت و ئازاردان؛ ئەتککردن. (بلابسرآوردن)
پەترۆکە و زامی: [ناو،ت] قەتماغەی سەر برین. (قشر نازک روی زخم)
پەترۆڵ: فە؛ انە: [ناو] پاترۆڵ؛ دەستکەوتەکان لە نەوتەوە؛ وەک: بێنزین، نەوت، گاز، مازووت. (فرآوردەهای نفت)
پەترووی‌برین:[ناو،ت](۱)توێژ و قەتماغەی برین. (قشر زخم) (۲) گوشتە زوونی برین. (گوشت التیام زخم)
پەتشان: [چاوگە] پەتشین؛ داڕزان؛ دافلیقان. (پوسیدن)
پەتکراو: [ناوبەر](۱) پەت لە مل‌کراو. (طناب بر گردن آویختەشدە) (۲) ژی‌کەوانی-

کێشراوی ئامادەی تیر هاویشتن. (زەکشیدە)
پەتکەر: [ناو] (١) خاوەنی تیر و کەوان؛ تیرەنازی کەوان.(تیرانداز، با کمان) (٢) [ناو،بک] ئەوەی کەپەت دەکا و ڕستدەکا.(کسیکەطنابب‌ەگردن کسی می بندد) (٣) پەتچێکەر.(کسیکەطناب درست می کند)
پەت لە سەر داماڵین: [چاوگە،ت] (١) بەرەڵلاکردن.(٢) هەوسار لەسەر داماڵین؛ (ب) زیاتر بە تەڵاق‌دانی ژنی ئاکارخراپ دەڵێن.(افسار از سر بازکردن)
پەتۆت: [ئاوەڵناو] پرتووکاو؛ پوواو. (پوسیدە)
پەتۆن: [ناو] پشوو؛ بێهن؛ هەناسە. (نفس)
پەتوورە: [ئاوەڵناو] شڕ و پەتوورە؛ کۆن و شڕ؛ شڕ و پرتووکاو. (پلدسیدە)
پەتە: [ناو]پەتەک؛ کۆپۆن؛ کۆپین. (کوپن)
پەتەفینگە: [ناو] قۆچەقانی‌بەن؛ قلماسکە. بەرەقانیٚ؛ کەهینک. (فلاخن)
پەت هەڵخستن: [چاوگە،ت] (١)(ب)سێدارە تەیارکردن؛ سێدارە ئامادەکردن.(طناب‌دارآمادە کردن) (٢)تەناف گێڕان؛ تەناف هەڵبەستن بۆ هەڵخستنی جلی شۆراو. (نصب طناب)
پەتیس: [ناو] (ف. مشە) زەرەر؛ خەسار. (زیان)
پەتینە: فد: [ناو] (کۆژی ڕەنگکاریە) جۆرێک ڕەنگ‌کردنی تێکەڵ پێکەڵ؛ تایبەت بۆ دیواری خانوو. (پەتینە)
پەچەخووز: [ناو] ماڵات‌کردنە ناو جاڕ و زەوی لە بەر پشکەڵەکەیان کەدەبێتەکووت بۆ زەوی.(گلەداخل زمینکردن؛برای‌کودگیری)
پەچین: بەپاڵێدان. (با پازدن)
+ پەخ: [ناو] لارییێک کە لە گۆشە و پاڵوودا پێکدێ؛(١) پەرچ؛ وەک: پەرچدا دانەوەی بزمار؛ سەر داشکاندنەوە. (پرچ کردن میخ) (٢) پەخکردن: لابردنی پاڵوی دار یا هەر شت کە تیژبێت، گردەماسی‌کردن؛ کووڕکردنی گۆشە و پاڵوو. (کوژ کردن)(٣) لێژکردنی شوێنێ لە چاو دەور و پشتی؛ ماردووکردن؛ پشتەماسی‌کردن. (پخ)
پەخشای: [چاوگە] پەخشکردن؛ بەشکردن؛ بڵاوکردن.(پخشکردن
پەخشەر: [ناو،بک] پەخشکەر؛ بڵاوکەر. (پخش کنندە)
پەدمان: [ناو] پەیمان؛ عەهد؛ قەرار؛ لە ئاوێستادا (پەتمان) هاتووە. (پیمان)
پەراسووخوار: [ئاوەڵناو] (ب) دەغەڵ؛ درۆزن؛ فێڵباز. (حیلەگر)
پەڕانتۆ: [ناو] وەرەقی‌یاری؛پەڕەی‌قومار. (ورق‌بازی)
پەراش: [ئاوەڵناو] لەئاش‌کراو؛ هاڕراوە؛ وردوخاش. (ریز ریز)
پەراشتی: [ناو] پشت‌وپەنا؛ داشدار؛ لایەنگر. (پشت و پناە)
پەراش پەراش: [ئاوەڵناو] وردوخاش. (ذرەذرە؛ خرد خرد)
پەراف: [ناو] پەڕاو؛ قەراخ‌ئاو؛ کەناری‌زەریا.(ساحل)
پەڕانتوو: >پەڕانتۆ
پەڕانتێز: [ناو] دوو کەوانە ڕووبەڕووی یەک لەنووسراوەدا کە چەند ڕستە دەگرێتە بەر بۆ

ڕوون کردنـەوەی واتـا و جیـا کردنـەوەی سەربەخۆیی ڕەستەکـانی نـاو کـەوانـەکـان. (پرانتز)

پـەرانتێـز کردنـەوە: [چاوگـە،ت] دانـانی کەوانەیێک ڕوو بەچەپ؛ (پرانتێـز بـەستن: دانانی دوهەمین کەوان ڕوو بەڕاست) (پرانتـز باز و بسته)

پـەڕانـدراو: [ناو،بـەر] پـەڕێنـدراو؛ قرتێنـراو؛ پەڕیاو؛ پەڕیو. (قطع شده)

پەڕاندن: [چاوگە،ت] (١) قرتاندن؛ قرسـاندن؛ پەڕاندنی لقی دار بەداس؛ قەڵتکردن. (قطـع کردن)(٢) خستن؛ بـەرد پـەرانـی؛ خسـتن؛ پەرتکردن. (پرت کردن) (٣) نامـە پـەڕانـی، نامە ناردن؛ نامە گۆڕینـەوە. (نامـەپرانـی)(۴) قەڵەم پەڕانی؛ زیناحکردن(زناکردن) لـەسـەر لاچوون، مەستی لە سەر پەڕاندن. (مسـتی از سر پریدن) (۵) هەڵفڕانـدن؛ کـۆتر پـەڕانـی، بازپەڕانی، (کبوتر پراندن)

(۶) نێر بە سەر مێو گێڕان؛ پەڕاندنی ئـەسـپ لە مایین. (جفـت گیـری) (٧) قسـە لـە دەم دەرچوون؛ بە هەڵە لە دەمی پەڕی. (از دهـن در رفتن)(٨) توانج خستن؛ تەشەری بۆپەڕاند. (متلـک پرانـد) (٩) پێـنج تیـری پـەڕان، فیشەکـەکـەی پـەڕانـدە دەرەوە . (پـنج تیـر پەڕان)

+ پەڕاو: [ناو،بک+ ناو] (١) قرتاو (قطع شده) (٢) قەراخ زەریا؛ قـەراخ ئـاو. (سـاحل دریـا) ٣.پەرتووک؛ کتێب. (کتاب)

پەڕاوپەڕ: [بەند] سەرانسـەر؛ ئـەمسـەر تائـەو سەر؛ ئەم پەڕ تا ئەوپەڕ . (سراسر)

+ پەڕاوێز: [ناو](١) پەردوو؛ کورتـە دارەکـانی بەینی دەستەک و هەڵاش. (پوده)(٢) کەنارە؛ لێوار؛ حاشیە. (حاشیه)

پـەڕبـار: [ئـاوەڵنـاو] پڕبـار؛ زۆربـەسـەمـەر؛ پڕسەمەر؛ (پربار)

پـەڕبـەڵـەکـە: [نـاو] (ف. ب) تـۆرەمـەی پەڕبەڵەکە ،شەش جۆر باڵندەن، بە ناوی پـە- ڕبەڵەکە، سەقری مێش خـۆر، قجـی، قجـی بـەڵـەک، قجـی چـاوڕەش، چۆلـەکـەگـرە، (پەڕبەڵـەکـە، کـەحـەوت تیـرەن١- بـۆری بچـووک، ٢- بـۆری گـەورە، ٣- پاشـەڵ خەنەیی، ۴- پشت سوور، ۵- پشتشـی، ۶- سەرشی، ٧- قەشان)(سنگ چشم)

پـەرپتانـدن: [چاوگـە،ت] پێچانـدن؛ بـادان؛ کرژکردنی بەنی بادراو. (پیچاندن)

پەڕپووت: [ناو] (١) پەڕپووت؛ جۆری مـراوی. (نوعی مرغابی) (٢) کۆن و شـڕودڕ؛ (کهنـەو پاره) (٣) (ب) مرۆڤـی بـوودەڵـەی چکۆلـە. (کوتوله‌لاغر)

پەڕپەڕ: [ئاوەڵناو] (١) گوڵەکە پـەڕ پـەڕبـووە: هەڵوەریوە؛ کتێبـەکـە پـەڕ پـەڕبـوو: وەرەق وەرەق بوو؛ گەڵا گەڵا بـووە. (پـر پـر)(٢) (ب) مردنی لاوێک، یان ئازیزێک، گوڵەکـەم پـەر پەر بوو. (کنایەمرگ جوان)

پەڕپەڕۆچکە:[نـاو،ت]تـەشـقیعاسـمان.(اوج آسمان)

پەڕتاف: [ناو](١) لەرز و یاو؛ نۆبەتی. (تب)(٢) تیریژ. (اشعه‌خورشید)

+ پەڕتاوتن: [چاوگە،ت]قرتاندن؛ هـەڵبـڕین؛ هەڵپاچین؛ قەڵتکردن. (قطع کردن)

پەڕتەڤ: [ناو] پەڕتاڤ؛ پەڕتەو؛ تیشک؛ تیرێژ؛ ڕۆشنایی. (پرتو؛ اشعه)
پەرتین: [چاوگە] دڕان؛ دڕیان. (پارەشدن)
پەرجوو: مۆجزە؛[ناو] ڕووداوی سەیروسەمەرە ودوور لە پێوەری عەقڵ و مەنتیق. «گوڤاری‌مهاباد ١١٢» (معجزه)
پەرچڤاندن: [چاوگە،ت] هەڵمساندن؛ پەنماندن؛ با پێکردن. (باد کردن)
پەرچۆ: [ناو] تەرچۆ؛ مەهەدەر؛ کرمزی؛ مۆجیزە؛ کاریٚ‌کەلەدەس هەمووکەس نایێت.(معجزه)
پەرچە: [ناو] پەچە؛ هەڤێز؛ هەوێز؛ جێی خە-واندنی مێگەل. (جای خواباندن گله)
+پەرچەم:تد؛فد:[ناو](١)مووی‌سەرهەنیە. (موی پیشانی) (٢) بەیداخ؛ لیوا؛ بەیاخ؛ ئاڵا؛ بەیداغ؛ بەندێر؛ دروشمی مەملەکەت یان هێزی عەسکەری. (پرچم)
پەرچەمدار:)[ئاوەڵناو] [ناو](١) بەیداخ هەڵگر.؛ ئاڵاهەڵگر؛خاوەن پەرچەم (٢) بوونە ڕچە شکێن و ڕێبەر وەک کاوەی ئاسنگەر کە ئاڵاکەی پێشبەندە چەرمیەکەی بوو. (پرچمدار)
پەرچەمی چەرمگ: [ناو،ت]پەرچەمی‌سپی-نیشانەی‌تەسلیم‌بوون یا کۆڵدان یا یەخسیربوون و خۆ بە دەستەوەدانە. (پرچم سفید)
پەرچەمی سپی: [ناو،ت] پەرچەمی چەرموو. ئاڵای سپی؛ نیشانەی تەسلیم بوون.(پرچم سفید)
پەرخاندن: [چاوگە،ت] گەمراندن؛ نیوەکوڵ کردن. (نیم پختەکردن).
پەرخین: [چاوگە] داپڵۆخین؛ پیربوون و لە کار کەوتن؛ خراپبوون؛ زایەبوون. (از کار افتادن و پیر شدن)
+ پەرداخ: (١)[ئاوەڵناو] توند و تۆل و پۆشتە و ڕازاوە. (پرداختە)(٢)[ناو،بک] شتیٚ‌کە لووس دەکا؛ وەک، کاغەز پەرداخ. (صاف کن)
پەرداخ کراو: [ناو،بەر]گریٚ‌وگۆڵ لێبراو؛ لووس کراو؛ ئامادەکراو؛ تەیار. (ساختەو پرداختە)
پەرداخکردن: [چاوگە،ت] تەیارکردن؛ ئامادەکردن؛ لووس‌کردن و تیف تیفەدان. (مهیا و پرداختەکردن)
پەرداخی: تەیاری و گورجوگۆڵی و ئامادەیی. (آمادەو سرحال بودن)
پەڕداڵ: [ناو] سۆفار؛ پەڕی تیر. (پرانتهای تیر)
+ پەردە: [ناو] (ب) ڕەمز و ڕاز؛ سوڕ؛ سڕ؛ ڕاز؛ نهێنی؛ پەردەدار: ڕازدار؛ پەردەپۆش: سوڕپۆش. > پاردە. (راز)
+پەردە: [ناو] پەردەی‌تار؛ پەردەی پەنجێرە و درگا؛ پەردەی‌گویٚ؛ پەردەی نەقاشی، پەردەی شانۆ و سینەما؛ پەردەی کچێنی و پەردەی پا. (پردە)
+ پەردە: [ناو] سیٚ وشەی پەردیسی فارسی و فردەوس (فیردەوس)ی ئارەوی و (پاردۆس)ی هەرمەنی سەرچاوەیان وشەی (پەئیریدە ئیزە)ی مادییە بە واتای جەغزی دەورە دراو، کە لە کوردیدا هەمان پارێز و پە-رژین وپاردەیە؛ وشەی (پارازیسۆس)ی

یونانی واتا پارێس هەر لەو ڕیشەیە کە لە فارسیدابووە بە پالیز و لە کوردیدا بووەتە پارێز و پەرژین، و پاردە: باغ وبێستانی‌دەورە دراو بە دیواریا قوماش؛ زۆر بۆی هەیە ووشەی پە-ردە نزیکایەتی زۆری لەگەڵ(پاردە)دا هەبی. (پردە)

پەردە بەستن: [چاوگە،ت] (١) گرێدانی پەردە لە سەر دەسکی تار بەگرێی تایبەت. (پردەبستن) (٢) پەردە هەڵبەستن بە پە نجێرە و دەرکەدا. (آویزان کردن پردە)

پەردەپۆشی: [بەرهەمی‌چاوگە]بە ژێرلچەوەکردن و چاوپۆشی لە سووچ و گوناح و ئاشکرا نەکردنی هەڵەی کەسێک . (پردەپوشی)

پەردە پەردە: توێ توێ؛ توێژتوێژ؛ چەند پەردە دوابەدوای یەک. (پردەپردە)

+ پەردەدار:[ئاوەڵناو] (١) خزمەتکار.(٢)بە پەردەوە؛خاوەن پەردە.(٣) ڕازدار؛ سوڕدار.(٤) جێگای‌موتمانە بوون بۆ نەدرکاندنی ڕاز.(پردەدار)

پەردە دامالین: [چاوگە،ت](١) پەردە لێکردنەوە؛ (پردەکندن) (٢) (ب) ئابڕو بردن و ئاشکراکردنی‌نەهێنی(پردەدری)

پەردە دڕین: [چاوگە،ت](١) (ب) ئابڕو بردن و نەهێنی درکاندن.(رسوا کردن)(٢) لابردنی پەردەی کچێنی. (پردەبکارت پارەکردن) (٣) لابردنی دیواری نزاکەت لە بەینی دوو کە-سدا، بەکردەوەی بێ ئەدەبانە. (پردەحرمت دریدن)

پەردەکێشان: [چاوگە،ت] (١) هوڵێ بە پەردە گێڕان دوو کەرتکردن. (٢) شاردنەوە و نە درکاندنی نەهێنی؛ چاوپوشی لە هەڵە. (٣) سەر داپۆشین و قوماش یا هەر شت بە سەرداان. (٤) پەردەی پەنجێرە لادان یا بە سەر پەنجەرەدا دان.(پردەپوشی. پردەکشیدن)

پەردەلادان: [چاوگە،ت] (١) پەردە هەڵدانەوە یا بەلادا خستنی پەردە لە بەر پەنجیرە و دەرکە. (کنار کشیدن پردە) (٢) ئاشکراکردنی نەهێنی. (پردەاز روی چیزی برداشتن)(٣) پەردە هەڵدانەوە لە سەر تا پۆ یا ئاسەواری هونەری بۆ ئەوەڵین جار. (پردەبرداری)

پەردە لە سەرلادان: [چاوگە،ت] (ب) نەهێنی ئاشکراکردن. ڕوون کردنەوەی مەبەستێکی نادیار؛ خویاکردن. (پردەاز رو برداشتن)

پەردەنشین: لە توێی پەردە و نیانیدازیان؛ دانیشتن لە سەراپەردە (ژوور) و دەرنەکەوتن؛[ئاوەڵناو] (ب) ناسک و نازداری و پاکی؛ زۆر خۆ دەرنەخستن. (پردەنشین)

پەردەی ئاسۆیی: [ناو،ت] پەردەی کڕکرە؛ لە شکڵی پەردەی ئەستونییە بەڵام پاژەکانی کانزایی و باریک ترە و ئاسۆیی دادەبەسترێ. (پردەکرکرە)

پەردەی ئەستوونی: [ناو،ت] جۆرێک پەردەکە لە پاژگەلێکی درێژ چێ‌بووە و بە شێوەی ئەستوونی لە بەر پەنجەرە دادە-بەسترێت و بەتەنافێک بەسەر پەنجەرەدا دەکشێت یان دەکرێتەوە. (پردەعمودی)

پەردەی بووک و زاوا: (ب) ژووری‌کە زاوا و

بووک بۆ ئەوەڵێن جار لەو ژوورەدا پێکەوە دەبن. (حجله)

پەردەی‌پا: زۆربەی بوونەوەرانی ئاوی بۆ چاکتر مەلەکردن، لە بەینی قامکەکانیاندا پەردەیێک هەیە. (پردەپا)

پەردەی پەنجێرە: [ناو،ت] قوماشی‌کە دەدریٚ بە پەنجێرەدا بۆ دیارنەبوونی ناومالٚ لە دەرەوە. (پردەپنجره)

پەردەی تار: [ناو،ت] ریخۆڵەی با دراو (کات کوت) کە لە سەر دەسکی‌تار دەبەستریٚ؛ وە-ک ژی‌کەوانێکی باریک وایە. (پردەتار)

پەردەی‌چاو: [ناو،ت] هەریەک لەسیٚ‌تویٚژی دەروونی چاو. (پردەچشم)

پەردەی حەسیری: [ناو،ت] جۆرێک پەردە لە قامیش چنراو بۆ بەرگری لە هەتاو کە بە رووکاری دەرەوەی پەنجێرەدا دادەبەستریٚ. (پردەحصیری)

پەردەی سینەما: [ناو،ت] (١) جێگاییێک‌کە وێنەی فیلم دەکەوێتە سەری یا قوماشی سپیە یا دیواری‌گەچکاری‌کراوە. (٢) پەردەییێکە دەکەوێتە بەینی (جێگەی وێنەی فیلم کەوتنەسەر) و بینەرانی فیلم لە هۆلی سینەمادا. (پردەسینما)

پەردەی شانو: [ناو،ت] (١) پەردەیەکە لە بەینی ئەکتەرەکان و بینەراندا. (٢) بەشێکە لە شانۆ لە ماوەی هەڵدانەوە و دادانەوەی ئەو پەردەدا؛ شانۆکە لە سیٚ‌پەردەدا بەرێوەچوو. (پردەنمایش)

پەردەی کچێنی: [ناو،ت] بن؛ پۆسێکی تویٚژ ئاسای ناسک لە ناو شەرمی کچاندا کە بە هۆی زەربە و گوشار دەدرێت. (پردەبکارت)

پەردەی‌گویٚ: [ناو،ت] تەپڵی‌گۆش؛ تەپڵی-گویٚ. (پردەگوش؛پردەسماخ)

پەردەی مۆسیقا: [ناو،ت] ژمارەی لەرانەوەی (فرێکانسی) هەردەنگیٚ هەتا دوو بەرانبەر بوون دەبێتە یەک هەنگاو(ئوکتاو)کە لە مۆسیقای خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دابەش کراوە بە٧ پردە کە هەرپەردەیش بە بەشی چووکتر وەک دیێز و بێمۆل و سۆری و کورۆن دابەشکراوە. (پردەموسیقی)

پەردەی نزاکەت: [ناو،ت] (١) (ب) حورمەت ڕاگەتن لە بەینی دوو یا چەند کەسدا. (ادب نگەداشتن) (٢) لەتۆی پەردەدا، مەبەست درکاندن بە هێما. (پردە ادب)

پەردەی نەقاشی: [ناو،ت] (١) یەکەی ژماردنی تابلۆی وێنەگەری و نگارکێشی. (پردەنقاشی) (٢) قوماش یا تەختە یا هەر شت کە وێنەی لە سەر دەکێشریٚ. (پردەنقاشی)

+ پەرزان: [چاوگە] هەل و دەرفەت بۆکردنی کاریٚ؛ سەرم ناپەرژیٚ: فورسەتم نییە. (فرصت)

پەرژین‌هێنەر: [ناو،بەر]داڵدەخواز؛پەناهێنەر؛-ئەوەی کە پەنادێنیٚ. (پناهندە)

پەرژینی قایم‌بیٚ:(ب) نزاکەت لە بەینداییٚ؛بیٚ‌ئەدەبی نەبیٚ؛دوورلەڕووی‌مە-جلیس؛ بیلاتەشبی. (کنایەدور از حضور)

پەرسار: [ناو] پەرستار؛ پەرەستار؛ ئاگاداری نەخۆش؛ تیمارکەر و چاوەدێری نەخۆش. (پرستار)

پەرسوجۆ: [ناو،ت] (١)پرسوجۆ؛ جۆیابوون بە- پرس کردن لەم و لەو. (پرسوجو)(٢) بە دوادا گەڕان و جۆیابوون. (جستجو)
پەرسۆم: [ناو] پەیینکە؛ ئەو ئاردە کە بە گونکە هەویر یەوە دەکەن تا بە تیرۆک و پنەدا نەچەسپی.(آردیکەروی چانەخمیر میپاشند)
پەرڤەند: [ناو] دیواری بڵیندی بێستان و ڕەز. (حصار بلند باغ).
پەرکەم: [ناو](١)گلاراو؛ (چشمدرد؛ تراخم) (٢)فێ.(صرع)
پەرکێشان: [چاوگە،ت] (١) پەلی باڵ- هەڵکەندن؛ (پر بال چیدن)(٢ب)باڵ لێدان و هەڵفڕین. (پرکشیدن)
+ پەرگاڵ: [ناو] بنەماڵە؛ ماڵ و خیزان. (خانواده)
پەرگر: [ئاوەڵناو]لاگر؛ گۆشەنشین؛ خۆ لەخەڵک و جەماوەر دوورگرتن. (گوشەنشین)
پەڕگرتنەوە: [چاوگە،ت] (١)باڵگرتنەوە؛ هەڵفڕین. (پرواز کردن) (٢) (ب) لە خۆشیان باڵ دەرهێنان. (بال درآوردن) (پرواز کردن)
پەرگی: [ناو] تووش؛ بەیەک گەیین. (برخورد.)
پەرمان: [چاوگە] پەرمین؛ پەرمیان؛ لێڕادین و چاوەڕوانیکردن بۆ کردنی کاری. (باور و انتظاربرای انجام کاری)
پەرنساندن: [چاوگە،ت] ئەحیاکردنەوە؛ بووژاندنەوە؛ ژیاندنەوە (احیاکردن)
پەرنسین: [چاوگە] بووژانەوە؛ ئە-
حیاکردن.(احیاشدن)
پەڕنیان: [ناو] جۆرێ قوماشی ئاوریشمی نەرم؛ حەریر. (پرینان)
پەرواربەندی:فد:[ناو]کارورەوتی پەروار دابە- ستن؛ قەڵەوکردنەوەی ئاژاڵ بەشێوەی تایبەت. (پروار بندی)
پەرواسە: [ناو] پەراسوو. (دنده)
پەروا نەکردن: [چاوگە،ت] کۆنەکردن؛ نەپرینگانەوە؛ نەترسان؛ بێپەروابوون. (پروا نکردن)
پەڕوباڵ پێدان:چاوگە،ت](ب)ژێربالگرتن؛ دەست ئاوالەکردن بۆئەنجامی کاری؛ بەربۆشکردن. (پر و بال دادن)
+ پەڕوباڵ دەرکردن: [چاوگە،ت](١)(ب) گەورەبوون و بە خۆداهاتن. (بزرگ شدن بچە)(٢) (ب) لە کارێکدا سەرکەوتوو بوون و دەسەڵات پەیداکردن. کنایە. موفق شدن و قوی شدن)(٣) پەل لەسەر لەش و باڵی فرندە ڕوان. (پردر آوردن)
پەڕوباڵ دەرهێنانەوە: [چاوگە،ت] (١ب) بە- هێز بوونەوە؛ بە دەسەڵات گەیشتنەوە؛ (دوبارەبەقدرت رسیدن) (٢) فڕندەی باڵ- کراو کە بال دێنێتەوە. (دوبارەبال در آوردن پرندە)
پە ڕوباڵ قرتاندن: [چاوگە،ت] (١) باڵکردنی مەل بۆ هەڵنەفڕین؛ باسکۆکردن.(قیچی- کردن بال) (٢) (ب) لەقودرت و دەسەلأت خستن. کنایە(از قدرت انداختن)
پەڕوباڵ وەریو: [ئاوەڵناو] (ب) هەژار و بێدەسەلأت و لاواز بوو. (کنایە.ناتوان‌شدن)

پەڕۆشان: [ناو] پەڕۆی سەرشانی منداڵ؛ پەڕۆی دەم و لووت سڕینی منداڵ کە بە شانیدا دەی لکێنن. (دستمال روی شانەبچە)
پەڕۆشدار: [ئاوەڵناو] بەپەرۆش؛ خەمبار. (غمگین)
پەڕۆشدڵ: [ئاوەڵناو] دڵ بەخەم؛ جاڕز؛ دڵ بەپەژارە؛ دڵ پەرێشان. (دل پریش)
پەڕوشک: [ناو] پڕشە؛ پڕشکەی ورد؛ پرووشە؛ بارانی ورد و کەم. (قطرات ریز باران)
پەڕۆکردن: [چاوگەت] پینەپەڕۆکردن. (پینەکردن)
+ پەروەراندن: [چاوگە] (١) بارهێنان؛ تەربیەتکردن؛ ڕەعەمەل‌هێنان. (تربیت کردن) (٢) پەروەراندنی قسە و مەبەست؛ ڕێکوپێک‌کردنی وشە بۆ سەفرەنگ‌کردن و شروڤەکردنی بابەتێ بە جوانی و تەواوی. (پروراندن مطلب)
+ پەروەردە: فد: [ئاوەڵناو]عاملاو؛ بەخێوکراو؛ بارهاتوو؛ قۆرەپەروەردە: قۆرەی ڕەعەمەل هاتوو و بارهاتوو. (پرورده)
+ پەروەردەکردن: [چاوگەت] بارهێنان؛ بەخێوکردن؛ ڕاهێنان؛ پەروەراندن؛ عاملاندن؛ بەرهەم هێنان؛ ڕەعەمەل‌هێنان. (پرورده‌کردن)
پەروەردەکەردەی: [چاوگەت] پروەردەکردن؛ بارهێنان؛ پێگەیاندن؛ ڕەعەمەل‌هێنان؛ ڕەنێوهێنان؛ هێنانەنێو. (پرورده‌کردن)
+ پەروەرشت: [ناو] ڕەوتی بارهێنان. (پرورش)

پەروەرین: [چاوگەت] (١) پەل وەرین (پر ریختن)(٢) (ب) لە دەسەڵات کەوتن؛ لە هێز و قودرەت کەوتن و ئارام بوونەوە و لاواز بوون. (آرام شدن. ضعیف شدن)
پەروەنێ: [ناو+ بەند] پەسرپێر؛ سێ‌ڕۆژ لەمەو بەر. (پس پریروز)
پەروێز: (١) ناوە بۆ پیاوان. (اسم مردانە)(٢) [ئاوەڵناو] پیرۆز؛ سەر بەرز؛ سەرکەتی؛ سەرکەوتوو. (پیروز)
پەروین: فد[ناو](١)ئەستێرەی سورەییا(پروین) (٢) ناوەبۆ ژنان. (اسم زنانە)
پەڕەتیر: [ناو] پەڕی بەستراو بە بنی تیرەوە؛ سۆفار؛ پەڕدال.(پرماوک)
پەڕەجگەرە: [ناو]کاغەزی سیغار. (کاغذ سیگار)
پەرەزیلە: [ناو] مێوینەی گیا؛ پایەی سەرلینج و نەرم لە ناو گوڵی‌گیادا کە دەبێتە هۆی بەرهێنانی گیا و ئاوسبوونی. (کلالە)
پەرەستگە: [ناو] پەرەستگا؛ جێگەی‌عیبادەت. جێگای پەرەستن. (پرستشگاه)
+ پەرەسلێرکە: [ناو] (ف. ب) تەیرەبەڵەک؛ پزلگرد؛ پلۆزگردی؛ پلیزرگ؛ پلیسر؛ پلیسرک؛ پلیسرگ؛ پلیسری؛ پلیسگر؛ پولیسور؛ پەڕەستوو؛ پەڕەسلێرکە؛ پەرەسێلکە؛ پەرەسێولکە؛ حاجی حاجک؛ حاجی‌ڕەش حاجی‌ڕەشک؛ حاجی‌ڕەنک؛ دومقەسک؛ دومقەس. دومقەسۆک؛ حەجەجک؛ حەجحەجک؛ کە لە بن‌میچ و بەرقەدی شاخی بەرزدا بە قوڕ هیلانە سازدەکا. (چلچلەیا پرستو)

پەرەسە: [ناو] ڕیزە؛ ڕادە؛ پلە و پایە و مەرتەبە. (سطح؛ مرتبە)
پەڕەک: [ئاوەڵناو] نێرێک‌کە زۆر دەپەڕێت. (نری‌کە زیاد جماع میکند)
پەڕەمریشکە: [ناو] سیچقە؛ لەسەرما مووی لەش ڕاستبوونەوە. (مو سیخ شدن ازسرما)
پەڕەمووچە: [ناو] قەڵەمموو؛ قەڵەمی نیگار کێشی. (قلم مو)
پەڕەمێز: [ناو] پریمووس؛ چرای چێشت‌لێنانی نەوتی کە بەناسووس بای تێدەکری. (پریموس)
+ پەڕەناو: [ناو]کلوشی بەرپای گاگێرە هەڵگێڕانەوە؛ ژێر و ڕووکردنی کولۆش لە پێخویی‌گێرەدا. (زیر و رو کردن خرمن در وقت خرمنکوبی)
+ پەڕەوازە: (١)[ناو] باڵەوازە؛ پەرتەوازە؛بەچکەی مەل کە فێری هەڵفرین ببی. (اولین پرواز پرنده) (٢) (ب) دوورکەوتنەوەی کوڕوکچ لە ماڵی باب و هەریەک ڕوو بکەنە وڵاتی؛ (ب)هەلوەدابوون بە وڵاتاندا؛ تەرە و ئاوارە بوون بەوڵاتاندا. (آوارەشدن درغربت)
پەڕەی جەنجەر: [ناو] تێخی جەنجەڕ؛ ئەو پارچە ئاسنانەکەکولۆش ورد دەکەن لەگێرەی جەنجەڕدا. (تیغەخرمنکوب) پەڕەی‌گوێ: [ناو،ت] نەرمەی‌گوێ؛ جێگای گوارە ئاوێزانکردن.(نرمەگوش)
پەڕەی ماسی: [ناو،ت] باڵ؛ باڵەی ماسی. (بالە ماهی)
پەری‌ئەندام: فد: [ئاوەڵناو] بەژن‌پەری. (ب) ژنی جوان و ڕێکوپێک و چەلەنگ و شۆخوشەنگ و دەلال. (پری اندام)
پەڕیتانک: [ناو] پەرپەڕۆک؛ پەپوولە. (پروانە)
پەریخان: پەری‌خاتوون؛ پەری‌خانم؛ ناوە بۆ ژنان. (اسم دخترانە)
پەریی دەریایی: [ناو،ت] فرشتەی‌خەیاڵی کە تا کەمەر ئینسانە و خوارەوەی ماسییە.(پری دریایی)
پەریروو: فد: [ئاوەڵناو](ف. گیو) سەروچاو جوان. پەری‌ڕوخسار. (پری‌رو)
پەری‌ڕەشک:[ناو،ت]شەیتان؛ئەهریمەن. مەڕنەمووک. (ابلیس)
پەریز: [ناو] نێردیوان؛ پەینجە. (نردبان)
پەریزاد: فد: (١) [ناو] کچی‌پەری؛ لە پەری بوو (ب) کچی جوان. (پریزاد) (٢) ناوە بۆ ژنان. (اسم دخترانە)
پەریسا: فد: (١)[ئاوەڵناو] وەک پەری؛ پەری ئاسا؛ پەری‌شێوە.(پریسا) (٢) ناوی ژنانە.(اسم زنانە)
+ پەرێش: [ئاوەڵناو] پەشێو؛ پەرێشان. (پریش)
+ پەرێشان: (١) بۆیان. (برایشان) (٢)پەری شان؛ بۆشان و مەقام. (برای مقام) (٣)[ئاوەڵناو] ئاڵۆز؛ دڵ پەشێو. (پریشان) (٤)[ئاوەڵناو] پەراگەندە؛ پرش و بڵاو. (پراکندەو پریشان)(٥) ناوە بۆ پیاوان. (اسم مردانە)(٦) ناوی گۆلێکە لە خۆرهەلاتی ئێران. (دریاچەپریشان در شرق ایران)
پەرێشان‌حاڵ: [ئاوەڵناو] حاڵ شێواو؛ کەلەلا؛ ناتەواو؛ دەستکورت؛ بێتاقەت و هێز؛ زار؛

ناکۆک؛ لێقەوماو. (پریشان حال)
+ پەڕین: [چاوگە] (١) فڕین؛ باڵگرتنەوە. (پریدن)(٢) خۆ هەڵخستنەوە. (پریدن)(٣) داچلەکان لە خەو؛ لە خەو پەڕین: لە خەو ڕاپەڕین (پریدن)(٤) داچلەکان و ترسان. (یکەخوردن)(٥) پەڕینی نێر لە مێو. (جفتگیری)(٦) لێواری کاسەکە پەڕی؛ شکا. (پریدن)(٧) هەڵپەڕین:ڕەخس. (رقص)(٨) ڕەنگ برووسکانی دەموچاو یا ڕەنگی قوماش؛ ڕەنگ پێوە نەمان؛ڕەنگ پەڕین. (رنگ پریدن)(٩) بازدان؛ بەسەر جۆگەدا پەڕین؛ داپەڕین . (پریدن)(١٠) بەهەڵم - بوونی‌تراو. (بخار شدن مایع؛پریدن)
پەڕێنەر: [ناوبک] (١) فڕێدەر (پرت کننده)(٢) نێر بە سەر مێو پەڕێن. (سوار کننده‌اسب بر مادیان)(٣) دەپەڕێنیتەوە؛ نەجات‌دەدا. (نجات دهنده)(٤) دەقرتێنیٚ و سەری گیا دەپەڕێنیٚ. (قطع کننده)
پەڕینە قوڕوو: خۆراک چوونە ناو بۆڕیەی هەناسە؛ لە گەروو پەڕینی ئاویا خۆراک. (بەگلو پریدن)
پەڕینەکۆڵ: (١) سوار پشت‌بوون؛ سوار بوون. (بر پشت پریدن)(٢) (ب) زاڵ‌بوون. (غالب شدن)
+ پەڕینەوە: [چاوگە،ت] دەربازبوون؛ نەجات-بوون؛ لە سەربازی پەڕیمەوە؛ لە خەتەر پەڕیمەوە. (گذشتن. نجات پیدا کردن)
پەڕیوە: (١)[ڕابوردووی پەڕین] هەڵپەڕیوەتەوە؛ هەڵی خستووەتەوە. (پریدە. جهیدە)(٢) هەڵفڕیوە. (پرواز کردە) (٣)[ئاوە-ڵناو]هەلودا؛ دوورکەوتوو؛ سەرگەردان؛ ئاوارە. (سرگردان. آوارە) (٤) پەرداخەکە لێوەکەی پەڕیوە؛ واتا شکاوە لەت بووە. (پریدە)
پەزپەزەکێفی: [ناو] پەسپەسەکێوی؛ جاڵجاڵووکەیەکی بیٚ‌ئازاری‌کورکدارە.(نوعی عنکبوت)
پەزدی: [ناو] مێشولە؛ پێشکە؛ پەخشە. (پشە)
پەزشەن: [ناو] پەسند؛ پیاهەڵخوێندن؛ پەسندان و تاریف‌کردن، بۆی هەیە لە(پەسن) ی ئاوێستاوە هاتبێت. (پسند؛ مدح)
پەزکدانک: [ناو] هاوڵەی جەرگی ئاژەڵ. (نوعی مرض جگر حیوانات)
پەزەکێفی: [ناو] مەڕەسوور؛ مەڕەکێوی.(میش کوهی)
پەزی ڤەرگاش: [ناو،ت] پەزی چاوڕەش، پەزی بەرازی. (میش چشم سیاە)
+ پەژ: [ناو] پرژ؛ لق و پۆپ. (شاخەنازک درخت)
پەژاج:[ناو]ژنی یاریدەدەری تۆلدارلەکاتی منداڵ بووندا. (ماما)
پەژراندن: [چاوگە،ت]قسەوەرگرتن؛قبوو ڵکردن؛ وەرگرتن؛ پەزێران.(پذیرفتن؛)
پەژقین: [چاوگە] تراو بەسەرەوەنان و خواردنەوە؛ هەڵقوڕان؛ هەڵقوڕاندن. (هورت کشیدن مایعات)
پەژک: [ناو] پرژ؛ لقی سەرەوەی دار؛ پژ؛ پەشک. (ساقەهای بالای درخت)
پەژلاندۆک: [ناو] مووبەر؛ داڕو؛ دەرمانی

تووک‌بەر. (واجبی)
+ پەژم: [ناو] ئاڵشتە؛ سیخوار؛ سووخ؛ خووسار؛ خووس؛ زوقم؛ خویز؛ ئەڵماسە؛ سەرماوەردە؛ پەژ؛ وردە سەهۆڵ یا دەنکە بەفری زۆر ورد کە سبەینان بە ئارامی دێتەخوار لە هەوای زۆرساردا. (پژ)
پەژمینە: [ناو] پەژینە؛ کەروو؛ کەرەکیفە. (کپک)
پەژەڵ: [ناو] هەژگەڵ؛ لق و پۆپی وشک؛ چرو چیلکە؛ دڕکوداڵ. (ساقەهای خشک شدە)
+ پەژیک: پەژی نەرم و ناسک؛ خەڵف؛ لقی نەرم و شلی دار. (شاخەترد و تازەدرختان)
پەژینە: [ناو] پەژمینە؛ کەرەکیفە؛ کەروو. (کپک)
+ پەس: فد: (١)[ئامراز] بەس؛ ئەدی؛ دەنا؛ ئیتر؛ ئەی؛ ئاخر؛ پەس بۆچی ناڕوی، پەس بۆچی وای‌کرد. (پس) (٢)[دەنگەناو] تەس؛ دەنگ‌دانی کەڵ بۆ چوونە دواوە. (پس رفتن) (٣)[ناو] پاش؛ پەسمەنە: پاشماوە. (پسماندە) (٤) [ئاوەڵناو؛ پست،(پست)
پەسا پەسا: پەسای‌پەس؛ پەیتا پەیتا؛ لەسەریەک؛ گوڕایگوڕ. (پی‌درپی، متواليا)
پەساکردن: [چاوگە،ت] ئاو لێپڕشاندن و تەڕکردنی‌پێخوێی‌قوڕ؛ نماندن؛ فیساندن؛ خووساندن. (خیساندن)
پەسای‌پەس: یەک لە دوای یەک پەیتا پەیتا؛ یەک لە سەریەک. (پیاپی)
+ پەسبوون: پیرۆز نەبووگ؛ لەدواوەبوون لەقوماردا دۆڕاو؛ لەپاش‌بوون. (عقب بودن)

+ پەستان: [لەچاوگەی پەستاوتن] گوشاردان؛ گوشین؛ حاڵەتی ئەوشار دانەسەر. (فشردن)
پەستاو: [ناو] پاسا؛ پەسا؛ پەستاو دەرهێنان: قوڕ گرتنەوە بۆ خشت‌بڕین. (خازە)
پەست‌بوون: [چاوگە،ت] پێخوست‌بوون؛ سەرشۆڕبوون. (خوار شدن)
پەست‌کردن: [چاوگە،ت] نزم‌کردن؛ زەلیل-کردن؛ پاپەستکردن. (پست کردن)
پەست و بڵیند: [ئاوەڵناو] پەس و بڵیند؛ هەوراز و نشێو؛ چاڵوچۆڵ؛ بەرز و نزم. (پست و بلند)
پەستەکە فیشەک: [ناو] پەستەکێ‌کە فیشەکدانی لە سەر دروست‌کرابێت. (چوخەنمەدین با جای خشاب)
پەستەوان: [ناو] پسوولەی ئیجازەدان بۆ هاتوچۆ. (اجازەنامەعبور)
پەس‌چوون: [چاوگە،ت] بە پاشداهاتن؛ نکوول‌هێیان کەوتنە دواوە؛ ڕووەوکەمی-چوون؛دژی پێشڕۆیشتن. (پس رفتن)
پە سدان: [چاوگە،ت](١) بۆڕدان. (شکست دادن)(٢) پەس‌وەدان؛ دانەوە؛ (قەرز دانەوە). (ادا کردن) (٣) پاڵ‌پێوەنان و تەس دانی حەیوانی بەرزە. (عقب راندن)
پەس سەندن: [چاوگە،ت] (ف. گیو) پەس-سەنن؛ لێ‌سەندەوە؛ ئەستاندنەوە. (پس گرفتن)
پەسقەرەوڵ: [ناو] پاشقەرەوڵ؛چاودێری پاش سپا. (نگهبان عقبەلشکر)
پەسندکەردەی: (١)[چاوگە]ت بەدڵ‌بوون؛

جیا کردنەوە و بـەرگـەم‌کـردن.(پسـندکردن)
(٢) (ب) پەژراندن؛ لە پەرلـەمانـدا یاسـا کـە پەسەندکرا: پەژێردرا. (پذیرفته‌شده)
پەسـکەفـتن: [چاوگـە،ت] وەپـاش کـەوتـن کەوتنەدواوە. (عقب افتادن)
پەسمار: [ناو،بەر]شکایەت لێکراو. (متشاکی)
پەسن کراو: [ناو،بەر] (١) پەسەندکراو؛ پەسن- کریـاگ (پسـند شـدە) (٢) هـەڵبژێـراو؛ هەڵبژێردراو؛ بەرگەم‌کراو. (انتخاب شده)
پـەس و بلـن: [ئـاوەڵنـاو] پـەسـت و بلێنـد؛ چاڵوچۆڵ. (پست و بلند)
پەسـەر: پـەسـر؛ لـە پـێش؛ پـەسـەرپێـرێ: پەسرپێری؛ سێ ڕۆژ لەمەوبەر؛ پەسـر پێـرار؛ (پس)
پەسەند: فد: [ناو] پەسـند؛ پـەسـن؛ بـە دڵ ؛ پاشگر: هەڵبژێر: جوان‌پەسەند، گەن‌پەسەنـد، دێر پەسەند. (پیواژە)
+ پەسیسە: [ناو] کەڕەسیسە؛ وردیلەبـەفـری خڕ کـە لـە سـەرمـای زۆردا دەنـک دەنـک دەبارێ (پژ)
پەسیلە: [ناو] پەسیرە؛ بەرسیلە؛ قۆرە؛ هـاڵ. (غورە)
پەسیرەمارانە: [نـاو] بـەرسیلە مارانـە؛ قـۆرە مارانە؛ هاڵە مارانە. (نوعی غورەو انگور)
پـەشـتوو: [نـاو] خـومرە؛ دەفـری گـەورەی کاشی بۆ ترشیات و مورەبا تێکـردن.(خمـرە- کاشی)
پەشتەپەشت: [نـاو،ت]خولانـەوەی مرۆڤـی بێکارە لەکۆڵانان. (کوچەگردی انسان بیکارە)
پەشتە ویۆی: [ناو+ ئاوەڵناو] لە دوای یـەک؛
دوابەدوا؛ درێژەدار؛ دەوامدار؛ (سریال)
پەشـک: [نـاو] پرشـە؛ پرشـەی وردی ئـاو؛ پرشکە؛ پژکە؛ پریشک؛ پژگ. (پشنگ)
پەشکاپیس: [ئـاوەڵنـاو] پرشـکەپـیس. (ب) حەرامزادە. بیژوو. (حرامزادە)
پەشـلاندن: [چاوگـە،ت] پژانـدن؛ پرژانـدن؛ پرشاندن. (پاشاندن)
پەشلین: [چاوگە] پرش و بڵاوبوون؛ پاشین؛ پرشان؛ پرژان. (پاشیدن)
پەشمە: [ناو] ڕانک؛ پاتۆڵی لە بووزو چێکـراو. (شلوار از شال پشم)
پەشمەنە: [ناو] پەسمەنە؛ پاشماوە؛ پاشخوان؛ لە دوا بەجیماو. (پسماندە)
پـەشـەنـگ : پێشـاهەنـگ؛ سـەرجـەلـە. (پیشاهنگ)
پەشێوان: (١) پەشێویان (پریشان شدن) (٢) پەشێوگەل. (پریشانان) (پەشێواوە لە بەر پەرچەم پەشێوان). (نالی)
پەشێواندن: [چاوگـە،ت] ئـاڵۆزکردن؛ (بهـم- ریختن)
پەقلی: تەقلی؛ لەگەل؛ پێکەوە. (باهم).
پەقرەنج: [ناو] پەقرەج؛ دۆڵچە. (سطل)
پەقیان: تەقیان؛ تەقین؛ تـرەکیـان؛ پـەقـین. (ترکیدن).
پـەکـەری: [نـاو] غـەمگینـی؛ وەڕەزی؛ داگیراوی؛ قەڵسی. (پکری)
پەلاپیسکە: [نـاو] کرمـی نـاو گـەلای گیـا؛ پەلەپیسکە. (نوعی کرم آفت گیاه)
پەلاتە: [ئاوەڵناو] دواکەوتە؛ پاشماوی عەقلی. (عقب ماندەی ذهنی)

پەڵاتە: [ناو] سواڵ؛ دەست درێژکردنەوە بۆ یارمەتی؛ پاڕانەوە.(خواهش و تمنا)
پەلاتەمان: [ناو] (ف. گیو) مەجلیس؛ کۆڕ؛ جێگەی کۆبوونەوە. (انجمن)
پەلار: [ناو] پلار؛ تەشەر؛ تانووت؛ دارە دەست تێگرتن. (تشر زدن.پرت کردن چوبدست)
پەلاڤساوار: [ناو،ت] پلاوی ساوار؛ پلاوبرویش. (پلوی بلغور).
پەلاماردان: [چاوگە،ت] پیاهەڵپرژان و هێرش بۆ بردن؛ پەل هاویشتن و بەدەست گرتن؛ بۆچوون و گاز گرتنی سەگ. (حملەکردن. گرفتن)
پەلاندن: [چاوگە،ت] پەل‌بۆهێنان دەست- پێداساوین؛ دەستلێدان؛ دەست لێخشاندن. (دست زدن؛ لمس کردن)
پەلاوێژ: [ناو] ڕەوتی هەڵبەز و دابەزی (دە- ستی)ئەسب لە قەدەم و وێرغەدا؛ ئەو ئەسپە پەلاوێژی جوانە؛ پەل‌هاوێژ. (رقص پای اسب)
پەلت: [ناو] پەڵک؛ جۆرێک چنار. (نوعی چنار)
پەڵت: زمان شکان؛ توانای قسە بڕیان. (قدرت تکلم نماندن)
پە لچڤاندن:[چاوگە،ت]هاڕین؛وردکردن؛جیق دەرهێنان. (لەکردن. خرد کردن)
پەلچفین: [چاوگە] فلیقاندن؛ پلیشاندن؛ وردکردن. (لەکردن؛ خرد کردن)
پەلچموک: [ناو] شەمشەمەکوێرە. (خفاش)
پەڵخاندن: [چاوگە،ت] پەلخاندن؛ پلیخاندن؛ پان و فلچ کردنەوە. (لەکردن)
+ پەلخوڕ: پەڵخوڕ: [ناو] جۆی کوتراو بۆ مەڕ و ماڵات. (جو کوبیدەشدە)
+ پەڵخورد:[ناو]خەرمانی تەواو وردکراو و گێرەکراو. (خرمن خوب کوبیدەشدە)
پەڵخە:[ناو]پالاخی‌چووک؛پەڵخەگامێش: بەچکەی گامێش. (گوسالەگاومیش)
پەل‌دێز: [ناو]گەڵای مەیلەو تاریک و ڕەش؛ (وەک گەلای ڕەشەڕەیحانە) پەل‌دێزە. (برگ تیرە)
پەلسین: [چاوگە] مەلسین؛ وردوخاشکردن؛ هاڕین. (خرد کردن؛ پودر کردن)
پەلشاندن: [چاوگە،ت] پلیشاندن؛ وێرانکردن. (لەکردن؛ ویران کردن)
پەڵک:[ناو]بی چەرمگ؛سپیدار؛پێستەکەی دەرمانی زەردوویییە.(درخت تبریزی؛ سپیدار)
پەلکێش: [ناو،ت] (١) چاوساخی‌کوێر؛ دەسکێشی کوێر. (راهنمای کور) (٢) پنگرگر؛ مەقاش؛ ماشە. (انبر)
پەلکین: [چاوگە]گاوڵکێ؛ بەچوارپەل ڕۆیشتن. (چهار دست و پا رفتن)
پەل‌لووس: [ناو] قاپ و جگی پەل؛ زۆر لووسکراو. (شتالنگ خیلی سابیدەشدە)
پەل لەئاسمان‌کوتان: (١) (ب) ڕەوتی یاخی- بوون؛ کوڵنەدەری. (تمرد) (٢) لەخۆبایی؛ بەفیز؛ بەرزەفڕ. (خودخواە)(٣) (ب) ئەسپێ‌کە پەلاوێژی جوانە. (کنایەاز رقص پای اسب در قدم)
پەل لەئەستێرەکوتان: پەل لە ئاسمان کوتانی ئەسپ. (رقص‌پای‌اسب‌درحرکت)

پەلم: [ناو] قیز؛ بێز؛ قین؛ نەفرت.
(نفرت) > قیزوبیز بۆ ڕوون بوونەوەی دژواتا.
پەلۆشە: [ناو] گیای کوڵوو؛ لە بنەکەی بۆ سوتاندن کەڵک وەردەگرن. (گیاهی است کەریشەاش سوخت زمستانی است)
پەل وەشاندن: [چاوگە،ت] (١) دەست وەشاندن؛ (کسی رازدن) (٢) مەلەکردن بە دەست؛ (شنا کردن با دست) (٣) پەلەکوتێ و پەل‌کوتان. (کورمال کورمال)(۴) پەلەقاژێ‌کردن. (دست و پا زدن)
پەل‌هاویشتن: [چاوگە،ت](١) دەست و پێ جووڵاندنەوە و پەل فڕێدان لە مەلەدا. (شنا کردن با دست) (٢) دەست بەرزکردنەوەی ئەسپ لە ڕەوتی قەدەمدا. (رقص اسب با دست) (٣) دەست درێژی؛ تەجاووزکردن. (دست درازی)
پەلەبزووت: (١) سەلکە بزووت؛ سەرەسووت؛ دار دەست و تیلای سەر سووتاو. (چوبدست سر سوخته)(٢)دەست بزێوی. (دست درازی)
پە لە پسیاگ:لەحاڵەتی پەلەپسکێ‌کەوتوو؛ وەعەجەلەکەوتووو؛ وەپەلەکەوتوو؛ بەلەزی؛ بەتاڵووکەبووگ؛ بەپەلە پڕووزکێ. (بەعجلە-افتادە؛ شتابزدگی)
پەڵە پەڵە: [ئاوەڵناو](١) گوڵ‌گوڵ؛ (لکە-لکە)(٢) خاڵ خاڵ؛ بەهارە، کویستانان پەڵە پەڵەبوون؛ کاژوواژ. (خالخال)
پەلەپیتکە: [ناو](١) ئامرازی تەقاندنی چەکی گەرم؛ پەلەپیتکەی تفەنگ. (ماشە) (٢) پڵتۆک. پتە. (تلنگر)
پەلەپیتکە وەشاندن: [چاوگە،ت] پڵتۆک لێدان؛ (ب) پلارە قسەتێگرتن؛ تەشەر و تانە و تانووت لێدان. (کنایەطعنەزدن)
پەلەپیسکە: مێملێ‌گەڵای دار و گیا میشوولەی تۆی گەڵای‌دار.(آفتبرگ‌وگیاه)
پەڵەدار: (١) پنۆکدار؛ خاڵدار. (خالدار)(٢) پەڵە دار؛ دارستانی چکۆلە. (باغ کوچک)
پەلە دار: [ناو]کوتەدار؛ تیکە دار. (قطعەچوب)
پەڵەدان: [چاوگە،ت]ئەو بارستا بارانەیەکەزەوی دەخووسێنێ بە ئەندازەی یەک بست و نیو. (بارانی کەزمین را سیراب کند)
پەلەسوور: [ناو]گیای قومام؛ لە کوردستاندا زۆرە دەرمانی خوێن بەستی برینە. (اذخر؛ گورگیا؛ سنبل هندی)
پەلەشتبەر: [ناوبک] پەلەشت شۆر؛ گەمار لابەر؛ پیسی لابەر. (پلشت بەر)
پەلەفڕکێ: [ناو] (١) پەل‌کوتان؛ پەلەکوتێ؛ باڵ لێدانی مەلی سەربڕاو؛ باڵەفڕێ. (پرپر زدن)(٢) پەل فڕێ دان و دەست کردنەوە. (مقابلە)
پەلەکەرگ: [ناو] دارێکە بە ناوی باوەشێن. (درخت بفایج)
پەلەماشێ: [ناو] پەلەکوتێ؛ کوێرەکوێر ڕۆیشتن بە پەل‌کوتان. (کورمال)
پەل‌هوورک: [ناو] پەڕەی ورد؛ پەڕانتۆ. (ورق‌بازی)
پەڵەهەور: [ناو] تیکە هەور؛ لکە هەور؛ گەواڵە هەور؛ پارچە هەور. (لکەابر)
پەلیار: [ناو] ئەستووندەک؛ کوڵەکە. (ستون)
پەلیک: [ناو] هەلووک؛ هەلویک؛ پلیک.

(الک)

پەلیکانی: [ناو] هەلووکێن؛ پلیکانیٚ. (الک دولک)

پەماو:پاماو: [ناو] سافکردنی دیواری گەچکاریکراو بە لۆکەیتەڕ. (ساف کردن گچ کاری پاپنبەتر)

+ پەمبلۆکیٚ: [ناو]کەرەکیفە؛ کەڕوو. (کپک)

پەمگ: [ناو] پەموو. (پنبە)

پەمۆخ: [ناو] (۱) پەمۆغ؛ چێوپەمە. (چوب پنبە) (۲) دارێکی نەرمە کە پەمۆخی لیٚ-دروست دەکریٚ. (درخت چوب پنبە)

پەمووجاڕ: [ناو] جاڕی پەموو؛ کێلگەی پەموو. (پنبەزار)

پەمووی‌کێوی: [ناو] پەمووکێفی؛ جۆرێک پەمووی نەسۆچ؛ بە ڕیشاڵگەلی خۆشڕەنگ و نەرمەوە. (پنبەکوهی)

پەمووی نەسۆچ: [ناو] لۆکەی نەسۆچ؛ پەمەی نەسۆچ؛ لۆکەیێ کە لە بەرانبەر ئاوردا خۆڕاگرە و ناسووتیٚ. (پنبەنسوز)

+ پەن: [ناو] با؛ نەفەس؛ هەناسە؛ پەنمین: پەنمان: باکردن؛ پەنکە: باوەشین؛ پەنەموس: نەفەس‌بگرە؛(خەفە بە) پەنمی: بای‌کرد؛ ماسیا؛ بەم بەڵگانەی سەرەوە. بۆی هەیە پەن واتای (با) بدا. (باد؛ نفس)

پەنابەربوون: [چاوگە،ت] (۱) ژیان لە مەملەکەتێکی بێگانەدا بە ئیزنی ئەو دەوڵەتە و ڕەچاوگرتنی یاسای پێویستی پەنابەری.(پناهندەبودن)(۲) لە داڵدەی کەسێک یان دەوڵەتێکدابوون .(پناهندەبودن)

پەنابەری: [ناو] (۱) داڵدەخوازی؛ کار و ڕەوتی پەنا بردن بۆ دەوڵەتێکی بیانی بەهۆی کێشەی سیاسی یا هەرچی .(پناهندگی)

پەنابەری ڕامیاری: [ناو،ت] کەسیٚکە بە هۆی خەباتی (سیاسی) و دژایەتی لەگەڵ حکومەتی وڵاتی خۆی و دژوار بوونی ژیانی، پەنا دەباتە بەر دەوڵەتێکی بیانی. (پناهندەسیاسی)

پەنابەری کۆمەڵایەتی: [ناو] لەبەرتوندوتیژی و گیروگرفتی کۆمەلایەتی یان ئایینی یان نەبوونی هێمنایەتی، پەنا بردنە بەر وڵاتی بیانی. (پناهندەاجتماعی)

پەنادان: [چاوگە،ت] داڵدەدان؛ جێگاپێدان و خستنە ژێر چاودەێری و دابین‌کردنی هێمنایەتی؛ حاواندنەوە. (پناەدادن)

پەنار: [ناو] چاوگە؛ سەرچاوە؛ کارێز؛ کانی. (چشمە)

پەناسیلە: [ناو] قوژبنی خۆحەشاردان؛ جیگای نادیار و نە لە بەرچاو. (پناگاە)

پەناگە: [ناو] (۱) قوژبنی نادیار؛ پەناو پەسیوو؛ پەرگە؛ جیگای پەناگرتن؛ رەبەت؛ پەناگا.(۲) > ئیورگە. (پناهگاە)

پەنامکردن: [چاوگە،ت] پەنهانکردن؛ شاردنەوە؛ نادیارکردن؛ پەنام لە گۆڕینی (پەنهانی)فارسییەوەهاتووە بەڵام لە ڕەستەدا وەک (پەنامکردن و پەنامەکی‌زیاتر بەکاردەبریٚ. (پنهان کردن)

پەناهێنان: [چاوگە،ت] پەرزین‌خوازی؛ هاتن و داوای پاراستن‌کردن؛ هاتنە بەر داڵدەی پارێزەر. (پناەآوردن)

پەنج چاوگەی هۆش: >پەنج چاوگە ی هە-ست

پەنج چاوگەی هەست: (ف گیو) پێنج چاوگەی هۆش؛ پێنج هێزی:(١- بیستن ٢- بۆنکردن٣-هەستی دەستلێخشاندن. (پەلاندن)٤-چێژتن ٥- دیتن)(حواس- پنجگانه)

پەنجدەری: [ناو] پێنجدرگایی؛ ژوورێکی هە-راو بووە لە بینای قەدیمیدا، بە پێنج دەرکی دووتاییەوە. (پنجدری)

پەنج ڕۆژیعومر: دونیا پەنج و دوو ڕۆژێکە، ئیشارەیە بە پێنج ڕۆژ ژیان و دوو ڕۆژی هاتن و ڕۆیشتن. (پنج روزەعمر)

پەنج گەنج: (١) > پەنج چاوگەی هەست.(٢) ناوی کتێبەکانی نیزامی گەنجەوی (خەمسەی نیزامی) یە.(خمسەنظامی)

پەنجۆڵە: [ناو] (١) پەنجەی چکۆلە. (پنجەکوچک) (٢) پووکاوڵ؛ چەمۆڵە؛ (پنجەبازدست،روبکسیگرفتنبعلامتتنفر)(٣) پە نجەیحەیوانیدڕندە(ناخنو پنجەدرندگان)

پەنجولەژەن: [ناو]گیاپەنجە؛ لەکوردستاندا زۆرە و گیا (خاوێنی)یشی پێدەڵێن. (کف مریم)

پەنجەبۆکس: فد: [ناو] جی؛پەنجەی کانزا کە لەدەستی دەکەن بۆ مشت وەشاندن لە شەڕدا. (پنجەبوکس)

پەنجەتەلایی(ب)کارجوان.(پنجەطلایی)

پەنجەداڵ: [ناو]گیای (گوڵ ئارام) یشی پێ دەڵێن کە بۆ خەنازیل و چاو قووڵکە (بلفەتە، تاعوون) باشە. (مامیران)

پەنجەکەڵە: [ناو] تلیامەزن؛ قامکەگەورە؛ کەڵەموست؛ تبلامەزن؛ ئەنگووسەگەورە. (انگشت شصت)

پەنجەگیا: [ناو] (ف.گیا) تاقەگوڵ؛ گوڵێکی - پڕپەڕە بۆ زیپکەی دەموچاو باشە.(گل- صدتومانی)

پەنجەمۆر: [ناو] قامک بە ژێر نووسراوەدا نان لە جیاتی واژۆ. (انگشت زدن)

پەنجەمۆرکردن:[چاوگە،ت](١ب)پەژراندن؛ قەبووڵکردن .کنایە (قبولکردن؛ پذیرفتن) (٢)قامک پیانان لە باتی ئیمزا (واژۆ) (انگشت زدن)

پەنجە نەخشین:)[ئاوەڵناو+ ناو] (١) (ب) کەسێککە دەست ڕەنگین و هونەرمەندبێ. (هنرمند)(٢) ئافرەتی پەنجە نەخش کراو بەخەند؛ (دۆی چاو بە سورمە و پەنجە نەخشینم دەوێ) (هێمن). (پەنجەنقش ونگار دار)

پەنجەوانە: [ناو] (١) دەستکێش. (دستکش) (٢) جۆرێک دەستکێشی چەرمی کە دروێنە-وانان لەکاتی دروێنەکردندا، لە بەر دڕک و داڵ لە دەستیان دەکرد. (نوعی دستکش درو)

پەنجەوانەی بۆکس: [ناو،ت] دەستکێشێکی نەرم کە لە چەرم دروست دەکریٚ و ناوەکە-ی بەشتێکی نەرم دەئاخنن بۆ کێبەرکێی بۆکس، (شەڕەمشت) (دستکش بوکس)

پەنجەهەڵپێکان: [چاوگە،ت] قامکی دوو دەست لەیەک قوفڵکردن یا گرێدان (ب) مات دانیشتن. (نجەقفل کردن)

پەنجەی‌پا: [ناو] (١) لە قولاپە بەرەوخوار بـە قامکی‌پاوە.(پنجه‌پا)(٢) قامکی پاانگشت‌پا)
پەنجەی‌تار: [ناو] (١) جێگای ڕاگرتنی شەش (گوشی) پێچی کوک‌کردنـی‌تـار کـە سیمی تیٰ‌ڕۆدەچی و دەپێچـرێ؛ لـە دەسـتە بـەرەو ژووری تار. (پنجـه‌تـار)(٢) چیژنیکـی کـونی ئێرانیانە.(عیدباستانی‌ایرانیان)<پێنجەی تار.
پـەنجیـەک: [ئـاوەڵنـاو] لـەپێـنج بـەش بەشیٰ.(یک‌پنجم)
پەنچـەر: انـد؛ فـد: [ئـاوەڵنـاو](١) حاڵـەتـی تەگەری بادەر چوو؛(٢) (ب) پـەکـەر؛ جاڕز؛ دەسەوسان.(پنچر)
پـەنچـەرگـر: [ناو،بـک] وەسـتاییٚک کـە پەنچـەری لاستیکی تـەگـەر چـاک دەکـا. (پنچرگیر)
پەنچەرگرتن: [چاوگە،ت]کاروەوتی گرتنـی-کـونی تیـوپی تـەگـەری لاسـتیکی. (پنچـر گیری)
پەنچەری: فد: [ناو، بەرهەمی‌چاوگە]حاڵەتـی پەنچەربوون؛ کون بوون و بادەرچـوونی تـە-گەری سەیارە (پنچری)
+ پەندپێدان: [چاوگە،ت]کردنەپـەنـد؛ کـاریٚ بەسەردا هێنان کە ببێتـە دەرسـی تـەممـیٚ بوونی خۆی و دیتران. (بلا بسر آوردن)
پەنـد وەرگـرتن: [چاوگـە،ت] (١) لـە گـویٚ گرتنی ئامۆژگاری.(٢) تەممیٚ بوون و ئەزموون ومرگرتن.(پند گرفتن)
پەنزەهار: [ئاوەڵناو] شڵەژاو؛ پەشۆکاو. (هـول؛ آشفته)
پەنس: اند؛ فد: [ناو] (١) ماشـەی گچلـە، لـە مووچین گەورەتر. (٢) گیرە.(پنس)
پەنسی‌کاغـەز: [نـاو،ت] گیـرەی‌کاغـەز،کـە دەستەییٚک کاغەز دەگریٚ. (پنس کاغذ)
پـەنسـی‌نـەشـتەرکـاری: [نـاو،ت]گیـرە و ماشەییٚک‌کە لـە (کـاردۆژە) نـەشـتەرکاریـدا بەکاردیٚت. (پنس جراحی)
پەنکە: هیندد؛ فد: [ناو] پەن: واتا (با) پـەنکـە بـاوەشـیٚن؛ واژەن؛ بـاژەن؛ ئـامرازی فێنـک کردنەوەی کارەبایی. (پنکه)
پەنکەی‌دیواری: [ناو،ت] (١) پەنکەییٚک کـە بە دیواردا هەڵدەواسرێت. (پنکـەدیـواری)(٢) هەروا پەنکەی میچی؛ کـە ئـاوێزان دەکـریٚ بە میچەوە. (پنکه‌سقفی)
پەنگاندن: [چاوگە،ت] ڕاوەسـتاندن؛ ڕاگـرتن؛ ماتڵ‌کردن. (متوقف کردن)
پەنگرگـر: [نـاو] ماشـە؛ مقـاش؛ ئـامرازێکی کانزای دوو لقانەیە سکڵی ئاوری پێـدەگـرن. (منقاش)
پەنگرەئەستێرە: [ناو] گوڵ‌ئەستێرە؛ کرمێکـی باڵدارە لەتاریکیدا دەدەرەوشێتەوە.(کـرم‌شـب تاب)
پەنگزین:[چاوگە،]هەڵبەزینەوەی هـەر شـت کە بەتەوژم بە عەرزدا بدریٚ؛ وەک بـەرزەوە بوونی تۆپی یاری؛ هەڵسانەوە. (بلند شدن)
پەنگوئەن: فد؛ فرد؛ اند: [ناو] پـەلـەوەرێکـی ڕەش و سـپییە و نـاتوانیٚ هـەڵفرێـت، لـە ناوچەی ساردی جەمسەری باشـووری گـۆی زەویدا دەژی. (پنگوئن)
پەنگەپیش: [ناو] پیش خواردنەوە؛ قین و رک خواردنەوە؛ بەرتووڕەیی گرتن. (خودخوری)

پەنگەمووس: [ناو] (١) پەنەمووسی یەک جاری: خەوی یەکجاری (ب) مردن. (مردن) (٢) باکردن؛ پەنمین؛ ماسین. (باد کردن)
پەنگهین: (١) بافیشکردن؛ خۆ هەڵمسان (ب)فیز؛ دەمار. (تکبر) (٢) پۆنگ خواردنەوەی ئاو. (راکد شدن و برگشتن و جمع شدن آب)
پەنمای: [چاوکە] هەڵماسین؛ باکردن. (باد کردن)
پەنمیان: [چاوگە،ت] هەڵماسین؛ باکردن. (باد کردن)
پەنوموونی: [ناو] سینەپاڵوو. (زاتالریه)
پەنەزانای: [چاوگە،ت] پێزانین؛ پەیپێ بردن. (پی بردن)
پەنەکەوتەی: [چاوگە،ت] لێکالاّن؛ پێکەوتن؛ لێجوان بوون. (برازنده)
پەنیرە: [ناو] گیای تۆڵەکە؛ تۆڵەکێ؛ تۆڵک؛ قەرەتۆرە؛ نانەحاجیلە؛ پەنیرۆکە؛ نانی حاجی-لەقلەق؛ کولێرەچەورە؛ پەپەچەور؛ پەپکەچەور؛ گیانانەشان؛ کە لە سەقز و مەهاباد و شنۆ زۆرە. (پنیرک)
پەنیرەبوون: [چاوگە،ت] (١) کاتێ دانیدەغڵ شیرەی تێدی و هێشتا ڕەق نەبووە. (نیم رسیدەدانەغلە) (٢) بەردی نەرمی ناو زاور کە هێشتا ڕەق نەبووە؛ خواردنی شووتی لە خورێنی چارەی ئەو نەخۆشینەیە. (سنگ صفرای سفت نشدە)
پەنیری پاستۆڕیزە: [ناو] پەنیرێ کە لە دەفری سەربەستەدا هەڵیدەگرن وشیرەکەی پاستۆڕیزەکراوە. (پنیر پاستوریزە)
پەنیری پیتزا: [ناو،ت] جۆرێک پەنیرە دەیکەنە نێو پیتزا و خۆراکی جۆربەجۆر. (پنیر پیتزا)
پەنیری خیگە: [ناو،ت] وەک پەنیری کووپە وایە بەلاّم دەیکەنە ناو خیگەوە(پۆس پەنێر). (پنیر خیک)
پەنیری سەلک: [ناو،ت] دوای هەوێن کردنی شیر؛ دەیگوشن و لە بیچمی گونکە هەویر خڕی دەکەن و هەڵیدەگرن لە ئاوە کەی خوێدا، یا لە ئاو و خوێدا. (پنیر خرد نشدە)
پەنیری کووپە: [ناو] پەنیری جەڕە: پەنیری سەلک ورد دەکەن و لە جەڕەدا بە نهێنی دای دەگرنەوە و لە ژێر خاکدا دەیشارنەوە تا پاییز. (پنیر داخل کوزە کوچک سفال)
پەوچی: پۆکێ؛ بۆیێ؛ لە بەرئەوە؛ ئەڕا؛ لەبەرئەمە. (برای اینکە)
پەوکی: پەوچی؛ پۆکێ؛ پەوکەی؛ ئەڕا. بۆیێ؛ لە بەرئەوە. (برای اینکە)
پەوینە: [ناو] پەوێنە؛ پاوانە. (خلخال مچ پا)
+ پەهەتن: [چاوگە]پانکردنەوە؛ پێژان. (پهنکردن)
پەهڤان: ئاگاداری لاشانی لەشکر؛ ئێشکچیی لاپاڵی لەشکر. (پهلودار)
پەهلەوان پەمبی: پاڵەوان پەمووی؛ (ب) مرۆڤی زلی بێهونەری ترسەنۆک. (پهلوان پمبە)
پەهناوەر: فد: [ئاوەڵناو] (ف.مشە) پاناتی و فرەیی. (پهناور)
+ پەی: فد: [ناو] (١)ڕەگ وڕیشاڵ و چەقی گۆشت. (٢) ڕشتەی هەست پێکردن لە لەشدا. (٣) دوو سەری ماسوولکە. (٤) بناغەی

دیوار. (پی) (٥)بۆ؛ ئەڕا؛ پەی‌چێش: بۆچی.(چرا)
پەیاغ: [ناو]تێلاٚ؛ داردەستی قەوی. (چماق)
+ پەی‌پەی: [ئاوەڵناو+ بەند] پەیتاپەیتا؛ لە سەریەک؛ پاتکردنەوەی لە سەریەک. (پی دریی)
پەیجۆ: [ناو،بک] پەیجۆر؛ شوێن‌هەڵگر؛ شوینگێڕ؛ پەیدۆز. (پیگیر)
پەی‌چێش: بۆچی؛ ئەڕاچە؛ ئەڕای چی.(چرا)
پەیخام‌کیان: [ناو،بک] پەیغام‌نێر. (پیغام فرستنده)
پەیدۆز:)[ناو،بک] پەیجۆر؛ پەیجۆ؛ پەیخواز. (پیگیر)
پەی دیوار: [ناو،ت] خەندەکی‌دیوار. (فونداسیون. خندق دیوار)
پەیروون: [ناو] پیرۆزە. (فیروزە)
پەیژۆ: [ناو،بک] پەیجۆ؛ شوێن‌هەڵگر؛ شوێن-گێڕ. (پیگیر)
پەیڤاندن: [چاوگە،ت] قسەپێکردن؛ وەقسەهێنان. (بحرف آوردن)
+ پەیک:[ناو](١)پێک؛جۆرێک ئیسکان.(٢)پڕئەو ئیسکانە لەتراو.(پیک)
+ پەیکان: فد: [ناو] (١)سەرەتیر؛(٢) ناوی-سیارەیێکی ئێرانییە. (پیکان)
پەیێکانە: [ناو] پەیکان؛ نیشاندانی ڕۆیشتن بۆ شوێنی لە راستای نیشانەی ← دا سەرەتیر. (فلش)
پەیکەر: [ناو] بەدەن و ئەندام؛ لەش؛ پەری پەیکەر، غوول پەیکەر. (پیکر)
پەیکەر بەندی: [ناو،ت](کۆژی‌پەیکەر تاشییە) گەڵاڵە گرتن و سەقامگیرکردنی پاژگەلی سەرەتایی کەرەستەیێک،یان تاپۆیێک پێش ئەنجامی وردەکاری. (پیکربندی)
پەیکەرتاشی: [بەرهەمی‌چاوگە]کاری دروستکردنی تاپۆ؛ کۆتەڵ‌تاشی. (پیکر تراشی)
پەیکەنی؛ [ناو] رەوتی پەی‌کەندن؛ بن‌دیوار دانەوە؛ خەندەقی دیوار دانەوە.(کە لە پاشان بە بەرد و چیمە نتۆ پڕی‌دەکەنە وە) ئیمڕۆ باوە فۆنداسیۆنی پیدەڵێن. (خندق کندن)
پەیگر:)[ئاوەڵناو] پەیجۆ؛ پەیجۆر؛ دەرەدوا؛ شوێنگر؛دواگەڕ؛بەدوادا گەڕ؛ پەیدۆز؛ بە دوای کارێکا چوون؛ بەدووی‌کاری‌کەوتن. (پیگیر)
پەیگری: [ناو،بەرهەمی‌چاوگە]کاری پەیگر بوون و بە دوادا چوون و پەیدۆزی. (پیگیری)
پەی‌گێلان: [چاوگە،ت] پەیجۆری؛ بە دوادا گەڕان؛ تۆژینەوە؛ بۆگەران. (تحقیق)
پەی لێدان: > قاپ‌هاوێژی ولاٚخ. (پا بهم زدن در راەرفتن)
پەی‌مان: فد: (١) بۆمان؛ پەرێمان. (برای ما)(٢)پەی‌مان؛ بەدوامانـدا. (پی ما؛ دنبال ما)(٣) پەیمان؛ قەول و قەرار. (پیمان)
پەیمانە: فد: [ناو] (١) پەیک؛ پێک؛ پیاڵەی شەڕاب خواردنەوە. (پیمانە) (٢) کیلە؛ ئایەرە. (پیمانەاندازەگیری)
پەیمانی ئاشتی: فد: [ناو،ت] بەڵێن بۆ ڕاگرتنی شەڕ یا تەواو کردنی حاڵەتی شەڕ؛ پەیمانی بەین خۆشی. (پیمان صلح)
پەیمانی دۆستی: [ناو،ت] (١) بەڵێنی برایەتی

له بەین چەند نەفەردا. (٢) بەڵێنی دوو یا چەند لایەنە بۆ بەرقەرار بوونی دۆستایەتی و ئاڕ و گۆڕی فەرهەنگ و توجاڕەت و ڕامیاری و ئابووری لە بەینی دەوڵەتگەلدا. (پیمانی دوستی)

پەیمانی عەسکەری: [ناو،ت] بەڵێنی دوو یا چەند دەوڵەت بۆ هاوکاری سەربازی هەروها؛ پەیمانی ئابووری؛ ڕامیاری و فەرهەنگی و کۆمەلایەتی. (پیمان نظامی)

پەیناو: [ناو] پەیین تێکەلاوی ئاو کردن بۆ ئاودانی شیناوەرد، چەشنێک کووت پێدان. (نوعی کود دادن)

پەی نەدان: [چاوگە،ت] پا لەعەرز نەکەوتن لە ڕۆباری قووڵدا؛ (ب)بوارنەدان.(پابەعمق آب نرسیدن؛ بی گدار)

+پەیوەند: فد: [ناو] (١)موتوربە؛ موتربە. (پیوند) (٢)گرێدانی وەک:ڕابیتەی تەلەفۆنی و مارەبڕین.(ارتباط؛ عقد)

پەیینکە: [ناو] گەلاوگژی دار کە دەڕزیٚ و دەبێتەگیاخۆل (کووت). (وەک بەڕوو بە پەیینکەی ژێر خۆی دەژی) (فۆلکلۆڕ). (خاک برگ)

پەیینگە: [ناو] پەیینگا؛ سەرانگوێلک. سەلوێنک. (شوله؛ سرگینگاه)

+ پیٚ: [پێشگر] پێم نییە: بەمن‌نییە؛ پێت نییە: بەتۆنییە؛ بەوشتە، پێمردن: بەو شتە مردن؛ پێنازین: بەو شتەنازین. (پیشوند)

پیا: [ناو] پەیا؛ پیادە؛ نە بە سواری هیچ ڕۆیشتن. (پیادە)

پیا: [ناو]کورتکراوەی پیاو؛ پیا بەلیٚ؛ پیا دەی: پیاو دەی؛ پیا بەسە:(پیاو بسە). (مرد)

پیا: پێیدا؛ بەئەودا؛ بەوا؛ بەئەوا؛ نامەکەی پیابنێرە: نامەکەی پێدا بنێرە.(بوسیلەاو)

پیابوون: [چاوگە،ت] دابەزین؛ پەیا بوون؛ پیادەبوون. (پیادەشدن)

+ پیاچزان: [چاوگە،ت] (١) چزوو لێدان؛ هەنگەژاڵە پیاچزان؛ پێوەدان؛ پووەرەدای. (نیش زدن)(٢) (ب) لێدان و تە ممیٚ کردن. (تنبەکردن)

+ پیادە: فد: [ناو] (١)سواری هیچ نەبووە؛ (پیادە) (٢) هەشت سەربازی شەترەنج؛ (پیادە) (٣) لێفەکەی پیادە: داپۆشە؛ (بپوشان) (۴) ئەودارەی پیادە: لێیدە؛ (بزن) (۵) بەسەرردادان و هێرش بردنەسەر؛ پیادە؛ پیا بدە:بدە بە سەریدا: بەسەریا بدە: هێرش(هێڕش) بەرە سەری؛ (حملەکن) (۶) کارێکی بە موفایە خۆتی پیادە (پێدادە).(ریسک برای انجام کاری)

پیادەکردن: [چاوگە،ت](١) دابە زاندن. (٢) ئیجراکردن و داڕشتنی نەخشە و پلانیٚ بە ڕێوەبردن. (پیادەکردن)

پیاڕاکێشان: [چاوگە،ت] (١)دارێکی پیاڕاکێشا: لێیدا؛ پیادا. (زدن) (٢) پیاڕاکێشا:(ب) ئیلاقەی کرد؛لێڕاکێشان. (تجاوز کردن) (٣) لە پڵاو و گۆشت ڕاکێشان (ب) خواردن. (خوردن)

پیارزە: [ناو] پیاسکە؛ پیارسکە؛ پریاسکە؛ پریسکە؛ پرێسکە؛ بوخچە؛ تورەکەی چووک. (بقچەکوچک)

پیاڕۆیشتن: [چاوگە،ت] (١) بەرێگایێکدا ڕۆیشتن. (از راهی رفتن) (٢) ڕۆیشتنەناو؛ بە

ناوا ڕۆیشتن؛ تێوەچوون.(گذشتن از توی چیزی)
+ پیاز: فد: [ناو] (۱) پیازی کەوکەب؛ پیازی ؛ زەعفەران؛ سەلکی هەرگیاییێک کە وەک پیواز وابیٚ؛ (۲) بنی موو: پیازی موو. (پیاز)
+ پیاز پاککردن: [چاوگە،ت] فرمێسک داوەراندن؛ (ب) گریان و دلسۆزی بەڕیایی (پیاز پاک کردن)
پیازچە: [ناو] پیازی چووک کە لەگەڵ ساقەتەکەیدا هەڵدەکەندرێت بۆ خواردن؛ تەڕەپیاز بە سەلکەوە.(پیازچە)
پیازەکەولی: [ناو] پیازەمارانە. (پیاز کوهی)
پیازەگولە: [ناو] گیای پیازی ورچ؛ پیازی هورچ؛ بۆ نەخۆشینی ڕیخۆڵەی دوانزەگریٚ بەکەڵکە. (سورنجان. گل حضرتی)
پیاسرین: [چاوگە،ت]پیاساوین؛قوڕەکەی پیاسڕی: قوڕی تیوەدا: قوڕاوی کرد (آلودەکردن،باگل)
پیاقی: (۱) پیاوەتی؛ پیاوی؛ مەردی (۲) مەردانەگی؛ جوامێری؛ مێرخاسی. (مردانگی)
پیاکەوتن: [چاوگە،ت] (۱) بەسەر شەڕەکەدا کەوتم؛ ئاگام لە و میوانییە نەبوو پیاکەوتم؛ کەوتن بەسەردا. (روی چیزی‌افتادن اتفاقاًواردشدن) (۲) بەسەر ماڵ و میراتدا کەوتن.(مال ودارایی‌بکسی رسیدن)
پیا گەیشتن: [چاوگە،ت] (۱) خۆگەیاندن؛ لە ئاخری شەودا پیاگەیشتم و هاتمە داواتەکە. (رسیدن)(۲) بەکەسێکدا ڕاگەیشتن و ئاگالێبوون و چاودێریکردن. (رسیدگی)(۳) بەشی هەمووان کردن. (بهمەرسیدن)

پیا گەیین: [چاوگە،ت] (۱) چاودێری و ئاگالێبوون. (رسیدگی)(۲) بەشی هەمووان-کردن. (بهم‌رسیدن) (۳) فریا کەوتن. (بموقع رسیدن)
پیاگی: [ناو] پیاوی؛ پیاوەتی؛ جوامێری؛ (مردانگی)
پیاڵ: [ناو] پیاڵە. (پیاله)
پیام: [ناو] پەیام؛ پەیغام؛ ڕاسپاردە.(پیغام)
پیانۆ: ئیتالیاد؛ فرد؛ اند؛ فد: [ناو] پیانوو؛ جۆرێک کەرەستەی موسیقایە. (پیانو)
+ پیانووسان: [چاوگە،ت] گرتنی نەخۆشی؛ قۆخەڕەشەم پیانووسا؛ پیالکان؛ تووشهاتن؛ تووشبوون. (دامنگیر شدن)
+ پیاو : [ناو] زۆرجار واتای مرۆڤ بەخۆوە دەگریٚ، (لە تەمومژی چڕدا پیاو سەری لێدە-شێویٚ) واتا: ئینسان سەری‌لێدە شێویٚ. (انسان)
پیاوماقووڵ: (۱) پیاوی بەڕوومەت و بەحورمەت.(مرد معقول) (۲) ڕیش سپی و قسەزانی‌گوند و شار.(ریش سفید)
پیاوی کاریٚ نەبوون: (ب) لەدەست نەهاتن؛ شیاوی‌کردنی‌کاریٚ‌نەبوون. (مرد کاری نبودن)
پیاهاتن: [چاوگە،ت](۱) بەتوندی لۆمە کردن و سەر کۆنە کردن و بەزم پێگێڕان و بە سەر داهاتن؛ (سرزنش کردن)(۲) پەیتا پەیتا ماڵ لێدان و پیاهاتنی تانجی لە نچیر. (نزدیک شدن پشت سر هم تازی بەشکار)پێداهاتن؛ جۆگەکەم پاک کردوەتەوە بۆ ئاو پیاهاتن. (گذشتن) (۴) بەگژدا چوون. (حملە

ویرخاشکردن)
+ پیا هەڵکالآن: [چاوگـەت] تـوورەبـوون و دۆعا و نزا لێکردن. (عصبانی شدن و نفـرین کردن)
پیا هەڵگوتن: [چاوگـەت] تـاریف‌کـردن لـە شاییدا بەگۆرانی و شێعر؛ پەسنددان؛ تـاریف-کردن. (تعریف)
+ پیٚبڕان: [چاوگەت] (١) حاڵەتی پابڕین لە جێگاییێـک و سـەر لێنـەدان؛ پـیٚبـڕین؛ ئامووشـۆنەکـردن. (پـا بریـدن از جـایی)(٢) وەبەرکەوتن؛ پیٚبڕان. (سهم رسیدن)
پیٚبژاردن: [چاوگەت] (١)شماردنی شـتیٚ بـە کەسێکی‌تر (٢ب) قـەرەبـووی زەرەر و زیـان پـیٚ کردنـەوە.(١.وادار بـە شـمردن؛٢.تـاوان گرفتن)
پیٚبووکی: [ناو] پیٚبووکیٚ؛ پاکردنەوەی بووک بۆ ماڵی بـاوک؛ بـاوەخـۆن. (اولـین مهمـانی عروسی در منزل پدری)
پیٚ بەدە مـا بـردن: [چاوگـەت] قولاپـەبـە-دەمابردن؛ وەک سەگ گاز لە قولاپـەگـرتن؛ (ب) بێحەیایی و شەڕفرۆشی. کنایە(پاچەگـاز گرفتن)
پـیٚ بـەعـەرزەوە بـەنـد نـەبـوون:(ب) زۆر خۆشـحاڵ و خۆشـکەیـف لـە گـەیشـتنی خەبەرێکی خۆش یان ڕووداوێـک. کنایـە(پـا روی زمین بند نبودن)
پیٚبەقوونە: [نـاو] (ف. ب) جۆرێـک باڵنـدەی قەراخ ئاو. (پینج جـۆرن) (١)پـیٚ بـەقوونـەی سەر بەکلاوە.(کشیم بزرگ)(٢) پیٚ بەقوونـە-یچووک. (کشیم کوچک)(٣) پیٚ بەقوونـەی شاخدار. (کشیم گوش دراز)(٤) پیٚ بەقوونەی گـەردن ڕەش.(کشـیم گـردن سـیاه)(٥) پـیٚ بەقوونەی گەردن سـوور؛کە لاقیـان زۆر لـە پاش لەشیانەوەیە و لـە ژێـر ئـاودا بینـەیـان زۆرە. (کشیم گردن سرخ)
پیٚ پاراستن: [چاوگەت] پا بەسەردا نـەنـان؛ (ب) هۆشیار بوون بۆ بـەژێـر پـاوەنـەکـردن. (پرهیزازپاگذاشتن)
پیٚپان: پاپان؛پیٚزل.(پابزرگوپهن)
پیٚپرکیٚ: [نـاو] خـۆڵ بـەسـەر خـۆدا کردنـی فڕندە؛ چینـەکردنـی مـەل لـەخوڵـدا؛ پیٚپـڕە. (چینەکردن در خاک)
پیپـۆک:[نـاو]شووشـەی تراش؛کریسـتاڵ. (کریستال)
پیٚپەتی: [ئاوەڵنـاو] پیٚخـاوس؛ (ب) ئاسـمان لێف؛ بەرەڵلا؛ گەدە و گودە. (پا برهنه)
پیٚپەرخ: [ناو]دەلاک؛کیسەکێش.(دلاک).
پیٚپەست: [ئاوەڵناو] پیٚخوست؛ پاماڵ. (پامال)
+ پیت: فد: [ناو] دەفری تـەنـەکـە؛ دەفـری نەوت تێکردن؛ تەنەکەی نەوت؛ چەلـەنـگ؛ دەفری حەڵەبی ؛ بانکەی‌تەنەکە. (پیت)
پیٚتا پەڕیگە؟: پیٚتا پەڕیوە؟ پیاتاپـەڕیـوە؟ (ب) جنۆکـەت پیاهـەڵپـەڕیـوە؟ شـێت بوویـت؟ (دیوانەشدەای)
پیتاس: [ئاوەڵناو] تووکی‌سەر وەریـو؛ سـەری بیٚموو؛ تاس؛ هەویز. (طاس)
پیٚتاک: [ناو] پـوورە هـەنگ؛شـانک؛ خلێـف؛ قوونوو.(تجمع زنبور عسل؛ شانە؛کندو)
پیتاکدان: [چاوگەت] یارمەتـی‌کـردن؛ ئـە-

ڕکی‌مالی (پووڵی) ئەداکردن (کمک کردن).
پیتاندن: [چاوگە،ت] بەرەکەتدارکردن؛خەنی-کردن؛ بەپیتکردن؛ دەوڵەمەنەکردن؛ وەک پیتاندنی‌ئۆڕانیوم. (غنی سازی)
پێتقی: پێویست. (لازم)
+ پیتگ: [ناو] شەنگەبی؛ شوۆڕەبی. (بید مجنون)
پێتەزک: [ناو] بەفرەچاڵ؛ یەخچاڵ؛کونە بەفر. (یخچال)مەبەست(سەلاجە)نییە
پیتێک: (۱) [ناو] یەک پیت لەئەلفوبێ. (یک حرف) (۲) تۆزێ؛ کەمێ. (کمی)(۳) یەک چەلەنگ؛ یەک حەڵەبی. (یک حلبی)(۴)[ئاوەڵناو] پاقژ؛ پاک؛ خاوێن؛ تەمیس. (پاک؛ تمیز)
پیجامە: [ناو] لیباسی تەنکی نێومال؛ پیژامە. (بیژاما)
پێجێ: (۱) [ناو] جێگەی پێ (۲ب) کاتێکی-کەم چرکەیێک؛ دەمێ. (جای‌پا.لحظه‌ای)
+ پێچ: (۱) [پاشگر] هەر شتێک کە تێدەئاڵێت. موس‌پێچ؛ پاپێچ؛ مەچەک‌پێچ؛ مل‌پێچ؛ (پیچ)(۲)[ناو] جەڕ. (پیچ)
+پێچ: [ناو] (۱) جەڕ. (پیچ)(۲) ناڕاست؛ خوار؛ لار. (کج)(۳) ژان و ئێشی سک. (درد شکم)(۴) (ب) فڕوفێل؛ زۆر بە پیچ. (حیله)(۵) خول؛ سووڕ. (پیچ)
پێچاف: [ناو] هەنیە؛ نێوچاوان. (پیشانی)
پێچاقک: [ناو] قووڵکەی چاو؛ کالانی چاو؛ قاپیلکی چاو؛ قووتەی چەمێ. (حدقه)
پێچاڵ: [ناو](۱) کەسێک‌کە لە پای چاڵ‌دایە، لە کایەی چاڵێندا. (پای‌چال)(۲) چاڵی ژێر سندان لە ئاسنگەریدا. (گودزیر سندان)
+ پێچان: [چاوگە](۱)پێچاندن؛ شێوان؛شێواندن؛(سەرلێ شێواندن بە پرسی زۆر لێکردن؛ بە لێپرسینی زۆر تەنگاو کردن). (پیچاندن)(۲) تێ‌ئاڵان؛ بە دەوردا ئالاندن.(پیچیدن)(۳)لادان لەرێ؛ وەرسووڕان و پێچان بە لای چەپ یان ڕاستدا. (پیچیدن)(۴) سەری پێچ بادان. (پیچ دادن)
+ پێچانەوە: [چاوگە،ت] (ب) بەستنی دەرکەی ڕیخراوێک و تێکدانی بیسات؛ پێچانەوە؛ ئاشبەتاڵ پێکردن؛ بار پێچانە وە (پیچیدن)
پێچ بادەر: [ناو] جەڕەبادەر (پیچگوشتی)
+ پی‌چرا: (۱)[ناو] بەرزاییێک کەچرای لە سەر دادەنرێت؛ پایەی‌چرا. (جا و پایەچراغ)(۲))[ئاوەڵناو] (ب) بە مرۆڤی کورتەباڵا دەڵێن. (کنایی کوتول (۳) پارەیێک کە قومار بازان بە خاوەن قومارخانەی دەدەن. (شیتیل)(۴)پێچرا؛ پێچراوە؛ ئالا؛ ئالیا؛ ئالۆزرا.(پیاپێچرا: پیائالا). (پیچیدەشد)(۵)تووشبوون؛ نەخۆشینم پیاپێچرا.(دچارشدن)
پێچک: (ف. گیا) [ناو] گیای لووشە لەکوردستاندا باوە دەیکەن بە دۆخەوا؛ دژی کرمی ڕیخۆڵەیە. (کرمی ئاسکاریس و کرمەک) (والک)
+پیچکردنەوە: [چاوگە،ت] (۱) (ب) قسەگۆڕین و بادان بۆ سەر مەبەستێکی دی.(پیچاندن صحبت)(۲) لادان بەلای ڕاست یا چەپ لە ڕێگادا.(پیچیدن از راه)(۳)

جەڕ شلکردنەوە یا دەرهێنان.(بازکردن یا شل‌کردن پیچ)(٤) مێزەر لە سەر کردنەوە. (پیچ و عمامەازسر بازکردن)

پێچوتاو:[ناو،ت](١) پێچ و باو؛ پێچ و قەمچ؛ پێچ وخول؛ ئاڵقە ئاڵقەبوونی زولف. (پیچ و تاب) (٢) بەناز و خۆ بادان بە ڕێگادا ڕۆیشتن. (پیچ و تاب)

پێچۆز: پچۆز؛ خوداحافیزی؛ بە دۆعا. (خداحافظ)

پێچوقەمچ: [ناو،ت](١) (ب) فڕوفێل (حیله)(٢ب) لار و لەنجە.(قروغمره)(٣) پێچی لە سەریەکی کۆڵان و چۆم و... (پیچ در پیچ)

پێچوواندن: [چاوگە،ت] (١) وێچوواندن؛ پێ-شوبهاندن (تشبیه‌کردن)(٢) لەڕکردن؛ لاواز کردن؛ (لاغر کردن)

+ پێچوون: [چاوگە،ت] (١) لە ڕبوون؛ لاواز بوون؛ (لاغر شدن) (٢) درەنگ‌کردن؛ لەمیوانی زۆری پێچوو: وەدرەنگ کەوت (دیر کردن)

پێچە:[ناو]گیای‌نەرمیلی‌لەکتێبی(تەقویم لئەبدان) دا هاتووە کە بۆ دڵ و جورئەت پەیدا کردن باندوری هدیە و باسی دەکا لە شەڕی ئەسکەندەر لە ناوچەی پیرانشاردا سەربازەکانی کورد بە خواردنی پێچە چاکتریان شەڕدەکرد؛ ئەویش هۆی ماکێکی وەک (پیکرو تۆکسین)ەکە جورئەت زیاد دەکا. (سداب)

پێچەک: [ناو](١) هەر شت کە ببێتە هۆی پێچ دان وەک پێچەکی گوریس لە بار کردندا، پارچە دارێکی کورتە کە گوریسێ پێتونە دەکەن. (پیچک)(٢) هەر شت کە بپێچرێ بە دەوری شتێکی تردا. (پیچک)

پێچەکدان: [چاوگە،ت] شەتەکدان؛ شە-داندن؛ پێچاندنەوە.(ب) دەست بەستن و ڕاماڵین و بردن.(گلولەپیچ‌کردن وبردن)

پێچەنە: [ناو] دەسرازە؛ پەتێکە پان بۆ پێچانەوەی منداڵ‌لە بێشکەدا.(قنداق‌پیچ گهوارە)

پێچیلە: [ناو] موورگەگیا؛ مووروەگیا؛ لەعیلاجی شەکەر مزدا کەڵکی هدیە. (گل لادن)

پێدافسین: [چاوگە،ت] سووار بودن و جووت بوونی فڕندە .(چسیدن پرندە)

پێداف: [ناو] تەڵە؛ داو؛ تەپکە. (تلە؛ دام)

+ پێداگرتن: [چاوگە،ت] (١)شتێک‌لە سەر ڕەفحە و بەرزایی پێهێنانە خوار. (پایین آوردن‌چیزی‌توسط‌کسی) (٢) پا لە سەر پاشبارە دانان بە نهێم بۆ زیاتر چەقینی گاسن. (با پافشار دادن انتهای خیش)(٣) پێ چەقاندن و سوور بوون لە سەر مەبەستێ. (پافشاری) (٤)پێداگرتن؛ بەرگ و مەلافە(چەرچەف) بە سەرسەرین و دۆشەکداگرتن. (ملافە وجلدکردن)

پێداڵ: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] جێگای پێ لە سەر دانانی بەرپێی شوفێری سەیارە؛ پێداڵی‌گاز، پێداڵی‌تورمز، پێداڵی‌کلاج. (پدال)

پێدانان: [چاوگە،ت] (١) پێ دانان؛ پێدانانە سەر بەردەباز؛ ددان پێدانان: پاڵێنان. (پاگذاشتن)راست گفتن)(٢) بەکەسێک دۆڕاندن. (باختن)(٣) ددان ئێشە بە دەوا

پێدانان ئێشی ناشکێ:(لە سەردانان) و پێوەچەسپاندن؛ (گذاشتن روی) (۴) گۆزە پێدانانە عەرز. (اجباراً کوزەاش را زمین گذاشتن)
پێداهێنان: [چاوگە،ت] پیاساوین و لێخستن؛ پەلاندن؛(سائیدن روی چیزی)(۲) ئەو لقەدارەی پێ داهێنا: پێدانەواند. (بەکسی خم کردن)(۳) قژەسەر بە شانە داهێنان. (مو شانەکردن) (۴) شتێ بەکەسێک هەڵگرتن و پێهێنان. (آوردن چیزی بوسیلە کسی دیگر) (۵) موور یا تەختە بڕینەوە بە کەسێک یان بە شتێک؛ بە مشار دارەکەی پێ داهێنا؛ (چوب را با ارەبریدن توسط کسی،یاچیزی)
پێڕازی‌بوون: [چاوگە،ت] پێخۆشبوون؛ پەسن‌کردن و پەژراندن. (بەچیزی راضی بوون)
پێڕاگەیاندن: [چاوگە،ت]ئاگادارکردنەوە و خەبەر پێگەیاندن. (خبری بەکسی رساندن)
پێڕاگەیشتن: [چاوگە،ت] پێڕاگەیین؛ چاودێری‌کردن و خزمەت‌کردن. (رسیدگی کردن)
پێڕاگەیێن: [چاوگە،ت] خەبەرپێدەر؛ ئاگادارکەر. (آگاەکنندە)
پیران‌کردن: [چاوگە،ت] (۱) دڵ بووردنەوە. (بیهوش شدن) (۲) مناڵەکە پیرانی‌کردوە لە بەرگریانی زۆر ڕەش و شین هەڵگەڕاوە(بیحال‌شدن) (۳) مەزرەقەکە پیرانی کردووە لە جێی خۆی واتوند دەخولێتەوە وادەزانی وێستاوە(خیلی با سرعت درجا چرخیدن)

پیرزال: [ناو](۱)گیای یازڤاک. (گیاهیست مدر)(۲) (ب) ژنی زۆر پیری فێڵەباز. (پیرزال)
پێرسپێکتیڤ: [ناو] دەستەواژەی نیگارگەرییە؛ قولایی وێنە نیشاندان لە وێنەکێشیدا. (پرسپیکتیو)
پیرگ: [ناو] پیری؛ پێشواز؛ پێشباز. (پیشواز)
پیرگیا:[ناو]گیای وێشن؛ بۆعیلاجی بێوەسیری و دومەڵ باشە. (اگیرترکی. وج)
پێرگین: (۱)شتی‌پێری.(پریروزی)(۲)پەرگین؛ تووشی‌یەکتربوون و یەکتردیتن.(بهمرسیدن)
پیرماما: [ناو] پیرێژنی‌بەرمامان؛کە کاری-کۆمەکبە منداڵبوونی ژنانیان گرتبوە ئەستۆ لە هەورامانی کۆندا؛ پەزاج. (مامای پیر)
پیروپاتاڵ: [ناو،ت] حەیوان و زیندەماڵی پیرو لاکەفتە؛ پیر و پاتاڵ. (دامهای اهلی پیر) (۳) بە سووک باسی کۆمەڵێ پیرکردن؛ (پیر و پاتال)
پێروو: ناوی مەملەکەتێکە. (کشور پرو)
پێرووت: [ئاوەڵناو+ ناو] پێخاوس؛لاق ڕووت؛ بێکەوش. (پابرهنە)
پیرەزاڵ: [ناو](۱) پەنیری لە ناو ڕۆندا سوورەوە بوو (پنیر سرخ شدە)(۲) (ب) پیرێژنی زۆرهان. (پیر زال)
پیرەژنە: [ناو]گیای زوفا؛ زلفان؛ بۆ تەنگە نەفەسی باشە. (زوفا)
+ پیرەکەمو: [ئاوەڵناو] (ف. مشە) بە ئەزموون.بەئاروین؛ شارەزا؛ جڕباندی. جە-ڕباندی. (باتجربە)
پێڕەو: [ناو] (۱) جێگای پیاڕۆیین. (مسیر)(۲) شوێن‌کەوتوو؛ بەشوێنداچوو. (پیرو)(۳) یاسا؛

پرۆگرام؛ بەرنامە. (برنامه)
پێرەوکە: [ناو] منداڵ‌کە دارە دارە دەکا و فێری ڕێگاڕۆیشتن دەبێ.(یادگرفتن راەرفتن-بچە).
پیرێژنی‌دۆڕاو: [کینایی] یا لۆتی‌عەنتەر تۆپیو. (ب) کەسێ‌دەڵێن‌کە پەژارەو خەمی زۆربێ لە بەر زەرەر و نەهامەتی‌گران و دەستە و ئەژنۆ و زۆر خەمبار دانیشتبێ. (کنایەاز درد و غم زیاد از رویدادی ناگوار)
پیری موغان: [ناو] گەورە پیاوی ئایینی زەردەشتی. (پیرمغان)
پیز: فرد؛ فد: ناوی یەکەی ئەندازەگرتنی تەوژم بەرانبەر بە۱۰۰۰ پاسکاڵ. (پیز)
پێزان: [ئاوەڵناو] (ب) ئەمەکناس؛ قەدر شناس.(قدرشناس؛باوفا)
+ پیزڵ: [ناو]گیاگۆپاڵ؛ بەرەکەی لەبیچمی هێلکەچۆڵەکەیە و دڕکاوییە گەلاپان و ژاراوییە، دووکەڵی بەرەکەی بۆ کوشتنی (هوورک) میکروب باشە. (تاتوره)
پێزۆ: [ناو] یەکەی پارەی ولاتانی: کۆبا، میکزیک ئارژانتین، شیلی، کۆلۆمبیا، و ئوروگوای. (پزو)
پیزۆک: [ناو] پیشۆک؛ پیفۆک؛ پیزگ. (گیاهیست پیاز دار و خوردنی)
پیژان: [چاوگە،ت] پێژتن؛ پێژان؛ پەهتن؛ لەقاڵبدان؛ پانکردنەوە وشکڵ پێدان. (پهن کردن؛ قالب زدن)
پێژکە: [ناو] پێژک؛ پێشکە؛ مێشوولە.(پشه)
پێژگە: [ناو] جێگای پێژان.(جای‌پهن‌کردن و قالب‌زدن)

پێژنا: [ئاوەڵناو] پێشوو. (قبلی)
پیژوکی:[ناو]گیای پیژۆک؛ پووشەک. (جوقاسم؛ زعفران وحشی؛ پوشک)
پێست و ئیسقان مان: (ب) زۆرلەڕولاواز بوون. (پوست و استخوان ماندن)
پێستە: [ناو]کەوڵ؛پۆس؛ ئیبار؛ پێستی هەرحەیوانێ کە بە ناوی حەیوانەکەیەوە دەناسرێ. (پوست)
پێستەی‌خاو:کەوڵی خۆش نەکراو. (پوست دباغی نشده)
پێستەی‌کەمانچە: پێستێ‌کە بە سەر کەمانچەدا دەکێشرێ؛ هەروها پێستەی (تار،زەرب، (دومبەک)،دەهۆڵ، دەف، دا یرە و قانوون و تارباس). (پوست کمانچه)
پێستی ئاوەلمە: [ناو] پیستێ‌کە بە تاریدا دەگرن، پێستی ئاوەلمەیێکە مانگێکی مابێ بۆ زایین کە دایدەماڵن و بۆتار خۆشی‌دەکەن. (پوست برەتودلی)
پی‌سڕی: پی‌سڕبوون؛ پی‌تەزین؛ پێ قەرمین؛ لەدەس‌دانی هەستی پێ. (بی حس شدن پا).
پێسڕین: [چاوگە،ت] بەشتێ‌پاککردنەوە؛ بەکەسێک پاککردنەوە. (وسیلەی ستردن). پێ سڕین؛ پاککردنەوەی پا (ستردن و پاککردن پا)
پێسۆر: [ئاوەڵناو] پێسۆڵ؛ (لام) بە(ڕێ) دەگۆڕێت لە هێندێ ناوچەدا وەک(مار) واتا(ماڵ) پێسۆل واتا، پێسور، پی‌کەوش و پیخاوس؛ واتا (پای کەوشە)و کەوشی‌نییە؛ پاپەتی. (پابرهنه)
پێسۆنە: (۱) پاسۆنە؛ پامراوی (ب) پا بەپەردە.

(پـای مرغـابی)(٢) پاسـەنـە؛ پاسـەن؛ وایـە. (اینطور است)
پێسـوور: [نـاو] قـەتـارە چیـا؛ زنجیـرەچیـا. (سلسلەجبال. سلسلەکـوه)(٢)جۆرێـک یـاری پەڕانتۆ؛ پاسوور (پاسور)
پێسە ی خاراو: [ناو،ت] پێستەی‌خـۆش‌کـراو. (پوست دباغی شده)
+ پیشان: (١)[چاوگە] برژان لە گەرمـای بـێ شوڵەدا.(کفیدن) (٢) نیشان؛ حاڵەتی بـەرچـاو خستن و نیشاندان. (نشان)
+ پیشـاندن: [چاوگـە،ت] (١) برژانـدن بـە گەرمای بێ گڕدا؛ بـەهـێ بـە بـووڵی گـەرم برژاندن. (کفیـدن)(٢) دەنگـی بـەردانـەوەی نەفەسی گـامێش و نـەهـەنـگ؛ پیشـقاندن. (صدای نفس بیرون دادن گاومیش و نهنگ)
پیشاندەر: [ناو،بک] نیشـاندەدا؛ بـەرچاوخـەر. (نشاندهنده)
پێشانی: [ناو] نێو چـاوان؛ هـەنیـە (پێشـانیم هەوەس زانووش جازمەن، تەعزیم جـەنـاب پێری لازمەن). «مەولەوی» (پیشانی)
پێشـباز: [نـاو] پێشـواز؛ بـەپیریـەوەچـوون (پیشواز)
پێشبرکێ: [نـاو]کـێ‌برکـێ؛ ملـە؛ ململانـێ. (مسابقە)
پێشبەر: [ناو] جۆرێک یاری پەڕانتۆ کـە هـەر کـــەس دوو دەســـــتی بـــــردەوە سەرکەوتووە.(پیشبر)
پێش بەرەلا: [ئاوەڵنـاو](١) بـێ‌سـەرگـری و بەرگری؛ بەربەرەڵا. (بیمـانع و آزاد) (٢) بـەر ئاواڵە؛ بەربەرەڵا؛ پێش‌نەگیراو. (جلوباز)
پێشبەستن: [چاوگە،ت] بەرگرتن؛ بەرلێگرتن؛ ڕێگەلێگرتن؛ بەرهەڵستبوون. (جلو گرفتن)
+ پێشبەنـد: [نـاو] (١) ڕەوتـی بـەسـتنەوەی دەسـتی چـارە وێ. (عمـل بسـتن دسـت ستور)(٢) پەت یا زنجیری دەست پێبەستنی چارەوێ. (زنجیر دست بستن)(٣) بـەروانکـە؛ بەرهەڵبێنە؛ بەرانپێل پارچـە قوماشـێکە بـەر سینگ و پێشەوەی لـەش دادەپۆشـێ. سـە- دریبە. (پیشبند)
پێشپەڕ: [ناو](١) لە پێشدا بازدەدا یا دەپەڕێت. (پرندەنفز اول). (٢) پاسووری کە زۆربـوونی پەڕەکانیش ڕەچاو دەگیرێ. (پاسورپیشبرگ)
پێشپەردە: [ناو]کورتەشانۆی پێش دەستپێکی شانۆ؛ زیـاتر بـێ‌لادانـی پـەردەی شـانـۆ لـە پێشەوەی پەردەدا دەکرێ. (پیش پردە)
پێش پـێش:(١)[بـەنـد]پێشـترلە دەستپێکی کـارێ؛ لـەپێشـدا؛ بـەلـەوا. (٢) زۆر پـێش؛ پێشەکی. (پیش پیش)
پێشتر: [ئاوەڵناو] لەمەوبەر؛ بەرووتـر؛ بـەرتـر. (پیشتر) (٢) نزیکتر. (نزدیکتر)(٣) پێشکە تیتر؛ پێشکەوتووتر. (جلوتر)
+ پێش‌خستن: [چاوگە،ت] (١)زووتر دەست بە کارێ کردن؛ سەفەرەکەم دوو ڕۆژ پـێش- خست؛ (٢)خستنە بـەرەوەی کـەسـێک و لـە پشت سەریەوە ڕۆیشتن. (جلو انداختن)
پیش‌خواردنەوە: [چاوگە،ت] بین(بێن، بێهن)- ڕاگرتن؛ مـان‌گـرتن؛ خـۆ خواردنـەوە؛ رک و قـین‌ڕاگـرتن؛ پـەنگـەپـیش(خودخـوری و عصبانیت‌دردرون‌نگهداشتن)
پێش‌خۆراک: [ناو]خواردەمەنـی سـارد وەک:

زەلاتە(سالاد) و سەوزی و خەیارماست (دۆغرمە)کە پێش لە خوراک خواردن دە- خورێ (پیش غذا)

+ پێشخۆری: (۱) [ناو] پێشدەستی؛ دە وریی بەردەست لە سەرسفرە. (پیشدستی)(۲)[بە- رهەمیچاوگە] حاڵەتی لە پێش بەرهەم هاتن و وەختی پێگە یشتنی داهات دەست بە کاری فرۆشتنیکردن، (پیشدستی)

پێشدا: (۱) پێشەوە؛ پێشداکەتی: پیشکەوتوو. (۲) پابنیۆپێشدا: پابنێ پێدا؛ (رویش)(۳) لە پێشدا وانەبوو: لەبهووریدا؛ لە رابووردوودا.(قبل ازاین) (۴)پێیدا: دای- پی:دایپێی؛بەئەویدا.(باو داد)

پێشدار: [ناو] ڕێبەر؛ پێشەنگ؛ سەرجەلە. (جلودار)

پێشژان: [ناو]ژانی پێش ژانی منداڵ بوون. (پیش درد)

پێشدەست: [ناو(ف مشە) ئامادە؛ بەرئەمر؛ بەردەست. (وردست)

پێشژمارە: [ناو] ڕەقەمی(پێشەوەی) تەلە- فۆنی هەروڵات و هەرشار؛ کۆد. (کد)

پێششەرت: پێشمەرج؛ من ئامادەم وتوویژی لەگەڵدا بکەم بەلاٌم پێش شەرتم ئەوەیە تەنیا سەبارەت بە داهاتوو قسە بکەین. (پیش شرط)

پێشفاکتۆر: فد: [ناو] وەرگرتنی نووسراوە- یێک بۆ قیمەت دیاریکردن؛ (پرسینی) ڕادە- ی قیمەتی کەلوپەل لە چەند فرۆشیار بە نووسراوە. (پیش فاکتور)

پیشقەپیشق:[دەنگەناو]پیشکەپیشک؛دەنگی لووتی گامێش (صدای بینی گاو میش)

پێشقەدەم: فد: [ناو](۱) لە پێش هەموانـدا ئامادە بوون بۆ دەستپێکی کارێ. (۲) ڕچەشکێن؛ لەنووسینی چیرۆکی دریژ (رومان)دا ماموستا فەتاحی ئەمیری لە بوکان پێشقەدم بووە. (پیشقدم)

پێشکڕ: [ناوبک] پێشخڕ؛ کڕیارێک کە بەسەلەم دەکڕێ؛ پێش(ئامادەبوون)ی بە- رهەمدەیکڕێت.(پیش‌خر)

پیشکوهوڕ: [دەنگەناو] زۆر پێکەنین بەدەنگی لە قاقا کە متر؛ تریقوهوڕ (زیاد خندیدن)

پێشکەفت: (۱)[ڕابورووی پێشکەوتن] کەوتە پێشەوە؛ پێشکەوت (جلو افتاد)(۲)[چاوگەی کورتکراوی پێشکەفتن] کار و ڕەوتی پێشکەوتنی کارێ. (پیشرفت)

پێشکی: هاوڵەگرتوو؛ گوڕوێ (ئابلەگرفته)

پێشکێلک: [ناو] بەرایی هەر شت؛ پێشایی؛ بەراهی؛ قەلاوێز؛ قەرەوڵیپێش‌لە- شکر.(جلودار؛ رهنما)

پێشگاییلە: [ناو بەرگاییلە؛ فڕندەیێکی چووک کە لەکاتی جووتکردندا لە سەر خەتی جووت بەدوای کرمدا دەگەڕێ. (اسم پرندەای کوچک)

پیشگۆ: [ناو] بەراوردی ڕووداو دەکا و لە پێش ڕووداندا دەیدرکێنێت. (پیشگو)

پێشگۆتن: [چاوگە،ت] (۱) سەرەتا بۆ کتێبێ نووسین. (پیشگفتار؛ دیباچە)(۲) کاری درکاندنی پێشگۆ. (اظهارات پیشگو)

پێشلک: [ئاوەڵناو] پێخڕک؛ پێگران؛ پاقورس. (تنبل در رامرفتن)

پیٚشلکرن: [چاوگه‌،ت] (۱) هێواشتر ڕۆیشتن. (آرامتررفتن) (۲) پیٚشلکردن؛ پیٚفشکردن؛ پیٚجووڕکردن؛ لیٚئەستاندن بەزۆر. (گرفتن؛ اخ کردن)
پیٚشماڵ: [ناو] حەوشە؛ حەسار. حیاط)
پیٚشمان: [ناو] حەمام چوونی ئەوەل جاری ژنی زەیسان. (اول حمام زائو)
+ پیٚشمەرگە: [ناو] گیان‌فیدا؛ فیدایی؛ (ب) سەرباز. (سرباز؛ فدایی)
پیٚشنیاد: [ناو] پیٚشنیار؛ پیٚشنیهاد؛ پیٚشنیاز. (پیشنهاد)
پیٚشۆر: (۱)ئامرازی پیٚشتن؛ وەک سابوون و سپۆن و ڕیکا؛ پنەشۆر. (عامل شستن) (۲)پیٚشۆر؛ کەرەستەی شووشتنی پا وەک(بەردەپاشۆر)(سنگ‌پا)
پیشە: فد: [ناو] (۱)شۆڵ؛ شوغل؛ کار؛ئیش؛ (۲)پاشگر:وەک هونەرپیشە، ستەم پیشە. (پیشه)
+ پیٚشە: (۱)چەقالە و ناوکی ڕەقی‌میوە. (هسته)(۲) لە بەرەوەیە؛ لە یاریدا لە-پیٚشە.(پیش است)(۳) پیٚیەتی؛ پیٚشەن. (نزد اوست) (۴) ئیسقان (استخوان)
پیٚشهات: [ناو] بەسەرهات؛ ڕووداو؛ هاتنەڕێ. (پیشامد)
پیٚشەسەر: [ناو] (۱) ئیسقانی کەڵەسەر؛ پۆزم؛ پۆزمین. (جمجمه) (۲) > پیٚشەسەرە.
پیٚشەسەرە: [ناو] خشڵ و گوڵنگی بەرەوەی لارە پیٚچ؛ یان خشڵی سەرەوەی هەنیە.(زیورجلوسر
پیٚشەن: بەوە؛ پیەتی؛ پیٚیەتی؛ پیٚوەیە تی(هە-رچی بوینوون شیٚوەی تۆ پیٚشەن،دڵ وەهەتیەی حەسرەتدا کیٚشەن) (پیش‌اوست؛ بەهمراەدارد)
پیشیاگ: پیشاو؛ پیشیاو. (کفیده)
پیٚفیٚربوون: [چاوگە،ت] (۱) دەسەمۆکردن و ڕام‌کردن؛ بەکەسیٚک فیٚربوون و کاریٚ بەسەر هیٚنان؛ (پی در پی بسرکسی‌بلاآوردن)(۲) دەست هەڵنەگرتن لەکەس یا جیٚگایی؛ ژاندارمە بەو گوندە فیٚربووە هەموو ڕۆژیٚ دیٚ.(راه جائیرا یادگرفتن) (۳) من بەو ئەسپە فیٚری سواری بووم: بەو ئەسپەفیٚربووم سواری‌بکەم.(با آن یاد گرفتن)
پیٚفیرکردن: [چاوگە،ت] (۱) فیٚری‌شویٚنیٚ یا کاریٚ‌کردن. (یاددادن وآشناکردن‌بەجا یا کاری)(۲)بەجیٚگاییٚک یان بەکەسیٚکیٚ‌تر فیٚرکردن؛ ڕیٚنموونی‌کردن و ڕیگا پیشاندان. (پای کسی را بجایی باز کردن)
پیفیٚ:> پوەڵەکارگ.
پیٚڤیان: [ئاوەڵناو] پیٚویست؛ زەروور؛ حەوجە.(ضرور؛لازم)
پیڤک: [ناو] پیٚوانە؛ عەیارە؛ کیلە؛ سەنگی ترازوو؛ پیٚوەرە. (وزنە؛ پیمانە؛ معیار)
پیٚڤیایی: [ئاوەڵناو] پیٚویستی؛ زەرووری. (ضروری)
پیک: فرد؛ فد: [ناو](۱) خالیٚکی ڕەشی سەر پەڕەی پەڕانتۆی یاری. (۲) پیق؛ جیکەنە؛ جیٚدەم لە زوڕنادا. (جا دهنی سرنا)(۳) نویٚڵی-بەرد شکیٚن.(میلەسنگ شکن)(۴) کور تکراوەی پیکنیک. (مختصر شده پیک

نیک)
+ پێکان: [چاوگـە](١) (ب) دۆزینـەوی واتـا؛ تێگەیشتن لە مەبەست؛ لـەئامـانج دان.(زدن بەخال سیاه؛ درک کردن) (٢) بەستن؛ سەف پێکان: سەف بەستن؛ سف پێک هێنان؛ سف دروستکردن. (بستن) (٣)[ڕابوردووی چاوگـە] پێکایان: ئە نگاوتیان. (بە هدف زدند)(٤)بـە-ستیان؛ سەفپێکان:سەفیانپێکا: سەفیان بە-ست(بستند)
پێکاهاتن: [چاوگە، ت] (١) پێکـداهـاتن؛ بـە دەور یەکدا هاتن؛ ئەو پووره هەنگـە ئـاڵۆزاوە هــەر پێکــادێن.(شــلوغی و آشــفتگی) (٢) پێکـداهاتن؛ لـەیـەک ڕۆبـوون؛ پێکـداداو. (جنگ‌کردن)
پێکچوواندن: [چاوگە،ت] وێچوواندن؛ بەیەک شوبهاندن. (بهم تشبیه‌کردن)
پێکڕا: [بەند] تێکڕا؛ هەموو پێکەوە. (همگی)
پێکراو: [ناو،بەر] (١) ئـەنگاوتـە؛ ئـەنگێـوراو. (مـورد اصـابت قـرار گرفتـه) (٢)پـێ‌کـراو: کــــەســــێک کــــە کارێکیــــان پــــێ‌-کرابێت.(مجبوربکاری شده) (٣) واوا پێکـراو: کاری خراپ بەسەرهاتوو؛ ئەتک کراو؛ ئابڕوو نەماو. (بسرآمده)
+ پێکردن: [چاوگـە،ت] (١) لـەغـاوەکـە بـە دەمی ناکا؛ پێی‌ناکا؛ کـەوشـەکـەت بـەپێـی کردی؟ جەڕەکە بە مۆرەکە ناکا: بە ئەندازەی نییە؛ (بـەچیـزی خـوردن؛ انـدازەبـوون) (٢) سـەگ بـە حدوشـە پێکــردن. (بلابـەسـر آوردن)(٣) کــاریٚ بــەزۆر بــەکــەسـێک کردن.(وادار بەانجام کاری کردن) (٤) چـرا و ئاگر هەڵکردن؛ داگیرساندن؛ چرا پـێ‌کـردن. (مشتعل کردن)
پێکڤە: [بەند] پێکەوە؛ بەیەکەوە(با هم)
پێکگـرتن: [چاوگـە،ت] هـەڵسـەنگانـدن و بـەراوەردی چـاکی و خراپـی یـا سـووکی و قورسی دوو شت پێکەوەکردن؛ بەرانبەر دان. (مقایسه)
پێکۆز: [ناو] بەرپا خستنی گیا و کـای وشـک لە ناو کۆزی بەرخ و بێچوودا. (گیاەخشکەزیر پای بزغالەو برەپهن کردن در آغل)
پێکـۆ:(١)[نـاو]سـمکۆڵ؛پیکۆڵ؛پێکۆڵ.سـم-برزمین‌سائیدن)(٢) [بەند] پیکەوە؛ بەیـەکـە-وە.(باهم)
+ پێکهاتن: [چاوگە،] سـازدان؛ دروسـتبوون؛ ڕێککەوتن؛ ئەم‌کارە پێکـنای: دروسـتنـابیٚ. (درست شدن؛موافق شدن)
پێکهاتوو: (١)[ناو،بەر] دروستبوو؛ ئەم شتە لـە سیٚبەش پێکهاتووە: لە سـیٚبـەش دروسـت بــووە(درســت شــدن؛ تشــکیل شــدن)(٢) موعامەلەکەیان پێکهـاتوە: سـازیان هـاتووە؛ ڕێککـەوتـوون. (توافـق کـردە)(٣) ئاشـت بوونەتـەوە: پێکهـاتوون(هـاتگن) و ئاشـتیان بووەتەوە؛ کۆکبوون(بووگن)؛ سازاون. (آشتی کردەاند)
پێکەنۆک: [ناو] جەفەنگ؛ حەنـەک؛ نوکتـە؛ قسەی گاڵتـە؛ کۆمیـدی؛ پێکـەنین هێنـەر؛ شانۆی پێکەنۆک: شانۆی کومێـدی. (جـوک. کمدی)
پێکەوتـن[چاوگـە،ت]: (١) پێکـەفتن؛ لـیٚ-کاڵانـەوە؛ لـیٚ جـوان بـوون؛ ئـەوکراسـەت

پێناکەوی: لێت جوان‌نییە، لێت‌ناکاڵێتەوە. (برازندەبودن) (٢) چاک و بەموفابوون؛ سازگاری؛ ئەو دەرمانەم پێناکەوی: (سازگاری)(٣) هەل ڕەخسان؛ ڕێکەوتن؛ پاکەوتن. (ئەگەر وا پێی بکەویٚ بێمەوە، پێم خۆشە. (پیش آمدن)
+ پێکەوەنان : [چاوگە،ت] (ب) ماڵ-کۆکردنەوە؛ پارەکۆکردنەوە؛ پووڵ‌فرەیێکی پێکەو نیاگە: پوولێکی زۆری کۆکردووەتەوە؛ پارە نیانە سەریەک. (مال اندوختن) ئەوکچەجیازییێکی زۆری پێکەوەناوە. (فراهم کردن و جمع کردن)
پێکهینان:[چاوگە،ت]سازکردن؛دروستکردن؛ چێکردن. (درستکردن)
پێکیاگ:>پێکراو (مورد اصابت واقع شده)
پێکیان: (١)[چاوگە] ئەنگێوران؛ پێکران (مورد هدف قرار گرفتن) (٢) پێکایان؛ بەستیان؛ سەفیان پیکا؛ (سەف پێکیان: سەفیان بەست). (صف بستند)(٣) هۆنراو؛ هۆنراوە؛ (پێکیای تای دەرد ڕیشەی خەم گوڵەنگ). « مەولەوی ». (برشتەکشیدەشدە)
پێکیایی: [ناو] پێکراوی؛ لێدراوی. (مورد هدف واقع‌شده).
پێکاف: [ناو] پێنگاف؛ هەنگاو؛ قەدەم؛ شەقاو.(قدم؛ گام)
پیٚ‌گران: [چاوگە،ت][ئاوەڵناو] (١) > پاگران؛ پاقوورس.(٢) قەدەم شەڕ. (بدقدم) (٣) (ب) ژنی ئاوس. (کنایەزن حاملە). پێگرانبوون؛ لەلادژوار؛ (٣)لەلاگرانبوون: دژی لا هەرزانبوون؛ (برای‌کسی،دشوار)

پێگرتن: [چاوگە،ت] (١) (ب) فێری ڕێگا ڕۆیشتن بوون. (راەرفتن آموختن)·(٢) پیٚ‌گرتن؛ لە زۆراندا پای حەریف گرتن، لاق گرتن. (زیر گرفتن در کشتی)(٣) دامەزران؛ سەقامگیربوون.(برپاشدن.پاگرفتن)(٤) مەجبوور بەگرتنی‌شتیٚ‌کردن.(مجبورکردن بەگرفتن) (٥) بەهانەپێگرتن.(بهانە گرفتن)
پیٚ‌گرۆک: [ناو] تەڵە؛ داو؛ تەپکە؛ باڵاٚن؛ پاگر. (تلە)
پێگرۆک: [ناو]کەرەستەی شت - پێگرتن.(وسیلەگرفتن اشیا)
پیٚ‌گوڵوڵە: [ئاوەڵناو]پاقورس؛ پیٚ‌شلک؛ پاگران لە ڕێگا ڕۆیشتندا. (تنبل در راەرفتن)
پیگمە: فرد؛ فد: ناوی هەندیٚ خەڵکی ڕەش پوستالیٚ،کورتە بالاٚی پۆڕهەڵەک (سەر و قژ لوول)ی ئەفریقا. (پیگمە)
پێگەییک: [ئاوەڵناو] پێگەیشتوو؛ پێگەییو؛ بارهاتوو؛ گەورەبوو، گەییو؛ گەورە بووگ. (بزرگ شدە؛ رسیدە)
پێگێرە: [ناو] پاهوڵە؛ پاگێرە؛ گێرەی بەپیٚ؛ گێرەکردن بە ڕەشەولاٚخ. (خرمنکوبی‌با پا)
پێلاف: [ناو] پێڵاو؛ کەوش؛ پاپۆش. (کفش)
پێلاف‌چێکەر: [ناو] [ناو،بک] کە وشدروو؛ پیلاٚوچێکەر. کفاش)
پێلامز: [ناو](١) حەقەپێڵاو؛ پارەی کەوش کرێنی کاسبکار کە خاوەن کار دەیدا. (هزینەکفش) (٢) کاڵە درانە؛ پاڵامز؛ مزی بەڕێگادا ڕۆیشتن؛ کرێی ڕێگا. (حق القدم)
پیلانکەر: (ب) ڕاسپاردەی ماڵی زاوا بۆ ماڵی بووک پێش زەماوەند. (قاصد قبل از عروسی

از خانه داماد بەخانەی عروس)
پیل‌بڕ: [ئـاوەڵنـاو] دەسـبڕ؛ قـوڵبڕ؛ فێڵـەبـاز. (کلاەبردار)
پێل‌پێلۆک: [ئاوەڵناو] پڕبەرزونەوی؛ شەپۆلدار؛ پڕ شەپۆل؛ چاڵوچوڵ(مواج)
پێلچۆک: [ناو] شەپۆل. (موج)
پیلۆت: [ناو](١) یەکەم قاتی خانوو کـە زیـاتر بۆگـاراج و مۆتۆڕخانــەی شـۆفاژ و هــەمـار بەکاردێ.(پیلوت)(٢)شەمعەک (مۆ مەک)ی-کەرەستەی گازی؛ مۆمەک. (پیلوت)
پێلووی‌چاو قورس‌بوون: (ب) خەو زاینە چـاو؛ خەواڵووبوون؛ خەوهاتن. (خواب آلود شدن)
پـێ‌لـەپـەیـین‌دان: [چاوگـەت] (ب) بێکـار سووڕانەوە. کنایە(بیکار گشتن)
پێ‌لەجێ: [ئاوەڵناو] پابەرجا؛ ڕاوەسـتاو؛ قـایم (مقاوم)
پیلەخۆر: [ناو] کەڵەسمە؛ کەلووەسمە؛ کرمی-نۆک؛ هاڕیە. (کرم آفت نخود)
پێ‌لێخسـتن: [چاوگـەت] (١) سـاوینەوە لـە ژێرپێـدا. (لـەکـردن زیرپـا) (٢) (ب) پـا نانەسەرگوناح و چاوپۆشـی کـردن. (کنایـەاز چشـم پوشـی)(٣)مــەجبـوورکردن بــە-لێخستن.(مجبوربەسابیدن‌کردن)
پــێ‌لێنــان: [چاوگــەت] (١) ڕاســتی قسەدرکاندن؛ دان پێدانان؛ پاپیانان. (اعتـراف کردن)(٢) پێخوست کـردن و پـا بـە سـەردا دانـان (پـا روی چیـزی گذاشـتن)(٣) بـە پـا شـێلان. (مشـت و مـال بـا پـا)(٤) پێلێنـان؛ چێشت بە ئاشپەز لێنان؛ ئاشـپەزی پێکـردن. (وادار کردن بەآشپزی)
پێ‌لێداگرتن: [چاوگەت] (١) پێ‌داگری‌کردن؛ سووربوون لـەسـەر مـەبـەسـت و ئیسـراری زۆرکردن. (بکسی اصرار کردن)(٢) قورسـایی خسـتنە سـەر پاشـبارە و دەنـدە لـە جـووت (شێوبڕین)دا.(فشار آوردن بەخیش بـا پـا)(٣) قورسایی خستنەسەر هـەر شـت بـە پـا (ب) زۆرگازدان و پا لەسەر پێداڵی‌گازی سەیـارە - داگرتن.(با پافشار دادن)
+ پیم: (١)[ناو] پیوو؛ پیف؛ چـەوری نـاوزگ. (پیە) (٢)[ئاوەڵناوی لکاو]پێم: بەپیم: پێم‌بـدە، بدەپیم: بدەپێم. (بمن)(٣) < ئیشپیل. (پیم)
پێمـردن: [چاوگـەت] ئـەو شـتەکـە دەبێتـە هۆی‌مردن. (با چیزی مردن)
پێمزک: [ناو]کرێی ڕێ؛ پامز.(حق‌القدم)
پێمەلە: [ناو] پامەلە؛ مەلەکردن بەپا. (شنا بـا پا)
پێمێرد: [ناو] عیزڕاییل. (عزرائیل)
+ پێناسە: [ناو] بەڵگـەی ناسـاندن؛ سـجیل؛ ناسنامە. (مدرک شناسایی)
پێنج پالۆ: بیچمێک کە خاوەنی پێنج گۆشە و پێنج پاڵوێت. (پنج ضلعی)
پێنج پەڕ: [ناو] لـەبیچمـی ئـەستێرەی پێنج گۆشە. (پنج پر) هەر شت کە پێـنج پـەڕەی هەبێت (هر چیزی دارای پنج پره)
پێنج‌تمەنی: [ناو] لەئێراندا ئەسکەناس‌بوو کـە ئەمڕۆ بووەتە قەرەپووڵی‌کانزایی.پنج‌تومانی)
پێنج چاوگەی‌دڵ: (ف گیو)> پەنج چاوگـەی هەست.
پێنج چاوگەی‌هـۆش: (ف. گیـو) > پـەنـج چاوگەی هەست.

پێنجشەممەشەو:[ناو]شەوی پێش لە ڕۆژی هەینی.(پنجشنبە شب)شەوی جومعە. (شب-جمعە)
پێنجشەممە:[ناو]پێنجشەمۆ؛ڕۆژێ دوای چوارشەممە و پێش هەینی. (پنجشنبە)
پێنج فەرزە: [ناو] پێنج فەرزان.(ب)پێنج کاتی نوێژکردن. (کنایە ازپنج وقت نماز در روز)
پێنج گا: مەقامێکی ئاوازی ئێرانی. (پنجگاەو راست پنجگاە)
پێنج گۆشە: [ناو] بیچمێکی پێنج قوژبن و پێنج پاڵوو. (پنج ضلعی)
پێنج گەنج: [ناو] پێنج گەنجینە. ۱) ناوی کتێبەکانی نیزامی گەنجەوی(خەمسەی نیزامی). (پنج گنج) (۲) (< پەنج چاوگەی هەست.
پێنج لەتیفە: لەعیرفاندا لەتایف یا پێنج لەتیفە ئەو پێنج جێگایەن کە لە دەروونـدا نووری خودایان دەکەوێتە سەر. ۱، دڵ ۲، رۆح ۳،سەر۴،خەفی ۵ ،ئەخفا.(پنج لطیفە)
پێنجوم: [ئاوەڵناو]پێنجەم؛ خاوەنی پلە و پایەی پێنج. (پنجم)
پێنجەی‌تار: پێنج ڕۆژەی هەوەڵی بەهار، (لە ساڵی کەبیسەدا دەبێتە شەش ڕۆژ). کە هەر ڕۆژ لە سەر مانگێ حیساب دەکەن لە ڕۆژ ژمێردا؛ تا پێنج مانگی ئەوەڵی ساڵ. (پنج روز اضافی سال از ۳۶۰ روز اول سال)
پێندقە:[ناو]کرێژی هەنگوین کەلە کەندوودا دەمێنێەوە(آشغال عسل‌درکندو) پێنکی: فـد: [ناو] پینەکی؛پینۆکی؛خەواڵوویی؛ خە-وەنووچکە بردنەوە؛ حاڵەتی وەنەوزدان.(خواب آلودگی)
+ پێنواندن: [چاوگە،ت] (۱) پیێ‌نیشاندان (نشان کسی دادن)(۲) مەجبوورکردن بە نیشاندانی شتێ. (مجبوربەنشاندادن)(۳) (ب) جەزای ئاکار دیتن؛ (ب) جەزای کاری خراپ بە سەر هێنان؛ سەبرکە پێت دەنوێنم واتا پێتی دەڕێژم نیشانتی دەدەم؛ خودا سوێندی درۆی پێنواند؛ نیشانی دا. (انتقام و جزای بدی نشان دادن)
+ پینە: [ناو] پۆرگ؛ پینەی دەست و پێ بە هۆی کاری زۆر یا پیاسەی زۆرەوە؛ توێخێکی ڕەق لە پاش تۆقلەکردن لە بەری دەست یا قامکی پا پێکدێ. (پینە)
پێن‌هاڤێژ: [ناو،بک+ئاوەڵناو]پێن‌هاوێژ؛ جووتەوەشێن؛ شەمبۆز. (جفتک انداز)
پێن‌ەزان:[ئاوەڵناو]سپڵە؛ناسوپاس؛بێ ئەمەک. (ناسپاس)
پینەهەڵنەگرتن: [چاوگە،ت] (۱) کووتاڵ یاکەوشێک، هێندەی پینە لێدرابێت جێگای نەبێت بۆ پینەی دیکە، یا زۆر پووابێت. (از بس پینەشدەجای پینەنداشتن) (۲) (ب) کەسێ هێندە ریسوایی ئاشکرای بارهێنابێ بەهیچ کلۆجێ نەشاردرێتەوە. (کسی کەاینقدر مرتکب جرم شدەباشد کەنشود آن را پوشاند)
پێوابوون: [چاوگە،ت] وازانین؛ واهەستکردن؛ گومان کردن؛ پنەزانای. (گمان کردن)
پیوار: [ئاوەڵناو] پێوار؛ ون؛ نەلەبەرچاو؛ بزر؛

بەرزە. (ناپیدا و گم)
+ پیواز: سەڵکی هەرگیای سەلکدار. (پیاز)
+ پێوانی بەرزەپێو: [ناو] پێوانی قەڵاچن؛ لە دارماڵ زیاتر. (بیشتر از مالامال)
پێوپڵڕەش: (۱)[ئاوەڵناو] بێفەڕ؛ نەحس؛ (۲) [ناو] قاچوقول ڕەش. (منحوس)
پیوڕە: فرد: فد: [ناو] نەخۆشینی چلک‌کردن و ماسین و ئێشانی پووک. (پیوره)
پێوشوێن: سالخ؛ نیشانەی لە جێگایێک بوون؛ سۆراغ. (سراغ)
پێ وەبەر پێدان: [چاوگە،ت] پاشقول دان. (لنگ کردن)
پێوەتلیان: [چاوگە،ت] تێوەتلان؛ تێوەگلان تووش‌بوون و گیرۆدەی ڕووداوێ‌بوون. (درگیر شدن)
پێوە تەقیان: [چاوگە،ت] (ب) لێدان و هەڵشاخیان (کتک زدن؛برخورد)
+ پێوەدان: [چاوگە،ت] (۱) تۆپەلەقوڕ پێوەدان؛ قوڕبە دیواردادان؛ نان پێوەدان بە تەندووردا، چەسپاندنی‌نان بە تەندووردا. (چسپاندن)(۲) چزوو لێدانی‌هەنگ؛ مارپێوە-دان. (نیش زدن)(۳)بەستن؛ داخستن؛ ژەندن؛ دەرکە پێوەدان (بستن)
پێوەدران: [چاوگە،ت] داخران. (بستەشدن)
پێوەڕوان: [چاوگە،ت] (۱) جووتبوونی سپلۆت. (جفتگیری سگ و روباەو گرگ) (۲) گرسان و سەوز بوونی لکی پێوەند(موتوربە)کراوی دار و درەخت. (گرفتن پیوند)

پێوەرە: [ناو] (۱) دارە دارە کردنی منداڵ. (تاتی تاتی بچە)(۲) دوابەری وێنجە. (آخرین بر یونجە)(۳) کیلە؛ پێوانە؛ پەیمانە. (پیمانە)(۴)بەیەکەوە؛ پێکرا. (با هم)
پێوەرمبینای: [چاوگە،ت] پێوەبەستن. (بستن بە چیزی)
+ پێوەکردن: [چاوگە،ت] (۱) تووشی بەڵای خراپ کردن؛ (۲) (ب) بەشۆفاری بەگرتن‌دان و بە داوەوەدان؛ بە داوەوەکردن. (بەدام بلا انداختن) (۳) هەڵبەستنی مووروو؛ مووروو بە ڕێسمانەوەکردن. (برشتەکشیدن دانەهای خرزە)
+ پێوەن: (۱) لەگەڵ دەست دێ؛ دەست و پێوەن؛ تاقمی خزمەتکارەکان؛ کەسانی بەردەست. (نزدیکان. خدمتکاران) (۲) پێوەیەتی؛ پیانەوەیە؛ پێشەن؛ (باڵای ئاڵای شەنگ سەد بەڵا پێوەن) (مەولەوی) (همراەدارد)
+ پێوەنان: []چاوگە،ت(۱)لکاندن؛ بەیەکەوەنان. (چسباندن)(۲) نەخۆشین پێوە نوساندن؛ پێوەلکاندنی نەخۆشی. (انتقال مریضی)(۳) داخکردن و داخ پێوەنان (داخ کردن)(۴) تێ‌گرتن؛ بۆ خستن؛ ئاراستەکردن؛ تیریکی پێوەنا. (انداختن)
+ پێوەند: (۱) پێوەن؛دەستوپێوەند؛ خزمەت-کارگەل.(خدمت کار)۲.پێوە بە-ستراو؛گرێدراو.(وابستە)۳ گوریس یازنجیر بۆ پابەستنەوە؛ پابەند. (ریسمان پابند)
+ پێوەنیشتن:[چاوگە،ت](۱)نیشتنەوەی باڵندە

لـە سـەر شـتێک.(نشسـتن پرنـدەروی چیـزی)(٢) خـۆڵوخـاک پێـوە- نیشتن.(گردگرفتن)

پێویست: [ئاوەڵناو] زەروور؛ حەوجە؛ ویسـت؛ (ضرور)

پێ هەڵکەوتن: [چاوگە،ت] پا هـەڵکـەوتـن؛ هـەڵـەنگـووتن؛ بۆچـارەوی،(سـەرسـمدان). (سکندری)(ب) هەڵەکردن. (اشتباه کردن)

+ پێهەڵگرتن: [چاوگە،ت] (١)بـار پـێ بـە- رزکردنەوە. (واداربـەبلنـدکردن‌بـار)(٢)پاهـە- ڵگرتن؛ بەلەز ڕۆیین (تندتررفتن)

پێهەڵێنان: [چاوگە،ت] (١) پا بەرز کردنەوە. (پا بلند کردن) (٢) پێهەڵێنان؛ بـار پـێبـەرز کردنـــەوە. (بـــەکســـی بـــار را بلنـــد کردن)(٣ب)پێهەڵێنان؛ هێلکەبەمرشک کردن بە جووجەڵە؛ جووجکـەپێهـەڵینـان. (واداربـە جوجەدر آوردن)

پێهـــێلان: [چاوگـــە،ت] لێخۆشـــبوون؛ لێبووردن؛ گوزەشتکردن؛ بەخشین وگـەردن- ئازادکردن. (گذشتکردن)

پیانـەڕێ: [نـاو] ڕێگـای پیـادە پیاڕۆیشـتنی قەراخ شەقام. (پیادەرو)

پێـی‌نـاوی: پێویسـت نییـە؛ نایـەوێـت.(لازم نیست)

پائەنداز: [چاوگە،ت]کۆکەرەوەی چەند نەفەر بۆ یاری ، مەجلیسی یاری وەڕێخستن؛کە-سێک کەکاریک پائەندازی دەکا. (پا اندازی)

پا ئەندازی: [ناو] پیشەی‌پائەنداز؛ دەڵالی و یەک خستنی ژن و پیاو بەناڕەوا؛ کاری ڕاخەری‌پایەناز. (پا اندازی)

پاتیناژ: فد؛ فرد؛ اند.[ناو] خلیسکێن و یاریکردن و ڕەخسی تایبەت‌کردن لە سەر سەهۆڵ، بە لە پێکردنی ئیسکەیت (جۆرێک پاپۆشی تایبەت). (پاتیناژ)

پادرەختی: فد: [ناو] بارێزە؛ میوەی وەریو لە پای داردا. (پا درختی)

پادمو: [ناو] شاگردی‌بەردەست زیاتر لە دووکان‌دا.(پادو)

پاڕازیت: فرد.فد [ناو] (١) لامژ؛ چەورە؛ موزاحیم؛ وەک ویرووس و کرمی ڕیخۆڵە.(٢) دەنگ و شەپۆلی زیادی کەدە-خرێتە سەر شەپۆلی ڕادیۆیی بۆ خراپکردن وتێکدانی دەنگ. لە بێتەل و تێلێڤیزیۆنیشدا هەر بەو شێوەیە (پارازیت)

پاڕازیت خستن: [چاوگە،ت] شەپۆل و دەنگی موزاحیم خستنە سەر شەپۆلی کەرەستەگەلی کارەبایی دەنگبەر یا ڕەنگبەر وەک بێتەل و ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆن و یا خشە و بەفرەک دروست کردن بۆیان؛ (ب) بە قسە پەڕینە ناو قسەی کەسێک. (پارازیت انداختن)

پاراشووت: فرد؛ فد: [ناو] چەتری نەجات؛ چەتری دەربازبوون و چەتری ڕزگاری، چەترێکە لە قوماشی تایبەت بۆ پەڕینە دەرەوە لە فڕوکە و ئارام هاتنە سەر زەوی. (پارشوت. چتر نجات)

پاڕاوان: ایتاد؛ فرد؛ فد: [ناو] (١) پەردەییکی پایە دارە لە کاتی دەرزی وەشاندن یا موعاینەی (ویزیتی) دوکتوردا لە بەر تەختی نەخۆش دادەنرێ بۆئەوەی لە چاوی دیترانەوە دیارنەبێ. (پاراوان)(٢) جۆرێک پارتیشێنی گچکە. (پاراوان)

پارتی: [ناو] (١) جەژن گرتن و میوانی ڕیخستن وەک: گوودبای‌پارتی، چای‌پارتی و کۆکتێل‌پارتی. (پارتی) (٢) ئەو بەشە لەکاڵاییێک کە هەر جار بۆ تاجر یا بۆ شوێنێ دەنێردرێت. (پارتی)(٣) گرووپ؛ دەستە. (دسته؛ پارتی)(٤) جەماوەری هۆزی پارت. (پارتی)(٥) لایەنگر؛ هۆگر؛ پشت‌گر. (پارتی)

پارتی‌بازی: فد:کارپێکهێنان‌بەهۆی سفارش و سپاردەی دۆست و ئاشناوە ؛کەسکەسانی؛ (ب) خۆمانەخۆمانە. (پارتی بازی)

پارتی‌دار: [ئاوەڵناو]پشت‌گەرم بوون بەهەوادار و لایەنگرەوە؛ خاوەن هەوادار و لایەنگر، کە کاری بۆ ئەنجام دەدەن ودەی سپێرن. (پارتی‌دار)

پارتیزان:فرد؛فد؛اند:[ناو] چریک؛ گەڕیلا؛ (گەریلا)کۆمەڵ یان گرووپ و دەستەی شەڕکەری شێوە پێشمەرگە و عەسکەر. .

(پارتیزان)
پارتیشن: اند؛ فد: [ناو] دیواری باریک یان چیغی بە تەختە یا قوماش کە ژوورێک دە-کاتە دوو کەرت. (پارتیشن) پارچەبافی: [ناو](١) پارچەچنێن؛ کووتاڵ چێکردن کاری چنینی کووتاڵ. (پارچەبافی)(٢) شوینی چنینی کووتاڵ و قوماش. (کارگاەپارچەبافی)
پارسا: فد: [ئاوەڵناو] (١) لە هێندی ئائیندا: (تەرکەدونیا). (پارسا:زاهد) (ب٢) پارێزکار؛ لە خوا ترس؛ دیندار. (پارسا)(٣) هەژار؛ سواڵکەر. (گدا. فقیر)
پارسایی: [ناوبەرهەمی‌چاوگە] (١) کار و ڕەوتی دینداری و لە خواترسی و لە خراپە پرینگانەوە. (پارسایی)(٢) هەژاری؛ گەدایی. (گدایی)
پارک‌وەی: فرد؛ اند: [ناو] ئینگلیزی(وەی: ڕێ،جادە)جادەی پان و بەرین کە بەناو دارستاندا تێدەپەڕێ؛ زیاتر دوو جادەی یەک-لایەنە لەپاڵ‌یەکدا(پارک‌وی)
پارکینگ: فد؛فرد؛اند: [ناو](١)گاراج؛ شوێنی-پارک‌کردن و ڕاگرتنی سەیارە. (پارکینگ)(٢) ئەزموونی پارک‌کردنی سەیارە بۆ وەر گرتنی پسوولەی شۆفێری.(پارکینگ)
پارکی‌وەحش: [ناو] شوێنێکی پارێزراوە بۆ ڕاگرتن و پاراستنی گیانلەبەران کە بە شێوەی ئاسایی تێیدا بژین و پیشاندنیان بە خەڵک. (پارک وحش)
پارەبوون: [چاوگە،ت] (١) دڕیان؛ بچڕان. (پارەشدن)) قرتان؛ بڕیان؛ لەت‌بوون. (قطع شدن)
پارە پارە: فد: (١) [ئاوەڵناو] لەت لەت؛ بچڕ بچڕ؛ تیکە تیکە؛ ونجڕ ونجڕ؛ کوت کوت.(٢) شڕو دڕاو؛ دڕاو لە چەند لاوە. (پارەپارە)
پارەوپۆرە:پارەوپوورە: [ئاوەڵناو] لەت وپەت؛ شڕودڕ.(پارە پورە)
پارین زیوی: ئەوەڵین دەورەی زەوین ناسی-کە ژیان لەو دەورەدا بە ئاو دەستی‌پێکرد. (پارین زیوی)
پاساژ: [ناو] پاساج؛ بینای گەورە کە هەموو ژوورەکانی موغازە و دووکان بێ. (پاساژ)
پاساسروشتی: [ئاوەڵناو] غەیری سروشتی؛ غەیری تەبێعی. (غیر طبیعی)
پاستارخانە: [ناو] شوێنێ پشوودان و ماندوویی دەرکردنی پاسەوانان و زێڕەوانان. (پاسدار خانە)
پاستاری: [ناو] نگابانی؛ زێڕەڤانی؛ چاوەدێری؛ چاودێری؛ ئاگالێبوون؛ ئێشکگرتن؛ کێشک دان؛ پارێزەری؛ ئاگاداری؛ (پاسداری)
پاستاری ئاشتی: [ناو،ت](١) هێزی پاراستنی ئاشتی سەربە ڕێکخراوی جیهانی، زیاتر لە سنووری دوو مەملەکەتدا کە نێوانیان ئاڵۆز بێ. (٢) ئەندامی ئەو هێزە. (پاسدار آشتی)
پاستۆڕیزاسیون: فد؛ اند؛ فرد: [ناو]کاری لەبە ین‌بردنی هوورگ و باکتێری لە خواردەمەنیە کاندا بەشێوەی گەرما پێدان بۆ ماوەی دیاریکراو و تێکنیکی تایبەت. (پاستوریزاسیون)
پاستۆڕیزە: فرد؛ فد؛ اند: [ئاوەڵناو] هەرماکێ کە میکروب (هوورک) و باکتێریەکانی بە شێوەی پاستۆڕیزاسیۆن لە بەین چووبێ،

وەک شیری پاستۆڕیزە. (پاستوریزە)
پاسیفیسم: [ناو] مەکتەبێکە کە چاوەڕوانە، ئاشتیی جیهانی لە بواری یەکسانی و خەباتی تێکڕاییەوە چاوەدێری بکرێ (پاسیفسیم)
پاسیۆ: فرد؛ فد؛ [ناو] نوورگیر؛ جێگەی ڕۆشنایی وەرگرتنی پەنجەرەیێک کە بەر ئاواڵە نییە. (پاسیو)
پاکسازی: [بەرهەمی‌چاوگە] (١) خاوێن کردنەوی شوێنێ لە پیسی و بزار؛ دە-رهاوێژتنی شتی پیس و خراپ. (٢)دەرکردنی کەسانی نا شایێست و نالایق لە ڕێکخراوەیێکدا؛ پاکتاوکردن؛(٣) دوورکردنەوەی شتی قۆرخ و قاچاخ لە شوێنێ بۆ ئەوەی لە دەست پشکنین نەجاتی‌بدا.(٤)ڕەوتی‌خاوێنکردنەوەی ماڵ‌یا شوێنێ لە شتی نالەبار و پیس.(پاکسازی)
پاکون: فد:[ناو،بک]کورتکراوی پاک‌کوون؛ هەر شت کە پاکەوە بکا. (٢)[]ناو (ب) مەساحە؛ میدادپاک‌کون. (پاک کن)
پاگوون: [ناو] (١) پارچە قوماشی سەرشانی سەرباز کە دوای شەش مانگ پێی دەدری. (٢) هەر ئەو قوماشە بۆ دروونی دەرەجە و ئەستێرەی ئەفسەران لەسەری.(پاگون؛ سردوشی)
پالئوسێن: ناوی خولی یەکەمی دەوری یەکەمی زەوین ناسی. (پالئوسن)
پالئولتیک: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] ڕۆژگاری کەونارا لە پێش خول و دەورانی بەردینە(حەجەر) دا. (پالئولتیک)
پالیت: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] تەختەیێکی دوو تۆیە بۆ ژێر کاڵای عەمبارکراو؛ لەکانزایش چێ‌دەکرێ؛ تەختەیێکی پان و ناسک و جەغز ئاسایە بۆ تێکەڵاوکردن و دانانی ڕەنگ، لە نگار کێشیدا بە کاردێ.(پالت)
پان ئیسڵاویسم: [ناو] یەکێتی ئیسلاوەکان و وڵاتگەلی ئیسڵاو. (پان اسلاویسم)
پان ئیسلامیسم: فرد؛ فد: [ناو] یەکگرتوویی وڵاتە ئیسلامیەکان و هەروەها ئیسلامەکان. (پان اسلامیسم)
پان‌تورکیسم: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] یەکێتی تورکەکان و هۆز و وڵاتیان. (پان ترکیسم)
پانتۆگراف: فرد؛ فد: ئامرازی وێنە کێشان . (پانتوگراف)
پانتەئیسم: فرد؛ فد: [ناو] ئایین و دینێک کە هەموو وزەیێکی سروشت بە خودا دەزانێ. (پانتەئیسم)
پاندۆڵ: فرد؛ فد: [ناو] ئاونگی هەندێ کاتژمێری دیواری کە وەک جوڵانە لە خوارێوە هاتوچۆ دەکا. (پاندول)
پانسمان: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] دەرمانکردن و پێچانی برین؛ برین پێچان؛ کاری شتنی برین بە دەرمان و پاک کردنەوە و مەڵهەم لێنان و پێچانی بە تەنزیف. (پانسمان)
پانسیون: [ناو] جێگاییێکی وەک میوانخانە کە لە بەرانبەر وەرگرتنی پارەیێکی دیاریکراودا، شوێنی مانەوە و خەو و خۆراکی کەسێک دابین دەکا. (پانسیون)
پان‌عەرەبیسم: فرد؛ فد؛ اند؛ عد: [ناو] یە کگر توویی هەموو وڵاتانی ئارەو و هەموو ئارەوی. (پان عربیسم)

پانکراتین: فرد؛ فد: [ناو] بەرهەمی پانکراس لە لەشدا. (پانکراتین)
پانکراس: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] لەوزە لمعیدە؛ ئەندامێکی ناو لەش لە ژێر گەدە دایە. (پانکراس)
پاوەرەقی: [ناو](١) پەراوێز؛ ژێرنووس. (زیرنویس.) (٢) ڕۆمانێ کە لە چەند ژمارە گۆڤاردا چاپ ببێت؛ زنجیرە نووسراوە لە گۆڤاردا؛ نووسراوەی سریالٚ لە بڵاوکراوەدا. (پاورقی)
پایەندە: [ئاوەڵناو] پایەدار؛ بێداوی بێ لەبەین چوون؛ پابەرجێ؛ ڕاوەستاو. (پاینده)
پراتیک: فرد؛ فد: [ناو] کردەوە بۆ فێربوون؛ مەشق کردن؛ فێربوون و کارامەیی بە کردەوە. (پراتیک. عملی)
پراگماتیک: فرد؛ فد: [ئاوەڵناو] گرێدراو بە پراگماتیسمە وە. (پراگماتیک)
پراگماتیسم: [ناو] مەیل و داخواز بە مەشق و کردەوە؛ بیرێکی فەلسەفی کە دەڵێ بۆ واتاکان لە تۆی مەشق کردن و کردەوەدا بگەڕێن. (پراگماتیسم)
پرسیارنامە: [ناو] پرسنامە؛ پەڕەی کاغەزی کە لەلایەن پرسیارەوە پرسی جۆراوجۆری تێدا نووسراوە بۆ وەڵامدانەوە، تەغەر بۆ ئەزموون یا بەرگەمکردن. (پرسشنامه)
پرەنس: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] پرێنس؛ شازادەبۆنێر.(پرنس)
پرەنسێس: [ناو] پرەنسێس؛ کچەشازادە. (پرنسس)
پروپاگاند: فرد؛ [ناو] پروپاگەندە؛ ڕاگەیاندن؛ ڕاگەیێنی؛ ڕێکلام؛ باڵگاشە. (تبلیغات)
پرۆسە: فرد؛فد: [ناو] ڕەوەند؛ بەرەوت؛ ڕەهەند؛ وشەیێکی فەرەنسیە و لەکوردیشدا بەکارد ەبرێ.(پروسه)
پرولیتاریا: فد؛ فرد؛ روس؛ [ناو]چینی کرێکاران. (پرولتاریا)
پرۆلیتێر:فرد؛فد؛روسد:[ئاوەڵناو]کرێکار. (پرولیتر)
پرەنس: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] پرێنس. شازادەبۆنێر.(پرنس)
پرەنسس: [ناو] پرەنسێس؛ شازادەی مێوینە. (پرنسس)
پرەنسیب: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] پرێنسیب؛ جێکەوتوویی کرداری؛ کەسایەتی ئیخلاقی. (پرنسیب)
پریز: [ناو] جێگەی دووشاخە یان سێ شاخەی سیمی کەرەستەی کارەبایی یان تەلەفۆن. (پریز)
پرێزیدنت: اند؛ فد: سەرکۆمار؛ سەرۆک کۆمار. (پرزیدنت)
پرێستیژ: فد؛ فرد؛ اند: [ناو] کەسایەتی. (پرستیژ).
پسیکۆلۆژی: فرد: [ناو] دەروونناسی؛ ڕۆح و ڕەوانناسی. (روان شناسی)
+ پشتەک: [ناو](١) سەرمەقولات؛ سەرمەو قولانج لەسەردەست؛ تەقڵە لێدانی فرندە. (پشتک) (٢)پشتە؛ کەرت؛ کەردوو. (کرت)(٣) لەژیمناستیک داهەڵگرانەوە و مەحەلەق لێدان لەسەردەست. (پشتک)
پشتەک لێدان: [چاوگە،ت] تەقڵەلێدانی فرندە؛

بە تایبەت کۆتری تەقڵەباز؛ سەرمە و قولانج لێدان؛ سەرمەقولاتلێدان؛ محەلەقلێدان و خۆ هەڵگێڕانەوە. (پشتک زدن)
پلاکارت: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] (١) قوماشی نووسراو بۆ هەڵواسین لەیاسای تازیە یا خۆپیشاندان و باڵگاشدا. (٢) کاغەز یان مقەبا یان قوماشی نووسراو کە لە خۆ پیشاندانا بە دەستیەوە دەگرن.(پلاکارت)
پلومب: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] (١) کاری مۆرکردن بە قورقوشم ، شەقڵ و دیاری کردنی درگای گاڵە دراوی هەر شت بە قورقوشم؛ (٢) ئامرازی پلۆمب کردن. (پلمب)
پوئەن: اند؛ فد: [ناو]ژمارەی سەرکەوتن لە یاریدا؛ لە والیباڵدا سێ پوئەنی لە سەریەک گرت؛ ڕەقەمی ئیمتیاز. (امتیاز. پوئن)
پۆرتابل: فرد؛ فد: [ناو] تایبەتمندی هەر شت کە بە دەست بگوێز رێتەوە؛ ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆنی پۆرتابل: دەستکدار. (پرتابل)
پورز: [ناو]پۆرز:(١) زۆپ و قوتکەگەلی ورد لەسەر ڕیخۆڵە(لەدیوی ناوەوە) و لە سەر زمان. (٢) پرووش؛ گرنجی و قوت بوونەوەی سەر شتی ساف وەک پورزی فەرش و خاولی (هەولە) (پرز)
پۆرزی ریخۆڵە: [ناو] قیتکەی وردی دەوری ڕیخۆڵە لە ناوەوە کە ماکگەلی پێویست لە ناوڕیخۆڵەوە دەبا بۆ ناوخوێن و لەشی بوونەوەر. (پرز رودە)
پۆرزیزمان: [ناو] زۆپ و قیتکەگەلی وردی سەرزبان کە لە هەر لایێکەوە دەستەیێک لەوانە هەست بە جۆرێک تام دەکەن و پەیغام بەمێشک دەدەن کە تاڵی و سوێری و ترشی و شیرینی هەست بکرێت. (پرز زبان)
پۆرس: [ناو] دەستیٚ خۆراکی خواردن لە چێشتخانە؛ دەستیٚکەباب: پورسیٚکەباب. (پرس)
پۆرسیٚ: دەستێک؛ ژەمیٚ خۆراکی یەک کەس؛ پۆرسیٚکەباب بەچەندە: دەستیٚ کەباب بەچەندە. (یکپرس)
پۆزیسیون: فرد؛ فد:[ناو]حاڵەت؛بارودۆخ؛ فۆڕم و حاڵەتزیاتر لە مۆسیقا دا.(پوزیسیون)
پۆستمۆدێرن:(پاستمۆدێڕن)فد؛اند: [ئاوەڵناو] پاش مۆدێرن؛ تازەتر لە مۆدێڕن. (پست مدرن)
پۆستمۆدێڕنیست: [ئاوەڵناو] پاش مودێرنیست. نوێخوازترلە مۆدێڕنیست. (پست مدرنیست)
پوستمۆدێڕنیسم: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] پاش نویٚ خوازی؛ هونەری دوای مۆدێڕنیسم؛ نوێتر لە مۆدێڕنیسم. (پست مدرنیسم)
پۆسکوڵوفت:پۆسکڵفت: [ئاوەڵناو] (١) هەر شت کە پێستی قەویبیٚ. (٢) (ب) ڕووداماڵاو؛ هیچ پیٚ مەنزور نەبوو؛ بەهیچ قسە و جوێنی شەرم نەکردن. (پوست کلفت)
پۆسیدە: فد: [ئاوەڵناو] پۆسیاو؛ ڕزیو؛ دافەتراو؛ لە (ف. مشە) یش دا هاتووە. (پوسیدە)
پۆلێتیک: فرد؛ اند؛ فد: [ناو]کردەوەی درۆ ودەلەسە لەڕامیاریدا؛ فێڵەبازی لە کاری رامیاریدا؛ (ب) زرنگی و دەسوگوێبڕیٚ و درۆ و دەلەسە. (پولتیک) پۆلێتیکلێدان:

[چاوگە،ت] فێڵوفەرەجکردن؛ کڵاو کردنە-سەر و کەڵەک لێدان. (پولتیک زدن)
پۆلیوێر: فرد؛ تد؛ فد: [ناو] چاکەتی چندراو لەکاموا یا بەن. (پولیور)
پۆماد: فرد؛ ئیتالیاد؛ فد: [ناو] مەڵهەم؛ مەڵحەم؛ ڕۆنی دەرمانی زام. (پماد)
پۆمپاژ: فرد؛ تد؛ فد: [ناو]کاریهەڵکێشانی ئاوەکی بە پۆمپ. (پمپاژ)
پوود: [ناو] پۆ؛ بەن یا داوێ کە لە سەر ڕایڵ (تاڵ)دەچنرێت. (پود)
پوورسان: [ناو] کورتکراوەی پوورسانت ئەویش کورتکراوەی پوورسانتاژە. > پوورسانتاژ. (پورسان)
پوورسانتاژ: [ناو] مزی، چەن لە سەدی جۆر کردنی موعامەلە؛ جۆرێ مزی دەلاڵی موعامله. (پورسانتاژ)
پووشە: [ناو] جۆرێک موقەبای ناسک و نەرم بۆ بەرگی پەروەندە (دۆسیە) (پوشە)
پووشەک: فد. [ناو] (١) > پیزۆکی. (٢) جۆری پێچراوەی لۆکە و قوماش لە بەینی پای زارۆکاندا دایدەنێن بۆ ئەوە کە پیسی بگرێتە خۆی. (پوشک)
پەڕاگەندە: [ئاوەڵناو] (ف.گیو) پڕشوبڵاو؛ پـرژ؛ بەلاف؛ جیا جیابوو؛ پەخشوپەلا؛ ئاوارە؛ پەخش؛ لەیەک پساو. (پراکندە)
+ پەرت: (١)پەرتکردن:کاری هاوێشتن و خستن و فڕێدان. (پرت)[ئاوەڵناو](٢)شوێن و جێگەی دوور کەوتوو؛ تەرت؛ جێگەی دوور لە هاتن و چوون؛ گوندەکەی ئێمە زۆر پەرتە: پەڕە؛ چەپەک؛ تەریک؛ دوورەدەس.
(پرت) (٣) بەحەت و نا ئاگا و ناحاڵی. (پرت)
پەرت بوون: (١)[ئاوەڵناو] (ب)پەرتبوون؛ دووربوون لە مەبەست؛ کابرا زۆرپەرتە هیچ حاڵی نابێ؛ نائاگا لە مەبەست. (پرت-بودن)(٢)[چاوگە،ت] کەوتنە خوار لە بەرزایی؛ هەڵدیران؛ پەرت بەستن؛ پەرت بوون؛ فڕێدران(پرت شدن)
پەرت بەستن: [چاوگە،ت] فڕێدران؛ پەرتم-بەست: فڕی درام: هەڵدێرام: کەوتمە خوارەوە. (پرت شدن)
پەرتدان: [چاوگە،ت] فڕێدان؛ خستن؛ هاوێژتن؛ هاوێشتن. (پرت کردن. انداختن)
پەرتکردن: [چاوگە،ت] فڕێدان؛ هاوێشتن؛ فڕدان. تووڕدان؛ هەڵداشتن.(پرت کردن)
پەرتکریاگ: [ناو،بەر]پەرتبووگ؛ پەرتبوو؛ پەرتکراو. (پرت شدن)
پەرتگە: [ناو] (پەرت+ گە) پەرت: (خستن، فڕێدان)، جێگەی فڕێدان؛ جێگەی کەوتنە خوار. (ب) جێگەی بەرز. (پرتگاە)
پەرتگە: [ناو] هەڵەموت؛ هەڵدێر. (پرتگاە)
پەڕوەزن: فد: [ناو] سووکترین ئەندامی دەستەی هاڵتێر لێدەران؛ لە دەستەی پەڕ وەزندا هاڵتێر لێدەدا. (پر وزن)
پەروەندە: فد: [ناو] (١) هەڤ نقیس؛ کۆمەڵێ زانیاری و بەڵگە و نووسراوە لە بارەی ڕابووردووی کەسێکەوە یا کارەساتێکەوە. (٢) جێگای ڕاگرتنی ئەو بەڵگانە. (پروندە)
پەروەندەسازی: فد: [ناو](ب)پاپۆش دروستکردن بە بەڵگەی درۆ؛ پیلان نانەوە. (پروندەسازی)

پەرەستاری: فد:[ناو](۱)شۆڵی پەرەستار. (۲) کاری ئاگا لە نەخۆشبوون و خزمەتی نەخۆش‌کردن. (۳) پێوەندیدار بە پەرەستارەوە. (پرستاری)

پەرەند: [ناو] جەوهەری سەرتێخی خنجێری دەبان و پۆڵا. (خطوط روی تیغەخنجر فولادی)

پەزان: فد: [پاشگر] واتا: کولان؛ هەڵوا پەزان؛ خورما پەزان:کاتی گەیشتنی خورما. (پیواژە؛ پختن)

پەزانن: [چاوگە،ت](۱) لێنان؛ کولاندن (پختن)(۲) (ب) نەرم کردنی لایەنێکی موعامەلە؛ نەرم کردنی کەسێک بە قسەکردن و ڕازی کردنی بۆ ئەنجامی کارێک. (پزیدن)

پەزین: [چاوگە](۱)پەزاندن؛ (ب) نەرم‌کردنی کەسێک بە قسە و ڕازی‌کردنی بۆ ئەنجامی کارێک. (پزاندن)(۲) کوڵین؛کولاندن.(پختن)

پەندنامە: فد: [ناو] پەرتووکێ کە ناوەرۆکی(ناوەرۆک)ی نووسراوەکەی قسەی نەستەق و پڕ لە ئامۆژیاری بێت. (پندنامە)

پەنهانکار:پەنامکار: فد:)ئاوەڵناو] ئاوژێرکا؛ کردەوە شاراوە؛ ئەوەی کار دوور لەچاوی جەماوەر دەکا؛ وەشێر. (پنهان کار)

پەنهانکاری:پەنامکاری: فد:[بەرهەمی چاوگە](۱) کاری شاردنەوەی مەبەست یا کردەوەیێ. (۲) ڕەوتی‌کردنی کارێ بەرپێوار و دوور لە چاوی خەڵک.(پنهان کاری)

پەهلوو: [ناو](۱) پاڵوو؛ پەهلی؛ خاڵیگە؛ لاتەڕافە؛ لاتەنیشت؛ کەلەکە. (پهلو) (۲) تەنگەی زین و کورتان؛ پاڵوو. (تنگ زین)

+ پەی‌زەنی: فد: [ناو]کاری چەن باوەقوورەت لە قەدیمدا کە شەڕی شیر و گورز باو بوو خۆیان دەکرد بە ناو لەشکری دوژمن دا و ڕەگی پشت پا ژنەیان دەبڕین؛ پەی لێدان. (پی زنی)

پەیمانی: فد: (۱) موچەخۆری قەراردادی و بڕیاری و غەیری ڕەسمی؛ بەپێی بڕیار؛ (۲) پێوندیدار بە پەیمانەوە. (پیمانی)

پێڕسپێکتیڤ: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] قوڵایی وێنە نیشاندان لە نیگارکێشیدا. (پرسپیکتیو)

پێڕسۆناژ: فرد؛ فد: کەسایەتیی هەریەک لە قارەمانانیٚ کە لە فیلمێکدا کایەدەکەن؛ (ئەکتەرەکانی سینەما و شانۆ). (پرسناژ)

پێڕسۆنێل: فرد؛ فد: [ناو] ئەندام؛ هەموو کارگێڕانی ڕێکخراوێک؛ کادر؛ کادێر؛ (پرسنل)

پێڕسۆنێلی: فد؛اند: [ئاوەڵناو] پەیوندیدار بە پێڕ سۆنێلەوە؛ لیباسی پێڕسۆ نێلی(پێرسونێل‌گەل) وێنەی پێرسۆنێلی برێتیە لە وێنەی۴×۶ سانت. (پرسنلی)

پیڕفیراژ: فرد؛ اند؛ فد:کونکردنی ورد و نزدیک بەیەک لە کەنار پەڕە بلیت و تەمر دا بۆئاسانتر لەتبوون ولێبوونەوە.(پیرفراژ)

پێڕمیەن: فرد: ئاخرین خولی چەرخەی هەوەڵی زەوی ناسی. (آخرین دورەاز دوران اول زمین شناسی)

پێڕێکامبێڕیەن: فرد؛ فد: سەرەتای مێژووی زەوین. (پیرکامبرین)

+ پێشرەفت: [ناو]ڕادەی چوونە پێشەوەی-

کارێک یان کردنی کارێک؛ کاری بینا کە چەندەی پێشڕەفت کردووە؟ (پیشرفت)

پێشڕەوی: [ناو](١) کاری بەرەو پێش چوون؛ لە شکری دوژمن نەیتوانی پیشڕەوی بکا: نەیتوانی بێتە پیشەوە. (پیشروی)(٢)(ف.گیو)ڕابەری؛ ڕێنیشاندان. (رهبری)

پیکنیک: فرد؛ فد: [ناو](١) کار و ڕەوتی چوونەسەیران و گەشت و هەرکەس خەرجی لە عۆدەی خۆی؛ (پیک، پیکی)، کورتکراوەی پیکنیک و پیکنیکی؛(٢) دەستە جەمعی شت یا خۆراکی کڕین کە هەرکەس پارەی خۆی بدا. (پیک نیک) (تێبینی) بەشە پارەیێک کە هەرکەس بابەتی پیکنیک دەیدا پێی دەڵێن (پیک) یابەش.(پیک)

پیکنیکی: [ناو](١ب) ئەزبەی گچکەی گاز تایبەت بۆ پیکنیک چوون. (گاز پیک نیکی) (٢) چوونە سەیران بەشێوەی پیکنیک. (پیکنیکی)

+ پیل: فرد؛ فد: [ناو] قووە؛ باتری وشک؛ ئامرازێ بۆ وەدەست هێنانی گەڕیانی کارەبای یەک‌لایەنە لە وزەی‌کیمیایی. (پیل)

پیلیۆسێن: فرد؛فد: پێنجەمین و ئاخرین‌خول لە خولی سێهەمی زەوین ناسی. (پلیوسین)

پیلی‌هەتاوی: [ناو] ئامرازێکە لە هێزی هەتاو هێزی کارەبایی پێک دێنێ. (پیل خورشیدی)



تئۆک: [ناو] تاووک؛ چادر؛ ڕەشماڵ؛ تـاوڵ؛ خێوەت.(خیمە)

تاب: [ناو] فد. (ف.مشە) (۱) تاو؛ توانا (تاب) (۲پاشگر) تریفە؛ ڕووناکی(روشنی)(۳)پێچ وتاب.(پیچ وتاب)

تابان: [ناو] فد. ناوی ژنانەیە(اسم زنانە)

تابڕ: [ناو] دوعای لەرز و یاو کە بەسەر ڕێسمانێکدا دەخوێندرێت و لە مەچەک دە- بەسترێت.(دعای تب بر) >لۆبڕ

تابڕ: لۆبڕ: [ناو] پچڕانی تاڵی تەون؛ پچڕانی لۆییێک لە تان.(قطع رشتە ای درقالیبافی)

تابلۆ:تابڵۆ: [ناو] فد.تد.(۱) یەکەی ژماردنی وێنەی کێشراو (نەققاشی) یان ڕەسم و نووسراوەی لە قاپ گیراو.(۲)نووسراوەی سەرتەختەی دار یا شووشە و کانزا و..کە لە سەر دەرکی ڕێکخراوەکان هەڵدەواسرێت (۳) نیشانەکانی ئاگادەر و ڕاگەیێن لە سەر شەقام، یان لە ڕێکخراوەکاندا بۆ ڕێنوێنی دادەندرێن. (تابلو)

تابلۆ: [ناو] تابڵۆ:(ب) لە بەر نائاسایی بوون،سەرنجڕاکێش و زەق؛ کەس یان شتیٚکە بە زەقی نیشاندەری کار یان خوو و خدەییێکە، (ئەو کابرایە تابلۆیە) بە ڕەنگ و ڕوویدا دیارە تریاکییە. (تابلو)

تابلۆی ڕێنوینی سەر شەقام: تابلۆی دانراوی سەر ڕێگەی هاتوچۆی سەیارە بۆ ڕێنموونی و ئاگادارکردن(تابلوی راهنمایی)

تابلۆی شێوەکاری: (۱) تابلۆی ئامادە کراو بۆ نیگارکێشان.(۲).تابلۆییێک کە نووسراوە یان وێنەی لە سەر کێشراوە. (تابلوی نقاشی)

تابوشت: [ناو] تاقەت؛ خۆڕاگری.(تحمل)

تابوو: [ناو] اند. هەر شتی بە خراپ یا حەرام لە قەڵەم دراوی ناوکۆمەڵگا یانلە بواری ئایینییەوە.(تابو)

تابوو: [ناو] فد. شتی پیرۆز وکەونارا کە دە- بیٚ بپارێزرێت و تێکنەدرێت وەک گۆڕی چاک و پیری قۆرغکراوی ئایینی و کۆمە- ڵایەتی. (چیزهای باستانی ومقدس).

تابوورە: [ناو] (۱)فەوجی هەزار کەسی لە سپادا. (فوج هزارنفری سرباز) (۲) یاسا؛ دە- ستوور.(قانون)

تابووق: [ناو] خشت؛ کەرپوچ.(خشت)

تابیلا : [ناو] دووپاتکردنەوەی داوخواز. (تکرارکردنتقاضا)

تابێتی:[ئاوەڵناو]تایبەتی؛ تاویەتی؛ تایوەتی. (مخصوص)

تابیە: [ناو] مەتەرێز؛ سەنگەر.(سنگر)

تاپۆ: [ناو] پەیکەرە.(مجسمە).

تاپیر: [ناو] فد: گیانداریٚکی گیاخۆری ناوچە- ی گەرمەسێری مالایا و سووماتڕایە.(تاپیر)

تات: [ناو] فد: لە وڵاتە تورک نشینەکاندا بەو کەسانە دەڵێن کە بە زمانی فارسی دە

دوێن.(تات)+< تاتی
تاتار: [ناو] فد: تەتەر؛ ناوی ئێلێکی تورکی مەغوول،لە نیژادی زەردپۆستاڵی ئاسیای ناوەندی .(تاتار)
تاتاڵە:[ناو] تاجکۆڵەکە؛ سەرکۆڵەکە. (سرستون)
تاتک: [ناو] ئارەو؛ زمانی ئارەوی؛ برای‌باب؛ ئاپ.(عرب؛عربی؛ عمو)
تاتۆڵە: [ناو] گیایێکە بەرەکەی لە هێلکە ڕیشۆڵی دەکا و دەسووتێنرێت دووکەڵەکەی هوورک کوژە؛ گیاگۆپاڵیشی پێدەڵین.(تاتوره)
تاتوو: [ناو] فد: جۆرێک ئەسپی کورتەباڵای کلک ویاڵ درێژە. (تاتو)
تاتەنوێژ: [ناو] بەردی پان بۆ نوێژ لە سەر کردن.(تخته سنگی که روی آن نمازمی-گذارند)
تاتی: [ناو] حاڵەتی تات بوون؛ کچێ‌کە کرۆژکرۆژە بەر منداڵدانی گرتبێت.(حالت-دختریکەجلوزهدانش راغضروف گرفتەباشد)
تاتیزۆک[ناو]گەردەلوول؛گێژەڵووکە.(گردباد)
تاج: تاز. تاژ. [ناو] فد: ناوی باپیرەی زوحاکە بەواتای تانجی، چونکی ئارەو لە بنەچەکی ئەون، فارسەکان پێیان دەڵێن تازی. (تاج؛ تاز)
تاجخورووز:[ناو] تانج خورووس؛ گوڵێکی سوورە؛ گوڵە مەخمەری؛ گوڵ‌قەدیفە؛ کۆفکا دیکی. (تاج خروس)
تاجوتەخت:[ناو،ت] فد: نیشانە و دروشمی پاشایەتی.(تاجوتخت)
تاجەگوڵ:[ناو] تاجەگوڵینە؛ کڵاو یان جەغزی لە گوڵ چێکراو بۆ پێشواز یان ڕێزگرتن .(تاج گل)
تاجی‌سەر: [بۆ ڕێزگرتن](ب) واتا: جێگات لە سەر سەرە؛ بەڕێز و سەروەر. (تاج‌سر)
تاجیک: [ناو] فد. <تاجی؛ خەڵکی تاجیکستان؛ ڕیوایەتە لەڕەچەڵەکی(هۆشەنگ)ی برای(تاج)ن (تاجیک)
تاچک: [ناو] بونچاخ؛ تاپۆ؛ قەواڵە. (بنچاخ)
تاچنای: [چاوگە] دەڵاندن.(نشت کردن)
تاچیک:تاجیک: [ناو] بێگانە؛ بیانی؛ زەڕدە-شتیەکان بە غەیری زەڕدەشتیەکانیان دە-گوت، بەتایبەت بە ئارەویان دەگوت. (تاجیک)
تاخت: [ناو] فد: (ف.مشه) غارە ئەسپ بە چوارناڵ. (تاخت)
تاخچە: [ناو] تاقچە؛ ڕەفحە. ڕەفە. (طاقچە)
تاخووک:[ناو]کالیسکە وعەرەبانەیقە دیمی سەر بەفر؛ بە مۆدی ئەورو(ئیسنۆمبیل) (گاری روی برف)
تاخە: [ناو] پاکەت؛ بەستە.(پاکت؛بستە).
تادرگا [ناو] لنگەی دەرکە؛ تای دەرکە .(لنگەدر)
تار: [ناو] فد: (۱)ئامێری مۆسیقایە؛ دووتار؛ سێتار؛ سیتاری(هێندی)؛ تاری‌شیراز؛ تاری - قەفقاز؛ (۲)تاڵی هەموو سازێکی تە-لدار(سیمی).(تار).
تارانی: [ناو] خەڵکی تاران.(تهرانی).
تاراوگە: [ناو]جێگای مرۆڤی تاراو؛ جێی کە-سێکی هەڵداشتراو (دوورخراوە). (تبعیدگاه)
تاربوون: [چاوگە،] تەرەبوون؛ هەتلەبوون؛

ئاوارەبوون. (آوارەشدن)
تاربوون: [لە ریشەی تاریک] لێل بوون؛ تاریکبوون. (تارشدن)
تارپ: [ناو] دیاری؛ سەوقات.(سوقات)
تارژەن: [ناوبک] تارلێدەر.(تارزن)
تارشە: [ناو] پەیامبەر؛ چەپەر؛ پۆستچی؛ تەتەر؛ (پستچی)
تارلێدەر: [ناوبک] تارژەن.(تارزن)
تارمە: [ناو] نەردە و مەحجەریی قەراخ پلیکان؛ چیخ و چارداخی لەشوول چێکراو، باڵکونی نەردەداری بەر پەنجێرە(تارمی)
تارنان: [چاوگەت] ڕاونان؛تارنیان؛ ڕاونیان.(دورکردن.دنبالکردن)
تاروپۆ: [ناو] (ف.گیو) تان و پۆ. (تاروپود)
تاریکبیر: [ئاوەڵناو] تاریکمژی؛ سیاویر؛ دژی ڕۆشنبیر.(تاریکاندیش)
تاریکخانە: [ناو] فد: ژووری تاریک بۆ ڕەعەمەل هێنانی فیلم و (نیگاتیف). (تاریخانە)
تاریک و ڕوون: (١) ناوی کتێبێکی شێعری مامۆستا هێمن.(نامکتاب استاد هیمن) (٢)[ئاوەڵناو] تاریک و لێل؛ گورگ و مێش؛ تاریک و ڕوون. (تاریک وروشن)
تارێنەر: [ناوبک] دەتارێنێ؛ ڕاونەر.(آوارەکننده)
تازە: فد:(ب١)[وتە] ئیتر؛ ئەیتر؛ تازەپێی ناگەم: ئیتر پێی ناگەم. (دیگر)(٢) [ئاوەڵناو] نەو؛ نوێ. (تازە)
تازەبووک: [ئاوەڵناو] نۆبووک؛ تازەوەوی؛ ژنی تازە شوو کردوو. (تازەعروس)
تازەجەوان: [ئاوەڵناو] لاو؛ تازەلاو؛ (سروە هات خونچە گوڵی باغی ئەدەب پشکووتن، باخەوانی گەرەکە، تازەجەوان، من چبکەم) «هێمن» (نوجوان)
تازەزاوا: [ئاوەڵناو+ ناو] مرۆڤێ کەتازە ژنی هێناوە؛ زاوا لە مانگی هەنگویندا. (تازەداماد)
تازەسوو: [ناو+ ئاوەڵناو] تازەساو (ب) تیژ. (تازە تیزشدە)
تازەقڵا: [ئاوەڵناو] (ف.گیو) ناشی؛ نابەڵەد ؛تازە دەستی بەکارێک کردووە؛ تازەکار؛ شتی تازە داهاتوو.(تازەکار؛ تازە مد شدە)
تازەنەفەس: [ئاوەڵناو] فد:ماندوویی دەرچوو. پشوو دەرچوو؛ (ب)کاتی دەستپێکی‌کار؛ دژی ماندوو. (تازەنفس)
تازەیی: فد: [ناو] حاڵەتی‌تازەبوون؛ نوێبوون؛ (ب) حاڵەتی کەرەستەی تازە،کارنەکردوویی.(تازگی)
+ تازیە: [ناو] گەنمی دەستاڕکراو؛ گەنمی نیوەکوتراو. تازیمانە.(گندم نیمکوب)
تازیەدار: [ئاوەڵناو] عەزادار؛ ڕەشپۆش؛ ئازیەتبار.(عزادار)
تاز: ڕەشماڵ و دەواری بەرزی پەشمینە.(چادربلند پشمی)
تاژانک: [ناو] تازانک؛ شێلاق؛ قەمچی؛ تازیانە. (شلاق)
تاژلۆرە: [ناو] تاوێرە بەردی خلۆرەوەبوو لە بەرزاییەوە. (سنگ‌بزرگ کە ازبلندی غل دادە شود)
تاس‌وتەبەق: [ناو] (ب) خشڵ‌وخاو؛ زیوەری‌ژنان. (زیورزنان)
+ تاس: [ناو] (١) فد: مۆرەی تەختە نەرد.

(طاس) (٢) [ئاوەڵناو] هـەویـز؛ مـووی سـەر وەریو. (طاس) [ناو] دەفری گەورەی تایبەتی گەرماو. (طاس)
تاس‌بازی: فد: مۆرە بازی؛ قومار بە مۆرەهە- ڵخستن. (تاسبازی)
تاسبی: [ناو] دوژمنایەتی؛ نەیاری(دشمنی)
تاس‌هەڵخستن: [چاوگە،ت] تاس‌هەڵاویشتن؛ (ب)تاسبازی. (تاس‌انداختن)
تاسکەتاسک: [ناو] بە ناز ولەنجە ڕۆیشتن؛ (کە دەکـەن تاسـکەتاسـک ڕەوەکـترن لـە ئاسک) (خرامیدن)
تاسگرتن: [چاوگە،ت] حاڵەتی تەختەبازیٚ کە بتوانی مۆرە بگرێت و هـەر خـاڵیٚ دڵخـوازی بێت بیهێنێت. (تاسگرفتن)
تاسمە: [ناو] (١) مەزرای چکۆلە. (٢)کاسـمە؛ بـەلـەچـەک(١)مزرعـە کشـتکاری کوچـک (٢)قاچ کـدوی خشـک شـدە) (٣)سـیرمەی پـانی قـایش یـان جیـر، هـەڵسـووڕێنەری (پوولی) لە مەکینەدا(تسمە)
تاسنای: [چاوگە] تاساندن(نزدیک‌بەخفگی)
تاسوولقە:[ناو]سواڵەت؛ئـەشـکەولـەت(تکـە کوزەسفالین)
تاسەدار: [ئاوەڵناو] ئارەزوومـەنـد. (آرزومنـد )
تاشت: [ناو] چاشت؛ بەرقلیان(صبحانە)
تاشتەی:[چاوگە]تاشین؛ تراشین(تراشیدن)
تاشەبەرد: [ناو] تراشەبەرد؛ تیشەشاخ؛ تاتـە- تەوەن. .(تختەسنگ)
تاشە تەوەن: [ناو] تاتەبەرد. (تختەسنگ)
تاشەوان : پسپۆڕی لـە بـەرد سـەرکـەوتـن؛ (صخرە نورد)

تاف: (ف.گیـو) هێرش؛پـەلامـار؛ هـورووژم. (حملە؛ یورش)
تافال: [ناو] سیڤاندە؛ سـوانە؛ سواندە؛پاسـارە. (اضافی لب بام)
تاڤاندن: ئاتیواندن؛ تاواندنەوە(ذوب کردن)
تاڤزەرک: [ناو] زەردەی خۆرئاوا؛ دەمە وئێواریٚ(قبل ازغروب)
تاڤـــک: [نـــاو] ڕوونـــاکی؛ ڕۆشـــنایی؛ نوور(روشنی)
تاڤکەتن: [چاوگـە،ت] خۆرکـەوتـن. (طلـوع آفتاب)
تاڤە هەیـڤ: [ئـاوەڵنـاو+ نـاو] مانگـەشـەو؛ ڕووناکیی مانگ. (مهتاب)
تاق‌تاقە: [بەند]تاقە تاقە؛ یەک یەک؛ چنارە- کان تاق‌تاقەیان مـاون؛ زۆربـە یـان وشـک بوون؛ تاقولۆق. (تک تک)
تاقمانە جفت : [ناو] تاقمانە جووت(بازی‌تاک یاجفت)
تاقنما [ناو] کۆنگرەی کەوانی(هیلالـی) لـە- دیواردا. (طاق نما)
تاقەتکردن: [چاوگە،ت]حاواندنـەوەی ئـاژەڵ ؛(ب)ئاڵف کردنە بـەرماڵـات. (رسـیدگی بـە حیوانات)
تاقەجانە: تەقەجانە: [ناو] گیرخـواردنی نچیـر لە جێی سەخڵەت و بێدەرەتانـدا(گیرافتـادن شکاردرجای دشوار)
تاقی‌برۆ: [ناو]کەوانی‌برۆ؛ شوبهاندنی بـرۆ بـە تاقی کەوانی. (طاق‌ابرو)
تاقی پیرۆزی: [ناو] تاقێک کە لە سەرشەقـام و جادە، بە هۆی جەژن گرتن یان ڕێزگـرتن

به هۆی هاتنی کەسێکەوە چێ دەکرێت.
(طاق نصرت)
تاقیزەڕ: [ناو] زەڕکڵاو؛ تاسکڵاوی نەخشێنراو بە لیرە و خشڵ. (کلاه ئارایش شده باسکه زر)
تاقیکەردەی: [چاوگە،ت] تاقیکردنەوە؛ ئاروین کاری. (آزمایشکردن)
تاکانەوە:[چاوگە،ت] تاکیانەوە؛ بەجێهێشتن؛ تەرک کردن. تاسیانەوەی مەل لە هێلانە. (ترککردن؛ جاگذاشتن)
تاکسی: [ناو] فرد؛ فد؛ اند: سەیارەی ڕاگوێزانی مسافیر، زیاتر لە ناوشاردا(تاکسی)
تاکسیبار [ناو] سەیارەی بارکێش زیاتر سەیارەی چووکی سەر بەتاڵ پیکاپ (وانێت)ی بارکێش. (تاکسیبار)
تاکسی تەلەفۆنی: [ناو] فد: جۆرێک تاکسی کە بە تەلەفۆن بانگ دەکرێت. (تاکسی- تلفنی)
تاکولۆ: [بەند] تەکولۆ؛تاقولۆق؛ تاک- وتروک؛ درێژ وکورت.(تک تک؛ بلند وکوتاه)
تاکوێ: [بەند]تا چ جێگایێ؛ تا چ ڕادەیێ. (تاکجا)
تاکە: (۱)تاقە، جووت نییە.(تک است) (۲) [پێشگر]تاکە کەسێک: تاقە کەسێک. (یک)(۳) [بەند] تا؛ تاکو؛ هەتاکو؛ تاکەتێ. (تا)
تاکەتێ : [بەند]تاوەکو؛ تاکو؛ تائەوکاتە. (تاوقتی که)
تاکەوبوون: [چاوگە،ت] دابڕان؛ جیابوونەوە لە کۆڕ.(اشتقاق)

تاکەی: [بەند] هەتاکەنگێ؛هەتاکەی؟. (تاکی)
تاکی: (۱) تۆ تاکی: تۆ تەنیای.(تنها هستی) (۲) [ناو] تەنیایی. (تنهائی).(۳) [بەند] هەتا؛ تاکەتێ؛ تاکی تۆهاتی ئەو ڕۆیی: هەتا تۆ هاتی ئەو ڕۆیی.(تا)
تاڵش: [ناو] ناوچەیەکە(ناوچەییێکە) لە باشووری ئێران (طالش)
تاڵوتوون: [ئاوەڵناو] (۱)تاڵوتیژ؛ تاڵ- وتوند.(تلخ وتند) (۲)ڕق هەڵساو؛ ناوچاو گرژ.(عصبانی)
تاڵەبانی: ناوی بەڕێز مام جەلال تاڵەبانی هەوەڵین سەرکۆماری کوردنیژادی دەوڵەتی- عێراق، و ناوی عەشیرەتەکەی( اولین رئیس جمهور کرد عراق، جلال طالبانی ونام طایفه ایشان )
تاڵەبانی: ناوی خێڵێکیگەورە لە هەرێمی کوردستانی باشوور. (طالبانی)
تاڵەبۆر: [ناو] مەڕی بۆری ئامالڕەشی یە کدەست، بێ پەڵەی سپی. (رنگ گوسفند)
تاڵەبۆربەڵەک:[ناو] مەڕی ڕەنگ بۆری پەڵە سپی کە جەغزی ڕەش یان سوور بە سەر سەریەوەبێت.(رنگ گوسفند)
تاڵەڕەشبەڵەک: [ناو] مەڕی ڕەش بە پەڵەی سپییەوە و چەند جەغزی سوور بە سەر سە- ریەوە. .(نوعی رنگ گوسفند)
تاڵەڕەش: [ناو] مەڕی ڕەش کە چەند جە- غزی سوور بەسەریەوەبێت. (رنگ گوسفند)
تاڵەسوور: [ناو] مەڕی سوور کە چەند جە- غزی ڕەش لە سەریدابێت. (رنگ گوسفند)

تاڵەسووربەڵەک: [ناو] مەڕی سووربەڵەک بە چەند جەغزی ڕەشەوە لە سەر سەری. .(رنگ‌گوسفند)
تاڵەشین بۆر: [ناو] مەڕی بۆرە بە چەند جەغزی شین و سوورەوە لە سەر سەری. .(رنگ‌گوسفند)
تاڵەشین‌سپی: [ناو] مەڕی سپی بە چەند جەغزی سوور و شینەوە لە سەر سەری. (رنگ‌گوسفند)
تاڵەشین‌سوور: [ناو] مەڕی سوور بە چەندجەغزی شینە وە لە سەر سەری. (رنگ‌گوسفند)
تاڵەشین‌ڕەش: [ناو] مەڕی ڕەش بە چەند جەغزی سوور و شینەوە لەسەریدا. .(رنگ‌گوسفند)
تاڵیتوسک: [ناو] تاڵیتۆز؛ تانتۆز؛ گیاییێکی باڵا بەرزە بە گوڵی زەرد وگەورەوە. (نام گیاهی است)
تاموخوا:[ناو] تاموخوێ؛(ب)تام و لەززەت؛ (ب) تامی‌قسە؛ نمەک. تام و مەزە. (مزە؛ نمک)
تام وخوێکردن : [چاوگە،ت] لە چێشتی‌سەر ئاگرچێشتن بۆ تاقیکردنەوەی ڕادەی خوێ و ڕۆن و ئەدوا. (چشیدن غذای روی‌آتش ازنظرنمک و روغن)
+ تان: [جێناوی لکاوی کەسی دووهەم کەسی‌کۆ] وەک: براتان،کوڕتان، ماڵتان. (ضمیر متصل دوم شخص جمع).
تانجکوڵەکە : [ناو] کوتە داری سەر ئەستوون کە دەکەوێتە بەینی کاریتە و وێستوون.تاج کوڵەکە. (سرستون).
تانج کەڵەشێر: [ناو] پۆپەی کەڵەشێر.(تاج-خروس)
تانجی قولانج: [ناو] حوشترخوا؛ بالووک؛ تاژیلۆکە؛ کە دوای جووت بوون، مێوە نێرەکەی دەخوا. (آخوندک)
تانکێر: [ناو] اند؛ فد: (١)بۆشکە و بەرمیلی زۆرگەورە. (٢)سەیارە و پاپۆڕی تراوکێش،زیاتر نەوت‌کێش. (تانکر)
تانگ: [ناو] دەبابە.(تانک)
تانگۆ: [ناو] فد؛ فرد؛ اند: [ناو] جۆرێک هەڵپەڕکێ(ڕەخس )ی ئارام و نەرمی دوو کەسی ئورووپیە. (تانگو)
تان‌وپۆ ئاورێشم: [ئاوەڵناو] لە لایەن دایک و بابەوە ئەسڵ زادە؛ (ب)بەر و پشت ئەتڵەس. (از دو طرف پدر و مادر،اصیل)
+ تانە: [ناو]تەشەر؛ تیز؛ تانووت؛ قسەیێ بۆ سەر کۆنە کردن؛ تەعنەی ئارەویە و کوردکاری بووە.(طعنه)
تانە : [ناو] تەیمان؛ دیواری بەچەپەر. (دیوار با ساقەهای باریک درخت.)ف.هەن لکەی سەر چاو.
تاوار : <تەوار ف.هەن
تاوان: [ناو] فد: دانی پارەی دۆڕاو لە قوماردا بە حەریف.(تاوان) +
تاواندەر: [ناو،بک] تاوانبژێر؛ (بەهەموو مانایێکەوە) زەرەربژێر. (دهنده تاوان)
تاوای: [چاوگە] تاواندنەوە؛ ئاتیواندن.(ذوب کردن)
تاوبازی: [ناو] جوڵانێ.(تاببازی)

تاو- تاو: [بەند] دەم- دەم؛ جار- جار؛ چەل چەل. (هردم؛گاهی)
تاوتوی‌کردن: [چاوگە،ت] پشکنین؛ بنج- وبناوانی مەبەستی ڕوون کردنەوە؛ شیکردنەوە؛ شروڤەکردن. (تحقیق وبررسی)
تاودار: [ئاوەڵناو] لار؛ تابدار؛ خوار؛ لوول- خواردوو؛ قژی تاودار: قژی لوول. (تابدار)+
تاودان: غاردانی ئەسپ بە چوارنال؛ تەنگە- تاوکردن؛ زۆر بۆ هێنان؛ بەتایبەت بۆ دەسبە- ئاو چوون. (فشارآوردن)
تاوشت: [ناو] تابشت؛ تاقەت؛ هێز؛ وزە؛ تووانایی. (توانائی)
تاوکار:[ناو،بک]ڕێختەگەر؛ قاڵب ڕێژی کانزا. (کارش ریختەگری است)
+ تاوڵە: [ناو] یاریی تێنیسی سەر مێز؛ پینگ پۆنگ. (پینگ‌پنگ)
تاوڵەکێفی: [ناو] گژنیژە کێویلە.(گشنیز کوهی)
تاوڵێ: [ناو] گیای بەناڕۆمی؛گژنیژ؛ دەرمانە بۆ نەزۆکی و بەهێزکردنی گەدە و (لەوزە- لمیعدە) و بۆ دەڵەمیزیی شەوانەی منداڵ. (گشنیز)
تاووک: [ناو] چادر؛ ڕەشماڵ؛ تاوڵ؛ خێوەت؛ تئۆک. (خیمە)
تاووگ: [ناو] تایلە؛ دارێکی کەژییە.(درختی- کوهی‌است)
تاوەسووت: [ئاوەڵناو] لە بەر خۆر سووتاو؛ تاوانگاز. (آفتابزدە)
تاوهەڵگرتن: [چاوگە،ت]گێژبوون؛ گێڕیان؛ وەک تەختەی تەڕ کە لار وگێڕ دەبێت.(تاب برداشتن)
تاهۆڕ: [ناو] تاجەواڵی گەورە. (جوال‌بزرگ)
تای: [ناو] (١) هۆزی زەردپۆستاڵی وڵاتی تایلەند و دەردۆری.(٢)زمانی سیامی و هێندوچینی.(تای)
تایاخ: [ناو] پاپۆش؛ کەوش.(کفش)
تایپ: [ناو] اند: فد: مەکینەی نووسین(پیت چن). کارکردن بەو مەکینە.(ماشین‌تایپ؛ تایپ)
تایپیست:[ناو]اند؛ فر؛ فد: پیت‌چن. (تایپیست)
تاییس: ناوی ئافرەتێکی خایین کە میللەتی خۆی فرۆشت و پاڵیدا بە ئەسکەندەری مە- قدوونیەوە. (تائیس)
تایینجە: [ناو] نیوەی تاڕەشکەی یەکسەری بە دوان دەبنە ڕەشکەیێک؛ نیوەی دووتایی. (لنگەتورکاەکشی)
تاییە: [ئاوەڵناو] دڵ‌مردوو؛ خۆپارێز. (دل‌مردە)
تبل: [ناو] قامک؛ پەنجە؛کلک؛ ئەنگووس. (انگشت)
تبلابەرانێ: [ناو] قامکەگەورە؛ تبلامەزن؛ کەڵە مووس. (انگشت شصت)
تبلاڕۆخێ: [ناو] قامکی براتووتەڵە؛ براتووتە.(انگشت بنصر)
تبلاقچیلک: [ناو] قامکە تووتە. (انگشت کوچک)
تبلانێوەکی: [ناو] قامکی قووتێ.(انگشت وسط)
تبلەک‌لسەرنینە: تبلێکی لە سەرنیە.(ب)عە- یبی نییە؛ عەیبی لە سەرنیە.(بی‌عیب ولکە)
+ تراتین: (١)هات‌وچۆی شتی هەلواسراو،

وەک جووڵانەوەی جوڵانیٚ. (آمدورفت تاب)
(٢) تەڕاتین؛ گێڕانی ئەسب بۆ وشک بوونەوەی عارەقی لەشی.(راەبردن اسب برای خشک‌شدن‌عرق تنش)
تراشە: [ناو] توٚڵاشەی دەمە تیخ و ڕەندەی نەجاڕی. (تراشە)
تڕاوەری : [ناو] ڕاگوێزی؛ هاتن وچوون؛ بردن و هێنانی کاڵا؛ ئەم وشە کوردیە چووەتە نێو زمانی فارسی و بووەتە (ترابەری) (ترابری)
تربووس: [ناو] شوٚ؛ شیٚ؛ نم؛ شە. (نم)
تربەسپی: خوٚڵەسپی؛ ئاخا سپی؛ ڕەنگە لە (تور بەت)ی ئارەوی کوردکاری کرابێت. (گل‌سفید)
+ تڕترە: [ناو] موٚتوٚڕسیکلێت. (موتورسیکلیت)
ترچک: [ناو] گیاگوڵەنک. (مارچوبە)
ترسوٚ: [ئاوەڵناو] ترسەنوٚک: (ترسو)
ترسوٚک: [ناو] ترسوٚ؛ ترسەنوٚک. (ترسو)
ترس‌هێنەر: [ئاوەڵناو] بوونە هوٚی سام لێکردن؛ ترس بەدیهینەر. (ترس‌آور)
ترسێنەر: [ئاوەڵناو+ ناو،بک]کەسیکٚ کە دەترسێنی؛ ترس هێنەر؛ بەسام. (ترسناک)
ترشکە: [ناو] ترشوٚکە؛ گیای خوٚراکی‌کەو. (ترشک)
ترشەکشمیش: [ناو] کشمیشەکەوڵی؛ سەرچک؛ زریشک. (زرشک)
ترشەکە : > ترشکە
ترشێنە: [ناو] هەویرترش.(خمیرمایە)
ترکزە: [ناو] (١) دڵ‌نیگەرانی؛ گێژەن؛ توٚکز؛ گێچەڵ؛ بقە. (ترس‌ونگرانی؛ پاپوش؛خطر).(٢) تەڵە؛ داو؛ تەپکە. (تلە؛دام)
ترگار: [ناو] ترار؛ دەفری گەورە.(ظرف بزرگ)
ترگژوٚک: [ناو] تەیروٚک؛ تەرزە.(تگرگ)
ترمسک: [ناو] ترماسک؛ تیلماسک؛ زەنگەتە تریٚ؛ بوٚڵە تریٚ. (خوشەانگور)
ترمە : [ناو] فد: تێرمە؛ قوماشی پەشمینە یان لە ئارمووش. (ترمە)
ترنگین: [چاوگە] زیاتر بوٚ دەنگە وەک: ئاوێژەی دەنگ؛ گەڕانەوەی دەنگ؛ دەنگدانەوە؛ زڤرینا دەنگی. (طنین)
تروان: [چاوگە] چڵدان؛نەبز؛ وەک: پتدانی‌دەمار .(نبض)
تراوندن: [چاوگە،ت] نەبزلێدان؛ پتلێدان؛ چڵ لێدان.(نبض زدن)
تروٚمبوٚن:[ناو]ئامرازێکی موٚسیقایە(ترومبون)
تروٚمپێت: [ناو] فرد؛ اند؛ فد: ئامرازێکی موٚسیقایە سیٚ کلیل (کون)ی هەیە و بە فوو دەژەندرێت. (ترومپت)
ترولاق: [ناو] تەپاڵە: (تاپالە)
trووسکایی: [ناو] ڕووناکیی‌کەم؛ بەحاستەم دیتنی چاو. (کم‌سویی؛ دیدکم چشم)
ترەکای‌دەڵیٚ: ترەکینی سپلوت.(زائیدن سگ)
تڕەوراویٚ: [ناو] چەنەدرێژی و هەڵیت‌پەلیت قسەکردن. (چرت‌وپرت و رودە درازی)
ترێبانتین: [ناو] دەرمانێکە لە بنێشت دەگیرێت، لە نیگارکێشیدا بوٚ تراوکردنەوەی ڕەنگی خەست کەڵکی هەیە و تاوێنەری (ڕەنگی ڕوٚن)ی نیگار گێشییە. (ترێبانتین)

تریبل: [ناو] دەنگ لە جاندێکی بەرزدا؛ دەستەواژەی مۆسیقایە. (تریبل)
تریشک: [ناو] تریشکە؛ تریشق؛ تیشک؛ وەک:تیشکی ڕۆژ. (اشعه)
تریشین: [ناو] فرد؛ فد: کرمی نێو لەشی بەراز، بەخواردنی گۆشتی بەراز بۆ ئینسانیش گیرۆی هەیە. (تریشین)
ترێلیۆن:[ناو] فرد؛ اند؛ فد: یەک‌ملیۆن‌ملیۆن (ملیۆن × ملیۆن). (تریلیون)
ترینگوهۆڕ: [ناو]ترینگە ترینگ؛ خرینگوهۆڕ. (صدای برخوردکردن زیورآلات بهم)
ترینگە: [ناو] دەنگی وێککەوتنی دەفری مس. (صدای‌بهم خوردن کاسەهای‌مسی)
تزۆک: [ناوەڵناو] ژنی ئەتوار خراپ.(زن‌بدکارە)
تسەگورگ : [ناو] فسە گورگ؛ کارگە فسە؛ جۆرێک‌کارگی ژەهراویە. (نوعی‌قارچ سمی) (٢)>فسە گورگ
تشپۆ: [ناو] (١)زپرکە؛ پیزۆکە؛ زیپک؛زیپکە. (جوش پوست) گرۆڤەر و لووی ناو لەشی گیاندار.(غدە)
تشپۆک: > تشپۆ
تشتومشت: [ناو،ت] شت‌ومەک؛کەل‌وپەل. (خرت‌وپرت)
تفال: [ناو] پەڕۆیێکە بە بەسەرگونکی هەویردا دەدرێت.(رواندازچانەهای خمیر)
تفتیک: [ناو]کورک. (کرک)
تفتیلک: [ناو] کۆترەباریکە.(قمری)
تفرە: [ناو] کراژ.(پوستە؛ شورە).
تفکردنەوە: [چاوگە،ت] فڕێدانی هەر شتێ لە دەمدا. (٢) تف فڕێدان. (تف‌کردن)
تفرەمار: [ناو] کراژەمار. (پوستە مار)
تفکە: [ناو] ئاگردانی لە قوڕچێکراو؛ کووانووی قوڕینە؛ (آتشدان گلی)
تفل: [ناو] تویێژ؛ تۆکڵ؛ تویخڵ؛ تفە. (پوستە)
تفڵ : [ناو] بۆی هەیە لە (تفل)ی فارسیەوە هاتبێت. تڵف؛ منداڵ؛ زارۆک. (بچە)
تفە: [ناو] تفل؛ تۆخڵ؛ توێکڵ.(پوستە)
تفە: [ناو] دیوارێک بە مۆرە( قوڕ)دروست بووبێت.(دیوارگلی)
تفەزڕێ: [ناو] تووە کێوی. (توت وحشی)
+ تفەنگچی:[ناوەڵناو](ب) دەست ڕاست لە تیرەندازیدا.(وارد درتیراندازی؛تیرانداز خبرە)
تفەنگیڕەشۆکی: [ناو] تفەنگێکی قەدیمی و سەر پڕ کە لە سەر لوولەکەیەوە باروت و ساچمەی تێدە کرا و بە زممە دادەگیرایەوە. (تفنگ سرپر)
تفەنگیساچمەیی: [ناو] زیاتر بۆڕاوە و فیشەکی سا چمەیی دەخوا. (تفنگ ساچمە زن)
تفیسەر بەرەوژوور: (ب)کارێکی‌کرێت کەزیان بە کریاریشی بگەیێنی، و وەک تفی بەرەو ژوور بگەڕێتەوە بۆ نێو چاوی خاوەنی . (تف سربالا)
تفرۆکە: [ناو] خەردڵ؛ خەردەڵ.(خردل)
تفسک: هەنجیری کێوی.(انجیر وحشی)
تڤل:>تفل
تڤو : [ناو] ترپ؛ توور؛ تڤر.(ترب)
تڤێ: [بەند] دڤێ؛ ئەشێ؛ دەبێ؛ گەرەک. (باید)
تڤیای: تووڕە بوون.(عصبانی شدن)

تک:[ناو](۱)دک؛دوو؛ هەرتک چاوی دێشێ: هەردوو چاوی دێشێ.(دو) (۲) دڵۆپ؛ دڵۆپە؛ تکە. (قطره)

تک: [ناو] نوختە؛ خەوش؛ خەش؛ لکە؛عەیب وئیراد؛ چ تک تێدا نینە: بێعەیب و لکەیە. (غش؛ لکه) دڵۆپ.(چکه)

تکەتک: (۱)[دەنگەناو]چرتەچرت؛ وەک:دەنگی کاتژمێر؛ (تک‌تک).(۲) دڵۆپە - دڵۆپ.(چکه‌چکه)

تکەکردن: [چاوگە،ت] هاتنەخوارەوەی دڵۆپە.(چکه‌کردن)

تلاسان :[چاوگە،] هەڵخلیسکان.(لغزیدن)

تلبژار: [ئاوەڵناو] بە قامک بژارکراو؛ دەست چن ؛ هەڵبژاردە؛ تلبژێر؛ (انتخاب) (۲) لە ڕادەی قامکی دەستێک تێناپەڕێت.(ب)نایاب. انگشت‌شمار)

تلخە: [ناو] کۆگابەفری بە سەهۆڵ بووی پەڵە پەڵە لە سەر عەرز ماو.(کپه برفهای بجامانده دربهار)

تلدار: [ئاوەڵناو]تۆڵدار؛ تۆڵدار؛ ئاوس؛ تۆلپڕ؛ سکپڕ.(آبستن)

تلگەنی: [ئاوەڵناو]زکگەنیو؛ سک‌بۆگەن.بۆ جوێنە. (شکم‌گندیده)

تلمسک: [ناو] تلماسک؛ زەنگەتەترێ. (تلسک)

تلنایۆ: [چاوگە،ت]تلین؛ تلانەوە.(غلطیدن

تلۆفک :[ناو] (ف. گولچنینەوە) گلۆفک؛لکی هەرە سەرەوەی دار. (شاخەهای بالائی درخت)

تلی: [ناو] (۱)گلە؛ دانە؛ دەنک. (دانه)(۲)تبل؛ قامک.(انگشت)

تمتم: [ناو] سماق.(سماق)

تنتیک: [ئاوەڵناو] بەدئەسل؛ بەدنیژاد. (بداصل)

تنگژ: [ئاوەڵناو] ئانگژا؛ تووڕە.(عصبانی)

تنگژی: [ناو] تووڕەیی.(عصبانیت)

تۆبەی‌گورگ مەرگە:(ب) دووری نەکردن و دەست هەڵنەگرتن لە خدە و خوو؛ تۆبەی بێبایەخ؛ تۆبەی بە درۆ.(توبه درو غین ؛ توبه گرگ)

تۆپز: [ناو] (۱)تۆپەوانەی کونی ئە ستێر و ڕۆ چن. (دها ن بندروزن)(۲) مێکوت و مێگوار؛ دۆق؛ کوتەکی سەر بزمارڕێژ؛ گورز. (گرز)

توپزەگیواوە: [ناو] گیاسپۆن؛ دەرمانە بۆ زە- ردوویی. (میخک وحشی؛چوبک؛صابونی)

تۆپلەگیا: [ناو] شەلەمەباخی. (کلم‌صحرایی؛ خردل‌بری)

تۆپەکەلەم: [ناو] گیا گەلەرم؛ کالیسیۆمی زورە بۆ پتەو بوونی ئێسک و نەخۆشینی ئێسک بەکەڵکە. (کلم پیچ)

تۆتۆ: تواتوا؛ چین‌چین. (لایه‌لایه؛ قشرقشر)

+ توخماخ: [ناو] قەتماغە؛ پێست؛ توخماخی سەرت هەڵدەکەنم: پێستی سەرت هەڵدەکە- نم(پوست)

توخمەتخێل: [ئاوەڵناو] زۆڵ؛ بیژوو؛ توخمی- حەرام؛حەرامزا. (حرامزاده)

تۆڕئاوس: [ئاوەڵناو] پابە مانگ؛ هەراش ئاوس؛ نزیک بە زائین. (پابماه)

تۆراخ: [ناو] خەسە؛ دۆی خەستی ئاوچنراو بۆ کەشک چێکردن؛ دۆراخ. (دوغ چکیده)

تۆراق:>تۆراخ.
تۆراقدان: [ناو] ئامانی تۆراق. تووره‌كه‌ی هه‌ڵواسینی تۆراخ. (ظرف دوغ چكیده)
تۆراک: [ناو] جۆری په‌نیر.(نوعی پنیر)
تۆربه: [ناو] تووره‌كه؛ توورێن؛ کیسه.(توبره)
توربچه: [ناو] تووره سووره؛ جۆرێک تووری چووکه‌ی پێست سووره.(تربچه‌نقلی)
تورتان: [ناو] مقه‌س؛ قه‌یچی؛ دوێرد. (قیچی)
تۆركردن: [چاوگه‌،ت] تۆران؛ زیزبوون.(قهركردن)
تۆڕكردن: [چاوگه‌،ت]به‌تۆڕگرتن؛ ڕام‌كردن؛ خسته‌تۆڕ؛ زیاتر بۆ کوڕ و کیژ ده‌وترێت که‌ مه‌یلی یه‌كترین ڕابكێشن. (توركردن)
توركمان: [ناو] توركمه‌ن؛ تورکه‌مه‌ن؛جه‌ماوه‌ری سپی پێستی توركه‌كانی ئاسیای ناوه‌ندی. (تركمن)
توركی: [ناو] زمانی توركی؛ زمانی توركه‌كانی ئۆراڵ ئاڵتایی وئازه‌ری. (تركی)
توركی: [ئاوه‌ڵناو] په‌یوه‌ندیدار به‌ توركه‌وه. (تركی)
توركی‌ئازه‌ری:جه‌ماوه‌ری توركی ئازربایجان. (ترک‌آذربایجانی)
توركی‌لاو: (ب)توركه‌كانی پاش شۆڕشی ئاتاتۆرک له‌ توركیا. (ترکهای پس‌ازانقلاب آتاترک)
توركیی‌ئه‌سته‌موولی: زمانی‌یاسایی ده‌وڵه‌تی توركیا. (زبان‌رسمی تركیه)
تورمز: [ناو] روس‌د؛ فد: ئامێری ڕاوه‌ستاندنی هه‌ر كه‌ره‌سته‌ی ته‌گه‌ردار؛ چه‌ند جۆره، كاره‌بایی، ڕۆنی، پایی، ده‌ستی، كومپێڕیسی و هیدرۆلیكی؛ له‌ كوردستانی باشوور وشه‌- ئینگلیزییه‌كه‌ی ده‌ڵێن، و ئیستۆپی پێده‌ڵێن. (ترمز)
تورمزبڕیان: [چاوگه‌،ت] تورمزبڕین؛ له‌ كاركه‌وتن و عه‌یبدار بوونی تورمز.(ب) خۆ پێنه‌گیرانه‌وه. (ترمزبریدن)
تورِنابازی: [ناو] فد: یاریی شا و وه‌زیر و دز و جه‌لالاد. (ترنابازی)
تۆڕۆس: [ناو] تۆڕۆس وئانتی تۆڕۆس، دوو كێون له‌ مه‌ڵبه‌ندی كوردستانی توركیان. (نام‌دوكوه)
توڕه‌هات: [ناو] فد: توڕڕه‌هات؛ هه‌ڵیت و په‌ڵیت؛ قسه‌ی پڕو پووچ.فشقییات. (ترهات)
تۆڕی‌چرا: [ناو] چنراو و هه‌ڵدووراوێكی تۆڕی كیسه‌ئاسای بچووكه له‌ ده‌زووی نه‌سووج، ده‌یكه‌ن به‌ سه‌ر پستانه‌كی(مه‌مكه‌)ی چراتۆڕدا. (طورچراغ)
تۆزته‌كاندن: [چاوگه‌،ت] (ب) لێدان؛كوتان و بۆ تێوه‌شاندن. (كنایی ،كتک زدن)
تۆزه‌ڵانینه: [به‌ند] تۆزه‌ڵانه؛ توزێكی‌كه‌م؛ نه‌ختێک؛كه‌مێک. هه‌ندێک. (كمی. خیلی‌كم)
تۆشكه: [ناو] كرێش وه‌ک:كرێشی سه‌ری چلكن یان گه‌چه‌ڵ. (شوره)
تۆشه‌ل: [ناو] تۆخل؛ تیقل. (پوسته)
+ تۆڤ:[ناو]تۆڤ؛ توو؛ تۆم؛ تۆو؛ توخم.(تخم)
تۆڤ‌نانه‌وه: [چاوگه‌،ت] گێچه‌ڵ به‌رپاكردن؛ كورتكراوه‌ی تۆڤان‌نانه‌وه. (شلوق‌كردن)
تۆڤ‌ئاڤێتن: [چاوگه‌،ت] تۆڤچاندن؛ تووچاندن؛ توو وه‌شاندن (تخم‌پاشی)

تـۆقی: تـەڕەکـاڵی بـۆ تـوو ڕاگیـراو. (میـوه بوستانی تخمی)
تۆقه: [ناو] تەوقه؛ دەستومشتاق. (بهم دست دادن)
+ تۆقین: [چاوگه]زیادکردنی ئـاوی کـارێز و کـانی؛ ژیانـەوەی کـوێرەکـانی. (پرآبـی کاریز؛پرآبی چشمه خشکیده)
تـــۆقین : [چاوگـــــه] (١ب) ترســـــان .(ترسیدن).(٢) دڕیـانی پـۆڕگ (پـارەشـدن تاول).(٣) ژیانەوەی کوێرەکانی. (زنـدەشـدن چشـمه خشـکیده)(۴)تـەقینـی قومبولـه. (ترکیدن نارنجک)+
تۆکز: [ئاوەڵناو] ترکزه؛ بڤه. (خطر)
تۆڵانەوه : [چاوگه،ت] داتوڵـان؛ نـەرمبـوونی میوه بەهۆی زۆر گەیینەوه؛ بڵ بوون. (نـرم-شدن میوه بەعلت زیاد رسیدن)
تۆلپڕ:<تلدار
تۆل دان : [چاوگه،ت] زکدانی دیوار.( شکم-دادن دیوار؛ طبلک کردن)
تۆڵدان: [ناو] منداڵدان؛ (بچەدان)
تولومپا: [ناو] تورومپا. (تلمبه)
+ تۆڵه: باتی؛جیاتی؛ بری؛ قەرەبوو؛ له تۆڵەی قەڵەمێکدا کتێبێکم پیٚدا. (عوض)
تۆڵەکه مارانه: [ناو] مارتۆڵەکیٚ؛ لەکوردستان زۆر دەڕوێت، تامی تاڵـه و هـەنـدێک مـاکی ژاری (ئامیگـداڵ) یتێدایـه و دەرمـانێکی-ئێشبەره.(افسنطین کبیر)
تۆمارکردن : [چاوگه،ت] دەنگ خستنه سـەر شریت و قەوان؛ <سەبت (ضبط کردن نـوار وکاست)+

تۆمانج: [ناو] بوختان؛ تۆمەت. (تهمت)
تۆماندن: (ف.گیـو) تۆمـەت لێـدان. (تهمـت زدن )
تۆمپز: [ناو] مشتەکۆڵه. (مشت)
تۆمقفه: [ناو] گیاچەوره؛ لەمیراوای بۆکـان و پاوه و کێوەکانی داڵـاهۆ زۆره و دەرمانـه بـۆ سینۆزیت. (گل‌مرو)
تۆمگیر: [ناو] گیـای بـالووکبڕ؛ گـویبـەرخ؛ گوڵەکەی به تۆپ له پاڵ یەکـدان،دەرمـانی برۆنشیت و ئازاری سینگه و گەڵا تووکنەکه-ی بۆ خنازیر باشه. (گل ماهور)
تۆمەز: <تومەیژه
تۆمەیژه: تۆمەڵیٚ؛ تومەز؛تۆمـەزانـه. (تونگـو)
تۆن: [ناو] فد؛ انـد؛ فـرد: ڕاده و ڕێـژەی دە-نگ،دەستەواژەی مۆسیقایه. (تن)
تۆن: [ناو] فد؛ فرد؛ اند: کێشێکه بەرانبەر بـه هەزار کیلۆ. (تن)
تۆن: [ناو] فـد؛ فـرد؛ انـد. گۆشـتی کوڵـاوی ماسی (تۆن) که لـه نـاو قوتـووی سـەربـه-ستراوی تەنەکەدا ڕای دەگرن. (تن)
تۆن: [ئاوەڵناو] مرۆڤی چاوبرسی و تێرنەخۆر. (حریص)
تـۆن: [نـاو] فـرد؛ فـد؛ انـد: نـاوی جۆرێـک ماسییه. (نام ماهی تن)
تۆن :[نیشانەی مڵکی بـۆ دووهـەم کـەسـی تاک] هەموو عالەم گرفتاری تۆن. (علامـت ملکی)
+ توند: [ئاوەڵناو] خەسـت؛ دژی شـل.(تنـد؛ سفت)
+ توند و تیژ: [بەند] (١)توند و تیـژ ڕابـوورد:

به لەز ڕابوورد. (سریع).(٢)[ئاوەڵناو] تاڵ- وترش؛ زۆر توون. (طعم خیلی تند)
تونده تەبیات : [ئاوەڵناو] ئەوەی زوو تووڕە- دەبێت، تەبیات له (تەبیعەت)ی ئارەوییەوه هاتووه. (تندخو)
توننی: [ناو]تونـدی؛ توونی؛ خەسی؛ تام تیژی‌قاییم. (تندی)
تووتکان: [چاوگە،ت] (١)ڕیوایەتە کوڕێک چاوی به خواردنێک بکەویت و ئیشتیای- بکات و نەیدەنێ تووی دەتکێت و منداڵی نابێت. (عقیم شدن مرد). (٢) هەڵتروو شکان. (چمباتمه)
+ تووتەک: [ناو] نەرمەنایه.(نوعی نی زبانه- دار)
تووجی: بەلاڤکرن؛ پشک‌کرن؛ بڵاوکردن؛ پڕش و بڵاو کردن. (قسمت کردن)
توودڕک: [ناو] تووتڕک؛ تەمشک؛ تێمشک. (تمشک)
توودۆکه: [ناو] خاکشیرەکەشیله؛ گیایێکە ده نکەکەی بۆ سێبەڕۆ (ماڵاڕیا) بەکەڵکه.(قدومه کوهی)
توور: هاوێژ؛ تووڕدان؛ هاوێژتن. (انداز)
توور: [ناو] فرد؛ اند؛ فد: گەشت وسە- یران،زیاتر بردنی چەند کەس پێکەوه بۆ گە- شت و وڵات گەڕان لەلایەن ڕێکخراوێکەوه. (تور)+
توورەکێوی: [ناو] گیای تورەدەیمی؛ له مهاباد، پیران شار و پاوه زۆر دەڕوێ که ڵاکەی دەکوڵێنن بۆ دەرمانی برین و دومەڵ. ( علف خر)

تووریست: [ناو] فرد؛ فد؛ اند: گەشتیار؛ گەڕۆک. (توریست)
توورەک:[ناو]تەڕەتیزه؛تەڕەتۆره؛تەرەتۆڵه؛ (ترەتیزک)
تووش: [ناو] فرد: (١) له زمانی فەڕانسەشدا بەمانای تووشی یەکبوونە؛ڕووبەڕووی یەک هاتن. (٢) چەتوون و تووش ودژوار. (سخت)(٣)جگی زۆرساوراو؛ جگی تووش. (شتالنگ‌زیاد سابیدەشده) (٤)شەڕانی. (خشن)
تووشک: [ناو] چوێشتیر؛ توێشتیر؛ گیسکه مێی له دوو ساڵه کەمتر. (بزغاله ازدوساله کمتر)
تووشکەله: [ناو] تووشک؛ کاوڕە مێ که پای‌نابێتە دوو ساڵان. (میش در اول دوسالگی.)
توفەڕەنگی: [ناو] شیلک؛ بنەگیایێکی خزۆ کە، میوەکەی سوور و ترش و شیرینه. (توت‌فرنگی)
تووکه: [ناو] ترووکه؛ پرووشەی بەفر و باران. (نم‌نم برف و باران)
توولی: [ناو] وشتری تووکن و بەرگن‌درێژ. (شترپشم دراز)
توولیایی: (١)هلهلیایی؛هەلوپەلبوون له بەر کوڵانی زۆر.(له شدەاز زیادپختن) (٢)
توندڕەوی: زێده ڕەوی؛ زیادەڕۆیی. (افراط)
+ توون: [ئاوەڵناو] تووژ؛ تیژ (تامی تیژ و توند).(طعم، تیز و تند)
توونکه؛ [ناو] تنۆکه؛ دەرپێی زۆرکورت. (شۆرت) مایۆ ی گوشاد. (تنکه؛ شورت)

توونوتیژ: [ئاوەڵناو](١) بەکار؛ خێرا توندوتۆڵ. (کاری). (٢) توون و تیژ؛ تامی زۆر توند و تیژ؛ تاڵ و تیژ. (طعم خیلی تند)
توونەگیواو: [ناو] توونیلە؛ توونەگیا؛ تەر خون. (ترخون)
توونەدار: [ناو] دارچین؛ دارچینی؛دارێکە لە چین و مالیزیەوە هاتووە،پێستی ئەو دارەدە-رمانی برۆنشیت و سی و زوکامە. (دارچین)
+ توونی: [ناو] توندی؛ تاڵی؛ تیژی، دژی نە-رمی؛ تووتنەکە توونە: نەرمنییە. (تندی)
توونیلە:> توونە گیواو
تووە قەسپە: [ناو] جۆرێکتووشیرینی دەنک گەورەی سپی(نوعی توت سفید)
+ تۆی: من نیم،تۆی. ئەتۆی. (تو هستی)
توێخمچوو: پێستم ساورا؛ (ب)شەکەت بووم؛ ماندوو بووم. (خستەشدم)
تەبانە: تەپانە.>بانگلێر
تەبتاندن: [چاوگە،ت] ئارامکردنەوە؛ حە-جماندن؛ دڵخۆشیدانەوە. (آرامکردن)
تەبتین: [چاوگە،] ئارامگرتن؛ حەجمین؛ داسراکان.(آرامگرفتن)
تەبخاڵە: [ناو] تیمسک؛ لێوهەڵزریان. (تبخال)
تەبرێز: [ناو] تەورێز؛ شارێکە لە ئازربایجانی رۆژهەڵاتی ئێران. (تبریز)
تەبسی: [ناو] کەشەفەی چایی. (سینی کوچک)
تەبع: [ناو] نەخۆشین بە هۆی خواردنی چەورایی زۆرەوە. (مریضی ازچربی زیادخوردن)

تەبلەیسەر: [ناو] تەپڵیسەر؛ تەوقی سەر. (فرق سر)
تەبەتۆر: [ناو] تەونی جاڵجاڵووکە. (کارتنک)
تەپتەپی : [ئاوەڵناو] کەسێک کە تەنیا تە وقەسەری هەویزە.(کسیکە فقط وسط سرش طاس است)
تەپساندن: [چاوگە،] (١)ڕاخستن؛ پانکردنە-وە. (پهنکردن) (٢)لێدان؛ کوتان. (زدن؛ کوبیدن)
تەپکەر: [ئاوەڵناو+ ناو،بک] تەپۆ؛ فێڵەباز. (حیلەگر)
تەپڵ: [ناو] دمەک؛ زەرب؛ ئامێرێکی مۆسیقایە. (ضرب)
تەپڵەک: [ناو] باکردنی گەچی دیوار بە هۆی تەڕەشۆیی(نم)ەوە. (طبلک).(٢) ژێرسیغار. (زیرسیگاری)
تەپلەکردن: [چاوگە،ت] هەڵەکردن لە قسە-کردندا. (تپق زدن)
تەپڵەکیڕۆژ: [ناو] گۆی ڕۆژ. (گوی خورشید)
تەپلەگوێنی: [ناو] ئگوێنییک کە کەتیرەی لێدەگیرێت. (گونکتیرا)
تەپ لێنەکوتان: (ب)بێزانستی لەکارێکدا. (سردرنیاوردن)
تەپودۆڵ: [ناو] کێو و شیو.(ب)هەردی پڕ-کۆسپ و کەندال. (زمین ناهموار)
تەپدووکەڵ: [ناو] تەمودووکەڵ؛ مژودوو؛ تەمتۆمان. (مە و دود)
تەپلوول:[ناو]تەمو مژلەکاتی بەفر و باران-بارینداا. (مە همراە با بارش)
تەپۆڵەگیا: [ناو] گیاگزگانە. (گیاە طاوسی-

رنگ)
تەپە : [دەنگەناو] دەنگی کەوتنی شتی قورس؛ وەعەرز کەوتنی شتی قورس؛ دەنگی بەدار تەکاندنی لێفە و مافوورە. (صدای افتادن اشیأ سنگین ونرم)
تەپوهۆڕ: [ناو] هەراوهوریا و زرموکوت. (تق-وپوق وسروصدای بلند)
تەپەسەر: [ناو]و[ئاوەڵناو] بێدەسەڵات؛بێدە-نگ؛ ستەم دیتوو؛ سەرکوتکراو؛ سەرکۆنە-کراو. (مظلوم)
تەپەوتەلان: هەردی پڕکەند و کۆسپ.(زمین ناهموار)
تەپی: [ناو] تەپلۆسی؛ سستی؛ لەش‌گرانی. (لشی)
تەتن: [ناو] قوڕ. (گل‌وشل)
تەتە: [ناو] دۆڵ و کەلی تەتە بەینی هە-ورامانی تەخت و هەورامانی لهۆن.(گردنە و درە ای در اورامان)
تەتەپێچ: تەختەپێچ؛ پێچاندنی دەست و پێی شکاو بە تەختە. (با تخته بستن استخوان-شکستە)
+ تەتەڵە:[ناو] ئامرازی هەوڕگەری، تەختە یان چەرمێکە بۆ لووس‌کردنی هەوڕ و هیربار. (ابزار کوزەگر)
تەتەڵە: [ناو] (١) کەوانە؛ لاتراسکەکردنی گوڵلە کە لە بەرد بکەوی. (کمانە).(٢) هە-ڵبەزینەوەی پەیتا پەیتای زاپ کاتێ لاتیل بۆ سەر ئاو دەهاوێژرێت. (نان و ماس). (کمانە)
تەحر: [ناو] تەرح؛ شێوە. (طرح)

تەخار : [ناو] تەغار؛ (ب)سی؛ تەغارێک تە-پاڵە سی دانەیە، تەغارێکی چوار پووتی گەنم سی ڕبەیە.(بە سی عدد اطلاق میشود)
تەختخاو:[ناو]قەرەوێڵەی لەسەرنووستن. (تختخواب)
تەختە: (١) [ناو] چاڵ‌وچۆڵ نییە (تە-خت)ە،(تخت است) (٢) [ناو]یەکەی ژمارەی بەری قوماشی پێکەوە لکاو و (دووراو)داوێنی کراس چوار تەختەیە. (تختە).(٣) [ناو] یەکە-ی ژماردنی جاش و بەتانێ و قاڵی، سێ تە-ختە قاڵی.(تختە). (٤ب) [ناو]تەختەنەرد، تاوڵە. (تختەنرد).(٥) [ئاوەڵناو] شتی پان وتە-خت وەک: تەختەبەرد، تەختەگەمرە. (هرچیزصاف وپهن). (٦) [ناو]تەغەر بۆ داری تاشراوی پان دەگوترێت. تەختە دار. (تختە-چوب)
تەختەپیتی: [ناو]تد: غەریب‌سنجان:جووجە. (ساس)
تەختەدامە: [ناو] تەختەیێکە خانە خانە کراوە و٦٤ خانەی هەیە بۆ یاری دامە؛ (چەلان چابوو هەمان‌بوو تەختەدامە)«هێمن» (تختە-داما)
تەختەسڕ: [ناو] پارچەیێ(لباد یان هەور)کە نووسراوەی تەختە سیای قوتابخانەی پێ-پاک دەکەنەوە. (تختەپاکن)
تەختەسێ‌لا: [ناو]سێ تەختەی ناسک کە ناوە ناوە بە باری ڕا ڕاست و ڕا پووتدا (بۆدە-وامی زیاتر) پێکەوە لکاون. (تختە سەلا)
تەختەشنۆ: [ناو] تەختە دارێکی ٨×٨٠ سانتیمیتر بۆ وەرزشی شنوکردن لە سەری.

(تخته شنا)
تـەختـەکـورت: (ب)عقـل‌سـڤک؛ کـەم عقڵ.(کنایی، کم عقل)
تەختەنەرد: [ناو] تاوڵە. (تختەنرد)
تەختی‌سینگ: [ناو] پانایی سەر سینگ. (تخت‌سینه)
تەختی‌ناوشان: [ناو] پانایی لای ژوورەوەی پشت. (پهنای شانه)
تەخر: [ناو] تەرک؛ وازلێهێنان. (ترک)
تەخلیت: [ناو] (۱) تەقلیت؛ سواعبەت؛ گاڵتە. (شوخی) (۲).لاسایی؛ دەمەلاسکێ.(تقلید)
تەخم: [ناو] شوێن؛ جێگا. (مکان)
تەخەر: [ناو] (۱)عەشیرە. (۲) [بەند] تەغەر؛ زۆرتر. (۱.عشیره ۲.بیشتر)
تەدووانە: [ئاوەڵناو] جێمک؛ لفەدووانە؛ بۆمیوه (شملوبەرەکەت). (دوقلو)
تەڕئەنداز: [ئاوەڵناو] پیرەمێردێک خۆ قیت و ڤیت کەت. دلتەڕ؛ تەڕپۆش. (شیکپوش)
تەڕا : بەتۆ؛ بۆتۆ؛ لۆتۆ. (ترا)
تەڕاتی: [بەرهەمی‌چاوگە] تەڕایی؛ تەڕی؛ نمداری. (تری)
تەڕاڤ: [ناو] دێلاندن؛ دەڵاندن. (نشت)
تەڕاخ: [ئاوەڵناو] (۱) مروی لەیلاق و درێژ. (آدم‌خیلی‌دراز قد) (۲) [ناو] عەلاف؛کڕیار و فرۆشیاری دەغڵ بەکۆم. (علاف)
تەرازیا: [ناو] شەونم؛ خوناوە. (ژاله)
تەراشکاری: [بەرهەمی‌چاوگە] تراشکاری. (۱) ڕەوتی تاشین. (۲)جێگا و کەرەستە و کاری کانزا تاشین(لە چەشنی خەڕڕاتی)(تراشکاری)

تەڕاکتۆر: [ناو] فد؛ فرد؛ اند: تڕاکتۆر؛ کەرەستەی شێو بڕین. (تراکتور)
تەڕاکردن: [چاوگە‌ت] بەردانەوە؛ خستنەخوارەوە. (پائین انداختن)
تڕاموا: [ناو] قەتار(شمەنەفەر)ی ناو شار. (تراموا)
تەڕانە: [ناو] تڕانە؛ قەشمەری؛ گەمە. (بازی)
تەڕاوس: [ئاوەڵناو] تەڕئاوس؛ هەردی‌هەمیشە شێدار. (زمین‌همیشەنمدار)
تەڕاوەری: [ناو] هاتن وچوون؛ تراوەری؛ هاتوچۆ کەر؛ ئەم وشە کوردیە و چووەتە نێو زمانی فارسی و بووە بە ترابەری.(تردد؛ ترابری)
تەڕبەل: [ئاوەڵناو] پیرێژنی تەڕپۆش. (پیرزن شیکپوش)
تەرت: [ناو] کەستەک؛ کولۆی‌خاک. (کلوخ)
تەرتلین: [چاوگە]گێژبوون؛ شێوان. (آشفتە-شدن)
تەرجۆ: [ناو] پەرجۆ؛ کرمزی؛ مەهدەر؛ کاری کەس نەکردوو. (معجزه)
تەرجە: [ناو] شەبباک؛ دەلاقە. (شباک)
تەرجەمە: [ناو] پاچڤە؛ وەگێڕانی نووسراوەیێک بە زمانێکی تر. (ترجمه)
تەرخان‌مەجلیس: مرۆڤی تایبەتی دانیشتن لە کۆڕ و مەجلیسدا؛ (ب) پیاوماقووڵ. (مجلس-نشین)
تەڕدەماخ: [ئاوەڵناو] کەیف خۆش؛ بەدەماخ. (خوشحال)
تەڕزەنوو: [ئاوەڵناو] شتی‌تازە و نوێ؛ خەبەر و باسی تازە ( جدید و نو)

تەرسا: [ئاوەڵناو] دیان؛ فەلە؛ عیسایی؛ (لە- چەند شوێنیدیکە بە گاوریش وتراوە). (عیسوی)
تەرفە: [ناو] تەفرە؛ خاپ؛ فریو. (فریب)
تەرقال: دۆستایەتی لەگەڵ کەسێکی خراپ- دا. (دوستی با آدمناباب)
تەرک: [ناو] (١)دواوەی زینی ئەسپ ، یان دوواوەی هەرسوارێک.(ترک).(٢)تەرخ؛ دە- ست لێبەردان. (ترک)(٣ )بێخ ؛ بن؛ تەختی ژێرەوە؛ (تە؛ کف)
تەڕکال: [ناو] مەزرای دەغڵی ئاوی. (کشت آبی)
تەرکبەند: [ناو] بەن‌سامۆرتە. (ترکبند)
تەرکزە: [ئاوەڵناو] تۆکز؛ مەترسی؛ بقە.(خطر)
تەرکەخەم: [ئاوەڵناو]کەم‌تەرخەم؛ بێ‌خەم. (لاابالی)
+ تەرکەدونیا: [ئاوەڵناو] دووری‌کردوو لە خۆشیەکانی دونیا؛ زیاتر بە (ڕاهیبە)ی کلیسانشین دەڵێن. (تارک دنیا)
تەرکەز: [ناو] دارتەقڵە لە ساقەتی خەیزەران. (چوب چوگان ازخیزران)
تەرکەزا: تەرکەزێد؛ جێ‌هێشتنی نیشتمان؛ تەرکەدیار (ترک‌وطن و دیار )
تەرکەوڵات : لە وڵات دەرچوو؛ ئاوارە؛ تەرکە- دیار. (آوارەغربت)
تەرمەک: [ناو] تایەی درێژ و باریکی گڕاڵک و دڕک و داڵ.(کپەخارمکعب‌شکل)
تەڕوتلیس: [ئاوەڵناو، تەڕ و خووساو. (تر و خیس)
تەڕ و وشک هاوێشتن: تێرووپشک.(نوعی- قورعە)
تەڕووک: [ناو] داری تەڕە ژیا؛ بەرێکی سووری هەیە بۆ نەخۆشینی سی و دڵ بە- کەڵکە (طویلک)
تەڕوەندە:[ناو]تازەفێرٍاگەیشتی؛نۆبەرە.(نوبر)
تەروەنە: [ئاوەڵناو] پرش‌وبڵاو؛ ئاوارە. (پراکندە)
تەڕەتیزە گێویلە: [ناو]کووزەڵە.(ترتیزک آبی)
تەڕەژیە: [ناو]گیای تەڕوو؛ لەکوردستان زۆرە و دەرمانی کرمی ڕیخۆڵەیە. (سنجد صحرایی)
تەڕەشۆ: [ئاوەڵناو] شێدار؛ نمدار؛ شەدار؛ تە- ڕەشوع؛ ڕتوبەتدار. (نمدار)
تەرەفاندن: [چاوگە] بڕین؛ بەلکردن؛ قرتاندن. (قطع کردن)
تەرەفە: [ناو] سک‌لەوەڕێن؛ پلەندەر. (تفیلی)
تەرەک: [ناو] تیک؛ درز؛ قەڵەش. (ترک)
تەرەکان: [چاوگە]ترەکیان؛قەڵەشان؛ قەڵە شین.(ترکیدن)
تەڕەلەیلان: [ناو] نێرتکەپیاز. (پیازچە)
تەڕەمێر:[ئاوەڵناو] پیاوی دڵ‌تەڕ و خۆڕازێنەر. (مردی‌کە زیاد بەخودش‌میرسد)
تەریانە: [ناو] ساقۆڕ؛ سەوەتە؛ تریان. (سبد بزرگ)
تەریب: [ناو] بەلاف؛ تەرس؛ تەپالە؛ تەپاڵە. (تپالە)
+ تەریب: [ئاوەڵناو]دوو هێڵ لە ڕاستی یە- کدا، کە هەرگیز بە یەگ نەگەن مەگەرلە نیهایەتدا، وەک ڕواڵەتی هێڵی قەتار. (موازی در هێندسە)

+تەریب: [ئاوەڵناو] تەراز؛ هاوتەریب:هاوشان ، هاوەمرام؛ هاوڕیْ. (موازی؛ همسان)
تەریفە:[ناو] تریفە؛ نەخۆشینی ئاژاڵە کە نابیْ گۆشتەکەی بخوریْت.(نوعی‌مرض حیوانات)
تەریکی: [ناو] تـەنیـایی؛ تـەنیاکـەوتـوویی؛ گۆشەگیری. (عزلت)
تەرییە: [ناو] تەریدە؛ ڕیْگر؛ چـەتـە؛ جـەردە. (راهزن)
تەزەرد: [ناو] مەڕی سپی کە سەروچاوی زە-ردبیْت. (رەنگ‌گوسفند)
تەزاندن: [چاوگە،ت] سڕکردن؛ لەئاوی سارد یان بەفـردا ڕاگرتنـی ئـەنـدامی گیانلـەبـەر؛ (ب)تەممی‌کردن. (کنایی،تنبیە کردن)
+تەزین: [چاوگە] (١) میْلـووره کردنـی ئـە-ندامی لەش؛ (مورمورکردن اعضـا)(٢)چیـان؛ چوون و سڕبوون بە سەرما. (کرخـت‌شـدن).
تەژ: [ئاوەڵناو] پڕ؛ دوْڵدر؛ لیپاولیپ. (پر)
تەژە: [ناو] (١) تەگە، نیْری(نهـاز).(٢) یـاری قەلەمنـداریْ. (نـوعی‌بـازی).(٣) ئـەسـتوون (ستون). (۴)باڵار. (الوارسقف)(۵)[ئاوەڵناو] زە-بەلاح. (لندهور)
تەژەندەر: [ئاوەڵناو] زەبەلاح؛ دریـْژ و ناقوْڵـا. (لیلاق؛ لندهور)
+ تەس: [دەنگەناو] فەمانی دەنگـدانی‌کـەلْ ْگامیْش و ئەسپ بوْ پاشەوە چـوون. (فرمـان پس رفتن اسب و گاومیش)
تەسکوتروسک: بەرتەنگ؛ باریک و تەسـکـ (کم‌عرض وباریک)
تەسمە: [ناو] وشەییْکی بیانیە بەڵـام بـە بـاو بوونی سەیارە، لە سەر زاری جەمـاوەر وەک کوردی بە کار دەبریْت وکوردکاریش کراوە و بووەتە تەسوو یان تەسوە بەڵام زیـاتر هـەر تەسمە دەوتریْت. (تسمە)
تەسمەپەروانە: [ناو،ت] ئاڵقەلاسیقیْکە کە بە هیْز ی ماتۆڕ پەروانە هـەڵـدەسـووڕیْنیْت بـۆ فیْنک کردنەوەی ڕادیاتۆر. (تسمەپروانە)
تەسوو: [ناو] سیرمە؛ تەسووە. (تسمە ، نواری از پوست وچرم)
تەسەل: ئارام؛ تیْروتەسەل، بـۆی‌هـەیـە(تیْـر وتــەســـەلا) بـــیْ و تـــەســـەلای ئـــارە-وی(سوکنایی)یە( آرام )
تەسیقی‌شوفیْری: [نـاو،ت] گـەواهـی‌نامـەی شۆفیری؛ شەهادەی شـۆفیری. (گواهینامـە-رانندگی)
تەشائوم: [ناو] شیْوە و شوبهاندن؛ ویْدەچیْ لە وشەی(تـەشـابوهەوە )کوردکـاری بوویـْت. (تشابە)
تەشریف:عد؛ فد: وشە ئارەویە بەڵام بە واتای (بەڕیْزەوە هاتن) بەتایبەت لـە هـەورامـان و موکو ریان زۆر دەگوتریْت. (تشریف)
تەشرین: [ناو] عد: ناوی دوو مانگی ساڵە لـە بەینی ئەیلوول و کـانوونی یـەکـەمـدا(نـام دوماە)
تەشکەلْ: [ناو] داویْن؛ دامیْن. (دامن)
تەشەخوس: [ناو]کەسایەتی؛ دەمار و لووت بەرزی ،لە ئارەویەوە هاتووە .
(شخصیت:تکبر)
تەشەنە: [ناو] پەرە؛ تەنینەوە(پخش )
تەشەنەکردن: [چاوگە،ت] تـەشـەنـا و هـە-وکردنـەوەی بـرین. (بـازچرک‌کـردن‌زخـم).

(۲)تەنینەوە. (پخش شدن)
تەشیبریق: [ناو] برووسکە. (برق)
تەشیکە: [ناو] موغموغـە؛ میشـوولەی لاق-درێژ کە هەنـدێکیان سـەرپشـتیان کوڵکنـە. (پشەبزرگ)
تەشیمل: [ناو]کولیچە گیواو؛ گوڵەکانی زەرد و لە پاڵ یەکدان، ڕیشەکەی تامتاڵە دەرمانی ئێشی گەدە و ڕەوانەوەی توورەییە. (جینتیانا)
تەشیۆک: [ناو] جۆرێک هەڵپەڕکێ. (نـوعی رقص)
تەعارفکردن: [چاوگە،ت] فد: ئارەویە بەڵام بە واتای خوڵککردن لە زمانی کوردیدا باوە. (تعارفکردن)
تەغمە: [ناو] شەقڵی ئاژەڵ داخکردن؛ تاغمە. (مهر داغکردن حیوانات)
تەغەر: [بەند] زۆرتر؛ زیاتر. (بیشتر؛غالبا)
تەفت: [ناو] قەرتاڵە. (سبد میوه)
تەفتی: [ناو] گەنمـی وەک بـرویش کـوتراو. (گندم نیم کوب)
تەفرەباز: [ئاوەڵناو] تـەفـرەدەر؛ فریـودەر؛ لـە خشتە بەر؛ خەڵەتێن؛ خاپێن. (فریبکار)
تەفەش: [ئاوەڵناو+ ناو] خایین؛ خۆفرۆش. (خائن)
تەفتەڤیک: [ناو] کەمانچە. (کمانچه)
تەڤجڤان: [ناو] لەگەڵ کەسـێک زۆرنزیـک-بوون؛ پەیوەندی. (رابطه)
تەڤدا: زەرەرگەیێن؛ زیانیخورۆ. ( زیانرسان)
تەڤرزین: [ناو] تەبەرزین. (تبرزین)
تەڤسک: [ناو] تەفزک؛ تەڤزک؛ تـەفاریـک؛ هەژیر؛ (هەنجیر)ی کێوی. (انجیرکوهی)

تەڤش: [ناو] قەمچ؛ چەوی پان. (تکەسـنگ پهن سابیدەشده)
تەڤگر: [ئاوەڵناو] هەمووگر؛ هەموولایەنێـک دەگرێتەوە؛هـەمـووان دەگرێتـەخـۆ. (همـە-گیر؛شامل)
تەڤل: [ئاوەڵناو] تێکەڵ. (مخلوت)
تەڤنپیر: [ناو]تەڤنە جنۆکـە؛ تـەونـی جاڵجـا لووکـە؛ تـاڵی داپیرۆشـک. (کارتنـک. تـار عنکبوت)
تەڤوو: [بەند] تەقوو؛ تەقاو؛ بەڵکوو؛بەشـکوو. (بلکە)
تەقاندن: [چاوگە،] (۱)بەشوێن شتێکیدا گـە-ڕان و پشکنین؛ هەموو جێگاییێکیـانتـەقانـد بەشوێنیدا تا دۆزیانەوە. (پی گشتن)(۲) چە-ک ئاوردان. (شلیک کردن).(۳) داتـەقانـدنی دەغل.(بیختن). (۴) ترەکاندن.(منفجرکردن)
+ تەقاو: [بەند] تەقوو؛ تەڤوو؛ هاتوو؛ بەڵکوو؛ بەشکوو؛ بەشکەم. (بلکە)
تـەقـاو: [ڕابـوردووی تـەقـین] بـە هـەمـوو ماناییێکەوە؛ تەقەکردوو: شەقبردوو؛ ترەکیـو. (منفجرشده)
تەقتەقان: [ناو] پلیکان لە بەردی خۆرسـت. (پله سنگیطبیعی)
+ تەقلە: [ناو] جەواڵی گەورە کە سـەرێکـی بچێت بە ناو خۆیدا لـە کـاتی بـاران بارینـدا وەک کەپەنک دەیـدەن بـە سـەردا.(نـوعی بارانگیر)
تەقەتێکەوتن: [چاوگە،ت] بـەرەو خـەلاس-بوون چـوون؛ یـەکـەیـەکـە و دووان دووان مردن یان کوژران، بەرە بـەرە چـوڵکردنـی

جێگاییێک.(روبه‌انقراض رفتن)
ته‌قه‌ڕاو: [ناو] جۆرێک ڕاو که به ده‌نگ‌وه‌ه‌را نچیر ده‌رده‌په‌ڕێنن. (شکار باسروصدا)
ته‌قه‌کردن: [چاوگه،ت] (۱)تره‌کین؛ تره‌کیان؛ قه‌ڵه‌شان؛ (ترکیدن) (۲)به چه‌کی گه‌رم تیرهاوێژتن. (تیراندازی‌کردن)
ته‌قه‌ڵ‌به‌ربوون: [چاوگه،ت] باقیه‌ی برین پچڕان؛ له یه‌ک به‌ربوونی ته‌قه‌ڵی دووریاو. (بخیه‌پاره‌شدن)
ته‌قه‌لۆ: [ئاوه‌ڵناو] شڕودڕ پۆش. (ژنده پوش)
ته‌قیاو: [ڕابوردووی ته‌قین] ته‌قیاگ(۱)دابێژراو. (بوجاری‌شده). (۲) ته‌قیو؛ وه‌ک: قومبوله‌ی تره‌کاو؛ ته‌قاو.) (منفجرشده)
+ ته‌کان‌خواردن:[چاوگه،ت]داچڵه‌کان(یکه خوردن)
ته‌کانده‌ر: [ناو] و[ناو،بک] هه‌ژێنه‌ر؛ جمێنه‌ر؛ ڕاوه‌شێنه‌ر. (تکان‌دهنده)
ته‌کان‌له‌خۆدان: (ب) هه‌ڵمه‌ت بردن بۆ کردنی کارێک. (تکان خوردن برای انجام کاری)
ته‌ک‌تیره‌ناز: [ناو] ته‌ک‌تیرهاوێژ؛ تیره‌نازی زۆر ده‌ست ڕاست و ئه‌نگێوه له عه‌سکه‌ریدا که بۆ مه‌به‌ستی تایبه‌ت که‌ڵکی لێ وه‌رده‌گرن. (تک‌تیرانداز)
ته‌ک‌خاڵ: [ناو] فد: چوار به‌رگی ته‌که له ده‌ستێک په‌ڕه‌ی په‌ڕانتۆدا. (تکخال)> ته‌که۱
ته‌کنای: [چاوگه] ته‌کاندن. (تکاندن)
+ ته‌که: (۱) بێ‌وێنه‌یه؛ ته‌نیایه. (تک است) (۲)تاقه؛ جووت نییه. (فرداست)(۳) بچوه؛ ته‌که‌ئه‌ولاتر: بچۆ ئه‌ولاتر. (بروآنطرف)(۴) چوار په‌ڕی ته‌ک‌خاڵی ده‌ستێ په‌ڕانتۆ.(تکخال‌ورق).(۵) حاڵه‌تی ته‌کان خواردن؛ شه‌که‌ی شتی‌ئاوێزان. (تکان خوردن؛ اهتزاز)
ته‌ک‌هاوسه‌ری: [ناو] (ب)یه‌ک ژنی؛ دژی فره‌ژنی. (تک همسری)
ته‌گه‌ر: [ناو] تایێر؛ تایه‌ر؛ چه‌رخ؛ پای خول‌خۆری ئه‌ڕابه و سه‌یاره. (تایر)
ته‌لابی: [ناو] به‌و ئاره‌وانه‌یان ده‌گوت، که پیشه‌یان له‌کاته‌یی بوو ؛گوڵچنی ئاره‌و. (خوشه چین تازی)
ته‌لاق: [ناو] له‌سه‌رته‌نیشت یان ئانیشک پاڵدانه‌وه. (لمیدن‌روی آرنج)+
ته‌لپ: [ناو] تڵپ؛ سلپ؛ تڵف؛ لیته‌ی نیشتووی بن تراو؛ پڵته. (تفاله ؛ درد)
ته‌لچن:[ناو] تۆڕی به ته‌لچنراو(طورسیمی) واباوه به (شه‌به‌که، تۆڕ)ی ئینتێرنێتی ده‌ڵێن، که پێم‌وایه وشه‌ی(تۆڕ، یان ڕاهێڵه، یان ڕایه‌ڵه) شیاوتره له ته‌لچن.> ڕاهێڵه
ته‌لدڕوو: [ناو] تێل‌دڕوو؛ ته‌لی دڕکدار؛ ته‌ل‌دڕکین. (سیم‌خاردار)
ته‌لواسه: [ئاوه‌ڵناو] په‌شێو؛ ئاڵوز؛ ئالۆز؛ خه‌مبار. (آشفته)
ته‌لووکی: [ناو] چاڵووک؛ ته‌نگز. (سفیدخار)
ته‌ڵه‌باو : [ناو] قوڕ ولیته‌ی به‌جێماو له سێڵاو. (گل‌ولای‌جامانده ازسیل)
+ ته‌ڵه‌زم: [ناو] هه‌رشتی باریک و درێژ بڕراو وه‌ک سیرمه.(۲)جیابوونه‌وه وسه‌رهه‌ڵدانی توڵاشه‌یێ له پێست یان ناخوون.(تراشه)
ته‌له‌سه‌نگ: [ناو] گابه‌رد (سنگ بزرگ)

تەڵکە: [ناو] پارەیی ٚکە قومارباران بە خاوەنی قومارخانەیان دەدا؛ پاچرا. (شتیل)> فێڵ وتەڵکە

تەڵەمار: [ناو]گیای مەرگەمار؛ لە ڕابوردوو دا لە ناوچەی ژاوەرۆ گەڵاکەیان دەکوڵاند و بۆ نەوەرینی مووی سەرکەڵکیان لیّ وەردە گرت. (کبر)

تەلەیفوون: [ناو] فرد؛ فد؛ اند؛ تد: ئامێری تێلداری ئاخاوتن لە دوورەوە(ئەوڕۆ بێتەلیشی هەیە). (تلفن)

تەلەیفوونچی: [ناو] کەسێک کە کاری پێکهێنانی پەیوەندی تەلەیفوونی لە نێوان-تەلەیفوون کەرانە؛ تەغەر لە تەلەیفوونخانە. (تلفنچی)

تەلەیفوون کردن: [چاوگە،ت] (جەرەس)زەنگ لێدان و پەیوەنی گرتن. (تلفن کردن)

تەلەیفوون گرام: [ناو] فرد؛ فد؛ اتد: نووسینی پەیغامی تەلەیفوونی. (تلفنگرام)

تەلەیفوونی بیٚسیم: [ناو] تەلەیفوونی ٚ کە لە سۆنگەی شەپۆلی ڕادیۆییەوە پەیوەندی پێکدێنیٚ؛ تەلەیفوونی بێتەل. (تلفن بیسیم)

تەلەیفوونیهاوڕی: مۆبایل. (مبایل)

تەڵو: [ناو] (١) قەرز.(قرض).(٢) داوخواز. (خواستن)(٣)چوونەزگ،زیاتر زۆر بۆ هێنانی جنسی، ئەحمەد چووە تەڵو فاتم.(۴) کاتی جووت خوازیی یەکسمی مێوینە؛ بەتەلەب. (فحل)

تەماتەجنانی: [ناو] گیایێکی گەڵاپانە و بەرەکەی لە تەماتە وردترە و عیلاجی باداڕی و بەردی مسوڵدانە. (عروسک پشت پردە)

تەماتەمارانە: [ناو] مێوەمارانیٚ؛ هەندی ژاری(بریونین)ی تێدایە، لە ڕیشەکەی بۆ چارەی شەکەرمز کەڵک وەردەگرن. (انگورمار)

تەماتەمرۆژە: [ناو]گیای ڕێزەڵە؛ تەماتە مرۆچە؛ دەرمانە بۆ زیپکە و پاڵاوتنی خوێن. (تاجریزی)

تەماشاکردن: [چاوگە،ت] بالاخوەدان؛ بەراخوەدان؛ سەیرکردن ؛ ڕامان؛ چاولێکردن؛ نهێرین؛ مێزەکرن؛ تواشاکردن؛ سەرنجدان. (نگەکردن)

تەماشاگە: [ناو] بەرجەوەن؛ دیمەن؛ جێی ڕوانین. (تماشاگە)

تەماکۆجنانە: [ناو] گۆشەن وەنا؛ گیاییکە بۆ لابردنی بەردیمسوڵدان بە کەڵکە (تنباکوی کوهی)

تەمایەر: [ئاوەڵناو] چاوەڕوان؛ بەهیوا؛ هیڤیدار؛(چارەنووست خۆت ئەبی دیاری بکەی، نەک تەمایەربی کە بۆت دیاری-بکەن«قانع» (امیدوار)

تەمباز: [ناو] تەپۆڵک؛ کەمباز. (تپە کوچک)

تەمباسک :>تەمباز

تەمبوورڤان: [ناو] تەمبوورژەن. (تنبورنواز)

تەمتۆمان : [ناو] تەم و مژ. (مە غلیظ)

تەمخە: تەخمە؛ تەغمە؛ داخمە.> تەغمە

تەمر: [ناو] پارچە قاقەزێکی چاپکراوی چووکەیە ونرخی لە سەر نووسراوە و لە بەرانبەر هەر خزمەتێکدا دەوڵەت لە جەماوەری دەستێنیٚ و مۆری پووچ(بەتاڵ)بوونی لێدەدا،وەک:تەمری سەر پاکەتی پۆستە. (تمبر)

تەمریهێندی: [ناو] دارێکی ئارانییە و بەرە - کەی کەڵکیپزیشکیی هەیـە. (تمبرهنـدی)
تەمس: [ناو] لێخشاندن؛ پەلاندن؛ پیاهێنان. (لمس)
تەمشک: [ناو] تەمیشک؛ تووڕک؛ تـووتڕک. (تمشک)
تەمومژ: [ناو] تۆز و غمار؛ (ب) هەورێـکـە بە سەر عەرزدا دەکشێ. (مەغلیظ)
تەمووڕەدان: ئاپۆرەدان؛ ئابلۆقەدان؛ تیٚئاڵـان؛ کۆبوونەوە بە دەور شتێکدا. (جمـع‌شـدن دور چیزی)
تەمەریز: [ناو] شەڕەکەڵ؛ (ب) گرمە وگوڕە؛ قەرەباڵغ و شێوانی جەمـاوەر،شـەڕ و هـەڵـا. (جنگ‌کل؛ شلوغی)
تەمەل: [ناو] هەڵماتیمەڕمەڕ؛ کەللا. (تیلە)
تەمەڵ: [ناو] جۆرێک گیانلەبەری مەیمـوون ئاسای تیسک درێژی خاوە خاوکـەری جـە- نگەڵیە. (تنبل)
تەمەن‌درێژ: [ئاوەڵناو] بەعـومر؛ پیـر؛ عـومر- درێژ. (مسن)
تەمینە : (۱) ناوە بۆ ژنان (تهمینە) (۲) شـە- ستە باران (باران تند)
تەنتەڵ: [ناو] مۆتەکە؛ مێردەزمە؛ حالـەتـی- سەنگ سواربوون. (کابوس)
تەنخوا: [ناو] بری؛ باتی؛ لـەبـاتی؛ (شـێعری ویٚم تەنخوای سەمتوور و سازیٚ) «مەولەوی». (تنخواه؛ عوض)
تەندروسی: [بەرهەمیچاوگە] تـەندروسـتی: لەش‌ساغی.ساخڵەمی. (تندرستی)
تەنک‌وتیواڵ: [ئاوەڵناو] شـتـی زۆر تـەنـک و ناسک. (بسیارنازک)
تەنگال: [ناو] و[بەند] رەخ؛ پاڵوو؛کەنـار؛ بـە- رقەد؛ کەلەکە؛ قەراخ. (پهلو؛ جنب)
تەنگاوتیلکە: [ناو] شەتەکدانی کوڵەبـار بـە- پشـتەوە بـە شـێوەی ڕاسـت‌وچـەپ و زۆر توند.(راست‌وچەپ بستن کولەبار)
تەنگوترش: [ئاوەڵناو] تەنگ‌وترووسک؛ بـە- تایبەت بە لیبا سی(جل‌وبەرک)ی تەنگ دە- وترێت.(لباس تنگ)
تەنگەزی:[ناو] وامکێوی(بادەم‌کێوی)؛دارجە- وگ ؛ لە کێوەکانی زاگرۆس زۆر دەڕوێـت و ماکێکی تێدایە بـەنـاوی(پڕوتئـاز) هـەربـەو هۆیەوە زووتر لە هەموو ڕووەکێـک لـە بـە- هاردا گوڵدەکا،گـەڵاکـەی وردە و دەرمـانی- کرمەک وکرمی(ئاسکاریس)ە (بـادام کـوهی مریوانی)
تەنگەکێش: [ناو] کەمەربەند؛ نێوقەد بـەنـد؛ کەژووی ژێرسینگی بارەبەر. (کمربند؛ تەنگە اسب)
تەنگیئێوارە: ئەنگۆری؛ ئێوارەیدرەنگ‌وە خت. (تنگ‌غروب)
تەندووراو : [نـاو] گێـژاو؛ تـەنـدوورەی ئـاو. (گرداب)
+ تەنوورە: [ناو] (۱) ناخیگێژاو؛ گێژاوی زۆر بە هێز. (گرداب سـهمگین)(۲) گیـژەڵووکـە. (گردبـاد) (۳) شـوڵەی بـەرزی ئـاور. (شـعلە بلندآتش)
تەنەسوور : ناوی کەسێک کە بە دەستووری ئەردەشێری پاپەکان بەشەکانی ئاوێستای کۆ کردەوە. (جمع آوری کننده بخشهای آویسـتا

بەدستور اردشیر بابکان)
تەنەکە: [ناو] ڕووپەڕی ناسکی کانزا؛ گیانداری لاوازی پێدەشوبهێنن، وەک: مایین تەنەکە. (حلبی)
تەنەکەپووتی: [ناو] چەلەنگی نەوت؛ (ئایەرە- یێکە بۆ دەغڵ، بەرانبەربە ۱۶کیلۆ یان پووتێک)(حلبی نفت)
تەنەیدار: [ناو] ساقەتی دار؛کۆتەی دار،لە ڕیشەوە تا لقی دار. (تنەدرخت)
تەنی: [ئاوەڵناو] لە دایک و بابێک؛ دژی زڕ. (تنی)
تەوارە: [ناو] دەغڵی پێگەیشتوو. (غلە رسیدە)
تەوازی: [ناو] بۆی هەیە لە (تەوازوع)ی ئارەویەوە هاتبێت، و واتاکەی گۆڕابێت؛ داوخوازی لێبووردن. (پوزش)
تەواشیر:>تەباشیر
تەوان: [ناو] هێز؛توانایی. (توان)
تەواو عەیار: [ئاوەڵناو] تەواو؛ بێکەموکە سری؛ لە سەتاسەت. «گۆڤاری مهاباد۱۱۲» (صد درصد)
تەورلەق: [ئاوەڵناو] ئاکارخراپ.حیز؛ ئاریلە(لوس؛ بدرفتار)
تەورێز: [ناو] تەبرێز؛ شاری تەبرێز لە ئازربایجانی خۆرهەڵاتە (شهر تبریز)
تەوقات: [ناو] ئیشت؛ بە شەپلاخە بە پشتملدا دان. (سیلی بە پشت گردن زدن)
تەوقەگوڵ: [ناو] گوڵێکی لە هەموو ڕەنگە و گەڵاکەی دەکوڵێنن بۆ دەرمانی ددانە- کیرە(گل شاەپسند)
تەوم: [ناو] تەگبیر. (تدبیر)

تەون وبەست: [ناو] بەن وبەست؛ بەندوبەست. (بندوبست)
تەوەرک: [ئاوەڵناو] ممبارەک؛ تەبەڕوک؛ پیرۆز.(تبرک)
+ تەوەرە: [ناو] مازە. (محور)
تەوەنۆدۆزەخێ:[ناو]بەردەسماتە؛بەردی جە- هەندەم. (فسان)
تەوەنی ڕژنێ: [ناو]بەردەمەڕمەڕ(سنگ مرمر)
تەهتاڤک: [ناو] تەحتاڤک؛ نەعنا؛ پوونگە ؛ پینک. (پونە)
تەهلک: [ناو] تەحلک؛ تاڵک؛ خرچە- تاڵ؛گرکەتاڵ. (خربزە و طالبی نرسیدە تلخ)
تەی: [ناو] مەڕی یەکدەست سپی.(گوسفند سفید)
تەیرین:[چاوگە]لەش گرانبوون؛سست بوون. (سست شدن)
تەیسان: [چاوگە،ت] بریقەدان؛ برووسکان؛ ترووسکان؛ [لەچاوگەی تەیسین]. (برق زدن؛ سوسو)
تەیەوبووگ: [ئاوەڵناو] (ب)مرۆڤی لەکڵدە- رهاتوو؛ بەئەزموون و قاڵبوو.(انسان پختە)+
+ تێبەربوون: [چاوگە،ت] بەدار تێبەر بوون و لێدان؛ تێڕۆ بوون تێهورووژان. (کتک- زدن؛ جمع شدن)
تێبینی: [ناو] چاوپیاگێڕان؛ چاڤ لێگێڕان؛ وردبوونەوە؛ وردەوبوون بۆ ئاگاداری؛ (ملاحظە)
تیپ: [ناو] برێتییە لە سێ گورهان؛ لە- شکرێکیش سێ تیپە (تیپ).
تێت: (۱) [داهاتووی هاتن]بەڕیوەیە دێتە

(میأید).(۲) [ناو] تاتەبەردێ کە گوڵاوی لە سەر بێت. (تختەسنگ دارای چالە پرآب)
تیت: تێیت؛ دێیت؛ دی ؛ دێی ؛دیت ؛تی. (میأیی)
تێترۆن: [ناو] قوماشی چێبوو لە هەودای پۆلیستێر. (تترون)
تێدامان: [چاوگە،ت] لە ناو جێگایێک یان مەکانێکدا مان. (ماندن در جائی) (۲) لە کارێکدامان و دەسەوسان بوون. (درماندن)
تێڕامان: [چاوگە،ت] سەرنج پێدان؛ تەماشاکردن؛ لیٚنهێڕین؛لیٚنۆڕین؛ مێزە کردن؛ لیٚورد بوونەوە. (بادقت نگاه‌کردن)
تیرتیرک: [ناو] سیسرک. (جیرجیرک)
تێردوهن: [ئاوەڵناو] تێربەز؛ چەور.(ب) قەڵەو. (دنبەدار؛ چاق)
تێڕژان: [چاوگە،ت] سەتڵێ ئاوی تێڕژان: ڕژاندیە ناویەوە؛ ڕژاندنەناو؛ لەشکرتێڕژان و گوندەکەیان گرت. (درآن؛ ریختن؛ ریختند)
تیرکردن:[کینایی] (ف.گیو) هاندان؛ فیتدان. (تیرکردن).
تێڕۆهاتن: [چاوگە،ت] هێرش‌بردن؛پەلاماردان؛ پڕپێدا کردن . (حمله‌بردن)
تێز: [ناو] دواهەمین نامیلکە بۆ وەرگرتنی بڕوانامە لە زانستگا، کە پێویستی بەلێدوان وسەلماندن هەیە. (تز)
+ تێز: [ناو] باڕووتی ورد؛ گەردی باڕووت. (باروت ساییده)
تێزار: نازناوی ئیمپڕاتوورەکانی ڕووس. (تزار)
تیزاندن: [چاوگە،] هەڵهاتن و لە پڕ دەر چوونی حەیوانی بەرزە، بەتایبەت‌کەر بەتڕ و زەڕەزەڕەوە. (عر وتیز)
تیزماڵک: [ناو] باریکە؛ هەر شتی‌باریکەوەبوو؛ باریک‌بوونەوە بۆ خۆ دزینەوە. (باریکە؛جیم-شدن)
تیزەجاڕ: [ناو](۱) گاڵتەجاڕ؛ کەسێک کە گاڵتە ی پێدەکرێت.(کسیرامسخرەکردن)(۲) شوینی‌گاڵتەکردن. (جای شوخیکردن)
تیژاو: [ناو] تراوێکی ترش و تاوێنەرە تەنانەت کانزایش دەتاوێنێتەوە؛ وەک تیژاوی باتریی(پاتریی) سەیارە. (اسید)
تیژبیر: [ئاوەڵناو] وردبین؛ هزرقووڵ؛عاقڵ؛ بیرۆمەند؛ کەسێک زوو لە مەبەست بگا. (تیزبین)
تیژبین: [ئاوەڵناو] خاوەنی چاوی بە هێز؛(ب) زۆرسەرنجدەر؛ هویربین؛هووربین؛وردبین. (تیزبین)
+ تیژپەڕ: [ئاوەڵناو] نێرەیی‌ێکە زۆر دەپەڕێت و زۆر ناخایێنێ (نرینه‌ای کە زیاد وسریع جفتگیری میکند)
تیژکەڵە: [ئاوەڵناو] بەلەباریک؛ ناتلەنگ‌زراڤ؛ بەژن‌باریک؛ بەژن‌شووش؛تیشکەڵە. (قدباریک؛کمرباریک)
تیژەوکردن: [چاوگە،ت] (۱) تیژکردن؛ تیژکردنەوە؛ وەک تیژ کردنەوەی دەمەتێخ.(۲)> تیرکردن.دنەدان.
تێسرماندن: [چاوگە،ت] تێسرەواندن؛ پێداماڵین و تێکوتان؛ لێدان؛ پیاکێشان. (کتک زدن)
تێشتەنگاو: [ناو] (۱)خواردنی بەینی بەر قلیان و فراوێن. (خوراک بین صبحانە و

نهار)(۲) کاتی بەیانی. (صبح‌زود)
تیشک‌شکانەوە: [چاوگە،ت] هەر۷ ڕەنگی تیشکی‌خۆر لە ناو تراو یان هەڵمدا ڕادەی شکانەوەیان(لاتراسکە) جیاوازە کە دەبێتە پێکهاتنی کەسکەسوور؛ هەموو نووریکی - تریش ڕادەی شکانەوەیان جیاوازە. (انکسارنور)
+ تێشکان: [چاوگە،ت]تانجی بەردانەکە- ڕوێشک ڕووبەڕوو لە بەرەگە و سەرڕاودا دە- بێتە هۆی تێشکان و لێک ترازانی تانجی و نچیر. (بسرعت‌ازهم‌ردشدن)
تیک : [ناو] درز؛ قەڵەش. (درز؛ شکاف)
تێکفەدان: [چاوگە،ت] تێکدان؛ شێوانن؛ ئاڵۆزی؛ ئالۆزی؛ پشێوە دروستکردن. (خرابکردن؛ بهم‌زدن)
تێکردنەوە: [چاوگە،ت] درێژکردنەوەی داوێن بەقوماش‌دانەدەم.(دوختن تکەای‌پارچە- بدامن‌کوتاه)+
تێکقرمان: [چاوگە،ت] ڕووخان؛ تێک‌شکان؛ وێران‌بوون. (ویران شدن)
تیکلە: [ناو]کیتەڵە؛ لە گۆزە چووکتر و دەمی گەورەترە؛ دیزەی چووک. (کوزە دهن گشاد)
تیکمە: [ئاوەڵناو] تۆکمە؛ قەوی‌وقۆڵ؛ تەنگە- قەوی؛ تەژە؛ زەبەلاح؛ تێکسمڕاو. (هیکلی وشکم گندە)
تێکۆشەر: [ناو،بک] هەوڵدەر؛ تەقەلادەر؛ خەباتکەر.(کوشا)
تێکەوتن: [چاوگە،ت] ژنێک کە دەکەوێتە عادەتی مانگانە؛ ژنەک کۆ مەهان دەبەت. (افتادن بەعادت‌ماهانە)
تێک‌وەردان:[چاوگە،ت]شێواندن؛تێکەڵکردن. (هم‌زدن)
تێکەوەپێچان: [چاوگە،ت] بارپێچانەوە؛ (بارگەیان تێکەوە پێچا و بەڕێ بوون یاران) «مێمن». (بار وبندیل بستن)
+ تێکەوەدان: [چاوگە،ت] تێکدانەوە؛خراپ- کردنەوە؛ ڕووخاندنەوە؛ ڕووخاندن.(خراب- کردن)
+ تێ‌گرتن: [چاوگە،ت] پێداگرتن؛ مەلافە (چەرچەف)تێگرتن؛ بەرگ تێگرتن.(برگ- دوختن؛ جلدگرفتن)
+ تێگیران: [ڕابوردووی چاوگە ،ت] (۱)کێشەیان لە بەیندا پەیدا بوو. (درگیر شدند) (۲)[چاوگە،ت]کێشە پەیدا بوون. (درگیرشدن)
تیلەکۆ: [ناو] ناوچەیێکە لە بەینی سەقز و سنەدا. (منطقەای بین سقز وسنندج)
تێلیسان: [ناو] بەرهەتاوگر؛ قایش یان لێواری پێشەوەی کڵاو. (آفتابگیر کلاە)
تەڵەفزیۆن: [ناو] ئامێری ڕاگەیاندنی دەنگ وڕەنگ. (تلویزیون)
تیمساح: [ناو]عد: خزۆکێکە لە چەشنی مارمێلک بەڵام زۆر گەورەیە. (تمساح)
تینتینۆکە:[ناو] بینەقاقا؛بەرقوڕوو.(بیخ‌گلو)
تێنۆر: [ناو] دەنگی هەرە بەرزی پیاو (بەم، بۆڵ، بۆڕ) لە کۆڕی مۆسیقادا؛ کۆژی مۆسیقاییە.(بلندترین‌صدای مردانە ، بم)
تینەگیا: [ناو] تاس‌ئەور؛ خەردەڵەچەرمە- لە؛دەرمانە بۆ لەرزینی دەست و سەر.(خردل سفید)

تیوار: [ئاوەڵناو] بەرتەسک؛ تەنگ؛ باریک. (تنگ)

تیواندن: [چاوگە،]تاواندن؛ ئاتیواندن؛ تاواندنەوە. (ذوب کردن)

تێولْ: [ناو] تەوێڵ؛ نێوچاوان. (پیشانی)

تێووشین:[چاوگە،ت] تێکوشین.تریت.(تلیت-کردن)

تێوەشێن : [ناو،بک] کەسێک کەکاری تێوە-شاندنی لیباسە(جل‌وبەرگ) لە ناو تەندووردا؛ یان خۆڵ دەپرژێنێ بەسەر قوڕدا. (تکان دهنده لباس؛ پاشنده)

تێوەتلاندن: [چاوگە،ت] تێوەگلاندن؛ تێوە-پێچان.(ب)تووشی کارێک کردن. (درگیرکاری کردن)

تێوەرێخ: [ناو] داوی پۆی جۆڵایی کە لە نێو ماسوولە (ماسوورە)دایە. (ریسمان و نخ پود جولائی)

تێوەشاندن: [چاوگە،ت] (ب) لێدان؛ پێداماڵین.کاری <تیْ وەشێن (کتک‌زدن)+

تێمپۆ: [ناو] کەرەستەیێکی موسیقایە لە دومبەک دەکا.(تمپو)

+ تیْهەڵدان: [چاوگە،ت] تێوەردان؛ ئاوێکی-تیْهەڵدە: ئاوێکی‌تیْوەردە. (آبکشی)

تیْهەڵقورتان: تیْهەڵقوتان؛ خۆ هاویشتنە ناو کار یان قسەی دیتران. (فضولی)

+ تیْهەڵکردن: [چاوگە،ت] تێگرتن؛ تیر-تێگرتن؛ ئاوقەکردن . (هدف‌قراردادن)

تییە: [ناو] قەبارە. (حجم؛ تیراژ)

تاچەک: [ناو] بن‌چەک؛ دوای واژۆکـردن ولێکر دنەوەی چەک کوتێکی چـووک لـە پاش چەکەکە بەجێ دەمێنێت. (تەچک)
تاخستن: (ف.گیـو) بـێخ‌گـرتن؛ بـن‌گـرتن؛ نیشتنی خڵتەی شلەمەنی.(تەگرفتن)
تاقیب: [ناو] لەوشەی(تعقیب)ی ئارەویەوە کورد کاری کراوە، وەشوێن کەوتن. (تعقیب)
تـاکردن: قـەدکـردن؛ نووشـتاندنەوە؛ دوولاکردن بە سەریەکدا. (تاکردن)
ترانزیت: [ناو] فد؛ فرد؛ اند؛ایتاد: ڕەوتـی پـە-ڕینەوەی ڕێبوار، یان شت‌ومەک گواستنەوە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی‌تر. (ترانزیت)
تـرانس: [نـاو] فـد؛ فـرد؛ انـد:کـورتکراوەی ترانسفۆرماتۆر؛ ئامێرێکی کارەباییە بۆ کـەم و زۆرکردنی هێزی کارەبا. (ترانس)
ترانسپۆرت: [ناو] فـد؛ فـرد؛ انـد: ڕاگـوێزی؛ ئاروگوێز؛ تراوەری. (ترانسپورت)
تراوێرس: [ناو] فرد؛ فد؛اند: تەختەکانی ژێر هێڵی قەتار. (تراورس)
ترەیلێر: [ناو] اند؛ فد: ترێلی؛کەرەستەی باری قورس ڕاگوێزان کە بە ترەیلیکێش(ئەسپە-ک)ە وە دەبەسترێت. (تریلر)
تریکـۆ: [نـاو] قوماشـی کێشـباف؛ جـل و پۆلیوێری کێشباف. (تریکو)
توالێت: [ناو] اند؛ فرد؛ فـد: (ب) ئـەدەبخانـە. (توالیت).
توستێر: [ناو] کەرەستەیێکی کارەبایی بۆ برژاندن یان گەرم‌کردنەوەی نان. (تستر)
توونێل: فرد؛ اند؛ فد: [ناو] قومەش؛ ڕەهوڵی-گەورە؛ بوارگـەی قـەتـار و سـەیـارەی، دە-سکردی ناو دڵی کێو یان ژێر عەرز. (تونیل)
تەرکەش: [ناو] ساچۆری تیـران؛ تیردانـک؛ تیردان. (ترکش)
تەک‌نەوازی: فد: دەستەواژەی مۆسـیقایە و کورد بە کاری نابا و هـەنـدێ موسـیقازانانی ئێرانیش پێیدەڵین(سۆلۆ) کە دەستەواژەیێکی مۆسیقای ئوروپییە واتاتاک‌ژەنی. (تکنـوازی؛ سۆلۆ)
تەن‌خواگـەردان: [نـاو] فـد: پـارەیێکـە بـە کە سێکی بەرپـرس دەدرێـت بـۆ خـەرجـی پێویستی ڕێکخراوێک کە دوای مـاوەیێکـی دیاریکراویـان تـەواو بـوونی پـارەکـە دێتـە حیساب.(تنخواه‌گردان)
تیراژ: فرد، فد، [ناو] تییەی دەرچوونی گۆڤار و بڵاوک لە یەک جار چاپ کردندا.(تیراژ)
تێرمینال: [ناو] فرد؛اند؛فد: (ب) جێگای سوار کردن و پیادە کردنی ڕێبـواران(موسـافیرگە-ل)ی شارەکان؛ جێی گاراجەکانی چەند شە-ریکەی ڕاگوێزانی مو سافیر.(ترمینال)
تێزاریسم:فد؛ فرد؛ انـد: ڕێژیمـی ڕامیـاری و کۆمەڵایەتیی زاڵی دەورانی قەیسەرەکـان بـە سەرعورو و سیات (ڕووسییە)دا. (تزاریسم)
تێرۆر: فد؛اند؛ فد: [ناو] ڕەوتی‌کوشتن؛ تەغەر کوشتنی ڕامیاری. (ترور)

+ تیره:[ئاوەڵناو] تۆخ؛ دژی ئاچخ؛ سووری تیرە:سووری تۆخ. (تیره)

تێکست:اند؛ فد:فرد: دەقی نووسراوە؛ ئایەت؛ ناوەرۆکی نووسراوەیێکی پەڕاو.(تکست؛ مطلب)

تێکنیک:اند؛ فرد؛ فد: ڕێگا وشێواری زانست و زانایی. (تکنیک)

تێلێکس:فرد؛ فد؛ اند: ئامێری پەیوەندی و پەیغام ناردن و وەرگرتنی پەیغام. (تلکس)

تیمارستان: [ناو] شێتخانە ؛ جێی دینەکان. (تی مارستان)

تیوپ: [ناو] اند؛ فرد؛ فد: (١)لاسیق(لاستیک)ی ناو تەگەری سەیارە.(٢) کەمەربەندی لاستیکی پڕ لەبا بۆ مەلەکردن و نەکەوتنە بن ئاو. (٣) لوولەی جێگەی ڕەنگی ڕۆنیی (ڕەوغەنی) نیگار کێشان . (١،٢،٣ تیوپ)

# ج

جائسته : بەجێمان وشەیێکی ئاویستاییە هەرەبەو واتا و مەبەستە. (جاماندن)
جائـەسـەمە : [چاوگـەت] بـەجێهێشـتن. (جاگذاشتن)
جابڕ : وتەی بێواتا. (سخن بی معنی)
جاترۆک : [ناو] جاترە؛ گیای نەعنـای کێـوی. (نعناوحشی)
جاجرم : [ناو] جاجم؛ جاش. (رختخواب پیچ)
جاجگ : [ناو] جاچکە؛ جاچک؛ بنێشت. (سقز)
جاجۆلکـە : [نـاو] جۆلاتـەنـە؛ جاڵجاڵووکـە؛ داپیروشک. (عنکبوت)
جاچۆلگـەر: [نـاو، جادووگـەر؛ جاچوولکـەر. (جادوگر)
جاحێل : [ئاوەڵناو] جەحێل؛ لاو؛ گەنـج؛ هـەرزەکار. (جوان)
جادوویی : [ئاوەڵناو] ئەفسووناوی؛ سێحراوی؛ پەیوەندیدار بە جادووەوە. (جادویی)
جادەیئاسفاڵت:جادەی قیرتاو. (جادەآسفالتە)
جادەی ترانزیتی : جادەی تایبەت بەهێنـان و نـاردنی کاڵـای دەرکـزە و بـەرکـزە. (جـادە ترانزیتی)
جادەیخاکی : [نـاوت] ڕێگـاییکـە خـۆڵ و خاکییە. (جادەخاکی)
جادەی زیخڕێژ : [ناوت] جادەی خۆش‌کراو کە زیخ و چەو بـە سـەریـدا ڕێـژراوە و پـان کراوەتەوە. (جادەشوسـە.؛ جـادە شـن ریـزی شدە)
جارجیم : [ناو] جارجم : > جاش۱
جاڕەوجاڕ :[ناو] (ب) داچەندنی مەزرا لە هـەموو ساڵێکدا، دوای ڕنینـەوەی گـەنـم و جـۆ دیسان شێو بڕین و داچاندنی مەزرا؛ پـەرێـزاو پەرێز. (کنایەهمە سالەکاشتن‌زمین)
جارێ :[بەند] هێشتا؛ جـارێ نـەگـەیشـتووە: هێشتا نەگەیشتووە. (هنوز)+
جارێکیان : (۱)[بەند] جارێک لە چـەنـدجـار. (دفعەای). (۲)یەک‌جار؛ جارێکیان میوان دەبم : یەک جاریان مێوان دەبم. (یکبار)
جـارێو : جـارێ؛ (جارێوتـەر : جـارێکیتـر). (یکبار)
جارێوتەر : [بەند]کەڕەتێکـی تـر؛ جـارێکیتـر. (دفعەدیگر)
جاز : [ناو] اند؛ فد: مۆسیقای ڕەش پێستاڵانی ئەفریقیا کە ئەمڕۆ لە دونیادا باوە. (جاز)
جاسووسی دوولایەنە : سیخوڕێ کە فسۆسی بۆ هـەر دوو لایـەنـی دژ بـە یـەک دەکـات. (جاسوس‌دوجانبە)
جـاش : [نـاو] (۱) مـەوج؛ جـاجم؛ جـارجم؛ جاجرم؛ جارجیم. (جاجیم). (۲)هوڵیکەر؛ بـەچکەکەر. (کرەخر) (۳) هەندێ جار کە ژنێـک سێتەڵاقە بکردراییـت دەبـوو لـە کـەسێکی دیکە مارەی بکـەن و پـاش تـەڵاقـدانی، بـۆ مێردەکەی مارەی بکەنەوە، بەو کـەسـەیـان دەگـوت جـاش و بـەو کـارەیشـیان دەگـوت (مارەبەجاش) (محلل) +

جاش‌باڵته : [ناو] قولـه‌باڵتـه؛ باڵتـه‌ی کـورت. (اورکت)
جاش‌ماکەر: جاشه‌مێو؛ هولی‌کـه‌رێ کـه مێـو بێت. (کره‌خر ماده)
جاش‌نێره‌کەر : هـولی‌کـه‌رێ کـه نێـر بێـت؛ جاشه‌نێر. (کره خر مذکر)
جاش‌هێستر : هێستری چکۆله تا سێ سالان. (استری که‌هنوزکره‌است)
جافی : [ئاوەڵناو] په‌یوه‌ندیدار به جافـه‌وه؛ وه-ک هۆره‌ی جافی؛زاراوه‌ی جافی. (مربـوطبـه طایفه‌جاف)
جاکەشی : [ناو، [ گه‌وادی؛ قورمساخی؛ پیشه-ی ده‌ویت؛ ده‌ویتی. (جاکشی)
جالۆ : [ناو] پـرد؛ زیـاتر بـه پـردی‌داریـن ده-وترێت. (پل‌چوبین)
جامبازه :[ناو] غاری‌وشتر؛ وشتر لۆقی بـه‌لـه‌ز. (نوعی‌دویدن‌شتر)
جامتا : [ناو] جانتا؛ ساک. (ساک)
جام‌زڕیان : (ب) ڕیسوابوون. (رسواشدن)
جامه‌ڕبه : [ناو] ده‌فرێ‌که شه‌ش مشت (ڕبه یێ) ده‌غل بگرێ. (کیل۴ کیلویی‌غلات)
جامه‌لووسکێ: [ناو] کلکه‌سووتێ وه‌ک ماستاو کـردن؛ خولتـه کـردن؛ ڕیـا و زبانلووسـی. (چاپلوسی‌وتملق)
جامی : ناوی مه‌لاجامی زانـایێکـی گـه‌وره‌ی کورد که گڵکۆکه‌ی لـه سـابڵاغه و مـه‌یـدانی مه‌لا جامی به ناویه‌وه ناو نراوه. (جامی)
جامی‌جه‌م : [ناو،ت] ئاوێنه‌ی ئه‌فسانه‌یی جه-مشید که شای ئێران بووه؛ (ب)جامی جیهان نوما. (جام‌جم)
جامیلکه : [ناو] (۱)جـامی چـووک؛ ئاوێنـه‌ی گچکه (آینـه‌کوچـک). (۲) ده‌فـر و بادییـه‌ی چووک. (ظرف‌کوچک)
جامی وه‌رزشی : [ناو،ت]کـاپی وه‌رزشـی؛ ده-فرێکی گوڵدان ئاسا بـۆ خـه‌ڵـاتی یاریزانـانی سه‌رکه‌وتـووی وه‌رزشـی؛ جـامی قـاره‌مـانی. (کاپ قهرمانی)
جانبێزار:ناوی‌تفه‌نگێکی قه‌یمییه(نـام‌تفنگـی-بوده)
جاندارم : [ناو] جاندارمـه؛ ژاندارمـه؛ پۆلیسـی ده‌ره‌وه‌ی شار. (ژاندارم)
جاندارمه : > جاندارم
جانک : (۱)کیژی پێگه‌یشـتوو. (دخترجـوان). (۲) جوانوو. (کره‌اسب)
جانکان : [ناو] گۆڕ؛ گڵکۆ؛ گۆڕ. (قبر)
جـانگۆری : [نـاو] گیـان‌فیـدایی؛ گیانبـازی. (جانبازی)
جانگیر: جیهانگیر؛ ناوی پیاوانه. (جهانگیر)
جانه‌گا : جوانه‌گا. (گاوجوان)
جانیک : [ناو] جوانـوو؛ جوانووماهین. (کـره-اسب ماده)
جاورس: [ناو] گاورس؛ گارس؛ دێمیله. (ارزن-تلخ)
جاوه‌جاو : [ناو] خـاوه‌خـاو قسـه‌کـردن؛ قسـه جوونه‌وه. (من و من‌کردن‌درسخن‌گفتن)
جاوی گازری: [ناو] جاوێک بوو تا مـاوه‌یێـک ده‌خرا ناو شیاکه بـۆ سـپیتر بوونـه‌وه، و پـاش شۆردن ده‌کرا به کراس و ده‌رپێ.(نوعی‌کربا-س‌سفید)
جبله : [ناو] که‌لـه‌شـێر؛ کـه‌ڵـه‌بـاب؛ دیکـل. (خروس)

جبه : [ئاوەڵناو] مەرەخەس؛ سەربەست؛ بەخشراو؛ عافوکراو؛ چاوپۆشی لێکراو له گوناح؛ ئازاد. (عفوشده؛ مجاز)
جخاره: [ناو] جغاره؛ جگەره؛ سیغار. (سیگار)
جخل : [ئاوەڵناو] دوژمن؛ نەیار؛ ناحەز. (دشمن)
جرتوفرت :(ب)هاتوچۆی بەلەز و لەسەریەک؛ فرته فرت هاتن و چوون. (آمدن‌ورفتن‌باعجله و زیاد)چرپوچۆپ؛ هاتوچۆی لەسەر یەک و بەلەز. (رفت‌وآمدزیادوباعجله)
جرتەجرت :(۱)دەنگی با لیبەر بوونی لەسەر یەک. (گوزیدن‌زیاد). (۲ب) خوتەوبوڵە؛جرت وپرت. (غرولند)
جرتیٚ : به سووکایەتی به ژنیٚ دەڵێن سووکوچرووک و بیٚئارام و قەرار بێت. (زن جلف و ناآرام)
جرجالٚ : > جەجالٚ
جرسه : [ناو] جلسه؛ جۆرێک کووتاڵی قەدیمی. (ژرسه)
جرم :[ناو] بەڵغ و خڵتەی شتی تراو که وردەورده به سەر شتێکی‌ترەوه دەنیشیٚ و وەک بەردێکی (نەزۆر ڕەق) پێیدا دەلکیٚ وەک : خڵته بەردی ڕووکاری ناوەوەی سەماوەر و کتری و بنی ددان. (جرم)
جرمگر : [ناو‌بک] بەڵغگر؛ ماکێکی کیمیاوییه که جرم له خۆیدا دەتاوێنێتەوه و لای دەبا. (جرمگیر)
جرم گرتنی ددان : (۱)کراندنی بەڵغی بن ددان بەکارد یا ئامێری تایبەت که دوکتۆری ددان دەیکا. (جرمگیر ی‌دندان) (۲) بەڵغ چیٚ بوون له سەر ددان (جرم‌گرفتن)

جرناوفرنا : > جورناوفرنا
جرنگ : [ناو]جرینگ؛ دەنگی لەیەک کەوتنی مامێز یا هەرجۆر کانزاییٚ. (جرینگ)+
جروجانەوەر : [ناو] جووڵەوەر و گیاندارانی ورد و کچکه؛ وەک: کرموم‌ێش‌ومێروو. (کرم‌وحشرات)
جروکەجروک: [ناو‌ت] دەنگی‌خوێندنی چۆلەکه؛ جووکه جووک؛ (صدای‌گنجشک) (ب) گریانی له ژێر لچەوه و به نووزه نووز. (۲ب) [ناو] پرته و بوڵەی له ژێر لچەوه؛ بوڵه و خوتەی له بەر خۆوه. (غرولند؛ مویه)
جرووسکه : [ناو] چرووسکه؛ ترووسکه؛ بریقه لێدانی هەور. (برق زدن؛درخشش)
جرید : [ناو] جریت؛ جلیت؛ دارتەقڵەی کورت.(چوبدست سوارکاران‌درنوعی‌بازی)
جریفک : [ناو] گەسک؛ گسک. (جارو)
جرینگاندن : [چاوگە‌ت] بوڵه و خوتەی له ژێر لچەوه. (غرغرکردن)
جرینگەجرینگ :[ناو‌ت] جرینگ‌وهۆڕ؛ (۱)دەنگی لەیەک کەوتنی(خشل وکانزا و مامێز)ی له سەریەک و زۆر. (جرینگ‌جرینگ). (۲) [ناو] پرته و بوڵه و قسەی له ژێر لچەوه خوته و بوڵه لەبەرخۆوه. (غرولند)
جزار: [ناو] ڕەنج؛ ئازار؛ جەزرەبه؛ جزیا؛ بێگار. (عذاب؛بیگاری)
جزال‌جزال : [ئاوەڵناو] ڕێزاڵ‌ڕێزاڵ؛ ونجڕونجڕ؛ لەت‌لەتی چکۆله. (تکەتکه)
چژوێن : [ناو] دژوێن؛ جوێن. (دشنام)
جسوجۆ: [ناو] له(جستوجوو)ی فارسیەوه وەر گیراوه گەڕان و پشکنین؛ بەدوای شتێکدا گەڕان. (جستجو)

جفه :[ناو] مووی تەوێڵ کە بە شێوەی چەتری بقرتێ. (مو ی‌پیشانی‌چتری)
جفتکردن : [چاوگە،ت] (۱)کێڵانی زەوی. (شخم‌کردن). (۲)پێکەوە چەسپاندن؛ جووت‌کردن. (۳)دوودەنک لەهەر شت نانە پاڵ یەک، وەک: کەوش جووتکردن. (۲و۳جفت‌کردن)
جفتەجفتە : (۱)[ناو] بەزمی شانۆ ئاسا کە لایەن
دەستەی لۆتیانەوە کە لە قەدیمدا بەرێوە دەچوو. (نوعی بازی‌لوتیهای‌دوره‌گردبود) (۲)[بەند] جووتەجووتە؛ دووان‌دووان. (جفت‌جفت)
جفتەدووانە : [ئاوەڵناو] لفەدووانە؛ ئاوەڵدووانە؛ جڤی. (دوقلو)
جڤات : [ناو] بزوتنەوە و شۆڕشی بەکۆمەڵ؛ بزاو؛ خەباتی بەکۆمەڵ؛ ڕاپەڕین؛ جوولە؛ جووین. (جنبش‌وشورش)+
جڤراندن : [چاوگە،ت]جەفلاندن؛ جنقاندن؛ جەنقاندن؛ ترساندن؛ داچڵەکاندن. (ترساندن)
جڤلین : [چاوگە]کەولکردن؛ پێست داماڵین. (پوست‌کندن)
جقە : [ناو] خشڵێک بۆ ڕازاندنەوەی کڵاو یان تانجی سوڵتان و گەوران. (جقە). (۲) چۆ؛ نینۆک (نانووخ)ی بەینی دوو پەنجەی کەڵەشێر.(ناخن‌بین‌پای‌خروس)+
جقەشینە : [ناو] جوقەشینە؛ کاسەڵکەشینە؛ کاسەڵەشینکە. (سبزەقبا)
جگمە : [ناو] جمگە؛ جومگە؛ بەند؛ جمژگە. (مفصل؛ بند)
جگە :[بەند] بێجگە؛ جیا؛ ژبلی؛ جودا. (بجز)
جگەرخوێن : جگەرخوون؛ زۆر جاران جگەر
لە جیاتی دڵ بەکار دەبرێت : واتا دڵ پڕ لە خوێن؛ناوی شاعیرێکی نیشتمان پەروەر (شێخ مووسا حەسەن) لە سووریا. (نام‌شاعربزرگ‌کرد)
جلخوز : [ئاوەڵناو] جلف؛ بێ‌مێشک؛سووک‌و-چرووک. (جلف)
جلشۆری : [ناو](۱)کاری باڵاف کردن؛ شیووکوڵ‌کردن. (لباس‌شستن) (۲) [ناو] مەکینەیێ کە جلک دەشوا و بە کارەبا ئیش دەکا. (لباس‌شویی)
جلکدروو: [ناو،بک] جلدروو؛ بەرگدروو؛ جلوراز؛ خەیات. (خیاط)
جل‌وراز : > جلکدروو
جلە : [ناو] جۆرێک قەوزەیە کە دەکەوێتە سەرئاو. (نوعی‌جلبک)
جلە :[ناو] جلەلاوێن؛ گیای سەرەتان؛ (شێرپەنجە)وەک دەزوو وایە و ڕەنگی زەردە و لامژە لە هەر زەرحاتێدا (بەتایبەت لە وێنجە)وشکی دەکا.(نوعی‌انگل‌گیاهی)
جڵەوشل‌کردن : [چاوگە،ت] (ب)بەربەرەڵاکردن و بەرگری نەکردن؛ قەدەغە و قورخ لێ نەکردن؛ ڕووپێدان و سەربەست کردن؛ (ممانعت‌وجلوگیری‌نکردن)
جڵەوگرتن: [چاوگە،ت] (۱) لە غاوگرتن. (گرفتن افسار).(۲ب)بەرگری کردن؛ پێش-گرتن.(جلوگرفتن)
جلیتقەی دژی‌گوللە: [ناو،ت] جلیسقەی چێ-کراو لە ماکێک کە گوللە نەیبڕێ. (جلیقە-ضدگلوله)
جلیتقەی نەجات : [ناو،ت] جلیسقەیێ‌کە پڕدە بێت لەبا، بۆ بەرگری لە نقوم بوون و خنکان

له ئاودا.(جلیقه‌نجات)
جلیسقه : [ناو] جلیقه؛ جلیتقه؛ جۆرێک سینگ پۆشی بێقۆڵ که له ژێر کۆته‌وه ده‌کرێته به‌ر و له جنسی قوماشی کۆ ته‌که‌یه و پشته‌وه‌ی له جنسی ئاسته‌ری کۆته‌که‌یه. (جلیقه)

جمژگه : > جگمه

جموجووڵ تێکه‌وتن : [چاوگه‌،ت] (ب)سه‌ره‌-تای بزاف؛ جووڵه که‌و تنه ناو جڤات؛سه‌ره‌تای سه‌ر بزێوی. (ابتدای جنبش و شورش)

جموور : ژموور؛ حیساب ڕاگرتنی ڕۆژ و مانگ و ساڵ له هه‌ورامانی قه‌دیمدا. (شمارش‌روز-وماه‌سال؛ نوعی‌تقویم‌دراورامان قدیم)

جناخه : [ناو]کرمه‌ک؛ زه‌نبه‌ر و زیوه‌رێک که له ژێر چه‌ناکه‌وه له دوولای لاره پێچ یان ده‌-سرۆکه و کڵاو قاییم ده‌بێت؛ ژێر چه‌نه. (زیوریست‌زنانه)

جناره : [ناو]خه‌یاره؛ جۆرێک قوونێر و دومه‌ڵ و کوان. (نوعی کورک)

جن‌جن : [ئاوه‌ڵناو] ئه‌نجن ئه‌نجن؛ له‌ت‌له‌ت؛ تیکه‌تیکه؛ کوت‌کوت؛ جنینی‌ورد. (قطعه‌قطعه)

جنچک : [ناو] پل؛ جنچک، وه‌ک: جنچکه گۆشت؛ پله‌گۆشت. (چنجه)+

جندۆکه‌دار (۱)[ئاوه‌ڵناو] شێت؛ جندار. (دیوانه). (۲)[ناو] جێگایێک که به‌ڕوایه‌ت و ئه‌فسانه ده‌ڵین خێوی هه‌یه یان جنۆکه‌ی هه‌یه. (به جائی‌گویندکه‌جن وپری‌دارد)

جنراو :[ئاوه‌ڵناو، به‌ر+ ناو‌به‌ر] ئه‌نجن ئه‌نجن-کراو؛ له‌ت‌له‌ت‌کراو؛ پل‌پل‌کراو؛ (تکه‌تکه‌شده)

جنگل : [ناو] گێنگل؛ پاپۆکه؛ وه‌ک : به ده‌ور خۆدا کۆبوونه‌وه‌ی مار. (حلقه؛ چمبره)+

جنه‌نار : [ناو] جن‌هه‌نار؛ هه‌ناره‌جنانه؛ هه‌ناره-جنانی؛ دارێکه له هه‌نار ده‌کا. (اناروحشی)

جواب‌کردن : [چاوگه‌،ت]کرێ‌نشینێ که خاوه‌ن‌ماڵ پێی ڕابگه‌یێنێ ماڵه‌که‌ی چۆڵ بکا. (جواب‌کردن)+

جوات : [ناو] جڤات؛ جووڵه؛ جووین؛ بزاف؛ بزاو؛ ڕاپه‌ڕینی به‌کۆمه‌ڵ؛ کۆمه‌ڵ؛ جه‌ماوه‌ر؛ جه‌مهوور. (شورش)+

جواده : [ناو] جۆرێک مه‌شکه‌ی ئاو تێکردن. (نوعی مشک‌آب)

جوان : [ئاوه‌ڵناو] (۱) قه‌نج؛ قه‌شه‌نگ. (زیبا). (۲) جه‌حێڵ؛ هه‌رزه‌کار. (جوان)

جوانڕۆ : [ناو] مه‌حاڵێکه سه‌ر به شاری کرماشان. (جوانرود)

جوانمێر : [ئاوه‌ڵناو] (۱)جوانمه‌رد؛ جوامێر؛ جه‌-مێرخاس. جوانمرد). (۲) پیاوی جوان و جه‌-حێڵ. (مردجوان)

جوانه‌زمه : [ناو]جوانه‌زوه؛ عازه‌به؛ زیپکه‌ی جه‌حێڵی؛ جوانه‌ژۆ. (جوش‌جوانی)

جوانه‌ژۆ : [ناو] جوانه‌زمه؛ ئازه‌وه؛ ئازه‌به. (جوش‌جوانی)

جواوکردن : [چاوگه‌،ت]جوابکردن؛ نه‌خۆشی که پزیشک لێی ناهومێدبێت و مالیجه‌ی پی نه‌کرێ و مالیجه‌کردنی ڕه‌ت بکاته‌وه. (جواب رد دادن؛ ردکردن)+

جواهێرنیشان : [ئاوه‌ڵناو] گه‌وهه‌رنیشان؛ شتێ‌که به جواهێرات ڕازاوه‌ته‌وه و له سه‌ری دامه‌زراوه؛ نقێم به‌ند. (جواهرنشان)

جوایه‌ز : [ئاوه‌ڵناو] جیاواز؛ جوێ. (جدا)

جۆبوار : [ناو] جۆبار؛ له ئه‌سڵدا جۆگه‌بوار بووه و بووه‌ته جۆبار و له کوردیه‌وه چووه‌ته نێو

فارسی. (جویبار)
جۆبه : [ناو] (١)جندەخانە؛ جێگای لەش-فرۆشی. (فاحشه خانه). (٢)مەیدانی بەر چاو خستنی کاڵا بۆ فرۆش وەک مەیدانی ماست و دانەوێڵە فرۆشتن. میدان‌فروش کالای‌خوراکی)
جۆبیْ : بەوهۆیە؛ لەبەرئەوە؛ ژبەرڤیْهەندیْ. (بەسبب)
جۆتقۆچ : [ئاوەڵناو] جووتشاخ؛ خاونی-دووشاخ. (دارای‌دوشاخ)
جۆتکه : [ناو] جووتە؛ پێن هاڤێتنا دەواران بە هەر دوو پاشیْ خۆ؛ لەقە خستنی حەیوان بە هەر دوو پاشوو. (جفتک)
جۆخینە : [ناو] خەرمانەی دەوری مانگ. (هالەماه)
جودابوونەوە :[چاوگە،ت] دەست لێک بەردان؛ جیا بوونەوەی ژن و مێرد؛ لێک دوور کە-وتنەوە؛ لێک هەڵبڕان؛ (ب) بەشکردنی ماڵ و سامانی شەریکی. (جداشدن)
جوداجودا :[بەند] بەش‌بەش؛ جویْجویْ. (جداجدا)
جوداکاری : :[بەرهەمی‌چاوگە][ناو] جوێکاری؛ کارورەوتی لێک هەڵبڕین و جیا کردنەوە. (جداسازی)
جودایی‌خوازی : [ناو] ویست و داوخوازی جیا بوونەوە؛ (ب) هەوڵ بۆ جیاکردنەوەی بەشیْ لە وڵاتێک و کردنی بە وڵاتێکی سەربەخۆ. (جدایی‌طلبی)
جوْدۆ : [ناو] وەرزشێکە لە ڕۆژهەڵاتی دوورەوە هاتووە و مرۆڤ ئامادە دەکات بۆ خۆ پاراستن و زاڵ بوون بەسەر حەریفدا. (جودو)
جۆربوون : [چاوگە،ت]تەبابوون؛ بەین خۆش بوون؛ ڕێک‌وپێک بوون؛ پێک‌هاتن؛ ڕەخسان؛ دابین‌بوون. (جوربودن)
جۆرابێن : [ناو] جۆراوێن؛ گۆرەوی‌بازی. (جوراب‌بازی)
جوڕناوفڕنا : [ناو] وڕینە؛ وڕاوە؛ لە بەر خۆوە قسەکردن. (هزیان)
جۆ ڕووتە : [ناو] یەوە ڕووتە؛ گیایێکی گەنم ئاسایە دەیدورنەوە بۆخۆراکی‌ئاژاڵ(جودوسر)
جۆش : [ناو] تاو وتین؛ هەڵپەڕین بە هەڵخە و داخەی زۆر و بەتاو و تینەوە. (حرارت؛تب‌و-تاب)+
جۆش‌خواردن : [چاوگە،ت] ڕەوتی چاک بوونە
وەی ئیسقانی شکاو؛ لکان و جۆش خواردنی متوربە. (جوش خوردن)+
جۆش‌دان : [چاوگە،ت] (ب)گەرم کردنی کۆڕی هەڵپەرکیْ. (گرم کردن‌وتب‌وتاب‌بە-گروەرقص‌دادن)+
جۆشکاری :[بەرهەمی‌چاوگە][ناو] شۆڵی جۆشکار؛ کاری لکاندنی پارچەگەلی کانزا بە-گەرم کردن و تاواندنەوە بە گاز و هەوا و... کارگەی ئەوکارە. (جوشکاری)
جۆش‌وخورۆش : [ناو،ت]تاو و تین؛ کوڵ‌وکۆ؛ جرپنی و بیْ ئارامی لە هەڵپەڕیندا؛ ویستی گەرم و گوڕ بۆ کردنی کاریْ.(گرمی‌و حرارت درکارورقص؛ جوش و خروش)
جۆشی‌شیرین : [ناو] ماکێکی سپی‌ڕەنگ و خۆراکییە بەڵام خواردنی دبێتە هۆی کفەڵی ئیسقان؛ بۆ شۆردنی ناو باتری(پاتری) سەیارە بەکەڵکە. (خوش‌شیرین)
جۆغ : [ناو] نێڵ؛ ماقیلە؛ نیر. (یوغ)

جوقه : [ناو] فڕندەییکه له چۆلەکـه مـەزنتـر؛ بەشەو و ڕۆژ ناڵەم دێ له چۆڵ و له بـەڕیـدا، وەک بەردێکی گۆلاوان وەک جوقەی خاسە-سیا «فۆلکلۆر» (نوعی پرنده)

جۆقی : [ناو] له ئاویستـادا بـەواتـای ڕێبـەر و مورشیدی زانا، هاتووه و له کوردیشدا هەر بەو مانایه. (مرشد)

جۆگمه : [ناو] جومگه؛ جمگه؛ جمشیرگ؛ بە-ند.
(بند)

جۆگه داخستن : [چاوگـه،ت] (١)جۆگـه هـە-ڵگرتن؛ جۆگه کێشـان. (جـوی‌آب کشـیدن). (٢)ئاوی جۆگه بـەردانـەوه لـه شـەلـەگـەوە. (سرازیرکردن آب ازجوی‌اصلی)

جۆل : [ناو] له زۆر جێدا پیتی(ل)لـه کوردیـدا ناوترێت و له ئەسڵدا جۆگەل و جۆگەلـەبـووە. (جوی)

جۆل : [ناو] و[ئاوەڵناو] ئاوێته؛ (١)تێکەڵاو؛ تە-ڤلـیهـەڤ؛ بـەسـەریـەکـداکراو. (مخلـوط) (٢)زنجیر. (زنجیر). (٣)کەرت؛ وەک کەرته - مـەڕ. (دسـتەچنـدتایی). (۴)جۆرێـک گـەنـم. (نوعی‌گندم)

جۆلـەمێـرگ : [نـاو] جۆلـەمێـرگ؛ شـارێکی کوردنشینه، پێتەختی وڵاتی هـەکـاری بـووە، ئێسته سەر به وڵاتی توركیایه. (نام شـهری-درکشورترکیه)

جومله : کۆ؛ جمله. گشت؛ تاقم؛ دەسـته .( بـۆ من له جوملەی عەبدی خودانیم؟ ، سەعـاتێ لـه دەس مـەینـەت ڕەهـا نـیم؟). «فولکلـۆر» (جمله)

جونگـه : [ئـاوەڵنـاو] (١)جنگـز؛ بـەهانـەگـر؛ بیانووگر؛ لەسەر چز بۆ شـەڕ فرۆشـی. (٢)> جوگمه

جونگه : [ئاوەڵناو] شەمبۆز؛ ئەسـپی نائـارام و شەروور (شەڕوور) و جووتـەوە شـێن و چـە-مووش. (چموش)

جووان: (١)[چاوگه،ت] بزاوتن؛ بزواندن؛ تـە-کـان‌دان؛ جووانـدن و هانـدان. (تکـان‌دادن؛ تحریککردن) (٢) جوانن؛ قەنجن؛ قەشەنگن. (قشنگ‌هستند)

جووتباقیه : [ناو]جۆرێک دروومانه.(یـکـنـوع-دوخت)

جووتبوون :[چاوگه،ت] (١)کاری‌سـەرجێیـی-کـردن؛ پێـوه ڕووانـی سـپلۆتی نێرومـێ. (همخوابگی؛جفـت‌شـدن‌سـگ‌نرومـاده).(٢) لکان؛ چەسپین. (چسبیدن)

جووت‌بەنده : [ناو] وەرزێری خاوەن جـووت-وگا؛ دژی ڕەشایی. (کشـاورزدارای‌گاوشـخم-زنی)

جـووت‌پـەروانـه : [نـاو+ ئـاوەڵنـاو] جۆرێـک فڕۆکەی قەدیمـی کـه دوو پـەروانـەی(پـە-ڕوانه)ی هەبـوو. (دوپروانـه) هـەر شـت کـه خاوەندی دوو پەروانەبێت. (جفت پروانه)

جووتخاڵ : [ناو] دووخـاڵ بـه شـێوەی(:) بـۆ شروڤه کردن و مانالێدانەوه له پاش ڕەسـتەدا دادەنرێ. (دونقطه)

جووتزگ : [ئـاوەڵنـاو] جـۆتزک؛ لفـەدووانـه. (دوقلو)

+ جووت‌کردن: [چاوگه،ت] به هاوتـاکـردن و نزیک‌دانانی دووتاق.وەک: کەوش جووتکردن > جفتکردن. (جفت‌کردن)+

جووتگیری : بەڕواڵەت وشه فارسـییه، بـەڵـام

دەستەواژەی دارتاشی و ناسک‌کارییە؛ واتا لە-
بەین بردنی ماوەی بەینی دوو تە ختەی
لکاو بەچەشنیٚ کە شەبەق‌نەدا یان ئاو نەدە-
ڵێنیٚ. (جفتگیری) (۲) کاری وەسەر گێرانی
نێر و میٚ(جفتگیری)
جووت لوولە : [ناو] (ب)تفەنگی دوولوول. (تفنگ‌دولول)
جووت‌لەقە : [ناو] جووتە؛ پاش‌لەقە بەهەر دوو پا، یان پاشوو. (جفتک)
جووتماقە : [ئاوەڵناو] شملٚ‌وبەرەکەت؛ شە-
نگڵەبەرەکەت؛ دوو دەنک میوەی پێکەوە
چەسپاو. (دودانەمیوەبهم چسبیده)
جووت‌وگا : [ناو] کەرەستەی جووتیاری و شێو
برین؛ ڕەوتی داچاندنی مەزار بە گاجووت.
گاوواسباب‌کار شخم‌زنی)
جووتەی‌سەران : (ب) دوو دۆست‌کە هەمیشە
پێکەوە بن. (کنایی،دو دوست‌کەهمیشەباهم باشند)
جووتیٚ : جووتێک؛ جفتیٚ؛ جفتێک؛ یەک-
جووت. (یک جفت)
جووجکەلەقیٚ :[ناو،ت] (ب)زەحمەتی زۆر؛ بە
هەزار جووجکە لەقیٚ کارەکەم خەلاس‌کرد؛
کلکە لەقیٚ. (کنایەاززحمت‌فراوان)
جووحە : [ئاوەڵناو] زۆرزان؛ فرەزانا؛ زانا. (دانا)
جووڕکردن : [چاوگە،ت] فش کردن و تاوانی
قومار بە حەریف‌دان؛ (هەڵبەت وشەیێکی بیٚ
ئەدەبانەیە) بە هێلکەکردنی مریشکیش دەڵێن
کە نە لە هێلانەی خۆیدا بیدۆڕێنیٚ. (اخ-
کردن‌وتحویل‌دادن)
جووقەوار لیٚ‌بڕین : کەس نەهێشتن و هە-
مووان کوشتن، هیچکەس کە کۆمەڵیٚ یا لە
ئێلیٚ نەهێشتن. > جنیوساید. (کنایە ازکشتن‌کلیەکسان)
جووکەلیٚ‌بڕین : بێدەنگ‌کردن؛ (ب) هەناسە
بڕکردن؛ خنکاندن. (خفەکردن)
جووکی : [ئاوەڵناو] (۱) مرۆی نووکەنووک
کەر؛ جووکن. (نق نقو)(۲) [ناو] موڕتاز؛ هە-
ندیٚ لە پیاوانی(ڕەنج و عازاب) دیتووی تەرکە
دونیا لە هێندوستان. (جوکی‌مرتاض)
جوولبڕ : [ناو] قرژانگ؛ قرژاڵ. (خرچنگ)
جووڵێن : [ناو،بک] بزوێن؛ کەسیٚ‌کە دە-
جووڵێنیٚ و دە بزوێنیٚ.(تکاندهندە). ڕاژێن؛
ڕاژێنەر؛ (ب) [ناو] هەژێنەر؛ هاندەر. (محرک)
جوومار : [ناو] کەوەمار؛ جۆرێک ماری شینی
کوڵە. (نوعی‌مار)
جوومەکار : جوومەکڤان؛ کەسێک‌کە ڕایەخ و
بەڕە دروست دەکات. (بافندەگلیم)
جهاڵ : [ناو] جوهاڵ؛ جەواڵ. (جوال)
جەبر : [ناو] دەرسێکی زانستگایە وەک جەبر
و موسەللەسات. (جبر)+
جەبرا : [ئاوەڵناو] چەپلەر؛ کەسێک کە بە دە-
ستی چەپی زیاتر کاردەکا. (چپ‌دست)
جەبعە : [ناو] سندوق؛ مجری؛ سنووق. (جعبە)
جەبعەی‌ڕەش :[ناو] جەعبەی ڕەش؛ ئامرازی
تۆمارکردنی هەموو چەشنە ڕووداوێک لە
فڕۆکەدا کە زیاتر دوای کەوتنە خوارە وەی
تەیارە، هۆی ڕووداوەکە ڕوون دەکاتەوە.
(جعبە سیاە)
جەبلە : [ناو] پیٚ‌خوێی‌قوڕ؛ کۆگای‌قوڕ. (کپە آب‌وگل)
جەبۆرە : [ناو] جێهی‌بۆر؛ جۆی‌ڕەش. (جوسیاە)

جەبەش : [ناو] ژەبەش؛ شمستی؛ شمتی؛ شووتی؛ شامی؛ شفتی؛ هەنی.زەبەش. (هندوانه)
جەبیل‌خانه : [ناو] جبەخانە؛ قوڕخانە؛ هەماری چەک و تەقەمەنی. (اسلحەخانه)
جەتان : [ئاوەڵناو] ڕقەن؛ کڕاڵ؛ بوورە. (زمین‌سفت و سخت)
جەجاڵ : [ناو] جرجاڵ؛ کەرسوارێکی ئەفسانەییە لە داها توو دا ڕۆژێک دەردەکەوێ و جەماوەر بانگ دەکا بچنە سەر ئایینی ئەو. (ب) ساختەچی؛ درۆزن؛ فێڵەباز. (دجال)
جەخت هێنان : [چاوگەت] چاک هێنان؛ دووجار پشمین؛واتا جە ختی هێناوە و ماتڵ مەبە و لەسەر ئەو کارە لەزبکە. (دوبارعطسه؛خوب‌آمدن)
جەخسی : [ناو] چیلانگەری؛ شیلانگەری؛ چە
کسازی؛ وە ستایی لە چەکسازکردندا. (اسلحەسازی)
جەدرقە : [ناو] نانی تەنووری‌کە لە کولێرە ناسکترو پانترە. (نوعی‌نان)
جەدوبن‌جەد : جەدوئابا؛ بنەوبنەچەک؛ پشتاوپشت؛ ڕەچەڵەک؛ (وشە بیانییە و لەسەر زارانە). (جداندرجد)
جەڕ : [ناو] بزمارێکی پێچدارە بە بادان توند دەبێت و بە باری دیکەدا شل دەبێتەوە. پێچ. (پیچ)+
جەربەزە : [ناو] جوربوزە؛ شەهامەت؛ غیرەت؛ بوێری؛ کارامەیی؛ لێهاتوویی. (جربزه)
جەرجوو : [ناو] قاپوڕە فیشەک. (پوکەفشنگ)
جەرجهە : [ئاوەڵناو] لێزان؛ پسپۆڕ؛ وریا؛ هونەرمەند؛ زانا؛ زیرەک. (زیرک‌ودانا)
جەردام : [ناو] گۆلاو؛ قوڵکی پڕ لە ئاو. (چاله-پرآب)
جەڕدان : (١) پێچ بادان و بستن. (بستن‌پیچ). (٢)شەتە کدانی بار؛ بە توندی بەستن.(بستن-بار).(٣ب) بەستنی‌ئاو؛ بە سەهۆڵبوونی ئاو لە سەرمای زۆردا. (یخ‌بستن)+
جەردە : [ناو] (١)جرج؛ مشک. (موش). (٢)دز؛ تەریدە؛ جەردە. (راهزن)
جەردەیی : [ناو] ئەبابوزی؛ تەریدەگەری؛ چەتەیی؛ ڕێگری؛ ڕاوە ڕووت کردن. (راهزنی)
جەردی :[ئاوەڵناو] ڕاستی؛ بایەخ؛ بەگرینگ-گرتن؛ پۆیتەپێدان؛ دوورلە گاڵتەوگەپ؛کۆشا ؛ تێکۆشەر؛ پێداگر. (جدی)
جەرسی : [ناو] ڕیسوایی؛ بێ‌ئابڕوویی. (رسوائی)
جەرگ هەڵقرچاو : (ب)فرزەند مردوو؛ جەرگبڕاو؛ جەرگ‌سووتاو. (جگرسوخته)
جەرگ‌بڕین : (ب)کوشتن. (کنایه‌ازکشتن)
جەرگدار :[ئاوەڵناو] بەجەرگ؛ نەترس؛ ئازا؛ جوامێر. (نترس)
جەرگسۆز : [ئاوەڵناو] خەمخۆر؛ جگەرسۆز؛ دڵسۆز. (دلسوز)
جەرگەبەز : [ناو] (١)ڕەشبەڵەک؛ داوەتێک کە ژن و پیاو پێکەوە هەڵپەڕن .(رقصیدن زن و مردباهم). (٢)جەرگی‌کە لە ناو چەوریدا سوور بووبێتەوە. (جگردرچربی‌سرخ‌شده)
جەرگهەلین : [ئاوەڵناو] سووسرەت؛ سەیرو-سەمەرە. (عجیب)
جەڕلەدەم : [ئاوەڵناو] ئاکبەند؛ نەکراوە؛ دەست لێنە دراو. (آکبند)

جەڕنە : مەڕی شاخدار. (گوسفندشاخدار)
جەڕەبابە : (١) توندکردنی دوو شت بە پێچ و جەڕ؛ بەستنی توندی کۆڵ و بار؛ بەنهێم شەتەکدان؛ جەڕاندن. (محکم کردن). (٢ب)سەهوڵ بەستن لە سەرمای زۆردا و پێکەوە چەسپینی دوو شت بەهۆی سەهۆل بەستنەوە. (یخ بستن‌وبهم‌چسبیدن‌درسرمای‌زیاد)+
جەڕەبادەر : [ناو] ئاسنێکی دەستکداری دوو یان
چوار سووچە بۆ بەستن و کردنەوەی جەڕ. (پیچ‌گوشتی)
جەڕەباییلە : [ناو] پشتوێن ئاساییکە پڕ لە با کە لە ناوقەدی دەبەستن بۆ ئەوەی لە ئاودا نقوم نەبن. (کمربند پرازباد برای‌شنا)
جەریمە نووسین :[چاوگە،ت] دیاریکردنی ڕادەی پارەی سزا بە نووسین وەک جەریمەی سەیارە بەهۆی ڕەچاو نەکردنی یاسای سەیارە ئاژوتنەوە. (جریمەنوشتن)
جەریمەی نەغدی:[ناو،ت] نوقرەداخ؛ سزا دان بە شێوەی پارە لێسەندن. (جریمەنقدی)
جەز : [ناو] مالووسکەی گەنم لەخەرمان، کە دوای شەنکردن سوور دەبێت و پاک دەبێتەوە لە کا. (گندم پاک‌شدەازکاەدرخرمن)
جەزیا : (١) [ناو]جەزرەبە؛ جەزرەوە؛ سزا؛ عەزیەت؛ ئازار؛ جەزا؛ (اذیت؛ آزار؛جزا ) (٢) [ناو] پاداشت؛ قەرەبوو. (جزا؛ پاداش)
جەژنی ئایینی : لە هەر ئایینێکدا ڕۆژی واهەیە کە دیاریکراو وجێی ڕێزوحورمەتە و لەو ڕۆژەدا جەژن دەگرن. (جشن‌دینی)
جەژنی‌سەدە : [ناو] جەژنێکی ئایینی زەردەشتیانە؛ بەرانبەر بە دەهەمی مانگی ڕێبەندان.
(جشن سده)
جەژنی سەرساڵ : جەژنی دەستپێکی ساڵی نوێ؛ وەک: جەژنی نەورۆز و جەژنی کریسمەس. (جشن‌اول‌سال)
جەژنی میللی : بۆ ڕێز نان لە ڕووداوێکی میللی
و نەتەوایەتی ڕۆژی ساڵهاتی ئەو ڕووداوە دەکەن بە جەژن و شادی. (جشن‌ملی)
جەعبە : [ناو] جەبعە، مجری؛ سندوقی چووک. (جعبە)
جەغزێن : [ناو] ناوی دوو کایەی باوە لەکوردەواریدا؛(١)بە زاپ میتە دەرخستن لە ناو جەغزێکی چووکدا کە لەسەر عەرز دەکێشری؛ زاپێن (٢) جۆرێک گەمەی تۆپێن کە لە ناو جەغزێکی گەورەدا دەکری؛ تۆپێنی ناو جەغز (١و٢.نام دوبازی‌متداول درکردستان)
جەغەتاو : [ناو] ڕۆن و ئاوی پاش کوڵاندن گۆشت کە وەسەر چێشت دەکەوێت. (آب و چربی‌گوشت پختە)
جەغەتوو : [ناو] جەخەتوو؛ ناوی چۆمێکە لە کوردستانی خۆر هەڵات کە دەڕژێتە زەریای ورمێ. (نام رودخانەایست)
جەغەتە : [ناو]جەڵغە؛ توێژی‌ناسکی سەرتراو یان توێژی ناسکی سەهۆڵی سەر ئاو. (یخ‌یا-قشررویی مایعات)
جەفا : [ناو] ئازار؛ ڕەنج؛ جەور؛ زوڵم؛ دژی‌وەفا؛ جەزرەوە؛ جەزرەبە. (جفا)
جەفتین : [چاوگە،ت] جەفتکردنی پێستی ئاژەڵ؛ پێستی‌کە بە جەفت(جەوت، تاڵ‌وجەوت) خۆش بکرێت وەک مەشکە.

(مهیاکردنپوست حیواناتبوسیله میوەبلوط)
جەفل : [ناو] ترس؛ بیم. (ترس)
جەفلاندن :[چاوگە،ت]ترساندن؛داچڵەکانـدن. (ترساندن)
جەفلین : [چاوگە] ترسان؛ کـۆ (سـڵ)کـردن؛ دەست نەچوونەکار؛ دەست شـلبوونـەوە لـە کردنی کارێک .(ترسیدن ؛ اباداشتن)
جـەفلـین :[چاوگـە] سـیس بـوون؛ ژاکـان. (پژمردن)
جەفەنـگ: [نـاو] حـەنـەک؛ گاڵتـە. شـۆخی. (شوخی)
جەڤلاندن:[چاوگە،ت] هەژاندن؛ داچڵەکاندن؛ تەکان‌دان؛ جووڵاندن. (تکان‌دادن)
جەکۆ : لەکوێ؛ لەکوورە؛ لەکوێنـە. (ازکجـا)
جەلا: لەلا؛ لەڕوخ؛ لەکن. (ازطـرف؛ ازجانـب)
جەلا : [ناو] ناوی ڕۆنێکە بە سەر نیگـار(نـە-قاشی) یان تەختە داردا دەساورێ بۆ بریقە دار کردنی. (جلا)
جەلال: [ناو] ناوی پیاوان؛ ناوی شۆڕشـگێڕی ڕێزدار و بەناوبانگ، مام جەلال تاڵەبانی هـە-وەڵین سەرۆک‌کۆمـاری کـوردی عێـراق لـە مێژووی کوردستاندا. (جلال)
جەلجەلۆت : [ناو] زانستنی جادوو؛ زانینی ئەو فسوون و سێحر. (علم‌جادوگری)
جەلۆ : لەگەڵ‌عەلۆدا دێت، عەلۆجـەلـۆ، واتـە: گەدەوگودە، بێ‌سەروپا. (بی‌سروپا)
جەلە :[ناو]جەڵە؛هەرشتی ڕەستەکراو و هۆنرا وە وەک: جەڵە ماسی و جەڵە وشتر.(هرچیزی

راردیف کردن‌وبەصف‌کردن)
جەڵەب : [ئاوەڵناو] ئەم وشـە لـە ئـارەویـەوە هاتووە، مرۆڤی ئاکار خراپ؛ نائەسـڵ و عـە-ییدار.(جلب)+
جەلەبەستکردن : [چاوگە،ت] پێکەوە بەستنی وشتر و دەوار و ڕیزکردنیـان. (ردیـف کـردن-وبهم‌بستن‌حیوانات)
جەلەبەند : [چاوگە،ت] جەلەبەسـت؛ ڕیزکـەر؛ پێکڤەگرێدەر؛ پێکڤە گرێدان؛ پێکەوە بەسـتن؛ بەجەلەکردن. (ردیف‌کردن)
جەلەوک :[ناو] جەلەبک؛ پەلەپیتکـەی تفـە-نگ. (ماشەتفنگ)
جەمام : [ناو] بەخاوکەوتن؛ بـەهـۆی مانـدوو بوونی ماسوو لکەی لەشەوە ژەهرێک لـەنـاو ماسووڵکەدا کۆدەبێتەوە ئەگەرئەو ماندووییـە، لە پاش ماوەییێکی زۆرکارنەکردنی ماسوو لکە بێ، ژەهرەکە درەنـگ دەڕەوێتـەوە و ماسـوو لکە ڕەق دەبێت و ژان دەکا و بەو حاڵەتە دە-ڵێن بە جەمامکەوتن (کوفتگی)
جەماوەری : (١)جڤاتی؛کۆمەڵی؛سـەربـەجـە-ماوەر.(جمعی) (٢) کۆکردنەوە: ئاژڵەکانم جـە-مـاوەری‌کـرد: کـۆمکردنـەوە.(جمـع‌کـردن؛ گردآوری)
جەماهی :[ناو] جەژنێکی ئیزەدیانە؛ بـەرانبـەر بە جەژنی مێهرەگانی زەڕدەشتیان. (نام‌جشن-ایزدیان)
جەمبازی : [ناو](١) جامبازی؛ چۆداری؛ کڕین و فرۆشتنی ئاژاڵ و وڵاخ. (٢) تەنافبازی؛ جـە-نبازی. (طناب‌بازی ) . (٣) فیـڵ و تـەلـەکـە-کردن؛ حیلەبازی. (حیلەبازی؛ حیلەگری)
جەمداندن : بە سەهۆڵکردن. (بەیخ‌کردن)
جەمرە : [ناو] پۆلوو؛ سکڵ. (اخگر)
جەمسەر : [ناو] سەروبنی هەر شت بە تایبەت

شتی درێژ؛ بە دوو سەری باکوور و باشووری-
گۆی زەوینیش دەڵێن. (ابتدا وانتها؛ قطب)
جەموجۆر :[ئاوەڵناو] گردوکۆ؛ تەکووز؛ ڕێک و
پێک. (جموجور؛ جمع‌وجور)
جەمەک : [ناو] مز؛ کرێ؛ پێمز؛ حەقەدەست.
(مزد)
جەمەلۆن : [ناو] ڕووپەڕی کانزای ڕووکێش-
کراو بە ڕۆح، واتا گاڵوانیزە کە سەربانی پێ
داپۆشرابێت. (شیروانی)
جەمهوور : [ناو] جەماوەر؛ کۆمار. (جمهور)
جەمهووری : [ناو] کۆماری؛ جەماوەری؛
(ب)حوکماتی سەروکێک‌کە لە لایەن جە-
ماوەرەوە بەرگەم کرابێت. (جمهوری)
جەندەرە : [ناو] تەنگ‌وچەڵەمە؛ سەرگەردانی؛
حەیرانی؛ ناڕەحەتی؛ تەنگانە. (تنگنا؛
سرگردانی)
جەنقاندن:[چاوگە،ت] جەنقین؛ ترساندن؛ جە-
فلاندن ؛داچڵەکاندن.(ترساندن)
جەنگەپۆپێ : [ناو] شەڕەدەنووکێ؛ شەڕە-
جوێن.
(جنگ‌لفظی)
جەنگەڵی : [ئاوەڵناو] پێوندی‌دار بە لێڕەوارەوە؛
(ب)کێوی؛ دوور لە شارسانییەت؛ وەحشی.
(جنگلی)
جەنەگرتن : [چاوگە،ت] مان‌گرتن؛ بیانوو-
گرتن. (بهانه‌گرفتن)
جەوادە : [ناو] جەواڵە؛ خیگەی ئاو؛ مەشکەی
ئاو. (مشک‌آب)
جەواز : [ناو] ئیجازە و ئیزنی کارکردن کە لە
لایەن دەوڵەتەوە بە کەس یان ڕێکخراوە-
یێک دەدرێت پەروانە؛ بەرایی؛ ئیجازەنامە.
پەساپۆرت. (جواز)
جەواهێرساز : ئاوەڵناو+ [ناو] کەسێک‌کە گە-
وهەرکاری دەکا؛ کاری دروستکردن و
ڕازاندنەوەی کەرەستەگەل بە جەوا هێر.
(جواهرساز)
جەوجەو : [ناو] جەوجەوک؛ توڵۆ؛ توڵەی-
گچکە؛ توڵەی‌کونەڕۆی چووک. (تولەسگ-
کوچک)
جەودک :[ناو] خیگەی گچلە.(خیک‌کوچک)
جەورک : [ناو] تووتکە تانجی هەتا یە-
کساڵان. (تولەتازی)
جەوز : [ناو] (١) جیوە؛ جەوە؛ شیلەی‌وشکە-
وەبووی ڕووەک.(صمغ).(٢)
گوێز.(گردو،گردکان)
جەوزا : [ناو] سێهەمین بورجی ساڵ بەرانبەر
بە جۆزەردان. (جوزا)
جەوشەن : [ناو] زرێ؛ کنجی کانزایی کە دە-
یانکردە بەر بۆ شەڕی شیر و گورز، لە قە-
دیمدا.
(جوشن)
جەولەخ : [ناو] جەواڵ؛ جوهال. (جوال)
جەوە : [ناو] شیلەی وشکەوە بووی ڕووەک؛
جیوە. (صمغ)
جەوەر : [ناو] جەوهەر ؛ ناوی پیاوانە؛ ناوی
سماییل ئاغای سمکۆ. (اسم‌مردانه)
جەهتەر : [ناو] نەعنای کێوی؛ جاترە؛
عارقێکی لێدەگیرێ کە بۆ ژانی گەدە بەکە-
ڵکە. (نعنای‌وحشی)
جەهر : [ناو] پێداگری و سووربوون لە سەر
بوغز و کینە و قین. (جهر)+
جەیران : [ناو] ناوە بۆ ژن؛ ئاسک. (نامزنانە؛

آهو)
جیٚ : [پێشکر] بەواتای جێگا؛ جیٚشەکر، جیٚ-سەهۆڵ، جیٚلیباسی، جیٚکلیل. (پیشوند.جا)
جیات : [ناو] جیاتی؛ جێی؛ بات؛ بری؛ لە
جیاتی : لەبری، لەباتی. (عوض)
جیپ : [ناو] جۆریٚ سەیارە تایبەت بە کەژ و کێو و جادەی ناساف. (جیب)
جیپ ئیستەیشێن : [ناو] جیپیٚکە زیاتر لە دوو ریز سەندەڵی هەبێت. (جیب‌استیشن)
جیٚپاگێڕان :[چاوگە،ت]شوێن‌گێڕان؛شوێن هەڵگرتن. (ردپا گرفتن)
جێت : [ناو] اند؛ فد: کەرەستەییٚک کە بە دە-رچوونی‌گاز بەلای دیکەدا دەردەچیٚ و دەڕوا؛ (ب)جۆرێک فڕوکەی تیژباڵ. (جت)
جیٚخاڵیانە : [ناو] چوونە لای کەسوکاری سەفەرکردوو زیاتر بە دیاریەوە. (بەدیدن-کسان‌سفرکردەرفتن‌وکادوبردن)
جیٚخەرمان : [ناو](١)گۆڕەپانیٚ لەبەرد و کوڵو پاک‌کردنەوە و ئاوپڕشین‌کردن و کوتانەوە و گسک‌لێدان بۆ کێشەوگێرە و خۆیان. (جای-خرمن). (٢) بن‌خەرمان؛ پاشماوەی گەنمی بن‌خەرمان پاش خەرمان هەڵگرتن کە باو بوو دەیاندا بە ڕەنجبەر و سەپان. (پس‌ماندە غلات‌پس‌از بردا شت خرمن)
جێدار : [ئاوەڵناو] (ب)کەسێک کە کوڕی هە-یە. (کنایە؛ دارای‌فرزند ذکور)+
جێدار : [ئاوەڵناو] بەرفراوان؛ هەراو. (جادار)+
جیٚدووگمە : [ناو] ئاڵقە دووگمە؛کونیٚ لە لیباسی(جلوبەرگ)ی دووگمەداردا بۆ داخستنی دووگمە. (جای دکمە درلباس)
جیڕ : [ناو] جۆرێک چەرمی خۆش کراوی بیٚبریقەی زبر و کوڵکن بۆ چێکردنی(کوٚت) وقوڵەباڵتە و کەوش وهتد (جیر)
جیڕدۆ : [ئاوەڵناو] چڕدۆ؛ ئاژاڵی کەم‌شیر؛ ئاژاڵیٚکە بە زەحمە بۆ دۆشین ڕادەوەستیٚ. (حیوان‌ناآرام دروقت دوشیدن یا کم‌شیر)
جیرە : [ناو] پووڵی‌گیلفانی ڕۆژانەی منداڵ. (جیرە)+
جیرەبەندی: [ناو،ت] ڕەوتی دەست پێوەگرتنی شتێک‌کە کەم بێت یان بۆ ئەوەی زیاتر بەش بکات؛ لە ڕادەییٚکی‌کەمدا ڕۆژانە یا هەر جەم دابەش بکرێت بەسەر بەشداراندا. (جیرەبندی)
جیرەوشکە : [ناو،ت] ئازۆخە و دانەوێلە بۆ دروستکردنی چێشت و خۆراک؛ لە جیاتی نە-هار و شام پێدان. (جیرەخشکە)
جیرەومەواجب : [ناو،ت] (ب)مووچە. (حقوق)
جێریفک : [ناو] گسک؛ گەسک. (جاروب)
جیفڕک : [ناو](١) دەرپەڕین و هەڵاتن. (پریدن‌وفرارکردن). (٢) دەرچوون بە (لووشکە، جووتە، و لەقە)وە. (جفتک)
جیقاندن : [چاوگە،ت] (١) قیژاندن. (دادکشیدن).(٢)ڕیقنەکردن.(فضلەکردن‌پرندە)
جیقن : [ئاوەڵناو] (١)ڕیقنەکەر؛ (٢ب)لاواز؛ زەحیر. (ریغو). (٣) جیقەجیق‌کەر. (جیغو ویغ کنندە)+
جیقنە سپیلکە: [ناو] ڕیقنە سپیلکە؛ جۆرێک نەخۆشینی‌کوشندەی مریشک و کەڵەباب و فڕندەیە. (نوعی‌مرض پرندە)
جیقەجیق :[ناو،ت] زریکاندنی زۆر؛ قسەکردن بە تووڕەیی و زریکاندن و بە دەنگی بەرزەوە؛ قیژەقیژ. (جیغ وویغ)
جیکەبڕین: جووکەبڕین؛ لە زریکە و قیژە

خستن؛ له دەنگ خستن؛ (ب)خنکاندن. (خفه‌کردن)
جیکەنە : [ناو] ئامرازێک کە ژێکەوانی هەلاجی دەلەرێنێتەو؛ کوتکی هەلاجی. (وسیله چوبی کوبنده دستگاه ندافی)
جێگا : [ناو] یاگە؛ جێ؛ شوێن؛ جێگە؛ جاگە. (جا)
جێگاکردنەوە :[چاوگە،ت] (۱)جێ کردنەوە؛ جێگا دابین کردن بۆ شت یان کەسێ. (جاکردن). (۲)جێ بۆ کەس یا شتێ ئاوالە کردن و دانیانە ئەو جێیە. (جابازکردن-وگذاشتن درآنجا) (ب) تێ‌ترنجاندنی شتێک بەناو شتێکی دیکەدا، بە زۆر (سپوختن)
جێگاگۆڕکێ : [ناو،ت] ڕەوتی جێگۆڕین و شوێن گۆڕین؛ جێگۆڕکێ : (جاعوض کردن)
جێگرتنەوە : [چاوگە،ت](۱)جێ دابینکردن؛ [ لە پێش موسافیرەکاندا چوومە نێو ئوتوبووسە-(باسە)کە و لە ڕیزی هەوەڵدا جێگەم گرتەوە]. (جاگرفتن). (۲) جێ پڕ کردنەوە؛بەجێنشیی کەسێک بوون؛ ئەوکوڕەجێی باوکی گرتووە-تەوە. (جانشین شدن)
جێگرتوو : [ئاوەڵناو] حاواوە؛ نیشتەجێبوو؛ حەواوە؛ دامەزراو؛دامەرزیاگ. (جاگیرشدە؛ مستقر)+
جێگۆڕکێ :[ناو] ڕەوتی شوێن گۆڕین. (تعویض جا)
جێگۆڕکێ‌پێکردن: [چاوگە،ت] گوێزانەوە لە جێگایێکەوە بۆ جێگایێکی تر. ( جابجا کردن؛ حالت نقل‌مکان کردن)
جێگەبەجێگە : (۱)[ناو] جێبەجێ؛ ئەنجامدانی کارێ. (جابجا) (۲) [بەند] شوێن بە شوێن.
(مکان مکان؛ جای جای)
جێگەرم کردن : [چاوگە،ت] (۱)لە زستاناندا کە مرۆڤ ساردەجێ دەخەوێت تا ماوەیێک ناو جێوبانەکەی ساردە وردەوردە بە گەرمای لەش گەرم دەبێت (۲) (ب) جێخۆش‌کردن و مانەوە لە جێگایێک. (جاگرم‌کردن)
جێگەماگ : [ناو] بەجێماو؛ کەلەپوور؛ جێماگ دواکەوتوو. جائستە. (بجاماندە؛ جاماندە)
جێگەوبان : [ناو]جێوبان؛نوێن؛ لێفە و دۆشەکە؛ جێوان. (رختخواب)
جێگەهێشتن : [چاوگە،ت] بەجێهێشتن؛ بە-جێ هێڵان؛ جائاسمە. جاگذاشتن)
جێل : [ئاوەڵناو] جیل؛ جەحێل؛ جوان و جێل : جوان و جەحێل. تولاز؛ گەنج. (جوان)
جیل: [ناو] تۆرەمە؛ بەرەی تەمەنی. «گۆڤاری-مهاباد۱۱۲» (نسل)
جیلە : [ناو] سیخوار. (بژ)
جێ‌لێژکردن : [چاوگە،ت] (ب)بوونە هۆی بێڕێزبوون یان دەرکردنی کەسێک لە(جێیێک یان لە سەر شوڵێک) زیاتر بە شوفاری. (زیرآب‌کسی‌رازدن)
جین : [ناو] (۱)دەستەواژەی بازاڕییە واتا شە-ش‌دانە و دووجین واتا دوازدەدانە. (جین). (۲) قوماشێکی قوتوقایم و قەوی زیاتر شەرواڵی لێ دروست دەکەن. (جین). (۳) جۆرێک خواردنەوەی ئالکۆڵدارە؛ خواردنەوەیێکە زیا تر لە ئینگلیز دروست دەکرێ. (جین)
جینار: [ناو] جیران؛ هاوسێ؛ هاوسا. (همسایە)
جینگز : [ئاوەڵناو] لەسەر بیانوو؛ لەسەرگزە؛ پەڵپ‌گر؛ نەگونجاو. (بهانەگر؛ستیزەجو)
جینۆساید : فرد؛ اند؛ فد: [ناو] بەرەکوژی نە-

سل‌کوژی؛ جووقەوار لێبڕین؛ وشە بیانییە بەڵام زۆر بەکار دەبرێت. (نسل‌کشی؛ جینوساید)
جێوار :[ناو] شوێنی نیشتەجێ‌بوون؛ جێی مانەوە؛ جێگەی ژیان؛ جێ‌هەوار؛ ئاسەوار. (جای‌ماندن)
جێوان : [ناو] جێوبان؛ جێگاوبان؛ پێخەفی نووستن. (رختخواب)
جێوان : > جێگەوبان
جیوبڕی : [ناو] گیلفان(گیرفان)بڕی؛ دزینی پارەی ناوگیلفانی کەسێک. (جیب‌بری)
جیوە : [ناو] (١)کانزاییێکی ڕەنگ زێوینی لەرزۆکە.(جیوە) (٢)جەو؛ شیلەی وشکەوە بووی دار. (صمغ‌درخت)
جیوەتێکراو : (ب) [ناو] نەسرەوتوو؛ بێ‌ئارام؛ فرە بزێو؛ (کنایی، ناآرام.)
جێوەلەک : [ئاوەڵناو] سووکوچرووک؛ عاسمان‌لێف؛ ئاوارە؛ هەرزە. (هرزە؛ آوارە)
جیهان‌بینی : [ناو] بیر و بۆچوون و ڕوانین بۆ گشت دیاردەکانی دونیا. (جهان‌بینی)
جیهان‌دیتوو : [ئاوەڵناو] دونیاگەڕاو؛ دوونیادیتوو؛ (ب) سەردەرچوو؛ کارزان؛ عاقڵ؛ بەئەزموون. (جهان‌دیده)
جیهان‌نوما : [ناو] دونیانوێن؛ خەریتەی تەواوی سەرگۆی زەوین کە لەسەر ڕوو پەڕێک کێشرابێت. (جهان‌نما)

جیهانی‌ئازاد : [ناو] ئەو دەوڵەتانە کە پێشکەوتوو ترن لە باری ديموکراسی و ئازادییەوە؛ وڵاتگەلێ کە دیواری جیاواز بوونیان بەدەوری خۆیان و میلەتەکەیاندا نەکێشاوە و هاتوچۆیان بێ‌گرف‌وگیریترە و هەڵبەت خۆیان‌ئەو ناوەیان لەسەر خۆیان داناوە. (جهان‌آزاد)
جیهانی‌سێهەم : [ناو](ب) ئەو بەشە لە وڵاتانی دونیا کە پاشکەوتووترن لە چاو وڵاتەکانی پێشکەوتووتر. (جهان‌سوم)
جێ‌هێشتن : [چاوگە،ت] (١)بەجێ‌هێشتن؛ لەسەر ڕانەوەستان و ڕۆیین.(٢)کارەکەم جێ‌هێشت : لێی گەڕام و دەستم لێبەردا. (ولکردن)
جێی‌خۆکردنەوە : [چاوگە،ت](ب) بە ئاکاری لە بەردڵان لە ناو دڵی کوڕ یان کۆمەڵدا خۆ شیرینکردن و خۆ گونجاندن و خۆ خۆشەویست کردنن. (جای‌خودرابازکردن)
جێی‌لێنەبێت: دووربێت لە ڕووی مەجلیس؛ دوور بێت لەم جێ و لە ڕووی تو یا ئێوە؛ حەددی نەبێت ؛ پەرژینی قایم بێت؛ حاشاحازری. (دورازحضور)

# چ

چابوک‌دەست:[ئاوەڵناو]بە دەستوبرد؛تـەڕدە-
ست.(تردست)
چابوک‌سوار :[ئاوەڵناو] سوارچاک.(چابک‌سوار)
چابوکی : [ناو] توندوتۆڵی؛ قۆچـاخی؛ بـە دە-
ستوبردی. (چابکی)
چابووغ : [ناو] (ف.مشه) سنوور. (مرز)
چاپارزەن : [ناو] چایی‌پاڵێو. (صافی‌چای)
چاپان : [ناو] (١)ئەندازە؛ بارست. (اندازه).(٢)
جاو؛ خام. (کرباس)
چاپانەسەرێ : [ناو] گیاییێکە لە کەرتەشـی‌دە-
کا، بەڵام درووی نییە. (گیاهی است)
چاپباز : [ئاوەڵناو] درۆزن؛ فێڵەباز. (حیله‌باز)
چاپکراو : [ناوبەر] لە چاپ‌دراو. (چاپشده)
چاپکە : [ناو] دەفری ماست تێدا هەوێنکردن.
(ظرف ماستبندی)
چاپگــەر : [نــاو] (١)ئــامێری چـــاپ-
کردن.(٢)شۆڵی
کەسێ کە چاپ دەکا. (٢.١. چاپگر)
چاپوک : > چابوک.
چاپوگووپ :[ناو] چاپوچووپ. فڕوفێڵ؛ درۆ و
دە لەسە. (نیرەنگ)
چاپـەزی : [نـاو]پیشـەی چـایچێتی.(قهـوە-
چیگری)
+ چات : [ئاوەڵناو] گەورە؛ گوشاد. (گشاد)
چاتکردن :چاککردنی ماین لە ئەسپ.(مادیان
راگشن کشی کردن )
چاتکێش : [ناو] ئاسنێکی باریکە بە سەر شر
یتی پاککردنـەوەی لوولـەی تفـەنگـەوەیـە.
(وسیلە‌تفنگ پاک‌کنی)
چاتەڕێ : [ناو] چەند ڕێیان. (چندراهه)
چاچۆڵەباز : [ئاوەڵناو] تـەشـقەڵـەبـاز؛ داوبـاز.
(حقه‌باز)
چاخانچی: [ئاوەڵناو] (ف.گیـو) درۆزن؛ دەڵـە-
سەباز. (چاخانچی)
چاخچاخ : [بەنـد] جارجـار؛ کـات‌کـات. (گـاه
بگاه)
چاخکردن : (١) قەڵەوکردن. (فربه‌کردن).
(٢) داگرســــاندنی‌جگـــــەرە.(گیرانـــــدن
سیگار).(٣)ئامادە کردن.(آماده‌کردن)
چاخموور : [ئاوەڵناو] قاییم؛ (محکم)
چاخوەی : چی‌دەخۆی؛ چ دەخـۆی؛ چـی‌ئـە-
خۆی. ( چەمیخوری)
چاخی : [ناو] قەڵەوی. (چاقی
چادرهەڵدان : دامەزراندنی ڕەشـماڵ و چـادر.
(برپاکردن چادر)
چادرچی : [ناو] خێوەت چێکـەر؛ خێڤـەتسـاز.
(خیمه ساز)
چاربەری : [ناو] بزنی چوارساڵە. (بزچهارساله)
چارپـانی : [نـاو] جـورە هـەڵپـەڕینێکـە؛
چاپانی.(نوعی رقص)
چارتیکـــانێ : [نـــاو] چوارمـــەشـــقی؛
چوارمشقی.(چهار زانو)
چارچەڤ : [ناو] چارشێو؛ چارشەو. (چادر)
چارچی:[ناو]جەڕەبـادەری چوارسـووچ؛جەڕە-

بادەری چوارگۆشە. (چهارسو)
چاردۆر :[ناو]چواردەور؛چوارکەنار؛(ب)دە-وراندەور.(چهارطرف)
چاردیو : چوارلا. (چهارلایه)
چارسوو :چوارگۆشە؛(ب)جەرەبادەری چوارسووچ.(چهارگوشه)
چارکەوت : [ناو] چاردەمسال؛ چواروەرز.(چهار فصل)
چارگاف :[ناو]چوارنالێ؛ غاری بەپڕتاوی ئە-سپ. (چهارنعل)
چارلنگ : [ناو] چوارپێ. (چهارپا)
چارلەپک :[بند]چواردەستوپا؛ گاگۆڵکێ.(چهار دست و پا)
چارماک : [ناو] (ب) چوار ماکی سەرەکی: ئاو، ئاور ، با ، خاک. (چهارعنصراصلی)
چارمەدۆر :[ناو] چوارکەنار؛چوارگۆشە؛چواردە-ور. (چهاردور)
چارمەکووک:[ناو] جۆرێک بووزوو.(نوعی شال)
چارمێرکی : >چوارتیکانێ.
چارنیچک : [ئاوەڵناو]چوارگۆشە. (چهارگوشه)
چارۆخ : [ناو] جۆرێک پاپۆشی وەک کاڵەیە. (چاروق)
چارۆکە : [ناو] پارچە قوماش، زیاتر لە هومایی کە ژنان لە کۆڵی دەکەن؛ کۆڵوانە.(پارچه روی دوش )
چاروێ : [ناو] چارەوا؛ چاروا. (مال سواری)
چارەساز:[ئاوەڵناو] بەئیفاقە؛چارەسەرکەر؛دە-رمان کەر. (چارەساز)
چارەشل:[ئاوەڵناو] دەموچاو سوورهوولی-خاڵخاڵێ.(صورت سرخ نقطەدار)

چارەکردن : دەرمانکردن؛ چارەسەرکردن. (چاره کردن)
چارەگران :[ئاوەڵناو]خوێن‌تاڵێ؛ ڕەزاگران؛ ناشیرین.( بدگل؛ زشت)
چارینی : [ناو] چارینە؛ چوارینە؛ چوارخشتە-کی. (رباعی)
چازووگەر : [ئاوەڵناو] جادووگەر؛ فێڵەباز؛ جامباز.(جادوباز)
چاژوو :[ئاوەڵناو] چاژوو؛خاپینۆک؛ فریودەر؛ حیلە گەر؛ جامباز. (حیلەگر)
چاژی : [بەند]لەوێ. (آنجا)
چاشاندی : [ناو، بەر] وشەیێکی ئاوێستاییە لە کورمانجی ژووریشدا هەربەو واتایەیە؛ فێرکری؛فێرکراو؛ چێشتەکراو؛ (تعلیم گرفته)
چاشیدەر : [ناوی بکەر] فێرکەر. (یاد دهنده)
چاشین : [چاوگە] فێربوون. (یادگرفتن)
چاغ‌وبەنگ : [ناو] تەفرە؛ فریو. (فریب)
چاڤبرچی :[ئاوەڵناو] چاوبرسی؛ چاو چنۆک؛ڕژد.(خسیس)
چاڤبەلۆق :[ئاوەڵناو]چاوبۆق؛چاو دەرپەڕیو. (چشم برجسته)
چاڤپارسەک:[ئاوەڵناو]فریودەر؛تەفرەدەر. (فریبنده)
چاڤتاری : [ناو] چاوکزی. (کم‌سویی چشم)
چاڤتەنگ : [ئاوەڵناو] ڕژد؛ چکووس؛ چاوبرسی؛ بەرچاو تەنگ. (خسیس)
چاڤ چەرینک : [ئاوەڵناو]چاوەچاوکەر؛ چاوحیز؛چاولەوەڕێن. (نظرباز؛ چشم زال)
چاڤدێری : [ناو] چاولێبوون؛(ب) ئاگالێبوون؛ ئاگاداری. (مراقبت)
چاڤڕێ :[ئاوەڵناو]چاوەڕێ؛ چاوەڕوان؛بەتەمای

کەسیٚ بوون. (چشم‌براه)
چاڤسپیک : [ناو] مارمێلک. (مارمولک)
چاڤ کلدایی : چاوبەکل. (چشم سورمه‌کشیده)
چاڤکوور : [ئاوەڵناو] چاوکوێر؛ (ب) چاوبرسی؛ ئازوەر؛ ڕژد. (خسیس)
چاڤ کەروٚک : [ناو] چاولێکەر؛ لاسایی‌کەر. (همچشمی)
چاڤگرتی : [ئاوەڵناو] چاونەکراوە؛ دونیانەدیتوو؛ نابەڵەد. (چشم‌بسته)
چاڤ گەڕوٚک : [ئاوەڵناو] چاوگێر؛ چاولەوەڕێن. (چشم چران)
چاڤ لی‌کەتن : چاڤ‌پیٚ‌کەتن؛ دیتن. (دیدن)
چاڤلێگەڕاندن : چاولێگێڕان؛ (ب) به تەماشا بە دوای کەسێکدا گەڕان. (دنبال گشتن)
چاڤ هاڤێژ : چاولێدەر؛ بە چاوە وەکەر؛[ئاوەڵناو] چاوپیس. (چشم‌زخم‌زن)
چاڤهشک : [ئاوەڵناو] ڕوودار؛ پڕڕوو. (رودار)
چاڤهەولی :[ناو]خێلی؛ چاوچەپ وچیڕی.(لوچی)
چاڤی :(۱)سەرچاوە؛ چاوگەی کارێز.(سرچشمه)
(۲) وێچوون؛ لێکردن؛ شێوە. (شبیه)
چاڤینوٚک : > چاڤ‌هاڤێژ.
چاکل : [ناو] کەڵەوە؛ کەڵەمە. (چنبر)
چاکله : [ناو] چاتۆل؛ داوەڵ. (مترسک)
چاک هێنان : دووجار پشمین؛ جەخت هێنان. (خوب آوردن)
چاک هێنان:له یاریی‌تەختە و پەڕانتوٚدا موٚرە و بە لگی باش‌هێنان؛(ب)له سەر شانس‌بوون. (شانس آوردن)
چاڵ : [ناو] (۱) قووڵک؛ جێگەی نزم.(گودی).(۲)ئەسپی ئەستێرەدار؛ ئەسپی ناوچاوان سپی. (اسب پیشانی سفید)
چال : بزنی سەرسپی. (بز سرسفید)
چالاکی :[ناو]فد:(۱)تونودوتوٚڵی؛ بەکاری؛ چوستی. بە دەستوبردی. (چالاکی). (۲ب) دەورگێڕان و بە شداری لە ئەنجامدانی- کارێکدا. (فعالیت)
چاڵبێستان : [ناو] دێراو؛کەردوو. (کرت)
چاڵبێش : ئاژاڵی سەر و پا سپی. (بز و گوسفند سر و پا سفید)
چاڵتینک:[ناو]قووڵکی بەرگەردن(گودی- جلوگردن)
چاڵ چەناکە : [ناو] چاڵی‌چەنە. (چاه زنخدان)
چاڵ زنیان :[ناو] سیاچاڵی زیندان(سیاه‌چال- زندان)
چاڵەقووت : [ناو] چاڵی‌کووڕ؛ چاڵایی.(گودی)
چاڵەکە : [ناو] گوٚڕەنبش؛ گوٚڕەنەفش؛گوٚڕەبەشە؛ قوڕەبەشە؛ جووالوو. (گورکن)
چاڵەوێن :[ناو] قووڵکەی ئاو؛ چاڵاو؛ دەفری ئاو خواردنەوەی سپلوٚت. (ظرف آب خوردن سگ)
چام :[ناو] چەپەرێکی سێگوٚشەیە بوٚ جوٚماڵکردن. (ابزار لایروبی)
چامە : [ناو] جوٚرێک لاواندنەوە بە شێعر وهوٚنراوەی پاشیلداری درێژ بە بالوٚرە و لاوکەوە.(نوعی عزاداری)
چامەڕەش : [ناو] بەلاییٚڕەش؛ بەڵای گەورە. (بلای سیاه)
چانتە : [ناو]توورەکەی شتومەک؛ جانتا؛ جانتک.(ساک چنته)
چاندە : [ناو] فەرهەنگ. (فرهنگ)

چانقووش : [ناو] جانکووش؛ مجێوری کلیسا. (خادم‌کلیسا)
چاو ئاو نه‌خواردن: هومێد پێنه‌بوون؛ نه‌په‌رمیان. (ناامیدی)
چاوانکی : (ف.گیو) چۆنه‌کی؛ چلۆنی. (چگونه)
چاو باشقاڵی : [ناو] چاوله‌وه‌ڕێنی؛ چاوحیزی؛ چاوبه‌لی. (چشم چرانی)
+ چاوبرکێ : [ناو] کێبرکێی نه‌قونجاندنی چاو.(بازی پلک نزدن)
چاو بلین : چاو ولین؛ هه‌ڵگلۆفینی پێلووی چاو. (چشم مالیدن)
چاو به‌رایی‌نه‌دان:دڵ هه‌ڵنه‌گرتن؛ (ب)نه‌بوونی توانا بۆ دیتنی هه‌ندێ حاڵه‌تی ڕووداوی دڵته زێن. (توانائی دیدن بعضی مناظررا نداشتن)
چاو به‌ستن:(ب) خاپاندن؛ فریودان.(فریب‌دادن)
چاو به‌ل: چاوحیز؛ (ب) زیاتر به مێوییه دموترێت؛ ژنێ که زۆر ته‌ماشای پیاوان ده‌کا. (چشم‌هیز)
چاو به مۆله‌ق وێستان : زه‌ق بوونه‌وه‌ی چاو به‌بێ تروو‌کاندن؛ (ب)حاڵه‌تی چاوکاتی مه‌رگ. (حالت چشم هنگام مرگ)
چاو پڕبوونه‌وه : تۆز و خۆڵ چوونه ناو چاو.(گردو خاک توی چشم‌رفتن)
چاو پرووشه :کوس‌کوسک؛ چاو مژومۆڕ، هاوڕێ له‌گه‌ڵ تروو‌کاندنی‌له سه‌ریه‌کی چاودا. (کم سویی چشم باپلک زدن پیاپی)
چاو پێداخشاندن : به په‌له چاو پێدا گێڕان.(سرسری نگاهی انداختن)

چاو پێوه‌بوون: [چاوگه،ت] چاو تێوه‌بوون؛ (ب)ئاگا لێبوون؛ چاڤدێری. (مراقبت)
چاو ترساو :(ب) په‌ند گرتوو؛ ته‌مبێ‌بووگ. (چشمترسیده)
چاو تێوه برین :(ب)به‌ته‌مابوون؛ ته‌ماح تێکردن؛ چاو تێبڕین. (چشم طمع‌داشتن)
چاو چه‌پوڕاس : [ئاوه‌ڵناو] چاو چه‌پوچیر؛ خێل؛ خوێل. (لوچ)
چاوچڵکن :[ئاوه‌ڵناو] (ب)چاوپیس؛ چاڤینۆک. (چشم‌شور)
چاوخومار :[ئاوه‌ڵناو]چاومه‌س؛ چاومه‌ست؛ دیده مه‌س. (دیده خمار)
چاوداته‌کاندن:هێما به چاو، بۆکردنی‌کارێک یان وه‌ڵامی ئه‌رێنی.(بله بااشاره چشم)
چاورا :[ناو]چاره‌وی؛ چاوره؛ چارموا.(مال‌سواری)
+ چاو قرتاندن : چاو داگرتن. (چشمک‌زدن)
چاوقووڵکه‌ی‌گا : [ناو] لاڕه‌شه؛ قۆڕه؛ گاقڕان؛ بامرنێی ڕه‌شه‌وڵاغی. (طاعون گاوی)
چاوقووڵکه‌ی مامر : [ناو] ئازاره‌مریشک؛ پۆپه ڕه‌شه. (طاعون پرنده)
چاوکاڵ: [ئاوه‌ڵناو] چاوکه‌ژاڵ. (چشم‌قهوه‌ئی روشن)
چاوکراوه : [ئاوه‌ڵناو] (ب) دونیا دیتوو؛ شار و به‌ره گه‌ڕاو؛ (ب)شاره‌زا و ئاگا.(چشم وگوش‌باز)
چاوکولی : [ناو] چاوئێشه. (چشم‌درد)
چاو گرێدای : [ئاوه‌ڵناو] چاوبه‌سته؛ (ب)چاونه کراوه؛ تێنه‌گه‌یشتوو. (چشم‌بسته)
چاو گلکردن : چاوئێشان. (چشم‌درد)
+ چاوگه : ده‌می برین؛ چاوانه؛ سه‌رچاوه. (دم

زخم؛ مصدر؛ سرچشمه).
چاوگە :سەرچاوە؛لەزمانەوانیدا، وشەیی کە بە-بێ ڕەچاوگرتنی(کات،مەکان،کەس)کردنی-کارێک دەگەیینی(مصدر)
چاوگێڕ : [ئاوەڵناو] (١) چاو لەوەڕێن؛ چاوبەل. (چشمچران). (٢) چاو چەپوچێر؛ خێل. (لوچ)
چاولار : [ئاوەڵناو]چاو تاوەتا؛ چاو لاوەلا؛ قیچ؛ چاوچەپوڕاس. (لوچ)
+ چاوڵە : [ناو] چاڵاو.(چاه‌آب)
چاو لەبڵیندان : (ب)بەرزەفڕ.(بلندپرواز)
چاولەبەر: چاوشۆڕ؛(ب) شەرمەزار؛چاو لەدەست. (شرمنده)
چاو لێبوون : (١) دیتن.(دیدن). (٢) مەلاعەزەکردن؛ ئاگالێبوون. (مراقبت)
چاو لێپۆشین:(١)خۆ بەگێل کردن؛ چاو نووقاندن.(چشم‌پوشی) (٢) لێبووردن؛ گوزەشت‌کردن؛ بەخشین. (گذشت‌کردن)
چاو مچاندن : چاوقونجاندن؛چاوقووچاندن؛ (ب)مردن. (چشم بستن)
چاومۆڕ : [ئاوەڵناو] چاوزەق؛ چاو دەرپەڕیو؛ چاوبۆق. (چشم‌برجسته)
چاونێرگسە : [ناو] جۆرێک ماسی. (نوعی ماهی)
+ چاوە : [ناو] یەکەی شماردنی ژوور و ئۆدە و بیری کارێز. (واحدشمارش اطاق)
+ چاوە : [ناو] لە دارەڕای خانوودا بەینی دووکاریتەیە. (فاصله دو بالار )
چاوەڕێیی:[ناو] چەمەڕایی؛ چاوەنواڕی؛ تەمایەری.(منتظری؛ درانتظار)
+ چاو هەڵتەکاندن : برۆ هەڵتەکاندن؛ بە چاو وبرۆ هێماکردن بۆ نەکردنی‌کارێک، مەچۆ، مەکە، یان وەڵامی سەلبی و نەرێنی، نە، نا. (ابرو بالا انداختن) .
چاو هەڵێنان :چاوکردنەوە؛ (ب) بە خۆداهاتنەوە. (چشم‌بازکردن)
چاویلکەدان :جزمە و قوتووی جێگای چاویلکە. (کیف‌عینک)
چایپاڵوون : [ناو] چاپارزەن؛ چایپاڵیو. (صافی چای)
+ چای :[ناو] چا؛ چایی؛ بنجە داری چایی؛دەم کراوی گەڵای پەروەردە کراوی دارچایی.(بته و برگ و دمکرده چای)
چایچی:[ناو]چاپەز؛ قاوەچی؛ چای‌پەز.(قهوەچی)
چای هەوایی : [ناو] چاڵی هەوایی کە فڕۆکە لەپڕ تیدەکەوێ و دادەچێ . ( چاه‌هوایی)
چتگەل : کۆی چت؛ شتگەل. (چیزها)
چت‌ومەک : [ناو] شت‌ومت؛کەلوپەل. (اشیا)
چتۆنە : چتۆ؛ چۆن؛ چاوا؛ چلۆن. (چطور)
چتێ : [بەند]شتێ؛ شتێک؛ وانێکێ. (چیزی)
چرابزر : چراییکی قەدیمی بوو بە فتێلە و شیلەی‌گەرچەک هەڵدەکرا (چراغ روغن گرچک)
چرا پێبوون: چراهەڵکردن؛ گڕاندنی چرا.(٢) خاوەن چرا؛چرا پێبوون:کەسێک کەچرای پێیە. (چراغ روشنکردن)
چرادەسی :[ناو] چراییکی پلیتەداری کەم شوڵە بوو. (چراغ موشی)
چرالخ : [ناو] لە تورکیەوە هاتووە، لکی دارێکە وەک مۆم دەسووتێ. (درختی است

مانند شمع میسوزد)
چڕاو :(١)پڕ و تێکئاڵاو. (توی‌هم- رفته)(٢)پچڕاو.(قطع شده)
چراوی : [ناو] چرا. (چراغ)
چڕای : بانگ‌کردن. (صدازدن)
چرپەی پێ : دەنگێکی کەمی کاتی هە- نگاونان ؛ (شتێ‌نیه که خۆشتر بێ له چرپەی- پێ و چپەیچپه) .«پەشێو» (پچ پچ)
چڕدۆ :[ئاوەڵناو]ئاژەڵێک‌کە باش شیرنادا(حیوانیکە مشکل‌دوشیدەشود) > جڕدۆ
چڕدەرپێ : [ئاوەڵناو] (ب) ژنێک‌کە درەنگ خۆ به دەستەوه دەدا. (کنایی،زنی‌که بەسختی خودرا دراختیاربگذارد)
چڕژ : [ئاوەڵناو] پڕژ؛ بڵاو؛ پرش. (پخش)
چڕژان :چوون بەناو یەکدا و تێک هاڵان؛لکی دارەکان تێکچڕژاون. (توی هم‌رفتن)
چرسک :[ناو]ترووسکه و چرووسکەی ڕووناکی؛ترووسک. (سوسو)
چرقراندن :پرش‌وبڵاو کردن.(پخش‌وپراکندە- کردن)
چرقری :[ناو] بڵاوی؛ پرژی؛ پەرێشانی. (پراکندگی)
چرقە :[دەنگ] قرچە؛ دەنگی شکانی دار. (قرچ)
+ چرکەچرک : به چرکەچرک پیاچوون: زۆر و به زەحمەت و گوشار پیاچوون. (بافشار)
چڕگاو : [ناو] زەلکاوی پڕ و چڕ. (نیزارانبوه)
چڕگە :جێگای دژوار و چڕ.(جای سنگلاخ ودشوار)
چڕگەر : [ناو] گۆرانی بێژ. (آوازخوان)

چرمسان :چرمسین[چاوگە] سیسبوون و ژاکان. (پژمردەن)
چرۆچێو:[ناو] چیلکە و چەوێڵ؛ لقی داری وشکی باریک و ورد. (خرده چوب‌خشک)
چرۆنەک: حەشار؛ نادیار؛ پەنهان. (پنهان)
چرووسکەڕاو : شەوڕاوی پەلەوەر بە چرا.(شکارپرنده درشب با چراغ)
چرووس :[ناو]ترووسک؛ چرووسکە؛ ترووسکه.(سوسو)
چرەکەو :خوێندنی‌کەو؛کێبەرکێی خوێندنی دوو یان چەند کەو. (مسابقه خواندن کبک)
چریسکان : ترووسکان. (درخشش)
چز : [ناو] نووکی قولاپی ماسی‌گرتن؛ وەک: قولاپی دووچز. (نک قلاب ماهی گیری).+
>دریشووشک.
چزرین:[چاوگە] سیس‌بوون؛ ژاکان؛ چرچ- بوون. (پژمردەشدن. چروکیدن)
چزلیک : [ناو] جۆرێک‌کێردی‌کەوانییە وەک خنجێر. (گزلیک)+
+ چزە لێ‌هەڵساندن : (ب)زەرەر لێدان؛ ئازار پێگەیاندن؛ پێوەدان. (ضرر وآزار رساندن)
چسک : [ئاوەڵناو] چوست؛ چالاک. (چست)
چغر : > چقر.
چغراندن : به گژداکردن؛ هاندان. (تحریک کردن)
چفت‌وبەس : [ناو] ئاڵقەڕێز ودوولایی. (چفت وبست)
چفتە : (١)[ناو] (تفەنگی ڕاو. (تفنگ شکاری).
(٢)[ئاوەڵناو]سیابەخت؛ بەدبەخت؛ داماو(بیچاره)

چفکرن:خێڵ‌وفەرەج کردن؛ گزی‌کرن؛ تەشقەڵەکردن. (حیلە کردن)
چفەچف : [ناو] سرتەسرت؛ پچەپچ. (پچ‌پچ)
چڤاتگە :[ناو]جڤاتگە؛ جێی کۆبوونەوە؛کۆمەڵگا.(جای اجتماع‌کردن)
چڤۆ :[ئاوەڵناو]حیلەباز؛ فێڵەباز، گزی‌کەر؛جامباز.(مکار)
چڤوونی : [ناو] جوان و جەحێڵی؛لاوی؛ هەرزە کاری. (جوانی)
چڤین :[چاوگە]خواربوون؛ چەمین؛ هاتنەوەیەک.(خمیدن)
چقر :[ناو]چغر؛ خاچ؛ خاڵی‌خاچ لە پەڕی پەڕانتۆدا. (خاج)
چقڵەکەوی : [ناو] دڕووەزەردە. (نوعی خار)
چقڵەکەوە : [ناو] پوورئایشێ؛ جۆرێک دڕووی کورتەباڵایە. (نوعی خار)
+ چک :کۆتایی؛ بڕان؛ بێهن چک‌بوون: هەناسە بڕیان. (قطع)
چکۆن: جەکۆن؛ لەکوێن؛کێدەرێن؛ لەکوورەن؛ وەکوورەن. (کجایند)
چگزین:ئەنتوپەهت‌بوون؛ بەشک‌بوون؛بەدگومانی؛چاڤزۆرک. (شکاکی)
چگووڕاندن:[ناو]ئاوساندن؛ هەڵمساندن؛ باپێکردن:ڕق‌هەڵساندن. (عصبانی‌کردن)
چلاب : [ناو] زریزەی ئاڵتوون. (زنجیرطلا)
چلپایی : [ناو] هەزارپا. (هزارپا)
+ چڵپوڵیس :خواردنی بە لەز و بە دەنگ وسەداوە.(خوردن‌باسروصدا وعجلە)
چڵتووکجاڕ:مەرەزە و شەڵتووکجاڕ ؛مەزرای برنج.(شالیزار)
چلتیکە:[ناو] ڕووەی لێفەی چێبوو لە تیکە-
گەلی قوماشی دەمە دوێرد. (چهل‌تکە)
چلچراو : [ناو] چلچرا؛ لووستێر. (لوستر)
چل‌چلە : زۆر بەساڵاچوو؛ چەندجار چل‌ساڵ. (چهلچهلە؛چل‌چلە)
چلچەمە:کێوێکە لە بەینی سەقز و مەریوانداکە سەرچاوەی چۆمی قزڵوەزانە.(نام کوهی است)
چڵخووس: [ئاوەڵناو] ڕژد؛ چکووس. (خسیس)
چڵدان : (۱) پتدانی دەمار و برین. (۲) ئێشان؛ ددانم چڵدەدا:دێشێت.(۱نبض‌زدن.۲تیرکشیدن،دردکردن)
چل‌درۆ : (ب) زۆر درۆزن. (خیلی دروغگو)
چلڤلین :[چاوگە]چریسکین؛بریقە دانەوە؛ شەوق‌دانەوە؛ ترووسکە دانەوە. (درخشیدن)
چلڤۆک : [ئاوەڵناو] بە بریقە؛ بە درەوشانەوە؛ برووسکەدار. (درخشان)
چڵکبەر : دەرمانی دژی چڵکی برین و هوورگ (میکرۆب)؛ ئانتی‌بایۆتیک. (آنتی‌بیوتیک)
چلوان : [ناو]چلەکانی زستان.(چلەهای‌زمستان)
چلوو : [ناو] مەودای بێنوێژ بوونی ژن لە پاش منداڵبوون هەرچەند لە چل ڕۆژیش کەمتربێت. (مدت‌قاعدگی زن پس‌از زایمان)
چلەشۆر : (۱)ڕێژنە بارانی پاش چلەی زستان؛ (۲) وسڵی دوای چلوو. (۱باران‌پس‌ازچلەزمستان؛ ۲،غسل پس ازچلە)
چڵەکان : (۱) لکەکان. لقەکان. (شاخەها). (۲) شڵەژان؛خورپان؛چڵەکیان؛ سڵەمان.(یکەخوردن)
چڵەکاو : شڵەژاو؛ خورپاو. (یکەخوردە)

چلەکیانەوە : سڵەمانــەوە؛ داچڵـەکـان.(یکـە-خوردن)
چلیٚ‌هامنیٚ : چلەی‌هاوین. (چلەتابستان)
چم : [ناو] سم؛ سمی وڵاخ. (سم)
چمبل: [ناو] دەستکی هیربار. (دستەظـروف-سفالین)
چنچکـان:[نـاو] چینچکـان؛ بـە چنچکانــەوە دانیشتن: هەڵترووشکان. (چمباتمە)
چنک : [ناو] ڕیٚزەولٚ؛ ورتکەنان. (ریزەنان)
+ چنگ‌گرتن:[چاوگە،ت]بە ناخوون ڕووشاند-ن وبریندارکردن. (چنگ‌زدن)
چنگۆڵگرتەی : چنگگرتن. (چنگ‌گرفتن)
چنگەپلماسیٚ:[ناو]هاشاولٚ‌بردن بـەپـەنجـە و چنگ گرتن؛شەڕەچنگ؛ حاڵەتی کەسیٚ‌کە لە شەڕدا وە ژیٚرکەوتووە لە ژیٚرەوە بە چنگ دە-ست دەکاتەوە. (باچنگ‌از زیر دفاع کردن)
چنینە : شتیٚ‌نییە؛ تشـتیٚ‌نینـە؛ (ب) گرینـگ نییە.(چیزی نیست)
چنینەوە : [چاوگە،ت] هەڵگرتنەوە وکۆکردنە-وە؛نان چنینەوەی شوان لە ئیواراندن. (جمـع-کردن)
چۆ :[ناو] چق؛ چقە؛ چۆب؛ قیتکەی زوور پە-نجەی کەڵەشیٚر و فڕندە.(انگشت شاخی پـای خروس)
چۆ؟ ار : [ناو] بـەینـی واو و ئـەلـف (د)یٚکـی سوواو هـەیـە کـە بـەحـاڵ‌هـەسـتی پیٚـدە-کریٚت.چۆدار.(چوبدار)
چوارپارە :[ناو] چواربەش.(ب)فیشەکی‌تـاپڕی چوار ساچمەی ڕاوی گەورەنچیر .(چهارپارە)
چوارجامە : [ناو] چوارمشقە. (چهارزانو)
چوارچـۆ : [نــاو] چوارچیٚــوە؛ قــاپی ویٚنــە و ئاویٚنە؛قاپ. ڕیٚژەک. (چهارچوب)
چوارخرت : بەران و بـزن و بۆقلـە و مـەڕی چوارساڵە. (بز و گوسفند چهارسالە)
چواردانگ:(١)[کۆڕی موسیقا]لە مۆسیقادا دە-نگی گۆرانیبیٚژەکان بە سـیٚ پلـە دابـەشـدە-کریٚت٢،۴،۶ ،دانگ.(٢)چواردانـگ لـە شـەش دانگی‌هەرملٚکیٚک. (چهاردانگ)
چوارشەممەسووریٚ : [ناو] وشەیەکی فارسییە ولە کوردیشدا دەوتریٚت؛ کوڵـەچوارشـەممـە. چوارشـەممـەی ئـاخری سـالٚ. (چهارشـنبە-سوری)
چوارقـــاپ : [نـــاو]جۆریٚـــک یاریـــە بـــە میچ(جگ،قاپ)(چهارقاب)
+ چوارقەد :[ناو] (ب) سەرپۆش و ڕووسەریی چوارگۆشە. (روسری چهارقد)
چوارگا :[ناو] مەقـامی چوارگـا لـە مۆسـیقادا. (چهارگاه)
+ چوارلا : چوارتۆ؛ چوارهیٚندە. چوار بەرانبـەر. (چهاربرابر)
چواروەرز :چوارفەسلٚ.(ب)سال.(چهارفصل)
چۆپ : [ناو] درۆ. (دروغ)
چۆپەمە : [ناو] چیٚوپەمە. (چوب‌پنبە)
چــوتیر : [نــاو]چویٚشــتیر؛ بزنـــی‌دووســاڵە. (بزدوسالە)
چۆخیٚ : [ناو] چۆغە. (بلیز از شال)
چۆدەرچوو : [ئاوەڵناو] چق دریٚژبوو. (ب)خاوە-نی ئەزموون و دونیادیتوو. (کنای،دنیادیدە)
چۆڕ :[ناو]چۆڕپۆڕ؛کەڵەشیٚری جەنگـەڵی؛قـە-رقاولٚ. (قرقاول)
چۆڕاوگە : [ناو] پلووسـکی سـەربـان.(نـاودان پشتبام)

چۆرت شێوان : چۆرت بڕیان؛ چۆرتی ترياكى پچڕان؛خەوە نووچكە شێويان.(چرت پاره شدن)
چۆڕەبڕ :چۆڕبڕ؛ وشک‌کردنی دوادلۆپی تراو.(تاآخرين قطره خشكاندن)
چۆڕەچۆڕ :شۆڕەشۆڕ هاتنەخوارەوەی تراو.(شرشر)
چوڕەگەڵوازە :[ناو] جوڕەقازڵاخە. (پرنده ای-كبودباندازه سار)
چۆق:[ناو] پۆک؛مژ؛ نەفەسێكە لە جغارە دە-درێت. (پک)
+ چۆقان :چۆقین؛[چاوگە] لەرزین لە ترس یان سەرما یان یاو. (لرزيدن)
چوقلی : سەرچڵ؛ سەرلک؛ خونچەی سەرلق وپۆپی دار. (غنچه و ساقه بالای درخت)
چۆقین :[چاوگە](١) هەڵقرچانی ڕۆن لە سە-رئاگر.(تفيدن؛ تفت دادن)(٢) >چۆقان.
چۆكار : [ناو] چێوكار؛ دارتاش؛ چۆگەر. (نجار)
+ چۆک دادان : چۆک لە عەرزدا دانان.(ب) كوڵدان؛شكستی‌هێنان؛ بەزین.(شكست-خوردن)
چوكڵەشەمچە : [ناو] چیلكەی شقارتە. (چوب كبريت)
چۆلخە :[ناو]كەسێ‌كە خوريی ئاژاڵ بە برينگ دەبڕێتەوە. (پشم‌چين با دوكارد)
چۆڵگەرد :[ئاوەڵناو]بیابان گەرد؛چۆڵ‌بڕ؛كۆچە-ری بیاوان نشین. (بيابان گرد)
+ چۆلە:[ناو] قەیسی و بادامی سەوزی نەگە-ییو.(چغاله)
چۆلەبادام : > چۆلە
چۆڵەپێچ : [ناو] (١) چۆڵمەپێچ ؛ دارێكی دوو فلیقانە بۆ دەرهێنانی نچیری وەک كە-روێشک و ڕێوی لە كون. (چوبدوشاخه شكار)
(٢) ڕاوە كەوی‌كاتی‌كڕكەوتنی ماكە-و.(شكاركبک‌درايامی كه ماده‌كبک كرچ-است).(٣) گولۆڵە پێچ؛ تەناف پێچ؛ شەداندن و شەتەكدان. (گلوله‌پیچ)
چۆڵەپێچەن : >چۆڵەپێچ
چۆڵەكەگرە : [ناو] سەقری مێشخۆر. قجی. فڕندەییێكە لە تۆرەمەی پەڕپەڵەكە چۆلەكە و مشک دەخوا.(سنگ‌چشم)
چۆڵەوانی : [ناو] دەشتەوانی.(ب)كشت‌وكاڵ لە كێو و دەشت. (كنايی، كشت‌وزرع درصحرا)
چۆماو : ئاوی چۆم. (آب رودخانه)
چونگە : چينە. (چينه)
چووانـدن : (١) پووچ‌كردنی گۆرەوی لە جۆرابێندا.(پوچكردن).(٢)دەركردن و قت‌كردن لە كۆڕی یاری. (اخراج)
چوواو : [ناو، بەر] قت‌كراو لە كايەی پشكيلاندا. (كنارگذاشته‌شده در جوراب‌بازی)
چووزانم :چ‌دەزانم؛ چیەزانم؛ چازانم، چە-بزانم.(ب) نازانم؛ (چه‌ميدانم)
چووزەرە:[ناو] تازەترين چووزەی ڕووەک؛ چووزە رەكردن: سەردەرهێنانی گیا لە توو یان لە خاک. (جوانه)
چووزەلاو : [ئاوەڵناو] لاوی منداڵكار و كەمەر باریک، ناوقەد زراف. (نوجوان‌كمرباريک)
چووكێتی : [ناو] پچووكی؛ چكۆلەیی؛گچكە-یی. (كوچكی)
چوولیت : [ناو]خەزێم؛ لووتەوانە.(زينت پره-دماغ)

چوونــــــه : (١)ڕابـــــووردووی چـــــــوون. چووگن.(رفتماند). (٢) [ناو] ئەنگووتک؛ گونکە هەویر؛ تۆپەڵە قوڕ.(چونه)

چوونەئاو : (١)کورت بوونـەوەی قومـاش لـە ئـاودا.(٢ب)لاواز بـوون ؛ تاوانـەوە لـە ئـاودا. (لاغرشدن؛حل شدن)

چوونەبـەس : بـەستران. قفـڵ بـوون؛ وەک: زمان چوونە بەس. (بسته شدن)

چوونە بەس :(١) پنا بردنە بەر مەرقەد و بارە-گای چاک و پیر.(بست رفتن).(٢) دوابڕیـان؛ تەواو بوون. (تمام‌شدن)

+ چوونە جەستە بە شەڕەوە چوونە سەرکـە-سیْ بۆ لێدانی. (پیش‌کسی‌رفتن بقصـدکتک-زدن)

چوونەسەر:(١)دان بـەسـەردا؛ هێـرش‌کردنـە سـەر؛ لـەشـکربردنەسـەرکـەسـیْ.(حملـه-بردن).(٢)سەرکە وتن؛ پلە و پایـە وەرگـرتن؛ چوونەبان، لە نێردیوان چوونـە بـان. (ترقـی-کردن)

چوونەلا : (١)ڕۆیشـتنە کـەنـار؛ چوونـە لاوە؛ (کناررفتن)(٢)چوونەکن؛ڕۆیشتن بۆ (خزمەت، نزیک،کن،لا)ی کەسیْ. (پیش کسی رفتن)

چوویت :(١)[ڕابوردووی چوون بۆ هەوەڵکـە-ســـی تــــاک]ڕۆیشــــتووی؛ ڕۆیشـــتکی؛ ڕۆیشـتی.(رفتـەای؛ رفتـی)(٢)[نـاو] هـەش. (تیل).(٣ب) تد. [ئاوەڵناو]چقیت، پاک لەپـاک. (بیحساب)

+ چووین : چوون بۆ هەوەڵ کەسی کۆ؛ ئێمە چووین؛ ڕۆیشتین. (رفتیم)

چەپازڵە : [ناو] شەقەزڵە؛ شەپلاغە. (سیلی)

چەپاڵە : [ناو] چەپک؛ چەپاڵەگوڵ:دەستەگوڵ. (دسته)

چەپخووس : [ئاوەڵناو] بەدواز. خراپەخواز. نیاز خراپ. (بدخواه)

چەپخوون : (١) [ئاوەڵناو] خێل. چاولار.(لوچ). (٢)[ناو] هێرش بردنە سەردوژمن بێخەبـەر و بە شەو. (شبیخون)

چەپدەست : >چەپلەر.

چەپڕاست : ئەسپیک کـە دەسـتی چـەپ و لاقی ڕاستی،بازنەییێکـی سـپی ڕەنگـی هـە-بێـت.(اسـبی‌کـه دسـت‌چـپ وپـای‌راسـتش دربخلق‌سفیدباشد)

چەپلەر:[ئاوەڵناو]چەپدەست؛مرۆییْ‌کە بـە دە-ستی چەپ کاردەکا یـان دەنووسـیْ. (چـپ-دست)

چەپ و گوپ : [ناو] ڕاوەڕووت. (راهزنی)

چەپە : وەرگەڕانی سەیارە. (چپه)

چەپەرچی : [ناو] پۆستچی؛ پەیـک و نامـە-هێنەر؛ نامەبەر. (پستچی)

چەپەرخانە : [ناو] پۆستخانە. (پستخانه)

چەپـەڵکـاری:[نـاو] کارپیسـی؛ کارنـاپوختی. (گندزدن)

چـــەپـــەڵـــی : [نـــاو] پیســـی؛ گـــەمـــاری؛ قرێژی؛پۆخڵی. (چرکینی؛ گندی)

چەپەنداز :[ئاوەڵناو] دەغەڵ؛ فێڵـەبـاز؛ حیلـە-باز(حیله گر)

چەپی :[ئاوەڵناو](١)ئەنـدامی حیزبـی چـەپ بوون. (چپی).(٢)[ناو]چەلەپایی؛هـەڵپـەڕکـێـی کرژ.(نوعی‌رقص‌تند)

چەت :[ناو](١)کـوزری خـەرمـان؛ سـاقەتـی گوڵەگە نمی نەکوتراو. (ساقەنیم‌کوبـخـرمن) (٢) تەگەرە.(چت)

چەتاندن : قتاندن؛ قرتاندن. (قطع کردن)
+ چەترهەڵدان:سەیوان کردنەوە؛ چەترپان- کردنە وە؛ چەترپێکانی بۆقلە و تاوس. (چە- تربازکردن)
چەتوەر : [ناو] نیوەی نیوبتری شلەمەنی بە- رانبەبە ٢٥٠سی سی(سانتیمیتری چوارگۆشە). (چتول)
چەتەبرژێن :[ئاوەڵناو] برژاندنی بە پەلە و نیوە برژ. (نیم پخته)
چەتەڕی :[ناو]لاڕێ؛ ڕێگەی باریک وچە- توون؛کوێرەڕی. (کورەراه)
چەتەوڵ : [ناو] پۆلیسی ئێشککگر. (پاسبان)
چەتیان:[ناو] دەرزیلە؛ دەرزیعورووسی؛ دە- رزی سنجاخ؛ دەرزی بەرسینگ و بەرۆک. دەرزیلە.(سنجاق قفلی)
چەتیم : چەتیوە؛ کچەتیو. (یتیمچەدختر)
چەتین:[ئاوەڵناو]چەتوون؛دژوار؛سە- خت.(مشکل)
چەچەکۆڵە :[ناو] چەچەقوڵە؛ جۆرێک ناساخی حە یوانی بەرزەیە. (نوعی مرض اسب وگاو)
چەخت: [ئاوەڵناو] بێشەرم. (بیشرم)
چەختی : [ناو]بێشەرمی؛چەقە- سوویی.(بیشرمی)
چەختی:[ناو]چوختی؛لە کاردەرهاتوویی؛ وریایی؛کارامەیی. (کارامدی)
چەخش : [ناو] بەرژەوەندی؛ قازانج. (منفعت)
چەخموور : [ناو] فد. ئەسپی کە گلێنەی چاوێکی کاڵتربێت لە چاوەکەی دیکەی. (چخمور)
چەخموور : [ئاوەڵناو] چاخموور؛ پتەو؛ قەوی؛ خۆڕاگر؛ قاییم. (محکم)

چەدما : [بەند]چە دما؛ لە دووماهی؛ لەپاش؛ لەدوو. (بعداز؛ سپس)
چەراخۆخ:بەشی ژوورەوەی سەرتەنوور و مدبەق. (قسمت بالای مطبخ)
چەرت :[ناو]سەتڵی گەورەی ئاو.(سطل بزرگ)
+ چەرچەف : ڕوو تەختی؛ مەلافە. (روتختی)
چەرخەتوون : [ناو] سۆبا؛ کوورە. (بخاری)
چەرخی : [ناو] بایەدەی مسی؛ کاسەی چووکی مسی. (بادیەمسی)
چەرخیای : [چاوگە] چەرخین؛ خول خواردن. (چرخیدن)
چەرخی خەیاتی:[ناو] مەکینەی دروومان. (چرخ خیاطی)
چەرقوبەز:[ناو]هەڵپەڕین و دوو دەسماڵەی دووکەسییە. (رقص دونفری)
چەرمای چەما : چەرمێنەی چاو؛ سپێنەی چاو. (سفیدی چشم)
چەرمە : [ئاوەڵناو+ ناو] چەرموو؛ سپی. (سفید)
چەرمەڵە : [ئاوەڵناو] سپیکەلە. (سفید)
چەرنای : لەوەڕاندن. (چراندن)
چەڕەدووکەل : >چڕەدووکەڵ
چەس : [جێناو]چییە؛ چێشە. (چیست)
چەسپ :(١)[ناو] چەست؛ سلاوی عەسکەری بە پاکوتانن بە یەکدا. (چسپ).(٢) [ئاوەڵناو] جلوبەرگی پڕبەپڕی ئەندام؛دژی فش و هەراو (چسبان)+
چەسپی ئاوەکی:[ناو+ت]چەسپی دارتاشی.چە- سپتراو. (چسب مایع)
چەسپنای :[چاوگە]لکاندن؛چەسپاندن.

(چسباندن)
چەسپین : [ناو،بک] نووسین؛ لکین. (چسباننده)
چەسپینەواری : [ناو] چەسپی کاغەزی و نایلۆنی. (چسب‌نواری)
+ چەشتە :[ئاوەڵناو] (ب) کاربەدەستی که فێری بەرتیل وەرگرتن بووبێت. (کنایی، کارمندرشوه بگیر)
چەشتەی : [چاوگە]چەشتن؛ چێشتن. (چشیدن)
چەشنە : پشک؛[ناو] قورعە. (قرعه)
+ چەشنی : [ناو] تەقێنەری فیشەک کە لە بنی هەر فیشەکێدا هەیە. (چاشنی فشنگ)
چەفت‌وچیڕ: [ئاوەڵناو]چەوت‌وگێڕ؛ چەفت- وخوار.لاروگێڕ. (کج‌ومعوج)
چەفتیاگ : [ناو،بەر] لاربووگ؛ خواربوو؛ گە- ڕاو. (خم‌شده)
چەفر : [ناو] چغر؛ خاچ؛ چقر. (خاج)
چەڤی: [ڕابوردووی چەڤین:چەمین]چەما؛چە- می؛ خەم بوو؛ گەڕا؛لار بوو؛ چەمیا؛ چەڤیا. (کج‌شد)
چەڤی: [ناو] حاڵەتی کووڕ بووگ؛ کووڕی؛لاری؛(خمیدگی)
چەق : [ناو] (۱)لای ناوچاڵی قاپ. (طرف گودشتالنگ)جۆرێک ڕیشە و دەماری سفتی ناوگۆشت ؛گۆشت یان مەمکی داشۆڕاو و چەق. چەق وداشۆڕاو.«سینەی ڕەقم مەمکی- چەقم«فۆلکلۆر»(پی؛پستان شل و افتاده)
چەقماق : [ناو] تد،فد: چەخماخ؛ئامێرێکە بە- سەر گێلەنگێدەنەوە؛ (چخماخ)
چەق‌وتەفی‌ڕۆژگار : (ب) چەرمەسەری ڕۆژگار. (کنایی، محنت‌روزگار)
چەقولوور : حەپەی بە کۆمەڵی سپلۆت. (عوعو دستجمعی سگها)
چەقوچۆ : [ناو] چەقوچۆ لی‌بڕین: قرتەلێبڕین؛ مژینی‌گوان و مەمک تا دوا دڵۆپ. (تاآخرین قطره مکیدن‌پستان)
چەق‌وچۆق : تەقەی ددان لەکاتی لەرز لێهاتندا. (صدای بهم‌خوردن‌دندان)
چەقۆی‌زامندار : [ناو] چەقۆیێکی زبانەدارە کە بە بێ گوشاری ئەو زبانە دەمەکەی نانووشتێتەوە. (چاقوی ضامندار)
چەقەتە : [ئاوەڵناو] زۆربڵی. چەنەباز. (وراج)
چەقەدووکەڵ : [ناو] چرەدووکەڵ؛ تەپەدوو. (دودغلیظ)
چەقەڕۆ : سەگوەڕ؛ هەراوهوریا؛ هەڵا. (عوعو؛ همهمه)
چەقەسرۆ : [ئاوەڵناو] زۆر بڵێ؛ قەرەچەناخ؛ ڕوو داماڵاو. (پررو؛ بیشرم)
چەقەل : [ناو] چەقەڵ. (شغال)
چەقەڵاخ :[ناو] کەمێڵەی ژێر دووگی مە- ڕ.(گال؛پوستاله)
چەقەڵتە : [ئاوەڵناو] لەڕ؛ لاواز. (ضعیف)+
چەقەوانە : [ناو] ئامرازێکی مۆسیقایە، چەنگ. (چنگ)
چەقی‌مەرگ :[ناو] بە هەزارحاڵ و کێشە- کێش. (بازحمت)
چەقی‌نەحلەت :[ناو] مانگرتن و ڕازی نە- بوون. (لج‌کردن)
+ چەقیو : [ڕابوردووی چەقین] (ب) بێجوولە و تەکان، مەزرەقەکە پیرانیکردووە و لە جێی خۆی چەقیوە؛ ڕاوەستانی بێ بزوە. (بیحرکت

ایستادن)
چەکاڵ :[ناو]گۆشتی لەش‌کە لەرەی دێت و سیس و چرچە. (گوشت شل وآویزان بدن)
+ چەکمەڕەق: خان‌زادە؛ بەگزادە؛ (کۆنەچەکمە ڕەق: خانزادەی لێکەوتوو.)(خانزاده؛نجیب‌زاده)
چەکمەسوور:[ناو] فڕندەیێکە لە تۆرەمەی مەلە ڕۆژ، لەشی‌بچووکە و لاقی درێژە. (چوبپا)
چەکوچۆ : >چەقوچۆ
چەکو چۆڵ :[ناو] چەک و ئامرازی شەڕ.(اسلحه و اسباب جنگ)
چەکوکەوان:[ناو]ئامێرەکانی هەلاجی.(دستگاه حلاجی)
+ چەکەرداسی :[بەند] تد، وشەیێکی تورکییە، (داس کێشان بێ‌تێفکرین)لەئاکۆیی؛لاپرەسەنی؛ بێ‌پێوانە و کێشانە و بەراورد و هەڵسەنگاندن. (بدون قیاس وتفکر؛سرسری)
چەکەرەکردن : هەوەڵین نیشانەی سەوزبوونی ڕووەک. (جوانەزدن)
چەلاپە:ڕاوی بەفرە بەسەر. (شکارکردن برروی برف یخ‌بسته)
چەلاندن : چەراندن؛ لەوەڕاندن. (چراندن)
چەلتین : [چاوگە] کەوڵ‌کردن. (پوست کندن)
چەلچەلە :[بەند] جارجارە؛ جاروبار. (گاهی)
چەلخوور : [ناو] چەلخوور؛ چەلغوور؛ گسکی لە لکی گزیچار. (جارو از شاخه درخت گز)
چەڵخووسی‌جۆ: گوڵە جۆی پروێنراوی بۆدراو بۆ چێشت. (جو نارس بوداده)
چەڵخووسی‌گەنم : گەنمی فەریکی لە ئاوی کوڵاتوو هەڵکێشراوی وشکەوەبووی لە دەستاڕکراو. (خرده گندم نارس‌خشک‌شده)
چەلغوور : چەلغوو.> چەلخوور.
چەلماندن : وەقسەهێنان. (بحرف‌آوردن)
چەلمین :[چاوگە]قسەکردن؛ ئاخەفتن(حرف‌زدن)
چەڵەبی : [ناو] جەڵەبچی؛ چۆدار. (چوبدار)
چەلەحانێ:لە سەرقسە ڕۆیشتن بە هەرا و دەنگی بەرز. (حرف‌زدن باصدای بلند)
+ چەلەپایی :[ناو] (١)هەڵخە؛ هەڵپەڕینێکی توند و کرژی کوردییە.(٢) ئاهەنگێکی مۆسیقاییە بە ڕیتمی توندەوە؛ ئاهەنگ و گۆرانی‌کرژ بە زەربی تایبەتەوە بۆ هەڵپەڕینی چەلەپایی. (آهنگ و رقص‌تند)
چەلەکی : [ناو] جۆرێک ماسی. (نوعی ماهی)
چەلەنگی : [ناو] جوانی؛ شۆخ و شەنگی.توند و تۆڵی .(جوانی؛خوشگلی.چابکی)
چەماش : [ئاوەڵناو] چەمووش. نائارام. (چموش)
چەماو : > چۆماو +
چەم‌برسی : [ئاوەڵناو] چاوبرسی؛ چکووس؛ ڕژد.(کنس؛ خسیس)
چەم‌بریای :[ناو]چاولێکەری.(تقلید؛چشم و هم چشمی)
چەم‌بلوول : [ناو] پلووسک. (ناودان)
چەم‌تەنگ : [ئاوەڵناو] بەرچاوتەنگ. (حسود)
چەمچ :[ناو]کەوگێز؛کەوچک؛ چەمچە؛کەوچکی دەمپانی بەننایی. (چمچه)
چەمچڤین :چاوفڕین؛ پێلووی چاو پەڕین.(چشم پریدن)
چەمچۆچای : [ناو] کەوچکە چایی(قاشق

چایخوری)
چەمچۆڕ : [ئاوەڵناو] مرۆڤی لەڕ و لاواز. (انسان لاغرونحیف)
چەمچەماڵ: شارۆچکەیێکە لە بەینی سلیمان و کەرکووکدا. (اسم شهرکی است)
چەمچەقازان: [ناو] کەوگێزی گەورەی ئاو هە ڵگوێزان. (آبگردان)
چەمچی : [ناو] چەرچی. (پیلەور)
چەمداری : [ناو] چاودێری. (مواظبت)
چەمزەق:[ئاوەڵناو]چاو دەرپەڕیو؛چاوزەق.(چشم برجسته)
چەمساخ :[ناو]دەسکێشی کوێر؛ چاوساخ.(راهنمای کور)
چەمکز : [ئاوەڵناو]کەمبین؛ چاومژومۆر؛ چاوکز؛ چاوپرووش. (چشم ضعیف)
چەمل : [ناو] قوڵفەی هیربار. (دسته کوزه)
چەمنای : [چاوگە] چەماندن. (خماندن)
چەموچوغر :[ناو] قۆرخ وچۆم؛ چۆم و دارستان؛ لێرەوار و چۆم. (درختستان کنار نهر)
چەموخەم :[ناو] پێچوپلووچ؛ڕاز و ڕەمز.(چم-وخم)
چەموز : [ناو] ۆشەیێکی هەورامییە و دە-کرێت لە جیاتی کۆنترۆڵچی بەکار ببرێت.چاوەدێری شتێک بوون (کنترولچی؛ نظارت کننده)
چەمۆک : [ناو] چۆمیچکۆلە. جۆگە. (جوب)
چەنانیپێشوو :[بەند] هەر وەک چەلانی-پێشوو؛ وەک جاران. (مانندزمان گذشته)
چەنتە : [ناو] جانتا؛ جەنتک. (ساک)
چەنچووز : > چەم برسی
چەنخووس : >چەم تەنگ

چەنگەپرچە : قژکێشان لە شەڕدا. (چنگزدن بمو دردعوا)
چەنگەک : [ناو] چفتە؛ قولاپ؛ قە-نارە.(چنگک)
چەنەئامەی:[ناو]لەدەستهاتن؛ توانا و لێهاتنی کار. (قادربوودن)
چەنەدریژ: [ئاوەڵناو] زۆربڵێ؛ چەنەشکاو؛ دەمە وەر؛ سوێڕقسە؛ فرەوێژ. (پرگو)
چەنەگە :[ناو]ئەرزینگ؛ ئارزەن؛ئارچەن؛ چە-ناکە؛ چەنە. (چانە)
چەنەم :(١)چەناکەم؛(چانەام).(٢)لێم. لەمن. (ازمن)
چەنیدان : [ناو] دەرزیدان؛ جێگەی دەرزی. (جاسوزنی)
+ چەو : چیبوو؛ چبوو. (چەبود؛چەشد)
چەوت و چیڕ : [ئاوەڵناو] چەوت و چە-وێڵ؛خوار وخێچ. (کج و کولە)
چەوچە : [ناو] مەتەڵۆکە؛ هەڵهێن. (متل)
چەوچەو : [ناو] هەوهەو؛ شڵەژاوی.(آشفتگی)
چەودما :[بەند] لەوەدوا؛ لەمەودوا.(سپس؛ منبعد)
چەمەرانە : هەوای(مۆسیقای) چەمەری. (آهنگ عزای چمری)
چەمەرچۆپی :[ناو]چەمەری؛دەستگرتن بەدە-ورە و ئاڵقە پێکان بۆ ماتەم و عەزا کە جۆرێک هە لپەڕکێیە.(عزاداری حلقەوار)
چەمەرەخەیار : [ناو] ترۆزی. (خیارچمبر)
چەمەزەخەم :[ناو](١)بەچاوەوە-بوون.(٢)نووشتەی چاوەزار. (چشمزخم. طلسمچشمزخم)
چەمەقووڵە:[ناو]چاوقووڵکە؛ چاوەقووڵە؛

بامرنیٚ؛ بای مردنیٚ. (طاعون)
چەمەنزار: میٚرغوزار؛میٚرگ؛چیمەنزار(چمنزار)
چەمیاگ : [ئاوەڵناو+ ناو،بک] لاربوو؛ چەماوە (خمیده)
چەناکەشکیاگ : [ئاوەڵناو] چەنە شکاو؛ (ب)
چەنەوەر؛ زۆربڵێ؛ دەمەوەر؛ فرەویژ. (پرگو)
چەنان : چەندان؛ هیٚندە؛ (چندان)
چەودان : [ناو]چەوار؛ چۆدان؛جەهداس(چودار)
چەوروچڵیک :[ئاوەڵناو]پیس و ڕۆناوی(چرب وچیلی)
چەوس : [ناو] ئازار؛ مەینەت؛ ڕەنج. (آزار)
چەوکیٚش : [ناو] کەرەستەییٚکە وەک شەنکە سەرەکەی چەماوەتەوە بۆ دەردانی کولۆ و ور تکە بەردی زەوی و زار. (شنکش)
چەوگان : [ناو] فد. جۆری یاری‌کە بەسواری ئەسپ و گۆچانی تایبەت و گۆ دەکریٚت(چوگان)
چەوگە :چەبووگە؛ چی‌بووە؛ چبووە(چی شده)
چەوڵ : [ناو]چەویٚڵ؛ چیلکەوچەویٚڵ؛ پاشاخوڕ. (پسماندەعلف درشت درآخور)
چەویر : گیاییٚکی بۆن‌خۆشە کە لە کوردوستانات. زۆرە(آویشن)
چەییگ : [ئاوەڵناو] تەزیو؛ چیاو؛ چاییگ؛ سارد؛ ڕچیاو. (سرد)
چی‌ئەویٚ :(۱) چشتیٚکی‌گەرەکە(چەمیخواهد).(۲)چەئەبیٚت؛ چیدەبیٚت؛ چدەبیٚت(چه میشود)
چیاو :[ئاوەڵناو] (۱)سارد؛ چاییگە (سرد). (۲) ڕچیاگ؛ بەسەهۆڵ‌بووگ. (یخ بسته)
چیای‌ئاگری : > ئاگری‌داغ
چیای‌باڵەکیان :کیٚویٚکی بەرزە لە ناوچەی باڵەکایەتی. (نام‌کوهی‌است)
چیای‌بستی : کیٚویٚکە نزیکی ڕەواندز. (نام کوهی است)
چیای‌زینی‌دەرگەڵە : کیٚویٚکە لە ناوچەی حاجی‌ئومەران.(حاجی‌عومران) (نام کوهی- است)
چیٚبوون : [چاوگە،ت](۱)چەشتەبوونی تانجی لە هەوەڵ ڕاودا(شکاریادگرفتن تازی).(۲)دروست بوون. (درست‌شدن)
چیتین : [ئاوەڵناو] فرندەی چیل‌چیل؛ خاڵخاڵ؛ پڵنگ پڵنگ. (نقطه نقطه)
چیچکە : [ناو] ڕیٚزەوڵ؛ ورتکەنان؛ (ریزەنان). > چنچکە.
چیچیٚست:ناوی زەریای ورمیٚ(نام‌دریاچەارومیه)
چیخ :[ناو]چیغ؛ پەردە لە حەسیری قامیش(پەردە حایل از نی)
چیٚدار : [ناو]کەلەپچە. (دستبند؛کلیچه)
چیٚدمای :[بەند] لەمەودووا؛ لە ئیٚستە بەولاوە. (ازاین ببعد)
چیٚر : [ناو] غەیبەت؛ پاشملە باسکردن. (غیبت)
+ چیڕ : [ئاوەڵناو] لەگەڵ چەپدا دیٚت بەواتای لار و گیٚڕ،ددانی چەپ و چیڕ و ناڕیٚک(کج- وکوله)
چیٚش : چی؛ چییە. (چە؛ چی)
چیٚشت‌لیٚنان :[چاوگە،ت] گرار و چیٚشت دروستکردن. ئاشپەزی‌کردن. (آشپزی‌کردن)
چیڤانۆک : [ناو] حەکایەت (داستان
چیڤک: [ناو]چیفک؛ چۆلەکە؛ چڤیک؛

کویشکە؛ کیشکە؛ مەلیچک؛ میرچک؛ مە-لیچک؛ مەلیشکە؛ چوول؛ جیڤک.(کنجشک)
چیق : [ناو] قاڵاوەڕەشە؛ قرکا ڕەش؛ قەلەڕە-شە.(کلاغ)
چێکە : (١)دروستیبکە.(درست کن).(٢) ئە-گرە. لێرە. وێڕێ. ئەیرا. ڤێرێ. (اینجا)
چێگە : چێکە؛ چێگا؛ لێرە؛ ڤێرێ.(اینجا)
چێگەولا : [بەند] لێرەولا.(ب)چێدمای؛ لەمە-ودوا. (منبعد)
چێلکرن : [چاوگە،ت] یادکرن؛ وەبیرهێنانەوە. (یادکردن)
چیلکەوچەوێڵ: [ناو] پووش‌وپڵاش. (خاروخاشاک)
چیلەک : [ناو] چێل؛ مانگا. (مادەگاو)
چێلەکی : [ناو] جۆرێک ماسییە.(نوعی ماهی)
چیلەوچەوتە : [ناو] سیلەوچەوتە؛ سیلەوچە-فتە؛ بەوردی ڕووانین؛ سێرەگرتن لە تفەنگ هاوێشتندا.(دقیق‌نگریستن؛ نشانەرفتن)
چین :[ناو] تویژ؛ وەک چینی دیوار؛چینی-کرێکار: توێژی کرێکار.(طبقە)(٢) کوێ چی؛ ئەوانە چین؟چشتێکن.(چیستند)(٣)ناوی وڵاتی چین(کشورچین)
+ چێو : [ناو] شت؛ چت. (چیز؛ شیئ)
چێوک :[ناو] دەمار؛(ب)دەماری تووتن.(رگبرگ توتون)
چێوک : [ناو]قنچک؛ قنچکی کشمیش و مێوژ و ترێ. (دم‌کشمش)
چێولای :[بەند] لەمەودووا. (بعدازاین)
چێوەخرتێ :[ناو،ت] چێوخشاندن لەجێگای تەنگ. و تێوەژەندن ؛ (ب)دارگێڕاندن لەکون و نچیردەرپەڕاندن. (شکاررا با چوب ازسوراخ بیرون‌کردن)

# ح

حارەب : [ناو] ئارەو. (عرب)
حارەبگاگۆزی:[بەند] سەرسەری؛لاپرەسەنی چە-
کەرداسی. (سرسری)
حازربیەی : [چاوگە] حازربوون. (حاضرشدن)
حاڵ : [ناو] (١)بارودۆخ. (حالت) (٢ب) کێشە بە-
هەزارحاڵ بارەکەم بردەسەر: حاڵەحاڵ؛ ڕەنج و
کێشە . (مشکل)
حالۆری : [ ناو] فیزداری ؛ بزۆزی .(تکبر)
حالووک : [ناو] هەلووک، هەڵووچە . (آلوچه)
حاڵیحازر : [بەند] ئەلعان؛ ئیستە؛ ئەمکاتە.
(حال‌حاضر)
حاملان :[ناو] پەروەردە؛ پەروەرشت(پرورش)
حاملاندن : [چاوگە،ت] ڕەنێوهێنان ؛ پەروەردە-
کردن . (به عمل آوردن)
حاوێن : [ناو،بک] کەسێک کە دەحاوێنێتەوە .
(آرام کننده)
حاوێنەر : [ناو،بک] حاوێن ؛ بەخێوکەر؛ ئارامکەر.
(پرورنده؛آرامش‌دهنده)
حل : [ناو] هێل؛ جۆرێک بهاراتی بۆنخۆشە؛ بە-
ری داری هێل. (هل)
حنچک : >حەنگ.
حۆپلە : حۆپلەر.> حۆپە
حۆپن : [ئاوەڵناو] زەبەلاحی ناقۆڵا؛ زەلام و
گمتە. (دراز بی قواره)
حۆپە : [ئاوەڵناو] زەلام ؛ زەبەلاح؛ ناقۆڵا(یغر)
حۆتە : [ناو] حەوتوو؛ حەفتە ؛ حەوتە. (هفته)
حوجرە : [ناو] ژووری چکۆڵەی فەقێیان لەمزگە-
وت؛ ژووری چووکی کاری توجارەتلە بازاڕ.
(حجره؛ )
حوققە : [ناو] (١) قوتوو. (قوطی ) (٢) فێل؛
گزی. (حقه) (٣)سەری بافوورکە تلیاکی پێدا
دەچەسپێنن.(حقه؛ سروافور)
حوکم : [ناو] جۆرێک یاری بە پەڕەی پەڕانتو.
(بازی حکم)+
حۆلبوون:[چاوگە،ت] سەرسامبوون گێژبوون.
(گیج شدن)
حۆلک : [ناو] کەپر. (کپر)
حۆلگێل : [ئاوەڵناو]گێژە گێژ؛ گێژ وحوڵ؛ گێژو
وێژ . (گیج و ویج)
حولویسک : [ناو] شیلاوک. (عضوی در شکم
گوسفند برای پنیر مایه)
حۆلی:[ناو] (١)ئۆلی؛ نهۆمی سەرەوەی خانوو .
(طبقه آخر ساختمان).(٢) گێلی؛گێژی؛ (گیجی)
حولیچەک : [ناو] هەڵووژە؛ هەڵووچە.(آلوچه)
حوننەر : [ناو] حوننەر؛کاریکە تەنیا کەسانێکی
تایبەت دەتوانن ئە نجامی بدەن؛ کاریشیاو، ئە-
وتۆ ؛ بۆیهەیە وشەی هونەر لەپێشداحوننەر
بووبێت.(هنر)
حەبان : [ناو] جەڕەی ئاو . (کوزه آب)
حەبدال : [ناو]مرۆڤی ماقووڵ؛ خوداناس؛ سە
وداسەر؛ عەودال. هەلوەدا؛(انسان خانه بدوش؛
خداشناس)

حەبداڵی : [ناو] سەوداسەری ؛ هەلوەدایی . (خانه بدوشی)
حەبدۆیی : [ناو] ئێلی سماییل ئاغای سمکۆ لە نزیکی شاری سەڵماس و گوندی چەهریق نیشتەجێن. (طایفه اسماعیل آقای سمیتقو)
حەپنای : [چاوگە] حەپین؛ وەڕین حەپەکردن. (عوعوکردن)
حەپۆنە : [ئاوەڵناو] حەپۆلە؛ کەمهۆش؛ مرۆڤی زل و تێکسمڕاو ؛ حەپلۆس . (آدم یغر و کودن)
حەپە مێشخۆر : (ب) مرۆڤی گێل و گەوج و نەزان. (کنایی، آدم گیج و بیشعور)
حەتاڵ : [ئاوەڵناو] لەگەڵ بەتاڵدا دێت. بەتاڵ-وحەتاڵ. خاڵیوخوت ؛چۆڵ؛ بێکار.(خالی بیکار)
حەتتار : [ناو] عەتر فرۆش؛ عەتتار. (عطار)
حەجمان : [چاوگە] حەجمین؛ تەبتین؛ عەجمان؛ ئارام و قەرار؛ هەدا. (آرام وقرار )
حەجماندن : [چاوگە،ت] ئارامکردن؛ تەبتاندن . (آرام کردن)
حەجمین : >حەجمان.
حەرد : [ناو] ئەرد ؛ عەرز؛ زەوی ؛ حەرز؛ عەرد. (زمین)
حەرز : [ناو]ئەرد؛ زەوی؛ عەرز. (زمین)
حەرەمخانە : [ناو] فد: ژووری جودا لە میوانخانەی گەوران؛ ئەندەروونی. (منزل مخصوص‌خانواده؛ حرمخانه)
حەرمەل : [ناو] گیاییێکە بۆ نەخۆشینی باداری بەکەڵکە . (نام گیاهی ایست)
حەرەسناک: [ئاوەڵناو] حەسوود؛بەئێرهیی. (حسود)
حەریر : [ناو] شارێکە نزیکی شەقڵاوە؛ گوندێکە نزیکیشاریکرند لە باشووری ئێران.(نام‌شهر ونام دهی است)+
حەزار : [ئاوەڵناو] هەزار. (هزار)
حەز وەنەئامەی : [چاوگە،ت] حەزلێکردن. (دوست‌داشتن)
حەسابی : >حیسابی
حەساوکەردەی: [چاوگە،ت] حیسابکردن. (حساب‌کردن)
حەساوی : [ناو] کەری بەکار و ئازا. ( خر پر توان و طاقت )
حەسەس: [ناو] پاسەبان؛ کێشکچی؛(عسس)
حەسەنەسستە : [ناو] باڵندەییێکە لاق درێژ وکلک کورت . (اسم پرنده ایست)
حەسێرەئاو : [ناو] هەسێراو؛ هەماراو؛ ئەستێر. (آب‌انبار؛ استخر)
حەسیل : [ناو] حەسیر . (بوریا)
حەسیلک : [ناو] حەسیر . (بوریا)
حەشاکەردەی : [چاوگە،ت] حاشاکردن؛ وەئەستۆنەگرتن؛ نەپەژراندن. (انکارکردن)
حەشرکردن : [چاوگە،ت] حەشر بەرپاکردن؛ (ب)کارێکی ئەوتۆ کردن؛ نواندنی ئازایی و کوشتاری زۆر لە شەڕدا . (حشر بپا کردن)
حەشروحەلەلا : [ناو] هەڵلا و هەنگامە؛ زەنا زەنا. (هیاهوی بسیار)
حەشیا : تشت؛ شت؛ لە ئەشیای ئارەوییەوە هاتووە، کۆی شەیئ. (اشیاء)
حەشیفاندن : [چاوگە،ت] نووسین . (نوشتن)
حەفتبراڵێ : [ناو] حەوت ئەستێرەی حەوتەوانان.(هفت‌ستاره دب‌اصغر)
حەفتم : [ئاوەڵناو]حەوتەم؛ حەوتە؛ حەو ڕۆژ پاش

ە دایک بوون یا مردن . (هفتم)
حەفتەیی :[بەند] حەوتـەیـی؛ هـەر حـەوت ڕۆژ جارێک . (هفته ای)
حەفتیر : [نـاو] حـەوتیـر ؛ جۆرێـک دەمانچـە . (هفت تیر)
حەڤە : [ئاوەڵناو] حەڤدە؛ حەڤوە. (هفده)
حەقیق : [ناو]حاقیق؛ عاقیق؛ عاقێق. (عقیق)
حەکلوو : حەککوو ؛ پەککوو. (وە)
حەلاقی : [ناو] جۆرێک ترێ. (نوعی انگور)
حەلاوی : [ناو] بەفرینە؛ پەروەردەکراوی شـیر و شەکر لە نێو بەفردا . (نوعی بستنی)
حەڵقەبەگۆش : [ئاوەڵناو] ئاڵقە بەگۆش؛ [ناو] زێڕخڕید؛ زێڕکڕ؛ بەندە؛ بـەنـی؛ ئاڵقـە لـەگـوێ؛ (حلقه به گوش)
حەلوا : [ناو] بەلاقێک هەڵبەزینـەوە و ڕۆیشـتن. هەنگڵەشەلە؛ حەلەکە.(لی- لی)
حەڵەبی : [ناو] (١)تەنەکە؛ (ب) چەلەنگە پووتی؛ خەڵک و پەیـوەندیـدار بـە شـاری حـەڵـەبـەوە (١و٢حلبی)
حەڵەوی : >حەڵەبی
حەلیشیش : [ناو] عەلەشیش؛ بۆقلەمووتە؛ قەل؛ کەرگامیسری؛ قەلەموون؛ گزگـل؛ عـەلۆعـەلۆ. (بوقلمون)
حەلیم : [ناو] خۆراکێکـە لـە گـەنـم و گوشـتی بۆقلە . (حلیم)
حەمباروزی : [چاوگە،ت] ئامباز بـوون؛ هێـرش. (هێرش)بردن . (حمله کردن)
حەمتەر : [ناو] عەمتەر؛ عەنتەر . (عنتر)
حەمس : [ئاوەڵناو] هەمس جۆرێک ڕەنگی بـزن و نێری . (نوعی بز)
حەمەڵی : [ئاوەڵناو] عەمەلی؛ گیرۆدە بە شـەڕاب و تریاک یان شتیتر. (عملی؛ معتاد)+
حەنزەڕووت :[ناو] ئەنزەڕووت ؛ شیلەی وشـکە - وەبووی تۆسی . (شیره چوغان)
حەنک :[ناو] ژەنین ؛ حینچک؛ کوت. (کله زدن)
حەنەق : [ناو] حەنـەک؛ گاڵتـە؛ شـۆخی؛ گاڵتـە وگەپ. (شوخی)
حەو : [ناو] حەد. (١) ڕادە؛ ئەندازە؛ مەقـام؛ حـە- وی بەچییە : قابیلی بەچییە. (٢) سنوور؛ تخووب؛ حودوود. (١و٢ حد)
حەورانەوە :[چاوگە،ت] پۆنگ خواردنەوە . (جمع شدن آب و بر گشتن)
حەوزخانە : [ناو] ژووری کە حەوزی تێدابێت. (حوضخانه)
حەوشی : [ناو] حەوشە؛ حەسار. ( حیاط؛ زمین محصور)
حەول و دەول : [ناو] هەوڵ و تەقالا. (جـد یـت وکوشش)
حەیاس : [ناو] حەیاز؛ جقە؛ چۆ. (انگشت شـاخی پای خروس)
حەیتاندن : گوڕڕەکردن؛ هـەو هـەوی سـواران. (هوراکشیدن دستجمعی)
حەیتە : [ناو] (١) چـەتیـو (نـوعی ناسـزا).(٢ ب) نیشانەی نێربوون؛ کێر (آلت تناسلی مرد)
حەیس‌وبەیس : [ناو] فد: (ب)گێرەوکێشە؛ هـە- نگامە؛ دەمەقاڵە. (حیص‌وبیص)
حەیش : [ناو] عەیش؛ خۆش ڕابواردن؛ وەشـی؛ کەیف و خۆشی. (خوش گذرانی)
حەین : [ناو] حان؛ لە حەینی گەرمـادا : لـە وە- ختی گەرمادا؛ (وقت)+

حیچ : [ئاوەڵناو] هیچ ؛نەتشت؛ هیچنەزان (هیچ)
حیچ: [بەند] هیچ زانیوتە دەستم شکاوە؟(هیچ)
حیچ: [پێشگر] هیچکارە؛ بەهیچجۆرێ. (هیچ)
حیچ: [جێناو] هیچی؛ هیچێک؛ هیچکەس. (هیچ)
حیچشتێ: [جێناو] هیشتێ؛ (هیچ چیز)
حیچکارە: [ئاوەڵناو] بێئیش؛ بێکار؛ بێدەسەڵات. (هیچکارە)
حیچکام: [جێناو] حیچکامیان: هیچکامەیان: هیچکەسیان؛ (هیچکدام)
حیچکەس: [جێناو] کەسێکنە؛ هیچکە؛ (هیچکس)
حیچنەزان:[ئاوەڵناو] بێئاوەز؛ ناشارەزا؛ گەوج. (دانائی‌نداشتن؛ نادان.( هیچمدان )
حیچوەخت: [بەند] هیچ کات؛ قەت؛ هەرگیز؛ (هیچ‌وقت)
حیز و سڵامەت : بۆپاراستنی بەرژەوەندی، سەرشۆڕی قبووڵکردن. (بخاطرمنفعت، خفت قبولکردن)
حیزەفرسەت : [ناو،ت] ناپیاوانە لە دەرفەت کەڵک وەرگرتن. (بانامردی از فرصت استفادە کردن)
حیزەفێل : [ناو،ت] فێڵی بێ ئابڕوانە و شەرمەزارانە و ناپیاوانە. (حیلە ناپسند)
حیزەڵە : [ئاوەڵناو] مرۆڤی سووک و چرووک و ترسەنۆک. (ترسوی بی ارزش)
حیسابی : [ئاوەڵناو] (١) بەرێ و جێ؛ باش؛ قسەی حیسابی: قسەی بەرێ و جێ. (٢) چاک؛ ماقووڵ؛ پیاوی حیسابی: پیاوی چاک و ماقووڵ(حسابی)
حیسابی: [بەند] بەتەواوی؛ تێر و پڕ؛ حیسابی دارکاری کرا. (حسابی)
حیشووە : [ناو] عیشووە؛ نازوئەدا؛ لارو لەنجە. (عشوە)
حیشووە باز : [ئاوەڵناو] عیشووەگەر. (عشوەگر)
حێل : [ناو] عێل؛ تایفە؛ ئێل. (طایفە)
حێل : پتەو. (محکم)
حێلاتی : [ئاوەڵناو] عێلاتی؛ ئێلاتی؛ عەشیرەتی. (ایلیاتی؛ عشیرەیی)
حیلاندن : [چاوگە،ت] شەهین؛ کوڕاندنی ئەسپ. (شیهە کشیدن)
حێلم :[ناو] هێلم؛ چەسپی نەجاڕی.(دارتاشی) . (نوعی چسپ چوب)
حیلەحیل : [دەنگەناو] چەند شەهینی لە دوای یەک. (شیهە پی درپی)
حێلەزووک : [ناو] حەقلی‌مەقۆ. (الەکلنگ)
حیلەمار : [ناو] کوڵەکۆرە؛ کوێرەمار. (افعی)
حینوان : [ناو] عینوان؛ حیشووە؛ فیز و دەمار. (دەچیە گوێی بانان کراس زەردێ، حینوان دەفرۆشی) «فۆلکلۆر» (غمزە و تکبر)

# خ

خاراج : [ناو] خەراج؛ باج و پیتاک. (خراج)
خـازی : [نـاو] خـاز؛ گوڵخـاز؛ گیاییێکـە بـۆ سوماێ چاو یان لابردنی زەرداو بـەکـەڵکـە. (گل‌شیپوری) +
خازی : [ناو] خۆزگـە؛ ئـاوات؛ خوزیـا؛ هیـوا؛ هیڤی؛ داوخواز؛ کەڵکەڵە؛ (آرزو)
خاسەسی : [ناو] قازی کێوی. (قازکوهی)
خاشەبڕ : [ناو] لە بێخ دەرهێنان؛ بنەبڕکردن؛ ڕەگەز نەهێشتن. (ازبیخ کندن؛نسل‌کشی)
خاشەکێشان : [چاوگە،ت] (١ب) سەربـڕین؛ کوشـتن.(کنـایی، کشـتن؛ سـربریدن) (٢ب)خۆراک تەواو کردن و هیچ نەهێشتنە-وە. (خوردن خوراک وچیزی‌باقی نگذاشتن)
خاکبەسەر: [ئـاوەڵنـاو+ نـاو] قـوڕبـەسـەر؛ خاکەسار؛کلۆڵ؛کولۆڵ. (خاکبرسر)
خاکشیر: [ناو] زیندەوەری وردیلەی ناو ئاوی زۆرماو لە نێو عەماراودا، کە خۆراکی ماسییە. (خاکشیر)
خاکشیرەکەشیلە : [ناو،ت] توودڕکە؛ گیاییێکە دژی نۆبـەتێیـە (یـاوی‌ماڵاڕیـا)یـە و لـە کوردوستان زۆرە. (قدومەکوهی)
خاکنشین :[ئاوەڵناو] بووڵنشین؛ماڵوێران؛ مافینگی؛ پووش‌لەدەم. (خاکسترنشین)
خاکوەج : [ناو] جووتیار؛ فەلا. (کشاورز)
خاکینە و خوڵینە : [ئاوەڵناو] (ب) مرۆڤی بێ-فیز و دەمار. (انسان متواضع)
خاڵوبەڵەک : [ناو] کاژ و واژ؛ خاڵخاڵ بوونی بەفـری کوێسـتانان. (خالخـال شـدن بـرف کوهستان)
خامحەلاوە : [ناو] جۆرێک خام؛ جـاو؛ (بـە-رهەڵبێنەی خام حەلاوە، هەردەڕۆیـی و دە-کراوە.) «فولکلۆر» (نوعی متقال؛کرباس)
خانەشاری : [ناو،ت] بۆ ئەم وشە دوو هۆ ڕە-چاو دەکرێت (١)خانە واتا ماڵ، کۆچ پێکردن بۆ شار. (٢) گوێزتنەوەی جێگای ژینی بـەگ و خانەکان لە گوندەوە بۆشار؛ کە دەگەڕێتە-وە بۆ زەمـانی ڕەزاشـای پالـەوی لـە ئێـران ١٩٤١ز؛ (ب)بە زۆر کۆچ پێکردنـی خـان و سـەرۆک عێلـی دیـاریکراوی دەوروبـەری شاری سەقز لە دێهاتـەوە بـۆ شـار . (خانـە-شهری)+
خانەمیـری : [نـاو] جۆرێـک هـەڵپـەڕیـن و گۆرانی تایبەتی ئەو هەڵپەڕینە. (نوعی رقص و آهنگ مخصوصش)
خانی‌خانان : [ناو] سەرۆکی خانگـەل. (خـان خانها)
خانی‌لەپ‌زێڕین : [نـاو] قـارەمـانی قـەڵـای دمدم. (نام یکی‌ازقهرمانان کرد)
خاو : [ئاوەڵناو+ ناو] هێواش؛ ئارام؛ ئاهەنگی خاو دژی ئاهەنگی بن‌بزێوکە و کرژ. (ملایم؛ آرام)+
خاو: [ئاوەڵناو] بانەدراو؛ دژی گرژ.(ریس زیاد

نتابیده)
خاوشکاندن : [چاوگە،ت] ڕاهێنانی وەرزا بۆ جووتکردن لە ئەوەڵی بەهاردا بە چەند هێڵ جووت پێکردن. (آمادەکردن ورزا برای شخم).< جەمام.
خاوک : [ناو]بەن و فرێتی پێویستی تەون؛ خاوە. (مواداولیه قالیبافی)
خاوکان : [ناو] بەنی زۆر با نەدراوی باریک کە دوو تاڵی پێکەوە بادەدەن و دەبێتە دوولا؛ (شیرین تەشی‌دەڕێسی خاوکانە یان دوولایە) «فولکلۆر» (ڕیس زیاد تاب‌نخورده)
خاوکردنەوە : [چاوگە،ت] هێواشکردنەوەی ڕەوتی‌ڕۆیشتنی توند و بەلەزی سەیارە یان هەر شت کە توند و بە تاو دەڕوا. (یواشکردن)
خاوکێش : (ب)پەتکێش؛ لێدان و پەتپەتی پێکردن و گەوزاندن. (کنایی، کتک‌زدن)
خاوە : >خاوک
خاوێرخاوێر : [بەند] هێواش هێواش؛ خاوە-خاو. (یواش‌یواش)
خاویلکە : [ئاوەڵناو] خاوەخاوکەر؛ تەمبەڵ. (تنبل و شل‌و ول)
خاوێن : (١)[ناو]گیای‌ژانەدڵ؛ لەکوردوستان زۆرە و بۆ نەخۆشینی بای‌سوور بەکەڵکە. (گیاەدم‌روباه)(٢) [ئاوەڵناو] پاک. (تمیز)
خایەن : [پاشگر] واتا پێچوون؛ درێژخایەن. (پسوند به معنی طول کشیدن)+
خرمان‌لۆغە : [ناو] خەرمان‌لۆغە؛ دەغلێک کە لە سەر خەرمان دەدرێت بە هەژاران. (ازخرمن چیزی‌بەفقرا دادن)
خرنە : [ناو] کوودەڵە؛ بێچووی بەراز. (بچە گراز)
خرۆپڕ : [ئاوەڵناو] توند و تۆڵ و قەڵەو. (تپل و فرز)
خشپەگیا : [ناو] دارخەڵاتە؛ زەرداو پەڕێنە؛ لە کولێندراوی خەستی گەڵاکەی مەڵهەمێک چێدەکەن و دەیساون بەسەر بیرۆدا، بە-موفایە. (شونگ؛ پلاخور)
خشە : [دەنگەناو] دەنگی بەیەکدا ساوینی دوو شتی زبر و ڕەق. (خش‌خش)
خشیل : [ناو] کەوڵەگیا؛ شیلەکەی هەوێنی بە پەنیرکردنی شیرە. (علف‌پنیر؛ شیرپنیر)
خفتان : [ناو] خەفتان؛ توو چاندنی پاییزی درەنگ وەخت. (تخمپاشی درپائیزدیرهنگام)
خلخلە : [ناو] خلخل؛ فڕندەیێکە لە جوڕە گەورەتر، سەر باڵی شینە و سینگی قاوەییە. (خوتکا)
خوان : [ناو] پنە؛ پنەکەی گونک لەسەر پان‌کردنەوە. (تخته خمیر پهن کردن) +
خۆ ڕازاندن: [چاوگە،ت] بزواندنی لەش لە کاتی ئێش و پەژارەدا. (خودرا جنباندن)
خۆڕانان: (ب) هووشەکردن؛ خۆهەڵکێشان. (تعریف از خود)
خۆردۆس: [ناو] لالەعەباسی؛ بۆ لەبەین-بردنی جوانەزمە و زیادکردنی مەیلی جنسی پیاوان باشە.(لالەعباسی)
خوردەک: [ناو] ئوردەک؛ جۆرێک مراوی. (اردک)
خۆرکە: [ناو] مۆرانەی کتێب و دار. (موریانه چوب)

خوری‌شۆر: [ناو] تەختە دارێکی لاپانە جلک و خوریی پێ دەکوتن لە کاتی شۆردندا؛ (ب) لێدانی زۆر و بە توندی وەک شتنی خوری. (کتک زدن زیاد)

خۆزگەخواستن: [چاوگە،ت] ئاوات خواستن. (آرزوکردن)

خوڵێدان: قەرەکەوتن؛ نزیک‌کەوتن. (خودرادرگیرکردن؛نزدیک‌شدن)

خومەهەردە: [ناو] گیا وەسمە؛ گیاییکە خومی لێ‌چێدەکەن لە جوانڕۆ و مەریوان و شنۆ زۆرە. (نیل‌کوهی.وسمه)

خوێنپاڵێن: [ناو] گیای‌شاتەڕە؛ دژی جوانە زمەیە. (شاه‌تره)

خەربەنگ: [ناو]گیای شادانە؛ مەنگە-گیا؛گوڵەلێوە. (شاهدانه)

خەرتەل: [ناو] داڵەکەرخۆرە؛ شانەکوورە. (نوعی کرکس)

خەرمان‌لۆغە : > خرمان‌لۆغە.

خەروو : [ناو] پاکەمتیار؛گیاییکە بۆ نەخۆ-شینی گەڕولی بەکەلکە. (خرنوب)

خەزال: [ناو] قشقەڕە؛ قشقەڵە. (زاغی)

خەزاڵی: [ناو] خەزایی؛ کەشوشک؛ تووخۆرە؛ عایلە مەل. (سارصورتی)

خەڵاتەگیا: [ناو] گوڵەئەوین؛ لەکوردوستان بەتایبەت لە ژاوەرۆ زۆرە و بۆ نەخۆشینی واریس(گرێ‌کرێ بوونی دەماری بەلەک) بەکەڵکە. (گل‌فراموشم‌مکن)

خەستەخانەی دەروونی : تایبەت بە نەخۆشینەکانی مێشک و عەسەب و نەخۆشینی ڕۆحی. (بیمارستان روانی)

خەستەخانەی دەوڵەتی: بیمارستانێک‌کە لە ژێر چاوەدێری دەوڵەتدایە و پارەی کەم لە نەخۆش دە ستێنێ یان هەر ناستێنێ. (بیمارستان دولتی)

خەستەخانەی سەحرایی: خەستەخانەی ناو چادر یا ناو سەیارەبۆ بریندارانی شەڕ یا بوومە لەرزە و ئیتر لە محەلدا. (بیمارستان صحرایی)

خەستەخانەی عمومی(گشتی): (١) خەستە-خانەییک بۆ مالیجەی هەموو نەخۆشینێک. (٢) بیمارستانێک کە بۆ تەواوی جەماورە و تایبت بە کەسانێکی تایبەت نییە. (بیمارستان عمومی)

خەمەخۆرە: [ناو] واق‌واق‌کەرە؛ شاوە-شینە.(اگرت‌ساحلی)

خەنجەربال : [ناو] پەڕەمەساسە؛ تەیرە کوێرە. (بادخورک)

خەنجەردەم :> دارتەقێنە

خەنەدێمی : [ناو] خەنەکرمانی؛ خەنێ؛ گیاییکە گەڵاکەی بۆلابردنی خorووی پێست و بەهێز کردنی ڕیشەی موو بەکەڵکە. (حنای کرمانی)

خەنێ : > خەنەدێمی

خەو :[ناو] خاو؛ باری‌لار بوونەوەی تووکی فەڕش و ڕایەخ و قوماشی تووکدار. (خواب)+

خەوێن: [ناو] گیای دەرمانەبرک؛ بۆکەم-کردنەوەی چەوری و تەوژمی خوێن بەکە-ڵکە. (ملیس)

خەیارەمارانە : [ناو] خەیارەدێمی؛ گیاییکە بۆ ڕەواندنەوەی ماس و پەنمانی ئەندام بەکە-ڵکە. (خیارخر)



دائاویستن : [چاوگە. ت]هەڵواسین. (آویزان-کردن؛ آویختن)
انهھردە . بژاردە . (بۆمیوە و چتی تر)
دابڕکردن: [چاوگە،ت] بڕدان؛ جویکردنەوە؛ کوتکردن و زەوت‌کردت.(جداکردن.غصب‌کردن)
دابگردن: [چاوگە،ت] ڕەت‌بوون؛تێپەڕین. (گذشتن)
دابووراندن: [چاوگە،ت] تێپەڕاندن. (گذراندن)
دابوورین : [چاوگە،ت] دابووردن؛تێپەڕین. (گذشتن)
دابەزێنراو: [ناو،بەر] کەسێک کە لە سواری هێنرابێتە خوارەوە؛ پیادەکراو.( پیادە شدە)
دابێژاندن: [چاوگە،ت] دابێژتن. (غربال کردن)
دابێنان : [چاوگە،ت] دابەستن؛ گرێدان. (بستن)
دابین‌کردن:[چاوگە،ت] شاردنەوە.دەستەبەر کردن. (پنهانکردن. فراهم کردن)+
داپرژان: [چاوگە،ت] پرش و بڵاو بوونەوە. (پخش و پلاشدن)
داپلۆخین : [چاوگە،ت] (١)داپلوسین ؛ بە توندی لێدان.(کتک زدن)(٢) بە گەرمای زۆر یان ئاوی کوڵاتوو سووتانی‌لەش سوختگی‌بعلت‌حرارت‌زیاد)
داپۆی:> پێوەدان.
داپەڕ: [ناو،بک] ئەوەی دەپەڕێتەخوارەوە. (پائین پرندە)
داپەڕین : [چاوگە،ت] بازدان لە سەرەوە بۆ خوار. (پایین پریدن)+

داپەستان: [چاوگە،ت] ئاخنینەوە؛ پەستاوتن.(تپا نیدن)
داپەستراو: [ناو،بەر] ئاخنراو؛ داتەپاو. (تپاندەشدە)
داپەنەی : [چاوگە،ت] پێدان؛ بەخشین. (دادن)
دات : [پیشگر] وەک، داتخست؛ داتنا؛ داتکرمان. (پیشوند)
داترازان: [چاوگە،ت] لێک‌هەڵبڕان. (دررفتن)
داتراشین: [چاوگە،ت] تاشینی سەرەوخوار. (روبە پائین‌تراشیدن)
داتووکان : [چاوگە،ت] هەڵترووشکان. (چمباتمە زدن)
داتەپاو :[ئاوەڵناو+ ناو،بەر]شێلراو؛ تەپێنراو؛ داسمڕاو؛ هێما بۆ مرۆڤی کورتەباڵا و قەڵەو و شل‌وشەوێق؛ داتەپیو.(آدم شل و ول چاق)+
داتەپیو: [ناو،بەر+ ئاوەڵناو] ڕۆچوو؛ قوپاو؛ داتەپاو (نشست کردە)
داتەکیان :[چاوگە،ت]بەتاڵ‌بوون؛تەکیان.(خالی شدن) +
داتەمیان : [چاوگە،ت] داتەپیان و سیس‌بوون بە هۆی خەم و کەسەرەوە. (افسردە شدن)
داچۆڕان: [چاوگە،ت] شۆڕبوونەوە؛ چەمینەوە؛ ئاوێزان؛ داهاتنی لقی دار.(خمیدن.آویزان‌شدن)+
داڤبسک : [ناو]داوموووسک؛ داوی تەپکە. (دام از رشتە مو)
داچەکاندن : [چاوگە،ت] مژین؛ دڵۆپ لێبڕین. (تاآخرین قطرە مکیدن)

داچەکاو :[ناو،بەر](١) مەمکێکە زارۆک مژ-
بیێتی. (٢)هەڵواسراوی شل‌وشەوێق؛
داچۆڕاو.(مکیده وآویزان)
داچەمان: [چاوگە،ت] چەمینەوە؛ کووڕبوونەوە؛
چەمانەوە. (خمیدن)
داچەماندن : [چاوگە،ت]کووڕکردن.( خم‌کردن)
داحەلاندن :[چاوگە،ت]داهێشتن؛ شۆڕکردنەوە.
(آویزان کردن)
داخاز : <داوخواز.
داخازتن : [چاوگە،ت] داواکردن؛ ئاوات خواستن.
(درخواست‌کردن؛ آرزوکردن)
داخرا : [ڕابوردووی چاوگەی‌داخستن] تەنوور
داخرا: تەنوور هەڵکرا؛ پێ‌کرا.(روشن شد)(٢)
پێوەدرا؛ بەسترا (بسته‌شد) +
داخران :[چاوگە،ت] (١) بەستران؛ پێوە-
دران.(بسته‌شدن).(٢) ڕاخران؛ پان کران؛
ڕاخستن.(پهن‌شدن)
داخرماندن :[چاوگە،ت] داکرماندن؛ داکرۆژتن.
(مانند، جویدن‌قند و غضروف)
داخزاندن: [چاوگە،ت] داخلیسکاندن؛ خزاندن؛
خزین.(سراندن‌روبپائین)
داخشان: [چاوگە،ت] داخوشین؛ خشکەکردن
ڕوو بە خوار. (خیزش‌روبپائین)
داخ‌کەردەی :[چاوگە] داخ‌کردن. (داغکردن)
داخ‌کێشان : [چاوگە،ت] دەردکێشان؛ ئاخ هە-
ڵکێشان. (آه کشیدن)
داخمە : [ناو]تەمخە؛ ئامێری مۆری دروشم و
داخ‌کردنی‌ئاژاڵ. (انگ‌داغ)
داخ‌ودۆخان : [ناو] خەم و خەفەت. (غم واندوه)
داخوراو :[ناو،بەر] داڕووخاو؛ دیوارێک کە
خورابێتەوە یان باران لایێکی شۆردبێتەوە.
(خوردگی‌دیوار)
داخورت : فاڵگرتنەوە و پێشگۆیی. (پیشگوئی)
داخوڵا : [بەند] داخوا؛ داخۆ؛ داخۆم؛ ئاخۆ؛ ئایا.
(آیا)
داخی‌بەجەرگم :(ب) داخی‌گرانم؛ حەیفێ
(افسوس)
دادپرستەی : دادپرسین. (داد پرسیدن)
دادڕەمردم : ناوی جۆرێک قوماشی ژنانە بوو.
(اسم پارچه)
دادنووس : [ناو] شکایەت‌نامە نووس؛سکاڵا
نووس (عریضه نویس)
دادو ڕۆڕۆ : [ناو] شیوەن و هاوار؛ داد وهاوار.
(شیون)
دادووراندن : [چاوگە،ت] پێدا دروون؛ دوورین.
(دوختن)
دارئالینگ : [ناو] لاولاو؛ لاڤ‌لاڤ. (نیلوفر)
دارات : دارەت؛ خۆت لەو داراتە مەدە: خۆت وا
نیشان‌مەدە؛ خۆت لەوڕێیە مەدە. (وانمودکردن)
درباز :[ناو] دارەوان.(استاد در بالارفتن ازدرخت)
داریاسقەنە : [ناو] جۆرە دارێکە دارجگەرەی لێ-
دروستدەکرێت. (چوب‌درستکردن چوب‌سیگار)
داربە دەم سەگەوەکردن: (ب)بێ‌حەیایی.(کنایی
شرارت و بی‌حیایی)+
دار بەڕۆحدا دان : زەبرلێدان.(ضرر و ضربه‌زدن)
دارپزو : [ناو] جۆرێک دارە؛ پارچە دارێکی پزوو
دەکەنە ملوانکە و دەیکەنە ملی پەز بۆ ئەوەی -
نەخۆشینی پزووی چاک بێتە وە (لە بری نو-
وشتە) (گردن‌آویزگوسفندبرای بهبود مرض پزو)
دارپێچ : [ناو] گوڵی لاولاو؛ گیای ملەگەوێ ؛

دارخـز؛ بـۆ تـەنگـەنـەفـەسـی بـەکـەڵکـە .(لبلاب؛نیلوفر)
دارپێچی‌کێوی : [ناو] ملەگەوی ؛گیای لاولاوی کێـوی؛ بـۆ ڕەوانـی بـەکـەڵکـە (لـبلاب ؛ نیلوفرصحرایی)
دارتاوگ : [ناو] گیای‌تەیلیٚ؛ تایله؛ بەرەکەی بۆ تاعوون (بامرنیٚ) و پەنمانی سی و زەردوویی بە کەڵکە. (داغه اغان ؛ تاغوت؛ تاقوت؛ درخت طا)
دارتەپان : [ناو] چێوتەپانە؛ دارێکە لەکەرەستەی جوڵاییدا. (چوب‌دستگاه جولایی)
دارتەقێنە : [ناو] فڕندەی دارتەقنە؛ دارەسمە؛خە-نجەردەمە. (دارکوب)
دارجـووت : [نـاو] نـەقیـزەی جـووت کـردن. (سیخونک دراز گاوآهن)
دارچەسپ : [ناو] گیای لاولاوی دیواری؛ کە بە دیواردا هەڵدەکشیٚ و دیوار دادەپۆشـیٚ و خـۆی بە دیوارەوە دەچەسپێنێت؛ بـۆزمـان بـەربـوونی منداڵ بەکەڵکە . (موچسب؛ پیچگ دیواری)
دارچەنگاڵ : [ناو] ئاڵقە و دووپشکە؛ ئامرازی نێو کەرەستەی گێرە. (قطعه‌ای در خرمنکوب)
دارچینی : [نـاو] دارچـین پێسـتی ئـەودارەیـە و ماکی(ئانتی سپتیک وئانتی میکۆتیک)ی‌تێدایـە-کە دژی هوورک و قارچکی پێستە . (دارچین)
داردوولەکان : [ناو] جۆلانیٚ؛ جۆلانە.(تاب بازی)
داردەغان : [ئاوەڵناو] (دەروداغـان؛ کـورتکراوەی دەرب وداغان یان‌دەردوداغانە).لە بـەریـەکـدەر هێنراو.(درب‌وداغان)
داردەماخ : [ناو] داری سەولٚ؛ دارێکی هەمیشـە سەوزە. (سرو)
دارسم : [ناو] فڕندەی دارتەقێنە؛ شەشجۆرن:بە-لووچی، ڕیٚڕیٚ، باڵ‌سپی،شـین، خاڵخـالٚ، ڕەش .(دارکوب)
دارسۆرک : [ناو] پەیوەند(متوربـە) کـراوی داری هەرمیٚ لە بەڕوو . (پیوند درخت بلوط و گلابـی)
دارسەوڵە : [ناو] (١)بێڵی لۆتکە.(پاروی قایقرانی) (٢)داری سەولٚ. (درخت سرو)
دارڕسیان : [چاوگە،ت] هێرش‌بردن؛ پەلامـاردان. (حمله بردن)
دارشاخکرن : [چاوگە،ت] سەرکۆنەکـردن؛ پێـدا هەڵکاڵان؛ پێدا هەڵشاخان. (سرزنش کردن)
دارشکێن :[ناو،بک] کەسێک کە دار دەشـکێنیٚ؛ داربڕ. (هیزم شکن)
دارشەق : [ناو] چێوشەق؛ چێوی ژێرباخەڵـی پـا شکاو یان شەل. (چوب زیربغل)
دارشین : [ناو] دارێکی‌کێوییە لە کاتی سوتاندندا گڕێکی ڕۆشنی هەیە، لە جیاتی لەنتەر هەڵیان دەکرد.(اسم درختی است)
دارشێنە : [ناو] دارکون‌کەرە. (دارکوب)
دارفرسەق :[ناو] نیشانەی ماوەی ڕێگـا.(تـابلوی کیلومترشمار)
دارقەندە : [ناو] کلکەقلیان. (چوب قلیان)
دارکافوور : [ناو] دارێکە لە هێندوستانەوە هاتووە و بۆ گەڕوڵی و بیرۆ بەکەڵکە؛ کافووری لێدەگرن کە بۆ گەڕوڵی و بیرۆ بەکەڵکە. (درخـت کـافور)
دارکەکەو : [ناو] دارکێکف؛ کەیکوف؛ چێـوێکی ڕەنگ جوانە بۆ ناسک کـاری وخـەڕاتـیٚ باشـە؛ گەڵاکەی‌دەکوڵێنن بۆ هاوڵە وسوورێجە بـەکـە-ڵکە. (کرکف،ککم)
دارگەزۆ : [ناو] مازگ دار؛ نەرە؛ داربەڕوو؛ جیـوە (شیلە)ی دارمازگ بۆ شـەکـەرمـز بـەکـەڵکـە .

(کزغلفی؛ بلوط)
دارلۆق : گـاڵۆک؛ وەکـاز؛ چێـو شـەق؛ گۆچـان. (عصا)
دارمۆق : [ناو] تابووت. (تابوت)
دارمەڵهەم : [ناو] دارێکە لە هێند و ئەفغانسـتانە وە هاتووە و لە هەورامانی لەهۆن زۆرە دەرمـانی نەخۆشینی تەنگەنەفەسە.(درخت برنـگ کـابلی)
داڕنین :[چاوگە،ت]داماڵین؛ وەک:ڕوومەت ڕنین؛ ڕنینیڕوومەت بە ناخوون لە سەرەوە بۆ خوارەوە (خراشیدن)+
دار و لەلە : [ناو] داری داڵیە؛ (ب) ئاگاداری لە حیساب‌وکیتاب و لە ژێر چاوە دێریدا.(کنایە از زیر نظربودن)
دارونەدار : [ناو] هەست‌ونیست(ب) هەموو شت. (داروندار)
داڕووشاندن : [چاوگـە،ت] ڕووشـاندن و داڕنـین ڕوو بە خوارەوە. (خراشیدن روبپائین)
دارونی:[ناو] دارەوەن؛ دارقەسقەوان؛ لە شـیلە-کەی بنێشت دەگیرێت کە دەرمـانی پـەنمـان و برینی گەدە و ڕێخوڵەیە و بۆ شەکەرمزیش بـە-کەڵکە . (درخت بنە؛ پستە وحشی)
داروێنە : [ناو] جۆرێک کاری هونەرییە؛ وێنەگە-ری، بەکەڵک وەرگرتن لـە پارچـە داری ڕەنـگ جۆراوجۆر؛(لە ڕوانگەی ڕەنگ و ئاچخ و تۆخیـە-وە) .(معرقکاری)
دارەبەجینگوڵ : [ناو] داریچاکی. (درخت‌سرمزار مبارک)
دارهەنە : [ناو] دارتەون. (دارقالی)
داریدنیٚ :یادارایی دونیا؛ لێرە دا بە هـەڵکـەوت داری ئـارەوی:(ماڵ،خـانوو) لـەگـەل دارایـی و

سامان(ماڵ)ی کوردیهاومانان کە دبێتە، (مـاڵی دونیا)کە جێی سامانی دونیا یا دارایـی دونیـایش دەگرێتە وە. (داردنیا)
داری‌نان : [ناو] دارێکە لە هەندیٚ ناوچەی ئـە-فریقا جۆرێک کولێرە و نانی لیٚدروست دەکەن. (درخت نان)
داریووش : [ناو] ناوی شایێکی هـەخامـەنشـییە (داریوش)
داژی : لارە سێبەری عەسر.(قبل از غروب)
داسراکیٚ : [کاری ئەمری] بسـرەوە ؛ زەوتبـە ؛ دامرکیٚ؛ ئارام بە.(آرام باش)
داسـراکێن : [ناو،بـک] ئـارام کـەرەوە؛ دامرکێن.(آرام بخش)
داسقاڵە : [ناو] داسوولکە؛ داسـی چـووک.(داس کوچک)
داس‌کێش : [ناو،بک] دروێنەوان. (دروگر)
داسمڕاو :[ئاوەڵناو] مرۆی قەڵەوی شل‌وشەوێق. (آدم شکم گندە وکوتاە قد)
داسن : [ناو] خوازبێنیکەر. (خواستگار)
داس‌وەشێن : [ناو،بک] دروێنەوان. (دروگر)
داسـەپانـدن : [چاوگـە،ت] بـە سـەردابـڕین. (تحمیل)
داش : [ناو] (۱)تـەنـدوور؛ تـەنـووری ئاسـنگەر. (کورەآهنگر) (۲) تد: بەرد؛ داشی دامـە: بـەردی دامە. (سنگریزە داما)
داش‌بەداش :[ناو،ت] لە دامەدا بـەرد بـە بـەرد ؛ واتا بەردی لە جیاتی بـەردیٚ دەچـوویٚ . (داش بە داش)+
داش‌دامە : [ناو] داش تورکیە واتا بەرد؛ بەرد یان زیخی دامە پێکردن .(سنگ ریز داما)

داشکان:[چاوگە،ت] خوارکردنەوە؛ شەلەگە داخستن. (خم کردن؛ تعویض مسیرآب )+
داشکاندن : [چاوگە،ت] داگێڕان؛ مەڕەکان داشکێنە بۆ داوێنی کێو.(پائین بردن گلە).(۲) شکاندن؛ شکست پێ‌هێنان.(شکست دادن)
داشۆ : [ناو] برایێ مەزن. (داداش)
داشێ : [ناو] خوشکامەزن. (خواهربزرگ)
داشیار : [ناو] تەنوور داخەر؛ کابانی‌ماڵ. (روشن-کننده تنور؛ خانەدار)
داشی دامە:[ناو] زاپی‌دامە؛ بەردی دامە. (مهرە داما)
داغان‌کردن : [چاوگە،ت] شەق و شڕکردن؛ لە بەریەک هەڵوەشاندن. (داغان‌کردن)
دافسین: [چاوگە،ت]فس خواردن؛ قزەبوون؛خە-وتنی مریشک بۆ کەڵەشێر. (خوابیدن مرغ زیر خروس)
دافلیقاندن : [چاوگە،ت] پان‌وفڵچ کردن. (لە-کردن)
داف_داف : [بەند] تاڵ تاڵ؛ هەودا هەودا. (رشتە رشتە)
داچوون : [چاوگە،ت] ڕۆچوون؛ چەقین. (فرورفتن)+
داکردن : [چاوگە،ت] بەئامانجکردن؛ میتەی هەڵماتێن و نیشانەی تیرەنازی دانان.(نشانە تیلەبازی و سیبل گذاشتن. +
داکوتان : [چاوگە،ت] (ب) بەمیوانی لە جێگایێک زۆر مانەوە؛ جێ‌خوشکردن .(جاخوش کردن) +
داکەتێ: [بەند] باکەتێ ؛ تاکەتێ؛ تاوەکوو؛ تاکوو.(تا)

داگرتنەوە : [چاوگە،ت] کوتانەوە؛ پەستاوتن؛ ئاخنینەوە. (لگدکوب؛کوبیدن)+
داگژاندن : [چاوگە،ت] گووشین. (فشاردادن)
داگیراو : [ناو،بەر](۱) ڕابووردووی‌داگیران؛ لەش داگیراو.(تن سنگین شدەازمرض)(۲) ئەوەی لە سەرەوە هێنراوەتە خوارەوە . (پایین آوردە شدە). (۳) لێم داگیراوە واتا لێم داگیرکراوە.(غضب شدە). (۴)تاپێک توتن داگیراوە: ئاخنراوە. (آکندە شدە).(۵) زەویە کە بە ئاو داگیراوە :ئاو دایگرتووە، زەوتی‌کردووە(آب گرفتە) (۶) ف.هن. گڕ تێچوو(شعلەور) .
داڵاش : [ناو]تۆرەمەی داڵاش پێنج جۆرن:کە-شکە خۆرە(پیرۆزە) ، پشتسپی ،ڕەشەداڵ، سیسارگ، شانەکووڕە.(هما؛کرکس)
داڵانداری:[ناو؛ بەرهەمی‌جاوگە] (۱) شوڵی چاودێری گاراج؛ تەویلەداری.(دالانداری).(۲) کرێی باری هەمارکراو لە گاراج.(انبارداری)
داڵانی‌هەوایی : [ناو] شوێنگەلی دیاریکراوی هات‌وچۆی فڕۆکە لە بەینی دوو وڵاتدا. (دالان هوائی)
داڵبەش : [ناو] دابەش؛ بەشکردن بە سەر چەند کەسدا . (پخش)
داڵقاندن : داردا‌کرن؛ هەڵواسین. (آویزان‌کردن)
داڵکەپیران : [ناو] کەنگر وەختێ پیردەبێت . (کنگر پیرشدە)
داڵکەدزان : [ناو] دەس‌کیس؛ دز دەسک. (راهنمای دزد)
داڵکەمارانە : [ناو] جۆرێک مارمیلکی گەورە. (سوسمار)
داڵگۆشت : [ئاوەڵناو] لەڕ؛ لاواز؛ ڕەقەڵە؛ ئاژاڵی

که درەنگ قەڵەو دەبێت. (لاغر)
داڵووت : [ناو] چێوبەستی باخ؛ داربەستی باخ. (داربست باغ)
دالووشاندن: [چاوگە،ت]فمکردن و لووت پاک-کردنەوە. (فین کردن)
داڵە : [ناو] باخچەی بەرماڵان. (باغچه جلومنزل)
دالە : [ناو] پیشگۆ.(پیشگو)
داڵەکەرخۆرە : [ناو] داڵاش. (کرکس)
داڵەواز : (١) زیندەوار. (جاندار).(٢) لە سەرپێ ڕاوەستاو. (روی پا ایستاده)
دالینگ : [ناو] دەستوور؛ قانوون. (قانون)
دالینگۆک: قانوون‌نامچە و نیزام‌نامچە.(قانوننامه)
داماگ : [ناو] گیای کەلپوری؛ بۆ لووی گەروو (لەوزەتەین) و دەست لەرزین بەکەڵکە (مریم-گلی؛ مریم نخودی)+
دامانگر : داوێنگر؛ دامان‌گیر. (دامنگیر)
داملە : [ناو] گوێلکی نێری دووساڵە.(گوساله نر یکساله)
داملەماچ : [ناو] ناوچەیەکی ئاسۆری‌نشینە لە نزیکی مووسڵ. (منطقه‌ای‌آسوری نشین نزدیک موصل)
دامنە : [ناو] دامەنە؛ داوێن؛ خواروو. بمنێ خوارەوە. (دامنه، مرابگذار پایین)
داموسکان : [چاوگە،ت] هەڵاواسین. (آویزان-کردن؛ آویختن ، دارداکرن)
دامەزران :[چاوگە،ت](١) مامۆستا دەرسی دامە-زران یا دامەزراند: دەستی‌پێکرد (شروع کردن).(٢) بناغە دامەزراندن.(پایه ریزی کردن) (٣) (ف.هن) جێگرتن . (جایگیرشدن)
دامەزرێنەر : [ناوبک] دابینکار؛ حاوێنەر. (فراهم کننده)
دان‌ئێشە : [ناو،ت] ددان‌ئێشە . (دنداندرد)
داناش : [ناو] دانەوێڵەی تایبەت بۆ هاڕین لە ئاش. (بنشن برای آردکردن)
دانان : [بەند] گریمانە کردن؛ وادانان؛ داینێین وابوو: گرتمان وابوو: هاتوو وابوو. (بەفرض)+
دان‌بەجەرگی‌خۆدانان : (١) پشوودرێژی. (تحمل کردن). (٢) وێران؛ زاتکردن. (جرئت کردن)
دان‌پەی : وەدووکەوتن؛ وەشووێن‌کەوتن. (دنبال کردن)
دان‌پیانان : پەژراندن؛ حاشالێنەکردن؛ درکاندن. (قبول کردن)+
داندار : [ئاوەڵناو] دەنکدار؛ پڕدەنک وەکوو هە-نار و گوڵە گەنم کە دانی زۆربێت. (پردانه)
داندۆقە : [ناو] کەرەکێوی . (گورخر)
داندۆل : [ناو] کەلەک؛ جەنجال؛ گێچەل . (هچل؛ معرکه)
دانڕسکێ : [ناو] ددانە چیرە . (دندان قروچه)
دانڕیۆی : [ناو] ددانە ڕیوی؛ خشڵێکی جوانە زێڕینگەران چێی دەکەن. (نوعی زیور)
دانزلین : [چاوگە،ت] هەراسان بوون؛ جاڕس بوون . (پریشان‌شدن)
دانستە : بە ئاگاییەوە؛ (ف.مشە) تایبەتی؛ هە-ڵبژاردە؛ بژاردە. (بخصوص)
دان‌کردن : [چاوگە،ت] هەڵوەراندنی هەنار و بۆڵی‌ترێ‌و... (دان کردن)
دانووشتاو : [ناوبەر] داچەماو؛ داهاتوو. (خم شده)+
دانوولە : [ناو] دانەوێڵەی کوڵاو بەهۆی ددان‌دەر

هێنانی منداڵەوە دروستی دەکەن. (بنش پخته)
دانە :(١)دانیٚ؛ داینیٚ؛ بارەکەت دانە: بارەکەت دابنیٚ؛ دای‌بنە. (بگذار)(٢) دەنک؛ گلە. (دانە؛ عدد) +
دانەبنار : دان بە بناردا؛ ڕووله بناری کێوکردن. (روبەدامنەکوه نهادن) +
دانە قود : [ناو،بەر] (ف.یاد) : گەنمە کوتراو. (گندم کوبیده)
دانەبەر : (١) لێخوڕینی ئاژاڵ؛ (ب)ڕاونان و دەر کردن(دنبال کردن).(٢) بەژێرسەیارەوەکردن؛ وەبەردان(مانند،زیرماشین گرفتن)(٣) وەپێش کە وتن(جلوزدن)
دانەبەزە : [ناو] مەمکی ژن یاگووانی وڵاخ و ئا-ژاڵانە لە دەمێکدا کە وشک بکا.(پستان شیردهی کەخشک‌شود)
دانەخاف : [ناو] گەنمی کوتراو و لەت بوو. (گندم نیمکوب شده)+
دانەدانە : [بەند]دەنک دەنک؛ دانادانار؛ (دانە-دانە)
دانەدوواوە : [چاوگە،ت] (١) ڕەتکردنەوە؛ وەرنە-گرتن؛ گەڕاندنەوە؛ گل‌نەدانەوە. (پس‌زدن؛پس-دادن) (٢)کشانەدوواوە؛پاڵدانەدوواوە (عقب-کشیدن)
دانەدەست : ئەسپاردن؛ پی‌ئەسپاردن؛ بەدەستەوە سپاردن . (سپردن)
دانەڕیژە :[ناو] ڕەوتی کۆمباینی‌دەنک ڕژێن و ئاشی‌کە لەگەڵ ئارد دەنکی ساخ فڕێدەدا. (دانە-ریختن کمباین وآسیاب)
دانەسەر : ڕشک داویەتە سەری. (دامەسەر خوە-ما:دامبەسەرخۆمدا)بە سەر و پۆتراکی خۆدادان؛ بەسەردادان؛ پەلامار بردنەسەر.(بسرو روی خودکوبیدن؛ حملەبردن)
دانەشاخ : [چاوگە،ت] (ب)یاخی بوون؛ بە-کێودادان . (یاغی شدن)
دانەکوژتن : [چاوگە،ت]دان بەکوشتن؛ بە-کوشتندان (بە کوشتن دادن)
دانەگرتن : [چاوگە،ت] دان‌بە گرتن؛ بوونەهۆی گرتن و گیران؛ بەگرتن دان. (سبب بازداشت شدن)
دانەوە : (١) بنوشتێوە؛ دابە؛ کوڕنوش بکە . (خم شو)(٢) ئەداوەکردن؛ پێدانەوە؛ (پس‌دادن) +
دانەوێڵەدێمی:[ناو]گیاییێکە لە ناو جاڕەگەنمدا دەڕوێت و تێکەڵی گەنم دەبێت، بەرەکەی لە گەنم دەکا وخواردنی بۆ ئینسان ژارێکی بکووژە و چارەی ژەهرەکەی خواردنی هەنار و بەڕووە. (گەنمڕەنگ)یشی پێدەڵێن (چچم؛ تلخک،علف چین)
دانهەڤ :کۆکردنەوە؛ بەرهەڤ کرن.(جمع کردن)
دانی‌کرمۆڵ : ددانی‌کرمی و ڕەشەوەبوو. (دندان کرم خورده)
دانێڵە : [ناو] دانەوێڵە . (بنشن)
داواخواز : [ناو] داواکار؛ خووازبێنیکەر. (خواستگار)
داوارین : [چاوگە،ت] دابارین . (باریدن)
داواکردن : [چاوگە،ت] (١)داخازکرن؛ لە کە-سێک ویستن. (تقاضاکردن).(٢)شەڕکردن. (دعواکردن)
داواکەر : [ناو][ئاوەڵناو] شەڕکەر؛ شەڕانی. (خوازەلۆک) (جنگی؛ جنگیدە؛ خواهان )+
داواڵ : [ناو] لقە گەنمی بەپاوە بەجێماو لە پە-

ڕێز. (ساقه درو نشده بجا مانده در مزرعه)
داوباز : [ئاوەڵناو] حیلەباز؛ فێڵباز. (حیلەباز)
داوبسەت : [ناو] داد و بسەد؛ ئاڵش وێرش؛کڕین و فرۆشتن. (خریدوفروش)
داوداو :[بەند] هەوداهەودا؛ بڵاو و پەریشان؛ تاڵ-تاڵ. (تارتار)
داوداوەکۆستە : [ناو] شوان خەڵەتێنە.(اسم‌پرنده ایست)
داودۆز : [ئاوەڵناو] داو دۆزەرەوە؛ داڤدۆز؛ داودیە؛ داودیتوو (ب) فێڵەباز.وەک باڵان دیده. (دام‌دیده؛ حیله‌گر)
داوک : [ناو] سیپە؛ ڕەبەت؛ کەمین؛ بۆسە. (کمین)
داوڵنا : [ناو] فد:(دابلنا، رووس‌د.) لۆتۆ. (دابلنا)
داونانەوە : [چاوگە،ت] (۱)نەخشەی فێڵ و تەشقەڵە کێشان.(۲) داو و تەپکە نانەوە؛ تەڵە نانەوە. (۱و۲ دامگستری؛ تله‌گذاری)
داوودڵ : بەدڵ و بە گیان ئارەزوومەندی؛ بەتاسەوە (آرزو)
داوودی : [ناو] (۱) جۆرێک قوڵەباڵتە؛ (۲)(ئاوەڵناو) دەنگی داوودپێغەمبەر ئاسا؛ (ب)دەنگی سێحراوی و خۆش. (نوعی تنپوش؛صدای داودآسا) (۳) ناوی گوڵێکە.(نام‌گلی‌است)
داووڕ داووڕ:[بەند] دابڕدابڕ؛ شەق شەق؛ لەت-لەت ؛ بڕدراوی هێڵ هێڵ. (بریدن درپی‌هم)
داووڕین : [چاوگە،ت] دابڕین؛ قسەدابڕین: قسە بڕینەوە. (بریدن)
داووسیان : [چاوگە،ت] ئاوابوون؛ بزربوون؛ وەک ئاوابوونی مانگ و خۆر. (گمشدن؛ غروب‌کردن)
داو و ناو : [بەند] بەدانستە؛ بەتایبە-تی.(مخصوصاً)
داوەرانن : [چاوگە،ت] داباراندن ؛ داڕژاندن . (باراندن)
داوەرڤاندن : [چاوگە،ت] داوەراندن؛ ڕووتاندنەوەی دار؛ دارخاوێنکردنەوە لە گەڵا و وشکەڵ. (تکاندن میوه‌درخت)
داوەرڤین : [چاوگە،ت] داوەرین . (تکانیدن)
داوەرە : [کاری ئەمری] ئاوەرە؛ ساوەرە؛ ئابۆرە؛ دابێرۆ؛ دابێ. (بیا)
داوەزیان : [چاوگە،ت] دابەزیان؛ دابەزین.(پیاده شدن)
داوەستە : [ئاوەڵناو] دابەستە. (پرواری)
داوەشاندن : [چاوگە،ت] وەشاندن؛ چاندن؛ بڵاوکردنەوە. (پاشیدن)+
داوەکا : [ناو] شەڵتە؛ ڕەشکەی‌کاکێشان. (طورحمل‌کاه)
داوەمشار: [ناو] مشاری وەک موو باریک؛ مشاری ناسک‌کاری. (اره مویی)
داوێ : دەهاوێ؛ دەخا؛ دەهاوێژێ. (می‌اندازد)
داوێنگر : [ناو]دامێنگر؛ داوێنگیر؛ هاتنەرێ و تووشبوونی سزای کردەوە. (دامنگیر)
داوێنگرتن : [چاوگە،ت] دامێنگرتن؛ دەستەوداوێن بوون. (دامن‌گرفتن)
داهات : (۱)چاوم لە بەرخۆر داهات.(چشم درد) (۲)دارەکە داهات: بڕدرا.(قطع شد).(۳)باو کردن. ڕادێو داهات، حەکایەت‌بێژ نەما. (پیداشد).(۴) ڕۆچوون؛ قوپان؛ بەفر زۆربوو سربان داهاتە خوارەوە.(نشست‌کرد) (۵)تاشین؛ سافکردن؛ ناسک کردن، تەختەکە بەڕەندە داهات: تەنک بووەوە (تراشیده شد).(۶) گەییشت؛ بەسە-

راهات. شەوداهات: بوو بەشەو. (رسیدن) بە-شانە مووی سەر داهێنان: ئاڵۆزابوو چەتوون بە شانە، داهات. (شانە شد)(٧)چەما؛ لقەکە زۆر داهات، شکا. (خمید).(٨)ڕاهاتن؛ دلم بەم شارە داهاتوە.(انس گرفت) (٩)دانان دروست کردن؛ هە تا ئەو ئاهەنگەم بۆ داهات، ماندوو بودم. (ساختە شد). (١٠) لارە سیبەرداهات : (سایە-بعدازظهرپیدا شد) (١١)بەهرە؛ دەرامەت (ف.هن) بهرە؛ درامد)

داهاوردن : [چاوگە،ت] (١)پاوێرکردن. (نوآوری؛ کشف کردن).(٢)کردن بە باو. (مدکردن.)

داهژاندن : [چاوگە،ت] تیٚترنجاندن؛ لڤاندن؛ کردنە نێو قاڵب. (درقالب ریختن)

داهۆ : [ناو] گزی؛ هەزاری سەر دەبەرخۆ؛ پیلان؛ (جادووگەر و گەپدەر و بە داهۆ «هەزار» (حیلە)

داهەژ :[ناو،بک] هەژێن؛ جووڵێن. (جنباننده)

داهێزاو : [ناو،بەر] داهێزراو؛ لەش گران بوو. (بیحال شدە از تب یاگرما)

داهێنەر :[ناو،بک] دۆزەرەوە؛ ڤەداندەر؛ خولقێنەر؛ پاوێرکەر(کاشف) چەمێنەوە ؛ داچەمێن.(خم کننده)+

داپیۆوە : [ڕابووردووی پیۆەدان]؛ داپییەو؛ پیۆدا؛ پیۆەیدا.دای پێیەوە. (نیشش زد)

دایکبرا : [ناو] زڕبرای دایک؛ دووبرا لە دایکێ. (برادر مادری)

دایکمردگ : [ئاوەڵناو] دایک مردوو؛ (مادر مردە)

دایەبەری : (١)دایە دەمی؛ بەدەمییەوەدا؛ درێژە-ی پێدا؛(دایەبەری لە هەموو بابەتێ قسەی کرد) (طول دادن بە صحبت. (٢)بەشێکی خستە سەر بەشێکیتر. ( جزو آن کرد) (٣) بە سەیارە دایە بەر،لاقی شکاند. (زیرکردن)

دایەگەورە :[ناو] دایکی باب، یان دایکی دایک. (مادربزرگ)

دایەنگا :[ناو] جێگەی ئاگالێبوون و پەروەراندنی مندا لی ساوا. (پرورشگاه اطفال)

ددان ئیشای : [چاوگە،ت] ددان ئێشان. (دندان-دردکردن)

ددان بەجەرگانان : [چاوگە،ت] (١)خۆخواردنەوە؛ هیچ نەدرکاندن بەرانبەر بەئێش و ئازار. خۆڕاگری. (دندان روی جگر گذاشتن)

ددان پێدانان :[چاوگە،ت] پیێلێنان؛ درکاندن؛ پالێنان؛ ڕاستیی مەبەستێ ئاشکراکردن(اعتراف کردن)

ددان پێدانەر : [ناو،بک] درکێنەر ؛ پالێنەر . (معترف)

ددان شاش : ددان بڵاو . (دندان فاصلە دار)

ددان شکێن: (ب)جوابی ڕەق؛ بەرسڤا تەحل؛ جو-ابی تاڵ. (جواب تلخ)

ددانکەل : [ناو،ت] کەسێکە یەک یا چەند ددانی کەوتبێت . (دندان افتادە)

ددان مرواری : (ب) ددانی ڕێکوپێک و سپی . (دندان سفید و ردیف)

ددانە : (١) ئەوە ددانە .(این دندانست )(٢) [ناو،ت] هەر شتی زۆپ یا ددان ئاسا وەک ددانەی سیٚسوو، ددانەی بڕبەند، ددانەی پێچ و مۆرە، ددانەی کلیل.(دندانە.آج)+

ددانەچیرە : [ناو،ت] حاڵەتی کەلپە نیشاندانی دڕندە بە نیشانەی هەڕەشە. (دندان نشاندادن

درنده)+
ددانەڕیچی : > ددانە چیرە .
ددانەڕێوی: [ناو،ت] دانڕێوی؛ جۆرە خشڵێکی-ژنانەیە. (نوعی زیورزنانە)
ددانیخیرپیانەهێنان: [چاوگە،ت] (ب)باس بە-چاکە نکردن.(بد گفتن)
ددانی شیری : [ناو،ت] ئەو ددانانەیە؛ کەلە تە-مەنی ۶ و ۷ ساڵیدا دەکەون . (دندان شیری)
دڕ : [ئاوەڵناو] بەهێزیی ڕەنگ لە نیگارکێشیدا وەک: ڕەش و شین؛ دەستەواژەیە. (قدرت رنگ درمخلوط کردن)+
دڕ : [پاشگر] دڕێن: دڕێنەر؛ قەڵەشێن، شەقکەر، دڕبە لەشکردان. (دونیم‌کردن و راەبازکردن)
دڕاقگەنی : [ئاوەڵناو] پارەپیس؛ بەرچاوتەنگ . (خسیس)
دراوکڕ : [ناو] بەدراوکڕاو ؛ زێڕکڕ . (زرخرید)
درژانگ :[ئاوەڵناو] لاواز؛ کز؛ لەڕ. (لاغر)
درکاندراو : وتراو؛ درکێنراو؛ پسێ‌لێنراو؛ ئاشکراکراو. (کفتە شدە)
دڕکەئاڵەت : [ناو،ت] گیای زڕوی؛ گەنم ڕەنگ؛ دەڵێن، دەرمانی بەرگری لە وەرینی مووە . (چوغان؛ چچم؛ علف چمن)
دڕکەپەرچین : [ناو،ت] گیای دڕەباخی؛ بە ئاور ڕۆنەکەی دەگرن و دەیساون بەسەر بالووکەدا، بۆ چاکەوەبوون؛ بۆ تیراوێش بەکەڵکە. (خارباغی)
دڕکەخەنجەر : [ناو،ت] تۆسی . (نوعی شوقاق)
دڕکەدەرزی : [ناو،ت] گیای دڕووە بزمارە؛ پاش کوڵاندنی لە ئاودا بۆ شۆردنی بیرۆ و گەڕوڵی بە-کەڵکە . (خارزرد؛خارشیری)
دڕکەژاڵ : [ناو،ت] گیای کوڵەوار؛ دڕکێکە ترنجەبینی لێدەگرن و بۆکەوتەیی و سکەشۆرە و هاوڵە بەکەڵکە . (خارشتر؛ خارترنجین)
دڕکەکەرە : [ناو،ت]گیای دڕکە وڵاخ؛ دڕەهەری؛ دەرمانی بێوەسیرییە . (کنگرفرنگی)
دڕکەگورزە : [ناو،ت] گیای کەرتەشی؛ گورزەگیا؛ بەراوەژووی کەرکوڵ؛ بۆ زیادکردنی ڕادەی شە-کری خوێن بەکەڵکە.(خارشکر تیغال)
دروار : (ف. گیو) بەرگدروو؛ درووما‌ن‌کەر.(خیاط)
درواری : [ناو] بەرگ دووری. (خیاطی)
دروانگە : [ناو] ڕۆچن؛ ڕۆچنە؛ کولاوکە. (روزن بام)
درواو : [ناوبەر] (۱)دووراو؛ دورواو؛()۲ ڕنراوە. **(۱)دوختە شدە؛(۲)دروشدە)**
دڕوودالْ : [ناو،ت] دڕکودال. (خاروخاشاک)
درۆودەلەسە : [ناو،ت] بافیش‌کردن؛ چاووڕاو. (چاخان بازی)
دڕووکردن : [چاوگە،ت] دڕک دەرهێنان؛ (دڕک کردن)ی هەندێ گیا وەک کەنگر. (خاردرآوردن گیاە)+
دروەدای (۱)درۆکردن؛(۲) درۆی کرد. (دروغگویی؛ دروغ‌گفت)
درۆهەڵبەستن : [چاوگە،ت] قسەی درۆسازکردن. (دروغ پردازی)
دڕەدموا : [ناو،ت] دڕووەدموا؛ دڕکەدەوا؛ گیای-کەرکوڵ؛ لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا زۆرە و دەرمانی تەوژمی خوێنە. (خارمقدس)
درەوشدار : [ناو،ت] ئالادار؛ پەرچەمدار؛ بەیرە-قدار؛ درووشمدار. (پرچمدار)
دڕپیل :اندفد: [ناو،ت] تۆپ ڕاگرتن و یاری

پێکـردن و درەنـگ پاسـدان لـە تـۆپی‌پـا و باسکیتباڵدا. (دریبل)

درێخ‌کردن : [چاوگە،ت] درێـغ‌کـردن: کۆتـایی-کردن لەکارێکدا . (کوتاهی در کار)

درێژاهی : [ناو] درێژایی. (درازی)

درێژکێشان : [چاوگە،ت] تلۆربوون؛ تلۆرکەفتن؛ پاڵکەوتن. (دراز کشیدن)

درێـژموکـردن : [چاوگـە،ت] درێژۆکـردن؛ درێژکردنەوە؛ ڕاکێشان؛ (دراز کردن)

درێشووشکە : [ناو] درێشووشک؛ چـز؛ چـزووی مار و دووپشک . (نیش و مار و عقرب)

دریڤ : [ناو] دراڤ؛ دراو؛ پوول؛ پارە. (پول)

درێلە : [ناو] گیای درێلەباخی؛ قەیسەکوژ (مە-جنون‌کوژ) گیاییێکی‌کورتەباڵایە؛ دەیکوڵێنن ئاوە-کەی بۆ خەم وخەفەت ڕەواندن باشە . (ترتیزک چمنی) +

دزبازاڕ : [نـاو] (ب)جیگاییێـک کـە دزی بـرەوی هەیە. (دزدبازار)

دزجاڕ : [ناو] شووێنێکە دزی زۆربێـت؛ جێـی‌دز. (مسکن دزدها)

دزخەندە : [ناو] لێوکەنـی پـەنامـەکـی. (لبخنـد دزدکی)

دزداشـە : [نـاو] کراسـی درێـژ؛ زیـاتر کراسـی مرۆڤی‌دینی و ڕاهیبە. (پیراهن بلند )

دزگین : [ناو] هەوسـار؛ لـەغـاو ؛ دەسـتەجڵـە-و.(افسار)

دزنێرۆ : [ئاوەڵناو] شۆفار؛ تێچێن. (نمام)

دزۆک : دز . (دزد)

دزە خورجێنی : کردنی‌کارێـک یـا شـتێک بـە-دزییەوە (پنهانی)

دزەکردن : [چاوگە،ت] خۆدزینەوە . (جیم شده)

دزیار : [ناو،ت] دەسکیس؛دایکە دز؛ دەستکیس. (راهنمای دزد)

دزی‌کردن : [چاوگـە،ت] ئـەبـابۆزی و دەسـت-پیسی کردن. (دزدی‌کردن)

دژاو : (١) مەزراییێک کە لێژبێت و چاک ئاو نە-خوات. (مزرعه شیبدار)(٢) ئـاژەڵـی‌کـە مـەیلـی ئاوخوارونەوی نییـە. (حیـوانی‌کـە میـل بـە آب خوردن را ندارد)+

دژخمان : [ناو]دوژمن . (دشمن)

دژدوێن : [ئاوەڵناو]کـەمقسـە؛ کـەمـدوو . (کـم حرف)

دژلەوەڕ: ئاژەڵی‌کە چاک نالەوەڕێت . (حیوانی‌کـە نمی چرد)

دشپۆکە :[ناو] وورده زیپکە و قنچکـە لـە سـە-ڕپێست.(جوش پوست)

دفتەری : [ناو] خوناق؛ وەناق؛ بوغمە؛ دەردێکە پشوو تەنگ دەکات و توێژێکی‌سپی لـە سـەر-شەرمی ژن و ناو گـەروو چێـدمبێـت (دیفتـری)

دفنان : قەرەبووی چاکە کردنەوە؛ تۆڵەی چاکە کردنەوە . (جبران نیکی‌کردن)

دفن‌بەران : قەپۆزبەران؛ کەپۆبەران ؛> پۆزبـە-ران . (مغرور)

دکراندن : [چاوگە،ت] حورمەت‌گرتن؛ ڕێزگرتن؛ قەدرگرتن. (احترام‌گذاشتن)

دگوور : جۆرە بووزوێکە. (نوعی‌شال)

دڵ‌ئازا : [ئاوەڵناو] دڵ‌قاییم؛ ئازا؛ بەجەرگ؛ چاونە ترس. (دلیر)

دڵ‌ئاوپرشێن‌کردن : (ب) زۆرپێ‌خۆش‌بوون؛ دڵگەشانەوە. (کنایی،دلشا دشدن)

دڵ ئێشان : [چاوگە،ت] (۱)ژانکردنی دڵ (دل درد) (۲)زیزبوون؛ دڵمەندبوون؛ دڵگران‌بوون؛ ڕە نجیان؛ دڵگیربوون. (دلخورشدن)

دلاخێف : [ناو] گرانی ؛ قات‌وقڕی. (قحطی)

دڵارام : [ئاوەڵناو] سوکنادەری‌دڵ؛ ئارامی‌دڵ؛ داسراکێن. دۆست؛ یار؛ ناوی ژنانە؛ (دڵاراما هیلالی‌نەو بە دیدارت موبارەک‌بی، )(دلارام)

دڵاودڵ :[ئاوەڵناو] دووشک ؛ دوودڵ . (دودل)

دڵباز : [ئاوەڵناو] بەرفراوان؛ دڵواز؛ دڵگوشا. (وسیع؛ خوش‌منظر)

دڵبزوێن : هەست بزوێن؛ دڵگر. (احساس‌برانگیز)

دلبکول : [ئاوەڵناو] دڵبەکول؛ خەفەتبار؛ دڵپڕلە کەسەر؛ خەمبار . (غمگین)

دڵبووردنەوە : [چاوگە،ت] دڵ سستبوون؛ بێ-حاڵبوون،هاتن بەلادا. (ازحال رفتن)

دڵبەجێ‌هێنان : [چاوگە،ت] دڵنەوایی و دڵنە-وازی‌کردن؛ ئاشت‌کردنەوە. (دلجویی‌کردن)

دلپارسەک : ژن‌پەرست؛ مێ‌باز؛ دلبژۆک. (زن باز)

دڵپەڕینە سەر : دڵچوونەسەر؛ ئارەزووکردن. (پسندکردن)

دڵپێ‌سووتان: [چاوگە،ت] زگ پێسووتان؛ بەزە-یی پێداهاتن؛ پەژارە هەڵگرتن بۆ کەسێک. «گۆڤاری‌مهاباد۱۱۲» (دلسوزی)

دڵحەسانەوە : [چاوگە،ت] دڵنیابودن؛ خاترجەم بوون . (مطمئن شدن)

دڵخاڵی : (ب) لە خورێنی؛ ناشتا. (ناشتا)

دڵخاڵی : دڵساف؛ دڵ پاک. (دلپاک)

دڵخاوبوونەوە : [چاوگە،ت] دڵسستبوون؛بێحا-ڵبوون . (بیحال شدن)

دڵداخورپاندن : [چاوگە،ت] داچڵەکاندن . (ترساندن)

دڵدوێن : [ئاوەڵناو] دڵحەوێن؛دڵداری‌دەر. (دلنواز)

دڵدەرهاتن : [چاوگە،ت] (ب)تامەزرۆی دیتن؛ دڵم دەرهات بۆی: دیقم‌کرد بۆی. (دل‌یک‌ریزە شدن)

دڵڕفێن : [ئاوەڵناو] هەر دیمەنێکی جوان و دڵڕفێن؛ سەرنج‌ڕاکێش. (دلربا) +

دڵسووتان : [چاوگە،ت] جەرگ سووتان؛ (ب) ڕۆڵە مردن.( دلسوختن) +

دڵسووتێن : [ئاوەڵناو] (ب) خەمی جەرگبڕ؛ پشت‌شکێن. (جگرسوز)

دڵ‌غەلینەک : [ناو] ڕشانەوە. (استفراق)

دلقاییم : [ئاوەڵناو] بەورە؛ ئەرخەیان؛ پشتگەرم. (مطمئن)

دڵقفڵبوون : [چاوگە،ت] (ب) بێتاقەت و دڵتە-نگ بوون. (دل‌قفل‌شدن)

دڵکلاًفەبوون : [چاوگە،ت] دڵداگیران؛ دڵخە-فەبوون؛ دڵتەنگی؛ دڵگوشران. (دل‌کلافه شدن)

دڵکوژتن : دڵ‌کوشتن؛ پا بەسەردڵدانان؛ لە عە شق بووردن . (دل‌کشتن)

دڵکەر : بێ‌خەم و خەیاڵ؛ (ب) دڵداری نەزانین. (بی‌خیال)

دڵکەفکردن :[چاوگە،ت]دڵ‌هەڵچوون.(دل‌کف-کردن)

دڵگرتن : > دڵپەڕینە سەر

دڵلەخۆکردن : [چاوگە،ت] لەخۆ زوێرکردن. (رنجاندن)

دڵلەدوا : [ئاوەڵناو] نیگەران؛ چاولەدوا؛ چەمە-

ڕای لەدەستچوو. (دلواپس)
دلنگان : [ناو] بـێ‌بانگهێشـتن چوونـە میـوانی . (تفیلی)
دڵنەرم : [ئاوەڵناو] مێهرەبان؛ دڵناسک. (مهربان)
دڵنەرم بوون : [چاوگە،ت] ڕام بوون؛ ڕازی بوون بۆکردنی کارێک. (دل‌نرم شدن)
دلۆق : [ناو،] بلۆق ؛ پۆرگ . (تاول)
دڵویسـتن : [چاوگـە،ت] دڵخـووازتن؛ ئـارەزووکردن؛ حەزکردن . (دل‌خواستن)
دڵەدەرد : ئازار و ئێشـی دڵ؛ بـۆ جنێـویش بـەکاردەبرێت. (نوعی دشنام) +
دڵەودوا : [ئاوەڵناو] چاولەدوا. (نگران جا گذاشته)
دڵهەڵکەندران : [چاوگە،ت] مەیلـی جێگاییێـک نان. دڵم لەم شارە هەڵکـەنـدراوە لێـرە نـامێنم. (دل‌کنده شدن)
دڵهەڵگرتن : [چاوگە،ت] تووانای قبووڵکردن. (دل‌قبولکردن)
دڵهێنانەجێ : [چاوگە،ت] ئاشتکردنەوە؛ ڕازی کردن. (راضی‌کردن)
دڵی‌لووای : [چاوگە،ت] چوونەژوور؛ چوونـەنـاو. (داخل‌شدن)
دڵیمە : [ناو،] کەڵلەسەر (داوەڵ)ی ناو بێستان. (مترسک)
دمارۆ : دوارۆژ؛ (ب)داهاتوو. (آینده)
دمەکدڕیاگ : [ئاوەڵناو] ئـاوەسـوو؛ بـێ‌ئـابڕوو؛ ڕیسوا. (بی‌آبرو) (۲)[ناو] کەسێک دمبـەکـی لـێ دڕابێت. (پوستەضرب پارەشده)
دنج : [ئاوەڵناو] (ف .گیو) ئارام؛ ئاسوودە؛ خەڵوەت. (دنج)
دنگز : [ئاوەڵناو] فیتنە.؛ ئاژاوەچی؛ (فتنه)

دنگە : [ناو،] بەردی ناوچاڵی چەڵتووک و دانـەوێڵە تێدا کوتان. (دنگ)
دنیاداری : [ناو] سامان پێکەوەنان؛ خەریکی پەیداکردنی ماڵی‌دونیابوون. (دنیاداری)
دوائاژۆ : >دواوان.
دواباش : [ناو،ت] دووهەمین کەس‌لە مێشسێندا؛ پاشمەڵلا . (نفردوم)
دوابەگ : [ناو] جێ‌نشین. (جانشین)
دوابەند : کۆپلەی ئاخر؛ پاشـبند . ( آخـرین بنـد؛ بستن پای چارپا)
دواپارێز: >پاشەنگ؛ پاشکۆی‌سپا.
دواجار : جاری ئاخر؛ لە دواییدا؛ لەپاشان . (دفعه آخر؛ سپس)
دواخ : [ناو،] ڕووبەند ؛ نیقاب.(نقاب)
دواخستن :[چاوگە،ت] وەپاشخستن؛ پاشڤەبـرن. (عقب انداختن)
دواژە: >دواوان
دواسک : (۱) قولینچکی لای لاجانگی چاو . (-گوشه بیرونی چشم) (۲) دواهەمین منداڵ بوون. (آخرین‌زایمان)
دواکەوتوو : شوێنکەوتوو؛ دوای‌کەسێک کەوتوو؛ بەدوای کەسێکدا ڕۆیشتوو.(دنبال افتادن).+
دواگیان : سەرەمەرگ؛ ئاویلکـە؛ ئاوزینـگ . (دم مرگ)
دوان‌دوان : [بەند] جووتەجووتە . (دوتا–دوتا)
دواوان : [ناو،] کومەکی شوان؛ مێرمنداڵێک کە لەپاش ڕانەوە دەڕوا . (کمک شبان)+
دوانە :[ئاوەڵناو] بۆئینسان؛ لفە دوانە بۆ ڕووەک شملۆبەرەکەت. (دوقلو)+
دۆبیە : [ناو،] دۆبە؛ ڕنگاڵ؛ شیلە؛ (شیره؛ شهد)

دۆت : [ناو]کیژ.؛ بنەمای( دۆ) لە داواتی ڕەشبە-
ڵەکدا (دختر)+
دۆتر : [بەند] ئەیتر؛ ئیدی؛ ئەدی. (دیگر)
دۆتمیر : [ناو،ت] کچی‌میر؛ پـرەنسـیس. (دختـر
امیر)
دۆخڕشمه : [ناو،ت] دۆخڕەشـمە؛ دەسـکەوسـار؛
دەستەوسار؛ هەوسار؛ پەتی ڕەشمە . (افسار)
دۆخوین : [ناو،] دۆخین؛ هۆجەنـە.(کمربندشـلوار
کردی)
دۆخین شل : [ناو+ ئاوەڵناو] دۆخین سست؛(ب)
سووک؛ حیز؛ بێئابڕو؛ بێ‌نامووس . (بی‌آبرو)
دۆراخدان : [ناو،ت] تۆراخـدان؛ تـوورەکـەی دۆ.
(کیسه دوغ چکیده)
دۆربەند : چوارچێوە. (چهارچوب)
دۆرج :[ناو،] سندووقی چکۆلەی جێکەی شـتی
بەنرخ. (صندوقچه چیزهای بهادار)
دورۆک : [ناو] دیرۆک؛ مێژوو. (تاریخ)
دوڕولبا : [ناو] بەردێکی قاوەیی ڕەنگی بەنـرخ و
وریشەدارە . (نوعی سنگ قیمتی)
دۆرەمەڕ : [ناو،بک] مەڕدۆش؛ بێری؛ ماڵاتدۆش.
(گوسفند دوش)
دۆز : (۱)[پاشـــکر] دۆزەرەوە؛ پشـــکێن؛ وەک:
داودۆز (پیدا کننده) (۲)فـد؛ فـرد: دەسـتەواژەی
پزیشکییە واتا ڕادەی خۆراکی هەر ژەمێکـی دە-
رمان. (دوز)
دوزام : [ناو،] بەلوەشین؛ گولی . (جذام)
دۆژ : [ناو،] ئاور؛ ئاگر؛ دۆژە: جەهەننەم. (آتـش)
دۆژم : دەڵێم؛ ئیژم؛ دێژم؛ ماچۆ؛ دەبێژم؛ ئووشم.
(می‌گویم)
دۆستودۆ : (ب) کەسوکار؛ دۆست و خزم. (کس-
وکار)
دۆسۆڵ : [ناو،] تۆراخ ؛ تۆراخێک کـە کـەشـکی
لێ دروست دەکەن . (دوغ چکیده)
دۆش‌خواردن : [چاوگە،ت]کوڵـان؛ هاتنـە کـوڵ.
(جوش خوردن)
دوشقان :[ئاوەڵناو] نیەت خراپ؛کیناوی؛ دوژمـن
(دشمن)
دۆڵابی : [ناو،] ئەشکافی نێو دیوار؛ کەنتۆر؛ وەک
جێگای نوێن و لیباس؛ جاریش هەیـە دەرکـەی
تێدەخەن و دەبێت بە کۆمۆد (گە نجه).(دو لاب)
دۆڵاخ : [ناو] جۆرێک چارشێوی دووراو لە شێوە-
ی کیسەیێکی سەر و بن بەتاڵ‌کە دوو کونیشـی
هدیە بۆ دەست هێنانە دەرەوە . (چاقچور)+
دۆڵار : [ناو،] یەکەی پارەی ئەمریکـا و کانـادا و
ئوسترالیا و چەند وڵاتی دی. (دلار)
دۆڵاو : [ناو،] دۆلاف؛ دۆڵیان؛ (دۆڵ تورکییە: پـڕ)
پڕئاو ؛ چاڵی پڕ لە ئاوی بارانی سەر تاشـەبـەرد؛
یان بۆی هەیـە لـە دۆڵ بـە واتـای شـیو وەر-
گیرابێت؛ لوولەی ئاوی ئاش‌کـە دەڕژێتـە سـەر
پەڕەی ئاش. (لوله ریختن آب آسیاب؛ چالـه پـر
آب روی سنگ)
دۆڵاو : [ناو،] (۱)دوو لوولەی تەنەکە ئاسـایە لـە
کانزای زەرد کە دەچن بە ناویـەکـدا و جێگـەی
دەرزیی دروومان ڕاگرتنە، دەیکەن بە بـەرمـوور
(پـای‌ملوێنـک) یـان لـەبـەر یـەخـە دەدرێـت.
(جاسوزنی پـای گردنبنـد) (۲) قوڵفـەی کـانزای
داخستنی سووخمە. (بست یلک)
دۆڵبە :[ناو] پاڵاخ؛ پەڵخە؛ گوێلکی‌گامێش . (بچه
گاومیش)
دۆڵەدۆل : لەرزە لەرز؛ دەڵەدەل؛ جووڵـە جـوول؛

ڕەشەچاو : [ناو] گیای سیاچاو؛گیای- سیاداری کە بۆنەخۆشینی فێ بەکەڵکە. (خربق)
ڕەشە دار : [ناو] ڕەش دار؛سیاوچنار؛ ڕەشە- چنار. (صنوبرسیاه)
ڕەشەداڵ : [ناو] داڵەگوورگە؛ جۆرێکداڵە کەلاکی تۆپیو دەخوات. (دال‌سیاه)
ڕەشەڕاڤ : [ناو] ڕاوی ڕەشێنک؛ ڕاوی بێ- بەفر. (شکار دروقت نبودن برف)
ڕەشەقەزوان : [ناو] داری ڕەشەوەن؛ وەنە- سیاوێ؛ بەر و گەڵاکەی دەهاڕنەوە بۆ بە- رگری لە وەڕینی قژ و بۆ چارەسەرکردنی کەچەڵییش بەکەڵکە. (بنه کوهی)
ڕەشەگزەر :[ناو] گیای‌گزەرگە سیاوێ. (شقاقل)
ڕەشەوار : [ناو] دەواری لە موو چێکراو؛ سیامالْ؛ سیاچادر. (سیاه چادر)
ڕەشەوبوون : [چاوگە،ت] بەفری کێوان چوونەوە. ڕەش هەڵگەڕان؛ ڕەش‌بوونەوە؛ ڕەش‌بوون. (سیاەشدن)
ڕەعنا : (۱)ناوی‌ژنانە. (اسم‌زنانه).(۲) [ئاوە- ڵناو]خاوەن بەژن و باڵای‌شەنگ؛ نەرم و نۆڵ؛ شل و مل.(زیبای‌نەرم اندام)
+ڕەفە : قاتەکانی گەنجە. (طبقات قفسه و گنجه)
ڕەقاشک : [ناو] ئامێری خەڕاتی. (دستگاه- خراتی)
ڕەقۆنەک : [ئاوەڵناو] گورگە؛ قاچاخ؛ هە- ڵاتووی‌خۆ وەشێر. (تحت‌تعقیب)
ڕەڤین : [چاوگە] ڕەوکردن؛ بازدان؛ هە- ڵاتن؛ ڕۆیشتن. (فرار)
ڕەقاز : [ناو] (۱)گوێزی بە دارەوە وشکبوو. (گردوی روی‌درخت‌خشکیده). [ناو،بک] ڕەقاس؛ ڕەخس‌کەر. (رقاس)
ڕەقاندنەوە : [چاوگە،ت](۱) وەک :بە دیوارە وەچەسپاندن و بەنهێم گوشاردان. (بدیوار چسپاندن وفشاردادن) (۲) ناسک کردنە - وەی دەمەداس بە چەکوش. (نازک کردن تیغه داس باچکش)
ڕەکسانا : ناوی کچی کوورش. (نام دختر کوروش)
ڕەگاژۆ : [ناو] ڕیشاژۆ؛ لەسەرڕیشە سە- وزبوون و پەرە سەندنی دار. (روی‌ریشه جوانه‌زدن‌سبزشدن)
ڕەگاوڕەگبوون : [چاوگە،ت] ڕەگبەڕەگ- بوون. (رگ‌برگ‌شدن)
ڕەگبڕە : [ناو] ملە؛ جۆبڕە؛ جۆبڕک. (آبدزدک)
ڕەگەزپەرس : >ڕەگەز پەرست.
ڕەگەزپەرست : [ناو] نژاد پەرەست.(نژاد پرست)
ڕەگەزناس : [ناو] نیژاد ناس. (نژاد شناس)
ڕەڵم : [ناو] خیزی ورد؛ نەرمەخیز؛ ڕەمڵ. (ماسه)
+ ڕەمز : عد؛ فد: [ناو] (۱)چەندژمارە یان پیتی نەهێنی بۆ کردنەوەی قوفلی ڕەمزدار. (۲) ڕاز. (رمز)
ڕەمەکی : ئاکۆیی(ب) دوور لە شارسانییە- ت؛ گاڕەش؛ گاڕانی؛ ئاسایی. (بی‌توجه به ئاداب : بی‌تمدن)
ڕەمەن : [ناو] وشکەچن؛ دیواری هەڵچنراو بە بەرد. (دیوار سنگی بی‌ملات)

+ڕەنجـدان: [چاوگـەت] ئـازاردان.(آزاردا دن)فـهن. ڕەنج پێدان؛ (رنج دادن) ڕەنج-کێشان.(زحمت کشیدن)
ڕەنجدەر : دژواتایە.(١) [ناوبک] ڕەنجێن؛ کەسێکە دەڕەنجێنی (رنجاننـده). [ناوبـەر] (٢)(فـهن) رەنجبەر. (رنج کش)+
ڕەند : [ئاوەڵناو] رند؛ نەترس؛ ئازا؛ زیـرەک. (رند).(٢) جوان؛ قەنج (قشنگ)
+ ڕەنگ : [کۆژی نیگارگەرییـە] هـەر ڕە-نگێـک جگـە لـە سـپی و ڕەش، کـە لـە نیگارکێشیشدا بە ڕەنگ لە قەڵەم نـادرێن ؛ هەموو ڕەنگێک لە تێکڵـاوکردنی سـێ ڕە-نگی سەرەکی(سوور، زەرد، شین )پێکـدێن. (رنگ)
ڕەنگاو : [ناوبەر] ڕەنگ کراو؛ (ب)خەملیو و ڕازاوە بە رەنگ. (رنگ شده)
ڕەنگاوی : [ئاوەڵناو] رەنگ تیوەتلاو؛ ڕەنگ پیاساوراو. (رنگی شده)
ڕەنگ بەڕووەوە نەمان : ڕەنگ بزرکان؛ ڕە-نگ پەڕین. (رنگ پریدن)
ڕەنگ کار : [ناوبک] ڕەنگێن؛ ڕەنـگ کـەر؛ [ئاوەڵناو] کەسـێک کـە پیشـەی ڕەنـگ-کردنە. (رنگ کاری)
ڕەنگ گۆڕان : [چاوگەت] (ب) بەپێی بـارو دۆخی ژیان چوونە سەر ڕەوت و دۆخێکـی-تر. (رنگ عوض کردن)
ڕەنـگ گـۆڕان : [چاوگـەت] لـەشـەرمـان سوورهەڵگەران؛ یان لەترسان ڕەنگ هـە-ڵبروسقان. (رنگ برنگ شدن)
ڕەنگ هەڵگەڕان : [چاوگەت] ڕەنگ برو-وسقان؛ ڕەنگ پەڕین؛ ڕەنگ شێوان. (رنگ-پریدن)
ڕەنگی : [ئاوەڵناو] ڕەنگین؛ هـەر ڕەنگـێ-جگە لە سپی و ڕەش، کە لە نیگارکێشیشدا بە ڕەنگ لە قەڵەم نادرێن. (رنگی)
ڕەنگی سارد : هەموو ڕەنگە کـانیتێکی ڵـاوی نێوان زەرد و شین. (رنگ سرد)
ڕەنگی سەرەکی : تەواوی ڕەنگـە کـان لـە-تێکلاو کردنی جۆراوجۆری سێ ڕەنگی سە-رەکیی (سوور، زەرد، شـین) پێکـدێن؛ لـە-وێنـەگـەریـدا سـپی و ڕەش بـەڕەنـگ ناژمێردرێن، بەڵکو بە تاریک و ڕۆشـن دادە نرێن(رنگ اصلی)
ڕەنگی گەرم : دەسـتەواژەی نیگارکێشـییە: هەموو ڕەنگە کانیتێکـەڵـاوی نێـوان زەرد و سوور. (رنگ گرم)
ڕەنەکاری : [ناو، بەرهەمی چاوگە] تاشینی-دار بە ئامێری ڕەندە؛ ڕەنـدەکـاری. (رنـدە-کاری)
ڕەوازان : [ناو] بە شیاو لە قەڵەمدەر؛ ڕادای؛ بە ڕەوا دەزانیٚ؛ ویزا.> ڕەوانامە. (روادید)
ڕەوال : (فـ. شە) ڕەوشت؛ شێوەی کار؛ ڕە-وتی کار. (روال)
ڕەوانامە : [ناو] ئیزنی چوون بۆ وڵاتێک کە لەلایەن نوێنەری ئەو وڵاتـەوە بـە بیانیـان دەدرێت؛ ویزا. (روادید؛ ویزا)
ڕەواندنەوە : [چاوگەت] ئاڵقەی زنجیر هە-راوکردنەوە؛ جەغز هەراو و گەورەکردنەوە؛ لەبەریەک ڕەواندنەوە؛ (گشادکردن)+
ڕەوانسـەر : شـارۆچکەییێکـە لـە بـەینـی کرمانشان و سنەدا. (نام شهرکی است)
ڕەوان کردن : [چاوگەت] چەورکردن و ڕۆ-

نکاریکردنی کەرەستەگەلی موتۆری بۆ ئاسان گەڕیان. (روان کردن)+
ڕەوانکری : [ناوبەر] ڕەوانەکراو؛ نێردراو؛ ناردوو؛ ڕەوانکراو. (روانەشدە؛ رەوان‌شدە)
ڕەوانە : [بەند] بەرێکراو؛ بەڕێوە؛ لە حاڵی چووندا (روانەشدە)
ڕەوانە : [بەند](١) لەچووندایە؛ بەڕێگەوەیە؛ (٢) لەحاڵی ڕۆیشتندایە؛ بۆ جیگایێ‌دەڕوا؛ وەک ئاوی چۆم.(٣ )[ئاوەڵناو] مەکینەی گریس لێدراو بێگیروگرفتە، ڕەوان دەخولێتەوە. گیری نییە. (روانە؛ روان است)
ڕەوانی: (١) نەخۆشینی ڕوحی.(٢) حاڵەتی مۆتۆڕێکە بێ‌گیروگرفت‌کاردەکا.(٣)نەخۆشینی ئیسهاڵی؛ زگچوون.(۴) ڕەوتی خوێندنەوەی دەرسێ بێ‌هەڵە. (١و٢. ۴ روانی.٣.اسهالی.
ڕەوەوان : [ناو] دارگوێز تەکێن. (گرد وتکاننده)+
ڕەوێلە : [ناو] ڕێچکە؛ جەلە؛ ڕیز؛ قەتارە. (صف. قطار)
ڕەویە : [ناو] ڕێ و ڕەسم؛ ڕەوشت؛ (بەندە نەوازیت وە پیشە کەردەن، ڕەویەی بۆزورگیت بەجا ئاوردەن)«مولەوی» (رویە)
ڕەها : [ئاوەڵناو] سەربەخۆ؛ ئازاد؛ وێڵ؛ بەردراو. (رها)
ڕەهابوون : [چاوگە،ت] ئازادبوون؛ ڕزگاربوون. (رهاشدن)
ڕەهن : [ناو] بارمتەدانان بۆ قەرز وەرگرتن؛ یان خانوویێک لە بەرانبەر پارەیێکدا بۆماوەیێکی دیایکراو بە گرێو لە لا بوون (رهن)

ڕەهن‌دەر : گرێودەر؛ گرەودەر؛ ئەوەی کە - شتێ لە ڕەهن‌دا دادەنێت. (رهن‌دهندە)
ڕیاکار : فد: [ئاوەڵناو] ڕووبین؛ دووڕوو؛ مەرایی‌کەر؛ ڕواڵەت‌باز؛ بەدرۆ خۆنیشاندان بەچاکەخوازی؛ ماستاوکەر. (ریاکار)
ڕیبا : [ناو] سوودی‌حەڕام لەئیسلامدا؛ سوودی‌پارە. (نزول)
ڕێ‌بزرکری : لە ڕێ دەرچوو؛ ڕێ‌گوم‌کردوو(ب)بە هەڵەداچوو. (راەگم‌کردە)
ڕیپاڵ : [ناو] (١) جل‌وبەرگ و لیباسی کۆن وشڕ و شڕۆڵ. (لباس‌ژندە) ٢) فێڵەباز؛ (حقەباز)
ڕیتاڵی : [ناو] گەڕیدەیی؛ دونیادیتوویی؛ ئاوارەیی؛ سەرگەردانی. (آوارەگی)
ڕیت‌ڕیتۆک : [ناو] زەحیری؛ ئیسهاڵی. (اسهالی)
ڕیتم : اند؛ فد؛ فرد؛[ناو] [کۆڕی مۆسیقایە] ڕەوتی‌کرژی و خاوی لە مۆسیقا یان گۆرانیدا؛ چونیەتی‌زەرباهەنگ، (زەربی) ئاهەنگ. (ریتم)
ڕێتن : [چاوگە] ڕشتن؛ ڕژاندن. (ریختن)
ڕیچار : [ناو] مامۆستا؛ فیرکار. (استاد)
ڕێخراو : [ناو] ڕێکخراو . (سازمان)
ڕێخستن: [چاوگە] سازدان؛ کۆڕێکمان ڕێخستوە. (راەانداختن)+
ڕیخن : [ئاوەڵناو] لەر و لاواز؛ زەحیر. (اسهال؛ لاغر)
ڕیخۆڵەباریکە : [ناو] ڕیخۆڵەیێ‌کە لەپێش ڕیخۆڵە گەورەدایە و پێیەوە چەسپاوە. (رودە‌کوچک)
ڕیخۆڵەگەورە : [ناو] ڕیخۆڵە ئەستوورە، کە

له دوای ڕیخۆڵە چکولەوەیە. (رودەبزرگ)
ڕێخەداروو : [ناو] گیاییێکە بۆ پاڵاوتنی-خوێن لە ژار، بەکەڵکە. (سنبل‌الطیب؛ علف‌گربە)
ڕیخەشلە : [ناو] نەخۆشینی فیڕکەی ئاژاڵ. (مرض اسهال حیوانات)
ڕیخەکوێرە : [ناو] ریخوڵەکوێرە. (رودەکور)
ڕێزدار : [ئاوەڵناو] بەحورمەت؛ بەڕوومەت؛ مرۆی‌گران و سەنگین. (محترم)
ڕێزگر : [ناو،بک] حورمەت‌گر. (احترام‌گیر)
ڕێژاف : [ناو] نەخۆشینی ئاژاڵ بە هۆی خواردنەوەی ئاوی زۆر لەگەرمادا. (مرض-گو سفندوبز)
ڕێژەو : [ناو] لووزەو؛ نێرینەی‌ئاو. (ریزش-آب بافشار؛گودی رودخانە)+
ڕێسمە : [ناو] ئێسقانی قوتی جومگە کە - لە ناو ئێسکێکی چاڵدا دەسووڕێت و دە-جووێ. (استخوان‌برجستە مفصل)+
ڕێسمەی‌دەرکە: [ناو،ت] گرێژەنەی‌دەرگا؛ گێجەنەی‌دەرگا؛ پاژنەی دەرگا. (پاشنەدر) > ژێر ڕێسمە
ڕیس‌وگوریس : (ب) ئاخافتنی بێ‌سەروبەر. (سخن بی سروتە؛ آسمان وریسمان)
ڕێسەر : [ناو،بک] ئەوەی کەدەڕێسێ. (ریسندە)
ڕیشازۆ : [ناو] ڕەگازۆ؛ لەسەرڕیشە سەوزبوونی ڕووەک . (روی‌ریشەسبزشدن)
ڕیش‌تراش: [ناو،ت] ئامێری خۆتراش (۱) ئامێری کارەبایی کە ڕیش دەتاشێت.(۲) گوێزان؛ تێخ. (۱و۲ ریشتراش)
ڕیش‌دەرمان : [ناو] ناوی‌گیاییێکە. (زرنباد)

ڕیشکە : [ناو] ڕیشوە؛ ڕیشوو؛ هەڵوەشاوی کەناری مێزەر و ئاغەبانوو کە چەند تاڵ چەندتاڵ بادرابێت. (شنگلە)
ڕیشکەهەڵبەستن : [چاوگە،ت] ڕیشوە هە-ڵبەستن؛ پاشتن. (شنگلەپیچیدن)
ڕیش‌گرێودانان : [چاوگە،ت] ڕیش‌لەگرێودا دانان؛(ب) دەروەستی و بەڵێنی ئەخلاقی. (ریش‌گروگذاشتن)
ڕیشۆڵی : [ناو] گاوانی؛ ڕیشۆڵە. (سار)
ڕیشە : [ناو] (ب) نەمامی بەڕیشەوە هە-ڵکەندراو بۆ چەقاندن لە جێگاییێکی‌تردا؛ یەکەی ژماردنی نەمام.(ریشە ) +
ڕیشەبڕ : [ناو] بن‌بڕ؛ لە بێخدا بڕین؛(ب) خاشەبڕکردن و ڕەچەڵەک فەوتاندن. (ریشەدر آوردن)> جینو ساید
ڕیشەداکوتان : [چاوگە،ت] (ب) مانەوە بە یەکجاری لە مەڵبەندێ و پابەرجابوون. (استقرار دائمی)
ڕیشەداکوتان : [چاوگە،ت] بنج داکوتانی-گیا؛ خۆقاییم‌کردن و مانەوە لەجێگاییێ؛ جێگر بوون و دامەزران. (ماندگارشدن)
ڕیشەدەرهاتن: [چاوگە،] (ب)تووێخ‌چوون؛ (ب) ئەرکی زۆرکێشان. (کنایی. زحمت-فروان‌کشیدن)
ڕیشەکەن: [ناو،ت] هەڵکەندن‌بەڕیشەوە؛ بنەبڕکردن؛ خاتیمەپێ هێنان؛ ڕیشەکێش. (ریشەکش کردن)
ڕیشەکێش‌کردن : [چاوگە،ت] (۱)بەڕەگ و دەمارەوە هەڵکەندن. (۲)بنەبڕکردن. (ریشە درآوردن)
ڕیشەهەلکێشان : >ڕیشەدەرهێنان.

ڕیق‌چەم :[ناو]ڕیپۆقی‌چاو.(ژمک‌چشم.قی- چشم)
ڕێک‌دەرچوون :> ڕێک‌هاتنەوە
ڕیٚ‌کردن : [چاوگە،ت] جیٚگاکردن: ئیزن-دان بۆ هاتنەژوور؛ میوانم‌ئەمشەو ڕیٚگەم‌کە: جیٚگەم‌کە. (راهدادن؛ جادادن)
ڕێک‌هاتنەوە : [چاوگە،ت] (ب)بەقەرا یە-کتربوون؛ بەقەدیەکترین بوون؛ حاڵەتی بە-رانبەری .(مساوی‌شدن)
ڕێکێشە : [ناو] ڕکێشە؛باری‌هەنگ؛ گڵادمەل؛ گەڵادومەڵ؛ گیاییٚکە بۆ درگاکردنی دومەڵ بەکەڵکە. (بارهنگ-سرنیزەای)
ڕیٚ‌گوم‌کردن : [چاوگە،ت] ڕیٚ‌بزرکری. (رەگم کردن)
ڕیگە : [ڕابوردووی چاوگەی ڕۆیین] ڕویگە؛ ڕۆیشتووە؛ ڕیکەسەو: ڕۆیشتووەتەوە. (رفتەاست)
ڕێلین : [چاوگە] وەڕین؛ حەپەکردنی‌سەگ. (پارس‌کردن‌سگ)
ڕیمۆڵە : [ناو] ڕیٚشکە و پیٚشکە کردنی چاو (دودو زدن چشم)
ڕین : [چاوگەی کورتکراو]کورتکراوی رویین؛ ڕۆیشتن؛ بابڕین: بابڕۆین؛ تەغەر لە بن‌زاراوەی ئەردەڵانیدا دەوتریٚت ( ضمیر- مرخم، رفتن)+
ڕینگاو : [ناو] تراوی خەست‌وخۆڵ وەک ئاوی خەستی سەروپیٚ. (مایع غلیظ‌شدە)
ڕیٚ‌نوێن : [ناو] ڕیٚ‌پیشاندەر. (راهنما)
ڕیواس‌چەرمگ : [ناو] گیای ڕیواوچۆ؛ بۆ عیلاجی بەردی کیسەی سەفرا (زرداو)بە-کەڵکە. (ریوندچینی)
ڕیواوچۆ : >ڕیواس‌چەرمگ.
ڕیوایەت: [ناو] لەئارەویەوە هاتووە بەڵام لە کوردیشدا بووەتە باو واتا، گیٚڕانەوەی باسیٚک لە زمانی کەسیٚکی ترەوە. (روایت)
ڕیٚ‌وڕەسم : [ناو] بنەمای پەژرێندراو و پە-سن‌کراوی باوی کۆمەڵیٚک. (راەورسم)

ڕاد : (ف.شە) مێرخاس؛ بەدەهەند. (راد)
ڕادیکاڵ : فد؛ فرد؛ اند: [ناو+ ئاوەڵناو] لە-ڕامیاریدا واتا بونیاتخواز؛ لایەنگری گۆڕانکاری بنەمایی شێوازگەل. (رادیکان)
ڕادیکاڵیسم : فد؛ فرد؛ اند: [ناو] بونیاتخوازی توندوتیژی. (رادیکالیسم)
ڕادیۆسکۆپی : فد؛ فرد؛ اند: [ناو] وێنەگرتن لەئەندامی گیاندار بە ئامێری ڕادیوگراف. (رادیوسکوپی)
ڕادیۆلۆژی : فد؛ فرد؛ اند: [ناو] چاولێکردن وناسینی گیروگرفتیناخی لەش بە کەڵک-وەرگرتن لەتیشکی نادیاری ئیکس. (رادیولوژی)
ڕادیۆلۆژیست : فد؛ فرد؛ اند: [ناو] پسپۆڕی ڕادیۆلۆژی. (رادیولژیست)
ڕاسوو : [ناو] مشک خورما. گیانلە بەرێکی چووکەی خورمایی ڕەنگە. (موش خرما)
ڕاشیتیسم : فد؛ فرد؛ اند: [ناو] نەخۆشینی نەرمبوونەوەی ئێسک. (راشیتیسم)
ڕاکئەندرۆل : فد؛ فرد؛ اند: [ناو] جۆرێک سەمای دوو کەسیی ڕۆژئاواییە. (راک-اندرول)
ڕاکێت : فد؛ فرد؛ اند: [ناو]ئامێری بەدە-ستەوەگرتن لەیاریی پینگپۆنگ و تێنیس-دا. (راکت)
ڕاکێت : فرد؛ اند؛ فد: [ناو] ئامێرێکیشەڕە؛ گولە تۆپئاساییکە گەورە و پڕتەقەمەنی. (راکت)
ڕاگۆ : فد؛ فرد؛ اند: [ناو]تاسکەبابی سە-ربازخانە و ئوروپی. (راگو)

ڕاڵی : فد؛فرد؛ اند: [ناو] کێبەرکێی سەیارە ئاژووتن. (رالی)
ڕشتەپڵاو : [ناو] هەرشتەپڵاو. (رشتەپلو)
ڕفووزە :فرد؛ فد:[ئاوەڵناو] ڕەت بوونەوە . دەرنەچوون لە ئەزموون. (رفوزە)
ڕفووزەبوون : [چاوگە،ت] ڕەتبوونەوە لە ئەزموونی وانەدا و دەرنەچوون. (رفوزە-شدن)
ڕۆڵ : فد؛ فرد؛ اند: [ناو] (١)دەورگێڕان لە-شانۆو سینمادا.(رل). ٢)فەرمانیسە-یارە.سوکان. (رل) (٣) تۆپی خڕ هەڵدراوی درێژ، وەک ڕۆڵی کاغەز . (رول)
ڕۆڵێت :فدفرد[ناو]ناوی جۆرێک شیرینیاتە کە وەک بابۆڵە دەپێچرێتەوە. (رولت)
ڕوماتیسم : فدفرد [ناو] ڕووماتیسم؛ نە-خۆشینی پەنمینی جومگە بەهۆی تەڕە-شۆیی وسەرماوە. (رماتیسم)
ڕومانتیک : ایتاد؛فد؛ فرد؛اند: [ئاوە-ڵناو](١)هەستبزوێن. (٢)خەیاڵاوی وهە-ستۆکی.(٣)هەرهونەرێک بە ناوەڕۆکی ئە-ویندارانە و هەستۆکییەوە. (رومانتیک)
ڕونێسانس : ایتاد؛ فد؛ فرد؛ اند: [ناو] ڕەوتی نویبوونەوە و بووژانەوە لەباری هونەرەکان و پیشە سازیەوە، کە چەرخی١٤ تا١٦ ی زایینی لە ئورووپا سەری هەڵدا. (رنسانس)
ڕووباز : [ئاوەڵناو] سەربەتاڵ؛ بێسەربان و میچ؛ دەفریسەربەتاڵ. (روباز)
ڕەزایەتینامە: [ناو،ت] بەنووسراوە چاوپۆشین لە سووچیتاوانبار؛ دەربڕینی ڕە-زامەندی بە نووسین. (رضایتنامە)
ڕەوانپزیشک :[ناو]دوکتۆری ڕۆح و ڕەوان.

(روان پزشک)
ڕەوانپزیشکی : [ناو] لقیٚ‌لە زانستی پزیشکی،کەکاری ناسین و چارەسەرکردنی نەخوشینەکانی دەروونی و ڕوٚحیە. (روان- پزشکی)
ڕەوانناس : [ناو] خاوەنی زانستی ڕەوان- ناسی. (روان‌شناس)
ڕەوانناسی : [ناو] زانستی لیٚکوٚڵینەوەی کردەوەکانی ڕوحی و هەست و بیر و بوٚچوونی هزری و چارەسەرکردنی گرفتە- کانی. (روانشناسی)
ڕەوانناسی پەروەردەکاری : کەڵکوەرگرتن لەبنەماکانی ڕەوانناسی بوٚ باشتر پەروەردە کردن. (روانشناسی پرورشی)
ڕەوانناسیتاوانکاری : دوکتوٚری ناسین و توٚژینەوەی هوٚگەلی هاندەری مروٚڤ بوٚ تاوانکاری. (روانشناس‌جنایی)
ڕەوانناسیگشتی: ڕەوتی تاوتویٚ‌کردنی ڕەسم و یاسا و دەستووری گشتی کە بە- سەر میٚشکدا زاڵن. (روانناسی عمومی)
ڕەوانناسیمنداڵان : توٚژینەوەی ئاکاری مروٚڤ لە سەرەتای منداڵییەوە هەتا لاوی. (روانشناس کودک)
ڕەوەند : شیٚوەیکار؛ ڕەوت؛ ڕەڤەند. (روند)

ڕەیل : اند؛ فد؛ فرد: ڕیٚگا یان خەتی ئاسنی شەمەنەفەر؛ هیٚڵی ئاسن. (ریل قطار)
ڕیٚزیدیٚنت : فد؛ فرد؛ اند: [ناو] پزیشکیٚک- کە بوٚ پسپوٚر بوون لەکاری کردەوەییدا، لە بەردەست ئوستاددا لە نەخوٚشخانە کاردە- کا. (رزیدمت)
ڕیٚکوٚرددار : فد؛ فرد؛ اند: [ئاوەڵناو] خاوەنی باشترینشوٚپ و پلە و پایە لە کیٚبەرکیٚدا. (رکورددار)
ڕینگ : اند؛ فد؛ فرد: [ناو] بازنەییٚک لەکانزا کە لاستیکی تەگەری سەیارە دەچیٚ بە- سەریدا. (رینگ)
ڕینگ : اند؛ فد؛ فرد: [ناو] سەکوی تەناف کیٚشراو بە چواردەوردا بوٚ کیٚبەرکیٚی شەڕە- مشت. (رینگ‌بوکس)
ڕینگ : اند؛ فد؛ فرد: [ناو]کەرەستەی- موٚتوٚڕە. بازنە ئاسا لەدەوری پیستوٚن دە- خری و بەسیلەندرەوە جووت‌دەبیٚت.(رینگ)
ڕینگ : [ناو] لە موٚسیقادا بە ئاهەنگی بن- بزیٚوکە دەوتریٚت کە بەبیٚ گوٚرانی، بە ساز لیٚدەدریٚت؛ چووارمیزراب. (رنگ)
ڕیٚویٚلویٚر :[ناو] اند؛ فد: ریٚڤیٚلڤیٚر؛ دەمانچەی تەوەرەدار(توٚپی دار). (رولور)



زاب : [ناو] زابی‌گه‌وره و چـووک نـاوی دوو زێ له كوردستانی عێراق. (دودریاچـه درکردسـتان-عراق)
زابێ‌مه‌یه : نۆره؛ گه‌ڕه‌دامـه‌یـه؛ نۆبـه‌ی‌مـه‌یـه. (نوبت ماست)
زاتاو : [ناو] زات‌ئاو؛ ئـاوی‌تـاڵی نیـۆ زراو؛ ئـاوی زاور؛ سه فرا. (صفرا)
زاچ : [ناو] ژنی زه‌یستان؛ ژنی‌تـازه‌زاو. (زائـو؛ زن تازه‌فارغ‌شده)
زاخ : قه‌له‌ڕه‌شه. (زاغ)+
زاخاو : [ناو] (۱)تاویاوه‌ی زاخ لـه‌نێـو ئـاودا. (زاج درآب‌حـل‌شـده). (۲)زاخجـۆش. (بـا زاج جـوش کردن؛زاج‌ذوب‌شده)+
زاخاودانه‌وه [چاوگه‌،ت](۱) پاککردنه‌وه‌ی خشڵی زێڕ و زێو به شێوه‌ی تایبـه‌ت لـه زێڕینگـه‌ریـدا. (تمیـز کـردن جـواهرات).(۲) زاخجۆشـکردن. (زاغجوش کردن). (۳ب) مشتومالکردنی تێخـی خنجێر و شمشێر. (مشتومال‌دادن تیغه خنجر).
زاخاودانی‌چاو : به‌کەیفی دڵ تـه‌ماشـای دیمـه-نێکی دڵڕفێن یـان هـه‌ر شـتێکی جـوان‌کـردن؛ (ڕووناک کردنـه‌وه‌ی چـاو بـه دیمـه‌نـی جـوان دیتن)(دیده جلادادن)
زاخجۆش : [ناو] تاواوه‌ی زاخ به‌گه‌رمـا پێـدانی زۆر. (زاج‌ذوب‌شده)
زاخجـۆش‌کـردن :[چاوگـه‌،ت] قـاییم کـردن و جۆش دانه‌وه و چێکردنه‌وه‌ی شتی‌شکاو به‌زاخی تاواوه. (جوش‌زدن‌بازاج)
زاخ‌دراو :[ناو،به‌ر] گاودراو به زاخ؛ قاییم‌کراو بـه-زاخ. (چسبانده شده بازاج)
زاخۆران : [ئاوه‌ڵناو] تێرنه‌خۆر؛ زۆرخۆر. (پرخور
زاخۆیی : [ئاوه‌ڵناو+ ناو](۱)خه‌ڵـک‌یـان پـه‌یـوه-ندیدار بـه زاخـۆوه. (اهـل‌یـا مربـوطبـه زاخـۆ). (۲)جۆرێـک باڵتـه کـه ده‌سـتکاری زاخـۆ بـووه. (نوعی‌پالتو)
زاخه‌که‌وه :[ناو،ت] قاژقاژه؛ ژه‌نگار؛ مووروه‌شینه؛ زاخی‌شین. (زاج‌آبی)
زاخی‌چه‌رمگ : [ناو،ت] زاخی‌سپی؛ له پزیشـکی و ڕه‌نگرێژیدا به‌که‌ڵکه و سیازاخیشی لێ‌دروست-ده‌بێت. (زاج سفید)
زاخی‌سه‌وز : [نـاو،ت] منـداره‌بـه‌رد؛ قژاڵـک؛ بـۆ دروست‌کردنی مه‌ره‌کـه‌ف و ڕه‌نگکردنـی چـه‌رم به‌که‌ڵکه. (زاج‌سبز)
زادپه‌ی‌زاد : پشتاوپشت؛ جه‌د ئه‌نده‌رجه‌د؛ ڕه‌چه-ڵه‌ک. (جد اندرجد)
زارانج : زارانجه؛ که‌و؛(کبک)
زاردڕاو : [ئاوه‌ڵناو] (ب)فره‌وێژ؛ زۆربڵێ. (پرگو)
زارا : سارا؛ ناوی ژنانه‌یه. (اسم‌زنانه‌است)
زاراف : [نـاو] زاراوه؛ شـێوه‌ی‌ئاخـافتن؛ زاراڤـه. (لهجه)
زاربڵاو : [ئاوه‌ڵنـاو] ڕاز درکـێن؛ قسـه ڕانـه‌گـر. (افشاکننده‌راز)
زاربه‌زار : ده‌م‌به‌ده‌م؛ سینه‌به‌سینه؛ به بێ نووسین

ڕاگوێزرانی مەبەست لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە. (سینەبەسینە)
زاربەستن : [چاوگە،ت] دەمبستن؛ (ب)قسەنە-کردن؛ قوڕوقەپکردن؛ قوڕوقەپ پێکردن. (دهن‌بستن)
زارجوو : [ناو] دەمەجاو؛ بەئەندازەی جارێک جاوین. (باندازەیکبارجویدن)
زارخەندە : [ناو] لێوکەن بە تەوسەوە؛ (ف.مشە) کەنینا نەژدل. (زهرخند)
زاردروون : [چاوگەت](۱ب) دەمبەسکردن؛ بەرگری لە قسەکردن. (دهن بستن)(۲ب) ڕیشوەت پێدان بۆ چاوپۆشی و قسە نە-کردن.(بارشوه دهان بستن). (۳) هەردوو لێو بە یەکدا دوورین. (لب دوختن)
زاردەشت : [ئاوەڵناو] ڕاستوێژ؛ زمان‌ڕاست؛ (ب) ناوی زەردەشت پێغەمبر. (راستگو؛ زردوشت)
زارزانک : [ناو] شانۆکار؛ شانۆگەر؛ ئەکتەر و دە-رهێنەری شانۆ. (تیاترگر.بازیگرتیاتر)
زارکردنەوە : [چاوگە،ت] زارلێکردنەوە (ب)دەم لێهەڵماڵین و قسەی ناخۆش پێوتن. (دهن-بازکردن)
زارنانەوە : [چاوگە،ت] سەرداپۆشین؛ سەرنانەوە؛ (ب)قسەلێنەکردن.(سرپوش گذاشتن)
زاروزیخ : [ناو] ناو و دەنگ؛ ناوونیشان؛ ناوداری. (اشتهار)
زارۆهەساران : [ناو] منداڵی ئەستێرەکان؛ (ب) زەڕدەشت کە ڕیوایەتە کوڕی ئەستێرە بووە. (فرزندستارەها)
زارەکی : [ئاوەڵناو] دەمی؛ لەفزی؛ لەبزی؛ دە-ڤکی؛ بەگوتە. (شفاهی)
زارەودەر : (۱)دەرگای ژوورێک کە بەرەو کۆڵان بکرێتەوە. (دری کە روبە کوچە بازشود.)(۲) جێگای گوڵە یان برینی دیواودیو. (جایگلولە کە ازطرف دیگر خارج شود)
زارهەژدیها : [ناو] گیای دەمەشێر؛ جۆرێک گوڵە. (نوعی‌گل)
زازایی : جۆرێک‌هەڵپەڕین؛ خەڵک و شیوەزمانی زازاکان. (نوعی‌رقص وزبان‌زازاها)
زاغۆری : [ناو] لارەپێچی شەدە؛ مێزەری شەدە. (نوعی‌دستارابریشمی)
زاف : [ناو] لە زەعفی ئارەوییەوە هاتووە، حاڵە-تی دڵ بێهێز بوون. (ضعف)
زاڤ : [ناو] ڕەسم؛ ئائین. (آئین)
زاڤدان : [ناو] تۆڵدان، منداڵدان. (رحم)
زاک‌وماک : [ناو،ت] زاوماک؛ بەرخ‌ومەڕ. (برە-ومیش)
زاکۆن : [ناو] زیپک؛ بڕشت؛ کارلێهاتن؛ قودرەت. (قدرت؛ ابهت؛ قاطعیت)
زاگاری : [ناو] زگاری؛ پەشێوی؛ عاجزی؛ غە-مباری. (آشفتگی؛ غصەداری)
زاگە : زایگە؛ زاوە؛ منداڵی‌بووە. (زائیدەاست)
زاڵ : پیر؛ بەساڵاچوو؛ ناوی‌باوکی ڕۆستەمی پاڵە وان بووە. (زال)(۲) هێز بەسەرداشکان. (زورچربیدن)
زال :[ناو+ ئاوەڵناو] بەساڵاچوو؛ زاڵ. پیر. (پیر)
زاڵ : [ناو] ژەهر؛ ژار؛ ژەحر. (زهر)+
زاڵە: کیسەی سەفرا؛ کیسەی جێگای زاڵ(ژە-حری سەفرا) (کیسەصفرا)
زالوو : زاروو؛ مارمژ؛ (زالو)
زاڵەبردن : [چاوگە،ت] (۱)هاواربردن؛ گلە و

گازنده بردن بۆ لای کەسێک. (دادخواهی‌پیش‌کسی‌بردن)(٢ب) ترساندن. (ترساندن)
زاڵەتەقێن : پڕمەترسی؛ زۆربەسام و ترس. (ترسناک)
زاڵەزەرداوە : >زاتاو.
زاڵی‌زەڕ : نازناوی باوکی ڕۆستەمی دەستان بوون. (زال‌زر)
زامن‌بوون : [چاوگە،ت] بەرعۆدەبوون، دەستەبەربوون؛ قفل‌بوونی چەک و چەقۆی زامندار.(ضامن‌شدن)
زامندار : (١)[ئاوەڵناو] هەرکەرەستەیێک کە زمانەیێکی ببێت بۆ نەجووڵان یان کارنەکردنی بەشێکی ئەو کەرەستە.(٢) دەستەبەرکراو. (١و٢.ضامندار)
زامنە : [ناو] زامن؛ ئامێری قفڵکردنی پەلەپیتکەی تفەنگ یان چەقۆی زامندار. (ضامن)
زامووسقە : [ناو] هەویرێک لە خاکی‌مێل و ڕۆن بەزرەک بۆ پڕ کردنەوەی درزی تەختە و بۆ دابەستنی شووشە پەنجێرە. (زاموسقە)
زان : [چاوگە و پاشگرێکە] واتا زایین بەڵام نەک هەر منداڵ‌بوون؛ خوێن‌تیزان؛ ئاوتیزان.> زایین (پسوندجمع‌شدن)+
زانای : [چاوگە] زانین؛ تێگەیشتن؛ تێگەیشت. (دانستن؛فهمید)
زانەوێر : [ناو] ئاڵووگۆڕ؛ گوڕان. (عوض‌کردن)
زاوابەند : > زاوارێوی
زاوارێوی : [ناو] زاوای لەسەر ماڵی خەزوورە دانیشتوو. (دامادسرخانە)
زاوازێڕینە : [ناو] نازناوێکە بە تازەزاوا دەڵێن. (مانندشاەداماد)
زاویە : [ناو] سێ‌سووچ؛ گۆنیا؛ کەرەستەی قەڵاشکاری و ئەندازیاریە. (گونیا)
زایفە : [ناو] لە قەدیمدا بە ژنیان دەگوت؛ ئافرەت. (ضعیفە)
زایلە : [ناو] زایڵە؛ زایەڵە؛ دەنگدانەوە؛ گەڕانەوەی دەنگ؛ ئاوێژەی‌دەنگ. (برگشت وتشدیدصدا؛ ایکو)
زایەکەردەی : [چاوگە،ت] لەناوبردن. (ب)فرۆشتنی مەڕوماڵات. (ازبین‌بردن)
زایین : [چاوگە،ت] قەتیس‌بوونی ئاو لەچاودا؛ ئاوزایینەچاو؛ دەستەقرنجا خوێنی‌تێزا. >زان. (جمع‌شدن‌مایع)+
زبان : [ناو] زمان بەهەمووماناوە؛ وەک زبان تاڵ؛ زبان‌پیس؛ واتا زمان‌تاڵ، زمان‌پیس، زمانی ئاخافتن. (زبان)
زبانە [ناو] (١).بڵێسە. (شعلە). ٢)داری تا شراوی ناوکانە؛ هەر شتی قوت کە دەخرێتە نێوشتی ناوچاڵ بۆ چاکتر پێکەوە لکان وەک کانە و زبانە. ٣) بزمارئاسای سەر ئاڵقەی ئاغزوونە. (زبانە)
زبری : [ناو] دژی‌نەرمی؛ زووری؛ حاڵەتی‌زبر بوون؛ زڤری. (زبری)
زخ : [ئاوەڵناو] سەخت؛ زەخ؛ زەخت. (سخت)+
زدک : [ناو] زیپک؛ زیپکە؛ زبرکە؛ جۆشی‌سەرپێست؛ جوانەزمە؛ جوانەزوە. (جوش)
زراسک : [ناو] کۆرپە؛ منداڵی‌ساوا. (بچەتازەبە دنیاآمدە)
زرالات : [ناو] تاتەبەرد؛ بەردی‌پان و گەورە.(تختە بزرگ‌سنگ)
زرانوو : [ناو] زرانی؛ ژنۆ؛ ئەژنۆ؛ چۆک؛ وژنگ؛ زرۆنی؛ زانوو ؛ زەنگوڵ. (زانو)

زڕانەوە : [چاوگە،ت] زڕیانەوە؛ دەنگی ناقووس و زەنگۆڵە بەرز بوونەوە. (بەصدادرامدن ناقوس و زنگ)

زرانیبەزرانی: چۆکبەچۆک؛ (ب)نزیک و ڕووبەڕوو دانیشتن. (زانوبزانو)

زراو : [ئاوەڵناو] زراڤ؛ باریک. (باریک)> زاڵە (ف.هن)

زڕاوشان : [ناو] زێڕوەشان؛ پارە بەسەربووکدا هەڵخستنەوە. (زرافشان)

زڕباڤ : [ناو] باوەپیارە؛ زڕباب. (ناپدری)

زڕبراله : [ناو] زڕبرا؛ براییکە تەنی نەبێت. (نابرادری)

زڕبورا : [ناو] زڕبرای هاوسەر؛ زڕبرایژن. (نابرادریزن)

زربه : [ناو] زبره؛ گرنج گرنج؛ درشته. (نخاله )

زربی : [ناو] زبری؛ گرنجی؛ ناسافی؛ دڕی. (زبری)

زرتخانه : [ناو] جێگەی کێبەرکێ و گاڵته و قەشمەری. (جایمسابقەوشوخیکردن)

زرتوپرت : [ناو]جرتوپرت؛ قسەیبێواتا؛ و بێ مانا. (یاوه)

زرتەسوور [ئاوەڵناو] زرتەزەلام؛ زرتەبۆر؛ زلحۆرت. (لندهور)

زڕچەنه : [ناو] ژێرچەنە؛ خشڵێکە دووسەری بە قولاپ لە ژێر چەناکەوە بەلارەپیچەوە قاییمدە- کرێت. (نامزیوریاست)

زڕدش : [ناو] زڕبرای مێرد. (نابرادریشوهر)

زڕدێ : [ناو] زڕدایک؛ ژنیباب؛ باوەژن. (زن- پدر)

زرز : [ئاوەڵناو] شەمبۆز؛ نائارام؛ شەڕوور؛ تەغەر بۆ وڵاخ دەوترێت. (شرور)

زرزڕە : [ناو] زوخاو؛ خوێناویبرین؛کیم؛(کێم) چڵکیبرین. (چرکزخم)

زرشک : [ناو] زریسک؛ زریشک. (زرشک)

زرگوهەڵەت : [ناو] زەردوما؛ زوورگوهەڵەت؛ پڕکۆسپ و کەندالێ؛ هەڵدێر. (سنگلاخ)

زرمتانه : [ناو] تۆڵە؛ حەیف؛ حەقسەندنەوە. (انتقام)

زڕنازیق : [ناو] جۆلانێ؛ جۆلانە. (تاببازی)

زرنگانەوە : [چاوگە،ت] زرینگانەوە؛ هێرباری- کۆن و بۆنگرتوو بە ئاور سوورکردنەوە. (سرخ- کردندوبارەکوزەکهنه)+

زرنگەیگوێچکه : [ناو،ت] بەهۆی دەنگی زۆر بەرز وەک دەنگیتۆپ، کە گوێ هاژەهاژی لێ- دێت. (ویزویزگوش)

زڕنووق : [ناو] چریسکایی ڕۆن لە سەر شۆرباو. (چربی کم روی سوپ)

زڕنووچقاو : >زڕنووقاو.

زڕنووقاو : [ناو] چەوراییکەم بەسەر چێشتی- تراوەوە (چربیکمرویغذایآبکی)

زرو : [ناو] زرب؛ زبر؛ زڤر. (زبر)

زڕواڵێ : [ناو] زڕخوشک؛ خوشکیناتەنی. (ناخواهری)

زڕوزبیل : [ناو] زبڵوزاڵێ؛ خەوشوخاڵێ. (آشغال)

زڕوزەنگیانه : [ناو] متومووڕو. (خرزەومنجوق)

زروقه : [ناو] (١)جووکە(جیکجیک). (٢)شەبەق؛ شەوقیکەم؛ ڕوشناییکەم. (سو)

زرۆنی : [ناو] زرانوو؛ زرانی؛ ژنۆ؛ ئەژنۆ؛ چۆک؛ وژنگ؛ زانوو؛ زەنگوڵێ. (زانو)

زرویێ : [ناو] دڕکە تاڵە؛ چەوغان.> تۆسی

زڕەفەقی : [ناو](ب)کەسێک کەتازە دەستی بە خوێندن کردوە؛ کەم خوێندەوار؛ کەم سەواد. (کم‌سواد)
زڕەکبون : [چاوگە،ت] زڕەبوون؛ چاولەبەرتیشک هەڵنەهاتن؛ بەشەوارەکەوتن. (ندیدن‌بعلت- نورروبرو)
زڕەکەش : [ناو] کەشاوێک کە کزر بووەتەوە و بۆ کێڵان ئامادە بووە. (زمین‌آبداده‌آماده‌شده)
زرەگەنە : [ناو] گیاییێکی بۆن ناخوشە و بەرەکە-ی خڕ و دڕکاویە. (نام‌گیاهی‌است)
زڕەلاو : لاوی‌ترسەنۆک و بێ‌بایەخ. (جوان‌ترسو)
زڕەمەندیٚ : [ناو] گیاییێکە وەک مەندیٚ بەڵام کورتە باڵاترە و گەڵاکەی وردترە. (نوعی گیاه)
زرێپۆش : [ناو] لەعەسکەریدا دەبابەیێکە لە- جیاتی زنجیر لەسەر تەگەری لاسیقی‌دەڕوا. (زرهپوش)
زرێپەڕ : [ناو] پەڕاوی‌زەریا؛ کەناری‌زیٚ؛ کە- ناری‌دەریا. (کناردریا)
زریشکی : [ناو] ڕەنگی‌زریشک؛ سووری‌تۆخ؛ پێکدی لەسوور و قاوەیی‌تۆخ. (زرشکی)
زریکەلیٚ‌هەستاندن : [چاوگە،ت] زریکە لیٚ‌هە- ڵساندن؛ پێوەدان؛ ئازار پێگەیاندن. (ئازاررساندن)
زستانەخەو : [ناو،ت] نیوە خەوتنی هەندیٚ گیانلەبەران لە زستاندا و بووژانەوە و بەخەبەر هاتنیان لە بەهاردا.(زمستان خوابی)
زڤر : <زرو.
زڤڕوک : [ناو،بک] خول‌خۆر؛ کەسێک زۆر دەگە ڕێت. (گردنده؛ چرخنده)
زڤڕۆک : [ناو] گێژاو؛خولخواردنی‌ئاو؛ ئاشی جند- ۆکان. (گرداب)
زقووم : [ناو] زوقم؛ خووسار؛ سیخوار؛ ئالشک؛ خویسک؛ قراف؛ خویز؛ سەرماوەردە؛ جیلە؛ هە- ڵمی بەسەهۆڵ بووی سەرگەڵای دار. (بژ)
زک‌دان : [چاوگە،ت] لەم‌دای؛ تەپڵەک کردنی دیوار؛ هاتنەپێشەوەی بەشیٚ لە دیوار یان هەر ڕووپەڕێک. (شکم‌دادن)
زکر : [ناو] پرچ هەڵسووڕاندن و هەڵپەڕ و داپە- ڕی دەروێشانە، تەغەر بەهەوای دەنگی دەفەوە. (سماع درویشان)
زکڕەش : [ئاوەڵناو] دڵپیس؛ دووشک؛ بەدگومان. (مظنون‌ودل‌چرگین)
زک‌شێلان : [چاوگە،ت] (ب)لێدان و بە پاوە چوونە سەرزگی‌کەسێک. (کتک‌زدن)
زک‌قوپاو: [ئاوەڵناو] کەلەکە قوپاو؛ (ب) لەڕ و لاواز. (کنایی‌لاغر)
زکەدڕیٚ : (ب)زۆر هەواداربوون و لەسەرکردنەوە و لایەنگریی بە هەموو تواناوە. (شکم‌دریدن)
زگ‌بەرەڵا : [ئاوەڵناو] (ب) زۆرخۆر. (شکمو)
زگ‌پەرس : [ئاوەڵناو] زگ‌پەرست؛ چلێس؛ نە- وسن؛ سکەڕۆ؛ چڵەک. (شکم‌پرست)
زگ‌دڕاو : [ئاوەڵناو](ب)زۆرخۆر؛ خۆرا؛ فرەخوەر. (شکمو)
زگ‌دەرپەڕیگ : [ئاوەڵناو] سک‌مەشکە؛ سک‌زل؛ زگ‌ماسیو؛ زگ‌پەنماو؛ ورگن؛ تەنگەقەوی. (شکم‌گنده)
زگماهی : زکماکی؛ سروشتی. (طبیعی)
زگەخشکی : [ناو،ت] بەزگەوە خۆخشاندن و چوونەپێشەوە زیاتر بۆ پارێزبردن. (باشکم‌خزیدن)
زلحۆل : [ئاوەڵناو] گمتەی گێز و وێژ و گەوج و گێل. (گندەبگ‌خول‌وچل)

زلحیز : [ئاوەڵناو] زەلامی بێزراوی بێغیرەت و حیز. (یوغر بی‌غیرت)
زڵفگیر:[ناو] گیرەی‌قژ؛ گیرەی‌سەری‌ژنان.(گیره‌مو)
زڵقەزڵق : [دەنگەناو] جڵقەجڵق؛ قوڵتەی نێو قوڕی‌شل و قوڕاو. (صدای‌پادرگل‌وشل)
زڵەقیاگ : [ئاوەڵناو] شڵەقاو؛ شڵەژیاو؛ شێواو. (بهم‌زده‌شده؛ آشفته)
زلەموو : [ناو] مووی قەوی کە لە پیریدا لە سەر کەپۆ و ڕوومەتی مرۆڤ دەڕوێ. (موی بلند که درپیری روی صورت میروید)
زلهێز : [ناو] دەسەڵاتداری‌گەورە. (ابرقدرت)
زلێندک : [ناو] دوێرد؛ قەیچی؛ مقەس؛ مقەست؛ دوارد. (قیچی)
زلینە : [ناو] زەمێڵە؛ قولینە؛ قەرتاڵە؛ بەرچن. (زنبیل)
زمان‌پاراو : [ئاوەڵناو] زمان‌لووس؛ قسەزان؛ دەم‌پاراو. (سخنور)
زماندن : بەرەڵاکردن؛ وێڵ‌کردن؛ ڕەها کردن. (رهاکردن)
زمان‌ڕەق : [ئاوەڵناو] قسەڕەق؛ قسەتاڵ؛ زمان‌تاڵ. (بددهن)
زمان‌گەستن : [چاوگە،ت] (ب) وەئاگاهاتن لە هەڵە و حەسرەت خواردن. (زبان‌گزیدن)
زمانەوان : [ناو] پسپۆڕی زمان‌ناسی. (زبان‌دان؛ خبره‌زبان)
زمبە : [ناو] شیشی‌تفەنگ پاک‌کردنەوە؛ زمە. (سنبه‌تفنگ)
زمبێڵ‌قەیتان : (ب)کەسێک کە سمێڵی باریکە؛ سمێڵ‌قەیتان. (سبیل‌باریک)+
زمپارە : [ناو] کاغەز پەرداخ؛ سمپارە. (کاغذسمباده)
زمڕان : [ناو] زمڕین؛ ئاروین؛ ئەزموون. (امتحان)
زمڕاندن : [چاوگە،ت] ئەزموون‌کردن؛ تاقی‌کردنەوە؛ ئاروین‌کاری. (امتحان‌کردن)
زمڕاو : [ناو،بەر] بەتاقی‌کردنەوە ناسراو؛ ئەزموون‌کراو. (امتحان‌شده)
زمرووت : [ناو] زمرووت. (زمرد)
زناعکار : [ناو،بک] زیناکەر؛ زیناح‌کەر؛ زینحاکەر. (زناکننده)
زنج : [ئاوەڵناو]تیژ؛ تیژایی‌تێغ؛ دەمی‌تیژی‌تێغ. (تیز)+
زنجیری‌تەگەر : [ناو،ت] تۆڕە زنجیرێک کە لە کاتی بەستەڵەکدا بە دەوری تەگەری سەیارەدا دەپێچرێت. (زنجیرچرخ)
زنگار : [ناو] زنجار؛زەنگار؛ ژەنگ و چڵکی سەر-کانزا؛ ژەنگی‌مس کە ڕەنگێکی‌شین‌باوە و ژاراوییە. (زنگار)
زنە : [ناو] چۆڕەچۆڕ ئاوهاتنەدەر لەکوێرەکانی؛ دەڵاندن. (نشت.آبزا)
زنەکێش: [ناو]جۆگەی زۆرقووڵ‌کە لە ناو زۆنگەزەویدا هەڵدەکەندرێت بۆ کێشانی ئاوی‌زەوی و وشک‌کردنەوەی. (جوی‌عمیق‌برای-کشیدن‌آب‌زیادی‌زمین‌باطلاقی)
زنیاگ : [ناو،بەر] گۆپکەکردوو؛ هەڵزراو؛ لێوهەلزنیاگ: لێوهەلزراو. لێوپشکووتوو. (تبخال‌شده)
زوخواڵ : [ناو] سوخاڵ؛ زووخاڵ؛ ڕەژی. (زغال)
زوڕاتەکێویلە : [ناو،ت] دێمیلە؛ کەردڕ. (ارزن-خوشه‌ای)

زوراد : > زوراته کێویله.
زۆرانیک : [ناو] سەهۆڵخانە؛ بەفرەچاڵ؛ بەرپرسی بەفرەچاڵ. (یخچال‌ومسئول‌یخچال)
زۆربۆهێنان : [چاوگە،ت] تەنگ پێهەڵچنین؛ تەنگەتاوکردن؛ گوشار بۆ هێنان. (تحت‌فشارقراردادن)
زۆرخواز : [ناو] فرەویست؛ زۆرویست؛ (ب)بەتەماح. (زیادەخواه)
زۆرک : زۆرکان؛ زیخەڵان؛ زەوینی زۆر سفت ورەق؛ رەپن. (زمین سفت)
زۆرگەڕ : [ناو] خولخۆر؛ (ب) ماڵانگەڕ؛ زۆر له سەفەردابوون. (زیادگشتن‌وگردشکردن)
زۆرلێکراو : [ناوبەر] (١) ناچارکراو؛ زۆربۆهێزاو؛ (مجبورشده). (٢ب) زوڵملێکراو؛ مافخوراو. (مظلوم)
زۆر وەنەکریا : >زۆرلێکراو
زۆرە : (١)فرەس. (زیاداست).(٢)زۆهرە؛ ناوی ئەستێرەی‌ناهید.ناچاریە. (زهره، زوراست)
زۆرهان : [ئاوەڵناو] پیری‌بێتاقەت؛ پیری لاکەفتە؛ پیری لەکارکەوتوو. (پیرازکارافتاد)
زۆرهاوردن : [چاوگە،ت] زۆر هێنان؛ تەنگەتاوکردن. (فشارآوردن)
زۆق : [ناو] جووت؛ دژی‌تاق؛ بەجووت. (جفت)
زۆڵ : [ئاوەڵناو] (ب)فیڵەباز؛ حیلەکەر؛ ساختەچی. (حیلەگر)+
زۆلانە : [ناو] ئالقەکانی‌زنجیر. (حلقەهای‌زنجیر)
زۆلوولاو : [ناو] بەلوویی؛ ڕوەکێکی لامژە، ڕیشەی له سەر داری بەڕوو دەڕووێ و میوەکەی بۆ ڕەوانی باشە(کشمش کولی؛دارواش)
زۆڵەچەرم : [ناو،ت] سیرمە؛ ڕیشاڵی‌باریک بڕدراو لە چەرم. (برش‌باریک‌چرم)
زۆڵەزا : [ئاوەڵناو] حەرامزاد؛ حەرامزاو؛ بیژوو. (حرامزاده)
زۆڵەک : [ناو]دەنکی‌گەرمەشانی کە لە برژاندندا نەپشکووتووە؛ دەنکە دانەویلەی نەکوڵیوی ناوچێشت. (دانەذرت چسفیل‌نشده؛ دانەنپختەدرآش)
زومڕاو : >زمڕاو.
زۆمە : [ناو] ئۆبە؛ کۆمەڵێ ڕەشماڵ له پەنای یەکدا. (چندسیاەچادرباهم)
زۆنار : [ناو] زوننار؛ کەمەربەندی قەشەی مووسایی. (زنار)+
زووان‌بەسە : [ئاوەڵناو] زبان‌بەستە؛ بەستەزمان؛ فەقیر؛ بێدەنگ؛ بێقسە. (زبان‌بستە)
زووان‌لاخستن : [چاوگە،ت] (ب)درۆکردن. (دروغ‌گفتن)
زووانەگا : [ناو] گوڵ‌گۆزروان؛ گۆزربان؛ گوڵەکەی بۆڕەوانی باشە و میزهێنەرە. (گل‌گاوزبان)
زووخاڵ‌سەنگ : [ناو،ت] زووخاڵی‌بەرد؛ بەردە ڕەژی؛ سوخاڵە تەوەن. (زغال‌سنگ)
زووخواڵەتەوەن : [ناو،ت] زووخاڵی‌بەرد؛ زووخاڵ‌سەنگ. (زغال‌سنگ)
زوورەئاوی : [ناو،ت] زبرەی‌ئاوی؛ زبرەییێک کە بۆ تیژکردنی تیخ تەڕی دەکەن. (سنگ‌سمبادە)
زووڕمزووڕ : [ناو،ت] گریان و شیوەن بەدەنگی‌بەرز؛ قووڕە قووڕ. (گریەکردن‌باصدای‌بلند)
زووڕمنج : [ئاوەڵناو] کەسێک زوو دڵی‌بشکێ یان‌بتۆڕێت. (زودرنج)
زووغور : [ناو] گورچیلەی حەیوان‌گەل. (کلیەحیوانات)

زووگوور :[ئاوەڵناو] پێدڤی؛ پێداویستی؛ پێویست. (لازم)
زووگوورت : [ئاوەڵناو] زووگورد؛ ڕەبەن؛ تەنیا؛ بیٚهاوسەر؛ سەڵت. (مجرد)
زووهەڵبەست : [ناو] بیٚفکرکردنەوە خولقاندن؛ دەسبەجیٚ حازرکردنی بەرهەم یان جووابێک. (فی‌البداهه)
زوێڵ : [ناو] پووش‌وپڵاش؛ زبڵ. (خاکروبه)
زەباندن : [چاوگە،ت] فریودان؛ گومڕاکردن؛ لاڕیٚ پێکردن؛ خاپاندن. (فریب‌دان)
زەبرۆ وونی : [ناو،ت] زەبری‌خوێن؛ فشاری‌خوێن؛ تەوژمی‌خوێن. (فشارخون)
زەبری‌خوێن : [ناو،ت] زەبرۆ وونی؛ تەوژمی‌خوێن. (فشارخون)
زەبوور : [ناو] ناوی‌کتێبی عاسمانیی داوود پێغەمبەر (د). (زبور)
زەبەرجەد : [ناو] جۆرێک بەردی بەهادارە؛ جۆرێک خشڵە. (زبرجد)
زەبەردەس : [ئاوەڵناو] زەبەربەدەس؛ بەدەست‌وبرد؛ کارامەد. (زبردست)
زەحلە : [ناو] زەهلە؛ زاور؛ زەندەق؛ زراو. (کیسه‌صفرا)
زەخفە : [ناو] گۆشتی‌ژێرپڵاو. (گوشت‌زیرپلو)
زەخم‌پێچ : [ناو] برین‌پێچ؛ قوماشی‌ناسک و درێژی بۆ برین پێچان کە زیاتر لە کەتان چێدەکرێت. (باندزخم‌بەندی) کەسێک کە برین دەپێچێتەوە.
زەخم‌دەرکردن : [چاوگە،ت]سەرهەڵدانی برین لەسەر پێستی‌لەش. (زخم‌درآوردن)
زەخم‌کردن : [چاوگە،ت] زخمدارکردن؛ بریندارکردن. (زخم‌کردن)
زەخمە : فد: [ناو] میزراب؛ لێدانی‌میزراب؛ بەمیزراب نەغمە وەشاندان لە سیمی‌تار؛ نەغمە. (زخمه)
زەڕباف : فد: [ناو،ت] قوماشی زەڕی؛ کری - سیمی‌باریک وزەرد. (زرباف)
زەربانی‌مەریوانی : زانایێکی‌کورد بووە کە لە ڕەسەدخانەی مەراغە کاری‌کردووە و کتێبی ساروج‌نامەی لە زەمانی هەلاکۆی مەغوول‌دا نووسیوە. (زربان‌مریوانی)
زەڕییق : [ناو] زەڕنیق. (زرنیخ)
زەرتک : [ناو] زەردوویی؛ خوێنەمیزکە. (یرقان)
زەرچی : [ناو] هەوەڵین سەوزایی کە بەهاران سەوزدەبێت. (اولین‌سبزەبهاری)
زەرحات : [ناو] (ب)بێستان و سەوزی‌کاری. (سبزی‌کاری‌وبوستان)
زەرد : [ناو] (ب) کانزای برنج. (برنج)
زەرد : [ناو] مسوار؛ کانزای تێکەلاو لە مس و قالاٚیی کە سەماوەریان لیٚدروست دەکرد. (مسوار)
زەڕداڵ : ناوی‌گیایێکە؛ سەندەڵ. (اسم‌گیاهی‌است)
زەردپێست : [ئاوەڵناو] زەردپۆستاڵ؛ ڕەگەزی ئینسانگەلی زەردی ڕۆژهەڵاتی‌دوور. (زردپوست)
زەردجۆش : [ناو] مسواری‌جۆش‌کردنی دووکانزا. (زردجوش)
زەردکریاک : [ناو،بەر] (١ب)گۆشت یان سەوزی یان هەر شت نیوە سورکراوە لەسەر ئاور. (تفت‌دادەشدە)(٢) ڕەنگی زەرد تێهەڵساوراو. (رنگ زرد مالیدن)

زەردوسوور : [ناو] هەسینە زێڕینە؛ مۆندای‌فاتمە؛ مۆندای‌ئایشە؛ کەسکەسوور؛ تویل‌زێڕینە؛ کۆلکە زێڕینە؛ کۆلەکە زێڕینە؛ ئەستوونەزێڕینە؛ هـۆرە-وەری؛ هەسارەزێڕینە. (قوس‌وقزح)+
زەردۆیی : [ناو] عێلێکی کوردن لە ناوچەی پاوە؛ ناوی‌ئەوناوچە. (ایل‌زردویی)
زەردەبرین : [ناو] ئاورە؛ زەردەزەخم. (نوعی‌زخم-واگیردار)
زەردەپێهاتن : بەکەسێک پێکەنین بـەلێوکـەنـی بەتەوسەوە. (بەکی‌خندیدن)
زەردەتا : [ناو] تەبی‌زەرد؛ نەخۆشینێکی جێی مە-ترسی و گیرۆدارە. (تب‌زرد)
زەردەچۆپە : [ناو] زەردەچێـوە؛ زەردەچـۆ؛ زەردە-چەوە. (زردچوبە)
زەردەزخم : [ناو] ئاورە؛ زەردە بـرین؛ برینێکـی-گیرۆ دارە. (نوعی‌زخم‌واگیردار)
زەردەشامی : [ناو] گۆرەویلە؛ گۆرەوی‌چنـە؛ فـڕ-ندەیێکە هێلانە کەی بـە شـێوەی گـۆرەوی بـە داراندا شۆڕ دەبێتەوە. (اسم پرندەایست)
زەڕدەشت : زاردەشت؛ دەشت واتا ڕاسـتی؛ دەم-ڕاست؛ قسەڕاست؛ زەڕدەشت؛ ڕەنگە شاری سە-ردەشت پێوەندی هەبێت بە زێدی زەڕدەشـتەوە چوونکا کەوتووەتە باشووری زەریای ورمـێ کـە زۆرینەی مێژوو نووسان ئەو شوێنەیان بە زێـدی زەڕدەشت زانیوە. (زرتشت)
زەڕدەشتی : [ناو] پەیرەوی ئـائینی ئاهورامـەزدا. (زردتشتی)
زەردەکەنە : [ناو،ت،] لێوکەن. (لبخند)
زەڕدەگوێنی : [ناو،ت،] جۆرێک گـوێنی کـە لـە جەوەکەی کەتیرەی زەردباو دەگرن. (گون‌زرد)
زەردەلۆ :[ناو] گیای لۆی زەردباو.(نام‌گیاهی‌است)
زەردەلێو : [ناو،ت] لێوکەن؛ بـزەهاتنـە سـەرلێـو. (لبخند)
زەردەماسی : [نـاو،ت] زەردەپـەڕ؛ ماسـیێـک‌کـە ژێرزگی‌زەردە. (ماهی‌زردەپر)
زەردەهاتن : گنژینەوە؛ گژینەوە؛ بزە هاتنە سـە-رلێو. (لبخندبرلب‌آمدن)
زەردەی‌خۆراوا : زەردەی ڕۆژپەڕ. (آفتاب‌غروب)
زەردی : [ناو] جۆرێک گیایە؛ قاقلی گیوی؛ بۆنە-خۆشینی تەنگەنەفەسـی بـەکـەڵکـە. (کـاجیرە؛ کاژیرە؛کافشە؛ گلرنگ)
زەردێنۆهێلەی :[ناو،ت] زەردێنەی هێلکـە. (زردە تخم‌مرغ)
زەڕڕە : [ناو] (۱) زۆر ورد. (۲ب) دەنگی زەڕاندنی کەر. (صدای عرعر خر)
زەڕڕەتاڵ: [ئاوەڵناو] (ب) ڕەزاتاڵ؛ ئێسـک‌گـران. (زشت)
زەڕڕەشیرین : [ئاوەڵناو] (ب)ڕەزاشیرین. جوان. (تودل‌برو)
زەرزوور : >پەڕەسریلکە.
زەڕفار : [ناو] سـەڕاف؛ کـەسـێک کـە پیشـەی گۆڕینە وەی پارەی جۆربەجۆرە. (صراف)
زەرکـاهێکێ : [نـاو،ت] زەردێنـەی هێلکـە؛ زە-ردێنۆهێلەی.(زردەتخم‌مرغ)
زەرکەزەوی : [ناو] گیایێکە بەسـەر زەویـدا پـان دەبێتەوە و سەلکـی بنـەکـەی شـیرینە (اسـم-گیاهی‌است)
زەڕکـەشـی :[ناوبـەرهـەمـی‌چاوگـە] (ف.گیـو) رووکێش‌کردنی هەرشت بە ئاوی زێڕ؛ ئاوڕدانـەوە بە زێڕ. (روکش‌کردن‌طلا)

زەڕگۆز : [ناو،ت] داری پەڵک؛ جۆرێک ڕەشە-چنارە. (درخت‌ترنگوت)
زەڕگـــووز : [نـــاو،ت] (١)دارگـــوێزێکی زەردە. (گردوی‌زرد). (درخت‌گردوی‌رنگ‌روشن)
زەڕناس : [ناو] کەسێک کە بە بەردی مەحەک زێڕدەناسێ؛ (ب)مرۆڤی‌تێگەیشتوو؛ بە ئەزمـوون. (زرشناس)
زەڕنگەر : [ناو] زێڕینگەر؛ زێڕفـرۆش. (طلاسـاز. طلافروش)
زەڕنیگار: [ناو] بە زێڕ نەخشاو. (زرنگار)
زەڕۆڤار : <زەڕفار.
زەڕوزیوەر : فد: [ناو،ت] خشڵ و خاو. (زروزیور)
زەروەزەردە : [ناو،ت] گوڵە هـەنگووین؛ بـۆ لا-بردنـی زەرداو بـەکـەڵکـە؛ گیـای سـەفرابـەر. (شاسپرم کوهی)
زەروێلە : [ناو] زەردیوەلە؛ زەرویلە؛ زەردیـوەلـی؛ چۆلەکەیێکی دەنگ‌خۆشە ونێـرەکانیـان ڕەنگـی زەردە. (پرندەایست)+
زەڕهـاتن : [چاوگـە،ت] (ب)هـەوەسـی قسـەی بێجێ‌کردن، قسەی بەرز و بێجێکردن؛ هاوتـای، ئەجەل هاتن.(هوس‌صحبت‌بیجاکردن)
زەڕەزەڕ : [ناو،ت] زەڕینی لە سـەریـەکـی کـەر. (عرعر)
زەڕەوشان : [ناو،ت] زێـڕوەشـان؛ پـارە بـەسـەر بووکدا هەڵخستنەوە. (زرافشان)
زەڕەهاتن : <زەڕهاتن.
زەڕهەلی : [ناو] هەلوۆچەزەردە. (آلوچەزرد)
زەڕیان : [چاوگە] زەڕین؛ دەنگی‌کەر. (عرعر)
زەریب : [ناو] (١)سـنوور؛ کـەوشـەن؛ حـودوود. (مرز). ٢)جێگەی بەیەک گـەیشـتنی دوو چـۆم. (محل‌تلاقی‌دو رودخانە)
زەری‌قیچ : [ناو،ت] زەردی ئاچخ. (زردروشن)
زەریک : زراف؛ باریک. (باریک)
زەریم : [ناو] نێرگز؛ نێرگس. (نرگس)
زەعف : [ئاوەڵناو] (١)زۆر؛ گـەلێـک. (زیـاد). (٢) [نـــاو] لـــەســـەرخۆچـــوون؛ دڵ بووردنـــەوە. (ضعف)<زاف
زەغچوون : نەمان؛ لە بەین چوون؛ ڕیشەکەن بوون. (ازبین‌رفتن)
زەغەڵ : [ناو] بژار و گیای زیادی لەنـاو دەغڵـی سەوز و شیناوەرد دا. (گیاەهرز)
زەق : [ناو] هەڵمات؛ کەللای‌مێشێن؛ مەڕمـەری مێشێن. (تیلە)
زەقان : [ناو] مێشێن. (تیلەبازی)
زەقەزەق : [ناو،ت] چاوداپچڕین و تەماشاکردن و چاولێ نەتروکاندن. (زل‌زدن)
زەلام : [ئاوەڵناو] گەورە؛ هەر شت‌کە قەڵافەتـی گەورەبێ. (بزرگ)+ پیاو
زەلامبـاش : [نـاو،ت+ ئـاوەڵنـاو ] سـەرگـەورە؛ مرۆڤی کەڵەگەت و باڵابەرز. (قدبلند)
زەلـــزەلـــۆک : [نـــاو]خلیســـکێن؛ خلیســـک. (لیز؛سرسرەبازی)
زەلە : [ناو] زمان‌بەهەڵەگەڕان؛ قسـەجووڕانـدن. جووڕاندن. (تپق)+
زەل‌ومـۆر : [نـاو،ت] زینـدەوار؛ مـەڕومـالات. (احشام)
زەلهان : خزین؛ خوشین؛ خشکەکردن. (خزیدن)
زەلین : خووسانەوە؛ فیسانەوە. تەڕبـوون و نـەرم بوون لەئاودا؛ خزین؛ (خیساندن؛ خزیدن)
زەلێن : زەناو؛ زەوینی زۆنگ؛ جێگای شین‌بوونی

قامیش و زەل. (گل وشل؛ باطلاق)
زەمبـە : [نـاو] نـاوە؛ ئـەسـتەمـوولی؛ دەفـری قوڕکێشان. (زنبه)
زەمبەریش : [ناو] سەرین؛ باڵشت؛ بالیف؛ موته کا؛ متەکا. (بالش)
زەمبەق : [ناو] گوڵیزەمەق. (زنبق)
زەمتە : [ئاوەڵناو] زەبـەلاح؛ گمتە؛تێکسـمڕاوی تەمبەڵ. (یغوروتنبل)
زەمزەمە : فذ: [ناو] (١)دەنگی هەڵقـوڵینی ئـاوی کەم لەعەرز. (٢) لەبەر خۆوە گۆرانی وتن بە دە-نگینزم؛ ویرەویر. (١و٢زمزمه)
زەمەگلێرە : [ناو] چلوورە؛ سەهۆڵی شۆڕەوەبووی بەر پلووسک و گوێسوانان. (دنگاله)
زەنجەف : [ناو] مت‌ومووروو؛ زێڕ و زیوەر؛ خشل و خاو. (زروزیور)
زەنخ : [ئاوەڵناو] گەنیو؛ بۆگەن؛ گەنی؛ گەنیـگ. (گندیده)
زەنـد :(١) [ئـاوەڵنـاو] گـەورە؛ مـەزن؛ زەلام. (بزرگ). (٢)[ناو]نازناوی چەنـد شـایئێـران لـە عێلی زەندیە. (زند)+
زەندئـەڤێسـتا : [نـاو] زەندئاوێسـتا؛ پـەرتـووکی پیرۆزی زەڕدەشتیان. (زنداویستا)
زەندشۆڕ : زەندەشۆڕ؛ جۆرەسەگێکە کە چوارپەلی تا قولاپە و تا مەچـەک لـەسـەرعـەرز دادەنـێ. (نوعیسگ)
زەندووک : [ناو] مووچ پێچ. (مچ‌پیچ)
زەنـگ : [نـاو] (١)کـاتی دیـاریکراو بـۆ دەرس-خوێندن لەوانەدا. (٢)نـاویئـەو دەرسـە کـە لـە ماوەی وانەیێـکدا دەخوێنـدری وەک زەنگـی-چوارەم ماموٚستا دەرسی جوغرافیا دەڵێتـەوە، (٣) دەستپێک و کۆتایی هاتنی وانـە بـە زڕەی (ژام) زەنگ. (١و٢و٣زنگ)
زەنگار : [ناو] ژەنگـار؛ قاژقـاژە؛ مـوورووەشـینە؛ زاخیکەوە؛ زاخیشین. (زاج‌آبی)
زەنگارۆ : [ئاوەڵناو+ ناو] ژەنگاری؛ رەنگـیشـین؛ رەنگیکەوە. (زنگاری)
زەنگدار : [ئاوەڵناو] خاوەنیزەنگ؛ دەستەواژەی-موسیقایە، بەسازێ دەڵێن کـەدەنـگدە داتـەوە و زایە لەی هەیە. (زنگدار)
زەنگڵ : [ناو] زەنگوڵ؛ دڵۆپ؛ تکەی تراو؛ دڵۆپە. (قطره)
زەنگڵەزیوە:[ناو]جۆرێک فڕنـدەیگچکـەیـەبـەر سینگی سوورە و لەبەرزایی داراندا هێلانە چێـدە کات. (نوعیپرنده‌کوچک)
زەنگڵەمیرە : [ناو] جۆرێک باڵنـدەی گچکـەیـە. (اسم‌نوعیپرنده)
زەنگ‌لێدان: دەست‌نان بە دووگمەی زەنگدا؛زە-نگی مەدرەسە و کلیسا لێدان؛ (ب)تـەلـەیفـۆن-کردن. (زنگ‌زدن)
زەنگۆڵ : [ناو] ژنۆ؛ ئەژنۆ؛ زرانی؛ وژنگ؛ چـۆک زرانوو. (زانو)
زەنگوڵ زەنگوڵ : [ناو،ت] دلۆپەدلـۆپ؛ دلـۆپی-فرمێسک و ئارەقیلەش. (قطره‌قطره)
زەنگۆڵە گیا : [ناو] گیای بەرزەلینـگ، پاڵاوتـەی کوڵێنراوی گوڵ و گەڵاکەی دژی کرمـی ڕیخـۆ لەیە. (درمنه؛ ورک؛ یوشن)
زەنگە : [ناو] داریشکاو بۆ سووتەمـەنـی. داری شکاوی سوخت بۆکوورە. (هیزم‌شکسته)
زەنگەزێرە : [نـاو] ژەنگـەسـوورە. (نـوعیزنبـور درشت)

زەنگەسوورە : [ناو] (١) ژنگەسوورەی ڕش‌باو بە قەرای(کۆ) دەبێت و ژەهری زۆر بقەیە. (٢) ژەنگەسورەی ڕەنگ‌سووری ئاچخ کە کەمەر باریکە و دووهێندەی هەنگەژاڵە دەبێت. (١و٢. دونوع‌زنبوردرشت)

زەنگەنە : [ناو] دووهۆزی ناودارن لە نزیکی کرماشان و نزیکی کەرکووک. (زنگنه)

زەنگەنەی‌گردەکان : هۆزێک‌بوون لە نزیکی‌هەمەدان. (زنگنه‌گردکان)

زەنگی :[ناو+ ئاوەڵناو] خەڵکی زەنگباری ئافریقا؛ ڕەش‌پۆستاڵ؛ قولەڕەش. (زنگی)

زەنگیالێ : [ناو] زەنگیانێ؛ زەنگیانە. (منجوق)

زەنگی‌پشوودان : [ناو،ت] زەنگێک کە نیشانەی کوتایی هاتنی وانە و دەستپێکی پشوودانە و زەنگێکی‌تر کۆتایی بە پشوودانە و دەستپێکی وانە-یێکی‌ترە،( ماوەی بەینی ئەو دوو زەنگە کە نزیکەی دەخولەکە،زەنگی پشوودانە. (زنگ-تفریح)

زەنگی‌درگا : [ناو،ت] زەنگی‌کارەبایی لە جیاتی - دەرکە لێدان و تەقەکردن. (زنگ‌در)

زەنگی‌کاروان : [ناو،ت] (١)جەرەس؛ زەنگۆڵەیێ کە دەکرێتە ملی حەیوانی‌کاروانی بە تایبەت وشتر و زیاتر بۆملی وشتری پێشەنگ، بۆهاندان و کە متر هیلاک بوونیان.(٢ب)مەرگی نزیکان و هەواڵان کە هێما و ئامازەیە بە نزیک بوونەوەی مردن و ڕۆیشتن بەرە و مەرگ. (١و٢زنگ-کاروان)

زەنگی‌کلیسا :[ناو،ت] زەنگێکی‌گەورەیە؛ناقو وس؛ جمخار. (ناقوس)

زەوت‌کردن:[چاوگە،ت](١)ئارام‌کردن؛ ئەسپەکەم بۆ زەوت نابێت؛ منداڵەکە زەوت‌نابێت. (آرام-کردن). ٢)داگیرگردن. (غصب‌کردن)

زەوتەک :[ناوبک] فریودەر؛ خاپێن؛ خاپینۆک. (فریب‌دهنده)

زەوزوو :[ناو]زاوزوو؛زەوەزۆ؛ زاوزێ؛ زاوزۆ؛ زاوزوە؛ زایینی‌زۆر. (موالیدزیاد)

زەوڵە : [ناو] مەچەک؛ زەند. (مچ؛ ساعت)

زەوڵەئەستوور : [ئاوەڵناو] مەچەکقەوی؛ زەند ئەستور. (مچ‌کلفت)

زەوونج :[ئاوەڵناو] زۆنگ؛ ئەردی‌ئاولێ‌ڕاوەستاو؛ شێدار؛ شەدار. (زمین‌همیشه‌تر ؛ باطلاقی)

زەوونگ : [ناو] دۆڵمەگیپە؛ دۆڵمەی ڕیخۆڵە و گەدەی ئاژەڵ‌کە پڕی‌دەکەن لە برنج وبڕوێش و سەوزی. (دلمه از روده‌درست شده)

زەوەڕ : [ناو] زمهەڕ؛ زمهاڕ؛ بەئاردکردنی پاییزانی دانەوێڵە بۆ زستان. (زمسان هاڕ)(آرد آذوقه زمستانی)

زەوەزۆ : <زەوزوو.

زەوی‌پێو : [ناو] ئەندازە گری‌زەوی. (مساح)

زەوی‌پێوان : [چاوگە،ت]ئەندازە گرتنی‌زەوی. (مساحی)

زەوی‌پێوان : [چاوگە،ت] دیاریکردنی درێژایی و پانایی یان هەردووکیان بە پێوان و میترکردن. (متراژومساحی‌زمین)

زەوی‌ناسی : [ناو، بەرهەمی‌چاوگە] زانستی ناسینی چۆنیەتی ئەرد. (زمین‌شناسی)

زەوین‌خۆشکریاگ : [ناوبەر] زەوینی‌ئامادە کراو؛ (ب) مەزرای خۆشکراو بۆ داچاندن. (زمین‌آماده‌شده)

زەهاک : [ناو] زوحاک؛ شایێکی خوێن‌ڕێژی

ئێرانیبوو. (زحاک)
زەهاو : زیندوو؛ ئاوەدان؛ (زنده؛ آباد)
زەهرەترەک : [ئاوەڵناو] زاڵەترەک؛ تۆقینیزراو؛ (ب)ترسان. (زهرەترک)
زەهرەمارکردن : [چاوگە،ت] ژەحرەمارکردن؛(ب) خواردنیٚکە بەدڵەوە نەنووسیٚ؛ بەزەهری مارت بێت: بەقوزەڵقورتتبێت. (زهرمارکردن)
زەهری‌هەلاهەلا : [ناو] ژەحری‌هەلاهیل کە - زۆر بکوژە. (زهرهلاهل)
زەهفان : [ناو] کۆمەڵ؛ دەستە؛ تاقم. (گروە؛ دستە)
زەهفتر : [ئاوەڵناو+ بەند] زەعفتر؛ زیاتر؛ زۆرتر؛ فیشتەر. (بیشتر)
زەهلەبردن : ترساندن؛ تۆقاندن؛ زاڵەبردن. (- ترساندن)
زەهلەبەر : [ناو،بک] ترسێن؛ تۆقێن؛ زاڵەترەکێن. (ترساننده؛ ترسناک)
زەهلەچوون : [چاوگە،ت] ترسان؛ زاڵەچوون؛ زەندەق‌چوون؛ تۆقێن. (ترسیدن)
زەهمان : [ناو] قەبرستان؛ زیارەتان؛ گۆڕستان. (گورستان)
زەهەک : [ناو] زەهاک؛ زەو؛ بزنەکان زەهەکیان تێکەوتووە: زەویان تێکەوتووە. (زایش)
زەیتوونەتاڵە : [ناو] دارێکە لە بەرەکەی ڕۆنی زەیتوون دەگرن. (زیتون وحشی)
زیان‌دەر : [ناو،بک] زەرەرگەیێن. (ضرررسان)
زیانی‌کردن : [چاوگە،ت] زەرەرگەیاندن؛ (ب) ماڵات کردنە نێو زەرحات و دەغڵی دیتران. (ضرر رساندن)
زیبک : [ناو] زاکۆن؛ توانایی؛ هێز؛ بڕشت. (توانائی؛ قاطعیت؛ ابهت)
زیتک : [ناو] زمانەی ئاغزوونە و باڵان. (زبانە- سگک‌وتلەگورگ)+
زیخماڵ : [ناو،ت] خۆڵماڵ؛ ساوینی دەفر لەکاتی شۆردندا بە خۆڵ و زیخ. (شن‌ساب)
زێدپەروەر: [ئاوەڵناو] نیشتمان پەروەر.(وطن‌پرور)
زێدەپاروو :[ناو،ت] پارووی زیادی بۆ قەڵەو بوون؛ (ب)تفاقی زیادی کردنەبەر ماڵات. (اضافەغذا)
زیڕنای : [چاوگە،ت] زریکاندن؛ قیژاندن. (جیق زدن)
زیروبەم : [ناو،ت] زیقە و بۆڕە؛ (ب)دەستەواژەی مۆسیقایە دوودەنگی‌نەرم و بۆڕ، یان دوودەنگی- ناسک و بۆڵ. (زیروبم)
زیروە : [ناو] (۱)زریوە؛ ترووسکە؛ چلقلین؛ درە- وشانەوە. (درخشیدن). (۲) سروە؛ شنە؛ سریوە؛ بای‌کەم و هێواش. (نسیم)
زیرە سیاوە : [ناو] گیای ڕەشە زیرە؛ کوڵێندراوی بۆ پەنمانی گەدە و بیٚخەوی بەکەڵکە. (زیرە سیاه)
زیرەی‌ڕۆمی : [ناو] جۆرێک‌زیرەیە. (زیرەرومی)
زیرەی‌سەوز : زیرەی‌کەسک؛ جۆرێک زیرەیە کە ڕەنگی‌سەوزە و بۆ پەنمانی جومگە (ڕوماتیزم) بەکەڵکە. (زیرەسبز)
زێڕی بیٚخەوش : [ناو،ت] زێڕی‌خالیس؛ (ب) مرۆڤی‌پاکو راستی پێدەشوبهێنن. (طلای‌ناب)
زێڕی‌سپی : [ناو] پلاتین؛ لە زێڕی‌زەرد بەقیمە- تترە. (طلای‌سفید)
زێڕین : [ئاوەڵناو] لەزێڕچێکراو. (زرین)
زیزەمەندیٚ : [ناو] گیاسیرێژ؛ بەلبەلەشووانیٚ؛ بە-

لبەلەشوانە. (نام‌گیاهی‌است)

زیقاوە : [ناو] سێ‌جۆر مەلی مەلەوانن: زیقاوە و زیقاوەی دەشتی و زیقاوەی کلکسپی<داوداوە کۆسە.

زیقەتی : [ناو] کێشە و تەنگانە؛ تەنگ‌وچەڵەمە؛ نەداری؛ بێدەرەتانی؛ هەل و مەرجی دژوار. (مضیقه)

زێل : [ناو] جەرگ. (جگر)

زیلان : [ناو] ڕیسمەی‌دەرگا؛ گرێژنەی‌دەرگا. (پاشنه‌در)

زیلک : [ناو] ژیلەمۆ؛ سکڵی ژێر خۆڵەمێشی نیوە دامرکاو. (آتش زیر خاکس)

زیندان‌بەبیگاریەوە : بەندکردن و کارپێکردنی بەلاش. (زندان‌باکار)

زیندانی : [ئاوەڵناو+ ناو] بەندکراو؛ بەندی؛ گیراو؛ ڕاگیراو لەزینداندا. حەپس‌کراو. (زندانی)

زیندانی‌ئەبەد :[ناو،ت] زیندان‌کردن بۆ هەتا هەتا و تا ئاخری‌عومر. (زندان‌ابد)

زیندەزێ : [ئاوەڵناو] هەرگیانلەبەرێک کە لە- جیاتی هێلکە هەڵهێنان، (بەراوەژووی تۆرەمەی خۆی) بەچکەی دەبێت. (ب)جۆرێک‌ماسی کە گەراکانی لە ناوزگیدا هەڵدێنێ و بەچکەکانی بە زیندویی دەبێت. (زنده‌زا)

زینک : زینگ. اند؛ فرد؛ ئالماند؛ فد؛ [ناو] ڕووپە- ڕێکی مسییە لە کاری چاپدا کەڵکی هەیە. (زینک)

زین‌گرتنەوە : [چاوگە،ت] زین لە سەرپشتی چارەوا هێنانە خووار. (زین‌برگرفتن‌ازاسب)

زینگەوکردن : [چاوگە،ت] زیندووکردنەوە.(احیا کردن؛زنده‌کردن)

زین‌لێکردن : [چاوگە،ت] زین‌دانانە سەرپشتی چارەوا و قاییم‌کردنی. (زین‌کردن)

زین‌وبەرک [ناو،ت]: زین، (ب)هەموو شتی- پێویست بۆ زینکردنی ئەسب. (لوازم‌زین‌کردن)

زین‌وەشکەر : [ناو،بک] زین‌چێکەر؛ زین‌ساز. (سراج)

زێنەب : زێنەو؛ ناوە بۆ ژنان. (اسم‌زنانه)

زینەت : ناوە بۆ ژنان. (اسم‌زنانه)

زینی یایلی : [ناو] زینێک کە بۆ هەمو چارە- وێیێک بەکاربێ. (زینی‌کەبدردهمه‌اسبهابخورد)

زیوان : [ناو] کون لە مەشکەدا. (سوراخ در مشک)

زیوەر : [ناو] خشڵ؛ ناوە بۆ ژن و پیاو. (زیور؛ نام‌برای‌زن‌ومرد)

**پیتی (ز) بەشی وشەی بیانی**

زالووسیفەت : (ب) مرۆی خوێن‌مژ. (زالوصفت)

زەرع : [ناو] یەکەی پێوانی درێژایی لە قەدیمدا بەرانبەر بە ۱۰۴سانتیمیتر. (ذرع)

زەڕووەرەق :[ناو،ت] کاغەزێکی پڕ نەقش و نیگار یان ناسک، زیاتر ڕەنگین بۆ پێچانەوەی دیاری و پێشکەشی. (زرورق)

زیپ : اند؛ فد؛ [ناو] زنجیر. جۆرێک بەست بۆهەڵپێکانی درزی شەرواڵ و کیف(جانتا) و ئیتر. (زیب)

زێڕ خرید. [ناو،بەر] زەڕخری؛ بەپارە کڕدراو؛ [ئاوەڵناو] (ب) کۆیلە؛ بەندە؛ بەنی.«ناڵەی جودایی . هێمن » (زرخرید)

زیراکس : اند؛ فرد؛ فد؛ [ناو] وێنەگرتن وەک کۆپیەگرتن لە بەڵگە. (زیراکس)



ژ : (١) له؛ ژبەر وی ھەندیٚ : لـەبـەر ئـەوە. (بعلت)(٢) (ف.گیو) ھەم؛ ش؛ یـش؛ زێـڤـ-ژی بەنرخە: زیوێش بەنرخە. (نیز)(٣) به؛ مه-ژتـەڕا گـوت: مـن بـەتـۆم گـوت. (بـه) (٤)(ف.هن) واتای جیابوون دەگەیێنی، جلکی ژ بەرخۆبکە (از)

ژاراڤ :[نـاو] حـەوتـاوکردنی جێـی دەمـی سپلۆت؛ گلاوی‌دەرکردن بە گڵەسوورە و ئاو. (نجسی‌درکردن)

ژاراڤ : [ناو] گلاو؛ سپلۆت؛ ژاراو. (نجس)

ژاراو : [ناو] ژاراڤ؛ گلاو سپلۆت. (نجس)

ژاربوون : [چاوگە،ت] بێ‌ئەنوا و فەقیربـوون؛ لاواوازبوون بێ‌هێزبوون.(١.بینواشدن٢.زارو نزارشدن)

ژارۆ : بۆبانـک‌کردنـی‌هـەژارە؛ ئـەی‌هـەژار؛ ئۆی‌هەژار. (ای‌بینوا)

ژارین : (ف.گیو) هاوارکردن؛پاڕانەوە؛ لاڵانه-وه. (هەوار؛تمناکردن)

ژاژ[ئاوەڵناو]قەرەباڵغ ؛شلۆق. پڕ حـەشـامەت. (جمعیت زیاد و شلوق)+

ژاژک : [ناو] باوێشک؛. (دهن‌دره) (ف.هـن) بنێشت؛ جاچکە (سقز)

ژاژکە : [ناو] جاچکە؛ بنێشت؛ جاچک. (سقز)

ژاژیل : زۆربڵێی خاوەخاوقسەکەر. (من‌ومن-کردن و زیادحراف)

ژاژیلۆک : [ناو] ڕووەکێکە ساقەتەکەی دە تاشن بۆ قەڵەم. (گیاهی‌برای‌درست‌کردنـی-قلم‌نی)

ژاله : ژاڵە؛ ناوی‌ژنانەیە. (اسم‌زنانەاست)+

ژان‌بردنەدلٚ (ب)چزەلێدان؛ داخ‌نانـەسـەردلٚ؛ داخ‌بەدڵەوەنان. (داغ‌بدل‌گذاشتن)

ژان‌بژاردنەوە : [چاوگە،ت] بـەرەژانـی پـێش ژانی منداڵبوون؛ وردەژان. (دردیکەعلامـت-دردزایمان‌است)

ژاندارمری : فرد؛ فد: [ناو] ژاندارملی؛ ڕێکخر اوێکـی دەوڵـەتـی (لـەئێرانـدا) کـە زاوتـی-دادگوستەری‌بوو و بەڕێوەچوونی قانوونی دە-رەوەی شاری وەئەستۆ بوو. (ژاندارمری)

ژاندارمـــه : [نـــاو] جندرمـــە؛ ژانـــدارم؛ ژاندار.(ژاندارم)

ژانکردوو : [ناو،] (١)کەسێک کەژان دەستی پێـدابێت. (کـەسـی‌کـەدردش‌گرفتـە). (٢ ب)[ئاوەڵناو] بێقەرار و بێ‌ئـارام و حـەجمـان لێبڕاو.(بیقرار)

ژان‌کردەی : [چاوگـە،ت] ژان‌لێهـاتن؛ ژان-کردن. (دردشروع‌شدن؛دردکردن)

ژانوییه : [ناو] مانگی‌هەوەڵی ساڵی‌زایێنی لە ١١ی بـەفرانبـارەوە تـا ٢٠ی ڕێبـەنـدان. (ژانویه)

ژانەژاردنەوە : >ژان‌بژاردنەوە.

ژانەسک:[ناو،ت]ژانی‌ناو زگ؛ دڵ‌پێچە؛ سک ئێشە. (دل‌پیچه)

ژانەهوورک : [ناو] وردەژانی پێش ژانی- منداڵبوون؛ بەرەژان. (دردهای کم‌پیش- اززایمان)
ژاوەژاو : خاوەخاوقسەکردن؛ فڵتەفڵت. (من- ومن)+
ژبەش : > شووتی؛ هەنی.
ژرسە : فرد؛ فد: [ناو] جرسە؛ جۆرێک قوماشە. (ژرسه)
ژمارای : [چاوگە]شماردن؛ بژاردن. (شمردن)
ژمێر : [ناو،بک] کەسێک کە دەبژێری؛ ئە- ژمێر. (شماره‌کننده)
ژمێردراو : [ناو،بەر] ژمێراو؛ ئەژمارکراو؛ هە- ژمێراو. (شمرده‌شده)
ژنباب : [ناو] باوەژن؛ زڕدایک؛ ژنباڤ.(نامادری)
ژن‌باو : >ژن‌ڕەنگ.
زنحا : [ناو]زینا؛ زیناح؛ سەرجێی‌کردنی ناڕوا. (زنا)
ژنحیز : (ب) گەواد؛ بێناموس. (کسی‌که- زنش‌هیزاست)
ژن‌ڕەنگ : [ئاوەڵناو] ژنەڕەنگ؛ ژنانیلە؛ بلە- کناچێ؛ ئاریلە؛ لووسکەی‌ژن‌ئاسا.(پسرزن‌نما)
ژن‌سەیدا : [ناو] ماموستاژن؛ ژنی‌پیاوی مودەڕیس. (همسرمردمعلم)
ژن‌ڤیان : [ناو] ژن‌خواز؛ ژن‌ویست.(زن‌خو- استن. خواستگارزن)
ژنکاپشت‌لەئەردێ : [ناو،ت] ژنی‌مارەکراو. (زن‌عقدکرده)
ژن‌مردگ : ژنمردوو؛ بێوەپیاو. (زن‌مرده)
ژنمێر : [ناو] کەڵەژن؛ شاژن؛ شێرە- ژن.(شیرژن)
ژن‌ومنداڵ : [ناو،ت] (ب)خێزان؛ خاوخێزان. (خانواده)
ژنۆیانەی : [ناو،ت] ژنی‌ماڵدار؛ بناوان؛ کەیبا نووی ماڵ؛ کابانی ماڵ؛ بەرماڵی. (زن‌خانە- دار)
ژنەسیت : [ناو] سیت؛ ژنی‌کە ماموستایە. (معلمه)
ژنەکە : (١) [ناوی‌ناسراو] لێرەدا(کە) ئامرازی ناسیارییە . (آن‌زن، معرفه). (٢) ژنەکێ؛ ئەی ژن؛ زیاتر ژنان لە ئاخافتندا بەیەک‌دەڵێن؛ ژنەکە درەنگە بابڕۆین. (ای‌زن)
ژنەوای : [چاوگە] بیستن؛ شنەفتن؛ ژنەفتن. (شنیدن. بشنفتن)
ژنەوایی : [ناو] ڕەوتی ژنەوتن؛ ڕەوتی‌بیستن. گوێداری(شنوایی)
ژوڕژێست : فرد؛ فد: [ناو] ناوی‌جۆرێک قوماشە. (ژررت)
ژۆکێڕ : [ناو] دووکارتی تایبەت لەپەرەی پەڕانتۆدا، شەیتان یان شەیتانە. (ژوکر)
ژووری : (١) [ناو] ناوەوە. (٢) [بەند]لای‌سە رەوە؛ (٣)[ئاوەڵناو] ژووروو؛ ژوورەوە؛ سەروو. (١–داخل٢طرف بالا ٣ بالا)
ژووژ : [ناو] حاکم(قازی) لەناو قوماربازاندا.(ژوژ)
ژووژک : [ناو] ژیشک؛ ژووژوو؛ ژڤژی؛ ژژۆ؛ ژژوو؛ ژیژوو؛ ژووشک. (جوجه‌تیغی)
ژووڵان : [چاوگە] ژووڵین؛ جووڵان؛ تەکان خواردن؛ جووڵانەوە. (جنبیدن)
ژەقنی‌هەلاهیل : ژەقنەی هەلاهیل؛ ژە-

هری هەلاهیل. (ب) ژەقنـەمـووت. (زهـر-
هلاهل)
ژەمەن : [ناو] بەرەمەشکە. (کرەحاصل‌ازیک
بارمشک‌زدن)
ژەندن : [چاوگە] هەڵپەڕین لەجێوە و چەلە-
پایی بێ جێگۆڕین. (دریک نقطه رقصیدن)+
ژەنگ : [ناو] وەک ژاری‌قلیان؛ جرمی‌قلیـان؛
خڵتەی‌مۆدنە. (جرم‌پیپ‌وقلیان)+
ژەنگار : [ناو] تەمومژی سەرکێـوان؛ تـەم و
دوومان. (مە)+
ژەنگ‌هاوردگ:[نـاو،ت] ژەنـگ لێـدراو؛ ژە-
نگاوی. (زنگ‌زده)
ژەنگیت : [ناو] برۆ؛ ئەبرۆ. (ابرو)
ژەنیـــاگ : [ناو،بــــەر] ژەنــــراو؛ ژەنیـــاو؛
ژنیاگ(مضارع (ژەندن)باهمەمعانی)
ژەنیک : [بەند] تۆسکاڵێ؛ تۆسقاڵێ؛ کەمـێ؛
بەئاستەم و دووبەڵا. (یک‌ذره)
ژەهرکەنگر : [ناو،ت] جـەوی وشـکـبـووی
بنی‌کەنگر؛ بۆڕەوانی بەکەڵکە. (انگم‌کنگر)
ژەهرەبا : [ناو،ت] بای‌سەبـوون؛ بـای‌سـە-
موون؛ گڕەبا؛ بای‌زۆرگەرم کە زەرحات هـە-
ڵدەپرو کێنێ. (بادسام)
ژهی : (ف.مشه)<ژهیکا.
ژهیکا : (ف.مشه) ژهی؛ ژنابەد؛ ژنی‌خراپ و
کردارخراپ. (زن‌بدکاره)
ژهینگی‌وە : [بەند] لەوەبەدووا؛ لەوساوە؛ لـە
ئێستەوە. (ازحالا)
ژیار : [ناو] هەلاج؛ پەڕەکەر. (حلاج)+
ژیارە : [ناو] گوزەران؛ بەڕێچوون؛ پێویسـتی
ژیان. (معیشت)

ژیان : [ناو] شیان؛ هێنان؛ بایـەخـداری؛ دە-
ژی؛ دێنی. (ارزش)+
ژیان‌نامە :[ناو] نووسینی کارەساتی ژیـان و
بـــە ســـەرهـــات و ڕووداو لـــە درێـــژەی
عومردا.(زندگینا مە)
ژێبـــەردان : [چاوگـــە،ت] لێبـــەردان؛ دەس
ژێبەردان؛ بەرەڵاکردن، تەڵاقدان، دەست ژێ
بەردان : دەست لێ بەردان. (طلاق‌دادن)
ژێبەردایی : [ناو،بەر] بـەرەڵـاکراو؛ لـێ تـە-
ڵاقدراو. (طلاق‌دادەشده)
ژی‌درێژ :[ئاوەڵناو] بەسـاڵاچوو؛تەمـەن‌درێـژ؛
عومردرێژ. (مسن؛ عمر دراز)
ژێرئاوی :مەلەکردن‌لـە ژیرئـاودا؛ بـەمـەلـە
ڕۆیشتن لە ژێرئاوەوە؛ (ب) بەدزیەوە و زیرە-
کانە کردنی کارێک. (زیرآبی)
ژێربان : [ناو] میچ. (سقف)
ژێرپاخســـتن :[چاوگـــە،ت] ژێرپـــێ‌خســـتن؛
پامالْکردن ؛ پایەماڵکردن. (پایمال کردن)
ژێرخاکی : لەژێرخاکدا شـاردراوە؛(ب)کـەل-
وپـەلـی کـەونـارا کـە لـە ژێرخـاک دەردە-
هێنرێت.(زیرخاکی)
ژێردەریایی : [ناو] جۆرێک‌کەشـتییە (پـاپۆڕ)
کەدەتوانی لە نێو ئاودا نقـومبێـت و لـە ژێـر
ئاوەوە بڕوات. (زیر در یایی)+
ژێرڕێسمە : [ناو] بەرد یـان کـانزای ناوچـاڵ
کـەپاژنـەی‌درگـا لـەسـەری دەسـووڕێت.
(زیرپاشنه در)
ژێرزین : [ناو] نەرمەزین؛ لبادی ژێر زین کە
پێش‌زینکردن لـەسـەر پشـتی چـارەوا دادە-
نرێت. (نمدزین)

ژێرسەر : ئاگاداری لە پیلان؛ (ب) هۆی(فیت، سووچ، خەتا، تاوان)، ئەوکێشە-گشتی لە ژێرسەر ئەوابوو: ئەوکێشە گشتی فیتی ئەوبوو، بە هۆی پیلانی ئەوەوە بوو . (آگاهی از دسیسه بازی)

ژیرسیغار : [ناو] تەبلەک؛ ژێرجغارە؛ ژێرجگەرە؛ ژێرسگار؛ چێرجگەرە؛ دەفرێک بۆ سووتکەسیگار تێکردن. (زیرسیگار)

ژێرمێزی : [بەند](ب) بەرتیل بەکاربەدەستی پشتمێز نشین‌دان بە پەنامەکی. (زیرمیزی)

ژێرهاڕ : [ناو] بەردی بنەوەی ئاش و دە-ستاڕ. (سنگ‌زیرین‌آسیاب)

ژێستاندن : [چاوگە،ت] ژێئەستاندن؛ لێ-ئەستاندن. (گرفتن‌از)

ژیسێ :[ناو] ناوی تفەنگێکە.(نام‌اسلحە-ایست)

ژیڤانۆ : [ناو] ژیان؛ زینگی؛ زیندەگی. (زندگی)

ژیڤانی : پەژیوانی؛ پەشیمانی؛ پوژمانی؛ پوشمانی. (پشیمانی)

ژیڤای : [ناو] ژیان. (زندگی)

ژیڤنای : [چاوگە،ت] ژیاندن؛ بەخێوکردن. (زندگی‌دادن)

ژێڤەقتاندن : [چاوگە،ت] لێ قەقەتاندن؛ لێجیاکردنەوە؛ لێ قرتاندن. (جداشدن و جدا کردن‌از)

ژێکری : [ناو،بەر] بڕاو؛ لیکراوە. (قطع‌شده)

ژیلا : تەگرە ژیلە؛ تەرزە؛ (تگرگ)

ژیلەمڕ : [ناو] ژیلەمۆ؛ زیلەمۆ؛ پوولووی ژێر خۆلەمێش. (اخگرزیرخاکستر)

ژێمایی : [ناو] لێماوە؛ (ب) لەپاش بەجێماو؛ میرات؛ لێبەجیماو. (ماترک)

ژێن : [پاشگر] کەسێک کە دەژەنی؛ ڕاژێن؛ هەژێن. (پیواژە،تکان‌دهندە)

ژێن : [ناو] لە کرۆمۆزۆمدا هۆکاری ڕاگوێزتنی تایبەتمەندیگەلی ڕەگەزی و ئە-خلاقی و سرو شتییە لەدایک و بابەوە بۆ منداڵ. (ژن)

ژین :ناوی ڕۆژنامەیەکی کوردیکە لە-سلێمانی دەردەچوو. (روزنامەژین)+

ژێن‌دەرمانی : [ناو،ت] چارەسەرکردنی کەم و کووڕیەکانی ڕەگەزی بەدەست تێوردانی کرۆمۆزۆمەکان. (ژن‌درمانی)

ژینگە : [ناو] جێگەیژیان. (جای‌زیستن)

ژین‌وژار : [ناو] ژیانی‌ناخۆش. (زندگی‌تلخ)

ژینیڕاڵ : [ناو] مەقامێکی باڵایە لەعەسکە-ریدا؛ (ژنرال)

ژیوان : [ئاوەڵناو] ژیڤان؛ پەژیوان؛ پەشیمان؛ پاشگەز بوون لەکردنی‌کارێک. (پەشیمان)

ژیوای : [ناو] ژیڤای؛ ژیان. (زندگی)

ژیونای : [چاوگە،ت] ژیڤنای؛ ژیاندن؛ بە-خێوکردن. (زندگی‌دادن)

ژامبۆن : فرد؛ اند؛ فد: [ناو] گۆشتی ڕانی لاشەی سەربڕاو؛ (ب) باسترمەی ڕان. (ژامبون)

ژانر : فرد؛ اند؛ فد: چەشن و چەمکێکی تایبەت لە کاری هونەری و ئەدەبیدا، ئافراندنی کارێکی هونەری یان ئەدەبی کە ناوەڕۆکێکی تایبەتی هەبێت؛ دەستەواژەی سینەمایی و هەواڵنێری سینەماییە. (ژانر)

ژووڕناڵ : فرد؛ اند؛ فد: [ناو] گۆڤارێک کە لە بابەت هونەری کردەوەی دەستییەوە دە-دووێ، وەک وێنەی لیباس و جلدرۆونی باوی ڕۆژ. (ژورناڵ)

ژووژ : لەکۆڕی یاریدا بەتایبەت لەقوماردا قسەڕەوا و حوکم ڕەوا (داوەر) ئاسایە. (ژوژ)

ژێتۆن : فرد؛ اند؛ فد:کوتە کاغەز یان - پلاستیک یان کانزاییێکی مۆرکراو یان نیشان لێدراوە کە لە شوینگەلی گشت گیردا لە سندوقدار یان کە سێکی تایبەت، بەپارە دەکڕدرێت و هەر لەو شوینەدا برەوی‌هەیە و زیاترلە شوێنگەلی وەک قومارخانە و چێشت‌خانە و جندەخانە و (بیستڕۆ) و ئیتردا باوە. (ژتون)

ژێرسازی:(١)ڕێک‌وپێک‌کردنی چینی ژێرە-وەی جادە و هێڵی‌ئاسن و تەپاندنەوەی بۆ — کارکردن لەسەری یان ئیسفاڵت‌کردن. (٢)کاری هەوڵدەست ڕەنگ‌کردنی دیوار یان تابلۆی وێنەکێشی یان هەرشتیێ کە لە پاشان ڕەنگی پێویستی لێبدرێت؛ ڕێکوپێککردنی هەر ڕووپەڕێک بۆ کارکردن لە سەری. (١و٢زیرسازی)

ژێلە : فرد؛ اند؛ فد؛ اسپانیاد: [ناو] لەرزانەک؛ گەردێکە کە لە ناو ئاوی گەرم دەکرێت دووای ساردبوونەوە وەک ئاوی سەروپێی سارده ومبووی مەییوی لێدێ و دەڵەمەیە و شل‌و شەوێقە، ئەگەر لە جیاتی ئاو بکرێتە نێو ئاوی‌میوە دەبێتە ژێلەی خواردەمەنی و بەناوی‌میوەکەیەوە ناودەبرێت. (ژلە)

ژێن : [ناو] لە کرۆمۆزۆمدا هۆکاری ڕاگوێزتنی تایبەتمەندیگەلی ڕەگەزی و ئە-خلاقی و سروشتیە لەدایک و بابەوە بۆ منداڵ. (ژن)

ژین : ناوی ڕۆژنامەییێکی کوردی کە لە سلێمانی دەرچووە. (روزنامەژین)+

ژێنراتۆر : [ناو] دینام؛ موتۆری‌کارەبا؛ کەرە-ستەییێ کە هێزی جووڵێنەر دەکاتە هێزی کارەبا. (ژنراتور)

ژێنێتیک : [ناو] زانستیێ کە لەسەر دیاردە کانی ئیرسی (میراتبەری) و ڕەگەزی دە-کۆڵێتەوە. (ژنتیک)

ژێنێتیکی : [ئاوەڵناو] ئیرسی؛ میراتی؛ ئە-وشتە سروشتیانە کە لە دایک و بابەوە بە منداڵ گەیشتووە؛ (ب) زگماکی؛ وەرنە-گێراوی زاتی. (ژنتیکی)



ساب: [ناو] سابات؛ کەپر؛ چەتر. (سایەبان)
سابات: >ساب.
سابروون: : [ناو] سابرێن؛ نێری؛ تەگە. (شاک؛تکە)
سابری : >سابروون.
سابۆتە : [ناو] پیرەژناکەڤن؛ پیرێژنی‌قاڕی. (زن‌بسیارپیر)
سابود: : [ناو] جۆخینە؛ خەرمانەی‌مانگ. (هالە)
سابیر: ناوە بۆ پیاوان
سابی‌سالار: : [ناو،ت] کاروان‌سالار؛ ڕێبەری کاروان. (کاردان‌سالار)
ساپ‌ساپانی: : [ناو،ت] نانوماست؛ زاپ-فرێدانی لاتیل بۆ سەرئاو کە چەندجار هە-ڵدەبەزیتەوە. (نوعی‌باز)
ساپیت: : [ناو] ساپیتە؛ کاریتە؛ باڵار. (شاەتیر)
ساتار: : [ناو] ساخۆر؛ ڕووتەنی ناولێڕەوار و جەنگەڵ. (زمین‌بی‌درخت‌درمیان‌جنگل)
ساتای: سایەی؛ لەساتای‌تۆدا؛ لەژێرسایەی تۆدا. (سایە؛کرم)
ساتن: [چاوگە] کوتان؛ لێدان. (کتک‌زدن)
سات‌وسەودا: : [ناو،ت] سەودا و موعامەلە؛ کڕین و فرۆشتن. (معاملە)
ساتوور: [ناو] ساتۆر؛ کاردێکی زۆرپان بۆ شە-قەکردنی‌لاشە لە قەساییدا. (ساتور)
ساتێر : [ناو] گاڵتە و شۆخی ؛ تەنز؛ جەفەنگ. (تنز)
ساجی‌عەلی: وشەیێک بۆ نەداری و موفلیس‌بوون؛ کەوتوەتە سەرساجی‌عەلی : واتا هیچی بە دە ست نەماوە. (ساج‌علی)
ساچان: پشووودان؛ حەسانەوە. (خستگی-درکردن)+
ساچلخ: [ناو] ساچ بە توورکی واتا ئەگریجە و زولف، (لخ)یش هەرتوورکییە واتا شتی ئە-گریجەبەند؛ زیوەری‌زولف. (زیورزلف)
ساچمە: [ناو] بەردی‌سەنگ‌فەڕش؛ بانوان. (سنگ‌سنگ‌فرش)+
ساچمەڕێژی: [چاوگە،ت] بەردڕێژی؛ سەنگ-فەڕش‌کردن؛ بانواندن. (سنگ‌فرش‌کردن)
ساچێنە : [ناو،ب‌ک] سارێژکەر؛ دەرمانکەر؛ خوەشەوکەر. (مداواکنندە)
ساحێب: ناوی‌گوندێکە لە ڕۆژهەڵاتی‌سەقز. (صاحب)+
ساحێبی: [ناو] ساحێوی؛ جۆرێک‌تری. (نوعی‌انگور)
ساحێو: ساحێب؛گوندێکە لە ڕۆژهەڵاتی شاری‌سەقز (قریەای‌نزدیک‌سقز)
ساحێومالْ : [ناو،ت] خاوەن‌مالْ؛(ب)خانە خویْ. (صاحب‌خانە؛ میزبان)
ساخ : [ئاوەڵناو] (ب)دەست‌لێنەدراو؛ شەقڵ-نەشکاو. (دست‌نخوردە)+
ساخی‌پارێزنای: ساخی‌پاراستن؛ تەندروستی

ڕاگرتن. (رعایت‌تندرستی‌کردن)
ساد: [ناو] پارچە؛ تیکە؛ کوت؛ لەت. (تکە)
سادر: [ناو] تەورداس. (تبر داس‌مانند؛ نوعی-تبرزین)
سادۆڵ: [ناو] دۆڵیانێ لە چیمەنتۆ کە سەری ئاواڵەبێت. (ناوآسیاب)
سادیل: [ناو] چووزەنەمام؛ چووزەخەڵف. (ترکەجوان‌درخت)
ساراکردنەوە: [چاوگە،ت] جێگای ناڕێک و پڕ کۆسپ‌وکەندالێ ڕێک‌کردن. (صاف‌کردن-زمین)
سارالێ: ناوی‌کێوێکە لە هورامان. (کوەساران)
سارامی: پەز لە کاتی‌تێریدا؛ پەزی‌تێربوو. (گوسفندسیرشدە)
ساردەسێر: [ئاوەڵناو+ ناو]کوێستان؛ ناوچەیێ کە هەوای‌ساردبێت. (سردسیر)
ساردەکێڵ : [ناو،ت] تووەشاندنی درەنگ وەخت لە پاییزدا. (تخم‌پاشی‌آخرپاییز)
ساردی‌کردن : نەخۆشی بە هۆی‌خواردنی خۆراکی(سروشت‌سردەوە). زۆرخۆراک بە سروشت سارد دە ناسرێن و بە خواردنیان مرۆڤ‌ساردی‌دەکات و نەخۆش‌دەکەوێت. (سردی‌کردن)
ساردین : فرد.فد.اند. [ناو] جۆرێک ماسی وردیلە؛ (ب) کونسێرو (قوتووی پڕ لە ماسیی ساردین کە ئامادەکراوە بۆ خواردن). (ساردین)
سارۆبیرە: ناوی‌قارەمانێکی بانەییە لە شەڕی چاڵدوڕاندا بەشداربووە و بەدەستی سوپای-تورک کوژراوە. ساروبیرە)

ساڕوج: [ناو] تێکەڵاوێکە لە قسڵ و خۆڵە-مێش بۆ سوواخدانی حەروز بەکاردەهێنرا پێش‌ئەوەی چیمەنتۆ پاوێر ببێت.(ساروج)
سارۆخ: ناوی چۆمێکە لە کوردستانی ڕۆژهە-ڵات. (نام‌رودخانەایست)+
سارۆخ : مووشەک چەکی شەڕ. (موشک)
سارۆقامیش: گوندێکە نزیکی بۆکان زێدی دوو زانا و بلیمەتی کورد، برایم‌خانی‌سەلاح و حەسەن‌خان سەلاح سۆران. (ساری‌قاموش)
سارەبان : [ناو،] سارەوان؛ وشترەوان؛ شوانێ حێشتران. (شتربان)
ساری: [ناو] تەزیاتی؛ سڤکی؛ ساردی. (سردی)
ساری: [ناو] جۆری قوماشی تەنکە ژنانی هێند لە خۆیانی دەپێچن. (ساری)
ساری: [ناو] ساردی؛ سەردی؛ (ب) بیێ-خولکی؛ لاڵووتی. (سردی)
ساریچ : <ساڕووچ.
سارێژەکردن: [چاوگە،ت] دڵنەوایی‌کردن؛ ئاشت‌کردنەوە. (آشتی‌کردن)+
ساز: [ناو] ناوی هەموو ئامێرەکانی مۆسیقایە بەڵام بەتایبەت بۆ تار بەکاردەبرێ. (ساز)+
سازاخ: [ناو] تۆفی‌سارد؛ با و بۆران پێکەوە. (بوران)
سازبەندی: [ناو،ت] کاری سازبەند؛ هەڵبژاردن و دابەشکردنی سازەکان لە ئورکێستردا. (تنظیم‌کنندە ارکستر)
سازگ: [ناو] تەڕەساز؛ ترشیاتێک کە شەلە-میشی تێدابێت. (ترشی‌باشلغم)
سازگاری: [ناو] (١)ڕەوتی‌هەڵکردن و پێک-

هاتن لەگەڵ خەڵک؛ (٢) پێکەوتن؛ ئەو دە-رمانەم پێناکەوێت سازگارنییە؛ (٣) پێک-هاتن؛ نەبوونی کێشە و دژایەتی؛ ڕەوتی سازشت؛ سازیاری؛ سازیان. (سازگاری)

سازوباز : [ئاوەڵناو] حازر و ئامادە. (حاضر وآماده)

سازیان: [چاوگە،ت] سازشتکردن. (سازش-کردن)

ساس: غەریبسنجان؛ جووجە؛ تەختەپیتی؛ واتا(ئەسپێی تەختە) لە تورکییەوە وەرگیراوە؛ جووڵەوەرێکی پانکیلەی چکۆلەتر لە گەنەیە و لە ڕۆیشتندا گورجە، ڕەنگی قاوەییسوورە و شەوڕاوە لە ڕۆشنایی بێزارە و خوێنمژێکی زۆر بە خوورووە ، پانکەیشی پێدەڵێن، و خوێنەکەی بۆگەنە. (ساس)

ساسی: [ناو] گەدایی؛ سووالکەری؛ دەرویشی. (گدایی)

سافۆ: [ناو]کلیلەبەفر؛ ڕنوو. (بهمن)

ساقە : [ناو] (١) سیاقە؛ سەدەقە؛ بەساقەوبم؛ بەسەدەقەتبم؛ (ب) بەڵا گەردان.(١و٢صدقه)

ساقە : [ناو] ساغە؛ نەشکاوە؛ ساخە. (سالم است)

ساقەت : [ناو] لاسکیڕووەک؛ لاسق؛لاسک. (ساقه)

ساقی :[ناو] (١) ساغی؛ ساخی؛ (سالمی) ؛ (٢) مەی گێڕ. (ساقی)

ساقی: وشەیێکی بیانییە بەڵام زۆربەی شاعیرانیکورد؛ باسیانکردوە بە واتای مە-یگێڕە. (ساقی)

ساک: [ناو] جانتە؛ کیفیلیباس و شتوومەک-تێنان؛ جانتا. (ساک)+

ساکار: [ئاوەڵناو] سادە؛ بێنەقش و نگار؛ یە-کڕەنگ؛ بێڕیا. (ساده)

ساکان: [چاوگە] حەپەسان؛ تاسان؛ کاس-بوون. (گیج‌شدن)

ساکسیفۆن: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] ئامێرێکی-مۆسیقایە بەفوو لێدەدرێ. (ساکسیفون)

ساکەدەشت: [ناو،ت] دەشتیپان و ساف و بەرین. (صحرای‌برهوت)

ساکەگۆڕ: >ساکەدەشت.

ساگات : [ناو] ساکات؛ سێبەر. (سایه)

ساگەوان : [ناو] بەرازیمێ؛ مالۆس. (خوک-ماده)

سالاد: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] زەلاتە؛ سەلاتە؛ ساڵات. (سالاد)

سالار: (١)لەقەمی سالاریناسر(مستەفابەگی موکری ڕەچەڵەکی بەرەبابی ناهیدەکانی ئێلی فەیزوڵابەگی.(٢) لە قەمیئەحمەدخانیفاڕوقی برازای سالاریناسر، کە ساڵی١٣٢٥هە، لە-گەڵ دووبرا و ٥ ئامۆزای شەهیدکران.(٣) لە-قەمیسالاری ئالبلاغ نیگارکێشێکی بە-ناوبانگ.(سالار)+

ساڵانە: [ئاوەڵناو+ بەند] هەمووساڵێک؛ لە-ساڵدا؛ ساڵەهات. (سالانه)

سالبڕ: [ئاوەڵناو] ساڵیانە؛ کرێگرتەی بەبڕ بۆ ساڵێک. (یکساله)+

ساڵبوێر: [بەند] ساڵینەساڵێ. (سال‌درمیان)

سالح : ناوە بۆپیاوان؛ ساڵە. (صالح)

ساڵدات: [ناو] پلەیێکیعەسکەری بوو لە ڕووسیا. (سالدات)

سالّنامه: [ناو] بەسەرهاتی ساڵانە؛ گۆڤاریٚ کە ساڵیجاریٚ دەردەچیٚ. (سالنامه)+
ساڵووس: [ئاوەڵناو] (ف.گیو) ڕیاکار؛ چاپلووس؛ درۆتاش. (سالوس)
ساڵوەگەڕ : [ناو] ساڵەهات. (سالگرد)
ساڵەوساڵ: [بەند] ساڵیجاریٚک؛ ئەمساڵبۆئە-وساڵ. (سالبەسال)
ساڵیئامیٚ: ساڵیداهاتوو؛ ساڵیٚک کە دیٚت. (سالآینده)
ساڵیبەدوانزەمانگ : (ب) لەتەواویساڵدا؛ هەمیشە و داییم. (مدام)
ساڵیخویٚندن: ماوەییٚک کە قوتابیان وانەییٚک تەواو دەکەن بەرانبەر بە٩مانگە و سیٚ-مانگیش پشوویهاوینییە. لە ئیٚراندا لە ئەوەڵی ڕەزبەرەوە دستپیٚدکات هەتا ئاخری - پووشپەڕ. (سال تحصیلی)
ساڵیداهاتوو: ساڵیٚکیتر؛ ئەو ساڵە کە دیٚت. (سالآینده)
ساڵیڕابووردوو : پار؛ پارەکە. (پارسال)
ساڵیزاییٚنی: بەقەرا ساڵیهەتاویە بەڵام سەرەتای دەکەویٚتە١١ی بەفرانبار. (سال-میلادی)
ساڵیمالیٚ: ١٢مانگە بەڵام سەرەتاکەی بە پیٚیباروددۆخ دیاریدەکریٚ و سیٚمانگیش ماوە دادە نریٚت بۆ سەرڕاست کردنی لیست و (بیلانی) خەرج. (سالیمالی)
ساڵیمەلاخەلیل: ساڵی١٣٠٧ڕاپەڕینی مەلا خەلیل کە بووەتە ساڵیمیٚژوویی لەناوچەی موکوریان. (سالملاخلیل)
ساڵیمیٚژوویی: ڕووداویٚک کە لە ساڵیٚکدا قە-وماوە و بەناوی ئەو ڕووداوە ناوی لیٚدەبەن. (سالتاریخی)
سالیۆن : [ناو] گیایکاشەمە؛ کەرەوزی کیٚوی؛ بۆ ئیٚشی جومگە باشە. (کرفسکوهی)
+ سام : (١)باپیری ڕۆستەم(پدربزرگ رستم)
(٢) باییٚکی زۆرگەرمە لە گەرمیٚنەوە دیٚت. (بادیست بسیار گرم)
سامالٚ: ساف؛ بیٚگریٚ؛ لووس؛ سایەقە؛ عاسمانیساف؛ ئاسمانیبیٚهەور. (صاف)
ساماڵسا : ویٚرانکردن و جیٚگەی ویٚرانەکە سافکردن. (باخاکیکسانکردن)
ساماڵسا : هەموو؛ گشت؛ ساماڵساتالانکردن: هیچ بۆ نەهیٚشتنەوە. (بکلی)
سامان : [ناو] خۆیانیکۆوەکراوی گەنم و جۆ. (خرمنجمعشدهگندموجو)+
سامان : ناوە بۆپیاوان. (سامان)+
سامڕەند: ناوە بۆپیاوان. (نامردانه)
سامڕیٚژ : >قاڵاوگیر.
سامڵیٚنیشتن: [چاوگە،ت] خۆف لیٚ پە-یدابوون؛ هەستکردن بەترس. (احساس-ترسکردن)
سامۆتک: [ناو] سامۆتە؛ سامۆرتە؛ بەندی پاشتەرک. (فتراک)+
سانتیمتر: فرد؛ فد؛ اند: [ناو] سانتین؛ یەک لە سەدی میتریٚک. (سانتیمتر)
سانتین: سانتیم؛ یەک لە سەدا؛ سامتین. (سانتیم)
ساندە: [ناو] گویسووانە. (لبەبام)
سانگۆ: [ناو] کویٚلکینیٚری دووساڵە. (گوساله-نردوساله)

سانەوە: [چاوگە،ت] پشوودان؛ بێهن‌وەدان؛ حەسانەوە؛ وچان‌گرتن. (خستگی‌درکردن)
سانیلکە:[ئـاوەڵنـاو] ئاسـانۆکە؛ ئاسـان؛ سـانا. (آسان)
سـانیلۆکە: [ئـاوەڵنـاو] سـانیلۆک؛ سـانیلە؛ سانیلکە؛ ئاسان؛ ئاسانۆک؛ سانا. (آسان)
ساواخی : [ناو] ساوایی؛ منـداڵی؛ کۆرپـەیـی. (نوزادی؛ بچگی)
ساواژ: ساواز؛ سەوازە؛ ترس‌ڕەوینـەوە. (بـی-ترس)
ساوەلەوان: [ناو،ت] بەرغـەلـەوان؛ کـارەوان. (شبان‌بره)
ساهیک: [ناو] کێویلە؛ تەپاڵە. (تاپاله)
سایراو: [ناو،بـەر] سـاوراو؛ سـوواو؛ سـاویاگ. (سابیده‌شده)
سایلێ: [ناو] سایلە؛ سایڵە؛ جۆرێک‌هەڵـوای-کەم یان بێ‌شـیرینی. (کـاچی؛ حلـوای بـی-شیرینی)
سایەوشـک: [ئـاوەڵنـاو] سـایەهیشـک؛ (ب) چکووس؛ ڕژد. (خسیس)
سایین: [چاوگە،] سـاوین؛ سـوون. (سـائیدن)
سباندە : [ناو] سوانە؛ گوێی‌بـان؛ قـەراخ‌بـان؛ پاسارە؛ گوێسوانە. (کناربام)
سبحان :ناوی گۆلێکی مەزنە لە ناوچەی وان لە تورکیا. (نام‌دریاچه‌ایست)
سپوور : [] گسک لێدەری کۆڵان و شـەقـام؛ زبلڕێژ؛ لە(سپوورگە)ی تورکییەوە هاتووەتە نێـو فارسـی و کـوردی، بـە واتـای گسـک. (سپور)
سپوون: [ناو] سپۆن؛ بنەگیایێکە وشکی دە

کەنەوە لەئاودا کـەفـدەکـات وەک سـابوون جلکی پێ دەشۆن. (اشنان)
سپیایی : چەرمگی. (ب) ماست و شـیر و دۆ. (کنایی‌لبنیات)
سپیتەڵۆک : داری‌بەپاوە وشک‌بـوو. (درخـت درجاخشک‌شده)
سپی‌چەرۆک :[ئاوەڵناو] سپیچەلۆک؛ ڕەنگی دەموچاوێک کە مەیلە و زەردبێت. (زردرنگ)
سپیکاچاڤێ : [ناو] سپێنەی‌چاو. (سفیده‌چشم)
سپی‌کردنەوە :[چاوگە،ت] (١) پـاک‌کـردن و پێست‌لێکردنەوەی میـوە؛ (٢) کـەوڵکـردن و پیستی لاشەی حەیوان یان سەروپێ گرتنە-وە؛ (١و٢پوست‌گرفتن) ؛ (٣) دەفری مس بـە قاڵایی سپی کردنـەوە؛ (سـفیدکردن ظـرف-مسی)
ستارخانی : [ناو] جۆرێک فیشەکـدان و قـە-تارەی فیشەک بووە. (نوعی‌فانوسقه)+
ستماندن : (١) غەدر و ستەم‌کردن. ؛ (ظلـم-کردن) ؛ (٢) تێکدان؛ ڕووخانـدن و هـەڵـوە-شاندن. (شکافتن؛ خراب‌کردن)
سـتەمدیتـی: [ناو،بـەر] (ب)زوڵـم لێکـراو. (ستمدیده)
ستیڤلۆک : [ناو] جرجەکوێرە؛ مشـکەکـوێرە. (موش‌کور)
ستیکان: [ناو] وشەیێکی ڕووسیە؛ ئیستیکان. (استکان)
ستێڵ : [ناو] ئەستێڵ؛ ئەستێر. (استخر)
سـڤالە: [نـاو] سـواڵە؛ دەسـتەیێـک دەغڵـی دروێنەکراو. (یکدسته‌گندم‌یاجودروشده)
سڤۆک :[ناو] سماق؛ داری‌سماق و بەرەکەی.

(سماق)
سجاف‌تەنگ : [ئاوەڵناو] دەستکورت؛ دەست تەنگ؛ فەقیر؛ نەدار؛ بێ‌ئەنوا. (بینوا)
سچ : [ناو] مچ؛ جۆرێک مچی پان و چووکە. (نوعی کنه کوچک)
سخان : [ناو] ئیسقان؛ ئیسک. (استخوان)
سخوڵمە: سیخورمە؛ بەمست تێکوتان. (سلقلمە)
سڕاندنەوە :[چاوگە،ت] سڕین؛ پاک‌کردنەوە؛ دەست یان پەڕۆ پێداهێنان. (پاک‌کردن)
سرپ : [ناو] سورب؛ قورقوشم؛ کانزاییێکی نەرم و قورس و سپیە. (سرب)
سڕکردن: [چاوگە،ت] بێ‌هەست‌کردن بە دەرمانی سڕکەر زیاتر لە نەخۆشخانە و ددان-پزیشکی، بۆ(کاردۆژە) نەشتە رکاری.(بی-حس‌کردن)
سرکەیی : [ئاوەلناو] هەر شت دروستکراو لە سرک؛ دەستماڵی سرکەیی: دەستماڵی-سرک؛ هەوری. (لباس‌از نوعی پارچە بنام سرک)
سڕۆک : [ئاوەڵناو] سەرمابردوو؛(ب)کە سێ-کە بەسەرما قەڵسە. (سرمایی)
سرەدڕە :[ئاوەڵناو] گێژ و حۆل؛ بێ‌ئاوەز .(بی شعور)
سرمۆک : [ئاوەڵناو] بێ‌ناوەڕۆک؛ پووچەڵ؛ بێ‌ناوکە. (بی‌مغز)
سریاس: هەوارگەیەکە لە نزیکی پاوە لە هە-ورامان . (اسم‌منطقەای‌دراورامان)
سرێشم : [ناو] هێلم. جۆرێک چەسپی‌دارە لە خوێن و ماسی دروست دەکرێ. (سریشم)
سزگاو : [ناو] ئاوێک کە لە کاتی پەنیر دروستکردندا دەمێنێتەوە؛ دۆی گەرم و کوڵاتوو. (آب‌پنیر)
سزیان: [چاوگە،ت] سۆچای؛ سووتان؛ کوڵان؛ جۆش‌هاتنی‌تراو. (سوختن؛ جوشیدن)
سژین : هاوکات ژان‌کردن و خورانی برین. (خارش‌ضمن‌درد زخم)
سفح: [ناو+ بەند] سبح؛ سبەینێ؛ بەیان؛ بە-یانی. (صبح؛ فردا)
سفحا: [ناو+ بەند] سبحا؛ سبەینێ؛ شەوەکی؛ سەیزوو؛ سۆزی؛ بەیانی. (فردا)
سفرنە : [ناو] لێواری سەربان یان دیوار کە لە پێشەوەترە بۆ ئەوە باران دیوار نە شواتەوە. (برآمدگی‌لب‌بام)
سفوورە: [ئاوەڵناو] ژنی تەڕپۆشی زۆر خۆدانە-پۆشەر؛ زیاتر لە ئوروپا کە (دێکۆڵتە)دەپۆشن و شان و ملیان ڕووتە. (زن‌شیک‌پوش‌کەگر-دن وشانەاش‌پەیداست؛ دیکولتەپوش)
سکەڕۆ : [ئاوەڵناو] زکەڕۆ؛ نەوسن؛ چڵێس؛ داییمە لە بیری خواردن‌دا. (شکم‌پرست)
سگووم : [ئاوەڵناو] نەگونجاو؛ بەدئەخلاق. (بد اخلاق)
سلت‌وسۆبا: [ناو،ت] سەڵت و ڕەبەن؛ تەنیا و بیماڵ. (مجردبی مال ومنال)
سلۆرت: (ف.مشە) بێکار. (بیکار)
سلۆرە: [ناو] کاشیبەن؛ کاشیبەند. (ماهیچە-بستن‌مقعد)
سلۆک : [ئاوەڵناو] سڵۆک؛ سرک؛ سڵکەر؛ ڕەمووک؛ ڕمۆک. (رم‌کنندە)
سلەزەوە : [ناو] قنچکەسڵاو؛ باپشکێو؛

چینچکەسڵاو؛ سیتکەسڵاو. (گل‌مژده)
سڵەمنـای: [چاوگـە،ت] سـڵەمانـدن؛ داچڵـە کاندنی حەیوان‌گەل. (شکەکردن)
سڵەوەچە : [نـاو] نـەخۆشـینێکی ئاژاڵـە کـە ناتوانێ خۆراک قووت‌بدا. (مرض‌حیوانات)
سلیک : [ناو] چقل؛ درک؛ درِوو. (خار)
سڵێمانکەندی: گوندێکە سەر بە شاری‌سەقـز بەشی فەیزوڵابەگی کـە بـۆ هـەوەڵـین جـار رۆشنبیری بە ناوبانگ ئیفتیخار(عەبدوڵاخانی-ناهید)لە سالی(١٢٩٨هە)دا تاری‌شیرازی‌هێنـا کوردستان و لەوگوندە داینا، زێدی ئوستادی نیگارکێشی و مۆسیقا (فەیزو ڵڵا خـانی‌ناهیـد) (سلیمانکندی)
سڵێن: ناوی‌گوندێکە لە هەورامان. (سلین)
سمایلۆک : [ناو] پیرخەنیلە؛ برِوێشین. (آش-بلغور)
سمپووتی : [ناو] سمکۆڵ؛ سم‌کوتان و بەسم عەرز رووشاندن. (سم‌برزمین‌ساییدن)
سمتەر : [ناو،بک] (لەچاوگەی سمین)کـون-کەر؛ هەڵکۆڵ.(سوراخ کننده)
سمنت : [ناو] سمینت؛ چیمەنتۆ. (سیمان)
سمە : پاشگر بەواتای کونکەر : (کەندەسـمە. دارەسمە). (پسوند)
سمەکرِێ: [ناو،ت] سمەکوتێ‌؛سمکۆڵ. (سم-برزمین‌کشین‌وکوبیدن)
سمێڵ‌قیت : [ناو،ت] سمێڵ‌قنج؛ (ب)مرۆڤـی قیت‌وقۆز و شایی بە خۆ. (سـبیل‌روبـە بـالا و ازخودراضی)
سناریۆنووس : [ناو،ت] فیلمنامەنووس. (سنار یونویس)
سنتۆر: ناوی داعباییێکی ئەفسانەییە کە گۆیـا نیوەی لای ژووروو لەشی ئینسـان بـووە و نیوەی تری ئەسب بووە. (نام‌جانوری‌افسـانه-ای؛سنتور)
سنجاو : سەنجاب؛ سمۆرە. (سنجاب)
سنچیە :[ناو] رەوشت؛ خوو؛ئەخلاق.(اخلاق)
سندم: [ناو] گرێ؛ بەست؛ قوفڵەگرێ؛ گرێ-پووچکە. (گره؛ بست)
سندوقدار : [ناو،ت] سندوقدار؛ دەخڵدار؛ بـەر-پرسی پارەی رێکخراوێک؛ کەسێک کـە لـە فرۆشگاییێک پارەی‌شتی فرۆشراو لە کرِیاران دەستێنێت. (صندوقدار)
سندووقی‌پۆستی : [نـاو،ت] سـندووقێکە لـە جیاتی ئادریس (ناونیشان) ژمارەییێکی تایبـە-تـی هـەیـە بـۆ نامـەی پۆسـتی کـە دێـت. (صندوق‌پستی)
سنگۆ : [ناو] رمب؛ نێزە. (نیزه)
سنگ و بـەرۆک: [نـاو،ت] بـەریـەخـە؛ بـەر سینگ؛ سینگ و مەمک. (جلوسینه)
سنگەبەر: [ناو،ت] بەردی خـۆرِس؛ بـەردی-خۆرِست؛ بەردی‌چەقـاو لـەعـەرزدا. (سـنگ-تانیمەدرزمین‌فرورفته محکم)
سنووربەرِانـدن : [چاوگـە،ت] لـە ئـەنـدازە دەرچوون؛ (ب)کاری بێشـەرمـی و نائاسـایی کردن. (ازحدگذشتن)
سنووردار: [نـاو] (١) بـەرپرسـی سـەرحـەد و سنوور. (مرزدار). (٢)هەر شت کە کەوشەنـی دیاری‌کرابێت. (دارای مرز)
سنووورداشـی : [ئـاوەڵنـاو+ نـاو] هـەڤسـێ: هاوسـێ؛ جینـار؛ جیـران؛ هـەمسـا. هاوسـا؛

دراوسیٚ؛ ئەم وشە ڕەگێکی تورکیی پێوە- دیارە. (همسایه)
سنووق‌ئاواز : [ناو،ت] گرامافۆن؛ گەڕەما- فوون. (گرمافون)
سۆ: پاشگرێکە لە زاراوەیٚ قەدیمی سەقزی و هەندیٚ زاراوەی‌تردا جیٚگای(تۆ) و (تەوە)ی دەگرتەوە وەک: خواردگیەسۆ، بردگیەسۆ، واتا خواردگیەسەو، بردگیەسەو. (خواددوویە تۆ، (خواردوویەتەوە)دۆزراوە سۆ (دۆزراوەتەوە)کە نیشانەی بکەر و بەرکارە. (پسوند)
سۆبەری : [ناو] مەلەوانی؛ مەلەکردن. (شناگری)
سوحوف : کتێبی ئیبراهیمی‌خەلیل. (کتاب- ابراهیم‌خلیل‌الله)
سوخان[ناو]: (۱)ئێسقان؛ ئێسک. (استخوان) (۲) زووخال. ڕەژی. (زغال)
سوخلٚ: [ناو] سوخالٚ؛ زووخالٚ؛ ڕەژی؛ ڕەژوو؛ کۆمر. (ذغال)
سوخورمە: [ناو] سیخورمە. (سقلمه)
سۆدا : [ناو] سەودا؛ تراوییٚکی گازداری بیٚڕە- نگە تێکەلٚی خواردنەوە دەکرێت. (سودا)
سۆدرە : [ئاوەلٚناو] سەیروسەمەڕە. (عجیب- وغریب)
سۆراقک : [ناو] سوورەقانک. (نوعی‌مرغ- دریایی)
سوراوسپیاو : [ناو،ت] سووراو و سپیاو؛ دوومـاکی ئاڕایشتی دەموچاو. (سرخاب- سفیدآب)
سۆراهی : [ناو] سووری؛ سورێتی. (سرخی)
سۆربۆن :ناوی زانستگای بەناوبانگی فەڕە- نسییە. (دانشگاەسوربن)
سۆرژە : [ناو] سوورێژە؛ سوورێجە؛ سوورکە؛ سۆرکە؛ سووهرک. (سرخجه)
سۆریشک : [ناو] قورقوراچکە؛ سوورینچک؛ سووهریچک؛ سوورێچکە؛ سوورانچک. (سرخنای)
سۆک : [ئاوەلٚناو] هەرزە؛ بیٚقابلیەت؛ بیٚ- قابیلەت؛ سووک؛ سووکوچرووک. (هرزه)+
سۆل : فرد.فد؛ [ناو] پێنجەمین نۆتی مۆسیقا. (سل)
سۆلاهەسپی : [ناو،ت] نالٚ؛ نالٚی ئەسب. (نعل‌اسب)
سۆلسۆ : [ناو] دووپشکی‌ساوا؛ بێچوە- دووپشک. (بچەکژرم)
سۆلۆ : فرد.ایتا.فد.اند. [ناو] کۆژی مۆسیقایە. تاکەژەنی؛ مێلۆدییٚک بە تەنیا کەرەستەییٚکی مۆسیقاژەندن یان ئاوازێک کە گۆرانیبێژێک بە تەنیا لە ئوپێرادا دەیلێت. (سولو.سلو)
سۆلٚەدار : [ناو،ت] شویتەدار؛ داری گەز. (درخت‌گز)
سۆلٚی : [ناو] سوێری. (شوری)
سونبولٚەتیف :[ناو] گولٚەخەو؛گیاییٚکە بۆ کەم- خەوی و لەش‌داگیران باشە و دژی ژاری خوێنە. (علف‌گربه. سنبل‌الطیب)
سۆند : فد.فرد.اند. [ناو] ئامرازی هەراوکردنە- وەی دەراوییٚکی لەش بەتایبەت بۆ چارەی میزگیران. (سوند)
سۆندە: [ناو] سۆند؛ لوولەی‌پلاستیکی؛ بۆڕی- پلاستیکی باریک. (لولەپلاستیکی)
سۆندەر : [ناو] سوواندەر؛ چەوندەر؛ چۆندەر.

(چغدر)
سونقوڕ: شارێکی نزیک کرماشانە. (سنقر)
سووا : [ناو] لە سنە بە وەستادەڵێن؛ (سوواکار: وەستاکار) ؛ وەستا. (استاد)
سووارۆ : ناوی بەیتێکە لە مۆسیقای کوردیدا. (آهنگی‌درموسیقی‌کردی)
سووارۆ : ناوی بەیتێکە لە مۆسیقای کوردیدا. (آهنگی‌درموسیقی‌کردی)
سوواعبەت : لە (سوحبەت)ی ئارەوییەوە هاتوە و کوردێنراوە بە واتای شۆخی و جەفەنگ و گاڵتەیە . (شوخی)
سووای‌ساڵحان : [ناو،ت] سبحی‌زوو؛ بەرەبەیان. (صبح‌صادق)
سووپڕانۆ : [ناو] دەستەواژەی مۆسیقاییە؛ دەنگی بەرز و زیل لە کۆڕی ئاوازدا. (سوپرانو)
سووت : (١)پاشکر بەواتای سووتاو. تاوەسووت. (پسوند). (٢)ڕیبا. (ربا). (٣)قازانج، سوود، موفا. (سود)
سووتاو : نازناوی شاعیری بە توانای مەهاباـ دی ڕەسووڵی‌کەریمی.(تخلص‌رسول‌کریمی شاعرمهابادی )
سووتفە : [ئاوەڵناو] هەڵکەوت. (تصادفی)
سووتکە : [ناو] (١)سوونکە؛ بنیسک؛ سوولکە؛ (سووتکەسابوون: سوولکەسابوون) ؛ (٢)بنە جگەری‌کێشراو. (تە سیگار). (تەماندـ صابون‌وکشک‌ساییده‌شده)
سووچەک : [ناو] سووتوو؛ سووتک. (خاکسترسیگاروکاغذ)
سوور : [ناو] لە کایەی پاسووردا؛ بەبێ‌سەرباز پەڕی خاڵ لەعەرزدا نەهێشتنەوە. (سور)
سووراوی لێو : ماتیک. (ماتیک)
سووربۆز : [ئاوەڵناو] ڕەنگی بۆز کە بە سوورایيدا بنوێنێ. (رنگ‌کبودتیره‌مایل‌به‌قرمز
سوورپێستاڵ :سوورپێست؛ ڕەگەزێک لە چووار ڕەگەزی مرۆڤی سەرگۆی زەوی لەـ ڕوانگەی ڕەنگی پێستەوە .(سرخپوست)
سوورسوور : [ئاوەڵناو] (ب) ئاشکرا؛ سوورسوور دەزانم کاری ئەوە؛ بەئاشکرا دەـ زانم کاری‌ئەوە. (آشکارا)
سووڕمان : [چاوگە،ت] حەیران‌بوون؛ حەپەـ سان؛ واق‌وڕمان. (حیران‌شدن)
سوورمە : سوورم؛(سوورمە) نیوەبۆ ژنان. (نام‌ـ زنانه‌است)+
سوورمەڕێژ : چاوڕشتن بە سوورمە. (سرمه‌ـ کشیدن‌چشم)
سوورنجێ: [ناو] سوورێژە؛ سوورێجە. (سرخچه)
سووروسەپان : ژنی جوان و جەحێڵ. (کنایه، زن‌جوان‌وزیبا)
سوورەبا : [ناو] بای‌سوور؛ نەخۆشینێکی گیروداره. (نوعی‌مرض‌واگیردار)
سوورەپیاز : [ناو،ت] پیازی سەلک سوور کە لە هەماردا درەنگتر خراپ دەبێت. (پیازقرمز)
سوورەتفی : [ناو،ت] سوورەتوو؛ شاتوو؛ گاتوو. (شاه‌توت)
سوورەڕێوی : [ناو،ت] جۆرێک ڕێوییە کە سەرپشت و لاکەلەکەی مەیلە و (سوورزەـ ردە). (روباه‌قرمز)
سووری‌کاڵ : سووری ئاچخ. (سرخ‌کمرنگ)
سووری‌هاوین : [ناو،ت] (ب)هەڕەتی گەـ

رمای هاوین. (درگرمای‌تابستان؛ چله‌تابستان)
سووزیای: [چاوگـه+ ڕابـوردووی سـووزیان]
سـووتان؛ سـووتای؛ سـووزیان. (سـوختن؛ سوختی)
سووک : [بەند] هێـواش؛ سـووک قسـەبکـە بابت خـەوتـووە: هێـواش و نـزم قسـەبکـە. (یواش)+
سوولک : ناوی گوندێکە لە ڕوژ ئاوای شاری ورمێ کە تافگەیێکی بەرزی لێیە. (اسم‌دهی-است)
سووڵی‌کـەبـاب : [نـاو،ت] بـۆی هـەیـە لـە تورکییەوە هاتبێت سووڵی واتا : ئـاودار؛ کـە-بابی ئاودار واتا زۆر ئـاوەکـەی نـە چنرابێـت یان زۆر نە برژابێت. (کباب‌آبدار)
سوونبول : [ناو] سونبوڵ؛ سوومبوڵ؛ جۆرێک گوڵێ بۆن خۆشە. (سنبل)
سـوونگەر : [نـاو] وشـەیێکـی یۆنانییـە ئـارە وکـاری بـووە و هـاتووەتـە نێـو فـارس و کوردیش؛ ماکێکی دروستکراوی نەرمی کفە-ڵە وەک ناوی قالۆرەی گوڵە بە ڕۆژە؛ کـەبـۆ دوشەک و ژێر سەندڵی سەیارە بەکاردەبـرێ. (اسفنج)
سوەیل : [ناو] ئالف‌پـێچ: گیاییێکـە لـە لاولاو دەکا و پاڵاوتەی کولێنـدراوی گـەڵاکـەی بـۆ چارەی فێداری بەکەڵکە. (سس. افتیمون)
سوێ: غەش؛ لەسەرخۆچوون؛ غەش‌کـردن. (غش‌کردن)+
سوێن: [ناو] گۆگرد؛ لەزەمانی موغەکانی زە-ڕدەشت‌دا کەسێک کارێکی خراپی بکردابێت سـوێناویان پێـدەخـوارد (دەرخـوارد یـان‌دە-
دا)سـوێن‌ئـاو : واتـا ئـاوی گـۆگرد، ئـەگـەر گوناحبار بووایە دەمرد و ئـەگـەر بـێ‌گونـاح بووایە هیچی‌لێ‌نەدەهات..؟، سوێن‌خـواردن و سوێندخواردن پاش‌هاتنی ئیسلام‌بوە بە قـە-سەم خواردن، بەڵام قەسەم خواردەمەنی نییە و لەسەر ڕەوتی ئاوی گوگرد خواردنەوە، قـە-سەمیش بووە بە خواردن. (قسم؛ سوگند)
سەبا: ناوی مەقامێکە لە مۆسـیقای کوردیـدا. (نام‌دستگاهی‌درموسیقی‌کردی)
سەبای‌زوو: [ناو،ت] سـبەینـێ‌زوو؛ هـەوەڵـی سبەینێ. (صبح‌زود)
سەبری‌ئەییوب : (ب) تاقەت و پشوو درێژیی زۆر. (صبرایوب)
سەبەتچی: [ناو،ت] سەوەتە چێکـەر؛ سـەوە تەچن؛ سەوەتەفرۆش. (سبدفروش؛ سبدساز)
سەبەقوڕ: سـەربـەقـوڕ؛ کـەسێک کـە بـۆ مردووی خۆشەویستی سـەری لـەقـوڕ نـاوە. (ب) ئازیـەتبـار وسـەربـە هـەش و قـوڕ. (عزاگرفته‌وگل‌بسرریخته)
سەپدونە: کێوێکە دەڵێن زەڕدەشـت لـەوێـوە سەری‌هەڵدا؛ لەڕۆژهەڵاتی باشـوری ورمێیـە. (کوه خاستگاه‌زردوشت)
سەتمیاگ:[ئاوەڵناو+ ناو،بەر] سـەتمیـا؛ سـە-تمیاو؛ وێران‌بوو؛ کاول‌بـووگ. (ویـران‌شـدە)
سەتمین: [چاوگە] وێران‌بوون. (ویران‌شـدن)
سەتەرە: قاتر؛ هێستر؛ وشەیێکـی ئاوێستـاییە هەر بەو مانا. (استر)
سەحلەب: [ناو] گیاسالمە؛ گیایێکی‌بـەنرخـە. (گیاەسلمە)
سەحن : [ناو] وشەیێکی فارسی و ئـارەوییـە؛

بۆی هەیە لە (صحن)ی ئارەوییەوە هاتبێـت، بەڵام لە کوردیشدا دەوترێت؛ جێگای بەربڵـاو؛ گۆڕەپان؛ (دڵارامـا هیلالـی نـەو بـە دیـدارت موبارەکبێ، بەدیداری مەهی وەک مەهـ (- گرفتارت موبارەکـبێ، قەتارەی دووگمەکـە- ی سینەت تـرازان بـۆ تـەماشـای مـن، دوو ناری نەورەسی سەحنی سەمەنزارت موبـارە- کـبێ. (بەداخـەوە نـاوی شـاعیرەکـەیـم لـەبیـرنییـە) (صحن)

سەحنە: شارێکی کوردنشینی سەربە هەرێمی کرماشانە. (صحنه)

سەحەری : ناوی ئاهەنگێکە کە لە پێش دە- ستپێکی شایی و هەڵپەرکێـی بـەیانیـان بـە زوڕنا لێدەدرا بۆ ئەوە خەڵک ئاگاداربکەن کـە بۆ هەڵپەرکێ ئامادەبن. (نام‌آهنگی‌است)

سەحی: سەعی؛ سەعو؛ سووکەڵە ناوی سـە- عید. (اختصارسعید)

سەختان: سەخناخ؛ زەوینی ڕەقەن؛ زوورکی- سەخت. (زمین‌سخت‌وسنگلاخ)

سەختەدار: داری ڕەق وەک داری گوێز و قە- یسی و بادام. (سخت‌چوب)

سەختەوبوون: [چاوگە،ت] سـەخـت‌بوونـەوە؛ ڕەق‌بوونەوە؛ پتەوبوونەوە. (سخت‌شدن)

سەخڵاو: [ناو] تاقمێ پێشمەرگەی ئێشکگـر کە لەجێگایێ دەمێننەوە؛ بۆی‌هەیە لە وشەی (ساخڵوو)ی تورکییەوە هاتبێتە نێـو کـوردی بەواتای جێی‌مانـەوەی عـەسـکەر؛ کـە لـە- چاوگەی(ساخلە ماخ) بـەواتـای(ڕاوەسـتان و ڕاگرتنە) و چووتە نێوزمانی فارسیش. (ساخلو)

سەخەل: [ناو] پز؛ ئاوەلمە. (جنین)

سەدپەلکە: [ناو] جۆرێـکگـولی پڕپـەڕەیـە. (نوعی‌گل)

سەدرە: نـاوی‌کراسـێکی موبـارەکبـووە لـە ئـاییـنی زەردەشـتدا کـە پـێش بلـووق‌بـوونی منداڵ دەیانکردە بەری و بە ومنداڵەیـان دە- گوت سەدرەپۆش. (نام‌پیراهنی‌مقدس‌دردین- زردوشت)

سەدری : پێشبەندێک کە بـەر سـینگ دادە- پۆشێت (سینه بند)

سەدمێری: [ناو] هاواڵی؛ هاوکاری؛ ئاریکاری؛ هەڤپایی. (همکاری)

سەدەمە: [ناو] (ب)بڤە؛ ترکز؛ ئەوکارە سەدە- مەیە مەیکە؛ ئەوکارە جێی‌مـەترسـییە.باسـی سەر(صدمه)+

سەدی‌سەد: سەد لە سەدا؛(ب) بێکـەماسـی؛ تەواو؛ هەموو؛ بەیەقین. (صددرصد)

سەڕ: [ناو] زەڕ؛ زەڕینی‌کەر. (عر)

سەرئاسن: [ئاوەڵناو] (ب) مرۆڤی کەڵەڕەق و سەرکێش و کەڵەشەق. (لجباز)

سەرئاڵقە: [ناو] هەوەڵین‌ئالقە. (ب)سەرتـۆپ؛ سەرباشقە؛ لەهەمووان سەرتر. (سرحلقه)

سەرئەستوون: [ناو] تاج‌کوڵەکە؛ سەرکوڵەکـە؛ سەرستوون؛ تەپڵەکی‌ڕەشماڵ. (سرستون)

سەرئیلچی: [ناو] سەرۆکـئێلچی؛ ڕیش‌سپی و بەڕومەتی تاقمی بەڕێکراو بو ئەنجامی‌کارێ؛ باڵوێز. (سفیر)

سەراڤ: [ناو] ئاودەس؛ سەرئاو؛ کناراو؛ بەئـە- دەبەوە دەڵـێن دەستشـۆری یـان تـەوالێـت. (توالت؛ مستراح)

سەراد: سەرەند؛ چوار گۆشەیێکـە وەک کـەو

بەتەل چنراو بۆ گرتنی درشتەی کلۆ و بەردی خۆڵ و خاک . (سرند)
سەرادار: [ناو] (١) سەرایدار؛ کاروانسەراچی.(٢) ژێرماڵە؛ چاودێری خانووبەرە و کۆشک. (سرایدار)
سەرانسۆ: بەسەرکردنەوە؛ سەرلێدان. (سرزدن)
سەرانگری: [ناو] سەرەنگری؛ هەڵکەوتن؛ هەڵەنگووتن؛ (ب) هەڵە. (سکندری؛ اشتباه)
سەراوێز: [ئاوەڵناو] سەرەوخوار ئاوێزان؛ بەراوەژوو؛ دالقان سەرەوخوار؛ دارداکری، بەراوەژی. (برعکس آویزان)
سەربڕ: [ناو+بک] دروێنەکردنی گوڵبڕ؛ دژی بن بڕ. (خوشەبریدن وجاگذاشتن ساقە-بلنددردرو)+
سەربردن: (ب) بەلەزبوون؛ بەتاڵووکەبوون؛ لەشەڕی قدیمدا ئەگەر سەری سەرۆکی دوژمن ببڕدرایێت، زۆر بەلەز بەسواری و تەقڵەکوت دەیانناردەوە بۆ بارەگای میر؛ ئەوەچییە ئەوەندە بەتاڵووکەی دەڵێی سەر دەبەی. (سربردن؛کنایی، عجلەداشتن)+
سەربردە: [ناو] سەربهووری؛ سەرگوزەشتە؛ سەرگورەشتە؛ بەسەرهات. (سرگذشتە)
سەربەتاک: [ئاوەڵناو] سەربەتاڵ؛ دانەپۆشراو؛ سەرنەنراوە. (سرباز)
سەربەستبوون:(١ڕەوتی ئازادی و سە ربەستی (ئازادی). (٢) بەسەربەستی گەیشتن؛ بەئازادی گەیشتن. (آزادشدن)
سەربەستن: [چاوگ+ت](١)سەرپێچانەوە. (بستن سر).(٢) سەرلێنانەوە. (سرپوش-گذاشتن)
سەربەفەتەراتدان: تووشی گێچەڵیک کردن کە سەری تێدابچێ. (سرکسی رابەباددادن)
سەربەکڵاوە: (ب) بارانی توند و دەنک گەورە؛ شەستەباران. (بارش شدیدباران)
سەربەوی: [ئاوەڵناو] سەربەخۆ؛ سەربەست؛ ئازاد. (آزاد؛ مستقل)
سەربەهوێیی: سەربەهەوی؛ شووکردن بەکەسێک کە ژنی دیکەی هەبێت. (شوهرکردن-بەمردی کەزن دارد)
سەربەهەش: ماتەمگێڕی کە خوم لە سەر - خۆی بساوێت. (عزادار؛ علامت ماتم گرفتن)
سەربەهەوی: شووکردن بەپیاوێک کەژنی-دیکەی هەیە. (ازدواج بامردزندار)+
سەربێن: [ناو] مێزەر؛ شتێک کە سەری پی ببەستن یان شتی سەر نانەوەی دەفر؛ بێن واتای بەستن دەدا وەک دەسبێنی شوان، دەمبێنی گاگێرە.. (سرپوش؛ درپوش)
سەرپایی: [ناو+ت] دەستەواژەی نەخۆشخانە-یە؛ مالیجەکردن بەبێ خەواندن لەسەرتەخت و لە ناو جێگەوباندا. (سرپایی)
سەرپۆش: [ناو+ت] (ب) لەچک؛ چارشێو؛چوارقەد؛ (ئەوکولمە جوانە لەژێرسەرپۆشا، بەبای پارێزی خەیاڵ دەڕوشا، فرمێسکی دڵ ڕەق بەردت لێباری، تۆچۆن دڵت هات پیابیتەخواری. «وەلی دێوانە» (سرپوش)
سەرپۆشراو:[ناو+بەر+ ئاوەڵناو+ بەند]داپۆ شراو ؛نیهانی؛ سەربەمۆر؛ شاراوە. (سرپوشیدە؛ نهانی)
سەرپولی زەهاو: شارێکە سەر بەکرماشان.

(سرپل‌ذهاب)
سەرپووت: (ب)سەرزل؛ سەربەقەرا پووتێـک. (سرگنده)
سەرپـەڕ: لای‌ژووروو؛ لای‌سـەروو؛ (ڕوو لـە لای‌من‌کە مـەچـۆ بـۆ سـەرپـەڕێ) «هێمن». (صدرمجلس)
سەرپەنـا : [نـاو] پـەناگـا؛ (ب) جێـی‌ژیـان؛ ژوورێک کە سەری داپۆشرابێت. (سرپناه)
سەرپێچی‌گلۆپ : [ناو،ت] ئامێرێکی قـوولی پێچدارە کە گلۆپی چرای بە پـێچ لـێ قـاییم دەکەن (سرپیچ‌لامپ)
سەرپێدانەواندن: [چاوگە،ت]کۆڵ‌پێدان؛ سەر پی‌شۆڕکردنەوە (واداربەشکست)
سەرتاس: [ناو] کەوچک‌ئاسا دروسـتکراو لـە تەنەکە، لە دووکانی بەقاڵی دانەوێڵەی پێـدە- کەنە ناو دەفر یان ترازوو. (سرطاس)
سەرتاس: [ناو،ت] تووکی‌سەر وەریو؛ هەویز. (سربیمو؛ طاس)
سەرتەپۆڵە : گەڕەکێکی قەدیمـی لـە شـاری سنە. (نام‌محله‌ای‌درسنندج)
سەرتەندوور: سەنتەنوور:>سەرتەنوور.
سەرتەنوور: [نـاو،ت] مدبـەق؛ جێـی‌چێشـت لێنان و نان‌کردن بەتەندوور. (مطبخ)
سەرتەونانە : [ناو،ت] جێژن‌گـرتن بـە هـۆی تـەواوبـوونی (فـەرش و ڕاخـەر)ی چنـراو. (جشن‌پایان‌فرش‌بافی)
سەرتیپ: [ناو] پلە و پایەیێکە لە عەسکەریدا؛ باڵاتر لە سەرهەنگی. (سەرتیپ)+
سەرتیر: سەرتیل؛ لەمێشێن و هەڵماتێنـدا بـە هەڵگرتەدەڵـێن؛ دژی‌خشـکە. (تیلـەهـوایی-
انداختن)+
سـەرتێکـردن: [چاوگـە،ت] (١)سـەریکـردە برێشکەکە تـا تـەواوی نـەکـرد هـەڵنـەسا. (خوردن‌تاتمام‌شدن) (٢)هەموو ڕۆژی دەچنـە زگ کیسـەی کشمیشـەکـە و سـەریـان- تێکردووە؛ دەست‌کردن بە خواردنی‌شـتێک و دەست لە خواردن هـەڵنـەگـرتن؛ یـان هـە- مووکات لە شتێک خواردن. (خوردن‌هەروزه)
سەرتیکـە : [نـاو] سـەیدووکـە؛ سـەیدۆکـە؛ گیایێکە بەرەکەی پانترلە نۆکـە و دەخـوری. (نام‌گیاهی‌است)
سـەرجـەمفـرۆش: سـەرجـەمورەش؛ تێکڕافروش. (عمده‌فروش)
سەرچاوان: لەکاتی بەخێرهێنان و بەڕێکردنی میواندا دەوترێ واتا: قەدەمت‌سـەرچـاو؛ یـان لەجیاتی بەڵی دەوتری، بە سەرچاوان. (روی- چشم)
سەرچق: [ناو] سەرلق؛ سەرچـڵ؛ سـەرلـک؛ لکی‌سەرەوەی‌دار. (بالاترین‌شاخه‌درخت)
سەرچک : [ناو] ترشە کشمیش؛ کشمیشـی- کەولی؛ زریشک. (زرشک )
سەرچۆپی‌کێش: [ناو،ک] کەسێک کە سـە- رچۆپی دەگرێ لە هەڵپەڕیندا. چـوپی‌کـێش. (چوپی‌کش)
سەرچـەمیـان: [چاوگـە،ت] سـەرخواربـوون؛ (ب)سـەرشـۆڕبوون. (سـرخم کـردن؛ شرمسارشدن)
سەرحەڵقە: >سەرئاڵقە.
سەرخستن: [چاوگە،ت] وەسەرگێڕانی نێر لە مێ. (سوارکردن‌نرروی‌ماده)+

سەرخواردن : (ب) مردنی کەسێک لەپاش هاتنی کە سێکی تر. (کنایی.مردن کسی-بابدنیاآمدن کسی دیگر)
سەرخواری: [ناو] سەرشۆڕی؛ شەرمەزاری. (شرمساری)
سەرخۆڤەهاتن: [چاوگە،ت]هاتنەوە سەرخۆ؛ وەئاگاهاتن؛ هاتنەوەهۆش. (بخودآمدن)
سەرخوران: حاڵەتی سەر وەخورین هاتن؛(ب) خولیا و مەیلی دەروونی بۆکردنی کارێک؛ شۆڕش سەری لەکاری ڕامیاری دەخورێت؛ واتا مەیلی لێیەتی. (سرخاریدن؛ بی‌میل نبودن)
سەرخوری: پێستی گا بە تووکەوە؛ کەوڵی خۆش نەکراو. (پوست‌درباغی‌نشدەگاو)
سەرخۆشیدار: [ئاوەڵناو] سەرەخۆشیدار؛ خاوەنی عەزا؛ خاوەن‌پرسە؛ عەزادار. (صاحب‌عزا)
سەرخوشیکەر: [ناو،بک] سەرەخۆشیکەر؛ کەسێک کە دەچێت بۆ پرسە. (افرادی کەبەتسلیت‌میروند)
سەرخەرمان: [ناو،ت] دانەوێڵەی پاک و خاوێنی سەرجەزی خەرمان؛ دژی‌بن‌خەرمان. (بنشن‌بالائی‌خرمن)+
سەرخەفنای: [چاوگە،ت]کوڕنووش کردن. (تعظیم‌کردن)
سەرداخانە: [ناو] نوقرەداخ؛ جەریمە و پارە لێ‌سەندن. (سزای‌نقدی)
سەرداری: [ناو] جۆرێک گەنمی ڕەنگ ئاچختر لە سمەوەژە کەنانی‌سپی‌تر و جوانترە. (نوعی‌گندم)+
سەرداس‌کردن: [چاوگە،ت] ئیجارەکردنی هەردی پڕ گژوگیا بۆ ڕنینەوە. (قرارداد دروکردن‌علفزار)
سەردانەواندن: (ب)کوڵ‌دان؛ سەرشۆڕبوون. (تسلیم‌شدن؛ خجالت شدن)+
سەردبوونەوە: [چاوگە،ت] ساردەوەبوون؛ ساردبوونەوە. (ب)مەیل‌نان. (سردشدن)
سەردروو: [ناو،بک] دروێنەوانێک کە دەستی لەسەرەوە دەگرێت و لاسق بەجێ‌دێڵێت؛ دژی بن‌دروو.(دروگری‌کە ساقە بلندبجامی-گذارد)+
سەردەرئینان: >سەردەرهێنان بەهەموو مانایێکەوە. (سردرآوردن)
سەردەرکردن: [چاوگە،ت] خۆڕزگارکردن؛ سەردەرکە و ماڵ‌زۆرە. (خودرانجات‌دادن)+
سەردەستە : [ناو] سەردەست؛ سەرقوڵی کراس و کۆت و کەوا. (سرآستین)+
سەردێر: [ناو] ئاودانی زەوی کە هەرسەرەوەی تەڕبێت و بنەکەی نەیچێژێ. (آب-دادن‌سرسری)
سەردێڕ: [ناو] عینوان؛ سەرناوی‌شێعر و نووسراوە. (تیتر)
سەرڕاستکردن: [چاوگە،ت] کردنەوە؛ ڕێک-وپێککردن؛ ئازادکردن؛ دەستلێبەردان. (بازکردن؛آزادکردن؛ )
سەرڕاو: [ناو] لەڕاوە کەروێشکدا ڕاوچییێک بە تانجیی ڕستکراوەوە دەچێتە ملەی‌کێو، کە کەروێشک لێی ڕەتبوو تانجیی تێبەردەدا. (موضع‌گرفتن‌بالای‌کوە در شکار)
سەرڕەقی: [ناو] کەللەڕەقی؛ کەللەشەقی؛بێ-داگری و سەرڕێ‌نەهاتن؛ سەرسەختی. (لجبازی)

سەرڕێدابردن: [چاوگە،ت] هەڵفریواندن؛ لە خشتەبردن؛ هەڵخراندن. (فریب‌دادن)
سەرڕێداچوون:[چاوگە،ت] لەڕی‌لادان؛ هەڵە- کردن؛ هەڵفریوان. (ازراەبدرشدن)
سەرزەلووت: سەر ڕووت؛ بێ‌مێزەر و بێ‌کڵاو و سەرپۆش؛ سەرپەتی. (بی‌کلاەوسرپوش)
سەرزەوی: [ناو] سەرزەمین. (ب) نیشتمان. (سرزمین)
سەرژێکردن: [چاوگە،ت] سەربڕین؛ سە- رلێکردنەوە. (سرقطع‌کردن)
سەرسامکردن: [چاوگە،ت] حەپەساندن؛ پە- شۆکاندن؛ حەیران‌کردن.(حیرت زده کردن)
سەرسامی: حاڵەتی سەرسامبوون؛ سە- رسووڕمان؛ سەرسووڕماوی؛ حەپەساوی؛ حە- یرانی؛ وڕی و گێژی. (تحیر)
سەرسڵامەتی: (ب)سەرەخۆشی؛ پرسە. (تسلیت)
سەرسۆنگە: کاوەخۆ؛ فەراغەت؛ ئاسوودەیی؛ سەرپەرژان؛ شێنەیی. (فراغت)
سەرسەرا: کۆشکی زۆر بەرفراوان؛ باڵەخانەی گەوران. (سرسرا)
سەرسەنگین: [ئاوەڵناو] وشەیێکی فارسییە بەڵام لە کوردستانی ڕۆژهەڵات زۆر بەساناهی دەوترێ بەدوو واتا. (١)سەر قورس: ئە- سپێک کە بەئاسانی سەری بە لەغاو وەر- ناسووڕێنێ. (٢)سەرگران و لالووت؛ نەبان؛ (سە نگین) لە هەنبانە بۆرینەیش‌دا بەواتای کێشی قورس و مرۆی بەحورمەت هاتووە. (سرسنگین)
سەرسەوز: [ئاوەڵناو] وڵاتی زەنوێر و پڕگیا و لێرەوار. (سرسبز)+
سەرشکێن‌کردن: [چاوگە،ت] دوای دابە- شکردن بەسەر هەمووواندا ئەگەر هێندێ لەو شتە زیادی بمێنێتەوە، دووبارە بەسەر هە- مووواندا بەشینەوە. (سرشکن)+
سەرشناس: [ئاوەڵناو] بەناوودەنگ؛ سەرناس؛ خاوەن‌کەسایەتی. (سرشناس)
سەرشیو: ناوچەیێکە لە سەقز؛ ناوچەیێکە لە مەریوان. (نام‌دومنطقه‌درکردستان)
سەرشیەی: [چاوگە،ت] هەڵچوون؛ هە- ڵچوونی‌چێشت لەسەرئاور. (سررفتن‌مایع- روی‌آتش)
سەرفڵت: دزێو؛ ناشیرین؛ سەرپووت؛ سەرزل. (زشت‌کله‌گنده)
سەرقوفڵی : [ناو] سەرقفڵی؛ پارەیێکە خاوەن مڵک (زیاتردووکان) لە کاتی ئیجارەداندا لە ئیجارەداری دە ستێنێ.(سرقفلی)
سەرقۆق: [ناو،ت] هەویز؛ کەچەڵ. (تاس؛کچل)
سەرقەبران : [ناو] سەرزیارەتان؛ گۆرستان؛ گەڕەکێکە لە شاری سەقز. (گورستان؛ محله- ایست‌درشهرسقز)
سەرقەپاخ : [ناو،ت] قەپاخ بە تورکی واتا (درگا،زار، سەر) و قاپاڵی:واتا درگابەستراو؛ دەرپوش؛ سەرداپۆش؛ سەر و زاری دەفر. (سرپوش)
سەرقەڵەم : [ناو] نووکی کانزای سەری خو- ودنووس و قەڵەمی بە جەوهەر نووسین. (نیش‌قلم)+
سەرکار : ناوێکە بۆ ڕێزنان لە عەسکەریدا تا

پلەی سەرهەنگی دەوترێت. (سرکار)+
سەرکارگەر : [ناو] سەرعەمەلە؛ عەمەلەباشی؛ سەرۆکی کرێکارگەل. (سرکارگر)
سەرکوت: [ناو] تەمران؛ دامرکان. (سرکوب)
سەرکوت‌کردن: [چاوگە،ت] دامرکاندن؛ تەمراندن؛ شکاندنی جقات؛ لەهێزخستن. (سرکوب‌کردن)
سەرکوتکەر : [ناو،بک] (۱) دامرکێن؛ داتەمرێن؛ (سرکوبگر)؛ (۲) لۆمەکەر؛ سەرکۆنەکەر (سرکوفت‌زن)
سەرکۆڵ: [ناو](۱) باری‌سەربار. (سربار). (۲) تاج‌کۆڵەکە؛ سەرئەستوون. (سرستون). ۳) پڕکردنی قەڵا قووچ؛ قڵاقووچان. (تاانتهای-طرفیت‌پرکردن)
سەرکونسوول : [ناو] سەرۆکی یەک یان چەند کونسوولگەری لە وڵاتێکدا. (سرکنسول)
سەرکەتی: [ئاوەڵناو] سەرکەوتوو؛ پێشکەوتوو لەکاردا. (موفق)
سەرکەچ: [ئاوەڵناو] مل‌کەچ؛ سەرشۆڕ؛ سەرچەمیای؛ شەرمەزار؛ بەرفرمان. (گردن‌کج)
سەرکەش : [ئاوەڵناو] بۆکێوی زۆر؛ بڵند دەوترێت. (سرکش)
سەرکەوت: (۱) ناوەبۆپیاوان.(اسم‌مردانە).(۲) [ڕابوردووی سەرکەوتن] چووەسەر؛ چووەبان. پیرۆزی؛ (بالارفت؛ بالارفتن؛ پیروزی)
سەرگاینجە: [ناو] سەرمژانە.(رابط‌خیش‌ویوغ)
سەرگۆڕ: (۱) سەرمەزار؛ (سرمزار) (۲) سەرگەرد؛ قوربانی. (بلاگردان)
سەرگورد : [ناو] یاوەر؛ پلەییێکی عەسەرییە لە سوپای ئێراندا. (سرگرد)
سەرگۆوەند: [ناو] سەرگۆبەند؛ سەرچۆپی. چۆپی‌کێش. (نفراول‌چوپی)
سەرگەرم‌کردن : [چاوگە،ت] سەرقاڵ‌کردن؛ خافڵاندن؛ (ب) جۆرێک خاپاندن؛ مەژووڵ‌کردن. (سرگرم‌کردن)
سەرگەشتە : [ئاوەڵناو] وێڵ؛ حەیران؛ ئاوارە؛ سەرلێشێواو. (سرگشتە)+
سەرگەندان: [ئاوەڵناو] سەرگەردان؛ ئاوارە؛ (لە هەندێ ناوچە هەروا گۆیەدەکرێت) (سرگردان)
سەرگین: [ئاوەڵناو+ جێناو] ئەوەی‌سەرەوە؛ سەرووتر؛ بانگین. (بالائی)
سەرلووای: [چاوگە،ت] سەرکەوتن. (بالارفتن)
سەرلەبەر: [ئاوەڵناو] سەرلەبەنگ؛ سەرشۆڕ؛ مل‌کەچ؛ فرمانبەر. (خجل‌وفرمانبردار)
سەرلەڕێدابوون: [چاوگە،ت](ب) حازر بۆ ئەنجامی فرمان‌تاسەر تیاچوون. (حاضربەانجام-فرمان)
سەرلێکردنەوە : [چاوگە،ت](۱) سێ و دوو کردن؛ دوودڵ بوون. (۲) سەربڕین. (دوودلی؛ سربریدن)
سەرمابری: [ئاوەڵناو] سەرمابردوو؛ سەرمابردگ. (سرمایی؛ سرمازدە)
سەرمایەداری : [ناو] سیستەمێکی حوکومەت کە لە سەر بنەمای ئابووری و پیشەسازی و بازارگانی دامەزرابێت. (سرمایەداری)
سەرمایەوز: [ناو،بک] ئەوەی سەرمایە دادەنێت بۆ کارێک. (سرمایەگذار)
سەرمایەوسەی: [ناو] سەرمایەدانان.

(سرمایه‌گذاری)
سەرمەوقولات: سەرمەقولات؛ خۆ هەڵگێڕانەوە بە سەر سەردا. (پشتک)
سەرنانەوە: [چاوگە،ت](ب)دیزەبەدەرخۆنە؛ باس‌نەکردنی مەبەستێک؛ شاردنەوەی‌قسەوباسێک. (پنهان‌کردن)+
سەرنگا: [ناو] (گ، منگەییە)سەرین؛ موتەکا؛ سرنگا. (متکا)
سەرنگووم: [ئاوەڵناو] بێ‌سەروشوێن؛ سەر نقوم؛ بەئاواچوو؛ تیاچوون؛ سەرئوندا. (ازبین‌رفتەبی‌نشان)+
(ب) بێ‌سەروشوێن؛ سەرنقووم. (گم‌شدن‌وبی‌نشان)+
سەرنووسەر: [ناو،ت] سەرنڤیسکار؛ سەرنڤیسەر؛ سەرۆکی نووسەرانی گۆڤار و بڵاڤۆک. (سردبیر)
سەرنەڤی: [ئاوەڵناو] سەرشۆڕ؛ سەرچەمیای؛ شەرمەزار. (شرمسار)
سەرنەشێڤ: [ئاوەڵناو] سەربەرەوخوار؛ سەرنشێو؛ سەرەوژێر. (سراشیب)
سەروان : [ناو] (١) پلەوپایەی عەسکەری لە سوپای ئێراندا، لە سیتوان یەکەم باڵاتر. (سروان) (٢)وشترەوان. (ساربان)
سەروپۆز: [ناو،ت] سەروپۆتراک؛ سەروسەکوت؛ سەرومێقل. ڕواڵەتی پوشتە و پەرداخ؛ سەروسیما (سروسیما)
سەروتار : [ناو] وتاری سەرەکیی گۆڤار و بڵاڤۆک لە لاپەڕەکانی هەوەڵی گۆڤاردا کە زیاتر لە لایەن سەرنووسەرەوە دەنووسرێت. (سرمقاله)
سەرودڵ: [ناو،ت] فێ؛ خووداری؛ گەشکە؛ پەرکەم؛ فەرکەم. (صرع)
سەروڕیش : [ناو،ت] مووی‌سەر و دەموچاو. (سروریش)
سەروزماندار : [ئاوەڵناو] زمان‌پاراو؛ بەتوانا لە ئاخەفتندا؛ (ب) زیرەک. (سروزباندار)
سەروزمان‌ناخۆش: [ئاوەڵناو] زمان‌تاڵ؛ قسە ناخۆش؛ قسەڕەق. (تلخ‌زبان)
سەروسامان: [ناو] ڕێک‌وپێکی؛ جەموجۆری؛ سەقام. (سروسامان)
سەروسامان‌گرتن: [چاوگە،ت] (ب)بوونە خاوەنی ژن‌ومنداڵ؛ بوونە خاوەنی ژیانێکی‌باش. (سروسامان‌گرفتن)
سەروسوڕ: [ناو،ت] کەین‌وبەینی پەنامەکی. (سروسر)
سەروسەدا: [ناو،ت] هەراهەرا. (سروصدا)
سەروسەمەنە: [ناو،ت] سەروسەنەمە؛ سەرونەشەمە؛ ودم؛ پێوقەدەم. (یمن)
سەروعوزرشۆڕ: [ئاوەڵناو،بک] (ب)کچێک‌کە باڵق‌بووە. (دختربالغ)
سەرۆکی‌دەوڵەت: [ناو،ت] سەرۆک‌وەزیر. (نخست‌وزیر)
سەرونەشەمە: [ناو،ت] پاوقەدم؛ یومن؛ ودم. (یمن)
سەروەخت: (١) ئاگادار؛ وشیار. (تذکر).(٢) لێ‌پرسین؛ سوراخ‌گرتن؛ بەتەنگەوەبوون؛ چوونەدیار؛ چوونەلا.(سراغ).(٣) لەسەر وختدا حازربوون: بەوەخت‌حازربوون. (سرموقع)
سەروەرگێڕان: [چاوگە،ت](١) پشت‌تێکردن؛ پویتەنەدان؛ ڕوو چەرخاندن؛ ڕوو کردن بە-

لای‌دیکه‌دا.(۱و۲روبرگرداندن)
سەروێن: [ناو] سەربێن؛ مێزەر؛ دەسرەی بە سەرەوە بەستن. (دستار)<سەربێن.
سەروێیی: [ناو] سەرخۆیی؛ لەسەروێیی: لە- سەرخۆیی. (هوشیاری؛ آرامی)
سەرە: [ئاوەڵناو] قەیرە؛ نیوەپیر.(ب)چۆدە- رچوو؛ بەئەزموون. (دنیادیده)+
سەرەپەت: (ب) بەرپرسی و دەسەڵاتداری؛ سەرەپەتێکم بە دەستەوەنییە: هیچکارەنیم. (کنایی شغل)
سەرەپیرێژن: بەڕواڵەت‌گێژ، بەڵام زۆرزان. (بظا هرگیج‌ولی‌حیله‌باز)
سەرەتان: [ناو] (۱) شێرپەنجه(سرطان). (۲) تەختەی تاڵی‌تەون پێوەبستن. (تاربندقالیبافی)
سەرەچڵووسک: [ناو] سەلکەبزووت. (چوب- نیمسوز)
سەرەخۆشی: [ناو] دڵنەوایی؛ سەرسلامەتی؛ تەسەلا؛ پرسەلێکردن. (تسلیت)
سەرەسۆدرە: [ئاوەڵناو] مرۆڤی ئاژاوەچی و شەڕ هەڵخڕێن. (فتنه‌گر)
سەرەشۆرگە: [ناو] سەرشۆرگە؛ جێگەی- خۆشتن‌یان سەرشتن لە ماڵدا. (جای‌تن- شستن)
سەرەکوتێ: [ناو،ت] (ب) بەلەقەلەق ڕویشتن؛ بەکوتەکوت؛ بەحاڵەحاڵ؛ کەم- وکووڕتێکەیشتن.(لنگان لنگان؛ بزحمت‌راه- رفتن؛ با اشکال فهمیدن،یاخواندن‌سطری- بزور)
سەرەکی: [ناو] (۱)بنەمایی. (اصل). ۲) پێشە کی؛ سەرەتا. (پیشگفتار؛ مقدمه)
سەرەلەقی: <سەرەکوتێ.
سەرەماسی: [ناو] بای‌سوور؛ ئازارێکی- گیروداری سەدەمەیە(بفه). (بادسرخ)
سەرەمەرگ: [ناو،ت] کاتی‌گیانەڵڵا؛ ئاویلکە؛ نزیک‌مردن؛ کاتی‌گیان‌دەرچوون. (موقع- مردن)
سەرەندەر: زانین؛ عەقل‌پێگەیشتن؛ پەی‌بە- کاری‌بردن؛ پسپۆڕی لەکارێکدا؛ سەردەر- چوون.(آگاهی‌ازکار)
سەرەوچێرە: [ناو] سەرەولێژی. (سرازیری)
سەرهۆستا: [ناو] سەرهۆستە؛ سەرووەستا؛ وە- ستاباشی. (سراستاد)
سەرەوقوڵە: [ناو،ت] نووک‌وسۆ؛ جۆری‌یاری- بەدەرزیلە؛ سەر و بنی هێلکە. (نوعی‌بازی- است؛ سروته تخم مرغ)
سەرەونیان: [چاوگە،ت] نیان‌بەسەرەوە؛ تراوبەسەرەونیان و خواردنەوە. (سرکشیدن)
سەرهەڵدان: [چاوگە،ت](۱) سەردرهێنان ؛ لەخاک سەردرهێنان. (۲) پەیدابوونی بیرۆکە یان جڤات. (سردرآوردن؛ پیداشدن)
سەرهێش: [ناو] سەرخێش؛ دەندە؛ دەندەی - جێگای‌گاسن لە ئامووردا.(جای‌آهن‌گاوآهن)
سەعورە: [ئاوەڵناو] لەندەهوور؛ زەبەلاح؛ تێکسمڕاو. (لندهور)
سەغلەت: [ئاوەڵناو+ بەند] سەخڵەت؛ (۱) سەخت؛ دژوار. (دشوار). (۲) دڵتەنگ؛ من‌گە- لەک سەغلەتم : من زۆر دلتنگم. (دلتنگ)
سەغلەت‌کردن: [چاوگە،ت] سەخڵەت‌کردن؛ دڵتەنگ‌کردن. (دلتنگ‌کردن؛ غمگین‌کردن)

سەغیربار: ژنێک کە منداڵی وردی هەبێت و مێردی نەبێت (زن‌بیوه‌دارای‌بچه‌صغیر)
سـەف‌پێکـان : (۱)[چاوگـە] سـەف‌بسـتن؛ (صف‌بستن)؛ (۲)[ڕابـوردووی چاوگـە] سـەفیان‌بەست؛ سەفیان‌پێکا. (صف‌بستند)
سەفرابەر : [ئاوەڵناو] زەرداوبەر؛ کەم کەرەوەی دەڵانـدنی زەرداو، وەک ئـاوی زریشـک و ئاوی‌هەنار. (صفرابر)
سـەفرابـەر : [نـاو] دارێکـە (نێـرۆک و نیرووک)یشی پیدەڵێن؛ بۆلابردنی زەرداو بەکەڵکە. (سرخس‌نر)
سەفڕەنگ: [ناو] شرۆڤە کردنی وشە؛ فەرهەنگی وشە. (فرهنگ)
سەفەر : [ناو] مانگی‌دووهەمی ساڵی مـانگی. (ماه‌دوم‌سال‌قمری)+
سەقلە : [ناو] قەبز بوونی مەزاج؛ زک کارنـەکردن؛ دژی زەحیر. (یبس)
سەکری‌سەکران: ناوی‌کێوێکە لە باڵەکایەتـی نزیکی کێوی هەڵگورد، کـە ڕادیـۆی هێـزی پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول لـە ئـەشـکەوتێکی ئەوکێوەدابوو. (نام‌کوهی‌است)
سـەگ: (ب)شـوبهاندن بـەسـەگ؛ زۆرزان؛ حیلەباز؛ زۆرسەگە: زۆرفێڵەبازە. (کنایی‌حیلـەگر)
سەگبا: [ناو] نەخۆشینی ڕیخۆڵەگیرانی‌سەگ. (مرض مخصوص سگ)
سەگباب: سەگ‌باوک؛ کوڕی‌سگ. (پدرسگ)
سەگ‌بزدینـک: [نـاو] سـەگ‌پسێنکە؛ کـەرویشـکی یـەکسـاڵە کـە زۆر خێرانییـە، زوو خۆی دەرباز بکات و سـەگـیش نایگـاتیّ و ئەوەندە سـەگ بـە دوای خۆیـدا ڕادەکێشـی هـەتـا سـەگ شـەکـەت‌دەبێـت یـان دەپسێت.(خرگوش یکساله)
سەگ‌حەسار: [ناوەت] سەگ‌بەحەوشـە؛ تـەمبیّ‌کردنی سەگێک کە زیانی‌خورۆبێت؛ دەرکەی حەوشەی لیّ دادەخەن و دارکاریی دەکـەن؛ (ب) ئـازاردان و گێـرەوکێشـەی زۆرپێکردن. (سگ رادرحیاط‌دربسته‌تنبیـه‌کردن)
سەگ‌خۆر : (۱)[ئاوەڵناو] هـەر شـت شـیاوی ئەوەبێت سەگ بیخوا؛ (۲) بیّ‌حورمـەتـی بـە کەسێک کە شتێکی پیّ بدریّ بـە نابـەدڵـی؛ بگرەئەم هەزارتمەنەیش سەگ خۆر؛ وادەزانم سەگ خواردی. (سەخۆر)
سەگدەست: [ناو] کەرەستەیێکە لە سەیارەدا. (سگدست)+
سەگ‌ژی: [ناوەت] سەگ مەرگی؛ ژیـانی‌سـەگی؛ وەک سەگ‌ژیان.(ب) ژیـانی نـاخۆش و تاڵ. (زندگی‌سگی)
سەگ‌گورگ: [نـاوەت] جۆرێـک‌سـەگـە لـەنێوانی‌سەگ و گورگـدا و زۆر هۆشـیارە و لـە هێـزی پۆلیسـدا یاریـدەرە بـۆ دۆزینـەوەی تاوانبار و کاڵای قاچاخ و شتی‌تر. (سگ‌گرگ)
سەگ‌ماسی:[نـاو] جۆرێـک ماسـییە.(سـگ‌ماهی)
سەگ‌مەگەز: [ناو] سەگ‌مەگەس؛ مێشەسەگانە. (سگ‌مگس)
سەگ‌نەخۆر: (۱) هەر شـت کـە سـەگ نـەیخـوات؛(ب) زێـڕ و زێـو و پـارە و پـوولّ. (طلاوپـول). (۲ب) خـۆراکی زۆر نـاخۆش.

(خوراک بدطعم)
سەگ‌وسەرچۆپی؟ : >سەگ‌ومزگەوت؟.
سەگ و شوان‌هاتنەوە: [چاوگە،ت] قڕبـوونی کەرتە مەڕ لـەکێـو و گـەڕانـەوەی سـەگ و شوان بێ‌مەڕ(ب) مافینگی بوون و پـووش - لەدەم‌بوون. (کنایی‌دارایی‌ازدست‌دادن)
سەگ‌ومزگەوت؟: (ب)کارێک کە لە کەسێک نەوەشێتەوە. (کنایی‌،ناهمخوانی‌افعال)
سـەگـوور: سـە و گـوور؛ سـەگ و گـورگ؛ بوومەلێل؛ تاریک و ڕوونی بەیانی کە سـەگ و گورگ بە دیتن فەرقی پێ نەکرێـت؛ وەک گورگ و مێش. (گورگ‌ومیش)
سەلاتە: >سالاد.
سەلاجە : وشە لە ئارەویـەوە هـاتووە و لـە- کوردستانی باشوور بە یەخچـاڵی فارسـی دە- ڵێن (یخچال)
سەلامەت :[ئاوەڵناو] (وشەئارەوییە)سـڵامەت؛ سـاغ؛ تـەندروسـت؛ وەش؛ سـاق؛ سـاخ. (سلامت)
سەڵبە : [ناو] سەوڵ؛ بێڵی کەڵەک لێخـوڕین؛ سەڵپ. (بیل‌قایق‌رانی)
سەلوا: [ناو] سەلوو؛ سەلوێ؛ سەوڵ؛ دارێکـی هەمیشە سەوز بە گەڵای باریکی سووژنییەوە. (سرو)
سەلوێنک: [ناو] سەرانگوێلک؛ سەرانگۆلـک. (شوله؛ سرگینگاه)
سەما: [ناو] بۆی‌هەیە لە(سماع)ی ئارەوییەوە هاتبێـت؛ هـەڵپـەڕکـێ؛ (ب) دوو دەسـماڵە کردنی ژنانی کە سـوکـاری زاوا لـە بـەردەم بووکدا لە کاتێکدا بووک دەگاتە بەرمـاڵی‌زاوا.
(رقص‌بادستمال جلوعروس)
سەمات: [ناو] تەرسەقول؛ تەرس. (پهن‌اسب‌و استر)
سەمتاندن: [چاوگە،ت] هـەڵکێشـان لـە ئـاو. (درآب‌گرم‌فروبردن)
سەمخەرات: [ناو] سەخمەرات؛ هۆ؛ سەبارەت ؛ بەخاتر. (علت؛ بخاطر؛ سبب)
سەمڵ: [ناو] بەرماڵ. (جانماز)
سەموون : [ناو] جۆرێک کولێرەی خەپەلە و خڕ و چکۆلە؛ (نوعی گردەنان)
سەمەڵ : سرووتی ناواخنی کورتـان. (سـاقە- گندم‌داخل‌پالان)+
سەمەند: [ناو] ڕەنگی ئەسپێک کە بەڕەنگـی کایە و زەردە. (سمند)
سـەمـەنـدەر: [نـاو] (١) جۆرێـک مارمیلـک. (سوسمار). ٢) داعباێکی ئەفسانەییە کـە دە- ڵێن لە ناو ئاگردا ناسووتێ. (سمندر )
سەمەندی‌کلک‌ویال‌سپی:[ناو،ت]یەزیدی؛ڕە- نگی‌ئەسپی یەزیدی‌کوڕی‌معاویە، کە ڕەنگـی سەمەنـد بـوو بـەڵـام ڕەنگـی‌یـاڵ و کلکـی ئاچختربوو. (سمندیال‌ودم‌شسته؛ یزیدی)
سەمەندی‌یەزیدی: [ناو،ت] ئەسپی سەمەنـد کەیاڵ و کلکی کاڵتر یان سپی‌بێـت؛ ڕەنگـی ئـەسـپی یـەزیـدی کـوڕی معاویـەبـووە. (سمندیال‌ودم‌شسته)
سەهناف : [ناو] سەیوان؛ سایەبان؛ پێشـەوەی کڵاوی لێو داری پان. (سایبان)
سەنبول : فدفردماند؛ [ناو] ئورنـاگ؛ نموونـە؛ سەرمـەشـق کردنـی شـت یـان کـەسێک؛ نموودە؛ نیشانە. (سمبل)

سەنتەنە: سەڵتەنە؛ ناوێکی ژنانەیە. (نامی استزنانه)
سەنج : [ناو] دوو جەغزی وەک دەوری دروستکراو لە کانزای زەرد کە بە یەکدا بدرێت دەزرینگێتەوە، کەرەستە یێکی مۆ-سیقایە. (سنج)
سەنجاڕ : ژەنگاڵە؛ ژەنگار؛ ناوی شارێک و چیایێکە لە نزیکی موسڵ. (نام کوهی است)
سەنجوور : [ناو] سەنجۆل؛ قەڵەدەی تانجی؛ قەلادە. (قلاده)
سەنجەر. ناوەبۆپیاوان. (سنجر)
سەندن:[چاوگە] کڕین. (خریدن)+
سەندنەوە : [چاوگە،ت] گۆرانی سەندنەوەی دوو یان چەندکەس بۆ ماندوو نە بوونی گۆرانیبێژ. (تکرارتصنیف)
سەندەلووس : [ناو] سەندەڕووس. دارێکی کورتەباڵایە جیوەکەی بۆ دروستکردنی دە-رمان بەکەڵکە. (سندروس)
سەنگ : [ناو] لاسکی کەنگری پیرکە دڕووەکانی داماڵرێت. (ساقەبی‌خارکنگرپیر)
سەنگ : [ناو] مۆتەکە. (سەنگ‌سوواربوون: هەستی خنکان لە خەودا). (کابوس)
سەنگدادان : لاسەنگ بوون. (طرفی‌سنگین-تر؛ نامیزانبوون)+
سەنگدانەسەر: گوشار و هێز خستنەسەر. (فشاروسنگینی‌برچیزی‌واردکردن)
سەنگ‌فەڕش : [ناو،ت] بانووان؛ داپۆشانی شوێنێک بە بەرد و (چیمەنتۆ یان قوڕ). (سنگفرش)
سەنگ‌وسووک‌کردن : [چاوگە،ت](١) بە-راوەردکردن (تخمین‌زدن) ؛ (٢) لە بەشی قورس هەڵگرتن و خستنە سەر بەشی سووک تا میزان بوون و بەرانبەر ڕاوەستان. (میزان‌کردن)
سەنگ‌وسووکی : [ناو،ت] (١) لە موعامەلەدا بەراوەردکردن و پێکگرتن. (٢) ئەتک‌کردن (زۆریان سەنگوسووکی بە سەر هێنا: زۆریان ئابڕوو چوواند). (١برآورد.٢توهین)
سەنگ‌وماست : [ناو،ت] سەنگی کەنگر کە ئاوەکوڵ بکرێت و تاڵایيە کەی تەواوبێت و لە گەڵ ماست تێکەڵ بکرێت. (ساقە-لنگروماست)
سەنگووسوژن‌کردن : [چاوگە،ت] هەموو کە-لێنێک گەران و پشکنین بە دووی شتێکدا. (سنگ‌و سوزن‌کردن)
سەنگەر : [ناو] بۆسە. (سنگر)
سەنگەسیر : [ناو] خۆراکێکی زۆر ناوداره بە تايبەت لە موکوریاندا کە لە گۆشتی گیسک یان کەروێشک و ماست چێدەبێت. (قوڕاو)یشی پێدەڵێن. (نام‌خوراکی‌محلی‌است)
سەنگەڵ: [ئاوەڵناو] ئاژەڵێک کە گوانێکی گەورەتربێت و شیری‌زیاتری تێدابێت. (دامیکه یک‌پستانش بزرگترباشد)
سەنگی‌زاور : [ناو،ت] بەردێکە لە کیسەی سەفرادا دروست دەبێت و زۆر بە ئێشە و ئێستا، بە نووری لەیزێر مالیجەی دەکەن. (سنگ‌صفرا)+
سەنگین‌ئەسڵەحە :[ئاوەڵناو] (ب) لە پیاوێک-کە نیشانەی نێرینەیی گەورەبێت. (کنایی، بزرگ‌بودن آلت تناسلی )

سەنگین‌پا :[ئاوەڵناو] پاسەنگین. >پیٚقورس. (پاسنگین)

سەنگین‌دەست : [ئاوەڵناو]کەسیٚک کە ماڵات سەردەببڕیٚت زوو گیانیان دەردەچیٚ؛ (۲) کەسیٚک کە دەستی قورسە و لە هەرکەس‌بدا زۆر ئازاری پیٚدەگەییٚنیٚ. (۱و۲سنگین‌دست)

سەوادبوونەوە : [چاوگە،ت] سەوازە بوونەوە؛ ترس‌وەرین. (ترس‌ریختن)

سەواش : [ناو] دەمەقاڵیٚ، شەڕەقسە؛ هاوار و داد؛ (سەواش‌بە تورکی واتا: شەڕ ). (جنگ-لفظی)

سەورۆ: [ناو] کووت؛ پەیین بەزەویداکردن بۆ بەهیٚز بوونی خاک. (کودحیوانی؛ کود-بزمین‌پاشیدن)

سەوری : [ناو] سابریٚن؛ساوریٚن؛ نیٚری.(تەکە)

سەوزاڵف : [ناو،ت] ئاڵفی‌سەوز؛ (ب)ویٚنجە و گزرە و گیا. (علف‌سبزخشک‌یاتر)

سەوزە : [ئاوەڵناو] مرۆڤی ڕەشتاڵەی ئاچخ؛ گەنم ڕەنگ؛ ئەسمەر؛ سەوزەڵی سەوزە باریکی منداڵیٚ«فۆلکلۆر»ٚ . (سبزەرو)+

سەوزەدار : [ناو] دارەسەوزە؛ داریٚکە گەڵاکانی وەک سوژن باریکە و هەمیشە سەوزە؛ پاڵاوتەی کوڵیٚندراوی گەڵاکەی بۆ عیلاجی کەچەڵی بەکەڵکە؛ و حەیوانی ئاوس بە خواردنی گەڵاکەی بەر دەخات. (درخت‌کاج)

سەوزی: [ناو] سەوزە؛ سەوزەوات؛ گیای-خواردەمەنی. (سبزی)

سەوس: [ئاوەڵناو] ویٚڵ و سەرگەردان و سەوداسەر. (سوداسر)

+ سەوڵ : ناوی گوڵیٚکە (گل تاج خروس)

سەوڵ‌لیٚدان : [چاوگە،ت] بەلەم ئاژووتن بە سەوڵ و بیٚڵی تایبەت. (پاروزدن‌قایق)

سەولاندن: [هەڵتەکاندن؛ تەتەڵەکردنی دانەویٚڵە بۆ پاک‌کردنەوە لە خەوش‌وخاڵ. (بوجاری‌وپاک کردن‌غلە)

سەوڵەجان : [ناو] گۆچان؛ وەکاز، گاگۆڵک. (عصا)

سەوڵی بیٚگریٚ : سەڵوی ڕاست هەڵچوو؛ شوبهاندنی قەد و باڵای بەرز و ناتلەنگ‌زراو بەسەوڵ. (سروقامت)

سهووروٚک : [ناو] سی‌ڕۆژ بەرانبەر بە یەک مانگ. (سی‌روز؛ یک‌ماه)

سەوهان:[ناو](۱)کەرەستەی‌ساوین؛ بڕبەند؛ (۲) جۆریٚک شیرینیاتی بە ناوبانگە لە ئیٚران. (سوهان)

سەوی: [ناو] سەوەتە؛ سەبەتە؛ قوڵینە. (سبد)

سەهوەر: [ناو] تاریکی‌شەو؛ ڕەشی‌شەڤیٚ؛ دەواڵ؛دەواڵ؛دیٚو و درنج؛ئەجننە.(تاریکی؛ جن)

سەهی: [ئاوەڵناو] ڕاست؛ بیٚگریٚ. (سهی)

سەیارە : [ناو] ترومبیل. ماشیٚن؛ ماشیٚنی سوواری. (ماشین)

سەیخوٚڵ : [ناو] کەڵەوە؛ کەڵەمە. (چنبرە)

سەیدەران : گیاساج؛ گەڵاکانی خڕە و دەخوریٚت؛ بۆ چیٚکردنی بۆرانی بەکەڵکە و دژی کرمی ڕیخۆڵەیە. (سیرزرد)

سەیز : [ناو] خزمەتکاری ئەسپ؛ مەیتەر. (مهتر)

سەیوان : (۱)گۆڕستانیٚکی گەورە لە سلیٚمانی؛ (گورستانی در سلیمانیە) (۲) چەتری سیٚبەر؛

سایەوان؛ (سایبان) (٣) ناوی کێوێکە لە ئیلام. (کوهیست در ایلامَ)
سەیوەت : [بەند] شێنەیی. ؛ ئەسپایی؛ هێواش؛ ئارام. (آرام؛ یواش)
سی: پاشگر واتا (تی) کردگیەسی، واتا کردوویەتی و نیشانەی بکەرە > سۆ (پسوند)
سێئاشان : گەڕەکێکە لە شاری مەهاباد. (محلەای‌درمهاباد)
سیا : کورتکراوەی ناوی سیامەند و سیامەک و سیاوەش. (مختصرسەاسم‌مردانه)
سیاچاڵ : [ناو،ت] (ب) جۆرێک گرتوو خانەی قەدیم؛ زیندانی قەدیم. (سیاهچال)
سیاچاو : [ناو،ت] گوڵێکی پێنج‌پەرە و ناخی ڕەشە و لە سەقز و مەهاباد و هەورامان و سۆمابرادۆست زۆرە و لە قەدیما چاویان بە هاڕدراوەی گوڵەکەی دەڕشت بۆ یومن و دوورخستنەوەی وەیشوومە. (خربق‌سفید)
سیاڕێحان : [ناو،ت] ڕەشەڕێحانە. (ریحان-سیاه)
سیازام : [ناو،ت] برینارەش؛ ئازارێکی هاوبە شی ئاژاڵ و مرۆیە کەبە شێوەی کوانێکی ناو ڕەش لە سەرپێست هەڵدەدا و گیرودارە. (سیاەزخم)
سیاسووت : [ناو،ت] ڕاوەکەوی هەوەڵی بە-هار. (شکارکبک‌دراول‌بهار)
سیاقەڵەم : [ناو،ت] دەستەواژەی نیگار کێشییە واتا وێنەکێشان بەڕەش لەسەر ڕووپەڕی‌سپی (ب) وێنەکێشان بەمیدادی‌ڕە-ش. (سیاەقلم)
سیاگۆش : [ناو] پشیلەکێوی لە ڕێوی پان و پۆڕترە وکلکی کورتە و پێستەکەی بەنرخە. (گربەگوهی)
سیامانگا : فد؛ [ناو،ت] گیانلەبەرێکی گۆاندارە بە دەست‌وپای درێژ و دەنگێلی زیل و بەرزە-وە زیاتر لە سەردار و ناو جەنگەڵدا دەژی. (سیامانگا)
سیامەند : ڕەشتاڵە؛ ناوی پیاوانەیە؛ کەسایەتی بەیتی خەج و سیامەند. (سیەچردە؛ نام مردانه)
سیاوئاڵەت : [ناو،ت] ڕەشەبیبار؛ هەستی پیاوەتی زیاد دەکات؛ دژی ژەهری خوێنە. (فلفل‌سیاه)
سیاوپۆژ : سیاوپۆش:>قەیتەران.
سیبا: [ناو] سیبات؛ سابات؛ کەپر؛ سایەوان. (سایبان)
سیبات: >سیبا.
سێبەنەرد: > سێفەنەرد.
سێبەنگی : [ناو،ت] هۆنینەوەی قژەسەر بە سێ پەڵکە. (بافتن‌موی‌سردرسەرشتە)+
سیبەهران : [ناو+ بەند] بەلێشاو؛ فرەوفراوان؛ بەزۆری. (بسیار)
سیپ : [ناو] جەعبە لە تەختەی سێ ڕووپەڕ یان زیاتر چێبوو؛ سیپی چایی دەکیلۆچایی تێدایە. (جعبەتختەسەلایی)
سێپا : [ناو] (١) هەرشتی‌پاچکەدار بە سێ پاچکەوە؛ (٢) سێباز؛ پەڕینی سێباز. (١اسم-پایە٢پرش‌سەگانە)+
سیپاڵشۆر: [ناو،بک] جلکشۆر. (لباس‌شو)
سیپە: [ناو] سەپان؛ هەرەتی‌لاوێتی؛ هەرەتی جەوانی؛ سووروسەپان : (ب)جوان و جەحێڵ.

(عنفوان جوانی)+
سێپەڕە : [ناو] ئامێری کون‌کردنی دار لە نـە-
جارِیدا. (سەپر)+
سیٚپەڕیٚ : [ناو] سێوەڕە : گیـاییٚکی کورتـە-
باڵـای کـەوەیـە؛ شـەوەرە هـەردی. (شـبد-
روحشی)
سیٚپیٚکـ: [ناو]سیٚپا؛سیٚپیٚ؛سیٚپایە.(سەپایە)
سێتاڤ : [نـاو] خـۆر؛ هـەتـاو؛ خـۆرەتـاو.
(نورآفتاب)+
سیتار : [ناو] ئامێرێکی مۆسیقای تایبـەت بـە
وڵاتی هێندە و پەردەکانی کانزایە و سـۆزێکی
تایبەتی هەیە. (سیتار)
سێتار : [ناو] ئامێرێکی مۆسیقایە کە ۴ تەلـی
هەیە و بە قامک لێدەدریٚ. (سەتار)
سیٚتەڵاقە : [ئاوەڵناو] سیٚبەردە؛ سیٚبـەسـیٚ؛
سیٚوەسیٚ؛ تەڵاقێک کە ئیتر گریٚ ناخوا مـە-
گەر دوای شووکردنێکی دیکە یان بە ڕاسـتی
یان بە ڕواڵەتی کە پێی دەڵێن جـاش. (سـە-
طلاقە)
سیٚتیر : [ناو] تفەنگێکی قەدیمی‌بـوو سـیٚ-
فیشەکی دەخوارد. (سەتیر)
سیچکە : [ناو] بەرەسماق؛ گیاییٚکە گەڵاکەی
دژی هوورگ و جووڵەوەرە، دەرمانە بـۆ بـە-
ردی گورچیلە. (ترشک)
سـیچەن‌گـرتن : [چاوگـە،ت] ئـۆقرەگـرتن.
ئارام‌گرتن. هەدادان. (آرام‌گرفتن)
سێخ : [ناو] سیخ(۱)یەکەی شماردنی کەباب؛
(۲) شیشی کەباب برژاندن. (۱و۲سیخ)+
سیخاندن : [چاوگە] دەنگی هەناسـە؛ دەنـگ
لە سینگەوەهاتن. (خس‌خس‌سینە)+
سیخمە : [ناو] سووخمە؛ ئێلەک؛ کوڵونجەی
بیٚقۆڵ. (یلک)
سـیخوار : [نـاو] زوقـم؛ ئاڵشـت؛ خـووس؛
خووسار؛ خووێز؛ سیخار.جیلە. (پژ)
سـیخوارلەپشـت : [نـاو،ت] دەسـتەواژەی
ڕاوکەرانە؛ هەڕەتی قەڵەوی و خێرایـی کـە-
روێشـک (ب) کـاتی پـاییزێکی درەنـگ.
(اصطلاح‌شکارچیان.آخرپاییز)
سیخە : [دەنگە ناو] دەنگی‌سـینگ و سـییە-
لاک لە کاتی هەناسە هەلکێشان‌دا. (صدای-
خس‌خس‌سینە)+
سـیٚدەنگـان : [نـاو،ت] بـەسـیٚدەنگـان
بانگکردن؛ زۆر بە دەنگـی بـەرز بـانگکردن.
(باصدای‌بلندصداکردن)
سێرب : [ناو] خەڵک و مەردومی سێربسـتان
کـە لـە ڕەگـەزی ئیسـلاوەکـانی باشـوورن.
(صرب)
سیرداخ : [ناو] سیری‌وردکراو و سوورکراو لە
ناو ڕۆندا چەشنی پیازداخ. (سیرداخ)
سیرماست : [ناو] سیری جنراو لە ماسـت دە-
کریٚ و دەبێتە سیرماست. (سیرماست)
سیرنۆک : [ناو] تەرزەی ورد. (تگرگ‌ریز)
سێرۆ : ناوچەییٚکە لە ڕۆژ ئاوای شاری ورمیٚ.
گوندێکــە لــە ســەرســنووری ئێــران و
تورکیا.(سرو)
سیروان : ناوی پیاوانە. (اسم‌مرانە)+
سێرووفەلە : [ناو] تەیرەکـوێرە؛ باڵداسـووکە؛
تەیرەڕەشکە. (پرستوی‌سیاه)
سیرە : [دەنگە،ناو] دەنگی‌هەڵۆ؛ دەنگی کە-
وشی تازە و تەنگ لە کاتی ڕێگـە ڕۆیشـتندا؛

جیڕەجیری کەوش؛ (ئامینیٚ نازەنینیٚ سیڕەی دیٚ لە پۆتینیٚ «فۆلکۆر». (صدای جیرجیر کفش)
سیٚرە: [ناو] (١) سەهرە؛ سـەیـرە؛ جۆرێـک- فڕندەی دەنگ‌خۆش. (سهره)(٢) سیلە و چە- فتە گرتن؛ میزان کردنی تفـەنـگ لـە سـەر ئامانج. (نشانەرفتن)
سیرەت : [ناو] ئابڕو. (بیٚسیرەت کـردن: بـیٚ- ئـابڕوکردن: بـەنـاڕەوا کچێنـی هـەڵگـرتن).
(سیرت) (٢ب) کێر؛ (آلت تناسلی مرد)
سیرەسەگانە : [ناو] گیاییٚکە سەلکی بنەکەی لە پیاز و سیردەکا. (سیرکوهی)
سێزوو : سەیزوو؛ سوٚزی؛ سبەینـیٚ؛ بـەیـانی؛ شەوەکی؛ سبحا. (فردا)
سیسوو : [ناو] بڕبەنـدی سـیٚ سـووچ؛ سـیٚ- گوشە. (سوهان‌سەگوش)
سیغاری : [ئاوەڵنـاو] خووگرتـوو بـە کێشـانی سیغار؛ جگرەکێش. (سیگاری)
سیغە : [نـاو] ژن مـارەکردنـی کـاتی یـان داییمی؛ (ب) مارەکردنی‌کاتی. (صیغە)
سیغەکردن : [چاوگە،ت] ژنێک بەهاوسەریی کاتی، مارەکردن. (صیغەکردن)
سیغەیی : [ئاوەڵناو] ژنێک کە سـیغەکـراوە. (صیغەای)
سیفر: [ناو] ژمارەییٚکە لە یەک کـەمتـر؛ لـە گەرماپیٚودا خاڵی بەینی سـاردی و گـەرمـی؛ نزیک بە هیچ. (صفر)
سێڤـنەرد: [ناو] سێبنـەرد؛ شـقاق. (سـیب- زمینی‌ترشی)
سیڤایی : [ناو] مەلە. (شنا)
سیڤ‌ڕەشک : [نـاو] سـێڤەکێویلـە. (سـیب- کوهی)
سیڤیل: اند؛ فد؛ فرد: [ئاوەڵناو] سیویل؛ قەرە- یـەخـە؛ کـەسـێک کـە عـەسـکەری‌نییـە. (سیویل)+
سیقلبۆق: [ئاوەڵناو] ژنی زمان شڕ و بیٚشەرم و هەوەسباز. (زن‌هوسباز)
سیقەتۆرە : [ناو] سیکەتۆرە؛ لـە زۆربـەی فـە رهەنگەکانـدا بـە جێکـەڵـدان و جیقـەڵـدان ماناکراوە، بەڵـام سـیکەتـۆرە زیخـەڵدانـە و (کوڵەزرگ)یشی پێدەڵێن و کیسەییٚکی بەقەرا گورچیلەی کاوڕ دەبێت و ڕەنگی سووری زۆر تۆخە و دەخورێت بەڵام جیکەڵدان ناخورێت. (سنگدان)
سیٚکانیان: [ناو] کێوێکی بەرزە نزیک‌کێـوی ڕەقیتان(لەیلان‌چۆغە) لە باکوری‌شاری‌سەقز. (نام کوهی‌است )
سـیکتر: [کـاری ئـەمـری] لـە وشـەی (سیکدیر)ی تورکییەوە هاتووە بەواتای(بـدەر، بڕۆ بدە) لە کوردیشدا واتای بە سووکایەتییە- وە دەرکردن دەگەیەنێت، گومبە لەبەر چاوم؛ بڕۆ گومبە؛ بڕۆبدە. (برو گمشو)
سیکەنوسـەرخـان : [نـاو،ت] بـە جێگـای قەرەباڵغ دەڵێن کە هاتوچۆی زۆربێت. (جای شلوق)
سیلسانک :[ناو] سەقری سپی‌واش؛ جۆرێک مشک‌گرەی سپی‌واش. (چرغ‌سفید)
سێلم : ناوی چیاییٚکە نزیکی حاجی‌ئومـەران. (نام‌کوهی‌است)
سیلۆخ : [ئاوەڵناو] لەڕ و لاواز. زەردەڵ و نە- خۆش و کز. (مریض‌لاغرومردنی)

سیلەوچەفتە : [ناو] سێرە؛ سێرەگرتن بەتفەنگ بۆ پێکانی ئامانج. (نشانەرفتن)
سیم : [ناو] تێل؛ تەل؛ سیلک. (سیم)
سیمان : فد. [ناو] چیمەنتۆ. (سیمان)
سیمڕسیمڕ: [ناو،ت] سمرسمر؛ هەراوهوریا و دەمەقاڵە. (هیاهو)
سیمرووکە : [ناو] سیرەکێویلە.(سیرکوهی؛ سیرخرس)
سینا: (١)ناوی‌پیاوانە. (اسم‌مردانە). (٢) ناوی- کێو و سارایێکە لە فەلەستین. (صحرای- سینا)+
سێناریۆ : فرد.فد.اند. [ناو] دەستەواژەی سینەماییە؛ فیلم‌نامە؛ دەقی نووسراوەی حەکایەتی فیلم. (سناریو)
سینجوڕ: [ناو] سنجر؛ تیشکی‌ئاور؛ شوڵەی‌ئاور. (شرارەآتش)
سینگوڕ: [ئاوەڵناو] قەڵەو؛ گۆشتن. (چاق)
سینگەسۆژ : [ناو،ت] دڵەکزێ؛ ژانی سینگ و سک. (دلدرد.سینەدرد)
سینمائیسکۆپ : [ناو،ت] سینەماییێک کە وێنەکان لە سەر پەردەیەکی پانتر لە سینەمای ئاسایی نیشان‌دەرێت. (سینما سکوپ)
سینەبەند : [ناو،ت] جۆرێک ژێرپۆشی ژنانەیە بۆ بەرگری لە داچۆڕان و داهێزرانی مەمک. (پستان‌بند)+
سێنەر : [ناوبک] بسێن؛ کەسێک کە دەستێنێ یان دەکڕێ؛ کڕیار. (گیرندە.خریدار)
سینەڕاما : فرد.فد.اند. [ناو] شێوەیێک لە فیلم هەڵگرتنی سینەماییە کە بە سێ کامێرا و چەند ئامێری دەنگ‌هەڵگر، تۆمار دەکرێت و لە سەر پەردەیەکی پان و چەماوە بەسێ (پرۆژێکتۆر) نیشان دەدرێت. (سینەراما)
سینەکێش: [ناو] سیغارکێشێک‌کە دووکەڵی سیغار دەباتە نێو سییەکانییەوە. (سینەکش)
سێنیزام : [ناو] ئامێرێک لە بیچمی سێ شەویلکە، کە بە پێچ لەیەک دەکرێنەوە و دەبەسترێن و بۆڕاگرتنی مەتە بەسەر دڕێلەوە بەکار دەبرێت. (سەنظام)
سینی‌مال: [ئاوەڵناو] سینی‌ماڵ؛ کاسەلێس؛ چڵکاوخۆر؛ (ب)خۆ بە بێگانەفرۆش. (سورچران؛ خودفروختە)
سیواد : [ناو] سپیایی بەیانیان و سوورایی ئێوارانی سەر ئاسۆ. (سفیدی‌وقرمزی‌افق- درصبح‌وغروب)+
سێدووکردن : [چاوگە،ت] لای‌خۆ بەراوەردکردن یان حیسابی چاکی و خراپی یان قازانج و زەرەرکردن؛ تۆیش سێدووی دڵی خۆتبکە؛ واتا لێکی بدەرەوە. (برآوردکردن)
سێودووکردن: [چاوگە،ت]لای‌خۆ هەڵسەنگاندن و بەراوەردکردن. (تحمین‌زدن)
سێوراو :[ناو،بەر]سێویاگ؛سوواو.(سائیدە شدە)
سیوسیوە : [ناو] تەوەرەی بانگردێن. (محوربام‌غلطان)
سی‌وشکە : [ناو] (١)جۆرێک ژوژو لە چالەکە دەکا و تیرها وێژە و دڕکەکانی وەک تیر دهاوێت بۆ بەرەنگاری لە دوژمن: (نوعی- خارپشت‌تیرانداز) ؛ (٢) فسۆس؛ خۆبە دوژمن فرۆش؛ نیشتمان فرۆش. (جاسوس) (٣) جۆرێک نەخۆشییە کەمرۆڤ تێرناخوا لە خواردنی ئاو؛ ئێسقا. (استسقا)

سێوه : [ئاوەڵناو] هەتیو؛ منداڵی بـێدایـک و باب؛ سەغیر. (یتیم)
سێوەخته : (ب) سبەینـێ و نیـوەڕۆ و شـەو؛ (سێژەمە). (سەوعدە)
سێوەڕۆ : [ناو] سـیبەڕۆ. یـاوینۆبـە؛ تـەوی-ماڵاڕیا. لە سێڕوژدا جارێک یاوکردن؛ نۆبـە-تێ. (تبنوبە)

سـێوهەرمـێ : [نـاو،ت] میـوەی دارسـێوی موتوربەکراو لـە دارهـەرمـێ؛ سـێوی‌گوڵـاو. (سیب‌گلاب)
سێویخانه : [ناو،ت] جێگای منداڵی بێبـاب-ودایک بە خێوکردن. (یتیم‌خانه.دارالایتام)
سێوی‌گوڵاو : [ناو] بەری داری پەیوندکراوی سێو لە هەرمێ. (سیب‌گلاب)

سابووتاژ : فرد.اند.فد؛ کارشکێنی؛ کۆسپ-خستنە بەرپا. (سابوتاژ)
ساپۆرت : پشتوانی؛ پشتەڤانی. (ساپورت)
سادیست : سادیسمی؛ تووشی ئازاری-سادیسمهاتوو؛ ئازاردەر. (سادیست)
سادیسم : فرد.اند.فد؛ مەردم ئازاری؛ (ب) سوکنایی هاتنی جنسی بە ئازاردانی لف. (سادیسم)
سازمانی و ڵاتە یەکگرتوەکان: ڕێکخراوی میللەتگەلی هاوبەش و هاوپەیمان. (سازمان-ملل متحد)
ساسات : کەدەستەیێ بۆ کەمکردنەوەی هەوا لە کاربوراتۆری سەیارەدا. (ساسات)
ساقدۆش: [ناو] ساخدۆش؛لە تورکیشداهەیە بەواتای شانیڕاست (ب) برازاوا. (دوستان داماد)
ساڵۆن : فرد.ایتا.فد.اند. [ناو] هۆڵ؛ ئۆدەی زۆر گەورە؛ تەلاری بەرفراوان. (سالن)
ساندویچ : فد.اند.[ناو] بابۆڵەی درێژ؛ پێخۆری لە نان پێچراو؛ ڕیوایەتەکە قومارباران دایان-هێناوە و کردویانە تە باو (ساندویچ)
سپایدانش : [ناو.ت] سەرباز موعەلیم؛ لەزە-مانی حمەرەزاشادا هێندی سەربازی سە واددار تەرخان دەکران بۆ دەرس وتنەوە بە منداڵانی دێهات لە جیاتی خزمەتی سەربازی. (سپاەدانش)
سجاف : [ناو.بەر] دووراو ، تەقەڵ لێدراوی پەڕاوێزی لیباس. (دوختن‌حاشیەلباس)

سللوول : فد، اند؛ فرد. [ناو] بچووکترین بە-شی هەرماکێک کەنیشانەی ئەوماکەی پێوە-بێت. (سلول)
سللوول: فدە ژووری یەک کەسیی-زیندان.(سلول)
سۆلفێژ : بەدەنگ‌وتنەوەی نۆتەکان بۆ فێر بوونی مۆسیقا. (سلفێژ)
سۆلیست : تاکەژەن؛ کەسێک کە سازی سۆلۆ(تەنیا) لێدەدا یان ئاوازی تەنیا لە کۆڕدا دەچڕی. (سولیست)
سۆنات : فرد.اند.فد.ایتالیاد؛ بەستەیێکی مۆسیقای بی‌گۆڕانیبێژە و تایبەت بە ئوروپایە. (سونات)
سوورپریز : فرد.اند.فد؛ کاری چاوەڕوان نە کراو کە ببێتە هۆی دڵخۆشی و شادییکە سانێکیتر؛ جۆرێک مزگینی؛ (سورپریز)
سووررئالیست :فرد.اند.فد؛ شوێگرانی سوور رئالیسم. (سوررئالیست)
سووررئالیسم :بزاڤێکی هونەری و ئەدەبییە و بڕوای بە خستنە پێش‌چاوی سەربەست و ئازادانەیبیر و بۆچوونە، بەبێ ئەوەی عەقل و بڕیار و ڕەسم و ڕسووم ئەوبیر و بۆچونە تێکبدا. (سوررئالیسم)
سووسیالیسم :فرد؛ اند؛ فد؛بڕوابەلاچوونی دەستەڵاتداریی (کەس) بەسەرئامێرەکانی بە-رهەم هێنەر و سەرمایەدا؛ سیستەمی حوکومەتی دامەزراو لەسەر ئەوبیروبڕوایە. (سوسیالیسم)

سووسیالیسمی میللی : فد؛ (ب) نازیسم؛ ئامۆژەییێکی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی کە لە نیوەی ئەوەڵی چەرخی بیستەمدا لە ئاڵمانیا پێک‌هات و ڕەگەزپەرەستی تاڕادەییێک پەرە-ی سەندکە لە ناو عەسکەری و ئە فسەرانی هیتلێریدا بوو بە هۆی ڕێکخستنی ئێس-ئێس. (نازیسم؛ناسیونال‌سوسیالیسم)
سەدادار: [ئاوەڵناو] وشەییێکی فارسییە بەڵام لە کوردیشدا هەیە؛ دەنگ‌دار؛ هەر شتەدەنگی لێوەبێت؛(ب)سازی خۆش‌دەنگ و دەنگ‌بەرز. (صدادار)
سەرپەرستار : [ناو،ت] سەرۆک و بەرپرسی پەرەستار گەلی نەخۆشخانەیێک. (سرپرستار)
سەرچەشمە: [ناو] سەرچاوە؛ بناوان. (سرچشمه)
سەردۆشی: [ناو] (وشەیێکی فارسی و کوردییە) پاگوون. (پاگون)
سەردەفتەر: [ناو] بەرپرسی نووسینگە؛ سەر-دەفتەری ژن‌مارەکردن و تەڵاقدان. (سردفتر)
سەرڕشتەداری: [ناو] مەرزینگەی دابین-کردنی ئابووری لە عەسکەریدا. (سررشته-داری)
سەفیر : [ناو] سەرئێلچی؛ باڵوێز؛ بریکاری بەڕێکراو بۆ ئەنجامی کارێک. (سفیر)
سەمبول : فردانفد؛ سەنبول؛ ئورناک؛ نمانا؛ شیاوی بە نموونەکردن. (سمبل)
سەمبولیست : فردانفد؛ ئورناک‌خواز؛ نموودەخواز. (سەمبولیت)

سەمفۆنی فردانفد؛ مۆسیقای درێژخایەنی چووار بەشی کە بە ئورکێستری فرەسازی لێدەدری. (سمفونی)
سەناتۆر: فرد؛ فد: [ناو] نوێنەری مەجلیسی-سەنا؛ ئەندامی پەڕلەمانی پیران لە ڕۆمیقە-دیمدا. (سناتور)
سێرۆم: [ناو] تراوێکی دەرمانی و خۆراکییە بە شرینقە دەکرێتە ناو دەماری هەندێ نە-خۆش. (سرم)
سێکولار : فردانفد؛ لادینی؛ بێدینی؛ بایەخ بەدین نەدان. (سێیکولار)
سێکولاریسم فردانفد؛سیستەمی لادینی و حوکومەتێک کە پێوەندی بەدینەوەنییە. (سیکولارسم)
سێڵف‌سرویس : چێشتخانە و ڕەستۆرانی بێ پێشخزمەت کە موشتەری خۆی خۆراک دە-باتە سەر مێزەکەی خۆی. (سلف‌سرویس)
سیلۆ : [ناو] هەماری گەورە و فەننی(فەنانی) بۆ ڕاگرتن و خراپ نەبووتی ئارد و دانەوێڵە و ئاڵف. (سیلو)
سیم‌کارت : انفد؛ [ناو] کارتێکی چکۆلەیە لەناو مۆبایلی دەنێن. (سیم‌کارت)
سێناریۆ : فردانفد؛ فیلم‌نامە؛ نووسراوەی داستانی‌فیلم. (سناریو)
سێنت : یەک لە سەدی دۆڵارێک. (ینت)
سیویل : فدفردانـد؛ قەرەیەخە غەیری ئە-سکەری.(غیرنظامی)+

# ش

شابک: [ناو] (١) چۆغە. (چوخـا). (٢) قـەفـی بسک‌کە دەکەوێتـە نێوچـاوان. (حلقـەزلـف)
شابەلووت : [ناو] جۆرێـک بـەڕوو؛ شـابەڕوو. (شاه بلوط)
شابەنگ : >بۆژانە سیاوە
شابی : > شاویرۆڵ
شاپ : [ناو](١)شوێپ؛ جیٚپا؛ ڕچە. (رد.جای‌پا) (٢) زاب؛ سواڵەت یان بەردی خڕی چکۆلەی پان. (سنگ یاسفال‌پهن وکوچک)
شاپانیٚ : [ناو] شاپان؛ زاپێن؛ کایە بەزاب؛ کایە بە شاب >شاب٢. (نوعی‌بازی)
شاپک : >شابک
شاپوور:ناز ناوی چەند شای ساسانی لە ئێران. (شاپور؛ شاهپور)
شاپەسەند: ناوی گوڵێکە و ناوی ژنانەیشە. (شاەپسند)
شاتۆن:[ناو] کەرەستەییٚکە لە مۆتوڕی سەیارە و هەرکەرەستەی سوپاپداردا. (شاتۆن)+
شاتەڕەدێمی: [ناو] گیایکەرمەژن؛ توونەگیا. ( خردل‌وحشی)
شاجۆگە:[ناو]جۆگەی سەرەکی‌کە چەند جۆ گەی لیٚجیا دەبێتەوە. (جوی‌بزرگ؛ کانال)
شاخبێزی : [ناو] شاخبزی؛ مەڕمەڕشا؛ هوما یی؛ مەڕمەڕش؛بلووری؛بالبالی؛ پیرانشا؛مۆری. (چلوار)
شاخ‌دەرهێنان:[چاوگە،ت] (١)شاخ ڕووان لەسەر سەری‌کاوڕە نێر و ئاژەڵی‌تر.(شاخ‌روئیدن)(٢ب) واق‌وڕمان؛سەرسووڕمان.(ازتعجب شاخ‌درآوردن)
شاخەوشاخ : یاڵەویالٚ؛ لەم لک بۆ لکی دارێکی تر. (ازاین‌تپە بەآن‌تپە؛ ازاین‌شاخە بەآن‌شاخە)
شاخەوەرز : شاخەوان. (کوهنورد)
شادی : ناوی ژنانەیە. (اسم زنانە)
شار : [ناو]مووروویی‌کانزای نێو بۆڵبرینگ؛ تۆپی دارینی یاریی بیلیارد. (شار)+
شاراشۆ : شارشێوێن؛ شەڕئاشۆ؛ شەرهەڵایسێن. (شهرآشوب؛ آشوب‌طلب)
شاربازێڕ :شارێکە لە کوردستانی باشوور.(نام شهریست)
شاربەدەربوون : [چاوگە،ت] لە شار دەرچوون یان لە شار وەدەرنانی‌کەسێک. (نفی‌بلدشدن)
شاربەدەرکردن : [چاوگە،ت] لەشاردەرکردن؛ (ب) دەربەدەرکردن. (نفی‌بلدکردن)
شاردار : [ناو] سەرۆکی شار؛ بەرپرسی شار؛ (لە باشوور شارەوان). (شهردار)+
شارۆچکە : شارۆکە؛ شاری بچووک. (شهرک)
شارۆکردن:[چاوگە،ت]گەڕان؛پشکنین؛توێژینە وە؛ لێکۆڵینەوە. (تحقیق‌وگشتن‌بەدنبال‌چیزی)
شاروێران : ناوچەییٚکە نزیکی مەهاباد. (ناحیە ای‌نزدیک‌مهاباد)
شارمزەردەوالە :[ناو] جیٚی ژیانی تاقمیٚ هەنگە ژاڵە و هەروەها شارە مێلوورە. (مکان و سوراخ کلنی‌زنبور)

شارەزەرگەتە : [ناو] شانە و کونی هەنگەژاڵە. (لانە زنبور) >شارە زەردەواڵە
شاسپەرەم :[ناو] ڕێحانە؛ شائەسپەرەم. (ریحان)
شاشە :ڕووپەڕی شووشەی تەلەفزیۆن کە وێنە دەنوێنێ. (صفحەتلویزیون)
شاعیر:[ناو] هۆنەری شێعر؛ هەڵبەستڤان.(شاعر)
شاکار:[ناو] کاری بەرچاو؛ جوانترین کردەوە یان دەستکرد. (شاهکار)
شاکلیل: [ناو] کلیلێک کە زۆربەی قوفل بکاتە وە کلیلیدز؛ (ب)لابەری زۆربەی گیر و گرفت و کێشە.(شاه کلید)
+ شاکە:(١)بینەر؛ سەیرکەر؛(تماشاگر) (٢)خوێ فرۆش. (نمکفروش)
شاگوڵ : ناوە بۆ ژنان بەتایبەت لە ناوچەیسنە (نامزنانە)
شاڵگەردن : [ناو] ئلێمی؛ ملپێچ؛ شاڵیدەوری مل. (شالگردن)
شالووک: [ناو] شالوول؛شالوور؛ ڕیشۆڵی؛گاوانی. (سار)
شالی :[ناو] مەزرای برنج؛چەڵتووک؛ شەڵتووک . (شالی.شلتوک)
شـالیجـاڕ : [نـاو]جـاڕی برنجـی دروێنـەکـراو. (شالیزاردرو شدە)
شالیکار : [ناو] فەلای برنج چێن. (شالیکار)
شالیگا : [ناو] جێی چاندنی برنج؛ جاڕە برنج. (شالیزار)
شامپانی:جۆرێک ترێڕەشە لە وڵاتی شامپاینی فەرانسە کە شەڕابێکی هەر بەو ناوە لێدروست دەکەن. (شامپاین)
شام : [ناو] قامیش. (نی)
شامپۆ : [نـاو] تراوێکـە بـۆ سـەر و قـژ شـتن. (شامپو)
شامەترووکـە:[نـاو]هـەنگێکـی چکۆڵـەیـە لـە کولـۆرەی دارانـدا شـانە دەبـەسـتێ. (نـوعی- زنبورعسل)
شامیران : [ناو] شایشاهان؛ میریمیران؛ شای میران. (شاهنشاه)
شانامە : [ناو] دیوانە شێعری فیردەوسی تووسی ؛ شاهنامە. (شاهنامه)
شانای :خستن؛ بڵاوکردنەوە؛تۆمچاندن؛ هەڵ خستنی مۆرەی نەرد؛ ڕەوانەکردن؛ ناردن؛ نار دی. (روانە کردن)+
شاندار : [ناو] بەشکۆ؛ مەقامدار؛ پایەبەرز؛شیاو. (بلندمرتبه)
شانداهێشتن : لەسەرتەنیشت درێژ بوون؛ شان دادان. (روی پهلو درازکشیدن)
شانک : [ناو] ئازەوی؛ ئازەوە؛ جوانەزمە.(جوش جوانی)
شانکڕ : [ناو] دووایین پلەی سفلیس. (شانکر)
شانلەشاندان : (ب) خۆ هەڵسەنگاندن وێبە ڕانبەرگرتن لەگەڵ پلە و پایەی کەسێکدا.(همپا - بودن)
شانوشکۆ : [ناوەت] پایەبەرزی؛ مەقامی بەرز . (شکوهمندی)
شانۆکێ:[ناو] گیای جافریکێوی؛دژی ئوورەی خوێنە. (جعفری)
شانەچرکێ :(ب) لەناو حەشامەتدا بەزۆر ڕێگا کردنەوە و دەرباز بوون. (درجمعیت بزورراەباز کردن)
شانهەڵتەکاندن : نیشانەی بێتەفاوەتی و

بیٚدەروەستی واتا بەمن‌چی؛ کەیفی‌خۆتە. (شانەبالاانداختن)

شان‌هەڵگرتن :شایان‌بوون؛لایق‌بوون؛شیاوی. (لیاقت)

شانەی‌خوری : [ناو،ت] جۆرێک شانەی‌گەورە لەکانزا بۆ شی‌کردنەوەی خوری و مووی ئاژاڵ . (شانەپشم)

شانەی‌هەنگووین: [ناو] شانی هنگڤین؛ خانە خانە لە مێو، جێگەی هەنگوین و بەچکەی هە نگ.(شانەعسل)

شاووڵ :[ناو] شاغووڵ؛ئامێری هەڵچنینی دیوار ی ڕاست. (شاغول)

[ناو] ڕێڤەبەر؛ بەڕێوەبەر؛ بەرپرس؛مودیر. (مدیر)

شاویر :[ناو] چەند گۆلاوی‌گچکە نزیک بە یە ک. (چالەهای‌پرازآب کنارهم)

شاوێر : [ناو] شاوەر؛ شەوەر. (شبدر)

شاویروڵ . [ناو] شابی؛ دارێکە لە میسرەوە هاتو وە عارەقێکی لێدەگرن بەناوی عارەقی بیدمشک بۆ نەخۆشینی دڵ‌بەکەڵکە. (بیدمشک)

شاوێری : [ناو] قاڵابن؛ ڕێواسی‌کوڵەبنە. (ریواس ساقەکوتاە)

شاهدانە : [ناو] گیاییێکە لە گەڵاکانی حەشیش دروست دەکەن و بە بەرەکەیشی کە لە هەرزن دەکا و دەخورێ دەڵێن شادانە یان شاهدانە. (شاهدانە)

شاهید : [ناو] شایەت؛ گەوا؛ شایەد. (شاهد)

شاهیک :[ناو] جێگای لووس‌و خلیسک.(جـای‌لیـز)

شاهی‌کەو : [ناو،ت] کەوێک کە پەنجە و چاو و دەندووکی مەیلەو زەردبێ. (نوعی‌کبک‌نوک‌زرد)

شایجان : بانگ‌کردنی ژنانە بە تەوسەوە؛ باجی شایجان؛ لەناو کوردەکانی خۆراساندا ناوی ژنانە . (خطاب‌تمسخرآمیززنان؛ نام زنانە)

شاینەک : شاهێنەک؛ باشوو<باشوو

شایەتیمان : [ناو] شاتیمان؛ شادەئیمان؛شادیمان . (کلمەشهادتین)

شایی‌شایی:(١ب) کۆکردنەوەی پارە، شایی لە-گەڵ شاییدا و بە زەحمەت؛ ئەو پارەیـەم شـایی‌شـایی و قڕان‌قڕان کۆ کردوەتە وە. (شاهی‌شاهی). (٢) خۆشی‌خۆشی(خوشی‌وسرورزیاد)

شباندن : [چاوگە،ت] شوبهاندن. (تشبیەکردن)

شبرەو : [ناو] شبرۆ؛ جۆرێک چەرمی بریقەدارە کەوشی لێ چێدەکەن. (شبرو)

شپک : [ناو] ماڵوو؛ دارێکی درێژە کە لە ناوەڕا ستیدا کونێکی تێکراوە و دەچی بە سەر دەندی ئامووردا و بەسەر زەوینی شێو بڕاوداڕایدەکێشن بۆ ڕێککردنی گری وگۆڵ وکوڵۆ. (نوعی‌مالە)

شپنەکردن:[چاوگە،ت] پاش شێوبڕپنی زەوی ماڵووکردن؛ ڕێک‌کردن بە ماڵوو. (صاف‌کردن زمین‌شخم‌زدەبامالە)

شرپوش :[ئاوەڵناو]لیباس‌شڕ؛کەسێک کە جلی شڕ وکۆنە لە بەر دەکات؛ مرۆڤی شڕۆڵ. (ژندە پوش)

شرپە :[دەنگەناو] شلپە؛ دەنگی شتی نەرم کە وەعەرزبکەوێت؛ دەنگی شتی کە بکەوێتە ناو ئاو(صدای‌درآب‌افتادن‌چیزی) شڕابە؛ گولینگ؛ مەنگۆڵە؛ شوڕابە. (منگولە)

شڕکردن : (١)لەت‌وپەت‌کردن؛ دڕاندن. (تکە پارەکردن). (٢) سەرزەنشتی زۆر بە توووڕەییەوە

یان فەزیحەت بەسەرهێنان و تەمبێ‌کردن و ئابڕوو بردن. (آبروریختن)
شرۆچی : [ناو+بک] شرۆڤەکەر؛ شیکەرەوەی باس؛ لێکدەرەوەی خەبەر. (مفسر)
شر و شڕۆل:بێ‌سەروبەرە و بێ‌واتا؛ شڕو وڕ. (بەقەسیدەی شڕ و شڕۆل) «قانع»(بیمعنی؛ ژنده)
شڕۆڵ : شڕۆڵە؛ تیتۆڵ؛ ڕیشاڵ؛ بزگوڕ؛ ڕیندوڵ. (ژنده‌پوش.؛ نوارپارچه‌کهنه)
شروو : [ناو] شروێ؛ دارێکی کورتە باڵایە ، کوڵێندراوی گەڵاکەی بۆ شۆردنی لەشی کە سێک کە نەخۆشینی کەوتەیی‌گرتووە یان زەر دوویی‌گرتوو بەکەڵکە.(کرکو؛ افرای‌صحرایی)
شڕو وڕ : [ئاوەڵناو] دڕاو؛ لەکارکەوتوو؛ ونجڕو نجڕ؛ ڕزیو؛ پرتووکیاگ. (داغان؛ پاره‌پوره)
شریت : [ناو] بەن؛ ڕێسمان؛ هەر شتی باریک و ناسکی وەک قەیتان یان نەوار. (ریسمان؛ نوار)
شریت‌پڕکردنەوە : [چاوگە،ت] نەواری کاسێت یان ویدئو تۆمارکردن و زەفت‌کردن(نوارپرکردن)
شریخ‌وهۆڕ : [دەنگە ناو] گرمەوگوڕە؛ گرمەگرم؛ شریق وهۆڕ. (غرش‌پی‌درپی)
شفرە : [ناو] تانە؛ کینایە؛ تەوس. (رمز)+
شفرەی‌فیل : [ناو،ت] دوو ددانی درێژی‌فیل کە زۆر بەنرخە، لە ناسککاری و خاتەمکاریدا بەکە ڵکە. (عاج‌فیل)
شفەژی : شیربەشیر؛ زگپڕ بوونی ژنێک‌کە شیر بە منداڵەکەی دەدا. (حامله‌شدن‌زن‌شیرده)
شقڤوت : قەمچی‌کوت؛ ئاوزەنگی‌کوت؛ (ب) زۆر بە لەز ئاژۆتن؛ یان بەلەز بە ڕێگادا ڕۆیشتن. (راه رفتن‌یا راندن باعجله )
شڤکوت :> شقڤوت .
شڤیلە : [ناو] شەوڕەو؛کەسێک بە شەو بە ڕێدا دە ڕوا. (شب‌رو)
شقاق :[ناو] سێبەنەرد؛ سێوەبن‌عەرزیلە. (سیب ترشی)
شکافە : [ناو] میزراب؛زەخمە؛ نەغمە. (ئامیری تارژەندن)
شکاکی : [ئاوەڵناو+ناو]پێوەندیدار بە شکاکەوە؛ جۆرێک‌هەڵپەڕین.(مربوط‌به‌شکاک؛نوعی‌رقص)
شکاندنەوە: [چاوگە،ت] (١) دەستەواژەی گۆرە ویبازانە؛شکاندنەوە یان چوواندنی گۆرەویی بێ پشکێل لە جۆرابێندا. (پوچ کردن جوراب درجو راب‌بازی)(٢)پاش‌دەمکێشانی چایی ئیستیکانێ ک پڕکردن و دیسان‌کردنەوە ناو قۆری. ( ازقوری‌یک استکان چای‌پرکردن و دوباره دا خل قوری ریختن)
شکایەت: [ناو] شکات؛ گازەندە وگلە وداد خو ازی. (شکایت)
شک‌بۆچوون : گومانکردن لە کەسێک؛ گومان بردن.(گمانبردن)
شکست : نوکوولی؛ شکان؛ بەزین؛ کۆڵ‌دان. (شکست)
شکست‌هۆربەستەی:چاوگە،ت]هەڵبەستنەوەی شکاو. (شکسته‌بندی)
شک‌لێکردن : [چاوگە،ت] گومان لە کەسێک کردن. (به‌کسی‌شک‌کردن)
شکۆ : [ناو] جەلال؛ لەگەڵ شەرمدا دێ، شەرم وشکۆ: شەرم و حەیا. (شرم و حیا)+
شکۆفە : [ناو] واباوە بە گوڵی داری بەر دەڵێن، بە ڵام شکۆفە گوڵی نەکراوەیە؛ پشکوژ؛ خونچە. (غنچه)

شکەڤ : [ناو] دەبە؛ تەنەکە پووتی‌نەوت؛ دەفر ی گەورە وەک بەرمیل؛ چەلەنگی‌نەوت. (پیت)
شکەنجە : ئەشکەنجە؛ ئازار. (شکنجە)
شکێن : [پاشگر][ناوبک] شکێنەر؛ کەسێک کە دەشکێنێ. (شکست‌دهندە؛ شکنندەچیزی)
شلاتی :> شەلاتی.
شلپ‌وهۆڕ : [دەنگەناو] شلپەشلپی زۆر. (شلپ شلوپ)
شلپیتاو : شۆرباوی زۆرتراو و بێ ڕۆن. (کنایی، شوربای‌خیلی‌آبکی)
شلتە : [ناو] دۆشەک؛ ڕایەخی نووستن.(تشک)
شلکردن : [چاوگە،ت] نەرم‌کردن؛ (ب) فش کردن. (نرم‌کردن؛ اخ‌کردن وتحویلدادن)
شلکەڕان :[ناو] نەرمەی‌ڕان(شلکەڕانی بگووشم بۆنی لەسینەومەم‌کەم) «مێمن» (نرمی‌ران)
شلکەگووێ : [ناو]جێگای کونکردنی گووێچکە بۆ گوارە؛ نەرمەی‌گوێ. (نرمە گوش)
شلوێ: شلەژاو؛ ڕەنگ تێک‌چوو.(رنگ‌باختە؛ آشفتە)
شلەپاندن:[چاوگە،ت] شلەقاندن؛ بەیەکدا دانی شلەمەنی. (جنباندن و بهم‌زدن‌مایعات)+
شلەساوار : [ناو] بڕوێشینی‌تراو. (آش‌بلغورآبکی)
شلەمەنی :[ناو] تراو؛ ئاوەکی. (مایعات)
شلەوبوون:[چاوگە،ت]شل‌بوونەوە؛تراوبوونەوە؛ نەرم‌بوونەوە. (آبکی‌شدن؛نرم‌شدن)
شلەوقولە : [ناو،ت] گەدەوگودە؛ بەرەڵاوهەرەڵا؛ لات‌ولووت. (لات‌ولوت)
شمش:[ناو]لە قاڵب دراوی کانزا؛ وەک شمشی تەڵا. (شمش)
شمشێربالْ : تەیرەکوێرە؛ تەیرە حەوایيلە. (پر ستوی‌سیاه)
شمشێرسیێ‌چارەکی :(ب)بە ڕواڵەت ئازا و لە ئە سڵدا خوێڕی. (شمشیرسەچارەکی)
شمقاڕ :جۆرێک باڵندەیە لە شاهێن چکۆلەترە و گۆشت‌خۆرە. (نوعی‌شاهین)
شملی‌براکە : >شملْ و بەرەکەت.
شناسای : [چاوگە] ناسین؛ ناس‌کرن؛ شارەزا بوون. (شناختن)
شناسنای : [چاوگە،ت] ناساندن؛ شناساندن؛ شارەزاکردن؛فێرکردن؛ئاشناکردن.(شناساندن)
شنووت : دەستەک؛ دەستەکی دارەڕای خانوو. (تیرسقف)
شوان‌کار : [ناو](١) شوانی بەرغەل. (شبان‌برە). (٢) شوانکارە؛ شوانی‌کردن بە نیوەیی. (شبانی کردن وسهیم‌شدن درمالکیت گلە). (٣) کەسێ کە پیشەی شوانی‌بێت. (شغل‌شبانی)
شوانکیلە :گیایێکە جیوەیێکی کێشداری هەیە. (نوعی‌گیاە)
شوانەوێلە : (ب)مرۆڤی ساکار و گەوج و گێل. (انسان‌سادە)
شوێت‌گرسێن : گیای خشیل؛ کەوڵەگیا؛ دوو دڵۆپ شیلەی ئەوگیایە هەوێنی لیترێک شیرە کە بیکات بە پەنیر. (علف‌پنیر)
شۆخی‌باز : گاڵتەچی؛ گاڵتەوکەپ‌کەر؛ حەنەک باز؛ حەنەق‌باز. (شوخی‌باز)
شۆر :کەڵەسوو؛ مانگایێک‌کە کەڵْ زۆر سواری بێت؛ (ب) هاوجێیی کردنی زۆر و لە سەریەکی نێر لەگەڵ مێوینە.(زیادجفت‌گیری‌کردن‌مادەگاو)
شۆر : سوێر؛ پڕخوێ. (شور)
شۆراقک:شۆراق؛ شۆرک؛ شۆرەکات. (شورەزار)

شۆڕش : ناوە بۆ پیاوان. (اسم‌مردانه)+
شۆڕڤەبوون : شۆڕبوونەوە؛ دالقان؛ هەڵواسران. (سرازیرشدن؛ آویزان‌شدن)
شۆرک : شۆرەکات؛ زەوینیٚ‌کە خاکی سوێر و خوێداربیٚ. (شورەزاز)
شۆڕکردنەوە : [چاوگە،ت] داهێشتن؛ داهێڵان؛ بەردانەوە. (آویزان‌کردن)
شۆرەشوان : [ناو] نانە مرۆچە؛ شەوەرەشەوەن؛ گیاییێکە بۆ خۆراکی ئاژاڵ، لە سەقز و سابڵاغ لە گەڵ قازیاخەدا دەیانکوڵاند بۆ عیلاجی زەردوو یی و ڕاماڵینی زەرداو. (اسپرس)
شۆڕەڵاس : هاواڵی‌خەزال لە بەیتی لاس خە زاڵدا. (نام مردانه)
شۆقاف‌خۆر : شۆقاوخۆر؛ چڵکاوخۆر؛ (ب) نۆکەر و بەرماوەخۆر. (نوکرماب)
شۆقە : لەئارەوی وەرگیراوە< ئاپارتمان (آپار تمان)
شۆک : قولاپی ماسیگرتن. (قلاب‌ماهی‌گرفتن)
شوکرەلات : [ناو] شوکۆلات؛چوکلێت.جۆرێک شیرینی.(شکلات)
شۆکە : [ناو] شیلەییٚ کە مێشوولەی(شەتە) دروستی‌دەکا و لەسەر گەڵای داران بەتایبەت لەسەر گەڵای داربی دەنیشیٚ و تامی شیرینە و لە گەزۆ دەکا. (مدفوع شته)
شۆلکرن : [چاوگە،ت] کارکردن؛ دە وامکردن (کارکردن)
شۆن‌کەفتن : [چاوگە،ت] وەشوێن‌کەوتن؛ بە دووادا ڕۆیشتن؛ (ب) ڕچە و ڕێوشوینی‌کەسێک گرتن. (دنبال‌رفتن؛ دنباله‌روی)
شوواڵپیس : <شەرواڵ پیس.

شوواڵ‌چەپەڵ : <شەرواڵ پیس
شوورتە : کەشک. (شک)
شووشبین : [ناو] شووشبان؛ پیاوانی‌بانگهێشتن کراو بۆ داوات؛ برازاوا . (رفقای‌داماددرعروسی)
شووتیلە : شفتەژی؛ گیاشیر؛ دوو دڵۆپ لە شیلە ی ئەوگیایە دەبێتە هۆی ڕەوانی. (گیاه فرفیون)
شووخاڵ : [ناو] شوێن؛ ئاسەوار. (رد؛ عمل بجامانده)
شووداخ : [ناو] داخی سەر گوێچکەی ئاژاڵ. (داغ‌گذاشتن‌روی‌گوش‌حیوانات)
شوورا : [ناو] شووبرا؛ هێوەر. (برادرشوهر)
شوورەوموورە : شڕوشاتاڵ؛ ئەسپابی نێومالک. (وسایل‌منزل)
شووش : ناوی باژێڕێکی کەونارا لە باشووری ئێران. ( شوش)
شووش : (١) [ئاوەڵناو] باریک؛ (ناو)پەنمانی جێگەی قامچی؛شووش بەستن؛ماسینی جێگای قامچی وەشاندن. (جای‌شلاق) +
شووشبین : [ناو] شووشبان؛ پیاوانی‌بانگهێشتن کراو بۆ داوات؛ برازاوا . (رفقای‌داماددرعروسی)
شووشتەری : (١)جۆرێک ڕاخەری وەک بەڕەیە. (نوعی‌زیلو) (٢) ناوی مەقامێکی ئاوازی کوردی و فارسییە. (شوشتری)
شووشتەری : گوشەییێکە لە مەقامی هومایووندا، هەندیٚ بەبنەمای هومایوونی دەزانن.(شوشتری )
شووشتی :شۆراو؛ [ڕابووردووی شتن بۆ سێهەم کەسی تاک ]: شۆردی. (شستەشدە؛ شست)
شووشی : ناوی قەڵاییێک لە خۆراوای باکووری ئێران بووە. (قلعەشوشی)
شووفا:جەژن،شادی بەهۆی ڕزگار بوونی موو

سابیەکان لە بەندی بابلیەکان لەلایەن کوور شی هەخامەنشیەوە، کە مووساییەکان هەموو ساڵێ لە ئەوەڵی پایزدا دەیگرن. (جشنپاییزی یهودیان)
شووگا : کەڵەکێوی. ( شوکا)
شووگرە:[ناو]جەغزێکی کانزای لەغاوی ئەسب کەلچی خوارووی ئەسب دەچێ بەنێویا. (گیرە لگام)
شویردن : شوارای؛ گوشین؛ شواردەی؛ گواشتن؛ گڤاشتن. (فشردن)
شوێنبەشوێن : یەک لە دوای یەک؛ بە دوای یەکدا ڕەوانەکردن و ناردن. (پشت سرهم)
شوێنگر : [ناو](۱)جێگر؛ بەردیل. (جانشین). (۲) ڕێ و شوێنی کەسێ هەڵبژاردن و کەوتنە سەر ئەو ڕەوشتە. (پیرو)
شەبانکارە : ناوی هۆزێکی کورد، کە دایکی ئە ردەشێری بابەکانی شای ئێران لەو هۆزە بووە. (نامعشیرەای کرد)
شەبخان : [ناو] داوێن و گۆشەی کەوا؛ شاقەل. (دامن کتوعبا)
شەبکاندن : [چاوگە،ت] ئێشاندن؛ ئێشان. (بە درد آوردن؛ دردکردن)
شەبنم : (ف. مشە) شەونم؛ شەڤنم؛ ئاونگ؛ قەرەو. (شبنم)
شەبەکەیچاو : [ناو،ت] تۆڕینەی چاو. (شبکیە چشم)
شەبەنگ : [ناو] تارمایی؛ زۆر لە دوورەوە و بە حاڵ دیار بوون. (شبح)
شەپاڵمە : [ناو] شەپڵاغە؛ زللە. (کشیدە)
شەپاڵۆخ : [ناو] وەروەرە؛ بێڵی بەفرماڵین. (بیل برف‌روبی)
شەپاندن : [چاوگە،ت] شڵەپاندن؛ شڵەقاندن . (تکان‌دادن‌مایعات)
شەپلاندن : [چاوگە،ت] ئاڵۆزکردن؛ شێواندن؛ شڵەقاندن.(آشفتەکردن)
شەپڵەلێدراو : [ئاوەڵناو] سەکتەکردوو؛ فەرکەم کردوو؛ پەرکەم لێدراو؛ (ب)کەسێک کە دەست و پای ئیفلیج(سەقەت) بێ. (افلیج)
شەپەشەپ : [دەنگەناو] تەپەتەپی شتی شۆڕ کە جارجار لە عەرز بخشێ؛ (شلپ‌شلپ)
شەترەنج : [ناو] شەترەنگ بووە بەڵام ئارەو پیتی(گ)ی‌نییە و بووەتە شەترەنج، یارییێکە بە ۳۲مورە دەکرێ. (شطرنج)
شەترەنجی : [ئاوەڵناو] وەکتەختەی شەترەنج خانەخانە؛ چوارگۆشە چوارگۆشە. (شطرنجی)
شەترەنگ : [ناو] ناوی‌پێشوی شەترەنج؛ لە بەر ئەوە ئارەو پیتی (گ)ی نییە بووەتە شەترەنج. (شطرنج)
شەتە :[ناو] میشولەییێکی بێباڵە کە لەسەر گە ڵای گوڵ وگیا دەنیشێ، جۆرێکیشی هەیە شۆکە دروستدەکا. (شتە)
شەختاندن : [چاوگە،ت] بەراوەژووکردن؛ هە ڵگەڕاندنەوە؛ سەرەونخوونکردن. (برگرداندن)
شەختین:بەرئاوەژوو؛ سەرەونخون.(برگرداندن)
شەخسە : [ناو] شەختە؛ بای زۆر ساردی پاییز کە زەرحات لە بەین دەبا. (سرمای پای پایزی آفت کشت)
شەخڵ : [ناو] شەقڵ؛ دیاریکردن. (نشان)
شەدانکە : [ناو] بەروبوخچە و کیسەی شانە و ئاوێنەی ژنان. (جایوسایل‌زنان)

شەدەلار : مێزەری شەدەی لار پێچراو؛[ناو] لارە پێچ بەسەر. (کج‌دستار)
شەربک : شەربە؛ لیوان؛ ئاوخۆری؛ لێوان. (لیوان)
شەڕ بەرپاکردن : [چاوگە،ت] گێچەڵ نانەوە؛ شەڕ هەڵایساندن؛ئاژاوە نانەوە.(شربرپاکردن)
شەڕخواز: [ئاوەڵناو]جینگز؛ بیانووگر؛شەڕفرۆش، جینگن. (ستیزەجو؛ جنگ‌طلب)
شەردین : دابێژان؛لەبێژنگ‌دان. (غربال کردن)
شەرکڕ : [ناو](ب)کەسانی‌کە چەک و سفتەی بێ‌محەل(بێ‌جێ) بە هەرزانتر دەکڕن و کاری وەرگرتنی پارەی چک و سفتەکە وەئەستۆ دە گرن. (شرخر)
شەرمخاندن : [چاوگە،ت]خوراندن؛ بە ناخوون ڕنین؛ هەڵ‌کڵاشین. (خاراندن)
شەرمخین : [چاوگە،] خوروو لێ پەیدابوون؛ خوران. (خاریدن)
شەرمین : [ناو] گیای گوڵەزەنگ؛ ماکی خەو هێنەری لێدەگیرێ. (گل‌شراب)
شەڕنانەوە : >شەڕ بەرپاکردن.
شەڕنەخێوی :[ناو] شەڕانخێوی؛ شەرناخێوی؛ غارغارێن و تەقلە بە ئەسب. (تاخت‌وتاز)
شەروالێپیس : [ئاوەڵناو] داوێن‌پیس. (تردامن)
شەڕوبنار : [ناو،ت] شەڕوکێشە. (جنگ‌ودعوا)
شەڕوتڕ : [ناو،ت]کێشە و هەرای بێ‌جێ و خۆ نەخواز. (جنگ بی‌جهت)
شەڕوشۆڕ:[ناو،ت] فیتنە و کێشە لە ناوچەیێکدا؛ کێشە و هەرا؛ نائەمنی. (ناامنی)
شەڕەباخە : [ناو،ت] کێبەرکێی دروێنەوانان لە کاتی دروێنەدا. (مسابقه‌درو)
شەڕەفڕ : >شەڕەقسە.
شەرەفنامە : کتێبی مێژووی کورد کە لە لایەن شەرەفخانی بەتلیسییەوە نووسراوە. (شرفنامه)
شەڕەقسە:[ناو] شەڕەفڕ؛ شەرەجنێو،(یان بەڕاستی یان بەگاڵتە). (جنگ‌لفظی)
شەڕەک : [ناو] شریتی بەستنەوەی ڕەشماڵ. (طناب‌بستن‌چادر)
شەڕەکەر:[ناو،ت]شەڕکردنی دوو یان چەندکەر؛ (ب) شەڕی چەندکەسێکی ناحاڵی و بێ‌عەقل. (جنگ‌خران)
شەڕەنێزە : شەڕەرمب. (جنگ‌بانیزه)
شەڕ هەڵگرساندن >شەڕ بەرپاکردن.
شەڕهەڵگرسێن : [ئاوەڵناو] فیتنە بەپاکەر، شەڕ هەڵخڕێن. (برپاکننده فتنه)
شەری زێڕینگەری : [ناو،ت] شەڕی بەدرۆ بۆ بازاڕ گەرمی لەلای‌کەسێ یان لای موشتەری. (جنگ‌زرگری)
شەش‌ئاگر>شەش‌تیر.
شەشپەڕ : [ناو] گورزێکی ئاسنین کە شەش گۆپکەی هەبووە. (گرزقدعی)+
شەش‌پەنجە : کەسانێک کە قامکی زیادیان هەیە. (شش انگشت)
شەش‌تیر : [ناو] چەکی شەڕ کە شەش فیشە ک دەخوات. (شش‌تیر)
شەشخان : [ناو] شەخشان؛ یاری منداڵان. (نوعی‌بازی‌بچه‌ها)
شەشدەربوون : ڕێگای دەرچوونی مۆرە گیران لە نەردین‌دا ؛ (ب) ڕێگەی چارە بەستران لە تەنگوچەڵەمەدا. (ششدرشدن)
شەش‌لۆ :هەر بەڵگێکی پەڕانتۆ کە شەش خاڵی

تێدابێت. (شش‌لوی‌ورق)
شەشلۆیە :[ئاوەڵناو](ب)درۆزن؛حیلەباز؛کڵاوباز. (کلک)
شەشلوول : >شەش‌تیر.
شەش و بێش : (بێش وشەیێکی تورکییە واتا (پێنج)، شەش و پێنج هێنان لە نەردین‌دا؛ (ب) دەست پێوەنەگرتن ؛شەش و بێش خەرج‌کردن. (ولخرجی)
شەغڵەم : [ناو] بەزموهەرا؛ هەراوهوریا؛ ئوغڵە مە؛ غەڵەبە. (دادوهوار و شلوغی)
شەغەڵ : [ناو] سەرپاچ‌کردن؛ سەرەوەی ڕووە ک هەڵپاچین. (غرس)
شەفت : [ناو] ئامێرێکی سەیارەیە کە دەچێ بە ناو ڕینگی تەگەردا. (شفت) +
شەفتاڵوو :لە هەشتاڵوو(قۆخ)دەکا، بەڵام کورکی نییە و چووکتریشە. (شفتالو)+
شەفتۆر : [ئاوەڵناو] شەفتوور؛ لارەولار؛ خووارو خێچ. (اریب)
شەفتە : گیامێشوولە. (نام گیاهی‌است)
شەفقە : شەپکە؛ شەپقە. (کلاەلبەدار)
شەڤادی : شەڤتر؛ پێری‌شەو. (پریشب)
شەڤبێری : شەونشینی. (شب‌نشینی)
شەڤترادی : بەسر پێری‌شەو. (پس پریشب)
شەڤچرا : [ناو] شەوچرا؛ چرای شەوی؛ (ب) چرای خەو. (چراغ‌خواب)
شەڤچەرین : [ناو] شەوچەرە؛ شەوچەلە. (شب چرە)
شەڤخشت : [ناو] کالیار؛ ترۆزی کە دایدەنێن بۆ توو. (خیارچنبربزرگ‌تخمی)
شەڤڕەشکی : [ناو] شەوکوێری. (شب‌کوری)
شەڤگەڕ:(١)شەوگەر؛ ئەوەی بەشەودا دەگەڕێ. (شب‌گرد).(٢)بەزمی ماڵی بووک لەشەوی پێش گوێزتنەوەی بووکدا. (جشن‌شب قبل‌ازعروسی درخانەعروس)
شەقاقی : [ناو] شقاق؛ شوقاق؛ نەخۆشینی ولاً خی بەرزەیە کە سمیان دەقڵەشێ. (مرض‌تر ک‌خوردن‌سم‌اسب)
شەقاو : [ناو] قەدەم؛ هەنگاو؛ هەنگاف. ( گام)
شەقاوپیل : [ئاوەڵناو] ڕاستەوخۆ؛ ڕاستەوڕاست. (مستقیم)
شەقتین : [چاوگە،] شەق‌کردن و هەڵوەشاندنە وەی درومان؛ هەڵوەشاندن. (شکافتن)
شەقراندن : [چاوگە،ت] شڵەقاندن؛ شێواندنی تراو؛ ڕاژەندنی‌تراو. (جنباندن‌مایعات)
شەقژن : [دەنگەناو] دەنگی شەق‌وهوڕ؛ وەک دەنگی هەورە تریشقە. (صدای‌مهیب)
شەقڵچی : بەرپرسی شەقڵ‌کردن و سەردان لە شەقڵ. (مسئول‌مهریانشانەکردن)
شەقەماسی : جۆرێک ماسییە. (نوعی‌ماهی)
شەقیف : [ئاوەڵناو+ ناو،بەر] شەقیف؛ شەقیو؛ شەق‌بردگ؛ شەق‌بردوو؛ لەت‌بوو؛ قەڵەشیاو (درزبزرگ؛شکاف؛شکافتە)
شەکرپەنیر:[ناو]جۆرێک شیرینیاتە لە شەکری هاڕاوە چێدەبێ. (شکرپنیر)+
شەکرۆکە : [ناو](١)گیای کەرتەشی کە بۆ زیادکردنی ڕادەی شەکری خوێن بەکەڵکە. (شکرتیغال )(٢) کوڕی لووسکە کە لە زەماوە ندی هێندی تورکاندا دەرەخسێ بەکنجی‌کچا نەوە. (رقاص‌پسردخترنما)
شەکرەسێو : [ناو] سێوی گوڵاو؛ بەری دارە

سێوی پەیوەند(موتوربە)کراو لە هەرمێ؛ مرۆ ڤی زۆر جوان و ڕەزا شیرینی پێ دەشوبهێنن. (سیب‌گلاب)
شەکری خوارد : شەکەری خوارد؛ (ب) بێجای کرد؛ غەڵەتی‌کرد؛ گووی خوارد. (غلط‌کرد)
شەکنای : [چاوگە،ت] شەکاندن؛ ڕاوەشاندن. (تکان‌دادن؛ بەاهتزازدرآوردن)
شەکۆ : بێڵی تایبەتی ڕاوەماسی لە چۆمی کەم ئاودا. (بیل‌شکارماهی)
شەکەت : (١)شەکەتدان: توند بەستن. (محکم بستن). (٢)[ئاوە‌ڵناو] ماندوو؛ هیلاک. (خسته)
شەکەراو : [ناو] شەکراو؛ شەربەت؛ (ب) بەین شێوان؛ پەیدا بوونی ساردوسڕی لە بەینی دوو دۆستدا. (شکرآب)
شەکەرە : [ناو] گیای شەکرە؛ کەرتەشی؛ دڕوە گورزە؛جیوەکەی کە لەجێی چزووی جۆرێک هە نگەژالەوە دێتەدەرەوە دەبێتە هێلانەی هەنگە ژالە و ئەوجیوە بۆ زیادکردنی قەندی خوێن بە کەڵکە و بۆ دەنگ بەربوونیش باشە.(گیاەشکر تیغال)
شەکیانەوە : [چاوگە،ت] شەکانەوە؛ لەرانەوە؛ بەدەم باوە لەرینەوەی قوماش. (اهتزاز)
شەکێن : [ناو] جگێن؛ یاری بە قاب. ( بازی شتالنگ)
شەگە : [ناو] لای چاڵی قاپ؛ چکە؛ ڕووپەڕی پشتەوەی پکە. (طرف‌گودشتالنگ)
شەلاق : شەلاخ؛ شێلاق؛ قامچی؛ قەمچی. (شلاق)
شەڵاڵ: [ئاوەڵناو] بێ‌حاڵ؛ زۆر شەکەت و شڵاڵ؛ زۆرماندوو و هیلاک؛ زۆر نەخۆش. (بیحال)+

شەلان‌شەلان : شەلەشەل؛ بە شەلین ڕویشتن. (لنگ‌لنگان)
شەڵپە : [ناو] مارنەگەز؛ چەکمە؛ جزمە. (چکمه)
شەلپین : [چاوگە،ت] بنکەن؛ ڕیشەکەن؛ دوورخستن؛ لابردن؛ لەبەین بردن. (ریشه‌کن؛ ازمیان‌برداشتن)
شەلتاخ : [ناو]شەڵتاخ؛شڵتاخ؛ تەشقەڵە؛گێچەڵ. (شلتاق)
شەلتاخی:[ناو] شەڵتاخی؛ شەڕفرۆشی؛تەشقەڵە کردن. (قالتاقی)
شەلتە :[ناو]خەرار؛ هوڕی زۆرگەورەی تایبەتی کاکێشان، لە ڕەشکە چکۆلەتر. (غراره)
شەڵواڵ : شەرواڵ؛ پاتۆڵ. (شلوار)
شەڵواڵ‌بەکوڵ : [ناو] شەرواڵ‌بەکوڵ؛ گیایێکە بنەکەی دەخورێ و بۆ ڕەوانی بەکەڵکە.(گیاهی استباخاصیت‌مسهلی)
شەل‌وشەپک : [ناو،ت] شاڵ‌وشاپک؛ ڕانک‌و چۆغە. (لباس‌ازشال)
شەل‌وکوت : شەکەت؛ ماندو؛ هیلاک؛ بەلێدان شپرزەکردن. (خسته)
شەل‌وکوت‌کردن:[چاوگە،ت] (ب)بەلێدانی زۆر شەکەت‌کردن و لە توانا خستن.(کتک‌زدن‌زیاد)
شەلەمکەرە : [ناو] پشیلە پاییزە. (قاصدک)
شەلەمێ : شێلم؛ شەلەم. (شلغم)
شەلەوشەپک :[ناو]شەل‌وشەپک؛شاڵ‌وشەپک؛ ڕانک‌وچۆغە. (لباس‌محلی‌ازشال)
شەلەولەو : [ئاوەڵناو] هەڵەوێژ؛ زۆربڵێ؛ چەنە درێژ. (پرحرف)
شەلی : [ناو] گێڕی؛ پا لەنگبوون؛ لەنگی. (لنگی)

شەماتە :[ناو] زەنگ؛ وەخەبەرهێنەر؛ سەعاتی شەماتەدار: سەعاتی زەنگ‌دار. (شماتە)
شەماڵ‌گیر:[ناو] قاقلی بەهار؛ گیاییێکی‌گەڵاپانە وگوڵەکانی چکۆلە و لەپاڵ یەکدان،عیلاجی‌کەم خەویە. (گلپر)
شەمامەبەنی : [ناو] جۆرێک کاڵەیە؛ کاڵەی شە مامە بەندی. (بندچارق)+
شەمامێنە : >شەمامە+
شەمتاندن : [چاوگە،ت](١)واز لی‌هێنان؛ دەست لێبەردان. (صرف‌نظرکردن). (٢) خلیسکاندن. ( سردادن)
شەمزیای : [چاوگە،ت] قورمچیای؛ سیس بوون. ئالۆز بوون؛ ڕەنگ‌پەڕین. (آشفتەشدن؛ پژمردن؛ رنگ‌باختن)
شەمزین : (١) [چاوگە،] شەمزیان؛ ئالۆز بوون. (آشفتەشدن).(٢)[ناو] ئاواڵی شەم لە بەیتی شەم و شەمزین‌دا. (عاشق‌شم). (٣) ناوە بۆ ژنان شەمزین ناوە بۆ پیاوان. (اسم‌مردانە)+
شەمسی : [ ناو]شۆڕاوەی بەفر و سەهۆڵی بە هاران کە درەنگ دەتاوێتەوە؛ ناوە بۆ ژنان. (شره آب یخ کە دربهاران ذوب میشود)
شەمشاد : [ناو] شمشاد؛ داری‌شمشاد. (شمشاد)
شەمشاق : [ئاوەڵناو] جووامێر و دڵ فراوان و بە پیاوەتی. (رادمرد)
شەموک : [ناو] شەم‌کۆڵەکە؛ داری کە دەیدەنە بەر دیواری شکست بۆ ڕاگرتنی. (حایل‌دیوار)
شەمەت : [ناو] جۆرێک جاو. (نوعی‌کرباس)
شەمەند و فێر :فرد؛ ند:[ناو] کەرستەی جۆرێک قومارە. (شمند و فر)
شەمێ :کورت کراوەی ناوی شەمسەددین و شەمسوڵا و شەمسی. (اختصار اسم)
شەندی‌شۆڕ : [ئاوەڵناو] شان داچەکاو؛ شپرزە. (پریشان‌حال)
شەنشە : [ناو] تووڵی‌هەلاجی؛ (جگە لە هەلا جی‌کردنە کە بە جیکەنە و کەوان دەکرێت) بە شووڵێکی باریک خوری و لۆکە دەکوتن و پێی‌کۆ دەکەنەوە. (باترکە حلاجی‌کردن)
شەن‌کردن :[چاوگە،ت]خەرمان بەدەم باوەدان بۆ جیا بوونەوەی کا لە دان. (خرمن‌بەباددادن)
شەنگاڵ:[ناو](١) ژەنگار. (زنگار) (٢) ناوی شار و چیاییێکە لەڕۆژئاوای موسڵ. (نام‌شهروکوهی است)
شەنەبا : [ناو] خەرمان بەشەنە بەدەم باوەدان؛ شەنی‌خەرمان. (باد دادن‌خرمن)
شەنەوا : [ناو] شەنەبا؛ شەنکردن. (باافشون خرمن‌باددادن)
شەوئاژین : [ناو] شەواژین؛ ئاژین‌کردنی ئاو بە سەر زەوی و مەزرادا بەشەو. ( آبیاری شبانە مزرعە)
شەوار . شەوگار. (شبها.درطول‌شب)
شەوارە : [ناو]نەدیتنی چاو لەبەر نووری زۆر بە هێز بەتایبەت لە تاریکی‌دا. (در مقابل‌نور قوی چیزی‌راندیدن)
شەوارەبوون : [چاوگە،ت] (١) چاوهەڵنەهاتن لە بەر ڕووناکیی زۆر و سەرلێشێوان. (عاجزازدیدن مقابل‌نورزیاد). (٢) بەشەو هەڵفرین و ئاوارە بوونی مەل لەهێلانە. (آوارەشدن‌پرندەدرشب)
شەواڵ‌بێن :[ناو] بەن‌شەرواڵ؛ دۆخین؛هۆجەنە. (بندتنبان)
شەوبات : [ئاوەڵناو] چێشتی شەومەنە. (غذای

بيات)
شەوبۆسان : [ناو] گوڵی شەوبۆی زەرد. (شب بوی‌زرد)
شەوبەکێو :[ناو] ماڵاتیٚ کە شەوانە لەکێو مۆڵ دەدریٚ،لەپەچەی دوورەدیٚ.(درصحراماندن‌گله درشب)
شەوبێر : [ناو] دۆشینی ئاژاڵ بەشەودا.(دوشیدن گوسفندان درشب)
شەوچراخ : [ناو] گەوهەرێکە؛ گەوهەری شەو چراخ کە لە تاریکیدا دەدرەوشێتەوە. (گوهرشب چراخ)
شەوچەرەز :[ناو]شەوچەرە؛شەوچەلە.(شب‌چره)
شەوڕن : [ناو] ڕنینەوەی شەوانە؛ (ب) دزی لە بێستان بەشەودا. (چیدن‌شبانه‌بوستان)
شەوسۆ : [ناو] چرای‌کەم سوو؛ چرای‌کاتی‌خەو؛ چرای‌خەو. (چراغ‌خواب)
شەوکەران : [ناو] گیایێکی ژەحراویە. (شوکران)
شەوگورد :[ناو] ژووانی شەوانە؛ ژووان. (محل‌قر ار شبانە؛ راندوو)
شەومەهی : [ناو] مانگەشەو. (شب‌مهتابی)
شەونامە:[ناو] بڵاقوکی نەهێنی کە بەشەو بڵاو دەکرێتەوە. (شب‌نامە)
شەوەرگ : [ناو] شەوەر؛ شەبدەر. (شبدر)
شەوەرە سوورە : [ناو]گۆچانە باغی؛ گیایێکە گوڵەکەی وەک گۆچان چەماوەیە؛ کوڵێندراوی گوڵ و گەڵاکەی بۆ بینایی چاو باشە. (شبدر عطری)
شەوەڕەشە : [ناو] جەژنێکی کاکەییانە. (نام جشنی‌است‌درمیان‌کاکه‌ایها)
شەوەزەنگ : شەوی‌تاریک؛ تاریکی‌خەست؛ ئە نگوستەچاو. (شب‌بسیارتاریک)
شەوەکە : [ناو]شەبەکە؛ تەلچن؛کون‌کون؛کونا کونا؛ وەک شەباک. (شبکه)
شەوەکی : [بەند+ ناو] سبحەینیٚ؛ سبەینیٚ؛ سۆزی ؛ سەیزوو؛ بەیانی. (فردا)+
شەوهەنیانە : [ناو] شەوهەینانە؛ شەوجومعانە؛ (ب) خێری تایبەتی شەوی جوومعە. (خیرات شب‌جمعه)
شەهباز : [ناو] شاباز؛ بازی‌سپی. (شاهباز)
شەهباڵ : [ناو] شاباڵ؛ پەڕە درێژەکانی باڵی باڵندە. (شاهپر)
شەهرابوون:[چاوگە،ت]لەسەر پاشوو هەستانی یەکسم. (بلندشدن‌اسب‌روی‌دوپا)
شەهریوەر:[ناو] مانگی شەشەمی ساڵی کۆچیی هەتاوی، بەرانبەر بە ئەیلوول. (شهریور)
شەهسوار : [ناو] شاسوار؛ سوارچاک. سەرتۆپی سواران. (شهسوار)
شەهلەوەند : [ئاوەڵناو] هونەرمەند؛ زانا؛ فێرس. (هنرمند)
شەیتان : [ئاوەڵناو](ب)هاروهاج؛ منداڵێکی شە یتانە : منداڵێکی هاروهاجە. (شلوق؛ بازیگوش)+
شەیتانەک : [ناو] پارچەیێکە لە شاخی حەیوان دروست‌کراو، لەبەینی دەسک و پەنجەی‌تاردا کە سیمی تار دەکەوێتە سەری. (شیطانک)
شەیدایی : [ناو] شێتی و سەرگەردانی بە دوای داخواز یان عەشق‌دا. (شیدایی)
شەیهەت : [ناو] شەهین؛حیلەی ئەسپ.(شیهه)
شیباب : [ناو] گوڵپەی تەنوور؛ چاوانەی تەنوور؛ گوڵبێنەی تەنوور. (هواکش‌زیرتنور)
شیپ : [ناو] بەن؛ ڕێسمان؛ قەمچی هەڵخولێنە

ری شیّلاق. (شلاق گرداننده‌گردنا)
شیّپێو : [ناو] کەرەستەی ئەندازەگرتنی نم و تە ڕایی و هەڵم. (بخارسنج)
شیّتاری : [ناو] شیّی‌تاریک؛ ئەسپی‌شیّی‌تۆخ؛ شیّی مەیلە و کوێت. (رنگ‌اسب‌کرنگ‌تیره)
شیّت‌شەیتان :کەسێک بە ئانقەست خۆبدا لە شێتی. (دیوانه‌مصلحتی)
شیّت‌وشڕ : [ئاوەڵناو،ت] بی‌ئاوەز؛ بی‌ئەدەب. (بی‌عقل)
شیتەشیت : [ناو،ت] بە قیژاندنەوە دەمهەراشی کردن، بەتایبەت بۆ ژنان بەکار دەبرێ. (دادو فریادکردن‌زنان))
شیّتەوژیرە : تاوێ بە ئاوەز و تاوێ شێت؛ هە رکات حاڵەت گۆڕین. (گاه عاقل‌گاه دیوانه)
شیّتەوێژی: قسەی هەڵیت‌وپلیت‌کردن. (حرف بیربطوغیرعاقلانه‌کردن)
شیّتی‌پەتەری : [ئاوەڵناو] شێتی پەت‌بەڕ؛ شێت و وێت. (دیوانه)
شیتین : [ئاوەڵناو] شیرتین؛ (ب) تراوێ‌کە تینی بە ئەندازەی تینی شیری تازە دۆشراوبێ.(ولرم)
شیّخانی : پەیوەندیدار بە عەشیرەی شێخانەوە لە نزیکی کەرکووک؛(ب) هەڵپەڕینی شێخانی. (مربوطبه‌شیخان)
شیّر :[ناو] ڕووپەری قۆشەی قەدیمی‌کەوێنەی شێرێکی پێوە بوو؛ ئەودیوی‌خەت. (شیرروی سکه)+
شیّر : [ناو] شێری: (سەماوەر، دەستشۆری، حە مام). (شیرآب)
شیراز :شارێکە لە ئێران، زێدی حافز و سەعدی شاعیرانی بەناو بانگی ئێرانی کە بە شاری گوڵ و بولبول بەناو بانگە. (شیراز)
شیربڕ : شیرڤەکرن؛ لەشیر بڕینەوەی منداڵی شیرەخۆرە. (قطع‌کردن‌شیردادن‌به‌بچه)
شیرحەرام : [ئاوەڵناو](ب) بێوەفا؛ بی‌نمەک؛ بی‌ ئەمەک؛ حرامزاد و فێڵەباز. (حرامزاده‌حیله‌گر)
شیرحەلال : [ئاوە‌ڵناو] (ب) شیرحەڵاڵ، پاک داوێن، بەئەمەک، حەڵاڵ‌زادە. (حلال‌زاده)
شیرخشت : [ناو] داری شیرخشت؛ بەمیوەکە یشی دەڵێن شیرخشت؛دژی بەڵغەم و پالێوەری خوێن و دژی زەردووییە. (شیرخشت)
شیرخشت : [ناو] گەردێکی وردە بۆ ڕەوانی دە یدن بە منداڵ. (شیرخشت)
شیرخۆرگە : [ناو](ف.مشە)جێگای بەخێوکردنی منداڵانی شیرەخۆرە. (شیرخوارگاه)
شێرداخ : [ناو] شیرداخی؛ جۆرێک قوماشی قە دیمی. (نوعی‌پارچه قدیمی)
شیرداران : [چاوگە،ت] (ب)مەیل پی‌دان؛ دە ست ئاواڵەبوون لە حاندی کەسێکدا. (تمایل؛ سرکیسه‌شل‌کردن)
شیردان : شیر بە بێچوودان؛ مەمک بە منداڵ دان. (شیردادن)
شێرزاد : نێوە بۆ پیاوان؛ بەرناوی بەرەبابێکی عە شیرەی فەیزوڵابەگی لەنەتەوەی ئاغا شێربەگ. (شیرزاد)
شێرکۆ :(١)نێوە بۆ پیاوان. (نام‌مردانه).(٢)بەچکە شێر؛ شێرکۆڵە. (بچه‌شیر) (٣)شیری چیا و کێو. (شیرکوه)
شیرگیا : [ناو] شیرهەرد؛ دووجۆرە بی‌ژەهر و ژە هردار،بی‌ژەهرەکەی لە ناوچەکانی سنە وجوانڕۆ و مەهاباد و ورمێ زۆرە و دژی بالووکەی ماڵاتی

بەرزەیە. (مانیوک)
شیرمەردە : [ئاوەڵناو] شیرمردە؛ بێچووی لەڕ و لاواز بەهۆی کەم شیری دایکەوە. (شیرمردە)
شیرمەشک : [ناو،ت] مەشکەی شیرتێکردن؛ (بێری دێن ڕادەبرن شیر مەشکیان پێیە) «فۆلکلۆر» (مشک‌شیر)
شیرواره :دەستە وامی شیر؛ لە پاییزاندا کە شیر ی ئاژاڵ زۆر کەمدەکا چەندماڵ شیری خۆیان بە نۆبە دەدەن بە یەکتر بۆ ئەوەی بشێ ماستی لێدروست بکەن. (قرض‌دادن‌شیربەهمدیگر)
شێروخەت [ناو] شێریاخەت؛ یاری بەقەرە پوو ل. (بازی شیریاخط)
شیر وشک : [ناو] گەردی شیرکە لە ئاودا دە یتاوێننەوە و بە مەمکەمژ بە زارۆیانی دەدەن. (شیرخشک)
شێروکۆڵ : [ناوریا،ت]ئەستوونێک بە سەرکۆڵە کەی درێژەوە لە بیچمی خاچ ، وەبەر دیواری شکست دەدرێت.(ستون سلیب ماننداحایل دیوار شکستە)
شیرە : [دەنگەناو](١) دەنگی قەلەم قامیش لە کاتی نووسین‌دا؛ (دایک وەقوروان شیرەی قەلە مت بێ) «فۆلکلۆر» (صدای قلم نی) (٢) دەنگی دادڕینی قوماش. (صدای جردادن پارچە)
شێرە بەفرینە : [ناو] تاپۆی شێر لە بەفر کە منداڵان دروستیدەکەن. (شیری‌برفی)
شیرەبەلەک : [ناو]شووتی؛ شامی؛ هەنی؛ کو لێندراوی پێستەکەی دژی بەردی گورچیلەیە ؛ بەڵام زۆر خواردنی شووتی دەبێتە هۆی پە نمان یان زامی گەدە. (هندوانە)
شیرەتکەر : [ناو،بک] مۆجیاری‌کەر؛ نەسیحە تکەر. (ناصح)
شیرەتوون : [ناو]گیای‌شیلەتوون؛ توونەگیواو؛ توونەگیا؛ تەرخون؛ بۆمالیجەی پەنمانی جومگە(ڕوماتیزم)و بێخەوی بەکەڵکە.(ترخون)
شیرەخانە : [ناو] شیرەکێشخانە؛ لەقەدیما جێگایێک بوو بۆکێشانی تریاک. (شیرەکشخانە)
شیرەمێ:ناوی مانگی دەهەمی کوردییە بەرانبەر بە بەفرانبار (مانگی‌دەی). (دی‌ماه)
شیرهەر : > شیرگیا
شێری‌دەریایی : [ناو] گیانلەبەرێکی قەڵەوی مە لەوانە و ماسی‌خۆرە و شیر بە بێچووی دەدا. ( شیردریایی)
شیرین : ناوی ژنانەیە؛ بۆ شوبهاندنی شتی جوان و مرۆڤی جوان بە کاردێ؛کەنیشکە شیرینەکەم: کچە جوانەکەم، نەشمیلانەکەم. (شیرین)
شیرین‌بەلەک : [ناو] مێمووک؛ شیرین‌بەیان. (شیرین‌بیان)
شیرین‌بەهارە : ناوی شێعرێکی بەڕێز ئیبراهیم ئەحمەدە کە شاعیر وخەباتگێڕی کۆڵنەدەری کورد بووە و بەڕێز تاهیرتەوفیق بە ئاواز گوتوو یەتەوە.(نام‌شعری‌ازابراهیم‌احمدشخصیت نا‌امدار وشاعر بلندآوازە کرد؛ نام آوازی‌کردیست)
شیرین‌تۆم : [ناو] گوڵەشەراو؛ گیاییکە لە هە ورامان و بانە زۆرە و لەگەڵ نارگیل و زەنجەفیل دەیهاڕنەوە بۆبەهێزبوونی هەستی پیاوەتی بە کەڵکە. (گل‌ساعت)
شیرین‌تۆمەکەشیە:[ناو] گیای بنجیلەکەشیە؛ گیاییکی کێویە تامی گەڵاکەی تفتە و بەرەکە ی بۆ کۆخەڕەشە بەکەڵکە (قدومەکوهی)
شیرین‌زووان : [ئاوەڵناو] شیرین‌زمان؛ زمان

خۆش. (شیرین‌زبان)
شیرینکاری : [ناو] (ب) هونەر نوواندنی وەرز شکارانی زۆرخانە بە یاریکردن و هەڵخستنە وەی کەرەستەی میل و شتی‌تر و نیشاندانی لێهاتوویی خۆیان له کاری وەرزشی باستانیدا. (شیرین کاری)
شیرین کاری : [ناو] جوان کاری؛ قەنج کاری؛ هونەر نیشاندان. (شیرین کاری)
شیرین گرویٚ : [ئاوەڵناو،ت] گرویٚی خۆین شیر ین؛ هەروا شیرین‌خێل و شیرین‌شەل. (آبلەرو)
شیرین‌وفەرهاد : چیرۆکێکی بەناوبانگە کە نیزامیی گەنجەوی بە شێعر دایناوە و شیرین عاشقی خوسرەوپەرویٚز بووە، فەرهادیش‌عاشقە رووتەی شیرین بووە. (شیرین‌وفرهاد)
شیرینی‌خواردن : (ب) دیاری‌کردنی کچیٚ بۆ کوڕی. (شیرینی‌خوران)
شیش‌کوت : بار و تابار بە شیش پشکنین. (بازرسی‌بار با سمبەزدن)
شیشەی‌مەی:[ناو،ت] بوتری‌مەی؛ بوتڵی‌مەی. (بطری)
شیشی‌تفەنگ : [ناو] زمە؛ سومبە؛ تەل‌ئاساییٚکە بۆ پاک‌کردنەوەی لوولەی تفەنگ یان بۆ دە رکیٚشانی قاپووڕی گیر کردوو لە تفەنگدا. (سنبەتفنگ)
شیشی‌تەندوور : [ناو،ت] شیشەی کانزا بۆ دەر هیٚنانی کوڵە یان خۆشکردنی ئاوری تەنوور. ( شیش‌تەندور)
شیشی‌کەباب : [ناو،ت] سیخی‌کەباب برژاندن. (سیخ‌کباب)
شێعری‌شین‌گیٚڕی : بەهۆی مردنی کەسێکەوە شێعرهەڵبەستن بۆی؛ لاواندنەوە بە شێعر. ( شعردرمدح‌فوت‌شده)
شێڤبڕین : [چاوگە،ت] شێوبڕین؛ کێڵانی‌زەوی. (شخم‌زدن)
شێڤەڕەش : [ناو] شەوی ڕەش؛ ئەنگوستەچاو. (شب‌تاریک)
شیکال :[ناو]کاڵە و قۆندەرە و کەوشی دڕاو کە لە پادا چەکەی‌دیٚ. (پاپوش‌کهنەوپارە)
شیکرن : [چاوگە،ت] (۱) ڕاڤەکرن؛ شرۆڤەکردن. (تفسیرکردن).(۲) شووکردن؛ مێردکردن. (شو هرکردن)
شێل : [ئاوەڵناو] لێڵ؛ئاوی شێل وعاسمانی‌شێل واتا ئاوی لێڵ وعاسمانی تەم گرتووی نەساف (ضدصاف)
شیلان‌وپیلان : [ناو،ت] شێلە و بێلە ؛ فڕوفێڵ؛ فێڵ‌وتەڵەکە . (شیلە پیلە)
شێلاق : [ناو] جۆرێک مەزرەقی بی‌تمتمەیە کە بە شیپ دەخولێتەوە. (نوعی‌گردنا)+
شیلاناوی : گوندێکە نزیک مەهاباد، زێدی مامۆستا هێمن. (نام‌قریەایست)
شێلگیر : (۱) [ناو] بێژنگ وکەوی کون زل. (غربال‌خیلی‌درشت).(۲)[ئاوەڵناو] شێتگیر؛ سوور بوون لەسەر مەبەست. (مصر)
شیلەپەڕێژ : پاداگرتن لەسەر شیلەپەی ئاموور و چەقاندنی زیاتری گاسن لە شێوبریندا؛(ب) تەواو تێچەقاندن. (شخم زدن‌عمیق)
شین‌بەندان : [ناو] بەهی؛ پرسە؛ تازیە؛ عەزا؛ شین‌گیٚڕی؛ ماتەم . (عزاداری)
شین‌خۆر : فرۆشتنی حاسڵات پێش بەرهەم ها تن. (پیش‌خور)

شینکە : [ناو] جووڵەوەرێکی شین ڕەنگە لە ژێر پەڕوباڵی فڕندە پەیدادەبێ. (جانوری‌شپش مانندانگل‌پرنده)+

شین‌گێڕ : [ناوبک] مردوو لاوێن؛ شیوەنکەر بۆ مردوو. (عزاگرفتن؛ عزاگردان)

شین‌وڕەش‌بوونەوە : [چاوگە،ت] (ب) پیران کردنی منداڵ لەبەر گریانی زۆر. (کبودشدن بچەبسبب گریەزیاد)

شینی‌خاتووزمهەریر : [ناو](ب) سەرما و تۆفی هەوەڵی ڕەشەمە؛ڕیوایەتە کوڕی سەیاح بەرەو ڕۆژئاوا کەوتەڕێ بۆ هێنانەوەی خۆر، لە کاتی ئاخرمانگی زستاندا و نەگەڕایەوە خاتووزمهەری خوشکی سەیاح شینگێڕیی بۆکرد کە هەمان سەرما و سوڵەی مانگی ڕەشەمەیە. (سرمای آخر اسفند و اول‌فروردین)

شێوەدان : [چاوگە،ت] وێچوون؛ دەستەواژەی وێنەگەرییە ئەو وێنە شێوەی خاوەنەکەی نادا : واتا لەو ناچێ. (شبیەبودن)

شێوەقوڵە : [ناو] شێوەقوڵانێ؛ چێشتەقوڵەی منداڵان‌کە تێکڵاوی دەکەن و وپێکەوە دەیخۆن. (خوراکی‌کە بچەها قاتی‌می‌کنند وباهم‌می خورند)

شێوەکردن : [چاوگە،ت] بەڕوواڵەت وێچوون؛ دووشک‌بوون لە ناسینی کەسێ.(باتردیدبەکسی شبیەبودن)

شیەوکردن : [چاوگە،ت] شی‌کردنەوە؛ شرۆڤە کردن. (تفسیر؛شرح‌دادن)

# ع

عــاداو : [نــاو] ئــاداو؛ ئــاداب؛ (١) ڕەســم و ڕسووم. (آداب). (٢)(کێم)کــیم و زووخــاوی برین. (خون‌وچرک‌زخم)
عادڵ : ناوە بۆپیاو. (اسم مردانه)
عارسز : [ئاوەڵناو] بێ‌عار؛ (سز) وشەییێکــی تورکییە بە واتای (نە بــوون ) و( عــار) واتــا عەیب و نەنگ بێ‌عاریش واتــا بــێ‌نــەنــگ وبێ‌عەیب بە ڵام وا باوە بە کەسێک دەڵــێن کە بێدەروەست و بێ‌شەرم بێت، (بی‌عار)
عارەب قۆزی : [ناو] ئارەوقــۆزی؛ جۆرێــک ڕووەکە؛ گوڵێکی شینی کەمڕەنگی هــەیــە. (نوعی‌گل)
عارەقگیر : [ناو] ژێرکراس. (زیرپیراهن)+
عارەقە : [ناو] ئارەقە؛ خووە؛ خووەی؛ عارە-ق. (عرق)
عارەویی‌جڵف : زمانی ئــارەویــی زاراوەیــی. (عربی‌جلف)
عاستەم : [ئاوەڵناو] حاستەم؛ سەخت؛ دژوار؛ وەک شاخی عاستەم. (دشوار)+
عاستەم و دووبەڵا :[نــاو] زۆر هێــواش؛ بــە-عاستەم و دووبەڵا دەستم لێی‌کــەوت: کــە-مووکە؛ شتی زۆرکەم. (خیلــی‌یــواش؛خیلی-کم)+
عاشق‌بەند : [ناو] زنجیر و زەمبەلەکێکە بــۆ سەر سینگی ژنان. (زیورزنان)
عاقیق : [ناو] عاقێق؛ ئاقیق؛ جۆرێک مووروویی بە نرخ. (عقیق)
عالەم : [ناو] عاڵەم؛ دونیا. (ب) حاڵ‌وهــەوا؛ دەروێشی عالەمێکی تایبەت بە خۆی هەیە. (عالم)
عامبازبوون : [چاوگە،ت] ئامباز بــوون؛ لــە-هەمبێزگرتن و باوش پێداکردن بەشــەڕەوە؛ هێرش بردن. (دست‌بەیخەشدن)
عوولی : [ناو] ئــوولی؛ ژوور؛ نهــۆم. (اطــاق؛ طبقه)
عوین :[ناو] ئــوین؛ دەســتێ بردنــەوە یــان دانانی یاری و قومار؛ عوینێک تەختەی دانا. (یکدست‌بازی)
عوین : [ناو] ئوین؛ لە تورکییەوەهاتووە، واتا کایە؛ بازی؛ قەرەچی‌عوین : قەرەچی‌بــازی. (بازی)
عەبرەش : [ئاوەڵناو] هەبرەش؛ زۆر تــوونی. (خیلی‌تشنه)
عەبیر : [ناو] گیای شەمدانی؛ عەترین؛ عە-ترە گیا. (شمعدانی)
عەتەب :[ناو] ڕەخنە؛ عەتەو؛ عەیب؛ ایــراد. (ایراد؛ انتقاد)
عەتەو: [ناو] عــەتــەب؛ڕەخنــە.(ایراد؛انتقــاد)
عەجمان : حەجمان؛ حەجمین؛ ئۆقرە؛ ئارام و قەرار. (آرام‌وقرار)
عەجیو : [ئاوەڵناو] عەجیب؛ سەیروسەمەڕە؛ سۆسرەت؛ بەلاجەوی. (عجیب)

عەداق: [ناو]چڵک؛ کیم؛ زووخاو؛ ئاداو؛ ئاداب.
(چرک‌زخم)
عەدیاڵ : [ناو] پەتوو؛ بەتانی. (پتو)
عەڕابە : [ناو] ئەڕابە؛ عەرەبانە؛ ئارەبانە. (ارابە)
عەڕابەی‌جەنگی. تانگ؛ زرێپۆش؛ تانگیَ کە لە سەر تەگەری لاسیقی دەڕوا؛ ناتگ؛ دەبابە. (تانک)
عەردانی : ئەردانی؛ زۆران؛ بەعەرزدادان. (کشتی؛ زمین‌زدن)
عەرزالە : [ناو] هەرزاڵ؛ کەپرۆکە؛ سەکۆی ناوماڵ و ڕەشماڵ. (سکوی‌جای‌اشیادرخانەو چادر)
عەرک : [ناو] جیقەڵدان؛ ئاشک. (چینەدان)
عەرن : ئەرن؛ ڕق و قین؛ توورە؛ قەڵس. (عصبی)
عەرنۆکی : [ئاوەڵناو] ئەرنۆکی؛ ڕقنی؛ قەڵسی. (عصبانی)
عەڕنین : [چاوگە،ت] ئەڕنین؛ ئەنرین؛ عەنرین؛ نەڕاندن وتوورە بوون . (داد کشیدن از عصبانیت )
عەزرەت : [ناو] تاو؛ ترس؛ خۆف؛ لەعەزرەت زیندان هەڵات. (خوف)
عەسرانە : [بەند]هەموو عەسرێک؛[ناو] (ب) نان خواردنی بەینی نیمەڕۆ و شێو؛ عەسرۆژە. (عصرانە)
عەسرۆژە : >(ب)عەسرانە
عەسکەری : (۱)سەربازی؛ نیزامی؛ ئەرتەشی.
(ارتشی). (۲) ناوی جۆرێک ترێی بێ ناوکە. (نوعی‌انگور)
عەشرەفی : [ناو] ئەشرەفی؛ قۆشەی چووکی ئاڵتوون؛ ناوی‌سکەی چووکی زێڕی ئێران. (اشرفی)
عەقرەو : [ناو] لەعەقرەبی ئارەوییەوە هاتووە؛ دووپشک. (عقرب)
عەلاحیدە : [ئاوەڵناو] جیاواز؛ جیا. (علیحدە)+
عەلەم : (ف.شە) جێی‌پشککرنا ئاوێە؛ جێگەی دابە شکردنی ئاو. (جای‌تقسیم آب)
عەلی‌قورتە : [ناو]کاغەز پەرداخ. (کاغذ-سمبادە)
عەماراو : [ناو] ژووری ژێرزەمینی بۆ پاشەکەوت کردنی ئاو؛ بۆشکە و بەرمیلی جێگای ئاو. (بشکە جای آب)
عەمارداری : > ئەنبارداری یا ئەمبارداری.
عەمارە : ناوی شارێکە کە قەدیم ناوی (ئاوماڵە) بووە. (نام‌شهریست)
عەمباراو : [ناو] عەنباراو؛ ژووری ژێرزەمینی بۆ عەمارکردن و ڕاگرتنی ئاو. (آب‌انبار)
عەمباز : [ناو] عەمبازد؛ ئامبازد. (حملە)
عەمبە : [ناو] داریکە تایبەت بە هێندووستان بەرەکەیشی ناوی عەمبەیە. (عەنبە)+
عەمبەر : [ناو] جۆرێک نەهەنگە؛ عەنبەر؛ شیاکەکەیشی ناوی عەمبەر یان عەنبەرە کە عەترێکی بۆنخۆشی هەیە. (عنبر)
عەمربەر : [ناوبەر] فرمانبەر؛ (ب) سەربازیَ کە دەستووری باڵادەس ڕادەگەیێنیَ.(امربر)

عەممە : [ناو] عەنبە؛ ئەنبە. (انبه)
عەمەڵی : حەمەلی؛ کەسیٚکە وەسواس و دوودڵبیٚ لە پاک بوونی زۆرشت. (وسواس)
عەمەلی : [ئاوەڵناو] عەمەڵی؛ حەمەلی؛ کەسیٚکە فیٚری عارەق یا تریاک بوو بیٚ و نەتوانیٚ دووری لیٚبکات. (معتاد)
عەمەڵی : [ئاوەڵناو] حەمەڵی؛ دوودڵ لە پاکوتەمیسی؛(وسواسی)
عەنبەرگوڵ :گیاییٚکە لە ناوچەکانی سەقز و سنە و شنۆ زۆرە، بۆ بۆنخۆشی لە نزیکی جلوبەرگدا دایدەنیٚن، لە عەترسازیشدا بەکەڵکە. (گل‌عطر)
عەنگرین : تووڕە بوون؛ ئەنگرین. (عصبانی شدن)
عەنناج : [ئاوەڵناو] (ف.شە) گەلاج؛ حیلەگەر. (حیله‌گر)
عەنەزە : لە ئانازاوە هاتووە کەئانا تورکیە واتا دایک. دایکزا؛ دارای ڕەسەنی دایکی؛ بەچارەوای ڕەسەن و کەحیل‌دەوتریٚت. (اسب‌اصیل)
عەیار : [ناو] ئەیار؛ پیٚست و کەوڵی ئاژاڵ. (پوست‌بز وگوسفند)+
عەییار : [ئاوەڵناو] حەیار؛ زۆرزان؛ حیلەباز. (حیله‌گر)
عیٚباری : [ناو] عەیبداری؛ زەدەداری. (عیبداری)
عیسا : پیٚغەمبەری خاوەنی کتیٚبی عاسمانی ئینجیل. (عیسی)
عیشوەگەر : [ئاوەڵناو] عیشوەفرۆش؛ بە ناز و خەمزە. (عشوه‌گر)
عیشوەگەری : [ناو] دڵبەری؛ ناز و خەمزەکردن. (عشوه‌گری)
عیٚلام : عیلام؛ ئیٚلام؛ ئیلام؛ ناوچەییٚکە لە ئیٚران. (ایلام)

# غ

غایله :[ناو]خەیاڵی‌بێجێ؛ دوودڵی؛ غایله بەدڵتا نەیێت : خەیاڵی‌خراب بەدڵتا نەیێت. (شک‌وگمان)

غایەتی : [وتە؛ حەرف] بەڵام؛ من‌هاتم‌بۆلات غایەتی تۆ لەماڵ نەبوویت : بەڵام تۆ لەماڵ نە-بوویت. (اما)

غزباب : [ئاوەڵناو] (ف.شه) قەڵەو؛ بەکە یف. (چاق وسرحال)

غوتکەخۆره :[ناو] جۆرێک‌مراوی.(نوعی‌مرغابی)

غوڕابیـه : [ناو] جۆرێک شیرینیاتی تایبەتی ئازربایجانی ئێرانه؛ غوڕابی. (نوعی‌شیرینی)

غورد : [ئاوەڵناو] دمبه؛ کەڵی دمبه و نەخەساوی مل‌ئەستوور؛ غوللوور؛ کەڵی کۆپارەداری قەڵەو. (گاو پرقدرت جنگی)

غوڵام‌گەردش:[ناو] پێشخانه؛بەرهەیوان.(جلو اطاق‌نشیمن؛ جلوایوان)

غوڵغوڵه : [ناو] غولغوله؛ دەنگی ئاوی کانیاو کە لە عەرز هەڵدەقوڵێ؛ (ب) هەرا و هوریا و قەره باڵغ. (غلغله)

غەڵتان : [ئاوەڵناو] بۆی هەیه له فارسییەوه هاتبێته نێو زمانی‌کوردی، خەڵتان؛ تلیاو (غلطان)

غەیدۆک : [ئاوەڵناو] قین‌لەدڵ؛ غەیزلەسک؛ ڕق هەڵساو؛ کین‌لەدڵ؛ دەخس. (کینەدردل)

غەب‌غەبه :[ناو] بەرخەبەبه؛گۆشتی ژێر چەنا کە. (غبغب)

غەرقە:دۆشەکی چووکی منداڵان کە نایلۆنی تێهەڵدەکێشن بۆ ئەوەی تەڕنەبێت. (نایلون-کشی‌دورتشکچه)

غەڕه: [ناو]غەڵ؛ ئاغەڵ؛ خەڵ؛کۆز؛کورتە دیوارێکی جەغز ئاسا بۆ حاوانەوی ئاژاڵ.(آغل)

غەریب‌سنجان : ساس؛ سوورکە؛ تەختەپیتی؛ جووجە؛ جووڵەوەرێکی سووری‌مەیلەو قاوەییە، شەوڕاوە و لە نوور بێزاره، جێی گەزتنی زۆر بە-خوروشە، لەقەڵەشی دیوار و تەختەدا دەژی،بە-ڕشاندنی‌نەوت‌بەقەڵەشەکانی دیواردا چارەی-دێت. (ساس)

غەزنەکردن: ئاودزکردنی برین وچڵککردنی. (چرک‌کردن‌زخم)

+ غەلیز : [ئاوەڵناو](۱)خەست.(غلیظ)(۲) (ف. هن) لە ئایین‌دا زۆر پێ‌چەقێن.(متعصب دردین)

غەلین : قامک یا پەل بە گەرووداکردن بۆ ڕشانەوه. (چیزی‌درگلوکردن‌برای‌استفراق)

غەواس :فد؛ عد: [ناو] ویشەیێکی ئارەویە و هاتووەتە نێوکوردی، ئەوەی لە ئاودا خۆی قووم دەکا و لەبنی ئاودا بۆشت دەگەڕێت؛ (گەوهەرم کەوتە دەریایە، بە سەد غەواس‌بۆم دەرنایە) «فۆلکلۆر». (غواص)

غەواسی : [ناو] مەلەکردن و چوونە بن گۆم و ئاوی قووڵ؛ (ب) لێکۆڵینەوه و بە دوادا گە-ران.(غواصی)

غەوغا : غەڵبەغەڵب؛ هەراوهوریای جەماوەری زۆر. (غوغا)

# ف

فابریکـا : وشـەی بیانییـە، کارخانـە؛ کارگـەی دروستکردنی شتومەک بە (ئامێری ماشـێنی). (کارخانە)

فارسۆنی >فاسۆنی

فارسوونیا >فاسۆنی

فارگون : فارغوون؛ فەرغوون؛ ئارەبانـەی یـە-کـتەگەرەی دەستی. (فرغون)

فاسۆنی : فارسوونیا؛ فارسـۆنی؛ قوماشـێکە بـۆ لیباس(جلو بەرگ) (فاستونی)

فالوودە : فاڵوودە؛ پاڵوودە؛ جۆرێـک هـەرشـتە ئاسا کە لە نیشاستە دروست دەکرێـت و شـە-ربەتی بەسەردا دەکرێت : (پالودە)

فاماندن : فامین؛ تێکەییشتن. (فهمیدن)

فامکردنەوە: (١)(ب)گەورەبوون و عاقڵبـوونی منداڵ.(٢)بە خۆدا هـاتن و هۆشـیاربوونەوە لـە هەڵەکاری هەڵـە؛ عـەقـڵ پـەیـداکردن. (١و٢ بزرگشدن. بخودآمدن)

فانتازی : ڕازاوە؛ نەخشێنراو؛ جـوان؛ ئیمڕۆیـی. (فانتزی)

فانووس : (١) چرای دەریایی؛ چراییکە لەسـەر بورجیکەناری دەریا بـۆ ڕێنمـوونی پـاپۆڕ. (٢) لەنتەر؛ فەنەر. (١و٢ فانوس)+

فت وفـراوان : زۆرزیـاد؛ زەحـف؛ زۆروزەبـەن. (فتوفراوان)

فتراک : فد: وشەییکی فارسییە و مەلایێ جزیری فەرمووییە (شکارەک درخوری شاهم، دوی بەندی و فتراکی) بەنسامۆرتە. (فتراک)

فتیلک : پلیتەیچرا؛ پلیتـەیبـرین؛ فتیلـەی-چووک. (فتیلە)

فجوق کـردن : فجـووزکـردن؛ دلدەرهـاتن و دیقکردن لە دووری کەسێک؛ سوی بوونـەوە؛ پەرکەمکردن. (سکتەکردن)

فدی : فهێت؛ فەدی؛ فەهید؛ فەهیـت؛ شـەرم؛ حەیا. (شرم)

فڕ : (١)تۆم وەشاندنی هەراش و بڵـاو؛ دەغڵـی چاندراوی تەنک. (کشت کمپشت گیـاوغلـە) (٢) پێوەندی. (ارتباط)

فڕ : خەبەر بەحەریفدان لەکاتی تەواوکردن و بردنـەوەی یـاری پاسـووردا. (اعـلامبـردن-یکدستپاسور)

فڕاماسیۆن : فڕامسۆن؛ کۆمەڵێکی نەهێنی کـە لە ئوڕووپا دروست بوو، لە پاشان پەرەی سەند و ڕەنگی ڕامیاریی بە خۆیەوە گرت و زۆر بـە-هێز و جیهانی بوو، زۆربەی ئەندامانی لـە کـە-سانێکی دەسەڵاتدار و سـەربـە دەرەوە بـوون. (فراماسیون)

فرامین : ناشتایی؛ فراوین؛ فرایین؛ قـاوەتـوون؛ قاوەڵتوون؛ قاواڵتی؛ قاوەڵتی؛ قاوەتـی.(وادیـارە لەکەڵ فراوێندا کە لە هێندی ناوچە بە واتـای نیمەڕۆژەیە جیاوازە) (صبحانە)

فڕپێدادان : دژوێن پێدان؛ جوێنپێدان.(فحش-دادن)

فرچۆک : فلچەی چووک؛ قەڵەمی مووی چکۆلە. (قلم‌موی‌کوچک)

فڕدان : هاویشتن؛(هاوێشتن) فڕێدان؛ خستن؛ هاڤێژتن. (انداختن؛ پرت‌کردن)

فردۆ : فردۆق؛فردک؛تێکوشیوی دۆ.(تلیت‌دوغ)

فڕدۆق : خۆراکی خراپ و ناپەسەند. (خوراک-بی‌ارزش)

فڕدۆق‌خۆر : فێربوو بەخۆراکی خراپ‌خواردن؛ پیس‌خۆراک. (خوراک‌بدخوردن)

فرس : [ناو] هەرێز؛ فرێزوو؛ هەرێژ. (فریز)

فرسک : فرچک؛ گۆچ؛ هەوێن؛ ئامیان. (مایه)

فرسەق‌نوین : [ناو،ت] فرسەنگ‌ژمار؛ نیشاندە-ری ماوەی ڕێگا لە سەر جادە. (فرسنگ‌شمار)

فرشە : [ناو] فرچە؛ فلچە؛ قەڵەمی‌موو. (فرچه)

فڕفک : [ناو] پەڕپەروک؛ پەڕپەڕۆکە؛ پەروانە؛ پەپوولە. (پروانه)

فڕفۆتە : [ناو] قوماشی شاش‌چنراو؛ قوماشی سست وهەراو چنراو. (پارچه‌شل‌بافت)

فرک بوون : زایین و بەرهێنانی مایین؛ لەزگ بوونەوەی مایین. (بچه‌آوردن‌مادیان)

فڕکەفڕک : [ناو،ت] فڕکوهوڕ؛ (١)هاتوچوی زۆر و بەلەز. (آمدن‌ورفتن‌زیادوباعجله)٢) پەیتا-پەیتا بەرد هاوێشتن یان شتێک فڕێدان بۆ کەسێ یا بۆ ئامانج. (سنگ‌یاچیزی‌انداختن-مسلسل‌وار)

فڕڵداخ: [ناو] فڕوفێل.>فەنوفێڵ.(نیرنگ)

فرمان : لەڕوانگەی دەستووری زمانەوە واتا کار(فێعل). (فعل)+

فڕمە : [دەنگەناو] پرمە؛ پرماندنی یەکسم. (صدای‌بینی‌اسب)

فڕنە : [ناو] فڕن؛ تەنوور؛ تەندوور؛ بۆی‌هەیە فێڕ (فێڕی گاز)ی ئینگلیسی و فارسی لە فڕنە وەرگیرابێت. (تنور)

فرۆشەمەنی : [ناو،ت] کاڵایی‌کە بۆ فرۆشتنە؛ فرۆشی. (فروختنی)

فڕوفیشاڵ : [ناو،ت] درۆ و دەلەسە؛ فڕوفێل؛ هووشە؛ بافیش. (چاخان‌پاخان)

فڕوفێل : [ناو،ت] فڕلداخ؛ فێڵ‌وفەرەج؛ چاپ‌و-چوب. (حیله‌ونیرنگ)

فڕۆک : [ئاوەڵناو] خوێن‌شیرین؛ ئێسک‌سووک؛ لەبەردڵان. (جذاب)

فڕۆکەشکێن : [ناو،ت] (١)جۆرێک فڕۆکەی تیژباڵ؛ فڕوکەی شەڕی. (هواپیمای‌شکاری). (٢) چەکێک‌کە بۆ خستنە خووارەوەی فڕۆکە بەکار دەبرێت. (اسلحه‌ضدهوایی)

فڕۆکەی بۆمب‌هاوێژ : جۆرێک فڕوکەی‌جە-نگی کەتایبەتە بەخستنەخووارەوەی بۆمب. (هواپیمای‌بمب‌انداز)

فڕۆکەی بێ‌فڕۆکەوان : جۆرێک فڕۆکەیە کە بەئامیری تایبەت لە دوورەوە ڕێنموونی دە-کرێ. (هواپیمای بی‌سرنشین)

فرووت : ساقەتی‌گەنم. (ساقه‌گندم)

فرووز : فرۆز؛ زۆربۆهێنان؛ تەنگ‌پێهەڵچنین؛ جاڕز؛ قەڵس. (به‌تنگ‌آوردن)

فرەخوەر : فەرەخۆر؛ زۆرخۆر. (پرخور)

فرەدان : (١) داندار؛ پڕدان؛ گوڵی دەغڵی کە دەنکی زۆرپێوەیە. (پروانه). (٢) حاڵەتی زۆردایین؛ زۆربدەری . (زیاددادن)

فرەگێل : زۆرگەڕ؛ ئەوەی زۆر دەگەڕێ. (زیادگشت‌زن)

فرەماگ : زۆرماو؛ (ب)کۆن؛ قەدیمی. (زیاد-مانده)
فرەنگ : فەرەنگ؛ فەرەنگستان؛ (ب)ئورووپا؛ کورتکراوەی ناوی فەرەنگیس. (فرنگ)
فرەواچ : درێژدادڕ؛ زۆربلێ؛ چەنە درێژ. (پر-حرف)
فرەوڕ : زۆرحەپەکەر.> فرەواچ
فرەوەر : زۆرخۆر. (پرخور)
فریاد : فریا؛ فەریاد؛ هاوار؛ داد؛ هانا. (داد)
فریاکەوە : (ب)زووبڕۆ؛ زوو وەرە؛ فریای کە وە؛ فریام کەوە؛ زووبگەیە؛ زووبگەرێ. (زود برس)
فریانەکەوتم : (١ب) نەمتووانی؛ دەستم نەگە-یی؛ پێم‌نەکرا. (نتوانستم). (١) فریای نەکەوتم هەتامن چووم ئەو ڕۆیشتبوو؛ نەگەیشتمێ (نرسیدم)
فرێت : کشتەک؛ ڕایەڵی تەون؛ تانی فەرش؛ بەن و ڕێسمانی کرژ بادراو. (تار در فرشبافی و جنس آن تار)
فڕێدان : پەرت‌کردن؛ هاوێشتن؛ ئاڤێتن؛ تووڕهەڵدان؛ خستن؛ ئاراستەکردن؛ ئاوێژتن. (انداختن؛ پرت‌کردن)
فریز : جۆرێک درێل(دڕێل) بە هەڵسووڕانێکی زۆرەوە کە مەتەی تایبەتی دەخرێتە سەر لە -نەجاڕیدا. (فریز)
فریشتە : پەری؛ ناوی ژنانەیشە. (اسم‌زنانە؛ فرشته)
فریشک‌کەوتن :[چاوگە،ت] بەژەک‌کەوتن؛ نەخۆشینی منداڵی ساوا لە ترسەوە. (مرض-بچەقنداقی‌ازآغوزگرفتگی)
فریشک‌گرتنەوە :[چاوگە،ت] چاک‌کردنەوەی نەخۆشینی منداڵێ کە فریشکی کەوتبێ. (بە-ژەک کەوتبێ یان ترسابێت)(علاج مرض‌بچە-قنداقی‌از مرض‌آغوزگرفتگی یا ترس)
فریڤی : [ئاوەڵناو] براشتی؛ برژاو؛ کوڵاو. (پخته)
فریودەر : [ناوبک] هەڵخەڵەتێن؛ کەسێ‌کە فریو دەدا؛ خاپێن؛ هەڵفریوێن. (فریب‌دهنده)
فستق : فندق؛ بەری دارێکە تێکەڵ دەکرێتە نێو ئاجیل؛ داری‌فستق. (فندق‌ودرخت‌فندق)
فسدوومان :ژوورێک کەکۆمەڵێک جگەرەی تێدادەکێش یان پڕە لەهەڵم و دووکەڵ. (اطاق‌پرازبخارودود)
فسەگور : تسەگورگ.
فس‌نیشتنەوە : بادەرچوون؛ (ب) لەهەوا و تەکەبور و لووت‌بەرزی کەوتن. (ازتکبرافتادن)
فسەکلک : مریشک یان کەڵەبابێک کە کلکی شۆڕبێ. (مرغوخروس‌دم رو بەپایین)
فسەگورگ : [ناو] جۆرێک جاڵجاڵووکەی بێ-داوەتەنەیە کە لەعەرزیدا چاڵێکی چکۆڵەی خز هەڵدەکەنێ و خۆی لە ژێرەوە لە بۆسەدایە کە جووڵەوەری تێ‌بکەوێ و ڕاویان بکا. (نوعی-عنکبوت‌زمینی)
فشاندن : چەماندن؛ لارکردن و چەماندنەوە وەک کەمەی گۆچان. (خم‌کردن)
فشقاندن :فیشقاندن وەک:دەنگی بەراز. (صدای‌گراز)
فشەپرتەقاڵ : نارنگی. (نارنگی)
فشەوبوون : فش‌بوونەوەی مریشک بۆ کەڵە-شێر؛ فش‌بوونەوە؛ شل‌بووونەوە. (شل‌شدن)
فشین : [چاوگە](١) چەمین؛ خواربوون.

(خمیدن ). (۲) هووشەکردن؛ خۆتاریفکـردن؛ بەخۆفشین. (ازخودتعریف کردن). (۳) دەنگی-هووشاندنیمار. (صدایمار) +
فلّته : [دەنگەنـاو] پلّتـە؛ دەنگـیقسـەکردنـی بێددانی پیر. (صدایحرفزدنپیر بیدندان)
فلّچەفلّچ کردن : ملّچەملّچ لەکـاتی خـواردندا؛ (ب) قسەی بێتـام کـردن؛ فلّتـەفلّـت کـردن. (صدایحرفزدن بیدندان)
فلیٚ :کورتکراوەی ناوەکانی(فلّامەرز، فەرامەرز، فەرەیـدون و فـەریـد)(مختصرشـده فرامـرز و فریدون و فرید)
فنجلٚ : بۆرەپیاو؛ گولەکە؛ (ئێوارە وەختە فنجلٚ بە بەختە)«فۆلکلۆر». (مرد بیارزش)
فوتوفەن : [ناو،ت] وردەکاریگەلـی پێویسـت بۆ کردنی کاریٚ؛ فەندوفێلٚ. (فوتوفن)
فۆتۆکۆپی : وشەی بیانییـە، فـەرکانـدن؛ وێنـە هەڵگرتنەوە زیاتر لە نووسراوە. (فتوکپی)
فۆڕ : لەگەلٚ (فش)دا دیٚ فشوفۆڕ : گـەورە و هەراو. (گشاد)
فوکل : [ناو] (۱) لەکاتی سەرتاشیندا بـەری-سەر دەهێڵنەوە کە فوکلی پیٚدەلـێن. (فکـل). ۲) مووی‌سەر بەرەو بان شانەکردن و خستنی-بەپشت سەردا. (موی‌شـانەشـدەروبـەبـالا). ۳) ملپێچ؛ شاڵگەردن. (شالگردن)
فوکلوکراوات : [ناو،ت] ملپـێچ و قـەرەوێتـە. (شالگردنوکراوات)
فوولەدۆ نەکردن : گویٚ بە حەڵالٚ و حەرام نە-دان. (درقیدحلال و حرام نبودن)
فەتراک : [ناو] زەرەر؛ زیان؛ ئێشوئازار. (زیان-ورنج)
فەترۆمە : [نـاو] موتوربـە؛ پـەترمـە؛ پـەیـوە-ندکردنیدار. (پیونددرخت)
فەتسان : خنکان؛ خەفەبوون. (خفەشدن)
فەتساندن : خنکاندن؛ خەفەکردن؛ قەڵەشاندن. (خفەکردن؛ شکافتن)
فەتسین : قەڵەشین؛ قەڵەشان؛ خنکان. (ترک-خوردن.خفەشدن)
فــەتــووت : فــەرتــووت؛ دارزاو؛ داقنیـو؛ ڕزاو. (پوسیدە؛ فرتوت)
فەحە : کورتکراوەی فەتحوڵـا؛ (ب) گیـژ و وڕ. (گیج)
فەڕاش : وشەیێکی بیانییە بە ڵـام لـە کوردیـدا ماناکەی گۆڕاوە و بە واتای گارەکەری بەردە-سـت و چاپـەزی میوانخانــەی گــەورانــە. (مستخدمبزرگان)
فەڕاشی مـەدرەسـە : گسـگـدەری حـەوش و حەساری مەدرەسە. (فراشمدرسە)
فەرامۆشخانە : جیگاێیک بۆ تـالیمی ڕیٚ و ڕە-وشتی ئەندامانی فڕاماسیۆن . (فراموشخانە)
فەرخەسینی : [ناو] فەرخە بۆ چکۆلـەی هـەر شت بەکاردیٚ و بۆ بەچکەی حـەیـوانیش دە-گوترێت، کەشەفی چکۆلە؛ مجۆعمەیچکۆلە. (سینیومجمعکوچک)
فەڕڕوخ : ناوە بۆ پیاوان؛ سـەرکـەوتـوو. (نـام-مردانە؛ پیروز)
فەرزانە : فر، وشەیێکـی بیانییـە و بـە ڕواڵـەت کوردییە و بۆی هەیە لە فـرەزان وەرگیرابێـت؛ فرەزانا؛ فرەزان؛حەکیم. (فرزانە)
فــەرســەخ : فرســەخ؛ فرسـەق؛ فرسـەنـگ. (فرسنگ)

فەرسەنگ : [ناو] فرسەق؛ فرسەخ؛ درێژایی ڕێگا نزیک بە سێ مایل(میل). (فرسنگ)
فەرشە : پنەکە؛ پنە؛ تەختەی‌گونگە هەویر لە سەر پان‌کردنەوە. (تختەپهن‌کردن‌چونەخمیر)
فەڕشی‌باریکە : >فەڕشی لاکێش.
فەڕشی‌تابلۆ : فەڕشی‌تابلۆ؛ جۆرێک فەڕشی دەستبافی چووکەیە پۆکەی زیاتر لە ئاوریشمە و گرێکانی زۆر وردە : و زیاتر (پۆرتڕە) و وێنە-ی جوانی لە سەردە نەخشێنن و لە قاپی دە-گرن بۆ هەڵواسین بە دیواری ئۆدەدا. (فرش-تابلو)
فەڕشی‌خرسەک : جۆرێک فەڕشی نە باشە گرێکانی هەراشە (گەورەیە) و تووکی درێژترە. (فرش‌خرسک)
فەڕشی‌دەستباف : فەڕشێکە بە دەست دە-چنرێت. (فرش دستباف)
فەڕشی‌لاکێش : فەڕشێکە باریک و درێژ زیاتر بۆ سەر پلیکان بە کەڵک دێت. (فرش‌باریکە)
فەرکەم : [ناو] پەرکەم؛ کوتووپڕ؛ نەخۆشینی شەپلە. (سکتە)
فەرمان : [ناو] فرمان؛ ڕۆڵی‌سەیارە؛ جەغز و بێژنگە(قەربیلی)سەیارە لێخوڕین.سوکان . (فرمان‌اتومبیل)
فەرمان‌نامە : دەستووری ڕەسمی؛ دەستوور بە نووسراوە. (امریە)
فەرمانفەرما : سەرۆک؛ حاکم؛ (فەرمانفەرمای ملّک دەروون پرێشان) «مەولەوی». (فرمانفرما)
فەرمانی : [ناو] جۆرێک فرنج وکەوا. (نوعی-کت محلی)
فەڕمەسۆن : > فڕاماسۆن .

فەڕوپیت : خێروبەرەکەت. (یمن‌وغنا؛ خیروبرکت)
فەرهاد : ناوی پیاوانە؛ ناوی عاشقەکەی شیرینی گڕاوی خەسرەوپەروێز بووە. (فرهاد)
فەرهادکوژ : (ب)کوڵکەی سەر بەخوێن؛ پیرێژنی فێڵەباز و سەر بەدەهۆ. (فرهادکش)
فەرهان : ترسان؛ داچڵەکان؛ فەرهین. (ترسیدن)
فەرەبوون : (١) زۆر بوون. (زیادشدن). (٢) بە-رفرەبوون؛ گوشادبوون؛ بەرئاواڵەبوون. (وسیع-بودن)
فەرەح :[ئاوەڵناو] (١)گوشاد؛ بەرفراوان. (وسیع). ٢) دڵشاد؛ خۆشحاڵ. (فرح)
فەڕەژان : ڤەرەژان؛ دڕان؛ پچڕان؛ قەتیان؛ قتیان؛ قرتیان. (پارە شدن)
فەڕەژاندن : دڕاندن؛ پچڕاندن؛ ڤەقەتیان؛ قرتاندن. ( پارەکردن)
فەڕەژین : پچڕین؛ دڕین . (پارەکردن)
فەرەنقە : [ناو] فەراقە؛ فەلاقە؛ پەت و چێوی فەلاقە؛ کاری فەلاقەکردن. (فلک‌وچوب‌فلک)
فەڕەنگ : (١)کورتکراوی فەڕنگیس. (خلاصە نام فرنگیس) (٢) وڵاتی فەڕەنگستان. (فرنگستان، اروپا، فرانسە)
فەرهوودکردن:تاڵان‌کردن؛غارەت‌کردن.(غارت-کردن)
فەرەیدون : ناوی پیاوانە. (فریدون)
فەریادڕس : فریاڕەس؛ کەسێک کە فریای کەسێک بکەوێ و یاریدەی‌بدا. (فریادرس)
فەرید : ناوی پیاوانە. (فرید)
فەریدە : ناوی ژنانەیە. (فریدە)

فەریکە : فەریک؛ بۆیھەیە لە فەریکی تورکییەوە ھاتبێت بەواتای، (تازە پێگەییو)؛ وە-ک نۆکە فەریکە و گوڵەکانی نیوە سووتی گە-نمی شلک بۆ قەرەخەرمان. (گندمدلملبوداده)

فەقی مەلکی : ناوی عێلێکە لە نێو دزەییانـدا. (نامعشیرەایست)

فەقیئەحمەدیدارەشمانە : ناوی قارەمانێکی-کورد بووە و بنەچەکی عێلیفەیزوڵابەگیە کە بەشێکیان لە ئێرانن و بەشێکیان لە دارە-شمانەیعێراق نیشتەجێن؛ مەزاریشی ھەرلە دارە شمانەیە. (نامسرسلسلەطایفەفیضالـە-بیگی)

فەقیتەیران : ناوی موحەممەد بووە وشاعیر و بلیمەتی کورد کە لە سەدەی نۆھەمی کۆچی ھەتاویدا ھاتووەتە دونیا. (نام شاعرکرد)

فەگلی : کەڵەوەکێشی؛ سەرپێچی؛ نافەرمانی؛ سەرەڕۆیی. (نافرمانی)

فەلاقەکردن : دارکاریکردنی پاییک کە لە ناو پەتی چێو فەلاقەدابێت. (فلک کردن)

فەنباز :[ئاوەڵناو] فێڵەباز؛بە فەندوفێڵ؛ حیلەباز. (حیلەگر)

فەنتاز : فانتەزی؛ شتی مۆد و جوان وتازەباو. (فانتری)

فانتازی : [ناو] فڕوفێڵ؛جادووبازی.(حیلەگری)

فێت : فەھێت؛ شەرم؛ حەیا. (شرم)

فیرکاندنیچەک :فیڕاندنی چەک بەجۆرێک (چەشنی) ئاوربگرێت بەڵام گوللە لە لوولەی چەک دەرنەپەڕێت و دووکەڵی بارووت لە-پاشەوە دەرچێ. (گلولەدرنرفتنازلولەاسلحە-درموقعشلیک)

فیسقە : (ب)مرۆڤی زۆر نابووتە و چکۆلە و لەڕ. (فسقلی)+

فیسکو : پیاوینێرباز. (مردبچەباز)

فیسکی : ژنیزینحاکار؛ بە ژنی خۆ فرۆشیش دەڵێن. (زنھرجایی)

فیسە : زینحا؛ زینا؛ زیناح. (زنا)

فیسەک : فیسەکار؛ زینحارکار؛ زیناکار. (زناکننده)

فیسەکەر : فیسەکار؛ فیسەک؛ زینحاکار. (زناکننده)

فیسەکی : وشەیێکی مردووە وکەم بەکاردە-برێت؛ قاحبە. (قحبە)

فیسیای : فیسیاگ؛ خووساو. (خیسووارختە)

فیشالکردن : هووشەکردن؛ خۆھەڵکێشان؛ درۆ و دەلەسەکردن. (ازخودتعریفکردن.دروغ)

فیشقاندن : دەنگی کەڵگامێش و یەکانەی بە-راز. (صدایگاومیشوگراز)+

فیکالەکونێ : قەراقەرا؛ یاریی خۆشاردنەوە؛ خۆشارکێ. (قایمموشک؛ قایمباشک)

فیکفیکە : [ناو] فیقفیقە. (سوتسوتک)

فێلەگێجە : [ناو] فیلەگێژە؛ گامێشیوەحشی؛ بووفالۆ. (گاومیشوحشی.بوفالو)

فیلێھاتن : بێھۆشبوون و دەستوپا وەشاندن و کەف ھەڵخڕاندن؛ حاڵەتێکە بەسەر خوودارد‌ا دێت. (دچاربحرانصرعشدن)

فینار : لە( فەرار)ی فارسیەوە کوردکاری بووە؛ ھەڵاتن. (فرار)

فێنکاھی : فێنکایی؛ فێنکی؛ جێگایفێنک. (خنکی)

فینۆک : فێنک؛ خونک؛ مرۆڤی زۆربەئیشتییا بۆ کاری سەرجێیی. (خنک؛ حشری)

# ڤ

ڤا : [ناو] باو؛ خول؛ با؛ پێچ. (پیچ)
ڤـاج: [نـــاو] گۆشـــه؛ کـەنــار؛ حاشــیه؛ پــه-راوێز.(گوشه.کنار)
ڤاچ : [ناو] گویه؛ گوته؛ بێژه؛ وێژه؛ زۆرڤاج: فرەوێژ. (گویه)
ڤـاخواردن : [چاوگــه،ت] بــاخواردن؛خول-خواردن؛ پێچخواردن؛ گشتبوون؛ کرژبوون. (پیچ و تاب‌خوردن)
ڤار : [ناو] بارِ؛ بارِۆکه. (جوجه مـرغ شــش-ماهه)
ڤارک : >ڤار.
ڤاگیر: باگر؛جێگایێ که بای تـیٚبکـەوێـت. (بادگیر)
ڤاڵا بوون : [ناو] کراوه؛ بەتاڵبوون؛ بەتـاڵ. (بازبودن؛خالی‌بودن)
ڤاوڤاران : [ناو،ت] واو واران؛ باو باران. (باد وباران)
ڤڕاڤه : [ناو] (۱)وەڕینی‌سەگ؛ڤڕا سەی؛ (پار س‌کردن‌سـگ). (۲) وڕینـه؛ وڕاوه؛ قسـەی هاته ران و پاتەران. (هزیان)
ڤرتـــوڤین : [نـــاو] درۆ و دەلـــەســـە؛ ماستاوکردن. (چاپلوسی)
ڤڕڕ :[دەنگەناو]ویڕڕه؛ دەنکی بەرد وگـو لله؛ فینگه. (صدای گلوله و سنگ‌اندازی)
ڤڕڤڕۆک : [ناو] فڕفڕه؛ لەیستۆکی منـداڵان کە لەکاغذ یان دار دروستی دەکەن و بە با دەخولێتەوه. (فرفره)
ڤلتەڤلت : [ناو] (۱) فڵتەفڵت؛ دەنگی فڵتەی کاتی ئاخافتنی بێددان.(صـدای دهـان‌پیـر-بیدندان) (۲) قسـەی بێتـام کـردن. (یـاوه-گفتن)
ڤلتیــای : پــەقیـای؛ قــەڵــەشــان؛ تــه-قیان.(ترکیدن)
ڤەبال : [ناو] وەباڵ؛ ئوباڵ؛ تاوان. (تـاوان-گناه)
ڤەبڕین : [چاوگه،ت] بڕینەوه؛ قەرار و مـه-داری موعامەله بڕینـەوه؛ قـەول و قـەراری سەودا و موعامەله تەواکردن. (اتمام پیمـان معامله)+
ڤــەبزدانـــدن: [چاوگـــه،ت] (۱)ترســـاندن (ترساندن)
((۲) قرتاندن . (قطع‌کردن)
ڤــەبزدانــدن : [چاوگـــه،ت] بزداندنـــەڤـــه؛ پساندنەوه؛پچڕاندنەوه. (دوباره‌پارکردن‌پاره-کردن)
ڤەبزدین : [چاوگه،] (۱) ترسان. (ترسـیدن). (۲) قرتان؛ بڕیان. (گسستن)
ڤــەبڕیـــان : [چاوگـــه،ت] ژێکڤـــەبـــودن؛ جیابوونەوه؛ قرتیـان؛ قرتـان؛ ڤـەقـەتیـان. (قطع‌شدن)
ڤەپاڕیـان : پاڕانـەوه؛ لاڵیانـەوه. (التمـاس-کردن)

ڤەچناندن : [چاوگە،ت] سەرکۆنە کردن؛ بۆدواوەبردن؛ چنەلێکردن. (ملامت کردن؛

ڤەچکیان : [چاوگە،ت] چک‌بوون؛ وشک‌بوونی‌ئاو؛ وشکایی‌هاتن؛ هشکبوون؛ نەمان و دوایی هاتنی هەر شت؛ نەفەس چکیان: نەفەس بڕیان. (قطع‌شدن؛ خشک‌شدن- چکه)+

ڤەچۆپریان: [چاوگە،ت] چۆپریانەوە؛ بڵاوبوونەوە؛جیابوونەوە. (جداشدن)

ڤەخاپاندن : [چاوگە،ت] فریودان؛ فێڵ- لێکردن؛ لەخشتەبردن. (فریب‌دادن)

ڤەخاندن :[چاوگە،ت]خوێندنەوە؛ بانگ- کردن. (خواندن؛ صداکردن)

ڤەخەلەتاندن:[چاوگە،ت]دەست بڕین لە- سەودا

و موعامەلەدا ؛ لە خشتەبردن؛ سەردا بردن. (مغبون کردن)

ڤەخوەندن:[چاوگە،ت]بانگهێشتن- کردن.(دعوت کردن)

ڤەدڕاندن:[چاوگە،ت]دڕاندنەوە؛دڕاندن؛ پچڕاندنەوە. (دریدن؛ بریدن)

ڤەدی : جوداکرن؛ دوورکرن؛ خۆ ژمن ڤە- دیکە: خۆ لە من جوداکە: خۆ دوور بگرە لە من؛ ڤەدی ناکەی مە بتیغ. «جزیری». (دوری گرفتن)

ڤەراسەی : وراسەی؛ دوورین؛ دروومان. (دوخت؛ دوختن)

ڤەراڤبەر : بەرانبەر؛ ڕووبەڕوو. (مقابل)

ڤەرانبەر : بەرانبەر. (برابر)

ڤەڕچالە : قرچالە؛ ترسەنۆک؛ بێ‌زاڵە. (ترسو)

ڤەرستیای : هەڵوەشاندن؛ کردنەوە. (باز- کردن)

ڤەرسهاندن : پشووپێدان؛ حەساندنەوە. (استرا حت دادن)

ڤەڕەز : وەڕەز؛بێزار؛ئاستەنگ؛ بەتەنگ- هاتوو؛ جاڕس؛ جاڕز. (بتنگ‌آمدن)

ڤەڕەستی:دەست‌بەردایی؛ ڕزگاری . (رستگاری)

ڤەرەمک : برکن؛ بن‌کڕ. (تەدیگ)

ڤەریک : بەریک؛ گیلفان؛ گیرفان. (جیب)

ڤەشاردن : شاردنەوە؛ وەشارتن . ( پنهان کردن

ڤەشەهتاندن : [چاوگە،ت] هیلاک‌کردن؛ ماندووکردن؛ ماندی‌کرن. (خسته‌کردن)

ڤەقراندن : [چاوگە،ت] شکاندن؛ شکاندنە- وە؛ تە تبلا مە ڤەقراند: تۆ قامکی منت شکاند. (شکستن)

ڤەقرچیان : وەک:لەبەرقرچەی خۆر ڕەش داگرسان؛ ڕەش هەڵگەران لەبەر هەتاودا. (سیاه‌شدن‌درآفتاب)

ڤەقوتان : کوتان؛ لێدان. (زدن)

ڤەکایێن : قاچک جوون؛ قاچک جاوین؛ کاوێژ؛ (ب) ڕینگانەوە و دووپاتکردنەوەی قسە (نشخوار)

ڤەکوروتن : [چاوگە،ت]کوروژتن؛ کوروشتن؛ کوروشتنەوە؛ داکرماندن؛ بەددان وردکردنی شتی‌ڕەق. (خردکردن‌خوردنی- سخت‌وبادندان شکستن)

ڤەکۆلان : [چاوگە،ت] (۱) هەڵکوڵان؛ هە-

ڵکۆڵین؛هەڵکەندن.(کندن)(٢)تۆژینەوە؛ پشکنین وگەڕان‌بەدوای مەبەست و واتادا. (تحقیق وتجس) +

ڤەگرتن : گرتنەوە؛ گرتنی نەخۆشین لە - کەسێکەوە؛ گرتنەوەی حەیوانی بەربوو؛ داگیرکردن. (پس گرفتن؛ ازکسی‌قرض گرفتن؛ بازگرفتن‌تسخیرکردن)

ڤەگژاندن : جووڵاندن؛ تەکان‌دان؛ ڕاژەندن؛ هەژاندن. (جنباندن)

ڤەگژگژاندان : ڕاپسکاندن و ڕزگارکردن. (تکان‌دادن‌ونجات‌دادن)

ڤەگژلان:ڕاپسکان؛هەژاندن؛ڕاوەشاند و تەکان دان. (تکان‌دادن)

ڤـەگوهـازتن:ڤـەگوهاستن؛گوێستنەوە؛ڕاگوێزان. (جابجاکردن)

ڤەگەشیان : گەشبوونەوە؛ گەشانەوە؛ گەشەکردن. (شتعل‌شدن؛ اخگرشدن؛ شکوفاشدن؛ شاداب‌شدن‌گیاه)

ڤەگەڤزاندن: [چاوگە،ت]گەوزاندنەوە؛بەپاڵکەوتنەوەخول و پێچ پێدان؛ تل‌پێدان. (پۆیێکی تورکیی پێوە دیارە).(غلطاندن)

ڤەماگ:شتێک کە مابێتەوە ؛بەجێ‌ماو؛ وەپاشکەوتوو؛ وەدواکەوتوو.(ماندە؛ بجاماندە)

ڤەها : ڤەهە؛ ئاوا؛ بەوجۆرە. (اینطور)

ڤەهاندن :هۆنینەوە؛ڕستن؛ بەڕیسمانەوەکردنی مووروو. (رستن؛ رشتەکردن)

ڤەهژاندن : [چاوگە،ت]هەژاندنەوە؛ ڕاژەندن؛ ڕاوەژەندن. (تکان‌دادن)

ڤەهەواندن : [چاوگە،ت] کۆم‌کردن؛ کۆکردن ؛ کۆکردنەوە؛ (جمع‌کردن)

ڤەیدان : >ڤەهەواندن.

ڤەیە : (١)وایە؛ ڤایە. (اینطوراست). (٢)ئهوەیە؛ ئەوەتانی؛ ئەوەتا؛ ئاوەها. (اینست)

ڤیان :[ناو] ویست؛ حەوجە؛ پێداویست؛ گەرەک؛ خواز؛ خوازە؛ خۆشەویستی. (خواستن)+

ڤێتۆ : فرد؛ فد؛ اند؛ وێتۆ؛ دەسەڵاتی ڕەتکردنەوەی ڕای‌گشتی، (ڕای‌کۆڕێک شکاندن) . (وتو)

ڤیچی :[ناو] خواری؛ لاری؛ لار و گێڕی؛ خێچی. (کجی)

ڤیدیۆ : ویدیۆ؛ ئامێری نمایش‌کردنی شریت (کاسێت)ی ویدیۆ. (ویدیو)

ڤیڕین : گیفەی شتی هاوێژراو وەک ویڕەکردنی بەرد و گوللە. (صدای‌سنگ‌پرتاب‌شدەوگلولە)

ڤیژاندن : فیڕاندن. (اسهالی)

ڤێک‌کەتن:[چاوگە،ت](١)وێک‌کەوتن؛ پێک‌هاتن؛ئاشت‌بوونەوە؛کەوتنەتەک‌یەک.(توافق‌کردن) .(٢) لەیەک کەوتن؛ تووشی یەک‌بوون؛ ڕاستی‌یەک هاتن. (بهم‌برخوردکردن)



قاب:[ناو]قاپ؛چوارچێوەی وێنە و پۆستێر.(قاب)+

قاب : [ناو] تد؛ (بەتورکی واتا درگا) سەر پۆشی دەفر؛ دەرپۆش؛ قاپاخ. (درپوش)

قابخانە : [ناو] جێگەی قاب و قاچاخ و دەفر و ئامانی مدبەق؛(جای‌ظروف‌آشپزخانه)

قاب دەسماڵ:[ناو] دەسرەی قاب سڕین یان وشکەوەکردنی قاب و قاچاخ. (قاب‌دستمال)

قابلی :[ناو] قابولی؛ قبوولی؛ پڵاوی برنج و بڕوێشی تێکەڵاو لەگەڵ گۆشت و لەپە و کشمیش. (نوعی‌خوراک)

قابولی : > قابلی.

قابووخە فیشەک :[ناو] قاپووڕە فیشەک؛جەرجوو. (پوکه فشنگ)

قابەجاخ :[ناو،ت] قاب و قاچاخ ؛ ئامان و دەفری مدبەق. (ظرف‌وظروف)

قابیلەت :[ناو] شایەنی؛شیاوی؛توانایی؛لێهاتوویی. (قابلیت)

قاپڕەش :پێڕەش؛ قەدەمڕەش؛ بەدیومن.(بدقدم)

قاپقاچاخ : قاپ و قاچاخ. >قابە چاخ

قاپووڕ : بە سووکی بە پیرە پیاوی زۆرهان و بە کەلەخ دەوترێ. (خطاب‌بی‌ادبانه‌به‌پیرمرد) > قاپووخە فیشەک+

قاپوورە :[ناو] قولاپە ؛ قولاپەی‌پا؛ جومگەی‌پا؛ قاپوولە. (مچ‌پا)

قاپووس :[ناو] مێردەزمە؛ خەوی ئاشەوپاشە؛ سەنگ سوواربوون. (کابوس)

قاپهاوێژ :(١)[ناو،بک]کەسێ‌کە جگ‌هەڵداوی لەیاری‌جگێن‌دا. (شتالنگ‌انداز). (٢) قاپاویژ؛ (حیوانیکه‌درراه‌رفتن قوزکهای‌پایش‌بهم‌بخورد)

قاپەشینکە : [ناو] قاپەکەوەڵە؛ گیای قەیتەران. (نام‌گیاهی‌است پرسیاوشان)

قاپەکەوڵە >قاپە شینکە.

قاپیلک :[ناو] قاپێلک؛ ئێسقانی دەوری لەشی ڕەقە و کیسەڵ؛ توخڵی گوێز و بادام و...(پوسته لاکپشت؛ پوسته بادام‌و گردو)

قاتا شەڕێ : جەرگەی شەڕ. (ب) مەیدانی شەڕ. (میدان‌جنگ)

قاترداشاغی: لە تورکییەوە هاتووە گونەهێسرە؛ هەڵوچەیێکی دەنک گەورەی ڕەشە. (آلوی‌سیاه دانه درشت)

قاتۆ : [ناو] شەقەمشار؛ مشاری مەزنی دوو دە ستک. (دره‌دونفره)

قات‌وقوتی : [ناو] قات‌وقڕی؛ گرانی و نەبوونی؛ وەگیرنە کەوتنی شتێ. (گرانی‌ونایابی)

قاتۆل : [ناو] وشترخۆرە. (خارشتر)

قاتی‌پاتی:وشەیێکی فارسییە،بەڵام لە سەقز هەتا کرماشان لە سەر زمانانە؛ تێکەڵ پێکەڵ. (قاتی‌پا تی)

قاچاخی :تد؛ فد:(١) نەهێنی؛ بە دزیەوە.(پنهانی) (٢)ماڵی قاچاخ؛شتێک‌کە بە قاچاخ دە فرۆشرێت. (قاچاقی؛ کالای‌قاچاخ)

قاچقاچ : قاش قاش. (ف. مشە) پارچە پارچە.

(قاچقاچ)
قاچک :[ناو] پەڵخوڕی کاوێژ نەکراوی نێو گەدە ی دووسم. (خوراکنشخوارنشدەداخل‌شکمبە)
قادبین :[ناو] پسپۆڕ و شارەزای جەنگ؛ قادناس. (متخصص‌امورجنگی)
قادە :[ناو] جۆریک خێشکە بۆ کێشانی‌شەغرەی گیا و ئالف. (نوعی‌ارابەبدون‌تایر)
قاڕ : وەلانراو؛ قت؛ بەرکەنار. (برکنار)
قارغ : ڕۆژکوێر؛ کەسێک‌کە لە ڕۆشناییدا چاوی باش نابینیٚ. (روزکور) تۆپ قاڕێن. (نوعی‌بازی)
قارەمانی:[ناو]پلەی یەکەمی کێبەرکێی وەرزشی؛ مێرخاسی؛ پاڵەوانی. (قهرمانی)
قارەوا:ناوی دوو گوندە لە بەینی سەقز و بۆکاندا. (نام‌دوقریە)
قاڕێن : [ناو] قەلەمناریٚ؛ (نوعی بازی باتوپ)
قازانەسەر :مەلێکی تیژ چنگاڵە و گۆشت خۆرە و کڵاونە. (نوعی‌پرندەشکاری) > قازان‌بەسەر. (ف.هن)
قازوخ :[ناو] وشەیێکی تورکییە و تورکەکان بۆ ئەشکەنجەدانی تاوانباران دارێکی تایبەتیان دەبر ڕیە پاشی تاوانباران؛ دار تێبڕین. (نوعی شکنجە ترکی‌درگذشتە)
قازوق : > قازوخ
قازووج :[ئاوەڵناو] لەڕ؛لاواز؛ بێحاڵ و بیٚتین و بێتوانا. (لاغر؛ ناتوان)
قازووخ :[ناو]هۆرەی دارقەڵەشاندن؛ میخ تەویلە؛ پوواز. (پفاز)
قازەڕن :[ناو] دەسکەنە لە جاری پڕگژ و گیادا کە ناچار وەک لەوەڕینی قاز چڵەچڵە دەسکەنەبکریٚ. (درو کردن بادست وساقە ساقە)

قازەقۆرە : جۆرێک ڕووەکە. (نوعی‌گیاه)
قازیاغە : [ناو] قازیاقە؛ قازیاخە؛گیاییێکی‌کورتەباڵا ی گەڵاپانە و دەخوریٚ. (قازیاغی)
قازیاقە : >قازیاغە
قازی‌بازی:[ناو] قالۆنچەی ڕەنگ سەوزی بریقە دارەکە لەسەرگوڵان دەنیشیٚ.(نوعی‌سوسک‌سبز)
قازی‌قولَینگ : [ناو] قازی‌قولەنگ؛ باڵندەیێکی قاچ و مل‌درێژی ئاوییە و زیاتر لە هەڵفڕیندا ڕیز دەبەستن.(درنا)
قاژەک : [ناو] قشقەڵە؛ قشقەڕە؛ قەلە کلک درێژ. (زاغچە)
قاست : قاس؛ ئەندازە؛ حاست. (حد؛ اندازە)
قاسڵوانک : گاوانی؛ ڕیشۆڵی. (سار)
قاسیەپاییزە:[ناو]قاسیدە پاییزە؛ گوڵی داوودی، مەڵهەمێکی لێدروست دەکەن بۆ جێی چزووی دووپشک و مار بەکەڵکە. (گل داوودی)
قاش‌قاش : [ناو،ت]کووزکووز؛ لەت‌لەتی میوە. (قاچقاچ)
قاشقوش :مرۆڤی تەمبەڵ و لەشگران.(آدم‌تنبل)
قاشقۆل :[ناو] قەشقۆل؛ قەشقیل؛ هەنجیری وشکەوەبوو بە سەردارەوە؛ هەژیری هشک‌بوو بدارێڤە. (انجیرخشک‌شدەروی درخت)
قاشقونجی : ئافرەتی جرپن و حەکەدار. (زن هرزە)
قاشکردن : بڕین و لەت‌لەت‌کردن، بەتایبەت کاڵەک و شووتی و میوە. (قاچ‌کردن)
قاشۆ:[ناو]چێوشەق؛گۆچانی‌گۆیێن.(چوب‌چوگان)
قاشیلە:[ناو]قاشوولە؛ کوتە شووشە و کوتەچینی. (تکەهای‌شیشەوچینی)
قافک : [ناو] قاوخ؛ ئیسقانی کلەسەر؛ قاپووڕ؛

قاپۆڕ؛ قاقل؛ قاوڕ؛ قاوغ. (پوسته؛ جمجمه)
قافکێتهێکا :[ناو] قافکی هێلکه؛ قاوخی‌هێلکه؛ هێلکەی خاڵی له سپێنه و زەردێنه. (پوسته‌تخم مرغ‌خالی)
قافڵه ڕێگا : ڕێگایێ که کاروانی پێدا دەڕوا؛ (ب) ڕێگای ئاوەدان و پان. (کاروان‌راه)
قافڵەسالار:فد:[ناو]ڕێبەری قافڵه؛ سەرۆکی قافڵه. (قافله‌سالار)
قافلی : قافڵه؛ کاروان. (قافله)
قاق :وەپاشکەوتن له یاریی جریتانێدا؛ دووا کەوتنی ئەسب له جلیتانێدا؛ قاڕ.(عقب‌افتادن‌اسب دربازی‌جریت)
قاقان:خاقان؛میر؛ گەورە؛ زیاتر به میری وڵاتی چینیان دەگوت. (خاقان)
قاقانی : [ناو](١)قەباله؛ بونچاق؛ قەواڵه. (قباله). (٢)جۆرێک قوماش بووە. (نوعی‌پارچه)
قاقبوون :وەلانران؛قاڕبوون؛ قت‌بوون؛وەپاشکەوتن. (برکنارشدن؛ عقب‌افتادن)
قاقڵاو :[ناو] فرۆ؛ ماستی لەژەک چێبوو. (ماست ازآغوزدرست‌شده)
قاقلۆکەشەیتان : قاپیلکەی شەیتانۆکه؛ شەیتانۆکه. (صدف‌حلزون)
قاقلی‌بەهاره : شەماڵگیر؛ گیاییێکه دژی هوورگ (میکرۆب)، بۆ گەرۆڵی و برینی چڵک‌کردوو به کەڵکه. (گلپررومی؛ انسجدان رومی)
قاقنەک : ژەک. (آغوز)
قاقەیچک:[ناو] قاقری؛قوڕقوڕاچکه؛ قوڕقوڕاکه؛ قڕقڕۆچکه؛ قامیشه؛ قوڕوو؛ کڕکڕاکەی گەروو. (خرخره)
قاقیژه : [ناو] قاژوو. (زاغ کوچک‌پاقرمز)

قاقیژه : [ناو]قاژوو؛ قاژی؛ له تۆرەمەی قاڵاوەڕەشەیە،بەڵام چووکتره و دەندووک و پای سووره؛ قەلەقاژ. (زاغ پا قرمز)
قالٚ :له پاش‌سەردادیٚ و واتای مەژوولٚبوون و خەریکی‌کاریٚ بوون‌دەدا؛ سەرقاڵی‌کاره : سەری ناپەرژیٚ (مشغول)+
قاڵاوخۆر : گوراڵه موسایيانه : >قاڵاوگیر
قاڵاوگیر :[ناو]سامڕێژ؛ گیاییێکه گوڵەکەی ورد و تۆپ ئاسایه دژی زەرداوە. (کلاغک‌خوشه‌ای)
قاڵاوه سیاوه : قەلاوەسیاوه؛ قەلەڕەشه؛ قاڵاوەڕەشه. (کلاغ‌سیاه)
قاڵبڕێژی : [ناو]کاری له قاڵبدانی کانزا یان خشت لەقاڵبدان. (قالب‌ریزی)
قاڵبسازی :[ناو]کاری دروستکردنی قاڵب؛جێگای دروستکردنی قاڵب. (قالبسازی)
قاڵبسووک :[ئاوەڵناو]ڕۆح‌سووک؛ چالاک و ئازا؛ دژی لەش‌گران. (آماده‌انجام‌کار؛ ضدتنبل)
قاڵب‌گران :[ئاوەڵناو] لەشگران؛ تەمبەلٚ. (تنبل)
قاڵب‌گرتن : قاڵب دروست‌کردن و ئەندازەگرتنی قاوخی دروستکراو یان ئەندازەگرتنی شتێک که بەو ئەندازه داڕێژریٚ؛قاڵبی‌تاپۆی قوڕین دروست کردن بۆ داڕشتن بەکانزا؛ قاڵبی ددان‌گرتن به هەویری تایبەت بۆ چێکردنی ڕووکێش یان ددانی دەستکرد. (قالب‌گرفتن).
قاڵبمجی : >قاڵبڕێژی
قاڵبی: [ناو] شتی له قاڵبدراو یان بەقاڵب دەر هاتوو؛ پەنیری قاڵبی و چوار گۆشه. (قالبی)
قالچه : [ناو]قانچه؛ سووانه؛گوێسووانه؛سووانگه. (کناره‌های‌پشت‌بام)
قالک : قاڵک؛ تۆخل؛ توێخل؛ قەپیلک؛ کاسەی

سەر. (پوسته، جمجمه)
قاڵکراو :[ئاوەڵناو+ ناوبەر]ئاتیواو؛ کانزای بە ئاور تاواوە؛هەنگوینی مێو لیٚجیاوەکراو و پاڵاوتە. (ذوب‌شده؛ صاف‌شده)
قاڵنجه : [ناو]کۆترەباریکە؛ تفرک. (فاخته
قالنگ:[ناو]گولۆڵە؛قالنگەبەن:گوٚلۆلەبەن؛کڵافە. (کلاف)
قالووشک :پێستی‌دار؛ توێخڵی‌دار.(پوسته‌درخت)
قاڵەقنگ : [ناو] قاڵاقنگ؛ ڕێواسی کولەبنەی ساقەت‌کورت. (ریواس‌پاکوتاه)
قاڵیباف :[ئاوەڵناو+ ناو،بک] تەون‌کەر؛ تەڤنکەر؛ فەڕشباف؛ فەرش چێکەر. (قالیباف)
قاڵیبافی :[ناو]شوٚلا تەڤنکرنیٚ؛کاری تەونکردن؛ چێکرنا مافیری. (قالیبافی)
قامام :[ناو]قومام؛ پەلەسوور؛گیاییٚکەکورتە باڵا و بوٚنی لیموٚی لیٚدێت، لە ئاودا دەیکوڵێنن و ئاوەکەی دژی کیچ و گەنە و جوولەوەرانە.(گورگیاه؛ سنبل‌هندی)
قامکەگەورە:تبلامەزن؛ تبلابەرانیٚ؛ تبلابەرانکیٚ؛ کەڵەمووس؛ تبلیٚڕانکیٚ؛ بەرانەک؛ پەنجەکەڵە. (انگشت شصت)
قامکی‌براتووتەلە : قامکی ئەنگوستیلە؛تبلاڕوٚخیٚ ؛براتووتە؛ بابەلیچک.(انگشت‌حلقه؛ انگشت‌بنصر)
قامکی‌چکوٚلە : قامکەتووتەلە؛ قامکەتووتەڵە؛تبلا قیچیلک؛ قەلینجەک. (انگشت‌کوچک)
قامکی‌شادە :تلیا شادیٚ؛ تلیا هەڵاڤێژکیٚ؛ دوٚشاو مژە؛ لەپاڵ قامکە گەورەدایە. (انگشت‌اشاره)
قامکی‌ناونجی : تبلاناویٚ؛ تبلانیڤەکی؛ قامکی نێوەڕاست؛ئەڕنەمووتیٚ؛ قامکی‌قووتیٚ؛ هەڵمەقوو تە.(انگشت میانی)

قامیشە : <قاقەیچک.
قامیشەڕەشە : [ناو] زەلەمێرگ؛ گیای جەگەن. (گیاه‌هزارنی؛ جگن‌نهری)
قامیشی‌شەکر:[ناو] قامیشێکە شەکری لێدەگرن. (نیشکر)
قامیشی‌گەرمیان : [ناو]لەلە؛ جوٚرێک قامیشە کە خەیزەرانیشی پێدەڵێن. (خیزران)
قاناو : ئاوەڕوٚی پیساوی مەبال؛ گەناو. (جوی گنداب‌ستراح)+
قانتوٚڤ : سەوەتە. (سبد)
قانج :[ئاوەڵناو]زوور؛ زبر؛ قەوی و ئەستوور؛دژی ناسک و لووس. (زبر)
قانچک :[ناو] قەڵداس؛ پڕژی‌گوڵەگەنم و جوٚ؛ داسوو. (پژ؛ داسه)
قانزاج‌کردن : قازانج‌کردن؛ سوودکردن. (سود بردن)
قان‌قان : مەودامەودا؛ بەینابەین؛ جێگەجێگە؛ پەڵەپەڵە. (جای‌جای.گله‌به‌گله)
قانگ : گیای ئەسپەندەر؛ تووەکەی دەسووتێنن دووکەڵەکەی دژی هوورگە. (میکڕوٚب).(اسپند)
قانگە : کانگە؛ کانگا. (کان)
قانوونزان :[ناو]قازی؛پسپوٚڕی قانوون ودەستوور و یاسای دادگا. (متخصص‌قانون؛ قاضی)
قاوچەخماخ :[ناو،ت] قاو و چەخماخ؛ ئەستیٚ و بەرد و پووشو بوٚ ئاورکردنەوە. (هود و سنگ آتشزنه)
قاولەمە :[ناو] قابلەمە؛ چان‌چیلک. (قابلمه)
قاوەخوٚری :[ناو] فنجان و ئیستیکانی چووکەی تایبەت بە قاوە خواردن. (قهوه‌خوری)
قایش‌کێشان :[ناو](ب)کەڵەوەکێشی؛نافەرمانی؛

سەربادان؛ شەڕە قسە و کێشەکردن. (تمرد)
قاییە : لە قاعیدەی ئارەوییەوە هاتووە. (قاعدە)
قجیلەشوان:[ناو]مەشکەدڕە؛ جۆرێک کوللەیە لە شێرەکوللە گەورەترە و دەنگێکی بەرزی هەیە و لە سەر پنجە گیا دەنیشێ و وەک سیسرک دەنگی هەڵدێنێت. (نوعیملخ)
قراڵوو : قرتۆڵ؛ پیری زۆرهان. (پیرازپاافتادە)
قربۆق‌کوژ :قورواق‌کوژ؛ گیاییێکی‌کورتە باڵایە و گوڵەکانی پێنج پەڕە. (وزغ‌کش)
قرپۆک : [ئاوەڵناو] هەر شتی ڕزیوی ناقایم‌کە خەریکە بشکێ و قرپبێ.(نامحکم؛ شکستنی)
قرتاندن:[چاوگە،ت] قرتەکردن و گارکەگارکی مریشک. (قدقدکردنمرغ)+
قرتک :[ناو] نزگەرە؛ نقەرە. (سکسکە)+
قرتەلێبڕین : [چاوگە،ت] خواردن و تەواوکردن؛ هیچ نەهێشتنەوە. (خوردن تا اتمام)
قرش‌وقەواڵ : گیاو کڵۆشی وشک. (ساقەگندو گیاەخشک‌شدە)
قرتۆڵ : قراڵوو؛ پیری زۆرهان. (پیرازپاافتادە)
قڕتێخستن:[چاوگە،ت]کوشتنی بەکۆمەڵ؛ئاسە وار لیٚبڕین. (کشتن دستجمعی)
قڕتێکەوتوو : وەک جوێن بە منداڵانی هاروهاج دەوترێت؛ ئاسەواربڕاو. (فنا سدە ها)
قرچ :[ئاوەڵناو]شتی تورت و ناسک.(ترد و نازک)
قرچ : قرچ بوو:شکا؛ قرچ بوون: لەت‌بوون؛ قرچ: شکان؛ تورت. (شکستن؛ شکستنی)
قرچۆک : قرچ؛ تورت و ناسک. (شکستنیوترد)
قرچۆڵ : شتیچرچ؛ (ب)مرۆڤیچرچ و چرچۆڵ؛ چرچەلۆک. (پرچین‌وچروک)
قرچەپێ : یەکپێ و بەلەز لەبەر کەسێ هەڵسان. (جلوپای‌کسی‌باشتاب‌بلندشدن)
قرخاندن : [چاوگە،ت] قرخەقرخ‌کردن؛ دەنگی گەروو کاتی خنکان. (خرخر هنگام‌خفە شدن)
قرخۆڵ : [ئاوەڵناو] قرخن. (زیادخرخر و سرفە کنندە)
قڕخەمەرەس : [ئاوەڵناو] مل‌نەدان و ڕێگە دانە گرتنی تاژی ڕست‌کراو. (امتناع از بدنبال‌آمدن تازی وسگ)
قرژاڵۆکە :کێچی دەریا؛ ئەنگوش؛ قولمەی‌ئاوی؛ مەیگوو. (میگو)
قرقیز : زمان و خەڵکی قرقیزستان لە ئاسیای ناوەندی. (قرقیز)
قڕنای : قڕاندن؛ موژدە؛ خەبەری‌خۆش؛ نوقڵانە. (بشارت؛ مژدە)
قڕنایی : قڕاندن؛ نوخشانەی خراپ یان چاک پێدان، یان هێنان (فال‌بدزدن؛ مژدە)
قڕوقەمزە : (ب) نازوقەمزە؛ ناز و ئەتووار.قە لبیرە؛ نازونیوناز؛ عیشوەوناز.(قروغمزە)
قڕەقڕ :[ناو،ت] قیرەقیر؛ هەراهەرا؛ دەمەقاڵە. (دعوای لفظی و دادوقال)
قڕەقڕ : [ناو،ت]کێشەکێش؛ زەحمەتی زۆر؛ بە هەزار قڕەقڕجانتاکەم هەڵگرت زۆر قورس بوو. (زحمت)
قڕیان :[چاوگە،ت] قڕبوون؛ قڕتێکەوتن؛ تێکڕا مردن. (مردن‌دستجمعی)
قرێژەکوچک :[ناو]خەنەبەردیلە؛ خەنەگورگە؛ گلەوەز؛ گلەوەزە؛گەنمەبەردیلە؛ چاییەشەیتانە؛ بەڵخ‌کوچک؛قەوزەبەرد،بیروٚبەرتک؛خەنەتیڤک؛ قۆزەبەرد؛ خەنەتیلکە. (گل‌سنگ)
قریۆلە : قەرەوێلە؛ قەروێلە؛ تەختی لە سەر نوو

ستن. (تختخواب)
قزلباش : تد؛ فد:[ناوت] دوو وشەی لێکدراوی تورکییە قزڵ :سوور و باش :سەر، واتا سەرسوور. (ب)عەسکەری شاعەباسی سەفەوی کەکڵاویان سووربوو و ناویان دەرکردبوو بە سەر سوور بە تورکی دە بێتە قزڵباش. (قزلباش)
قژوتیتک :[ناو،ت] مووی‌سەر؛ سەر و قژ. (موی سر)
قسقانج :[ناو]جوولەوەرێکە لە قالۆنچە چووکترە و کلکی دووفلیقانەیە. (نوعی سوسک)
قسقە : تووی‌پیاز. (تخم‌پیاز)
قسقە : سەلکە پیازی ورد، بۆ چاندن. (پیازریز)
قفەڕەشە:[ناو]قۆزەڕەشە؛کۆخەڕەشە.(سیاەسرفە)
قلاف‌ڕەنگی :کاسەڵکەشینە؛ کاسەڵەشینە و کرا سەشینکەڵە. (سبزقبا)
قڵچخ :[ناو] داسوو؛ داسووک. پرزەی سەرگوڵی گەنم وجۆ. (اخگل؛ داسە)
قڵخن : >قرخۆڵ.
قڵکەجەوت : [ناو]کڵاوەی بەڕوو.(کلاهک بلوط)
قڵم‌بوونەوە :[چاوگە،ت] ڕژیان؛(ب)خەلاسبوون؛ جاران دەوڵەمەند بوون بەڵام قڵم‌بوونەتەوە و هیچیان نەماوە؛تایفەیێکی گەورەبوون کەسیان نەماوە بەجارێ قڵم بووونەتەوە. (ریختن؛ ازبین رفتن)
قڵم‌کردنەوە :[چاوگە،ت] (١)ڕژاندنی ئاوی دەفر. (ریختن‌آب ظرف). (٢ب) بە بادان و لە دەست دانی ماڵ و سامان. (بباددادن‌دارایی)
قلەکردن : گاڵتەکردن؛ جەفەنگ‌کردن. (شوخی کردن)
قلیچ : شمشیر؛شوور؛ شیر؛ناوی گوندێکە نزیکی بۆکان. (شمشیر؛ نام‌دهی‌است)
قناولێ:گیاییێکە بۆ مالیجەی (سینوزیت) ئازاری چڵککردنی ناوەوەی لووت و دەم‌وچاو بەکەڵکە. (گیاەمنداب)
قنج‌بوونەوە : ڕاست بوونەوە؛ قوت بوونەوە. (پا شدن؛ سربلندکردن)
قنج‌گۆش : کەروێشک. (خرگوش)
قنجیلانە:[ناو]خنجیلانە؛خونجیلانە؛چووکەڵەی جوان. (زیبای‌ریزە)
قنگرتن : فێری‌دانیشتن بوونی زارۆ. (نشستن یادگرفتن‌کودکان)
قنگەجووڕێ: قنگەجووڵێ؛ خۆخافڵاندن و بی‌مە یلی لە کردنی‌کارێک؛ ملەجووڕێ بە نزاکەتترە. (بی‌میلی‌ازانجام‌کاری‌وبەتأخیرانداختن)
قنگەخەو:خەوەنووچکە بە دانیشتنەوە وەنەوزدان. (پینکی)
قوباد: ناوی‌جۆرێک ماسی؛ ناوە بۆ پیاوان. (قباد)
قوتبڕ : [ناو] کوشتاری بەکۆمەڵ و هچکەس نەهێشتن. (نسل‌کشی)
قوتبڕین:[چاوگە،ت]لەناوبردن؛ لناڤبرن. (ازبین بردن) قوتبڕکردن : بنەبڕکردن؛ قەڵاچۆکردن؛ ڕەگەز نەهێشتن. (نسل‌کشی‌وریشەکنکردن)
قوتو قۆڵ : >قەوی‌وقۆڵ.
قوت‌وقایم: [ئاوەڵناو] زۆر مەحکەم؛ زۆر قایم. (خیلی‌محکم)
قوت‌وقەوی :[ئاوەڵناو] تێکسمڕاو؛مرۆڤی تەژە و زەڵام. (شکم‌گندە؛ لندهور)
قوتەقوت:کوتەکوتی دڵ‌لێدان.(زدن‌نبض)+
قوتەمووت :قوتەموور؛ئاژاڵی گوێ‌گچکە و قوت. (گوسفندوبزگوش‌کوچک‌وبرجستە)

قوتیان : [چاوگەت] کۆخین؛ قۆخین؛ کۆکین. (سرفەکردن)
قوچووسەرقەل : نووچکەی کێو. (قلەکوە)
قۆچەن:[ناو] قۆشەن؛قوشوون؛لەشکر.(لشکر)
قۆدغ : [ناو] لە تورکییەوە هاتووە : جاشەکەر؛ هوڵیکەر؛ گودخ. (کرەخر)
قۆدە : خوپەسەن؛ گەڤەزە؛ گەبەزە؛خۆبەزل‌زان؛ لەخۆبایی؛ بادیهەوا. (خودپسند)
قۆدیلە :قودیلە؛ ئاوێنەی چووکە. (آینەکوچک)
قۆڕ : (ب)هەراو؛ لەبەریەک ڕەوینەوەی ئاڵقە و جەغز؛ قوپانی دەفر. (گشاد؛ قور)+
قوڕابە : قەڕابە؛ دەفرێکی شووشەی مل‌درێژی گەروو تەنگ. (قرابە)
قۆراخ : [ناو] کەژووی ژێرسکی بارەبەرە بۆ ڕاگرتنی کورتان؛ کەژگ. (نوارپهن.؛ بندپالان)
قوڕازە : قۆڕازە؛ ئامیری وەک سەیارەی کۆن و شرو وڕ و شکاو. (قراضە)
قوڕاس : [ناو] یەکەی ژماردنی کاڵای توجاڕی بەرانبەر بە دووازدە دووجین. (قراص)
قوڕاوخواردنەوە :(ب) منەت کێشان؛منەتباربوون. (منت کشیدن)
قوربانی :(ب)گیان لە دەستدان لە شەڕ یان ڕوو داوێکدا؛شەڕی دوێنێ سێ قوربانیی لێکەوتەوە. (قربانی)+
قورپینە : قرقێنە. (آروغ)
قورچ و قوژبن :[ناوت]کونج و قوژبن؛ کەلێن و کولێن. (سوراخ‌سمبە)
قۆرخانە :[ناو]جبەخانە؛جێگای چەک‌وتەقەمەنی. (اسلحەخانە)
قۆرخچی :کەسێ‌کە ئاگای لە لێڕەوار و دارستان و مێشەی پاوانە. (نگهبان‌بیشە)
قورس : (ب)خوراکێ‌کە درەنگ هەڵدەتاوێ. ( خوراک‌دیرهضم)+
قورسان :[چاوگەت] پچڕان؛پسان؛هەڵتاواندنی خۆراک لەگەدەدا. (پارەشدن؛ هضم‌کردن)
قورساندن : [چاوگەت] پچڕاندن؛ پساندن؛ قور سان. (پارەکردن)
قورسەیاو:[ناو] گرانەیاو؛گرانەتا؛کەوتەیی؛ئەسپە ک؛ کەوتوویی. (تیفوس)
قوڕشێلان :قوڕخۆشکردن و ئامادەکردن بۆ قوڕە کاری و هیربار؛(ب)کچانی ئاوایی دەنگ دەدران بۆ شوێنێ و یاسای هەڵپەڕین و داواتیش بەدەم شێلانی قوڕی هیربارەوە بەڕێوە دەچوو.(مراسم آمادەکردن‌گل‌کوزەگری)
قورقورک :[ناو]کەڕەک؛ هەوێردە؛ کەڕەواڵە.(بلدر چین)
قورمچاندن :(۱) سیس بوون. (پژمردەشدن)(۲) لێو هەڵقورتاندن. (لب ورچیدن)
قورمیچ :[ناو] ڕەشایی و بارستای دووکەڵ لەسەر دیوار و میچی مدبەق‌نیشتوو. (دودە سقف مطبخ)
قورنی: [ئاوەڵناو] تووڕە؛ قەڵس؛ بەخیل.(عصبانی؛ بخیل)
قوڕوچڵپاو :[ناوت] قوڕی شلی دوای بارانی زۆر. (گل‌وشل)
قوروشکە :[ناو] روس‌د؛ تد: شەربە و ئاوخۆر دەسکدار لە چیمکۆ. (لیوان‌لعابی‌دستەدار)
قورووسکاندن : دەنگی سەگ لەکاتی ئازار پێگە یشتن‌دا. (جیغ و نالەسگ‌ازشدت‌درد)
قورووش :لە دوای قایش‌دێ،قایش و قورووش؛ قایش و لەتەقایشی زۆر. (چرم‌وتکەچرم‌زیاد)+

قوڕەپەست : [ناو] قوڕەبان. (گل‌اندودکردن بام)
قورەمە :[ناو] دەن؛ دەند؛ دەندی جێی‌گاسن لە بنی ئامووردا؛کە بەسەرئامووڕەوە دەکرێت.(جای تیغەگاوآهن)
قوڕی : [ناو](١) حاڵەتی قوڕبوون و گون‌پەنمان. (فتق‌داشتن). (٢) قوڕی؛ چادان. (قوری)+
قوڕیٚ : جوێنێکە بۆ ژنان واتا ژنیٚ کە خەشەی هەراوبیٚ. (ای‌گشاد)
قوڕیجان : جوێنی ژنانەیە؛ قوڕیٚ. (دشنام‌زنانه)
قوڕی‌قەڵا : گوندێکە سەر بە شاری پاوە کە ئە شکەوتێکی بەناوبانگی لێیە هەربەو ناوە.(قوری قلعه)
قوڕیەزەردە :[ناو]زەردەقوڕە؛ جۆرێک‌مارمێلکە کە ڕەنگی دەوروبەری دەگرێتەخویٚ(نوعی‌سوسمار)
قوزای :[چاوگە] قوخین؛ کوٚخین. (صرفه‌کردن)
قوزلوو : گوندێکە نزیکی شاری سەقز کە ترێی بەناوبانگە. (نام‌دهی‌است)
قوزەسیاوە : [ناو،ت] قوٚخە ڕەشە؛ خورووزەک. (سیاه‌سرفه)
قوزەقوز : [ناو،ت]کوٚخەکوٚخ؛ (سرفه کردن زیاد)
قوفڵی‌ڕەمزی : قوفلی ڕەمزدار، کە بە ڕەمزی تایبەت و دیاریکراو دەکرێتەوە. (قفل‌رمزدار)
قوٚقل : [ناو] نێرەکەو. (کبک نر)
قوقلاندن:[چاوگە،ت] دەرهێنانەدەر؛ وەک‌کاسە ی چاو هەڵکوٚڵان؛چاقێت وی قوقلاندن:چاویان دەرهێنا. (قلفتی‌درآوردن)
قوٚقلاندن : [چاوگە،ت]هەڵکوٚڵین؛ چاوقوٚقلاندن: کالانی چاودەرهێنان. (قلفتی‌درآوردن)
قول : کون. (سوراخ)
قولٚ : هەڵاتن وەک هەڵاتنی هەویر. (ورآمدن)+
قولاپدۆزی : چنین یان دوورینی هەر شت بە قولاپ.(قلاب‌دوزی)
قولاپی‌دووچز :[ناو] جۆرێک قولاپی‌ماسیگرتنە کە دوو نووکی تیژی هەیە و ماسی لێی ڕزگار نابێت.(قلاب‌دوسر)
قوٚڵاجە : مەودای هەردوو قوٚڵ بەکراوەیی؛ بوٚ پێوان و ئەندازەکردن. (فاصله‌دودست‌بازشده)
قوٚڵبڕ:[ئاوەڵناو+ ناو،ب]دەستبڕ؛دەست‌وگوێبڕ؛ (ب) ساختەچی؛ کڵاوباز. (کلاه‌بردار)
قولت :سەلت و قولت :ڕەبەن‌وتەنیا؛ تاق‌وتەنیا. (تک‌وتنها)+
قوٚڵتڕ : قەڵخەکوٚن؛ زیاتر بوٚ مێینە دەوترێت. (واژه‌توهین‌به‌پیرافتاده)
قولتەی‌ڕان : [ناو] شلکەی ڕان. (نرمه‌ران)
قوٚڵداخ :[ناو] بازنە؛ خڕخاڵ. (النگو)
قوٚڵ‌قوٚڵ:دەستەدەستە.(گروه‌گروه؛ دسته‌دسته)
قولک: [ناو] قوڵەک ؛ دەخیلەی قەرە پوولی منداڵان. (قلک)
قولک : [ناو] چەپک؛ چەپکە؛ پڕ قولی دەستێک. (دسته)
قولکردن : [چاوگە،ت] (ب) لە قوماردا پارەپێنە هێشتن(کوٚژی قومار بازانە). (درقمار تا آخرین دینار ازحریف بردن)
قولمەی‌ئاوی :کێچی دەریا؛ ئەنگوش؛ قرژاڵوٚکە؛ مەیگوو. (میگو)
قوٚڵنج :[ناو] کوٚڵنج؛ ڕەونج؛ ڕەق‌بوونی ئەندامی لەش وەک قوٚڵنجی شان‌وملو و قوٚڵنجی‌گەدە. (قولنج)
قوٚڵنجی‌گەدە :[ناو]لەسەرمای زوٚرەوە مروٚڤ توو شی دەبێت و ئازارێکی جێی‌مەترسییە.(قولنج

معده)
قولنچک : >قولینچک.
قولوچ‌گێڕ :شاخ‌گێڕ؛ شاخ وەرگەڕاو؛ شاخ‌چەمیو. (شاخ‌کج)
قۆله : (ب) خستنه پشت‌گوێ و لەبیرچوونەوەی قەرزدانەوە؛ کەوتە قۆلە ئەیترنایداتەوە . (کنایه ازقرضی‌که ادانمی‌شود)
قوله : قوڵه؛ قوڵ؛ کورت؛ بێ‌کلک؛ کلک‌کورت. (دم‌کوتاه؛ بی‌دم)
قۆڵەکووره : لوولەی دووکەڵکێشی‌سۆبا. (لوله بخاری)
قولێر : [ناو] حوڵڵەبا؛ ڕۆچن؛ دەلاقه. (پرویزن)
قولینچک : [ناو] سووچ؛ گۆشه؛ قوژبن؛کەلێن؛ قولنچک. (گوشه؛ زاویه)
قوڵینگ : [ناو](۱)پاچی‌دووسەر.(کلنگ)(۲) قازی قوڵینگ؛ قورینگ. (درنا)
قومار : (ب) خۆبه ئاو و ئاگردا دان؛ زیاتر له توجارەت و موعامەلەدا. (قمار؛ ریسک)+
قومراخ : [ئاوەڵناو] به دەستوبرد؛ گورج‌وگۆڵ؛ ئازا؛ لەسەرحاڵ؛ قۆچاخ. (قبراق)
قومساڵ : خاکی‌زیخ‌دار؛ زیخەڵان؛ خیزەڵان. ( خاک‌دارای‌شن)
قومەلان :[ناو] قومەڵان؛ زیخەڵان. (شنرار)
قۆنتراش :[ناو]خۆتراش؛کەرەستەیێ‌که به تێغ ڕیش دەتاشێ. (خودتراش)
قۆنگره :[ناو] ددانەی زۆپی لێواری‌کۆشک بۆ سەنگەر یان بۆ جوانی. (دندانه؛ کنگره)
قۆنگره : [ناو]گونجەی ئەستێر (راه‌آب استخر)
قۆنگرەقۆنگره :شەپۆل‌شەپۆل؛ هەر شتێک زۆر پڕ له بەرز و چاڵی بێت. (کنگره‌کنگره؛ مواج)
قۆنەره :[ناو] (ن) منگه، قۆندەره؛ کەوش؛پێڵاو. (کفش)
قووشچی : شاروچکەیێکه و ناوی چیاییێکه له بەینی سەڵماس و ورمێدا. (قوشچی)
قووفلین :چرچ هەڵاتنی چەرم. (چروکیدن‌چرم)
قووقنای :[چاوگە،ت]قووقاندن؛ خوێندنی کەڵه شێر. (خواندن خروس)
قووقه : دەنگی‌کەڵەباب. (صدای‌خروس)
قوولکرن :[چاوگە،ت]کون‌کردن.(سوراخ‌کردن)
قووڵکەستۆ:[ناو]چاڵی بەرگەردن.(گودی‌گردن)
قوولەشکاندن :(ب) بن‌پژاندن.(دخترگی‌برداشتن)
قووناو :[ناو] پاشاوی ئاوداشتنی زەوی‌که له خوار ەوەی برژێته دەرەوە.(آب‌زیادی‌ازمزرعه‌خارج‌شده)
قوونجاندن : [چاوگە،]بەستن؛ قووچاندن؛ چاڤ گرێدان؛ لێک‌نان و بەستنی دەست و چاو.(بستن)
قوونسوول : [ناو] نوێنەری وڵاتێک له وڵاتێکی دیکەدا. (کنسول)
قوونوو : [ناو]کەنووی مێش‌هەنگوین؛ کەنووی گۆزه ئاسای هەنگوین. (کندوی‌عسل)
قوونەجووڕێ : گەی‌گرتن؛مل‌بادان و نەکردنی‌کار ی. (اطاعت نکردن؛ سرباززدن‌ازکردن‌کاری‌است)
قوونەخشکێ : خۆخشاندن لەسەرسمت. (روی باسن‌خزیدن)
قوونەخەو : وەنەوز؛ بەدانیشتنەوە وەنەوزدان؛ چۆر ت‌لێدان. (چرت‌زدن)
قوونەڕێژه : [ناو] دوومەڵێ که بەهۆی سوواریی زۆرەوە له خوارسمتەوە دەردێ. (دمل‌بعلت‌سوار کاری‌زیاد)
قوونەشەڕ: شەڕی نه بەڕاستی؛ شەڕەجنێو یان چنگه پلماسکێ بۆ خۆ دزینەوە له شەڕ. (جنگ

لفظی)
قوونەهەنگوین : <قوونوو.
قۆیماخ : [ناو] تدنجووجووش؛ خۆراکی زەیستان لە ئارد و ڕۆن. (قیماق.کاچی)
قەبا : [ناو]کورتەک؛ لیباسی هامدامان؛لیباسێکی درێژی وەک باڵتە. (قبا)
قەبرکۆل : قەبرکۆڵ؛ قەبرکەن؛ قەبرهەڵکەن؛ کەسێک کە قربر هەڵدەکەنێ.(کسیکەقبرمیکند)
قەبراوقەبر :دەرهێنانی مردوو لە قەبر و گواستنە وەی بۆ قەبرێکی‌تر لە جێگایێکی‌تردا. (تعویض جای قبر)
قەبز : (۱)دژی ڕەوانی و زەحیری. (قبض). (۲) قەوز پسوولەی حیساب. (قبض). (۳) قەوس؛ کاتی ساردیی پاییز. (اواخرپاییز)
قەبەل : قەبەڵ؛ قۆنتەرات؛کاریٚ گرتنە عوٚدە بە کۆنتەرات. (کونتەرات)
قەپانچەلە :[ناو] قۆچەقانی‌بەن؛ قڵماسکی‌بەن؛ بەرەقانی. (فلاخن)
قەپچل : [ئاوەڵناو] دزێو؛ ناشیرین؛ ئێسک‌گران. (زشت)
قەپوبڕ : [ناو] قات‌وقڕ؛ گرانی. (نایابی)
قەپووشکە :[ناو]توێکل؛توێخل؛ قاوخ؛ کاسەڵەی بەڕوو؛ سەدەفی شەیتانۆکە؛کاسەڵەی داپۆشەری ڕەقە وکیسەڵ(پوستە.لاک پشت.صدف‌حلزون)
قەپوولک : پاشقول؛ پاوەبەرپا دان. (لنگ)
قەپەچە : ڕەنگە لە قەپاتماخی تورکییەوە هاتبێت بە واتای بەستن؛ دەست بەستن؛ ڕێگالیٚ بەستن. (دست وپابستن)
قەتارچیان : گەڕەکێکی قەدیمییە لە شاری سنە. (محلەای‌درسنندج)
قەتارکێش :[ناو]واگونی پێشەوەی قەتار(شەمەنە فەر)کە مۆتۆڕی قەتاری تێدایە وقەتار ڕادەکێشیٚ بە دوای خۆیدا. (واگن‌موتور قطار)
قەتران : فدنماکێکی‌کیمیایی پاترۆلییە لە نەوتی ڕەش بەدەستدیٚ وەک مازووت وایە، دەرمانی نە خۆشینی (تەبەقی)دووسمە. (قتران)+
قەتلاس : [ئاوەڵناو] نایاب؛ بیٚهاوتا؛ بیٚوەک؛ ئەوەی قەت لاسایی ناکرێتەوە. (بیمانند)+
قەتیس : ڕاگیراو؛ مەحتەل؛ تراوی‌کۆوەبوو؛ ڕاوە ستاو؛ فرمێسک لە چاویدا قەتیس ماوە.(معطل؛ مایع جمع‌شدە)
قەتین : لەت بوون؛ قرتان؛ شکان؛ بڕیان.(قطع شدن،شکستن)
قەجەلە : <قشقەڕە.
قەداخە : قەدەغە. (قدغن)
قەدکردن :نووشتاندنەوە؛ دوو تۆکردن.(تاکردن)
قەدوقەوارە :[ناو،ت] قەدوباڵا؛ بەژن‌وباڵا.(قدوبالا)
قەدەح : فد: [ناو] پیاڵەی خواردنەوەیە، شووشە بێت یان گڵێنە. (قدح)+
قەڕابە : <قوڕابە
قەراخگرتن : نووشتانەوە و دوورینی قەراخی لیبا س. (دورگرفتن)
قەرادە : [ئاوەڵناو] بیٚهێز؛ بیٚتابشت. بیٚتین؛ چرچوڵ؛پیری زۆرهان (ازکارافتادە)
قەراوبڕیە:پەیمان بەستن و تەواو بوونی موعامە لە؛ خاتیمەی قسەی موعامەلە. (قراردادبستن)
قەراسەکردن :بەرزکردنەوەی شتی قورس و سە نگین بە لۆسە و قەراسە. (بلندکردن با اهرام)
قەراغوبیجاغ :[ناو،ت] قەراخوبیجاخ؛ دەوروبەر. (اطراف؛ دوروبر)

قەراقەرا : [ناو] خازەڵێ؛ یاری خۆشارکێ. (قایم موشک؛ قایم باشک)
قەراوش : [ناو،ک] بالکێش؛ سەرنج ڕاکێش؛ دڵدار وخۆشەویستی هەست بزوێن.(جذب کننده)
قەربیل : [ناو] بێژنگ؛ سەرەند؛ هێڵەک.(غربال؛ سرند)
قەرپوونە : جێگای نەوت لەلامپادا. (جای‌نفت‌در لامپا، چراغ‌نفتی )
قەرتلاندن :[چاوگە،ت]قرتاندن و پەرتاوتنی‌لقی دار؛ هەژگەڵی دار پەرتاوتن.(هرس کردن‌درخت)
قەرتلین : قەرتلان؛ قرت‌کردن؛ پەرتاوتن. (قطع کردن)
قەرتماغە : [ناو] قەتماخە؛ قرتماغە؛ توێژی سەر برین؛ پۆس بەستنی برین؛ قرتماخە.(پوستەزخم)
قەرخ :[ناو] ئەو ئەندازە وینجە یا گیا کە بەیەک گەوزی مەڵەغان دەدروێتەوە. (اندازەای‌دردرو)
قەرقوو : [ناو] قۆرخ و دارستان و قامیشەڵان.(چنا رستان‌ونیزار)
قەرقەس : [ناو]گڵۆشی گێرەنەکراوی دەوری پێخوێ. (ساقەهای‌خوردنشدەدروخرمنکوبی)
قەرقەف : مەی. (می)
قەرقەل:[ناو]کفن؛هومایی بۆ داپۆشین و پێچیان بە دەوری لەشی مردوو دا. (کفن)
قەرماندن :[چاوگە،ت]قەرملاندن؛ ماندووکردن؛ هیلاککردن. (خستەکردن)
قەرمچاندن : [چاوگە،ت]قرمچاندن؛پووکاندنەوە؛ مووچاندنەوە؛ وردکردن؛ چرچ‌کردن؛چروک‌کردن؛ هوورکرن. (خوردکردن؛ چروک‌کردن)
قەرمچین :[چاوگە،ت]قرمچین؛ ژاکان؛چرچ‌بوون؛ سیس‌بوون. (پژمردەشدن)
قەرملین :ماندوو بوون؛هیلاک بوون.(خستەشدن)
قەرەئاغاج : تد: لەتورکییە وەهاتووە(١)(ناوی‌گوند ێکە). (٢)داری پەڵک؛ ڕەشە دار. (درخت‌ترنگوت؛ نوعی‌چنار)
قەرەباڵغ : تد: قەرەبارغ؛ حەشامات. (جمعیت‌زیاد، شلوغی)
قەرەبووسەندنەوە : تۆڵەسەندنەوە. (انتقام‌گرفتن)
قەرەپڵاو : پلاوێ‌کە بروێشی تێدابێ؛ یەکاوە؛ برویش پڵاو. (بلغورپلو)
قەرەچیاوا : گەڕەکێکە لە شاری سەقز. (محلەای درشهرسقز)
قەرەستوون :[ناو]قەپان؛ئامێرێک بۆ کێشانی‌باری زۆر قورس. (قپان)
قەرەسی : [ناو] بڵاڵووکە کێویلە. (آلبالوی‌وحشی)
قەرەقاز : تد:[ناو]قازی ڕەش؛ جۆرێک قازە بەڵام ڕەنگی بۆری تۆخە. (قازسیاه)
قەرەقانی‌گێڵانی : >قەرەگەیلان
قەرەقورووت : فد؛ تد: [ناو،ت] ماکێکی خواردە مەنی و زۆر ترش و سوێرە ڕەنگی خورمایی‌تۆخە. (قرەقروت)+
قەرەقۆڵ : [ناو] قەرەقۆڵ؛ قەرەول؛ قەراول؛ چاوەدێر؛ سەربازی زێرەوان. (قراول)
قەرەقۆڵخانە : [ناو] قەرەوڵخانە. (قراولخانە)
قەرەکول :مەڕی لاوازی تووک کورت.(نوعی گوسفند)
قەرەگەیلان:قەرەقانی‌گێڵانی؛دارێکە لە باکووری ئێران بەتایبەت لە گێڵان زۆرە و میوەکەی دە کوڵێنن دژی تەوژمی خوێنە. (قرەقا)
قەرەمات :تد:سەیروسەمەرە؛ حەیران؛ سەرسووڕ مان. (بسیارحیران)

قەرەموٚکی : جاڕز و قەڵس بە سەرما؛ سەرمایی؛ کەسێ کە سەرما لە گیا نیدا شکابێتەوە و دایم سەرماییێ.(سرمای)
قەرەمەست : فد؛ تد:سیامەست؛ زوٚرمەست؛ (ب) زوٚرمەست و ئاگا لە خوٚ براو. (سیاەمست)
قەرەنەی : [ناو] ئامێرێکی موٚسیقایە بە فوو لێدە درێ و بنەکەی زوڕنا ئاسا ڕەواوەتەوە وکونەکانی کلیلی تایبەتیان هەیە. (قرەنی)
قەرەوڵ : [ناو]جێگەی بەرز بوٚ ڕووانین؛ئێشکچی؛ زێرەوان؛ زێڕەوان. (جای‌نگهبانی؛نگهبان)+
قەرەهەواڵ :زوٚربەپرس؛ فرەپرسیار؛ فرەپرس‌کەر. (زیادسئوال‌کننده)
قەرەیەخە : [ناو] لە تورکییەوە هاتووە،کەسێک کە نیزامی و عەسکەر نییە. (سویل؛ شخصی)
قەریسەک :[ناو] زوقم؛ خووس؛سیخوار؛خووسار؛ ئاڵشک؛ سووخ؛ خویسە؛ قراڤ؛ خویز؛پەژم. (پژ)
قەزاق : خەڵکی وڵاتی قەزاقستان و زبانیان کە (قەزاقییە). (قزاق)
قەزاوقوٚرتەکی : ئەڵڵا بەختەکی؛ خوٚ و بەختی؛ بە شێوەی شانسی و هەڵکەوت.(الابختی)
قەزک : [ناو]کەژوٚک؛ ئاورێشمی ڕەنگ نەکراوی سپی. (ابریشم‌رنگ‌نشده).
قەزمەنوشتە : [ناو] قەبزەنوشتە؛ بەرگەنوشتە؛ دوٚعای نووسراوی سێ‌سوچکراوا.(طلسم نوشته، تا شده)
قەزەلوەر : غەزەلوەر؛ خەزەڵوەرکوردیترە. (آبانماه)
قەساتوٚر : [ناو] ساتوٚر. (ساطور)
قەسپ : [ناو] مووروەشینە؛زاخی‌شین؛زاخەکەوە. (خرزەآبی؛ زاج‌کبود)
قەسپوٚک : تەمتەمان؛زەوینی ڕەق‌کە گاسنی تێ نەچەقێ. (زمین‌سخت‌وسفت)
قەسری : کاسەکەلی سووالەت کە دەینێنە ژێر منداڵ بوٚ پیسی تێکردن . (کاسەسرپاکردن‌بچە)
قەسری‌شیرین : شارێکە کوردنشین و سەربە ناوچەی کرماشان. (قصرشیرین)
قەسکان : قەسقەوان؛ قەزوان. (چاتلانقوش)
قەسەر : [ناو] قەسەڵ؛ دەغڵ بە ساقەتەکەیەوە. (ساقە وخوشەغلات)
قەسیسە : [ناو]پەرێزی وشکەچن؛ پەرێزی بەرد ینی دەوری مەزرا. (دیوارسنگی‌باغ)
قەشاقی : نەخوٚشینی لێوەشکبوون و خەت خەت بوونی لێو. (خشک‌شدن‌وپوستەپوستەشدن‌لب)
قەشارتن : [چاوگە،ت]قاش‌کردن. (قاچ‌کردن)
قەشقوش >قاشقوش.
قەشقوٚل : > قاشقوٚل.
قەشقیل : >قاشقوٚل.
قەشەماسی : [ناو] جوٚرێک ماسی چوٚم. (نوعی ماهی‌رودخانەای)
قەشەو : [ناو] قاشاو؛ پژنچە؛ ڕنەک. (قشو)
قەفانچە : [ناو] دارێکی دووفلیقانەیە لەدەسکی مەڵەغان دەخرێ. (جای‌دست‌درداس‌دراز)
قەفتە قوشقون : دەم لەسەر پشت؛ هەڵبڕین و بەدوادا هەڵاتنی بێ ماوە و مەودا. (دنبال‌کردن نزدیک)
قەقلەبازی : گوڵەشلێرە. (لالەسرنگون)
قەل : [ناو](۱)بوٚقلە؛ عەلەشیش؛ عەلوٚعەلوٚ.(۲) قشقەڕە؛ قشقەڵە؛ قەلەبازەڵە؛ قەلەباچلە. (۳) قەلەبانەیی؛ قەلەسابوونی؛ قاڵاو؛ قاڵاوە بووڵینە. (۴) قاڵاوەڕەشە.(چهارنوع‌پرندەکەبەقل‌مشهورند)
قەلاپیسک : [ناو] بێڵەکان؛ بێڵەقان. (چوبدست

نک‌پهن)
قەلاش : [ئاوەڵناو] شەڕفرۆش؛ دەستوگوێبڕ؛ داوباز؛ حیلەگەر. (کلاش)
قەڵاغە : [ناو] قەڵاخ؛ تەپاڵەی هەڵچنراو؛ (ب) گومبەز ئاسا لە تەپاڵە دروستدەکریٚ و بە شیاکە سواخ دەدریٚ بۆ جێگەی وردە و تەپاڵە. (اطاقک با تاپاله درست شده)
قەڵاقووچان : قەڵاقووچ؛ پڕکردنی دەفریٚ لە شتی ورد وەک دانەوێڵە کە سەرەکەی قووچ بێتەوە (مالامال پرکردن؛ هرمی)
قەڵاکردن : قەڵاقووچ‌کردن؛ پڕکردنی دەفر لەدە غلٚ یان هەر چی کە لەسەری قووچ ببێتەوە و لەوە زیاترنەگریٚ. (سرپرکردن)
قەلاوێز :[ناو](١)سەردەلیل؛ پێشەنگ (پیشاهنگ) (٢) پێش قەرەوڵی سپا.(طلایه‌سپاه)گوڵە جۆی‌بە لاسقەوە بەجێماو لەجاڕدا و بەرداس نەکەوتوو لە بەرکورتەباڵایی.(گل‌وساقه‌کوتاه‌بجامانده‌درمزرعه)
قەڵاوێز : [ناو] ئامێری بڕگەبڕگە کردنی بۆڕی کانزا بۆ جێگای پێچ. (قلاویز)
قەڵای دمدم :قەڵای قارەمانی بەناوبانگ خانی لە پ‌زێڕین کە شاعەباس وێرانی‌کرد. (قلعه‌دمدم)
قەڵای هەولێر : قەڵایێکی‌گەورە و مێژوییە لە شاری هەولێر. (قلعه هولیر)
قەلای‌چکۆلە :دۆخێک لە شەترەنجدا کە شا دە چێتە جێی ئەسپی شا و روخ دەچێتە جێی فیلی شا. (قلعه‌کوچک)
قەڵایچی :گوندێکە سەر بە شاری سەقز کە ئاسە واری مێژینەی زەمانی سەکا گەلی لیٚدۆزراوەتە وە. (اسم‌دهی‌است)
قەڵای‌شەترەنج:لەحاڵەتێکی تایبەتدا شا دەتوانێت دوو خانە بە ڕاست یان چەپدا بڕوا و روخیش بە سەریدا بازبدا و لەپنای جێگیربێت. (قلعه‌شطرنج
قەلای‌گەورە :دوخیٚ لەکایەی شەترەنجدا کە شا دەچێتە جێی فیلی وەزیر و روخ دەچێتە جێی وەزیر. (قلعه‌بزرگ)
قەلبیرە : <قرِوقەمزە
قەڵپنگ : [ناو]کەرخنکێنە. (نوعی‌گیاه)
قەلپووچ :قەلپووت؛ناوخاڵی؛پووچ؛ (ب)کوێریٚ کە گۆی چاوی نەبیٚ.(پوچ؛ حدقه‌چشم‌درآمده)
قەلپەزە : شەپۆڵ‌دانی ئاو بە تەوژم؛ قەڵوەزە؛ قەڵپەزە؛ کەڵوەز؛ قڵپەکردنی ئاو لە بەرزاییەوە. (موج‌بلندآب)
قەلپەزەنگی : کاری پیس و قەڵپ و ناشیرین. (کارناسره)
قەلچغە : [ناو] سیچقە؛ پەڕەمریشکە؛ مووی لەش ڕاستەوەبوون بەهۆی سەرمای زۆرەوە. (سیخ شدن‌موازسرما)
قەلخان:دەلیل؛پێش قافڵە؛ قەلاوێز.(طلایه)+
قەڵخ‌کردن :[چاوگە،ت]پێستی ئاژەڵی سەربڕاو داماڵین. (پوست‌کندن‌لاشه‌حیوانات)
قەڵداسوو : [ناو] قەڵداس؛قلچخ؛داسوو؛داسووکە. (اخگل؛ داسه)
قەڵشیو : [ڕابوردووی قەڵشین]قڵیشاو؛ قەڵەشاو؛ قەڵشاو. (ترکیده)
قەلنۆشە: [ناو] تووی برژاوی کەنگر(تخم‌بوداده کنگر)
قەلوگاگۆز : [ناو]پۆڵکەگایانە؛ بەگلێنەیش‌دەڵێن. (غله‌ایست‌خوراک‌گاو)
قەلوونکێش : قلیان‌کێش. (قلیان‌کش)
قەلوین : قلیان. (قلیان)

قەلەبەڵەک : (١)قشقەڕە؛ قشقەڵە؛ قەلەبازەڵە؛ قەلەباچکە؛ قەجەلە. (زاغچە). (٢) قەلەبانەیی؛ قەلەسابوونی؛ قاڵاوەبووڵینە. (زاغ؛کلاغ‌خاکستری)

قەلەپێچک :[ناو] تۆخڵ؛ توێخڵ؛ قاڤک؛ قاوخ، زیاتر بۆ توێکڵی میوە دەوترێ. (پوستەگردووبادام)

قەڵەدە : [ناو] قەڵادە؛ سەنجوور؛ قەلاتە؛ قەڵەتە؛ قەڵەنگ؛ قەڵیتە؛ سەنجۆل؛ تەوق؛ قڵێتە. (قلادە)

قەلەڕەشە : قاڵاوەڕەشە؛ بەقەد قاڵاوە بووڵینەیە بە ڵام ڕەشە. (کلاغ‌سیاه)

قەڵەزەنگ : >قەلانگ.

قەڵەشت‌قەڵەشت : شەقارشەقار.(ترک‌ترک)

قەلەقاژ : >قاقیژە .

قەڵەم پەڕاندن : (ب) بەناڕوا کاری سەر جێیی‌کر دنی ژن. (زناکردن‌زن)

قەڵەم زریش :قەڵەم زریج؛ قەلەم ڕەساس؛ میداد. (مداد)

قەڵەمی تەوەن تاش : قەڵەمی بەرد تاشین.(قلم سنگ‌تراشی)

قەڵەمی‌بێشکە:قەلەمی‌لانک؛بلوێری میزی‌منداڵ لە لانکەدا. (لولەای‌درگهوارەکەپیشاب‌بچەرابە جای پیشاب‌هدایت می کند)

قەڵەمی‌موو : [ناو] قەڵەمی وێنەکێشان بۆ ڕەنگ و ڕەوغەن پیاساوین. (قلم‌مو)

قەڵەندەر : (١)کەسێ کە داب و نەرێتی کومەڵگا ڕەچاو نەکاو دەربەستی خەڵک نەبێ. (٢)جاروبار وەک جوێن بەژنی خۆ دانەپۆشەری ڕووداماڵاو دەڵێن. (٣) گوندێکە سەر بە شاری سەقز.(١ و٢ و٣. قلندر)

قەلەندەری : [ناو] ڕێبازگەیێکی سۆفیانەیە. (پیروی‌ازعقیدەای‌سوفیانە)

قەڵەنگ :[ناو] قەڵانگ؛گۆچانێ کە لەباتی کەمە ی خووارکروا، لکی کورتی هەرئەو دارە دەبێتە کەمەی‌گۆچانەکە. (نوعی عصا)+

قەلەودەلە :[ناو] فێڵ و تەڵەکە؛ عەلەم و قەلەم. (نیرنگ)

قەلەوقوتە : [ناو] قالەوقوتە؛هەتیومەتیو؛ڕەش و ڕووتە؛ گەدەوگودە. (لشوش؛ بیکارەها)

قەلیانقۆز : قلیان‌قۆز؛ پۆشتەوپەرداخ؛ بەپۆز و بۆشناخ. (شیک و با تکبر)

قەمتەر : [ناو] شەیتان لەغاو؛ شەیتان لغاڤ . (نوعی‌دهنەلگام)

قەمچ‌کەرە : فڕندەیێکە لە تەختی هێلانەکەیدا زیخی‌لاپان و قەمچ دادەنێ. (نوعی‌پرندە)

قەمچوورە : خشلێکی ژنانەیە؛ ژێرچەنە.(زیوری زنانەاست)

قەمچی‌قوت :قامچی‌قوت؛ قەمچی‌کوت؛(ب) زۆر بەلەز بە رێگادا ڕۆیشتن یان ئەسپ ئاژو وتن. (عجلە کردن درراەرفتن)

قەمچی‌موو : [ئاوەڵناو+ ناو] قەمچ و لوول؛ مووی‌لوول؛ هەلەک؛پێچ و لوولی قژ.(موی‌فر؛ حلقەزلف)

قەمچێن : قەمچان؛ یاری بە قەمچ و زیخی پان. (نوعی‌بازی‌باسنگ‌ریزەپهن)

قەمراندن : [چاوگە،ت] برژاندن؛ کەباب‌کردن؛ سوورکردنەوە لەتاوەدا. (کباب‌کردن)

قەمقوڕ : ئەشکەوتی تاریک و تنۆک و تەنگ؛ ژووری تەنگ و تاریک؛ ژێرخانی تەنگ. (اطاق‌و غارتنگ و تاریک)

قەمەڕەژە : [ناو] قومری؛ کوکوختی؛کۆترەباریکە؛ کۆترە بەرجیلە؛ فاتمۆک؛یاکەریم؛ یاهوو؛ فاتک؛

تووتاک؛تڤلک. (فاخته)
قەمەڵ : ملۆزمی زەرحات و دەغڵ؛ وەک: سن؛ کیسەڵە. (آفت مزرعه)
قەمەلاخ : [ناو]ڕاوی زڕەکەو بەزستانان و لەسەر بەفرە بلووکە. (شکارکبکدرزمستان ودربرف)
قەنات : (١) [ناو] قەننات؛قەناد؛ شیرینیساز شیرینیفرۆش. (قناد). (٢) قەنات؛ کارێز. (قنات)
قەناس : [ئاوەڵناو] قەنگاس؛ گێڕ و وێڕ؛ نالەبار؛ ناڕێک و بەدقەوارە. (قناس)
قەنجکار:کارجوان؛کارچاک؛ قەنجیکار.(نیککار)
قەندبڕ : [ناو] قەنبڕ؛مقەسی قەند شکێن؛ دوێرد ئاسایێکە دەمکورت بۆ لەتکردن و بەکوڵۆی ورد شکاندنی قەند. (انبرقندشکن)
قەندیل : [ناو] شووشە سەهۆڵی شۆڕەوەبووی لێواری گوێسوانە و پلووسک. (دنگاله)+
قەنگاس : >قەناس
قەنەفە : هەرکاناپەی ئینگلیزیە واتا نیمکەت بەڵام لەکوردستانی باشوور بە مۆبل دەڵێن (مبل؛ کاناپه)
قەواخە :[ناو] قەباخە؛ قاپووڕ؛ جەرجوو؛ قاوخ. (پوکە؛ پوسته)
قەوارە :[ناو] ئەندازە؛ قەوارەی قوماشکەبەشی دەستێ لیباس بکات یان بەشی کراسێک یان هەرچی. (قواره)+
قەوتاندن :[چاوگە؛ت] قەوراندن؛ بەرەڵلاکردن؛ دەرکردن؛ ئازادکردن. (آزادکردن؛ دککردن)
قەوچە:[ناو](ب)بە سووکایەتی بەکەسێ دەڵێن کە دەمەجاوێکی گەورەی بنێشت لە دەمدابێ و بیجاوێ. (جویدنسقز)+
قەورخە :[ناو]قەورغە؛قەبرغە؛ کەلەکە.(تهیگاه)
قەورین : قەوران؛ دەرکردن. (بیرونکردن)
قەوڵ : بەقەوڵکردن؛بەقسەکردن؛ بەقەوڵمناکا: جوابمناداتەوە : بەقسەمناکا. (گفته؛حرف)
قەوم: [ناو]خزم؛تایفە؛عەشیرە؛(بە واتای میللەت نییە) میللەت بۆیهەیە لە چەند تایفە و ئێل و عەشیرەی جیاواز پێکبێت، بەڕەسم و زاراوە و زبانی جۆراوجۆرەوە. (قوم)+
قەومینە : (١) خزمینە؛ خزمەکان؛ ئەیخزمگەل. (اینزدیکان). (٢) ئەیئێلگەل؛ عەشیرەگەل. (ایعشایر؛ ای نزدیکان)
قەوەتکردن :[چاوگە؛ت]بەنەهێم گوشارهێنان بۆ خۆ بەتایبەت ژنێکە لە حاڵی زایین دایە. (فشاربەخودآوردن)
قەیسیوڕۆن : [ناو؛ت] خۆراکێکە؛ چەقالەی قەیسی دەردێنن و ڕۆنی داخ دەکەن بەسەریدا. (خوراکیاز زردآلوباروغن)
قەیلوولە : عد؛فد: دەستەواژەی فەقێیانە، خەوی پێش نیوەڕۆ. (قیلوله)
قەیلەسوون: ناوی گوندێکە لە خۆرهەڵاتی شاری سەقز. (نام قریەایست)
قەیلەسێل : [ناو] بەربەسێل؛ قوڕاو؛ خۆراکێکە لە گۆشت و ماست و ڕۆن چێدەبێت. (نامخوراکی محلی)
قەیەوکردن : [چاوگە؛ت] قەیکردنەوە؛ ڕشانەوە. (قیکردن)
قیچەقیچ : لار وخێچ تماشاکردن؛ڕوانینی لابەلا. (کجکینگاەکردن)
قیچەک : فد؛ تد:ئامێرێکی مۆسیقایە، لە ماندلین چووکترە. (قیچک)
قیرسی :[ناو] بەرچاوتەنگی؛قڕنویسی.(چشمتنگی)

قیروگۆنی : [ناوەت] گونیەی لەقیر هەڵکێشراو بۆ ڕووکێشکردن(داپۆشینی) سەربان. (قیروگونی)

قێرەگیا : گیای گولێپژێن. (خاتمسلیمان)

قیزبەلە : هەڵاکوێک. (پامچال)

قیزگە : نیشانە؛ ئامانج؛ وەک نیشانە داکردن بۆ تیرئەندازی و پێکان بەچەک. (هدف؛ سیبل)

قیزوبیز: لەسەر زمانان و لە قامووسەکاندا بە واتایدلێهەلنەگرتن وئیشتیا نەچوونە سەر خوار دەمەنی>بێز

قیژنای :[چاوگە] قیرێنای؛ قیژاندن؛ قیڕاندن.(جیغ زدن)

قیسپ:[ناو]داری چەقاوی لێواری ئەڕابەی کەڵی لە گلۆش‌کێشاندا. (تیرچوبی‌کنارارابە)

قێلیچ : توێخلی چەقالەی بادام و گوێز. (پوست بادام وگردو)

**پیتی (ق) بەشی وشەی بیانی**

قاڵتاخ:[ئاوەڵناو]مرۆڤی شەڕفرۆش؛لات و بەبیانوو بۆ شەڕکردن. (قالتاق)

قەدەح :فد:پیاڵەی خواردنەوەیە، شووشە بیٚ یان گڵێنە. (قدح)+



کابرنج : [ناو] بەلّم؛ کای ساقەتی بـرنج. (کـاه-ازساقەبرنج.)
کاپ : [ناو] جامی کێبەرکێی وەرزش. (کاپ)
کاپشێن : اند.فد؛ [ناو] قوڵەباڵتە؛ قـەمسـەڵـە. (کاپشن)
کاپوت : اند.فد؛ [ناو] (١) سەرپوشی مۆتـۆڕی سەیارە (کاپوت)؛ (٢) کانـدۆم، ئـامرازی بـە-رگری لە نەخۆشین یان تۆڵدار بوونی ژن کـە بەسەر سیرەتی پیاودا دەکێشـرێت. (کانـدوم؛ کاپوت)
کاپۆل : [ناو] کەڵلەسەر کاسەسـەر؛ کاپۆلـک؛ قالکامەژی. (جمجمە)
کاتـا : چـین‌د؛ [نـاو] دسـتەواژەی وەرزشـی تێکواندویە؛ ڕەوتی جووڵانەوەیێکـی وەزرشـی تێکواندویە. (کاتا)
کاتمی : [ناو] هەڵمەڵە؛ گوڵەهێرۆ؛ گوڵەکـەی بۆ بەرگری لە وەرینی مووی‌سەر بە کـەڵکـە. (گل‌ختمی)
کاتۆس : [ناو] کاکتۆس؛ گوڵەخـەپلـە؛ ڕووە-کێکە گەڵا و ساقەتـی قـەوی و پڕلـە دڕووی هەیە و چەنـد جـۆری هـەیـە لـە میکزیـک جۆرێکی بەقەرا سێ میتر بەرز دەبێتەوە. (کاکتوس)
کاتۆلیک : [ناو] لقـێ لـە مـەسـیحیەت کـە شوێنگری واتیکانن. (کاتولیک)
کاتەوار : [ناو] شوێنەوار؛ شۆنەوار؛ ئاسەوار؛ نیشان لەشتی ڕابوردوو. (نشانەهای‌بجامانده)
کاتی : [ئاوەڵناو] دەمی؛ وەختی؛ بۆ زەمانێکی دیاریکراو؛ بۆمـاوەیێـک؛ مـاوەیـی. (مـوقتی؛ زمانی؛ فصلی)
کاجۆ : [ناو] کای‌ساقەتی‌جۆ. (کاەساقەجو)
کاچیڕ : [ناو] شەویلکە؛ کاچیڕە. (فک)
کاخ : فد؛ [ناو] قەسر؛ کۆشک. (کاخ)
کاخنشین : فد؛ [ئاوەڵناو] دانیشتووی کوشـک و قەڵا. (کاخ‌نشین)
کادی : [نـاو] کـەنـدوو؛ قوونـووی‌هـەنـگ. (کندوی‌عسل)
کار : [ناو] (١) فرمان؛ (لەبـواری زمانـەوانیـدا فێعل؛ کردار)(٢) پیشەوشـۆڵ؛ (٣) خـەبـات و تێکوشان هەرکارێکم‌کرد بەقسەی نەکـردم؛ (٤) پاشـگرە وەک؛ گوناحکـار؛ وەرزشـکار؛ کاشی‌کار؛ خراپکار. (کار)
کاراتە : چین‌د؛ فرد؛ فد؛ انـد؛ [نـاو] جۆرێـک وەرزشـی تایبـەت و پـاوێری خۆرهـەڵـاتی ئاسیایە. (کاراتە)
کاراتەکار : [ناو،ت] کاراتەباز؛ کـەسێک کـە وەرزشی کاراتەدەکا. (کارتەباز)
کاراد : [ناو] کەوەر؛ کەوەرگ. (ترە)
کاراوان : [ناو] (جۆرێک ئـۆدەی تـەگـەردار) کەبەپاش سەیارەوە دەبەسترێت. (کاراوان)
کاربڕانەوە : [چاوگە،ت]کاربڕیانەوە؛ کۆتایی هاتن؛ ئـیش تـەواوبـوون و دوایـی پێهێنـان

(کارتمام‌شدن)
کاربۆن : فرد؛ اند؛ فد؛ [ناو] کاغەزی کۆپییــە. (کاربن)
کارپەیداکردن : [چاوگە،ت] شـوڵ دۆزینــەوە. (کارپیداکردن)
کــارت : [نــاو] (۱) ڕووپــەرێکــی مقــەبــایی؛ (کارت)؛ (۲) کارد؛ کێرد. (کارد)
کارتۆپڵ : [نــاو] ئێــرەل؛ (ئیــرەڵماســی)؛ لــە توورکییەوە هاتووە، (یێر: زەوی + ئاڵما: سێو) یارەڵماسی؛ سێوک؛ یێرەڵماسی؛ کــارتۆڵ؛ کــارتۆپی؛ پــەتاتــە؛ سێف زەمینــی؛ سێب زەمینــی؛ کارتینــە؛ هێــرەڵماســی؛ کرتۆپــل؛ پۆتیتە؛ کارتینک؛ کرتۆفـل؛ پـەتیتـە. (سـیب زمینی)
کارتۆپی : [ناو] سیف‌زەمینی؛ هێــرەڵماســی؛ سێوک؛ کارتۆفل؛ کەرتۆپل؛ پەتاتە؛ پــەتیتــە؛ هێڵەماسی؛ یارەڵماسی؛ کار بەتــوورکی واتــا بەفر؛ تۆپی بەتورکی واتا تۆپی ئەو؛ تۆپی‌بەفر (تۆپەڵەبەفر)؛ جگە لە سێوک و سیف‌زەمینــی و هێڵەماسی کە کوردین پەتاتە و پەتیتەیــش ئینگلیزییە و وشەکانی‌دیکــە هــەموویــان لــە تورکیەوە وەرگیراون. (سیب‌زمینی)> یێــرە-ڵماسی
کارتۆن : فد؛ [ناو] (۱) جــەعبــەی مقــەبــایی (کارتن)؛ (۲) جۆرێک فیلم کە بە وێنەکێشان چێدەبێت. (کارتون)
کارتوو : [ناو] کەردو؛ دێراو. (گراز)
کارتی‌پۆستی :[ناو،ت] کارت‌پۆستاڵ؛هەروەها کارتی بانگهێشتن؛ کارتی پیرۆزبــایی؛ کــارتی پێناسە؛ کارتی ئەندامێتی. (کارت‌پستی)
کارتێکردن : [چاوگە،ت] بــەدڵــەوە نووســانی قسە یان کردەوەیێک؛ باندۆر لــەســەردانــان. (ردگذاشتن؛کارگربودن)
کارتینک :[ناو] داوی جاڵجاڵووکە؛ تەونی جۆ-ڵاتەنە. (کاتنک عنکبوت)
کارحف : [ناو] هەرمی؛ هەمرۆ؛ ئارمووت؛ ئە-مروود. (گلابی)
کارخەوتن : [چاوگــە،ت]کاروێستــان؛ ماتــڵ-بوونی‌کار؛ کارڕاگیران. (کارخوابیدن)
کاردار: [ناو](۱) بەرپرسی ڕامیاریی دەوڵەتێک لە وڵاتێکی دیکە؛ بریکاری بــاڵوێز؛ (کــاردار)؛ (۲) کاربە دەست و بەرپرسی کاری دەوڵەتی؛ (کارمند)؛ (۳)کەسێک کە کــارێکی هــەبێــت. (شاغل)
کارداک : ناوی مێژویــی نــەتــەوەی کــوردە. (نام‌تاریخی‌کرد)
کاردانەوە : [چاوگە،ت] باندۆر دانان؛ ئــاوێژە-ی کردە وەیان ڕەفتاروگوتە. ( عکــس‌العمــل انعکاس‌فعل‌درجامعه)
کاردۆ : > کاردۆخ
کاردۆخ : کاردۆک؛ ناوی هەرە کۆنی گەلی کورد؛ (نام باستانی کردها)
کاردۆژە : [نــاو] (۱) بــە نــەشــتەر پشــکنینی تۆخڵە گوێز بۆ دەرهێنانی لەت‌وکوتی کاکڵــە-کەی.(تکەهای مغز گردو را با کارددرآوردن)؛ (۲) نەشتەر کاری لە سەرلەش، (جراحی)؛ (۳) >کاردەوەژە.
کاردۆش : ناوی کوردەکانی گێڵان بــە زبــانی گێڵانی، کە لە لێواری زەریای خــەزەر دژیــن. (کاردوش)

کاردۆک : > کاردۆخ
کارده : [ناو] گیاییک‌که لەسەر ڕیشەی ساڵی ڕابوردووی شین ببێتەوە. (گیاهی‌کەبرروی- ریشەاش‌سبزشود)
کاردەوەژە : [ناو] کاردۆژە؛ پشکنین و گەڕان بە دوای شتێکدا بە کارد. (جستجوبەدنبال- چیزی)
کارڤین : [ناو،ت] کارەبا؛ کارەوا. (کهربا)
کارقاییم : [ئاوەڵناو] بەمشوور؛ کارپتەو. (محکم‌کار)
کارکردن : [چاوگە،ت](۱) کارکردنی وەک نووسین؛ دروێنە؛ دەفرشۆردن؛ (۲) شوڵ- کردن، دەوام کردن لەئیدارەدا. (کارکردن؛ اشتغال)
کارکرده : [ئاوەڵناو] کارکردوو؛(ب) شتی‌کۆن و لەکارکراو؛ شتی‌دەستی‌دوو. (کارکرده)
کارکەوتنەڕێ : (۱) دەستپێکردنی‌کار، گیروگرفتمان نەماوە کارەکەمان کەوتوەتە- ڕێ؛ (۲) کار جێبەجێبوون؛ لەشارەوانی زووکارەکەم کەوتەڕێ. (کارراەافتاده)
کارگەپەینە : [ناو] قارچکێکی ژەحراویە لە- سەر پەین‌وپاڵ دەڕووێ. (نوعی‌قارچ‌سمی)
کارگەچی : [ناو] بەڕێوەبەری کارگە؛ خاوەنی کارگە؛ کارخانەدار. (مسئول‌کارخانه)+
کارگەخوویرک : [ناو] قارچکێکی هەرەباشە بۆ خواردن. (نوعی‌قارچ‌خوردنی)
کارگەشێتە : [ناو] قارچکەشێتە؛ قارچکێکی ژەهراویە و خواردنی ئینسان دەکوژێ. (قارچ- آمانیت‌کشنده)
کارگەف : [ناو] جۆرێک قارچکی ژەحراویە؛ هاردراوەکەی بۆسەربرینی کرموڵی ماڵات باشە. (نوعی‌قارچ‌سمی)
کارگەکەرکۆڵ : [ناو] کارگەهەڵز؛ قارچکی خۆراکی. (نوعی‌قارچ‌خوردنی)
کارگەنیو : [ئاوەڵناو] کارگەنیگ؛ کارلێنە- هاتوو؛ کارخراپ؛ نەبوونی توانای ئەنجامی کارێک. (گندکار)
کارگەهەڵز: [ناو،ت] قارچکێکی هەرە باشە بۆ خواردن. (نوعی قارچ مرغوب خوردنی)
کارگی‌دار: [ناو،ت] قارچکێکی لامژە کە بە- شیلەی دار دەژی و ژەهراوییە. (غاریقون)
کارگی‌کەما : [ناو،ت] قارچکێکە لەسەر بنی کەما دەڕووێ و دەخورێت. (نوعی‌قارچ- خوردنی)
کارمەزەل : [ناو] (۱) نووسینگە؛ دەفتەرخانە؛ (محضر)؛ (۲) چرپای لەسەر نووسین. (میزتحریر)
کارن : ناوی یەکێ لە کوڕەکانی کاوەی ئاسنگەر. (یکی از پسران کاوه آهنگر)
کاروان‌ئاشی : [ناو،] هێلکاو؛ پیازاو بە هێلکە- وە. (آش‌پیازوتخم‌مرغ)
کاروکاسپی : [ناو،ت] کاروبار؛ کاروپیشە؛ کە- سب‌وکار؛ کاروکاسبی. (کاروکاسبی)
کارووت : [ناو] کارۆت؛ گێزەر؛ گەزەر؛ گزەر؛ دووجۆرە: بەنەوش و زەرد. (گیزەر؛ هویج)
کارەما : (۱) [ناو] کارژیلەی مێو؛ (بزغالە- ماده)؛ (۲) [ئاوەڵناو] شارەزا و کارزان. (کاربلد)
کارەوا : [ناو] کارەبا. (کهربا)
کارەوان : [ناو] شوانی بەرغەل. (شبان - بزغالەها)

کارەیل : [کۆی کار]کارگەل؛ کارەکان؛ ئیشەکان. (کارها)
کاری : (١) [ئاوەڵناو] وەک برینی کاری؛ دە-ردی کاری؛ (کاری)؛ (٢) [ڕابوردووی کارین] تووانی؛ پێی کرا. (توانست)
کاریبۆ : [ناو] گیانلە بەرێکی شاخداری سەر درێژە بەقەرا جوانەگاییێک دەبێت و لە گەوە-زن(کەڵە کێوی) دەکا. (کاریبۆ)
کاریبێکاری : کاری بێسووت و بێمونا. (کاربی‌سود)
کاریت : (١) [ڕابوردووی کارین]توانیت؛ تانیت؛(توانستی)؛ (٢) هەنگوین؛ هەنگین. (عسل)
کارێزە : ناوی دووگوندە لە نزیکی شاری سەقز. (نام‌دوقریه)
کاڕیش : [ناو] کارووش؛ گیاییێکە لە گاڕس-دەکا. (نوعی‌گیاه)
کاری‌کەس‌نەکردگ: >کاری‌کەس نەکردوو.
کاژوماری : [ناوەت] کراژەمار؛کراشەمار. (پوسته انداخته‌مار)
کاژوواژ : [ئاوەڵناو] خاڵ خاڵ تێکەوتنی بەفر لەدەمەو بەهاردا. (خال‌خال‌شدن‌وذوب‌شدن-برف)
+ کاژێر : کورتکراوی کاتژمێر تایبەت بە کات؛ بۆ ناوی ئامێری (سەعات)هەر کاتژمێر دەوترێت. (مخفف کاتژمێر برای تعین وقت)
کاسان : [چاوگە] تاسان؛ بێهۆشبوون؛ گێژبوون؛ حاڵەتی وڕبوون. (گیج‌شدن)
کاسکردن : [چاوگەت] وڕکردن؛ گێژ کردن. (گیج‌کردن)
کاسۆچەمی : >کاسەی‌چاو.
کاسەپشتی‌ئاوی : [ناوەت] ڕەقە؛ جۆرێک کیسەڵی پانکەڵەیە لە ناو ئاودا دەژی. (لاکپشت‌آبی)
کاسەچەم :> کاسەی چاو
کاسەسڕ : [ناوەت] قاپ‌دەستماڵ. (دستمال طرف‌خشک‌کن)
کاسەکەل : [ناوەت] گڵێنە و دەفری‌گڵین کە هەندێکی پەڕیبێت یان شکابێت. (کاسە-گلین‌شکسته)
کاسەکەل : [ناوەت] گڵێنە یان دەفری لێو هەڵپەڕیو یان نیوەشکاو. (کاسەشکسته)
کاسەگوڵ : [ناوەت] وڕەگیا؛ گیاییێکە بۆ بێ-خەوی و بێقەراری باشە. (گل‌انگشتانه)
کاسەی‌جێژن: [ناوەت] کەلوپەل و شتی پێویست بۆ بەڕیوە بردنی جێژن گرتن، وەک: برنج و ڕۆن و...هتد (وسایل برگذاری جشن)
کاسەی‌چاو : [ناوەت] کالانی‌چاو؛ ئەوچاڵاییە کە گۆی چاوی تێدایە. (کاسه‌چشم)
کاشمە : [ناو] کەرەس؛ حەشەگیواو؛ کەرە-فس. (کرفس)
کاغەز : فد؛ [ناو] کاغز؛ (١) ڕووپەڕێکە بۆ لە-سەر نووسین. (٢ب) نامە. (کاغذ)+
کاغەزی‌فافۆن :[ناوەت] ڕووپەڕێکی ناسکە لە فافۆن بۆ تێوەپێچانی دیاری یان بەستە. (کاغذآلومینیومی)
کاغذزی‌ئا : کاغەزی تایبەت بۆ چاپ لە ئە-ندازەی ٦٠٠×٩٠٠ (میلیمیتر)دا هەروەها (ئا ٣) لە ئەندازەی ٢٩٧ × ٤٢٠ م.مدا (ئا٤) لە ئەندازەی ٢٩٧×٢١٠ م.مدا و (ئا ٥ ) لە ئە-

ندازەی ۲۱۰×۱۴۸ م.مدا و (بیٚ) لە ئەندازەی ۷۰۰×۱۰۰۰ م.مدا و (بیٚ۴) لە ئەندازەی ۲۳۵×۳۲۰ م. مدا و (بیٚ ۵ ) لە ئەندازە-ی ۱۶۰×۲۳۵ م. مدا.
کاغەزی‌کایی : [ناو،ت] کاغەزیٚکی نەباش؛ کاغەزی هەندیٚ رۆژنامە و بڵاوٚک. (نامە-نوشتن)
کاڤزیم : [ناو] کەف. (کف)
کاڤینان : وەک : برژاندنەوەی برین؛ خوین بەس کردنی‌برین. (بندآوردن خون‌زخم)
کاکا : فد؛ [ناو] لە کوردییەوە چووەتە نیٚو فارسی؛ کاکە؛ برای‌گەورە. (کاکا)
کاکائوٚ : فرد؛ فد؛ اند؛ [ناو] داریٚکی کورتە باڵا-یە ؛ بە بەرەکەیشی دەڵیٚن کاکائوٚ نیوەبرژی بەرەکەی دەهاڕنەوە و دەیکەنە نیٚو شیری داخ یان ئاوی داخ و دەیخوٚنەوە. (کاکائو)
کاکروٚس : [ناو] پاقلە. (باقلی)
کاکڵەمووشان : جوٚریٚک جاڵجاڵووکەی ژارداره و زیاتر ڕەنگی ڕەشە. (رطیل)
کاکوت‌کردن : [چاوگە،ت] دوای‌سوواخدان کا بەسەر قوڕەکەدا کردن و شیٚلان. (کاه-روی‌گل‌اندودریختن‌وکوبیدن)
کاکوٚڵ‌هەڵەک : [ناو] پوٚڕهەڵەک؛ قژلوول؛ قژفرفڕی؛ قژی پیٚچ‌پیٚچ. (موفرفری)
کاکوٚڵی‌گەرمەشانی : [ناو،ت] تال‌گەلی باریکی سەر گەرمەشانی؛ پوٚپەکابە؛ کاکوٚڵی کابە (کاکل‌ذرت)
کاکەمەم : گراوی خاتووزین لە بەیتی خاتووزین و کاکە مەمدا. (نام‌مردانە)
کاکی‌بەکاکی : [ئاوەڵناو] دەشتیان بیابانی کاکی‌بەکاکی واتا تاچاو هەتەردەکا بەرین بیٚت و تەغەر چوٚڵ بیٚت. (دشت‌وبیابان پهناور و برهوت)
کاکیلە : [ناو] خر؛ ددانەکانی دواوەی تایبەت بەهاڕینی خوٚراک. (آسیا)
کاکیلە : [ناو] وشەی بانگ‌کردنی برای چکوٚلە؛ هوٚی کاکیلە؛ کاکەی چکوٚلە. (داداش کوچک)
کاڵاور : [ناو] کەوشی وەور؛ کاڵە لە پیٚستی خاو بوٚ ناو بەفر و سەهوٚڵ. (چارق)
کاڵای : [چاوگە](۱)هەڵکوٚڵین؛ (گودکردن)؛ (۲)کیٚڵان. (شخم‌کردن)
کاڵوٚش : [ناو] گاڵوٚش؛ کەوشی ناسک زیاتر لە لاسیق کە بە سەر کەوشدا دەکریٚتە پا بوٚبەرگری لە قوڕاوی بوونی کەوش لەکاتی قوڕ و چلپاودا. (گاش)
کاڵ‌وکرچ : [ئاوەڵناو] (۱) مروٚڤی مووزەردی سوور و سپی و چاو کاڵ ؛ (بورسفید پوست) (۲) نەگەییو؛ نەکوڵا. (نرسیده؛ نپخته).
کاڵەکی‌کرمیٚ : [ناو،ت] هەنەی کاڵەک کاتیٚ بە ڕوولەیە میٚشوولەییٚکی تایبەت پیٚستی ناسکی بەڕوولەکە کون دەکات و گەرای تیٚدا دادەنیت و دەبیٚتە هوٚی کرموٚڵ بوونی؛ بوٚ بە-رگری لە کرموٚڵ بوون دەبیٚ...>گول‌گرتن. (خربزەکرمو)
کاڵەنویٚژ : [ناو،ت] سبەینانی زوٚر زوو کە هیٚشتاکاتی نویٚژ نە گەیشتبیٚ. (نزدیک‌بە-وقت‌نمازصبح)
کاڵەوبووگ : [ئاوەڵناو] کاڵەوبوو؛ ڕەنگ-ڕوٚیشتوو. (رنگ‌باختە)

کاڵەی شەمامەبەندی : [ناو،ت] کاڵەیێکە بە ئاورشمی ڕەنگاوڕەنگ گوڵینگی بۆ دروست-دەکرێ. (نوعی‌چارق)
کالیسکەی‌سەربەفر :[ناو،ت] سوورتمەی تایبەت، کە بەسەر بەفردا دەخزیٚ و لە جەمسەری باکووری گۆی زەوی ئیسکیمۆکان چەند سەگ دەکەنە سوورتمەکە بۆ ڕاکێشانی. (سورتمەبرفی)
کاڵین : [چاوگە](۱) باڵاندن؛ باڕاندن؛ (بعبع-کردن)؛(۲)پیاکاڵین؛تووڕەبوون؛بەمنداڵەکەدا هەڵکاڵی: لی‌تووڕە بوو.(سرزنش‌کردن)+
کاناڵ : فد؛ فرد؛ [ناو] جۆگەی بەرفراوانی بەینی دوو دەریا کە دەستکردە؛ کەنداو؛ (کانال)؛ (۲) تۆڕ و شەبەکەی (تەلەفزیۆن؛ (کانال‌تلویزیون)؛ (۳) لوولە ئاسای چوارپاڵو بۆهاتنی هەوای سارد لە کوڵێرەوە. (کانال-کولر)
کانگا : [ناو] (ب) قووڵایی؛ ناخ؛ لە کانگای دڵەوە: لەناخی دڵەوە. (بیخ؛ ته)+
کانوون :[ناو] جۆرێک مراوی لە تۆرەمەی وەردەک (ئۆردەک)ە و چەند جۆرە. (۱) کانوونی‌کاکۆڵدار. (مرگوس‌کاکلی). (۲) کانوونی‌گەورە. (مرگوس‌بزرگ). (۳) مراویی سەرسپی. (اردک‌سرسفید)
کانەوزبانە : [ناو،ت] ئەو بەرزاییە لە تەختەیێک کە دەچێتە نێو جێگای کانیشکافەوە بۆ جووت بوونی دوو تەختە. (کانەوزبانە)
کانیشکاف : [ناو] کەرەستەیێکە وەک کوشتەرە، بەڵام لەناوەڕاستی تەختەدا هێڵیٚ هەڵدەکەنێت. (کانیشکاف)
کانیشکافە : [ناو] کانە؛بەرهەمی هەڵکەندنی هێل لەسەر تەختە بە کانیشکاف. > کانیشکاف.
کانیکەوە : گوندێکە سەربەشاری سەقز. (اسم‌دهی‌است)
کاوبا : [ناو،ت] خەیاڵاتێک کە مێشک بە خۆیەوە خەریک دەکا؛ (ب) خەیاڵ پڵاو. (خیالات‌واهی)
کاولکەردەی : [چاوگە،ت]کاولکردن؛ ڕووخاندن. (خراب‌کردن)
کاوە : (۱)داری ڕزیو؛ (کندەپوسیدە)؛ (۲)کێوی زۆربەرز و قووچ. (کوەسرکش)
کاویە : گەندەڵ بوونی ناخی‌دار. (پوسیدن-داخل‌کندەدرخت)
کتاف : کونجی. (کنجد)+
کتکەشۆر : [ناو،ت] پشیلەشۆر؛ شتنی بە پەلە و سەرسەری. (گربەشور)
کچەتیو : [ناو،ت] چەتیم؛ کچی‌هەتیو؛ چەتیو؛ بەتەوسەوە بانگی کچێک دەکەن وەک جوێن. (دخترک‌یتیم)
کچەمام : [ناو،ت] کچمام؛ کچی‌ئاپ ئامۆزای مێوینە؛ (دخترعمو) هەروها کچەخاڵ؛ کچەپوور. (دختردایی. دخترعمه)
کچیٚ : [ناو] کچەکە؛ کیژیٚ؛ کەنیلە؛ کەنیٚ؛ لە کاتی ئاخافتن‌دا بە کیژدەڵێن. (دختر)
کچی‌مۆردار : [ناو،ت] (ب)کچێک کە بنی هەبیٚ. (دخترباکرە)
کچێنە : [ناو] گلینەی‌چاو؛ بیبیلە؛ ڕەشکێنەی‌چاو؛ بیلبیلەی‌چاو. (سیاهی‌چشم.مردمک)
کخک : [ناو] قۆخە؛ کۆخە؛ قەف. (سرفە)

کخمیته : [ناو] تۆز و ورده ئاردی دەوروبەری ئاش. (آرداطراف‌آسیاب)
کدوخ : [ناو] گەرماڤ؛ گەرماو؛ حەمام. (حمام
کراس‌قاقانی : [ناو،ت] کەسێک کەکراسی لە قوماشی قاقانی لە بەردایە؛ بەستەیێکە لە گورانی کوردیدا؛ (پیراهن‌ازقاقانی.نام‌ترانە-ایست)
کراسەمارانە : [ناو،ت] کراژی‌مار؛ کاژەمارانە؛ تفرەمار. (پوست‌انداختەمار)
کراش : [ناو] توێژ و قەتماغەی برین؛ کراژ؛ تۆژ. (پوست)
کراشۆ : [ناو] کدوخ؛ حەمام؛ گەرماو. (گرمابە)
کراک : [ناو] ماکێکی سرکەری بقەیە. (کراک)+
کڕاوات : فد. فرد؛ ئالماند؛ اند؛ بۆینباخ؛ کە-ڕاوات؛ کەرەوێتە؛ قەرەوێتە. (کراوات)
کرپە : خورپە؛کرمە؛ وەک:کرپەلەدڵمەوە-هات: (ب)دڵمداکەوت؛ (دلم‌ریخت؛دل-ریختن)+
کڕخەو : لەخەوی گرانەوەچوون. (خواب-غمیق)
کردنەیەک : دوو شت دانەدەم یەک و بە یە-کی‌کردن. (یکی‌کردن)
کردەپەشیمان : کەسێک کە لە کاری ڕابوردووی یان لەکارێک کە کردوویەتی پە-شیمان بێت. (ازعمل‌یا ازاعمال پشیمان)
کردەی : [چاوگە]کرن؛ کردن. (کردن)
کرفە : [ناو] سەروا؛ دەنگی فریشتە؛ دەنگی-غەیبی؛ سرۆش. (وحی؛الهام)
کرکاسە : [ناو] دەفر و قاپوقاچاخ. (ظرف-وظروف)
کرکرۆکە : [ناو] کرکراکە؛ کوروژکوروژە؛ کرکروچکە؛ خرێنچکە؛ خرتێنک؛ کورکوروژە؛ ئەستیٚ‌کوژ؛ لە ئیسک نەرمترە. نەرمە ئیسک.(غضروف)
کرمزی : [ناو] حوننەر؛ هونەر؛ کارێک‌کە لە دەس هەمووان نەیێت. (هنر)
کرمن : [ئاوەڵناو] حەکەدار؛ ژنی بە ئالۆشی زۆر بەئیشتیا بۆکاری سەر جێیی؛ جۆرێک جوێن. (حشری)+
کرمن : [ئاوەڵناو] وەک‌جوێن بە مرۆی ئالۆشدار دەوترێت؛ کرمن یان‌کرمنە. (حشری)
کرمنشاندن : [چاوگە،ت] جیق دەرهێنان؛ گوشینی بەتەوژم و تلیقاندنەوە. (فشاردادن و له کردن)
کرمنشین : [چاوگە،ت] وردوخاش‌کردن؛ تلیقاندن. (لەولورده)
کرمەتووکنە : [ناو،ت] جۆرێک کرمە بە کۆمەڵ لەدەوری بنجەگیایێک دەهاڵێن و تاڵگەلی وەک تاڵی جاڵجاڵووکە بەڵام شپرزە و شێواو دروست دەکەن و بنەگیاکە دادەپۆشن و خۆیشیان تووکنن. (نوعی‌کرم)
کرمەک : [ناو] کرمی زۆر وردی ناو ڕیخۆڵە. (کرمک)+
کرمەکوژە : [ناو] گیان‌گیر؛ گیایێکی ژەهرداره و عیلاجی تیراوێ و برینی دیکەیە. (شوکران‌صغیر)
کرمەگڕینە : [ناو،ت] گوڵ‌ئەستێرە؛ کرمێکی فۆسفۆڕدارە بەشەو دەدرەوشێ. (کرم‌شب‌تاب)

کرمی‌ئارمووش : [ناو،ت] کرمی‌هەوریشم؛ کرمی‌ئاوریشم. (کرم‌ابریشم)
کرمی‌کەدوو: [ناو،ت] کەدووانە؛ جۆرێک کر-می ناو ڕیخۆڵەیە وەک تووی کوولەکە وایە و بە دەمیە کەوەیە. (کرم‌کدو)
کڕندە : [ناو، بک] لێسک؛ ئامرازی قووڵ‌کر-دنی کاسەی‌تار و کەوچک. (لیسک)
کڕنووش : [ناو] کوڕنووش؛ سەرچەماندنەوە؛ کۆم بوونەوە. (کرنش)
کڕنە : [ناو] کڕنوو؛ قڕنوو؛ مچ؛ چنگنە؛ کڕنک. (نوعی‌کنه‌کوچک)
کرۆچلێ : [ناو] کروژکروژە. (غضروف)
کروشمە : [ناو] دووشدامان؛ کزومات‌دانیشتن؛ خۆکزکردن لەخەم یان لەسەرما. (خودراجمع-کردن‌ونشتن)
کڕوکاش : [ناو] تەقالا؛ حەول‌وتەقەلا؛ (ب) دڕک‌ودال دوورین و کۆکردنەوەی. (کوشش)
کرۆلیە : [ناو] تۆپەڵ؛ گونک؛ تۆپەڵە؛ گوندەڵە بەفر یان هەویر. (مانندگلوله‌برف‌یاخمیر)
کڕومات : [ئاوەڵناو] کپ و بێدەنگ؛ کش-ومات. (ساکت‌وبی‌صدا)
کرێتی : [ناو، بەرهەمی‌چاوگە] فهێتی؛ ناشیرینی؛ کارخراپی؛ چەپەڵی؛ خراپی. (زشتی؛ بدی)
کرێخانوو : [ناو،ت] کرامال؛ ئیجارەی‌خانوو؛ کری‌مال. (کرایه‌خانه)
کرێداسی : [ناو،ت] حەقەدروێنە؛ کرێی دروێنە؛ مزی سەپانی. (فرددروکردن)
کرێز : کێش‌هاتنی شلەمەنی؛ وەک‌کێش-هاتنی هەنگوین. (کش‌آمدن‌مایعات)
کز : [ناو] لە کوردییەوە چووەتە نێو فارسی؛ حاڵەتی کۆوەبوونی موو لە کاتی سووتاندا. (کز)+
کززێن : [ناو] جۆرێک گەمەی کوڕە لاوی گوندنشین بوو، بە توپی بەن دەکرا. (نوعی-بازی)
کسپە : کزە؛ حاڵەتی ئاسنی داخ بەلەشدا چزان؛ (حالت سوزش تن با آهن گداخته)
کشایەوە :[ڕابوردووی کشانەوە] کشادوواوە؛ پاشەکشەی‌کرد. (عقب‌کشید)
کشت‌وکیاز : [ناو،ت] چاندنی‌بێستان و تەڕە-کاری (تەڕەکاڵی). (کاشتن‌بوستان)
کشت‌وکێل : [ناو،ت] کشت‌وکاڵ؛ کاری مە-زراداری. (کشت‌وزرع)
کشتی‌جەنگی : [ناو،ت] کەشتی شەڕی؛ پاپۆڕی تۆپ داری تایبەت بەشەڕ. (کشتی-جنگی)
کشکشین: وەدرەنگ کێشانی کار یان کات؛ وەدرەنگ‌کەوتن؛ زۆرپێچوون. (بدرازاکشیدن)
کفارە : [ناو] فیچقەکردنی ئاو لە لوولە (بۆڕیە) پێکەوە کە لە نێوحەوزدا دروستی دەکەن؛ فووارە. (فواره)
کفت : [] وەک؛ کفت‌قسەکەی‌تۆ : وەک قسەکەی‌تۆ؛ تەغەر لە بن‌زاراوەی ئەردەڵانیدا گۆیە دەکرێت. (مانند)+
کفتەزووخاڵ : [ناو،ت] وردەزووخاڵ کە بەئاو تەڕی دەکەن و وەک‌کفتەی‌گەورەخڕی دە-کەن پاش وشک بوونەوە زستانان دەینێنە نێو چاڵە قورسی. (خرده‌ذغال‌بصورت‌کروی - درست‌شده)

کفتەوشۆروا : [ناو،ت] کفتەوشۆربا؛ جۆرێک-چێشتە؛ کفتەوشۆرباو. (کوفتەوشوربا)
کفتەوگۆشت : [ناو،ت] خواردنێکە؛ لەشاری سنە، وەک سەروپێ زیاتر بە بەرقەندە دە-یخۆن. (کوفتەوگوشت)
کفتێ : [ناو] کفتە. (کوفتە)(٢) شەکەتی؛ حاڵەتی ماندوو بوون. (خستگی)
کفکار : [ناو] کارگ؛ قارچک. (قارچ)
کفن‌زەردنەبوون : هێشتاکفنی زەردنەبووە : زۆری پێ نەچووە مردووە؛ (ب)تازە مردوو. (کفن‌زردنشدن)
کفە : (١) [ناو+ دەنگەناو] قف؛ قفە؛ کۆخە؛ قۆخە؛ کۆکە (سرفە)؛ (٢) دەنگی هەڵبوونی باروت و گۆگرد؛(صدای‌روشن‌شدن‌گوگرد) (٣)هەڵچوونی تراو لە سەرئاور؛ (سررفتن-مایعات).
کفەڵ : [ئاوەڵناو] پووک؛ قانگ؛ پف. متخلخل)
کلا : کەنار؛ بۆ ئەسب لەسەر ئاخوڕ لەجیاتی تەنیشت بە واتای (بڕوئەولاتر) بەکاردەبرێت. (بروآطرف)
کلاج : [ناو] کەلاج؛ ئامێرێکە لە سەیارەدا کە دەندەڕەها (خەلاس) دەکا بۆ گۆڕینی دەندە. (کلاج)
کلاس : [ناو] کەلاس؛ پۆلی خوێندنگە؛ کلاسی پێنج : پۆلی پێنج. (کلاس)
کڵاشپان : (ب) سەپان و ڕەنجبەر. (کارگر؛ رنجبر)
کڵاش‌وەراز : [ناو] کڵاشکەر؛ کڵاش‌دروو. (کفش‌نخی‌ساز)
کڵاف : [ناو] بەردێکی تاشراوە پێنج سانتیم پانە و لە بەردکاری نومای بینادا دەیخەنە بە-ینی بەردی (ترێشتەیی) و بە ردی نوما بۆ جوانی. (کلاف)+
کڵاف : [ناو] کەرەستەیێکی کانزایی زیاتر لە زێو بە ئەندازەی جێگای ئیستیکان دروست-دەکراو دەسکداربوو لەجیاتی‌ژێر پیاڵە ئیستیکانی بی‌قوڵفەیان‌تێدەنا. (کلاف-استکان)+
کلاکردن : [چاوگە،ت] خستنەلاوە؛ وەلانان. (بەیکطرف‌انداختن)
کلاوڕۆچنە : (١) [ناو] ڕۆچن؛ کولاوکە. (روزنەبام)
کڵاوسەرنان : [چاوگە،ت] (ب) خاپاندن؛ فریودان. (کلاە گذاشتن سر کسی)
کڵاون : [ئاوەڵناو] فڕندەی پۆپەدار؛ کڵاونە. (پرندەکاکلی)
کڵاوی‌سەخریچن: [ناو] کلاوێکی ئەفسانەییە ڕیوایەنە هەرکەس لەسەری‌نێ لەچاو ون‌دە-بێت. (اسم‌کلاهی‌افسانەای)
کلچیف : [ناو] کلچێوک؛کلچۆک؛ مێڵی کل-کێشانی‌چاو. (میل‌سرمەکشی)
کلک‌پیاهەڵسپاردن : [چاوگە،ت] (ب) بایەخ پێ‌نەدان؛ کەمتەرخەمی لە کردنی کارێک. (اهمیت‌بەانجام‌کاری‌ندادن)
کلک‌زەردە : [ناو] تۆرەمەی فڕندەی کلک‌زە-ردە دوو جۆرن. (١)کلک‌زەردە کە کاکوڵی خورمایی ئاچخە و سەری زە ردە و باڵی‌ڕە-شە. (بال‌لاکی)(٢)میوەخۆرە کە لە سەر دار و بنچک هێلانە دەکا و مێوەکانیان بۆری مەیلە

و قاوەییە و نێرەکانیان ڕەنگی بـۆری ئاچخـە ولا جانگیان ڕەشە. (میوەخور)
کلک‌کردن‌بەناوگـەڵ‌دا : لـە کـاتی شکسـتی سەگ لـە شـەڕە سـەگ‌دا کلـک بردنـە نـاو پاشوو؛ (ب) قزەبوون وترسانی مرۆڤی پێـدە-شوبهێنن. (ناتوانی‌وشکست)
کلک‌گرتن:[چاوگە،ت](۱)کلک بەرزکردنەوە-ی ئـەسـب زیـاتر لـەکـاتی غـاردا؛ (دم-بالانگاهداشتن‌اسب) ؛ (۲) دەسـت‌گـرتن بـە کلکی حەیوانەوە (گرفتن‌دم‌حیوان)؛ (۳ب) لـە خۆدەرچوون، بە پلە و پایە کە یشـتوە خـۆی لێگۆڕاوە وکلکی‌گرتووە؛ دەعیە لی‌پەیـدابوون (دارای کبروغرورشدن )
کلک‌مەقلی :[ناو،ت] قشقەرە؛ قەلـەبـەلـەک. (زاغچە)
کلک‌نامڕاس:[ناو،ت] قامکی نـاوەڕاسـت؛تبلا قووتی؛ تلیا ناوین؛ بەرزەملی. (انگشت‌وسط)
کلک‌ووژە : [ناو] کەڵەموست؛تبلامەزن؛ تلیا-مەزن؛ قامکەگـەورە؛ کلکـەگـەورە؛بـەرانـی. (انگشت‌شصت)
کلکەبێل [ناو،ت] : دەستکی‌بێل. (دستەبیل)
کلمسـین : [چاوگـە،ت] واق‌وڕمـان؛ سـە-رسامبوون. (سرسام‌گرفتن)
کلۆن‌کردن : [چاوگە،ت]کلـۆم‌کـردن؛ گاڵـە-دانی‌درگا بەگلۆن. (کلون‌کردن)
کلووچی : [ناو] کولووچە؛ کولیچی؛ کولیچـە. (کلوچە)
کلـوور : [نـاو] کـروور؛ کـورووڕ؛ نیوملـوێن. (کرور؛ نیم‌میلیون)
کلـۆیی : [ئـاوەڵنـاو] پیپـۆکی؛ بلـووری؛ کریستالی؛ کولۆیی. (کریستالی)
کڵـەوە : [نـاو] قـولاپی ماسـی‌گـرتن. (قلاب‌ماهیگیری)
کلیپ :فد.اند؛[ناو] دەنگ‌خستنە سەر وێنەی-فیلم بە شێوەی لێو جووڵاندنەوە. (کلیپ)
کناچلی‌چەم : [ناو،ت] بیبیلەچاو؛ ڕەشکێنەی چاو. (مردمک)
کناچوو : [ناو] کچ؛ قیز؛ دۆت؛ کەنیک؛ کیژ؛ کەنیشک؛ کناچە. (دختر)
کنج : [ناو] مەهان؛ بی‌نوێژی‌ژنان؛ تێکەوتنی مانگانەی‌ژنان. (قاعدگی)
کنگلاشک : [ناو] قنگەلاشک؛ گەنگری پیر؛ گیای کەنگری پیری وشکەوە بوو. (گیاه کنگرپیرخشک‌شدە)
کنێشت : [ناو] کنشت؛ پەرستگای جوولەکان. (کنشت)
کۆ : [ناو] قالۆنچە ئاساییکە هـەڵـدەفڕێـت و ئەگـەر خـۆی بـدا بـە چـاوی گـا و مانگـادا دووچاری چاوئیشە و نەخۆشین چاویان دەکا. (نام‌حشرەایست)+
کۆئەندام : [ناو،ت] چەندئەندام کـە هـەمـوو پێکەوە لە بوواریکدا ئەرکی خۆیان بەجـێ د-ێنن بۆکردنی‌کارێک. (اعضا)
کۆئەنـدامی‌هـەرس :[نـاو،ت] (ب)ئـەندامـە-کانی(دەم ، گەروو، گـەدە، ڕیخۆڵـە، جـەرگ، زراو) کـە سـەرجـەم کـاری هـەرس‌کردنـی خواردنەکان دەکەن. (دستگاەگوارش)
کوای : (۱)[بـەنـد] کـوا؛ لـەکوێیە؛لـەکـوێی. (کجاسـت؛ کجـایی). (۲)[چاوگـە] کوتـان؛ هاڕین. (کوبیدن). (۳) لێدان؛ دارکاری یان بە

کوتەک لێدان. (زدن)
کۆب : [ناو] کاپ؛ لەکاپی ئینگلیزیەوە هاتووە، فنجان؛ ئیستیکانی قاوە خواردنەوە. (کاپ؛جام)
کۆپان‌وراز : [ناو،ت] کورتاندروو؛ پاڵان‌چێکەر. (پالان‌دوز)
کۆپلە : [ناو] (۱) بەش؛ کۆگای‌چکۆلە. (کپه)؛ بەشێک لە شێعرێکی درێژ. (فراز؛ بند)
کۆپەک : [ناو] (۱) قەرەپوولی ڕووسیا؛ (اجزاپول‌روسیه)؛ (۲) پێلووی‌چاو. (پلک‌چشم)
کوتانەزەویا : [چاوگە،ت]کوتانن بەعەرزا؛ دان‌بەعەرزا؛ کوتانن بە زەوینا، (ب)کوڵ‌پێ‌دادان؛ شکست‌دان. (زمین‌زدن)
کوتحە : [ناو] کۆڤل؛کوتەدار؛ داری سووتاندن لە کل و تەندووردا. (کنده‌چوب)
کوتحەی‌جەهەندم : [ناو،ت] (ب) مرۆڤی ناخۆشەویستی زۆرهان؛کۆتە داری جەهەندم. (کنده‌چوب‌دوزخ)
کۆتر : [ناو] کابۆک؛ کەبووتەر؛ کەڤۆک؛ کاووک؛ لەڕوانگەی فڕندەناسیەوە چەند جۆر فڕندەن. (۱)کۆترەشینە. (کبوتر-چاهی).(۲)کۆترەگایانە. (کبوترجنگلی). (۳)کۆترەنەخشینە. (کوکوختی). (۴)قومری. (قمری). (۵)کۆترەباریکە. (قمری‌درختی). (۶)(یاکریم؛ یاهوو)کەکللی لەقومری درێژترە. (یاکریم)
کۆترەپەپوو : [ناو] تۆرەمەیێک باڵندەن کە دووقامکیان لەپێشەوەیە و دووقامکیان لەپاشەوەیە و سێ جۆرن، (۱)کۆترە پەپوو. (کوکو)، (۲)کۆترە پەپووی جقەڕەش، (کوکوی‌تاجدار)،(۳)کۆترە پەپووی خاڵخاڵ، (کوکوی‌خالدار)
کوترهێنان : [چاوگە،ت] لەیاری پەڕانتۆ یان هەرقومارێکدا خراپ‌هێنان. (بدآوردن درقمار)
کۆتری‌دەریایی : [ناو] فڕندەیێکی تیژباڵە و بەرزگ‌سپی و پشت‌ڕەشە، لەبەرد و شاخی ەراخ دەریادا هێلانە دەکا. (کبوتردریایی)
کۆتری‌نامەبەر : [ناو] کۆترێکە نامەی بە پاوەدەبەستن و لەهەر شوێنێ بەریدەن دەگەڕێتەوە بۆ هێلانە سەرەکیەکەی و لەقەدیم‌دا لەجیاتی چەپەر کەڵکیان لێ وەردەگرت. (کبوترنامەبر)
کۆت‌وکوڵکە : [ناو،ت] وردەمووی قرتاوی سەروریش لە دەلاکخانە؛ وردەخوری و مووی ئاپۆرە کە بە خاوکان دەیرێسن بۆ بەنی جەواڵ و تێر دوورین. (پشم‌وپیله)
کوت‌وکوێر : [ئاوەڵناو+ ناو] کوێر؛ (ب) چاوکز؛ نیوەوناتەواو دیتن. (کور؛ چشم‌کم-سوو)
کوت‌ولەت : [ئاوەڵناو] شڕوپچڕاو؛ لەت‌وپەت. (تکه‌پاره)
کوتە : (۱)[ڕابوردووی کوت بوون] لەتە؛ شکاوە؛ (۲) [ناو] کوتەسواڵەت: سواڵەتی لەت. (تکه‌شده؛ تکه)
کوتە : <هەزارە و دولایی
کوتە : کوتتە؛ لەجیاتی دەردوسندان و ژەقنە و ژەحریمار و قسەی ناخۆش دەوترێت. (مترادف‌زهرماروکوفت)
کوتەڕاو : [ناو،ت] ڕاوەکەوی ئاخری‌پاییز. (-شکارکبک‌پاییزی)

کۆتەرە : [ناو] (١) کورتەوەبوو؛ وەک گسکە کۆتەرە؛ گسکێ کە چووەتەکار و کورتەوە - بووە (کوتاەشدە)؛(٢)کوتەی کورتیی‌دار بەتایبە- ت بنی‌دار کە دەبڕدرێتەوە و بنەکەی دەمێنی لەعەرزدا. (ماندەتنەدرخت بریدەشدەدرزمین)
کوتەکوت : [بەند] لە تاریکیدا بە پەل کوتان ڕۆیشتن؛ ڕێگاڕۆیشتنی کوێر. (کورمال)
کۆتەل : [ناو] کۆتەڵ؛ بەیرەق؛ (ب)جلی مردوو لە مەیدانێکدا وەک ئاڵا بەرز دەکەنەوە و نیشانی پرسەکەرانی دەدەن یان جل و چە- ک و فیشەکدان و شتی‌تری مردوو لە سەر پشتی ئەسپێک دادەنێن و بە پرسەکەرانی نیشان دەدەن و شیوەنی بۆ دەگێڕن. ( علم- کردن‌لباس‌واسلحەمتوفی‌برای‌نشاندادن‌بە- مردم‌درعزاداری‌متوفی)
کۆتەی : [چاوگە]کەوتن. (افتادن)
کوجیلە : [ناو] ئەستوندەکی‌ڕەشماڵ.(دیرک- چادر)
کۆچبار : [ناو،ت] ماڵەکۆچ؛ سامانی‌ماڵ کە بارکراوە بۆ کۆچکردن. (کوچبار)
کوچک: ناوی دووگوندە لە باکووری‌شاری سەقز(نام‌دهکدە) بەرد؛ تەوەن. سنگ)
کوچک‌تراش : [ناو] کوچک‌تاش؛ تەوەنتاش ؛ بەرتاش؛ بەردتاش. (سنگتراش)
کۆچەرکی : [ئاوەڵناو] وەک کۆچەر؛ ڕەمەکی؛ دەشتەکی؛ بێ‌سەرە و بەرەیی. (هردمبیل)
کۆچەک : [ناو] بەچکەی وشتری یەکساڵە. (بچەشتریکسالە)
کوچەڵە : [ناو] کەوچکەڵە؛ کەوچک ئاسا لە قوڕ دروست‌دەکرێت بۆ گرتنی شیرەی دار قەزوان (بنێشت). (قاشقک‌جمع‌اوری‌سقز)
کۆد : [ناو] پیتی‌نەوت؛ چەلەنگ؛ دەفری تەنەکەی بیست‌لیتری. (پیت)(٢) پێش ژمارە؛ ژمارەی ڕەمز. (کد)
کورد : [ناو] کوردمانج؛ کورمانج کە لە وشەی کورماد وەرگیراوە. (کرد)
کورزە : [ناو] جەواڵ. (جوال)
کورژین : [چاوگە،ت] بۆڵەبۆڵ؛ گورەگوڕ. (غرغر)
کورسین : [ناو] (١) کورسی؛ قورسی؛ قورسین؛ چرپایێک کە لە زستاناندا ئاور لە ژێریدا دادەنێن و لێفەی بەسەردادەدەن. (کورسی) ؛ (٢) [چاوگە،ت]کوڕووسانەوە. (کلوچیدن)+
کوڕکوڕە :[ناو]هاوارە بەرە؛کەتی؛ قەتی؛قتک ؛ کوڕکوڕ.(مرغ‌سنگخوار؛ باقرقرە). حەوت- جۆرن.(١) کوڕکوڕەی بە رزگ‌خەنەیی، (٢)بەرزگ‌ڕەش، ((٣)بەرزگ‌سپی، (٤)خاڵ- خاڵ، (٥)ڕێ‌ڕێ؛ (٦)کلک‌درێژ؛ (٧) کوڕکوڕە- ی گەنمان)،(١.شکم بلوطی، ٢.شکم‌سیاە، ٣.شکم‌سفید، ٤.خالدار، ٥.راەراە، ٦. دم‌دراز؛ ٧ کوکرگندمی.)
کورماج : [ناو] کرماج؛ کورمانج؛ کوردماد؛ واتا هەمووکوردێک لە سەر گۆی زەوی و بەسێ بەش و سێ زاراوە دابەش کراوە. (١)کورمانجی ژووروو. (٢)کورمانجی ناوە ڕاست. (٣)کورمانجی‌خواروو. کە١٠٤بن زاراوەی هەیە. ئەگەر بەسووکایەتی بە تاقمێکی نەخوێندەوار دەڵێن، ئەوە ناڕەوایە و هەڵبەستی نەیارانی کوردە. (کورمانج)

کۆرنان: [ئاوەڵناو] نان کوێر؛ نـانکوڕ؛ ڕژد؛ دە-
س‌قووچاو. (خسیس)
کـۆرنـۆمیتر : [نـاو] کـات‌پێـو؛ زەمـان‌پێـو.
(کرنومتر)
کۆرنێر : [ناو] دۆخیٚ لە یاری تۆپی پـادا کـە
لە گوشەوە دەست پێدەکا. (کرنر)
کورۆن : یەکەی پـارەی وڵاتـانی دانمـارک و
سوئێد و نۆرویژ. (کرن)
کوڕەمام : [ناو،ت] کوڕمام؛ پسـمام؛ ئـامۆزای
نێرینە؛ کوڕئاپ. (پسرعمو)
کۆرەوار : [ئاوەڵناو] وار، یان هەوار، یان مـا-
ڵبات، کوێر بوونەوە. شوینەوار کوێر بوونـەوە؛
ماڵویٚران؛ بـۆی هـەیـە کوڵـەوار سـێوراوی
کۆرەوار بێت. (بدبخت؛ خانمان‌ویران)
کوزاز : [ناو] نەخۆشینیٚ‌کە بەهۆی هوورگی
کوزازەوە مرۆڤ تووشی دەبێت و ماسوولکەی
لەش ڕەق دەکات و دەبێتە هۆی مەرگ؛ دە-
ردەکۆپانە؛ نەخۆشـینێکە دەبێتـە هـۆی ڕە-
قبوونی ماسوولکەکانی لـەش و زۆر بڤـەیـە.
(کزاز)
کۆزبەستن : [چاوگە،ت]کۆبوونـەوە بـەدەورە.
(جمع‌شدن‌دایرەواردورهم)
کۆزروبـەربانانـەوە : (ب) تـەمبـیٚ‌کـردن و
لێدانی‌زۆر. (کنایی‌تنبیه‌کردن)
کوژاندنەوە : [چاوگە،ت] (١) هێڵ‌کێشان یان
ڕەشـکردنەوە یـان سـڕینەوەی نووسـراوە؛
(محوکردن)؛ (٢) تەمراندن؛ خامۆش کردنـی
ئاور و چرا. (خاموش‌کردن)؛ (٣) ئارام‌کردنەوە
و لابردنی شەروکێشە. (خاموشکردن‌فتنە)
کۆژە : [ناو] حەساوی؛ کەری سـپی ڕەنـگ.
خرسفیدرنگ)+
کوژەڵ : [ناو] جۆماڵ. (لایروبی‌جوی‌آب)
کوژیاگ : [ناو+ ناو، بەر] (ب) هەویرەمردوو؛
هەویرترش؛(خمیرمایە)(٢)کوژراو.(کشتەشدە)
کۆس : [ناو] تەپڵـی‌زەلام؛ دەهـۆڵی‌شـەڕیٚ.
(پۆس‌کۆس‌گۆش ئاوکێشان کەم‌کەم، ئی‌سەر
ئەوسـەرەن دووربینـەکـەی چـەم)«مـەولـەوی
(کوس)
کۆس :[ناو]کۆست؛ مەیتی کـوڕە لاوی دەز-
گیراندار(بە کیژێک دەگوترێت، (کۆس‌کەوتە)
کە دەزگیرانی مردبێت). (جنازەنامزددختر)
کوساڵان: ناوی چیاییٚکی بەرزە لە هەورامـان.
(نام‌کوهی‌است)
کۆست‌کەوتوو : [ئـاوەڵنـاو ]بـەکیژێکـی دە-
زگیرانـدار دەوترێـت کـە دەزگیرانـەکـەی
مردبێت، بەڵـام وا بـووە بـە بـاو هـەرکـەس
مردووی لیٚبمرێت یان بەڵاییٚکی گەورەی بە
سەردابێت پێـی دەڵـێن کـۆس‌کـەوتـە؛ یـان
کۆست‌کەوتوو. (دختر نامزدمردە)
کۆس‌وکەڕەنا :[ناو،ت]مۆسیقای تایبەتی شەڕ
لە قەدیمدا؛ تەپڵ و شەیپوور. (کوس‌وکرنا)
کۆسە : [ناو] (کۆستە؛ دابێکی کۆنی کـوردە-
وارییە زیاتر لە گوندەکاندا وەک شـانۆگـەری
دەمەو نەوروز بە ڕێوەدەچیٚ، چەند لاوێک خۆ
دەگۆڕن و ڕیش بۆ خۆیان دروست دەکـەن و
لە ماڵان کۆسە دەگێڕن و پـارە یـان مێـوژ و
گوێزیان دە دەنیٚ. (مراسم‌کوسەدرایام‌نـوروز)
(٢) جۆرێک ماسـی دڕنـدە و زۆر گـەورەیـە.
(کوسەماسی)
کۆسـەوەوی : [نـاو،ت] بووکـە بـارانیٚ.

(عروسکی کەبرای‌باریدن‌باران‌درست‌می‌کنند)
کوسەی‌هەجیج : زاتێکی بەڕێزی ئایینییە کە کڵکۆکەی لە گوندی(هەجیج)ی هـەورامانـە. (کوسەهجیج)
کۆش : [ناو] داوێنی بەرەوی کراسی ژنانە؛ پڕکۆشی‌کرد لە دانەوێلە: داوێنی پڕکرد لە دانەوێلە. (دامن)+
کۆشا : [ڕابوردوو کۆشش] تێکۆشا؛ خەباتی‌کرد. (کوشید)
کۆشا : [ئاوەڵناو] خەبات‌کەر؛ تێکۆش؛ حەول و تەقالادەر. (کوشا)
کوشتی : (١) [ڕابوردووی کوشتن] گیانی‌کێشا. (کشت)؛ (٢) [ناو] بۆ کوشتن؛ ئاژەڵی‌دابەستە بۆ قەڵەو بوون و سەربڕین. (حیوان پرواری‌مخصوص‌ذبح‌کردن)؛ (٣) [ناو، بەر] کوژراو؛ باب کوشتی: باب کوشتە؛ کوشتە: (کوژراو) (کشتەشدە)
کوشتیار : پێداگری‌کردن؛ کوشتیاری‌بووم نەهات لەگەڵم. (اصرارکردن)
کوشنای : [چاوگە،ت]کوژاندنەوە؛ خامۆش ردن. (خاموش‌کردن)
کۆشەر : [ئاوەڵناو] هەوڵدەر؛ خەباتکەر؛ تەقالادەر؛ تێکوش. (کوشا)
کۆف : [ناو] چیا؛ کۆ؛ کێو؛کێف. (کوه)
کۆک : [ئاوەڵناو] دەستەواژەی مۆسیقایە واتا میزان بوونی سیم‌گەلی ساز. (کوک)+
کۆککردن : [چاوگە،ت] میزان‌کردنی تەلی ساز و هێنانە سەر (فرێکانس) یان نۆتی پێویست. (کوک‌کردن)
کۆکڵاش : [ناو] کۆکڵاشک؛ جۆرێک چەقە، وەک بنێشت‌دەجاورێت و لە شیلەی گیای کۆکڵاش دەگیردرێت. (نوعی‌سقز)
کۆکۆ : [بەند]کۆمەڵ‌کۆمەڵ؛ کۆگاکۆگا؛ کۆماکۆما. (کوپەکوپە)
کۆکی‌دیاپازۆن : [ناو،ت] کۆکێکی پەرژێندراوی جیهانییە لە مۆسیقادا <دیاپازۆن
کۆگە : [ناو،ت] جێگای‌کۆبوونەوە؛ جێگای‌کۆڕ بەستن. (جای‌تجمع)+
کۆلا : [ناو] ماکێکە لە نۆشابەی وەک پیسی کۆلا و کۆکاکۆلا دەکرێت و بەرهەمی‌دارێکە هەر بەو ناوە. (کولا)
کۆلاس : [ناو] فیشەک کێشی تفەنگ و چەک. (قشنگ‌کش)
کۆلاک : [ناو] (ف.مشە) بارۆقە؛ بادەوە. (کولاک)
کولپک : [ناو] جێگە دووکمە؛ کونەدووگمە. (جای‌دکمە)کوڵکریاو : قرتاو؛ کورتکراو؛ قوڵکراو. (کوتاەشدە)
کۆلکەمەلا : [ناو،ت] نیمچەمەلا؛ مەلایێک کە سەوادی‌زۆر نەبێت. (ملای‌کم‌سواد)
کولکەمیرزا : [ناو،ت] میرزایێک کە بەزەحمەت بتوانێ بنووسێ و بخوێنێتەوە. (کەسیکە نیم‌سوادی‌دارد)
کوڵگرتن : [چاوگە،ت]کوڵەگرتن؛ بەدزییەوە گوێ لە قسەی خەڵک‌گرتن؛ گوێ‌ڕاگرتن لە قسە بەدزییەوە؛ گووشێ ماڵێ و سەی. (-استراق سمع)
کۆڵنەدەر : [ئاوەڵناو] نەبەز؛خۆڕاگر و نەبەز؛ بێ‌شکست. (شکست‌ناپذیر)
کولۆر : [ئاوەڵناو] کەلەبەرکەوتنە دیوار؛ قەڵە-

شی گەورە؛ ناوخاڵی. کۆتەرە بوون.(تو خالی)+
کۆلە : [ناو] کۆیلە؛ بەنی. (بندە)
کۆلەدار : [ناو، بـک] کویلـەدار؛ چـەوسێنەر؛ (ئیستیعمارگەر). (بردەدار؛ استعمارگر)+
کۆلەزرگ : [ناو] سیکەتۆرە؛ سیقەتـۆرە؛ ئـە-ندامێکی ناوزگی فڕندەیە کە وەک گورچیلە-ی بەرخ وایە وکیسەئاسایە وزیخ و بەرد هـە-رس دەکــات و پــەردەیێکــی زەردی لــە ڕووکـاری نـاوەوە هـەیـە و خـۆی ڕەنگـی؛ سووری تۆخە. (سنگدان)
کۆلەفیتنە : [ناو+ ئاوەڵناو] مایەفیتنە؛ کورتە باڵای شەڕ هەڵخڕێن؛ کورتە بالایش نـەبێـت هەر بەو مانایەیە. (فتنەگر)
کۆڵەکەچەقاندن : [چاوگـە،ت] لـەسـەرسـەر وێستان؛ لەژێمناستیکدا. (روی‌سر ایستا دن)
کۆلەوار : [ئاوەڵناو] بریننداری زۆر سەخت؛ مـاڵوێـران بـوون لـە موعامـەلـەدا؛ حـاڵ-خراپ.>کۆرەوار (زخمی؛ خانەخراب)
کۆلەواربوون : [چاوگە،ت](ب) لەموعامەلـەدا زۆر تێشکان و زەرەرکـردن. (مغبـون‌شـدن-زیاددرمعامله
کۆلەوەیوای: [ناو] سووزمانی؛ بەتەوسەوە بە ژنی خراپ دەبێژن. (لقبی‌ناشایستبـرای‌زن-بدکارە)
کۆلێ : [نـاو] بـالاف؛ کـەلـی؛ کـەل؛ گـە-رماوچوون؛ خۆشۆردن لە گـەرمـاو. (حمـام-کردن)
کولیچەگیا : [ناو] کولیچەگیواو؛ تـەشـی‌مـل؛ گەڵاکانی پانە و گوڵەکانی بەینابـەیـن لـەنـاو گەڵاکەیدان؛ بۆکەم ئیشتیایی باشە.(جنتیانا)
کۆلێڕ : فدـاندـفرد (کوولێڕ)؛ [ناو] وشـەیێکـی بیانییە واتا سـاردەوەکـەر؛ دووجـۆرە گـازی و ئاوی ئامیرێکی کارەباییە بۆ فێنک کردنـە-وەی ناوماڵ بەکاردێت. (کولیر)
کولێرەناسکە : [ناو،ت] کولێرە لە هـەویرێـک چێدەبێت کە لەجیاتی ئاو بەشیردەگیرێتەوە و ڕۆنیشی تێدەکەن. (نوعی‌گردە)
کۆلین : [چاوگە] کۆڵان؛ کـۆڵین؛ قـەکـۆلان؛ کۆڵیان؛ کۆڵاندن. (حفرکردن)
کوماچە : [ناو] شەپۆلی گەورەی سێڵاو کە لە بیچمی کوماجی سەربان بەرز دەبێتەوە؛ قـە-ڵپەزە. (موج‌سیلاب)
کۆمـار : لـە وشـەی کۆمـای مادییـەوە وەر گیراوە بەواتای کۆگا. جـەمـاوەری‌کـۆوەبـوو؛ (جمهور؛ جمعیت)
کومپووتە : [ناو] کۆمپووت؛ میوەی نیوە کوڵ لەشەربەتدا. (کمپوت)
کۆمڕ : [ئاوەڵناو] پشت‌کووڕ؛ پشت‌کۆم.(کوژ-پشت)
کومزەخ : [ناو] ئەشکەوت؛ ئەشکەفت؛ موغار. (غار)
کۆمـەوبـوون : (١) [چاوگـە،ت] کۆبوونـەوە؛ خڕبوونەوە لە دەوری یەک. (جمع‌شـدن)؛ (٢) نووشتانەوە؛ کووڕبوون. (خم‌شدن)چەمیانـەوە؛ کووڕبوون؛ چەمانەوە. (خم‌شدن)
کۆمیتـە : فـرد؛ فـد: [نـاو] لێژنـەی‌باڵـای لێکۆڵینەوە و ڕاگەیێنی؛ گوزارشتی بەرهەمی-کاری ئەنجامدراو. (کمیتە)
کۆمیتە١ : [ناو] لێژنەیێکی چەند کەسی‌کـە بەرپرسی کاروباری شـار یـان ڕێکخراوێکـی

ڕامیارییه. (کمیته)
کومیسیۆن : [ناو] مەجلیس‌گرتن بۆ ڕاگەیشتن بە کاروباری ڕێکخراوێ. (٢) مافی دەلالی موعامەلە. (١و٢ کمیسیون)
کوناودەر : کوناودیو؛ لەم سەر تا ئەوسەر کون؛ شەبەق تێکەوتوو؛ (تاطرف‌مقابل‌سوراخ)
کوند :[ناو] بایەقوش؛ بادەقوش؛باياکوش؛بوو؛ بووم؛ بووە؛ بووەتەقلە؛ بووەکەرە؛ کوندەبوو؛ کوندەبوویشی پێدە لێن.(جغد؛ بوف)
کوند : [ناو] چەند جۆر فڕندە لە ڕووانگەی فڕندەناسیەوە لە تۆرەمەی کوندن، (١)تاق-تاق‌کەرە، (مرغ‌حق). (٢)تاق تاق‌کەرەی بۆر، (مرغ‌حق‌جنوبی). (٣)کوندەپشیلە، (جغد - گوش‌دراز). (٤)کوندەڕۆماڵ، (جغدماهی‌خوار). (٥)کوندەزێڕە، (جغد)(٦) کوندی‌سپی کە زیاتر تایبەت بە وڵاتانی ساردەسێرە. (جغدسفید). (٧)کوندەشەخسەی خاڵخاڵ، (جغد-خالدار).(٨)کوندەقوتە، (جغدتالابی). (٩)کوندەگایانە، (جغدبزرگ طلایی). (١٠)کوندەشەخسە، (جغدکوچک).
کونداکۆر : [ناو،ت] کوندەکوێرە. (بوف‌کور)
کوندەکی : هەڵترووشکان؛ قەرەفیسکا ڕۆنیشتن؛ بەقنیچکانەوە دانیشتن. (روی-پانشتن)
کوندی‌شاخدار : [ناو،ت] کوندا شاخدار؛ کوندێ کە دووپەل وەک شاخ لەژوور چاویدا هەیە. (جغدشاخدار)
کۆنگرە : فرد.فد.اند. [ناو] کۆبوونەوەی ئەندامانی یەک یان چەند گرووپی هەڵبژاردەی دەوڵەتی یان ڕێکخراوی سەربەخۆ؛ وەک: کۆنگرەی جیهانیی دوکتۆرگەل یان کۆنگرەی جیهانیی ئاشتی. (کنگره)
کونەجەرگ : [ئاوەڵناو] وەڕەز؛ جارز؛ قەڵس؛ هەراسان؛ کونە جەرگ کردن : زۆربۆهێنان و قەڵس‌کردن. (فشارآوردن وعصبانی‌کردن)
کۆنەچەکمەڕەق : قەدیم دەوڵەمەندی لێکەوتوو؛ جاران دەسەلاتدار و چەکمە لەپا بووە و ئێستا نەدارە و لێکەوتووە. قدرت ومال ازدست‌داده)
کۆنەژن : (١)پیرێژن؛ ژنی بەساڵداچوو. (-پیرزن). (٢)ژنی‌پێشوو؛ ژنی‌تەلاق دراوێ کەسێک. (زن‌سابق)
کۆ نەکردن : [چاوگە،ت] نەترسان و سڵنەکردن و نەپرینگانەوە. (نترسیدن)؛ (٢کۆ نەکردن: کەڤنەکردن؛ (چاودەگێرم دیارنییە لەیلم، دیارەکۆنەی کردووە مەیلم): مەیلی کۆن‌کردووم. (کهنه‌کردن)
کۆنەڵانی : [ناو] (١) خەڵکی کۆنەڵان.(اهل-کونەڵان)؛(٢)جادووگەر؛ سیحرباز؛ (جادوگر)
کۆنەمێرد : [ناو،ت] شووی پێشووی ژن، یان مردبێت یان ژنەی تەڵاق دابێت. (همسر-سابق‌زن)
کووانی : [ناو] کووانوو؛ کووانگ؛ ئاوورگ. (اجاق)
کووپ : [ناو] دوو جۆر خاڵە لەپەڕەی پەڕانتۆدا لە بیچمی‌دڵ، کووپی‌سوور و کووپی ڕەش. (کوپ)
کووپەی‌تار : [ناو،ت] کاسەگەورەکەی تار؛ لە نەقارە گەورەترە و خەرەکی سیمەکان لەسەر پێستی کووپەی تاردادەنرێت. (کاسەتار)

کووفت : [ناو] سفلیس؛ پلەیێک بڤەترلە سووزاک. (سفلیس)
کووفتی‌کاری:[ناو،ت]سفلیسی کاری؛ وەک- جنێو دەوترێت لە جیاتی ژەحری‌مار. (کوفت-کاری)
کووفەکووف : [ناو،ت] هەناسەکردنە نێودە- ست بۆ گەرم بوونەوە لەسەرمای زۆردا؛ (ب) هەل لەرزین لەسەرمادا.(ازسرما لرزیدن‌وگرم-کردن‌دست‌بانفس)
کوولەکەسەرئاوی : [ناو،ت] کوولەکەدە- رۆیشی؛ کوولەکەیێکی بن‌خڕی مل‌باریکە بۆ مەلە فێربوون بەکەڵکە و بۆ جێگەی دانە- وێڵەیش دەبێت. (نوعی‌کدو)
کوولەکەشێتە : [ناو،ت] کوولەکەدێمی؛ جۆرێک کوولەکەی چووکەی کێوییەبۆ نە- خۆشینی شەکەرمز باشە. (کدوی‌صحرایی)
کوێربوونەوە : [چاوگە،ت](۱) ڕووخان یان پڕبوونەوەی گومانەی کارێز و کانی. (بستە-شدن‌راه‌آب‌کهریز)؛(۲) نەمانی شۆرەت و ناو و دەنگی ئیل‌وتەبار و فەوتان و نەمانیان؛ خانەدانێکی گەورەبوون ناویان کوێر بووەوە. (ازبین رفتن‌فامیل‌یانام آنها)؛ وێک‌هاتنەوەی کونی نەرمەی گوێ کە کونی‌دەکەن بۆ گۆشەوارە. (سوراخ‌جای‌گوشوارەبهم‌آمدن)+
کوێرکوێرانە : [ئاوەڵناو+ بەند] ئەنجامدانی هەرفرمانێک بێ‌سەرنجدان لە دروستی و نادروستی فرمانەکە؛ وەکوو کوێر (کورکورانه)+
کوێرکێش : دەسکێشی کوێر؛ ڕێنموونیکەری کوێر لە ڕێگە ڕۆیشتن‌دا. (عصاکش)

کوێرەکوێر : [بەند] وەک ڕۆیشتن بەڕێدا لە تاریکاییێکدا کە چاو هیچ نەبینێت. (کورمال-کورمال)
کوێستانی : [ئاوەڵناو+ ناو](۱)پەیوەندیدار بە کوێستانەوە؛ ئەوەی لە کوێستان دەژی. (مربوطبەکوهستان). (۲) جۆرێک‌گەنمە. (نوعی گندم)
کەبابی : [ئاوەڵناو] گۆشت یان ماسی یان هەر شت کە وەک کەباب برژابێت؛ هەر شت کەشیاو یان بابەتی کەباب و تایبەت بە کە- باب، دانرابێت بۆ ئەوەی بیکەن بە کەباب. (کبابی)
کەبابی‌پل : [ناو،ت] کەباب لە پلە گۆشت؛ کەبابی‌چنجە (جنچک) (کباب‌چنجه)
کەبابی‌لوول : [ناو،ت] کەبابی قیمە کە لە شیشی پانی دەدەن. (کەباب‌کوبیده)
کەبەرەزبرە : [ناو،ت] زبرەتەوەن؛ بەردەزبرە؛ بەردەزوورە. (سنگ‌سوهان)
کەبیسە : [ناو] ساڵێک کە ۳۶۶ ڕۆژە؛ و لە چوارساڵدا جارێک ساڵ کەبیسە دەبێت و ئەو ڕۆژە دەخرێتە سەر مانگی ڕەشەمە. (سال-کبیسه)
کەپچاندن : [چاوگە،ت]دوواندن؛ قسەلەگە- ڵکردن؛ وەقسەهێنان. (بحرف‌آوردن)
کەپچین : [چاوگە] دووان؛ قسەکردن؛ ئاخفتن. (حرف‌زدن)
کەپسوول : [ناو] ئەم وشەیە بیانییە؛ (۱) جۆرێک ئەزبە، جیگای گەردی دەرمان کە دەچێ بە ناویەکترینەدا و گەردەکە ڕادە- گرێت.(کپسول)؛ (۲) ئەزبە؛ کەپسوولی‌گاز. (-

کپسوول)
کەپەبێل : [ناو،ت] کەتەبێل؛ بێڵی کـۆنی دەم سوواو. (بیل کهنەوکارکردە)
کەتان : [نـاو] گیـامرۆژە؛ لـە لقـی ڕووشـاڵ ڕووشاڵی ئەوگیایە بەن و قوماشـی کـەتـانی دروست دەکەن. (کتان)
کەچە : [ناو] کرێش؛ بۆی هەیە کەچەڵی لە وشەی کەچە ڕاهاتبێ. (شورە)
کەچەک : [ناو] مێزەر؛ مـەنـدیل؛ پێچـی لـە سەربەستن. (دستار)
کەچەلباد : [ناو،ت] کوتەلبادی شـڕوکۆن. (-قطعەنمدکهنەوپارە)
کەدخوا : [ناو] کوێخا؛ قیخا؛ کەی‌خودا؛ کـەد بەتورکی واتا گوند؛ کوێخادێ. (کدخدا)
کەدکەر : [ناو،ت] کارکەر؛ کارەکەر. (کارگر)
کەدووانە : [ناو] کدووانە؛ کرمێکە لە بیچمی تووی کوولەکە، تەزبێح ئاسا بەدەم یەکـەوەن و لە ناو ڕیخۆڵەی مرۆڤدا دەژی. (کرم‌کدو)
کەڕاکە : [ناو] تەپڵی‌سەر؛ سەر؛ (ب) سەری-زل. (سر)
کەڕاهی : [ناو] کەڕێتی؛ ڕەوتـی کـەڕبـوون؛ بێگوێی. (کری)
کەرب : [ناو] تووڕەیی؛ قین. (عصبانیت)+
کەرباندن : [چاوگە،ت] تووڕەکردن؛ قین‌هەڵساندن؛ دنـەدان؛ هانـدان. (عصـبانی‌کـردن .تهیج‌کردن)+
کەربین : [چاوگە]تووڕە بوون؛ قین‌هـەڵسـان. (عصبانی‌شدن)
کەرپسە : [ناو] کەرپەسە؛ جۆرێک مارمیلکـە. (آفتاب‌پرست)
کەرتکردن :[چاوگە،ت] لەت‌کردن؛ بە دووبە-ش‌کردن؛ کوتکوتکردن. (دونیم‌کردن)
کەرت‌کەرت : [ئاوەڵناو] لـەت لـەت؛ کـوت کوت؛ بەش بەش؛ (تکە تکە)
کەرتۆر : [ناو،ت] تۆرانی نێرەکەر بۆماوەیێکی کورت و ماکەری بەتـەڵـەب بـەجێهێشـتن و دیسان گەڕانەوەی؛ بەتەوسەوە بـەکـەسـێک دەڵـێن لـە بـێ‌جـێ لـە شـتێک بتۆرێـت. (قهرکردن‌بیمورد)
کەرخ : [ناو] گەوز؛ ئەنـدازەی جارێـک داس یان مەڵەغان هێنان بە گیا یان گەنم و جـۆدا لـەکـاتی دوورینـەوەدا. (جـای‌یکبـارداس بکاربردن‌دردرو)
کەرخاندن : [چاوگە،ت] تێکدان؛ خراپکردن. (خراب‌کردن)
کەرخاو : [ناو] دێراو؛ کەردوو. (گراز)
کەرخەنـۆک : [نـاو] کـەرخنکێنـە؛ جۆرێـک گیایە. (نوعی‌گیاە)
کەرخی : [ناو] کەڵەک؛ لۆتکەی لە چەند مە شکە و تەختە چێبوو، بۆ پەڕینـەوە لـە چـۆم. (کلک)
کەرخین : [چاوگە، کەرخان ] بێزیـان؛ وەک: بێزران لـە خواردنێـک؛ لـە بـەرچاوکـەوتنـی خواردەمەنییێک. (ازچشم‌افتادن‌غذا)
کەردوکێش : [ناو،ت] بێلاسن ئاسـاییێکی زۆر پانە بە دوو تەنافەوە کەردووی پێ هەڵـدەدە-نەوە. (بیل‌گرازکنی)+
کەردەی : [چاوگە]کردن. (کردن)
کەرژیلە : [ناو] بارینی وردە بەفری پێش بـە-فربارین؛ پرووشە. (بارش‌برف‌دانەریز)

کەڕسوون : [ناو] تاوە. (ماهیتابە)
کەرسەلە : [ئاوەڵناو] ئاوارە؛ دەربەدەر. (آوارە)
کەرکاش : [ئاوەڵناو] نەسرەوت؛ ئۆقرەنەگر؛ بزۆز. (ناآرام)
کەرکاوی : [ناو،ت] کەراقی؛ کەڵک؛ دوو جۆرن کەڵکیسپی و کەڵکیبۆر، فڕندەییەکی گەورەی ماسی خۆرە. (پلیکان)
کەرکوڕگ : [ناو،ت] جاش؛ (ب)کەرکوڕگ؛ کوڕیکەر؛ وەک جوێن دەوترێت. (کرەخر)
کەرکوژ : [ناو،ت] کەربەنگ؛ هەرەبەنگ؛ گیاییێکە دووساڵە و ژەهراوییە و ماکی خەو- هێنەری تێدایە خواردنی دەبێتە هۆی نەمانی هەست،(سرکەر)ە. (بنگدانە)
کەرکە : [ناو] (باینجانی سوور)ی نەگەییو؛ تەماتەی کاڵ و شینی نەگەیشتوو. (گوجە فرنگینرسیدە)+
کەرگووان : ئاژاڵێکە گوانێکی وشک بووبێت. (حیوانیکەیکپستانشبیشیرباشد)
کەرگەدێوێ : [ناو،ت] وشترمر. (شترمرغ)
کەرگەس : [ناو] داڵە کەرخۆرە؛ سیسارگ؛ سیسارگە کەچەڵە. (کرکس)
کەرگەوز : [ناو،ت] ئەگەرکەرێک لەناو خۆڵدا خۆی بتلێنێتەوە کەرەگەلی دیکەیش هەرئە و کارە دەکەن؛ (ب) چاولێکەری. > کە- رمیز(چشم وهم چشمی)
کەرمیز : [ناو،ت] هەرکات لە کەرەگەلدا یە- کێکیان میزبکات زۆربەی ئەوانیتریش میزدەکەن؛ لەو ڕووەوە بۆ چاولێکەری ئەو وشە بەکاردێنن؛ چاولێکەری. (چشمهم- چشمی)
کەڕوکوێر : (۱)کەسێک کە نەبیسێت و نە- بینێت؛ (کروکور)؛ (۲ب)چاوودەم نەکراوە؛ هیچ نەدیتوو؛ دونیا نەدیتوو؛ نائاگا لەدونیا. (چشموگوشبستە)
کەڕۆڵە:[ناو] سەکوییێک کە لە پەنای دەرکە- ی ژوور دروست دەکرێت بۆ کەوش دانان. (سکویجاکفشی)
کەڕەتەی : مەڕی کەڕیلی سپیڕەنگ. (گوسفندسفیدگوشکوچک)
کەرەسی : [ناو] کەرەس؛ کاشەمە؛ کەرەوس؛ کەرەوز. (کرفس)
کەڕەشین : [ناو،ت] کەڕووەشینە کەڕەکیفە؛- کەڕوو؛ ماکێکی (ئانتیبایۆتیکی) لێ دەگیرێت کە دژی هوورگە. (کپک)
کەڕەفرۆ : [ناو،ت] کەڕە: ژەک؛ ژەک لەسەر ئاور دادەنێن هەتا دەگرسێت. (نوعیآغوز)
کەرەکەر : گەوجەگەوج. (احمقانە صحبتکردن)
کەڕەگۆشە [ناو]: بەری جەگەن؛ شتێکی تووکنە و لەقەدیمدا دەکرایە نێو گەچ بۆ گە- چکاریی دیوار کەدەبووە هۆی نە قەڵە شانی گەچی دیوار. (کرکگلنی)+
کەرەگەل : [کۆی کەر] ڕەمەیکەر؛ هەرە- گەل؛ (ب) بە گرووپێکی ناحاڵی دەڵێن. (رمە- خران)
کەرهەنگ:[ناو]جۆرێک هەنگی بێهەنگوینە لە قەڵەشی دارەکۆندا دەژی.(نوعیزنبور)
کەڕێ : [ناو] کەڕوو؛ کەڕەکیفە. (کپک)
کەریڕێژگاو : کەرێک کە هەر زەڕینی هە- بێت و پەڕینی نەبێت؛ پیاوی بێکرداری

سوێرقسەی پێدە شوبهێنن(لاف زن‌بی‌عمل)
کەزیکوور : [ئاوەڵناو] بێ‌بەخت؛ بێ‌شانس؛ بەدبەخت؛ تەغەر بۆ ژن دەگوترێت. (زن-بدبخت)
کەژ : [ناو] کەش؛ بەنێکی کێشداره لەجیر؛ هەر شت کە کێشی‌بێت. (کش)+
کەژوکۆ : [ناو،ت] کێو و سارا؛ دەشت وکێو؛ بیابان وکێو. (دشت‌وصحرا)
کەسایەتی : [ناو] خوو وخده و ڕەوشتی هەر-کەس کەدەبێتە هۆی بایەخ دار بوون لە کۆمەڵدا یان بێ‌بایەخ بوونی. (شخصیت)+
کەستی : ناوی ناوچەی سەرشیو نزیکی سە-قز کە وشەیێکی (پەهلەوی و ئارامییە)کە بە پشتوێنی زەرد ڕەنگی مووساییەکانیان گوتووه کە لە ناوچەی کەستی(سەرشیو)دروست دە-کرا. (نام‌قدیم‌منطقه‌سرشیو)
کەسدار : [ئاوەڵناو] پشتیواندار؛ خاوەنی قەوم وخێش. (دارای‌قوم‌وکس)
کەسری‌شان :ئەم وشەیە بیانییە، بەڵام لەسەر زمانی جەماوەریشە؛ ئەوەی دەبێتە هۆی شان و شکۆکەم‌بوون؛ هۆی‌کەم‌بوونەوەی کە-سایەتی لە نێوجەماوەردا. (کسرشان)
کەسکوون : [ئاوەڵناو] دەردونەخۆشینی تیژوتوند و بقە؛ ئازارەکەم کەسکوونە دەردە-کەم توولانییە «فوڵکوڕ» (خطرناک؛مرض سخت)+
کەس‌نەبینێ : گۆڕینەوەی شت بە مەرجی چاو پێنەکەوتن. (معاوضه‌بدون‌دیدن)
کەس‌نەکردوو : (۱) [ئاوەڵناو] کاریکی دژوار کە هیچکەس پێی نەکرێت؛ (کاریکه‌ازعهده-کسی‌برنیاید)؛ (۲)کارێک کە تا ئەوکاتە کە-سێک نەیکردبێت. (کاری‌کەسی‌انجام‌نداده-باشد)
کەس‌نەکێل : [ئاوەڵناو] مەزرای بێ داهات زەوینێک کەشیاوی کێڵان نەبێت. (زمین‌بی-حاصل)
کەسەین : مەینی خوێن. (دلمه‌شدن‌خون)
کەشاو : [ناو] (۱)کەشەو؛ چەکمەجە؛ کەشە-وی‌مێز. (کشو). (۲) ئاو داشتنی زەوی بۆ نەرم بوونەوە و ئاسان کێڵران. (آبیاری زمین‌برای-نرم‌شدن‌وشخم‌زدن)
کەشتی‌بادەوان‌دار : [ناو،ت] پاپۆڕێک کە بە بادەوان دەڕوات. (کشتی‌بادبانی)
کەشتی‌شکێن : [ناو،ت+ ناو، بک] جۆرێک پاپۆڕی قاییمی شەڕە بۆ تێک‌شکاندنی پاپۆڕی دوژمن. (ناوشکن)
کەشکۆڵ : [ناو] داری‌نارگیل؛ دەڵێن ڕۆنی بەرەکەی بەرگری لە وەرینی مووی سەر دە-کا. (نارگیل)+
کەشکەڕەشە : [ناو،ت] قەرەقورت؛ لە کوڵاندنی ئاوی ماست دروست دەبێت. (قراقوروت)
کەشکەژەنی : [ناو] کەشکە زەنگۆڵ؛ کە شکەژنۆ؛ کڵاوەی چۆک؛ کڵاوەی ئەژنو. (کاسەزانو)
کەشکەسوو : [ناو،ت] سووتکە کەشک؛ کشکی ساوراو کە نەختێکی دەمێنێ وەک سووتکەسابوون. (ماندەکشک ساییده‌شده)
کەشەن : [ئاوەڵناو] هیلاک و ماندوو؛ شەکە-ت. (خسته)

کەشەنی : [ناو] هیلاکی؛ ماندوویی؛ شەکە-تی. (خستگی)
کەشەوان : [ناو] کەژوان؛ شاخەوان؛ کۆگەرد؛ کەژڤان. (کوهنورد)
کەفسوول: > کەپسوول
کەف‌وکوڵ‌نیشتنەوە : [چاوگە،ت] لەکەف-وکوڵ کەوتن؛ (ب) ساردبوونەوە و دڵساردبوونەوە لە ئەنجامی کارێک؛ لە جۆش و خورۆش کەوتن. (ازشوروشوق‌افتادن)
کەڤچک : [ناو] کەوچک؛ کەڤچی. (قاشق)
کەڤلاندن : [چاوگە،ت]کەڤل کرن؛ کەوڵ-کردن. (پوست‌کندن‌لاشە)
کەڤیس : مەڕێک کە سەری زەرد بێت. (گوسفندی‌کەسرش‌زردباشد)
کەڵاس : [ناو] لاشەی مندارەوەبوو؛ کەلاکی مردارەوە بوو. (لاشەمردار)
کەڵان : فد؛ [ئاوەڵناو] بۆی هەیە لە کوردییەوە چوبێتە نێوفارسی؛ چوونکا کەڵ لە زمانی کوردیدا ئورناک (سەمبول)ی کەڵەپیاو یان کەڵانە : وەک کەڵان، کە هاوتای پیاوانە وگەورەییە؛ بۆ موعامەلەی گەورە لە فارسی و کوردیشدا بەکاردێت. (کلان)
کەلبەتەین : [ناو] گاز؛ گازی بزمار هەڵکێشان.جاران ددانیان پێدەکێشا. وەک دوو کەلپە. (گاز)
کەلپتاندن : [چاوگە،ت] تۆخڵ لێکردنەوە. (ازپوستەدرآوردن)
کەلپورەی : >داماگ
کەلپیچ : [ناو] کەرپیچ؛ کەرپوچ؛ (کەرپیچ)بە-تورکی واتا خشت لە کوردیشدا واتای خشت-دەدا. (خشت)
کەڵت : [ناو] جۆرێک‌ڕاخەر. (نوعی‌فرش)
کەلچەری : [ناو] کەڵچەری؛ خویندەواری؛ ڕۆشنبیری؛ پسپۆڕی مێژوو؛ لە(کاڵچیر)ی بیانییەوە وەرگیراوە واتا(کەلتوور). کە-لتووری.(روشن‌فکری)
کەڵس : [ناو] بەڵغێ کە بەشێوەی بەرد لە بێخی‌ددان یان بنی سەماوەر و شتی‌تردا پێکدێ. (جرم)
کەلشۆک : [ئاوەڵناو] شاڕلاتان؛ شەڕلاتان؛ شەڕفرۆش؛ شەڕانی. (شارلاتان)
کەلک : [ناو] کەڵک؛ موفا؛ فایدە؛ قازانج. (فاید)
کەلکدار : [ئاوەڵناو] بەکەڵک؛ بەمونا؛ بکارهاتوو؛ بەقازانج. (فایدەدار؛ بدردبخور)
کەلک‌گری : [ناو] ڕەوتی بەکەڵک خواردن؛ بە کارهاتن. (بدردبخوری)
کەڵەپووک : [ئاوەڵناو] مێشک‌خاڵی؛ نەزان؛ بێ‌ئاوەز؛ (کلەپوک)
کەڵەگەرم‌بوون : (ب) سەرخۆش بوون؛ مە-ستبوون. (کلەگرم‌شدن)
کەڵەمەلەق : [ناو] لەڵەمحەلەق؛ سەرمەو قولانج؛ سەرمە و قولات؛ لە فارسیدا بە واتای بەراوەژووە. (کلەمعلق)
کەڵەوشک : [ئاوەڵناو] مێشک‌وشک؛ کۆنە-پەرەست؛ مێشک‌کۆن؛ دژی نوێخواز و ڕۆشنبیر. (مرتجع)
کەڵەوشکی [ناو] مێشک‌وشکی؛ کۆنەپەرە-ستی؛ڕەوتی بیرکردنەوە لە بواری ڕابوردوودا؛ دژایەتی لەگەڵ نەوژەنی و نوێکاری و

ڕۆشنبیریدا. (ارتجاع)
کەلمژاندن : [چاوگە،ت]کەلاندن؛ کوڵاندن؛ وەکوڵ هێنانیتراو؛ وەجۆش‌هێنان. (جوشاندن؛ پختن)
کەلمژین : [چاوگە،ت]کوڵان؛ جۆشیان؛ کوڵیان؛ کەلیان. (جوشیدن)
کەڵمێش : [ناو] مێشەحوڵکە؛ مێشەگایانە؛ جۆرێک‌مێشی هەرە گەورەیە. (نوعی‌مگس‌درشت)
کەلنەوەن : [ئاوەڵناو] غەوارە؛ بێگانە؛ ئاوارە؛ دەربەدەر. (آوارە)
کەلووەخۆرە : [ناو] هارپە؛ کرمێکە مێملی کەلووی نۆکە. (آفت‌مزرعه‌نخود)
کەلووەڕێژ:[ناو،ت]نۆک،نیسک و دانەوێڵەی‌تر کە دەرەنگ بیدوورنەوە؛ بەکەلووەکەیەوە دەڕژێتە سەرعەرز. (ریختن نیامک‌بنش‌که‌دیرچیده‌شوند)
کەڵوەڕێژ : [ناو] سەرڕێژ؛ لێواولێوپڕ؛ لیپاولیپ؛ قەڵا قەڵا پڕ. (لبریز؛ مالامال‌پر)
کەلهاندن : [چاوگە]کوڵاندن؛ جۆشاندن. (جوشاندن)
کەلەرمقومری : [ناو،ت] داشکەلەرم؛ داشکەلەم. (کلم‌قمری)
کەڵەشاخ : [ناو،ت] شاخی ناوهەڵوڵی کەڵگامێش و گا کەچەورەسانی دروێنە وانانی تێدەکەن.(جای‌روغن‌تیزکردن‌داس)
کەلەشە: کێشەکێش؛ بەزەحمەت؛ دەردیسەر. (زحمت‌ودردسر)
کەڵەشێرباز : [ناو] کەسێک کە کەڵەشێر ڕادەگرێت و حەزی لە شەڕە کەڵەشێرە. (خروس‌باز)
کەڵەکەبڕێ : [ناو] جۆرێک گەمەی منداڵانە؛ بەردێک لە ناو کۆگا خوڵێکدا دەشارنەوە و یەک منداڵ کە خاوەندی کۆگا کەیە بەشەق لە منداڵەکانی‌دی هەڵدەدا و بەرگری دەکات لە ڕووخاندنی کۆگاکە لەلایەن هێرش‌کەرانەوە. (نوعی‌بازی‌کودکان)
کەلەمگوڵ : [ناو،ت] گوڵ‌کەلەرم؛ بۆ دروست‌کردنی ترشییات کەڵکی هەیە. (گل‌کلم)
کەڵەوان : [ناو] لەقەدیمدا کە ئەڕابەی گەڵی هەبوو بەکەسێکیان دەگوت کە ئەڕابەی کەڵی باژوێ. (رانندەاربە)+
کەڵەوەشکێنی : [ناو] کەڵەوەکێشی؛ سەرپێچی؛ ملهوڕی؛ یاخیگەری. (یاغیگری)
کەلهین : [چاوگە]کوڵین؛ جۆشین؛ وەکوڵ‌هاتن. (جوشیدن)
کەلی : [ناو، بەر] کوڵاو؛ چێشی نەکەلی: چێشتی نەکوڵاو. (پخته)
کەلیان : [چاوگە]کوڵان؛ وەکوڵ‌هاتن. (پختن؛ جوشیدن)
کەلیز : [ناو] بەلەچەکی کوولەکە. (قاچ‌کدوی‌خشک‌شده)
کەڵێشە : [ناو] کڵیشە؛ لەش. (جسم‌جاندار)
کەم : [پێشگر] بە واتای کەمێک یان (بێ)؛ وەک: کەم‌ئاوەز؛ کەم‌ئاو؛ کەمتەرخەم؛ کەمایەخ. (پیوازە، کم)
کەماچ : [ئاوەڵناو] زبر؛ ڕووش؛ ناساف؛ گرنج‌گرنج؛ زڤر. (زبر)
کەماسی : [ناو] کەمایەتی؛ کەموکووڕی؛

کێماسی؛ ناتەواوی. (کمبود)
کەماندار : [ناو] کەواندار؛ کەسێک کە خاوە-
نی تیروکەوانە؛ (ب) تیرهاوێژی کەوان.
(کماندار)
کەمانە : کەوانە؛ (۱) [ناو] نیوە جەغزی
ووک؛ (نیمداره‌کوچک)؛ (۲) لاتراسکە؛
لاڕێکردنی بەردی هاوێژراو یان گوللە کە لە
شتی ڕەق بکەوێت و لاتراسکە بکات؛
(کمانه)؛ (۳) [ناو] ئاڕشەی ویلوون و کە-
مانجە. (کمان)
کەماوڵاخ : [ناو] زەردەکەما؛ بە شیلە وشکەوە
بووەکەی دەڵێن(ئانغووزە)، دژی کۆخەیە.
(کمای‌اصلی)
کەماهی : >کەماسی.
کەمبوون : (۱) میوانەکان زۆر نەبوون، کەم-
بوون ؛ (کم‌بودند)؛ (۲) هاتنە کەمایەسی؛ کەم
بوونەوە؛ کەمەوبوون؛ هاتووەتە کەمبوون
خەریکە تەواو دەبێت؛ (کم‌شدن)؛ (۳)حالەتی
کەمی؛ کەمبوونی بەش؛ (کم بودن)؛(۴) کە-
م بووگن؛ کەمیان کردووە، نیوەیان لە نێو
چوون.(چووگن). (کم‌شده‌اند)
کەمتر : (۱) [ئاوەڵناو] خوارتر؛ خلە لە بلە
کەمتر نییە «فۆلکلۆر» (۲) [ئاوەڵناو] دژی زیاتر؛
من پارەم لە تۆ کەمتر هەیە؛ (۳)[بەند] بەهە-
ڵکەوت؛ جارجار؛ کەمجار؛ کەمتر دەتبینم.
(۱و۲و۳کمتر)
کەمتۆلیە : [ناو] کەمتۆڵی؛ کلینچکە؛ دووایین
مۆرەکانی مۆغەرەی پشت. (دنبلیچه)
کەمتین : (۱)کەمگەرم؛ کەمتاو؛ بێتین.
(کم‌حرارت)؛ (۲)[ئاوەڵناو]لاواز؛ بێهێز.
(ناتوان)+
کەمخێر : [ئاوەڵناو] بێداهات؛ کەمبارە؛ بێ-
سووت. (کم‌بهره)
کەمراندن : [چاوگە،ت] سوورکردنەوە؛ وەک
سوورکردنەوەی خۆراک لە ناو تاوەدا. (سرخ-
کردن)
کەمشیر : ئەبرەش؛ عەبرەش؛ مێوینەیێ کە
شیری کەم بێت. (کم‌شیر)
کەمفرۆش: [ئاوەڵناو] ترازووسووک؛کەسێک
کە شتی فرۆشراو بە تەواوی بە-
کڕیارنادا(کمفروش)
کەمکەم : [بەند]تۆزە تۆزە؛وردەوردە؛ نەختە-
نەختە؛ کەمکەمە؛ هێواش هێواش. (کم-
کمک)
کەمکەمەک : [بەند] تۆزەتۆزە؛ وردەوردە؛ لە-
سەرەخۆ؛ بەکاوەخۆ. (کم‌کمک)
کەمواردەی : [چاوگە،ت]کەمخواردن. (کم-
خوردن)
کەموکەسری : [ناو] کەموکوڕی؛ کە-
موکووڕی؛ ناتەواوی. (کم‌وکسری)
کەموونی : [ناو] کەمخوێنی؛ کەمخێنی. (کم-
خونی)
کەموەر: (۱) [ئاوەڵناو] کەم بەر؛ تەسک؛
(باریکو غیروسیع)؛ (۲) کەمخۆر؛(کە-
مخوراک)؛ (۳) کەمبەر؛ دارێک کە بەری
کەمبێت. (کم‌بهره)
کەمەچ : [ناو] دیاری؛ نیشانە؛ عەلامەت.
(نشانه؛ علامت)
کەمەچکردن : [چاوگە،ت] دیاریکردن؛
پیشان‌دانان بۆ ناسینەوە. (علامتگذاری‌کردن)

کەمەرباریک : [ئاوەڵناو] ناف‌تەنگ‌زراف؛ (ب) تیشکەڵە و قەوباریک؛ ناوقەد باریک (کمرباریک)

کەمەربەس : [ناو] پشتوێن؛ (شال‌کمر)

کەمەربەستن : [چاوگە،ت](١)پشتوێن بە ستنەوە؛ (شال‌بەکمربستن)؛ (٢ب) ئامادە - بوون بۆ خزمەت یان ئەنجامی‌کارێک. (کمر بستن)

کەمەربەسە : (ب)کەمەربەستە؛ ئامادەی خزمەت. (آمادەخدمت)

کەمەربەندی‌هێمنی: کەژو ئاساییکە لە سە- یارەدا کە سەرێکی بەسەیارەوە لکاوە و سە- رەکەی تریشی سەرسینگ و کەمەری دانیشتووی نێو سەیارە دەگرێت و دەبەستری بەپاڵ سەندەڵیەوە. (کمربندایمنی)

کەمەرەشل : پشتوێن شل‌وەل؛ (ب) ناوی گۆرانییێکی کوردیە. (کسی‌کەشالش‌راشل‌می- بندد)

کەمەوکردن : [چاوگە،ت]کەم‌کردنەوە. (کم- کردن؛کاهش دادن)

کەنارخستن : [چاوگە،ت] خستنەلاوە؛ (ب) پاشەکەوت‌کردن و لەخەرج گێڕانەوە؛ وە- لانان. (کنار گذاشتن؛ پس‌انداز)

کەناردەریا : [ناو] لچ‌دەریا؛ بەستێنی دەریا؛ قەراخ‌دەریا؛ روخی زەریا. (کناردریا)

کەناوەسمە : [ناو] کەندەسمە؛ ڕەنگ‌ڕەژە؛ مێش‌خۆرە؛ هەنگ‌خۆرە؛ لەبەندەن و کەندە- ڵان و کونی تاشە بەردان هێلانە سازدەکا و سێ جۆرن، (١)کەندەسمەی ئاسایی، (٢) کە- ندەسمەی چووک، (٣) کەندەسمەی گەردن قاوەیی. (١)زنبورخور. (٢)زنبورخورکوچک. (٣)زنبورخورگردن‌قهویی)

کەندوکۆسپ: [ئاوەڵناو] کەندولەند؛زەوینی بەرز و نزم یان پڕکوڵۆ و ناساف.(زمین- ناهموار)

کەندولەند : [ئاوەڵناو] بڵیندونەوی؛ کە- ندوکوسپ. (پست‌وبلند)

کەنگرەخاتوونە : [ناو،ت] کەنگرێکی لاسک- درێژ و ناسکە. (نوعی‌لنگرمرغوب)

کەنگرەکەرانە : [ناو،ت] کەرتەشی؛ شە- کروک؛ دڕکەگورزە؛ بۆ زۆربوونی شەکری خوێن بەکەڵکە(گیاەشکرتیغال) >کەرتەشی

کەنگرەماسی : [ناو،ت] کەنگری لە هێلکە - وەردراو کە لە ناو ڕۆندا سوورەوە بووبێت. (لنگروتخم‌مرغ‌سرخ‌شدە)

کەننەڵان : [ناو] ئاودڕ؛ ئاودڕکەی گەورە؛ کەندەڵال. (آبکندبزرگ)

کەنۆلان : کۆندەڵان؛ گوندێکە سەربەشاری سەقز. (اسم‌دهی‌است)

کەنەکاری : [ناو] کەندەکاری. (کندەکاری)

کەوابوو : [وتەی شەرتی] هەرگاوایە؛ کەواتە؛ کەواسە؛ کەوایە. (اگراینطوراست)

کەواژ : [ناو] هیربار؛ دەفری‌گڵین. (ظرف- سفالی)

کەواغ : [ناو، بک] هەوڕگەر. (سفالگری)

کەوانگۆشە : [ناو] شتێکە وەک دووکەوان و- ەک [ ] کەچەندکەوان دەگرێتەخۆ. (کروشە)

کەوانی‌ڕۆستەم : >کۆڵکە زێڕینە. (قوس‌و- قزح)

کەواوخانە : [ناو،ت] کەبابخانە. (دکان کبابی)

کەوتنەخوار : بەر بوونەوە لە سەرەوە بۆخوارەوە؛ لە ئەسپ کەوتنەخوار؛ خلۆر بوونەوە؛ وەرسیان؛ گرێل بوونەوە. (پایین- افتادن.بپایین‌غلطیدن)
کەوتنەدڵ : (١)کەفتنەدڵ؛ بەدڵاهاتن؛ (بدل- برات‌شدن)؛ (٢) پەسەندکردن؛ بەدڵبوون. (پسندکردن)
کەوتەی : [چاوگە]کەوتن. (افتادن)
کەوتەیی : [ناو] نەخۆشینی ئەسپەک؛ لە ئەسپێی سپییەوە مرۆڤ تووشی دەبێت؛ (تیفوس)؛لە ئەسپێی ڕەش(ئەسپێی‌سەر)ەوە مرۆڤ نایگرێت.
کەوجووت : [ناو،ت] ڕاوەکەوی ئاخری خاکەلێوە کە لەو کاتەدا کەو خەریکی جووتگرتنن. (شکارکبک‌درآخرفروردین)
کەوخۆر : [ناو] دەنکی هەرە وردی تریێ لە - ناو بۆلێ ترێدا کە لە پێش دەنکە گەورەکاندا دەگات. (دانەهای‌زیرمیان خوشەانگور)
کەوشەدارینە : [ناو] تەقتەقیلە؛ کەوشی سەرپایی لە تەختەدار.چەکچەکیلە . (دمپایی- چوبی)
کەوکەو : [ناو] کەوکەب؛ گوڵێکی جوانی پڕپەڕە گەڵاکەی کورکدار و پانە ، گەڵاکەی دەکوڵێنن بۆ شۆردنی برین. (کوکب)
کەوکەوە : [ناو] (١) هەوهەوە و هەراوهوریای جەماوەر بە بۆنەی هاتنی‌کەسێکی ڕێزدارەوە؛ (٢) گوپاڵێکی تایبەت بە سوڵتان لە قەدیمدا؛ (٣) شکۆ و جەلال و تەمتەراق و تەنتەنە. (١و٢و٣کبکبەودبدبە)
کەوگێز : [ناو] کەوچکی هەرەگەورە. (قاشق- بزرگ)
کەوڵ : [ناو] پێستەی ئاژاڵ بەڵام لەزۆر ناوچە بە سفرە دەوترێت چوونکا لە پێشدا سفرە لە کەوڵ‌بووە. (سفرە)
کەوڵەکۆن : [ناو،ت] بەتەوسەوە بەمرۆڤی زۆرهانی قڵخەقڵخ‌کەر دەڵێن. (کنایی- ازپیرازکارافتادە)
کەوڵەگیا : >شۆت‌گرسێن
کەولێ‌نان : [ناو،ت] (١) سفرەی‌نان لەسەر خواردن؛ (٢) قوماشێکە لەقەراخ تە نوور دایدەخەن و گونکی لەسەر دادەنین. (١و ٢سفرەنان)
کەوەرگ : [ناو] کەوەر؛ کاراد؛ جۆرێک سەوزەواتی تام تیژە. (ترە)
کەوەزەن : [ناو] دووبرا؛ دووبرالە؛ هەڵۆی- کاوان، هەڵۆیێکی‌گەورەیە تا ٧٠ سانتیمیتر باڵایەتی ڕاوی کەروێشک و باڵندە(تەغەر کەو) دەکا. (نوعی عقاب)
کەوەگیا : [ناو] خوم؛ وەسمەگیا؛ نیل؛ گیاییێکە بۆ ڕەنگ‌کردنی موو بەکاردەبرێ. (وسمە؛ نیل)
کەوەموورگ : [ناو،ت] مووروە شینە. (خر- مهرە)
کەوێل : [ناو] چارداخی نێو بێستان و باخ؛ کولیت؛ کۆخ. (کوخ؛کومە)
کەیبانوو : [ناو]کابان؛ کەیوانوو؛ ژنی‌کە سەرپەشتی ماڵ‌دەکا؛ ژنی بەرماڵ؛ بەرماڵی. (بانوی‌خانەدار)
کەیبانوو : [ئاوەڵناو] کابانی بە مشوور و کارامە لە بەڕێوە بردنی ئەرکی ماڵداریدا(خانەدار)
کەیخا : [ناو] قێخا؛ کەیخوا؛ کوێخا؛ کۆخا. (کدخدا)
کەیخوسرەو : (کەی : گەورە ، مەزن. و

خوسرەو: ناودار ) گەورە و ناودار. (ناوی شایێکی ساسانییە)(نامداربزرگ؛ نام یکی از شاهان ساسانی)
کەیکیف : [ناو] کەیکوف؛ کێکف؛ سەختە- دارێکی نەخش‌جوانە بۆ دروستکردنی کەرە- ستەی ڕازێنەر لە کاری خەڕاتی و نەجارپیدا بەکەڵکە، گەڵاکەی دژی زەردووییە. (کیکف؛ کرکف)
کەیلان : ناوەبۆژن؛ ژنی جوان و ڕێک‌وپێک؛ تەرڵان؛ خۆش بەژن‌وباڵا. (زن‌بلندقامت‌زیبا)
کەیلەکۆن : [ناو] کەلاوەکۆن؛ خانووبەرەی لەمێژ ڕووخاو و تێک تەپیو. (خرابەقدیمی)
کەین‌وبەین : [ناو] سەروسڕ؛ قەراروبڕیەی پەنامەکی. (سروسر)
کەیوان : ناوەبۆپیاوان. (نام‌مردانە)+
کیاسەی : [چاوگە،ت]کیاستەی؛ ناردن؛ هە- ناردن. (فرستادن)
کیانای : [چاوگە،ت] کیاسەی؛ ناردن؛ کیاندن. (فرستادن)
کیاندن : [چاوگە] هەناردن؛ ناردن؛ شاندن. (فرستادن)
کیبەرە : [ناو] کیە؛ نەقم؛ نەغمە؛ کاناڵ؛ بوودڕ. (کانال؛ مجرا)
کێچ‌کەوتنەکەوڵ : ئۆقرە لێبڕان و لەزکردن بۆ ئەنجامی‌کارێک؛ شڵەژان. (قرارنداشتن- وعجلەکردن)
کێرەوڵ : [ناو] پێستی شۆڕەوەبووی ژێرسکی گا کە میزی گا لەویوە دەچۆڕێتە خوارەوە. (پوست‌آویزان‌زیرشکم‌گاو)
کیسەکێشان : [چاوگە،ت] لە گەرماو بە - کیسە خۆ شتن؛ (کیسەکشیدن)؛ (٢ب) ماستاوکردن و ڕیایی‌کردن. (تملق‌کردن)
کێش : [ناو] هێزی ڕاکێشان و ڕۆیشتن؛ سە- یارەکە نامیزانە کێشی‌نییە. (کشش)
کێشە : [ناو] گیروگرفتی؛ گرفتاری؛ دەمەقاڵە؛ شەڕەقسە؛ شەڕ (گرفتاری.نزاع‌لفظی)+
کێل‌گەردن : [ئاوەڵناو] (ب) ژنی‌گەردن‌بەرز. (زن‌گردن‌بلند
کیلۆمیتری‌چوارگوش : [ناو،ت] بەرانبەر بە یەکملیۆن میتری چوارگوش. (کیلومتر مربع)
کیلە : [ناو] عەیارەیێکە بۆ پێوانی دەغل بەرا- نبەر بە ١٦ کیلۆ. (کیل)
کێم : (١) کەم؛ دژی زۆر. (کم)؛ (٢) چەکە- سم؛ من‌کێم : چ‌کەسم. (کی‌هستم)؛ (٣) کیم؛ ئاداو؛ زووخاوی‌برین. (چرک‌زخم)
کێمخیتە : [ناو] سپوس؛ کەپەک؛ پێستی‌گە- نم. (سبوس)
کێم‌وکیاسی : [ناو] کەم‌وکەسری؛ کەم- وکورتی؛ کەم‌وکووڕی. (کم‌وکسری)
کیمۆنۆ : فرد.ژاپون‌د.فد. [ناو] کراسی درێژی قۆڵ‌فش کە لەپێشەوە وەک باڵتە بەسەریە- کدا دێتەوە و بە کەمەرەیێک قاییم دەکرێت. (کیمونو)
کێوپارە : [ئاوەڵناو] ناوچەی کوێستانی. (جای‌کوهستانی)
کێوڵکانێ : [ناو] کێبەرکێ؛ کێبرکێ .(مسابقە
کیوی : [ناو] بەری‌داری‌کیوی؛ کە میوەیێکە هێلکە ئاسا و تووکن و ڕەنگ قاوەیی، تامیکی مزری هەیە و دەخورێت. و تاڕادە- یێکی زۆر ویتامینی(سی)ی هەیە. (کیوی)
کێوی‌ئاورپژێن : [ناو،ت] کێو ئایر پژگنای. (کوەآتشفشان)
کێها : کامە؛ کام؛ کێژان؛ کامەتا؛ کیشک. (کدام؛ کدامین)
کێهایسان :کامەیان؛ کامیان؛ کێهەیان. (کدامشان)

# گ

گ : کورتکراوەی گشت؛ هەموو؛ سوپاسی گلایێکتان دەکەم: سوپاسی هەمووتان دە-کەم. (همگی)

گ: [پاشگر] لە هەندێ زاراوەدا نیشانەی بە-رکارە وەک مردگ، سووتاگ، خواردگیە، بردگیە

گابـاردین : [ناو] گاواردین؛ جۆرێک فارسوونیای ئینگلیزی زۆر بە ناویە و باشە. (گاباردین)

گابـازی : [ناو] دابێکی کۆنی ئیسپانیایە، مرۆڤێکی گاباز لە مەیدانێکدا لەگەڵ گایێک شەڕدەکات و زیاتر گاکە شکست دێنی و دەکوژرێت و جاریش هەیە گابازەکە کوڵەوار دەبێت یان دەکوژرێت. (گاوبازی)

گابژار : [ناو] بژاری بەرد لە کاتی جووتکردندا، کە لە پاش هێلی گاسنەوە بەردبژێر دەکرێت. (جمع کردن سنگ درشیار شخم)

گابەدەنگ نەڕۆیشتن : بێبایەخ بوونی فرمان؛ (ب) جواب نەدانەوە. (اجرانکردن دستور)

گابەردان : کاتی لارەسێبەری ئێوارێ کە گای جووت و ڕەشەوڵاغی گێرە بەردەدەن بۆ لەوەڕ. (درعصربازکردن یوغ گردن گاوخرمنکوب)

گابێنان: جووت بەستن؛ نیر لە سەرملی گا بەستن بۆ جووت؛ گاگرێدان بۆ جووت. (یوغ-بستن بگردن گاو)

گاترمە : [ناو] کەمەربەند؛ کەمەربەندی زێڕ و زێو نیشان. (کمربندطلایانقرەنشان)

گاح : گاوان. (چوپان گلەگاو)

گاحی : [ناو]گاوانی. (چوپانی گاوها)

گاخۆر : هەر شت کە گا بیخوات ؛ هەر شت-کە گا دەخوات؛ (ب) زۆرخۆر. (پیرخور)

گاڕان گۆلکانی : [ناو] (ب) بێسەرەوبەرەیی؛ هەرکەس بە کەیفی خۆ؛ بێدەستووری. (بی-نظمی؛ بی قانونی)

گارکەگارک : [دەنگەناو] گارەگار؛ خوێندنی-مریشک لە کاتی هێلکەکردندا. (کراخ)

گارگاە : [ناو] مۆغەرەی پشت؛ بڕبڕەی پشت؛ گازراکە. (ستون فقرات)

گارمۆن : روس د؛ فـد؛ تـد: ئامێرێکی مۆسیقایە؛ گەڕەمەشکە. (گارمۆن؛ آکاردئون)

گارووس : دێمیلە. (گاورس)

گارە : [ناو]کێو؛ شاخ. (کوە)

گاڕەش : [ناو]گایێ کە ڕەنگی ڕەشە؛ (ب) ڕ-ەشەوڵاخ.( ب) گا و مانگا (گاوسیاە؛گاو)

گاریس : [ئاوەڵناو] چەپەڵ؛ سووک و چرووک؛ پەست؛ خراپ؛ ڕووڕەش. (ناپاک؛ پست)

گاریسۆک : [ناو] تەرزەی دەنگ گەورە. (تگرگ دانەدرشت)

گاریە : [ناو] گاری؛ ئارەبانە. (گاری)

گازاندە : گازندە؛ گلەیی. (گلە)

گازدار : هەرچی کە گازیهەبێت؛ زیاتر بۆ نۆشابەیێک بەکاردەبرێت کە گازی هـەبێـت؛ وەکپێپسی و سەودا. (گازدار)
گازرە : [نـاو] ئـەسـتووری؛ قیلـەت؛ بارسـتا. (ضخامت)
گازگر : [ئاوەڵناو] گـەزۆک؛ ئـەوەی گـازدە-گرێت. (گازگیر)
گازگرتوو : [ناو،بەر] ڕەوتی خنکاو بـە گـازی ژاراوی. (گازگرفتە)
گازمە : خاوشکاندنیگا لە ئەوەڵیبـەهـاردا و ئامادەکردنیان بۆ شێوبڕین بە دوو سـێ هێـل جووت کردن؛ لەبەرئەوە بە جەمام نەکـەون. (آمادەکردنگاوبرایشخمزدن)
گازمە : تد: بـەتـورکی(واتاهـەڵکـەن). [نـاو] قوڵینگ؛ پاچ؛ زەنگـن؛ کوڵـەک؛ کولـەنـگ. (کلنگ)
گازندۆک : بەکلەیی. (گلەکنندە)
گازۆر : [ئاوەڵناو] بەهێز؛ کەسێک کە هێـزی بەقەد هێزی گاییکە؛ زلهێز. (خرزور)
گـازوگیر : نزیـکبـەگـرتن؛ هـەڕەتـی گیروگرفتی.تەنـگ و چـەڵـەمـە. (درشـرف گرفتنبا دندان؛ فشارآوردن، گیرانداختن)
گازۆل : [ناو] بەرهەمێکی پاترۆڵییە، سـووتە-مەنی مۆتۆڕی گازوئیلییە. (گازوئیل)
گازە : [ناو] لە کاتای ئاویستاوە وەرگیـراوە و گازندە و گازکردن و گازی بەواتای پاڕانەوە و بانگ و هاوارکردنـە لـە خـودا؛ موناجـات. (-مناجات)
گـازەرە : [نـاو] گـازەرا؛ مۆغـەرەی پشـت. (ستونفقرات)

گازیتراو : [ناو] گازی کە بەپەستاوتنی (بـە-گوشار) بووەتە تراو. (گازمایع)
گازیخەردەل : [ناو] گازێکی کیمیاوییـە کـە حەڵەبجـەی شـەهیـدی پـێ بۆمبـاران کـرا. (گازخردل)
گاس : فد: [بەنـد] گاهـەس؛ لـە کوردییـەوە چووەتە نێو فارسی؛ شایەد؛ بۆیهەیە؛ ڕەنگە؛ وێدەچێ. (گاس)
گاڤادی : گاڤا دن؛ دەمێکیدی؛ کـاتێکیتـر. (وقتدیگر)
گاڤقەلیش : [ئاوەڵناو] هەرزەگـەڕ؛ زۆرگـەڕ؛ ئاوارە. (هرزەگرد)
گاڤگاڤانێ : [ناو] کایەی بازدان. (بازیپرش)
گاڤۆک : > گامیز.
گاکوژە : گیاییێکی ژەهرداره؛ مرۆڤ و گـا دە-کوژێت، بەڵام ئاژاڵیتر ناکوژێـت. (شـوکران-آبی)
گاکەرک :[ناو] فەرەجی قۆڵکورتی تا ئەژنـۆ درێژ. (نـوعیعـەبـایآسـتینکوتـاه، دامـن-تازانوبلند)
گاگلوان : [ناو] تەویلەی گاگەل. (تویلەگاوها)
گاگۆڕ : [ناو] قەبر جگە لە گۆڕیچە. (قبر بجز ازلحد)
گاگۆز : [ناو] گلێنە؛ کزن. (گاوەدانه)+
گاڵتەوگەپ : [ناو] گاڵتەوگەپ حەنەک و پە یڤین؛ قسە و شۆخی. (شوخیوگپزدن)
گاڵەکوت : [ئاوەڵناو] هـەڵچـون؛ هـەراسـان؛ نیگەران. (مضطرب)
گالەوەڕێن : [ناو](ب) گـاح؛ شـووانیگاگـەل. (چوپانگاوها)

گامبۆره : [ئاوەڵناو] ئازا؛ بەکار؛ بەدەستوبرد. (کاری)
گـامۆلکی : [نـاو] گـاگۆلکیٚ؛ گـاوڵکیٚ. (چهاردستوپاراەرفتنبچه)
گامیر : جۆرێکقالۆنجه. (نوعیسوسک)
گامیزه : مارپێچ؛ ئەم بەروئەوبەرکردنی هێـل یان پێچ و قەمچ لە ڕیگا ڕۆیشتندا. (زیگزاگ)
گاوانەسی : >گاوەناس؛ گاوەناز.
گاوبار : لە زۆرانبازیدا بەلای شـاندا کـەوتـن. (نیمتیغ)
گاوریسەرکۆ : بەو زەڕدەشتیانەیان گوتـووە، کە لە دەس زوحاک ڕوویانکرده کەژ وکێـو؛ یان دەستەییٚکیتریان کە بـەهـاتنی ئیسـلام هەڵاتنه سەرکێو و شاخ. (زردوشتیانفـراری-کوەوکمر)
گاوەشه : [نـاو] گـاوس؛ مـەشـکەیگـەوره. (مشکبزرگ)
گاوەشەدەم : [ئاوەڵناو] دەمزل؛ مەشکەدەمـه. (دهنگشاد)
گاوەناس : [ناو] گاوەناز؛ پەیدابوونی گروڤەڕ-ێکی بەئێش و برین و چڵک لە بەر ملی گادا. (مرضورمکردنگلویگاو)
گاهنبار : لەئاوێستا داهاتووه کە دونیا لەشـە-ش ڕۆژدا دروستبووه، (ب) لەو شەش ڕۆژەیه. (ششروزیکەدنیاخلقشده)
گاهیـت : [نـاو] گـاجووت؛ گـایشـێوبڕین و جووتکردن بە تەوسەوه وەک جوێن بە کە-سێکی گێژ و حۆل دەوترێت. (گاونرگـاوآهن-کش)
گایباری : لە قەدیمدا باو بوو گایان بـار دە-کـرد. (خـۆم کـوڕەکـاروانی گـا بـە بـارەوه) «فۆلکلۆر». (گاوباری)
گایسەره : ئەوەڵێن گایگێره کە لـە قـەراخ پێخویٚدا دەگەڕێت. (اولینگاودرخرمنکوبی)
گاییٚ : (١) یەک گا. (یکگاو). (٢.ب) [بەنـد] جاروبار؛ بـڕیٚجـار؛ هـەنـدیجـار؛ بڕێوجـارا. (گاهی)
گرانفرۆش : [ئاوەڵناو] گرانجان؛ گرانوەرش. (گرانفروش)
گرتن : [چاوگە] (ب)جوانووی لە سـیٚ سـالٚ بەرەوژوور ڕامکردن بۆ سـواری. (رامکـردن-اسببرایسواری)+
گرتەیوەر : گرتنه باوش. (بغلگرفتن)
گرد : لەگەلٚ؛ وەگردمنی ؟: لەگەل منته ؟: لەگەلٚ منت دایه؟. (با)
گرد : [ناو] نیشانەییٚکه لە سەر پێنج هێلی نۆتنوسینی مۆسیقادا کە یەکەی کاته و بە ڕانبەر بە دووسپی وهەشت چەنگه. (گرد)
گردەبڕ : [ناو]لق یان کۆته دار کـە بـە بـاری ڕادپووتدا ببردرێتەوه؛ خشتەبر یان گردەبـڕی پێدەڵێن، ئەوداره گردەبڕ، ببڕەوه ؛ ئەگەر بـە باری ڕاڕاستدا ببرێتەوه (داهێنانی) پێـدەڵـێن. (بریدنهرچیزگردازعوض)+
گردەوبوون : گردبوونـەوه؛ کۆبوونـەوه؛ کـۆم بوونەوه؛ خڕبوون؛ خڕبوونەوه . (جمـعشـدن؛ گردشدن)
گردیشک : گیاییٚکه لە ئاڵەکۆک دەکا. (نـام-گیاهیاست)
گرسانەوه : ڕاوەستانی خـوێنیبـڕین؛ خـوێنی برینەکەی گرسایەوه : بەندهات؛ هاتە بـەس.

(بندآمدن‌خون)+
گڕسۆز : [ناو] گردسۆز؛ جۆرێک‌چرای نەوتی کە گڕەکەی جەغزئاسایە. (گردسوز)
گڕگڕە : [ناو] چەرخی ئاو دەرهێنان لەبیر؛ جەڕجەڕە. (گەردوونە؛ چرخ‌چاه)
گرۆبان : پلەی عەسکەری بانتر لە سەرباز یەکەم و خوارتر لە ئیستیوار. (گروهبان)
گرۆبان‌دوەم : پلەی عەسکەری بانتر لە گرۆبان‌سێ. (گروهبان‌دوم)
گرۆبان‌سێ : خوارترین پلەی گرۆبانی. (-گروهبان‌سوم)
گرۆبان‌یەکەم : پلەی عەسکەری بانترین پلەی گرۆبانی و خوارتر لە ئیستیوار. (گروهبان‌یکم)
گرۆڤەر : [ناو] لوو؛ لک؛ لووی؛ بەرزەک؛ ئالک؛ ئالوو. (غدە.تومور)+
گڕوشاندن : [چاوگە،ت] کرووساندن؛ کڕاندنەوە و داماڵین بەددان. (بادندان‌لخت‌-کردن مانند بلال‌خوردن)
گرووچ : [ئاوەڵناو] سووک‌وچرووک. (پست)
گرەمشقەڵە : گرەمشقەڵان؛ ئاگری شوڵەبەرز. (آتش‌شعلەبلند)
گرێ : [ناو] جۆرێک گروڤەر لە ناو کۆتە یان لەسەر ڕیشەی‌دار. (گرەداخل‌تنەوریشەدرخت)
گریاشان : سەیرانگابوو، ئێستا گەڕەکیکە لە شاری سنە. (گریاشان)
گڕیاڵ : [ئاوەڵناو] کەچەڵ؛ سەرگەنیک. (کچل؛ گر)
گرێدێر : اند؛ فد: [ناو] ماشێنی تەخت‌کردنی زەوی زیاتر لە جادەسازیدا بەکاردێ. (گریدر)

گوڵێر : فد: [ناو] لە ئینگلیزی وەرگیراوە واتا دەروازەوانی کایەی تۆپێ‌پا. (گلر)
گرێ‌تێکەوتن : (ب)چەت‌تێکەوتن؛ کۆسپ و بەرهەڵست کەوتنە سەر ڕێی ئەنجامی کارێک. (مشکل درکارپیداشدن)
گرێ‌تێکەوتن : ۱) گرێ‌کەوتنە ناو ڕیس و بەن؛ ئاڵۆزان و لێک گیربوونی بەن و ڕێسمان. (گرەافتادن). (۲.ب)کۆسب و لەمپەر کەوتنە سەر ڕێگەی ئەنجامی کارێک؛ دژواری دروستبوون لە کاردا. (گرەخوردن؛ بە مانع برخوردن)
گریس : اند؛ فد: [ناو] ڕۆنێکی زۆر خەستی پاترۆڵییە بۆ ڕەوان‌کارکردنی کەرەستەگەلی سەیارە و موتۆر بەکاردێت. (گریس)
گرێ‌گوێز : [ناو] لەبن‌کۆتە و سەر ڕیشەی-گوێز گرێیێک خڕ دەبێتەوە کە تەختەنەردی لێ دروست دەکرێت و زۆر نایاب و بەنرخە. (گرەگردو)
گریسکاری : فد: [بەرهەمی‌چاوگە] گریس لە پاژگەلی بزۆزی مۆتۆر هەڵساوین. (گریسکاری)
گرینچۆ : [ناو] جومگە؛ جمگە؛ خرتک. (مفصل)
گرێی‌دەریایی : [ناو] یەکەی درێژایی لە دە-ریادا بەرانبەربە میلێکی دەریایی. (گرەدریایی)
گرێی‌سەردڵ : داخ‌بەدڵ‌مان؛ ئاوات‌نەهاتنە-دی؛ داخی‌سەردڵ؛ (عقدەدل)
گزرەهۆڕیڕ : [ناو] کوللە؛ قولمە. (ملخ)
گزمک : [ناو] بزمک؛ دەمبێن. (پوزەبند)
گزی : [ناو] گزک؛ گسک. (جارو)+

گسک‌لێدان:[چاوگە،ت] (ب) ماڵینەوە و هچ-بەجێ‌نەهێشتن (کنایی؛ چیزی‌بە-جانگذاشتن)+
گسکەکۆتەرە :[ناو] گسکێکە چڵەکانی چوو-بێتەکار و کورت بووبێتەوە. (جاروب‌کوتاه-شدەبعلت کارکردن زیاد)
گشتەک : [ناو] گشتەک؛ بەنی دوورینی کە-وش و درگای جەواڵ و ئیتر. (نخ‌کفش‌دوزی)
گفکە : [ناو] گوڵینگ؛ گوڵەنگ. (منگوله)
گڤالە : (١)گەڤالە؛ گەواڵە؛ پارچەهەور. (تکه-ابر). (٢) گڤالەکەڤۆک: تاقمی‌کۆتر. (دسته)
گڤشین : [چاوگە] گوشین. (فشاردادن)
گڤکرن : [چاوگە،ت] گیف‌کردن؛ خۆئامادە-کرن؛ چەترپێکان. (آمادەشدن؛ پزدادن)
گڤن : [ئاوەڵناو] گرژ؛ مۆن؛ توورە. (عصبانی)
گل : [ناو] گلە؛ دانە؛ دەنگ؛ دووگلە: دوودانە. (عدد؛ دانە) +
گلار : [ناو] گلارە؛ گلێنە؛ ڕەشکێنەی‌چارو؛ بیبیلە؛ دەنکە تری. (مردمک‌چشم؛ دانە انگور)
گلاراو : [ناو] نەخۆشینی گلێنەی‌چاو؛ گل-کردن و ئێشانی‌چاو؛ (چشم‌درد)+
گلایۆل: فرد؛ اند: [ناو] شالانگ؛گوڵە دیاری؛ گەلایۆل؛ گوڵەکانی بەریز لە سەر لقێک دە-پشکوون وچەند ڕەنگی جۆراوجۆری هەیە. (گلایول)
گلج : بژاربڕ؛ براڕچن. (بیلچەوچین)
گلدوگاجل : [ناو] شتی‌کۆن و پروپووچ؛ شڕە-وبڕە؛ شڕوشاتاڵ. (خرت‌وپرت‌کهنه)
گڵکەن : [ناو،بک] کەسێک کەگڵ هەڵدەکە-نێت؛ ئاخکۆڵ. (خاک‌کن)+
گلمیسک : [ناو] ئاوی‌زار؛ لیک. (آب‌دهان)
گلۆپ : [ناو] لامپی‌چرای‌کارەبا. (لامپ)
گلۆرە : شتی‌خڕ؛ گوڵوڵە. (کلاف‌وگلولەنخ-یاهرچیزگرد)
گلێرای : [چاوگە،ت] خلاربوونەوە؛ خلۆربوون؛ سەرسەمدانی‌چارەوی. (سرازیرشدن.افتادن)
گلێرۆکەردەی : [چاوگە،ت] کۆم‌کردن؛ کۆکردنەوە؛ خڕکردنەوە. (جمع‌کردن)
گمتە : [ئاوەڵناو] تێکسمڕاو؛ (ب)قەڵب؛ بەرە-ڵا؛ گەدەوگودە. (گندە.بی‌ارزش)
گن : [ناو] گروڤەر؛ لوو؛ گرێی‌ناو لەشی زیندەوەر. (غده)+
گنای : [چاوگە] کەوتن؛ کەفتن. (افتادن)
گواتر : فرد؛ فد: [ناو] نەخۆشینی پەنمانی گروڤەری (تیروئید) بە هۆی‌کەم بوونەوەی (یۆد) لە لەشدا کە دەڵێن لە خەم و خەفەتی زۆرەوەیە؛ وەرهەم. (گواتر)
گۆپاڵ : [ناو] گورز. (گرز)
گوپینە : [ناو] کۆپکە؛ چڕوی‌دار؛ خونچەی-ساوای سەر لقی دار. (تژەدرخت)
گوتوویژ : [ناو] گفتوگۆ؛ وتوویژ. (گفتکو)
گوتیار : [ناو،بک] بێژەر؛ قسەکەر. (گوینده)
گۆجەستەک:[ئاوەڵناو]نەگبەت؛ بە نەحلەت کراو؛ نەفرین‌کراو؛ نەگریس. (نکبت)
گوجیلە : [ناو]گورچیلە؛ وڵک.(کلیه)
گۆر : [ناو]گۆرخەر؛ کەرەکێفی؛ کەرەکێوی؛ وەک کەر وایە و لەشی خەت‌خەتە. (گورخر)
گوڕایگوڕ :[بەند] پەیتاپەیتا؛ لەسەریەک.

(گروگر)
گورجی:[ناو]خەڵکی گور جستان-.(اهلگرجستان)+ توند وتۆڵی
گورخەر : >گۆر.
گوردان : [ناو] تاقمێک عەسکەر بەرانبەر بە سێ گورهان. (گردان)
گۆردەک :سەگی گوێ شۆڕ؛سەگی گوێ نە-بڕاو. (شگ گوش آویزان)
گورزەگیا : [ناو]گوڵەهەنگە؛ گیاییکە نیومیتر بەرزە و بۆ پەنمانی گورچیلە و میزگیران بە-کەڵکە. (افسنطین رومی)
گورگستان : (ب) ناوچەیێک کە دانیشتووانی بێبەزە و جەردە و پیاوکوژبن. (گورگستان)
گورگەبوون : [چاوگە،ت] هەڵاتن و خۆشاردنەوە لە دەس کەسێ یان حوکومەت. (گریختن وئاوارەشدن)+
گورگەڕاو : [ناو] ڕاوی گورگ؛ (ب)زەحمەت و دەردیسەری زۆر پێدان؛ هێنان و بردنی زۆر. ( شکارگرگ؛ آزاردادن زیاد)
گورگی باران دیدە : گورگی باران دیتی؛ هەڵە-یە. >گورگی باڵان دیدە.
گورگی باڵان دیتی : > گورگی باڵان دیدە.
گورگی باڵان دیدە : باڵان لە کوردی و فارسییدا واتا تەڵەی گورگ، دیارە هیچ گورگێک نییە کە بارانی نەدیبێت و باران دیدە هەڵەیە کە لە فارسی و کوردیدا دەیڵێن و لە ئەسڵدا باڵان دیدەیە وەک کەوی داودۆز بە گورگێک دە-گوترێت کە تەڵەی دیبێت و ئەزموونی وە-رگرتبێت و لە تەڵە سڵ بکات و بیناسێت؛ لە ئاکامدا بە مرۆڤی بە ئەزموون و دونیا دیتوو دەوترێت. (گرگ بالان دیده)
گوڕم : [ناو] پاڵ پێوەنان و تەکاندانی بە تە-وژمی مەشکە یان شتی تر. (محکم تکاندادن)
گوڕمەتە : [ناو] تەکان لەخۆدان؛ بەتوندی-ڕاپسکان؛ بەتوندی هێرش بردن. (جهیدن)
گۆڕاواباف : [ناو] دووکەڕێسە؛ گۆڕەویلە؛ گۆڕەویچنە؛ تۆرەمەی گۆڕەویچنە ٨ جۆرن. (١)گۆڕەویچنەی بۆر. (چرخ ریسک سرسیاه). (٢) گۆڕەویچنەی سەرسپی. (چرخ ریسک-سرسفید). (٣) گۆڕەویلەی پشتملشی. (چرخ ریسک پشت بلوطی). (٤) گۆڕەویچنەی تورکستانی. (چرخ ریسک تورانی). (٥) گۆڕە-ویچنەی سمێڵدار. (چرخ ریسک نیزار) (٦) گۆڕەویچنەی شین. (چرخ ریسک سرآبی). (٧) گۆڕەویچنەی کلک درێژ. (چرخ ریسک دم دراز). (٨) گۆڕەویچنەی گەورە. (چرخ ریسک-بزرگ)
گورهان : [ناو] تاقمێک عەسکەر بەرانبەر بە سێ دەستە. (گرهان)>گوردان
گوڕەکردن : [چاوگە،ت] (ب) بە هەرا و دە-ستوبرد کارێک تەواوکردن زیاتر لە کاری فەلاحەت و دروێنەدا بە کاردێ (لێمان گوڕاندو بەرێکمان دووریەوە)؛ هەیتاندن. (بادادوفریادوعجله کاری راتمام کردن)
گوڕیچە : جۆرێک تەڵەنانەوە لە بەر درگای کونێکدا کە نێچیری تێدابێت. (نوعی تله-گذاری)+
گۆریل : اند؛ فد؛ فرد:[ناو] جۆرێک مەیمونی بێکلکە و زۆر بە هێز و ئارامە بە ڵام ئەگەر تووڕەی بکەن بێترس و بێبەزە هێرش دە-

کات. (گوریل)
گۆزن‌گرێ : [ناو] پشتوین بەستن بە شێوەی گرێچن. (نوعی‌بستن‌شال‌کمر)
گوزەران : گوزەشت‌کردن؛ بەخشینی تاوانبار؛لێ‌خۆشبوون. (گذشت‌کردن)+
گوشادادن : لە کایەی نەردێن‌دا تەنیامۆرە، لە بواری مۆرەگەلی حەریفدا دانان. (گوشادادن)
گۆشارە :[ناو]گۆشوارە؛گوارە؛گوهارک؛ گوهار. (گوشوارە)
گۆشت‌کۆی : [ناو] گۆشت‌کوت؛ کوتکی گۆ-شت‌کوتان. (گوشت‌کوب)
گۆشتی‌قیمە : گۆشتی‌کوتراو یان لە چەرخ دراو. (گوشت قیمە)
گۆشتی‌کوتراو : [ناو،ت،بەرک ] لەقەدیمدا بۆ دروستکردنی‌کەبابی لوول گۆشتیان دەکوتا ئەمڕۆ لە چەرخی گۆشتی دەدەن و قیمەی پێدەڵێن. (گوشت‌کوبیدە)
گۆشتی‌گەردەمل : [ناو] (ب) ئاماژەیە بۆ شتی سەربار و بەسەرداسەپاو. (کنایی‌سربار)
گۆشتی‌یەک خواردن‌وئیسقان نەشکاندن : ئیشارەتە بە خزمایەتی. (کنایی.قوم‌وخویش)
گۆشدەر:[ناو]گۆش:گوێ،گوێگر:گوێ ڕایەڵ ؛ (پۆس‌کۆس گۆش ئاوکێشان کەم‌کەم، ئیسەر ئەوسەرەن دووربینەکەی چەم) «مەولە-وی» . (شنوندە)
گۆشگرە : [ناو] گوێ داپۆش زیاتر بۆ منداڵی دروست‌دەکەن. (گوش‌پوش)+
گۆشەمڵە: گیای‌گوێ‌مشک؛ کوڵێندراوی گیای گوێ‌مشک دژی تووڕەیی و بێ‌خە-

وییە. (مرزنجوش؛ مرزنگوش)
گۆشەوکەنار : (ب) دەوروبەر. قەراغ‌وبیجاغ. (گوشە‌کنار)
گۆشی : فد. لە سازەکانی تەلیدا ئەو بە ڕوولە خڕانەن کە سیم (تەل)یان پێوە دەبەسترێت بۆ شل و توندکردنەوە وکۆک کردنیان. (گوشی)
گۆشی : کەرەستەی گوێگرتن لە دەنگی لێدانی دڵ کە دوکتۆرەکان بە گوێیەوە دە-نێن؛ بیستۆکی دەزگای تەلەفۆن؛ کەرەستەی دەنگ‌بڕین لە ئامێری وەک ڕادیۆ و گرام و ئیتر کە تەنیا بە و کەرەستە گوێی لێ-بگیرێت؛ (گوشی)
گوشینە : [ناو] گونیە؛ گۆنی؛ تەلیس. (گونی)
گوفتار : [ناو] گوتە؛ ڕەوتی پەیڤین؛ وتار؛ گوتار. (گفتار)
گوفتوگۆ : [ناو] دەڤچەنگ؛ وتوویژ؛ دەمەتە-قێ. (گفتگو)
گۆگراندن : [چاوگە،ت] خرت‌کردن؛ خڕهە-ڵدان؛ گردکردن؛ لەخەراتی‌دان. (کروی‌کردن)
گۆگرکار :[ناو،بک] خڕهەڵدەر؛ خڕکەر؛ لەخە-ڕاتیدەر؛ خرت‌کەر؛ خەڕات. (خەراط)
گوڵاڵەقلیان : [ناو] گوراڵەقلیان؛ گولەنەورۆز؛ جۆرێک گوڵاڵەیە کە پەڕەکانی قەویترە لە گوڵە خەشخاشە و گەڵاکانی درێژ و باریکە و پیازەکەی شیرینچقە؛ دژی کرمی برینی دە-ست و پای حەیواناتە کە کرمی هەڵهێنابێت. (لالەالوان)
گوڵباران : [ناو] جۆرێک ڕێزگرتن لە کەسێک بە داباراندنی گوڵ بە سەریدا لە لایەن کەس

یان جەماوەرەوە.جۆرێک باربوو. (گلباران)
گوڵپرشنگ : گیای پەنگەڵ زەرد؛ هەسارە شمار؛ هەسارەژمار. (گیاەشیرمرغ)
گولپەڕ : [ناو](۱)گوڵەسۆ. (۲)کوتراوی گوڵبە-رگی جۆرێک گوڵە وەک بەهارات دەیکەنە نێو ماست و خۆراکەوە. (گلپر)
گوڵتریاک :[ناو]سەبیلەگیا؛ مەنگەگیا. (-خشخاش)
گولچیک : [ناو]گولچیسک؛ گورچیلە؛ گولچیلە؛ وڵک؛ گورچەویلە؛ گورچیلک؛ گورچک؛ گولچیزک؛ گورچوو؛ ڤلک. کاری-پاڵاوتنی خوێنە لە لەشدا. (کلیه)
گوڵخاز : خازی؛ گیایێکە کوڵێندراوی گوڵ و گەڵاکەی لەگەڵ سرکەدا دژی کرمە و بۆ بینایی‌چاو باشە. (گل‌شیپوری)
گوڵدەستە : [ناو] چەپکەگوڵ؛ دەستەگوڵ؛ منارە. (گل‌دسته؛ منار)
گوڵڕوخسار : [ئاوەڵناو] ڕوومەت وەک گوڵ؛ (ب) جوان و دیمەن‌گەش؛ گوڵعوزار. (گلعذار)
گوڵسازی : [ناو] هونەری دروستکردنی گوڵ؛ گوڵ دروستکردن لە قوماش و پەڕۆ و پلاستیک و شتی‌تر. (گلسازی)
گوڵقەند : [ناو] گەرمەشانی برژاوی هەڵتۆقیو لەگەڵ شەربەتدا بە توپەڵ گوشراو. (گلولەچسفیل‌باشربت)
گوڵگرتن : [چاوگە،ت] شاردنەوەی بەڕوولە خرچە لە ژێرخۆڵدا بۆ بەرگری لە گەرا دانانی مێشوولە و کرموڵ بوونی. (زیرخاک‌کردن-خربزەدرموقعی‌کەباندازەبادمی‌استبرای-جلوگیری‌ازکرموشدن)+
گوڵگوڵاو : [ناو] گوڵەباخ. (گل‌محمدی)
گوڵەباران : [ناو](۱) تیرباران؛ کوشتنی تاوانبار بە شێوەی بەستنەوەی بە ئەستوونەوە و دەسڕێژ لێکردنی. ۲) بە چەکی وەک تفەنگ و توپ و خومپارە جێگاییێک دانەبەر گوڵە. (۱و۲ تیر باران ؛ گلولەباران)
گوڵمانج : [ناو]گوڵی‌گەورە؛ زۆنگاو؛ تاڵاو. (تالاب)
گولمت : [ناو]گومتل؛ پارچە؛ بەشێکی گچکە لە هەرشت. (تکەکوچک)
گوڵناز : (۱) ناوە بۆ ژنان. (۲) گوڵێکە ئەگەر دەست لە گوڵەکەی بدرێت پەڕەکانی لوول دەبن. (۱و۲گلناز)
گولنیشان : [ناو] گوڵێکی سووری بێ بۆنە. (نوعی‌گل‌قرمزبیبو)
گولۆسوورکە : ڕێحانە کێویلە. (ریحان‌کوهی)
گوڵوێنە : (۱) وێنە و ڕەسمی گوڵ؛ لە شکل و شێوەی گوڵ. (عکس گل؛ شکل و شبیە گل) (۲) گوڵبێنە. هەواکێشی خوارە وەی تە-نوور. گوڵبێن. (گلوە تنور)
گوڵەئاخ : گوڵەئاوات؛ گیاییێکە گوڵەکەی و-شک‌دەکەن لە مەریوان و بێساران(کاژە)ی پێدەڵێن دەیکوڵێنن بۆ سەرئێشە بە کەڵکە. (گل‌میمون)
گوڵەئاسۆ : گوڵێکی هەشت‌پەڕی جوانە بۆ مالیجەی سەرئێشە(میگرێن)دەبێت. (گل-ستارەای)
گوڵەئاڵۆز : کوڵێندراوی لە ڕادەیێکی کەمدا بۆ نەخۆشینی جەرگ و سپڵ باشە و ژە-

هراویە و خواردنی زۆری بڤەیە. (زبان‌در( قفا)
گوڵەئەسپەک : گوڵێکی ئاوییە و بۆ نە-خۆشینی کەوتەیی بەکەڵکە. (نوعی‌گل)
گوڵەبا : [ناو،ت] گیای‌قلینچکەهەورێشە؛ بۆ برینی گەدە کەڵکی لێ‌وەردەگرن. (علف-چای؛ گل‌باد)
گوڵەباخ : گوڵ‌گوڵاو؛ گوڵێکە گوڵاوی لێ‌دە-گیرێت (گل‌محمدی)
گوڵەبارزانی : گوڵێکی زەردی باڵابەرزە؛ گیابەرزە. (نوعی‌گل)
گوڵەبریقە : گوڵەمرواری. (گل‌مروارید)
گوڵەبەفرینە : گوڵێکی سپی و بۆن خۆشە و گەڵای‌نییە و پەڕەی گوڵەکەی ئەستوورە و ڕیشەی لە نێو بەفردایە و دەمەوبەهار لە-کاژوواژ(خاڵخاڵ بوون)ی دەمەو بەهاردا لە-سەر بەفر دەڕوێ. (گل‌یخ)
گوڵەپاییزە : گوڵەحەسرەت؛ لە پزشکیدا بۆ دەستکاریی (کرۆمۆزۆم)کەڵکی هەیە و بۆ جێگۆرکێی ژێنەکانی کورۆمۆزۆم بە کاردە-برێ. (گل حسرت
گوڵەپیاڵە : گوڵێکی کورتە باڵای شێوە لاو-لاوە بەڵام کاسەی گوڵەکەی قووڵترە؛ بۆ خوێن‌بەستی برین بەکەڵکە. (گل‌استکانی)
گوڵەتیکە : گیای شەش‌پەرفەڕەنگی؛ کو-ڵێندراوی گوڵەکەی بۆ شتنی چاوی چاوئیشەدار باشە. (گل‌آهار)
گوڵەجیرە : هەڵاوەدێمی؛ گیایێکە لە(مۆمیایی)دا زۆر بەکەڵکە. (گل‌کتانی)
گوڵەخەشخاش : چارەچەقیلە؛ گوڵاڵە سوورە؛ خەشخاشە. (شقایق)
گوڵەخەنازیل : گیایێکی ژەهرداره کوڵێندراوی دەساونە جێگای پەنمینی جومگە یان بێوەسیری، بەکەڵکە. (انجیرک؛علف-بواسیر)
گوڵەخەو : >سونبولەتی؛ سونبولەتیف
گوڵەدان : کابە.گەرمەشامی؛گەنمەشامی؛ گوڵەپێغەمبەرە. (ذرت)
گوڵەدرەوش : گیای دووگەگورک؛ گوڵەئە-ختەر. (گل‌اختر)
گوڵەڕوو :گوڵ‌گیرووڵک؛کاتمی؛ هەڵمەڵە؛ گوڵە هێرۆ. (گل‌ختمی)
گوڵەزاوا : گیایێکی یەکساڵەیە،بۆ مالیجەی برینی کۆن‌بوو، لەگەڵ پیازدا لە سەر برینی دادەنین بەکەڵکە. (آناغالس‌دشتی)
گوڵەفەرهاد : گولەکاویان؛ گوڵەکاوان؛ گیا-یێکە بۆ ئێشی کویچکە بەکەڵکە. (کلماتیس)
گوڵەکاغەزی : گوڵێکی گەرمەسێرییە و ڕە-نگی گوڵەکەی سوورە لەبەر تاو بێت گوڵە-کەی زۆرترە و لەبەر سیبەر گەڵای‌کەی زیاتر دەبێت. (گل‌کاغذی)
گوڵەکەر: نێرەکەر؛ (ب) پیاوی زۆر نەفام و تێنەگەیشتوو بەتەوسەوە؛ (نرەخر)
گوڵەگیا : گیایێکە لە ناوچەی مەهاباد و مە-ریوان زۆرە لەگەل برەئاسن بەبرینی گولی و بیرۆی‌تەڕدا دەکرێت و بەکە لکە. (گرگ-کش؛ اقونیطون)
گوڵەلێوە : خەرەبەنگ؛ گیایێکە بەنگی لێدە-گرن. (شاهدانەهندی؛ بنگ)
گوڵەمێلاقە : جۆرێک گوڵاڵەسوورەی گە-ڵادرێژە و بەرگی گوڵەکەی لە گوڵەخەشخاشە

قەویترە؛ گوڵەنیسان.(گل لاله)
گوڵەنان‌ودۆبڕ : چارەچەقیلـەی نـاو مـەزرای گەنم‌وجۆ؛ گوڵەخەشخاشە؛ بە گوڵە تریاکیش دەڵێن. (شقایق گل خشخاش)
گولەهەرمەڵێ : هەڵمەڵە؛ گوڵـەهێـرۆ. (گـل- ختمی)
گوڵەهەنگوین : گیاییێکە لە ناوچەی بۆکـان و مەهاباد زۆرە و زەرداوبەرە و دەرمانی بـرین و بەردی زراوە. (شاه‌سپرم‌کوهی)
گوڵەهەوار : گوڵەچایە؛ گیاییێکە دەرمـانی زە- ردوویی و لابەری زەرداوە. (گل‌سرخ‌آلمانی)
گولی‌بەخیل : (ب)مرۆڤـی چکـووس و حـە- سوود و ڕژد. (کنایی‌آدم‌بخیل‌وحسود)
گوماندار : بەگومان؛ بەشـک؛ زک‌ڕەش؛ دڵ- پیس. (شکاک)
گومتاق : تەقیلە لە سەری بێ‌مێـزەر. (شـب- کلاه‌بسرکرده بدون‌دستار)
گونحە : پاداش؛ جەزا؛ توڵە. (پاداش)
گوندڕیا : [ئاوڵناو] گوندڕیاو؛ قوڕ؛ قێڕە. (قر)
گونگلە : [ناو]گێنگل؛ چەمەرە؛ ئاڵقـە پێکـان. (چمبره)
گۆنگەڵ : قوماروباری؛ (لەسەر قورسی سـە- نگەڵی، فێری قومار و گۆنگـەڵـی) «فولکلۆر». (بازی)
گون‌هەڵبەست : [ناو] سوواخدانی ناوبەنـاوی دیوار کە سـوواخەکـەی بـەریـدابێت. (گـل- اندودکردن‌گله‌گله‌دیوار)
گونەهێسترە : [ناو] جۆرێک هەڵووژە ڕەشەی دەنک گەورەیە. (نوعی‌آلوچه)
گووژ : [ناو] جەو؛ جیـوە؛ شـیلەی وشـکەوە- بووی دار و ڕووەک. (صمغ)
گووگەڕێـن : [نـاو] گووگلێنـەک؛ گـووگلێن؛ جۆرێک‌قالۆنچە. (نوعی‌سوسک)
گوو نـەکـەر : [ئـاوەڵنـاو](ب) مرۆڤـی ڕژد و چکووس و سەقیل؛ (خسیس)
گوونیە : [ناو] گۆنی؛ تەلیس؛ گۆنیە. (گونی)
گووهاسن : [ناو] بەردەڕەژی؛ زووخاڵ‌سەنگ. (زغال‌سنگ)
گۆهاش : فذ: [ناو] چـەشـنێ ڕەنگـی وێنـە- کێشان کە بەئاو شل‌دەبێتەوە. (کوهاش)
گۆهڤەچنین:[چاوگە،ت]گوێ داتەپان؛گوێدان .گوێ‌شل‌کردن بۆقسەی نەهێنـی خـەڵـک؛ کول‌گرتن. (استراق‌صمع)
گۆهماکەر : (ب) مرۆڤی بێ ئاوەز و بێ‌عەقڵ. (کم‌عقل)
گوێ‌بڕوسقێنێ :[ناو] گوێ‌پچڕکێ؛ زیاتر لـە- سەر سەربانێ کە دڵۆپە دەکات منـداڵان کـۆ دەکەنەوە و کایەی‌گوێ بڕوسقێنێ‌سازدەکە- ن و ئەوکێبەرکێیـە دەبێتـە هـۆی کوتانـەوە سەربانی بەگڵدا پۆشراو. (نوعی بازی‌است)
گوێبرین : (١) گوێی هەندێ حـەیـوان وەک سپڵۆت بە تووتکی‌بڕین. (٢.ب) خەڵـەتانـدن؛ زیاتر لە موعامـەلـەدا بـەکـار دەبرێـت؛ پـارە لێکێشانەوە؛ (گوش‌بریدن)
گوێچکەگا :کۆشەن‌وەنە. گیاییێکی کێوییە بـە گەڵای پان و درێژەوە لـە ناوچـەی سـەقـز و شنۆ و برادۆست زۆرە؛ دەی‌کوڵێنن و لـەشـی پێـدەشـۆن خـورووی لـەش دادەمرکێنـێ. (کاهوی‌وحشی)
گوێسبان : [ناو] گوێسوانە؛ قـەراخ سـەربـان.

(لبەبام)

گوێسەنگین : گوێگران؛ دژی گوێسووک. (گوش‌سنگین)

گوێکەرە : [ناو] جووڵەوەرێکە وەک هەزارپێ دەڵێن ئەگەر بچێتە نێو گوێ دەبێتە هوی کەری. (خزندەایست)

گوێل: [ناو] پرهەردوودەست؛لاگوێل:(نیوەی گوێل، پربەری دەستێک: پرلۆچی دەستێک، لاوێچێک). (پرکف‌هردودست)

گوێلاک : [ناو] سەروپۆتەراک: سەروپۆتراک؛ پۆتراک. (سروسیما)

گوێماڵینەوە : [چاوگە،ت] نیشانەی هێرش کردن و تووڕەبوونی ئەسب. (گوش‌خواباندن-اسب)

گوێنەبیس : [ئاوەڵناو](١) کەڕ؛ کەڕانسۆ. (٢.ب)گوێ نەدانە قسەی‌کەس؛بەقسەی‌کەس نەکەر.(١و٢کر؛ناشنوانسبت‌بەحرف‌کسی)

گەبڕ : [ناو،بک] نۆگەبڕ؛ نۆبەبڕ؛ کەوتنەپێش کەسێکی کە نۆبەی لە پێشداگرتووە. (احجاف‌درنوبت)

گەبرەک : گەبر؛ گەور؛ زەردەشتی. (زردوشتی)

گەبۆل : [ناو] دەفر؛ کاسە؛ قاب. (ظرف)+

گەبە : [ناو] لبادی قەوی و تووکن. (نمدضخیم)+

گەبەر : [ناو] بن‌هەنگڵ. (زیربغل)+

گەبەزە : [ئاوەڵناو] گەوەزە؛ حاڵەتی گەبزی؛ خۆ ویست؛ خۆ هەڵکێش؛ خۆ پەسن. (خودپسند)

گەبەل : [ناو] گەواڵە؛ پەڵەهەور؛ دەستەی-باڵندە. (دستە.گروە)+

گەپاندن : هەڵگلاندن؛ قووتدانی پاروو بەلەز. (لقمەبلعیدن باعجلە)

گەپوگاڵتە : <گالتەوگەپ.

گەدەروگودەر : <گەدەوگودە.

گەدەوگودە : [ئاوەڵناو] بێسەروپا گەل؛ بەرەڵا و هەرەڵا؛ ڕەش و ڕووت گەل؛ لاتولووت؛ قەلەوقوتە؛ قەلەودەلە. (آدمهای‌بی‌سروپا)

گەڕ : [ئاوەڵناو](١)گەڕۆڵ؛ لەهەندێ ناوچەبە گولیش‌دەڵێن. (گر).(٢) نۆبە؛ دەور. (نوبت؛ دوران)

گەڕاو : [ئاوەڵناو،ت] خواربوو؛ خواربووگ؛ تەختەدارە کە گەڕاوە: لاربووە: گێڕبووە. (کج-شدە)+

گەڕاو : گەڕیدە؛ دونیاگەڕاو؛ (ڕابووردووی گەڕان، گەریاو). (گشتە)

گەڕباڵ : [ناو] بێژنگ؛ هێڵەک؛ نزیکایەتی هەیە لەگەل غەربالی فارسیدا. (غربال)

گەردان‌کردن : [چاوگە،ت] ڕێکخستنی چاوگی وشە لەگەڵ (کات و جێگا و کار و کەس)لە ڕستەکاندا. (صرف‌کردن)

گەردۆز : [ناو]کاتی‌تێکەڵبوونی نێر و مێی بزنەکێوی. (هنگام‌جفتگیری‌بزکوهی)

گەردوون : [ناو](ب) ئاسمان؛ فەلەک؛ زەمانە. (فلک؛گردون)

گەردو وەرد : [ناو] تووچاندن و کێلانی زەوی پاش پەڵە. (شخم‌زن‌زمین‌بعدازباران‌زیاد)

گەردێ : [بەند] تۆزێ؛ نەختێ؛ کەمێ. لادێ. (کمی)

گەردی : فد: [ئاوەڵناو](ب)کەسێک کە

خووی بە کێشانی هێرویین گرتووە. (گردی)
گەرساندن : [چاوگـەت] ئابڵۆقـەدان؛ گـە-ماڕۆدان؛ قەرساندن؛ لێدان. (محاصره ؛کتک-زدن)
گەرساندن : [چاوگەت] گەوزاندن؛ تلانـدن؛ تیوەتلاندن. (غلتاندن؛ داخل‌بەکاری‌کردن)
گـەرسـین : [چاوگـە] گـەوزیـن؛ گـەڤلـین. (غلتیدن)
گەرک : [ناو] ئاشی‌برنج‌هاڕین. (آسیاب‌برنج)
گـەرمخـین : [چاوگـەت] وشـکەوەبـوون. (خشک‌شدن)+
گـەرمشـاندن : [چاوگـەت] هـوورکردن؛ هاڕین؛ وردکردن. (خوردکردن‌وپودرکردن)+
گەرمونەرم : [ئاوەڵناو] خۆش و لەبار بۆ حـە-سانەوەی لەش؛ جێوبانی گەرمونەرم. (گـرم-ونرم)
گەڕمە : [ناو] گەمرە. (سرگین‌زیرپاسفت‌شدە-وخشک)
گەرمەژان : [ناو] هەرەتـی ژانـی منـداڵبوون. (شدت‌دردزایمان)
گەرمەژۆ : [ناو] زیپکە بە هۆی تاوبردنەوە؛ گرمژە. (جوش‌آفتابزدگی)
گەرمەلان : [ناو](١)لانی‌تازەی گیانلە بەران. (لانەتازە). (٢)لانی‌کەروێشک لە جێگای بەر ڕۆژ کـە لـە پاییزانـدا، چێـی‌دەکـات. (لانـە-خرگوش‌درپاییزکەروبەآفتاب‌است).
گەرمەیاو : [ناوەت] تەوی‌زۆر؛ تەبی‌زۆر؛ جـە-نگەی نۆبەتیْ لێهاتن. (شدت‌تب)
گەرمیان : ناوچەییێکـە نزیکـی کـەرکـووک. (منطقه‌ای‌نزدیک‌کرکوک)

گەرمیلە : [ناو] دەستبەجێ و گـەرماوگـەرم سەربڕینی نێچیر کـە گومـانی منـدار(مـردار) بوونەوەی لێبکرێت.(سـربریدن‌شـکاربدون-فوت‌وقت)
گەرنیزە : [ئاوەڵناو] لاواز؛ گەرنیسە؛ لەڕ؛ بێ-تووک. (لاغر.مردنی)
گەرنیسە : >گەرنیزە.
گەڕوگیف : عڕ وگیف. ئـەڕنـین؛ نـەڕانـدن و هەڕەشەکردن؛ گوڕەکردن. (عروتیز)
گەروە خڕە : [ناو] ملەخڕە؛ دووشاخە. (خناق)
گەڕمەشکە : [ناو] جۆرێک ئاکـاردئۆنی بـێ کلیل؛ ئامیری‌مۆسیقایە. (آکاردئون‌بی‌کلید)
گەرەو : [ناو] گرێو؛ مەرج. (شرط.مرج)
گەرهە : مەڕێک دەوری چـاوی ڕەش بێـت. (گوسفنددورچشم‌سیاە)
گەڕی : [ناو](١)گەڕۆلی. (گـری). (٢)بـەنـە-خۆشینی(گوڕوێ و گـولیش) دەڵـێن. (آبلـە ؛ جذام)
گەڕێک : دەورێک؛ گەڕیْ هەڵپەڕە. (یکدور)
گەری : [ناو] گەلی؛ شیوی‌قـوول و بـەریـن؛ دۆڵ. (درەبزرگ)
گەزگەسک : [ناو] گەزکەزک؛ گەزنە؛ گـەزە-نە؛ ئاڵۆشە؛ گزگزە؛ خەلەنگ؛ گیاییێکی گەلا-پانە و کـولکی گـەڵاکـەی خورۆشـدارە و بـۆ باداریی (ڕوماتیزم) بەکەڵکە. (گزنە)
گەزیزە : [ناو](١)گولاڵە گەزیـزەی هـەوەڵـی بەهاران. (نوعی‌گل‌بهاری). (٢) دوورگە. ئـادا. (جزیرە)
گەسکەتووڵینە : [ ناوەت]گسکی لە خـەڵفـی بلاڵووک و گزیچار و ئیتر چێـبـوو. (جـاروب-

ازشاخەنازکدرختان)
گەشتوگوزار : [ناو] گەڕان و سەیران؛ گەشت و سەیران. (گشتوگذار)
گەفوگوڕ : [ناو] هەڕەشە و گوڕەشە. (تهدید)
گەفین : [چاوگە،] حەپەکردن؛ وەڕین؛ (ب) قسەی بێتام؛ فلْتاندن. (عوعو؛ سخنبیمعنی)
گەڤازتن : [چاوگە،ت] گەڤزاندن؛ خلْافاندنەوە؛ گەوزاندن. (غلتاندن)
گەڤز : [ناو] زیخ؛ ڕێخ؛ خیز. (شن)+
گەڤژاندن : [چاوگە،ت] گەڤزاندن؛گەوزاندن؛ لە تورکیدا (گەوزاتماخ) واتا گەوزاندن؛ خول-پێدان و خولاندنەوە بە پاڵکەوتنەوە؛ تلاندنەوە؛ لە خوێن گەوزاندن. لە خوێن وەردان. (-غلتاندن)
گەڤلاندی : گەوزێندراو. (غلتیده)
گەڤلین : گەوزین؛ تلین؛ گەرسین. (غلت)
گەڤەز : مەڕەکێوی؛ مەڕەسوور؛ پەزەکێوی. (گوزن)
گەڵاز : [ئاوەڵناو] پیرولاکەفتە؛ بەتەوسەوە بە مرۆی پیر دەڵێن؛زیاتر بە سگی پیر دەوتر ێت .(سگپیرازکارافتاده)+
گەڵاڵە : [ناو]کاری دیاریکردنی ئەندازەی پاژگەل وکێشانی نەخشەی سەرەتایی بۆ کردنی کارێک؛ داڕشتنی ڕێژەکی سەرەکی لە پەیکەرسازیدا بۆ ئەوەی وردەکاریی لە سەربکرێت. (طرح)+
گەڵباخی : [ناو] گەڵواخی. ئێلێکی گەورەن لە کوردستانی ڕۆژهەلات. (ایلگلباغی)
گەلفاندن : [چاوگە،ت] وردکردن؛ هاڕین؛ هوورکردن. (خردکردن؛ پودرکردن)
گەلفچاندن : [چاوگە،ت] هەڵوەراندن؛ وردکردن؛ پرواندن. (خردکردن)
گەلفین : [چاوگە،] داوەرین؛ گوڵوفین و پروان. (مچالەکردنوبهمسائیدنوخردکردن)
گەلڤچین : [چاوگە،ت] هەڵوەرین؛ گەلفین؛ وردبوون؛ پروان؛ سیسبوون. (خردکردن؛ پژمردن)
گەڵوان : [ناو] قەزوان؛ قەزکەوان؛ قەزخەوان. (نانکش؛ چاتلانقوش)
گەلەخوێ : [ناو] خاوەن مێگەل؛ (چ هەژارم نەدی وەک کوردی هەژار، چاوبە ئەسرین و سڕی دەس زۆردار، خێوی خەرمانخڕی بێنان دەنوێ، گەلەخوێ پیوی نەبێ داس بسوێ) «هەژار» . (صاحبگلە)
گەڵەساوکێ : [ناو] نارێکڕۆیشتن؛ بە قاپاوێژ ڕۆیشتن. (پاشنەبەساقخوردندرراەرفتن)
گەلێری : [ئاوەڵناو] گەلی؛ نەتەوەیی؛ پێوەندیدار بە گەلەوە؛ تۆرەمەیی؛ نیژادی. (نژادی)
گەلیزە : [ناو]کووزووی ملباریک؛ مینا؛ سوراحی؛ سەبوو؛ تۆنگە. (سبو)
گەم : [ناو] لەغاو. (افسار)
گەمارە : [ناو] خۆشکردنی پێست و کەوڵی ئاژەل. (دباغی)
گەمرین : [چاوگە،] جویێبوونەوە. (جداشدن)
گەندەک : [ئاوەڵناو] وشەیێکی ئاوێستاییە بە واتای گەنیک؛ گەنیو؛ گەنیاگ؛ گەندەڵ. (گندیدە)
گەنگ : ناوی چۆمێکە لە هێندوستان کە خۆڵەمێشی لەشی مردووانی پاش سووتاندن

تێدەڕێژن. (رودگنگ)
گەنگەشە : [ناو] پشێوی؛ ئاڵۆزی؛ کێشەو ناڕەحەتی؛ دەردیسەری. (دردسر)
گەنگەشە : [ناو] ڕاوێژ. (مشاوره)
گەنم : [ناو] ١٢جۆرە سەرداری، سمەوەژ، بە هارەسوورە، کوێستانی، قەندەهاری، ئومێد، گوڵڕووت یان گوڵڕووتە، شووشە، مەلا، بە-هاروو، حوڵە، زەردە، گوڵپەڕشە، بۆی هەیە چەشنی تریشی هەبێت (گندم)+
گەنمەبەردیلە : [ناو،ت] بەڵخ‌کوچک؛ خەنە تیلکە؛ گڵەوەرزە؛ کرێژەبەرد؛ قرێژەبەرد؛ قەوزەبەرد؛ کرپشەبەرد؛ گەوەز؛ بقز؛ مەخمەڵینە؛ خەنەتیفک. (گل‌سنگ)
گەنمەویەو :[ناو،ت] خەلەڕن؛ ماشێنی‌دروێنە؛ کۆمباین. (کومباین)
گەوار : [ناو] بەچکەکەو. (جوجه‌کبک)
گەور : [ئاوەڵناو] جوان؛ ڕند؛ گەورامن: جوانی‌من. (قشنگ)
گەورایی : [ناو] ئەوەی لە شیر بەرهەم دێ؛ سپییایی. ( لبنیات)
گەوزالە : [ناو،بەر] خول‌خواردوو؛ بەگولۆڵەبوو؛ کڵاف؛ گلۆڵە. (کلاف؛ گلوله)
گەوەرچین : تد: [ناو] گەوگەرجین؛ کۆتر؛ کەڤۆک؛ کاووک؛ کاڤووک. (کبوتر)
گەویر : شارێکی جوولە کە نشین بووە لە نزیکی پاوە ئیستە بووەتە چۆڕژی. (نام‌سابق-چورژی)
گەیینەیەک : تووشی یەکترین‌بوون؛ (ب) - پێک‌بڕانی دوودڵدار؛ بە یەک‌گەیشتن. (بهم-رسیدن‌دوعاشق)

گیائاڵەت : گیاییێکە وەک ڕکێشە بۆ در-گاکردنی دومەڵ بەکەڵکە. (نوعی‌گیاه)
گیاتەناف : گیاگوریس؛ بەرگوواڵە؛ گیاییێکە تەنافی لێ‌دروستدەکەن. (کنف)
گیاتیراوی :لە ناوچەکانی مەهاباد و سۆما-برادۆست و ورمێ، (گەڕی‌گیا)ی پێدەڵێن و بۆ مالیجەی برینی‌کۆن‌بوو(تیراوی) بەکەڵکە. (سیزاب)
گیاخاو : گیاییێکە لە بەیبوون دەکا بەڵام ڕە-نگی گوڵەکانی شینی مەیلە و سپین. (نوعی-گیاه)
گیاخاوێن . گیادڵژان؛ لە ناوچەی مەهاباد زۆرە و دەرمانی بای‌سوور و کوڵنجە. (گیاه-دم‌روباه)
گیادۆخوا : پسڵی؛ گیاییێکە دۆخەوای لێ-دروستدەکرێت و دژی کرمی ڕێخۆڵەیە و زەرداوبەرە. (گندنای‌کوهی)
گیاسنجابی : گیاسالمە؛ لەبەستەنی (دۆندرمە) چێکردندا بەکەڵکە و دەقاقی قوماشی پێ‌دە-دەن. (گیاەسلمە؛ ؟علب؛ این فونت حرف پنجم فارسی‌ندارد)
گیاسەفرا : گیاییێکە بۆ ڕەوانی باشە. (گیاهی-استملین)
گیاکەو : تاڵشک؛ تاڵژگی؛ دەرمانی لابەری زەرداو و مالیجەی زەردووییە؛ گەڵاکەی خۆراکی کەوە. (کاسنی‌تلخ؛ امیرون)
گیامایەسیر : ڕێزەلەگایانە؛ گیاییێکە گەڵاکانی وەک دەرزی باریکە و بەرەکەی وەک فندق وایە و کوڵێندراوی بۆ شۆردنی برین بەکەڵکە. (ریس؛ ابهل)

گیامشک : گیایێکی باڵابـەرزە و گوڵـەکـەی ژەهرداره ئاوی‌کوڵێندراوی بالووکەی پێـدە-شۆن بەموفایە. (مازریون)

گیامەنگە : گوڵ‌بەفرین؛ گیایێکی باڵـابـەرزە، بۆ کەم‌خوێنی کەڵکلی هەیە. (گل‌رازک)

گیان‌سـەگ : [ئـاوەڵنـاو] (ب) سـەگ‌گیـان؛ گیان‌سەخت. (جان‌سخت)

گیپش : [ئـاوەڵنـاو] تێکسـمڕاوی سـکزل و قەڵەو.خیپش. (چاق‌شکم‌گنده)

گیتار : اند؛ فد؛ فرد: [نـاو] ئـامیرێکی شـەش تـەلـی موسـیقایە و تایبـەت بـە ئورووپایـە. (گیتار)

گیتاری‌کارەبایی : گیتارێک کە بە کارەبـا دە-نگەکەی بەرز و نەوی دەبێتەوە. (گیتاربرقی)

گێج : [ئاوەڵناو] گێژ؛ (ب)حـوڵ؛ گێژوگـەوج؛ گێل. (گیج)

گێج‌بازی : [ناو] تاقمانەجووت. (دڵوەگـێج - بازی چەپگەرد بـازیش وەرد، جفـت ئـارەزوو کـەرد چـەپگـەرد تـاق ئـاوەرد). «مـەولـەوی» (بازی‌تک‌وزوج)

گێجگا : [نـاو] لاجانـگ؛ شیشـنگ؛ جینـگ؛ جاینگ؛ گێجەنە؛ بـەینـی قـولینچکی‌چـاو و گوێ. (شقیقه)

گیجەلوول : [ناو] ناخی تەندووره و گێژەنـی-ئاو؛ بەرزبوونەوەی ئەستوونی گێژەڵووکە؛ تە-ندووره؛ گێژەڵووکە. (گردباد؛ گرداب؛)

گیرامەبۆ : نەیێتەدی؛ قبـوول‌نـەبێت؛گیرانـە-بێت. (مستجاب‌نشود)

گێڕوویڕ : [ئاوەڵناو] لاروخێچ؛ چەپوچیر؛ گێڕ-وڤێڕ. (کج‌وموج)

گێرەپێکردن : [چاوگە،ت] (ب)هات و چـوێ زۆر پێکردن.(سردواندن)

گێرە شێوێن : [ناو،بـک] کارتێکـدەر؛ ڕەوتـی کار گۆڕین و شێواندن. (کار بهم زن)

گێزراندن : [چاوگە،ت] وەدرەنگ‌خسـتن؛ وە-دواخستن؛ گنخاندنی‌کات. (عقب‌انداختن)

گێژگێژەکانێ : [ناو] باوەخولێ. (بـازی‌چـرخ-خوردن بدورخود)

گێژن : [ناو] تەنووره؛ گێژاو؛ گێجەلوول؛ تـە-لەزگە؛ گێجاو. (گرداب)

گێژو وڕ : [ئاوەڵناو] گەلحو؛ گێژ؛ گێج؛ حـوڵ؛ گێل‌وگەوج. (گیج)

گێژیی‌دەلیا : [ناو] گێجیی‌دەریا؛ دڵ‌تێکچوون و سەرلە گێژەوەهاتن لە ناو پاپۆڕدا؛ دەریاگە-زی؛ دەریا بردوویی. (دریازدگی)

گیشا : ژاپۆن‌د؛ فد؛ تد؛ [ناو] هـەنـدێ ژنـی ژاپۆنی کە بارهێنراوان بۆ ڕابواردن و خزمەت بە پیاوان. (گیشا)

گیشە : فرد؛ فد: [ناو](۱)ئودەی چووک بە دە-ربیجەیێکەوە بۆ فرۆشتنی پسووله؛(۲) گیشە-ی بانک: باجەی‌بانک. (۱و۲،گیشە)

گیڤـەگیـڤ : [دەنگـەنـاو] صـدای بادتنـد. (صدای‌بادشدید)

گێلاس : [ناو] گێڵاس؛ لە گڵاسی ئینگلیزیە وەهاتووە؛ پەرداخ؛ شەربەی تایبەت بۆ مەی نۆشی. (گیلاس)+

گێلنـای : [چاوگـە،ت] سـوورپێدان؛ زڤڕیـان؛ خول‌پێدان. (چرخاندن؛گرداندن)

گیلەکی : [ناو] زمان و جەمـاوەری خـەڵکـی گێڵان لە باکووری ئێران. (گیلکی)

گێلەندی : [ناو] مەڵەغان.(داس‌دستەبلند)
گێلەن‌گێدەن : فد؛ تد: [ناو] لە تورکییەوە هاتووە (واتاهاتن‌وچون)، گەلەن گەدەن؛ ئامێرێک لە تفەنگدا کە بە هاتوچۆیێک فیشەک دەخاتە بەر خانی چەک. (گلنگدن)
گیندە : [ناو]کونک؛ گشتک؛ ئەنگووتک. (چوونە)
گێنگڵ : [ناو] قەفخواردن؛ ئاڵقە پێکان. (چمبرە)+
گینی : [ناو]گوێنی؛ گەون؛ گێنی. (گون)
گیو : ناوەبۆ پیاوان؛ ناوی کوڕی گـودەرز لە شانامەدا؛ ناوی مامۆستا گیو موکریانی زانا و فەرهەنگ نووسی پسپۆڕ و بە توانای کورد.کە بە تێکۆشانی(کوردستان،موکریانی)کیژە ڕووناکبیرەکەی فەرهەنگی(گیو موکریانی) چاپ کرا. (گیو)
گیوا : [ناو] شینایی؛ گیا؛ گیواو. (گیاه)
گیواوەمانگاز : [ناو] مارەجیوە؛ مالەجێوە؛ گیایێکە دەخورێت؛ دەڵێن ئەگەر کەسێک مار بیگەزێت کوتراوی مارەجیوە دابنێنە سەر شوێنی مارگەستە بەکەڵکە. (مارچوبە)
گیوەهەڵکێشان : [چاوگە،ت] کڵاش هۆڕ- کێشتەی؛ (ب) خۆتەیارکردن بۆ ئەنجامی کا- رێک. (گیوەراورکشیدن)

گارانتی : اند؛ فد؛ فرد: دستەبەرایەتی؛ کـاری وەئەستۆگرتنی ڕاپەڕاندنی گیروگرفتی کـەل-وپەل، پاش فرۆشتنی لەلایـەن فرۆشـیارەوە. (گارانتی)

گارد : اند؛ فد؛ فرد: وشە بیانییە پارێزەر؛ یەک یان چەندکەس کـە پـارێزەری گیـانی کـە-سێکن. (گارد)

گارسۆن :اند؛فد؛فرد:پێشخزمەتی چێشتخانە و ڕەستۆران. (گارسن)

گاز : فد؛ فرد؛اند: قوماشیتاییـەت بـۆ بـرین پێچان. (گاز)+

گالوانیزە : تەنەکەیێ کە بە ڕۆح سـوواخدراوە (بەسەریدا کێشراوە و ئاودراوەتەوە و ژەنگ-ناهێنییێ)، زیاتر بۆ داپۆشینی سەربان بـە جـە-مەلۆن. (گالوانیزە)

گرافیست : اند؛ فد؛ فـرد: پسـپۆڕی هونـەری گرافیک. (گرافیست)

گرافیک : اند؛ فد؛ فرد: هونەری بە دیهێنانی نەخش و وێنە بە هێل و نووسراوە. (گرافیک)

گرانیت : اند؛ فد؛ فرد: جۆرێک بـەردی خـارا بۆ ڕووکاری بینا بەکەڵکە (گرانیت)

گریپ : فرد؛ فد: پەرکەم؛ پەتـا؛ هـەڵامـەت؛ ئەلامەت؛ ئارسم؛ هاڵمەوت؛ پەسیو؛ پەرسـی؛ زوکام؛ درم. فرفینگ؛ نەخۆشینێکە؛ بەهۆی سەرمابوونەوە تووشی مرۆ دەبێت و گیرۆدارە. (گریپ)

گریم : فرد؛ اند؛ فد: گۆڕانی شێوەی لـەش و سەرچاو بە شێوەی دڵخوار؛ زیاتر لە شانۆگە ری و ئاکتەری سینەمادا. (گریم)

گریمۆر : فرد؛اند؛ فد: پسپۆڕی کـریمکـردن. (گریمور)

گڵگیر : فد: [ناو] سەرقاپێکی کۆمە لە سـەر تەگەری سەیارە بۆ بەرگری لە قوڕ پرژانـدن. (گلگیر)+

گڵگیرسازی : [ناو](۱) ڕەوتی دروستکردنـی گڵگیر. (۲) ڕێکوپێک کردنـەوەی گڵگیـری لاروخـێچ بـــوو. ۳) کارگـــەی ئـــەوکـــارە. (گلگیرسازی)

گلۆکۆز : فد؛ فرد: [ناو] قەندیتریێ و هەندیێ میوەیتر؛ لە هیدرۆلیزی نیشاستەیـش بـەر-هەم دێت و لە ڕەوتێکی تایبەتدا دەبێتە شە-ڕاب و لە پاشان بـە گـەڕانـەوەی بـە هـۆی قارچکیێ کە لە هەوادا هەیـە دەبێتـە سـرکە. (گلوکز)

گودبایپارتی : اند؛ فد؛ فرد: [ناو] میوانیی ماڵێ ئاوایی؛ وەڕێخستنی میوانی بۆ بەڕێکردن و خوداحافیزی لە کەسێک کـە دوور دەکـە-وێتەوە. (گودبایپارتی)

گوزارش:گوزارشت؛ ڕاپورت؛ خەبەردان؛ گێڕ-انەوەی خەبەروباس. (گزارش)

گوزارشگەر : [ناوبک] هـەواڵنێـر؛ خـەبـەر-نووسیگۆڤار؛ هـەواڵـدەر؛ شـۆڵی هـەواڵنێـر. (گزارشگر)

گوڵف : اند؛ فد: [نـاو]یارییێکـە بـە گۆچـان و توپێکی گچکە دەکرێت و تایبەت بەولاتـانی ئوڕووپییە. (گولف)

گووبلەن : اند؛ فد؛ فرد: [ناو] وێنـەی بـە دە-
زووی ڕەنگاورەنگ چنراو؛کووبلەن. (کوبلن)
گەردنکـەش : [ئـاوەڵنـاو](١)یـاخی؛ (یـاغی؛
متمرد). (٢ب) سەرکـەش؛کێـوی زۆر بڵینـد.
(کوەسربفلک‌کشیده)

گیربۆکس : اند؛ فد؛ [ناو] جەعبە دەندی سە-
یارە. (گیربکس)
گیۆتین :[ناو] کەرەسـتەی قرتانـدن؛ کـەرە-
ستەی ڕێـک بڕینـی قـەراخـی‌کتێـب؛ لـەڕا
بووردوودا لە ئوڕووپا سەری تا وانباریان پێـدە-
قرتاند. (گیوتین)

# ل

لا :[ناو] (١) لۆ؛ تاڵ؛ ڕشته؛ (خاتوون‌تەشی دە-ڕێسێت، خاوکانە یان دوو لایە). «فۆلکلۆر» (رشته)(٢) کن؛ نک؛ پاڵ؛ تەنیشت. (طرف. پهلو)

لا : [ناو] لە مۆسیقادا ناوی چووارەمین نۆتە. (چهارمین‌نت‌موسیقی)

لائیک :[ناو] فرد؛ اند؛ فرد: حوکمەتی لائیک : حوکماتی تاقمێک‌کە دینی نییە(جیاواز لەدین). (لائیک)

لاباز : ئەسپێک کە ڕاستەوڕاست نەڕوا و بە لاتەنیشت و لابەلادا پەل باوێ. (بەطرف‌پهلو-راه‌رفتن‌اسب)

لاپرەسەن : [ئاوەڵناو+ ناو] سەرەڕۆ؛ حاڵەتی بێ‌تێفکرین‌کارێک‌کردن؛ مل بەکارێکەوەنان بێ‌سەرنج و تێفکرین؛ چەکەرداسی؛ بێ-تاوتوێی‌کردن و هەڵسە نگاندنی چاکی و خراپی و ئاکام، خۆ خستنەناو کار یان گێچە-ڵێکەوە؛ (ب)گوێ بە ڕەسم و ڕسووم نەدەر. .(بدون تفکر و برآوردکارکردن‌ودرنظرنگرفتن-آداب‌ورسوم؛بی‌تفکر)

لاپێ : [ناو] لێژ؛ جێگەی‌لاپاڵ؛ وەک: ڕێگای لیژولاپاڵی داوێنی کێو. (راه‌مایل‌برکمرکش‌کوه)

لاپیش :[ناو] وەرزی پاییز. (پاییز)

لاتانە : (١) وەک‌لات؛ لات‌ئاسا.(لات مانند). (٢) شەڕفرۆشی. (شارلاتانی)

لاتانە فرۆشتن : شەڕفرۆشی؛ لاتێک بۆ ئەوەی سامانێکی دەست‌کەوێت بەهانە بەکەسێک بگرێ و شەڕی بەسەردا بسەپێنێ. (پاپیچ-کسی‌شدن؛ تحمیل‌کردن دعوا)

لاج‌لاج :[ناو] قوماربازێکی زۆر بەناویە و قومارزان بووە؛ (ب)کەسێک کە زۆر قوماربازبێ بە لاج‌لاجی دەشوبهێنن. (لیلاج)

لاجوور : [ئاوەڵناو] غەریب؛ ناشارەزا؛ نابەڵەد. (ناآشنا)

لاچێ : (١)[بەند] ئەڕاچێ؛ ئەڕاچە؛ بۆچی؛ لۆ چی. (٢) بچێتە ئەولاوە؛ لابچێ. (برای‌چە؛ برودکنار)

لاخستن : [چاوگە،ت](١) جۆرێک دزی‌کردن. (٢) لێ‌قرتاندن؛ لە خەرجی ڕۆژانە پاشەکەوت-کردن و گلدانەوە زیاتر بە نەهێنێ. (کنار-گذاشتن؛ پس‌اندازکردن وآینده‌نگری)+

لاخوراو :[ناو،بەر] هەر شت کە لایێکی خورابێت؛ میوەی قەپاڵ لێگیراو؛ (ب)میوەیێ کە نیوەی داعبا خواردبێتی. (میوه‌گاززده)

لاخوز : [ناو]گڕکەیێک کە لایێکی چووبێ بە چاڵاو لەو جێگەدا ناسکترە و تاڵە. (گرمکی‌کە-یک‌قسمتش‌گودوتلخ‌باشد)

لادایی : لاڕێ‌کردوو؛ لەڕێ‌لاداو؛ ژ ڕێ دەر-کەتی؛ هاتیە بەرکەنارکرن. (منحرف‌ازراه)

لادگا : [ناو] لادێ؛ گوند. (قریه)

لادەست : کەناردەست؛ لبال؛ پاڵ‌دەست؛ لەنک قومارکەران دانیشتن و تماشای یاریکردن؛ (-

لادەست زەینی ڕوونترە). (بغل‌دست)
لارگۆ : [ناو] دەستەواژەی مۆسیقایە واتا ئاهە-نگی زۆر ئارام و لەسەرەخۆ. (لارگو)
لارولۆچ : [ئاوەڵناو]لارولەوێر؛ خواروخێچ. (کج-ومعوج)
لاڕوس : ناوی کتێبی فەرهەنگی بەناوبانگی فە-ڕانسە. (لاروس)
لارەدیای : لاتیل ڕوانین. (چپ‌چپ‌نگاه‌کردن)
لاڕێ : [ناو] ڕێگای تەریک؛ کوێرەڕێ؛ قاچاخەڕێ؛ لقە ڕێگایێ کە لە ڕێگای گەورەتر جوێ دەبێتەوە. (راەفرعی؛کورەراە)
لاریانەوە : [چاوگە،ت]لارەولارکردن؛ خۆ شە-نگاندن و بە ناز و قەمزە ڕۆیشتن. (خرامیدن)
لازانیا :ناوی خۆراکێکی ئیتالیاییە؛خواردنێکە بە شێوەی پەڕەگەلێک لەگەڵ هەرشتە فەڕە-نگی و ڕبی(دۆشاوی)تەماتە و پەنیر و گۆشتدا چێ‌دەبێت؛ لە کوردستانیش بووە بەباو، دروستی دەکەن. (لازانیا)
لازوان : [ئاوەڵناو] لاڵەپەتە؛ بێ‌زوان؛ (ب) نە-زان؛ ناحاڵی. کەم‌ئاوەز؛ لەزمان حاڵی‌نەبوو. (الکن؛ زبان نفهم.کم‌عقل)
لاژەلاژ : [ناو] ئاخاوتنی خاوەخاو؛ گەمژەگەمژ قسەکردن. (من‌ومن‌حرف‌زدن)
لاس :[ناو] دارە سنجووی نێر.(درخت سنجدنر)
لاس : [ناو] هەوریشمی نەزۆرباش؛ ناوە بۆ پیاوان. (ابریشم‌پست؛ اسم‌مردانە)
لاساوە : [ناو] ڕێژنەباران؛ شەستەباران؛ وەک گۆزەی سەربەرەوخوار بارینی باران. (باران‌تند)
لاس‌وخەزاڵ : بەیتێکی زۆر بەناوبانگی کوردە-وارییە؛ ناوی دوو قارەمانی ئەوبەیتە. (نام-آوازیست‌مشهور)
لاشاو : [ناو] لێشاو؛ لافاو؛ سێڵاو؛ لەهی؛ تیژاف؛ لێمشت؛ لاخێز. (سیلاب)
لاشۆ : [ناو] ئافەتێکی‌کەندووی هەنگە کە قڕیان‌دەکا. (آفت‌زنبورعسل)
لافکەر : هێوچی؛ خۆ پەسن‌کەر؛ مەدحا خۆکە-ر. (لاف و گزاف‌کنندە)
لاڤایی : [چاوگە،ت]لالیانەوە؛ پاڕانەوە؛ لاڵانە-وە. (لابەکردن)
لاق‌گرتن : [چاوگە،ت] (١) لە زۆرانبازیدا پاگرتن. (زیرگرفتن). (٢) پاچە بردن بەدەما. (ب) تووڕە بوون و جوێن پێدان. (پاچەگرفتن). (٣) سەگێک کە گاز لە لاقی کەسێک بگرێت. (پاچەگرفتن)
لاقوزە : [ناو] لاخوزە؛ لاخوز؛ گندورەییێکە-لاییکی چووبێ بەچاڵا و لەو شوێنەدا پێستەکە-ی ناسکترە و تاڵە. (گرمک‌کەازنقطە ای-پوستش‌نازک‌وتلخ‌وفرورفتەباشد)
لاق‌ولۆق : [ناو]گورگە لۆقی ئەسپ؛ لۆقەی ئەسپ کە لە یورغە توندترە؛ یۆرتمە. (یرتمە)
لاق‌ولەتەر : [ناو،ت] قاچ‌وقول؛ خوارەوەی لە-ش. (پا.پایین‌تنە)
لاقەپرغە : [ناو،ت]لاقەبرغە؛ کورتەکەلەکە؛ خاڵیگە. (پهلو)
لاک : [ناو](١)لاکی مۆرکردنی نامە و بەستە و کیسەی پۆستی. (لاک)
لاک‌وئاڵکۆڵ : [ناو] شارلاکی تواوە لە ئاڵکۆڵدا؛ ماکێکی سوور لە ژێرسکی مێرووی(تاکارلاکاو) دەتکێ و لە ئاڵکۆڵدا دەتاوێتەوە بۆ ڕەنگ-کردن و بریقەدارکردنی تەختە و شتی

دروست‌کراو له دار به‌کاری دێنن. (لاک‌الکل)
لاک‌ومۆرکردن : [چاوگه‌،ت] داخستنی ده‌رکی هه‌ر شت (به‌تایبه‌ت پاکه‌تی نامه‌)، به‌گه‌رم- کردنی لاک له سه‌ری و مۆرپیانان؛ شه- قلکردنی لاکی تاواوه له سه‌ر پاکه‌ت یان قوفلی ده‌رکه‌. (لاک‌ومهر)
لاکه‌وتن : [چاوگه‌،ت]که‌وتنه قه‌راخ؛ شتی ئاو ئاورده‌، که‌وتنه که‌نار؛ به‌رکه‌نار بوون. (به- ساحل‌آمدن؛ برکنارشدن)
لاکێلْ : [ناو] خه‌ڵکی گوندێک‌که زه‌وینی - گوندێکی‌تر بکێڵێت. (اهل‌دهی‌که‌زمین‌ده- دیگری‌رابکارد)
لاکی‌ناخوون : [ناو] جۆرێک لاکه بۆ ڕه- نگاندنی ناخوونی ژنان. (لاک‌ناخون؛ مانیکور)
لاگوێل : [ناو] نیوه‌گوێل؛ لاوێچ؛ پڕ له‌پی ده- ستێک له هه‌ر شت. (پریک‌کف‌دست )
لالانگی : [ناو]لاله‌نگی؛نارەنگی؛نارنگی؛ فشه‌- پڕته‌قالْ. (نارنگی)
لاڵبیه‌ی : [چاوگه‌،ت]لاڵبوون؛ بێ‌زبان بوون؛ (ب) قسه‌نه‌کردن؛ وس بوون. (لال‌شدن)
لالکه‌: [ناو] لالک؛لاڵیان؛ پاڕیان. (لابه‌)
لالنگی : [ناو] فشه‌پڕته‌قالْ؛ نارنگی. (نارنگی)
لالۆزا : [ناو] خاڵۆزا. (پسردایی)
لالێکردنه‌وه : [چاوگه‌،ت] (ب)مه‌لاعه‌زه‌کردن؛ ده‌ست‌گرتن و کۆمه‌ک پێکردن. (مراعات- کردن؛کمک‌کردن)
لام : [ناو]کوته شووشه‌یێکی ناسک و چکۆله‌یه بۆ له سه‌ردانانی نموونه‌گه‌لی ئاڕوینکاری (له تاقیگه‌) که له ژێر میکروسکۆپ (هووربین)دا داده‌نرێت؛ (نموونه له‌توێ لام و لامیدا داده- نرێت). (لام)
لاما : (١) نازناوی پێشه‌وایانی ئایینی لامایی له ئایینی بوودایی‌دا. (لاما)
لاما : فرد؛ اند؛ فد: وشتری بێ‌دووگ. (لاما)
لامژ : چه‌وره‌؛ خۆبه‌خێوکه‌ر. ژیان له سه‌ر خوان یان له‌شی زینده‌وه‌رانی‌دی؛ وه‌ک کرمی ڕیخۆڵه و گه‌نه و ئیتر. (انگل)+
لامژ : [ناو] ڕووه‌کێ که ڕیشه‌ی ده‌چه‌قێنێته ساقه‌ت و ڕیشه‌ی ڕووه‌کی‌تر و به شیله‌ی په- روه‌رده‌کراوی ئه‌وان ده‌ژی و له ئاکامدا لا- وازیان ده‌کات یان وشکیان ده‌کات. (انگل- گیاهی)+
لامژ : [ناو]کارژیله و به‌رخ، که جگه له دایکی خۆیان مه‌مکی ئاژڵی دیکه ده‌مژن. (بزغاله‌ای که‌ازپستان‌غیرمادرشیرمی‌خورد)+
لامژ: له جگه‌ره‌ی خه‌ڵک کێشان. (از- سیگارمردم کشیدن)
لامل : [ئاوه‌ڵناو] نه‌گونجاو؛ که‌ڵه‌وه‌کێش؛ سه‌- رکێش؛ نافه‌رمان؛ (ب)نه‌هاتنه سه‌ر بار و ڕا؛ لاسار. (متمرد)+
لاموجیم : لاموجووم؛ پرسینی هۆی ئه‌نجامی کارێ و سه‌ربادان له ئه‌نجامدانی ئه‌وکاره. (تمرد)
لامه‌سه‌و : (لا) وشه‌یێکی ئاره‌وییه‌، به واتای(بێ؛ نا) و (مه‌سه‌و)یش له مه‌زهه‌بی ئاره- وییه و کوردکاری بووه‌؛ لامه‌زهو؛ لامه‌سه‌ب؛ واتا بێ‌دین. (لامذهب؛لامصب)
لامی : [ناو] کوته شووشه‌یێکه له تاقیگه‌ی پزیشکیدا که نموونه‌ی تاقی‌کردنه‌وه له‌توێ لام و لامیدا داده‌ندرێت.(لامی)> لام

لان : لایەن؛ لانـی ژن لاوازاه : لایـەنـی ژن لاوازە. (طرف)+
لانجین : [ناو] دۆڵەی هەویر؛ سووێنە؛ تەشـتی هەویرتێدا شێلان. (تغار.)
لانچێنە : [ناو] پنە؛ پنەکەی گونکەهەویر لـە- سەر پانکردنەوە بۆ نان‌کردن. (تختەخمیرپهن- کردن‌نانوایی)
لانکۆڵێ : [نـاو] گـۆرانییێکی کوردییـە. (نـام- آهنگی‌است)
لانەولان : [ناو،ت] ئەم‌شان و ئەوشان؛ لانە ولانت کەم، شانەوشانت کەم شەو لە نێو جێ- دا. «فۆلکلۆر» (ازاین‌پهلوبه‌آن پهلوغلتاندن)+
لانی‌کەم : هیچ‌نەبێ؛ کەمترین؛ بەلانی‌کەمەوە دوو ڕۆژم پێدەچێت (حداقل)
لاوا بوون : لای کەسێک وابوون؛ بە ڕای کە- سێک وابوون؛ گومان‌کردن؛ لام‌وایە: پێم‌وایە. ( گمان‌کردن؛ استنباط‌کردن)
لاونای : [چاوگـە،ت] لاوانـدنـەوە. (نـوازش- کردن)
لاوەران : ناوچەیێکە نزیکی پاوە. (منطقـەای- نزدیک‌پاوه)
لاوێردە :[ناو] ئامێری دروێنە. (وسیله‌دروکـردن ودروگری)
لاهێر : [ئاوەڵناو]لاهۆرە؛ لەندەهوور؛ لەندەهۆر؛ زەبەلاح. (لندهور)
لایاوا : لەکەسێکەوە گەیشـتن؛ (ب)[ئـاوەڵنـاو] گێرۆدار؛ لەلاگەیشت. (مسری. واگیر)
لای ژووروو : دابێکی ئەنـدازیاری و نـەخشـە- کێشییە هەمیشە لای باکوور لە خەریتـەدا دە- خەنـە لای ژوورەوە و باشـوور لـە خـوارەوە و خۆرهەلات لە ڕاستەوە و خۆرئاوا لە لای چـە- پەوەیە؛ لە ئاخەفتنیشدا بووە بە باو، واتا باکوور؛ کورمانجی‌ژووروو : کورمـانجی‌بـاکوور. (کنایـە ازشمال)
لچ‌داژەندن : (ب) مۆن‌بوون؛ نوواندنی ناڕەزایـی و خەمناکی. (نشان دادن حالت‌ناراحتی)
لچ هەڵقوتاندن : [چاوگە،ت] لچ هەڵقورتاندن؛ لێو هەڵقرچاندن؛ دەربڕینی ناڕەزایی و وەڕەزی. ( نشان دادن‌نارضایتی با ورچیدن لب)
لچەنان : قەراغە نان؛ لێواری نان. (کنارەهای- نان،لبەنان)
لرخە : دەنگی هەناسە هەڵکێشانی ئاژەڵی سەر بڕدراو. (خرناس)+
لرفاندن : [چاوگە،ت] (۱)گلاندن؛ هەڵگلاندن؛ بەلەزخواردن. (باشتاب‌خوردن)(۲) دەنگی لرفە- ی وشتر و سێڵاو.(صدای غریدن شتر و غرش سیل)
لرفاندن : [چاوگە،ت]دەنگی وشتر؛ لرفـەلـرف- کردنی‌وشتر؛ دەنگی سێڵاو. (صدای‌شتر)
لزگە : [ناو] هەودای موورو پێوەکراو؛ هۆنراوە- ی پەلکـەی مـووی سـەر؛ جـەلـە و هـۆنراوە. (رشته موی‌بافته؛گیسوی بافته شده)
لفکە : [ناو] کلکەی سۆرانی؛ کلکەی فەقێیانە. (دنباله سرآستین پیراهن‌کردی.)+
لڤای : [چاوگە،] لوای؛ ڕۆیشتن. (رفتن)
لق‌وپۆ : [ناو] لک و سەرلک؛ لک و پۆپ؛ پڕژ و شوول و گەڵای دار؛ لقی‌قـەوی و لقـی‌ناسـکی دار؛ گولییف؛ چقک. (شاخ‌وبرگ)
لکنـای : [چاوگـە،] لکانـدن. (چسـب‌کـردن؛ متصل‌کردن)

للیه :[ناو] للپ؛ شەپۆل؛ لیپ؛ پێل؛ پێل. (موج)
لمارته : [ناو] لم؛ زیخ؛ لیم. (شن)
لمه : [ناو] سک؛ زگ. (شکم)
لندوو : [ناو] ماستی گرێگرێ لە نێو ماستاودا کە باش نەشلەقابێ. (دوغ‌صاف‌نشده؛ ماست‌حل‌نشده‌داخل دوغ)
لنگ‌جووت‌کردن : [چاوگە،ت] (ب) بۆ مردنی مرۆڤی ئاکارخراپ دەڵێن. (کنایەازمردن)
لواسه : [ناو] لۆچ؛ لواسەی دەست: لۆچی دەست؛ لاوێچ. (کف‌دست)
لوای : [چاوگە،] ڕۆیین؛ ڕۆیشتن. (رفتن)
لۆبر : [ناو] تەناف یان گوریسێ کە لە چەند لۆ(تاڵ)پێکهاتبێ و یەک یا دوو تاڵێ پچڕابێ. (طناب‌چندرشته‌که‌یکی‌دوتارش‌پاره) (شده‌باشد)<تابر
لۆپ : [ناو] پلاس؛ جۆرێک پێخەف و ڕاخەری چندراو لە بەن یان دەزوو. (نوعی‌گلیم‌نازک‌برای‌زیراندازیارواندازا)+
لۆپ : [ناو] جیکەنەی هەلاجی. (پتک‌حلاج)+
لۆپژەن : [ناو] جیکەنە ژەن؛ هەلاج. (حلاج)
لۆتک : هەڵبەزین. (پریدن.بالاانداختن)
لۆتکین : هەڵبەزینەوە؛ هەڵخستنەوە. (بال‌پریدن)
لۆتی زەلزەلە : [ناو] تەناف‌باز؛ ئەوەی لە سەر تەنافی هەڵخراو یاری‌دەکا. (بندباز)
لۆچ تێکەوتن : [چاوگە،ت]چرچ تێکەوتن؛ پەیدابوونی چرچ‌ولۆچ لە سەروچاو یان لە هەر شت. (چین‌افتادن)
لۆرکێ : ناوی‌گۆرانییێکە لە کوردی و تورکیدا. (اسم‌آهنگی‌است‌درکردی‌وترکی)
لۆری‌لۆری : (بەند) ئارام‌ئارام؛ لە سەر خۆ ڕۆیشتن؛ لۆری‌لۆری هاتەوە سەربۆری. «فۆلکلۆر» (آرام‌آرام)
لۆس : [ناو] شۆر؛ مانگایی کە کەڵەگا زۆری سوار بووبێتن و بەدەستیانەوە وەڕەز بووبێ و ئەیتر بۆیان نەوێستێ. (جفتگیری کردن‌زیاد‌مادەگاو؛ ناوی پزیشکییەکەی، بیم‌فومانیا)یە+
لۆس : [ناو] لۆسە؛ کاریتەی قەوی. (بالار‌کلفت)+
لۆفەکردن : حەول‌دان؛ تەقالاکردن؛ تێکۆشان. (تقلا)
لۆق‌درێژ : [ئاوەڵناو] لاق‌درێژ؛ (ب)درێژی ناقۆڵا. (لنگ‌دراز.آدم‌درازقد)
لۆقمەقادی : [ناو] لوقمەقادی؛ لوقمەقازی؛ لوقمەگازی؛ جەغزی هەویری شەکر تێکراوی پان و ناسک و چووک، کە کاکڵە گوێز و بادام لە تۆیدا دادەنێن و دەیپێچنەوە و لەڕۆندا سوریدەکەنەوە. (لقمەقاضی)
لۆکەمێشە : گیاییێکە بەرەکەی کورکدارە و لە لۆکە دەچێ. (نوعی‌گیاه)
لۆلک : لۆرک؛ پەرپەڕۆک؛ پەپوولە. (پروانه)
لۆنگ : [ناو](١) بەرماڵ و فۆتەی شڕی سەرشانی هەژاران؛ (شەرتە لە داخت لۆنگی لە کۆڵ کەم،لەم شارە بڕۆم بەر چاوت چۆڵ کەم). «فۆلکلۆر».(٢) فۆتەی گەرماو.(لنگ‌روی‌شانە‌بینوایان؛ لنگ حمام)+
لووت بەلووتەوە تەقین : (ب)لووت‌وبزووت تووشی کەسێک بوون. (ناگهانی‌برخوردکردن)
لووت ڕەق بوون : هەستی بەزین و قسە پێ‌نەمان لە جوابی کەسێکدا؛ لەجێی خۆ وشک-

بوون. (درجاخشک‌شدن)
لووت‌بەران : قەپۆزبەران؛ لووت‌کەوانی. (دماغ-کمانی)(ب)[ئاوەڵناو] بەپۆز؛ بەدەعیە؛ لووت‌بەرز؛ بەفیز؛ بادیهەوا. (متکبر)
لووت‌کەڵەشاخ : (ب)[ئاوەڵناو]کەپۆزل؛ کونەلووت هەراو. (دماغ‌گندە؛سوراخ‌دماغ‌گشاد)
لووت‌ماسیاو : لووت‌هەڵماساو؛ ناڕازی؛ مۆن؛ گرژ؛ تووڕە. (عصبانی)
لووت‌وپووت : [ناو،ت](١)قیزوبیزکردن لە هەندێ خۆراک. (بدغذائی)(٢) <ف هن.+
لووت هەڵماساندن. [چاوگە،ت] لووت ماساندن؛ مۆن‌بوون؛ نیشانەی ناقایلی. (اظهار-نارضایتی)
لووچکین : [چاوگە،ت] پاک‌کردن؛ توێکل-داماڵین؛ توێخل لێکردنەوە. (پوست‌کندن؛ پوستەشکستن)
لوورین : [چاوگە،] لووراندن. (زوزەکشیدن)
لووساوکەبەستن: تراو بە لووزەوە هاتن؛ (ب) خوشینی ئاو بە سەرعەرزدا؛ پلووسک پەڕین. (آب‌بافشارآمدن)
لووشتەی : [چاوگە،] هەڵمژین؛ وەک ئاومژینی قوماش؛ هەڵلووشین. (جذب‌کردن؛ مکیدن)
لووشە :[ناو] بەکەڵکترین گیای بەهاری بۆ لە-بەین بردنی کرمەک و کرمی ڕیخۆڵە. بەتایبەت دۆخەواکەی. (والک)+
لووشەگوڵ : [ناو] گیایێکە دژی ئێشی ئێسقان و جومگەیە؛ لە جەنگەڵەکانی مەریوان و نۆدشە زۆرە؛ بۆ برین و پەنمانی لێواری گەدە و ڕیخۆڵە بەکەڵکە. (گل‌اختر)
لوول پەڕ : لولو پەڕ؛ لاولاو. (نیلوفر)
لوولەسۆبە : لوولەکوورە؛ قۆڵەکوورە؛ لوولەی دووکەڵ‌کێشی سۆبا. (لولەبخاری)
لە ئاو ترسان : حاڵەتێک لە نەخۆشینی هاری و کێشانی بەنگ و حەشیش کە مرۆڤ تووشی-دەبێ و لە ئاو دەترسێ. (از (آب‌ترسیدن)
لەئاوکەرەگرتن : (ب) مرۆی زرینگ و بەرژە-وەندی‌خواز. (انسان‌سودجووزرنگ)
لە ئاو و گل‌دەرهاتن: (ب) لە خەم ڕەخسین؛ گەورەبوون؛ قەیرەبوون؛ پێگەیشین. (ازآب‌و-گل‌درآمدن)
لەباک : [ئاوەڵناو] فرلداخ‌باز؛ دەسیسەباز؛ فێڵباز؛ فێڵەباز. (حیلەگر)
لەبال : [بەند] پێکەوە؛ لەتەک؛ لەگەل؛ پێوەرە؛ لەیەل؛ تەفڕا؛ تەڤی‌هەڤ؛ پێکۆ؛ وەیەکەو. (با-هم؛ پهلوی هم)
لەبتاندن : [چاوگە،ت] لەپتاندن؛ جووڵاندن؛ بزاوتن؛ لەعەرزدان. (تکان‌دادن؛ بەزمین‌زدن)
لەبنی‌کوولەکە دان : [چاوگە،ت]درکاندنی هە موو قسەی شاراوە و درکاندنی نەهێنی. (فاش-کردن‌اسرار)
لەبۆ : [بەند] ژبۆ؛ بۆچی؛ ئەڕا؛ ژۆ؛ ئەڕاچە؛ لۆ چی. (چرا)
لەبەرئەوە : [بەند] بۆیێ؛ ژبەروێ هەندێ؛ ژبەر ئەوە.پۆکێ. (زیرا؛برای‌چە)
لەبەرا : [بەند] (١)لەپێشدا. (قبلا). (٢)ئەولیباسە وا لەبەر دایە. (برتن‌پوشیدە)
لەبەرچاونەبوون : (١)دیارنەبوون. (جلوچشم-نبودن). (٢ب) بێ‌ئەمەکی؛ ناسوپاسی؛ بەچاکە نەزانین. (ناسپاسی)
لەبەردڵان : [ئاوەڵناو] جوان و ڕەزا سووک و

خۆشەویست. (دل‌پسند)
لەبەر وی : ژبەروی؛ لەبەرئەو؛ بەخاتری‌ئەو؛ لەبەرئەوە. (بەخاطراو)
لە بەریەک ڕەوینەوە : گوشاد بوونەوەی ئاڵقە- زنجیر و قەفی گۆچان؛ (ب)قەڵەو بوونی زۆر. (گشادشدن‌حلقه.چاق‌شدن)
لە بیر خۆ بردنەوە : پشت‌گوێ‌خستن. (پشت- گوش‌انداختن)
لەپاخستن : [چاوگە،ت] هیلاک‌کردن؛ ڕەتاندن و شەکەت کردنی کەسێک بەجۆرێک کە نە- توانێ هەنگاو هەڵبێنێ یا خۆ بەسەر پاوە بگرێ. (ازپاانداختن)
لەپاش : لەدوا؛ کارێ کە لە کاتی دیاریکراودا نەکرابێ و وەدوا کەوتبێ؛ پرۆژەکە لە پاشە. (تاخیروعقب‌ماندن‌کار)
لەپاکردن : کردنەپا؛ پاکردنەناو؛ کەوش و گورەوی، کردنەپا؛ پۆشینی دەرپێ و پاتۆڵ. (پا- کردن)
لەپاندن : [چاوگە،ت]فریودان؛ خەڵەتاندن. (فریب‌دادن)+
لەپتە دەرچوون : [چاوگە،ت] لە مەرمەڕێندا هەڵمات لە پللە دەرچوون؛ (ب)هەڵەکردن. (اشتباه‌کردن)
لەپڕێکدا : [بەند] لەپڕدا؛ لەپڕرا؛ ژنشکاڤە؛ نیشکڤە؛ لەهێکڕا؛ لەناکاو. (ناگهان)
لەپزێرین : لەقەمی(ناسناوی) خانی لەپ- زێرین قارەمانی قەڵای دمدم کە دەوڵەتی سە- فەوی هێرشی هێنایەسەر و قەڵای خاپوورکرد و خان تادوایین کەس شەڕیکرد و گشتیان کوژران. (خان‌لپ‌زرین)
لەپژاندن : [چاوگە،ت] بەعەرزدا دان؛ دان بە- عەرزدا. (بەزمین‌زدن)
لەپکە : [ناو] گرێ هەویری وشکەوەبوو لەناو ناندا. (خمیرگره‌شده‌روی‌نان)
لەپن : [ئاوەڵناو] تێرنەخۆر؛ چڵێس؛ زۆرخۆر؛ زکن؛ فرەخوەر. (شکمو؛ شکم‌پرست)
لەپۆک :[ئاوەڵناو] لەباک؛ فێڵەباز؛ فریودەر ؛خاپێن.(فریب‌دهنده)
لەپێش : (١)بەردەم؛ لە پێشی‌دانا : نایە بەردە- ستی (جلورو) (٢) سەرکەوتوو؛ سەرکەتی. (پیروز)+
لەپێش : بەر لە؛ کارێ: کە لە کاتێکی زووتر لە کاتی دیاریکراو، ئەنجام درابێ؛کارەکەمان لە- پێشە، وەدوا نەکەوتووە . (پیش‌بودن)
لەپیک‌وماپیک‌دان : (ب) لە نالْ و بزماردان؛ ڕیا و دووڕوویی کردن. (کنایه ازدورویی)
لە تان و پۆکەوتن :(ب)زۆرکۆن‌بوون؛لەکەڵک- کەوتن؛ زۆر کەنەفت بوون. (فرسوده‌شدن)
لەترە : قەڵافەت و لەتەر؛ زل‌وگۆشتن؛ قەڵەو. (آدم‌گنده‌وچاق)
لەتە : [ناو](ب)کەرتە مەڕێک کە بە جیا بلەوە- ڕێ و تێکەڵاوی مێگەلی گوند نەبێ. (گله کوچک که قاطی گله روستا نشود)
لەتە : [ناو]سوالْ؛ گەدایی. (گدایی)+
لەتەپلی بێعاری‌دان : (ب) ئەوپەڕی بێشەرمی و بێعاری. (زدن‌برطبل‌بیعاری)
لەتەچن : [ناو] سواڵکەر؛ پارسەکەر. (گدا)
لەتەچینی : [ناو](١)سواڵکەری؛ دەرووزەگە- ری.(گدایی‌کردن.) (٢) کوتەکاسەی چینی. (تکه‌سفال‌چینی)

لەتەر : [ناو] تەشی.( هەم لەتەری خەم خول ئاوەردەوە،تای گرژی مەینەت دووباد کردەوە) «مەولەوی». (دوک)+
لەتەرە : >لەتەر
لەتەڕێ : لەتەرە؛ تەشی. (دوک)
لەتەڕیخواردن و لە وشکی نوستن :(ب)خۆش ڕابوواردن و نەبوونی سەرقاڵی و کێشە؛ ئاسوودەیی (خوردن‌وخوابیدن)
لەتەنبار : [ئاوەڵناو] چاڤبرسی؛ چاوبرسی؛ چاوچنۆک؛ چاڤبرچی؛ چکووس؛ تێر نەخۆر. (خسیس)
لەچک لابردن : (ب) بێئابڕوکردن و ئیلاقەکردن و تەجاوەزکردن بەژن. (کنایەازبی‌آبروکردن)
لەچەری : [ناو] پەستی؛ ڕەزیلی؛ قڕنووسی. (رذالت)
لەحنەت : [ناو] لە (لەعنەت)ی ئارەوییەوە هاتووە، لەهەندێ لە دووبلەی فلیمەکاندا وشەی(نەفرەت)بەکاردێنن کە ئەویش کوردی نییە و هەر لەحنەت بەجێترە.(لعنت)
لەحەرام گەڕان: لەحەرام گەڕیان.(۱)خەسار- بوون؛ زایەبوون. (حرام‌شدن.ضایع‌شدن)(۲)بە شوێن شتی ناڕەوا و حەرامداگەڕان. (بەدنبال حرام‌گشتن)(۳)ڕەهاکردن و دەستبەردان لە شتی حەرام، لەماڵی حەرام گەڕێ: مەچۆ بەلایدا، لیگەڕێ (دوریکردن‌ازحرام)
لە خرتکەچوون : [چاوگە،ت]لە ورتکەچوون؛ لە ورکەچوون؛ لەجێچوونی جومگەی لەش. (از- جادررفتن)
لەخشە : [ناو] نەخشە؛ پلان؛ پیلان؛ خەریتە؛ نەقشە. (نقشه)
لەخۆبوونەوە : [چاوگە،ت](ب) زۆر تەعارفکردن؛ خوڵکی گەرمی میوانکردن. (تعارف‌کردن‌زیاد)
لەخۆتەوە : (۱)لەخۆتەوە دەست بە بژارنی هەمووان بکە، دوو واتا دەگەێنێ، (۱/۱)تۆ ئەوەڵ کەس بە ، (۱/۲) خۆت حیساب مە کە و لەکەسی پاڵ دەستی خۆتەوە دەست پێبکە.(ازخودت) (۲)لەخۆتەوە ئەوشەڕەت دامەزراند : لەخۆڕا ئەوشەڕەت دامەزراند. (بی‌سبب)
لەخۆفشین : هووشەکردن؛ تاریفی خۆکردن. (ازخودتعریف‌کردن)
لەخۆیوێ : (۱)لەخۆیڕا؛ (۱/۱)دەستیکرد بە بژاردن لەخۆیەوە، خۆیشی هێنا حیساب.(۲/۱) خۆی نەهێنا حیساب لە کەسی پاڵ دەستیەوە دەستیپێکرد.(ازخودش). (۲) لە خۆڕا؛ بێدەلیل؛ بێبەڵگە؛ بێهۆ. (بی‌دلیل؛ بی‌سبب)
لە داری دنێ : لە دارای دونیا؛ لە ماڵی دونیا؛ لە سامانی دونیا. (ازمال‌دنیا) > داری دونیا
لەدووگەڕان : بەدوادا گەڕان. (دنبال‌گشتن)
لە دەست دەرچوون : [چاوگە،ت] بێ ئاگا لێبوون چەک بە دەستەوە تەقین. (ازدست در- رفتن)(۲)لەدەست چوون؛ لەکیس چوون. (ازدست دادن) +
لەدەمدان : (۱)لەدەم ڕاکێشان و لێدان. (توی دهان‌کوبیدن). (۲ب) قسە لێبڕین و ڕەتکردنەوەی قسە؛ جوابی ڕەق دانەوە. (تو دهنی زدن)+
لەدەم و دووکەوتن : [چاوگە،ت] لە قسە و دوواندن کەوتن. (ب) نەخۆشێ کە زمانی

بشکێ. (قدرت‌تکلم‌ازدست‌دادن)
لەڕاست : لەئاست؛ بەرانبەر؛ لەحان. (دربرابر؛ مقابل)
لەرزەپێو : [ناو] کەرەستەی ئەندازەگرتنی ڕادە-ی هێزی بوومەلەرزە. (لرزەنگار؛ زلزله سنج)
لەرزەلەرز : زۆر ترساو؛ لەرزین لە ترسا؛ دەست لەرزین بەهۆی مالْ خۆشەویستی و دەست پێوەگرتن؛ چکووسی. (ترس و(لرز؛ ازخست دست لرزیدن )
لەرزیان : [چاوگە،ت] چۆقە پیاهاتن لە یاو یان لە ترس یان لە سەرما؛ لەرز پیاهاتن؛ لەرینەوە. (لرزیدن)
لەڕکەڵە : [ئاوەڵناو] ناتلەنگ‌زراڤ؛ قەدباریک؛ شووش و باریک و لاواز. (لاغر؛کمرباریک)
لەزاردەرچوون : [چاوگە،ت]لەدەم دەرپەڕین؛ لە زارترازان. (ازدهن‌دررفتن)
لەزگ‌چوونەوە : لەزەوزوو کەوتن. زاوزوو بڕانە-وە. (یائسه‌شدن)
لەزم : [ناو] لێزم؛ قەوموخێش؛ کەسوکار. (قوم-وفامیل)
لەژێرڕکێفدابوون : لەژێر فەرماندابوون؛ ژێرچە-پۆکە بوون. (تحت‌فرمان
لەسک کەوتن : [چاوگە،ت] ژنێ‌کە ئیدی مند-اڵی نەبێ؛ (ب) مەهان نەبوون؛ تێنە کەوتنی ژن. (عقیم‌شدن‌زن)
لەسەرخۆداماڵین : لەکۆڵ‌خۆکردنەوە؛ لەمل کردنەوە؛ لە ئەستۆی خۆ لابردن؛ (ب) خۆ لە دەست کێشە رزگارکردن. (ازسرباز کردن)
لەسەردانان : (۱) وەک نرخ دیاریکردن؛قیمەت لە سەر دانان. (قیمت‌گذاری). (۲) دانیانە سەر شتێ. (روی‌چیزی‌گذاشتن). (۳) دانیانەبان. (بالاگذاشتن)
لەسەردرچوون : [چاوگە،ت] فەرامۆش کردن؛ لەبەر فەقیری عەشقی یارەکەی لەسەر دە-رچووە. (فراموش‌کردن؛ازسربەدرشدن)
لە سەرگریو : ئەنجامی کارێک لە سەر مەرج؛ بەمەرج. (شرطی)
لەسەرگوان : [ئاوەڵناو] ئاژەڵی نزیک بە زایین. (حیوان‌ماده‌پابماه)
لەشا تەکە هێنان : لە قوماری بانگدا تەکە بۆ شا هێنان؛ (ب) مرۆی خۆش شانس. (کنایه‌از-آدم‌خوش‌شانس)
لە شان‌وقۆڵ کەوتن : [چاوگە،ت]زۆر ماندوو بوون بەکارێکەوە. (ازپا افتادن بعلت خستگی)
لەشت‌وموفا : [ناو،ت] قازانج؛ سوود؛ منفەعەت؛ کەڵک. (سودومنفعت)
لەشکەر : [ناو] لەشکر؛ سپا. (لشکر)
لەعلە : [ناو] لالە؛ مەردەنگی. (لاله)
لەعلی‌بێدانە : [ناو] جۆرێک ترێی دەنک گەو-رەی سوورە و ناوکی نییە. (نام‌نوعی‌انگور)
لەعلی‌فا : جۆرێک قوماشی ڕیْ‌ڕیْ بوو لە زە-مانی ڕابوردوودا. (نام‌پارچەای‌قدیمی)
لەغ : [ناو] گریْ؛ چەت. (گره)
لەغامە: [ناو] لەغاوە؛ سووچی هەردوولای لێو؛ ئەملا و ئەولای لچی ئەسب . (دوگوشەلب؛ دولب اسب‌که حلقه لگام آنرا دربرمی‌گیرد)
لەغاوبرە : [ناو] لەغاوەگوورگە؛ فڕندەییکە بە-قەرا ڕیشۆڵییێک. (نام‌پرنده‌ایست)
لەغاوشل‌کردن:[چاوگە،ت] ئیزن‌دان بە ئەسب بە کەیفی خۆی بڕوا؛ (ب)سەرگری و بەرگری

نه‌کردن، ڕووپێدان؛ به‌رنه‌گرتن؛ سه‌ربه‌ست کردن. (جلوگیری‌نکردن)
له‌غاوکردن : (١) له‌غاو له‌زاری ئه‌سپ‌کردن. (لگام‌به‌دهن‌اسب‌زدن). (٢) پێش‌گرتن؛ به‌ستنه‌وه و ئیزن پێنه‌دان و به‌رهه‌ڵست‌بوون له‌هه‌موو بوارێکدا؛ دژی له‌غاو شل‌کرن. (دهنه‌زدن)
له‌غاوه‌گوورگه : فڕنده‌ییێکه له تەیره به‌ڵه‌ک ده‌کا و سێ جۆرن، (١) له‌غاوه‌گوورگه‌ی باڵ خورمایی. (گلاریول‌بال‌قرمز). (٢)له‌غاوه‌گوورگه‌ی باڵ ڕه‌ش. (گلاریول‌بال‌سیاه).(٣) ود وده. (دو دوک)
له فڕه‌چوون : [چاوگه،ت] له شه‌رمه‌وه چوون و له ڕوودربایستی که‌وتن؛ تریێق بوونه‌وه؛ به‌یده‌س بوون. (شرمنده‌وخجالت‌زده‌شدن)
له فڕه‌که‌وتن : [چاوگه،ت] فڕنده له باڵ لێدان که‌وتن؛ (ب) له جووڵه و بزوان که‌وتن. (بی‌حرکت‌شدن)
له قاودان : [چاوگه،ت]له هه‌ڵلادان؛ چه‌پڵه لێ‌کوتاندن؛ ڕاستیی نه‌هێنی که‌سێک بڵاوکردنه‌وه. (افشاکردن‌راز)
له‌قسه‌ده‌رنه‌چوون : (١)به‌قسه‌کردن؛ ئاموژگاری بردن به‌ڕیوه؛ به‌قه‌ول‌کردن؛ فرمان به‌جێ هێنان. (اطاعت‌کردن). (٢)له به‌ڵێن په‌شیمان نه‌بوونه‌وه؛ ڕاوێستان له سه‌ر قسه و په‌یمان. (سرقول‌ایستادن)
له‌ق‌له‌ق : [ناو] فڕنده‌یێکی مل درێژی قاچ درێژه و مار و بۆق و ماسی خۆره و دوو جۆرن. (١)حاجی‌له‌ق‌له‌ق؛ حاجی‌له‌ک‌له‌ک. (لک‌لک). (٢)حلڵێر؛ له‌ق‌له‌قی ڕه‌ش. (لک‌لک‌سیاه)

له‌قنای : [چاوگه،]له‌قاندن. (تکان‌دادن‌-جنبانیدن)
له قه‌بر ده‌رهێنان : (١) مردو ده‌رهێنان له قه‌بر. (میت‌راازقبردرآوردن). (٢ب) جوێن به‌که‌سێک‌دان که‌مردووه. (دشنام‌دادن‌به (مرده)
له قه‌فه : [ناو] ڕکه؛ قه‌فه‌ز؛ قه‌فه‌س. (قفس)
له‌قه‌ڵه‌مدان : [چاوگه،ت] به حیساب گرتن؛ له ئه‌ژمارهێنان؛ به حیساب هێنان؛ وای له‌قه‌ڵه‌م مه‌ده: وای دامه‌نێ. (بشمارآوردن)
له‌قیا :[رابوردووی له‌قین] له‌قی؛ بزوا له جێی خۆی؛ له‌ق بوو؛ له جێی خۆی جووی. (لق‌شد)
له‌کان : [ناو] ڕاکێت؛ ڕووپه‌ڕێکی جه‌غز ئاسایه بۆ یاری پینگ‌پۆنگ و تێنیس. (راکت)
له‌کۆڵ‌خستن : ڕزگارکردنی‌خۆ یان یه‌کێکی‌تر له ده‌ست ملۆزم و کێشه و به‌ڵای به‌سه‌ردا سه‌پاو. له‌سه‌ر لابردن. (نجات‌دان‌کسی‌ازدست گرفتاری)
له که‌ف‌وکوڵ که‌وتن :(١ب)به‌سه‌رچوونی تین و تامه‌زرویی؛ سارد بوونه‌وه له‌کاری. (ازشوروشوق‌افتادن) (٢) له کوڵ چوونه‌وه‌ی تراو. (ازجوشش افتادن)
له گا چوونه‌وه : وشک بوونه‌وه‌ی که‌شاوێک که کاتی کێڵانی تێپه‌ڕ بووبێت. (خشک‌شدن‌-زمین‌آبیاری‌شده‌برای‌شخم)
له‌گرنه : (١) له‌گره نا؛ لێره‌دا نا؛ نه له ئێره . (اینجانه). (٢) لێره‌ن؛ لێرانه‌ن؛ ئه‌وان‌له‌گره‌ن: هان‌لێره. (اینجاهستند)
له‌گوێچکه‌ی‌گادا خه‌وتن : (ب) بێ‌خه‌به‌ر بوون له مه‌به‌ست؛ بێ‌خه‌به‌ری؛ نائاگایی. (کنایه‌ازبی‌خبربودن‌از دنیا)

لەگوێن :[وتە] وەک؛ وێچوون؛ وەکشتێ؛ لە-
وەدەچێ؛ لەگوێن : بەشێوەی. (شبیه؛ مانند)
لەگەنماڵ : [ئاوەڵناو] کاسەلێس؛ چڵکاوخۆر؛
نۆکەرکردار؛ بەرماوەخۆر. (کاسەلیس)
لەلاقانوەرهاتن : هەڵاتن و توند و تیژ تێپەڕ-
بوون. (بەتندیفرارکردن)
لەلە : [ناو](١) قامیشیگەرمیان؛ خەیزەران؛
جۆرێک قامیشی قەویە و گەڵاکەی بە
کوتراوی لە سەر برین دادەنین بەکەڵکە. (-
خیزران) (٢) نەیچە شەکەر؛ قامیشی شەکرکە
شەکری سووری لێدەگیرێ. (نیشکر)+
لەلەنگی : [ناو](١)هەویری لە ڕۆندا سوورەوە
کراو؛ نانساجی؛ ناوساجی. (خمیرسرخشدەدر-
روغن؛توتک)
لەمرک : [ناو] ئانیشک؛ هەرەژنی؛ مرک؛
ئانیسک. (آرنج)
لەملوای : [ناو] لەمشۆریای؛ سکەشۆرە؛ زە-
حیری. (اسهال)
لەناکاو : [بەند] ژنشکاڤە؛ لەهێکرا؛ ژنیشکفە؛
لەپڕرا؛ لەپڕدا. (ناگهان)
لەناڵولەبزماردان : >لەپیکومابیکدان
لەنگاندن : [چاوگە،ت] (١) جووڵاندنەوە؛
(تکاندادن) (٢) شانەوشان و ئارام بە ڕێگادا
ڕۆیشتن؛ (سەیزادەی کە مەرەشل بیلە نگێنە).
«فۆلکلۆر» (سلانە سلانە رامرفتن)
لەنگەر : [ناو] تراز؛ تەراز؛ میزان؛ قورسکردن و
سووککردنی بار بە دەست پێوەگرتن؛ لەنگە-
ڕێکی ئەو بارە(ڕەشکە کایە)م بۆبگرە.(تراز)
لەوان : (١) لەوموان؛ لەوڤان؛ شوانی گاگەڵ؛
گاوان. (چوپانگاوها )(٢) لە ئەوان. (ازآنها)

لەوچەتی : [ناو] لەو چێتی؛ زۆر بلێیی. (پر-
حرفی)
لەوز : [ناو] لەبز؛ قسە؛ (ب)ئەو قسە کە لە(لە
وس : لیو)دێتە دەرەوە؛ بۆ لەوزت ناگەڕێت؟.
(لفظ)
لەولەوە :>لەوچەتی.
لهۆن : ناوچەیێکی هەورامانە لە ئێران و
عێراقدا. (منطقەلهون)
لەوە : [ناو] گا؛ گامێش؛ لەو. (گاو؛ گاومیش)
لەوەڕێن : [ناو،بک]کەسێک کە دەلەوە-
ڕێنێ(ب) شوان. (چراننده؛ شبان)
لەوەیڕا : لەوشتەوە؛ لەوەی ڕا دیارە ڕاست
دەکا؛ بەوەیڕا. (ازآنچیز)
لەوێر : [ئاوەڵناو] زیاتر لەگەڵ وشەی لاردا
دێت و واتای خواروخێچ دەدا، لارولەوێر؛ چە-
فتوچیر. (کجومعوج)
لەهاندن : [چاوگە،ت] داگیرکردن؛ زەوت-
کردن؛ دەست بە سەردا گرتن. (تصرفکردن)
لەهێکەوە : [بەند] لە ناخافڵ؛ لە ناکاو؛ لە پڕدا.
(یکهو)
لەیاز :[ناو] ئاوهاوردە؛ ئاوماڵک؛ ئەوەی ئاو یان
سێڵاو لەگەڵ خۆی دەیهێنێ. (آب بە ساحل-
آوردە)
لەیزاندن : [چاوگە،ت] کایە پێکردن؛ گەمە
پێکردن؛ ڕاوپێکردن؛ خافڵاندن؛ فریودان؛ سە-
رگەرمکردن؛ خاپاندن. (بازیکردن)
لەیزتن : [چاوگە،ت] لەیزین؛ یاریکردن؛ حە-
نەککرن؛ سەما؛ لەیستن. (بازی؛ رقص)
لەیل : [ناو] جۆرێک فرندەی گۆشتخورە لە و-
اشە دەکا و چیتین (چینچین: خاڵخاڵ)ە. (-

پرنده‌ای‌شکاری)
لەیلاخ : ناوچەییٚکە بەرفراوان سەر بە شاری سنە. (نام‌منطقه‌ایست)+
لەیلان چۆخە : ڕەقتیان؛ کێوێکی هەرە بەرزی ناوچەی سەقزە لە بەینی دوو گوندی سلێمانکەندی و کانی‌نیازدایە. (نام‌کوهی‌است)
لەیلوێ : [ناو] هەلۆرکە؛ لەلوە؛ لەیلوک؛ جۆلانێ هەڵبەستن بۆ خەوتنی کۆرپە و ڕاژە-ندنی. (ننو)
لەیلێ‌ومەجرووم :[ناو،ت] لە لەیلێ و مەجنوون کوردکاری بووە. (لیلی‌ومجنون)
لەیەڵ :[بەند] لەگەڵ؛ لەیێل؛ تەڤرا؛ تەڤی‌هە-ڤ؛ پێکەوە؛ پێکوٚ. (باهم)
لێبڕین : (١) بە چەقو یان شتی‌تیژ کوتێ لە شتێ بڕینەوە. (بریدن‌از). (٢)کۆتایی هێنان بە خەڵات و بەرات یان جیرە و مەواجب. (قطع-کردن) (٣) وەک: نان و ئاو لێبڕین. (قطع-کردن)
لێبواردن : ڕەوتی خوش ڕابواردن. (حالت-خوش‌گذراندن)(٢) لێ‌ڕەت بوون؛ بەسەردا کشان. (ردشدن)
لێبوورین : [چاوگە،ت] (١)جیگای ڕۆیشتن و ڕەت بوون. (مفر). (٢.ب) لێخۆش بوون؛ بە-خشین. (٣) بە سەرچوون؛ تەمەن لێبووردن. (گذشتن؛ عفوکردن)
لیپ : [ناو] لێزگە؛ لزگە؛ ڕستە مووررووی لە تاڵ هەڵکێشراو؛ جەلە؛ ڕیز. (رشته)+
لێپیس‌کردن:[چاوگە،ت]کراسەکەت لێ‌پیس-کردم؛ کراسەکەمت پیس‌کرد. ( نجس و-چرکین‌کردن‌چیزی‌یاکسی)

لیخاندن: [چاوگە،ت] لێدان؛ لێخستن؛ پیامالێن؛ دارکاری و لێدان. (کتک‌زدن) لێرەدا لێخستن بەواتای تێ‌ساوین نییە
لیخە: [کاری‌ئەمری] (١)لیبدە؛ پیا ماڵە؛ پیابدە. (اورابزن.بزنش)(٢) پیاساوە؛ لیخشێنە. (بساب)
لێدەر (١)[کاری ئەمری] لێی‌دە؛ فرمانی لێدانە. (٢)[ناو،بک] کەسێک کە لێدەدا. (بزن؛ نوازندە)
لێدەرکردن : (١) [چاوگە،ت] ئەو مێشانەی لێدەرکە؛ لێدوورخستنەوە. (دورکردن‌ازچیزی) (٢)لێدەرهاویشتن؛ کەم‌کردن لە حیساب. (منها؛ازحساب‌کمکردن)+
لیر : [ناو] (١)لیرگ؛ (٢)یەکەی پارەی تورکیا؛ لیرە؛ لیر. (کهیر؛ لیره)
لێڕاکێشان : [چاوگە،ت] لێدان؛ بەمشت لێڕاکێشان. (کتک‌زدن) پا لێڕاکێشان (پشوو دەرکردن و ئاسوو دەبوون) (استراحت)
لێڕاکێشان : [چاوگە،ت] بەزۆر ژنی کەسێک داگیرکردن یان هەڵگرتن، دابێکی زۆر کۆن بوو.(زن‌کسی را بزور فراری دادن)(ب) بەکە-یفی دڵ خواردن، سکنانەسەر(لە پڵاو و گۆشت ڕاکێشان).(بارغبت خوردن)
لێڕاکێشان: [چاوگە،ت] (ب) ئیلاقەکردن. (بازن همخوابگی کردن)
لیستە : [ناو] لیست؛ سیایی؛ ناوی شت نووسین بەڕیز لە سەر کاغەز یان دەفتەر. (لیست)
لیسماڵ : [ئاوەڵناو] ماستاوکەر؛ جامەلووسکە کەر؛ خولتەکەر. (متملق)
لێسە : [ناو] لێسک؛ ئامرازی کەوچک و کووپەی‌تار هەڵکۆڵین. (لیسک)+
لیف : [ناو] توێکڵی داری خورما کە کیسەی

گەرماوی لیٚ دروست دەکەن. (نوعی‌پوسته‌-درخت‌خرما)
لیٚف بزمری . لیٚوبەبار؛ لیٚڤا حشک و قەرچمی. (کنایه‌ازغمگینی)
لیٚکاڵانەوە : [ناو] لیٚجوان‌بوون؛ پیٚکەوتن؛ ئەو لیباسانەی لیٚدەکاڵیٚتەوە : پیٚیدەکەوی : لیٚی-جوانە. (برازنده‌بودن)
لیٚکاڵیانەوە : > لیٚکاڵانەوە
لیٚک‌چوون : لەیەک‌چوون؛ شیوەی یەک‌دان. (شبیه‌بودن)
لیٚک‌خران : [چاوگە،ت+ڕابوردووی چاوگە] لە-یەک‌خران؛ دووبۆری لیٚک‌خران: چوون بە ناو-یەکدا؛ ئاڵقە ڕیٚز و دوولایی لیٚک‌خران؛ لەیەک هەڵپیٚکران. تیٚک‌خران. (توی‌هم‌رفتن)
لیٚک‌خشان: [چاوگە،ت +ڕابوردووی‌چاوگە] (١)لەیەک‌ساوین؛ (٢) بەیەکدا ساوران؛ لەیەک خشیان. (بهم‌ساییدن؛بهم‌ساییده‌شدند)
لیٚک‌دابڕدران : لەیەک دوورکەوتنەوە؛ دەست لیٚک بەردان. (جداشدن)
لیٚک‌ڕاکیٚشان : : [چاوگە،ت] (١)لەیەک‌دان؛ لە سەروگوێلاکی‌یەک‌دان؛ شەڕکردن. (یکدیگر-رازدن). (٢)ڕاکیٚشانی ژن لە یەکترین(لە بھوریدا باوبووە). (نامزدکسی‌رافریفتن یا ازچنگش‌درآوردن)
لیٚکراو : [ناو،بەر](١)بە سەر هیٚنراو؛ وەک: زوڵم لیٚکراو. (٢)جیٚگای ڕووداوی کاریٚک شە-ڕلیٚکراو.(١.براوشده.٢.جای‌انجام‌کاری) (٣) دە-غڵی لە ئاش هاڕدراو. (غله اسیاب شده)
لیٚک‌زیادکردن: [چاوگە،ت] قیمەت بردنەسەرە-وە و لە یەکترین زیادکردن لە موعامەلەی کیٚ‌زیاد (موزایده)دا. (مزایده)
لیک‌کراو : (١)جیاکراو لەیەک. (ازهم‌جداشده). (٢)ڕەواوە. ئاڵقەییٚک کە ڕەواوەتەوە. (بازشده)
لیٚک‌کردن : [چاوگە،ت] (١) جوداکردن؛ جیاکردن. (جداکردن) (٢) شیٚوەدان؛ لە یە-کچوون.(شبیه هم بودن)
لیٚک‌لادان : لەیەک لاڕیٚکردن؛ ڕوو بە رووی یەکتری نە بوون و ریٚگا کەچ کردنەوە؛ (ب) تخونی یەک نەکەوتن و دووری‌کردن لە یە-کترین (احتراز ازروبرشدن و نزدیکی)
لیکوو : [ناو] جۆریٚک باڵندەیە ڕەنگی قاوەیی مەیلە و نارنجیە و دوو جۆرن. (١)لیکووی خە-تخەت. (لیکو). (٢)لیکووی زەلان. (لیکوی-تالابی)
لیٚکەوتنەوە: (١) زایین؛ ئەولاد بە دونیا هیٚنان؛ مانگا کە سیٚ گوێرەکەی لیٚکەوتووەتەوە؛ (ب)عاییلە و ئەولاد لە دوابەجیمان. (٢) بومباییٚک تەقی دوو کوژراوی لیٚکەوتەوە. (٣)دیسیان لیٚکەوتن و هەژاربوون و مافینگی بوون و ماڵ و سامان لە دەستدان. (١و٢و٣ بجاماند ؛بجاگذاشتن؛ دوباره‌ورشکست‌شدن)
لیٚک‌هەڵوەشان . لەبەریەک‌چوون؛ لەبەریەک-دەرهاتن؛ ئەوراق‌بوون. (اوراق‌شدن)
لیٚگۆڕان(١) لەوکاتەوە دەوڵەمەند بووە خۆی لیٚگۆڕاوە ئەیتر نامناسیٚ؛ گۆڕینی ڕەفتار و کردار؛ بووە بە حاکم خۆی لیٚگۆڕاوە لە بیری - نییە کیٚبوو. ( اخلاق‌عوض‌شدن)+ (٢) لاڕیٚ بوون؛ خودا لەونی لیٚگۆڕاوە: گومڕا بووە. (گمراه‌شدن)+
لیٚگۆڕاندن : : [چاوگە،ت] (١)بەسەردا قیژاندن

و هـاوارکردن. ( برسـر کسـی نعـرەزدن) (٢) گـوڕە لێکـردن؛ بـە هـەرا و هوریـا وجـۆش و خورۆشەوە هەندێ کـار ئـەنجـام دان؛ لێمـان گوڕاند و بەرێکی دروێنەکەمان تەواوکـرد. (بـا هورا و دادوهوار کاریرا بە پیش‌بردن)

لیمان : [ناو] ئاوێکی خـەسـتی چڵـم‌ئاسـا کـە دوای زایینـی مێیینـە لـە زێیـان دێ. (مـایع-غلیظی‌کەهمراەزائوبیرون‌می‌آید)

لێنایی : [ناو،بـەر] لێنـراو؛ چێشـتی سـازکـراو. (خوراک‌پختەشدە)

لینجاو : لینچقاو؛ لینچقی‌تراو. (مایع‌لزج)

لێنگێزە: لەنگێزە؛ باران و لەنگێزە؛ بارانی بە خوڕەم. (باران‌تند)

لێ‌نیشتن :بە کۆمەڵ نیشتنەوەی مەل لە سـەر دار یان شتی‌تر. (نشستن‌پرندەبردرخت)+

لێوجووین : لێوکروژتن؛ لە تووڕەیی زۆر یان لە بەر خەم و کەسەر. (لب‌گزیدن؛ لب‌جویدن)

لێوڕێژ .[ئاوەڵناو] پڕ؛ سەرڕێـژ؛ دارمـاڵ؛ دوڵـدر. (لبالب‌پر؛ لبریز)

لێوکەن: [ناو] زەردە. بزە. (لبخند)

لیولێدان : [ناو]کەکـاتی(کلیـپ)ی فیلمـدا لێـو جووڵاندنەوەی ئاکتەر. (لب‌زدن)

لێو لێنەدان : (ب) مێڵاک نەکردن؛ نـەخـواردن. (لب‌نزدن)

لێ‌وەخۆ کەوتن : خۆ بۆ ئامادە کـردن؛ خـۆ بـۆ تەیار کردن؛ خۆ ئامادە کردن بۆ هێرش کـردن و دەست کردنەوە. (دفاع کردن آمـادە مقابلـە-شدن)

لێ‌وەربوون : هێرش بۆ بردن؛ تێ ئـالان و دە-ستە و یەخەبوون؛ هاتنەژوور؛ (حملەبردن)

لێ‌وەشان :[ناو] لێ‌شیان؛ لـێ‌کاڵـان و لێهـاتن؛ پێکەوتن. (برازندەکسی‌بودن)

لێوەشیان: [ناو] لێکاڵینەوەی جلک، لیباس؛ پێکەوتن. (٢)پێکران؛ توانای کارێ هەبوون؛ پێ‌چێبـوون؛ لـە بارانـدا هـەبـوون (برازنـدگی. شایستگی)

لێهاتن : (١)لە دەست هاتن؛ پێکران؛ توانای ئەنجامی کار هەبوون؛ لە باراندا هەبوون. (از دست‌آمـدن) (٢) لـەرز لێهـاتن. فـێ لێهـاتن؛ دومەڵ لێهاتن؛جووت‌بوونی نێر لە مێو. (دچـار-شدن)

لێهاندان : : [چاوگە،ت] لێ‌فێرکردن و دنـەدان. (کسی‌رابرعلیەکسی‌تحریک‌کردن)

لێ‌هەستان : هەستان بە تووڕەییەوە بۆ لێـدانی کەسێک. (برای حملە بەکسی‌بلندشدن)

لێ‌هەستان : هەستی پیاوەتی لە ژنێکی جـوان جووڵان؛ ئێرەق بوون لە کەسێک. (نعوذکردن)

لێ‌هەڵسان : لێ‌هەستان؛ ڕابوون بۆ لێدانی کە-سی یان هێرش بۆ بردن. (برای‌تنبەکسـی پـا-شدن)+

لێ‌هەڵکەوتن : (١) پـا لـە شـتێ‌دان و سـەرە-نگرێدان؛ (پا بەچیـزی خـوردن). (٢) ڕابـوون؛ کوردستان پیاوی گەورەی زۆر لێ‌هەڵکەوتووە. (برخاستن)

لێ‌هەڵگەڕانەوە : لـێ‌وەرچـەرخـان. (١)جـواب دانەوە بە توندی. (اعتراض‌کردن). (٢) گۆڕینی دۆستی بە دوژمنی؛ پشت تێکردن؛ پشـت بـە-ردان. (پشت‌کردن)

لامپ : گولۆپ؛ گلۆپ؛ گلۆپی چرای کارەبایی. (لامپ)

لامپیگازی : گلۆپی چرای کارەبایی کە ناوەکەی گازی(ئارگۆن یان نیئۆن)ی تێدایە. (لامپگازی)

لەفافە : [ناو](١) قوماش یان شتێ بۆ پێچانەوە. (پیچیدنی). (٢) سەرپۆش؛ لە تۆی نزاکەتدا و بەهێما باسی شتی عەیب و عار کردن. (لفافە)

لەوەندی : [ناو] ڕەوتێکی زاتییە لە هەندێ ژندا کە بە کریشمە و ناز و لێوکەن، سەرنجی پیاو بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن؛بەڵام ئەو ڕەمزوڕازە بەشێوەی دەستکرد(غەیری سروشتی) لە وانەکەلاس)ی تایبەتدا فێری هەندێ ژنی ژاپۆنی دەکەن کە گیشایان پێدەڵێن. (لوندی)



مات : (١) [ئاوەڵناو] حەیـران؛ کێـژ؛ واق‌و-ڕماو. (مات). (٢) [ئاوەڵناو] خەمگـین؛ دڵ پڕ له کەسەر. (غمگین). (٣)کش‌ومات؛ بێ جووڵه دانیشتن؛ بـێ جووڵـه و خـەمگـین؛ بۆی هەیه وشەی کیش‌وماتی شەترنج لـه کش‌وماتی کوردیەوە وەرگیرابێت. (کیش-ومات). تێبینی : زمانی کـوردی لـه سـەر هەڵدانی شەترنج کۆنترە وبۆی هەیه وشە-ی (کیش‌ومات)ی شەترەنج له کش‌ومـات و کەشتەنگییەوە هاتبێـت؛ حاڵـەتێـک لـه شەترنجدا که شا نەتوانێت بجووڵێت؛ مت؛ کڕ؛ واتا: دۆڕاندنی شەترنج. (مات)+

مات : فد؛ فرد: [نـاو] لێـڵ؛ وەک شووشـه (جام)ی پەنجیرەی مات که بەشێکی کەم ڕۆشنایی لێیەوە دەرباز دەبێت. (مات)+

مـات‌کـردن : [چاوگـه،ت] (ب)بردنـەوەی کایەی شەترەنج. (مات‌کردن)+

ماتماتیک : [ناو] زانستی حیسـاب. (علـم-حساب.ریاضیات)

ماتۆره : [ناو] ناتۆره؛ ناونیتکه؛ ناوی خـراپ لەسەر کەسێک دانان. (لقب‌زشت‌روکسی گذاشتن.)

مات‌ومەلوول : [ئاوەڵناو]کش‌ومات؛ مـات-وخەمگین؛ بێدەنگ‌وپەکەر؛ دەستەوئـەژنـۆ دانیشتن. (غمگین؛دست‌بەزانو)

مات‌ومیت : [ناو،ت] خۆ کپ‌کردن و گوێ هەڵخستن؛ خۆ کڕکرن و گۆهڤەچنین؛ خۆ مراندن و گۆهتیژ کرن. (حواس‌خودراجمـع کردن وگوش‌تیزکردن)

ماته : [ناو] سماته؛ بـەردی جـەهـەنـدەم؛ هەسان. (فسان)

ماته : [ناو] موورگێکه دەڵـێن بـۆ لابردنـی تەمی چاو (لێڵی‌چاو)باشه. (نوعی‌خرزه)

ماتیک : : فد؛ فرد: [ناو] ماکێکی ڕەنگی بۆ ڕەنگ کـردن و جـوانکردنی لێـوی ژنـان. (ماتیک؛روژلب)

ماتێن: [ناو] هەڵماتێن؛ مەڕمەڕێن؛ مێشێن؛ مووشێن. (تیلەبازی)

ماجەمین : ناوه بوو ژنـان؛ جـەمـین وەک مانگ؛ هەنیەوەک مانگ. (ماەجبین)

ماچماچانێ : [ناو،ت] ماچومـووچ. (مـاچو-بوسه)

ماچماچۆک : >ماچماچانێ

ماچەنگی : [ناو]کایەی‌جگـێن؛ محـانچێن. (یک‌نوع‌بازی‌باشتالنگ)

ماخۆ : [ناو] خاوەن؛ خێو؛ماڵخۆ. (صاحب)

ماخولیایی : [ناو]تووشی مالیخولیـا هـاتوو. >مالیخولیا

ماخەر : [ناو،ت] ماکەر؛ ماچەکەر. (ماچـه-الاغ)

ماد : [ناو] تەن؛ ماک؛ ڕەنـگ؛ مـادێ وی نەمایه : ڕەنگی نەماوە. (مادە؛ رنگ)

ماد : [ناو] وەکی دەزانن هەموو کوردیٚ کورمانجـە، کومـانجی ژوورو، کورمـانجی ناوەڕاست و کورمانجی خواروو، کورمانج لە سەرەتادا کوردماد و کوردمانج بووە و کورد و مـاد وەک یـەک باسـی لێکـراوە ، لـە کتێبی(تەفسیری عەهەی قەدیم و عەهە- ی جەدید)دا لە پاڵ وشـەی مـاد و مـدی، وشەی کورد و کوردستان لە بـەینـی دوو- کەواندا هاتووە و لە زۆر مێژوودا هـەر بـەو جۆرە باسی لێکراوە. (ماد)+

مادخووزکراو : [ناوبەر] بەرگەمکـراو؛ پـە- سـندکـراو؛ پـەسـەنـدکـراو. (پسـندشـده؛ برگزیدەشده)

مادی : [ئاوەڵناو+ ناو]سەر بـە هـۆزیمـاد؛ زمانی مادی کە تائێستا ئاسەوارێکی سەربە خۆی نەدۆزراوەتەوە. (مادی)

مادی: ماددی: [ئاوەڵنـاو] ئـەنبووژەنـی؛ دونیـایی؛ دژی(پژۆنـی و مـەعنـەوی و واتایی) (مادی)

مارانمژیو :[ئاوەڵناو] (ب)لەڕولاواز.(نحیـف ولاغر)

مارپێچ : [ناو] خەتی چاڵ بەدەوری دار یـا هەرشتدا دروستکردن لە بیچمی ماریٚ کە بەدەوری دارێکدا ئاڵابێـت؛ یـاوەک لاولاو ئاڵابێتە ڕووەکیٚ؛ مارخول. (مارپیچ)

مارپێچ : [ناو] ڕووەکێکی چقڵدارە، جۆرێک دڕووە. (نوعیخار)

مارپێچ : [ئاوەڵناو] وەک ڕێگای پـڕ پـێچ و قەمچ؛ چەند پێچی ڕێگا یان چۆم بە دوای یەکدا ؛ گامیز؛ گامیزە. (مارپیچ)

مارخول : >مارپێچ

ماردەی : [چاوگە،ت] شکاندن. (شکستن)

مارڕفێن: [نـاو،ت] مراوکـەزەردە؛ گیاییٚکـە ژەهردار و کولێنراوی ساقەت و گەڵاکـەی بۆ شتنی دەمی برین باشـە. (گیـاەدرمـان- عقرب)

مارزۆ :[ناو] مازۆ؛ لێگەڕان؛ هێشتن؛ نمازۆ : نایێڵیٚ. (رخصت)

مارس : فد؛تد: [ناو] مارس؛جارێـک کایـە کردن و بردنەوەی تەختە نەرد کە بـە دوو دەست بەحیساب دیٚ. (مارس)

مارس : [ناو] مارچ؛ مارت؛ مانگی سیهەمی ساڵی زایینی(ئازار؛ ئادار). (مارس)

مارش : فد؛ فرد: [ناو] ئاهەنگی عەسـکە- ری. (مارش)

مارشال . فرد؛ فد؛ اند؛ آلماند: [نـاو] پلـە- یێکی ژوور لە ئەرتەش (عەسکەر)یدا، بـە- رانبەربە سپەهبود. (مارشال)

مارشیموون : > مەرشمین

مارک : ئالماند؛ فرد؛ فد؛ اند: [ناو] یەکەی پـارەی ئاڵمانیـا. (٢) مـۆرک؛ نیشـانەی فابریکا لە سەر کاڵا. (١و٢.مارک)

مارگڵ : [ناو] جۆرێک فڕندەیە؛ مارگر. (نوعیپرنده)

مارگیسە : [ناو] بۆقلەموونە؛ عەلـیشـیش؛ عەلۆعەلۆ. (بوقلمون)

مارگیسە : [ناو] جۆرێک مارمێلکی گەورە- یە. (نوعیمارمولک؛ سوسمار)

مارمژ : [ناو] زاروو؛ زەروو؛ زالوو. (زالو)

مارمژ : [ناو] سینەکێش؛ سیغار کێشیٚ کـە

هەموو دووکەڵی سیغار قووت بدا؛ دژی دەم کێش. (سیگاریسینەکش)
مارنەگەز: [ناو]جزمە؛ چەکمە؛ پۆتینی مل درێژ. (چکمە)
مارۆخ : ناوە بۆ ژنان؛ [ئاوەڵناو] ڕوخسار وەکوو مانگ. (ماهرخ)
مارۆخسار : [ئاوەڵناو] ناوە بۆ ژنان؛ ڕوخسار وەک مانگ. (ماەرخسار)
مارووم : [ئاوەڵناو]لە مەحرووم وەرگیراوە؛ بێبەش؛ ئافەرۆز. (محروم)
مارەتۆپیو : [ناو،ت](ب)کەسێکی کز و بێدەنگ ماتڵی هەل و دەرفەتێک بێت تاچزەی خۆی لێدا و زەبر بوە شێنێ؛ زۆر جار دەڵێن مەڕە مردوو هەر بۆیە تۆپیوە-کەیش بووە بەمردوو. (مارمردە)
مارەخۆرە : [ناو] زەردەقۆڕە؛ دووڵقەدەرە؛ جۆرێک مارمێلکی گەورە کە ڕەنگی دە-وروبەری بە خۆیەوە دەگرێ. (نوعی سوسمار)
مارەکە : [ناو](۱)لە(مەعرەکە)ی فارسییەوە هاتووە؛ شەڕومارەکە. (معرکە). (۲) فرمان بە مارەکردن، مارەبکە. (عقدکردن). (۳) ڕە شە مارەکە : مارە ڕەشەکە؛ لەڕوانگەی دە-ستووری زمانەوانییەوە، مارێکی ناسیاو مە-عریفەیە. (مارمعرفە در دستورزبان).
ماری: ماکەو؛ (کبک مادە)
مارِیا :[ڕابوردووی مارِیان] بەزی؛ شکستی هێنا. (شکست)
مارِیان : [چاوگە،ت] مارِین؛ شکاندن؛ شکستدان. (شکستن)
مارِیایە : [ناو،بەر] شکاوە؛ شکستییە؛ شکیاگە؛ بەزیوە. (شکستەاست)
ماریژۆک: [ناو] ماراژۆک؛ گیایێکی تەمەن کورتە و دەخورێت. (نوعیگیاەخوردنی)
مارێژە : [ناو] مارووژە؛ ماریژە؛ گیایێکی بە هاریە و دەخورێ؛ ماریژۆک. (گیاهیاست-خوردنی)
ماریکتکی : [ناو،ت] ماریزەنگی. (مار-کبری)
ماریکەرانە : [ناو،ت] جۆری ئاسکی گە-ورەیە. (گوزن)
ماز :[ناو]بەرانی چوارساڵە.(قوچچهارسالە)+
مازگ : [ناو] (۱)مازە؛ موغەرەی پشت. (پشتمازە). (۲)مازوو؛ بەری دار مازوو. (مازوج)
مازگە : [ناو] مێژی؛ (مازگا) لە ئاویستاییدا بە واتای مێشک(مەغز)هاتووە. (مغز)
مازگەدەر : [ناو] مازگەدەرد؛ ئێشی مازە؛ پشتئێشە. (دردکمر)
مازوت . فرد؛ روسد؛ فد: [ناو] نەوتەڕەشە. (مازوت)
مازۆرێ : تۆراو لە ماڵ و مەسکەن و پەنا بردوو بە شوێنێکیتر. (قهرکردنازخانەو-کاشانە)
مازەندەر : [ناو] هەندران؛ وڵاتانیدوور؛ تاراوگە. (ولایتدور؛ تبعیدگاە)
ماژە : حاڵەتی ئێسکی لەش؛ ئێسک بە-ندی؛ ئیسکلێتی لەش ( اسکلت)
ماستەک : [ناو] ڕەحەتی. (قیف)
ماسرێشم : [ناو] هێلم؛ چەسپیدار؛ چە-

سپی نەجاڕی. (سریشم)+
ماسک : (١)[ناو] مەیتەر؛ خزمەتکاری ئەسب لە تەویلە. (مهتر). (٢)[ناو] ئاسکی مێ. (آهوی‌ماده). (٣) [ئاوەڵناو] ڕژد؛ چکووس. (خسیس)
ماسک : فد؛ اند؛ فرد: [ناو] ماکی دەرمان و مەڵهەمی دەموچاو سواخدان بۆ گەشەدان بە پێستی ڕوومەت؛ زیاتر لە ئاڕایشگای ژنانەدا. (ماسک)
ماسک : فد؛ فرد؛ اند: [ناو]کەرەستەی پاڵاوتنی هەوای هەناسەکێشان لە ناو دوو کەڵ یان لە ناو تۆز وگازی کیمیاو یدا. (ماسک)
ماسکی‌گاز : [ناو،ت]کەرەستەی پاڵاوتنی گازی کیمیایی لە کاتی هەناسەکێشاندا بۆ بەرگری لە وەزەنی گازی ژاراوی لەسەرکۆ ئەندامی هەناسەکێشان. (ماسک‌گاز)
ماس‌ماڵ : [ناو،ت]گیامێرک؛ گیاییکە بۆ لابردنی ماس و پەنمینی جومگەی باکردوو بەهۆی(روماتیزمەوە)بە کەڵکە.(گل‌آلاله)
ماسی‌خاویار : [ناو،ت] بەتایبەت بە ماسی (ئوزوون‌بڕون)دەگوترێ چونکا چەند چەشنە ماسی دیکەیش گەرای ناو زگیان وەک خاویار دەخورێت. (ماهی‌خاویار)
ماسیگرەک : [ناو،ت] ماسیەوچنە؛ مایی‌چنەک؛ ماسیگرە؛ فڕندەییکی باڵدرێژ و تیژباڵە؛ قاق؛ تورەمەی ماسیگرەکان نۆ جۆرن. (١)ماسی‌خۆرکە. (پرستوی‌دریایی) (٢)ماسی‌خۆرکەی بۆر. (پرستوی‌دریایی‌تیره).(٣)ماسی‌خۆرکەی خەزەری(پرستوی دریایی‌خزر).(٤)ماسی‌خۆرکەی دەندووک ئەستوور. (پرستوی‌دریایی‌نک‌کلفت). (٥)ماسی‌خۆرکەی دەنگ بۆڕ. (پرستوی-دریایی‌بدصدا). (٦)ماسی‌خۆرکەی ڕەش. (پرستوی‌دریایی‌سیاه). (٧)ماسی‌خۆرکەی ڕەشی باڵ سپی. (پرستوی‌دریایی‌سیاه‌بال-سفید). (٨)ماسی‌خۆرکەی کڵاون. (پرستوی‌دریایی.کاکلی).(٩)ماسی‌خۆرکەی قەشان. (پرستوی‌دریایی‌پشت‌کبود)
ماسیی‌سپی : [ناو] جۆرێک ماسی کە لە دەریای خەزەردا زۆرە وگۆشتەکەی خوازیاری زۆرە. (ماهی‌سفید)
ماسیی‌سیم : [ناو] ماسییێکی پانی کورتە و لە دەریای خەزەردا زۆرە و گوشتەکەی خوازیاری زۆرە.(ماهی‌سیم)
ماشتن : [چاوگە] ڕامالینی سفرە و تەواو کردنی خۆراکی سەرسفرە. (همەغذای‌سر-سفرەراخورن)
ماشتە : [ناو]کوڵوانە. (چارقد رو دوشی)
ماشێن‌شۆری : [ناو،ت] جێگای تایبەت بۆ شتنی سەیارە؛ ڕەوتی شتنی سەیارە. (ماشین‌شویی)
ماشین‌کردن : [چاوگە،ت](١)بە مەکێنە سەروقژ کورت کردنەوە و هەڵپاچین. (٢) تایپ‌کردن؛ نامە نووسینەوە بە ماشێنی تایپ. (ماشین‌کردن)
ماشێن‌نووس : [ناو،بک]کەسێک کە نامە و نووسراوە تایپ دەکا. (ماشین‌نویس)
ماشینەوە : [چاوگە،ت](ب) لێساولێسدان و

هیچ لەسەر سفرە یان لە ناو کاسەدا نە-
هێشتن؛ماڵینەوە؛ ڕاماڵین و گسک لێدان.
(خالی‌کردن وخوردن‌همه‌چیزسرسفره‌یا
کاسه)
ماف ئەستێن : [ناو،بک] بەش‌وەرگر؛ حە-
ق‌وەرگر. (سهم‌گیر؛ حق‌گیر)
ماف سەندن : [چاوگە،ت] حەق سەندن؛
بەش سەندن. (حق‌گرفتن؛ سهم‌گرفتن)
ماف‌خواز: [ئاوەڵناو+ ناو]حەق‌خواز؛ کە-
سێک کە داوای حەقی خۆی بکا.
(ب)ئازادی‌خواز. (آزادیخواه)
ماف‌خۆر : [ئاوەڵناو+ ناو،بک]کەسێک کە
حەق و بەشی کەسێک داگیردەکا و
نایداتێ. (غصب‌کننده‌حق‌وحقوق‌مردم؛
حق‌خور)
مافر : [بەند] وەکوو؛ وەک؛ چوون؛ مینا؛
میناک؛ (مانند)
ماقە : [ناو]گۆی‌چاو. (حدقه‌چشم)
ماکەرمەلە : [ناو](ب) جامەلووسکێ؛ دەڵە-
چەیی؛ ماستاو کردن؛ کلکە سووتێ.
(تملق)
ماکی‌سڕکەر: [ناو،ت](ب)تریاک و
هێرویین؛ دەرمانی بێ هەست کردنی نە-
خۆش لە کاتی نەشتەرکاریدا. (ماده‌مخدر)
ماکێش :[ناو] سەلەی‌پڵاو ئاوکێش کردن؛
پڵاو پارزن؛ پڵاو پاڵێو. (آبکش‌پلو)
ماگمە : مامە؛ ماومە؛ پێم‌ماوە؛ تەواوم نە-
کردووە؛ ماگمە بگەم: تاوێکی‌تر دەگەمێ.
(معادل:هنوزدارم؛ مانده برسم)
ماگە : ماوە؛ مایە؛ نەمردووە؛ هێشتاهەس؛
هێشتاهەیە. (مانده.هنوزهست)
ماڵ : [ئاوەڵناو] [ناو] وەک: ئامووریێ کە
زۆر نەچەقی دژی ئامووری ڕژد. (خیشی-
کەزیادفرونرود)+
ماڵ : [ناو]گەیشتنی دەمی تاژی بەنێچیر
یان لە خۆڵ وەردانی، بەڵام بەدەمیەوە نە-
هاتن. (رسیدن‌تازی‌بەشکارودرخاک-
غلتاندن امانگرفتن)+
ماڵ بە قورگرتن :[چاوگە،ت] (ب) ماڵ
ویرانکردن؛ خانە خراپکردن؛ بێچارەکردن.
(خانەخراب‌کردن)
ماڵ وێرانکەر : [ئاوەڵناو+ناو] هەر شت و
هەرکس ببێتە هۆی ماڵ کاولی؛ (ب) ژنی
بێ مشوور و هەڵە خەرج. (کنایەاززن-
ولخرج)
ماڵاریا : فد؛ فرد: [ناو] نوبەتێ؛ پەتایێک کە
بەهۆی چزووی مێشوولەی(ئانۆفێل)ەوە
مرۆڤ تووشی دەبێت. (مالاریا)
ماڵان : (١) ماڵین؛ گسک لێدان. (٢) ماڵ-
گەل. (١.جاروکردن.٢.خانەها)+
ماڵای :[چاوگە،ت] مەشتن؛ ماڵین؛ گسکد-
ان؛ گزگ‌لێدان؛ ماشتن. (جاروب‌کردن)
ماڵ‌بەقوڕگیران : [چاوگە،ت](ب) بەد بە-
خت‌بوون؛ ماڵ‌کاول‌بوون؛ بێچارەبوون.
(بدبخت‌شدن)
ماڵ‌بەکۆڵ : [ئاوەڵناو]ڕەبەن و نەدار؛ بێ
سەروسامان. (خانەبەدوش)
ماڵبەن : [ناو] ماڵبەند؛ جێگەی بەستنەوە-
ی کەرو چارەوا بە دروشکە و گاریەوە.
(ماڵ‌بند)+

مـال‌خـۆنـەخـۆر : [ئـاوەڵنـاو] (ب) ڕژد؛ چکـووس؛ دەس قووچـاو؛ خـەسـیس. (خسیس)
مالخیر :[ناو] جۆرێـک تفـەنـگ. (نـوعی-تفنگ)
مالدوخین : [ناو،ت] پزوو؛ نیفۆ؛ ماڵـدوخین. (جای‌کمربنددرشلوارکردی؛جای بندشلوار)
مـاڵران : گسـکدان؛ پیاسـاوین؛ سـاویان. (جاروب‌زدن؛سائیدن)
مالزارۆک : [ناو] تۆڵدان؛ پزدان؛ منداڵـدان؛ ماڵزارۆک. (زهدان)
ماڵشته : [ناو،بک] گسک‌لێدەر؛ کـەسـێک که دەماڵێ. (سپور)
مال‌کەمباخ : [ئاوەڵنـاو+ نـاو] مـاڵوێـران؛ چارەڕەش؛ بەدبەخت. (خانەخراب)
مالکەیی : [ئاوەڵناو] ماڵکەیـی؛ مالکـەتـی؛ ماڵوسـامان لـە دەسـداو؛ مـافینگی بـوو؛ موفلیس کەوتوو؛ دەم لـەپـووش.(مفلـس؛ ورشکسته)
ماڵگرتن : (ب) مـاڵبـەکرێگـرتن. (خانـه اجاره‌گرفتن،اجاره‌کردن)
ماڵگۆڕی : ئەو ماڵانه پەزیان له ڕاندایه هەرشەوەی ماڵێـک پیاوێـک دەنێـرن بـۆ ئاریکاری شـوان و ئاگـالێبوونی ڕانـەمـەڕ. (نوبتی‌کمک‌شبان‌کردن)
ماڵمـاڵۆک : [نـاو] جۆرێـک هـەڵپـەڕینـه. (نوعی‌رقص)
مال‌میڤان : [نـاو،ت] میووانخانـه؛ ئوتێـل؛ ماڵمیوان.( مهمانخانه؛هتل).
ماڵومین : مال و سامان؛ (ب)خۆشەویست-
وریزدار. (عزیز)> مان
مـاڵوو : [نـاو] دارێکـی قـەوی بـەقـەرای دوومیترکه دەخرێته سەر دەنـد بـۆ سـاف-کردنی نارێکی له دوای شێف‌بڕین. (مالـه-صاف‌کردن‌شخم)
ماڵه : [ناو](۱)ماڵنج؛ڕووپەڕێکی دەسکدارە، بۆ لووسکردنی سواخی دیـوار. (مالـه). (۲) ماڵوو، کۆتـه دارێکـی درێـژ کـه کـونێکی تێدایه سەری دەند دەچێ بەناویا و دەیهنن بەسەر شێوی پڕ لەکوڵودا بۆ ساف و لووس کردنی. (شخم‌صاف‌کن)
ماڵی : (۱)[ڕابوردووی ماڵین] گسکی لێـدا. (جارو کرد)(۲) [ئاوەڵناو] پەیوەندیـدار بـه-مـاڵوسـامانەوە؛ وەک: کێشـەیمـاڵی. >ف.هن. (مالی)+
ماڵی بێدان : (ب) بابەتی بێدان، خواردنی نەرموشل. (۲ب) شـتی هـەرزان یان کارێکی ئاسان. (چیزیاکارساده)
مالیته : [ناو]کونی داعبای کێوی وەک گورگ و ڕێوی. (کنام)+
مالیجه : [ناو] چارەسەرکردنی نـەخۆشـی؛ دەرمـانکردن و چـاککردنـەوە؛ لـە(موعالیجـە)ی ئـارەوییـەوە هـاتووە. (معالجه)
مالیخولیا : فد؛ عد؛ یونان‌د؛ [نـاو] ماخولیـا؛ نەخۆشینی بیر و هـزرە و مـرۆڤ تووشـی خەیاڵاتی تێکەڵ پێکەڵ دەکا. (مالیخولیا)
مالیسۆک : [ناو] ڕووەکێکه بەرێکی سـوور و چکۆله دەگرێ. (نام‌گیاهی‌است)
ماڵیکردن : [چاوگە،ت] فرنده و حـەیـوانی

کێوی لە ماڵدا ڕام و دەسەموّکردن. (رام-کردن‌پرندەوحشی)
مالیکی:یەکێ لە چوارمەزەبی‌موسوڵمانانی سوونی، شوێکرانی ئیمامی مالیکی. (مالکی)
مامایی : [ناو] داپیرکی. (مامایی)
مامرکوژ :[ناو] ڕوەکێکی تام تیژە؛خەردەل؛ لە کمیابارانی شاری حەڵەبجەی شەهیددا لە گازی خەردەل کەڵکیان وەرگرت. (خردل)
مامرەچینی : [ناو،ت] مریشکەچینی. (مرغ-چینی)
مامرەڕەشە : [ناو] مریشکەڕەشە؛ لە قەدیمدا باو بوو ئەگەر فەقێ هەتا سوورەی نەسریان بخوێندایێ دەبوو مریشکێکی ڕەش بە دیاری ببەن بۆ ماموّستا. (کنایەاز-سورەنصر)
مامرەش : [ناو] جۆرێک مراوی کە ڕەنگی ڕەشە. (مرغابی‌سیاه)
مامۆخ : هەورازێکی بەرزە لەبەینی سەقز و سنەدا. (گردنەماموخ)
مامۆرە : [ناو] جۆرێک تروّزییە. (نوعی-خیارچنبر)
مامۆستا : [ئاوەڵناو] [ناو] لێزان؛ پسپۆڕ؛ ماموەستا؛ مامۆسا؛ سەیدا. ( استاد؛ ملا؛ معلم)
مامووت : فرد؛ فد: [ناو] فیلی سەرەتای دەورانی چوارەمی زەوین‌ناسی بە لەشی تووکن و عاج(شفره)ی درێژ و چەماوەوە. (ماموت)
مامە : (۱)ماوەمە؛ ماگمە؛ لێم‌نەبڕاوە؛ تەواوم نەکردووە(بن‌زاراوەی سەقزییە). (تمام-نشده.تمام‌نشده‌ام). (۲) مامۆ؛ ئاپۆ. (عمو)
مامهۆرتک : (ب)کەسێک‌کە شارەزای زۆرئیش و کارگەل بێت. (خبرەدرخیلی امور)
مان : وشەیێکی ئاوێستاییە بە واتای (خانوو ، ماڵ)لە کوردیشدا هەیە وەک سامان؛ ساختومان؛ ساختمان؛ بە واتای بینا و ماڵ؛ خان‌ومانت شێوی : ماڵ کاول‌بی. (خانە)
مانتۆ : [ناو] عابا و کەوای درێژی ژنانە کە بە سەر لیباسدا لەبەری دەکەن. (مانتو)
ماندانا : ناوی کچی ئاژیدهاک دواهەمین شای ماد و دایکی کوورش.(دختر ضحاک و مادر کورش)
ماندنەوە : [لە چاوگەی مان] نەڕۆیشتن لە جێگایێ و مانەوە. (ماندن)
ماندۆلین : ئیسپانیاد؛ فد؛ تد: [ناو] جۆرێک ئامێری مۆسیقایی لە باغڵەمە چووکترە و تەلیە. (ماندولین)
ماندو و مردوو : (ب)زۆر شەکەت و هیلاک. (بسیارخستە)
مانگابەکەڵ : مانگایێ‌کەکاتی جووت-خوازی هاتووە. (مادەگاوگشن‌خواه). (ب)بە تەوسەوە بە ژنێ دەڵێن کە پیاوان زۆر بکەونە شوێنی. (زنی‌کەمردان بەدنبالش راەبیفتند)
مانگادۆش : [ناو،بک] چێل دۆش(۱)کە-سێک کە مانگا دەدۆشێ. (گاودوش).

(٢)[ناو] دەفری گەورە لە مەڕدۆش گە-
ورەتر. (ظرف‌دوشیدن‌گاو)
مانگاماسی :[ناو] جۆرێک ماسیی‌گەورەیە.
(نوعی‌ماهی)
مانگ‌دیتو : [ئاوەڵناو] ژنەک کۆ مەهان
دەبەت؛ ژنێک کە بکەوێتە بێ‌نوێژی. (زنی
کەقاعدەشود)
مان‌گرتن: [چاوگە،ت] گەی‌گرتن؛ (ب)بۆ
مەبەستی ڕامیاری یان کێشەی مالی، دە-
ست لە کار کێشانەوە و کار نەکردنی
کادێرگەل لە ڕێکخراوێکدا.(اعتصاب)+
مانگ‌گیران : [ناو] هەیڤ‌گیران؛ مانگ-
گیریەی؛ حالەتی مانگ وەبەرسیبەری زە-
وی کەوتن. (خسوف)
مانگە : [ناو] هیلالی؛ خەرپشتە؛ میچی‌خە-
رپشتە. (خرپشتە)
مانگەڕۆژ : مانگەشەو. (شب‌مهتابی)
مانگ‌هەڵاتن : [چاوگە،ت] مانگ لە ئاسۆ
دەرکەوتن. (ماەدرآمدن)
مانگی‌تەواو : (١)مانگی کە ٣٠ ڕۆژ کەمتر
نەبێت. (٢)مانگی پڕ بە ئاسمانەوە، چەغزی
تەواوی مانگی چواردە. (ماەتمام؛ بدر)
مانگی‌زایینی : [ناو] ناوی مانگەکانی سالی
زایینی. (ماەمیلادی)
مانگی‌شەرم : [ناو] مانگی هەوەلی
مێردکردن. (ماەعسل)
مانگی‌نۆ : [ناو] مانگی‌نوی؛ هەر مانگی
نەو بۆ حالم پەشێوە، چوون هیلال شێوەی
ئەبرۆی تۆی پێوە؛ «فۆلکلۆر» مانگی یەکشە-
وە.(ماەنو)

مانگی‌هەتاوی : ناوی مانگەکانی سالی
کۆچی‌هەتاوی؛ مانگی ڕۆژی. (ماەشمسی)
مانە : [ناو] خانووی گچلە؛ لە هەورامیدا
بووە بە یانە. (هەرەس وەیانەم : هەرەس
بەمالم) دیسان وشەی وانە واتا ژووری
دەرس‌خوێندن، و زۆر نزیکە بە مانە. (خانە
کوچک)
مانەوی : [ناو] شوێنگرانی دینی مانی.
(مانوی)
مانی : [ناو] خاوەنی کتیبی وێنەی ئەرژە-
نگ کە خۆی بە پێغەمبەر دەناساند و
کوردێکی وریا و قسەزان بووە. (مانی)
مانیشت : (١)ناوی نێونامەی بەڕێزسەجاد
جەهانفەر. (٢)ف.مان. جێگای نیشتە-
جێبوون و شوێنەواری ماد( ماد+ نیشت)
(سرزمین ماد)
ماوت : [ناو] ماهووت؛ جۆرێک قوماشی
کورکدارە. (ماهوت)
ماوت‌مالْ : [ناو،ت] ماهووت‌مالْ؛ فلْچەی
پاک‌کردنەوەی قوماش و لیباس. (ماهوت-
پاک‌کن؛ برس‌لباس)
ماوزۆ : [ئاوەڵناو+ناو] بەجێماو. (بەجامانده)
ماوس : اند؛ فد: [ناو]کەرەستەی جووڵێنە
ری نیشاندەری سەر شاشەی کامپیوتێر.
(ماوس)
ماوەر : [ناو] پوتکی بەرد شکاندن؛چە
کوشی گەورە و قورسی بەرد شکێن
.(چکش‌سنگ‌شکن)
ماوەرۆ : [داهاتووی هێنان] دێنیْ؛ دەهێنیْ؛
تێری. (میآورد)

ماەپارە : نێوی ژنانە. (مهپارە.)
ماهۆن : [ناو] دەسکی چەقۆ لە داری مێو. (دستەچاقوازدرختمو)
ماهوور : [ناو] مەقامێکی ئاوازی‌کوردی و ئێرانییە. (ماهور)+
مایلی‌دەریایی : [ناو] یەکەی مەودا لە دەریادا بەرانبەربە ١٨٥٢ میتر. (مایل‌دریایی)
مایو : [ناو] توونکە؛ تنۆکەی مەلە و هاڵتێر لێدان بۆ پیاوان و تنۆکە و مەمکبەند بۆ مەلەکردنی ژنان. (مایو)
مایۆنێز : فرد؛ فد؛ اند: [ناو] جۆرێک ڕب یان سۆسی سەلاتە کە لە خەردەڵ و هێلکە و سرکە و ماست و ئارد چێدەبێت. (سس) (مایونز)
مایە : دەستەواژەی مۆسیقایە، (١) ڕیز گرتن واتا میزراب وەشاندن لە سازێکی‌تر کاتێک لە کۆکی سازی ساز ژەنێکدا بێت و دەنک تێکەڵی دەنگی سازی ساز ژەنەکە کردن. (٢) بنەمای مەقام لە مۆسیقادا. (١و٢.مایە)+
مایی : [ئاوەڵناو]ماوەوە؛ کۆن؛ بەیات؛ مەنە؛ مەندە؛کۆن‌کەوتوو. (ماندە؛کهنە)
متمتی : خۆپاشقەکێش؛ خۆوەپاش‌خەر؛ خۆماتکەر؛ماتڵی دەرفەت بوون؛ خۆخافڵێن. (بی‌فرصتبودن)
متۆ : [ئاوەڵناو]کەوی؛ ماڵی؛ ڕام؛ ڕاهاتوو؛ دەستەمۆ؛ ئوگر. (رام)
متەق : هەست؛ جوولە؛ دەنگ؛پرزە. (حس؛صدا)
متەکا : سەرین. (متکا)
مجمعە: [ناو] مجۆعمە؛ بۆی هەیە لە (مەجموعە: جەمع گەل)ڕا هاتبێت و کوردکاری کرابێت، بەواتای کۆمکراوی چەند شت؛ (مجموعە)
مجۆعمە : [ناو] مجومعە؛ کەشەفەی لەسەردانانی کۆمێک خواردەمەنی؛ سینی و کەشەفەی گەورەی نان لەسەر خواردن؛ خوان. (مجمعە)
مجێوری : [ناو]کاری مجێور؛ مزی مجێور. (کارومزدمجاور)
مچکاندن :[چاوگە،ت] وشک‌کردن.(خشک کردن)
مچیرە:قەوچەکردنی‌کەر.(فک‌جنباندن‌خر)
محانچێن : [ناو]یاری بەقاپ(جگ)، هەڵگێرانەوەی قاپ بە بارێکی‌تردا بە قاپێکی تر. (نوعی‌بازی‌باشتالنگ)
محەنەک : [ناو] ئەسپی ڕەسەن؛ کەحیل. (اسب‌اصیل)
مختی : [ناو] شۆڵاوەی فرمێسک. (اشک سرازیرشدە)
مخمخاندن : [] هارین؛ پەراش‌پەراش‌کردن؛ فلیقاندنەوە. (خردکردن؛ لەکردن)
مخمخک:(١)بێستانی‌تەڕەکاڵی.(جالیز)(٢) شۆڵاوەی فرمێسک. (سرازیرشدن‌اشک)
مداس : دەمپایی. (دمپایی)
مدو : دەدا؛ دەیدا. (می‌دهد)
مدیۆ : دەڕوانیٚ؛ ئەڕوانی؛ تماشادەکا؛ دەبینیٚ. (می‌بیند)
مرخ : [ناو] داخواز؛ ئارەزوو؛ ویست؛ تەماح. (آرزو،طمع)

مـردار بوونـەوە : [چاوگـە،ت](ب) مردنـی مرۆڤی خراپ و بەد ئاکار. (مردن‌انسان‌بد و فاسد)+

مردارخۆر : [ئاوەڵناو]کەلاکـی تۆپیـو خـۆر؛ مندارخۆر؛ منارخۆر؛ وەک : کەمتیار و داڵ. (مردارخور)

مردارکردنەوە :[چاوگە،ت] (١ب) ماڵی کـە-سێک بە زەم‌کردن قەڵب‌کـردن لـەکـاتی موعامـەلـەدا. (تـوی‌سـرمـال‌زدن). (٢) کوشتنی حەیوان بی‌سەربڕینی شـەرعـی . (٣) خراپ سەربڕینی ئاژەڵ نە بەگـوێرەی شەرع. (٢و٣.مردارکردن)

مردارەمانگ : [ناو] منارەمانگ؛ بەینی بە هار و هاوین کە لەو کاتەدا نەخۆشین و مردار بوونەوەی ئاژاڵ زۆرە. (بین‌بهار وتابستان)

مرقاندن : دەنگی نێری هاوکـات لـەگـەڵ زبان دەرهێنانی نێری بەدەوری بزنی بـە-تەگەدا هەروەها دەنگی بـەراز و گـامێش. (صدای تکه گراز و گاومیش)

مرقە : (١) کەمترین دەنـگ؛ مرقـەی دە-رنەهات : دەنگی لێوە نەهـات. (کمتـرین-صـــدا). (٢) دەنگـــی گـــامێش و بـــەراز. (صدای‌گراز)

مروس : مریس؛ مێتن؛ مژتن. (مکیدن)

مری‌پۆش : کفن. (کفن)

مریتانۆ : [نـاو] مـرۆڤ؛ ئینسـان؛ عیسـان؛ بنیادەم؛ بەشەر. (انسان)

مریشکاوی : [ناو] قەلەمـراو؛ باڵنـدەییێکـی ڕەشە لە مـراوی چـووکترە و مـەلـەوانـە. (نوعی‌پرندەآبی)

مریشکەئاویلە : [نـاو] تۆرمـەی مریشـک-ئاویلە چەند جۆرن. (١)ڕەش‌بەشە. (چنگر). (٢)تاوسە. (طاوسک). (٣)مریشکـئاویلـەی گەورە و بچووک و خەنـەیـی و دەنـدوک سـەوز، سـوور بـەڵـەک. (یلـوەبـزرگـو کوچکـو حنایی‌و نوک‌سبزو خالدار)

مریشکەکێوی : [ناو] فڕەندیێکی تیـژ باڵـە مێیەکەی(مێوەکەی) چیتـین(خاڵخـاڵ)ە و نێرەکەی لە چەند ڕەنگی(ڕەش و سـوور و زەرد)ە،کلکـی ڕەش و درێـژە و گۆشـتیان دەخوری. (قرقاول)

مزاخە : [ناو] سـندوقی‌نـان؛ جێگـای نـان تێنان. (جای‌نان؛صندق جای‌نان)

مزانا : مـزانـی؛ دەزانـی؛ ئـەزانـی؛ دزانـی؛ زانیت؛ زانیتەی. (میدانی)

مزانوو : دەزانم؛ ئەزانم. (می‌دانم)

مزانـی :(١) مزانـی؛ مزگێنـی؛ خـەبـەری خۆش هێنان؛ پاداشـی خـەبـەری خـۆش هێنان. (مژدگانی)(٢)دەزانی. (میدانی)

مزدان : حەق‌دان؛ پاداش‌دان؛ قەرەبووی-چاکەکردنەوە. (مزد دادن)

مزراب :[ناو] میزراب نەغمە؛ دەندوک ئاسایێکی چووک لە کانزای زەرد یان شاخ یان شاپەل، یان ئێسک، بۆ ژنـدنی سـازی ژێدار و تەلدار. (مضراب)

مزرە : (١) هێستری نێر. (استرنر). (٢)ترش و شیرینە. (می‌خوش‌است)

مزگەری : [ناو] پیشە و کارگەی مسـگەر. (مسگری)

مزووری : [ناو] بەکریٚ کارکردن؛ بەکریٚ گیراوی؛ لە (موزدووڕی) فارسییەوە وەر گیراوە. (مزدوری)
مزە : مەزە؛ کورتکراوی ناوی(مەرزیە و موزەفەر)ە. (مخففاسممرضیەومظفر در زبان کردی)+
مزەوت : مزگەوت؛ مزگت. (مسجد)
مزیانی : [ناو] مزگێنی؛ مزگانی؛ نوخشانە؛ نوقڵانە؛ خەبەری خۆش پێدان؛ مزانی. (مژدگانی)>مزانی
مزێج : [ناو] بێزوو؛ مەگیرانی بێزگ. (ویار)
مژدانە : [ناو] موژدانە؛ خەڵاتیٚ کە بە - مزگێنی هێنەر دەدرێت. (مژدگانی)
مژدی : [ناو] بێزو؛ مەگیرانی؛ بێزگ؛ مزیج. (ویار)
مژگ : [ناو] مێشک؛ مەژگ؛ مەژۆ؛ مەژی. (مغز)
مژومۆر : [ناو] بەکەسێک دەڵێن چاوی کز بیٚ؛ چاو مژومۆر : چاو نیوە کراوەی کز. (چشمکمسو)
مژیای : [چاوگە] مژتن؛ مژین. (مکیدن)
مژیلانک : [ناو] مژۆلانک؛ مژۆڵ؛ برژۆڵ؛ برژانگ. (مژە)
مستە : مچە؛ مستۆ؛ کورتکراوی مستەفا. (مخففاسممصطفی)
مسمسۆک : مسەمس‌کەر؛ خنەخن‌کەر؛ منەمن‌کەر. (مس‌مس یا من‌ومن‌کنندە)
مسوار : [ناو]کانزای مس لەگەڵ قاڵاییدا تێکەڵ‌کراو بە (ئالیاژ)کراو. (آلیاژمس‌و- قلع)+
مسۆگەر : [ناو،بک] دابین‌کراو؛ ئامادەکراو. (تهیەکنندە)
مش : فرد؛ فد: [ناو] تایبەتمەندی قژی ڕەنگ‌کراو، هەر چەپکی لە ڕەنگیٚ. (مش)
مشت قووچاو : [ئاوەڵناو] مشت قووچیاگ : (ب) ڕژد. چکووس؛ خەسیس؛ چاوچنۆک؛ ڕەزیل. (خسیس)
مشتومالٚ : [ناو،ت] جاران باو بوو لە گەرماو بە جۆرێکی تایبەت دەلاک(کیسە- کێش) مشتومالی موشتەری‌دەدا، و دە- یشێلا.(مشت‌ومال)
مشتومالٚ : دەست پیاهێنان و سڕین؛ (مشتومالی دەوی ئاوینەی ژەنگاویی خە- یالٚ). «هێمن» (صیقل؛ پاک‌کردن)
مشت‌وەشێنی : دەکریٚ لە جیاتی مشتە- کۆڵە بۆ کێبەرکێی شەرەمشت بەکاربێت. (مشت‌زنی)
مشتەکۆڵە : یاری شەرەمشت(کێبڕکێی شەڕەمشت)گۆیا لە ماوەیکی نەزۆر دوور دا ئەو ناوەی لێنراوە لە تەلەفزیۆندا بیستوومە.(بکس)
مشتەگرتن : [چاوگە،ت] سێرەگرتنی تفە نگ بۆ لە ئامانجدان. (نشانەرفتن)
مشتەل : (١)شەتل؛ نەمامی‌ڕیشە. (نشا).(٢) دووکان؛ جیٚ‌شەتل. (کرت؛ جای‌پرورش‌نشا)
مشقەمشق : (١)مرقەمرقی نێری بە دە- وری بزندا. (٢) مۆزەمۆز؛ خولانەوەی تازە- لاوان بە کۆڵاناندا بۆ حەزلێکەری. (صدای (شاک‌درجفتگیری.٢. پسرجوان کەدور

دختران‌می‌پلکد، میچرخد)

مشومۆڕ : >مۆڵ‌ومرچ.

مشوەش : وردەنیسک. (عدس‌خرد)

مشەخت‌کردن : [چاوگە،ت]کۆچپێکردن؛ ئاوارەکردن؛ تاراندن؛ دوورخستنەوە. (کوچانیدن؛ آوارەکردن)

مشەگیا : [ناو،ت] ڕووەکێکە لامژ وەک کەڵەی بێستان. (گیاهی‌است ،انگل- گیاهان‌دیگر)

مشیۆ : [بەند] مەشیۆ؛ دەبێ؛ ئەبێ؛ ئەشێ؛ دەشێ. (باید)

مفا : [ناو] موفا؛ خێر؛ سوود؛ قازانج؛ چاک. (سود؛ فایده؛ خیر)+

مفتەلابوون : [چاوگە،ت] موفتەلابوون؛ تووش‌بوون؛ دووچاربوون؛ موپتەلا- بوون؛گیرۆدەبوون. (مبتلاشدن)

مفس : [ناو] پارزن؛ پاڵێو. (صافی)

مفسیت : > مفسد

مفلنگ : [ناو] قاحبە؛ جندە. (روسپی)

مقۆ : [ئاوەڵناو]خووگرتوو بە شتێ‌کە تە- رکی دژواربێت؛ وەک هێرۆئین و تریاک. (معتاد)+

مقۆمقۆ : (١)دەنگۆ؛ وتەوت؛ قسە بڵاو بوونەوە لە جەماوەردا؛ مقۆمقۆ داکەوتووە : دەنگۆیە. (٢). >ف.هن. (شایعه)

مکۆ : [ناو] مەکۆ؛ جێگای کۆبوونەوە. (جای‌تجمع)+

مکوڕ : [ئاوەڵناو]سوور لە سەر قسە و ڕا. (مصر بر رای‌ونظر)

مکێنە : > نکێنە

مگیز : [ناو] تامەزرۆیی؛ مەیل؛ هەوس؛ ئارەزوو؛ ئیشتیا. (آرزو)

مڵاس: [ناو] مڵاز؛ خۆ ماتکردن وگوێقوڵاغی دەرفەت بوون؛ لەبۆسەوە چوون. (کمین)

مڵاشی : [ناو] مڵاشوو؛ مەڵاشوو؛ مەڵاشک؛ مڵاشک. (سق‌دهان)

مڵاڵە : [ناو] جزمە؛ چەکمە؛ پۆتینی درێژ تا نیوەی بەلەک. (چکمە)

ملبێند : [ناو] ملوانکە؛ ملبەند؛ ملوێنک؛ ملبێدە. (گردنبند)

مل‌پێچی : [ناو]کەڵەوەکێشی؛ مل‌بادان؛ بەربەرەکانێ؛ نافەرمانی؛ ملەجووڕێ. (نافرمانی)

ملتۆڕلی : [ئاوەڵناو]ئەستۆزراڤ؛ مل‌باریک. (گردن‌باریک)

ملکس : [ناو] گزگ؛ گسک؛ گەسک. (جاروب)

ملکەو : [ئاوەڵناو] (ب) ژنی شان و مل جوان و خوشیک و چەلەنگ. (زن‌زیبا- وگردن‌زیبا)

ملکێش : [ناو] دەسکەنە؛ دروێنەی دەغڵ بە دەست. (بادست‌چیدن‌گندم‌یاجو)

ملکێش کردن :[چاوگە،ت] مل‌گرتن یا تەناف لە مل‌خستن و ڕاکێشان، بەزۆر بردن بۆ شوێنێ. (پشت‌گردن‌گرفتن‌وبردن- بەجایی)

مڵۆزم : [ئاوەڵناو]مێملی ملهوڕ و بەهیز؛ لە- بەین بەر؛ دوشمنی زاڵ؛ ئافەت؛ بەڵا. (ضد؛ آفت)

مڵومۆ : (ب) ڕەوتی سەرکێشان و گەڕانی

فسۆس بە دوای خەبەر و جاسووسیدا. (سرک‌کشیدن‌جاسوس)+

ملوەبەرملنان : [ناو،ت]بەربەرەکانی- کردن؛ زۆران‌گرتن. (مقابله‌کردن؛ رقابت)

ملەجووڕێ : [ناو] ملبادان و کەڵەوە- کێشی؛ لاموجومی؛ لاملی؛ لەقوونەجووری بەنزاکەتترە. (نافرمانی)

ملهوڕی : [ناو] زۆرداری؛ ملئەستووری؛ شەڵاتی؛ زۆرەملی. (گردن‌کلفتی)

ملێب : [ناو] شەنە؛ شەن. (افشون)

منارکردنەوە: [چاوگە،ت](١) مندارکردنەوە؛ مردارکردنەوە؛ (مردارکردن) (٢ب)کاری سەقەت‌کردن؛ کاری گەناندن و خراپ- کردن. (گندزدن)

منجەمنج : قسە جاوین و خۆ خافڵاندن و دەربڕینی قسە بە ناڕاشکاوی. (من‌ومن)

مندۆ : [ناو،ت] تولە فەڕەنگی؛ سەگی - چووکەی کونەڕۆ. (سگ‌فرنگی)

مندۆخ : مندۆغ : >مندۆ

منع : [ناو] مەنع؛ مەنح؛ ئەم وشەیە لە ئارەوێیەوە هاتووە بەڵام لە کوردییدا بە- واتای لۆمە بەکاردێت، دوێنێ باسی ئە- حمەدکرا زۆریان منع‌کرد لەوکارە خراپە کە کردوویەتی، واتا لۆمە یان کرد. (سرزنش)

منمانۆ : دەنوێنێ. (می‌نمایاند)

منمنە : [ناو] زەنگیانە؛ مووررووی ورد. (منجوق)

منۆخ : [ئاوەڵناو] تەمبەڵ؛ لەش‌گران؛ سست. (تنبل)

منەت‌کێشان : [چاوگە،ت](١) داوای شتێ- کردن کە بێتە هۆی سووک و چرووک بوون. (٢)ژێرباری منەتی کەسێک چوون؛ (منت کشیدن)

منەمن : خۆ خافڵاندن لە ئەنجامی کارێ؛ ملەجووڕێ. (این‌پاوآن‌پاکردن)+

منیچ : من‌ژی؛ ئەز ژی؛ منیش؛ ئەمنیش. (من‌هم)

مواجوو : [ناو] مەواجوو؛ مەواجب؛ پارەی مانگانەی کاربەدەست؛ مەعاش. (حقوق)

مـوارۆ : دەخـوا؛ دیخـۆت؛ دەخـوات. (میخورد)

موانۆش : دەی‌خوێنم؛ دەیخوێنمەوە؛ دێ بخوونم. (می‌خوانمش)

مۆبایل : اند؛ فرد؛ فد: تەلەفۆنی هاوڕێ. (مبایل)

مۆبەد : زانای ئائینی زەڕدەشتی لە مۆغ باڵاتر. (موبد)

موپتەلا : > مفتەلا.

موتلی : موتووی؛ متۆ : منداڵێ کە زۆر خووی بە باب یا دایکی یا کەسێکی‌تر گرتبێت؛ بۆ بێچوی زیندەوەرانی تریش دەوترێ. (طفل وابسته به پدر یا مادر؛ رام)

موتووی : >موتلی

مۆخ : بەشێکی جیاواز لە مێشک کە لە پشت مێشک دایە. (مخ). (٢) مەزگی- ئیسک. (مغزاستخوان)

مۆرتخای : مەلای موسایی؛ مەلای - جووەکان. (عالم‌دینی‌یهودیان)

مۆرد : مۆرت؛ گیاییێکە لە گەرمەسێر دە- ڕوێ دژی بۆکلێشەی پایە؛ سرکە لەگەڵ

هاڕاوه مۆرد دەساونە بەینــی قــامکی پــا و ژێر پا، بۆگەنی پا لەبەین دەبا. (مورد)
مورداد : ئەمورداد؛ مانگی ناوەڕاستیهاوین لەساڵی هەتاویدا. (مرداد)
موردەشۆ : مردووشۆر. (مردەشور)
مۆروپنجلەخۆنان : دەعیــه و دەمــارکــردن؛ لووتبەرزی و فیزکردن؛ خۆگرتن. (قیافه-گرفتن)
مورەڕەش . بزنی کەڕیلی ڕەش هەروها مووره (سوور و سپیوکاڵ و قەشان). (بز گوشکوتاهباتعین نوعرنگمو)
مۆرەی شەترەنج : داشی شەترەنــج؛ هــە-رکام لە ٣٢ پەیکەرەی کایەی شەتــرەنــج. (مهرەشطرنج)
مۆرەی کەمەر : پێــنج مــۆرەی مۆغــەرەی پشت لە بەینی مورەکانی پشــت و مــوره-کانی سیبەندەدا. (مهرەکمر)
مۆرەی مـل : مــۆرەیگــەردن(ب)حــەوت مۆرەی سەرەوەی موغەرەی پشت.(مهرە-گردن)
مۆرەیدامه : داشیدامه. (مهرەداما)
مۆری : هومایی؛ بالۆری؛ بالبالی؛ مــەڕمــە-ڕشا. (چلوار)
مۆریانه :(١) مۆرکه؛ ژەنگ. (٢ب)ڕشک و سپێ.(٣) جوولەوەرێکــه مێملــی خــوری و لیباسه. (زنگ؛شپش؛ موریانه..)
مۆریله . مێلووره؛ مرۆچه؛ مێروو. (مورچه)
مۆریماریٚ : موورگیمار؛ مۆریمــار؛ بــه-ردیمار؛ کاتی مار کراژ دەخا کالیســیۆمی لەشی کەم دەبێتەوە بەهۆی کــراژی نــۆی دروستکردنەوە و بۆقەرەبــووی ئــەو کــە-ماسیە بەرد دەکرۆژێ و دەیخــوا و پاشــان دەریاندەخاتە دەرەوە (دەیانهێنتــەوە)و ئــەو بەردانە چارەســەری نــەخۆشــینیٚ چــاوە و ڕۆشنایی و سوویچــاو زیــاد دەکــا؛ واتــای ناوەکەی بە ئارەوی(بەردی نوور)ە. (مهر مار)
مۆز : جۆرێک مێشی چزوو دارە بە گاگــە-لەوە دەدا و خوێنیان دەمژیٚ. (مژمژ)
مۆزگره : پووشبەقوونه. (سنجاقک)
مۆزەمۆز : سەرەتای حەزلێکەری ومشــقە-مشق. (دنبالعاشقیپسران)+
مــۆزیٚ : مشــقەمشــق و بــە دوای ژنانــدا چوون؛ حەزلێکەری لەگەل ژنان. (دنبــال-عاشقیزنانبودن)
موزیڕ : زەرەرگەیێن؛ زیاندەر؛ (لەئارەویــڕا هاتووه). (مضر)
مۆزیک : (١)مۆسیقا. (موزیک). (٢) ئاوەنیا، منــــداڵی ژن لــــە مێــــردی پێشـــــووی. (٣و٤)>ف.هن
مۆژانک : مژۆل؛ برژۆل؛ برژانــک؛ مــوژە-ڵانک. (مژه)
موژدەدەر : مزگێنیدەر؛ خەبەری خــۆش - هێنەر. (مژده دهنده)
مۆسیقا : (١)هونەری بــەدوای یــەکــدا دە-رهێنــانی دەنــگ بــە ڕەچاوگرتنــی زەرب (ڕیتم)و هارمۆنی و پێکــهێنــانی مێلــۆدی. (٢)بەرهەمی ئەوکارە. (موسیقی)
مۆسیقار: مۆسیقازان؛ زانیاری مۆسیقا؛ زە نیاری ئامێری مۆسیقا. (موسیقیدان؛

موسیقیدان؛ سازژن)
مۆسیقای‌پاپ : مۆسیقای خەڵکی ئاسایی بەبێ ڕەچاوکردنی بنەمای (موسیقای مەقامی و ڕەدیفی). (موسیقی‌پاپ)
مۆسیقای‌جاز : (ب)موسیقای تایبەت بە ڕەش پۆستاڵانی ئەفریقایی. (موسیقی‌جاز)
مۆسیقای‌ڕەسەن : موسیقاییێ کە لە کەوناراوە لە ناو میلەتێکدا گەشەی کردووە؛ لە کوردیدا زیاتر لە تۆی مەقامەکاندا گونجاوە و پێوەندیی بە مێژینەی مۆسیقاوە هەیە. (موسیقی‌اصیل)
مۆسیقای‌کلاسیک : مۆسیقای بەربڵاوی ئورووپی لە سەدەی ١٧و١٨دا؛ و بەردەوامیی ئەوڕێبازە. (موسیقی‌کلاسیک)
موشک : میشک؛ میسک؛ موسک؛ عەتری ناوکی جۆرێک ئاسکی وڵاتگەلی خەتا و خوتەن و ساخارین. (مشک)
موعەلیمی‌تایبەتی : سەیداییێ کە لە دەرەوەی فێرگە (لە ماڵەوە)دەرس دەڵێتەوە زیاتر بە پارە. (معلم‌خصوصی)
موغ : لە ئاوێستادا(مغو)بە پیاوی ئایینیی زەردەشتیان گوتووە. (مغ)
موغموغە : مغمغە؛ مێشوولەی قاچ درێژی سەرپشت کوڵکن. (پشه‌پادرازبزرگ )
موفادار : بەلەشت‌وموفا؛ خاوەنی سوودو-قازانج؛ مەفادار؛ بەفاییە. (بهرەدار)
موفەتیش : (ب)سیخوڕ؛ فسۆس؛ جاسووس؛ پشکێن. (جاسوس)
موقەیەت : گریدراو؛ دەروەست؛ بەندیوار؛ ڕەوتی ڕوودەر بایسیکردن؛ پابەند. (مقید)+
مۆکر : لە(مەکرووهی) ئارەوییەوە هاتووە، کارێک‌کە نەکردنی باشترە لەکردنی؛ خوراکیێ کە نەخوارنی باشترە لەخواردنی. (مکروه)
مۆکێت : فرد؛ فد؛ اند: ڕایەخێکە بە مەکینە چنراوی کوڵکن بۆ ڕاخستن لە تەختی عەرزی ژووردا. (موکت)
مۆکێت‌کاری : ڕەوتی ڕاخستن و چەسپاندنی مۆکێت بە تەختی عەرزی ژووردا. (موکت کاری)
مۆلان : مژ؛ تەم‌ومژیێ کە بە عەرزدا دەڕوا. (مەغلیظ سطحی؛ هوای‌مەآلود)
مۆل‌ومرج : مچ‌ومۆڕ؛ مۆن؛ ڕووتاڵ؛ ڕووگرژ؛ مرومۆچ. (عبوس)
مۆلەق : [ئاوەڵناو] لە موعەلەقی ئارەوییەوە هاتووە؛ هەڵواسراو؛ ئاوێزان و ویستاو بە حاسمانەوە. (معلق)+
مۆم : [ناو](١)مێو؛ مێوی‌هەنگوین. (موم).
(٢) شەم؛ شەمی داگیرساندن. (شمع)+
مۆمدان : [ناو] جێگەی شەم هەڵکردن؛ (ب) بەیەکەوە چەسپاندن؛ بەستن و شەتەکدان؛ یان گرێدان. (شمعدان؛ چسباندن)
مۆمۆل : مووی چاو کە لە پێلووەوە ڕوو بە ناو چاو دەڕوی؛ و ئەگەر چارە نەکرێت کوێر دەکا. (روئیدن‌مو روبەداخل‌چشم)
مۆمیاگەر : کەسێک کە مۆمیایی دەکا. (مومیاگر)
مۆنیتۆر : [ناو] ڕووبەری نیشاندەری وێنەی کەمپیوتێر و تیلێویزیۆن؛ شاشەی کومپیوتێر . (منیتور؛ مانیتور)

مونیر : منیره؛ ناوە بۆ ژن. (اسمزنانه)
موو بە بەیندانەچوون : تەواو پێکەوە نووساو؛ (ب)زۆر بەین خۆش و تەبا. (بهم-چسپیده؛ دوستصمیمیونزدیک)
مووبەموو : (ب)گێڕانەوەی خەبەر بەوردی. (موبەمو)
مووچنگۆک : [ناو] مووچینیچووک؛ مووکێشیچکۆلە؛ مووچینک. (موچین-کوچک.)
مووچیاگ : [ناو،بەر] نووشتاوە؛ چەماوە؛ شتێ کە مووچاوەتەوە و گرمۆڵەبووە. (خمیده؛ مچالەشده)
مووخۆرکە : [ناو] ڕەوتی دووفلیقانە بوونی سەری موو کە دەبێتە هۆی وەرینی موو؛ زیاتر لە مووی درێژی سەردا پەیدا دە بێ.(موخوره؛ مرضشکافتەشدن نک مو)
مووەدرز : مووقڵیش؛ درزی زۆر ورد. (مودرز)
مووەدەمار : وردەدەمار؛ دەماری باریکی ناوە لەش کە لە دەمارەکان جیا دەبنەوە. (مویرگ)
موور : (١)کەڕیل؛ بزنێکە گوێی چکۆلە و کورت بێت. (بزگوشکوتاه)(٢) کۆتەی دار. (قطعه چوب کلفت)
موورگەگیا : پێچیلە؛ گیایێکە بەگوڵیسوور یان سپییەوە، تووەکەی خڕە و ماکی ئانتی بایوتیک(دژی هوورک)ی زۆرە و کوڵیزاوی بۆ شتنی برین باشە. (گللادن)
مووروەکەرانە :[ناو] مورویێکی ئەفسانەییە گویا لە لەشی کەسێک بساورێ دەبێتە هۆی ڕاکێشانی خۆشەویستی و مێهری ئەوکەسە. (معادلمهره مار درفارسی)
مووری : [ناو](١)مووروو. (خرزه). (٢) مرۆچە؛ مێلوورە؛ مێروو. (مورچه)
مووزپێچ : بەلەکپێچ. (مچپیچ.)
مووزەر : مووزەرد؛ پۆڕ زەرد؛ قژکاڵ. (موزرد؛ بلوند)
مووسیر :[ناو] سیرۆکە؛ مووسڵ؛ سیرەعەجەمانە؛ مووسڵی؛ گیایێکە بنەکەی لە سیر دەکا و لە ناو ترشییات و ماستی دەکەن. (موسیر)
مووشن : (١)[ئاوەڵناو] مووشەمووشکەر. (کسیکه صدایتنفسکشیدنش ازدماغ شنیدەشود). (٢) میەن؛ دەڵێن؛ دەبێژن؛ ئوشن. (مگویند)
مووقڵیش :>مووەدرز.
موهەڵپڕووزاندن : [چاوگە،ت] (ب) هاتن و پەیدا بوونی کەسێک لە دوای باسکردنی؛ لەپڕ پەیدا بوون. (مویکسی-راآتشزدن.کنایەاز) (آمدنکسی پسازاسم-بردنازاو)
موهەندیس : [ناو] ئەندازیار. (مهندس)
مهاباد: [ناو] (١)ناوی ئازەرهۆشەنگ،پێغە-مبەرێکی پارسییەکانبووە؛(٢) شاری مهاباد، زێدی قازی موحەممەد.(مهاباد)
مەبەران :[داهاتووی چاوگەی بردن بۆ کۆ] دەیبەن؛ دەبەن؛ ئەوەن؛ ئەیوەن. (میبرند)
مەبەری : [داهاتووی چاوگەی بردن بۆ کەسیک دووهەمی تاک]دەیبەی؛ دەبەی؛ ئەوەی؛ ئەیوەی؛ موەری. (میبری)

مەترسوو : دەترسم؛ ئەترسم. (می‌ترسم)
مەترەباز : [ئاوەڵناو] پیاز پاک‌کەر؛ ڕیاباز؛ خوڵتەکەر؛ ماستاوکەر؛ زمان‌لووس؛ چاپ-باز؛ خافڵێن؛ حوقەباز؛ جامباز؛ مەرایی‌کەر. (حقەباز؛ چاپلوس)
مەترەق : (ب)ئەندامی شەرمی پیاو. (ذکر)
مەتکنە : [کاری ئەمری سەلبی] مە-دڵۆپێنە؛ مەتکێنە؛ (نەچکان)
مەتڵەب : ئەم وشە لە ئارەویەوە هاتووە بەڵام واتاکەی گۆڕدراوە. پێم مەتڵەب نییە: واتا پێم شتێکی ئەوتۆ و گرینگ نییە (مهم؛ مسئله چشمگیر)
مەتەرێز : شەڕەکەڵ؛ شەڕ؛ شەڕگە؛ مە یدانی‌شەڕ. (جنگ؛ میدان‌جنگ)+
مەتەلوان . مەتەڵوکبێژ؛ مەتەڵوان. (معما-گوی)
مەتەوکەوان : [ناو،ت]جۆرێک مەتەی دە-ستەدار کە بە ژێی کەوان دەخولێتەوە بۆ کون‌کردنی دار و شتی‌تر. (متەوکمان)
مەجبوورئاوا : گەڕەکی کەنار شار و فەقیر-نشین کە خانوو بە تەلیس و تەنەکە دروست دەکەن. (حلبی‌آباد)
مەجمنە : لە چاوگەی‌جوین؛ مەجێونە؛ مە-لەقێنە؛ مەشەکنە؛ مەشەکێنە؛(ب) تەکانی-مەدە. (تکان‌ندە)
مەچەکە : جۆرێک ملە و زۆرەبانێ؛ زورانێ کە مەچەک لە ناوقەدی یەکترتونددەکەن. (نوعی‌کشتی‌محلی)
مەحبوس : جۆرێک یاریە بە تەختە نەرد دەکرێ. (محبوس)

مەحجەری :[ناو] تارمە؛ محەجەری؛ دیواری دەوری هەیوان یا قەراخ پلیکان بە میلەی کانزا یان‌دار بۆ بەرگری لە کەوتنە خوارەوە. (معجر)
مەحلان : [ئاوەڵناو] قابیل؛ خاوەنی زانایی؛ پسپۆڕ؛ شارەزا. (دانا)
مەختە : [ناو] دەستەبەری. (بیمە)
مەخشووش : شێواو؛ تیکەڵ و پێکەڵ. بە-ترەف. (مغشوش)
مەخمەلەک : فد: [ناو] سوورێجە. (مخملک)
مەخە :[کاری ئەمری سەلبی لە چاوگەی هاویشتن] مەیخە؛ مەیهاوێ؛ مەهاوێ؛ فڕمەدە. (نیانداز)
مەدرەخە : [ناو] ئەسپەرە؛ جێگای‌پێ لە-سەردانانی پێمەڕە. (جای‌پادربیل)
مەدوونە : [ناو] جۆرێک چرای شیلە گە-رچەک. (چراغ‌روغن‌کرچک)
مەرازە : یەکەی ژماردنی تەمەنی سەگ؛ سەگی‌دوومەرازە : سەگی‌دوساڵانەیە. (واحدعمرسگ)
مەرافە : [ناو] لە مەرافێعای فارسییەوە هاتووە؛ شەڕ، داوا؛ جەنگ؛ کێشە. (دعوا)
مەربێڵ : [ناو] ئەسپەرەی پێمەڕە؛ مەدرە-خە؛ پێمەڕە. (جای‌پادربیل؛ بیل‌آهنی)
مەرجان : [ناو] گیاندارێکی دەریاییە لە ئاوی شیرینی(غەیری‌سوێر)ی دەریادا دە-ژی؛ کوراڵ یان بستام یا شماوەی لە شییەتی کە لە سەریەک کۆدەبێتەوە و خشڵ‌وموورووی لێ دروستدەکەن.

(مرجان)
مەرجانپێخاوس : (ب)ورچ. (کنایه.خرس)
مەرزدار : [ناو](١)هەر شت کە سنووری دیاریکرابێت. (دارای‌مرز). (٢) بەرپرس و ئاگاداری سنوور؛ مەرزەوان. (مرزدار)
مەرزداری : [ناو](١) ڕەوتی سنوور دیاریکراوی. (حالتمرزداشتن). (٢) ڕەوتی کارگێری و بەرپرسبوونی سنوور. (مرزداری)
مەرزم : [ناو] پلووسک. (ناودان)
مەرزەڤان : [ناو] سنوورەوان؛ مەرزەوان؛ ئاگاداری‌سنوور. (مرزبان)> مەرزدار
مەرزینگە : [ناو] دامودەستگا؛ ڕێکخراوە؛ ڕێخراوە. (اداره؛ پایگاه)
مەڕشمین: [ناو] ماڕشەمعوون؛ ماڕشیموون؛ سەرکردە و گەورەی فەلە(مەسیحی)گەل. (مارشیمون)
مەرقە : [ناو] پیازداخ. (پیازداغ)
مەرقەو : [ناو] مەرقەد؛ گۆڕ؛ قەبر. (مرقد)
مەرگومیر : [ناو] مەرگ و تیا چوون. (ب) ڕەوتی قڕتێکەوتن؛ مردنی‌زۆر لەناو ڕەمە - یان جەماوەردا پەیدا بوون. (مرگ‌ومیر)
مەرگۆنە : گوڵۆڵەکردن و پێچاندنەوەی هەرشت. (گلوله‌کردن‌وپیچیدن)
مەرگە مویش : [ناو] مەرگە موش؛ ژەهری ئارسنیک؛ ژەهری مشک کوژ. (مرگ‌موش)
مەرگەمار : [ناو] تەڵەمار؛ گیاییێکە لە کوردستان زۆرە لە قەدیمدا هاڕاوەی میوەکەی لەگەل زرنیقدا گەردێکی لیٚدروست دەبوو کە ماری کوێر دەکرد، بۆ سیاتیک (پەنمانی دەمار) بەکەڵکە. (پانەترو؛خاورک؛کبر)
مەرگەمەلە : [ناو] (ب)مەلە چاک نەزانین. (کنائی، خوب شنابلدنبودن)
مەڕموول : [ناو] بڕە؛ شفرەی‌بڕەک؛ شفرەی‌بەرزا. (دو دندان‌گراز)
مەڕمەڕش : [ناو] هومایی؛ بلووری؛ شاخ-بزی؛ بالبالی؛ بەلووری؛ مەڕمەڕشا؛ مۆری. (چلوار)
مەرنای : مراندن. (میراندن)
مەڕبێر : [ناو] ڕانەبێرە؛ دانەمەڕ؛ رانەمە رهێنانەوە بۆ نزیک گوند لە نیوەڕودا بۆ دۆشین. (گله‌رابرای‌دوشیدن‌نزدیک‌آبادی-آوردن)
مەرەمووز : بە ئەزموون؛ دونیادیتوو؛ پوخت. (دنیادیده؛ باتجربه)
مەز : لا؛ کن؛ پاڵ؛ بال؛ نک؛ تەنیشت. (نزد؛ جنب)
مەز : مەزن؛ (مەز، مەزی، مەزویی،مەزدا) لە ئاوێستادا بەواتای گەورە هاتووە و وشەیێکی زۆر کۆنی کوردییە. (بزرگ؛ کبیر)
مەزاختن : لە حەرام‌گێڕان؛ خراپ‌کردن؛ لە دەستدان. (خراب‌کردن)
مەزاد . [ناو] کیٚزیاد؛ جۆرێک فرۆش وەک هەڕاج بە هەرکەس قیمەتی زیاتر بدا. (مزایده)
مەزار : قەبر؛ گۆڕ؛ گڵکۆ. (قبر)+
مەزارگە : زیارەتان؛ قەبرسان؛ گۆڕستان. (گورستان)

مەزانە : (١) زانینت نەبێت؛ ئاگات لـێ‌نـە-بێت. (نـدان). (٢) تومـەز؛ تمـەز؛ مـەمنـا؛ تۆمەیژە؛ تۆمەڵێ. (تونگو)
مەزحەکە : [ناو] گاڵتەجار؛ گاڵتە.(مسخره)
مەزدا : مەز واتا گەورە و(دا)بۆی هەیە کـە یەکی لەسێ وشەی(دارا ،دانـا، دانـەر) وە-رگیرابێت. (مزدا)
مەزدەک : مرۆڤێکی کورد بوو کـە ئـایینی مەزدەکی دامەزراند و لـە پاشـان خـۆی و شوێنگرانی بەدەستی ئەنەوشیرەوانی شـای ئێران کوژران. (مزدک)
مەزدەکی : [ناو] شوێنگری دینی مەزدەک. (مزدکی)
مەزراح : [نـاو] مـەزرەق؛ مـزراق؛ مـزراح. (گردنا)
مەزرەکەوان : چاپخان‌چی. (چاپخانەچی)
مەزغەنـە : [نـاو] خانوویێـک کـە چـاوە-چاوە(دیودیو) و ژوور ژوور بەکـرێ بـدرێ. (خانەای‌کەاطاق‌اطاق‌کرایەدادەشود)
مەزگی : [ناو] (مەز)واتا گەورە(گی)واتا : گە، گا، جێگا، گەورەجێگا؛ جێگای گـەورە؛ جێگای بەرێز؛ جێگای بەڕوومەت؛ مزگـە-وت. (مسجد)
مەزگیت : [ناو] مەزگی؛ مزگت؛ مزگەفـت؛ مزگەوت؛ مـزەوت؛ مـاڵی‌خـودا؛ خانـەی-خودا.> مەزگی (مسجد)
مەزناندن : [چاوگە،ت] حورمەت‌گرتنی زو-ر؛ گەورەکردن لەلای خەڵک؛ مەزن‌کردن. (بزرگ‌داشتن)
مەزووک : [ئاوەڵناو] نەزۆک؛ مێوینەیێ کە بێچووی نابێ. (نازا)
مـەزە : کـورتکراوی نـاوەکـانی مـەرزییـە وموزەفەرە. (مخفف‌اسم‌مرضیه‌ومظفر)+
مـەزەچێشـتن : [چاوگـە،ت] تـام‌کـردن؛ مێلاک‌کردن. (مزەکردن)
مەژاڵک : [ناو] قاپوولکەی سەر؛ قاپیلـک؛ قاقلۆک؛ کاپۆلک؛ کاژەڵاک؛ کاسەی سـەر. (جمجمە)
مەژگی‌ئێسقان. مەژگی‌ئێسـک؛ مـەژگـی-لوولاک؛ مۆخی‌ئێسقان. (مغزاستخوان)
مـەژە : نیسـک؛ مـەژو؛ نـوژی؛ میـژوی. (عدس)
مەژیر : پسپۆڕ؛ زانا؛ کارزان. (متخصص)
مەژی‌وشک : مێشک‌وشک؛ قسـە ناحـاڵی کە هەر لەسەر بواری فیکریی خۆیدا ماوە؛ فکرکۆن؛ کۆنە پەرەست؛ بیر گرساو؛ دژی پێشکەوت‌خواز و نوێ‌خواز. (متحجر)
مەژی‌هشک : > مەژی‌وشک
مەست‌کەر : (١)[ناو،بک]کەسێ‌کە مەست دەکا و شەڕاب دەخواتەوە.(کسی‌کەمسـت-میکند) (٢) [واوەڵناو] هەرشتێ ببیتە هـۆی سەر خۆشی. (مسکر)
مەستوورە: ناوە بۆ ژنان؛ ناوی مەستوورەی ئـەردەڵـان ژنـە شـاعیری بـەناوبانـگ. (مستوره)
مەسەف : [ناو] تەپکە. (نوعی‌دام‌پرندگان)
مەسەو : [ناو] مەزەو؛ مەزەب. (مسب)
مەسیح : حەزرەتی عیسا پێغەمبەر. (عیسی مسیح)
مەسیحی : [ناو] خاچپەرەست؛ فەلە؛ فەلا.

(مسیحی)
مەسیحییەت : خاچپەرەستی؛ ڕێبازی مەسیحی بوون. (مسیحیت)
مەشکەدۆ :[ناو](١) جۆرێک ماری کورت و قەویە. (٢ب) مەشکەی جێگای دۆ یان پڕلە دۆ؛ پیاوی زگ‌زلی پێدە شوبهێنن.(نوعی‌مار.مشک‌دوغ)
مەشکەڕان : [ناو] شلکەی‌ڕان؛ نەرمەڕان. (نرمی‌ران)
مەشکەرەک : [ناو] مەشکەدرە؛ جۆرێک کوللەیە(سەوز و ڕەشە) و بە دەنگی بەرز دەخوێنێ. (نوعی‌ملخ‌بزرگ باصدای بلندجیرجیرک‌آسا)
مەشکەسکە : سک‌مەشکە؛ بە مرۆڤی زگ زل دەڵێن. (شکم‌گنده)
مەشکەلاق : [ناو] مەشکەلوولاک؛ بەلەک. (ساق‌پا)
مەشکەلوولاک : >مەشەلاق.
مەشکەومەڵان : [ناو،ت] دەزگای مەشکە؛ مەشکە یا گاوس بە سێپاکەیەوە. (مشک‌وسەپایەاش)
مەشەیی : [ناو] مەشەدی؛ کەسێک کە چووبێت بۆ زیارەتی ئیمامی هەشتەمی شێعە؛ زیاتر لە ناو شێعەدا باوە؛ (مشدی) (٢) خەڵکی مەشهەد. (مشهدی)
مەعدەنووس : [ناو] مەدەنووس؛ شانۆکیٚ؛ جافری.(جعفری)
مەعزەر : [ناو] لە مەحزەری ئارەوییەوە هاتووە، نووسینگەی(مارەوتەڵاق)یا نوسینگەی(قەباڵە) و بەڵگەی مڵک و
خانوو. (دفترخانە)
مەغڵا : [ناو] موڵگە؛ جێگای موڵدانی ڕەشەوڵاخ. (جای‌استراحت‌گاوها)
مەفادار : [ئاوەڵناو] بەلەشت‌وموفا؛ سوودوقازانج‌دار؛ موفادار؛ بەفاییە. (بهرەدار)
مەفشەن : [ناو] مەشفەن؛ تاتەشۆر. (تخت‌مردەشویی)
مەڤلاندن : [چاوگە،ت] ڕەنگ پیاساوین؛ ڕەنگ‌کردن؛ ڕەنگاندن. (رنگ‌کردن)
مەڤلین : [چاوگە،] ڕەنگ تێساویان؛ ڕەنگ‌کران. (رنگ‌شدن)
مەقەڕنە : [ناو] ماکاڕوونی؛ جۆرێک هەرشتە؛ هەرشتە فەرەنگی. (ماکارونی)
مەکرۆ : > مۆکر
مەکیشۆ : مەکیشوو؛ دەکێشم؛ ئەکێشم. (می‌کشم)
مەلاڵان : ئەوان دەلاڵیانەوە؛ دەلاڵینەوە؛ دەپاڕانەوە؛ دەپاڕایەوە؛ دەلاڵیاوە. (التماس‌می‌کردند؛ التماس‌می‌کرد)
مەلاڵیا : ئەو دەپاڕاوە؛ دەپاڕایەوە. (التماس‌می‌کرد)
مەلایە : (١) مەڵاس؛ پێش نوێژە. (ملا). (٢)[ناو] سەربە کڵاوە؛ بالندیێکی پۆپەدارە بەقەرا ڕیشۆڵییێک دەبێت. (نام‌پرندەایست)
مەڵحەکە : >مەزحەکە
مەلخاندن . شاردنەوە؛ دابین‌کردن؛ حەشاردان. (پنهان‌کردن)
مەلسین : (١)پەراش‌پەراش‌بوون؛ وردبوون؛ شکان، وردوخاش‌بوون.(٢) ملاس‌بوون؛ ملاس‌بوون. (خردشدن.

کمین‌کردن)
مەڵکەسەن : کرمێکە داوەتەنە دروستدەکا و لە پاشان باڵ دەردێنێ و هەڵدەفڕێت. (نوعی‌کرم)
مەڵڵا : [ناو] نەفەری ئەوەڵ لە کایەی مێشێن و مەڕمەڕێندا. (نفراول‌درتیله‌بازی)
مەلۆک : پیاوێ کە لە ماڵدا کاری ژنانە دەکا. (مردی‌که‌کارزنانه‌انجام‌می‌دهد)
مەلوند : [ناو] مەڵوەن؛ جێگەی‌ژیان؛ مەڵبەند. (جای‌زندگی‌کردن)
مەلەڕۆژە : فڕندییێکە لە پاساری چووکتر و بزۆزترە، دەندووکی درێژ و باریکە و شیلەی گوڵان دەمژێ و هێلانەکەی بە لقی‌داراندا شۆڕ دەبێتەوە. (شهدخور)
مەڵەغانگێڕ : دروێنەوانێ کە بەمەڵەغان دروێنە دەکا. (دروگری‌باداس‌بلند)
مەلەنگ :[ئاوەڵناو] جوان و خوشیک؛ قەنج؛ شەپاڵ؛ دەلال؛ خوشکۆک؛ (زیبا)
مەلهێب : [ناو] مەلهەب؛ شەنە؛ شەن. (افشون)
مەمان : [ناو] (۱)مەمکان.(پستانها). (۲) لەکورستانی ڕۆژ هەڵات لە فارسییەوە هاتوە و بووە بە باو، منداڵ لە جیاتی دایە دەڵێ مەمان. (مامان)
مەمکە : [ناو] پێچێکی کونکراوە، جێگای نەوت هاتنەدەر لە چراتوڕ و چوونە ناو تۆری چرا؛ جێگای هاتنە دەرەوەی گاز لە چیشت لێنەری گازیدا. جێگای هاتنە دەرەوەی بێنزین لە کار بو ڕاتۆری سەیارەدا بۆ ناو مۆتۆڕ. (پستانک)
مەمۆڵە : [ناو] مەمکۆڵە؛ مەمکی‌گچکە. (پستان‌کوچک)
مەمووز : [ناو] مامێز؛ مەهمێز. (مهمیز)
مەمی‌ئالان : شارێکی کەونارای خاپوور، کە لە کوردستاندا بووە. (نام‌شهرویرانه‌قدیمی)
مەنار : [ناو] مننار؛ مردار؛ بی‌سەربڕین - مردنی حەیوان. >مردارکردنەوە. (مردار)
مەنتەشە : [ناو] لاولاوەی دەرک و پەنجێرە. (لولای‌درب‌پنجره)+
مەنجەڵی زنجیرەدار . مەنجەڵی زۆر گەورەی دەسک‌دار. (دیگ‌دسته‌داربزرگ)
مەنجەنیک : [ناو] ئارەو کردوویە بە مەنجەنیق؛ لە شەڕی قەدیمدا ئاگر هاوێژ بووە بۆ بان قەڵا لەکاتی گەمارۆدان یان هێرشکردن وگرتنی قەڵای دوژمن. (منجنیق)
مەنح : > مەنع
مەندەل : [ناو](۱) فاڵ؛ وەک: ڕەمڵ‌گرتنەوە. (۲)حاشا؛ ددان‌پیدانەنان؛ نەپەژراندن؛ پا لێنەنان. (فال‌گرفتن.انکار)
مەندین : [ئاوەڵناو] بەهێز؛ بەقەوەت؛ قەلەوی تێکسمڕاو. (پرقدرت؛چاق‌وکوتاه‌قد)
مەنقەڵی‌کارەبایی : [ناو] مەنقەڵێ کە بە کارەبا گەرم دەبێت. (منقل‌برقی)
مەنهەج :
مەنەی : [چاوگە،] مان. (ماندن)
مەنیجە : مەنیج؛ (مەنیژە، کچی ئەفراسیاو گراوی بیژەن) ناوی ژنانەیە . (منیژە)
مەوج : [ناو](۱)شەپێل؛ شەپۆل؛ مۆنج؛

پێل. (موج). (٢) جاش؛ جاجم؛ نـوێن پـێچ. (رختخواب‌پیچ)
مەوز : [ناو] داریکی گـەرمـە سـێرییە؛ بـە میوەکەیشی دەڵێن مەوز. (موز)
مەولانا : > مەولەوی
مەولەوی : ناوی جەلالەددین موحەممـەد بەهادینی بەلخی بووە، ناسراو بە مەولانای ڕۆمی خاوەنی دیوانی مەسنەویی مەعنـە-وی و دیوانی شەمسی تەبریزییـە کـە بـە زبانی فارسی دایناوە بەڵام خۆی عـارفێکی مەزنی کورد بووە. (مولوی‌بلخی؛ مولانـای رومی)
مەولەویی تاوەگۆزی : >ف.هن
مەوەر : [کاری‌ئەمری لەچاوگەی بردن بـۆ کەسیک دووهەمی تاک](١) مەیبە؛ مەیوە؛ نەبە؛ مەبە؛ (نبر؛ مبر)(٢) مەیبە بـەناویـدا؛ پیامەکە؛ پێیدامەکە. (فرونکن)
مەوینی : دەبینی؛ ئەبینی. (می‌بینی)
مەهان : [ناو] بێ‌نوێژیی مانگانـەی ژنـان. (عادت‌ماهانه)
مەهبرن : ماوەی بێزوکردنی ژنی تۆڵدار. (روزهای‌ویارزن‌باردار)
مەهموز : [ناو] مامێز؛ مەهمێز. (مهمیز)
مەهووژ : [ناو] مەڤیژە؛ مێوژ؛ مەویژ؛ مـاوژ؛ مەڤیژ. (مویز)
مەهەر : [ناو] شفاعەت؛ لاڵیانەوە.(شفاعت)
مەی : [ناو] مانگی پێجەمی ساڵی زاییێنی ٣١ ڕۆژە و لە یەکەمـی گوڵانـەوە دەسـت پێدەکا. (مە)+
مەی پەرەست : [ئاوەڵناو] حەز لەمەی‌کەر؛ مەی‌خۆر. (می‌پرست)
مەیاندار : [ناو] میاندار؛ مەیداندار؛ مەیـدا-نداری زۆرخانە: سەردەستەی پاڵـەوانـانی زۆرخانە. (میاندار)
مەیانە : [ناو] خەڵووزی‌بەرد؛ زوخـاڵ‌سـە-نگ. (ذغال‌سنگ)
مەیاونووم : ئەمگەیێنی؛ دەمگەیێنی. (مرا-می‌رساند)
مەیبـەنـگ: [نـاو] مـەیبانـگ؛ مـەیخانـە. (میخانه)
مەیجێر : اند: [ناو] دەرەجەی عـەسـکەری لە ئەرتەشی ئینگلیز و ئەمریکادا؛ بەرانبـە-ری سەرگورد. (سرگرد)
مەیدان‌دان : [چاوگە،ت] مەیـدان‌پێـدان؛ ڕووپێدان؛ بەدەمەوەدان؛ ڕێدان؛ ماوەپێدان. (میدان‌دادن)
مەیدە :(١[کاری ئەمری لەچاوگەی دان بۆ کەسیک دووهەمی تاک ])مەیدەری؛ پی‌مەدە؛ دڵ هەریەکێکە مەیدە بە هـەزار. «فۆلکلور» (٢) ئاردی دووجـار لـە هێڵکـەک دراو. (آرد دو بارالک‌شده)
مەیدەڤان : [ناو] نانەوا؛ نانپێژ. (نانوا)
مەیرە : (١) مەی‌هێنە؛ تەنیاوەرە کـەس - لەگەل خۆت مەیرە : کەس لەگەل خـۆت مەهێنە. (میاور). (٢) > مەیلە٢
مەیڕێژە : [کاری ئەمری لەچاوگەی ڕژتن- بۆ کەسی دووهەمی تاک ]کلی‌پیامەساوە؛ کلچـۆکی‌پیامـەهێنـە؛ چـاوتـمـەڕێـژە : سوورمەی تـێ مـەڕێـژە. (سـرمەنکـش). (٢)قلمی مەدەرەوە؛ بڵاوی‌مەکەوە؛

ئاوەکەمەڕێژە؛ مەیرژنە؛ مەیڕێژنە. (نریز)
مەیل‌نان : مەیل‌وەلانان؛ لەبیر بردنـەوەی خۆشەویستی. (فراموش‌کردن محبـت و - دوستی‌وعشق)
مەیلە : (١)سەربەست لەکردنی‌کاریٚ؛ مـە- یلەیە : هەرکەس بەمەیلی خۆیەتی. (دل- بخواهی) (٢) مەیلە، یان مەیـرە، لـۆرک و پەنیری تێکەلاٚو. (پنیرولورمخلوط)
مەیۆ : دێت؛ دیٚ؛ تێت. (می‌آید)
مەیوە : (١و٢)[کاری ئەمری لـەچاوگـەی بردن‌بۆ کەسیک دووهەمی تاک ] مەیبـە؛ دوری مـەخـەوە. (نبـرش). (٢) پیامـەکـە؛ پیامە چەقێنە. (فرونکن) . (٣) مەییوە؛ گرساوە. (منعقدشده).(٤)میوە؛ میٚوە.(میوە)
مەیەز : [نـاو] مـەیـەس؛ مـێش مـەگـەز. (مگس)
می : [ناو] سێهەمین نۆتی مۆسیقا. (می)
میتکنە : >مێتوولکە.
مێتوولکە : [ناو] ئـەسـپێی وردی تـازە لـە ڕشـــک (گـــەرا) دەرهـــاتوو؛ میتکنـــە. (نوزادشپش)+
میتەل : [ناو] دۆشەک؛ دۆشەکە. (تشک)
میتێن : [ناو] هەڵماتێن بە میتـە داکـردن؛ مەڕمەڕێن. (نوعی‌تیلەبازی)
میچ‌کوت : تەژی کردنی هـەمـار یـا هـەر ژووریٚ تا میچ؛ هەماری‌کا میچ کـوت لـە- کایە : واتا سەر لێو پڕە. (تاسقف پـرکـردن انبار)
مێچکە : [ئاوەڵناو] (ب) پیاوی ئاڕیلە و ژن ئاسا؛ ژنانیلە. (اخلاق‌زنانەداشتن مرد)

مێخ‌سکە : [ناو] گوڵمێخی سەرپانی ئاسـن. (گل‌میخ‌سرپهن)
مێدیا : [ناو]میللەت و دەوڵەتی ماد کەکورد نەتەوەی ئەوانن؛ دەوڵەتی ماد.(میدیا؛ ماد)
میراوا : گوندێکـە پاڵیـداوە بـە بـۆکانـەوە. (میرآباد)
میراودەلی : عەشیرەتێکن لە پشدەر. (نـام- عشیرەای‌درپشتدرعراق)
میردەزمۆکە : [ناو] مێردەزمە؛ سەنگ سواربوون(کاووس)؛ مۆتە؛ مۆتەکە. (کابوس)+
مێرگەشە : [ناو]مێرگ؛ چیمەن؛ مێرغـوزار. (مرغزار.چمن)
مێرمنداڵ : [ناو] لاو؛ گەنجی‌کەم‌تـەمـەن؛ تازەلاو. (نوجوان)
میرووله‌کردن : [چاوگە،ت] سەرەتای وە- کـوڵ‌هـاتنی تـراو. (اوایـل‌جـوش‌آمـدن- مایعات)+
میرووله‌عەجەمانە : [ناو] جۆرێک مێلوورە- ی گەورە و گازگرە. (نوعی‌مورچە)
میرەدیٚ : گوندێکە لـە باشـووری سـەقـز. (میردە)
میـری‌میـران : [نـاو] ئـەمیـری‌ئـەمیـران؛ سوڵتان. (سلطان)
مێز : [ناو] چرپای لەسەر نووسین. (میز)
میزا : [ناو] میرزا؛ خوێندەوار. (میرزا)
میزاڤـک : [نـاو] میـزاو؛ ئـاوە باریکـەی کوێرەکانی؛ شۆڕاوەی‌کەم. (آب‌باریکە)
میزان . [ئاوەڵناو+ نـاو] (١) ڕادە. ئـەنـدازە. (٢) بەرانبەر. (٣)کۆک؛ لە یـەک کـۆکـدا؛

دووسازی هاوکۆک. (٣) دروستبوونی شتی وەک کاتژمێر، کات ژمێرەکەت میزان کە. (٤) مانگی حەوتەمی ساڵ یەکەم مانگی پاییز. (٥) پاژی جیاکراوە بە دووهێلی ئەستوونی لە سەر پێنج هێلی ئاسۆیی نۆتی مۆسیقا. (١و٢و٣و٤و٥. میزان)

میزراب : >مزراب.

میز کەف کردن : هاتنە سەر بار؛ کەیف لە ئەنجامی کارێ هەڵسان.(کنایی‌تمایل‌پیدا-کردن‌برای‌انجام‌کاری.اشتیاق‌داشتن)

مێزوینە : [ناو] نیسکین؛ مێژوینە. (عدسین)

مێزەکار : [ناو] چاودێر؛ زێرەڤان؛ زێرەوان. (نگهبان)

مێژونک : [ناو] شەمشەمەکوێرە. (خفاش)

مێژوەمار : [ناو] نیسکەتاڵە؛ گیاییێکی ژەهرداره و بەرەکەی خڕە. (عدس‌تلخ)

میسواک : فد: [ناو] سیواک؛ ددان‌شۆر. (مسواک)

مێش: مەڕ؛ گورگ‌ومێش : بەیانی زوو یان ئێوارەی درەنگ وەخت کە گورگ و مەڕ لە یەک جویێنەبنەوە . (میش)+

مێش : [ناو] هەنگ؛ کرمێکە لە زستانانـدا لە ژێرپێستی ڕەشە وڵاخ پەیدا دەبێت و - هەڵدە قوپێ و لە هەوڵی بەهاردا لە پێست دێتە دەرەوە. (نوعی‌کرم‌زیرپوست‌گاو)+

مێش‌کوژ:[ناو] کەوگیر ئاساییێکە لە نایلۆن بۆ لێدان و کوشتنی‌مێش و مێرووی باڵدار؛ (ب) دەرمانگەلی‌کە مێش لەبەین دەبەن. (مگس‌کش)

مێشک‌وشک : > مەژی‌وشک

مێشکی کەر خواردن . (ب) درەنگ حالّی بوون؛ درەنگ تێگەیشتن یا هەرتێنە گە-یشتن لە مەبەست و قسە. (مغزخرخوردن)

مێشگرەگیا : [ناو] مێشەگرە؛ گیاییێکە گە-ڵاکەی شیلەییێکی خەستی لەسەرە کە مێش پێیەوە دەچەسپێ؛ بۆ قۆخەڕەشە و ئیشی گەروو باشە؛ لە کوردستاندا زۆرە. (دیونە؛ گیاەمگس‌گیر)

مێشولەبەند : [ناو] پەشەبەند؛ پیشکەبەند؛ چادرێکە لە واڵی ناسک کە شەو لە ناویدا دەخەون. (پشەبند)

مێش‌ومەگەز : [ناو،ت] (ب) جڕوجانەوەر. (حشرات)

مێشەگەز : [ناو](١)گوڵبانوو؛ جۆرێک مێشی سەوز ڕەنگی چزووداره. (مگس-نیش‌دار). (٢) مۆز. (مژمژ)

مێشی‌سرکە : [ناو] مێشوولەییێکە میوەی کۆن هەڵیدێنێ؛ زیاتر لە سەر سرکە و شەڕاب دەنیشێ. (مگس‌سرکە)

مێڤانگە : [ناو] میوانخانە؛ مەیمانخانە. (میهمانخانە)

میکانیک: فرد؛ ند؛ اند: [ناو] بەشێ لە زانستی فیزیک کە سەبارەت بە وزە و هێز و کاریگەری لە سەر تەن دەکۆڵێتەوە. (مکانیک)

میکانیک : فد؛ فرد؛ اند: [ناو] وەستای دروست کردنەوەی ماشێن بە تایبەت سە-یارە. (مکانیک)

مێکووک :[ناو] ئامرازێکی جوڵاییه؛ شه
پۆپه. (وسیلهای‌درجولایی)+
مێگان : دامنه‌چه‌قان؛ نووینک؛ مینگوین؛
نێنگوین؛ به‌رکه‌ڵ. (ماده‌گاوسه‌ساله)
مێگۆن : >مێگان.
مێل : جۆرێک گڵی ورده ئاوێته‌ی ڕۆنی
به‌زره‌کی ده‌که‌ن و ده‌بێته به‌توونه یان به‌-
تانه. (مل)
میل : جووتێ کۆته داری خه
ڕاتیکراوی ده‌سکداره له زۆرخانه وه‌رزشی
پێده‌که‌ن : (میل)+
میل : شیشی خڕ که له زه‌مانی قه‌دیمدا
سووریان ده‌کردەوه و به چاوی
تاوانبارانیاندا ده‌کێشا و کوێریان ده‌کردن.
(میل)
میل : شیشی کاموا چنین. (میل‌بافتنی)
مێل : مێڵ؛ هێل؛ خه‌ت؛ مێل‌مێل: خه‌ت-
خه‌ت؛ ڕێڕێ؛ خاڵ‌ومێل: خه‌ت‌وخاڵ.
(خط)
میل‌کێشان : (ب) میله‌ی سووره‌وه‌بوو به
چاودا کێشان و کوێرکردن. (۲) چاوڕشتن.
(۱و۲.سرمه‌کشیدن)
میللی : [ئاوه‌ڵناو] پێوه‌ندیدار به میلله‌ته‌وه؛
شتی میلله‌ت. (ملی)
مێلۆدی . فرد؛ فد؛ اند: [ناو] ده‌سته‌واژه‌ی
مۆسیقایه، چه‌ند نۆت و ده‌نگ که ڕسته-
یێکی مۆسیقایی پێک دێنن. (ملودی)
مێلۆدیکا :[ناو] ئامێرێکی مۆسیقایه که به -
فوو لێده‌دری و دووگمه‌داره وه‌ک ئۆرک.
(ملودیکا)

مێمان : میوان؛ مه‌یمان؛ میڤان؛ مه‌هڤان.
(۱.ب)خه‌رجی که‌سێک له ئه‌ستۆی که-
سێکی‌تر؛ ئه‌م نه‌هاره که‌س له‌م ڕه‌ستۆرانه
پاره‌نه‌دا هه‌موو میوانی منن؛ با بڕۆین بۆ
سه‌فه‌ر خه‌رجه‌که‌ی میوانی منی؛ خوڵکی
دووکاندار و فرۆشیار : پاره‌مه‌ده میوان به.
(۲) له میوانخانه ژوور به‌کرێ گرتن و
مانه‌وه؛ ئه‌م میوانخانه ئه‌مساڵ مێمانی‌که‌م
بوو. (۱و۲.مهمان)+
مێمک : [ناو] خونچه‌ی‌دار که له پاشان
ده‌پشکوێ و ده‌بێته گوڵ. (شکوفه)
مێمل : [ئاوه‌ڵناو] مێمل؛ به‌ڵا؛ ئافه‌ت؛ دژ؛
خه‌نیم؛ دوژمن. (بلا؛ ضد)
مێمێ : گۆڕدراوی ناوی مریه‌م. (بجای نام
مریم گفته‌میشود)
میناک : (۱) ژه‌حر. (زهر). (۲) وه‌ک؛ له-
گوێن؛ وه‌کو. (مانند)
مینچ : [ناو] جۆرێک یاری له سه‌ر په‌ڕه
یێکی چوار گۆش که به تاس(مۆره)هه-
ڵخستن ده‌کرێ. (منچ)
مینک : [ناو] زینده‌وه‌رێکه له مشک گه-
وره‌تره و پێستی به هاداره؛ قیژه‌ک.
(مینک)
مینگه‌یی : [ناو] به‌و پیت و وشه ده‌ڵێن که
له که‌پۆدا مینگه دروست ده‌که‌ن وه‌ک(ژه-
نگ؛ ده‌نگ؛ منگ). (حرف‌وکلمه‌تودماغی)
میوان‌په‌روه‌ر : میوان‌حه‌وێن؛ میوان‌دۆست؛
میوان‌خۆشه‌ویست؛ مێهمان‌نه‌واز. (مهمان-
پرور؛ مهمان‌نواز)
میواندار . (۱)که‌سێک که میوانی زۆر

بوێــت. (٢)خانــه خــوێ. (٣)راســپاردەی ڕێکخراوێ بۆ خرمەتکردن بـه میوانـانی ئەو ڕێکخراوە. (۴) کـەسێک کـه کـاری خرمەت کردن و ڕاگـەیـین بـه کاروبـاری موسافیری باس(ئوتووبووس) و فرۆکـەیـه. (۱و۲و۳و۴.مهماندار)

میوانهەوێن : [ئاوەڵنـاو] مێڤـانحـەوێـن؛ میواننەواز؛ میواندۆست؛ خانەخـوێی بـه- خوڵک. (مهماندوست)

مێوره : [ناو] چرپیولقی هەڵپـاچراوی داره مێو. (شاخههایبریدهشدهمو)

مێوژه : [ناو] دەنکه ترێی وشکەوه بوو له بەینی هێشوه ترێدا. (دانههایخشکشـده- بینخوشهانگور)

مێوژه ڕەشکه :[ناو] مێـوژی تـرێ ڕەشـه. (مویزسیاه)

مێوژەمەلێ : [ناو] مێوژەمەلا؛ مێوژەمـەلـه؛ جۆرێک مێوژه. (نوعیمویز)

مێوژەمارانێ : [ناو]هەنگوورەمار؛ گیاییێکی ژهرداره و زۆرخـواردنی بڤـەیـه؛ خـواردنی ڕۆژی سێ دەنک له تووەکەیتا پـازده ڕۆژ دەبێته هۆی بـەرخسـتنی تۆلـدار. (انگـور- فرنگی؛ انگورمار)

مێوین : (١) مشەمای له مێو هەڵکێشـراو. (آغشتهبهموم). (٢) پشتوێنی سـێ کرێیـی زەردەشـــتیان بـــه نیشـــانەی ســـێ- درووشمی(کردار و وتەو نیـەت)ی چـاک. (کمربندسهگرهزردوشتیان)

مێهران : شارێکه له باشووری ئێران سـەر به ئیلام. (مهران)

مێهرەجان : [ناو] ئاهەنگی گشتی؛ جۆرێک جـەژن و شـانۆی گشـتی؛ جـەژنئاسـا؛ فیستیواڵ. (جشنواره)

مێهرەڤان : [ئاوەڵناو]مێهرەبان. (مهربان)

مێیەل : [ناو] مێگەل؛ ڕان؛ ڕانەمەڕ؛ ڕانـه- پەز. (گلهگوسفند)

ماترِیالیسم : فرد.اند. ڕێبازێکی فەلسەفییە کە( ماک) بە ڕاستییێکی سەرەتایی و(ئەزەلی)دەناسێت. (ماتریالیسم)
مارکسیسم : فد.فرد.اند. ئامۆژەی فەلسەفی و ڕامیاریی کارل مارکس لەسەر بنەمای ماترِیالیسم و شووسیالیسم. (مارکسیسم)
مارکسیسم لێنینیسم : فرد.فد. بەرهەمی لێکدانەوەی لێنین لە مارکسیسم. (مارکسیسم لینینسم)
مازوخیست : فرد.فد. تووشی نەخۆشینی ئازار خوازی هاتوو.(مازوخیست)
مازوخیسم : فرد. ئازار خوازی؛ نەخۆشینیّ کەمرۆڤ بە ئازار و سووکایەتی بەسەرهاتن لە لایەن گراوەوە کاژێر دەبێت. (مازوخیسم)
ماسک : فد؛ اند؛ فرد: دەمامک؛ ڕووبەند. (ماسک)
مافیا : ایتالیاد؛ فرد؛ فد؛ اند: ناوی ڕێخراوێکی خراپەکار و پیاوکوژە کە لە دوورگەی سسیلی ئیتالیا دروست بوو؛ ناوی هەر ڕێکخراوی پیاو کوژ (تیرۆریست)ی نەهێنی و شاراوە. (مافیا)
ماکرووەیف : اند.فد. (١)مەکرۆوەیف :کەرستەیێک بۆ گەرم کردنەوەی خۆراک بە هۆی شەپۆلی مەکرووەیفەوە. (٢)درێژایی شەپۆل لە یەک تا سێ میلیمەترەوە. (١و٢.ماکروویو)
ماکزیمۆم : لانی‌زۆر. زۆرترین. بان‌ترین ئاست. (ماکزیمم)
ماکسی‌ژووپ : ماکسی‌ژووپ. کراسی درێژ تا قولاپە. (ماکسی‌ژوپ)
ماکیاولیسم : ڕێبازی ڕامیاریی نیکۆلۆ ماکیاولی. کەڕای‌وایە لە ڕامیاریدا درۆ و بێ ئەخلاقی بۆ گەیشتن بە ئامانجی ڕامیاری ڕەوایە. (ماکیاولیسم)
مانۆڕ : ڕەوتی خۆ ڕاهێنانی هێزی چەکدار بۆ شەڕ.(٢)بارودۆخی مەیدانی شەڕگوڕین بە هێرش یا کاری پێویستی عەسکەری. (١و٢.مانور)
مانیکۆڕ : فرد؛ فد: لاکی ناخوون‌ڕەنگکردنی ژنان. (لاک‌ناخن)
مۆنتاژ : فرد؛ فد؛اند: (١)کار و ڕەوتی خستنەسەریەک و پێکەوەنانی پاژگەلی سەیارە یان کەرەستەگەلی مۆتۆڕی یا کارەبایی. (٢) لە پال یەک دانانی پاژگەلی فیلمی سینەمایی یان شریت یان نووسراوە یان هەر ئامێرێک بۆ بەدیهێنانی بەرهەمێکی ڕێک‌وپێک و تەواو. (مونتاژ)
مەشرووتە : عد؛ فد؛ ئەم وشەکوردی‌نییە واتا حوکمات و ڕێژیمی مەشرووتە. (مشروطه)
مەڵات : [ناو] مەلات؛ قوڕ یا چیمەنتۆی گیراوە بۆ دانان لە بەینی بەرد و خشتی بینادا. (ملاط)
مەلاس : فد؛ فرد؛ اند: شەربەتی خەستی ئاوی چۆندەر پێش ئەوە پاڵاوتە بکرێ یا ببێتە شەکر لە فابریکا؛ بۆ دەرمان و بە-

هێزیی لەش کەڵکی هەیە. (ملاس)
مەلامین : (١)جۆرێک پلاستیکی ڕەق بۆ چێکردنی دەوری و دەفر. (٢) دەفری دروست کراو لە مەلامین. (ملامین)
مەلیلە دۆزی : فد: [ناو] بەزەنگیانە نەخشاندن؛ دادوورینی زەنگیانە بەقوماشدا؛ بەرهەمی ئەوکارە. (ملیلەدوزی)
مەنع : بەرگری؛ وشەیێکی ئارەوییە و لە کوردیدا بەواتای لۆمەکردن بەکاردێ. (سرزنش)
مەیجێر : اند. دەرەجەی عەسکەری لە ئەرتەشی(سوپای) ئینگلیز و ئەمریکادا. بەرانبەری، سەرگورد. (سرگرد)
میترائیسم : خۆرپەرەستی. ڕۆجیارپەرەستی. (آفتابپرستی)
میتینگ : اند؛ فرد؛ فد: خۆ پیشاندان و کۆڕ بەستن بۆدەربڕینی هەستوخوازە.(میتنگ؛ تظاهرات)
میچکاندن : داگرتنەخوار؛ هێنانەخوار. (پایینآوردن)
میزانپێلی : فد؛ فرد؛ هەڵەک لێدان و ڕازاندنەوەی مووی سەر. (میزانپلی)
میزانسێن : فرد.فد. ڕەوتی ڕێکخستنی کەل و پەل و جێی ئاکتەرەکان لەسەر شانۆ یان جێگەی وینەیفیلم هەڵگرتن. (میزانسن)
میسێونیر : فرد.فد. ئەندامی لێژنەی بەڕێکراو زیاتر بۆ بانگەشەی دینی مەسیح. (مسیونر)
میکروفۆن : فرد؛ فد؛ اند: [ناو] ئامێری دەنگ زیادکردن لە بڵیندگۆوە؛ کەرەستەیی کە شەپۆلی دەنگ دەکاتە شەپۆلی ئێلێکتریکی بۆ بڵاو بوونەوەی بەهێزتر یان بۆ تۆمارکردن. (میکروفن)
میلیتاڕیسم : فرد.فد. حوکماتی هێزی چەکدار و عەسکەری. (میلیتاریسم)
مین : قوتوو یان بەستەی پڕ لە تەقەمەنی کە بە گوشاردان یان پا پێدانان یان گوشار لە سەر هەڵگرتن یان گەرما دەتەقێتەوە. (مین)
مێنۆ : فرد؛ فد؛ اند: پێڕستی خواردەمەنی لە نادی و ڕەستۆران. (منو)
مینیاتۆر : فرد؛ فد: [ناو] وێنە کێشانێکی تایبەت کە دوور و نزیکی(پرسپێکتیف) ڕەچاو ناگیرێ. (مینیاتور)
مینیژووپ : [ناو]کراسی قوڵە و کورتی ژنانە کە داوێنی ناگاتە ئەژنۆ. (مینیژوپ).

# ن

نئاندرتاڵ : [ناو] ئینسانەکانی سەرەتای پەیدا بوونی ئاگر کە لە ئەشکەوتەکاندا دەژیان. (نئاندرتال)

نئۆپان : فرد؛ فد: [ناو] نیئۆپان؛ تەختەی دەستکرد لە بڕەدار و چەسپ. (نئوپان)

نائارام : [ئاوەڵناو] بێقەرار؛ نەسرەوت؛ بێئۆقرە؛ ئاڵۆز؛ نائەمن. (ناآرام)

نائارامی : [ناو] ئۆقرەلێبڕاوی؛ بێقەراری؛ حەجمان‌لێبڕاوی؛ حاڵەتی شەڕوشۆڕ، نائەمنی. (ناآرامی)

نائەمن : [ئاوەڵناو] جێی مەترسی؛ ڕەوتی ئەمین نەبوونی شوێنێ. (ناامن)

نائەمنی :[ناو] نەبوونی ئاسایش؛ نەبوونی هێمنایەتی. (ب)شەڕ و پشێوە لە شوێنێکدا. (ناامنی)

نابان : [ئاوەڵناو] (١)نەبان؛ ئاژاڵی کە ناهێڵێ بێچووەکەی بیمژێ.(بزمتنفرازبزغالەاش). (٢)قەڵس؛ تووڕە. (عصبانی). (٣)ناتەبا؛ تۆراو. (قهرکرده)

ناباوەڕی : [ناو] بێبڕوایی؛ بێموتمانەیی؛ ڕەوتی بڕوا پێنەکردن. (ناباوری)

نابەرامبەر: [ئاوەڵناو] ناتەراز؛ لە چونیەتیدا وەک یەک نەبوون؛ یان فەرق و جیاوازی لە بەرانبەر یاسادا. (نابرابر)

نابەڵەو : [ئاوەڵناو] نابەڵەد؛ ناشارەزا. (ناوارد)

نابەهۆز : [ئاوەڵناو] ناڕێک. (ناهموار)

نابینا : [ئاوەڵناو] کوێر؛کەسێک کە نابینێت. (نابینا)

ناپاڵم : اند؛ فد: [ناو] سووتێنەر؛ (ب)بۆمبی ناپاڵم؛ بۆمبی سووتێنەر و گڕتێبەردەر. (ناپالم)

ناپەتی : [ئاوەڵناو+ ناو] (١) نەپەتی؛ بێهۆشی؛ لەسەر خۆ چوویی. (بیهوشی)(٢) [ئاوەڵناو] تێکەڵاو؛ خەوشدار. (ناخالص)

ناپەتیاتی : [ناو] ڕەوتی هۆش لەخۆبڕان و بێهۆش بوون. (حالتبیهوشی)

ناپیاگی : [ناو] ناپیاوی؛ ناجوامێری. (نامردی؛ ناجوانمردی)

ناتۆرڤان: [ناو] ئێشکچی بێستان و باغ. (باغبان)

ناتەنی : [ئاوەڵناو] زڕبرا یان زڕخوشک؛ زڕ. (ناتنی)

ناچاندی : نەچێنراو؛ نەوەشێندراو؛ نەچێندراو. (کاشته نشده)

ناخاس: [ئاوەڵناو] خراپ؛ شتێک یان کەسێک کە چاک نەبێت؛ نەباش. (بد)

ناخوازەڵڵا : نەخوازە؛ خاسمە؛ بەتایبەت؛ سەرەڕای ئەوە. (مخصوصا)

ناخوون‌گر:[ناو] ناخوون‌گیر؛ ناخوون قرتێن ؛ نینۆک بڕ. (ناخون‌گیر)

ناخوونگرتن :(ب)نانووخ کوڵکردنەوە؛ سەری ناخوونی درێژ قرتاندن. (ناخون‌گرفتن)

ناخووین : [ناو] ناخوون؛ نانووخ.نینۆک. (ناخن)

ناراو : (١)هەوارگەیێکی جافەکانە لە ناوچەی جوانڕۆ. (نام خیمەگاه ییلاقیایل‌جاف).

(٢)ناردراو. (فرستاده). (٣)ژاراو؛ تاڵاو. له جیاتی دەرد و سندان دەوتری؛ ژەقنەمووت. (زهرابه)
نارچه : [ناو] حەشارگە؛ ڕەبەت. (کمین‌گاه)
ناردنەوه : گەڕاندنەوه؛ ڤـەزڤڕانـدن؛ زڤڕانـدن؛ دووباره ناردن. (برگرداندن)
نارستان : [ناو] باخی هەنار. (انارستان)
نارگیل : [ناو] ناڵگیر؛کـەشـکۆڵ؛ دارێکـه لـه داری خورما دەچێ، میوەکەی گـەوریـه و لـه کەشکۆڵ دەکا؛ ڕەنگی قاوەییه و ڕیشاڵ دە-وری گرتووه؛ دەڵێن ڕۆنی نارگیل بۆ بەرگـری له وەرینی مووی سەرباشـه، میـوەی نـارگیلی وشـک لـەگـەڵ کاکڵـه گـوێز و بـادام و تووشیرین بۆ نەزۆکی باشه. (نارگیل)
نارنجبۆ : [ناو] لیمۆ. (لیمو).
ناروجه : [ئاوەڵناو+ نـاو] نـارنجی؛ بـەڕەنگـی نارنج. (نارنجی)
نارۆەن : [ناو] جۆرێک داری جەنگەڵێه و سه-خته داره. (نارون)
نارەحەتی دروستکردن : (ب)کێشـه دروسـت کردن ؛ گێچەڵ بـۆ کـەسـێک دروسـتکردن. (ناراحتی‌درست‌کردن)
نارەزایی : [ناو] ناقایلی؛ ڕازی نەبوون له که سێک یان کارێک؛ ناڕازیبوون. (نارضایتی)+
نارەنار : [ناو،ت] له زۆر جێدا(ل)دەبێته (ر) وه ک(مال)دەبێته(مار)بۆی هەیه وشەی نـارەنـار له(ناڵەناڵ)ه وەهاتبێت بەواتای ناڵین و له بەر-خۆوه لوورەلوور یان ویرەویرکردن یان لەبـەر-خۆوه گۆرانی‌وتن. (زمزمه‌کردن‌ترانه)+
نارێ : کچ و ژنی شەرمێون و کـەم ڕوو؛ نـاوه بۆ ژنان؛ (نام زنانه؛ زن و دختر کمرو)
ناری قەڵا : [ناو] نارین قەڵا؛ جێگاییکی بـەرزه له ناوەڕاستی شاری سەقزدا له گـەرەکـی نـاو قەڵا؛ بۆی هەیه له(ناری ئارەویەوه هاتبێت بە-واتای ئاور)و نارین قەڵا بووبێت که ئاتـەتشـگا یان ئاورگای زەردەشتیەکان بووبێـت، چوونکـا زۆربەی ئاورگاکانی زەردەشت له جێی بـەرزدا دروستکراون. (نام‌قلعه‌شهرسقز)
نارێکی : [ناو] نەگونجاوی؛ ناڕاستی؛ ناکۆکی؛ فێڵاوی؛ ناتەبایی. (ناراستی). (٢) پڕکەنـدولـه-ندی؛ پڕکەندوکۆسپی؛لارولەوێـری. (ناصـافی؛ ناهمواری)
ناز بالگهه : [ناو] ناز باڵنج؛ بنسەر. (نازبالش)
ناز بالیف : [ناو] نازبالگهه؛ نازباڵنج؛ سـەرینـی چووک. (نازبالش)
نازار : نازدار؛ ناوه بۆ ژنان. (اسم‌زنانه)+
نازانم : چووزانم؛ چدەزانم؛ چەدزانـم؛ چنـزانم. (نمیدانم)
نازکەفس : ناز و خەمزەی ژنێ که لێی‌نا کاڵێتەوه. (نازکردن‌زنی‌که‌برازنده‌ش‌نیست)
نازکێ: [ناو] ناسکێ؛ (١) ناسکێ ناوه بۆ ژنان. (اسم‌زنانه).
نازکێشان : نازهەڵگرتن؛ کێشـانا نـازان. (نـاز-کشیدن)
نازگوڵ : ناوه بۆ ژنان (اسم زنانه)
نـازم : [نـاو](١)کـەسـێک کـه نـەزم و زەرب (ڕیـتم)ی گـۆرانی تێـکنـادا.(٢) جێنشـینی مودیری مەدرەسه. (ناظم)
نازناڤ : ناسناڤ؛ ناسناو؛ نازناو؛ لەقەمـی هـە-ڵبژارده. (اسم‌مستعار)
نازێ : ناوێکه بۆ ژنان. (نامی است‌دخترانه)
نازی : [ئـاوەڵنـاو+ نـاو] هـەوا داری نازیسـم؛ ناوی حیزبێک که هیتلێر لـه ئاڵمـان‌دروسـتی

کرد. (نازی)
نـاژتن :[چاوگـه](۱) ناشـتن؛ بـه خاکسـپاردن (دفن‌کردن). (۲) نه‌مام و شـه‌تـل چـه‌قانـدن. (نشاکردن و کاشتن‌درخت)
ناسازگار : [ئاوه‌ڵناو] (۱)که‌سێک‌کـه لـه‌گـه‌ڵ کـه‌سـێکدا ناحاوێتـه‌وه؛ ناتـه‌بـا؛ نـه‌سـاز. (۲) خۆراک یان ده‌رمان پێ نـه‌کـه‌وتـن (۱و۲. نـا سازگار)+
ناسپاس : [ئاوه‌ڵناو] سپڵه؛ بێ‌ئه‌مه‌ک؛ بێوه‌فـا؛ بێ‌چاووڕوو؛ پێ‌نه‌زان. (ناشکر؛بیوفا)
ناسته بۆ : نـه‌یهێشـتبێت؛ نـه‌یهێشـتوی؛ نـه‌-یهێشتوێت. (نگذاشته‌باشد)
ناسر : ناوه بۆ پیاوان. (اسم‌مردانه)
ناسروماڵماڵ : ناوی به‌یتێکی کوردییه. (نام آوازی کردی است)
ناسک به‌ده‌ن : [ئاوه‌ڵناو] نه‌رمونیان؛ شل‌ومل؛ ناتله‌نگ زراف. (نازک‌اندام)
ناس‌کری : [ئـاوه‌ڵنـاو+ نـاو] ناسـیاو؛ ناسـراو. (آشنا.شناخته‌شده)
ناسکه‌نان : [ناو] نـازکـه‌نـان؛ (۱)نـانی پـان و ناسکی ته‌نووری یان ساجی.(نـان‌لـواش). (۲) نانێک که له هه‌ویری کولێره ناسکه دروسـت ده‌بێت و له‌باتی ئاو هه‌ویره‌که‌ی بـه شـیر ده-گیرێته‌وه. (نان‌لواش‌ترد)
ناسکێ : ناوی ژنانه‌یه. (اسم‌زنانه)
ناسناو : نازناو؛ نازناڤ؛ له‌قـه‌مـی هـه‌ڵبـژارده. (اسم‌مستعار)
ناسـیاو : ناسـراو؛ بـه‌نـاووده‌نـگ؛ مـه‌نشـوور. (شناخته شده؛ مشهور)
ناسێلک :[ناو]ناوسـێلی؛ نـان‌سێلی؛ناوسـاجی. (گرده درروغن‌سرخ‌شده.توتک)

ناشتایی : [ناو] سـفحانه؛ سـبحانه؛ سـوبحانه؛ ئه‌وزاده کو سپێدی دخۆن؛ نانێ‌که سـبه‌ینـان ده‌یخۆن. (ناشتایی)
ناشته : ناشتا؛ برسی،کۆ ژسـپێدڤه هـیچ نـه-خاری؛ له‌خرێنی؛ له‌خورێنی. (ناشتا)
ناشته : نیژراو؛ به خاک سـپێردراو؛ نـه‌مـامی
ناشته : نه‌مامی چه‌قێنراو. (به‌خاک سپرده؛کاشته)
ناشته کرن : ناشتایی‌کردن؛ به‌رقه‌نده خواردن. (صبحانه‌خوردن)
ناشنه‌وا : فد: [ئاوه‌ڵناو+نـاو] ناژنـه‌وا؛کـه‌ڕ؛(ب) ئه‌و که‌سه کۆ گۆه نه‌ده‌ته چ شـیره‌تـان؛ کـه-سێک گوێ نه‌داته قسه‌وپه‌ند. (ناشنوا)
ناشه‌رعی : دژی ده‌ستووری شه‌رع‌ودیـن؛ (ب) زۆڵم‌وزۆر و ناڕه‌وایی. (ناشرعی)
ناعاملاو : [ئاوه‌ڵناو] ناحاملاو؛ ڕانـه‌هـاتوو؛ ڕه-عه‌مه‌ل نه‌هاتوو؛ (ب) ڕه‌زاگران؛ ناقۆلا؛ ناعـه-مـلاو؛ ورچـی ناعـاملاو، بـه‌مرۆڤـی نـاقۆلاو ناشیرین ده‌ڵێن. (بدقیافه؛ زشت)
ناعیلاجی : [ناو،ت] مه‌جبووری؛ ناچاری؛ بێ-ده‌ره‌تانی. (ناعلاجی)
ناف پێ‌دان : [ناو،ت] ناولێ‌نان. (اسم‌گذاری)
ناڤبری: [جێناو] ناوبردوو؛ ناوبراو. (مذکور)
ناڤبێن : ناڤبه‌ین؛ نێوان؛ مابه‌ین. (بین)
ناڤبێن‌چی : [ناو،ت] ناوبژی‌که‌ر؛ ناوجێیی‌کـه‌ر. (میانجیگر)
ناڤچار: [ناو،ت](۱) ناوچاڵ. (گود). (۲) قامکی ناوه ڕاست؛ هه‌ڵمه‌قووته؛ زه‌رنه‌قووتـه؛ بـه‌رزه-ملێ؛ تلیاناوین؛ قامکی قووتێ. (انگشت وسط)
ناڤدۆک : [ناو،ت] نێره‌ژه‌ن؛ ناڤدۆ؛ دارمه‌شـکه که ده‌چێ به ناو هه‌ردوو ده‌سـکی (لۆلـه‌پ)ی

مەشکەدا. (چوب میان دو دسته مشک
ناڤشرین : (۱) دەروون و ناخی شتێ کە شیر-ین بێت. (وسط ومیانشیرین). (۲) ناو خـۆش؛ نێو جوان. (اسمنیکو؛اسمقشنگ)
ناڤهنجی : [ئاوەڵناو] ناونجی؛ نێونجی؛ دەسته؛ نەزۆر نەکەم. (وسط)
ناڤێ : ناوێ؛ مەتەناڤێ : منتۆم نـاوێ؛ نامـە-وێ؛ (نمیخواهم)
ناڤیره : [ناو] دوێرد؛ قەیچی؛ مقەسـت؛ دوارد؛ تۆرتۆ؛ مقەس. (قیچی)
ناڤێش : [ناو] زکئێشه؛ ئێشیهەناو. (دلدرد)
ناقووس : [نـاو] زەنگـی گـەوره. (ب)زەنگـی کلیسا. (زنگبزرگ)
ناک ئەوت : اند؛ فد: [نـاو] دەسـتەواژەی وە-رزشی مشتەکۆله(شەڕەمشت)ه واتا له شـەڕە-مشتدا ناک داونێ(کەوتنێ)کـه لـه ژمـارەی دیاریکراودا نەتووانی هەڵسێتەوه. (ب) لەعـە-ردران و شکستخواردن له کێبەرکێی شـەڕە-مشتدا.(ناکاوت)
ناکداون : فرد؛اند؛ فد: [ناو] دەسـتەواژەی وە-رزشی مشتەکۆله(شەرەمشت)ه واتا لـه شـەڕه مشتدا کەوتن و بەعەرزدا دران بەڵام له مـاوە-ی بژاردنی ده ژمارەدا، هەڵسانەوه و دەوام دان به کێبەرکێ. (ناکدوان)
ناکام : [ئاوەڵناو] نەوەکام؛ نـەگـەیشـتوو؛کاڵ؛ خۆنەگرتوو. (نرسیده)+
ناکامی : [نـاو](۱)بـه ئاکـام نـەگـەیشـتوویی؛ نامورادی.(نامرادی) (۲)نەوەکامی؛ بـه ناکـامی بەرخەکه له دایک بوو نەژیا. (کاملنشده)
ناکۆک : سازێ کە سیمەکانی(تەلەکانی)میزان نەبێت. (ناکوک)
ناگۆره : [ئاوەڵناو] بایەخدار؛ پڕدڵ؛ ئـازا؛ دلێـر. (باارزش؛ شجاع)
ناڵ : لەگەڵ(نک)دێ واتای ناڵـه دەدا، نـک-ونالْ. (ناله)
ناڵەشکێنه : [ناو] تـەپێکـه لـه قـەراخ شـاری بۆکان. (اسمتپهایست)
ناڵەناڵ : هەندێ جار واتای گرماندن دەدا، وە-ک ناڵەناڵی توپ و مەترەلۆس؛ ناڵەناڵی هەور. (صدایرعدآسا)+
نامـان : [نـاو] حـودوود؛ سـنوور؛ کـەوشـەن؛ تخووب. (مرز)
نامڕاس : [ناو] ناوڕاس؛ ناوەڕاس؛ نـاوەڕاسـت. (میان؛ وسط)
ناموس : [نـاو](۱)شـەرەف. ئـابڕو.(نـاموس). (۲ب) ژن و دایک و خوشک و کچ کـه پـارا-ستنی ئابڕویان له ئەستۆدایه.(ناموس)+
ناموسی : [ئاوەڵناو] پێوەندیدار به ناموو سەوه؛ جوێنی ناموسی : جـوێنی دایـک و خوشـک بەدەما هاتن. (ناموسی)
نامەت :[ناو،ئاوەڵناو] له بەینـی(ن و ئـەلـف)دا دەنگێک که ئاوێتەییێکه له(ە ،گ ، ی)هـەیـه که له کوردیدا پیتـی تایبـەتـی نییـه و ناچـار وشەی(نەدامەت)جێگای پڕکـردوەتـەوه؛ بـە-واتای نەکبـەت؛ شـووم؛ بـەدیـومن. (نکبـت؛ شوم؛ بدیمن)
نامەی سەرئاوالـه : (ب) سـکاڵا و داوخـواز لـه گۆڤاردا بڵاو کردنەوه بـۆ ئاگـاداریی کاربـەدە-ستێکی حکومەت. (نامەسرگشاده)
نامیـای : [چاوگـه ت] چـەمیـای؛ دانـەویـن؛ کوڕنوشکردن؛ کۆم بوون؛ کووڕ بوون. (خـم-شدن)

نامیزان : [ئاوەڵناو] ناڕێک بوون و هاوسەنگ نەبوونی تای ترازوو؛ لە پاشبوون یان لە پێشبوونی کاتژمێر؛خراپ کارکردنی‌مۆتۆڕ؛ تراز نەبوون؛ لار؛ گێر؛ کورت و درێژ بوون؛ ناڕاست؛ ناکۆک. (نامیزان)
نانا : [ناو] لە هەندێ شوێن بە نەعنا دەوترێ. (نعنا)
نان‌بدێ : [ئاوەڵناو] دەس‌ئاواڵە؛ دڵاوا؛ بە سەخاوەت؛ دڵ‌فرە؛ دەست‌ودڵ‌باز. (سخی)
نان‌بڕ : کەسێک کە دەبێتە هۆی لەسەر کار لابردن و بڕینی داهاتی کەسێک. (نان‌بر)
نان‌برنجی : [ناو] جۆرێک شیرینیاتە(تۆشە)کە بە ئاردەبرنج دروست‌دەبێت؛ کولووچەبرنجی؛ نان‌برنجی کرماشان بەناویەیە.(نان‌برنجی)
نانبڕەگوڵ :[ناو](١)گوڵی‌خەشخاش؛گیای خەشخاش کە لە شیلەی گورزەکەی تریاک دەگیردرێت. (گیاەخشخاش). (٢) نانودوێڕ: چارە چەقیلەی نێو مەزاری گەنم و جۆ. (شقایق)
نان‌حەرام : [ئاوەڵناو] بێ‌ئەمەک؛ بێ‌وەفا؛ ئەمەک نەناس. (بیوفا)
نان‌حەلال: [ئاوەڵناو] نان‌حەڵاڵ:(ب) بەئەمەک؛ بەوەفا؛ ئەمەکناس؛ لە بن زاراوەی ئەردەڵانیدا واتای (نانی‌حەڵاڵیش)دەدا(باوفا
نان‌خۆر : [ناو](ب)جیرە و بەرات‌گری بەردەست. (نان‌خور)+
نان و دوێڕ:کەسێک کە دەبێتە هۆی پووش - لەدەمی و بێ‌سامانی؛ (ب) بەدیومن و نا سپاس و ناشکور؛ (ب)چارەچەقیلەی‌ناو زەرحات و گەنم‌وجۆ. (کنایەازبدیمن وناشکر؛ شقایق روییدەدرکشتزار)
نان‌وماس : [ناو] یاری منداڵانە؛ زاپ لاتیل فرێدەدەن بەسەر ئاودا کە تەتەڵە دەکا و چەند جار بەسەر ئاوەکەدا هەڵدەبەزێتەوە. (نوعی-سنگ‌اندازی‌روی‌آب)
نان‌وناو : (ب) داهات لەگەڵ ناو دەرکردن و منشور بوون؛ پارە و پلە و پایە؛ پارە و ناوداری. (نان‌ونام)
نانەجیم : [ئاوەڵناو] نانەجیب؛ بەدئەسڵ؛ بەد ڕەسەن؛ (ب)بە ژنی هەرزە و تەورلەق دەڵێن. (نانجیب)
نانەکێشکە : [ناو] نانەچێشکە؛ گیای نان چۆلەکە. (گیاهی‌است)
نانەمرۆچە : [ناو]گیای شەوەرەشەوەن؛ شەوەرەشوان. (گیاەاسپرس)
نانی‌حەج :[ناو] نان‌وچێشت بە خەڵک‌دان، بە بۆنەی هاتنەوە لە حەج. (حاجیانە)
نانی حەرام : [ناو](ب) هەر شت لە ڕێگای کە سبی ناڕەوا و دزی‌وفزییەوە بەدەست بێت. (-نان‌حرام)
نانی‌حەفتە : [ناو] خوانی ڕازاوە کە لە ماڵی بابی بووکەوە تا حەوت ڕۆژ بۆ ماڵی زاوا دەنێردرێ. (نان‌هفتە)
نانی حەڵاڵ : [ناو](ب) هەر شت لە ڕێگەی ڕەوا و حەڵاڵەوە بەدەست‌بێت. (نان‌حلال)
نانی‌زەماوەند : [ناو] (ب) شام‌ونەهارێک کە بەخەڵکی بەشدار لە زەماوەنددا دەدرێ. (نان-عروسی)
نانی سۆح : [ناو] نانی بەیانی؛ بەرقلیان؛ ناشتایی؛ سفحانە؛ بەرقەندە. (صبحانە)
نانی‌گاڵ : [ناو] لە قاتوقڕیدا لە هەرزن کولێرە دروست دەکرێ؛ کولێرەی هەرزن. (نان‌ارزن)
ناو دەرکردن : منشوور بوون،(مەشهوربوون)

بەناوودەنگ بوون؛ ناو کـەوتنـە نـاوان. (اسـم درکردن؛ مشهورشدن)
ناوال :[ناو]کەوشەن؛ حودوود؛ سنوور.(مرز)
ناوبری : ناوبراو. (نامبرده)
ناوپێسیر : [ناو] نێفەک. (خشتک)
ناوتەنگە : [ناو،ت] تەنگە؛ نێوقـەد؛ ناتلـەنـگ. (اندازەکمر)
ناوچاڵ : [ناو،ت] هەر شتێک ناوە ڕاستەکەی چووبێت بە چاڵدا؛ قوپاو. (گود)
ناوچاو : [ناو،ت](ب)بەخـت؛ شـانس؛ ئیغبـاڵ؛ نیوچاو؛ لە نێو چاوی ئـەو خانـەدانـە، لـەهـی بۆچی پیتی بڕاوە. «سوارە ئێلخانی زادە»+
ناودار : بە ناوودەنگ؛ ناسـراو؛ سـەربـەدەرەوە؛ مەنشوور. (نامدار)
ناودەرکەوتوو : [ئـاوەڵنـاو] ناوبـەدەرەوە؛ بـە- ناوبانگ؛ مەنشور. (مشهور)
ناوڕاس : ناوەراس؛ نێوەڕاست؛ نامڕاس. (میان؛ وسط)
ناوژووکە : [ناو] ساچمەی گەورە کـە لـە نێـو زەنگۆڵە دایە. (ساچمەزنگوله)
ناوقەڵا : نارین قەڵا؛ گەڕەکێکە لە نـاوەڕاسـتی شاری سەقزدا. (محلەای‌درسقز)
ناوک : [ناو](۱)دەنکی نـاو میـوە؛ چـەقالـەی میوە. (هستەمیوە).(۲)کاکڵی نێو چەقالـە وەک کـاکڵی بـادام. (مغـزهسـته). (۳)چاڵـایی نـاوە ڕاستی سک. (ناف)
ناوک داخستن : [چاوگە،ت] داچڵەکاندن بە تەقە یان خەبەری دوور لە چاوەڕوانی. (وارد کردن‌شک شدید؛ شکەکردن)
ناوکە دووانە : [ناو] دوو دەنک نێوک کە لە ناو چەقالەیێکدابێت. (چغاله یا بادام با دومغز)-
ناوکەوتنە ناوان : ناو بڵاو بوونەوە؛ شۆرەت پە- یداکردن؛ بوونە خاوەنی ناوودەنگ. (مشـهور- شدن)
ناوگەل : (۱) نێو کۆمەڵ؛ نێوجڤات. (داخل جمعیت). (۲) چەنـد نـاو؛ نـاوەکـان. (اسـمها)
ناومیری : > ناوێژک
ناونامە : فەرهەنگـی نـاو؛ نێونامـە. (نامنامـە)
ناونیتکە : [ناو] ناتۆرە؛ ناو ونرتـک لـەقـەمـی خراپ لەسەر کەسێک دانان. (لقب‌زشت)
ناونیشان هەڵدان : [چاوگە،ت]ناساندنی چلـۆ- نایەتی و شێوە و شێوازی کەسـێک بـە قسـە، چلۆنایەتی وێنەی کـەسـێک شـرۆڤە کـردن. (شرح‌نشانەهای‌برجستەکسی)
نـاو و نرتـک : [نـاو،ت] نێـو و نرتـک؛ نـاو و ناتۆرە؛ ناونیتکە؛ لەقەمی خراپ.(لقب‌زشت)
ناوەبەناو : > ناوەناوە
ناوەخت : [ئاوەڵناو+ بەند] نەلـەکـاتی‌خۆیـدا؛ بـێ‌وەخـت؛ (ب) درەنـگ؛ درەنـگ وەخـت . (نابهنگام؛ دیروقت)
ناوەرە : [ناو] ڕیخۆڵە؛ ڕیڵەخۆ. (روده)
ناوەزۆل : ناوەزێڵ > ناوەزێڵە
ناوەزێڵە : [ناو] ناخ و نـاوەرۆک؛ نـاوە ڕاسـتی ناخ؛ وەک: شووتی ناوەزێڵـەکـەی شـیرنیترە. (وسطومیان)
ناوەش : [ئاوەڵناو] ناخۆش (بـەهـە مـوو واتـا یێکەوە). (ناخوش)
ناوەکی : [ئاوەڵناو] شتی ناوەوە، دژی دەرەکی. (داخلی)
ناوەناوە : [بەند] بەین‌بەین؛ بەینابەین؛ جارجار. (هرازگاهی؛گاهگاه)
ناوی فامیلی : > ناوی‌گەورە.

ناویت : (١)[کەسی دووهەمی تاک]نابی؛ ئەتو ناویت بە ئەندازیار. (نمی‌شوی). (٢) )[کەسی سێهەمی تاک]نابیٚ؛ ناویٚ. (نمی‌شود). (٣) نابووت؛ نابود؛ مافینگی؛ دەم لەپووش. (نابود)
ناوێت : نابێت؛ ناویٚ؛ نابیٚ. (نمیشود)
ناوێرم . زات ناکەم؛ زاتم نییە؛ دەترسم؛ جورئەت ناکەم. (جرئت‌نمی کنم)
ناوێژک : [ناو،ت] داری بەینی دوو لوٚلەپ؛ دار دوٚ ژنگ؛ نێرەژەن. (چوب‌بین‌دودسته‌مشک)
ناوێژە : [ئاوەڵناو] لکەدار؛ لەکەدار؛ عەیبدار. (لکه‌دار؛ معیوب)
ناوێژە : [ئاوەڵناو] نەبیستراو؛ سوٚسرەت؛ سوٚزرەت؛ عەجایەب؛ تایبەت. (عجیب؛ ممتاز)
ناوی‌گەورە : ناوی فامیلی؛ شوٚرەت؛ ناوی بنەماڵەیی کە لە بابەوە بە فرزەند دەبڕێت. (شهرت)
ناوێن‌کەفش : لە ڕوانگەی دەستووری زمانەوانیەوە، ناوی شتی ناسراو(مەعریفە). (اسم-معرفه)
ناوێن نەکەفش : لە ڕوانگەی دەستووری زمانەوانیەوە، ناوی شتی نەناسراو(نەکەرە). (اسم‌نکره)
ناهید : [ناو](١)بەرەبابێکن لە ئێلی فەیزوڵڵابەگی کە شورەتیان (ناهید)ە. (٢) زوهرە گەروکێکی ئاسمانییە و دووهەمین گەڕوٚکی نزیک بە خوٚرە. (ستاره‌زهره؛ ناهید)
نایاب : [ئاوەڵناو] شتیٚ کە درەنگ یا بە دژوارى وەدەست بکەویٚ؛ (ب) بەقیمەت؛ بەهادار. (نایاب)+
نایلوٚن :: فد: [ناو] لایلوٚن؛ دەڵق؛ تەڵق؛ (نایلن)
نتک : [ناو] پنوٚک؛ خاڵ؛ لکە. (لکه)
نخوٚ : [ناو] نوٚک؛ نخووت؛ نخیٚ؛ نخه. (نخود)
نزارە : [ناو] مەشکەدڕە. (نوعی‌ملخ‌بزرگ‌و-سیاه)
نزاکەت : [ناو] ناوە بوٚ ژنان؛ نەزاکەت؛ حەیا؛ ئەدەب؛ لەسەرەخوٚیی؛ لە توٚی نزاکەت‌دا قسە کردن : پەردەی ئەدەب ڕاگرتن. (ادب؛حیا؛ نزاکت)+
نزوول : عد؛ فد: [ناو] ئارەوییە، بەڵام زوٚر لەسەر زمانی جەماوەرە، ڕیبا؛ سووت. (نسزول)
نزیٚ: کورتکراوەی ناوی نزاکەتە.<نزاکەت
نزیکە : (١)دوورنییە؛ ماوەی‌کەمە. (نزدیک است). (٢ب)[بەند] لەوانەیە؛ خەریکە؛ نزیکە بمریٚ : لەوانەیە بمریٚ. (مشرف‌است)
نزیکی : [ناو](١)دژی دووری. (نزدیکی). (٢ب)کاری سەرجێیی؛ ئیلاقە. (همبستر شدن)
نژارە : [ناو] بنەبانی خانوو؛ سەربان. (پشتبام)
نژی : > نەسک؛ نیسک
نسرم : [ناو]ژێرزەمینی و ژێرخانی تەڕەشوٚ؛ یان جێگای خوٚرنەگر. (اطاق‌زیرزمینی‌مرطوب)
نسک : ف.مان. ژیان؛ ژین. (زندگی)
نشم : [ئاوەڵناو] هێدی؛ ئارام. (آرام)+
نعوٚری : [ناو] میزراح؛ مەزرەق. (گردنا)
نفاوە : لەبەین‌چوونی پەنمان؛ نیشتنەوەی بای هەڵماسینی لەش. (خوابیدن‌آماس)
نقژدی : [ناو] ڕەبەنی؛ سەڵتی؛ بیٚژنی. (مجردی)
نقێژ هێل: نوێژ نەکەر.(کسی‌که‌نمازنمی‌خواند)
نقیسەر : [ناو] نووسەر؛ نقیسیار. (نویسنده)
نقیسین : [چاوگە] نووسین : کاری نوسینی کتێب و نامە. (نوشتن)

نفیشک: [ناو] (۱)گوێج. (معلول). (۲)کەرە. (کره)

نقتین : دڵوپەکردن. (چکەکردن)

نقوورە : [ناو] چەکوش؛ چەکوچ. (چکش)

نکمال : [ناو] پەنامالْ؛ جیران؛ هاوسیْ؛ جینار. (همسایه)

نکمە : [ناو] نکم؛ بوودڕ؛ ڕەهۆڵی ئاوەڕۆ؛ نە-غم؛ نەغمە؛ لەغمە. (کانال‌آبروفاضلاب)

نکێنە : [ناو]فڕندەییکە لە مریشک‌چووکترە ولاق درێژ و دەندووک درێژە، لە تەنکاواندا ڕاودەکا و جۆرێکی تریان هەیە کە چەکمە سووری پێدەڵێن. (آوست؛ چوب‌پا)

نگریس : [ئاوەڵناو+ ناو] نەگبەت؛ پیس؛ چە-پەڵ؛ کرێت. (نکبت)

نمانای : نیشاندان و وەدەرخستن؛ نوواندن. (نشاندادن)

نم‌تک : [ناو] نزاڤ؛ دزاو؛ جێگەی ئاو دەڵێن؛ دڵۆپەی کەم. (چکەناچیز؛ نشت)

نمتک لێبڕین : [چاوگە،ت] وشکایی پێهێنان؛ دڵۆپ لێبڕین؛ چکاندن. (قطع‌کردن‌تراوش)

نم‌کێشان : نم‌کێشتەی؛ تەرەشۆ بوون؛ شێ-مژین. (نم‌کشیدن)

نم– نم : [ناو] دڵۆپ‌دڵۆپ؛ نمەنمە. (نم‌نم). [بەند](ب) هێواش‌هێواش؛ کەم‌کەم؛ بەشێنە-یی؛هێدیکا؛ هێدی‌هێدی؛ ئارام‌ئارام. (نم-نمک.آرام‌آرام)

نمەک‌پەروەردە : [ناو](ب)بەخێو بوو لەسەر سفرەی کەسێک ؛ (ب) منەتباری چاکەی-فراوانی کەسێک بوون. (نمک‌پرورده)

نمەک‌نەناس : [ئاوەڵناو] سپڵە؛ بێ‌ئەمەک؛ بێوەفا. (نمک‌نشناس)

نۆ : پێشگر واتا نویْ؛ نۆ بووک، نۆموسو ڵمان، نۆمالْ. (پیشوندبمعنی‌نو)+

نۆئافرێن : خولقاندنی شتی تازە؛ نۆژەن. (نوآفرین)

نۆبنیات : [ئاوەڵناو] نەوبنیات؛ تازە ساز کراو؛ تازە دروست بوو. (نوبنیاد)

نۆبە : [ناو](۱)نۆگە؛ نۆبەت؛ گەڕەد. (نوبت). (۲)جار؛ کەڕەت؛ بارەکەی بە دوو نۆبە گوێزاوە. (بار؛ مرتبه)+

نوبەرەی گێلاس :بەتەوسەوە بە کەسێک دە-وترێ، مەگەر نۆبەرەی گێلاست هێناوە؟، هاوتاکەی دەبێتە مەگەر چاوت جوانە؟. یان مەگەر کارێکی ئەوتۆ و گرنگت کردووە؟ مە-گەر لەوخەڵکە زیاتری؟ (معادل‌تافته جدابافته و نوبرش‌راآوردن؛ نوبرگیلاس‌آوردن)

نۆبەند : (۱) گای نۆسالْ جووت کردوو. (گاو-۱۲ساله). (۲)گایی کە تازە نیری خراوەتە سە-رمل. (گاوتازەبەخیش‌بسته‌شده)

نۆت: [ناو] نۆتە؛ ئەلفوبێی نووسینی‌مۆسیقا. (نت)+

نۆتشە : [ناو] نۆدشە؛ شارێکی کەونارایە لە بەینی سنە و پاوە دایە؛ بەواتای نەمر لە زمانی پەهلەوی کۆندا. (نودشه)

نۆتلا : [ناو] میناک؛ مینا؛ وەک؛ وەکوو؛ کوت-وموت؛ بینانی؛ وەکی. (مانند)

نۆتۆرڤان : [ناو] نەیرەڤان؛ چاودێر؛ نۆتروان؛ قەرەوڵ. (نگهبان)

نوخرۆ: نخرۆ؛ نوغرۆ؛ نقوم بوون لە تراوڤا؛ وە-ژێر ئاو کەوتن و نقوم بوون. (غرق‌شدن)

نۆرە فەوتان : نۆگە فەوتان؛ کەسێک کە نۆبەی گرتووە و لە کاتی پێویستدا لەوی نە-

بووە و کەسێکی دیکە کە لە دوایەوە بووە هاتووەتە جێگای ئەو. (ازدست دادن نوبت،)
نۆزاوا : [ئاوەڵناو+ ناو] تازەزاوا. (تازەداماد)
نۆژوو : > نەسک؛ نیسک
نۆژەنی : [ناو] نویْژەنی؛ نویْخوازی؛ نەو ژە نی؛ پاوێری؛ داهێنان. داهێنەری؛ داهانین. (نوآوری؛ اختراع)
نوسکەنوسک : [ئامراز،دەنگ] قوروووسکە قوروووسکی سپلۆت. (نالیدن‌پی‌درپی‌سگ)
نوسند : [ناو] ئاوەنیا؛ ڕەپستە. (آبستە.؛ بساردە)
نۆش: لەگەل عەیش دادیْ؛ عەیش‌ونۆش : ڕابواردن بە خۆشی. (نوش)+
نۆش: [ناو] گەوارا؛ پاشگر وەک: بادەنۆش.
نۆش‌گیان :[ناو،ت] نۆشی گیانت بیْ؛ گەوارات بیْ. (نوش جان)
نۆشابە : (١) ناو بۆ ژنان. (٢)[ناو] خواردنەوی بە لەزەت؛ شەربەت. (نوشابە)
نۆشابەی ئەلکولی : [ناو،ت] ساردەمەنی کە ئالکۆلی تێدابێت؛ (ب)مەی. (می)
نوشان (ا)[چاوگە]نۆشین. (٢)[ڕابوردووی نۆشین] نۆشیان‌کرد؛ نۆشیان: خواردیانەوە. (نوشیدند)
نۆشانە : تراوی خواردنەوە؛ نۆشابە.(نوشابە)
نۆشانەی خودایان : [ناو،ت] لە زەمانی زەڕ دەشتدا لە هەورامان دروست دەکرا و حەوت گیای تایبەت لە ناو هۆمە(کوپە)ی شەڕابدا حەوت ساڵ‌دەمایەوە حەوت دەردی چارە سەر دەکرد لە گۆرانییە فولکلۆرەکاندا هێمای پیْ کراوە(درمانی حەو دەردانی). (نوشابەخدایان)
نوشی‌گیان : واتا بە گیانت خۆش بێت؛ لە جوابی فەرموو یان بە سلامەتی، لەکاتی خواردنەوەدا؛ یان لە پاش خواردن و خواردنەوە دەوتریْ. (نوش‌جان)
نۆڤامبر . [ناو] نۆوامبر؛ مانگی یازدەهەمی ساڵی زایێنی. (نوامبر)
نوقرە داخ : [ناو،ت] جەریمە کردن و چزاندن بە پووڵ و پارەی نەغد لیْسەندن. (نقرەداغ)
نوقرە داخکردن : [چاوگە،ت](١)زێوی داخ چزاندن بە لەشی کەسێکدا. (داغ‌کردن‌بانقرە-داغ). (٢ب) جەریمە کردن و پارە لیْسە-ندن.(نقرەداغ) گەرم کردنی نوقرە. (داغ‌کردن-نقرە)
نوقرەج : [ناو] ماشە؛ گاز؛ مقاش. (منقاش؛ گاز)
نوقڵە دەمە : [ناو،ت] بەکیژ ولاوی دەم چکۆلە دەڵێن. (معادل‌غنچەدهان)
نۆکە سوورکە : [ناو،ت] لە نۆکە ڕەشکە دەکا، بەڵام ڕەنگی تۆخ نیە و قاوەیی ئاچخە. (نخود رنگ صورتی)
نۆکەشامی : [ناو،ت]گیای باقلە شامی و بەرە-کەی. (باقلای‌مصری)
نۆکەمار : [ناو،ت] ولەرە؛ گیای نۆکە فەڕەنگی کە میوەکەی لەکالانێکی دوو درزدا یە، دژی کرمەکی ڕیخۆڵەیە. (گیامنخود فرنگی)
نۆل : نۆلی؛ میناک؛ مینا؛ وەک؛ لێچوون؛ وە-کوو؛ شێوەدان. (مانند)
نوواندن : (١) نیشاندان؛ نمونەی کاڵاکەی لە بازاڕ نوواند. (نشان‌دادن). (٢)سەرنج ڕاکێشان و فیزکردن، ئەدادرهێنان و خۆنوواندن. (خود-نمایی)+. (٣)دیاربوون؛ (چاییەکەی دەستت حەوڕەنگ دەنوێنیْ). (نمایان شدن). (٤) ڕازاندن. خەواندن. (خواباندن)+

نووچ : [ناو] وەنەوز؛ خەوەنووچکە. (چرت)
نووچدان : کورتەخەو؛ وەنەوز بردنەوە. (چرت-زدن)
نوورانی : [ئاوەڵناو] تیشکدار؛ پڕشنگدار؛ (ب) پیاوی خواناس و ئەنی‌گەش. (نورانی)
نوورباران : [ئاوەڵناو+ ناو] (داپڕژانی نووری زۆر) تیشک‌باران؛ مانگە شەو نووری دەباراند بە سەر عەرزدا : تیشکی دەباراند نوور وشەیێکی ئارەویە بەڵام لە سەرزمانی جەماوەرە، کەس بە مردوو ناڵی تیشک لە قەبرت بباریٚ، یان شەوق لە قەبرت بباریٚ، زیاتر دەڵێن نوور لە قەبرت بباریٚ و مەبەست نووری خوداییە. (نورباران)
نووروناوچاو : [ناو] شانس و ئیغباڵ؛ لە نوور و ناوچاوی تۆ بەشکم کارەکە دروست بێت. (بخت‌وشانس)
نووره : [ناو] بەردەزووخاڵ؛ خەلووزی بەرد؛ بەردەڕەژی. (ذغال‌سنگ)
نووری‌دیه : [ناو] نووری دیدە؛ ڕوشنایی و ڕووناکی چاو؛ (ب) زۆر خۆشەویست؛ فرزەند. (نوردیده)
نووژی : > نەسک؛ نیسک
نووسان :[چاوگە] (۱)کپ بوون؛دەنگ‌نووسان؛ دەنگ کەوتن. (گرفتگی‌صدا). (۲) تووش - بوون؛ دووچار بوون؛ هەڵامەتم پێوە نووسا. (مبتلا). (۳) سازگاری و نزیک بوونەوە لە کەسێکٚ، ناسازگارە بە کەسێکەوە نانوسیٚ. (نزدیک‌شدن).(۴) نڤیسان.نووسین ؛نووسانگمە : نووسیومە. (نوشتن)(۵) چەسپاندن؛ وەک‌گەنە پیانووسان؛ لکان؛ بە چەسپ پیا نووساندن. (چسپاندن)

نووسکاندن : نووزە نووزکردنی سپڵۆت؛ قوروووسکاندن. (صدای‌سگ‌دروقت‌درد و آزار)+
نووسیار : [ناو] نڤیسیار؛ نووسەر؛ کەسێک کە دەنووسیٚ. (نویسنده)+
نووسینگە : [ناو] بونگا یان ڕێکخراوێکی وەک: نووسینگەی ماڵٚ و خانوو؛ نوسینگەی مارە و تەڵاق و ئیتر. (بنگاه؛ دفترخانه)
نووسینەوە : لە سەر ڕا نووسین؛ ۲و۳(ف.هن). (دوبارەنوشتن)+
نووک تیژ : [ئاوەڵناو+ناو] بەسەری باریک و تیژەوە؛ دژی نووک کوڵٚ و نووک کول. (نوک‌تیز)
نووکڕاندن : [چاوگە،ت]نووقاندن؛ چاولێکنان : چاو قووچاندن. (بستن؛ رویهم‌گذاشتن)
نووهووت : [ناو] پارگوێری میٚ. (گوسالەدو-سالەماده)
نویٚئەفلاتوونی :[ناو،ت]ڕێبازێکی فەلسەفییە دەڵیٚ هەموو عالەم تیشکێک لە خودایە و ڕۆح دەگەڕێنەوە لای خودا. (نوافلاطونی)
نویٚباو : [ناو] تازە داهاتوو. (مۆدێڕن) مۆد. (مدرن؛ مد)
نویٚخواز : [ئاوەڵناو] لایەنگری ڕێبازی تازە لە بواری ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و هونەریەوە؛ نوی‌ژەن. (نوگرا)
نویٚخوازی : [ناو،ت] ڕەوتی نویٚخواز بوون؛ خاوەنی هزری نوێخوازانە. (نوگرایی)
نوێژخانە : [ناو،ت] ژووری تەرخان کراو بۆ نوێژ کردن بەتایبەت لە ئیدارات و ڕەستۆرانی سەر جادەدا. (نمازخانە)
نوێژی جومعە : [ناو،ت]ناو نوێژی هەینی کە

زیاتر له مزگەوتی جامێعەی هەر شارێ لە پشت پێشنوێژەوە دەکرێ. (نمازجمعه)
نوێژی شێوان : [ناو،ت] چوار رکاتی ئاخری نوێژی شەو؛ نوێژی خەوتنان. (نمازعشا)
نویسەی : [چاوگە] نووسین؛ نڤیسین؛ نوویسان. (نوشتن)
نەبانی : [ناو] ناسازگاری؛ ناکۆکی؛ زویری. (ناسازگاری؛ بدخلقی)
نەبڕاوە : (١)[داهاتووی نە بڕین]هێشتا نە- بڕدراوە؛ بە مشار نەبڕاوەتەوە. (هنوزبریده- نشده). (٢)[ئاوەڵناو]لەبڕان نەهاتوو؛ دەوام دار. (خاتمەنیافته)(٣) لەت نەکراو، ساخ.(قطع نشده)
نەبهیستی : [ئاوەڵناو] نەبیسراو؛ نەبیستوو. (شنیدەنشده؛نشنیده)
نەپسێن : [ئاوەڵناو] نەپچڕ؛ (ب)تاڵی قاییم و خۆراگر کە درەنگ بپچڕێ. (غیر قابل‌قطع شدن)
نەپوختە : [ئاوەڵناو] (١) لەکار دەرنەهاتوو؛ ڕانەهاتوو؛ ساف‌وسادە؛ بێ‌ئەزموون؛ جێ نە- کەوتوو؛ لەکڵ دەرنەهاتوو؛ کار نەزان؛ (٢)نە کوڵیو. (١و٢.ناپخته)+
نەپەتی : [ئاوەڵناو] بێهۆش؛ بەرزە؛ نادیار؛ پە- سیو. (بیهوش.گم)
نەترانـدن : تەسکین دان؛ دلداری پێدان؛ ئارامکردن. (تسکین‌دادن)+
نەترسان : وێران؛ نەترسیان؛ بێ‌پەروایی؛ بێ- هەراسی. (نترسیدن)
نەترسە : (١)بوێرە؛ بەزاتە؛ بەجورئەتە. (- شجاع‌است). (٢) مەترسە؛ ترست نەبێت. (پروانکن)
نەترین: [چاوگە،ت] ئارام بوون؛ ئۆقرە گرتن. (آرام‌شدن)
نەتەویست : [ئاوەڵناو+ ناو] دڵ نەخواز؛ دوژمن. (دشمن)
نەجەخ : [ناو] بێور؛ تەوری چکۆلە. (تبرزین)
نەختەک : [بەند] نەختێک؛ کەمێک؛ توزێک. (کمی)
نەخشکار : [ناو،بک] ئەوەی کاری نەخشاندنە. (نقش‌کننده)
نەخڵ : [ناو] دار خورما. (نخل)
نەخوازە : [بەند] بۆ کەس درێغیم نییە نەخوازە بۆ تو؛ نەخاسما؛ بەتایبەت؛ خاسما. (مخصوصا)
نەخۆشەر : [ناو] لەپە. (لپه)
نەخۆشین داری: [ناو](١) پەرەستاری و ئاگالێبوونی نەخۆش. ( ٢) کەسێک کە لە ماڵدا نەخۆشی هەبێ وئاگای لێ‌بێت. (بیمار داری).
نەخۆشینی ئۆرژانسی: نەخۆشی لە مەترسیەوە نزیک کە بێ‌نۆبەگرتن لە نەخۆش‌خانە، دەبێ دوکتور بگاتە سەری. (بیمار اورژانسی)
نەخۆشینی‌خەو:چەشنێ نەخۆشین‌کە بە هۆی پێوەدانی مێشوولەی (تسەتسە) ئینسان تووشی دەبێ. (مرض خواب)
نەخۆشینی قەند: [ناو] شەکەرمز؛ دیابێت(بیماری قند)
نەخۆشینی‌گیرۆدار: نە خۆشینێک‌کەجەماوەر لەیەکترینەوە تووشی دەبن و زوو تەشەنە دە- ستێنێ. (بیماری واگیردار)
نەخوە: [بەند] نەخۆ؛ ئەینا؛ ئەگینا؛ دەنا. (وگرنه)
نەدار : فد: [ئاوەڵناو+ ناو] دەستەواژەی قومار-

بازانه، مەبەست لە دوو نەفەر لە کۆڕی قومار-بازاندا کە لەیەک پارە وەرناگرن. (ندار)+
نەداری : [ناو] حاڵەتی نەدار بوون لە قومـاردا؛ فەقیری.(نداری؛ بینوایی)+
نەدەرووم : نەمدا؛ نەدەرووم وەباد :نەمدا بە بـا. (ندادم)
نەدیتۆک : [ئاوەڵناو] نەدیتوو؛ نەدیو بدیو؛ تازە پیاکەفتگ. (ندیدبدید)
نەدیتی : [ئـاوەڵنـاو] نـەدیتـوو؛ نـەدیوبـدی. (ندیده؛ ندیدبدید)
نەدیر : [ئاوەڵناو] نەدار؛ نەدیرم : نەیرم : نیمە، نەدیرێت : نەیرێت : نیەتی، هەروەها نەیری : نەیریت : نیتە، نەدیرن : نەیرن : نیانە. (ندار)
نەڕاست : [ئاوەڵناو] (١)درۆ. (دروغ). (٢)کـەچ؛ خوار؛ لار. (کج)
نەڕاوەستایی : [ئاوەڵناو]  خۆڕانەگر؛ نەحەجماو؛ بزۆز؛ بیٚ ئۆقرە؛ بیٚئارام. (ناآرام)
نەڕمادە : [ئاوەڵناو]  پیتی(د)لە زۆرجـیٚ نایێتـە گوتن و دەسێـورێت، واتا نـە نێـر نـە مێـوی گامیش و وشتر. (نەنرونەمادەگاومیش‌وشتر)
نەرمگۆ : [ئاوەڵنـاو]  زمـان‌خـۆش؛ نـەرمبێـژ. (شیرین‌زبان)
نەرمە خوناف : [ناو،ت] نـەرمـە بـاران؛ پـروو شەی باران. (باران‌اندک)
نەرمەڕان : [ناو] نەرمایی ڕان؛ شلکەڕان؛ نـە-رمەڕانی(شلکەڕان)ی بگوشم بۆنی لە سـینە و مەم کەم. «هێمن». (نرمەران)
نەرمەساو : [ناو] تیژ کردنی تێخ بـە هـەسـان یان شتی ساف دژی زبرە ساو کە بە بڕبەندی تایبەتی ئاسن یان زبرە دەکرێـت (تیزکـردن-تیغ‌بافسان یاشیئی‌صاف)+
نەرمەنایە : [ناو،ت] ئامێرێکی مۆسیقایە بە فوو لێدەدرێ. (نوعی‌نی)
نەرمیلیٚ : > پێچە
نەڕنای : [چاوگە] نەڕاندن؛ نەعـرەتـە پێکـان؛ ئەڕنین. (نعرەزدن)
نـەرە : [نـاو] بـەلـوو؛ بـەڕوو؛ (ب)مـازگ دار؛ دارگەزۆ. (گزعلفی.بلوط)
نەریت : [ناو] داب و دەستوور و  ڕەسـمی بـاو لە کۆمەڵگادا. (رسم‌ورسوم)+
نەڕێک : [ئاوەڵناو] (١) ناڕێک؛ ناڕاسـت؛ چـە-وت؛ لار. (ناصاف.کج). (٢)نادروسـت؛ ناتـەبـا. (نادرست)
نەریمان : باوکی سامی جەددی ڕۆستەم؛ نـاوە بۆ پیاوان. (نریمان)
نەزاکەت : > نزاکەت.
نەزرونیاز : [ناو،ت] بەڵێنی ماڵ و سـامان بـە-خشینەوە پێشەکی یان بەمەرجی بە دیهـاتنی ئاواتێک. (نذرونیاز)
نەزری : [ئاوەڵنـاو+ بـەنـد] مـاڵ و سـامان و خۆراکێک کە بە هۆی بە دیهاتنی ئاواتێک بە نـاو خـەڵکـدا بڵـاو دەبێتـەوە یـان بـە نیـازی خێروخێراتەوە دەبەخشرێتەوە یان دانـراوە بـۆ بەخشینەوە. (نذری)
نەژناس : [ئاوەڵناو] ناس‌نەکری؛ نەناس؛ نـە-ناسراو؛ نائاشنا؛ ناشناس. (ناشناس)
نـەسـارا : [نـاو] مـەسـیحی؛ مـەسـیحیگەل. (مسیحیان)
نەساز : [ئاوەڵناو] ئـەوەی ناسـازیٚ و لـەگـەڵ کەسن ناحەوێتەوە. (ناسازگار)
نەستووری : [ناو] لقیٚ لە ئایینی مەسـیحیەت. (نسطوری)

نەسرانی : [ئاوەڵناو] شوێنکەوتوانی عیسا مەسیح؛ مترانی. (عیسوی)
نەسک : [ناو] نیسک؛ نووژی؛ نوژوو؛ نـوژوی؛ نژی، نژوو؛ مژوی؛ مەرجو؛ مـەرجـی؛ نسـک؛ میژوی؛ مەرژی. (عدس)
نەسک : [ناو] هەریەک لە ٢١ بەشی ئاویسـتا. ( هریک‌از٢١ باب اوستا)
نەسۆز : [ئاوەڵناو] نەسووچ؛ نەسۆز. (نسوز)
نەشکەن : [ئاوەڵنـاو] وشـە فارسـییە، بـەڵـام ناوی جۆرێک شووشەیە کە درەنگ دەشکێ و بەرگەگرترە. (نشکن)
نەشمیل : خونجیلانە و نەرمـو نـۆڵ؛ جـوان و کورتە باڵا. (کوتاه اندام خوش قیافه)
نەشنەفتن : (١)نەبیستن؛ گـوێ لـێ‌نـەبـوون. (نشنیدن). (٢)گوێ بە قسە نەدان؛ گـوێ لـێ خەواندن. (گوش‌ندادن).(٣)کەڕی. (کری)
نەشنەفتەن : نـەی‌بیسـتووە؛ گـوێی نـەداوە- تێ؛گوێی لێنەبووە. (نشنیده)
نەشیف : [ئاوەڵناو] نشێو؛ سەرەوژێـر؛ سـەرە- ولێژ؛ لێژ؛ سەرەوخوار. (سراشیب)
نەعنـاداخ : [نـاو،ت] نـەعنـای لـە نێـو ڕۆنـدا سوورەوە بوو بۆ سەر هەندێ خۆراک. (نعناداغ)
نەغمە : > میزراب.+
نەغمە : [ناو] ئاواز؛ ئەی موتیریبی حەریفان دەست‌کەن بە نـەغمـە خـوانی. «تـامیر تـەوفیـق». (نغمه)+
نەفتک : [ناو] نـەفتیـک؛ شـقارتە؛ شـەمچـە؛ کمریت؛ گۆرد. (کبریت)
نەفتە ڕەشە : [ناو،ت] مازووت؛ نەوتە سـیاوێ؛ ناوی گەڕەکێکە لە شاری سـنە. (نفـت‌سـیاه؛ نام‌محله‌ای‌درسنندج)
نەفتی : [ئاوەڵناو] هەرکەرەستەیێک بە نەوت کار بکات. (نفتی)
نەفتی‌گاز : [ناو،ت]گازوییل؛ سووختی هەندی ماشینیٚ دیزل. (گازوئیل)
نەفسـکە : [ئـاوەڵنـاو] نـەفسـەک؛ نـەوسـن؛ چڵیس؛ سکەڕۆ. (شکمو؛ شکم‌پرست)
نەڤجار : [ناو] نەوە. (نوه)
نەقارە : [ناو]کاسەی چووکەی تار. (نقاره)+
نەقۆ : [بەند] نهۆ؛ نهو؛ نووکە؛ ئێستا؛ ئـەلعـان. (حالا)
نەگەڕ : [ئاوەڵناو] بێ‌جووڵە و تەکـان و خـول خـواردن؛ بـێ‌ڕەویـن و زڤڕیـان. (سـاکن‌و- بیحرکت)
نەماگ : [ئاوەڵنـاو+ ناو،بـەر] نـەمـاو؛ لـەبـین چووگ؛ فەوتاو؛ لە ناوچووگ. (نمانده؛ ازبـین- رفته)
نەمانەوە : (١) لە جێگایێک نیشتەجێ نەبوون و گل نەخواردنەوە. (نماندن‌درجـایی). (٢) لـە کەسێک کەمتر نەبوون؛ بەجێ نەمـان؛ کـەم نەهێنان؛ تۆ لە کەس نامێنیەوە : تۆ لە کـەس کەمتر نیت. (کم‌آوردن)
نەماو : > نەماگ.
نەمری : (١)[ناو] زیندوویی؛ ڕەوتی هـەرمـان. (مرگ‌ناپذیر). (٢) هەربژیت و نەمری: مردنـت لێ دووربێت؛ نەمریت. (زنده‌باشی؛ نمیری)
نەنێ : [ناو](١) دایە گەورە؛ نازناوێک بۆ ژنـی زۆر پیر و داپیـر. (٢)زۆر ژنـی مانگـادۆش بـە مانگا دەڵێن، بەتایبەت لەکاتی دۆشـیندا، وەک لاواندنەوە (١و٢.ننه)
نهۆ : [بەند] ئیستە؛ ئیسە؛ ئەلعان؛ نهە؛ نووکە. (حالا)

نەواڕیای : نەگوڕان. (عوض‌نشدن)
نەوانخانە : [ناو] بی‌ئەنواخانە؛ هەژارخانە؛ جێگای بەخێوکردن و مانەوەی هەژاران و فەقیران. (نوانخانه)
نەوتکێش : [ناو]کەرەستەی ڕاگوێزانی نەفت؛ وەک پاپۆڕ و تریلیی نەوتکێش. (نفتکش)
نەوتی سپی : [ناو](ب)نەوتی سووتاندن؛ نەوتی چرا. (نفت‌سفید)
نەوراتن : هەویر هەڵنەهاتن. (ورنیامدن‌خمیر)
نەوساز : [ئاوەڵناو] تازە دروست‌کراو؛ نوێ‌ساز؛ خانووەکەم نۆسازە یان نەوسازە : تازە سازە. (نوساز)
نەوسازی : [ناو] تازەکردنەوە؛نوێکردنەوە؛ چاک‌کردنەوەی خراپی؛ ئاوەدان‌کردنەوە. (نوسازی)
نەوسی : [ناو] زڕمنداڵ. (ناپسری‌ونادختری)
نەوەڕە : (١)گوندێکە نزیکی شاری سنە. (اسم‌دهی‌است). (٢)مەوەڕە؛ چەقەمەکە. (عوعونکن؛ ورنزن)(٣) ناوەڕێت (پارس نمیکند)
نەوەزی : نەی‌خەیتە؛ تی‌نەهاوێیت؛ نەی‌خەیە؛ نەی‌خەی. (نیاندازی)
نەوەکام : [ئاوەڵناو] کامڵ نەبووگ؛ نەگەییو؛ خۆ نەگرتوو؛ وەک بەرخێ کە لە پێش کاتی خۆیدا لە دایک ببێت؛ تووی خرچە هێشتا نەوەکامە. (ناکامل)
نەوەندە : [ ناو] ڕەپستەی درەنگ چێزاو. (آبستەوبساردەدیر کاشتەشدە)
نەویم : (١)نەبووم؛ نەووم. (نبودم). (٢) لی‌نەویم بۆم بەرزەوەنەبوو؛ گوشار بۆ بەرز کردنەوەی شتێک. (فشاربرای‌بلندکردن) (چیزی)(٣) لەخوارەوەم؛ بەرزنیم. (درپائینم)
نەوینوون : نەبینم. (نبینم)
نەهیڤیکری : چاوەڕوان نەکراو؛ دوور لە هیوا. (دورازانتظار)
نەهێشتن : (١) ڕێگە نەدان. (نگذاشتن). (٢) لەبین بردن و نەهێلان؛ لە ناو بردن. (ازبین‌بردن)
نەهێڵ : [ناو،بک] نەهێژ؛ بەرگر؛ کەسێک کە نایێڵێ و بەرگری دەکا. (مانع؛ جلوگیر)
نەی لێدان : شمشاڵ ژەندن. (نی‌نواختن)
نەیچە شەکەر :[ناو] نەیچە شەکەر. > لەلە
نیا : (١)پاشکر لەچاوگەی (نیان، دانیان: دانان) بەواتای چاندن؛ دەسنیا. (٢)لە (نگاه)ی فارسیەوە هاتووەتە کورتکردن بەواتای ڕوانین. تماشا. (نگاه)+
نیاگیە : بهوریی نیان. > نیای
نیانگر : [ئاوەڵناو] نەهێنگر؛ نەهێندڕ؛ یانی‌گر؛ نیانیگر؛ سەگێ کە لە پاشەوە بە نەهێنی دێ و لە پڕ گاز دەگرێ. یانیگر. (سگی‌کەدزدکی وبی سروصداحملەمی‌کند)
نیانەوە : نانەوە؛ دروستکردن(ماڵ‌نیانەوە)، تەون نیانەوە : تەون هەڵخستن؛ ئاژاوە نیانەوە : ئاژاوە نانەوە.(برپاکردن.دایرکردن)
نیانەوە: نانەوە؛ دیاریکردن؛ لەبەرچاوگرتن؛ نیانەوەی جێگایێک بۆ دزی یان کردنی کارێکی تر.(زیرسرداشتن؛ درنظرگرفتن)
نیانی : [ئاوەڵناو+ بەند] شاراوە؛ پەنامەکی؛ لە (نهان)ی فارسیەوە هاتوو. (نهانی)
نیانیگر : > نیانگر
نیای : [ڕابوردووی چاوگەی نیان](١)نای؛ چەقاندی. (کاشت). (٢)دای‌نیا: داینا، نیایە ئە-

گره : دایناێره. (گذاشت)
نیپتۆن . (١) ناوی ئەستێرەیێکە. (٢) ناوی خودای زەریا لە یۆنانی قەدیمدا. (نپتون)
نیترۆگلیسرین : [ناو] تەقەمەنییێکی زۆر بەهێزە. (نیتروگلیسرین)
نێر : [ئاوەڵناو] لە مۆسیقیدا بە دەنگی بۆڕی گۆرانیبێژ دەگوترێ؛ باس؛ گڕ؛ بەم. (صدای- بمخواننده)+
نێرگزەکردن : [چاوگە،ت] نژدەکردن؛ بڕینی بەقەرا دوو قامک لە سەری کلکی جوانوو بۆ ئەوەی چاک کلک بگرێ. (قطعدوسانت از- دمکرەاسب)
نێرنژەن : [ناو] داردۆژەنگ؛ دارێک کە دەچێ بەناو هەردوو لۆلەپی مەشکەدا. (چوبمیانە دودسته مشک)
نێرۆک : [ناو] گیای زەرداوبەر؛ باوەشێنەگیا. (سرخسنر)
نێرومێ : [ناو،ت] دەستەواژی دارتاشییە؛ واتا کانەوزبانە؛ دوو تەختە کە یەکێکیان دەچی بە ناو یەکیکی دیکەدا. (نرومادە)+
نێروو : [ئاوەڵناو]کاتی جووتخوازیی پشیلەی مێو. (گربەمول)+
نێرەژەن : [ناو] داری بەینی دوو لۆلەپ لە مەشکەدا؛ دار دۆ ژەنگ؛ مەترەقی پیاوی پێ دەشوبهێنن. نێرەنژەن. (چوببیندودستە- مشک)
نەیڕڤان : [ناو] نێڕڤان؛ چاودێر. (نگهبان)
نێرەمۆ : (١) [ئاوەڵناو] نێرە مووک. (نەنرنە- مادە؛ ) (٢)[ناو] پەیوەندی ڕووەک؛ موتوربە؛ موتربە؛ کاری تاماندن. (پیوند)
نێرەمۆی ئەندام : [ناو،ت] پەیوەندی ئەندامی لەش وەک گورچیلە و دڵ و جەرگ. (پیوند اعضا)
نێرەنان : [ناو،ت] تیرەنان؛ تیرۆک؛ وەردێنە؛ داری نان پانکردن لەسەر پنەکە. (نورد)
نیڕەنیڕ : [ناو،ت]قیژەقیڕ و هاوارهاوار؛ نەڕاندنی زۆر. (داد زدن زیاد)
نێرەهەر : [ناو،ت] نێرەکەر؛ کەرینێر. (نرەخر)
نێری : [ناو](١)بارودوخی نێر بوون. (نری) (٢) نێرەی بزن. (شاک؛ تکە)
نێژان : نێژتن؛ چەقاندنی نەمام؛ ژێر خاککردن؛ بەخاک سپاردنی مردوو. (دفن- کردن؛ نشازدن)
نیسکەشۆر : [ناو،ت]نیسک شۆردنەوە بە دوو کاسە بۆ جیابوونەوەی زیخ، لەو کاسەوە بۆ ئەو کاسە گویستنەوە؛(ب)هاتوچۆی زۆر. (شستن- عدس؛ بروبیاکردن)
نیشان : پاشگر بەواتای لەسەر دانراو و لەسەر چەسپ کراوی عەلامەت؛ نیشانە کراو؛ وەک: سەدەف نیشان، گەوهەرنیشان؛ دەست نیشان. (نشان)+
نیشانە ئەنگێو : [ناو،بک] لە ئامانجدەر؛ ئامانج ئەنگێو. (کسیکە بە هدف میزند)
نیشتن : [چاوگە](١) لە یاریی ڕامیدا دانانە عەرزی کۆمەڵێک لە کارتەکانە. (٢) گێلە نەهێنان و وەگەرخستنەوەی مۆرەی کوژراو لە نەردێندا. (١و٢.نشستن)+
نیشتن : [چاوگە] داچوون؛ ڕوچوون؛ قوپانی سەربان. (نشست)
نیشتنەوە : (١)لە گەڕکەوتنی با؛ باکەی نیشتەوە؛ نیشتنەوەی با. (فروکش- کردن)(٢)دوای هەڵفڕین هاتنە سەر عەرزی

فڕنده و فڕۆکه. (نشستن‌پرنده)+
نیڤەتۆڤ : [ناو] نیوەتوو؛ ڕنینەوەی دەغڵ بـە-مزێک، بەرانبەر بە نیوەی تووی وەشاوی دە-غڵەکە. (دروکـردن‌غـلات‌درمقابـل دریافـت-کردن‌نصف‌تخم‌پاشیده‌شده)
نیڤەڕۆژە :[ناو] فراقێن؛ نەهار؛ نیوەڕۆژە؛ نـانی نیمەڕۆ. (نهار)
نیکۆتین : [ناو] ماکێکە لە ناو ژەحری سیغاردا؛ ماکێ لە ناو تـووتن و دووکـەڵـی تـەمـاکودا. (نیکوتین)
نیگارستان : [ناو] جێگای وێنەگەری یان هە-ڵواسین یان دانانی وێنەگەل؛گالێری؛ گەلێری. (نگارستان)
نیگارگەر : [ناو،بک] وێنەکیش. (نقاش)
نیل : > کەوەگیا.
نێڵ : [ناو] نیل؛ نیر؛ ئارق و نێڵ : ئاموور و نیر. (یوغ)
نێڵەنێڵ : [ناو،ت] حاڵەتی گـڕی بـە تـەوژم و تینی ئاگر. (زبانه‌بلندآتش؛ حرارت‌زیادبخاری)
نـیم پـەردە :[نـاو،ت] نیوپـەردە نیوپـەردە لـە مۆسیقادا لە بەینی دوو نۆتی سەرەکیدا نیوەی پەردەیێک. (نیم‌پرده)
نیمڕوو : [ناو،ت] کـۆژی‌وێنـە کێشـییە، نـیم-ڕوخسار؛ وێنەی نیوەی سەروچاو واتا لـە تـە-نیشتەوە. (نیمرخ)
نیمساڵ : [ناو،ت] نیـوەیـێ لـەسـاڵ؛ شـەش مانگ؛ (ب)نیو ساڵی خوێندن؛ نیو تێڕمی یـە-کساڵە یان تێڕمێکی شەش مانگە. (نیمسال
نیمگرد : [ناو] کۆژی مۆسیقایە، نیوەی یەکە-ی کات لە نۆت نووسیندا، بەرانبـەر بـە یـەک سپی یان چوار چەنگ. (نیم‌گرد)
نیمەیی: [ناو] نیوەیی؛ (ب) لە نێوەڕاستدا شـە-ریک بوون؛ نیوەیی بووە : گەیشتووەتـە نیـوە.
(۵۰٪ .نصف؛ نیمه)
نینۆڕ : [ناو]گیاییێکی دوو ساڵەیـە، گـەڵاکـەی ماکێکی سڕکەری تێدایە بە ناوی(لـۆڕێن)کـە دەبێتە هۆی سەرگێـژ بـوون؛ دژی پـەنمـانی گورچیلەیە. (کرفس‌عطری)
نیوئاڵقە : [ناو] نیوجەغز؛ لەتێک لە جـەغـزیێ؛ نیوەی‌جەغزیێ. (نیمدایره)
نیـواونیـو : (ب)بـەشـکردن لـە نێـوەڕاسـتدا؛ دووکوتی بەرانبەر و بەقەرایەک. (نیم‌ونیم)
نێوبڕ : [بەند+ ناو] لە ریزێک چـەنـد دانـە بـە حیساب نەهێنان؛ بە جێ هێشـتنی ناوبـەنـاو؛ بەینابەین بەجێ‌هێشتن؛ مەودا بە مەودا. (چند، یا یک‌درمیان)+
نێوبەدەرەوە : [ئاوەڵناو]ناودار؛ مەنشوور؛ ناسراو لە جەماوەردا؛ بەنێوبانگ. (مشهور)
نێوچاوان : [ناو،ت] توێڵ؛ تەوێڵ. (ب)بەخت و شانس. (پیشانی؛ بخت‌واقبال)
نێوچاوانە : [ناو،ت] لەناوەڕاستی شتێکدا؛ ناوە-ند؛ لە کوردستانی باشوور سەنتەر بـەکـاردێنن کە لە سێنتێری ئینگلیزی وە ها تووە. (مرکز)
نێوڕان : [ناو،ت] ناومەڕ؛ نـاو گـەلـەی پـەز؛ د چمە نێو ڕان؛ دەچمە ناو مێگەل. (میان‌گله)+
نێوقەد :[ناو]بەینـی نووچکـەی‌کێـو و دامـێن؛ کەمەر؛ ناتلەنگ؛ ناوەڕاستی درێژایـی. (کمـر ؛ کمرکش؛ میان)
نێوککەوتن : [چاوگە،ت](۱)نـاوک کـەوتـن؛ جۆرێک نەخۆشین بە ئیشی ناوزگەوە. (نـاف-افتادن). (۲) (ب)ترسان و داچڵەکـانی بـە تـە وژم. (شکه‌شدن)
نێوکەڕەشە : [ناو] برینی سەرپشتی یەکسم بە هۆی باری ڕەق یان گرتنی زین و کورتانـەوە. (زخم‌پشت‌اسب‌والاغ)
نێوگایی : [ناو] (گـا) واتـا (جێگـا)، نێـوجێیـی؛

ناوبژی. (میانجیگری)
نێولێنان : [چاوگە،ت] ناو لەسەر دانان؛ نێونان. (اسم‌گذاری)
نیوە: [ناو+پێشگر]کوتێکی تەواو؛ نیوەشەو؛ نیوەڕۆ؛ پێشگر واتا بەشێ، نیوەشۆر. (نیمە)
نیوە : پێشگر بەواتای کوتێ یان بەشێ؛ وەک نیوەشەو، نیوەکوڵ، نیوە ڕزیو؛ نیوە کوتراو. (نیمە)
نیوە پەردە : <نیم پەردە.
نیوە دوورگە : [ناو،ت] جێگایێک لە وشکی کە سێ کەناری ئاوبێت و لایێکی چەسپابێت بە وشکانیەوە. (شبەجزیرە)
نیوەکارە : [ئاوەڵناو+ بەند]نیوەوناتەواو؛ کارێ کە هێشتا تەواو نەبووە. (نیمەکارە)
نیوەکاری : [ناو]ڕەوتی کاری نیوەکار؛ ڕە-نجبەرێک کە بەشێک لە دوو بەشی بەهرە و داهات دەبات. (٥٠ ٪دربهرەشریک‌شدن-کارگر)
نیوەگۆ : [ناو،ت]کوتێکی تەواو لە شتێکی خڕ. (نیمکرە)
نیوەگۆی باشووری : [ناو،ت] نیوەگۆی زەوی لە هێڵی ئیستیواوە بەرە و باشوور.(بەرەو خوار). (نیمکرەجنوبی)
نیوەگۆی باکوری : [ناو،ت] نیوەی گۆی زەوی لە هێڵی ئیستیواوە بەرە و باکور.(بەرەو ژوور). (نیمکرەشمالی)
نیوەگیان : [ئاوەڵناو] لە نێوان مان و نەماندا؛ نەخۆشی نزیک بە مردن. (نیمەجان)
نێوەنێوە : [بەند] جارجارە؛ ناوبەناو؛ بەینابەین. (گاهگاە)
نیوەوناتەواو : [ئاوەڵناو]کارێ کە نیوەکارە مابێتەوە. (نصف ونیمەکارە)
نیوەونیوە: [بەند] لەناوەڕاستدا؛ وەک لە ناوە-ڕاستدا بەشکردن. (نصف و نصف؛ قسمت-کردن)
نێوەوە : ژوورەوە؛ ناوەوە. (توی؛داخل)
نییە : [ناو] توونە؛ دژی هەیە. (نیست)
نییەزانم : نازانم؛ نزانم؛ چووزانم؛ چزانم؛ چازانم. (نمی‌دانم)
نییەسی : نییەتی؛ لەڕابووردوودا ئەو وشەیە زۆر لە سەقز بەکار دەبرا بەڵام ئێستا لە سنە لە بری(تی)هەر(سی) دەوتری و باوە وەک: هە-یەسی، کوشتگیەسی. (ندارد)<سی

## پیتی (ن) بەشی وشەی بیانی

ناتۆڕالیست : فد؛ فرد: سروشت‌خواز؛ هۆگری شروشت بەتایبەت لە نیگارکێشیدا. (ناتورالیست)
ناتۆڕالیسم . فرد؛ فد: ڕێبازێکی هونەری نیکارکێشییە، کە شوێکرانی هۆگری سروشتن. (ناتورالیسم)
نارسیزیسم : فد؛ فرد؛ اند؛ تد: نەخۆشی خۆ بەزیاتر لەدیتران زانین و خۆ پەسەندی و خۆویستی. (نارسیزیسم)
نازیسم : فرد؛ فد؛ اند: ئامۆژەیێکی ڕامیاری

عەسکەری و کۆمەڵایەتی کە لە ئاڵمانیا پێکهات و لە سەربنەمای ڕەگەز پە رستی و تاکە حیزبی دامەزرا. (نازیسم)
ناسیۆنالیست : فرد؛ فد؛ اند: نەتەوەخواز؛ باوە- ڕمەند بە هۆز و نەتەوەی خۆ. (ناسیونالیست)
ناسیونالیسم : فرد؛ فد؛ اند: نەتەوەخوازی؛ بڕوای لە ئەندازەبەدەر بە هۆز و نەتەوەی خۆ. (ناسیونالیسم)
ناشایستە : [ئاوەڵناو] (١)نالایەق؛ ژیێنەهاتی؛ نەشیاو. (ناشایست). (٢) ناشایست؛ ناپەسەند؛ بەد؛ کرێت. (ناشایست)+
نشینی : پاشگر بەواتای دانیشتن و مانەوە؛ شارنشینی؛ گوندنشینی. (نشینی)
نوختەچین : ناوی جۆرێک نیگارکێشییە بە خاڵی(پڕو لە پەنای یەک و جارنا خاڵی بڵاوبڵاو). (نقطەچین)
نوشوست : [ناو] ڕۆچوون؛ بەچاڵدا چوون و قوپان و نیشتنی سەربان و عەرز؛ سەربانەکە نوشوستی‌کردووە؛ داچووە؛ ڕۆچووە. (نشست)
نەستەعلیق : عد؛ فد: [ناو] ناوی جۆرێک نووسینە، زیاتر بە قەڵەم قامیش دەنووسرێ و زۆر پەسەندە. (نستعلیق)
نەسخ : عد؛ فد: ناوی شیوە نووسینێکی وڵاتە ئیسلامییەکانە. (نسخ)
نیئۆپان : [ناو] تەختەی دەستکرد، لە بڕەدار و چەسپ. (نئوپان)
نێسکافە : [ناو] جۆرێک قاوەی هاڕاوە کە حەوجەی بە دمکردن و کوڵاندن نییە و لە ئاوی کوڵاتوو دەکرێت. (نسکافە)

# هـ

**هاتومەگا** : [ناو] مەیخانە. (میخانە)
**هاتنەدەست** : [چاوگە،ت] (١) پارە هاتنە دەست: وەدەست کەوتن. (بدست‌آمدن). (٢)دەستکردنەوە و بەرەنگار بوونەوە؛ کوڕەکان‌هاتنە دەست و شەڕێکی باشیان کرد. (دفاع‌کردن) (٣) فێربوون و شیاوی و شارەزایی بۆ ئەنجامی کارێک؛ ڕەوشتی کار هاتنەدەست. (خبره شدن در کاری)
**هاتنەسەربەڕە** : [ناو،ت] بۆ داوخوازێ چوونە ماڵی کەسێ، زیاتر بۆ خواز بێنی ژن وکچ. (خواستگاری)
**هاتنەسەرچۆک** : [چاوگە،ت] هەڵسانە سەر چۆک بۆ وەڵام دانەوە زیاتر وەڵام دانەوە بە توندوتیژی. (روی‌زانوبلندشدن‌برای‌جواب دادن)+
**هاتنە قەوام** : خۆ گرتنی چێشت یا خۆراکی تراو کە بە کوڵاندن دێتە ڕادەی دیاریکراوی ئامادە بوون. (قوام‌آمدن)
**هاتنە کوشتن** : [چاوگە،ت]کوژران؛ کوژیان. (کشته شدن؛کشته‌شدند)
**هاتنە کەوان** : [چاوگە،ت] نزیک بوونەوە تاتیرەڕەس؛ (ب)ڕازیبوون؛ هاتنە سەربار؛ مەیل‌دان، ئەگەر مەیلت لە سەرە بەڕاستی وەرە کە وان. «فۆلکلۆر». (براه‌آمدن)
**هاڕای** : [چاوگە] هاڕین؛ وردکردن. (خرد- کردن)

**هارپ** : فرد؛ اند؛ فد: [ناو] ئامێرێکی مۆسیقایە وەک چەنگ وایە و بەقامک دە- ژەندرێ. (هارپ)
**هارژنگ** : [ناو] تەنگز؛ چاڵووک. (سفیدخار؛ نوعی‌خاربرای‌پرچین‌روی‌دیوار)
**هارس** : [ناو] تاوان؛ گوناح؛ سووچ. (گناه)
**هارمۆنیکا** :[ناو] ئامێرکی مۆسیقایە بە فوو لێدەدرێت. (هارمونیکا)
**هارمۆنیۆم** : [ناو] ئامێریکی مۆسیقایە بە فوو لێدە درێ. (هارمونیوم)
**هاروژاندن** :[چاوگە،ت] شێواندن؛ ئاڵۆزاندن؛ هورووژاندن وەک ئاڵۆزاندنی شارە هەنگەژاڵە. (آشفته‌کردن)
**هارەبڕ** : [ناو،بک]بەردی دەستاڕ و ئاش چێکەر؛ وەستای هارە دروستکەر.(تراشندە سنگ‌آسیا)
**هازی** : [بەرهەمی‌چاوگە] توانایی؛ بەتاقە- تی؛ بەهێزی. (توانایی)
**هاژیلە** : [ناو]حاجیلە؛ حاجێڵە؛ کووژەکەی چووک؛ قاوخی هەندێ زیندەوەری دە- ریایی وەک شەیتانۆکەی چووک. (پوستە نوعی حیوانات دریایی)
**هاس** : [ناو] ڕەنگی قاوەیی ئاچخ بە پەڵە- ی وردی ڕەشەوە. (رنگ‌قهویی‌باخال‌های- سیاه)
**هاسر** : [ناو] کاتژمێر؛ دەمژمێر؛ سەعات.

(ساعت)
هاسرساز :[ناو،ت] سەعەتساز؛ کاتژمێر-چێکەرەوە. (ساعتساز)
هاشاوڵ : [ناو] حاشاوڵ؛ هێرش؛ بەشەڕەوە بۆ چوون و پەلاماردان. (حمله)
هاڤیتی : (١)فڕێدراو. (پرتشده). (٢)فڕێیدا؛ خستی؛ هاویشتی؛ هاوێشتی (انداخت)
هاکوو : [بەند] هاتوو؛ لەوانەیە؛ نزیکە؛ تەقاو؛ ڕەنگە؛ هاکوو گەیشتە ئێرە : هاتوو گەیشتە ئێرە. (ممکن‌است؛ بەزودی
هاکی : اند؛ فد؛ فرد؛ هێندد: [ناو] یارییێکە وەک تۆپی پێ؛ بەڵام بە گۆچانێکی تایبەت لە تۆپ دەدرێ دوو جۆری هەیە لە سەر عەرز و لە سەر سەهۆڵ. (هاکی)
هاڵاو : (١) [ناو،بک+ناو،بەر]تێوە پێچراو؛ لەپام هاڵاوە : لە پام ئاڵاوە. (پیچیدەشدە). (٢)[ناو] هوڕمی گەرمی ئاور؛ (هاڵاوی خۆشترە لە پڵاوی) (گرمای آتش). (٣)[ناو] چێشتێکی مزری قۆرە تێکراوە، تایبەت بە ناوچەی سنەیە. (نوعی‌غذا با - غوره)
هالای : > هەلای
هاڵتێر : فرد؛ فد؛ اند: [ناو] میلەیێک لە پۆڵا کە لە هەر دوو سەرەوە سەنگی تایبەتی دەخرێتە سەر بۆ بەرز کردنەوە و وەرزش کردن و کێبەرکێ. (هالتر)
هالۆلک : جەژنانە. (عیدی)
هالەکوێ : لەکوێیە؛ هەروها، (های لە-کوێ و هان لە کوێ). (کجاست)
هالەینە : لەوێیە؛ ئەوەتا لەوێ؛ لەوێندە-ڕێیە؛ لەوێنەیە. (آنجاست)
هام‌لفە: (١)[ئاوەڵناو] هاولف؛ هاوجووت؛ هاوشان؛ لفەدووانە؛ جمک؛(٢)هاوجووتە؛ هاوشانە؛ (همتا؛دوقلو؛ همتاست)
هاموێر : [ئاوەڵناو] هاوفکر؛ هاوڕا؛ هاوبیروڕا؛ هاوباوەڕ. (همفکر)
هاندراو : [ناو،بەر] فێرکراو؛ بزوێندراو؛ دنە-دراو؛ هەژێندراو؛ (تحریک‌شدە)
هانگاڤا : [بەند] هەرئەوکاتە؛ دەستبەجێ. (فوری)
هانەهانەدای : [چاوگە،ت] هۆڕنیای؛ هاندان؛ دنەدنەدان. (تحریک‌کردن)
هاوئاست : [ئاوەڵناو] هاوتەراز؛ هاوشان. (همسطح.هم‌شان)
هاواربەدەم : (١) [ئاوەڵناو]دەم بەهاوار؛کە-سێک کە زۆر و زوو دەنگۆ دادەخا. (٢)کە-سێک کە قسە و ڕووداو لە هەر جێگا دە-گێڕێتەوە. (خبرپخش‌کن)
هاوارو‌داد : [ناو،ت] هەراوهوریا؛ قیژەقیژ. (دادوهوار)
هاواڵ‌منداڵ : [ناو،ت] پەڕەوڵ؛ ئاواڵ-منداڵ. (جفت)
هاوپایە : [ئاوەڵناو] هاوشان؛ هاوپلە؛ هاو دەرەجە. (همپایە)
هاوجا : [ناو] ژنانی دووبرا بۆ یەکتر؛ هێوروژن. (زن‌برادرشوهر)
هاوخوێن : (١)دوو یان چەند کەس کە گرووپی خوێنیان یەک جۆربێت. (هم‌گروە-خونی).(٢) هاوڕەگەز؛ هاونیژاد؛ (ب)خزم و کەس. (همخون)

هاوخەرج : [ناو]چەند کەس کە پێکەوە شت دەکڕن یا دەچنە سەفەر و هەرکەس بەشە پارەی خۆی دەدا؛ دوو یان چەند هاو مەنزڵ‌کە لە خەرجی ماڵدا شەریکن. (همخرج)

هاودڵ : [ئاوەڵناو+ ناو] هاومەڕام؛ یەک بیر. (همدل)

هاودەر : [ناو،ت] دراوسێ؛ جینار؛ جیران؛ هاوسێ؛ هاوسا؛ هامسا؛ هاوهێس. (همسایه)

هاودەورە : [ناو،ت]کەسانێک کە پێکەوە بەشدارییان کردوە لە خوێندنی بابەتێکی فەنیدا یا پێکەوە سەرباز بووگن. (همدوره)

هاوڕدانەوە : [چاوگە،ت] ئاوڕدانەوە؛ لالێکردنەوە؛ (ب)کۆمەک و ئاریکاریکردن. (مساعدت)

هاوڕەنگ : [ئاوەڵناو] لەڕەنگی یەک؛ هەڤڕەنگ؛ وێکچوویی. (همرنگ)

هاوسەرکەم : [ئاوەڵناو]کەمتر لە ئاواڵان؛ (ب)کەمدەستی؛ هەژاری؛ نەبوونی. (کمتر- ازدیگران؛بینوایی.)

هاوسەنیری : [ناو] هاوسەری؛ ژن و - مێردایەتی. (همسری)

هاوقوتابی : [ناو] دوو یا چەند کەس کە پێکەوە لە شوێنێ هاو وانە بووگن؛ هاوکە- لاس؛ هاومەدرەسە. (همدرس)

هاوکێش: [ئاوەڵناو] هاوسەنگ.(همسنگ)

هاوکێشە : [ناو] هەڤکێش؛ موعادەلە؛ ڕە- ستەیێکی دووبەشی لە ماتماتیکدا کە بە- رانبەرن. (معادله)

هاونێو : [ئاوەڵناو] هاوناو؛ چەند کەس کە ناوێکیان هەیە. (هم‌نام)

هاوواتا : [ئاوەڵناو]دوو یا چەند وشە کە مانایێکیان هەیە. (هم‌معنی)

هاوەڵ : [ناو] هاواڵ؛ دۆست؛ ڕەفیق. (دوست)

هاوەن : [ناو] هاون؛ هاونگ؛ ئاونگ. (هاون)

هاویناو : [ناو،ت] ئاودانی دەغڵ لە هەوەڵی هاویندا. (آبدادن‌کشت‌دراوایل‌تابستان)

هاویە : [ناو] چەکوچێک کە بەکارەبا یا بە ئاور گەرم دەبێت بۆ لەحیم‌کردن. (هاویه)

هایدی :تد: [بەند] هایدێ؛ وشەی هاندانە؛ زووکە؛ گورج بە؛ خێراکە؛ لە تورکی عو- سمانیشدا هەر بە وماناپەیە. (زودباش)

هایۆبیەی : [چاوگە،ت] هەڵسان لە خەو؛ وەئاگاهاتن؛ وەخەبەرهاتن. (بیدارشدن)

هتد : > هەتەد

هچکار . [ناو] هچهار؛ بیباری سوور؛ بیبەر. (فلفل‌قرمز)

هرچکی : [ئاوەڵناو]کار لێنەهاتوو؛ بێدە- سەڵات؛ ناشایست؛ نالایەق؛ نەشیاو. (نالایق)

هڕشاندن : [چاوگە،ت] ڕێتن؛ ڕژاندن؛ قڵمدانەوە (ریختن)

هرووش : [ناو] پیرخەنیلە؛ وردەساوار؛ برۆیشی ورد. (خردەبلغور)

هشکەساو : ئیشکەساو؛ (۱) [ئاوەڵناو] ئاسمانی ساماڵ و بێ هەور لەکاتی هەوا ساردیدا. (آسمان ساف دروقت یخبندان

وسرما)(٢) [ناو،ت] ساوینی تێغ و تیژ کردنی بە هەسان و زبرە بە بێ ڕۆن و چەورەسان و ئاو. (تیزکردن‌تیغ‌بدون‌چربی)
هلهلاندن : [چاوگە،ت] دڕاندن؛ کۆنەکردنی لیباس و شڕکردنی. (فرسودەکردن‌وپارەکردن)
هلهلین : > هلهلاندن
هناری : ئەوک گیران؛ قورگ گیران و قورسبوون لە بەر خەم و گریان. (گلوسنگین‌شدن‌وگرفتن)
هنگودینگ : [ناو،ت] هنگودنگ؛ شکۆ و شانازی؛ کەبکەبە و دەبدەبە؛ دەنگ‌وفەنگ. (دنگ‌وفنگ)
هۆتۆ : ئەوتۆ؛ وها؛ کارێکی وها بەرچاو؛ ئاوا. (اینطوروچنین؛ چشمگیر)+
هۆتیل : [ناو] ئۆتیل؛ میوانخانەی مۆدی ڕۆژ. (هتل)
هۆچکوچی : [ناو]کشمیش : (کشمش)
هۆدانەوە : [چاوگە،ت]گەڕاندنەوەی گاجووت لە جەمسەری گاوخاندا؛ (ب) بادانەوە و قسە گۆڕان. (برگرداندن ورزا درموقع‌شخم)
هۆرقۆڕنای : [چاوگە،ت] هەڵقوڕاندن؛ هەڵلووشین و قۆڕە لێ‌هێنان. (هورت‌کشیدن)
هۆرکزاندن : [چاوگە،ت] هەڵکزاندن. (حالت‌آتش‌زدن‌مو)
هۆرگڕاندن : [چاوگە،ت] هەڵکردنی چرا و ئاگر؛ گڕاندن؛ پێکردنی چرا و ئاگر. . (روشن‌کردن‌آتش)
هۆرتروشکنای : [چاوگە،ت] هەڵتروو شکاندن. (نشاندن‌بحالت‌چمباتمه)
هۆرتروشکیای : [چاوگە،ت]هەڵترووشکان. (چمباتمه‌زدن)
هۆرتەوبەرە : [ناو،ت] لەکاتی‌جووتکردندا بۆ خستنە سەر هێلی‌جووت بە گا جووت دەوترێ. (ب) هاتوچۆی زۆر پێکردن.(بیا و برو )+
هۆردی : [ناو] هۆردوو؛ لەشکر؛ سپا؛ (اردو)
هۆرزای : [چاوگە،] هەڵسان؛ ڕابوون؛ هەستان؛ وەخەبەرهاتن. (بیدارشدن)
هۆرشین : [چاوگە،] هەڵچوونی تراو لەسەر ئاور. (کف‌کردن‌غذاروی‌آتش)
هورمز : [ناو] گیای گۆزروان. (گیاه،گل‌گاوزبان)
هۆرمیس : [ناو] هۆرمیسک؛ فرمێسک؛ ئەسرین؛ ڕۆندک. (اشک)
هۆرمیسک : ئەسرین؛ فرمێسک. (اشک)
هۆرۆگێڵان : [چاوگە،ت] وەرگەڕاندن؛ زڤڕاندن؛ هەڵگەڕاندنەوە؛ پاچڤەکردن. (برگرداندن؛ترجمه)
هۆرە : [ناو] (١)کۆنترین ستایشی ئەهورا مەزدا بە دەنگ هەڵبڕین. (٢)پاشماوەی ڕەسمی هۆرە کە جۆرێک ئاوازە بە شێوەی خوێندن و(لاسایی کردنەوەی خوێندنی کەوە). (نوعی‌آوازکهن)
هۆرە ٢: ئەوڕۆ لە جیاتی شێعری گازە کردن و ستایش، شێعری دڵداریش ئامێتەی هۆرە بووە و لە ٢٢ شێوە ئاهەنگی هۆرەی تەمەن چوار هەزار ساڵە تەنیا ١٣ یان ماون.

هۆره گورگێ : [ناو،ت] گورگەزێ؛ باران و خۆر پێکەوه. (باران‌باریدن‌درموقعیکه‌آسمان آفتابی است)
هۆڕهۆڕه : [ناو] قوڕقوڕه؛ مەزرەقی ناو بە-تاڵ که دەنگی لێوەدێ. (مزراح‌میان‌تهی)
هۆریال: [ناو] هۆڵی‌کەر؛ کەرکوڕگ؛جاشە کەر. (کره‌خر)
هۆزەبانه : [ناو] گوێزه بانه؛ شت بەخشینە-وه و سەدەقه کردن بۆ بیستنی‌گوێ و قسه کردنـی منـداڵ و سـاغی گـوێ و زبـانی. (سوردادن‌به امیدگوش‌وزبان نـوزاد سـالم-بودن)
هۆزی :[ناو] وەرزای یەخته نەکراو؛ کەڵـی دەبه. (گاواخته‌نشده)
هۆسـه:[وتـه] هۆسـا؛ هـەروەکـوو؛ لـە-گوێن؛مینا؛ چەشن؛ وێنەی. (مانند؛همانند)
هوشترمر : [ناو] گیانلەبەرێکی زۆر زەلامـە لـه جنسـی فڕنـده، بـەڵـام هـەڵنـافڕێ. (شترمرغ)
هۆشەنگ : (۱)[ناو] منداڵ مـردوو. (بچـە-مرده). (۲) [ئاوەڵناو] زیرەک؛ زانا. (دانا)
هۆکەڵ : [ناو] بلیمەت؛ هەڵکەوته؛ پسـپۆڕ و فرەزان. (نابغه)
هۆڵ برینەوه : [چاوگە،ت] دەرهێنانی گە-مڕه له هۆڵی ماڵـات. ( جمـع آوری‌تاپالـە-فشرده شده‌از کف‌تویله)
هۆلاک : [ناو] هۆلمـان؛ هـۆترک؛ گـەدە؛ مەعده؛ ورگ؛ ئوور. (معده)
هۆلالێ : [ناو] گەون؛ گوێنی. (گون)
هۆلانکێ : [ناو] جۆلانێ؛ دێلەکانێ. (تاب-بازی)
هۆڵەوەز : [ناو]کەمکۆڵەوەز؛ کەمکۆڵەگوێز؛ توێکڵه شینەکـەی کـوێز، کـه لـه ڕەنـگ ڕێژی و ڕەنگسازیدا کەڵکی هەیه. (پوسـته سبزگردو)
هۆما : [ناو] خودا. (یزدان)
هوما : [ناو]کـەشـکه خـۆره؛ باڵنـدەیێکـی سـپییه و سـەربـاڵی ڕەشـه و گۆشـتخۆره. (هما)
هۆمان : [ناو] سەرۆکـی سـپا؛ فـەرمانـده؛ ناوی پیاوانه. (فرمانده‌سپاه.اسم‌مردانه)
هۆنراوه : [ناو،بەر] شتی وەک مـووروو بـه ڕێسمانەوه کراو. (رشته‌شـده). (۲)هـەڵبـە-ستی شێعر. (ردیف‌شده؛ سروده‌شده)
هونەرپەروەر : [ئاوەڵناو] لایـەنگـر و بـار-هێنەری هونەر و هونەرمەند. (هنرپرور)
هوود : اند؛ فرد؛ فد: [ناو] هەواکێشی کاره-بایی زیـاتر لـەسـەر کوانـووی چێشـتخانه دادەمەزرێت بۆ هەڵکێشانی هەڵم و بۆق و دووکەڵ. (هود)
هووده : [ناو] موفـا؛ سـوود؛ قـازانج؛ (دژی بیهووده و بی‌موفا). (سود)
هوورات : ف. مان. (۱)بیرەوەری؛ هـوور-مان؛ (خاطرات)(۲) بۆن خـۆش؛ (خوشـبو) (۳ ) ناوی گوڵێکه(نام گلی است )
هـوورکـمـوورک : [نـاو،ت] وردەوپرتـە؛ ورتک و پرتک. (خرده‌مرده؛ ریزه‌میزه)
هووندا : [ئاوەڵناو] ئووندا؛ وندا؛ ون؛ گـوم؛ بزر. (گم)
هەپله هورچ : حەپله هورچ. > هەپەنتی

هەپلەگۆ : [ئاوەڵناو] چەقە سرۆ؛ پڕبێژ؛ چە-نە درێژ؛ هەڵە پاس. (پرحرف)
هەپەڵۆک : [ناو] گیای قیزبەلە؛ هەپڵـۆک. (نام‌گیاهی‌است)
هەپەنتی : [ئاوەڵناو] حەپـەنتـی؛ زەبـەلاح؛ زلحۆرت؛ زل و زەبەندە. (لندهور)
هەتاف : [ناو] هەتاو. (۱)ڕۆژ؛ جەغـزی ڕۆژ بە عاسمانەوە. (خورشید). (۲)خۆر؛ تیشـکی ڕۆژ. (اشعه‌خورشید)
هەتاکەی : (۱)[بەند] تا؛ هـەتـاکوو؛ هـە-تاکەی تۆ لەوێنە بیت من نـاییم.(تـاوقتی-کە).(۲)هەتا چووەختی، هەتاکەی لە سەفەر نایێتەوە: تاکـەنگـیٚ لـەسـەفـەر نایێتـەوە. (تاچەوقت)
هەتک‌کەر : [ناو،بک] ئەتک‌کەر؛ ئابڕووبەر. (رسواکننده)
هەتلی : [ئاوەڵناو] هێتلی؛ بیٚشـەرم؛ بـیٚ-حەیا؛ مرۆڤی پەست. (بیحیا)
هەتەد : لە ئاخری ڕستەدا بە واتای هەتا دوایی؛ زیاتر لەگەڵ سیٚ خاڵدا یان هـەتـا-د..یان هتد.. (الی‌آخر..)
هەتەربڕ : چاوێک کە هێزی دیتنـی شـتی زۆر دووری هەبێت. (چشم‌دوربین)
هەتیتە : [نـاو](۱) ئـامرازی جێگـای پـیٚچ دروسـت کـردن لـە دەرەوە و نـاوەوەی لوولەی کانزادا. (حدیده). (۲)پارچـە پـۆلا-یێکە بە چەند کونەوە لە گەورە تـا چکۆلـە بۆ باریک کردنەوەی تەل و سیمی ئامێری موسیقا. (حدیده). (۳) ئامرازی تەلی زیـڕ و زیـو دروسـتکردن لـە زیڕینگـەریـدا. (شفشاهنج)
هـەتیتـە : [نـاو]کـوڵ؛ ئـامیری دەقـدانی قوماش بەتایبەت بـووزوی ڕانـک‌وچۆغـە. (نوعی‌اطو)
هەجامەت : لە حەجامەتی ئـارەوی کـورد کاری بووە واتا کەڵە شاخ گرتن. (حجامت)
هەجەت : [ناو] حەجەت؛ بـەڵگـە؛ دەلیـل؛ نیاز؛ پێویست؛ بۆی هەیـە لـە (حوججـەت یـان (حاجــەت)ی ئـارەوی کوردکـاری بووبێت(دلیل؛ نیاز)
هەدلان :[نـاو] نـەخۆشـینی ڕەشـەوڵاخـە. (نوعی‌مرض‌گاو)
هەرسین : (۱) ناوی باژێرێکە لە هەرێمـی کرماشان (نام شهری در استان کرمانشاه) (۲) هوورسین؛ خۆرسین؛ خۆر هەڵات؛ ڕ ۆژ هەڵات (مشرق)
هەڕ لەبڕ نەکردنەوە : نەزانینی جیاوازی لە بەینی کرمی ساقەتی تووتن و بڕکەی تو-وتندا. (ب)نەزان وتێنە گەیشـتوو. هاوتـای قول بە فول حاڵی بوون. (کنایە؛ نادانی)
هەڕاج : [ناو] (۱ ب)فرۆشتنی شتومـەک بە کەمترین قیمەت؛ ماڵەکەم هەڕاج کـرد واتـا هــەرزان فرۆشــم کـرد. (۲)هــەڕاج جۆرێک (مەزات یا مەزاد)ە کـە شـت دە-فرۆشریٚ بە کەسیٚ کە لەو کۆڕەدا زیاترین قیمەت پێشیناربکا. (حراج)
هەراز : [ناو] هاتوچۆ و شەکانـەوەی شـتی ئاوێزان؛ وەک ئاونگی هەنـدیٚ کـاتژمێری دیواری. (آونگ)
هەڕاڵ : [ئاوەڵناو] بـەرەڵـا؛ بێعـار؛ بێکـارە؛

خوڵێگوڕاو: غەرە و لووت بەرزی بێجێ. (بیعار؛ ول)
هەراڵەبرەم : > هەراڵەبرایمە.
هەراو : (١) [ئاوەڵناو] گوشاد؛ بەرفرەوان. (گشاد). (٢) [ناو]گیاییێکە لە ناو گەڵاکەیدا کرمێک دەژی کە ئاژاڵ بەخواردنی دە-مرێ. (نام‌گیاهی‌است)+
هەرپەرچوون : [چاوگە،ت] هەرپەرچڤین؛ هەڵامسان؛ ئاوسان؛ هەڵمسان؛ پەنمان؛ ماسین؛ باکردن. (بادکردن)
هەرجوول : [ناو] جۆرێک کوللەیە. (نوعی ملخ)
هەردک : هەتک؛ هەردووک؛ هەردوو؛ هەرتک؛ هەردک دەستی شکا : هەتک دەستی شکا. (هردو)
هەردەبیلە : [ئاوەڵناو+ ناو] زەوینی بێ-داهات؛ زەوینی بێخاوەن و چۆل و بەرە-هووت. (زمین‌بیحاصل و برهوت)
هەردی : شاعیری ناسک خەیاڵ و بیرتیژی کورد، کە لە نوسینی ئەم وشە-دانەدا هاندەرم بوو بۆ تێکوشان و نەترسان لە رەخنە، و رای وابوو کە هەر وشە لەسەر زاری جەماوەرە سامانی خۆیەتی ئەگەر وشەکە بیانیش بێت. (شاعرکرداستاداحمد هردی)
هەردین : [چاوگە،] هەرژین؛ جویێبوونە-وە؛ جیابوونەوە؛ لەیەک‌ترازان. (جداشدن)
هەرز :[ناو] فریس؛ هەریس؛ هەرێز؛ فرێزوو. (فریس)
هەرزە مەرەس : [ناو،ت] سپلۆت یا تانجی کەرست دەکرێ و هەرکەس رای کێشێ رستەدەدا واتا بەشوێنیدا دەروا. (تازی‌که بارشته‌قلاده‌به‌دنبال‌هرکسی‌راه‌بیافتد)
هەرزەگێڵ : [ئاوەڵناو] حاڵەتی بێکار سووڕانەوە و گەڕان؛ گاف‌قەلیش. (هرزه-گرد)
هەرژین : > هەردین
هەرساندن:[چاوگە،ت] فێرکردن.(یاددا دن)
هەرشتەفەرەنگی :[ناو،ت] هەرشتە لە ئا-ردی بێسپۆس کە بە دەزگا و مەکینە چێدەبێت. ماکاروونی. (ماکارونی)
هەرکوێیێ : (١)هەرکێوێ. (هرکوهی). (٢)هەر کوێنێ؛ هەرکوێنەیک؛ هەرکوێنە-یێک؛ هەر جێیێ؛ هەر جێگایێ.(هرمکانی)
هەرکوێیێ: > هەکوێیێ (٢)
هەرکێشە : [ناو،ت] بارانی پەڵە؛ هێشەنم. (بارانی‌که‌به‌اندازه‌حدودبیست‌سانت‌زمین‌را-ترکند)
هەرگەلە : [ناو،ت]کەرەگەل؛ (ب)جەماوە-رێکی وەپاشکەوتووی نەزان. (گله خر)
هەرملێسین : [چاوگە،ت] هەڵملێسین؛هە-ڵمژین؛ هەڵمژتن؛ وەک مژینی ئاوی هەنار و میوە. (مک‌زدن)
هەر مەڵێ : هەر مەیژە؛ هەر مەوژە؛ هەر مەوشە؛ هەر مەبێژە. (هی‌نگو).
هەرمەڵێ : [ناو] هەڵمەلە؛ هەرمەڵە؛ گوڵەهێرۆ. (گل‌ختمی)
هەرمەنی : ئەرمەنی. (ارمنی)
هەرنەبی : (١) هەرنەوی؛ تۆ قەت نەبی. (هیچگاه‌نباشی). (٢)هەرنەبێ؛ بەلانی کە-

مەوە. (لااقل)
هەڕنەمووت :[ئاوەڵناو] بۆگەنی شتیترشاو و گەنیو؛ بۆی زۆر ناخۆش. (بویبسیاربد)
هەڕوگیف : [ناو] عەڕوگیف؛ زەڕاندن و جووتە خستن و هەڵاتنی کەر. (ب) نە-ڕاندن و گوڕاندن و خۆ تووڕەکردن. (عروگیف)
هەرووشا : [ناو]کەروێشک؛ هەرووشە؛ کە-روێشک. (خرگوش)
هەروەر : جۆرێک هەڵپەڕینە. (نوعیرقص)
هەڕەبان : [ناو] هەڕگەبان؛ قوڕەبان. (گل-اندودکردنبام)
هەڕەزانێ : [ناو] جۆلانێ؛ جۆلانەکردن. (تاببازی)
هەڕەشین :[چاوگە] هەڕەشیان؛ خراپ-بوون؛ لەناوچوون. (ازبینرفتن)
هەڕەگ : [ناو] هەڕەت؛ جەنگە؛ تاف. (نوغان؛ بەوقت؛ گرماگرم)
هەرەگەورە : (١)[ناو]کەرەگەورە.(خربزرگ)
(٢) [ئاوەڵناو] زۆرمەزن؛ زۆرگەورە؛ حەلە-گەورە؛ حەرەگەورە. (خیلیبزرگ)
هەرەمک :[ئاوەڵناو] ئەستێور؛ نەزۆک. (نازا)
هەڕەمەخەرج : [ئاوەڵناو] هەڵەخەرج؛ دە-ستبڵاو؛ دەست پێوەنەگر؛ ئەبلەخەرج. (ولخرج)
هەرەنگ : [ناو] هێز؛ تابشت؛ تاقەت؛ خۆڕاگری. (توانایی)
هەڕەهەڕە:تیرەشاخێکە نزیک هەورامانی تەخت. (اسمسلسلەکوهیاستدراورامان)
هەرێژن : [ناو] هەرەژن؛ ئانیشک؛ بن ئا-نیشک. (آرنج)
هەرێس : [ناو] هەرێز؛ فرێزوو. (فریس)
هەریسان : [چاوگە،ت] قرنجیانی پێستی لەش کە خوێنی تێزابێت؛ کونجڕین. (خونمر دگی بعلتضربدیدگی و فشار روی پوست)
هەریل : [ناو] جاو؛ خام. (کرباس)
هەرینگا : [بەند] هەرگا؛ هەرینگاوایە : کە وایە. (حالاکه)
هەزارفەند : (ب) بەفێڵ و تەڵەکە؛ کڵاوباز؛ حۆقەباز. (حقەباز)
هەزارە : [ناو] لۆسە؛ باری. (اهرم)
هەزارە : ناوی هۆزێکی گەورەی کوردە لە ئەفغانستان. (نام ایل بزرگی از کردهای افغانستان)
هەزارە دوولایی : [ناو،ت] هاتوچۆی کەرو ێشک لە بەفردا بە سەر شوێنی خویدا بۆ چەند جار، کە شوێنی خوێ لە ڕاوکەران تێکدەدا و لە پاشان بە چەند قەڵەمباز خۆی لەو شوێنە دوور دەخاتەوە. (نوعی-ردگمکردنخرگوشبررویبرف)
هەزوە کێوی : [ناو] هەزبەکێوی؛ گیاییێکی بۆن خۆشە؛ کوڵێنراوی گەڵاکەی بۆ سەر-ئێشە (میگرێن) باشە و ماکێکی هوورگ کوژی تێدایە. (آویشنکوهی)
هەژار : ناز ناوی مامۆستا عەبدولڕەحمان شەرەفکەندی زبانزان و شاعیر و پاچڤە-زانی کوردە کە هەنبانە بۆرینە و چەندین دیوانی شێعر و نوسراوە و پاچڤە، بەجێما

وی ژیانی پڕ بایەخی ئەوبلیمەتەیە. (تخلص دانشمندبزرگ کرد)
هەژخوەکەر : [ئاوەڵناو] حەز لەخۆکەر؛ خۆ-پسەند؛ خۆویست؛ لەخۆبایی؛ لووتبەرز. (خودخواه)
هەژگوهەژاڵ : [ناو،ت] هەژگوبژال؛ هەژگەل؛ چیلکەوچەوێل؛ پروپووش. (شاخەهای خشک وباریک درخت)
هەژمەت : [ناو] حەجمەت؛ حەیبەت؛ لە-تاو؛ پەرۆش؛ ترس. (هیبت،ترس)+
هەژهەژۆک : لەرزۆک. ( مبتلابەمرض-رعشه)
هەژیا:[ناو] هەژدیها؛ هەزیا؛ حەفی.(اژدها)
هەسارەژمار : > گوڵپرشنگ.
هەسارەی گڕجەشۆن : ئەستێرەی گڕلە-شوێن؛ بەردی ئەستیرەیی کە دەخوشێ و کلکێکی گڕداری بەپاشەوەیە. (شهاب)
هەساوی : [ناو] حەساوی؛ جسنە کەرێکی بەکار و بەهێزە. (نژادنوعی خرپرقدرت)
هەستوون: [ناو] وێستوون؛ کۆڵەکە.(ستون)
هەستهورووژێن: [ئاوەڵناو]هەستبزوێن. (حس برانگیز؛ مهیج)
هەستەوەری : [ناو،ت] هەستیاری؛ هە-ستۆکی؛ هەست ناسکی؛ چاوم لە بەرانبەر تیشکی خۆردا هەستیارە : هەستەوەرە یان هە ستۆکە. (حساسیت)
هەسروە : [ناو] خەسوو. (مادرزن)
هەسوورە : [ناو] خەزوورە. (پدرزن)
هەشامەت : [ناو] حەشامەت؛ ئاپۆرەی جە-ماوەر؛ کۆمبوونەوەی زۆری خەڵک. (انبوە-جمعیت)
هەشت گوڵ : [ناو]کاتی کە گەنم یان دە-غل تەواو گوڵ دەکا. (هنگام خوشەبستن-گندم)
هەشتپەل:[ناو]هەشت پالۆو؛هەشت سووچ؛ هەشت گۆشە.(هشت گوش،هشت-پر)
هەشتێ لە مشتێ : بەشێک لە شتێک؛ نمونە لە هەر شت. (نمونەچیزی)
هەشنبۆز :[ناو] شین‌بۆز؛ بۆزی مەیلەوشین. (رنگ تیرەمایل بەآبی ستور)
هەشینۆک : [ناو] سووریجە؛ سوورێژە. (سرخچە)+
هەفان : [ئاوەڵناو] هیلاک؛ ماندوو. (خستە)
هەفاندن : [چاوگە،ت] هیلاک کردن؛ ماندوو کردن. (خستەکردن)
هەفتجۆش: [ناو] حەوجۆش؛ کتری گەورە لە جنسی مەفرەق. (کتری بزرگ ازمفرغ)
هەفتخەت : [ناو] [ئاوەڵناو] لە قە
دیما ئەوکات کە شەراب خواردنەوە مەباح بووە لە جێگایێ بە ناوی مەیخانە شە-ڕابیان دەخواردەوە، کەسێکیش کە ساقییان پێدەگوت بە ئامێرێکی(پە-رداخێک)ی حەوت هێل بۆ موشتەرییەکان شەڕابی تێکردووە و ئەو ساقییە ئاگاداری ڕادەی شەڕاب خواردنەوەی هەرکەسێک بووە و بەقەرا توانای(هەر کەس) لە ڕووی هێلەکانەوە بۆی تێکردوون، کەسێک کە ئەوپەڕی توانای خواردنەوەی هەبووایێت هەتا هێلی حەوتەم بۆی پڕدەکرد، ئەو

وشەیە ماوەتەوە و بە کەسانێکیان گوتـووە کە پاڵەوان و بەهێز بووگن و ئیمڕۆ واتەی گوڕاوە و بە کەسانێکی زیرک و فێڵەباز دە وترێت حەوخەت. (هفت‌خط)
هـەفـت‌ڕەنـگ : [ئـاوەڵنـاو] حـەوڕەنـگ (ب)مروقی کڵاوباز کە هـەردەم خـۆی بـە ڕەنگیٚ نیشاندەدا. (هفت‌رنگ)
هەفـت‌زمـان [ئـاوەڵنـاو]:حـەوزمـان (ب) مرۆڤـی ماسـتاوکەر و ڕیابـاز و زمـان‌بـاز، زمان‌لووس. (زبان‌باز)
هەفت‌سین : [ناو] سفرەی جەژنی نـەوروز کە حەوت شت یا خۆراک کە هەول پیتـی ناوەکەیان(س)بیٚ لە سەر سفرە دادە نێن. (هفت‌سین)
هەفتۆوە: [ناو] ئەفتاوە؛ ئافتاوە. (آفتابه)
هەفتەبیجاڕ : [ناو] حەفتەبیجاڕ؛ جۆرێک ترشیاتە کە چەند جۆر سەوزی و بەری گیای تێدەکەن. (هفته‌بیجار)
هەفتەو : [ناو] ئـەفتـاوە؛ لوولێنـەی‌مسـی؛ هەفتۆوە. (آفتابه)
هەڤدوو : [جێناو]یەکـودوو؛ هەڤو دوو؛ یە-کترین؛ یەکتر. (همدیگر)
هـەڤـڕەسـەن :[ئـاوەڵنـاو] هـەڤـجـنس؛ هاونیژاد؛ هام‌ڕەسەن؛ هاوڕەگەز. (هم‌نژاد)
هەڤگەل : [ناو] پشتیوان؛ یارمەتـی؛ هـە-واداریی بە کۆمەڵ. (پشتیبانی)+
هەڤۆ : [ناو] نێریەکێوی؛ کەڵەکێوی. (گل-کوهی)
هەڤ‌هێسی : [ناو] هاوسا؛ هاوسیٚ؛ جینـار؛ جیران؛ هامسا. (همسایه)
هەڤیساندن : [چاوگە،ت] هەرساندن؛ فێر-کردن. (یاددادن)
هەڤیسین:[چاوگە،ت] فێربوون؛ هەرسـین؛ فێم‌بوون. (یادگرفتن)
هەڤێن : [ناو] هەوێن؛ ئامیان. (مایه)
هەقە : [ناو] تۆخڵە هێلکە؛ توێکڵی هێلکە؛ قاخکیٚ‌هێکیٚ. (پوسته‌تخم‌مرغ)
هەقەپەڵە : [ناو] حەقەپـەڵـە؛ بـارانی نێـوە ڕاست مانگی پاییز. (باران‌آبانماه)
هەکڵ‌مەکڵ : [نـاو] منـداڵان پایـان ڕادە-کێشن و یەکێکیان بە ئاهەنگ دەڵیٚ هـە-کڵ‌مەکڵ کڵکافۆکیٚ زەرد و سوور و شـە-ماموکیٚ مێخم کوتا مێخ هەڵبەزی تیکـە-ی‌چەپم ئالە مەگەزی و لەوێـدا ئیشـارەی بە هەر پایێک کرد، هەڵدەکێشرێت هـەتـا تەنیا پای کەسێک دەمێنێتەوە کە سەرکە-وتووی کایەکەیە. (آچین و واچین)
هەڵ: [پێشگری کار(فێعل)] وەک:هـەڵپـە-ڕین ، هەڵبەزینەوە، هەڵخستنەوە. (پیشوند)
هەڵازریان : [چاوگە،ت] هـەڵزریـان؛ هـە-ڵپشکووتن؛ وەک: هەڵپشکووتنی لێـو؛ لێو هەڵزریان. ( مانندتبخال‌لب)
هەڵالەبرایمە : [ناو]گوڵەشلێر؛ شلێرە. (لاله-واژگون)
هەڵاوەخۆر : [ناو] مۆر؛ مۆریانە؛ جووڵـەوە-ڕێکە مێملی قوماش و خورییە. (بید)
هـەڵـاوێردراو : [ئـاوەڵنـاو+ ناوبـەر] دە-رهـاوێژراو؛ دابـڕاو؛ جیـاوەبـوو؛ فڕێـدراو. (جداشده؛ پرت‌شده)
هـــەلای : [بـــەنـــد] هێشـــتا؛ حـــەلای؛

هالای؛هێژ. (هنوز)
هەلای‌هێل : [ناو] مارەکوژە؛ گیای هەلا-هێل ماکێلی ژەهراوی تێدایە بە ناوی (ئارسنیک)کە کوشەندەیێکی بێ-عیلاجە.(شوکران‌کبیر)
هەڵبڕووسقان :[چاوگە](١) ڕفاندن و لە دەست سەندن. (ازدست‌کسی‌ربودن). (٢)هەڵگەڕانەوەی شیر و دۆخەوا. (بریدن-شیر). (٣)ڕەنگ پەڕین و ڕەنگ بە ڕووەوە-نەمان لە ترسان یان هەر شت. (رنگ-پریدن). (٤) قرتیان؛ گیای بژار قرتیان و بە ڕیشەوە دەرنەهاتن. (قطع‌شدن)
هەڵبەزینەوە : [چاوگە،ت] (ب)داچڵەکان و سڵەمینەوە. (شکەشدن؛ ازجاپریدن)+
هەڵپەڕاندن : [چاوگە،ت](١)پەرتاوتن؛ سە-رقرتاندن. (قطع‌کردن). (٢)ڕەخساندن. (رقصاندن)+
هەڵپەژنین : [چاوگە،ت] هەڵپاچین؛ پە-ڕتاوتن. (کوتاه‌کردن؛ قیچی‌کردن)
هەڵپەهەڵپ:[ناو،ت] زۆر لەز کردن لە کاتی خواردندا. (باعجله‌غذاخوردن)
هەڵچنراو : [چاوگە،ت] (١)چنراو؛ ئاوی چێشتەکە هەڵچنراوە. (تمام‌شدن‌آب‌وبخار-شدن؛ جوش‌رفتن‌آب‌غذا).(٢)بە ڕێکوپێکی لە سەر یەک دەستەکراو و دانراو. (چیده-شده)
هەلچی : [ناو]کارگ؛ قارچک. (قارچ)
هەڵخڕاندن : [چاوگە،ت] خڕکردنی هەر-شت؛ گوپ پڕ لە با کردن بۆ کایەی پەلە-پیتکە لێدان. (کروی‌کردن و پربادکردن-لپ)+
هەڵداشتن :[چاوگە،ت] (١)لاڕێ‌کردن بە کەسێک؛ هەڵفریواندن. (قریب‌دادن) (٢)فڕێدان لە بەرزییەوە بۆ خوارەوە(٣)دە-ستبەسەرکردن دوورخستنەوە. (ازبالا پرت کردن؛ تبعید)
هەڵدانەوە : [چاوگە،ت] کۆگا کردنە سە-ریەکی دەغڵ یان هەر شت؛ خەرمانی هەڵداوەتەوە. (تلمبارکردن‌غله)(٢) بە-رزکردنەوە؛ وەک کۆش هەڵدانەوە و بەلە-ک دەرخستن؛ پەردە لەسەر لابردن. (بالازدن)
هەلزرینگاندن : [چاوگە،ت] زرینگاندنەوە؛ گۆزە و دیزەی کۆن و بۆن گرتوو دیسان بە ئاور سوور کردنەوە. (پختن‌مجددظروف سفالی)
هەڵزەقین: [چاوگە،ت] هەڵزەقیان؛ هەڵتۆقین؛ تۆقلەکردن. (بادکردن؛ حباب‌شدن)
هەڵزەلین : [چاوگە،ت] هەڵزەلیان؛ هە-ڵخلیسان؛ (بۆی هەیە لەگەڵ زەللەکردندا پێوەندییێکیان هەبێت) (سرخوردن)
هەڵس : [ناو] هێسر؛ ئەسرین؛ فرمێسک. (اشک)
هەڵسوبنیش : [ناو] هەڵسوکەوت؛ هاموشۆ. هاتوچۆ. (آمدورفت)
هەڵسووڕاندن : [چاوگە،ت] (ب)بەرێوە بردنی کاری ڕێکخراوێک. (اداره‌کردن)+
هەڵسیان : [چاوگە،] هەڵسان؛ ڕابوون؛ هە-ستان؛ وەک: لافاو هەڵسان.(پاشدن؛آمدن)
هەڵفریوێن : [ناو،بک]خاپێن؛ فریو دەر.

(فریب‌دهنده)
هەڵکاڵین : هەڵکاڵان؛تووڕە بوون لـە کـە-
سێک؛ تووک لێکردن. (بدوبیراه‌گفتن)+
هەڵکڕاندن:[چاوگە،ت](ب)هەنـدێکی کـەم
لە مەبەستێک تێگەیشتن. (درک‌انـدک‌از-
مطلبی.جزئی درککردن) +
هەڵکردن : [چاوگە،ت] (١)دەست پێکردنی
با. (شروع‌شدن‌وزیدن‌باد). (٢) گلۆلەبەن‌هە
ڵکردنە سەر یەک. (کلاف‌پیچیدن)+
هەڵکزاندن : [چاوگە،ت] مریشـک و سـە-
رویێ دوای پاک کردن بە سەر ئاورداگرتن
و هەڵکزاندن و هەڵپروزاندنی پەل و مـووە
وردەکانی. (سوزاندن‌موی‌کله‌پاچه‌پاکشده)
هەڵکلۆشان:[چاوگە،ت] خوراندن‌بە نەهێم؛
هەڵکڕاندن (تبندی‌خاراندن)
هەڵکووچان : [چاوگە،ت] هەڵترووشـکان؛
هەڵتووتەکان؛ زیاتر بۆ سپلۆتە. (چمباتمه)
هەڵگر : (١ب)[ئاوەڵناو] شیاو؛ شان‌هەڵگـر:
لە باراندا بوون. (شایسته) (٢) [ناو،بک] بە-
رز کەرەوە؛ کـەسێک‌کـە هـەڵـدەگرێـت.
(کسیکه برمیدارد)
هەڵگرتە : [ناو] لە یاریی مێشێن دا دژی
خشکەیە واتا هەڵمات بە حەوادا بۆ میتە
یان هەڵماتی حەریف فڕێدان. (تیله‌پـرت-
کردن هوایی)
هەڵگلۆفین : [چاوگە،ت] گەوزاندن؛ وەکوو
: سەگ کە نێچیر لە خۆڵ وەردەدا و دە
یخڵافێنێتەوە. (مچاله‌کردن‌وغلطاندن)+
هەڵگوێزان : [چاوگـە،ت] دەردان؛ خـاڵیکر
دن، زیاتر بۆ تراو وەک ئـاوی حـەوز هـە-
ڵگوێزان. (خالی‌کردن)
هەڵگەڕیان :[چاوگە،] سەرکەوتن؛ بە کێودا
هەڵگەڕیان: هەڵگەڕان. (صعود)
هەڵگەڕێن : [ناو،بک](١)ئەوەی سەردەخـا.
(بالا برنده).(٢)زڤـڕێن؛ بـەراوەژووکـەر.وەر
چەرخێن. (برگرداننده؛ ).
هەڵگیرساندن : [چاوگە،ت] هەڵگرسـاندن؛
ئاورکردنەوە. (ب)ئاشووب نانـەوە و بـەرپـا
کردنی فیتنە. (آتـش‌روشـن‌کـردن؛ فتنـە-
بپاکردن)
هەڵڵاوبگر : [ناو،ت]کێشـە و هـەراوهوریـا.
(درگیری‌ودادوهوار)
هەڵلووشین : [چاوگە،ت] (١)هەلقوڕاندن و
خواردنەوە. (نوشیدن). (٢)هەلقوڕانـدن بـە
دەنگ و سەداوە. (هورت‌کشیدن)
هەڵماشتن : [چاوگە،ت] هـەڵمـاڵین؛ وەک
قۆڵ هەڵکردن. (بالازدن)
هەڵماڵان : [چاوگە،ت] سەرپۆش لەسەر
لاچوون؛ لە زۆر جێدا هەڵمالان و دامالان
یەک واتان و هەنـدی جـاریش دژ واتـان
(ڕوو بە خوار و ژوور)؛ سەرپـۆش داماڵـان؛
پێستی دەستم هەڵمالراوە : پێستی دەستم
داماڵراوە. (لغزیدن)
هەڵمە قووتە : [ناو]تلیاناوین؛ قامکی ناوە-
ڕاسـت؛ زڕەنـەقووتـە؛ باڵـابـەرزە؛ قـامکی
قووتی. (انگشت‌وسط)
هەڵمەدوو : [ناو] هەڵمی گەرمی دووکەڵ؛
بـۆقـی گـەرمـی تـەڕەشـۆدار؛ شـەرجـی.
(شرجی)
هەڵمەدووگ : [ناو] هاڵاوی گەرمـی چـە-

ورایی و دووگ. (بخارچربی)
هەڵمەقووت : قووتدانی بەلەز؛ قووتدان بە یەکجاری و بە توندی؛ قووتدان بە گەرمی و سارد نەکردنەوەی خۆراک. (خوردن‌با-عجلەوگرماگرم)
هەل‌وپەل :[ئاوەڵناو] زۆرکوڵان و لەبەر یە-ک چوون؛ بۆی هەیە کە(حەل)ی ئارموی و پەلی بە واتای(کوت‌ولەت)ی کوردیەوە دروست بووبێت. (لەشدن‌بعلت‌پختن‌زیاد)
هەل‌ومەرج : [ناو] بارودۆخ. (موقعیت)
هەڵوەشاندنەوە : [چاوگە،ت] (١) لەبەر یە-ک دەرهێنانی ئامیر و ئەندامی کەرەستە-یێک.(اوراق‌کردن). (٢) تێکدانی موعامەلە و پەیمانی بەستراو. (فسخ‌کردن‌معامله)+
هەڵۆی پەڕکوور :[ناو] ٧٠ تا ٨٠ سانتیمتر باڵایەتی، باڵی زەردە و کلکی سپییە. (عقاب‌طلایی)
هەڵویست : [ناو] هەڵویس؛ لایەنگری لە مەبەست و داوخوازێکی فکری. (اصرار و پشتیبانی‌از نظریه و یا موردی)
هەلەپارسی : هەڵەپاسی؛ زۆر وەڕی؛ (ب) فره وێژی. (پرگویی)
هەڵەشە : [ئاوەڵناو] شپرزە؛ دەستە نەکراو. (آشفته؛ فله)
هەلیلۆک: [ناو] نەرمەی‌گوێ؛ بەڵگی‌گوێ. (نرمه‌گوش)
هەمووددەم : [بەند] گشت‌کاتێک؛ هەموو کاتێک. (همه‌وقت؛هردم)
هەمەلایەنە : [ئاوەڵناو] لە هەموو لایێکە-وە؛ لە گردلایێکەوە. (همه‌جانبه)
هەمیرترش : [ناو] هەویرترش. (خمیرمایه)
هەناڕەس : [ناو،بک] هاناڕەس؛ فریاڕەس. (فریادرس)
هەناسەبڕکێ : [ناو] نەفەس‌نەفەس لێدان بە هۆی هێلاک بوونی زۆرەوە. (نفس-نفس‌زدن)+
هەناسەڕەش : [ئاوەڵناو] بەد یومن؛ نەفە-س پیس. (بدیمن)
هەناسەکەوتنە ژمارە : (ب)سەرەمەرگ. (نفس‌بەشمارەافتادن)
هەناسەی دوایی : (ب)ئاخرین هەناسەی سەرەمەرگ. (آخرین‌نفس)
هەناقڕەشی : [ناو] زکڕەشی؛ دڵپیسی؛ بە-شک‌بوون. (سوظن‌داشتن)
هەناوەکوتێ : [ناو] دڵەکوتێ؛ دڵەتەپێ. (-طپش‌قلب)
هەنجنراو : [ئاوەڵناو+ناو،بەر] ئەنجنراو؛ وردکراو؛ ئەنجن ئەنجن کراو؛ قیمەکراو. (قیمەشده)
هەندرێنە : [ناو]گیاییێکە لە شیلەکەی لاستیک دروست دەبێت. (نام‌گیاهی‌است)
هەندەیی : چاوچنۆکی؛ چکووسی. (خست)
هەنگ : [ناو] دەستەواژەی کامپیوتێرییە واتا قوفڵکردنی کامپیوتێر. (هنگ)
هەنگ : [ناو] فەوج؛ دەستەیێک عەسکەر کە برێتییە لە سێ گوردانی سێسەد کەسی. (هنگ)+
هەنگاڤێ : [بەند+ ناو](١) نهۆ؛ ئێستا؛نووکە ؛ هەنگاوێ. (حالا). (٢) یەک قەدەم؛ قە-دەمێک. (یک‌قدم)
هەنگ‌بەر : [ناو]گیای فاتمەداروو؛ بۆ بیرۆی وشک و بیرۆی تەڕ بەکەڵکە.

(فرنجمشک)
هەنگڵ : [ناو] دەستە، دەسکی گۆزە؛ قۆڵ؛ باسک؛ بن‌هەنگڵ : بن‌باسک : (بازو، دسته)+
هەنگوژە : [ناو] شیرەی وشکەوەبووی‌دار؛ جیوە؛ جەو؛ جەوگ. (صمغ)
هەنگوڤ : [ناو] جۆرێک مێشە لە زستاناندا لە ژێر پێستی ڕەشە وڵاغاندا دەژیێتەوە و بەهار سەر دەردێنێ؛ هەنگی ڕەشە وڵاخ. (نوعی‌انگل‌زیرپوست‌گاو)
هەنگوورە تاڵە : [ناو،ت] تەماتە مارانە؛ (گیاوبەرەکەی). (مهرگیاه؛بلادن؛ شابیزک)
هەنوان : [ناو] جێگای پەسیو کە باران نە-یگرێ. (پناهگاهی‌کەازباران‌محفوظ‌باشد)
هەنەکار: [ئاوەڵناو] حەنەککار؛ گاڵتەچی. (کمدین)
هەنێ : (١) [بەند] هەنێک؛ هەندێ؛ هە-ندێ؛ هێندێ؛ کەمێ؛ هەنێ. (کمی) (٢)>شووتی
هەواکێش : [ناو](١)کەرەستەی ڕاوانی هەوا لە ژوورەوە بۆ دەرەوە زیاتر لە ئاشپە-زخانەدا؛ (٢)قوڵە کوورە ئاسا بۆ کێشانە دە-رەوەی هەوا بۆ سەرەوە. (١و٢هواکش)
هەواڵنێری : (١) [ناو] ڕێکخراوی خەبەر شاندن؛ بڵاوکەرەوەی خەبەر .(خبرگزاری) (٢)کاری خەبەر ناردنی هەواڵ نووسی گۆڤار. (خبرنگاری)
هەوتەهەوت : [ناو،ت] وەڕەوەڕ. (عوعو)
هەوجا : [بەند] ئەوجا؛ ئەمجا؛ ئەوسا؛ سا. (حالادیگر)
هەودانەوە : [چاوگە،ت] هۆدانەوەی گا جووت لە جەمسەری گاوخانی جووت کردندا. (برگرداندن‌گاودرآخرخط‌شخم)
هەودل : [ناو] دەفرێکی گەورە لە مەڕ-دۆش مەزنتر؛ گادۆش. (ظرف‌دوشیدن‌گاو.)
هەوراز و نشێو : [ئاوەڵناو] بەرز و نزم؛ چاڵ و بەرز؛ کەند و کۆسپ. (پست و بلند)
هەورنگ : ئەلەتریکی ساکین کە لە کاتی دەست پیاساوین بە قوماشی پەشمیندا دەتروسکێتەوە و قرچەی دێت؛ ئاورینگ؛ پڕشکەهاویشتنی ئاور. (الکتریسته‌ساکن ؛جرقه آتش)
هەوروبا :[ناو،ت]دەستە واژەی ڕەنگکارییە؛ ڕەنگی تێکەڵ پێکەڵ و شێواو لە بیچمی هەور. (ابر و باد)
هەوروبەرق : [ناو] هەورە برووسکە؛ هەورە تریشقە؛ چەخماخەی هەور. (رعدوبرق)+
هەوکردنەوە : [چاوگە،ت] سەرلەنوێ تە-شەنا کردنی برین پاش چاک بوونەوە؛ یان دووبارە نەخۆش کەوتنەوە پاش چاک‌بوونە وە. (ب)هاتنەوە گەڕی کێشەی کۆن و لە-بیرچوو (لەبیرچووگ). (عودکردن)
هەوڵ : [ناو](١)خۆف؛ کەوتنە حاڵەتی شێواوی لەترس یان لەبەر ڕووداوێکی ترس هێنەر؛ دەسەپاچە بوون؛ شڵەژان. (هول) (٢) حەول تەقالا. (کوشش)
هەوڵدەر : [ناو،بک] تەقالادەر؛ تێکوشەر. (مجاهد)
هەویر تیکان : [ناو،ت] پەیینکە؛ ئاردێ کە بە سەر گونکی هەویردا دەکرێ بۆ ئەوەی بە تیرۆکدا نەلکێ. (آردی‌کەروی‌چانەمی پاشند)

هەوێڵ : [ناو] هەرد و مەکان؛ جێگا؛ دەوروبەر؛ ئارا؛ کەس لە هەوێل دانە بوو : کەس لەو هەردومەکان و جێگا دا نەبوو.(مکان)
هەویە : [ناو](١)چەکوشێ کە بەکارەبا یان ئاور گەرم دەکرێ بۆ لەحیم کاری. (هویە). (٢)لە کوردستانی باشوور بەناسنامە دەڵێن و لە ئارەوییە وە وەرگیراوە. (کارت- شناسایی؛ شناسنامە)+
هەویەشەو : [ناو] مانگەشەو؛ هەیڤی شەڤ. (مهتاب‌شب)
هەیانی: هەتاکانێ؛ هەتاکوونێ؛ هەتاکەی؛ هەتاکانێ؛ هەتانێ؛ هەتا. (تاوقتی)
هەیتاندن : گوڕاندن؛ قیژاندن بە سەر کەسێکدا. (نعرەزدن)
هەیڤی‌سوور: [ناو] هیلالی ئەحمەر؛ دامەزراوەیێکە لە وڵاتەکانی ئیسلامیدا کە کاری یارمەتیدانی لێقەوماوانە، لەکاتی ڕووداو یان نەخوشی و کێشەدا؛ وەک سەلیبی سوور لە ئوروپا. (هلال‌احمر)
هەیهاوار . هەی‌دادهەی‌بێداد؛ ئەی هاوار. (ایدادوبیداد)
هیبب : [ناو]جۆرێک ئاهەنگە کە زیاتر کچان بە لێو دەیلێن و پێی هەڵدەپەڕن. (نام‌آهنگی‌است)
هێپاتیت : [ناو] جۆرێک نەخۆشینی جەرگە. (هپاتیت)
هێپکای : [بەند] هێدیکا؛ ئەسپایی؛ بەهێواشی و سووک؛ بەئارامی؛ هێدی؛بەهێمنی؛ لەسەرخۆ. (بەآرامی)
هێج : [ناو] تەگە؛ نێری. (تکە.شاک)

هێجوو : [ناو] خوازبێنی؛ خوازگێنی. (خواستگاری)
هیچکە : [جێناو] هیچکەس(هیچکە نەو : هیچکەس نەبوو). (هیچکس)
هیچکەسم نییە : (١) قەوم و کەسی من - نییە؛ کەسی من نییە. (کس‌وکارمن‌نیست). (٢)من هیچکەسێکم نییە. (من‌بی کسم)
هیچێ : [جێناو] هیچشتێ؛ هیشتێک؛ هیچێک؛ هیچ‌تشت. (هیچی)
هێرش : ناوە بۆ پیاوان. (اسم‌مردانە)+
هیرماڵ : [ناو] هیربار؛ دەفری هەوڕ؛ دەفری گڵین. (ظروف‌سفالی)
هێڕۆیین : فرد؛ فد؛ اند: [ناو] بەرهەمێکە لە تریاک و مۆڕفین کە مرۆڤ زۆر زوو خووی پێدەگرێت، ماکێکی سڕکەری بە هێزە. (هیروئین)
هێڕە : [ناو] نهێڕین؛ مێزە؛ تەماشا؛ چاولێکردن؛ ڕوانین. (نگاه)
هێرەقونێل : [ناو] ئاموورونیر؛ ئاقیلەوماقیلە؛ ئارەق‌ونێل؛ ئالاف. (خیش)
هێرەڵماسی : [ناو] ئێرەل: (ئیرەڵماسی)؛ لە توورکیەوە هاتووە، (یێر: زەوی + ئاڵما: سێو) یارەڵماسی؛ سێوک؛ یرەڵماسی؛ کارتوڵ؛کارتۆپی؛ پەتاتە؛ سێف زەمینی؛ سێب زەمینی؛ کارتینە؛کرتۆپل؛ پۆتیتە؛ کارتینک؛ کرتۆفل؛ پەتیتە.(سیب‌زمینی)
هێرێ : [بەند+ ناو] دوێنێ. (دیروز)
هێڕین : [چاوگە،] هاڕین؛ وردکردن؛ لە ئاش‌کردن. (خردکردن)
هێزن : ناوی گۆرانییێکە، چەلەپاییە و بۆ هەڵپەڕین دەبێ. (آهنگ‌رقصی‌است)

هێسین : (١)[چاوگە] ساوینەوە؛ سـوونەوە؛ لەساودان؛ تیژ کردنی تێخ. (تیزکردن‌تیـغ).
(٢)پیا ساوین؛ سواخدان. (مالیدن‌وگل‌اندود)
هێشترگا: [ناو] وشترگا. (زرافه)
هێکادلمیْ : [ناو،ت] هێلکـەی دەڵـەمـە و نیوەکوڵیو. (تخم‌مرغ‌عسلی‌ونیم‌بند)
هیکـاری : هینکـاری، فێرکـاری؛ ئـامۆژە. (آموزش)
هێکتار : فرد؛ اند؛ فد: [ناو] یەکەی پێوانی ڕووپەڕی زەوی بەرانبەربە دە هەزار میتری چوارگوش. (هکتار)
هیکرن : [چاوگە،ت] هینکـرن؛ فێرکـردن. (یاددادن)
هیلاکەت : حاڵەتی نەخۆشینی زۆر خـراپ و نزیک بە مردن. (دم‌مرگ)
هێلکە مارانە : [ناو،ت] شەیتانۆکە. (پوسـتە حلزون)
هیلنای : [چاوگە،] حیلنای؛ حیلاندن؛ شە-هین. (شیهه‌کشیدن)

هێلە : [ناو] هێک؛ هێلکـە؛ زەردبـەقوونـە. (تخم‌مرغ)
هێلیکۆپتەڕ : [ناو] جۆرێک فڕوکـەی پـە-روانە دارە. (چرخبال)
هین : (١)هینک؛ فێنک. (خنک)(٢) شـت؛ وانێک. (چیز)(٣) فێر؛ فێم؛ زانین.(فهمیدن)
هێنانەوە : (ب)ڕشانەوە. (استفراق)
هێندوو : [ئاوەڵناو+ ناو] دینێکە لە هێندوو-ستان؛ هێندووستانی. (دینـی‌اسـت‌درهنـد؛ هندوستانی)
هێندی : [ئاوەڵناو+ ناو] زبـان و خـەڵکـی هێندوستان. (هندی)

هێوان : [ئاوەڵناو] خۆش؛ بەختـەوەر؛ بـە-ختیار. (بختیار)+

هێورزە : دەم وشک بوون لـە توونیـەتیـدا. (خشک‌شدن‌دهان‌ازتشنگی)

هێولْ : [ئـاوەڵنـاو] هێـور؛ ئـارام؛ هێـدی؛ هێمن. (آرام)

هارمۆنی : فرد؛ فد؛ اند: [ناو](١)هاودەنگی لە مۆسیقادا. (٢)لەیەک کاڵانەوەی ئەندام گەلی سیستەمێک یان لە هونەری‌نیگار کێشیدا لەیەک‌کاڵانەوەی ڕەنگی پاژگەلی نیگارێک. (هارمونی)

هافبەک : اند؛فرد؛ فد: [ناو] هەرکام لە ئەندامانی تیمی کایەکەری تۆپی پێ کە لە نیوەی دواوەی زەوینی تۆپی پێدا کایە دەکەن. (هافبک)

هافتایم : اند؛ فرد؛ فد: [ناو] [کۆژیوەرزشی تۆپی‌پا] هەرکام لە دوو نیوەی کایەی وەک تۆپی پا. (کافتایم)

هاونشین : [ناو] هەم‌نشین؛ هاودەم؛هاواڵ؛ دۆست. (همنشین)

هاوێرکرافت : اند؛ فرد: [ناو،ت] هاڤێرکرافت جۆرێک پاپۆڕ کە بەسەر دەریادا و بە سەر عەرزدا دەخشێ. (هاورکرافت)

هۆپ : ئوپ؛ لە ئیستۆپی ئینگلیزییە وەهاتوو؛ بە شوفیر دەڵێن بە واتا ڕاوەستە، تۆرمز بگرە . (ایست)

هونەرپیشە : فد: [ناو،ت] شانۆکار؛ ئەکتەری شانۆ و سینما. (هنرپیشه)

هەپەڕووت : [ناو]حاڵەتی نەشە بوونی زۆر بەهۆی کێشانی تریاک و هێڕوویینەوە. (هپروت)

هەرز : [ئاوەڵناو] هەرس؛ ساف‌بوون و سووانی هێڵی گرنجی پێچ و مۆرە. (هرز)

هیپنۆتیزم : فرد؛ فد؛اند: [ناو] خەوی دەستکرد؛ کە لە لایەن هیپنۆتیزۆرەوە بەسەر کەسێکدا دادەسەپێ. (هیپنوتیسم)

هیپنۆتیزۆڕ : [ناو،بک] پسپۆڕی‌کاری هیپنۆتیزم. (هیپنوتیزور)

هیپی : اند؛ فرد؛ فد: [ناو]لاوی بێکارەی وڵاتگەلی ڕۆژئاوایی کە دژ بە کۆمەڵگایان هەڵسوکەوت دەکەن و بە کنج و سەروقژی نائاساییەوە خۆیان نیشاندەدەن و زیاتر خوو گرتووی ماکی سڕکەرن. (هیپی)

هێندل : اند؛ فرد؛ فد: [ناو] میلەیێکی دوو ئانیشکە کە مۆتۆڕی سەیارەیان پێ‌هەڵدەکرد ئیمرۆ بووەتە (سویچ) کلیل. (هندل)

# و

واپژگ : [ناو] باوەشێن؛ باپژێن. (بادبزن)
واپەڕ : [ناو] باپەڕ؛ کوڵنج. (قولنج)
واتایی: [ئاوەڵناو] مەعنەوی؛ پژۆنی؛( شەرابی ئاڵی واتایی بدەدستم فەلەکبادە، تەپوتۆزی خەیالات و خەفەتباریم وەبەرباده).«حەسەن‌سەلاحسۆران» (معنوی)
واتە : [چاوگە] وتن؛ وتە؛ بەواتەی بەدگۆ : بەوتەی بەدگۆ. (گفتە؛ گفتن)
واتێرپۆلۆ : [ناو] یارێکی گروپییە لە نێوان دوو تیمی مەلەواندا کە یاریکەران تێدەکۆشن تۆپێک پخەنە نێو دەروازەی بەرانبەرەوە. (واترپولو)
واجە : [ناو] لە ئاوێستادا(واج)بەواتای وتە هاتووە؛ واژە؛ وتە؛ پەیڤ؛ وشە. (واژە)
واچتیٚ : [ناو] وەک ئەوەی؛ وەکوو؛ پسەو؛ مینا. (مانندانیکه)
واچەی : [چاوگە] وتن؛ کوتن؛گوتن؛ پەیڤین. (گفتن)
واخ : [ناو] واغ؛ لەیاریی واخێندا بەین‌دار بوونی دوو گوێز یان دووگزمووولەیە، بەقەرای قامکە چکۆلە پێدا چوونێک؛ دژی کوێراخ. (دوگردوی‌فاصله دار دربازی-گردوبازی)+
واخوان : [ناو،ت] واخوێن؛ تەلی شەشەمی تار کە قەوی‌ترە. (سیم‌ششم‌تار)
واخولیٚ : [ناو،ت] گێژەڵووله؛ شایی جندۆکان. (گردباد)
وادار: (١)[ئاوەڵناو] بادار؛ خۆراکێک کەسکی پیٚ دەماسیٚ. (رماتیسمی؛ خوراک-نفخ‌آور)
وادای : [چاوگە](١)بادان؛ تاودان؛ گرژکردن. (تابدادن). (٢) فوو دەر چوون؛ باڵێدەرچوون. (باددادن)
وارئامەی : [چاوگە،ت] هاتنە خوار؛ نیشتنەوە؛ نیشتنەوەی مەل و تەیارە. (نشستن؛ پایین‌آمدن)
واراناو : [ناو،ت] باراناو؛ ئاوی باران. (آب-باران)
وارانەمانگ: [ناو،ت] سەرماوەز؛ هەوەڵ مانگی پاییز. (آذرماه)
واردەمەنی : [ناو،ت] خواردەمەنی؛ هەر شت بۆ خواردن ببێت. (خوردنی؛ خوراک)
واردەیۆ : [چاوگە] خواردنەوە؛ واردنەوە؛ وەخواردن. (نوشیدن)
وارکێشەی هەوایی : [ناو] چاڵی هەوایی. (چاههوایی)
وارۆ : [ئاوەڵناو+ جێناو]خوارۆ؛ خوارەوە؛ ژێرەوە. (پایینی؛ طرف‌پایین)
وارویۆخ : [ناو] لەتورکیەوە هاتووە؛ دارونەدار. (هست‌ونیست)
واڕەواڕ :[ئامراز،دەنگ] بارەبار؛ بالەبال؛ دەنگی کار و بەرخان. (صدای‌بزغالەوبره)

وازلین : [ناو] ماکێکی پاترۆلیه بۆ نەرم بوونەوەی پێستی وشکی لەش بەکەڵکە. (وازلین)
وازیار : [ئاوەڵناو+ ناو] خوازیار؛ کەسێک کۆ دەخازێت. (خواهان)
وازیگە : [ناو] بازگە؛ بازیگا؛ یاریگا؛ جێگەی یاری و کایە. (جای‌بازی)
واژۆ : [ناو] پەسند؛دروستکردن؛ڕێکخستن؛ شروڤە؛ پەژراندن؛ ئیمزا. (تصویب؛راه-انداختن؛ امضا)
واشاک : [ناو] جۆرێک پشیلەی کێوی بە-کلکی کورت و گوێی ڕەش و پێستی بە-هادارەوە. (گربەوحشی)
واشەنگ: [ناو،بک]سەڵاکەر و تەپڵ‌لێدەری پارشێوانی مانگی ڕەمەزان. (طبل زن سحری در ماەرمضان)
وافووری : [ئاوەڵناو](ب)تریاکی؛ خووگرتوو بە کێشانی تریاک. (معتادبەتریاک)
واق‌واق‌کەرە : [ناو] فڕندەی تاق‌تاق‌کەرە. (مرغ‌حق)
واکێش : [ناو](١)باکێش. (٢)کەڵەشاخ. (باد کش ؛ استکان‌حجامت)
واگۆن : [ناو] ڤارگۆن؛ چەندژوور(کووپە)کە لە پاڵ یەکدا دابەستراون، زیاترلە شەمەندە فەردا کە لە چەند واگۆن پێکدێ. (واگن)
واڵ : ناوی جۆرێک نەهەنگە. (وال). (٢) [ناو] قوماشی تۆری زۆر ناسک. (تورخیلی نازک)
واڵس : فرد؛ فد؛ اند: [ناو] جۆرێک هەڵپەر-کێی ئارامی دوو کەسی ئوڕووپییە.(والس)
(٢)ئاهەنگێکی سێ زەربی تایبەتە بۆڕە-قسی واڵس. (آهنگ والس)
والۆڕ: [ناو] چراێکی چێشت لێنانی پلیتە-دارە. (والور)
واڵە : [ناو] لەنگ لێدان و خوار و خێچ بوونەوەی هەرتەگەرێک لە کاتی خولانەوەدا. (لنگ‌زدن‌تایرماشین)
واڵە: [ناو] خوشک. (خواهر)
واڵەزا :[ناو] خوشکەزا؛ خوارزا؛خارزا؛مندالی خوشک. (خواهرزادە)
واڵێ : [ناو] خوشک؛ واڵە. (خواهر)
والیباڵ : [ناو] یارییێکی‌گرووپییە، دوو دە-ستەی‌شەش کەسی کەیاری و ملە دەکەن بە تۆپ، تۆڕێکیش لەناوە ڕاستیاندا، کەنابێ بهێڵن توپلە زەوینەکەیاندا وەعەرز بکە-وێ. (والیبال)
وامەزەند :[ناو] مەزەندەکەری‌با؛ باپێو. (بادسنج)
وان : (١) [جێناو] ئەوان. (آنها). (٢)[ناو] شارێک‌وگۆلێکە لە کوردستانی تورکیا. (شهرودریاچەاست). (٣)[ناو] دەفرێکی‌درێژ و گەورەیە لە گەرماو پڕی دەکەن لە ئاوبۆ خۆ شۆردن و چوونە ناوی. (وان).(۴)بەو جۆرەن؛ وەهان. (اینطورهستند)
واناى : [چاوگە] خوێندن. (خواندن)
وانگ : [ناو] بانگ. (اذان)
وا نواندن:[چاوگە،ت](١) بەوجۆرە نیشاندان ؛ (ب)بە جۆرێکی پێچەوانە خستنە بەرچاو؛ بەجۆرێکی درۆیین خستنە پێش‌چاوی خە-ڵک بۆ بەهەڵە بردنیان. (وانمودکردن)(٢)

وێچوون؛ وادەنوێنێ: لەوە دەچێ. (بنظر-رسیدن)
وانییە : وەهانییە؛ بەو جۆرەنییە؛ (ب)ڕاست نییە؛ درۆیە. (اینطورنیست؛ دروغ‌است)
واوشە : [ناو] باوشە؛ باوش؛ باخەڵ. (بغل)
واوەیلا : هاوار؛ وشەیێک بۆ دەربڕینی کار خراپی. (واویلا)
واهۆفە :[ناو] واهۆڕ؛ بۆران ؛با وکڕێوە پێکەوە. (طوفان)
وایکینگ : [ناو] ئێلێکی شەڕکەری پاپۆڕە وان بوون لە ئیسکاندیناوی کە زۆر جار جینارەکانیان تاڵان دەکرد و تا سەدەی دە-یەمی زایێنی ئەو کارە دەوامی بوو. (وایکینگ)
وتەی : [چاوگە] خەوتن؛ نووستن؛ ڕازان. (خوابیدن)
وراسەی : [چاوگە] دروومان؛ دوورین. (دوختن)
ورتکە و پرتکە : [ناو،ت] وردەوپرتە؛هوور کەوموورک. (خردەریزە)
ورچەکەبوون : درێژ بوونەوەی سێبەری بەرد و ڕەوەز. (درازشدن‌سایەسنگلاخ)
وردەکاری : [ناو] لە کاری هونەریدا لە پێشدا گەڵاڵەیێک دەگرن و پاشان بەوردی لە سەری کار دەکەن کە ناوی وردەکاریە. (ریزەکاری)
وردەگیواو : [ناو] ئەم گیایە لە زەمانی ئە-شکانییەکاندا دەرکزە دەکرا بۆ وڵاتی ڕۆم و لەوێ بۆ عیلاجی نەخۆشینی نزیکایەتیی ژن‌وپیاو (جنسی)کەڵکیان لێوەردەگرت.

(درمنەدشتی.)
ورستەی : [چاوگە] هەڵسان؛ ڕاپەڕین. (پا شدن؛ قیام)
ورسی : [ئاوەڵناو] برسی. (گشنە؛ گرسنە)
ورشەورش : [ناو،ت] جریوەجریوی ئە-ستێران؛ تروسکەتروسک؛ تروسکانەوەی لەسەر یەک. (درخشیدن‌زیاد)
ورگەپێست : [ناو،ت] ورگەپۆس؛ پێستی ژێر سکی ئاژەڵ هەڵمسان، یان ئاو تێزان و ماسین. (پوست‌زیرشکم‌حیوانات‌بادکردن)
وروڕەی جادوو : ناوی دێوێکی ئەفسانەیی مێوینەیە. (نام‌دیوی‌افسانەیی)
وڕەگیا : > کاسەگوڵ
وڕێزان : [چاوگە](١) ڕاچەنین و لە خەو هەڵسان. (٢) هەڵسانەپا. (١و٢ پاشدن)
وزاندن : وزوزکردن؛ ویزاندن؛ گیزە-گیزکردنی مێش و هەنگ. (وزوزکردن)
وززە : (١)[ئامراز،دەنگ] ویزە؛ دەنگی باڵی مێش؛(٢)[ناوە] هێز؛ توانایی. (صدای‌بال-مگس؛ زور)+
وزمەدار : [ناو] دارسێوەر؛ دارسیبەر؛ گژەدار؛ دارێکی باڵا بەرز و جەنگەڵییە گەڵاکەی لەگەڵ گەڵای تووشیرین و وەنەوشە دە-کوڵێنن و ڕۆژی کەوچکێکی دەخون بۆ مالیجەی برینی ڕیخۆڵە(کولیت)بەکەڵکە. (درخت‌نارون)
وژار : [ناو] بژار. (وجین)
وژارکێ : [ناو] خۆشارکێ؛ قەراقەرا. (قایم-باشک.قایم‌موشک)
وژارە : [ناو] پەژارە؛ ئەندێش؛ خۆف؛ ترس.

(ترس)
وژن : [ناو+ ناو،بک]بژار؛ وژن کەر : بژار- کەر. (وجین)
وژنە : [ناو]گاینجە؛ سەرمژانە. (رابطبین- خیش‌ویوغ)
وشاردەی : [چاوگە]گوشین؛ کوشین؛ گوشان؛ گڤاشتن؛ گوڤاشتن. (فشردن)
وشترگا : [ناو] زەڕافە. (زرافە)
وشک‌وبرینگ : [ئاوەڵناو] وشک‌وبرنگ؛ زۆر وشک. (خشک‌خشک)
وشکە بەند : [ناو،ت](ب)سەرمای زۆر و بێ بارین کە ئاو دەیبەستێ.(سرمای‌سخت؛ یخ‌بندان)
وشکەشایی : [ناو،ت](١)بێ‌هۆ و بێ‌پەیوە- ندی بەشتێکەوە چۆپی گرتن و هەڵپەڕین. (بی‌دلیل‌وعلت‌رقصیدن). (٢)هەڵپەڕینی بی دۆ(دۆت). (رقص‌مردانەبدون‌دختروزن)
وشکەشیو : [ناو،ت] جاران برێتی بوو هە- ڵگێڕانەوەی لیباس وەک پشتوین و مێزەر بەباری خاوێنتریدا؛ بەڵام ئەمڕو بەشوشتنی لیباس دەڵێن لە ماشینی(وشکەشۆر)دا بێ ئەوەی ئاوی لێبکەوێ و بە تراوی تایبەت یا بێنزین دەشۆردرێ؛ ناوی ئەو مەکینە و بەرهەمی کاری ئەو مەکینە وشکەشیوە. (خشک‌شویی)
وشکەکەڵەک : [ناو،ت] دیواری وشکەچن؛ دیواری بەردچن بێ‌مەلات و قوڕ. (دیوارسنگ‌چین)
وشکەمز : [ناو،ت] وشکەمس؛ مزی دە- ست و حەقی کرێکار بە شێوەی نەغد و بێ نان و ئاو یان خۆراک پێدان. (مزد- بدون خوراک)+
وشی‌چن : > ئاوارە٣
وشی‌کەر : > ئاوارە٣
ولۆشە : [ناو] بڕویش؛ ساوار؛ پەڕشە.(بلغور)
ولۆف : [ناو] وڵەف؛ هەچک؛ هەچەڵ؛ ئاڵقەی سەری گوریس و کەژو. (وهنگ)
ول‌ول : [ئاوەڵناو+ ناو]کون‌کون؛ (دڵ ول- ول کەردەن خەدەنگی دووری)«مەولەوی» (سوراخ‌سوراخ)
وڵەگوڵاوی : [ناو]گوڵی‌گوڵاو؛ گوڵەباخ؛ گوڵباخی؛ گوڵ‌گوڵاو. (گل‌محمدی)
وڵەتووتی: [ناو]گوڵەتووتی؛گوڵەباخی‌کێوی؛ کوڵێندراوی گوڵەکەی بۆ مالیجەی بەردی گورچیلە باشە. (نسترن؛ گل‌سرخ وحشی)
ولیکان : [ناو] داب و ڕەسمێکی کۆنی ناو- چەی گەڕووسە لە ئاخری ساڵدا پەیکەرە- یێک لە پەڕۆ چێدەکەن و هەرکەس گازێک لە پیاز دەدا و تفی دەکاتەوە بە سەر پەیکەرەکەدا بەداخەوە هۆیەکەی تە- واو بۆم ڕوون نەبووەوە. (مراسمی‌در- گروس)
ون‌ئەور : [ناو] گیای هەرێز؛ فرێزوو؛ کوڵێندراوی بۆ لابردنی بەردی گورچیلە باشە. (مرغ؛ بیدگیاە)
ونتاڵ : [ئاوەڵناو] خوێن‌تاڵ؛ ناشیرین. (زشت)
ون‌ڕێژ : [ئاوەڵناو] خوێنڕێژ؛ پیاوکوژ؛ بکوژ. (خون‌ریز)
ونەن :[ناو] پردی لە مێورەی درێژ چێبوو

ی سەر ڕۆبار. (پل‌ازتاک‌درست‌شده)
ونەی : [چاوگە] خوێندن. (خواندن)
ووٚدکا : ڕوس‌د؛ فد؛ [ناو] ڤۆدکا؛ تراویکی ئالکۆلداری سەر خۆشکەرە. (ودکا)
وەئاگاهاتن : [چاوگە،ت] خەبەر بوونەوە؛ هۆشیار بوونەوە؛ لە بێخەبەری دەرهاتن. (آگاه‌شدن)
وەبا : [ناو] چاوقوولکە؛ ئازارێکە، بەهۆی زگە شۆرە و ڕشانەوە ئاوی لەش کەم دە-بێ و زۆر بڤەیە. (وبا) (٢) بەبا؛ وەک: دێلە بەبا. (موقع جفتخواهی سگ)
وەبالبەز : [ئاوەلناو] تاوانبار؛ بەرسووچ؛ گونا حکار. (گناهکار)
وەبای ئالتۆڕ : [ناو] جۆرێکی کەم هێزترە - لە نەخۆشینی چاوقوولکە. (نوعی‌وبا)
وەبەردان : [چاوگە،ت] شتێک‌دانە بەر شتێک یان تەگەرێک بۆ ڕاگرتنی؛ کاریتە-ی شکاو کۆڵەکەی وەبەردەدەن. (حایل-کردن)+
وەپێش‌گەڕان : [چاوگە،ت] پێشکەوتن و بەرانبڕدانەوە. (جلوافتادن‌ودورزدن)+
وەتاو : (١) بەخۆر. (٢)[بەند] بەتالووکە؛ بە-پەلە؛ بەلەز؛ بەپڕتاو. (با خورشید و آفتاب؛ باعجله)
وەجاخ‌کۆر : [ئاوەلناو] لە سەردەمی زەردە-شتدا کوانووی ئاگر، ئەولادی نێرینە هە-ڵیدەکرد؛ ئەگەر کەسێک ئەولادی نێرینە-ی نە بووایە پێیان دەگوت وەجاخ‌کۆر یان وەجاخ‌کوێر. (اجاق‌کور)
وەجێ : [ئاوەلناو](١) بەجێ؛ بەجێ‌وڕێ.
(بجا). (٢) لە جیاتی؛ تەنخوای. (درعوض)
وەختاو وەخت : (ب)٢۴ کاتژمێر. (٢۴ ساعت)+
وەخت‌وناوەخت : [بەند] بەشێوەی‌گوڕایگوڕ چوون بۆ جێگاییێ، لەکاتی لەبار یان نالە باردا. (وقت‌وبی‌وقت)
وەختیەسی : وەختیەتی؛ کاتی‌خۆیەتی؛ کاتی‌هاتووە. (وقت‌آنست)
وەخشوور : پێغەمبەر. (پیامبر)
وەخشووری: [ناو](ب)زەڕدەشتی.(زردو شتی)
وەخۆگر : [ئاوەلناو] لەخۆگر ؛ دەرووەست؛ حاڵەتی دەستە بەر بوون. (متعهد؛ ضامن)
وەدووکەوتن : [چاوگە،ت] (١) ڕیگە و ڕە-وشتی کەسێک کردن بە ئوڕناک و لەسەر ئەو ڕێبازە ڕۆیشتن. (کسی‌راسرمشق-قراردادن). (٢) دوای کەسێک کەوتن و بە شوێن کەسێکدا ڕۆیشتن. (دنبال‌کسی‌راه-افتادن)
وەدەرخستن : [چاوگە،ت] (١) ئاشکراکردن و سەر لابردنی سوڕ. (آشکارکردن). (٢) پیشاندان خویاکردن؛ نیشاندان. (نشاندادن) (٣)دەرکردن و وەدەرنانی‌کەسێک لە-جێگاییێک. (بیرون‌کردن)
وەدەست‌وپاکەوتن: [چاوگە،ت]کەوتنەخۆ؛ کەوتنە پەلە و هەوڵ بوون؛ کەوتنە جم و جووڵ. (بەدست‌وپاافتادن)
وەدەنگ هاتن : [چاوگە،ت](ب) زبانی ڕە-خنە و ناڕەزایی کردنەوە. (زبان‌بەاعتراض-گشودن)

وەر: (١)[ناو] بەر؛ پانایی. (پهنا). (٢) [ناو] خۆر؛ رۆژ. (خورشید)
وەراوەر : [ئاوەڵناو،ت] بەرامبەر؛ بەرانبەر. (برابر)
وەربازن : [ناو] بەربازن؛ بازنەییێکی تەنگ و چووکە، پاش بازنە دەکرێتە دەست کە - ببێتە لەمپەر بۆ ئەوەی بازنەکان دانە ماڵر ێن.(نگهدارندەالنگوها)
وەربەردەی : [ناو] خۆربردن؛ لە بەر خۆر سووتان؛ خۆر سۆچنای. (آفتاب‌سوختگی)
وەربێژ : [ناو] قەلبیر؛ هێڵەک؛ بێژنگ. - (غربال)
وەرپڕای : [بەند+ ناو]خۆرپەڕ؛ خۆرئاوا بوون. (غروب)
وەرپڕگا : [ناو] خۆرپەڕگە؛ بەرانبەری خۆر هەڵات؛ خۆرئاوا؛ خۆرنشین. (مغرب)
وەرتاخ : [ناو] شەخەڵ؛ نەمامی ساوای داری لیرەوار. (نونهال)
وەرچەپ : لای چەپەوە؛ (ب)سووچ؛ گۆشە؛ لابەلا؛ لاڕێ. (گوشە؛ بیراهه)
وەرچەم‌لێل : [ئاوەڵناو] وەرمالۆس؛ زۆر خەو هاتن؛ چاو پڕ لە خەو؛ خەو زاینە چاو؛ خەو هاتنی زۆر. (خواب‌آلود)
وەردەک : [ناو] ئوردەک: ئەم تۆرەمە هەر لە هێلکە هاتنەدەر هەموو مەلەوانن، دە- ندوکیان پانە و لە ڕوانگەی فرندە ناسیەوە پێنج جۆرن. (١)دەندووک مشاریەکان. (نک ارەایها). (٢) قازەکان. (قازها). (٣) مراویەکان. (مرغابیها). (۴) قوو. (قو). (۵) مراویە بینە کێشەکان. (مرغابیهای‌غواص)

وەردەک : [ئاوەڵناو+ جێناو] بەردەک؛ ئە- گەر دووکەس دووپشتەکی سوواری ئە- سپێ‌بن ئەوەی پێشەوە وەردەک یا بە- ردەک و ئەوەی پاشەوە، پشتەک یان پشت تەرکە. (سوارجلویی)
وەرزا : [ناو] وشەیێکی پەتی کوردییە کە - چووەتە نێو فارسیس واتا گاجووت. (ورزا)
وەرزان : [چاوگە] جووڵان؛ تەکان؛ بزوان؛ وەرزش. (جنبش)
وەرزانــدن : [چاوگــە،ت] (١)جووڵانــدن. (تکاندادن). (٢) خارانـدن؛ خـۆش کردنـی پێست و چەرم. (دباغی‌کردن‌پوست)
وەرزانەوە : [چاوگە،ت]جووڵانەوە؛ بزوانەوە؛ وەرزش کردن. (ورزشی‌کردن)
وەرزشی پیشەیی : [ناو،ت] وەرزشێ کە ببێتە کاری سەرەکیی وەرزشکار. (ورزش- حرفەای)
وەرزشی تاکەکەسی : ئەو وەرزشانەن کە وەرزشکار بە تەنیا دەچێتە مەیدانی حە- ریفەوە، وەک : زۆران و جوودۆ و شەڕە مشت. (ورزش‌انفرادی)
وەرزشی زستانی : [ناو،ت] وەرزشگەلی تایبەت بە زستان کە زیاتر لەسەر سەهۆڵ و بەفر بەڕێوە دەچن. (ورزش‌زمستانی)
وەرزشی زۆرخانەیی : [ناو،ت] وەرزشێ کە لە ناو زۆرخانەدا بەرەسمێکی تایبەتەوە بە- ڕێوە دەچێ. (ورزش‌باستانی)
وەرزشی سوئێدی : [ناو،ت](ب) لەش گە- رم کردن بۆ دەستپێکی کارگەلی وەرزشی؛ وەرزش کردن بە جووڵانەوەی ئەندامگەلی

لەش، بەبێ کەڵک وەرگرتن کەرەستەی وەرزشی. (ورزش‌سوئدی)
وەرسیان : [چاوگە،ت]کەوتنە خوار؛ ڕێکەوتن؛ ڕۆیشتن. (افتادن‌پایین؛ براه‌افتادن)
وەرسین : [چاوگە](١)بەربوونەوە خواری؛ داکەفتن. (افتادن‌پایین). (٢)کاژێربوون؛ ڕازی‌بوونی‌جنسی .(ارضاشدن در همخوابگی)
وەرکەردەی : [چاوگە،ت] لەخۆڕاکرن؛ کردنەبەر؛پۆشین؛ پۆشان. (پوشیدن)
وەرکەمەر : [ناو،ت] بەردەگیا؛ کەوچکە چایێ لە کوڵێندراوی گوڵە خڕەکانی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ کرمی ڕیخوڵە (ئاسکاریس‌وکرمەک)لەبەین دەبا. (برنجاسف وحشی؛ بومادران‌کوهی)
وەرکەوتوو : (پاشکەوتوو، سەگی‌خەوتوو؛) بە تەوسەوە بە کەسێکی خەوتوو دەڵێن. (سگ‌خوابیده)
وەرگل‌دای : [چاوگە،ت]گل‌دانەوە؛ بەرگرتن؛ نەهێشتن و بوونە لەمپەر. (مانع شدن؛ جلوگیری‌کردن)
وەرگیراو : [ناو،بەر](١)هەر شت تا ئیستا لە کەسێک ئەستیندراوە یان وەرگیراوە. (٢) پەسند کراو پەژرێندراو. (قبول‌شده)
وەرگێل : [ناو] بەردکێش؛ خەرەکی. (وسیله‌سنگ‌کشی‌باالاغ)
وەرگێڵاو : [ئاوەڵناو+ ناو،بەر] وەرگێڕدراو؛ بەراوەژوو؛ سەرەونخوون؛ پاچڤە بوو؛ تەرجەمەکراو. (برگردانده‌شده؛ ترجمه شده)
وەرماڵ : بەرماڵ؛ پێش‌ماڵ. (جلومنزل)
وەرم دیەی : [چاوگە،ت]ورم؛ خەو دیتن؛ خەو بینین. (خواب‌دیدن)
وەرمەزڕ : [چاوگە،ت]خەو زڕیان؛ خەو نەهاتن. (خواب‌ازچشم‌پریدن)
وەروچێش : [بەند] ئەڕاچی؛ لۆ چی؛ بۆ چی؛ بۆچ؛ ئەڕا؛ لەبەرچی؛ لە چ‌ڕوویێکەوە. (چرا)
وەروە سەر : [ئاوەڵناو] بەفرەبەسەر؛ بەفری کە مرۆڤ تێی‌ناچەقێ. (برف‌سفت‌منجمد-شده‌روی‌زمین)
وەروە وار : [ناو] بەفرانبار؛ هەوەڵ مانگی زستان. (دیماه)
وەڕەزی : [ناو] بێزاری؛ جارزی؛ بێ‌تاقەتی. (بیزاری)
وەڕەس : [ئاوەڵناو] وەڕەز؛ بێزار؛ بێتاقەت. (بیزار)
وەرەقەهاتن : [چاوگە،ت] (ب)ناوی کەسێک بە سەربازی دەرچوون. لە زەمانی قەدیم‌دا ناوی چەند کەس لەسەر وەرەقەیێک دەنووسراو دەدرایە دەس دێهبان کە حازریان بکات بۆ ناردنیان بە سەربازی. (اسم‌درآمدن‌به‌سربازی)
وەرەلوایی : [ناو] چوونەپێش؛ پێشڤەچوون. (پیشرفت)
وەرەما : [ناو] بەرخەمێو. (برەماده)
وەرەندل : [ناو] جۆرێک تفەنگی قەدیمی بوو. (نوعی‌تفنگ‌قدیمی‌بود)
وەرەنیا : [ناو] بیراز؛ گرنج‌گرنج کردنی بەردی ئاش. (آجدارکردن‌سنگ‌آسیا)
وەرەنێر : [ناو] بەرخەنێر. (برەنر)

وەڕێخستن : [چاوگە،ت] (١)ناردن؛ خستنەڕێ. (فرستادن). (٢)سەرپەرستی کردن و بەرپرسیکردن و ئیدارە کردن و بەڕێوە بردن. (ادارەکردن). (٣)پێکهێنان وەک، میوانی وەڕێخستن. (راەانداختن)
وەرێنان : وەرهێنان؛ لە دەور ئاڵاندن؛ دە ستم لە قەدی وەرێنا : ئاڵقەم کرد. (حلقە-کردن)
وەریەقە : [ناو](١)بەریەخە؛ بەروانکە. (دستمال‌سینە). (٢)پێسیر؛ یەخە؛ بەرۆک. (گریبان)
وەز : [ناو] بەز؛ پیو؛ چەوری و چەورایی دووگ و بەز. (چربی‌ودنبە)
وەزاڵەهاتن : [چاوگە،ت] وەرەز بوون؛ وە-هاوار کەوتن؛ زۆر بۆ هاتن. (درفشارافتادن)
وەزەند : [ناو] وەزەن؛ زەرەر و زیان؛ ئە-زیەت و ئازار. (زیان؛ ضرر)
وەزی : [ناو] گوێز؛ دار و بەری، داری‌گوێز. (گردو)
وەژارە : بیر و باوەڕێک کە تەنیا لە خە-یاڵەوە سەرهەڵدەدا؛ پڕوپووچ و خورافات. (خرافات ؛ موهومات)
وەژوورکەوتن : [چاوگە،ت] (١)لای ژوورو وەوە دانیشتن. (درصدرنشستن). (٢)چوونە ژوورەوە؛ چوونە ناوەوە؛ لێ وەژووورکەوتن. (برکسی‌واردشدن)
وەستاکار :[ناو،ت] پسپۆڕی هەرکارێک، وەستای ئەو کارەیە؛ وەک:وەستا کاری ئاش : ئاش وەستا. (استادکار)
وەستەک : [ئاوەڵناو] حەیوانێک‌کە زوو ماندوو دەبێت؛ زیاتر بۆ ئەسپ و قاتر دە-وترێت. (اسب‌وقاطری‌کەزودخستەمی‌شود)
وەسڵە : [ناو](١)دارتاشی؛ نەجاڕی. (نجاری). (٢ب) وەسڵە و پینە. (وصلە.)
وەسەرکردنەوە : [چاوگە،ت]بەسەر کردنە وە؛ سەرلێدان؛ حیساب کردن؛ کەسێک بە حیساب هێنان. (سرزدن)
وەسەرکەوتن : [چاوگە،ت] (١)وەک:کە-وتنە سەر ئاو. (روی‌آب‌ایستادن‌چیزسبک). (٢) ڕویشتنە سەر و چوونە قاتی سەرەوە یا سەربان. (بالارفتن). (٣ب) بە پلە و پایە گەیشتن. (ترقی‌کردن)
وەسەن : بەسە؛ ئیتر بەسە، لەوە زیاتر پێویست نییە. (بس‌است)
وەشتو وار : [ناو] وەشتەی و بارین؛ باران بارین. (بارندگی)
وەشرەنگ : [ئاوەڵناو] خۆشرەنگ؛ (ب) ڕووگەش؛ ئەنی‌گەش. (خوشرنگ؛ خوشرو)
وەش ونەئامەی : وەش گەرەگ بیەی؛ خۆش‌ویستن؛ خۆشەویستی. (دوست-داشتن)
وەشێنەر : [ناو،بک](١)ئەوەی بڵاو دەکاتە-وە؛ توو وەشێن؛ بڵاو کەرەوەی گۆڤار. (ناشر). (٢) لێدەر؛ شەق‌وزللە وەشێن. (بزن). (٣) هاوێژەر؛ فڕێدەر. (انداز)
وەفات : (١) وەفای تۆ؛ قوربانی وەفاتم. (وفای‌تو). (٢) وشە ئارەوییە واتا مردن. (وفات)
وەفرین : [ئاوەڵناو] بەفرین؛ هەر شت لە بەفر بچێت یان لە بەفر دروست بووبێت.

(برفین)

وه قله‌كه‌وتن : [چاوگه‌،ت] وه‌خۆ كه‌وتن و خۆ سازكردن بۆ ئه‌نجامی كاریٚ؛ پـل‌هـه‌ـ- لسان. (خودراآماده‌كردن)

وه‌كازه : [ناو] وه‌كاز؛ گۆچان؛ گالۆك.(عصا)

وه‌ك خۆلٚ : (ب) بـه‌ شـتی زۆر و فـراوان ده‌وتریٚت؛ وه‌ك خۆلٚ ڕژاوه : یه‌كجار زۆره. (مانندخاك)

وه‌كردن : [چاوگه‌،ت] (١)كردنه‌وه‌ی گـریٚ و شتی به‌ستراو. (بـازكـردن). (٢)ئـاگر وه‌- كردن: ئاگر كردنه‌وه؛ هه‌ڵكردن. (روشـن- كردن‌آتش). (٣) ئاوه‌ڵا كردن. ئاواڵه‌كردن و كردنه‌وه‌ی ده‌ركه. (بازكردن)

وه‌كه‌لٚ: [ئاوه‌ڵناو] به‌كه‌لٚ؛ هه‌روها وه‌ته‌گه: به‌ته‌گه و وه‌به‌ران : به‌به‌ران. (ماده‌گاوگشن خواه)

وه‌لاداهاتن : [چاوگه‌،ت] (١) بـه‌پـالٚ‌كـه- سیٚكدا ڕۆیشتن؛ به‌لاداهاتن (ازكنار گذشتن ). (٢) بووردنه‌وه، بووردنـه‌وه‌ی دلٚ؛ بـه‌لادا كه‌وتن؛(ب) مردن. (بیحس‌شدن و افتادن)

وه‌ڵاشم : [ئاوه‌ڵناو]وه‌ك:گیای دووراوی نه‌- به‌ستراوی كۆوه بوو؛ پرش‌وبڵـاو و شـیٚواو؛ به‌سته‌به‌ندی نه‌كـراو. (بسـته‌نشـده‌وبهـم- ریخته؛ فله)

وه‌له‌خ : [ناو] یاكه‌ریم؛ قومری؛ جۆریٚك كۆ تره باریكه. (قمری)

وه‌لیقه‌ت : [ناو] ڕشوه‌ت؛ به‌رتیل. (رشوه)

وه‌م جۆره : [به‌ند] وه‌یته‌ور؛ به‌م‌جۆره. (اینچنین)

وه‌ندیداد : [ناو] به‌شیٚكه له كتیٚبی پیـرۆزی ئاویٚستا. (وندیداد)

وه‌ن سـیاوه‌ش : [نـاو] خـویٚنی سـیاوه‌ش؛ گیاییٚكه كه به گوڵه‌كه‌یشی ده‌ڵیٚن خـویٚنی سیاوه‌ش، گوڵه‌كه‌ی هیٚـنده ده‌كـوڵیٚنن تـا ئاوه‌كه‌ی ده‌چندریٚت پاش وشـك بوونـه‌وه هه‌ر جار به‌قه‌را ده‌نكه نۆكیٚ لـه ئـاودا ده- تویٚننه‌وه و له‌ده‌مـی وه‌رده‌ن بـۆ عیلاجـی چڵككردنی پووك(پیۆره) به‌كه‌ڵكه. (خون- سیاوشان)

وه‌نـه‌دی : [نـاو](١)جابـه(جـه‌بعـه)ی لـه شووشه چیٚكراوی پیٚش دووكان. (ویترین). (٢) هه‌ر شتی شووشه تیٚگیراو وه‌ك ئاویٚنه و په‌نجیٚره و...(هرچیزباجام‌شیشه‌ای)

وه‌نه‌دیگ : > وه‌نه‌دی

وه‌نییه . وهانییه؛ وانییه؛ (ب)ئایـا وهانییـه؟ (آیااینطورنیست؟)

وه‌ور : [ناو] به‌فر. (برف)

وه‌وراو : [ناو] به‌فراو؛ تاواوه‌ی بـه‌فـر؛ (ب) ئاوی سارد و سه‌هـۆڵـاو؛ وه‌ورواون چـوون سه‌یل دیده‌ی من جۆشان «مه‌وله‌وی»( آب سرد؛ آب برف)

وه‌ویه‌جنۆكانه : [ناو] بووكه‌جنۆكانه؛ شـاییه جنۆكانه؛ گیٚژه‌ڵووله. (گردباد)

وه‌هابی : [ئاوه‌ڵناو] شۆپكرانی وه‌هابییه‌ت. (وهابی)

وه‌هابییه‌ت : [ناو] لقیٚك له مه‌زهه‌بی حه- نبه‌لی كه له‌سه‌ر بیروبڕوای موحـه‌ممـه‌دی عه‌بدولوه‌هاب دانراوه كه قورعان و سوننه- تی پیٚغه‌مبه‌ر به بنه‌ڕه‌تی بڕوا ده‌زانیٚ و به- غه‌یری خودا پنا به‌هه‌ر شت بردن به‌شـه-

ریک دانان بۆ خودا دەزانیٚ. (وهابیت)
وەی وەگەڕێن : [ناو] بەڵا وەرگەڕێن؛ بەڵاگەردان؛ قەڵخانی بەڵا. (بلاگردان)
ویاران : [جێناو] ئەوانەی ویەردن: (بوورین، ڕابوورین)؛ ڕابووردووگەل. (گذشتگان)
ویتامین : فرد؛ فد؛ اند: [ناو] هەرکام لە پێکهاتە ئالیەکان لە نێو خوراکدا کە بۆ ژیان پێویستە بەڵام نابێتە هێز و وزە. (ویتامین)
ویتامین ئا : [ناو] ڕتینۆڵ؛ ئەو ویتامینە لە نێو چەوریدا دەتوێتەوە و کەم بوونەوەی ئەو ویتامینە لە لەشدا، دەبێتە هۆی شەوکوێری و زبر بوونی پێست. (ویتامینA)
ویتامین ئی: [ناو] لە گەورە بوونی ماسوولکەکانی لەشدا دەوردەگێڕیٚ و پێشگری لە زوو پیربوونی سێللولەکان دەکا. (ویتامینای)
ویتامین (ب١) : [ناو] کەم بوونی ئەم ویتامینە لە لەشدا دەبێتە هۆی نەخۆشینی بێری‌بێری؛ لە ناو جەرگ و هێلکە و بیرەدا زۆرە. (ویتامین‌ب١)
ویتامین(ب٢) : [ناو] ئەم ویتامینە دەبێتە گەشە و نەشەی لەش؛ لە ناو شیر و جەرگدا زۆرە. (ویتامین‌ب٢)
ویتامین(ب٦) : [ناو] بەرگری لە دڵ بە یەکداهاتن و ڕشانەوە دەکا. (ویتامین‌ب٦)
ویتامین(ب١٢) : [ناو] لە دروستکردنی خوێن‌لە ناو لەشدا دەوری هەیە. (ویتامین-ب١٢)
ویتامین(سیٚ): [ناو] لە ناو سەوزی خواردن و میوەدا زۆرە؛ بۆ بەرگری لە هەڵامەت-باشە ؛ خۆش کەرەوەی برینی لەشە. (ویتامین‌سی)
ویتامین (دیٚ) : [ناو] لە پتەو بوونی ئێسک و ددان‌دا ڕۆڵی هەیە. (ویتامین د)
ویتامین(کا): [ناو] لە ڕاوەستانەوەی خوێنی بەربووی لەش و گرسانەوەی خوێنی‌برینداد دەوری هەیە. (ویتامین‌کا)
ویتڕای :فرد؛ فد: [ناو] چەشنیٚ وێنەکێشان بەڕەنگی خەستی(هەویری یان ڕۆنی) لە-سەر شووشە. (ویترای)
وێتن : [چاوگە] وتن؛ هوٚتن؛ خوٚتن؛ خەوتن؛ نووستن؛ ڕازان. (خوابیدن)
وێچنە : [ناو] بێژنگ؛ وێچن؛ هێڵەک. (غربال)
ویدئو : اند؛ فرد؛ فد: [ناو]کەرەستەی توٚمار کردن و بڵاوکردنەوەی دەنگ‌ورەنگ بە شێوەی میقناتیسی. (ویدئو)
وێدەچیٚ : [بەند](١) لەوانەیە؛ ڕەنگەوابێت. (شاید؛ احتمالا). (٢) شێوەدەدا؛ لەودەچیٚ. (شبیه‌است)
وێرانکەر : [ناو،بک] وێرانگەر؛ خاپوورکەر؛ تێکدەر. (ویرانگر)
وێرانکەردەی : [چاوگە،ت] ویرانکردن؛ خاپوورکردن؛ کاولکردن. (ویرانکردن)
ویرشیەی : لەبیر چوون؛ لەیاد بردن؛ فەراموٚشکردن. (فراموش‌کردن)
وێرمووت : ناوی جوٚرێک شەرابە. (نام‌نوعی‌شراب)
وێڕنی : فرد؛ فد: [ناو](١)تراوێکە بوٚ بریقە-

دار کردنی وێنه و چەرم. (۲)چەرمی وێڕنی لێدراو. (۳) جۆرێک چـەرمـی دەسـتکردی بریقەدار. (۱و۲و۳.ویرنی)
ویروڵ : [ناو] ویکول؛ ویکـوڵ؛ بیـەکـول؛ بنجەبی؛ گەڵاکەی دەکولێنن، بۆ مالیجـەی زەردوویی و ماڵاڕیا(نۆبەتی)باشە؛ سێ جۆرە (۱) بیە چەرمە، یان سپیە بی،(۲)سوورەبـی ، (۳) ڕەشە بی. (بید)
ویرەویر : [ناو،ت] بیرەبیر؛ هەڵاتن و کورتە ڕاوەستانی ئاسـک. (رمکـردنوایسـتادنو-واپسنگریدنآهو)+
ویڕەویڕ : [ئامراز] دەنگی هەر شت کە بـە تیژی ڕابڕێ وەک بەرد و گـوللە؛ ویـڕەی زۆر. (ویزویزگلوله)
ویزا : فرد؛ فد: [ناو] بەرایی؛ ئیزنـی چوونـە ناو وڵاتێکی بیانی لە لایەن نوێنـەری ئـەو وڵاتەوە. (ویزا)
وێژامورر :[ناو] زەنگڵە؛ زەنگۆڵە. (زنگوله)
وێژامە : [ناو] پـرۆزە؛ پـەخشـان؛ وەژەگ؛ نفیسکی. {نسر.با (ت)سەنقطه}
وێژێ : [ناو] باوێشک؛ ئارووشک؛ هۆنژین؛ باووشک. (خمیازه)
ویساندن : [چاوگە،ت] فیساندن؛ نماندن؛ خووساندن؛ تەڕکردن؛ خویساندن. (خیساندن)
وێستاو : [ئاوەڵناو+ بەند] لەسـەر درێژایـی چەقاو؛ بێجووله؛ بە پاوە ڕاوێسـتاو؛ ماتـڵ. (ایستاده؛ بیحرکت؛ معطل)
ویستراو : [ناو،بەر] داوخوازکراو؛(ب) بانگ-کراو لە ڕێکخراوییێکی دەوڵەتیەوە زیاتر بـۆ لێپرسینەوە. (خواستەشدە)
ویستەر : [ئاوەڵناو] خوازۆک؛ کەسێک کـە دەیەوێت؛ خاترخواز؛ خوازەر. (خواستار)
ویسکی : [ناو] جۆرێک خواردنەوەی سەر خۆشکەری ئاڵکوڵدارە. (ویسکی)
ویسیای : [ناو،بەر] فیسای؛ خویسیای؛ خوو ساو؛ نماندی. (خیس‌شده)
وێکهاتن : [چاوگە،] چەمین؛ چـەمـانـەوە؛ چــەمینــەوە؛ هاتنــەوەیــەک و نزیــک بوونەوەی دوجەمسەری هەر شـت. (خـم-شدن).
وێلک : [ناو] بەژن و ناوقەدی دار،لە ڕیشە وە هەتا جێی لقدەرکردنی دار.(تنەدرخت)
ویڵەکی : سەرگەردان؛ تیری بێئامانج؛ وە-ک: گوللەی وێڵەکی. (بی‌هدف؛ سرگردان)
وێڵی : [ناو] بەرەڵایی؛ ئاوارەیی؛ سـەرگـە-ردانی. (ولبودن)
+ وێنە : ناوە بۆ ژنان. (اسم زنانە)
وێنجە تاڵـە : [نـاو] وێنجـە کـەروێشـک؛ خۆراکی ئاژاڵـە؛ بـۆ شـیفای بـرین باشـە. (یونجەوحشی)
ویـەرد : [ڕابـوردووی ڕەدبـوون] تێپـەڕی؛ ڕابوورد؛ ڕۆیی. (گذشت)
ویـەرنـای : [لـەچاوگـەی ویـەردن](۱) ڕابووردن؛ ڕۆیـین. (۲) لێخـۆشـبوون؛ بـە-خشین. (۱و۲ رفتن؛ گذشتن)

